خانەی چاپ وبلاوکردنەوەی قانع
٣٣

کاتـرین کلێمان

# گەشتی تیۆ

## رۆمانێك دەربارەی ئاینەکان

لەفارسییەوە: دلاوەر عەبدولا

چاپی یەکەم
سلێمانی



خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی قانع- ٣٢-
ناونیشان: سلێمانی – شەقامی ئۆرزدی- بازاڕی گۆران
خاوەنی: ئاگر بورهان قانع
مۆبایل: ٠٧٧٠١٥٦٥٥٨٤

کتێب: گەشتی تیۆ
بابەت: ڕۆمان
نوسینی: کاترین کلیمان
وەرگێرانی: دلاوەر عەبدوڵڵا
تایپ: نیاز
دیزاین: ئازاد حاجی
چاپ: خانەی چاپ وبڵاوکردنەوەی قانع
سەرپەرشتیاری چاپ : دیار عەزیز
چاپی یەکەم: سلێمانی ٢٠٠٦
تیراژ: دوو هەزار دانە
ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٠١٠)ی پێدراوە

## تێبینییەك:

ئەم ڕۆمانە لەسێپتامبەری ١٩٩٧ (واتە پێنج مانگ پێش وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی فارسی) لەلایەن خانەی چاپی (سیویل–SEUIL) لەژێر ناونیشانی (گەشتی تیۆ) لەپاریس بڵاوکراوەتەوەو بەپرفرۆشترین کتێبەکانی فەرەنسا ئەژمارکراوە. بێگومان وەرگێڕانەکانی بۆ سەر زمانەکانی دیکەش هەمان پێشوازی لێکراوە.

خانەی چاپی (سیویل)، کە پێشتر وەرگێڕاوی مێژووی فەلسەفەی (جیهانی سۆفیا)ی نوسەری نەرویژی (یوستاین گاردەر)ی لەفەرەنسا بڵاوکردبۆوە، ڕۆمانی مێژوی ئاینەکان (گەشتەکەی تیۆ)ی بەهەمان ستایلو سیاق خستۆتە بەردەم خوێنەرانی، تەنانەت نەخشەو جوانکاری بەرگەکەشی وێکچونێکی تەواوی لەگەڵ (جیهانی سۆفیادا) هەیە، کە هاوتایە لەگەڵ ئاماژەو هێما ئاینیەکانی جیهان.

نوسەری ئەم ڕۆمانە خاتوو (کاترین کلێمان – CATHERINE CLEMENT)، کە لەجیهانی ئەدەبی ئەو وڵاتەدا ناسراوە، فەیلەسوفو ڕۆماننوسی هاوچەرخی فەرەنسایە. (کاترین) لە ساڵی (١٩٣٩) لەدایکبووەو پاش چوار ساڵ مانەوە لە هندستانو پێنج ساڵ لە (نەمسا) ماوەی (١٠) ساڵ دەبێت ئەفریقای بۆ نیشتەجێبوون هەڵبژاردووە. خاتوو (کلێمان) توێژینەوەی زۆری لەبواری سۆسیۆلۆژیو سایکۆلۆژیدا هەیەو نزیکەی خاوەنی (دە) ڕۆمانەو ئەمەش دوایین ڕۆمانێتی. (گەشتەکەی تیۆ)، کە (د. مهدی سمسار)وەرگێڕی فارسی کردویەتی بە(دنیای تئو)، ئێمە وەك دەقە ڕەسەنەکە بە(گەشتەکەی تیۆ) ناوزەدمان کردۆتەوە.

## (تورەیی خواکان)

- تیۆ، دەزانیت سەعات چەندە؟

تیۆ لەڕاستیدا نەخەوتبوو، سەری لەنێو بەتانییەکەی ڕۆکردبوو، خۆی بەشەپۆلە چێژاوییەکانی بێداربونەوە سپاردبوو. دروست لەودەمەدا دایکی پێینایە ژوورەکەیەوە ئەم خەونی دەبینی، کە قاچەکانی لەزەوی دەبڕان، وەك ئەوەی بتوانێت لەهەوادا بەرزببێتەوە... چ خەونێکی نامۆ بوو! ئێستا دەبێت کۆتایی پێ بێنیت؟ بۆچی مرۆڤ بەوئاسانیە لەنێوان خەونو بێداریدا بەئەندێشەدا ڕۆدەچێت؟

- (میلینا فۆرنە) هاواریکرد: هەستە، بەسە ئیتر! ئیدی ئەبێت هەستیت، ئەگینا ....

- بەدەنگێکی خەفەوە منگەمنگێکی کرد...نا... نا.. باڵی ڕامەکێشە !

- دایکی بەناڕەزاییەوە وتی: هەموو جارێك ئەم گەمەیە دوبارە دەکەیتەوە. تا درەنگانی شەو ناخەویتو بەیانیش بەتەمەڵی لەخەو ڕادەبیت، ئەوەش هەمووی سوچی خۆتە !.

(تیۆ) بەزەحمەت ڕاستبۆوەو ڕۆنیشت. لەهەموشی خراپتر ئەوەبوو خۆی بەپێوەبگرێتو ئارام بوەستێت لەبەردەم سەرەگێژەی بەیانیان. قاچێکی ڕەوانەی دەرەوەی جێخەوەکەی کردو پاشان قاچەکەی دیکەی‌و سەرەنجام هەموو جەستەی بەهۆی ئەو دەستەی لەناو قژە لولەکەی ڕۆکردبوو لەسەر پێکانی خۆی ڕاگیرکرد... بەملاو بەولادا لەتری دەدا. دایکە باوەشی پێداکردو هەردوکیان لەسەر لێواری جێخەوەکە ڕۆنیشتنەوە. بەئاخ هەڵکێشانەوە نیگایەکی گرتە ئەو کتێبانەی لەسەر جێگاکەی بڵاوببونەوە. فەرهەنگی میسری کۆن، ئەفسانەکانی یۆنان، کتێبی مردووەکانی تبت...

- ئەم وڕێنانە چین؟ ئەم شتانە هەرگیز لەگەڵ تەمەنی تۆ ناگونجێن. (تیۆ) دوێنێ شەو تاکوکەی بێداربویت؟

(تیۆ) بەچاوی خەوالّو بلّمەبلّمێکی کرد: ها.....

دایکە، کە ئەبرۆکانی هێنابوونەوە یەك لەبەرخۆیەوە مراندی: دیارە بەدرێژایی چەندین سەعاتی شەو سەرقالّی خوێندنەوەیت. دەزانیت درێژەدان بەوکارە دوچاری نەخۆشیت دەکات؟

(تیۆ) باوێشکێکیداو گوتی: نا نا... نەخۆش ناکەوم. هێندە هەیە کەمێك برسیمە.

دایکە، لەبارێکدا ناوچاوانی (تیۆ)ی ڕاموسی، وتی: هەموو شتێك لەسەر مێزەکە ئامادەیە. ڤیتامینەکانیشم ئامادە کردوە. ئێستا (فاتۆ)ی هاوڕێشت دەگات... خێراکە. خۆت باش بپێچەوە دەرەوە زۆر ساردە. بزانە نابێت وەرگرتنی ئەمپولەکانت لەدەرمانخانە فەرامۆش بکەیت. ڕاچێتەی دکتۆرەکە لەسەر بۆفێکەیە....!

بەڵام (تیۆ) کە دەست بەدیوار دەڕۆشت، لەسەرخۆ بەرەو گەرماوەکە هەنگاوی دەنا . (میلینا) بەخەیالّ پەرتییەوە بۆ چێشتخانەکە گەڕایەوە، کەلەوێ (ژروم)ی هاوسەری سەرگەرمی ڕۆژنامە خوێندنەوەبوو، بەدەنگێکی پەژارەوە وتی:

- ئەم منالّە حالّی باش نییە، لەڕاستیدا هیچ باش نییە.

- هاوسەرەکەی بەبێئەوەی لەخوێندنەوە سەرهەلّبڕێت گوتی: کێ، تیۆ.. یەکەم، چونکە چواردەسالّە منالّ نییە. دووەم، چ عەیبو عارێکی هەیە؟

- ئاخ.. لەتۆ، تۆ هەرگیز نابینی. ڕەنگ بەروخسارییەوە نەماوە، بەهەزار حالّ لەسەر جێگاکەی ڕاست دەبێتەوە...

- (دیکارت)یش نەفرەتی لەبێداربونەوەی بەیانیان دەکرد، ئەو نەفرەتەش ڕێگر نەبوو لەوەی ببێتە فەیلەسوف.

- بەڵام سەری گێژدەخواتو ...

- (ژروم) بەهێمنی قسەکەی پێبڕیو گوتی: خۆت دەزانیت تادرەنگانی شەو خەریکی خوێندنەوەیە.

- (میلینـــا) هـــاواریکرد: دەزانیــت چــی دەخوێنیتـــەوە؟ فەرهــەنگی ئەفــسانەکان، کتـــێبی مردووەکانی تبت... کتێبی مردووەکان!

- ئازیزەکــەم گــوێڕادێرە.. (تیــۆ) بــەهیچ ئامۆژکارییــەکی ئــاینی گۆشــنەکراوە. مــنو تــۆ لەوبارەیەوە ڕێککەوتبوین.... هیچ مایەی نیگەرانی نییە، کەخۆی، خۆی پەروەردەو فێربکات ! بهێڵە ئـەوە بکـات. ئەگـەر بتـەوێت ئـاینو مەزهـەبێك بۆخـۆی هەڵبـژێرێت واباشـترە ئازادانـە ئەوکارە بکات... لەلایەکی دیکەشەوە زۆر گەورەبوە. هێندەی ئاگاداریش بین پشکنینی ساڵانەش هیچی دەرنەخستوە.

- (ژروم) پـشکنینی پزیـشکی قوتابخانـە، چییە ڕادەبوێریـت؟ بێگـوێی، ڕادیـۆگرافی عـەجولیو جوڵەجوڵ، ئەوەش نەرێکوپێكو نەبەردەوام... نەخێر هەرڵەیبەم بۆ لای (دێلاتر).

- (میلینا) وازبێنە! هەمیشە گەدەی پڕ لەمادەی بەهێزکردن دەکـەیتو وەك منـاڵێکی کۆرپـە چاودێری دەکەیت! تا دەرەنگانێك کتێب دەخوێنیتەوە یا بیخوێنیتەوە، تەنانەت بەکارێکی باشی دەزانم. دانیشە.

- (میلینا) لەژێر لێوەوە گوتی: دڵنیام شتێك لەئارادایە.

- هاوسەرەکەی، کە ڕۆژنامەکەی قەدکرد، ئاهێکی کێشاو گوتی: بەدڵی خۆت بکە. بـڕۆ بـۆلای (دێلاتـر). لـەوێ پـشکنینی خـوێنی بـۆ دەکـەن، بـەڵام مـن ئەگـەر مۆڵـت دەفـەرموی دەچـم بـۆ تاقیگەکەم. دەتوانم چاوەڕوانی ماچێك بکەم؟

(میلینا) بەبێ وەڵامدانەوە ڕومەتی لێ نزیککردەوە.

- پیاوەکـە لەگـەڵ چـوونەدەرەوەی لەژوورەکـە بەهەڕەشـەوە وتـی: ئیـدی نامـەوێت هـیچ دەربارەی جوجەڵە نازەنینەکەت ببیستم! (میلینا)، کە بەتەنها قاوەی دەخـواردەوە، چاوەڕوانی (تیۆ) بوو.

## خێزانی تیۆ

تادوا زستان هەڵسوکەوتی خێزانی (فورنە) باش بوو، نەبێکاریو نەمشتومڕی ناوخۆ. باوکی (تیۆ) بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوەی زانستی لە پەیمانگای پاستۆر بوو. پیانۆی لێدەداو خۆی وەك یەکێك لەباشترین هاوسەران پیشاندەدا. (میلینا) گەلێك بەختی هەبوو: لەقوتابخانەی (جۆرج-سان)، کە (تیۆ)ش خوێندکاری ئەوێ بوو، مامۆستای زانستە سروشتییەکان بوو؛ هاوکاری تورەو قوتابی گوێڕایەڵی هەبوو. کچەکان (تیۆ)ی برایان خۆشدەویست: (ئیرن)ی خوشکە گەورەی (تیۆ) سەرقاڵی بەکالۆریۆسی ئابوری بوو. (ئاتنا)ی خوشکە بچوکیو دواین منداڵی خێزانەکەیان پێی نابوە شەشساڵی. جگە لەدەمەقاڵێ لەسەر ونبونی گۆرەویو پاککردنەوەی مێزی نانخواردن (تیۆ) هیچ کێشەیەکی دیکەی لەگەڵ خوشکەکانی نەبوو، کەسێك بوو باش و نەرمونیان و تەواو.

(میلینا شاکرۆس) پێشئەوەی شوو بە(ژروم) بکات ڕۆژانێکی سەختی تێپەڕاندبوو. هێشتا منداڵ بوو، کەباوکی (جۆرج شاکرۆس)ی ڕۆژنامەنوسو دایکی (تیانۆ ویڤلونیست) لەساڵی (١٩٦٧) لەترسی هەڕەشەی دیکتاتۆری ڕژێمی یۆنان هەڵاتنو خۆیان گەیاندە پاریس، ئەو شارەی نەزمیتونو نەخۆری هەیە. پاشان (میلینا) گەورە بوو، تاقیکردنەوەکانی بەسەرکەوتویی بەئەنجام گەیاند، (ژروم)ی بینیو شوی پێکردو منداڵان هاتنە دنیاوە. دیکتاتۆری ژەنەراڵەکان لەیۆنان جێگایان بۆ دیموکراسی چۆڵ کردو دایكو باوکی (میلینا) بۆ یۆنان گەڕانەوە. منداڵەکانی (فورنە) بەیادی نیشتمانەوە ناوی یۆنانیان لێنرا. بەهۆیەوە کچە گەورە بە(ئیرن) واتا ئاشتیو ئارامیو بچوکوکە بە (ئاتنا) واتە (ئەقڵو زرنگی) ناونران. بەڵام ناوی تەواوی تیۆ لە (تیۆدۆر)ەوە هاتوە، کەلەیۆنانیدا واتای (دیاری خوا) دەبەخشێت. دیارە لەقوتابخانە (تیۆدۆرو ئاتنا) لەناو هاوڕێکانیان گرفتیان هەبوو، بەڵام هەر زوو هاوڕێکانیان فێربوون بە(تیۆو ئاتی) بانگیان بکەن.

(تیۆ) لەدایکبوونێکی گرانی هەبوو، (میلینا) چاوەڕێی جمکی دەکرد، جمکەکە مانگێك پێشتر لەکاتی خۆیان لەدایکبون، بەڵام تەنها (تیۆ) بەزیندوێتی مایەوە. ئەوەی لەوسەرەتا ناخۆشەدا بۆ (تیۆ) مایەوە تەنها بێخەویو نائارامی بوو. بۆ ئەوەی (تیۆ)لەوە زیاتر نیگەران نەبێت (میلینا) بڕیاریدا هیچ دەربارەی ئەو جمکە نەدرکێنێت، کە (تیۆ) هیچی دەربارە

نـەدەزانی. (تیـۆ) منـاڵێکی جـوان و قەشـەنگ بـوو، بەقـژە زەردو چـاوە سـەوزباوەکانی ئیرەیـی خوشکەکانی دەجولاند.

(ماری) نەنکە فەرەنسییەکەی (تیۆ)، واتە دایکی (ژروم)، کە پەرۆشـی پـەریان و جنۆکـەکانی دارسـتان بـوو، لەژیانیـدا جوانییەکـەی (تیـۆ)ی بـە (جـوانی شـەیتان) وەسـفدەکرد، بـەڵام دایـە (تیانۆ)، نەنکە یۆنانییەکەی، کەکللەی نەوەکانی بە ئەفسانە کۆنـەکان و ئـاینی ئەرتـەدۆکس پـڕ دەکرد، وەڵامی دەدایەوە: (جوانی خواکان)ـە!. (تیـۆ) بـەجۆرێك جـوان و قەشـەنگ بـوو، کاتێك هـەردوو دایەگـەورە لـەجیهانی پەرۆشـی جـوانی نەوەکـەیان نغـرۆ دەبـون (میلینـا) بەدزییـەوە وێردی دەخوێند تا کوڕەکەی لەچاوی بـەد بـەدوور بێـت. هەرچـەندە دایـە گـەورەی فەرەنـسی بڕوای بەوە نەبوو، بەڵام دایکی (تیۆ) زیاد لەڕادە ئەفسانەیی بوو.

لەناو خێزاندا دەزانـرا (تیـۆ) وەك ئـەوانی دیکـە نییـە؛ لـە قوتابخانـە هەمیـشە یەکـەم بـوو؛ بەردەوام کتێبی دەخوێندەوە؛ هەر لەسەرەتای مناڵییەوە سەری بەسـەر کتێبـدا شـۆڕدەکردەوە؛ کاتێك دوریان دەخستەوە دەچوە سەر کۆمپیوتەرو دەکەوتە گەڕان بەناو (CD Rom)ـەکانیدا. لەڕۆژانی دواییـدا لـەو یارییـە ئەفـسانەییە ئینگلیـزی زمانـە جیانـەدەبۆوە، کـەدایکی بـەدیاری پێیـدابوو. یارییەکـە نـاوی (تـوڕەیی خواکـان – Wrath of the Gods) بـوو. لـەو گەمەیـەدا قارەمانێکی لاو ڕوبەڕوی هەموو پەری دەریایی، دێۆو درنـج و شەیتانەکانی یۆنانی کۆن دەبۆوەو لەو نێوەندەشدا ژنێکی غەیبزان (پی تـی - Pythi)ش هـەموو هێـزی بـەکاردەهێنا تـا بەپێـدانی ئامۆژگاری زەرەرمەندانە گەمەکارەکە گومڕا بکات.

(میلینـا) سـەرەڕای ئـەو دورەپەرێزییـەی بەرامبـەر بـەیاری کۆمپیوتـەر هـەیبوو، بـەڵام لەبەرامبـەر (تـوڕەیی خواکـان) نـەیتوانی خـۆی ڕابگرێـت. (تیـۆ) بەدرێـژایی چـەندین سـەعات لەبەرامبەر کۆمپیوتـەر ڕۆدەنیـشت و سـەرزەمینی خـاکی دایکیی و لـەژێر درەختـەکانی زەیتـونی دەنـواڕی و چـەندین سـاتی بـۆ گـەڕان بـەدوای کەسـایەتیی و ناسـنامەی قارەمـانی ڕوداوەکـان دەگـوزەران، کـە وەك هاوشـێوەیەکی خـۆی بـوو. پاڵـەوانی قـۆزو هوشـیارو کـەمێك خۆشـڕوی (تـوڕەیی خواکـان) چـەندینجار دەکەوتـە کۆشـکی دۆزەخـەوە تـا سـەرئەنجام دەیتـوانی بـاوکی ڕاستەقینەی خۆی (زیۆس)ی پاشای خواکانی یۆنان بدۆزێتەوە. کاتێـك (ژروم فۆنـە) دەیویـست لەگەڵ کوڕەکەی ململانێ بکات خۆی لە دۆزەخدا دەبینییـەوەو ئیـدی نەیـدەتوانی دەربـچێت...

چونکە دەرکەوتبوو تەنها ((تیۆ) دەتوانێت بەلێدانی بەرد، چەکوش وزنجیرە نهێنییەکان بەکۆمپیوتەرەکەی پاشای خواکان بدۆزێتەوە. ئیتر ئاشکرابوو لای هەموان کە (تیۆ) منداڵێکی بلیمەتە.

بلیمەتبونی (تیۆ) کەسی نیگەران نەدەکرد، بەڵام ئەو منداڵێك بوو زۆر دوچاری زیان و نەهامەتی دەبوو. (میلینا) بەخێرایی ئەژماری دەکرد: لەسێ ساڵی یەکەم دوچاری نەخۆشی ساری، لەحەوت ساڵیدا سورێژەی پیس، کەماوەیەکی زۆر بێهێزو لاوازی کردبوو. بەڵام وا ئێستا بۆتە چواردە ساڵەو ئەوە فەرامۆشکراوە، لە (دە) ساڵیدا لەیاری فوتباڵدا قاچی شکاو ئێستاش کەگەورە بوە وەرزش هیلاکی دەکات و مامۆستاکانی باسیان لەکەنەفتی ئەو دەکرد، بەکورتی (تیۆ) دوچاری لاوازی و ناتوانییەکی سەیر بوو. ئایا دەبوو وەك میراتی سەیری ئەو نەهامەتیانە بکات؟ دایکی لە چواردە ساڵیدا دوچاری کەمخوێنی سەخت ببوو یان بڵێت تاکە هۆی نەخۆشیەکەی (تیۆ) تەنها کەمی شەکرەی خوێن بێت یان نەخۆشییەك کەلەزیادبونی خرۆکە سپییەکانی خوێنەوە سەرچاوەی دەگرت...

## (فاتۆ)

دەنگی فاتۆ بوو لە ڕاڕەوەکەوە دەهات. منم (فاتۆ)! .وەك هەمیشە (فاتۆ) لەکاتی خۆیدا هاتبوو. دوبارەش وەك هەمیشە هەناسەبڕکێ بوو؛ پرچە بچوکەکانیشی دەلەرانەوە، کە بەمرواری ئاڵتونی بەسترابون. (فاتۆ) کچێکی سینیگاڵی دراوسێ بوو، کە مایەی خۆشحاڵی بەیانیانی ئەو خێزانە بوو.

- ئامادەی؟ گوێم لەدەنگی زەنگەکەت بوو! کچە بچوکەکە، کە جانتاکەی لەکۆڵ دەگرت وتی: ئاساییە، هاوسەرەکەت لەبەردەم دەرگاکە بوو. (تیۆ) ئامادەیە؟

- (میلینا) ئاهێکی هەڵکێشا: دیارە ئامادە نییە. خۆت دەزانیت. دانیشە قاوەیەك فڕکە.

- کاتمان نییە. لەوانەیە درەنگ بکەوین، سەرەڕای ئەوەش ئەمڕۆ تاقیکردنەوەی مێژوومان هەیە. دەچم بۆ لای.

- (میلینا) بێهودە هاواریکرد: سەرەتا لەدەرگا بدە، لەوانەیە لەگەرماوەکە بێت.

وەك ئەوەی (فاتۆ) بترسێت (تیۆ) ڕوت بێت. هەر لەپۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە پێکەوە گەورە ببون. لەگەڕەکی (ئابەگرگوار) کەس (تیۆ)ی بەبێ (فاتۆ)و ئەمیش بەبێ ئەو نەدەبینی.

(فاتۆ) هەمیشە خەندەلێو بوو، جگە لەرۆژێکی کەلەخۆپیشاندانێکی دەوروبەری شاردا لاوێك کوژرابوو. لەوەودوا (فاتۆ) لەکاتی خۆپیشاندانەکاندا دەچوە مالی (تیۆ)و دەستی دەگرتو دەیگوت: تیۆ دەچین بۆ خۆپیشاندان. (تیۆ) نەیدەتوانی چاوپۆشی لە(فاتۆ) بکات. ئەوەهەر (فاتۆ) بوو لەناو کتێبەکاندا دەریدەکێشا تادەربارەی (سینیگال) قسەی بۆ بکات: دەربارەی لوتی درێژی بەلەمەکان لەسەر شەپۆلەکان، لقی درێژو تێکئالاوی درەختانی (بایۆباب)، ئەنباری ڕەشی گەورەی دانەوێڵە کەوەك کەندو لەسەر پایەڕاگیرکراون، تەختانییەکانی کەنار دەریا، کەماسیگرەکان ماسی جۆری (باراکود - کەماسییەکی گەورەی گۆشتخۆری دەریا گەرمەکانە) ڕاوکراویان لەسەردادەگرن. فرینی قورسی ماسیگرەکان، چاوان درشتو سورباوی ئەسپی ئاوی، کەمەر (دە) سال یەکجار لەکەنارەکانی سینیگال دەردەکەون... (فاتۆ) دەیوتو (تیۆ) بەجیهانی ئەندێشەدا ڕۆدەچوو. (دیۆپ)ی باوکی (فاتۆ) بێوە پیاو، فەیلەسوفو کارمەندی (یونسکۆ) بوو؛ لەکاتی باسکردنی پشوداندا باسی لەوە دەکرد ڕۆژێك هەموو پێکەوە بۆ ئەفریقا دەچن، بەلام هەموو سالێك هەردوو خێزانی دراوسێ لەجیاتی ئەفریقا خۆیان لەشاری (لابول) دەبینییەوە، کە لەوێدا بەڕێز (عەبدولایە دیۆپ) بەهەندێك خەمو پەژارەوە شەپۆلە خاکی ڕەنگەکانی کەنارەکانی (فەرەنسا)ی لەگەل شەپۆلە پیرۆزەییەکانی ولاتەکەی بەراورد دەکرد.

لەناکاو (فاتۆ) لەگەرماوەکە هاواریکرد: (میلینا)! ڕاکە!

(میلینا) بەپەلە گەیشت. (تیۆ) بەچاوی خەوالوەوە لەسەر تەختی گەرماوەکە ڕاکشابوو. (فاتو)ش بێ ئەنجام بەپشتی دەست بەڕومەتی (تیۆ)یدا دەکێشا. (میلینا) بە پەرداخێکی ئاوی بەلۆعەوە ئاوپرژێنی دەکرد. (تیۆ) چاوەکانی تروکاندو پژمی. دایکە لەسەرخۆ وتی: ئازیزەکەم مەجولێ... پەلە مەکە، هەر ئێستا بەرزت دەکەمەوە.

بەلام کاتێك هەستایە سەرپێ، خوێن بەلوتیدا هاتەخوار. (میلینا) بەدەنگێکی تورەوە فەرمانیدا: سەرت بۆ دواوە شۆڕ بکەرەوە، (فاتو) تکایە دەسرێك بێنەو بەئاوی سارد تەڕی بکە. بیدە بەمن...و لەسەرناوچاوانی داینا.. هیچ نییە.

بەلام خۆشی بڕوای بەوە نەبوو کە دەیگوت. نەخێر (شتێك) هەیە. (میلینا) بەهەلەدا نەچوبوو، (تیۆ) نەخۆش بوو، کاتێك خوێنەکەی وەستا دەستی لەسەر ڕەگی گەردنی کوڕەکەی دانا. پڕ بوو لە غودە. سیمای (میلینا) گرژبوو.

- خاتون.. زۆر باشە !

- (میلینا) وتی: بەخاتون بانگم مەکە. (تیۆ) بڕۆ بنوو؛ خواردنەکەت بۆ دێنمە سەر جێگاکەت.

- (فاتو) بڵماندی: تەمەڵ.. هەر ئێستا دەگەڕێمەوە. نیگەران مەبە تیۆکەی من.

- (تیۆ) وتی: بەڵام من نیگەران نیم. بۆچی دەبێت نیگەران بم؟

## نەخۆشییەکی نهێنی ئامێز

(دێلاتر)ی پزیشک فشاری خوێنی (تیۆ)ی گرت، کاردانەوەکانی ئەزمون کرد. دەستی لە غودەکانی گەردنیدا. بنباڵو ڕانی پشکنیو ماوەیەك لەو پەڵە شینباوەی سەر ڕانی (تیۆ) وردبۆوەو ئینجا بە سیمایەکی گرژەوە پرسی:

- کوێت بەرکەوتوە؟

بەڵام (تیۆ) هەمیشە لە هاتوچۆکانیدا بەرداراو دیوار دەکەوت نەیدەزانی بەتەواوی کەیو کوێی بەرچی کەوتوە. پاشان (دێلاتر)ی پزیشک لەهەموو جەستەی ڕوانیو پەڵە شینباوەکەی سەر سکی بینیو پەنجەی لەسەر دانان. پاش گوێڕادێران جوڵاندنی ماسولکەکانو تاقیکردنەوەی نەرمی گەردنی بەبێ یەك وشەش لەجێی خۆی هەستاو بەبێ خواحافیزی چوە دەرەوە. (تیۆ) خێرا خۆی گەیاندە پشت دەرگاکە تا بزانێت چی بەدایکی دەڵێت.

کاتێك پزیشکەکە لەژورەکەی (تیۆ) هاتە دەرەوە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو پاش بێدەنگییەکی دورودرێژ بەدایکی وت:

- بەبێ تاقیکردنەوەو شیکاری ناکرێت هیچ بوترێت، تەلەفون بۆ ئەم ژمارەیە بکەو داوای کەسێك بکە بۆ شیکاری خوێن.

- دەمودەست (میلینا) بەدوودڵییەوە وتی: دەتەوێت بڵێی خۆم نازانم بۆ تاقیگەی ببەم؟

- پێمباشه لەسەر جێگا بمێنیتەوە، دەبێت ئاگاداری لوتپژانەکەی بیت.
- بەڕێز.. شتێك هەیە، وانییە؟

- پزیشك وەڵامی دایەوە: بێگومان، لەگەڵ گەیشتنی ئەنجامی شیکاری خوێنەکە تەلەفۆن دەکەم.

- (میلینا) بەدەنگێکی گیراوەوە پرسی؟: خاتو فۆرنە، خۆت ئازار مەدەو چاوەڕوانی سبەینێ بکە. ئەمرۆ ناچیت بۆ قوتابخانە؟

- بەڵێ، دوو سەعاتی دیکە، بەڵام تا ئەوکاتە...
- تا ئەوکاتە خواردنی باشی بدەرێ؛ حەزی لەچییە بۆی ئامادە بکەو با پشووبدات ! نەوەکو شتێکی گرنگ بێت!

(تیۆ) بەشەکەتی‌و خەندەوە گەڕایەوە سەرجێگاکەی. ئەگەر شتێکی ئەوتۆ نەبێت چەند چاکە هەفتەیەك لەسەرجێگا پشوو بدات، لەگەڵ کتێب‌و کۆمپیوتەرو تەلەفزیۆنەکەی. دایکی هەموو بەیانییەك سینییەك چاوو نان‌و هێلکەی کوڵاوی بۆ دەبات‌و ئیدی ناچارنەدەکرا لەجیهانی خەونی شەوانە بەدەربنرێت. ئەوەش ئەوشتە بوو ئەو بەیانییە ڕویدا: دایکی لەسەر سینییەك نان‌و چاوو هێلکەی بۆ بردو پاشان خۆی بۆ قوتابخانە ڕۆشت‌و (تیۆ)ش وەکو منداڵێکی ساوا لەخەودا نغرۆ بوو.

هەڵبەتە پێش ڕۆشتنی دایکی پەرستارێك خوێنی لێگرت بۆ شیکارکردن، بەڵام ئازاری دەرزییەك بەرامبەر بەپشوی ڕۆژێکی درێژ شتێکی ئەوتۆ نەبوو، لەلایەکی دیکەشەوە (تیۆ) ئاشنای ئەو دەرزییە بوو.

ڕۆژی دواتر (تیۆ) گوێی لەدەنگی دایکی بوو، کە بەتەلەفون لەگەڵ پزیشکەکە دەدواو دەرگاکەی داخست. پزیشکەکە دەبێت چی پێبڵێت. (میلینا) بەرەنگێکی خەفەتاوییەوە دەرکەوت.

خۆت بگۆڕە. بۆ تەواوکردنی تاقیکردنەوەکان بۆ نەخۆشخانە دەچین، دەبێت هەر ئێستا بڕۆین.

نەخۆشخانە؟ تاقیگە؟ تیۆ هەستی بەبێتوانایی خۆیکرد، بەڵام نەیویست دایکی هەست بکات. نەخۆشخانە، ئەو شوێنەی بۆنی سوتاوی‌و دەرمان دەدات. باشە، هەرچەندە بارەکەش گران بێت هێشتا ساڵێك لەهاوکلاسەکانی لە پێشترە. بەدەنگێکی نەرمونیانەوە پرسی:

ئەم تاقیکردنەوانە بۆچین؟

هیچی وانییە ئازیزەکەم. هەندێك لەمۆخی ناو ئێسقانت دەردەهێنن، کەمێك ناخۆشە.

بەتەنزێکی خۆشەوە وتی: مۆخی ئێسقان؟ خۆ من لولاقی نۆکاو نیم مۆخەکەم هەڵلوشن!

## سەراسیمەبونی ناوماڵ

کاتێك ئەنجامی شیکارییەکانی نەخۆشخانە گەیشت هەمووشت گۆڕاو هەموو خێزانەکە دوچاری نیگەرانی بون. دایك فرمێسکەکانی شاردەوە. باوکی پاشنیوەڕۆ زوو بۆ ماڵ گەڕایەوە. (ئاتی) بەردەوام سەردانی ژوری براکەی دەکرد، بەڵام (فاتو) ئیدی پێنەدەکەنی. (تیۆ) هەوڵیدا پرچە نیوەکراوەکەی ڕاکێشێت، بەڵام (فاتو) تەنها خەندەیەکی خەماوی بۆکرد. (تیۆ) لەخۆی پرسی: "چیم بەسەر هاتووە؟".

بەدڵنیاییەوە هیچ کەسێك هیچی بەو نەدەگوت. لەوەش سەیرتر ئەوەبوو هەفتەیەك تێپەڕی و بۆ نەخۆشخانە نەگەڕایەوە. لەڕاستیدا (تیۆ) حاڵی خۆی نەباشتر دەبینی‌و نەخراپتر. لەناو دەریایەك لە لاوازی‌و بێتواناییدا شەپۆلی دەدا، کە بێتامیش نەبوو. کاتێك (فاتو) لێیدەپرسی (تیۆی من.. ئەمڕۆ حاڵت چۆنە؟) هەمیشە یەك وەڵامی دەدایەوە (کەمێك هیلاکم.. چاك دەبێت).

ئیتر باسی چونە قوتابخانە لەئارادا نەبوو. دوو ڕۆژ پاش دەرچونی ئەنجامی شیکارییەکە باوکی بەراتەکاندنێکی دەست پرسەکەی بڕیبۆوە. بڕیاردرا (فاتو) وانەکانی قوتابخانە لەماڵەوە بە(تیۆ) بداتو ئەرکەکانی جێبەجێ بکات. مامۆستاکانیش ڕازی بون تاقیکردنەوەی بۆ بکەن‌و بەڕێوەبەریش هەروەها. بەوجۆرە چارەسەری دواکەوتنی قوتابخانەکراو گرفت نەما، ئەمەش ئەو قسەیە بوو کە باوکی کردبوی.

باوکی هەولێدەدا بەوردی هەموو شتێك بخاتە ژێر چاودێرییەوە. مێزێکی بچوکی جوانی کریبوو، کە لەسەر جێخەوەکە سوار دەکرا، پەردەیەکی بچوکی نەشمیلانەی بەسەرەوە بوو. قەڵەمێکی ناسکیشی بە (تیۆ) دابوو. بەڵێ، باوکە چاودێری هەموو شتێکی دەکرد. (تیۆ) کتێبەکانی خۆی لەفێربونی بیرکاری لاباشتر بوو، (فاتو)ش کە ئەمەی دەزانی هیچ نارازی نەبوو.

ڕۆژێکیان (فاتۆ) ملوانکەیەکی بۆ (تیۆ) هێنا، کە دوپشکێکی ڕەشی پێدا هەڵواسرابوو. کاتێ ملوانکەکەی لە ملی (تیۆ) دەکرد وتی: "باوکم بۆ خۆشبەختی پێیدام، لەملی بکە... تیۆی من... پارێزگاریت لێدەکات". ئەو گیانداره پارێزەرە بەو چاوە سپیانەیەوە شتێکی سەرنجڕاکێش بوو. (تیۆ) لەبارێکدا پەلەپیتکەی لێدەدا بیری لەو خوا سەیرو سەمەرانەی ئەفەریقای دورەدەست دەکردەوە، کە چاودێری ماڵی ئەمیان دەکرد، ئەو ئەفەریقایەی (تیۆ)ی تێدا لەدایك ببوو.

لەو ڕۆژەدا (فاتو) پێکەنیبوو، بەڵام پاش ئەوە هەرگیز. (تیۆ) بەسەختی نارەحەت بوو. لەهەمووی خراپتر ئەوەبوو دایکی بەهەموو ئازایەتیو خۆڕاگری خۆیەوە لەتاوگریان چاوەکانی ببوە گۆمی خوێن. دیارە (تیۆ) هەموو ڕۆژێ دەرمانەکانی دەخوارد، بەڵام چونکە بەبێ دەستورو ڕێکخستن خرابوە بەردەستی نەیدەزانی کامیان دەخوات. پزیشك بۆتاقیکردنەوەی پێستو چاودێریکردنی پەڵەکانی سەر جەستەیو غودەکەی زۆرجار سەردانی دەکرد. دایکی بە پەرداخێك ئاوەوە حەبەکانی پێدەداو بێ قسەکردن لەسەر لێواری جێگاکەی دادەنیشت. بەیانییەکیان لەدایکی پرسی ئایا دوچاری ئایدز بوەو دایکیشی لەپڕ هەستابوو گوتبوی : نەخێر، کە ئایدزی نییە. ئیتر بەگریانەوە ژورەکەی چۆڵ کردبوو.

نەخێر، ئەوەی دەیزانی ئەوەیە نەخۆشەو لەوانەیە، بەڵێ لەوانەیە بەو زوانە بمرێت، بەڵام نابێت ئەوە لای کەس بدرکێنیت، لەلایەکی دیکەشەوە هێندە دڵنیا نەبوو.

## بەشی یەك

# (ڕوداوێك لەسەر شێوازی پورە مارتا)

### پورە خاتونێکی سەرسوڕهێنەر

هەفتەی دووەم (تیۆ) گەڕایەوە بۆ نەخۆشخانە، بۆ هۆڵی چاوەڕوانی خوێن وەرگرتن. دوبارە هۆڵی چاوەڕوانی، سکان، جارێکی دیکەش هۆڵی چاوەڕوانی، ڕادیۆگراف، ئاکیۆگراف، هۆڵی چاوەڕوانی.... ئەمە تەواو نەدەبوو. (تیۆ) دەترساو هیچ بەرگرییەکی نەدەنواند، گوێڕایەڵ ببوو. درێژیان دەکرد، جۆرەها لولەیان تێڕۆدەکرد، چەسپی بێڕەنگو سارد وەکو سەهۆڵیان لەسینەی دەدا، بەرزیان دەکردەوە، بۆ هۆڵێکی دیکەیان دەگواستەوەو ئیدی بەوجۆرە. هەندێك جاریش دەیپرسی، کە ئایا نەخۆشی هەمیشەیی هەیە، بەلام تەنها وەلامەکەی خەندەیەك کەبەڕویدا دەدرا. پەرستارەکان میهرەبان بونو دایکیشی گەلەك نیگەران. (تیۆ) بۆ هەلاتن لەخەمو دودلی کتێبی ئەفسانەکانی میسری لەگەڵ خۆیدا بردبوو.

- دایکی ئاهێکی هەلکێشا: پێمنالێیت چۆن حەوسەلەت هەیە ئەم بابەتانە بخوێنیتەوە. بۆچی ڕۆمانێکی خۆش ناخوێنیتەوە؟ بۆ نمونە (سێ چەکدار)، ها دەلێیت چی؟.

- هوف۔ خوێندومەتەوە. ئەم خەلکانە تەنانەت بونیشیان نەبوە. (ئاتۆس)و (میلادی) کەسی راستەقینە نین.

- باشە منیش هەرلەبەر وادەلێم! ئەو شتەی ڕاستەقینەو واقعی نییە سەرنجراکێشترە! ئێستاش تۆ پێتوایە ئەم خوایانەی میسر بونیان هەبوە؟.

- (تیۆ) لەژێر لێوەوە وتی: بەلێ، دیارە.

پاشان نغرۆی جیهانێك بوو، کەلەقلەقەکان دانیار بون، شێرە مێینەکان عاشقو گۆشتخۆرەکان دایك. لەگەڵ ئەوەشدا لەکۆتایی ڕۆژدا شەکەتو بەختیار بوو. ئەو ئامێرو

ئـامرازە گـەورەو زەبەلاحانـەی لـە تاریکیـدا دەجـولان، ئـەو بێدەنگییـە قورسـەی دەوروبـەری نەخۆشخانە...

شەوێکیان کاتێك لەنەخۆشخانە بۆ ماڵ گەڕایەوە، باوکی تەلەگرافێکی بۆ درێژکردو گوتی:

- دواجار ڕێکەوت. بەیانی دەگاتەجێ.

- (تیۆ) پرسی: کێ بەیانی دێت؟.

- دایکی وەڵامی دایەوە: پورە مارتا. لە (تۆکیۆ)وە دێت.

(تیۆ) پرسی: بەیانی؟ چیبوە؟

ئیدی هیچ وەڵامێکی نەدرایەوە. خەوانیانو خۆشیان بۆ ژوری خوێندنەوە چون. ئەو ماستە مویەکی تێدابوو. هیچ لە پورە مارتا شاراوە نەبوو.

پورە (مارتا) کەسێکی سەیرو سەمەرە نەبوو. (مارتا فۆرنە) لەتەمەنی بیست ساڵیدا، کاتێك بەپاسکیل بەدەوری جیهاندا دەسوڕایەوە، لەسەر ڕێگای (تایلەنـد) ئاشـنایەتی لەگـەڵ پیـاوێکی ژاپـۆنی پەیـداکردو شـوی پێکـرد. دوای پێـنج سـاڵ کـابرای ژاپـۆنی بەهـەمان شـێوەی سـەیر کەچوبوە ژیانیەوە بەهەمان شێوەش لێیدەرچوو. پورە (مارتا) لەهاوسـەرگیری دووەمیـدا شـوی بە بانکدارێکی دەوڵەمەندی ئوسترالی کـرد، کەلـەکالیفۆرنیاو لـەماوەی نێـوان لـۆس ئـەنجلسو سـان دیـەگۆدا ئاشـنای ببـوو. مارتـاو جـان ماکـاری (هاوسـەرە ئوسـترالییەکەی) لـە (سـیدنی) نیـشتەجێبون. جگـە لەجەژنـەکانی کۆتـایی سـاڵ ئیـدی هـیچ هـەواڵێکیان نـەبوو. پاشـان (جـان ماکـاری) بـەڕوداوێکی ئۆتۆمبێـل مـردو پـورە مارتـاش بـە سـامانێکی زۆرەوە دوبـارە بێـوەژن کەوتـەوە. بـۆ پیرۆزڕاگـرتنی یـادی (جـان ماکـاری)، کەبەپەرسـتن دەیپەرسـت، بڕیاریـدا ئیـدی شونەکاتەوە. چونکە وەجاخ کوێریش بوو، لەهەموو شوێنەکانی جیهانەوە دیـاری بـۆ بـرازاکـانی دەنـاردو خۆشەویـستیەکەی نـەزری ئـەوان کردبـوو. کیمونـوی ژاپـۆنی بـۆ کـچەکان، ڤیتـامینی ئەمریکی، چەقۆی ژاپۆنی بۆ لەتکردنی ماسی، بوکوڵەی ڕوسـی، پـیرۆزەی چـینیو ئەندەنوسـی، داودەرمان... پورە مارتا داهێنەرێکی بەورە بوو. لەڕاستیدا هەمیشە خەریکی سەفەرکردن بوو. پاش ئەوەی بێوەژن کەوت بیری لەخوێندنی زمانەکانی خۆرهەڵات کردەوەو کەوتە لێکۆڵینـەوە لەدابونەریتەکان. پورە مارتا هیچ پێویـستی بـەکارکردن نـەبوو، بـەڵام ئـارەزوی دەکـرد هـەموو جیهان تەی بکاتو ئـەوەش مایـەی خۆشـحاڵی خێزانەکـەی بـوو. (مارتـا)، کەبەئاشـکرا ژیـانێکی تایبـەتو هەسـتێکی گـەلێك ئـاڵۆزی هـەبوو، لەهـەموو گۆشـەیەکی جیهانـدا هـاوەڵی بۆخـۆی

دروستکردبوو. سەرەڕای سەرسوڕمانو نیگەرانی (میلینا)ی براژنی، کە بەغەیبەتکردنی خەڵکی تاوانباری دەکرد، هەموو شتێکی دەربارەی هاوەڵەکانی دەدرکاند.

پورە (مارتا) گردە ژنێکی کەمێك گۆشتنو چالاك بوو، وەکو جۆکەری ناو کاغەزی یاری خۆی دەگۆڕی. حەزی بەخشڵ بوو، جگەرەی درێژی دەکێشاو مەشقی یۆگای دەکرد. ژنێکی گەلەك سەرنجراکێش بوو، بەڵام باوکی بەکەمێك ئەقڵ سوك دایدەنا، کاتێك کارێکی سەیری بەرچاو بکەوتایە دەیوت: (ئەها.. ئەم ڕوداوەش لەبەزمەکانی مارتا دەچێت). (مارتا)یان بەدەگمەن دەبینی،بەڵام تەلەفونی زۆر دەکرد. بەتایبەتی کاتێك گەشتی بکردایە بۆ نمونە دەیگوت: (مانگێکی دیکە دەگەم). ڕۆژی دواتر دەیگوت: "هەینی سەعات هەشتی شەو بەفرۆکە لەتۆرینتۆوە". جادەکرا پورە مارتا بەبێدەنگیو هێمنی بگەڕێتەوە؟ دواینجار کە هاتنەوەی ڕاگەیاند لە پرسەی باوەگەورەیدا بوو.

بە دڵنیاییەوە پورە مارتا لەنەخۆشییەکەی تیۆ ئاگادار کرابوو.

## پورە مارتا دەگات

بەشاڵێکی هیندییەوە، کەتوند لەخۆیەوە پێچابوو، بەگرانی لەسەر قەنەفەکە ڕۆنیشتو ڕایگەیاند:

- منالآن وابزانم سەرمام بوە. (میلینا) دەتوانیت دەنکێك ئەسپرینم بدەیتێ؟ (ئیرن) دەکرێت چایەك دەم بکەیت... ئازیزم؟ سەیری ئەو جانتا گەورەیە بکە پاکەتێك چای ژاپۆنی تێدایە، چای سەوز. (ئاتی) لەجانتا دەستییەکەمدا بەستەیەك ئاوریشمی ڕەنگ سوری تێدایە هەڵیگرەو لەژورەکەی خۆتدا بیکەرەوە، بەڵام تۆ (تیۆ) ...

(تیۆ) لەسەر قەنەفەیەکی هۆڵەکە درێژ ببوو، بە نیگەرانییەوە بۆی دەڕوانی. هەموان بەبێ دەربڕینی نارەزایەتی شوێن فرمانەکانی پورە (مارتا) دەکەوتن، تەنانەت (ئایرن)یش کەحەزی بە چا سازکردن نەبوو. پورە (مارتا) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی:

- بەڵام دەربارەی تۆ دوایی گفتوگۆ دەکەین. باشە گاڵتەمان لەگەڵ دەکەیت ها؟ نەخۆشیت؟ ڕاستم پێبڵێ، ڕاستە یان بۆ ڕابواردنە؟.

- (تیۆ) کە یاری بەقژەکەی دەکرد وتی: چوزانم!

پورە (مارتا) بەبەرگە نیوەڕوتو كڵاوە شێوە نیپاڵییە نەخشێنراوەكەیەوە زیاتر پێكەنیناوی دەركەوت. چونكە مێشكی (تیۆ)ی خوێندبۆوە بەقوڵی بۆی دەڕوانیو (تیۆ)ش هەستی بەگوناهە كرد، بەپەلە وتی:

- پورە مارتا ڕاست دەڵێم هیچیان بەمن نەوتوە، هیچ.

- پورە خاتون وتی: دواجار شتێك دەزانیت، بیرۆكەیەكت هەیە؟.

- (تیۆ) بڵماندی: بەڵێ.

- باشە.

پورە (مارتا) بە نیگایەكی دروستەوە چاوی لەسەر (تیۆ) لانەدەداو (تیۆ)ش لەپڕێكدا دەستی بەگریان كرد. پورێ لەبارێكدا ئەوی لەباوەش گرتبوو ئاهێكی هەڵكێشاو گوتی: " لەو بڕوایەدایت منیش بەهەمان شێوە بەبێئەوەی كارێك ئەنجام بدەم دەتوانم پشوو بدەم؟".

(تیۆ) هەروا دەگریاو پورە (مارتا)ش نەوازشی دەكرد. لەناكاو دوری خستەوەو گوتی:

- هەستە سەر پێ!

- (تیۆ) لە دڵەوە وتی: مۆڵەتم پێنادرێت !

- بۆخۆیان وتیان. پەلەكە ! هەستە !

(تیۆ) وەك ئەوەی كارەبا لێیدابێت ڕاست ڕاوەستاو دەستەكانی بڵاوكردەوە. پورە (مارتا) بەرەزامەندییەوە وتی:

- باشە دەبینی؟ نەخێر پێویست ناكات دوبارە بكەویتەوە.. كەمێك بڕۆ... فەرموو زۆر باشە، ئێستا هەڵبەزە.

بەڕاستی پورە مارتا شێت بوو.. هەڵبەزو دابەزكردن؟ ئەوەش لەكاتێكدا منالێ نەخۆشو كەوتوی سەرجێگایەو دەبێت پشوو بدات. ئەی باشە پاش هەموو ئەوقسانە بۆچی نا؟. (تیۆ) باش هەڵنەبەزییەوە. پورە (مارتا) لەبارێكدا جانتایەكی فەرامۆشكراوی پیشانی (تیۆ)دا وتی:

- باشە، خراپ نەبوو، بەڵام بەهەرحاڵ لەوباوەڕەدای بتوانیت ئەو كۆڵەپشتە هەڵگریت؟

(تیۆ) بەبێ هیچ نارەزایی بونێك، تاویدایە، كەمێك قورس بوو، بەچەپو ڕاستدا دەكەوت.

- كەمێك ئازارت هەیە. لۆژیكانەیە، هەمیشە پاڵ كەوتویت، دەمزانی بەو جۆرەیە.

پورە(مارتا) چۆن بیری دەكردەوە؟ چی لە كەللەیدابوو؟. (تیۆ) كاتی خۆی لەئامێزی هاویشتبوو لەناوكاو هەستی بەهەستێكی سەیركرد لەخۆیدا.

- پورێ، بڵێ بزانم هیچت بۆمن هێناوە؟

- بەمیهرەبانییەوە وتی: بەڵێ.. کوڕەکەم. تۆ هەرئێستا شێو دەکەیت تا ئەوکاتەش بڕۆ خۆت بگۆڕە. حەز ئەکەم (جین)[1] لەبەربکەیت.

- (تیۆ) پرسی: خۆ بۆینباخت بۆ نەهێناوم؟ وانییە، چونکە پەسەندی ناکەم..

- سەرشێت هێندە بەسە ملپێچ بکەیتە ملت. زیاتر حەزم لەوەیە.

## غافڵگیرییەکانی یەکەمین شێوکردن

(تیۆ) کراسێکی سوردەستە جلێکی (جینی خەتمی)[1] و ملپێچێکی ڕەشی هەڵبـژاردبوو. باشـە، ڕەنگەکان تۆخو هەتاوی بون، بەڵام پورە (مارتا) لەو کەسانە بوو دەیتوانی لەدڵی زستاندا هاوین بهێنێ.

(تیۆ) کەبەپێوە ڕاوەستابوو بەڕێکەوت یاری (تـوڕەیی خواکـان)ی لەسـەر کۆمپیوتەرەکـە پێکردو لەگەڵ (پی تی) کەوتە ڕاوێژکردن. (پـی تـی) بەخەنـدە فریـودەرو دروسـتکراوەکەیەوە پێنج تازیاری بۆ (Hint) دانا، کە چارەسەری مەتەڵی ڕۆژەکەی دەکرد. (تیۆ) پێنـج تازیارەکـەی دیاریکردو چاوەڕێی وەڵام بوو: (چانـست نـەیهێنا.. سـەرەتا دەبـوو بەدارسـتانی پـیرۆزدا ڕەت ببیـت). ئـەوە وەڵامێـك بـوو (پـی تـی) بـەئاوازێکی سەرزەنشتکارانەوە بـە (تیـۆ)ی ڕاگەیانـد. دارسـتانی پـیرۆز؟ (تیـۆ) گومـانی هـەبوو هـەمو شـوێنەکان گـەڕابێت... کۆمپیوتەرەکـەی کوژاندەوەو بۆ موبەقەکە چوو. دایکی خەریکی زەڵاتەکردن بوو. پرسی:

- ئەم شەو چیمان هەیە؟

- بۆچی ئازیزم برسیتە؟ سوپی مینیسترۆن، چەرەسات و کێکی میوە.

- کێکی میوە؟

- (میلینا) بە پەشیمانییەوە گوتی: نەخێر، هەرمێ و کرێم باشە.

---

[1]. جین: Jainism، Jain مەزهەبێکە نزیکە دوو ملیۆن کەس لە هیندستان پەیڕەوی لێدەکەن. پرەنسیبی سەرەکیان ئەوەیە، کە نابێت ئازاری هیچ گیاندارێك بدرێت، هەرگیز گۆشتیان بخورێت. بڕواشیان بە دونادون (تناسخ) هەیە، کە سزای چاکەو خراپەی خۆت لەم جیهانەدا دەبینیتەوە. دامەزرێنەرەکەی شازادەیەك بووە بەناوی (واردامانا)، کە لە (٥٥٠ پ.ز) لەسەردەمی (بوزا)دا لەهیندستان سەریهەڵداوە. ڕاسپاردەکانی لەکتێبی (ئاگاما)دا کۆکردۆتەوەو بۆتە کتێبی ئاینی (جین). (ف.ف.عمید)

[1]. خەتمی: دارێکە قەدی گەورەو بڵندەو بەمەترو نیو دەگات. گەڵای پانە، گوڵەکانی سوورو سپین، ڕەگەکانی ئەستوورو شیرینە. هەمووی بۆ کاری پزیشکی بەکاردێت. (ف.ف.عمید)

هەر هێند گۆشتی سووری تێدا نەبێت، بەرنامەکە بەدڵی (تیۆ) بوو. لەماڵەکەدا کەوتە پیاسەکردن. چوو بۆ ژوری (ئایرن)، بەڵام وەك هەمیشە بەتەلەفون خەریکی قسەکردن بوو لەگەڵ دۆستەکەی. (تیۆ) بەئەدەبەوە بەجێیهێشتو وەکو جاران بۆ سەخڵەتکردنی ئاتی) بۆ ژورەکەی چوو، بەڵام (ئاتی) هیچ کاردانەوەیەکی نەنواند. مابوو ژورەکەی باوکی . باوکی بە ساردییەکەوە گوتی: چۆنە؟ بەرێگادا دەڕۆیت؟ نەخێر کارێکی باش نییە، بڕۆ پشوو بدە... بۆ نانخواردن بانگت دەکەین.

(تیۆ) نائومێدانە تا هۆڵەکە لەسەرخۆ ڕۆشتو لەسەر قەنەفەیەك ڕاکشا. شێوکردن کەشێکی خەمئەنگێزی هەبوو. دایکی بەخۆشییەکی دەستکردانەو بەزۆر قسەی دەکرد. (ئیرت) هیچی نەدەخوارد، (ئاتی) یاری بەخواردنەکە دەکردو باوکیشی بێدەنگبوو. پورە (مارتا) هەروا ورتەی نەدەهات. کاتێ تەواوبون دەستی بەقسەکردن کرد. لەگەڵ ئەوەی چاوی بەهەموواندا دەگێڕا وتی:

- (تیۆ) بڕیارمداوە پێکەوە بۆ گەشتێکی جیهانی بڕۆین.

- گەڕان بەدەوری جیهاندا؟ بەڕاستی ئەم ژنە تەواو نییە ! بە دەنگێکی لەسەرخۆ وتی: ئەقڵت لەسەردا نییە؟ ئەی قوتابخانە چی؟.

- پورە (مارتا) وتی: بۆ قوتابخانە کاتی تەواوت هەیە، بەڵام من نەمرنیم. تۆ ساڵێك لەپێش هاوتەمەنەکانتەوە نیت، وانییە؟

(تیۆ) بەسەراسیمەبونەوە لەدایكو باوکی نواڕی، کەسەریان بەسەر قاپی خواردنەکاندا شۆڕکردبۆوەو هیچیان نەدەوت.

(ئیرن)و (ئاتی) وەك ئەوەی پێشتر پێیان وترابێت هەستانو چوونە دەرەوە.

- (تیۆ) ئازایانە وتی: پوریێ من نەخۆشم، لەو بڕوایەدا نیم کە...

- پوریێ هاواری کرد: هەر لەبەر ئەوەمە؛ ئەم پزیشکانە تێناگەن. ئێمە جیهان دەگەڕێینو لەلای خۆمەوە ڕاوێژ بەپزیشکان دەکەین، بەڵام نەك لەنەخۆشخانەکان ! ڕازیت؟).

ئەمەش یەکێك بوو لە کارەکانی پورە مارتا! نەك لەخەستەخانەکان ! کەواتە لەکوێ؟ پورە (مارتا) درێژەی پێدا:

- (تیۆ)ی من، دەبێت بزانیت ئەم گەشتە گەشتێکی ئاسایی نییە بەدەوری جیهاندا. باوەڕ مەکە من حەزم بەگەشتو تیورستی بێت! لەم گەڕانە بەدەوری جیهاندا نەدیواری چین دەبینیتو نە (تاج محل) نە تاڤگەکانی نیاگارا...

- تیۆ بەنەرمی وتی: دایە.. پێی بڵێ!

- پوورە (مارتا) قسەکەی پێبڕی‌و گوتی: نامەوێت تۆ بدزم. دیارە دەزانیت من بەبێ ڕەزامەندی دایك‌و باوکت پێشنیازی لەوجۆرە ناکەم ! ژروم وانییە؟

باوکی بەبێئەوەی قسەبکات بەسەر لەقاندن ڕەزامەندی دەربڕی. بەڵام دایکی ڕای چییە؟

- پورە (مارتا) بەدەنگێکی دلێرانەوە وتی: دەی (میلینا) کەمێك بوێری‌و شەهامەت!

- دایکە لەکاتێکدا سەری هەڵدەبڕی وتی: ڕاستە، تیۆ. ئێمە ڕازین.

- (تیۆ) کە لەخۆشیدا هەر ئەوە بوو باڵنەگرێت وتی: باشە، کەواتە ئیدی چارەسەرکراوم؟

- پورە (مارتا) وتی: هەرچۆنێك بێت هەموو ڕۆژێك تەلەفون دەکەین. لەلایەکەوە تەلەفونێکم پێیە لەتۆکیۆ کرپومە سەرنجڕاکێشە، دەیبینیت. هیچ کێشەیەکمان نابێت.

- دایکی وتی: گەیشتنە هەرکوێ پشکنینی خوێن دەکات. ناوی هەموو نەخۆشخانەکانم لەلایەو.. (تیۆ) ئاهێکی هەڵکێشاو میلینا درێژەی پێدا.. پزیشکی باش لەگشت شوێنێك هەیەو دەبێت داوو دەرمانەکانیش ببەیت‌و...

- پورە (مارتا) نیگایەکی توندوتیژی لە (میلینا) گرت‌و گوتی: ئیتر نامەوێت گوێم لەپزیشك‌و داوو دەرمان بێت! پەلەکە مێزەکە کۆبکەرەوە !.. کچان یارمەتی بدەن !.

پورە (مارتا) فەرماندەرانە قسەی دەکرد. (ئیرن‌و ئاتی) لەپڕ لەژورەکە پەیدابون‌و لەچاوتروکانێکدا مێز کۆکرایەوە.

- خاتوو پورێ دەستوریدا: ژروم، بەیارمەتیت نەخشەکە بکەرەوە. ئێستا پیشانتان دەدەم... ئالێرەوە دەست پێدەکەین....

- (تیۆ) لەپڕێکدا، کە خرۆشابوو، قسەکەی پێبڕی‌و گوتی: ئایا هەرەمەکان دەبینم؟

- هەموو ساتێك قسەم پێمەبڕە! ئاتی لەجانتاکەمدا پولەکەی سووری چەسپاو لەسەر مەقەبایەك هەیە...

- (ئاتی) وتی: ئەی کرملین چی؟.

- پورە مارتا لەبارێکدا پولەکەکانی قایم دەکرد وتی: حەز دەکەیت جەستەی مۆمیاکراوی لینین ببینیت؟ هەر لەئێستاوە با پێت بڵێم ئەوشتانە لەبیری مندا نییە.

- (تیۆ) لە بارێکی سەرسوڕماندا سەیری ئەو پولەکە سورانەی دەکرد لەسەر نەخشەکە قایم دەکرا: ڕۆما، دلف، لوکسور، ... وتی:

- تێگەیشتم! جیهانی سەردەمی کۆن دەگەڕێین.

- پورە (مارتا) وتی: وانییە. سەیرکە، ئەوێ...

- (تیۆ) وشەکانی خوێندەوە: ئێم، تی، سار...

- پورە مارتا ڕاستی کردەوە: ئێم – ڕیت – سار. دەزانم ناوهێنانی گرانە.

- (تیۆ) پرسی: چییە؟ ...

- باوکی چۆ ناو گفتوگۆکەوە: شاری پیرۆزی (سیک)ـەکانە لە پەنجاب.

- بەڵام (سیک)ـەکان کێن؟ ...

- دایکی وتی: پەیڕەوانی مەزهەبێکن تۆ نازانیت.

- (تیۆ) وتی: سەیرە، زۆر لەلام سەرنجڕاکێشە. بەپێی حیکایەتەکانی قوتابخانە هەینی بۆ موسڵمانان، شەمە بۆ جولەکە، یەکشەمە بۆ خەڵکانی دیکەیە. تازە دەڵێیت ئاین‌و مەزهەبەکان ناناسم.

- پورە (مارتا) بەخەندەوە وتی: شش! باشە تۆ بڵێ و ئێمەش گوێ ڕادەدێرین.

- (تیۆ) وتی: جولەکەکان لەهەموان کۆنترن. ڕۆژانی شەمە لە کلێساکاندا نوێژ دەکەن، کە پێیدەڵێن (کەنیسە). لەجەنگی دووەمدا لەلایەن نازییەکانەوە جینۆسایدکران. بەو کۆمەڵکوژییە دەڵێن (شوئاه). لەکۆندا لە (ئۆرشەلیم)دا ژیاون، بەڵام دەربەدەریان کردون. پاشان وڵاتێکیان پێدان کەناوی (ئیسرائیل)ـە، بەڵام بەردەوام دژ بەموسڵمانەکان دەجەنگن.

- پورە (مارتا) وتی: باشە، کەوایە خواکەیان کێیە؟

- (تیۆ) بێدەنگ بوو.

- خاتوو پورێ بە تانەلێدانەوە وتی: ئافەرین... جولەکەکان تەنها یەك خوایان هەیە، کە مافی ئەوەیان نییە لەژێر هیچ ناونیشانێکدا بیخەنە ڕوو یان تەنانەت ناویشی بهێنن. ئەمە دەبێتە بنەچەی یەکەم، پاشان دەڵێن نەتەوەی هەڵبژێراوی خواوەندن‌و ئەویش پەیمانی لەگەڵ بەستون، کە ئەوەش دەبێتە بنەچەی دووەم. چاوەنواری مەسیحن، کە بڕیارە لەکۆتایی دنیادا سەرهەڵبدات، ئەمەش بنەچەی سێیەم. ئێستا بڵێ...

- تیۆ پرسی: پەلە مەکە، مەسیح کێیە؟

- فریادڕەسی جیهان.

- (تیۆ) هاواری کرد: کەواتە هەمان عیسایە!

- نەخێر لای یەهودییەکان.. نا ! عیسا مەسیحی کریستیانەکانەو جولەکەکانیش هێشتا چاوەڕێن.

- (تیۆ) پێی ناخۆش بوو، گوتی: سەبارەت بە موسڵمانان سادەیە، خواکەیان (الله)یە، ئەو گەورەیەو (محەمەد) نێرراوی ئەوە. لەمزگەوتدا ڕووەو مەککە نوێژ دەکەن، کەشاری پیرۆزی موسلمانەکانە. بەدرێژایی تەمەن یەکجار زیارەتی دەکەن، ئەوکاتە دەبن بە (حاجی). موسڵمانەکان (کەشیش - قەشە)یان نییەو (مارابۆ)یان هەیە(پیاوی ئایینی لەهەندێك لە وڵاتانی موسڵمان لەئەفریقا).

پورە (مارتا) وتی: ئەمە باشترە، بەڵام ئەم (مارابۆ)یانەت لەکوێوە هێنا؟ ئەوانە تەنها لەئەفریقادا دەبینرێن.

- بە لەخۆبایبونەوە وەڵامیدایەوە: (فاتو)ی هاوڕێم باسی کردوە. کچێکی موسڵمانی سینیگالییە.

- ئەی مەسیحییەکان چی تیۆ؟

- ئەمانە بڕوایان بە (عیسا)یە. کە لەلایەن ڕۆمەکانەوە لەخاچدرا، چونکە بە (پاشای یەهودی)یەکان ناوزەدیان دەکرد. (عیسا)، کوڕی (خوا - باوك) بوو، کە بۆ شۆردنەوەی گوناهکاران نێررابوە سەرزەمین. عیسایەکان ڕۆژانی یەکشەمان بۆ نزاکردن بەکۆمەڵ بۆ کڵێسا دەچن، نانی فەتیرە دەخۆن. لەکۆتایی سروتەکەدا یەکدی لەئامێزدەگرن. قەشەکان بەرگی سەرنجڕاکێش و نەخشێنراو لەبەردەکەن.

- پورە (مارتا) ئاهێکی کێشاو گوتی: باشە، پەسەندە. تۆ چ جیاوازییەك لەنێوان خوای یەهودی، خوای مەسیحیان و موسڵمانەکاندا دەبینی؟

- (تیۆ) بەدودڵی و گومانەوە وەڵامیدایەوە: جگە لەوەی کە یەهودی و موسڵمانان بڕوایان بەتاکە خوایەك هەیە، هیچ جیاوازی دیکە نازانم. چونکە لای کریستیانەکان دوو خوا هەیەو کۆترێکیش کەبەپیرۆزی.... لەبیرم چوو .... باوکی پیرۆزی پێدەڵێن؟.

- (میلینا) ڕاستی کردەوە: نەخێر ڕۆحی پیرۆز. باش گوێت لەدایە (تیانۆ) نەگرتوە.

- پورە (مارتا) درێژەیپێدا: ئەی ئایینەکانی دیکە؟

- پێشتر ناوی مەسیحی و یەهودی و موسڵمانانی بردبوو. (تیۆ) وتی : پرۆتستان و ئەرتەدۆکسەکانیش، چونکە خێزانەکەی ئەرتەدۆکس بون، ئەرتەدۆکسی یۆنانی... هەروەها بودایی، ئانیمیستەکان (Animistes).

- باوکی وتی: تیۆ، چی ئانیمیستەکان؟

- (فاتو) ئەمەی پێوتوم. ئەمانە بڕوایان بە ڕوح هەیە، هەروەها (فاتو) دەربارەی خوا کۆنەکانی ئەفریقاش قسەی بۆ کردوم. ئانیمیستەکان هەموو جموجوڵێکی ژیان و گوزەران بەدەرئەنجامی بەشداریکردنی ڕوح دادەنێن. مەبەستم ئەوە نییە کە...

- پورە (مارتا) قسەکەی پێبڕی و گوتی: دوای ئەوان....

- دوای ئەوان هیندییەکانن.

- کامەیان؟ هیندیِ ئەمریکی یان هیندی هیندستان؟

- (تیۆ) بێدوڵی وەڵامیدایەوە: هیندییەکانی ئەمریکا[1] چونکە کاسێتی (ڕوحە پیرۆزەکان)م هەیە. لەیەك لەبەشەکانی (تەکزاز رەنجەر – Texas Ranger)دا، ڕەنجەر دەچێتە کوختێکەوە ئاگری گرتوە، چونکە لەبەرچاویدا هەڵۆیەك خۆی بەرجەستەدەکات، کە دەچێتە ژورەوە منداڵێکی بریندار دەبینێتەوە. لەلایەکی دیکەشەوە ئاینی هیندییەکان لەوپەڕی دنیاش لە هیندستان هەیە..بەڵام....

- پورە (مارتا) بەرونکردنەوەیەکی گونجاوەوە وتی: لەهندستان هەشت ئاین. وەك دەبینی نازانیت ئەو ئاینانە چین.

- (تیۆ) سەرکەوتوانە وتی: (زەن ZEN). (ئیرن) هەمیشە دەڵێت ئەو زەنە!

- پورە (مارتا) وتی: زۆر باشە. پەسەندە. ئەی لە بەرازیل؟ (تیۆ) بێدەنگ بوو، سەبارەت بە ئاینی چین وشەی (مایۆییزم)ی درکاند.

- پورە (مارتا) وتی: خراپ نییە، لەوانەیە کەمێك متمانەی لەدەستدابێ، بەڵام باشەو خراپ نییە. دیارە ویستت بڵێی (تایۆیزم - Taoisme) وانییە؟

بەڵام (تیۆ) ئەو وشەیەی نەدەناسی. سەری بەسەر نەخشەکەدا شۆڕکردەوە بەسەرسوڕمانەوە پرسی:

- دارجیلینگ؟ نازانم لەکوێ هەیە! خانەی نەخۆشان نییە؟.

- دایکی وتی: مارتا، نەخۆشخانە، دارجیلینگیش...

میلینا، دووبارە دەست پێمەکە. دارجیلینگ شەش سەعات بەرێگای زەمینی لە (کەلکەتا) دوو سەعات بەفڕۆکە (دهلی)یەوە دوورە. دەوری مێزەکە بێدەنگ بوو.

(تیۆ) وتی: باشە، تێگەیشتم بەدوای ئاینەکانی جیهاندا دەسوڕێینەوە، وانییە؟. هەرواش بوو.

---

[1]. Indians: مەبەست لەهیندییە سورەکانی ئەمریکایە، کە بەسورپێستەکان ناسراون و دانیشتوانی رەسەنن.

## نهێنییەکانی پێش گەشتەکە

بەلام تەنها (بەوجۆرە) نەبوو. بەیانی ئەو ڕۆژە وەك دەڵێن (سەفەر بەدەست خۆمەو گەڕانەوە بەدەست خۆم نییە) پێش هەنگاوی گەشت دەستیپێکرد، بەلام ئەو پێشهەنگاوانە شتێکی سەیرو سەمەرە بوو. پورە (مارتا) خەریکی ئامادەکردنی لیستێك بوو، کە دیارە تەواو سروشتی بوو. لیستی هوتێلەکان، دۆستەکان، شەمەندەفەرەکان، فڕۆکەکان، کەشتییەکانو تا کۆتایی. لیستێکی دیکەش، کە تەنها لەگەڵ کچەکانی برازای قسەی لەسەر دەکرد، بۆچی؟ هەر کە سەرو کەللەی (تیۆ) پەیدا دەبوو (ئیرن) کاغەزەکانی حەشاردەداو (ئاتی) سورهەڵدەگەڕا، بەتایبەتی کە پێستی پەمەیی بوو. ئەو هەموو نهێنی پارێزییە بۆچی؟ (تیۆ) هەوڵیدا شتێك لە (فاتو) هەڵکرێنێ، بەلام بەپێداگرتنەوە وتی:

- تیۆکەی من، ناشێت سوێندم خواردوە ئەوە ڕازێکە.

- دەربارەی نەخۆشییەکەمە؟ داودەرمانی جۆربەجۆرە؟

- (فاتو) هاواریکرد: نەخێر، بەهیچ شێوەیەك. زۆر لەوانە سەرنجڕاکێشترو سەرقاڵترە!

لەنەخۆشی سەرنجڕاکێشتر؟ لەڕاستیدا (فاتو)ش دەستەواژەی سەیری بەکاردەهێنا! وەك ئەوەی شتێك هەبێت بتوانێت لای (تیۆ) سەرنجڕاکێشو مایەی سەرقاڵی بێت، ئەویش لەکاتێکدا کە دەیزانیو لەوانەشە لەماڵەوە... نەخێر، نەیدەویست بیر لەمەرگ بکاتەوە. بێگومان مردن شتێکی خراپە ئەگینا هێندە ترسهێنەر نەدەبوو. ئازارو ئەشکەنجەیەکی گەورەو پاشان.... (تیۆ) دەیزانی پاش مەرگیش سەفەرێکی درێژو تۆفانی پڕلەگرفتاریو دژواری لەپێشدەبێت. ئەگەر بڕوا بەباوەڕەکانی تبتیو میسرییەکان بهێنین ژیانی پاش مەرگ گەمەیەکی چێژدار نییە. گومان دڵی (تیۆ)ی گوشی. لەهەمووی خراپتر ئەوە بوو دایکی نەیدەتوانی بەرگەی مردنەکەی ئەم بگرێت. لەوانەشە ئەو کاتە ئیدی (تیۆ) ئەو نەبینێتەوە. نەخێر! تاکە ڕێگا چارەسەر ئەوەبوو نەمرێت.

- پورە (مارتا) هاواری کرد: وتم قالۆنچە نەك کیسەڵ. لەلیستەکەدا نوسیبوم. دەبێت دوبارە بۆ مارکێتەکە بگەڕێیتەوە!

- زۆر باشە. چی ڕویداوە؟ دەچم ئەو خشڵانەت بۆ پەیدادەکەم. بۆ کام قۆناغی سەفەرەکەیە؟

- بۆ شاردنەوەی ئەوە...

(تیۆ) بەحەزی ئەوەی شتێك تێبگات سەری بەهۆڵەکەدا کرد. پورە (مارتا) ڕستەکەی قوتدایەو گوتی:

- دەڕۆیتو لەسەر جێخەوەکەت ڕادەکشێیت، فزوڵی!

(تیۆ) ماوەیەك بیری لەوەکردەوە بۆچی پورە (مارتا) دەیەوێت قالۆنچەیەك لەشوێنێکدا بشارێتەوە. چوو بۆ دۆزینەوەی لیستەکە، بەلاّم هیچی دەستنەکەوت، تەنها ئەوەی بینی، کە پورە (مارتا) جانتا گەورەکەی لۆك کردووەو بوخچەیەکی داخراویشی پێوەکردوە. بەکورتی بۆنی پلانگێڕان دەهات، لەوانەیە بوخچەکان دیاری بن، شتی پێشبینی نەکراو؟

مانگێکی بۆ سەفەرەکە مابوو. پورە (مارتا) کاتەکانی خۆی لەئاژانسەکانی سەفەرکردندا بەسەردەبردو خۆرئاوا بەخرۆشاوی دەگەڕایەوەو بۆنمونە دەیگوت: " دەبینیت؟ هیچ جۆرە پەیوەندییەکی ئاسمانی لەنێوان (باگدوگرا)و (جاکارتا)دا نییە... دەبێت لە کەلکەتاوە بڕۆین! شتێکی سەیرە!" یان بۆ نمونە لەو هوتێلەی دەیویست جێگا دەستنەدەکەوت یان هوتێلەکە داخرابوو یان هەر نەبوو.... تا دوایی.... لە دەرەوەی ماڵەکەوە بەتەلەفونە تایبەتەکەی قسەی لەگەڵ شوێنی سەیرو سەمەرە دەکرد، بە ئینگلیزیو ئەڵمانی، بەشێوەزمانی لێدوانی قورس قسەیدەکرد، لەنێو گفتوگۆکانیشدا جارجار هاواری دەکرد:

- مهانەتجی — Mahantji (بە ئینگلیزی دەکەوتە گفتوگۆ) خۆشحالّم گوێم لەدەنگت دەبێت. بەڵێ، دێم. نەخێر، ئێستا لە (پاریس)م — نێ لە (بنارس) جێگا هەیە؟ ئۆکەی (OK)، بەلاّم تەنهانیم. برازاکەشم لەگەڵمدا سەفەر دەکات. یەس (Yes) ... لێرەدا دەنگی خۆی نزمکردەوە.

کاتێ پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوپەڕی جیهان دوایی پێدەهێنا، بەڕەزامەندییەوە لەخۆی دەڕوانیو وەك ئەوەی لەگەڵ کەسێکی تایبەت بدوێ دەیوت: (مهانتجی) خۆشحاڵە. کەس نەیدەزانی (مهانتجی) کێیە؟ بەلاّم پورە (مارتا) خۆشحاڵ دەردەکەوت و کەس زاتی نەدەکرد پرسیاری لێبکات. بەتایبەتی کە هەموو ڕۆژێك بەتەلەفون ناوی خەلّکی نەناسراوی ڕادەگەیاند، کە بەسەردانەکەی پورە (مارتا) خۆشحاڵن، مۆدمەزێل ئۆپنهابیەر، مادام نەسرە، ڕابی ئالیئەزر. لەدەفتەری ئەدرێسەکان ورد دەبۆوەو دەیوت: (باشە! لەبەرازیل بروتوس کارنرۆ داسیلڤا بوو).

باوکی (تیۆ)، کە لەوەزارەتی دەرەوە ئاشنای هەبوو، خەریکی ڤیزا بوو بۆ کوڕەکەی، کە کارێکی ئاسان نەبوو. (میلینا) زۆری لەخۆی کردو سەردانی بەڕێوەبەری قوتابخانەی کرد.

بەڕێز (دیۆپ) باوکی (فاتۆ)بوە ڕێنیشاندەری ڕێگای سەفەری ئەفریقا. (تیۆ) بەهۆی ڕاوێژکردن لەگەڵ (پی تی) غەیبزانی کۆمپیوتەرەکە، گومان و دودڵییەکانی خۆی دەڕەواندەوە.

## پی تی پەیامێك دەدات

غەیبزانی زرنگی کۆمپیوتەرەکە هیچی دەربارەی ئەمڕۆژانە نەدەوت. (تیۆ) بەخێرایی سەرقاڵی ئەو ئەزمونانە بوو، کە لەبەریکردبون: پێدانی ئەڵماسێك بەهەژارێك، دانانی پارچە شیرینییەك لەبەردەم میحرابێکدا، دەرکەوتنی مارێك، کە فێری زمانی ئاژەڵانی کردبوو. بەخێرایی قارەمانی مەیدانەکەی بەرەو سەرەوەی لاپەڕەکە برد. بەوردی لەناو قەڵەمڕەوی مردوەکاندا بەرەلا بوو. (تیۆ) هیچ حەزی بەو شوێنە نەدەهات. پاشان چوە ناو دارستانەکەوە.... دارستانێکی چڕی تاریك، کە تا ئێستا لەهیچ کۆمپیوتەرێکدا نەبینراوە. دارستانی پیرۆز!

(پی تی) چاوێکی داگرت و پەنجەی خستە سەر لێوی و ئینجا وەك هەمو جارێك پەیامەکەی دوبارەکردەوە: (پێنج تازیار...)، (تیۆ) بیریکردەوە، زۆر باشە پێنج تازیار دەدەم، پیرەژن قسەبکە.

- (پی تی) وتی: (ئەنگوستیلەیەك لەگەڵ خۆت ببەو بچۆ خزمەت پاشا...).

(پی تی) لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکە نەماو جێگەی بۆ باخێکی گەورە چۆڵکرد، نغرۆ لەڕوناکیو گوڵو خونچە، دەشتێکی خەیاڵاوی یۆنانی ژێر درەختی زەیتون. لەنزیك پەرستگایەکی وێرانەوە خەیاڵێك چاوەنوارِ بوو. بەدەنگێکی تێکشکاوەوە پرسی: (موستیلەکەت پێیە؟ ئەگەر موستیلەکەت پێیەو ئەگەر چاوت بە پاشا کەوت، نامریت و خێزانەکەت بۆ دەگەڕێتەوە، ئەگینا،....)

بەڵام (تیۆ) ئەنگوستیلەی پێنەبوو، سکرینی مۆنیتەرەکەش وردە وردە ڕەش هەڵدەگەڕا. کۆتایی یارییەکە. (تیۆ) ئەمجارە دۆڕابوو. یەك دوو جار پەنجەی بەدوگمەکەدا نا، بەڵام ئیدی (پی تی) چاوی دانەگرت، هیچی دەربارەی ئەنگوستیلەش نەدەگوت و ئیدی نە خەیاڵەکەو نەدەنگە تێکشکاوەکە دەرنەکەوتن. زۆر نارەحەت و سەغڵەت بوو.

## نۆیل لەپێش ڕەسەوە[1]

[1]. نۆیل: مەبەست لەجەژنی لەدایکبوونی حەزرەتی مەسیحە.

دوو ڕۆژ زیاتری نەمابوو، ئیتر (فاتۆ) ماڵەکەی چۆڵنەدەکرد. دواین شەو لەموبەقەکە هەراو بگرمیەکی زۆر هەبوو، بەلام ڕێگە بە (تیۆ) نەدەدرا بەشداری بکات. بیست دەقیقە پێش شێوکردن باوکی پێیڕاگەیاند: (خۆت بگۆڕەو ئامادە بە !). باوکی (تیۆ) خۆی بەرگی (ئەسموکینگ)ی پۆشیبوو، وەك ئەو شەوانەی بۆ ئۆپرا دەچوو. (تیۆ) پەسەندیکرد : پانتۆلێکی ڕەش و تیشێرتێك، کە وێنەی بەورێکی لەئاودا لەسەر چاپکرابوو، هەروەها ملوانکە دوپشکەکەی (فاتۆ)ش لەملیابوو.

کاتێك دەرگای ژوری نانخواردنیان کردەوە دەتگوت جەژنی نۆیل بەپاکراوە. (ئیرن) بەرگێکی قەشەنگی سوری پۆشیبوو، (ئاتی) خۆی بەچەشنی سەماکارانی بالیە ڕازاندبۆوەو پورە (مارتا)ش عەزییەکی ڕەشی بەژن نەخشێنراوی لەبەرکردبوو، (فاتۆ) .... ئاخ ! (فاتۆ). بەرگێکی ئەفریقی لەوەی (تیۆ) حەزی پێدەکرد لەبەرکردبوو، کەچەند بازنەیەکی ئالتونی لەهەندێك شوێن تێدا نەخشێنرابوو. لەسەر مێزی نانخواردن کەوکەس (خواردنی تایبەتی تونسی) ئامادەکرابوو. لەگۆشەیەکی ژورەکەدا دارکاجێکی ڕازاوە لەسەر نمونەیەکی بچوککراوەی تەویلەی[2] مەسیح بەرچاو دەکەوت...

- واری کرد: بەلام خۆ هێشتا نۆیل نەهاتوە!

- (میلینا) وتی: بڕیارمانداوە بەپێشوازییەوە بچین! ئەمشەو کاجو دیاری ئامادەکراوە،

- ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: لەوانەیە بەو بۆنەیەوە بێت،کەمن تا نۆیل... دەمەوێت بڵێم....

- پورە مارتا قاقایەکی کرد: سەرشێت، ئێمە لەکاتی جەژنی نۆیلدا خەریکی گەشتین !

- (تیۆ) بەگومانەوە پرسی: بۆ نمونە لەکاتی جەژن لەکوێ دەبین؟

- پورە (مارتا) بەجوڵەیەکی نمونە ئامێزانەوە وتی: دەیزانیت، پاشان دەبێت یەکەم قۆناغی سەفەرەکەمان بدۆزیتەوە. تەنها خۆت، وەك پیاوێکی کامڵ.

- (تیۆ) بەدودڵییەوە وتی: بەلام.... بەلام..

- بەلام لەئارادا نییە.لەسەر کۆمپیوتەرە ئەمریکییەکەت ئەو گەمەیە هەیە، ناوی چییە؟ خۆت دەیزانیت، (پی ی)یەکە.

- (تیۆ) وتی: (تورەیی خواکان). باشە پاشان چی؟

---

ڕەس: بەو گەلە دەوترێت، کە لەکۆندا دەڵێن لەسەر روباری رەس نیشتەجێبوون و داری سنەوبەریان پەرستووە. ئەو پەیامبەرەی داوای بڕواهێنانی لێکردوون زیندە بەچاڵیان کردووە.

[2]. تەویلە – واتە (اسگبل) کە لەلاتینی (Stabulom) وەرگیراوە واتە (شوێنی داکردنی چوارپا) – (ف.ف.عمید).

- باوکی وتی: باشە، ئێستا تۆ ئەو گەمەیە لەجیهانی واقیعدا دەکەیت. دەبێت خۆت مەتەڵەکان هەڵبێنیت.

- پورە (مارتا) درێژەیپێداو گوتی: تۆ دەبێت لەهەر شارێکدا شتێك بدۆزیتەوە یان چاوت بەکەسێك بکەوێت. خودی خۆت دەبێت مەبەستی سەفەری ئایندە هەست پێبکەیت.

- (تیۆ) وەڵامی دایەوە: زۆر ئاسانە. هەر ئێستا دەیزانم. ڕۆما، لۆکسۆر، ئەمریت سار، دارجیلینگو دلف. دەتەوێت دوبارەی کەمەوە؟

- پورە (مارتا) بەناڕەزاییەوە وتی: تکایە بەگێلم دامەنێ. سەرەتا من شارەکانم لەسەر نەخشە دیاریکرد گریمانەیەك بوو، کە لەوانەیە سەریان بدەین، دووەم دەبێت تۆ مەتەڵەکان هەڵبێنیت. بۆ نمەونە ئەگەر بەتۆ بڵێم ( بۆ ناو دڵی ئەو شارەی هەرەمی هەیە بچۆ)، چ وەڵامێکم دەدەیتەوە؟

- دیارە، قاهیرەیە!

- (مارتا) سەرکەوتوانە وتی: نەخێر، پاریسە! لەقاهیرە چەندین هەرەم هەیە، لەکاتێکدا لەپاریس تەنها یەك هەرەم هەیە، ئەویش دەکەوێتە بەرامبەر مۆزەخانەی (لۆڤەر)و .... کڵێسای (دڵی پیرۆز)[1] لەمۆنمارتنە لە پاریس. بیرت لەمە نەکردبۆوە. وەك دەبینی ئامانجەکە هێندە سادە نییە....

- (تیۆ) بە پەرێشانییەوە وتی: نەخێر، هیچ نازانم! هیچ ناکەم!

- نەخێر نابێت هیچ نەکەیت. یەك بوخچە کتێبم بۆ ئامادەکردویت. هێندە کارت بەسەردا دەکەوێت فریای سەرخوراندن ناکەویت. لەو بارەیەوە منو دایكو باوکت پێکهاتوین.

- (تیۆ) بەدەنگێکی خەفەتاوییەوە وتی: ئەگەر شەکەتو تەمەڵ بوم بۆ ماڵ دەگەڕێینەوە؟

- هەرگیز، هەرکات شەکەت بویت دەتوانیت تەلەفۆن بۆ (فاتۆ) بکەیتو ئەو هێمات پێدەدات. دروست وەك (پی تی) ناو کۆمپیوتەرەکە.

(فاتۆ)و (پی تی)! ئەمە لە هەموو شتێك خۆشتربوو. (تیۆ) لەخۆشیدا پێی بەزەوی نەدەکەوت. باشە لەو بارەدا دەتوانیت هەموو شتێك بزانیت... هەستا تا (فاتۆ) ماچ بکات، کچەکە، کە خۆی بۆ دواوە دەکێشایەوە، وتی:

-- بەڵام وا مەزانە هەموو شتێکت پێدەڵێم !.

[1]. مەبەست لە کڵێسەی (Sacre - Coeur)ی بەناوبانگە لەگەڕەکی مۆنیمارترە لەپاریس، کە لەبینا بەناوبانگەکانی پاریسە.

- (تیۆ)، کە ئەوی بۆ ژورەکەی خۆی کێشدەکرد، وتی: نا.. نا، تەنها بە ئەندازەی پێنج تازیار پێمبڵێ.

- (میلینا) هۆشیاریدا: مەڕۆن! هێشتا میوە نەخوراوە.

- (ژروم) وتی: وێڵیان کە! ماوەیەکی دورودرێژ لەیەك دادەبڕێین. ئەگەر ئەو دورییە بۆ هەمیشە نەبێت. ئنجا(ژروم) پاش پێنج خولەك چوو بەدوای (تیۆ)و (فاتۆ)داو گوتی:

- ئێستا کاتی دیارییەکانی (تیۆ)یە....

(تیۆ)، کەلەسەر چۆك ڕۆنیشتبوو، کەوتە گەڕان بەژێر درەختی کاجو ناو تەویلەکە، پەیکەری بچوکی ولاغەکانی فرێدا، گاکەی خستەسەرپشت. پاشاکانی مەجوسی هەڵدایە کەنارەوە، لەسەرخۆ مریەمو یوسفی بە هێواشی ئاڵوگۆڕکردو عیسای بچوکی هەلگرت. بەستەیەك دیاری لەژێر تۆپەڵە (کا)یەکدا بوو. بلیتی فرۆکەیەکی پاریس – تەلئەبیب، پلەیەك- بەسەراسیمەبونەوە وتی:

- هەر ئەمەیە؟

- پورە (مارتا) بەنارەحەتییەوە لەژێر لێوەوە بڵماندی: لەوە زیاتر چیت دەوێت؟

- باوکی وتی: (تیۆ) ئەوانی دیکە لەجانتاکاندایە. دیارییەکانت لە ئۆرشەلیم دەبینیت. ئەوەش یەکەمین تاقیکردنەوەت دەبێت.

- هاواریکرد: نەخێر ئەمە ڕاست نییە! بۆچی؟ بێئەوەی هیچی دیکە بڵێت دەستی بەگریان کرد. (میلینا) ڕایکرد بۆ لای.

- (تیۆ) بەهەنسکەوە وتی: دایە من دەڕۆم...

ئەو چەند وشە سادەیەی (من دەڕۆم) ئەشکی زانە چاوی هەموان، چونکە هەمویان واتای دیوەکەی دیکەی ئەو ڕستەیەیان دەزانی. واتایەك کەس نەیدەویست بیری لێبکاتەوە، یان هەموان ڕێگرییان لەو بیرکردنەوەیە دەکرد.

- (تیۆ) هەروا دەکوڕوزایەوە: دایکە، دایکە.... کاتێك دایکی بە نوازشکردنەوە بۆ ژورەکەی بردەوە، بەدایکی وت: دایکە، تکا دەکەم یەکێك لە ئەنگوستیلەکانتم بدەرێ، تەنها یەك دانە هەرکامیان بێت....

- (میلینا) تیامابوو. پرسی: یەك ئەنگوستیلە؟

- بەڵێ، یەك ئەنگوستیلەی تۆ، تکات لێدەکەم....

(میلینا) بەدودڵی و گومانەوە لە پەنجەکانی خۆی وردبۆوە، کە تەنها لەپەنجەیەکیدا ئەڵقەیەکی ئاڵتونی دەدرەوشایەوە. ئەڵقەی بوکێنییەکەی. لەبەرخۆیەوە وتی: ئەمەیە؟ هەڵبەتە.

دەمودەست ئەڵقەکەی لەپەنجەی دەرهێناو لەپەنجە گەورەی (تیۆ)ی کردو گوتی: (تیۆ) دەزانیت ئەمە ئەڵقەی چییە؟ بێگومان بزری ناکەیت.

- (تیۆ) لەسەرخۆ وتی: سوێند دەخۆم. ئێستا دڵنیام بۆ ماڵ دەگەڕێمەوە. لەکاتێکدا گەنجینەکەی لەناو مشتیدا توند دەگوشی لە دڵی خۆیدا دەیوت (ئێستا ئەو موستیلەیەی پی تی دەیویست لەچنگمدایە). موستیلەی مارەیی دایکم بۆ باوکم. دڵنیاترین تەلیسمەکانە.

هۆی سەفەرەکەش بەشێك لەو نهێنیانە بوو، کە بەدڵنیاییەوە پەیوەندی بەو پزیشکە سەیرو سەمەرانەوە هەبوو، کە لەنەخۆشخانەکاندا نەبون. بەڵام مەگەر پورە (مارتا) بڕوای بە موعجیزە بێت! ئەم سەفەرە دروست لەسەر شێوازی یەکێك لەمۆدێلە سەیرەکانی پورە (مارتا) بوو!

ئەوەی (تیۆ) باش دەیزانی ئەوە بوو، کە بەهیچ شێوەیەك چارنەکراوە. زۆر نەخۆشەو هیوایەکی گەورە بەو گەشتەوە بەستراوە، هەروەها ئەوەش باش دەزانی، کەئەگەر بڕیار بێت مرۆڤ گەشت بکات بۆ سەفەرکردن واباشترە لەم جیهانەدا لەگەڵ پورە (مارتا) گەشت بکات تانەوەی سەفەر بۆ دونیایەکی دیکە بکات. شتێکی دیکەشی دەزانی، ئەویش ئەوە بوو کاتێك سەرقاڵی هەڵهێنانی مەتەڵەکان دەبێت خێزانەکەی لەپاریس سەرقاڵی گریان دەبن!

خەو لەچاوەکانی تۆرابوو. ئێستا، کەموستیلەی لەپەنجەدایە (پی تی) ناو کۆمپیوتەرەکە چی دەڵێت؟ دەتوانێت لەقەڵەمڕەوی پاشای مردوەکان خۆی لابدات و نەکەوێتە دەستی (هادس)[1] ی دەرگاوانی ڕەزاقورس و ناشیرین و ترسناك، کەناوی (شارون)[2]ـە.

هێشتا دەلەرزی ، کە پورە (مارتا) درزی خستە دەرگاکەو سەری کێشایە ژورەوە. (تیۆ) بەدەنگێکی پڕ لەگومانەوە وتی:

- پورە (مارتا) دەمەوێت شتێکت لێبپرسم. ئایا بەم زوانە دەمرم؟

- پورە (مارتا) کە قژە لولەکەی ئەمی نوازش دەکرد، وتی: کوڕەکەم، ئەم پرسیارە قەدەغەیە.

---

[1]. هادس – Hades– لە ئەفسانە یۆنانییەکاندا بەرامبەر پلوتۆنە – Pluton– لە ئەفسانەی ڕۆمەکاندا خوای مردوەکان و قەڵەمڕەوی ژێر زەوییە. کوڕی کرونوس و ریایە و بەو جۆرە برای زیۆسی خوای خواکانە.

[2]. شارون – Charon– لەئەفسانەی یۆناییندا کوڕی تاریکەکان و شەوە. کارمەندی پەڕینەوەی مردووەکانە لە ڕوباری (ئەستیکس – ڕوباری دۆزەخ) بەرەو سەرزەمینی (هادس).

## بەشی دوو

## ( ئۆرشەلیم )

چ سەفەرێکی غەمئەنگێزە! لەفڕۆکەخانە (میلینا) بەئاستەم دەیتوانی ڕێگری لەرژانی ئەشکەکانی بکات. (ژروم)، کەچاوێکی هەر لەسەر ئەو بوو، باسکی گرتبوو، ئەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بوترێت، کەهەم (میلینا)و هەم (تیۆ)ش ئازایانە ڕوبەڕوی دۆخەکە دەبونەوە، هەردوکیان لەبێدەنگییەکی تەواودا دانیان بەخۆیاندا گرتبوو تا دادو فیغان نەکەن.... خۆشبەختانە (فاتۆ)، کەپرچەکانی بەملاولادا هەڵدەسوڕان، توانی کەشەکە بگۆڕێت، ڕوو بە(تیۆ) وتی:

-دەبێت ئەو جانتایانەی لەفڕۆکەکەدا بەگەشتیارانی دەبەخشن بۆ منی بێنیتەوە. دەزانیت چییە؟ جانتایەکی بچوکی قوماشە، کە پێڵاوی کەتانیو فلچەی ددانی تێدایە. هەمووی بۆ من کۆبکەرەوە !

(تیۆ)، کەسەری هەڵبڕی وتی: باشەو چیدیکە؟

- سابونی بچوك، شامپۆی هۆتێلەکان. نمونەی شوشەی بۆن، ئا... پاشان لیستی خۆراکەکانیش.... تکا دەکەم.

- زۆر باشە، بەزۆری تەلەفۆنت بۆ دەکەم....

- تەنها پێنج تازیار! ئێستا من (پی تی) تۆم... وەرە باخواحافیزی بکەین.

لەفڕۆکەکەدا پاش خواردنی چەند شیرینییەك، کە بۆ ناساندنی میواندارەکانە، پورە (مارتا) سەری بەسەر ڕۆژنامەکاندا شۆڕکردەوەو سەرقاڵی خوێندنەوە بوو... (تیۆ) هەموو دوگمەکانی پشتی کورسی فڕۆکەکەی تاقیکردەوە. گڵۆپەکەی سەر سەری خۆی کوژاندەوە. بەهەڵە جەرەسی بۆ پێشوازی میوانەکان لێدا. کورسییەکەی خستە باری خەوتنو کەوتە پرخە. جارجارە سەری بۆ سەرشانی پورە (مارتا) شۆڕدەبۆوەو ڕادەچڵەکیو پورە (مارتا)ش بەسۆزەوە دەیوت (بنو، تیۆ گیان).

بەڵام دودڵی بەجۆرێك چنگی لەناخی گیرکردبوو ئەستەم بوو بتوانێت بەباشیش هەناسەبدات! بیری لە ئۆرشەلیم دەکردەوە، کە زۆرجاران لەوێنەی گومەزێکی ئاڵتونیدا لە پشتی بێژەری تەلەفزیۆنەوە بینیبوی. دورتر لەوەش منارە زۆر سپییەکان، زەنگەکانو میچە خۆڵەمێشییەکانی کە هێندەی ئارامبون بەزەحمەت دەتوانرا وێنابکرێت لەژێر ئەوانەدا بارانی تۆپو گوللە دەبارێت! لەگەڵ ئەوەشدا پەیامنێری سەربازی هەمیشە باسی لە پێکدادانو مەبەستەخراپو پرۆسەی ئاشتی دەکرد. پرسی:

- پورە (مارتا) ئەو گومەزە ئاڵتونییەی بەسەر سەری ئۆرشەلیمەوەیە چییە؟
- قوبە، بەردە، یەکێك لەپیرۆزترین شوێنی موسڵمانانە.
- بەڵام جولەکەکانیش لە ئۆرشەلیم کەنیسەیان هەیە! کەواتە کەنیسەکانیان لە مزگەوتی موسڵمانان بچوکترە؟
- یەکەم گومەزە بەردینەکە مزگەوت نییە، دووەم جولەکەکانیش لە ئۆرشەلیم پەرستگایان بۆخۆیان دروستکردبوو، بەڵام ئەو پەرستگایە لەسەردەمێکی زودا وێران بوو. گوێبگرە دەست مەکە بەپرسیارو سەرم لێبشێوێنی!
- باشە بەلای کەمەوە پێمبڵێ بۆچی دەبێت سەفەرەکەمان لەئۆرشەلیمەوە دەستپێبکەین؟

پورە (مارتا) وردو توندوتۆڵانە وتی:

- لەبەرئەوە ئۆرشەلیم لەتەواوی شارەکانی تری جیهان پیرۆزترە، شکۆمەندترین، پڕخرۆشاوترینو پارچە پارچەترینە! کەمێك بیر بکەرەوە! لەسەر چیایەکی ئەم شارە بوو، کە لەسەدەی هەشتەمی پێش کاتی ئێمە (زاینی) (سلێمان پاشا) پەرستگای تاکەخودایی دروستکرد، کە چەندین جار وێران کرا. پێشئەوەی ڕۆمەکان بەتەواوی لەگەڵ خاك یەکسانی بکەن، چەندینجاریش تازە کرابۆوە. لێرە لەئۆرشەلیم بوو مەسیح لەگەڵ هاوەڵەکانی(حواریەکان) دەرچوو تا هەواڵی خۆش ڕابگەیەنێت، هاوەڵەکانی لەودەرچونەدا بۆ شانازیکردنی پەلکی دارخورمایان لەسەرسەری (عیسا) ڕاوەشاندبوو، چونکە کوڕی خوابوو لەوێنەی مرۆڤدا. ئەمەش شتێکە کە سەیروسەمەرە دێتە بەردیدە. لێرە لەشاری پیرۆزی جولەکەکاندا بوو، کە ئەویان دەستگیرکرد، دادگاییان کردو لەسەر گردێك لە خاچیانداو لەهەمان ئۆرشەلیمدا بوو دوبارە زیندوو بووەوە... دواجار لەسەر یەکێك لەبەردە گەورەکانی

ئەو ئۆرشەلیمە بوو، کە موحەمەدی پەیامبەری موسڵمانان بەهۆی (ئەسپی باڵدار- بوراق)ـەوە بەردو ئاسمان هەڵکشا! ئەمەش هێندە بۆتۆ بەسە نازدارەکەی من!

- (تیۆ) بەخاکیانەوە وتی: من نازانم سلێمان پاشا کێیە؟ یان پەیامبەری موسڵمانان بەئەسپی باڵدار بۆ ئاسمان چوو! لەڕاستیدا من زۆر نەزانم، بەداخەوە!

بەلاینی کەمەوە دەزانیت عیسا کێبوو؟

- سەیرە! ئەو لەتەویلەیەکدا لەنێو گوێدرێژو گایەکدا لەدایك بوو، مەریەمی دایکی پاکیزە و یوسفی باوکی دارتاش بوو. لەگەڵ ئەو جیاوازییەی کەخوا باوکی ڕاستەقینەیەتی. پاشماوەی ڕوداوەکە ئاسانە، چونکە مردو دوبارە زیندو بوەوەو لەئاسمان نیشتەجێیە.

- پورە (مارتا) بەزمان گۆڕینەوە وتی: نیشتەجێیە، تکا دەکەم مەسیحیش بۆ ئاسمان چووەو تەنانەت ئەو ڕۆژەش تیایدا چۆتە ئاسمان ناوی هەیەو پێیدەڵێن (ئەسێنشن - Ascension).

- (تیۆ) وتی: ئەگەر باش تێگەیشتبم کەواتە دوان بۆ ئاسمان هەڵکشاون! مەسیحو موحەمەد. ئەی لەنێو جولەکەکاندا کێ؟

- کەس. جولەکەکان باوانیان هەبوو، کە دامەزرێنەربون. پاشاکان، پەیامبەرەکان، پاڵەوانەکان، گەواهیدەرانو فەرمانبەرەکانی جەنگ!. بەلام هیچ کام لەوانە بۆ ئاسمان هەڵنەکێشراون تا بچنە پاڵ خوا! نەگونجاوە! چونکە جولەکەکان ماق ئەوەیان نییە ڕوبەڕوو خوا ببینن!.

- سەیرە! باشە ئەی دەبێت چی بکەن؟

- گوێڕایەڵی دەکەن. لە ئۆرشەلیم خواوەند بەچەند زمان دەدوێت بە زمانی عیبری جولەکە، بەزمانی عەرابی موسڵمانانو بە زمانی لاتینی، ئەرمەنی، یۆنانی کریستیانی... هەندێ جار باش گوێبیستی قسەکانی نابن، چونکە مرۆڤەکان گوێیان گرانەو زیاتر چەنە ئەدەن. زۆرجار بەهۆی جیاوازی زمانەکانەوە لەوتەکان تێناگەنو دەستدەکەن بە کوشتو کوشتاری یەکدی. تۆ چیرۆکی (تاوەر-بورج)ی بابل دەزانیت؟

- (تیۆ) وتی: دروست نەخێر. هێندە دەزانم مرۆڤەکان بیریانکردەوە تاوەرێك دروستبکەن هەتا ئاسمان، هێندە بەرزبوو خوای تورەکرد. بۆچی تورەبوو نازانم؟... بەهەرحاڵ هێندە هەیە زەحمەتی ئەوەی دایە بەرخۆی تاکاری دروستکردنی بورجەکە ڕابگرێت.

- نەخێر. ئەو کارە سادەیەی کەکردی ئەوە بوو خوا زمانەکانی جیهانی داهێنا. تا ئەوکاتە هەموو خەڵکی بەیەك زمان دەدوان و کارێکی سادەبوو هەموان لەیەکدی دەگەیشتن، بەڵام دەیانویست ململانێ لەگەڵ خوا بکەن! ئینجا خوا سزایدان.

یەکێك لەو کارانەی بۆ راگرتنی ئەو کارە زمانی جۆراوجۆری نقارکرد. کاتێك خەڵکەکە دەستیاندایە تەواوکردنی تاوەرەکە لەیەکدی نەدەگەیشتن و کارەکە ڕاوەستا!

- (تیۆ) وتی: باشە، کەواتە ئۆرشەلیم هەمان تاوەرەکەی بابلە؟

- هەم سەنتەری جیهانیشە، شوێنی ئەفراندنی ئادەم، باوکی هەمومان. شوێنێك کە هەموو (با)کان پێشئەوەی بەسەر زەویدا هەڵبکەن لەوێدا سوژدە بۆ حزوری خوا دەبەن.... زۆرجاران لەمنت بیستوە، کەبڕوام بەتاکە شتێکی تایبەت نییە، وا نییە؟ باشە، بەڵام لەسەر بەرزاییەکانی ئۆرشەلیم بارەکە بەجۆرێکی دیکەیە. ئەم سێ ئایینە مەزنەی هەریەکەیان خۆشەویستی و عەشقی خۆی بۆ خوای بەهێزو توانا دەردەبڕێت، ئەم نەفسە شکۆمەندو مەزنەی بەسەر ئەم بەردەکۆنانەدا باڵ لێکدەدات، ئەم زارانەی پێکەوەو جودا لەیەکدی باس لەعیبادەت و شوکرانەبژێری دەکەن...

- (تیۆ)ش وتی: ئەم دەستانەی بۆمب دەچێنن و پەنجە لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکان توند دەکەن... ئەگەر خوا هەیە کەواتە چی دەکات؟ ناتوانێت ئەوانە ڕابگرێت، وانییە؟

- دیارە جیهان ئەو ئامادەییەی نییە. دەڵێن ئەگەر ئێمە شایستەیی کەماڵی ئاشتیمان هەبوایە خواوەندیش دەمودەست پێی دەبەخشین.

- ئەمە وەڵامی پرسیارەکەی من نەبوو. ئەگەر خوا نەتوانێت ئاشتی بەرقەرار بکات، چۆن دەیسەلمێنیت خوایەك هەیە؟

- تۆ بەردەوام ئەو پرسیارە دوبارە دەکەیتەوە! ئاگادارت دەکەم، کە ئەو پرسیارە بێوەڵامە.....

- چۆن دەبێت بونی خوا پرسیارێکی بێوەڵام بێت؟ پێکەنیناوییە؛ کەواتە ملیۆنان خەڵك لەسەر ڕوی زەوی بۆ بڕواهێنان بەبونی خوا چیدەکەن؟ بێگومان هۆکاریان هەیە؟!

پورە (مارتا) هەناسەیکی قوڵی هەڵکێشاو بێدەنگ بوو، فڕۆکەکە بەسەر دەریای ناوەڕاستدا ڕەتدەبوو.تیۆ لەپەنجەرەکەوە لەو دورگانەی دەڕوانی، کەناویانی نەدەزانی، ئاسمان شینێکی هێندە مات بوو، کە (تیۆ) حەزی دەکرد لەقوڵاییەکەیدا نغرۆ ببێت. لەبەرخۆیەوە وتی:

- ئەگەر خوا بونی هەبێت، کەواتە نازانم بۆچی دەبێت بمرم. لەوانەیە نەیەوێت دەست لەوکارەش وەربدات. ها پورە (مارتا) وانییە؟

## جولەکە، کریستیانی و موسڵمانان

فڕۆکەکە خەریك بوو لەفڕۆکەخانەی (لود) لەنزیك ( تەلئەبیب) دەنیشێتەوە؛ پورە (مارتا) پێشبینی کردبوو پشکنین توند دەبێتو هەموو جانتاو کەلوپەلەکان دەگەڕێن. کاتێك پشکنینی پۆلیس تەواو بوو پورە (مارتا) بەرەو ڕوی پیاوێکی شیکپۆش بوەو دەستی بۆ هەڵتەکاند:

- هێی..

- پیاوەکە بەنیشانەی ڕێز کەمێك نوشتایەوە وەڵامیدایەوە: هێی.. مارتای ئازیز!

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: ئای دۆستی ئازەنین چەند گەورەیت نواند کە بۆ پێشوازیمان هاتیت! ئەمە (تیۆ)ی برازامە. (تیۆ) ئەم ژەنەراڵە بلۆێزی فەرەنسایە لە ئۆرشەلیم. (تیۆ) کە خەریکی هەڵهێنانی ئەو مەتەڵە بوو لەمێشکی خۆیدا، کەچۆن دەبێت ژەنەراڵێك باڵوێزیش بێت؟. لەژێر لێوەوە ڕۆژباشێکی لێکرد. ئۆتۆمبێلی تایبەتی باڵوێز بەشۆفێرەوە چاوەڕێی دەکردن. پورە (مارتا) لەپشتەوەو (تیۆ) لەپێشەوە ڕۆیشتنو شۆفێرەکەش ئۆتۆمبیلەکەی بەرەو ئۆرشەلیم ئاژوو.

- پورە (مارتا) بە لاقرتێوە وتی: ئایا ئۆتۆمبیلەکە هەر وەك جاران زرێپۆشە؟

(تیۆ)، کە ئەوەی بە ئەقڵدا نەدەچوو لەدڵی خۆیدا وتی: ئوتومبیلی زرێپۆش، وەك فیلمەکان؟

- باڵوێز وتی: هیوادارم ڕۆژێك دابێت ئەمجۆرە پێشبینیانە پێویست نەبن، بەڵام وەك دەبینیت پاش ڕوداوەکانی دوایی دەبێت زۆر بەتەگبیر بین. فەلەستینییەکان لەژێر ڕكو فشاردا دەژینو یاساخوازەکانیش لەجموجوڵدانو ئارام دانانیشن...

- (تیۆ) هەوڵیدا بەدەنگێکی نەرمو ڕێزدارو بەئەدەبانە بپرسێت: ئەو یاساییانە کێن؟

- پورە (مارتا) بەدەنگێکی بەرز وتی: تیۆ نابێت قسە بەکەسانی لەخۆت گەورەتر ببڕیت!، بەڵام چونکە من سەبارەت بەم سەفەرە قسەم لەگەڵداکردووە، تۆ ئەی دۆستی ئازیز دەتوانیت وەڵامی بدەیتەوە ...

- باڵوێزەکە وتی: باشە، چارەنییە، هەوڵدەدەم. لاوی هاوڕێم.. تۆ لێرە لەمەملەکەتی ئیسرائیلدایت. زۆربەی دانیشتوان جولەکەنو جولەکەبون یان (جودایزم) ئاینی وڵاتە.

- (تیۆ) دوباره قسەی پێبڕیو گوتی: وەك كاسۆلیكەكانی ولاتی ئێمه.

- بالۆیزەكه وتی: لەوەش زیاتر. لەفەرەنسادا دەستور ڕێز بۆ هەموو ئاینەكان بەیەكسانی دادەنێتو مەزهەبی كاسۆلیكی تەنها ئەوەیه، كه زۆرینەی دانیشتوان پەیرەوی لێدەكەن. لێره ئیسرائیل دەستوری نییه. جولەكەگەری ئاینی دەولەته، بەلام ئایینەكانی دیكه مۆلەتیان پێدراوه.

- (تیۆ) وتی: تێناگەم. لەولاتی ئێمه ئاین هیچ كارێكی بەسەر دەولەتەوه نییه، وانییه؟ بەلام له ئیسرائیل وانییه؟

- بالۆیزەكه وتی: بەتەواوی وانییه، لێره ڕێساكانی جولەكه بون بەتوندوتۆلیو یەكپارچەیی پیادەدەكرێن. نمونەیەكتان بۆ دێنمەوه. لەفەرەنسا ڕۆژانی یەكشەممه پشوه، چونكه لای كاسۆلیكەكان ڕۆژی هەستانەوەی مەسیحەو بۆ هەموانیش پشودانه.

- (تیۆ) هەلێدایه: ویك ئێند، دوارۆژ لەهەفتەی پیرۆزه!

- بەلام لەئیسرائیل لەزەردەپەڕی هەینییەوه تازەردەپەڕی ڕۆژی شەممەی داهاتوو هەموو جولەیەك دەبڕن. ئەو ڕۆژه ڕۆژی (شەبات)ـەو ناكرێت گالتەی پێبكرێت... (یاساخوازەكان) واته جولەكه زۆر پەیوەستەكان دەیانەوێت یاسای ئاینی پیادەبكرێت! كه بەهۆیەوه تاكی جولەكه بەدرێژایی (شەبات) هەرخەریكی نوێژو نزا بێتو ماف ئاگركردنەوه، گلۆپ، چێشتلێنانو سواربونی ئاسانسۆری نەبێت. ئەو بڕیارانه بەتوندی چاودێری دەكرێن. بەلام دەبێت ئەوەش بوترێت، كه زۆررینەی ئیسرائیلییەكان نائاینی(سكیولاریزم)ن.

- (تیۆ) وتی: واته بێئیمانن؟.

- بالۆیزەكه وتی: (مارتا)ی ئازیز، ئەم برازایەت زۆر زرنگه، بەلام لاوی دۆستم جیاوازییەكی گەوره لەنێوان سكولاریزمو بێئیمانیدا هەیه: بێئیمان یان (Athe) بەكەسێك دەوترێت بڕوای بەخوا نەبێت، لەكاتێكدا نائاینی یان (لائیك- سكولاریست) بەو واتایه دێت، كەتاكی ناوبراو یاسا مەدەنییەكانی ولاتەكەی پەسەندەو ڕێگا نادات ئاین دەستبخاته هەموو كاروبارێكەوه. تاكەكان دەتوانن كاسۆلیك بن، جولەكه بن، نائاینیش بن. پرۆتستانت بنو نائاینی بن.

(تیۆ) وتی: موسلمانەكانیش دەتوانن بەوجۆره بن؟

- پوره (مارتا) وتی: (تیۆ) هاوڕێییەكی سینیگالی هەیه موسلمانەو ناوی (فاتۆ)یه. بەلام واچاكه بگەڕێینەوه سەر بابەتەكەی خۆمان (یاساییەكان)یان (یاساخوازەكان)

- بالۆیز درێژەیپێدا: جولەکەگەری (جودایزم) ئاین‌و مەزهەبی دەوڵەتی ئیسرائیله، بەلام هەموو هاولاتیان لەسەر یەك شێوە پەیڕەوی ناکەن. هەندێك ئیمان هێنان بەخوای جولەکەو پەیڕەویکردنیان لەلا بەسە، گروپێکی دیکە نائاینین‌و زۆری دیکەشیان ئیماندارو بەبڕوان، کە ئەمان (یاساخوازەکانن)و بیرکردنەوەیان زۆر سادەیە، دەڵێن تائەوکاتەی لەسەررِوی زەوی یەك جولەکە مابێت سەرپێچی لەپشودانی (شەبات) بکات (مەسیح) ناتوانێت بۆ رزگاری‌و ئازادکردنی خەلکی جیهان بگەرِێتەوە، لەبەرئەو هۆیەیە یاساییەکان دەیانەوێت موبەمو، بەبێ کەموزیاد برِیارو یاساکان جێبەجێ بکرێن.

زۆربەی ئەم کەسانە بەرِیش‌و ئەو کلاوە خرِە بچوکەی سەر تەوقی سەر دەناسرێنەوە، کە پێیدەوترێت (کیپا - Kippa).

- (تیۆ) وتی: ئەومیان چییە؟

- بەپێی دابونەریت پیاوی جولەکە دەبێت بەسەری رِوتەوە لەبەردەم خوادا دەرنەکەوێت. زۆربەی ئەو کەسانە (کیپا)، شاپوی سپی یان کلاوی قوت، کە لێوارێکی پێستداری هەیە لەسەر دەکەن.

- بەلام ئەم یاساییانە چ شتێکی زیاتریان گەرەکە لەخەلکی؟

بالۆیز ئاهێکی قولی کێشاو گوتی: دەیانەوێت بەوردترین‌و توندترین شێوە پەیرِەوی مەزهەبەکەیان بکەن، لەوەش زیاتر خەون‌و خەیالی دامەزراندنی ئیسرائیلێکی گەورەیە. ئەمانە نایانەوێت فەلەستینی لەسەر خاکەکەیان بن. بۆ نمونە یەك لەو یاسایانە بوو (ئیسحاق رابین)ی کوشت، چونکە لەگەلْ فەلەستینییەکان ئاشتی کردبوو.

- (تیۆ) وتی: موسلْمانە تیرۆریستەکان کێن؟ ئا... ئەمەیان دەزانم.

- پورە (مارتا) وتی: ورێنە مەکە تیۆ! یەکەم فەلەستینییەکان تیرۆریست نین. دووەم ئەوە توندرِەوەکانن نایانەوێت ئاشتی سەقامگیر بێت، جگە لەوە لێرە فەلەستینی موسلْمان‌و هەروەها مەسیحیشیان هەیە.

- (تیۆ) وتی: راوەستە تێبگەم، فەلەستینی مەسیحی؟ بیربکەرەوە.... سەرەتا لێرە جولەکە هەبوە، دروستە؟.

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: پەیوەستە بەوەی کام سەرەتا. لەسەرەتای سەرەتاوە لێرد (کەنعانی)یەکان ژیاون، کە لەدۆلی (هینۆن)بون‌و خوای هەمەچەشنەیان پەرستودو قوربانیان

بۆداوە تا باران ببارێنێت، زەوی ئاودێری بکاتو زەوی بەرهەمی فرابێت. تەنانەت دەڵێن ئەمانە منالەکانیشیان کردۆتە قوربانی...

- (تیۆ) قسەکەی پێبڕیو گوتی: چی؟ منالی زیدوو؟

- پورە (مارتا) وتی: بەڵام گوێگرە! هەموان ئەو بڕوایەیان نەبوە. بەهەرحاڵ ئەوەی رونە کەنعانییە بتپەرستەکان لەگەڵ قەومێکی بچوکدا پەیمانیان بەست – ئەو قەومە بچوکەش عیبرییەکان بوون – کە تاکە خوایەکیان دەپەرست، بەڵام مافی ئەوەیان نەبوە ناوی بهێنن، تەنها یەکەم وشەی ناوەکەیان دەدرکاند: (YHWH).

- (تیۆ) هاواریکرد: تێگەیشتم (He who dose not have a name) واتە (ئەو کەسەی کە ناوی نییە). ئەمەم لە فیلمدا بینیوە. لەهەمان کاتداو لەناکاو دەوەنەکان لەبەرچاوی (موسا)دا دادەگیرسان. بەڵێ فیلمی (دەفرمان) (سسیل. ب – دومیل ١٩٥٦) لەگەڵ (چارلتۆن هستۆن)و (پۆڵ براینەر)....

- باڵوێز وتی: چ کۆگایەکی زانستو زانیینە! کەواتە (تیۆ) تۆ هەموو شت دەزانیت....

- نەخێر. چونکە لە فیلمەکەدا جگەلەوەی کەخوا لەناو ئاگرەکەوە دەدواو دەنگی دەنگی مرۆڤبوو، ئەو دەنگە لەدەنگی هەموو خواکانی میسر بەتواناتر بوو، کەس نەیدەزانی چیدەوێت؟.

- باڵوێز هەناسەیەکی پێداهاتەوەو گوتی: چۆن وەڵامت بدەمەوە؟ بەگشتی دەیەوێت هەموو خەڵك ئەو بپەرستن، خاوەنی شایستەییو لێهاتویی ئەوبنو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن.

- (تیۆ) درێژەی پێدا: کەواتە دەبێت جولەکە زۆر نافەرمانیان کردبێت، چونکە هەمویان لەمیسر کۆیلەکرابون....

- باڵوێز وتی: بەڵێ، سەریان لەنافەرمانیکردن نابوو، خواوەندیش بەتوندترین شێوە سزایدان. وەك دەبینی پەیوەندی نێوان جولەکەو خوا دور لەتوندوتیژی نەبوە. زۆرجار خواوەند بەرامبەریان تورەبوە...

- (تیۆ) وتی: بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوا یارمەتی گەورەی پێبەخشیون، کۆمەکی گەورە. لەوکاتەدا کە (موسا) بڕیاریدا لەمیسر رزگاریان بکات... ئەو گۆچانەی بوە مار، بۆقی سەوز کە لەئاسمانەوە دەباریو کوچەو کۆڵانی دەتەنی، چ مەحشەرێك! پاشان هاتنە ئێرە، وانییە؟

- باڵوێز وتی: هاتن، گەڕانەوە، دوبارە هاتنەوە... (نەبوخودنەسور – بخت النصر) پاشای بابل ئەوانەی بۆ بابل برد. پاشان رۆمەکان پاش گرتنی پەرستگاکە دەریانکردن.

- (تیۆ) کە زۆر خرۆشابوو گوتی: پەرستگاکە دەبینین؟

- نەخێر. لەبەرئەوەی ئەوجارە بەتەواوی وێران بوو ئیدی گەلی جولەکە گەشتەکەی خۆیان بۆ هەموو جیهان دەستپێکرد. سەرەتا بۆ یۆنان، میسر، بۆ خاکی مەغریب، ئیسپانیا، ئیتالیا، روسیا، پۆلۆنیا، هندستان، چین.... پاشان بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، ئەمریکای باشور، ئەفریقا... سەدەبەسەدەو لەڕاستیدا بەدرێژایی ئەو سەفەرە دورودرێژەو لەگشت شوێنێك ئازار دراون و مایەی بەدواداچون بون، بەتایبەتی لەنێوان سالآنی (١٩٣٣)و.....

- (تیۆ) قسەکەی پێبڕیو گوتی: ئەوە دەزانم. لەقوتابخانە باسکراوە. روداوی (شوئاه) لەسەردەمی جەنگی دوایدا. چۆن ئەوە رویدا ناتوانم تێبگەم.

- پورە (مارتا) وتی: تیۆ هەتا ئێستا کەس تێنەگەیشتووە.

- بالۆیز درێژەیپێدا: سەرئەنجام لەساڵی (١٩٤٨)دا، بەهۆی ئەو هەموو کوشتوکوشتارەی نازییەکان بەملیۆنانیان کوشت دەوڵەتێك بەناوی ئیسرائیل دروستکراو لەسەر ئەم خاکە جێگیربون.

- (تیۆ) وتی: کەواتە کارێکی باش بوو!

- بەلآم لەگەڵ ئەو کێشەیەی کە ئەم خاکە جێگای گەلە فەلەستینییەکان بوو، ناچار ژمارەیەکی زۆر لەلای خۆیانەوە بێماڵ کەوتن و توشی رەو هاتن. جەنگەکان، یاخیبونەکان، هەلگەڕانەوەو راپەڕینەکان، ئۆتۆمبیلی خۆکوژی، چالاکی خۆکوژی بەئۆتۆمبێل و بەردەفڕکەی لاوەکان، ئازاوەو شڵەژاوی خوێناوی و دانوستانی پشت مێزەکان... ئێستاش ئیسرائیلی و فەلەستینییەکان خەریکی دانوستانی ئاشتین، بەلآم بەرقەرارکردنی ئاشتی کارێکی سادە نییە، لەهەردولا خەڵك هەن ئاینی بن یان سکولاریزمی دژ بەو ئاشتییەن؟

- (تیۆ) وتی: لەهۆکەی تێناگەم... نایانەوێت دابەشی بکەن؟

- بالۆیز وتی: نەخێر. (یاساییەکان) لەو باوەڕەدان ئەو خاکە وەکو لەتەوراتدا ناوی هاتوە تەنها تایبەتە بەجولەکە.

- (تیۆ) وتی: من هێشتا لەوە تێناگەم کە ئەو فەلەستینییە مەسیحییانە لەکوێوە هاتون!

- پورە (مارتا) وتی: باشە کەمێك بیرکەرەوە.

(تیۆ) کەوتە بیرکردنەوە: مەسیحییەکان بڕوایان بەمەسیحەو لەدایکبوونی عیسا لە..... لەپڕ هاواریکرد:

- دۆزیمەوە! مەسیح لەفەلەستین لەدایکبوەو لە ئۆرشەلیم مردوە، بەمپێیە فەلەستین پەیوەستە بەمەسیحییەکانیشەوە.

- پورە (مارتا) وتی: پێکەوە. هەموو شت لەنێو ئەو وشەیەدا حەشاردراوە.

- باڵۆێز بەبیرکردنەوەوە وتی: سەرەڕای ئەوەش پەیوەستە بەموسڵمانەکانیشەوە.

ئۆتۆمبیلەکە بەنێو گردو تەپۆلکەکانی رێگای ئۆرشەلیم بەرەوپێش دەڕۆشت. جارجارە جێبێکی پڕ لەسەرباز بەتەنیشتیاندا رەت دەبوو. روناکی خۆر بەسەر گوندە خاکیو بەرزاییە روتەکاندا دەکشا.

- باڵۆێز بەئارامی وتی: شاری سێجار پیرۆز: یرۆشالایم (Yerovshalayim)ی پیرۆز بۆ جولەکەکان، یەروشالم (ئۆرشەلیم)ی پیرۆز بۆ کریستیانیەکانو (القدس - Alqods) لای موسڵمانان.

- (تیۆ) وتی: پیرۆزبون بۆ جولەکەکان تێدەگەم، لای مەسیحییەکانیش. زۆر باشە، بەلام لای موسڵمانەکان؟

- پورە (مارتا) وتی: ئارام بگرە.

- (تیۆ) بەکەمێك دودڵییەوە پرسی: بەڕاست لێرە هەندێك جەنگی خاچپەرستان رویداوە؟

- باڵۆێز بەسەر لەقاندنەوە سەلماندیو گوتی: دیارە لەوکاتەدا کە موسڵمانان (ئۆرشەلیم)یان لەژێر دەستدابوو هەردولایان جەنگێکی زۆریان لەسەر گۆڕی مەسیح بەرپاکرد. کاتێك بەفەرمانی (گۆدفیرۆی دوبۆیلۆن)[1] پانزە هەزار سەربازی خاچپەرستان بۆ دوبارە گێڕانەوەی کریستیانی بۆ سەر خاکی پیرۆز دەستیاندایە هێرشبردن بەجۆشو خرۆشییەکی زۆرەوە وەك سێلاو ئەشکیان هەڵڕشت، بەلام لەسەر رێگایاندا هەموانیان دەکوشت... ئەو روداوە لە (١٥/ژوییە/١٠٩٩)ی زاینیدا رویداوەو شەوێکی پڕ لەوەحشەت بوو بۆ ئۆرشەلیم. خاچپەرستە کریستیانەکان دەیان هەزار موسڵمانیان کوشتوبڕ کرد. جولەکە گیرخواردوەکانی ناو کەنیسەکان لەناو ئاگردا سوتێنرانو پاشان ئیماندارانە دەستەکانیان لەناو خوێنی دوژمنەکانی خۆیاندا شوشت. (تیۆ) چوە ناو قسەکانییەوەو گوتی: ئەمەش لەتایبەتمەندییەکانیانە، ئەم مەسیحانە!

---

[1] . Godefroide Bouillon: ١٠٦١ –١١٠٠ دۆل لۆرن سفلی نەجیبزادەیەکی جەنگاوەر بوو، کە سوپاکانی ناوچەی موزو راینی بۆ یەکەمین جەنگی خاچپەرستان بردو پاش دەستبەسەراگرتنی ئۆرشەلیم لەساڵی (١٠٩٩) بۆ پاشایەتی هەڵبژێردراو نازانوی (بەرگریکاری لە گۆڕی پیرۆز)ی پێبەخشرا.

- ئاها! پاشان بەرگی سپی کەتانیان پۆشی‌و بەپێی پەتی شوێن پێی عیسا کەوتن! فەرمانڕەوایی کریستیانی تاسالّی (١١٨٧) بەردەوام بوو تا ئەوکاتەی سەرکردەی گەورەی موسلّمانان (سەلاحەدینی ئەیوبی) دوبارە ئۆرشەلیمی گرتەوە. بەپێچەوانەی خاچپەرستانەوە کنیسەی لەهەرجۆرە دەستدرێژییەك پاراست‌و رێگای بەگەڕانەوەی جولەکەکاندا. جیای ئەوەی جەنگی خوێناوی لەنزیك گۆڕی عیسا روبدات!

- (تیۆ) وتی: سەیرە! چونکە بەپێی لۆژیك کەس لەو گۆڕەدا نییە، ئەگەر وانییە دەبێت بوترێت، کە مەسیح هەلّنەستاوەتەوە.

- بالّویز وتی: ئەمە دروست ئەو شتەیە کەجولەکەو موسلّمانەکانیش دەیلّێن: بەو واتایە عیسا خوا نەبوەو پەیامبەر بوە، کە پێشتر لەنمونەی هەبوە، پەیامبەرێك خۆی لەخۆیدا شتێکی ناناساییە. بەلاّم دەزانیت ئۆرشەلیم تاکە گۆڕێکی مەسیحی تێدانییەو لەژێر ئەو قوبە بەردینەدا یەکێك لەپیرۆزترین شوێنەکانی موسلّمانانیشی لەخۆ گرتوە.... هەروەها دیواری (ندبە)ش، کە جولەکەکان بەرامبەری دەوەستن، پاشماوەی پەرستگا وێرانکراوەکەیە، کە ئەشکی بۆ دەرێژن.

- (تیۆ) وتی: ئەوەم لە تەلەفزیۆندا بینیوە، پارچە کاغەزیش کە نییەتی تێدا نوسراوە، لەدرزی بەردەکان رۆدەکەن.

- پورە (مارتا) زۆر بەفەرمیانە وتی: بەلّێ، بەنییەتی (سالّی ئایندە لە ئۆرشەلیم)، هەموو جولەکە کۆچبەرەکان لەڕۆژی جەژنی پاکدا ئەو چەند وشەیە دەدرکێنن.

- (تیۆ) هاواریکرد: چی، ئەوانیش جەژنی (پاك) دەگێڕن؟ ئەوەی رۆژانی شەمە کارناکەن. دەزانم، لەقوتابخانە بینیومە، بەلاّم ئەوەی کە جەژنی پاك بگێڕن!

- پورە (مارتا) وتی: بەو جیاوازییەی کە ئەم دوو (پاك)ـە لەیەکدی جودان.

## دوو جەژنی (پاك)و چەندین مەسیح

ئەو دوو پاکە لەبنچینەدا یەك نین. جولەکەکان (پاك) یان (پسح)ی خۆیان بەیادی ئەو شەوە ترسناکەی لەمیسر دەرچون دەگێڕن، کە فیرعەون بەدرێژایی چەندین سالّ کۆیلەی کردبون.

کریستیانیەکان (پاك) بەیادی ئەو رۆژە پرشکۆیە دەکەنە جەژن، کە عیسا پاش سێ رۆژ لەخاچدان گیانی لەدەستدا، بەلاّم دوبارە گیانی بەبەرداکراوەتەوە. ئەو رۆژەش پیرۆز راگیراوە.

(پـاکی) جولەکـەکان بریتییـە لـە جـۆرێکی تایبـەت لـەخواردن و بـەرانێك بەسـاغی سوردەکرێتەوە، کە بەسەوزەی تاڵو نانی فەیترەوە دەیخۆن.

(تیۆ) بەغرورەوە وتی:

- نانی بێخومرەیەو باوکیشم لەماڵەوە بۆمانی دەیهێنایەوە.

- جەژنی پاکی مەسیحی بەرزڕاگرتنی رۆژی پڕ لەشادییە، کە هاوەڵی نزایـەکی کۆگەلی شکۆمەندە. بەیانی زوو ناقوس(زەنگ)ەکان بۆ شاری رۆما دەگەڕێننـەوە، کـە سێ رۆژ پێـشئەوە وەك پرسەداری لەشار دەیبەنە دەرەوە.

- پورە (مارتا) وتی: بەڵێ، بەڵام ئـەوە تـەنها نەریتـە، هـەر ئەوەنـدەو بـەس، چونکە لـە (پەیمانی نوێدا – مەبەست لەئینجیلە. و) هیچ دەربارەی زەنگەکان نەوتراوە.

بەڵام چونکە ئەو بابەتە رونکردنـەوەی دورودرێـژی دەویـست بـاڵوێز داوای لێبـوردنی کـردو پورە (مارتا)ش پێداگری نەکرد.

شەوی (پاك) لەمیسر شەوێکی تۆقێنەر بـوو، نـەك بـۆ جولەکـەکان، بـەڵکو بـۆ میـسرییەکان، چـونکە ئـەو سـەرزەمینەی جولەکـەکان تیایـدا ناخۆشـترین رۆژگاریـان تیابـەڕێکردبوو (موسـا) نـەفرەتی لـە(فیرعـەون)و میـسرەکەی کردبـوو، سـەرئەنجام بـەڵاو نەهامـەتی جۆراوجـۆر ئـەو خاکەیان تەنی، کە (تیۆ)ش هەمووی دەزانی، چـونکە لـە فیلمـدا بینیبـوی: هـەوری رەشـی تـاڵ، سێڵاوی خوێن، نەخۆشی ساریو سەرئەنجام دواین بـەڵا، کـە لەهـەموی نەهامـەتتر بـوو: کاتێـك رۆژ بۆوەو یەکەمین تیشکی خۆر پەخش بوو، هەموو ساوا تـازە لـەدایکبوەکانی میـسر بـەمناڵی فیرعەونیشەوە مردن. لەبەرئەوەیـە جولەکـەکان چێـشتی جـەژنی پـاکی خۆیـان بـەیادی شـەوی پێش ئازادبونیانەوە دەخۆن، ئەوانە لەو شەوەدا پێڵاوی باشیان لەپێکردو ئامادەی هەڵاتن بون. کاتی ئەوەیان نەبوو خومرە بکەنە هەویرەوە تاهەڵبێتو هـەروا بەفـەتیرەیی کردبویـان بـەنان، کەنانێکی تەواو رەقو هەڵنەهاتوی لێدەرچوبوو، سەوزەواتەکەش بۆ تامی تاڵیو سوێری رۆژانی کۆیلایەتییـە، کـە ئیـدی کۆتاییـان هـاتبوو. جولەکـەکان بەرێنیـشاندەری (موسـا) لـە بومەلێڵدا کەوتبونە رێو پاشان فیرعەون دەیویست رێگرییان بکات.

- (تیـۆ) وتـی: لەیادمـە موسـا روبـاری شـەقکردو جولەکـەکان لـەنێو ئـەو رێگایـەی بـەناو شەپۆلەکاندا کرابۆوە تێپەڕین. کاتێکیش فیرعەونو سوپاکەی بـەدویان کـەوتنو گەیـشتنە نـاو روبارەکە، دوبارە هاتەوە یەكو داخرایەوە. بۆ موسا باش بوو.

مەسیح بەخاچەکەیەوە لە ئۆرشەلیم گیانی سپارد، چونکە جولەکەکان ئەویان بەمەترسی گەورە لەسەر جولەکە دەزانی. ئەو دەیوت کوڕی خوام‌و جولەکەکان دەیانوت ئەو بانگەشەکردنە پەسەند نییە. کەس ناتوانێت کوڕی خوابێت. خوا نەسیما، نە جەستە، نەخێزانی هەیە، هەندێك خراپتر لەوەش دەیانگوت: عیسا مەسیحە، ئەو کەسەی خوا بەڵێنیداوە بە پەیامبەرەکانی، کە رۆژێك دەگات‌و لەگەڵ خۆی چاکەکاری‌و فریادرەسی دێنێت. هەڵبەتە چەند پەیامبەرێك پێشبینیان کردبوو رۆژێك مەسیح دێت، بەڵام نەك ئەو لاوە بێنەوایە، نەك کوڕی ئەو دارتاشە، ئەو کەسە نابوتە، کە ئێستا دەڵێت (کوڕی خوا)یە. بەکورتی جولەکەکان داوایان لە رۆمەکان کرد تا لەبەڵای ئەو عیسا دەست‌و پێ سپییە، کوڕی مەریەم‌و یوسفی دارتاش رزگاریان بکەن. لەو زەمانەیەدا فەلەستین لەژێردەستی رۆمییەکاندابوو، بەئاشکرا دەستیان لەکاروباری ئاینی جولەکەکان وەرنەدەدا، مەگەر ئەو دەمانە نەبێت (حاخامەکان) داوایان لێکردبن تانەزم لەکۆمەڵگادا بەرقەرار بکەن. بەڵام پیاوانی ئاینی جولەکە، کە (حاخام کۆڤ) لەسەرهەموویانەوە بوو، (عیسا)ی بەوە تاوانبارکرد تۆوی ئاژاوەو پشێوی لە وڵاتدا دەچێنێت، چونکە خۆی بە (پاشای جولەکەکان) ناوزەد دەکات، کە بابەتێکی تەواو ناڕاستە. (کۆڤ) بۆ ئەو کارەش بەڵگەنامەیەکی گرنگی لەدەستدابوو، واتە لەوسەردەمەدا تاکە پاشای جولەکەکان، کە بەڕاستی پیادەی دەسەڵاتی دەکرد، ئیمپراتۆر ئیبریۆس (تیبر)ی رۆم بوو. حاکمی رۆمی شارەکە (عیسا)ی بەتاوانبار نەدەزانی‌و تەنها وەك پیاوێکی ناڕازی بێزیان سەیری دەکرد، بەڵام دواجار هەرهەمان حاکم بوو کە (عیسا)ی بە لەخاچدان حوکمدا، بەڵام بەپێی رێوڕەسمی فەرمی، پێشئەوەی بڕیاری حوکمەکەی (عیسا) دەربکات، دەستەکانی شوشت، تا دەریبخات کە ئەو باری زوڵم‌و بێدادییە لەئەستۆی ئەو نییە.

- (تیۆ) وتی: دەزانم ئەو پیاوە (پۆنس پیلات) بوو، باوکیشم زۆرجار دەڵێت: (من وەك پۆنس پیلات دەست لەکار دەشۆم)، واتا ئەوەی رودەدات کەموکورتی‌و دەستی منی تێدانییە.

بەوپێیە عیسا لەبەرهۆی سیاسی بەلەخاچدان حوکمدراو بەرگری لەخۆی نەکرد. لەناو کۆمەڵی جولەکەدا بەرشەلاق درا، وەك سوکایەتی پێکردن تاجێکی دڕکاوی تیژ لەسەریکراو دارێکی لەشێوەی خاچێکی گەورە لەکۆڵی نرا تا بەدرێژایی رێگای شوێنێك، کە بە (جومجوم — جل جتا)[1] ناو دەبرێت، هەڵیگرێت، لەهەمان شوێنیشدابوو عیسا کرا بەخاچەوە. لەسەر

---

١. ئەسڵی ئەو وشەیە بەزمانی ئارامی (Golgolta) واتە (جومجومە — کەللەسەر)، کە بەیۆنانی (Golgolta)و لەلاتینیدا (Calvaria)یە بەهەرحاڵ بریتییە لەو گردەی لەسەری مەسیح لەخاچدراوە. شوێنی ئەو گردە، کە گفتوگۆی زۆری لەسەرە،

خاچەکە حوکمدراوەکان، کە دەستو قاچەکانیان میخ کوت کرابوو، بەهەڵواسراوی چاوەڕێی مەرگێکی بەئازارو درەنگ وەخت دەمانەوە: ئێسکی قەڵەمی پێیان دەشکاندن، جەستە چیدی راگرێکی نەبوو، سییەکان دەکەوتنە ژێر فشاری جەستەوەو هەناسەدان ئەستەم دەبوو، سەرئەنجام مەرگ لەڕێگای خەفەبونەوە دەگەیشت. دەبوو لەگەڵ (پاشای جولەکەکان) رەفتاری جیاواز بکرایە: هەرچەندە قەڵەمی پێی نەمیان نەشکاند، بەڵام دەستو پێیان بەمیخ داکوتیو خوێنی لێدەچۆڕا. سەریشی بەهۆی تاجە درکاویەکەوە خوێنی لێدەچۆڕا. (عیسا)، کە لەنێوان دوو چەتەدا لەخاچدرابوو، پێش ئەوانو بەهاوارێکی ترسناك، کە لەناخییەوە هاتبوەدەر گیانی سپاردبوو. لەگەڵ ئەو جیاوازییەی ماوەیەکی زۆر بەمردویی نەمایەوە. پاش سێ رۆژ گۆڕەکەی کرابۆوەو خودی خۆی بەخەندەو خۆشحاڵییەوە بەرامبەر بەو ژنانە دەرکەوتبوو، کە لەسەر گۆڕەکەی دادو فیغانیان دەکرد. بەوجۆرەش باوەڕهێنان بەوەی (عیسا) کوڕی خوا بوە مەیسەر دەبوو، چونکە دروست لەساتی مەرگیدا پاش ئەو نەعرەتە ترسناکەی هەور دەستی بەگرماندن کردو بەمەلەرزە رویداوە. باشە لەڕاستیدا مەسیح ئەو مەسیحی بەڵێن پێدراوە بوو، کە دەگەڕێتەوە یان نا؟

کریستیانیەکان وەڵامێکی پۆزەتیفی ئەم پرسە دەدەنەوە، چونکە ئەو لەنێو مردوەکان هەستاوەتەوەو دوبارە ژیانی بەبەردداکراوە. جولەکەکان رێك دوای ئەو رۆژە وەڵامێکی نێگەتیڤی پرسەکە دەدەنەوە. ئەمانە دەڵێن کە گەلی جولەکە پاش (عیسا) لەو مەسیحانەی زۆر دیوە. زۆرجار لەناو کۆمەڵگای کۆچکردوی جولەکەدا کەسی بەهرەدار هەڵکەوتوە، کە وتویەتی مەسیحە، هەر وەك چۆن عیسا لەڕابردودا وتبوی. بۆ نمونە لەسەدەی شانزەدا چارەنوسی ئەمجۆرە کەسانە بەزۆری لەناو ئاگردا کۆتایی پێهاتوە، کەدەزگای (ئەنکیزسیۆن)[2] سازی کردبوو. چونکە لەو سەردەمەدا کڵێسەی کاسۆلیکی دەستیدابوە ئازارو ئەشکەنجەدانی قورسی جولەکەکان. هەندێکجاریش هەندێك لەوانە سەرکەوتوو بوون وەك (ساباتاتە زیڤی)، کە خۆی بەمەسیح راگەیاندو لەسەدەی حەڤدەدا بوە چرای رێگای جولەکە کۆچبەرەکانی ئەوروپاو سەرئەنجام بوو بە ئیسلام.

---

بەپێی ریوایەتە کۆنەکان دەکەوێتە بەشی باکوری خۆرئاوای ئۆرشەلیمو لەهەمان شوێندا کڵێسای بەناوبانگی (گۆڕی پیرۆز – Sain- Sepulker) دروستکراوە، کە لەشوێنە پیرۆزەکانی مەسیحییەکانە.

٢. Inqoisition: دەزگای تۆقێنەری پشکنینی بیروڕا، کە کڵێسای کاسۆلیکی بەقسەی خۆیان بۆ دژایەتیکردنی کوفرو گومڕابوون لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پێکیانهێنا. بەتایبەتی لەسەدەکانی سیانزە تا شانزەیەم لەئەوروپای مەسیحی (جگە لەئینگلتەرا)و لە کۆلۆنیالییەکانی ئیسپانیادا چالاك بووە. و. کوردی.

- (تیۆ) وتی: لەمەش دوچاری سەرسوڕمان بوم، کەسێك خۆی بەمەسیح رابگەیەنێت چۆن دەبێتە ئیسلام؟

- پورە (مارتا)ش دوپاتی کردەوە کە بەڕاستی سەیرە. ئەوەی لێرەدا دەبێت سەرنجی بدرێت ئەوەیە کە گەلی جولەکە هەر لەسەردەمی چاوەڕوانی مەسیحەوە تائێستا چەندین مەسیحی تیا هەلکەوتوە. تەنانەت ئێستاش هەندێك لە (یاساییەکان) لەو بڕوایەدان مەسیحی راستەقینە بەو زوانە سەرهەڵدات.

لە دەیەی نەوەدەکاندا هێندەی نەمابوو ئەو مەسیحە بەڵێندراوە لەشێوەو روخساری پیاوێکی بەتەمەن‌و حاخامێکی زۆر پیرۆزی ئەمریکایی بەناوی (مناحم شنیرسون) لەفڕۆکەخانەی نیۆرکەوە سواری فڕۆکە بێت. بەیانییەکیان بەئاژانسی هەواڵی ئۆرشەلیم راگەینرا کە (مەسیح بەفڕۆکەی ئال ئال لە نیۆرکەوە دێت‌و هەمان شەو دەگاتە ئۆرشەلیم). شوێنی نیشتەجێبونی ئامادەکربوو. روداوێکی گرنگبوو. بەلام (مەسیح) نەگەشت‌و لەتەمەنی نەوەدو دوو ساڵیدا لە نیۆرك مرد. لەدوای ئەم روداوە واوێنادەکرا کە ئیمان بەهاتنی مەسیح لەم چەرخە نوێیەدا لاواز بووبێت.... نەخێر، هەرگیز! دوو ساڵ دوای ئەو روداوە موریدەکانی لەجیهاندا بلاویانکردەوە کە نەمردوەو بەو زوانە دوبارە دێتەوە. لەناو خودی ئیسرائیلیشدا گروپێك رایانگەیاند کەمەسیح – مەسیحێکی دیکە – لە یەهودا (Juda) سەرهەڵدەدات تاهەموو جیهان رزگار بکات.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە پرسی: لە یەهودا؟

- بالۆیز گوتی: بەڵێ، ئەم گروپە دەیانەوێت خۆیان لە ئیسرائیل جیابکەنەوەو لەیەهودا دەوڵەتێکی بچوك پێکبهێنن. بەلام لەهەموی سەیرتر (شێتی ئۆرشەلیم)ـە. هاوڕێ لاوەکەم.. وێنای بکە هەموو ساڵێك سێ سەد کەس ئەقڵی لەدەستدەدات، جولەکەو مەسیحی لە کوچەو کۆلانەکانی شاری پیرۆزدا بەپێی پەتی‌و عەبا بەشانەوە دەسوڕێنەوەو کۆتایی جیهان رادەگەینن، چونکە هەمویان خۆیان بەمەسیح دەزانن.

- (تیۆ) هاواریکرد: هەمویان شێتن؟

- منالە عەرەبەکانیش هەمان شت دەڵێن‌و هاوار دەکەن ئەوانە (مجنون)ن، واتە شێتن. بەگشتی خەلکی خراپ نین‌و لەگەڵ ئەوەشدا یەکێك لەوانە مزگەوتێکی بەناوبانگی سوتاند تا بەقسەی خۆی ئاخر زەمان پێشبخات. بەکورتی دەبێت چاودێری بکرێت.

- پورە (مارتا) وتی: بەڵێ، بابەتی مەسیح لەلای جولەکەکان بوە بەنەریتێکی کۆن، بەڵام خەڵکی دیش لەو نەریتە بێبەری نین و لە ئەمریکاش جارجارە لەو جۆرە مەسیحیانە دەردەکەون. بۆ نمونە لەسەدەی نۆزدەدا هاوڵاتییەکی ئەمریکی، کە هیچ پەیوەندییەکی بە جولەکەو جولەکەگەراییەوە نەبوو، بەناوی (جۆزیف سمیس) لەتەمەنی چواردە ساڵیدا رایگەیاند کەسروشی بۆ هاتووەو خوا مۆڵەتی پێداوە تا لەشاری نیۆرك تەوراتێکی نوێ بەناوی (کتێبی مۆرمۆن - Mormon) بنوسێتەوە. ئەوەش بەناوی ئەو پەیامبەرە نەناسراوەی ئەو کتێبەی بۆ هێناوە. بەوجۆرە بوو کە پاش دە ساڵ لەدروستکردنی ئەو بزووتنەوەیە (جۆزیف سمیس) بوو بە (موسا)ی نوێ یان مەسیحی نوێ یاخود شتێکی لەوجۆرە. (جۆزیف سمیس) چونکە بەشێوەیەکی چەکدارانە بەرگری لە پەیامەکەی کردبوو بەهۆی کۆمەڵە کەسانێکی تورەوە کەهێرشیان کردبوەسەر زیندانەکەی پارچەپارچە کرا. پاش مەرگی جێنشینەکەی (مۆرمۆن)ەکانی لە مەزهەبێکی نوێدا رێکخست و ناوی نا (کڵێسای عیساو مەسیحی قەشەکانی رۆژی دوایی).

- (تیۆ) پرسی: ئەوە واتای چییە؟

- باڵۆیز نارەزایەتی دەربری: بەبرِوای ئەم پورە (مارتا) مافی ئەوەی نەبوو گروپێك کە گرنگ بوو، بەڵام مەزهەبی نەبوو بە (ئاین) ناو ببات.

- پورە (مارتا) وتی: بەهەر حاڵ ژمارەی (مۆرمۆن)ەکان لە ئەمریکادا دەگاتە ملیۆنێك کەس و بارەگای وەك پەرستگای ئاینییان هەیە. سەرەرای ئەوە پورە (مارتا) لەو بروایەدابوو کە عیساییەکانیش لەسەرەتادا تەنها گروپێکی بچوك بون.

- باڵۆیز وتی: کەواتە دەتەوێت بڵێیت ئاینی مەسیحیش گروپێك بون و چونکە سەرکەوتوو بون بەمشێوەیەیان لێهات.

- پورە (مارتا) وتی: کە تەواو بروای بەو جۆرەیە.

- (تیۆ) وتی: بەڵام گروپگەلەکان زۆر ترسناکن. لەتەلفزیۆندا باسیان دەکرێت... سەردەستەکان خەڵکی راراو خراپەکارن! ئەندامەکانی یان خۆیان دەکوژن یان خەڵکی دیکە..... بەهەرحاڵ دەسدرێژی دەکەنە سەر خەڵك! لەراستیدا ئەم سەرشێتانە چۆن دەتوانن ئەو کارانە ئەنجام بدەن؟

- پورە (مارتا) رونیکردەوە: زۆرجار چاوی ئەفسوناوی موگناتیزییان هەیە. جوان دەدوێن و خاوەنی رەوانبێژین، بەڵام لەهەمان کاتیشدا دەزانن کەی بێدەنگ دەبن و شەیەك نەدرکێنن تا

زیاتر لایەنگرو موریدەکان بخەنە ژێر ئەفسونی خۆیانەوە. سەردەستەکان خەڵکی راڕاو هەڵوەشاو بەلای خۆیاندا کێشدەکەن، هەروەك چۆن لەزگە مێش و مەگەز لەخۆدەگرێت، جوداکردنەوەی ئەم کەسانە لەسەردەستە نەشیاوە!

- (تیۆ) وتی: رادەکێشرێن، وەکو ماددەی سڕکەر؟

- تاڕادەیەك وایە. دەرکێشانی سەرشێتێك لەناو دەستەیەکدا بەئەندازەی بڕینەوەی شێتێك لەدەرمان سەختە، چونکە موریدەکان وەك مادەی سڕکەر پێویستیان بەسەردەستەکەیانە. هۆگربونی ئەمپولیش شێتیە.

- (تیۆ) گەیشتە ئەنجام!: کوژەرە! کوژەرە! زۆر کوژەرە!

ناتوانرێت وازەن نەکرێت (تیۆ) راستدەکات. کوشتوبڕی (داودییەکان) لە (واکو)ی مەکیسیك، خۆکوژی بەکۆمەڵی (پەرستگای خۆر) لەئەوروپاو کەنەدا لەدەمیەی نەوەدەکانداو هەروەها - بەهۆی کەم تەمەنی (تیۆ)وە ئەم روداوانەی نەبیستبوو – کوشتوبڕی دەستەگەلی ترسناکی (گویانا) لە ئەمریکای خواروو، کە سەردەستەیەك بانگەشەی بەدەستهێنانی روناکی دەرکردو بەهۆی ژەهری ناو ئاوی پرتەقاڵەوە سەدان کەس لەموریدەکانی خۆی ژەهراوی کردبوو، کە هەندێکیان بەمەیلی خۆیان ژەهرەکەیان فرکردبوو.

- - (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئاه ! نەفرەتاوییە. پورە (مارتا) لەوانەیە (مۆرمۆن)ـەکانی تۆش لەهەمان بابەت بن و ئەوەش قسەیەکی زۆر هەڵدەگرێت !

- - نەخێر. (مۆرمۆن)ـەکان لەوجۆرە گروپانەنین و مەترسیان نییە.

- پورە (مارتا)و بالۆیز دواجار لەسەر ئەوخاڵە کۆك بون، کەکۆنیو دێرینەیی رۆڵی خۆی هەیە. پاشان تێپەڕبونی دووهەزار ساڵ بەسەر ئەو دەستە سەرەتاییەی یەکەمجار لەگەڵ ئێستادا زۆر جیاوازی هەیە. سەبارەت بە (مۆرمۆن)ـەکانیش بەلایەنی کەمەوە دەبێت هەزار ساڵ چاوەڕوان بکرێت تادەرکەوێت چیان لێپەیدا دەبێت. هەرچۆنێك بێت پورە (مارتا) ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە (مۆرمۆن)ـەکان شارێکی بەناوبانگیان لەجیهاندا دروسکردوە، کەناوی (سۆلت لەیك ستی – Salt Lake City)یە.

ئۆتۆمبیلەکە لەشاری ئۆرشەلیم نزیك دەبۆوە. تەمێکی تەنك بەسەر شارێکی گەورەوە شەپۆلی دەدا. بالۆیز لەسەعاتەکەی روانی: پاش چارەکە سەعاتێکی دیکە لەسەنتەری شاردابن، دروست لەنیوەڕۆدا.

- (تیۆ) وتی: لەڕاستیدا کاسۆلیکەکانیش وەکو جولەکەکان چێشتێکی تایبەتیان هەیە، مەگەر ئەمانیش سەرەتا ئاهەنگی (مێس)[1] (نزای کۆگەلی)و نانخواردنو شەراب نۆشینیان نییە؟

وتەکانی (تیۆ) تەواو دروست بوو، تەنها هێندە نەبێت وەك بالۆێز دەیوت ناکرێت خۆراکی (پسح)ی جولەکە بە (مێس)ی کریستیانیەکان بەراورد بکرێت، چونکە کریستیانەکان ئەو سروتە بەیادی دواین نانخواردنی (عیسا)وە سازدەکەن. لەڕاستیدا لەگەڵ ئەوەی (عیسا) ئەو سروتەی لەئۆرشەلیم لەرۆژی (پسح)ی جولەکەکاندا بەرزنرخاندوە، ئەو دوو خۆراکە لەدوو جەمسەری پێچەوانەی یەکدیدان: خۆراکی جولەکەکان بەیادی کۆتایی خولێکی پڕ لەڕەنجی کۆیلایەتییەوەیە، لەکاتێکدا ئەو خۆراکەی مەسیحییە کاسۆلیکەکان یادەوەری دواین ساتەکانی ژیانی مەسیحەو ئاماژەی دەستپێکردنی سەردەمێکی نوێیە.

- (تیۆ) بەباوێشکدانەوە پرسی: بەراست کەئێستا باس لەخواردن دەکرێت، خۆراکی نیوەڕۆمان چییە؟

## نیگەرانی.. هەرلەسەرەتاوە

دەرگایەکی گەورە لەژێرچاودێری کامیرادا کرایەوەو ئۆتۆمبیلەکە چوەناو باخچەی باڵیۆزخانەی فەڕەنساوە. سەربازێك بۆ هەڵگرتنی جانتاکان هاتو بەبەڕێز ژەنەڕاڵی باڵیۆزی ڕاگەیاند کۆبونەوە دەستیپێکردوە. باڵیۆز کەوتە پەلەپروزە.

ژوورەکەی (تیۆ) دەکەوتە کۆتایی پلیکانەیەکی پێچاوپێچەوەو ژووری پورە (مارتا) کەمێك لەخوارتر بوو. (تیۆ) لەکاتی سەرکەوتن بە پلیکانەکاندا لەپڕ سەری گێژی خواردو سەربازەکەش باوەشی پێداکردو تاسەرجێگاکەی برد. پورە (مارتا) ڕەنگ بە رویەوە نەما.

- سەربازەکە وتی: هەرئێستا شتێکی گەرمی بۆ دێنم. فرۆکەکە تەندروستی شێواندوە؟ یان لەوانەیە بەهۆی پەلەکردنەوە دەرمانەکانی لەیادکردبێت. پورە (مارتا) لەجانتاکەیدا ڕەچێتەیەکی دەرهێناو کەوتە وردبوونەوەو لەژێر لێوەوە وتی:

- دەرمانی نەفرەتاوی! کەی دەست لەیەخەمان دەکەنەوە! ئەمانەیە لەیادم کردبون! (تیۆ) .. پەرداخێك ئاو خێرا!

---

[1]. مێس Messe لەم سروتەدا، کە هەموو رۆژانێکی یەکشەممە لە کلێسەی کاسۆلیکیدا سازدەکرێت، قەشە وێنەی نان و شەراب پەیامبەر ئیمانداران دەدات.

(تیـۆ) حـەبێکی هەڵـداو چـاوەکانی نوقانـد. بەڕاسـتی هەسـتی بەشـەکەتی دەکـردو سەرگێژخواردنێکی تیژ یەخەی گرتبوو. زۆر حەزی دەکرد بکەوێتە گفتوگۆکردن لەگەڵ (پی تی) دۆستی دێرینـەی، بـەڵام هەسـتی بـەوەش دەکـرد لەئۆرشـەلیم نـەدیۆودرنج نەئـەژدیهاو غـەیبگۆ هەیـەو هـیچ کـام لەبەرئـەنجامی ئەفـسانەکانی یۆنـانیش جولەکـەو مەسـیحییەکان ناگەیەنێتـە رێکـەوتنو بەبێئـەوەی لـەم نێوەنـدەدا فەلەسـتینی، مەسـیحیو ئـەو موسـڵمانانەی نەلەگەڵ ئەم نەلەگەڵ ئەودا رێکن فەرامۆش بکەین.

- پورە (مارتا) لەگەڵ ئەوەی دەرگاکەی لەدوای خۆیەوە دەبەست وتی: خـەوتوە، هیـچی بـۆ مەبەو سەغڵەتی مەکە.

بـەڵام (تیـۆ) کەخـەو لەچـاوی تـاربوو لـەخۆی دەپرسـی بۆچـی بـۆ ئـەم وڵاتـە هـاتوە؟ مەملەکەتێکی ئاینزاو بەناوی خواوەندەوە یەکدی دەکوژن. گوایـە ئـەو خوایـە خـوای هـەمویان نییە؟ باشە، دیارە بـەیانی لـەوە تێدەگات. لەوانەیـە درەنگـتر، دیـارە ئەگـەر کـاتی مابێـت، خۆ لەوانەشە هەرگیز. ئاخ.... نەخێر بـەو ئاسـانییە خـۆی رادەسـت نـادات ! تۆزێـك بـوێریو ورە!. هێشتا (تیۆ) ئەو جانتایانەی نەبینیبوو، کە دیارییەکانی (نۆیل)ی تێدابوو. بەئارامی هەستا تـا جانتا گەورەکەی هـەموو دیارییـەکانی تێدابوو، چەسـپی لەسـەر دانرابـوو، بیکاتـەوە.... دیـاری باوکی کامێرایەکی وێنەگرتن بـوو بـەزومێکی گـەورەو قورسـەوە. دیـاری (ئـاتی) موبـایلێکی دوا مۆدێل، (ئیدن) رادیۆ – سـەعاتێك، کەکاتی لەهـەموو جیهـان پیـشاندەدا.دایکـی قەمـسەڵەیەکی وەرزشیو پێڵاوی گەرمو نەرم، بەڵام (فاتۆ) کە هەمیشە کارەکـانی داهێنەرانـە بـوو، کاغـەزێکی لولکراو پارچـە ئایـەتێکی قورئـانی لەسـەر نوسـرابوو، لەسەرشـێوەی نوشـتەیەك بەزنجیرێکـەوە کرابوو. (تیۆ) دەمودەست کردییە ملی؛ بەسەر ملوانکەکەی پێشوی (فاتۆ)دا، ملوانکە گرێ گرێ سەنیگالییەکەی. لەناو جانتای دیارییەکاندا پەراوێچکەیەك هەبوو نوسـراوێکی بەچەسـپ پێـوە لکێنرابوو بەم ناوەرۆکە: (لەلایەن هـەموو مامۆسـتایانەوە). پەراوێـچکەیەکی سـورباوی جـوانو پێنوسێك. (تیۆ) بیریکردەوە کەشتێکی خراپ نییـەو بەهـەرحاڵ بـۆ تۆمـارکردن باشـە. دەسـتی بەنوسین کرد: جولەکەو موسڵمانەکان: یەك خوا. کریستیانەکان لەو بڕوایەدان مەسـیح هـەمان (عیسا) بوەو جولەکەکان هەر چاوەڕوانی هاتنی مەسیح دەکەن. (پاك – پسح)ی جولەکـەکان = یادی لەمیسر دەرچون. (پاك)ی مەسیحیان = یادی هەستانەوەو دوبارە زیندوبونەوەی عیـسایە. ئۆرشـەلیم شـاری پـیرۆزی جولەکـە، کریـستیانو موسـڵمانانە، بـەڵام لـەم نێوەنـدەدا پرسـیارەکە

ئەوەیە، کە ئایا خوای کریستیانەکان تاکو تەنهایە، بەڵێ یان نەخێر؟ ئایا موسڵمانەکانیش شتێکی وەك (پاك)ی مەسیحییەکانیان بۆ یادێکی گرنگ هەیە؟

سەفەرەکەی (تیۆ) لەنێو مشتێك لەو نیگەرانیانەدا دەستپێکرد! کەخەریکبوو چاوی دەچوە خەو بەهێواشی وتی: ساڵی ئایندە لەئۆرشەلیم. باشە، رۆژی سەرەتای ساڵ نازانم، بەڵام دیارە بۆ جەژنی (نۆیل) لەئۆرشەلیم دەبین، کەلەو بارمیەوە بەهەڵەدا چوبوو، بەڵام هێشتا نەیدەزانی.

## سێ رێنمایی سەرەتایی (تیۆ)

- تیۆ سەعاتەکەت بینی؟ تیۆ!

چی؟ ئایا زەنگی بێدارکردنەوەکەی گوێ لێنەبوو؟ کەواتە دووبارە، لەچون بۆ قوتابخانە دوادەکەوێت.... پەلەبکە، دەبێت راپەڕیت. قاچێك بێنەخوار، دەی قاچەکەی دیکەو پاشان چاوەکان بکەرەوە... بەڵام ئەوەی لەپشتی سەرییەوە بوو دایکی نەبوو، پورە (مارتا) بوو. (تیۆ)ش لەپاریس لەئاپارتمانی گەڕەکی (ئایەگرگوار) نەبوو، بەڵکو لە ئۆرشەلیم بوو، کە بۆ فراوین چاوەڕوانی بون. پورە (مارتا) پێشنیاری کرد بۆ شوشتنی دەموچاوی سەرەتا بۆ دەستشۆرەکە بچێت: بەلای راست، بسوڕێ، فەرموو.

پلیکانەکان لەهەیوانی خانووەکەدا کۆتایی دەهات، کە لەسەرویەوە حەسارەکانی شار لەسپاییەکی خەون ئاسادا دەبینران. جوانی ئەو دیمەنەی لەبەردەمدا بوو (تیۆ)ی پەرێشان کردبوو. دەتگوت قەڵای ناو ئەفسانەی پەریەکانە. لەودیو حەسارەکەوە بڵندی گومەزەکان، تاوەرو زەنگەکان بوو، لەبەرامبەر سەروی سەربڵندی رەنگ تێر. کەش وەك یەکەمین رۆژی ئەفراندن سادەو شەماڵ بوو، بەسەر گژو گیا وشكو باریکە رێگاکاندا بەجۆرێك هەڵیدەکرد، وەك ئەوەی تایبەت بن بەسەردەمێکی دێرین. دەنگێکی گەورە لەپشتی سەرییەوە وتی:

- جوانە؟ لێرەوە حەساری عوسمانییەکان دەبینیت. وەرە کوڕم. لەهەیوانەکەدا سێ کەسی ریشدار بۆی دەخەنینەوە.

- پورە (مارتا) کەبەرەو میوانەکانی دەبرد وتی: ئەمە (تیۆ)ی ئێمەیە، بەڵام سەرەتا دەبێت نانبخوات. خوانێك سازکرا. حەزت لەچییە؟. زەڵاتەی تەماتەو مریشکی سارد یان رۆسبیف بە ئاردی پەتاتە.

- (تیۆ) پرسی: چاوەڕوانی ژەنەراڵی باڵیۆزی هاوڕێت ناکەیت؟

- پورە (مارتا) بەسەغڵەتییەوە وتی: باڵیۆزی ژەنەراڵ؟ نەخێر، ژەنەراڵی باڵیۆز، خۆ ئێمە لەرۆمای کۆن نین!

- (تیۆ) بەنارەزاییەوە وەڵامیدایەوە: بەڵێ! لە رۆمای کۆن سەرەتا ژەنەراڵ بون و پاشان دەبونە باڵوێزو ئینجا ئیمپراتۆر، باشە...

- پورە (مارتا) لەدرێژەپێدان رێگری لیکردو گوتی: بەهەرحاڵ پەیامێکی بۆ ناردوین، کەکۆبونەوەکانی تەواو نەبوەو چاوەڕوانی نەکەین. باشە خواردنەکەت هەڵگرە.

- مریشك، زەڵاتە.

(تیۆ) لەبارێکدا، کە قاپی خواردنەکەی لەسەر کۆشی دانابوو بەتام و چێژەوە دەستی بەخواردن کردو بەدزە نیگاوە لەسێ میوانەکە ورد دەبۆوە. کەباش لێیان ورد دەبویتەوە هێندە بەتەمەنیش نەبون، خۆ ئەگەر بەوجۆرە بەرچاو دەهاتن بەهۆی ریشە درێژەکانیانەوە بوو. یەکێك سپی لەژێر عەبایەکی درێژ، یەکێك خورمایی لەناو چاکەت و پانتۆڵێکی خۆڵەمێشی، یەکەکەی دیکەیان بۆربەدەسماڵێکی خڕی دوراو لەسەرسەر، کە لەناوەڕاستی سەریدا (کیپا)یەك هەبوو. ئەمانە لە هەیوانەکەدا چییان دەکرد؟

- پیاوە ریش بۆرەکە وتی: خۆم دەناسێنم، ناوم (رابی[1] ئالیئەزر زیالبەربەرگ)ـە. پورە خاتونەکەت داوای لێکردوم تا ئۆرشەلیمی عیبرییەکانت پیشان بدەم.

- ئەو پیاوەی چاکەت و پانتۆڵی پۆشیبوو گوتی: من باوکە ئەنتوان دۆبۆرۆم. پێکەوە ئۆرشەلیمی کریستیانەکان دەبینین.

- پیاوی سێیەم بەدەنگێکی کەمێك پچڕ پچڕ وتی: من شێخ سلێمان ئەلحاجیدم. منیش ئۆرشەلیمی موسڵمانەکانت پێدەناسێنم. بەڵام هەرسێکمان پێکەوە دەڕۆین، رازیت؟

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: باشە، کەواتە ئێوە بەرامبەر بەیەکدی کینەتان نییە؟ گومانم هەبوو... مەبەستمە بڵێم بەمنیان راگەیاندبوو...

- شێخ ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: بەتۆیان وتبوو، کە ئێمەی پیاوانی خوا لە ئۆرشەلیم هەمیشە خەریکی شەڕو شۆڕین؟ ئێمەو چەندانی وەك ئێمە ئەو بێهودەییە رەتدەکەینەوە. ساڵانێکی دورودرێژ جولەکەو موسڵمانەکان لەسەر ئەم خاکە بەئارامی ژیاون. لەسەردەمی دەسەڵاتدارێتی تورکە (عوسمانییەکان)، جولەکەکان لەسەر ئەم خاکە لەئارامیو ئاشتیدا

[1] ربی- Rabbi: بەواتای خواناس یان دانیاری ئاینی دێت.

دەژیان... کاتێك لەکۆتایی سەدەی نۆزدەدا، جولەکەکان دەستیانکرد بەکۆچکردن بۆ فەلەستین، عەرەبەکان دەستیان بەڕویانەوە نەنا. ئیسلام ئاینی پێکەوژیان و خۆشەویستییە.

- (تیۆ) بەتامەزرۆوە وتی: بەمجۆرە بیردەکەیتەوە؟ بەڵام لەپاریس وانالێن!

- پورە (مارتا) بەشداریکرد: ئەوە سروشتییەو بەپێی مەبەستە هەڵەکانی رودەدەن. وامەزانە (تیۆ) هەموو شتێك دەزانێت! لەیادی مەکە، کە هیچ پەروەردەو زانیارییەکی ئاینی نەبینیوە. ئەمەم بەئێوە راگەیاندبوو...

- (حاخام)[٢] ـەکە وتی: کەواتە دەبێت لەکوێوە دەست پێبکەین؟

- شێخەکە وتی: کوڕی ئازیزم.. لەو شوێنەوەی هەمومان یەکدەخات و پێکەوەمان دەبەستێت.. یەك شت لەهەرسێ ئاینەکەماندا هاوبەشە ئەویش خوای تاك و تەنهایە، پەروەردگارە. هەڵبەتە ئەوەش راستە ئێمە بەیەك ناو بانگی ناکەین و لای جولەکە ناوی (الوهیم – Elohim)ـە.

- حاخام لەژێر لێوەوە گوتی: ئادۆنە – Adonaae - ئەدۆنە – الوهیم .

- شێخ بەنارەزاییەوە وتی: مەیشێوێنە. لای کریستیان ناوی (خوای باوکە) و لای موسڵمانانیش ناوی (الله). سێ کتێبە پیرۆزەکەمان هەرسێکیان بەیەك داستان دەستپێدەکەن، روداوی ئادەم و حەوا یەکەمین هاوسەرگیری مرۆڤایەتییە. پەروەردگار پێیانی راگەیاندبوو کە دەتوانن هەموو جۆرە میوەیەکی باخی بەهەشت بخۆن جگە لەیەك دانەیان میوەی جیاکردنەوەی چاکە لەخراپە...

- (تیۆ) وتی: ئەمە هەمان پرسی درەخت و مارە، بەڵێ، نەدەبوو سێو بخۆن! خوا نەیدەویست، بۆچی؟ تۆ باسی گوناهت کرد، دزینی میوەیەك....

- بەڵام تیۆ هەرکەسێك کارێکی قەدەغەکراو بکات گوناهی کردوە. ئەمە شتێکی سادەیە!

- حاخام (ئالیئەزر) بەشداری کرد: لەوبارەیەوە رێکین. کاتێك خوا فەرمان دەدات دەبێت تۆ پەیڕەوی بکەیت.

- (تیۆ) سەراسیمە بوو: سەیرە! ئەی کەوایە بۆچی سێ ئاین؟.

- حاخام بەردەوامبوو: لەبەرئەوەی ئێمەی جولەکە باوەڕمان بەوە نییە (عیسا) کوڕی خوا بێت.

---

[٢]. حاخام: خاخام– رەبانی، ناونیشانی زاناو پێشەوایانی ئاینی جولەکەیەو بەرامبەرە بە (حکیم)ی عەرەبی.

- شێخ سەری قسەکەی گرتەوەو گوتی: ئێمەش هەر بەو جۆرە. بەڵێ پەیامبەرە، بەڵام کوڕی خوا نەخێر!

(تیۆ) وتی: تێناگەم، ئەوە چییە جیاوازە لە نێوانتاندا؟

سێ پیاوەکە بەبێدەنگی لەیەکتریان روانی

- پورە (مارتا) وتی: ئاسانترین کار ئەوەیە کە هەرسێکتان سەرەتای ئاینی خۆتان رونبکەنەوە.

- حاخام وتی: کەواتە من دەست پێدەکەم، چونکە ئێمەی جولەکە خاوەنی پشکی کۆنترینین. هیچ کەسێکیش ناتوانێت نکوڵی لەوە بکات! پەیامبەرانی مەسیحیو ئیسلامیش پاش ئێمە هاتون.

- شێخ خێرا نارەزایی دەربڕی: ئێمە پەیامبەرانی جولەکەش بە پەیامبەری خۆمان دەزانین!

- پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: سلێمان بێدەنگ بە، نۆرەی تۆ نییە.

## بونێك یاسادانەرە

- حاخام وتی: باشە، ویستم بڵێم، کە ئێمە یەکەمین بونەوەر بوین بونی خوامان راگەیاند. ئەمە واتای چییە؟ باشە، بەو واتایەیە کە ئەو هەیە،کە ئەو خودی بونە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بون، چ ناوێکی سەیرە؟

- تیۆ، بەو هۆیەوە کە ئەو یەکێك لەخواکان نییە، خوای رەها، تەنها خواندە. ئەو زەمەن لەخۆ دەگرێت، ئەو هەیە. تێدەگەیت، ئەو هەیە!

- (تیۆ) وتی: نەخێر تێناگەم.

- بون، خود، لێڵو رازە. ئێمەی مرۆڤ کاتێك دەمانەوێت کارێك بکەین هێندە بەس نییە شتێك بڵێینو کارەکە مەیسەر ببێت، دیارە شتی وا نابێت! بەڵام خوا دەئافرێنێت، بۆ ئەو بەسە بڵێیت: (رۆشن بە)و روناکی دەربکەوێت.

- (تیۆ) وتی: پەلە مەکە. ئەگەر من بڵێم (من تیۆم) ئایا من بونم نییە؟

- حاخام وتی: باس لەکام تیۆ دەکەیت؟ ئەم تیۆیەی ئێستا یان ئەو ساوایەی کاتێك پێت نایە ئەم دنیایەوە یان ئەوەی لەدواییدا بەکۆمەکی خودت نەمر دەبیت. ئێمە هەین، بەڵام خودی بون نین. دەبینیت کە تۆ لەبوندا نیت، تۆ دێیت، گەورە دەبیت، کات دەتگۆڕێت، لەکاتێکدا کە خوا هەمیشە هەیە. خودێکی نەمرە!.

- (تیۆ) ملی نەدا: بەو مەرجەی باوەڕدار بم!

- وەڵامیدایەوە: تەنانەت ئەگەر باوەڕداریش نەبیت، ئەو بێباوەڕییە نابێتە ڕێگر تاخودێکی نەمر هەبێت، بەڵکو ئەوە تۆیت ژیان بەنارەحەتی دەگوزەرێنیت. پشت بەکێ دەبەستیت؟ بەدایك و باوكت؟ ئەوانیش ڕۆژێك دەمرن. بەوڵاتەکەت؟ ئەگەر هەیە ڕۆژێك نەمێنێت. کەواتە بەخودی خۆت؟ بەڵام تۆ دەگۆڕێیت. کێ یاسات پێدەڵێت؟ کێ پێتدەڵێت کە چ شتێك قەدەغەکراوە؟ ڕێگا بەخۆت دەدەیت کەسێك بکوژیت، تیۆ؟ نەخێر بەو جۆرە نییە؟. بێگومان وادەزانیت کەس ناکوژیت، تەنها لەبەرئەوەی کارێکی خراپ و ناشیرینەو تۆ خاوەنی دڵێکی میهرەبانت هەیە... هەڵەیە! تۆ کەس ناکوژیت، لەبەر ئەو هۆیە سادەیەی کە بنەمای شەشەمی (دە) فەرمانی خودی نەمر وادەڵێت. تۆ ناکوژیت، چونکە ئاینی جولەکە یاسای ئەخلاقی لەبەرامبەر کرداردا بۆ جیهان هێناوە. بەرامبەر نۆ بنەمای دیکەش بەهەمان شێوەیە، کە کۆی (دە) فەرمان یان (دکالۆك- Decalogue) پێکدێنن. بنچینەو ڕێسای جولەکە بونە.

- (تیۆ) لەسەرخۆ وتی: بەبڕوای من ئەگەر من بومایە کوشتنم نەدەکردە یاسای یەکەم. چ یاسایەك پێشی هاتوە؟

- یاسا یان(بنەما)ی یەکەم ئەوەیە کەتۆ هیچ خوایەکت خۆش نەوێت جگە لەخوای نەمرو هەتا هەتایی. دووەم ئەمەیە، بەرامبەر هیچ بتێك، هیچ وێنەیەك و شتێکی ناراستەقینە سەری نەوازش دانەنەوێنیت. لەبەرئەوەیە ئێمە خودی نەمرو هەتاهەتایی وێنە ناکێشین، چونکە لە دیدی خودی باڵاو بونی ڕەهاوە هەموو وێنەیەك کۆپی و دروستکراوە.

- بەڵام وێنەی عیسا دەکێشنەوە!

- (رابی) وتی: بەبیرتان دێنمەوە لەدیدی ئێمەوە (عیسا) خوا نییە، کە وێنەی دەکێشن ئەوە یاسای یەکەمەو هەڵبەتە ئەگەر پێویست بێت وێنەی خوا ببینین. کوڕەکەم، تەنانەت ناتوانرێت ناوی ئەو بونە بهێنرێتە سەر زمان... ئەمە فەرمانی سێیەمە، تێدەگەیت. ناو نەهێنانی خودی هەتاهەتایی بێهودەیە. لەڕاستیدا هۆکەی ڕونە، چونکە ئەگەر بەردەوام ناویت لەسەر زار بێت سەرئەنجام دەکەویتە شێوە سازییەوە. بەم پێیە نەوێنەو نەوتنەوەی ناوی خوای نەمرمان. فەرمانی چوارەم.... ئەها فەرمانی چوارەم گەلەك گرنگە. (تیۆ)! (ڕۆژی شەباتت لەیاد بێت، بۆ ئەوەی خۆت پاکیزە بکەیتەوە. شەش ڕۆژ کار دەکەیت. بەڵام ڕۆژی حەوتەم ڕۆژی بونی نەمرە). من لەو گروپە نیم، کە دەیانەوێت تەنانەت بزاوتی ئوتومبیلیش راگرن، بەڵام هەست بەواتای دەرونی ڕۆژی حەوتەم دەکەم.

منیش هەروەها. دەبێت پشویەك بدەیت، فەرمووا

حاخام بەگونجاوییەوە وتی: نەخێر کوڕەکەم. ڕۆژی حەوتەم ڕۆژێکی بەتاڵیی نییە. تۆ لەو ڕۆژەدا هەموو شت رادەگریت. هیچ کارێك ناکەیت. دوای ئەو ڕۆژەیە، کەدەتوانیت دەست بەکارەکانت بکەیتەوە، چونکە ئەگەر هەمیشەو بەردەوام کاربکەیت ئایا ئەوە پێی دەوترێت ژیان؟ ڕۆژی حەوتەم ڕۆژی پشودان نییە، ڕۆژی جەژنی بێدەنگییە. ماوەی نێوان تۆو جیهان. یەك بۆشایی، یەك بەتاڵیی پێویست.

- کەواتە تاڕادەیەکی وەك خەو؟

- خەوێکی زۆر بەئاگا! چونکە بەدرێژایی کاتی (شەبات) جولەکەکان چاودێرو بەئاگان... زیاد لەوەی بەخەو وێنای بکەیت، دەمەوێت باس لە پشوو بکەم، چونکە وشەی (پشوو)ش جۆرێك لەواتای بەتاڵی دەدات. ڕۆژی حەوتەم ڕۆژی پشوە لەپێناو هەتاهەتاییو خودی نەمر تەرخانکراوە. ڕۆژێکی پیرۆزە!

- پشودان، من حەزم بە پشودانەکانە. ئەی فەرمانی پێنجەم؟

- حاخام وتی: حەزیش بەمەیان دەبێت (ڕێز لەدایكو باوکت بنێ، بۆ ئەوەی ئەو ژیانەی، کە خودی نەمر پێیداویت، درێژ بێت). تۆ پەیوەستی بەوانەوە کوڕم. ڕێزدانان بۆ دایكو باوك واتا ڕیزگرتن لەژیانیانو نابێت بخرێنە ژێر پرسیارو لێکۆڵینەوەوە، لەیاد نەکردنیانو کردنەوەی دەرگاکانی ئایندە بەڕوی وەچەکانی خود...

- (تیۆ) هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: ئەگەر ڕێزگرتن لەدایكو باوك بەتەنها بۆ درێژبونی تەمەن بەسبوایە هیچ مەترسییەك روی لەمن نەدەکرد، بەڵام پزیشکەکان بەوجۆرە سەیری ناکەن، تێدەگەییت.

- حاخامەکە بەبڕشتێکی تەواوەوە وەڵامیدایەوە: پزیشکەکان ئاگایان لە نەخشەکانی خودی نەمر نییە! تەنها ئەوە فەرمان دەدات... فەرمانی باشیش دەردەکات. ئەو دەتوانێت بڕیاری شفای تۆ بدات.

- (تیۆ) وتی: سەیرە!

- من ئەو داوایەی لێدەکەم! پاش ڕێزگرتنی دایكو باوك، فەرمانی شەشەم دێت: (تۆ ناکوژیت!) چونکە ئەگەر تۆ پێداگرییەکانی خودی نەمر پەسەند نەکەیت، ئەگەر ڕێز لەپشوەکانی بون نەگریت، ئەگەر دایكو باوکت لا ئازیز نییە، ناگەیتە دەرککردنێکی دروستی ئەو داوایەی بۆچی نابێت بکوژیت. تۆ خودێکی نەمر نیت، پەیوەندیت بەهیچ ژیانێکەوە نییە.

- (تیۆ) کە بەفورسی کەوتبوە ژێر کاریگەرییەوەو گوتی: راستە من بەوجۆرە بیرم نەکردبۆوە.

- چوار یاساکەی دیکە قەدەغەکردنی زینایە لەگەڵ ژنی کەسێکی دی، دزیکردن، گەواهیدانی درۆو چاوچنۆکی بەسەر ماڵی خەڵکی دییەوە. باش سەرنج لەو خاڵە بدە. تۆ مافی ئەوەت نییە خراپە بۆ کەس بەڕەوا بزانیت. تۆ مافی ئەوەت نییە ساختەو نادروستی بکەیتە حەقیقەتی بونێکی دروستکراو نەساختە. زینا، دزی، درۆکردنو چاوچنۆکیو تەماع. لەبەرئەوەیە ئێمە دامەزرێنەری ئەخلاقو رەفتارین. ئەم راگەیاندنە بەراددەیەك دروستو راستەقینەیە، کە سەرەتاییەکانی ئاینەکەمان دەڵێن هەر لەگەڵ راگەیاندنی ئەو (دە) فەرمانە هاوکات بۆ حەفتا زمانی دیکە وەرگێڕاوە تا هەموو جیهان لێی شارەزا بن.

- (تیۆ) وتی: ئەوەم نەزانیوە. دونیا قەرزارباری ئێوەیە!

- (رابی) بەخەندەیەکی زەردەوە وتی: بەلام جیهان ئەم ئایینەی بە ئێمە نەبەخشیوە، جیهان ئێمەی بەهەموو خراپەکارییەکان تاوانبارکردوە. تەورات دەڵێت: ئێمە گەلێکی هەڵبژێرراوین. ئەمەش ئیرەیی بزواندوە! گەلێکی هەڵبژێرراو، دەستەواژەیەکی مەترسیدارە، ئەی کەواتە خەڵکی چی؟ مەحروم لە بونی ئەمر، بەرەلاکراو، رك‌و کینە؟ ئەوانی دیکە نازانن، کە ئەم بابەتە، چەند لای خودی خۆشمان وەك جولەکە ترسهێنەرە! ئێمە هەردەم لەبەردەم بونی ئەمر کەموکوڕیمان هەیەو لەباری گوناهکردندایەن... دەزانیت ئیسرائیل واتای چییە؟

- دەوڵەتی جولەکە؟

- باشە، بەلام ئیسرائیل لەپلەی یەکەمدا ناوێکی بونی ئەمرە بەگەلەکەی خۆی بەخشیوە. وشەی (ئیسرائیل) لە زمانی عیبریدا لەدوو سەرچاوەوە دێت: خەباتو خودا. یەکەمین کەس بەو ناوەوە ناونراوە (یەعقوب - Jacob) بوو: شەوێك لەخەوندا پەیژەیەکی بینیوە، کە لەزەوییەوە بۆ ئاسمان درێژبوەو فریشتەکان سەرو خورایان پیاکردوە... بونی ئەمری لەپاڵ خۆیدا بینیوەو ئەویش بەڵێنی خاوەنداریتی ئەو خاکەی پێداوە. پاشان (یەعقوب) ناچاربوە بکەوێتە مشتومڕ لەگەڵ (عسیو-Esou)ی برایو دەست بدەنە یەخەی یەکتر.

- (تیۆ) بەسەرسامییەوە وتی: براکەی خۆی؟ کەواتە لەنێو گەلی هەڵبژێرراویشدا شەڕی براکان هەیە؟

- (رابی) ئاهێکی کێشاو گوتی: بەڵێ هەر لەبەرایی دنیاوە. (قابیل- CaãËn) کوڕی ئادەمو حەوا (هابیل- Abel)ی برای خۆی کوشت. (عیسۆ)و (یەعقوب)یش دژ بەیەك شەڕیان کرد، لەشەوی پێش شەڕی دوو براکە فریشتەیەك لەئاسمانەوە هاتەخوار تا شەڕ لەگەڵ (یەعقوب) بکاتو بریندداری بکات... بەڵام (یەعقوب) دلێرانە بەرگری لەخۆی کرد، لەگەڵ سپێدەی بەیانیدا فریشتەیەك نیازی بوو هەڵبێت، (یەعقوب)یش داوای لێکرد پیرۆزی بکات. پاش ئەو شەڕە (یەعقوب) بریندار، بەڵام سەرکەوتوو بوو. ئەو ناوەی بەسەردابڕا، کە بونی نەمر پێیبەخشی: ئیسرائیل (چونکە فریشتەکە پێیڕاگەیاندبوو، کەتۆ لەگەڵ خودی نەمر بەشەڕ هاتویتو سەرکەوتیت).

(یەعقوب) دەستەبژێری خوا بوو. رۆژی دواتر (یەعقوب)و (عیسۆ) ئاشتبونەوە، بەڵام جەنگی درێژی ئیسرائیل لەوێوە دەستپێکردبوو، چونکە هەر لەو سەردەمەوە تا تاق ئێستا گەلی ئیسرائیل بەردەوام لەگەڵ خوای خۆیدا لەجەنگدایە.

- (تیۆ) وتی: هیچ خۆشم لەوکارە نایەت. بۆچی دەبێت لەشەڕو مشتومڕدا بیت لەگەڵ خوای خۆتدا؟

- (رابی) وتی: چونکە ئێمە مرۆڤین، چونکە براکان لەسەر میرات بەشەڕ دێن؛ هیچ کەسێك بەئاسانی ملکەچی نانوێنێت. لەدواداوشدا ملدان بۆ حوکمەکانی (دە) فەرمانەکەی بونی نەمر دژوارە!. هەموو حوکمەکان، هەر (دە) فەرمانەکە پێکەوە، ئای، کە رێگایەکی دورودرێژمان لەپێشە... بەڵێ رێگایەکی گەلێك دورو هێندە درێژ، کە باوەڕهێنان بەهاتنی مەسیح لەتەی کردنی ئەو رێگایە ئاسانترە. ئۆف، چەند بێسەریەشە بوو ئەگەر رۆژێك بیانوتایە فەرموو ئەوە مەسیح هاتوە! لەوێیە لە کۆتایی ململانێ ! پشودان ! بەڵام نا... هەرگیز بەوجۆرە نییە. لەگەڵ خودی نەمردا هەرگیز پرسەکە دوایی نایەت. دەڵێن بونی نەمر داوایکردوە گەلەکەی نمونە بێتو رێنیشاندەری خەڵکی بن. گەلی هەڵبژاردە ! چەند ئاسانە بانگەشەی ئەوە بکرێت، بەڵام دەبێت چ گرفتێك لەومەرجبەندییە گرانەوە دروست ببێت؟. ئاخ، ئێمە لەپێناوی هەموو ئەو پرسانەدا نرخێکی گرانمان بەخشی ! بەڵام توند تێدەکۆشین. بێ هۆ نییە، کە خودی نەمر بە (گەلێکی کەللەشەق) ناوزەدی کردوین...

- (تیۆ) وتی: بونی نەمریش زۆر میهرەبان نەبوە لەگەڵتان.

- بونی نەمر نەکەموکورتیو نەعەیبو عاری هەیە !؛ نەمرە، خودی بونە!

- (تیـۆ) وتـی: ئـەم گەمەیـە سـەرناگرێت. خواوەنـد تـوڕە دەبێـت، ئاشـتی دەکاتــ و دەبەخشێت؛ کەواتە خوا چاکەو خراپەشی هەیە ! وەك باوکە، وانییە؟

- (رابی) رونیکردەوە: ئەمە ئەو وێنەیەیە، کە ئێمەی مرۆڤ بۆ ئەومان داتاشیوە. بـەڵێ، تەورات دەڵێت خواوەند مەزنە، دانیارە، خەمخوارە، غەمگینە، میهرەبانە، بـەتواناو بەئیرادەیـە. ئەگەر توڕەبێت ترسناکەو ئەگەر میهرەبان بێت بەخشندەیە. هەنـدێکجار لەگـەڵ خۆیـدا نوێـژ دەکاتو نزا دەخوێنێت تا توڕەیی خۆی بنیشێنێتەوەو میهرەبان بێت.... ناتوانرێت بـەجۆرێکی دیکە وێنەی بکرێتو دیارە دەبێت تەورات بەزمانی تەنیاو تاکی مرۆڤ بدوێت تا مەبەستەکەی بگەیەنێت. بەڵام خەڵکی ئازادن گوێڕادێرن بۆ خـودێتی نـەمر یـان گوێیـان دابخـەنو بەرامبـەر بەوەی دەیڵێت خۆیان کەڕ بکەن.

- (تیۆ): ئازادن؟ بەرامبەر بەو دەستورو فرمانانە؟

- (یەعقوب) چیکرد؟ لەگـەڵ فریـشتە بەشـەڕ هـات... بـەڵێ، مـرۆڤ بەرامبـەر بـەخودی هەتاهەتایی ئازادە. ئەوەش پرسـە سەرنجراکێشەکەیە ! نـەمر بـانگی مـرۆڤ دەکـاتو چاودێری دەکات، لێیدەکۆڵێتەوە. ئەرکی سەرشانی مرۆڤە وەڵامی بداتەوە ! یان توڕە ببێت...

- سەیرە! چونکە جولەکەش هەیە کە توڕەبون؟.

- (رابـی) وتـی: بـەڵێ، یـەکێك لەوانـەی بـڕوای وابـوو نـاوی (ئـەیوب) بـوو، لەبەرئـەوە خواوەندی نەمر هاویشتیە بۆتـەی تاقیکردنـەوەوە، دوچاری فەلاکەت هـات. تـەواوی جەسـتەی دوچـاری گـەڕی کـرد، هیـچی بـۆ نەهێـشتەوەو (ئـەیوب) بێنـەوا بـەئازارو ناسـۆرێکی زۆرەوە قسەیدەکردو هەر سووربوو لەسەر ئیمانی بەخودی نەمر. بەڵام هاوەڵەکانی بڕوایان وابوو، کـە بێگومان گوناهێکی کردوە، ئەگینا بۆ دەبێت سزایەکی بەو جۆرە ترسـناکی پێـڕەوا ببینـرێـت؟. (ئـەیوب) پێیڕاگەیانـدن، کەهـەرگیز بـەو جـۆرە نییـەو مـن هـیچ کـارێکی ناشایـستەو خـراپم نەکردوە، ئەمە رەوا نییە، من بڕوام بەبونی هەتاهەتایی هەیە، بەڵام ناتوانم لەوە تێبگەم.

(تیۆ) وتی: ئەو پیاوە ئارامگرتنو حەوسەڵەیەکی سەیری هەبوە.

- ئۆو، نـەخێر!. ئـەیوب هەڵگەڕایـەوە! گلـەیی کـرد، کە ئـەو بونـە نـەمرە چـی لـەگیانی دەوێت؟ لەبەرچی ئەشکەنجەو ئازاری دەدات؟ سەرەڕای ئەوە بەقینەوە لەگەڵی دەدوێت... نەمر پێیدەڵێت: ( بوکارەت لۆمەی نەخـشەکانم دەکـەیتو نـاڕەزایی دەردەبڕیـت؟ کاتێـك مـن زەویـم ئەفراند تۆ لـەکوێ بویـت؟). لێـرەدا (ئـەیوب) تێـدەگاتو وەڵام دەداتـەوە: ( مـن بێـدەنگ دەبم،

قسەم زۆرکرد، ڕاستە. من جگە لە مرۆڤێك هیچی دیکە نیم). قەیرانەکە چارەسەر دەبێت. (ئەیوب) تەندروستیو سامانەکەی بۆ دەگەڕێتەوەو نغرۆی بەخشندەیی دەبێت.

- (تیۆ) پاش بێدەنگییەکی درێژ وتی: لەڕاستیدا ناشرینو نەگونجاوە. هیوادرام خوای هەتاهەتایی ئەو نەهامەتیانە بەسەر مندا نەدات.

- (رابی) وتی: من هیوادارم بەسەرتدا بدات ! چونکە لەو بارەدا چارەسەر دەکرێیت.....

## خودای قوربانی کراو

- پورە (مارتا) دروست لەوێدا گفتوگۆکەی بڕیو گوتی: باشە ! (ئالیئەزر)، تۆ ماوەیەکی درێژ وتاری خۆت خوێندەوە. ئێستا بەپێی سەردەمی سەرهەڵدان نۆرەی تۆیە باوکە.

- باوکە (دۆبۆر) بەمجۆرە دەستیپێکرد: ئێمە بە (مەسیحی - Chrestin) ناودەبەنو ئەمەش لەوشەی (مەسیح - Chrest)وە دێت، کە لەڕەگی (کرستۆس - Chrestos)ی یۆنانییەوەیەو بەرامبەرە بە (مەشیا - Machiah)یەو لەزمانی عەربیدا واتە (ئەو کەسەی چەورکراوە). مەبەست لە (مەشیا) لەئاینی جولەکەدا (حاخام)ی گەورەیە، کە پیرۆزکراوەو ڕۆنی پیرۆزکراوە بەسەریاو تەنها ئەو دەتوانێت لەپەرستگای خودی نەمردا قوربانی بۆ بکات، بەڵام لە دیدی جولەکەکانی ئەو سەردەمەوە (عیسا) بەوجۆرە پیرۆزکراو نەبوە، واتا چەور نەکرابوو، هەرلەبەرئەوەشبوو حاخامی گەورە (کییف)، کە چەورکراوی فەرمی خوا بوو، دژایەتی کرد.

- (تیۆ) وتی: پیاوێکی پیس بوە.

- باوکە (ئەیوب) وەڵامیدایەوە: نەخێر. پاسەوانی پەرستگا نەیدەتوانی کەسێك پەسەند بکات، کە دەیوت کوڕی خوایەو چەوریش نەکرابوو. لەبەرئەوە (عیسا) کەوتبوە ناو شوێنکاتێکی هەستیارەوە. لە (بێنانی)[1] (مەریەمی مەجدلیە)[2]، کە ژنێکی داوێن پیس بوو، خاکیانە خۆیداوە بەسەر قاچی عیساداو بەڕۆنێکی زۆر گرانبەها قاچەکانی هەنوو.

- شوێنکەوتوانی هاواریان کرد: چ دەستکراوەیەکە ! لەدەورگێڕانی ئەو هەمووو دراوە بۆ دەربڕینی تەنها جولەیەکی خۆبردنە پێشەوەیە؟ بەڵام (عیسا) ڕێگای پێدا کاری

---

[1] Bethanie. گوندێکی نزیك ئورشەلیم، لەتەنیشت باخی زەیتونو ماڵی مارت، (مەریەم)و براکانی. و. کوردی.

[2] مەریەمی مەجدەلیە: بەپێی هەندێك بیروڕای نوێ گوایە بەنهێنی لەگەڵ عیسادا هاوسەرگیری کردوەو پاش لەخاچدانی عیساش بە دوگیانی هەڵاتوە بۆ فەرەنساو ئێستاش نەوەکانی بەنهێنی درێژە بە ژیان دەدەن.

چەورکردنەکەی تەواوبکاتو رۆنی بۆنداری بەسەردابکاتو ئینجا وتی: (دەیـەوێت پەیکەرەکـەم بۆ ناشتن ئامادە بکات).

(تیۆ) وتی: هەر وەك چۆن جەستە پێش ناشتن دەهەنون؟

- بـەڵێ. هەرچـەندە هێشتا مەسیح بەمـەرگ حـوکم نـەدرابوو، کەچـی لـەبیری ئـەوەو هەسـتانەوەی پیرۆزیـدا بـوو. (مەریـەمی مەجدلیـە) هیـچی لەوبارەیـەوە نـەدەزانی، بـەلآم لەکارەکەشیدا دوودڵ نەبوو: بەجۆرێکی رەمەکی سەری (عیسا)ی بەگرانبەهاترین رۆن شوشت، هـەروەك چـۆن نۆکـەرێك گـولآوپرژێنی شـازادەیەك دەکـات. چـونکە ئـەو ژنـە خاکییـە خـۆی بەگوناهکار دەزانیو تێگەیشتبوو کە (عیسا) بە رۆن هەنوی دەستی پەروەردگارە.

- لەڕاستیدا وەکو پاشایەك؟

- حاخامە گەورەکانی ئیسرائیل هەم پاشا بونو هەم پیاوی ئاینی. رۆنی چـەورکردن لـە زەیتـون دەگـیرا، هەرلەبەرئەوەشـە کریـستیانەکان (عیـسا) بـە(زەیتـونی پـیرۆز)یش ناودەبـەن، چونکە لەخاچدانەکەی وەك زەیتونی بەردەزگای کوتانـدن بـوو، خوێنەکـەش چـەورییەکەی.... (تیـۆ) لەبەرئـەوە (عیـسا) لەپاشـا زیـاتر بـوو، کـوڕی خـوا بـوو !، بنـچینەی پرسـەکەش لـەو پنتەدایـە. ئـەو لـەحیاتی ئـەوەی قوربـانی بـۆ پەرسـتگاکە بـدات خـۆی بـۆ قوربـانی پێـشنیاز دەکرد... لەوێشدا ژنێکـی گـەناهکارە نافـەرمانی کـردوەو بـە (رۆن لێـدراوی پـەروەردگار) نـاوی بردوە. لەڕوبەڕوبونەوەیەکی رێکەوتدا چشاردنەوەیەکی بـەرزو گـەورە بـوو!. بـۆ یەکـەمجاربوو خوا رازی بێت خـۆی لەجەسـتەی مرۆڤێکـدا دەربخـات. دەبـوە بـاوك و کـوڕ، کـەمردیش دوبـارە هەستایەوە. گۆڕانێکی مەزنو ریشەیی، بەلآم درێژەی لۆژیکانەی تەورات، چونکە گەلی جولەکە چاوەڕوانی مەسیح بون.

- (تیۆ) وتی: هەر کەمەسیح پێینایە سەر زەوی جولەکەی پشتگوێخست ! .

- تیـۆ، عیـسا لەگـەڵ جولەکـەدا پەیوەنـدی نەپـچڕاند. (عیـسا) وەك جولەکـە هـاتبوە دنیـاوەو نکـوڵی لەحوکمـەکانی (دە فەرمانەکـە)ش نـەکرد.... بەپێـچەوانەوە! ئـەو فەرمانانـەی فراوانکرد. مەسیح لەکتێبی (لاویان)[1] یەکێك لەئامۆژگارییەکانی دواین فەرمانەکانی دەرکێشاوە، کە ئەو فەرمانە رادەسپێرێت نابێت دزی بکرێـت، نابێـت بـە چـاوی هەوەسـەوە لـەژنێکی دیکـە

[1]. لاویان (Le Live du Levitique) کتێبی لویتیك یان لاویان سێیەمین کتێبی تەوراتە لەگەڵ چوار کتێبەکـەی دیکـە (ئەفراندن (سـفر) – دەرچـون (خـروج) – سـەرژمێری (اعـداد)و دوتـاکردن (تپنیـە) (یاسـاکان) یـان (ئەسـفاری پێنجـەکی – Pentateuque) پێکدێنێت، کە بەتەورات ناودەبرێت. و. کوردی.

بروانرێـتو خراپــە دەرهــەق کەســانی دیکــە بکرێــت... ئینجـا ئەمــەی لێدروسـتکرد کــە (هاوشـێوەکەی خۆتـت وەك خـۆت خۆشـبوێت). خۆتـت خۆشـبوێت تـا هاوڕەگـەزەکانی خۆمـان خۆشبوێت. خۆویستنو خۆ خۆشویـستن، کـە لـەلای خـەڵك کـارێکی ئاسـاییە دەبێـتو دەکرێـت، دەکرێـتو دەبێـت بـۆ هـەموان بـەبێ جیـاوازی پیادەبکرێـت. یەکـسانی تـەواوی نێـوان خـودو نەویدیکە: ئەوەی (عیسا) دەستورو رێسای خوایە بۆ سەرانسەری جیهان.

- (تیۆ) رایگەیاند: نمونەو مۆدێلی جیهان، جولەکەکانیش باسیان لەوەکرد.

- بەڵام (عیسا) کوڕی خوایە!. بونی هەتاهەتایی هەمان ئەو باوکەیە، کەگورەکـەی خـۆی وەك مرۆڤێك لە گۆشت، کە دەخواتەوە، دەنۆشێت، ئازار دەچێژێتو دەمرێت، ناردە سەر زەوی. بونی هەتاهەتایی ئیـدی تـەنها دەنگێکـی شـاراوەی فەرمانـدەر نییـە: بـەڵکو خـۆی لەئافەریـدەو دەسکردەکانی خۆی نزیك دەکاتەوە. چرِوداوێکی موعجیزە ئاساو سەرسوڕهێنەرە! خـوا بـۆ نـاو خەڵك دابەزیوە! وشە لەقاڵبی گۆشتو جەستەدایە!

- وشـە؟ وایـە: چـونکە لەڕسـتەدا کـردار ناسـێنەری کارەکەیـە. بـەڵام هـەم بـۆ ئێمـەی کریستیانی و هەم بـۆ جولەکـەش قـسەی خـوا کاردەکـات، چـونکە دەئافرێنێـتو خـەڵق دەکـات. بـەڵام پـێش لـەدایکبونی مەسـیح خـەڵکی تـەنها لەرێگـەی گوێـچکەوە پەیوەنـدیان بـەخواوە دەکـرد... لەتەوراتـدا خـوا فـەرمان دەدات، تـوڕە دەبێـت، ئـارام دەبێـت، بـەڵام کـەس نایبینێـت. نەوەندە بەس نییەو خەڵکیش بەرگریان دەنوانـد. لەبەرئـەوە وشـەکانی خـۆی کـرد بەگۆشـتو جەستە. ئێستا دەیـانتوانی دەسـتی لێبـدەن، گفتوگۆی لەگـەڵ ئـەنجام بـدەن، لەسـەر رێگاکـەیو لەپشتەوە هەنگاو بنێن، لەخۆراکدا هاوبەشی بکەن، نیگاکانی ببینن، لەچۆڕانەوەی خوێنەکـەی بروانن. خوا خۆی بۆ مرۆڤ گۆڕیبـوو. چـئارامیو دڵڕازیبونێـك، لـەدایکبونی خـوا چ داسـتانێکی سەیرە!

- (تیۆ) وتی: بەڕاستی خراپ نییە ئەگەر باسی ئەوە بکەیت کەچۆن پاکیزەیـەك منـاڵی دەبێت؟

- باوکە (دۆبۆر) وەڵامیدایەوە: راسـتە. روداوی لـەوجۆرە واباوە پەسـەندکردنی سـەخت بێـت. دەربـارەی (مەریـەم) زۆر کـەم دەزانـین. کـچێکی زۆر قەشـەنگ بـوە. بـەپێی نـەریتێکی جولەکـە، کـە بـە (نـەزر) ناودەبرێـت، نـەزری خواکرابـوو. ئـەو نەریتـەی باسـکرا لەسـەر ئـەو بنچینەیەیە، کەکەسی نەزرکراو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەبێ نۆشـینی یـەك دڵۆپ شـەراب یـان خواردنی دەنکێـك تـرێو پـرچ بـڕین خـۆی بـۆ خـوا تـەرخان دەکـات. (مەریـەم) لـە (ناسـریە -

Nazarcth) وەك گوندییەكی بێناونیشان وەك ئەوەی هەرگیز نەبوبێت دەژیا. (مەریەم) دەسگیرانی (یوسف)ی دارتاش بوو. خوا نەناسراوترین ژنی جولەكەی هەڵبژاردبوو، سروشتییە! چونكە پەیامەوەرگرانی (عیسا) كەسانی هەژارو سادەو دەستكورت بون.

- (تیۆ) لەژێر لێوەوە وتی: زۆر باشە، بەڵام چۆن توانی بەبێ جوتبون لەگەڵ پیاوێكدا منالی ببێت؟

- ئەمە دروست هەمان ئەو شتەیە (جوبرەئیل)ی فریشتەی خوا پێیرادەگەیەنێتو موژدەی دەداتێ كە بەو زوانە منالێكی لەخواوەندەوە دەبێتو (مەریەم)یش بیردەكاتەوە (چۆن شتی وا دەبێت، لەكاتێكدا هیچ پیاوێكم نەناسیوە؟).

- (تیۆ) دەمودەس وەڵامدەداتەوە: (یوسف)ی دەناسی!

- باشە، لەنوسیندا (ناسین) ....دەتوانێت .... دواجار .. واتای هاوسەرێتی بدات، بەڵام (مەریەم) بەسادەیی دەڵێت پاكیزەیە، تێدەگەیت؟. وەڵامی (جوبرەئیل)ی بەهێواشی پێیدەگات: (ئەو كەسەشی لەتۆ دەبێت پیرۆزە). لەهەمان ساتدا (مەریەم) هەستدەكات خوێنی فریشتە لەسكیدا دەسورێت (هەرهێندە) ئیتر رویداوەو ئەویش بەبێگومانو دودڵی باوەڕیكردوە!. شادمان بوو، خۆشییەكەی بەگۆرانی دەربڕی، چونكە ئەو دەستەنێژەی خوابوو. دەزانیت تەمەنی چەندبوو؟

- (تیۆ) بەنارازییەوە وتی: تۆ نەتگوت چۆن خوا چوە ناوییەوە؟

- باوكە (دۆبۆر) بەهەست بەنازارەوە وتی: هەر ئێستا بەتۆم راگەیاند! دلۆپێك خوێن، فوپیاكردنێك، بێدەنگییەك... دەنگی خوا!

- (تیۆ) گەیشتە ئەنجامێك: باشە، كەواتە لەوبارەدا (مەریەم).. (موسا)یە لە شێوەی كچێكدا، چونكە ئەویش دەنگی خوای دەژنەوت. بلێ بزانم خوا، كە پەیوەندی بەخواستو دیدو بیروباوەڕی خەڵكەوە نییە خۆی هەڵدەبژێرێت، خۆی بڕیار دەدات...

- پاكیزەیەك هەڵدەبژێرێت تا گوناهی پاكیزەیەكی دیكە (حەوا) بشواتەوەو قەرەبوی بكاتەوە. (ئایرنە)[1]ی ناوداری گەورەی مەسیحی، كە یەكێكە لەو كەسانەی بە (باوكانی كڵێسای مەسیحی) ناوی دەبەین نوسیوێتی: (پێویستبوو پاكیزەیەك بەقبوڵو بریكاری پاكیزەیەكی

[1]. Irencc باوكو یاسا دانەری كڵێسا (لەدایكبوونی نیوەی یەكەمی سەدەی دووەمی زاینی لە ئاسیای بچوكو لە لیۆدانی فەرەنسا مردووە لەسەرەتای سەدەی سێیەم)، (ئیرنەی قەدیس) یەكێكە لەكەسایەتییە گرنگەكانی كڵێسای كاسۆلیكی بوو. رۆژی (٢٨ ی ژوین)ی هەموو ساڵێك یادەكەیەتی.

ـیکە سەرپێچی پاکیزەیەك بەملکەچیو گوێڕایەڵی پاکیزەیەکی دی قەرەبوو بکاتەوەو ئەو ـخیبونە بسڕێتەوە).

- (تیۆ) بەشکۆمەندییەوە وتی: ئێ، لێرەدا بوەستە نافەرمانی پاکیزەیەك واتە ـفەرمانی حەوا، ملکەچیو گوێڕایەڵی واتە مەریەم، ئەی لێرەدا بابەتی بریکارو لەجیاتی جییە؟

- چونکە (مەریەم) بریکاری هەموو ئەو کەسانە بوو بەگوناهە ئاڵودە بونو خراپەکاربون. هەمیشە لەلای کوڕەکەی دەبوو بەمیانجیگەری جۆری مرۆڤەکان؛ هەمیشە ھەستی میهرەبانی هەبوو، چونکە تەنانەت بۆ ساتێکیش دوودڵو ڕاڕا نەبوو، ئیدی خوا کردییە ـشێك لەچاکەکانی خۆی. (مەریەم) توانی بەرگری لەخەڵك بکات، بەئاگایان بێنێتەوەو ئارامیان بکاتەوە. (مەریەم) وەکو هەموو خەڵکی دی نەمردوە. خەوتوەو جەستەی بۆ ئاسمان هەڵکشاوە. ئێمە خەوەکەی بە(دۆرمیشن)و هەڵکشانی بۆ ئاسمان بە (ئەسۆمپشن) ناو دەبەین، کە بەواتای (هەڵکشان)و سەرپەرگرتنە.

- (تیۆ) وتی: کەواتە ئەو بەڕاستی نەمردوە؟

- باوکە (دۆبۆر) درێژەیپێدا: نەخێر. ئایا دەتوانی لەناوچونی جەستەی دایکی (عیسا) لەبەرچاودا بەرجەستە بکەیت؟ شیاو نییە! بەجۆرێك نەشیاوە، کە لەسەدەی چواردەدا ناودارانی کڵێسە بەڕاشکاوی ڕایانگەیاند: کەمەریەم تەنانەت بەگوناهی دایکی هەموو مرۆڤایەتی، واتە حەوا، ئاڵودە نەبوە. دایكو باوکیشی بە پاکیزەیی هێنایانە دونیاوە... واتە خوا لەپێشدا لەدایکبونی پاکیزەی مەیسەرکردوە.

- پێمبڵێ، ئەگەر خودی (عیسا)ش خوایە، کەوایە یان من بەهەڵەداچوم، یان ئەوەی لەو بارەدا (مەریەم) دەبێتە کوڕەزای ئەو؟.

- باوکە (دۆبۆر) وەڵامیدایەوە: ئەگەر ڕاستت دەوێت وایە. ئەمەش لەهەمان ئەو شتەیە کە (سنت ئاگۆشتن)[1] دەیڵێت.

- (تیۆ) بەسەغڵەتییەوە وتی: شتی لەوجۆرە هەرگیز نەبینراوە، ئەی (یوسف)ی بێچارە لەو نێوەندەدا چکارەیە؟

---

[1]. Saint-Agostin (Aorclivs Avgustinvs) لەگەورەترین کەسایەتییەکانی کڵێساو یەکێك لەباوەکانی کڵێسای کاسسۆلیکی، کە لەساڵی (٣٥٤ تا ٤٣٠) زاینی ژیاوە سەرەتا حەزی بە (مانوی کری) بوەو پاشان لێکۆڵینەوەی فەلسەفی نوێی ئەفلاتونو کەوتۆتە ژێر کاریگەری (سنت مۆنیکا)ی دایکیو پەیوەندی بە مەسیحەوە کردووە. و. کوردی.

- بەڵام (یوسف) لەخێزانێکی چاك و بەڕێز بوو!. لەئەنجامی پاشایەتی (داود)دا هەردەبوو وابێت، چونکە خواوەند رایگەیاندوە (مەسیح) لەڕەچەڵەکی ئەو پاشایە دەبێت... لەلایەکەوە (یوسف) پیاوێکی نائاسایی، جولەکەیەکی بڕوادارو فریشتە لەگەڵ ئەمیش دواوە. ئەوەش کاتێك بوو کەپێیڕاگەیەنرا: (مەریەم لەخۆ بگرە، منداڵ و دایکەکەش ببە). یوسف بێدوڵی ملکەچی نواند..

- لەگەڵ ئەو جیاوازییەی کە باوکی راستەقینەی (عیسا) نەبوو!

- باوکی (عیسا) خوایە. ئێمە لەخواوەندا بڕوامان بە سێ کەسێتی هەیە: باوك، کوڕو رۆحی پیرۆز.

- (تیۆ) هاواریکرد: چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد! لەڕاستیدا ئەو رۆحە پیرۆزە چییە؟

- باوکە (دۆبۆر) وتی: هەناسە (نفخە)ی خوایە، دەنگی فریشتەیە کاتێك سەرقاڵی قسەکردنە لەگەڵ (مەریەم). لێرەدا ئەو باوکە بڕیاردەدات، کوڕە رەهایی دەبەخشێت و رۆحی پیرۆزی بەهرە دەدات: سێ لایەك (سێکوچکەی پیرۆز)؛ خوا لە سێ کەسایەتیدا: یەکێ: خوای جولەکەکان، ئەوی دی کوڕی تاقانە، کەهەمان فریادڕەسی جیهانەو سێیەم ئەو بەهرەیەی لەنێو ئێمەی خەڵکدا سەرهەڵدەدات.

- (تیۆ) پرسی: سەرئەنجام بڵێ بزانم (عیسا) چی بۆ خەڵك هێناوە؟ ئەوەی کە یەکێك لە ئێمەیە بەس نییە.

- باوکە (دۆبۆر) وتی: نەخێر، (عیسا) هیوای بەڕزگاربونی هێنا. دابەشکردنی ئەو شتەی بۆ ناو هەموو خەڵك هێناوە کەبەچاکەکاری ناودەبرێت و یادویادەوەری مانەوەی فیداکاری ئەوە. ئێمە لە سروتی (میس) یان رێوڕەسمی کۆگەلی نزای کڵێسادا ئەوە بەرز دەنرخێنین، چونکە (عیسا) لەدوا شێوکردنیدا نانی لەنێوان دوانزە هاوەڵیدا (حواری) دابەشکردو پێیوتن: (بگرن هەموتان لێیبخۆن، ئەمە جەستەی منە). ئەوەشی بەمشەرابەوە کردو گوتی: (ئەوەش خوێنی منە). قسە بۆ گۆشت و جەستە گۆڕا، بەڵام لەوەش زیاتر، چونکە جەستەی خوا لەنان و شەرابدا بەرجەستەبوو.

- (تیۆ) وتی: جەستەی من بخۆن، خوێنی من بنۆشن، ئەمەش مرۆڤ خواردنە!

- پیاوی کڵێسا بەمۆنییەوە وتی: هەرگیز بەوجۆرە نییە. (عیسا) خۆیکرد بەقوربانی، بەڵام مادەی جەستەی لەنان و شەرابدا جێگای گرت!. بەقوربانیبونی جەستەی (عیسا) دواهەمینە، کۆتاییە... لەوەودوا ئێمە بەنان و شەرابەوە یادی دەکەینەوە: پێش مەرگی

ـەنێمەی وت: (هەموتان لێی بخۆن) هەموو، تێدەگەیت تیۆ؟. کێشکردنی جەستەی پیرۆزی (عیسا) وەك ئەوەیە لەناو ددانەکانتدا رایگریت، بەزمان هەستی پێبکەیت، قوتی بدەیت. ئەوە ڕوداوێکە بەجەستەو تەنی تۆدا گوزەر دەکات. ئەو نانە فەتیرەیە نەزرکراوەی ئێمە بە hostie) ناوی دەبەین گۆشتو تەنی مرۆڤ نییە، بەڵکو جەستەیەکی شێوە گۆڕاوی خوایە... ئەمە مرۆڤخۆری نییە، دابەشبوونێکی خواوەندی جیهانە، تێدەگەیت!

- (تیۆ) پرسی: ئەم باوەڕەی ئێوە ئاڵۆزترو رازدارترە لەئیمانی جولەکەکان. وەك دەبینی دەبێت مرۆڤ بڕوا بەچەند موعجیزەیەك بکات؟ پاکیزەیەك پاكو باش هاتۆتە دنیاوە، کە بەتەنها بەهەناسەی رۆحی پیرۆز دوگیان دەبێت، خوایەك لەسیمای مرۆڤدا دەردەکەوێت، کە دەمرێت دوبارە زیندوو دەبێتەوەو جەستەی نانو خوێنی دەبێتە شەراب.... بەکاری چی دێت؟

- باوکە (دۆبۆر) وتی: یەکەم بۆ نزیککردنەوەی خواو مرۆڤەکانو پاشان نزیککردنەوەی مرۆڤەکان لەنێوان خۆیاندا. لەوێوە خوا خۆی لەخەڵك نزیك کردەوە، ئێمەش دەتوانین ئەو نمایش بکەین. وێنەکێشانەوەی لەدایکبونی، ژیانی، ئازارو ئێشەکانیو ژیانی دوبارەی. پەیکەرتاشی جەستەی زیندوو یان مردوو، پێدانی کرێ بەئەکتەرەکان بۆ بینینی رۆڵی ئەو لەسینەماو دوبارە بەرجەستەکردنی لەبەرچاوماندا، بونەوەرێکی مرۆییو خوایی. ئەو فیداکارییە دوبارەیە بەبەخشین بەکەڵکی رەهایی لەگوناهە و گەناهکاری دێت. بەکاردێت بۆ سڕینەوەی ئازارەکانی رابردوی گەلی ئیسرائیل لە پێداکێشانێکدا، بۆ بەستنی پەیمانێکی نوێی هیواو برایەتی (یەکێتییەکی نوێ) (سەردەمێکی نوێ)، فیداکاری خوا بۆ گەڕانەوە بۆ ئەو بەهەشتەی لێی بەدەرنراین.

## دواین سروشی خو

- پورە (مارتا) وەك رێکخەرێکی کارامە سەری گفتوگۆکەی گرتەوە: سلێمانی ئازیز، ئێستا نۆرەی تۆیە. چانسو بەخت روو لەتۆیە، چونکە تۆ دوا کەسیت قسە دەکەیت!

- شێخ دەستێکی هێنا بەریشەکەیدا وتی: ئینشاالله. بەپشتیوانی خوای گەورە. باشە. دۆستی ئازیزم تۆ راستدەکەیت، چونکە لەراستیدا ئێمەی موسڵمانان دوایەمینین. یەکەمین سروشی خوایی گەلی جولەکەی ناچار بە گوێڕایەڵیو فەرمان راپەڕاندن نەکرد. (ئالیئەزر) خۆتان ئەمەتان باسکرد، کەجولەکە هەر لەسەرپێداگرییان لەململانێ لەگەڵ خوای نەمر بەردەوامبونو درێژەتان پێدا. کاتێك (عیسا) سەریهەڵدا بەقوربانیبونی ئەویش بەس نەبوو،

چونکە هێشتا لەجیهانـدا خـەڵکێکی زۆر هـەبون بڕوایـان بـە تـاکێتی خـوا نـەهێنابوو. وانییـە ئەنتوانی ئـازیز؟. لەبەرئـەوە خـوای تـەعالا حـەزرەتی (موحەمـەد)ی وەك دوایـن پەیامبـەر بـۆ سروشەکەی هەڵبژارد، کەپاش ئەو سەرهەڵدانی هیچ پەیامبەرێکی دیکە ئەگەری نییە، چونکە خوای تەعالا هەموو یاساکانی بۆ پەیامبەرەکەی خستەڕوو.

- (تیۆ) وتی: بۆ شتێك مابوو هێشتا شاراوە بێت؟ تێناگەم!

- (تیۆ).. دەبێـت پـێش هـەموو شـت ئـەوە بـزانین خـوای مـەزن هـیچ فـەرامۆش ناکـات. لەهەموو شتێك دەدوێت. کاتێك دەقی قورئان بۆ (موحەمـەد) تـەواو دەکـات ریـزی پەیامبـەران دەژمێرێت: ئادەم، ئیبراهیم، نوح، موسا، عیسا، کەهەمویان پەیامبـەری قـسەکانی بـونو ئەوانـە بۆ ئێمە پەیامبەر بون. (دە) فەرمانەکە بۆ ئێمەشـە. ئێمـە هـەرگیز سـیمای خـوا ناکێـشینەوەو هی پەیامبەرەکانیشی. جیاوازی لەوێدایە، کەخوای بەخشندەو میهرەبان لەلای ئێمە زۆر رونـتر یاساکانی خۆی خستۆتە روو. لەجێگای ئەم رستەیە کە (تۆ جگـە لـە خـوای خـۆت کەسـی دیکـە ناپەرستیت) قـسەی خواوەنـد دەبێت بەمـە: (خوایـەك نییـە جگـە لـە (الله)و (موحەمـەد)یـش نێـراوی ئـەوە). ئـەم رسـتەیە بـەو واتایەیـە کـە ئیـدی سـروش کۆتـایی هـاتوە؛ تـەواو بـوو. (موحەمەد)یش دواین پەیامبەری خوا بوەو دەبێت.

- پەیامبەرەکەی تۆ چ شتێکی جیاوازو جودای هەبوو؟

- پەیامبەرەکەی ئێمە، سەڵاوات لە دیاری، خۆی بـەکوڕی خـوا نەدەناسـاند. چۆن دەکـرا خوا منالێ هەبێت؟ ئێمەش وەکو جولەکە لەو بڕوایەداین خواوەند ئەفرێنەرێکی نەمرە، بـەڵام ئەو ئەفرێنەرەو خودی ئەو نەئەفرێنراوە.

- (تیۆ) بەگومانەوە وتی: ئەفرێنراو (مخلوق) نییە؟ لەکەس نەبوە؟

- بـەڵێ وایـە، ئەفرێنـەر لەکـەس نـەبوەو کەسیـشی لێنابێـت، چـونکە ئـەو سـەر بەکاتـە (زەمـان)، نـەژیانو نەمـەرگ. ئەگـەر کەسـی لێبکەوتایەتـەوە، ئەگـەر بـاوك بێـت، ئەوکاتـە بێکۆتـایش دەهاتـە ناوکاتـەوە! ئەمـەش تـەواو هاوئاهـەنگ نییـەو نـەگونجاوە. لەبەرئـەوە پەیامبـەری ئێمـە خـۆی بـەکوڕی خـوا ناناسـێنێت، بـەڵکو بەدەسـتەنێژەی ئـەو. کاتێـك خـوا (جوبرەئیـل)ی فریـشتەی بـۆلای هەڵبژاردەکـەی نـارد فەرمانیپێـدا ئـاینێکی کامـڵو تـەواو جێگیربکات.

- (تیۆ) وتی: باشە، پاشان چی؟

- ئەو کێبوو؟ پیاوێکی زۆر هەژار، کە لەساڵی (٥٧٠) لە مەککە لەدایکبوو، بۆ نان پەیداکردن دەستیکرد بەکاسبی لای ژنێکی دەوڵەمەند بەناوی (خەدیجە). پاشئەوەی لەگەڵ ئەو ژنەدا هاوسەرگیری کرد، خواوەند گفتوگۆی لەگەڵ کرد.

- (تیۆ) وتی: وەك موسا؟

- بەڵێ، لەو تافەدا لەئەرەبستان، کە شوێنی نیشتەجێبونی بوو، پیاوان دڕندانە دژ بەیەکدی دەجەنگان و رەفتاری توندوتیژیان بەرامبەر بەژنان هەبوو؛ دەیانفڕاندن و دەستدرێژیان دەکردنە سەر. نزیکەی سێسەد بتی داتاشراو لەبەرد یان لەقوڕی سورەکراویان دەپەرست. خوای جۆربەجۆر بۆ بەرهەم و کشتوکاڵ و خاك، لەسەر هەمان شێوەی (کەنعانییەکان). وەك سەردەمی پەیدابونی جولەکەگەرایی (Judou Emse)، کە ئەو جۆرە بتانەیان دەپەرست.

- (تیۆ) وتی: کەواتە لەو دەمەوە هیچ نەگۆڕابوو؟

- شێخ ئاهێکی کێشاو گوتی: بەداخەوە نەخێر. دەبوو هەموو شت سەرلەنوێ دەستپێبکاتەوە. خوای گەورە بڕیاریدا بۆ هەمیشە کۆتایی بە پەرستنی بتەکان بهێنێت. بەهرەی بەخشییە ئەو پیاوەی وەك پەیامبەری خۆی دەستنیشانی کردبوو. رۆح و جەستەی هاویشتە بۆتەی تاقیکردنەوەوە تا ئەو توانایەی بداتێ بەروونترین شێوە بئاخڤێ. لەڕاستیدا ئەوە راهیبێکی کریستیانی بوو یەکەمین ئاماژەی هەڵبژاردنی خودایی تێدابینی... هێشتا لەقۆناغی پێگەیشتندا بوو، کە (بحیرە) پێیڕاگەیاند (تۆ نێردراوی خودایت، پەیامبەرێك، کەئینجیلی من بەڵێنی هاتنی داوە).

- (تیۆ) لەسەرخۆ وتی: مەسیحێك؟

کابرای بەتەمەن بەئارامی قسەکەی (تیۆ)ی راستکردەوە: (تیۆ) پەیامبەر نەك مەسیح. (موحەممەد) چل ساڵ بوو، کەخوی پێوەگرت بەتەنها بچێت بۆ ئەشکەوتی (حەڕا)ی نزیك (مەککە). لەسەرەتای سروشدا ئەزمونێکی تاڵی تێپەڕاند. بەهرەی خواوەند ئازارو مەینەتییەکی تۆقێنەری بۆ دروستکرد... هەمان ئەو فریشتەیەی ناوی (جوبرەئیل)ە، کە پەیامی خوای بە (مەریەم) گەیاندبوو، چوو بۆ لای (موحەممەد)یش. لەوێدا ( موحەممەد)زانی لە قۆناغی بێخودیدایە. سەری وەك ئاگر دەسوتاو تەنها هاوسەرەکەی هاندەرو پارێزەری بوو. پاشان (جوبرەئیل) قورئانی بۆ هێنا، بەڵام چۆن دەشیا سروشی خودایی، کە بەدەرونی ئەودا، دەرونی مرۆیەکی سادەدا، تێدەپەڕی بۆ کەسانی دیکە بگوێزرێتەوە.

- (تیۆ) وتی: تەواو راستە. (موسا) لەسەرئەوە دوچاری گرفتی زۆر بوو، (عیسا) لەو پێناوەدا گیانی بەخشیو موحەمەد..

- پەیامبەر دادوەرو چاکەکار بوو؛ دیاری خوا لەسینەیدابوو، دڵێکی نەرمونیان، قسەی توندوتۆڵ، کە بەتوندی کاری لەخەڵکی هەژارو نەدار دەکرد... یەکەمین کەس لەشوێنکەوتوانی کۆیلەیەکی رەشپێست بەناوی (بیلال)بوو، کە بوە بانگدەری موسڵمانان. دەوارنشینەکان لەسەر قسەی (موحەمەد) دەستیان پێکردو ئینجا ئەوانەی کافربون بۆسەر ئیمانهێنان بانگهێشتیان کردنو پەیامبەر بەرێنوێنی خوای گەورە بەسەر دوژمنەکانیدا زاڵبوو، کە موریدو وەفادارانێکی زۆری شوێنکەوتبوو. یەکەم کۆمەڵگای باوەڕداران یان (ئومەت)ی دامەزراند.

- ئومەت؟ وشەیەکی عەرابییە؟

- پەیامبەر لەئەرەبستان دەژیا، لەبەرئەوە سروشەکەی بەزمانی عەرابی بۆ هات. سەرەتا سروش بەزمانی عیبری، دووەم بەزمانی یۆنانیو دواجار بەزمانی عەرابی راگەیەنراوە. بەڵام سەرنجبدە زمانی عەرابی قورئان وەك زمانەکانی دیکە نییە. بەهرەی خواوەندی مەزن، کە رێنوێنی پەیامبەرەکەی خۆیکردوە، لەکامڵترین جوانیدا راگەیەنراوە.... زمانی قورئان وەکو موزیك ئاهەنگسازە. هەموو شتێك لەگەورەییو شکۆمەندی خۆیدا کۆدەکاتەوەو دەیپارێزێت؛ لەبەرئەوەهۆیەیە زمانو گوتنەوەی (قورئان) واتە (خوێندن بەدەنگی بەرز)یان (لەبەروتنەوە)ی جەستەی ئیماندار پڕدەکات. هەر خوێندنەوەی بەس نییە، دەبێت قسەی پێبکرێت، هەناسەی پێبدرێت...

- (تیۆ) وتی: باشە. منیش پەسەندی دەکەم کە (موحەمەد) وەك (عیسا) پەیامبەرە، بەڵام ئەو زانستو زانینی تەوراتی دوبارەکردۆتەوە یان چ کارێکی بۆ زیادکردون؟

- پیرەمێردەکە دوپاتیکردەوە: سەرەتا دەبێت ئەوە بزانرێت، کەئێمە ئایدیاو وێنای (کوڕی خوا) پەسەند ناکەین. بەدرێژایی سەدەکان لەگەڵ جولەکەکان لەمشتومڕداین. ئەو پەیمانو یەکێتییەی کەئەوانی بەخودی نەمرەوە بەستوە جەنگە. هەڵبەتە جەنگێك سەرچاوەکەی عیشقو خۆشەویستییە، بەڵام هەرچۆنێك بێت هەر جەنگە. باری تەعالا لەدواین سروشی خۆیدا ویستویەتی کۆتایی بەو جەنگەی نێوان خۆیو خەڵك بهێنێت. بۆ خەڵك بەسە ئەو حەقیقەتە پەسەند بکەن کە (هیچ خوایەك نییە جگە لە (الله)و موحەمەدیش نێراوێتی). ئێمە بەعەرابی دەڵێین (لا اله الا الله ومحمد رسول الله)و کاتی جەنگ دوایی هات. بەوجۆرە ئەو

کاتە پیاوی باوەڕدار دەچێتە ریزی (ئومەت)ەوە. (تیۆ).. ئومەت شتێکی نائاساییە! یەکسانی، دادپەروەری، نوێژ، سادەیی، هاوبەشیکردن، کۆمەڵگەی تەواو... نەقەشە، نە پاپ، نە کڵێسا، نە وێنەی کێشراوە، نە پەیکەرو پیرۆزکردن.... هەموو کەس لەخۆڕادەستدان بەخواو دەستبەردان لەخوددا دەژی؛ هاوەڵ لەگەڵ براکەی، لەگەڵ مرۆڤ بە یەکسانیو بەرامبەر بەخود، ئەمەیە سروشی پەیامبەرو پەیامەکەی.

- (تیۆ) هاواریکرد: نەمانی جەنگ؟ تۆ چیدەڵێیت؟ موسڵمانەکان هەموو کاتی خۆیان لەجەنگدا بەسەربردوە، ناوی چییە... چی .. ئاها، جیهاد؟.

- شێخ هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا: بەڵێ، جیهاد؛ جەنگی پیرۆز. لەسەرەتا ناچاربوو بۆ بەرگریکردن لەسروش چەك هەڵگریتو شەڕبکات، ئەمە راستە. بەڵام (جیهاد) بەواتای تەقەلادانەو لەپلەی یەکەمدا پەیوەستە بەهەوڵدان یان جیهاد لەگەڵ خوددا. ئیماندار بۆئەوەی رێز لەیاساکانی خوا بنێت دەبێت لەگەڵ خۆی بجەنگێت. پەیامی ئیسلام پەیامی ئاشتی بێچەندوچونو هەمیشەییە. چ ئاشتییەك (تیۆ)! شیرین، بزوێنەر، قوڵ، وەك شەو، رونو درەوشاوە وەك ئەستێرەکانو کامڵ... بەڵێ، کامڵ، وشەیەکی دیکەم بۆ ئەوە بۆ نادۆزیتەوە.

- (تیۆ) وتی: بەڵام جیهان بەو جۆرە نییە، کامڵ نییە. ئێوەش لە کارەکەتاندا سەرکەوتونەبون.

- ئاشتی دێت، (تیۆ) ئاشتی دێت... بۆ هەموان.

- (تیۆ) بەحەسرەتەوە وتی: باشە، لەوبارەدا بۆ دەبێت کریستیانەکان، جولەکەکانو موسڵمانان پێکەوە بەشەڕ بێن؟ لەڕاستیدا بەگشتی گەمژانەیە!

سێ پیاوەکەی خوا خەندەیەکیان لەنێوان خۆیاندا گۆڕییەوەو لەورووەوە جیاوازییەکیان نەبوو.

## جەنگو ئاشتی

- پورە (مارتا) وتی: دەبینم وەڵام نادەیتەوە،

- شێخ وتی: هەموو ئەو جەنگانەی بەدرێژایی سەدەکان ئێمەی بەرامبەر بەیەك راگرتبوو کێشمەکێشێ بون بۆ دەسبەسەراگرتنی خاكو پرسەکانی دەسەڵات.

- (رابی) وتی: چونکە خواوەند هێشتا تاقیمان دەکاتەوەو بە هێواشی کاروانی ئاشتی بەرەوپێش دەبات.

- پیاوی کڵێسا پشتگیریکرد: چونکه خەڵك نازانێت ئەوەی پەیوەستە بەوانەوە چۆن دابەشی بکەن.

- (تیۆ) بەکەمێك دەمارگرژییەوە وتی: دەبێت پێیانڕابگەیەنرێت!

- قەشەکە وتی: ئەمە ئەو کارەیە ئێمە دەیکەین، بەڵام هەردەم گوێبیستی ئێمە نابن. دەبێت چی لە ئۆرشەلیم بکرێت؟ جولەکەکان ئەو شارەیان هەر بۆخۆیان دەوێت؛ موسڵمانەکان هەر داوای بەشی خۆیان دەکەن‌و کریستیانەکانیش دەیانەوێت شوێنی مردنی عیسا هەر بۆخۆیان تەرخان بکەن. دەبێت بەشبکرێت؟ رۆژێك دادێت، کەی؟ نازانین کەی!، بەڵام هەوڵی بۆ دەدەین.

- شێخ لەسەرڕۆشت: هەرلەبەرئەوەیە هەرسێکمان کۆبوینەتەوە تا (ئۆرشەلیم) پیشانی تۆ بدەین.

- پورە (مارتا) بەشداریکرد: ئێستا دەبێت بۆ ئەو سەردانە بەرنامەیەك دابنێین. دەتانەوێت چی پیشانی (تیۆ) بدەن؟

سێ پیاوەکە کەوتنە راوێژکردن لەگەڵ یەکدی. لەدیدی حاخامەوە دەبوو سەردانەکە بەپێی نەزمی مێژوویی‌و کات ئەنجام بدرێت. جولەکەکان، کە دەڵێن بەرلە سێ هەزار ساڵ (ئۆرشەلیم)یان دروستکردوە، دەبوو سەردانەکە لە (دیواری خۆرئاوا)وە دەستپێبکرێت، کە تاکە پاشماوەی پەرستگای ئۆرشەلیم‌و شوێنی (ندبە)ی هەموو جولەکەکانی جیهانە. باوکە (دۆبۆر) لەو بڕوایەدابوو بەهۆی هیلاکی (تیۆ)وە ئاقڵانەتر ئەوەیە لە (نزرگای پیرۆز -- Saint Sepulcar)ەوە دەستپێبکرێت...

- (تیۆ) وتی: چی پیرۆز؟

- نزرگا، واتە گۆڕ.

- (نزرگای پیرۆز)، گۆڕی مەسیح، ئەو شوێنەی هەموو لقەکانی کریستیانی تێدا کۆبونەتەوە.

- پورە (مارتا) وتی: هەموویان نا، چونکە پرۆتستانەکانی تێدانییە.

- شێخ بەهەلیزانی تا بەمیهرەبانی پێیانڕابگەیەنێت، کە ئۆرشەلیم شارێکی عەرەبییەو (ئیسرائیل)ییەکان داگیریان کردوەو دادپەروەری‌و راستیش ئەوە دەسەپێنێت، کە دەبێت سوپاسی پارێزەران‌و پاسەوانانی راستەقینەی ئەو شوێنە پیرۆزانە بکرێت، کە موسڵمانەکانن.

پورە (مارتا) وتی: بڕوانن.. تکام کرد (تیۆ) شەکەت نەکەن. هەریەکەتان دەتوانن شوێنێك یان دوانی پیشانبدەن. ئیدی لەدەست خۆتاندایە.

باوکە (دۆبۆر) پێشنیازی کرد نزرگەی پیرۆز، شاخی زەیتون، کە لەوێدا عیسا باسی لەچارەنوسی خۆی بۆ مریدەکان کردو ئینجا (ڤیادۆلۆرزا)[1] ئەو ڕێگایەی (عیسا) بەخاچێك بەسەرشانیەوە تا ئەو شوێنەی گیانی تیا سپارد تەی کرد پیشانی (تیۆ) بدات. بەڵام پورە (مارتا) داوای لێکرد کەمیبکاتەوە.

(رابی) دەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕی. چۆن دەیتوانی لەنێوان (دیواری ندبە)، مۆزەخانەی ئیسرائیل، شوێنی یادەوەری (یادواشم)، کە بەیادی تیرۆرکردنی ملیۆنەها جولەکە لەسەردەستی نازییەکان بەرپاکراوەو گەڕەکی ئاینی (میا- شریم) هەڵبژاردن بکات؟ چۆن داوای لێدەکەن سەردانەکە سنورداربکات!. پورە (مارتا) بەڕاشکاوانە وتی بڕیار لای خۆیەتی، بەڵام لەو نێوەندەدا شێخی بەتەمەن بەشێوەیەکی سەیر بێدەنگ بوو.

- پورە (مارتا) لای سەیر بوو! گوتی: سلێمان، تۆ هیچ ناڵێیت؟
- لەژێرلێوەوە وتی: نەخێر. پێویست ناکات.
- پورەخانم فەرمانیدا: ڕێکەون یان بهێڵن با(تیۆ) بڕیاربدات.

سێ جوت چاوی درەوشاوە ڕوی لە (تیۆ) کردبوو، بەڵام (تیۆ) زیاتر دیقەتی لەسەر ئەو دەسڕە بوو، کە هەنگوینی پێدا دەهاتەخوارو مشتومڕی سێ پیاوی ئاینییەکە لەو شیرینییەیان بێبەشدەکرد.

- پورە (مارتا) وتی: باشە، دەڵێیت چی؟

- (تیۆ) وتی: هەرئەوەی لە منداڵیدا دەمکرد، چونکە سەر لەو هەموو بابەتە تێکچڕژاوە دەرناکەم. زۆر باشە. دەستپێدەکەم.

لەبارێکدا پەنجەی دۆشاومژەی بەڕوی سێ کەسەکەدا درێژکردبوو دەستی کرد بەهەللور بللورو لەسەر شێخ وەستا.

- پورە (مارتا)، کە دەترەقایەوە وتی: زۆر باشە. پشکخستن تەواوبوو. سلێمان لەتۆوە دەستپێدەکەین. گرەو دەکەم چاوەڕوان نەبویت بەو زوانە پەیمانی ئاشتی مۆربکرێت!.

[1] Via Dolorosa. ڕێڕەوی ئازار. ئەو ڕێگایەی، کە بەدرێژاییەکەی (عیسا) خاچێکی لە کۆڵگرتو تا شوێنی لەخاچدانەکەی برد. و. کوردی.

## ئیبراهیم لەناڤینی جیهاندا

سەرئەنجام هەرسێکیان رازیبون. شێخ سەردانی گومەزی بەردینی پەسەندکردبوو؛ قەشەکە (نزرگای پیرۆز)و (رابی) پاشئەوەی پورە (مارتا) بەڵێنی پێدا (تیۆ) لەقۆناغەکانی سەفەرەکەیدا بۆ سەردانی کەنیسەکان دەچێت بەئارەزوی خۆی (دیواری ندبە)و گەڕەکی (میاشریم)ی هەڵبژارد. بەمپێیە بەپێی پشکی (تیۆ) خۆی یەکەمجار چوو بۆ بینینی (گومەزی بەرد)ی. لەمەیدانێکی فراواندا، کە دیواری (ندبە) بەسەریدا دەیڕوانی، (تیۆ) درەوشانەوەی ئالتونی گومەزو روپۆشێکی گەوهەرداری بینی. ژنان بە عابای درێژی رەش و لێوار نەخشێنراوەوە بەرەنگی جۆراوجۆرو سیمای داپۆشراوی ناو پەچەوە خەریکی پیاسەبون. پیاوان، کە لەچکێکی سپی ژێر قەیتانێکی ئەستوری رەشیان لەسەر نابوو بەویقارو بەدڵنیاییەوە بەپەلە هاتوچۆیان دەکرد. کاتێك گروپە بچوکەکەیان گەیشتنە بەرامبەر بەگومەزە ئالتونییەکە، شێخ وتی:

- گەیشتین. لێرەوە (مزگەوتی ئەقسا – مسجد الاقصى) دەبینین، کە بەگومەزە بەردینەکەیەوە لەسەدەی حەوتەم[1] دروستکراوە. ئێستا لەناو (گومەزی بەردین)داین، ئەو شوێنەی هێشتا پارچەی بەردی (قوربانی - Montmonh) لێماوە. ئەم شوێنە پیرۆزە بە (ناڤینی جیهان) ناودەبرێت. ئەو پارچە بەردانەی کە( الله) لەباخی بەهەشت هەڵیبژارد تا بیکاتە بنچینەی جیهان. رۆحی هەموو پەیامبەرەکانمان لە چاڵێکدان لەژێر بەردێکداو لەوێدا بەردەوام خەریکی رازو نیازو نزاکردنن.... ئەو تاقانەی لەنێوان گومەزو مزگەوتدا دەبینیت بۆ هەڵواسینی تەرازووەکان بەکاردێن تا لەکاتی گەیشتنی روداوی کۆتایی (دنیا ئاخربون)دا بۆ کێشانی رۆحەکان بەکاربێن.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: روداوی چی؟ لەو بڕوایەدابوم ئیسلام چاوەڕوانی هیچ نییە.

- شێخ لەسەرخۆ وتی: چۆن... بەڵێ چاوەڕوانە، ئێمە چاوەڕوانی کۆتایی خودی زەمانە دەکەین. بەڵام خۆئەگەر دەربارەی سەرەتاش قسە بکەین ئەوا هەر لێرەدابوو، کە ئیبراهیم پەیامبەر (سەلامی لێبێت)، هەمان ئەو کەسەی کە جولەکەو کریستیانەکان بە (ئەبراهام - Abraham) ناوزەدی دەکەن، قوربانی کردوە. کوڕەکەم دیارە ئەو روداوە دەزانیت.. وانییە؟

- (تیۆ) وتی: ئاخ هێندە زۆر نا.

---

[1]. لەساڵی (٧٢ هجری قمری) بەفەرمانی عبدالملك ئەمەوەی بوو.

- شێخ وتی: ئیبراهیم پەیامبەرێکی مەزن بوو؛ باوکی هەموو باوەڕدارانی جیهانە. لەلای ئێمە چیرۆکی ئیبراهیم بەمجۆرەیە: چونکە (سارا)ی هاوسەری بەتەمەن و منالّی نەدەبوو مێردەکەی ناچارکرد لە (هاجەرە) منالّی ببێت. پاشان خودی (سارا)ش منالّی بوو. لەبەرئەوە ئیبراهیم بوو بەخاوەنی دوو کوڕ. کوڕەکەی (سارا)ی ناونا (ئیسحاق)و ئەوەی (هاجەرە)ی خۆشەویستیشی ناونا (ئیسماعیل). پاشان (سارا)ی بەرچاوتەنگ داوای لە(ئیبراهیم)کرد دەستبەرداری (هاجەرە) ببێت، ئەویش بردنی بۆ بیابانو لەوێ بەخوای سپاردن. جولەکەکان خۆیان بە وەچەی ئیسحاق دەزانن‌و موسڵمانانیش بە وەچەی (ئیسماعیل)؛ لەبەرئەوەش ئیبراهیم باوکی هەموانە. بەهێمنی بەردەوام بوو:

- (تیۆ) لەیادتە چەند ساڵ لەمەوبەر لە(هیرۆن) توندڕەوێکی جولەکە چەکی دەرکێشاو هەموو موسڵمانەکانی لەشوێنێکدا کوشت، کە بە(گۆڕی باوکی سەلاران) ناسراوە. دەڵێن ئەوە گۆڕی (ئەبراهام‌و سارا)ی هاوسەرێتی‌و تەنانەت گۆڕی (ئادەم‌و حەوا)شە. ئەوێ تاکە شوێنی جیهانە موسڵمانان‌و جولەکەکان دەتوانن پێکەوە نزای تێدابکەن.

- (رابی) وتی: راستە. بەلاّم لەژێر چاودێری سەربازەکانمان. ناوی ئەو کەسەی ئەو کارەساتە ترسناکەی ئەنجامدا ناهێنم!. گۆڕی (ئیبراهیم) خالّی پێکگەیشتن‌و روبەڕوبونەوەی ئایینەکانمانە، چونکە خوا ویستی ئیبراهیم ئەزمون بکات: داوای لێکرد (ئیسحاق)ی تاقانەی سەربڕێت.

- (تیۆ) لەپڕێکدا وتی: بەلاّم ئەو دوو کوڕی هەبوو!

- (رابی) بەسەراسیمەبونەوە وتی: باشە. واتە (ئیسحاق) کوڕی شەرعی بوو، چونکە بەپێی نوسراوی کتێبی ئاینەکەمان (تەورات) کوڕەکەی دیکەی لەخزمەتکارەکەی بوەو بەکورتی زۆڵ بوو، بەلاّم هەموان ئەو جیاوازییە پەسەند ناکەن؛ دەزانم. لای ئێمەی جولەکە (ئیسحاق) کوڕی تاقانەیە. خۆئەگەر وانەبوایە ئەو ئەزمونەی خوا بڕیاریلێدا ئەو گرنگییەی نەدەبوو. (ئیسحاق) درەنگ هاتە جیهانەوە، لەکاتێکدا بوو، کە دایکی تەمەنی نزیکەی سەد ساڵ بوو....

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: سەد ساڵ! گاڵتە دەکەیت!

- خودی (سارا)ش کاتێك فریشتەکان پێیانڕاگەیاند لەو تەمەنەدا دوگیان دەبێت زۆر پێکەنی. لەگەڵ ئەوەشدا هەروا بوو. (تیۆ) ناخۆشی‌و ئازاری ئەو باوکە پیرە لەبەرچاوبگرە،

پیرەمێردێکی خواوەند فەرمانی پێدەکات تا کوڕەکەی بباتەسەر چیایەکی بەرزو لەوێدا چەقۆ لەملی بسوێ. ئیبراهیم ملکەچی نواند.

- (تیۆ) وتی: کەواتە خوای ئێوە بەوجۆرەیە؟ تۆقێنەرە!

- (رابی) وتی: نەخێر، بەهانەگرەو ئەم دووەش لەیەکدی جیاوازن. لەلایەکەوە دەزانیت زۆر میهرەبانە. بەڵگەش ئەوەیە کاتێك چەقۆی نایە سەر ملی کوڕەکەی لەدواساتدا فریشتەیەك دەستیگرت و ئینجا ئیبراهیم بەرانێکی بینی، کە شاخەکانی لەخاکی دابۆوە، ئەوی کردە قوربانی. خوا پێیڕاگەیاند: (دەزانم تۆ بۆ من درێغیت لە کوڕەکەت، لەتاقانەکەت نەکرد، لەبەرئەوە نەوەکانت وەکو ئەستێرەکانی ئاسمان ئەڵماسی ناو دەریادا دەبن). بەڵێ، ئەو روداوە لەم جێگایەی ئێمەی تیاوەستاوین رویدا، لەژێر پێی ئێمەدا.

- باوکە (دۆبۆر) وتی: لەیادت چوو بڵێیت کە (ئیسحاق) لەو قوربانییە سەیرە زۆر نیگەران بوو. باوکی بارێك داری لەسەر ولاغێك لەگەڵ خۆی بردبوو نێچیرێك ببرژێنێت، بەلام هیچیان پێنەبوو. ئیسحاق لەباوکی پرسی کوا کارژۆلەکە؟ بەبێئەوەی بزانێت خودی خۆی کارژۆلەکەیە. پاشان کاتێك مەسیح هاتە جیهانەوە پەسەندی کرد خۆی ببێتە قوربانییەکەو بەراستیش بەسەر خاچەوە کرا بەقوربانی. کارژۆلەی خوا.

- (تیۆ) بەپەژارەوە وتی: وەکو پێشتر حەزم بەوە نییە. بۆچی خوا داوای مەرگ بۆ منالێك دەکات؟ بۆچی بیەوێت (عیسا) ببێتە قوربانی؟ چ مەبەستێکی لەپشتەوەیە؟

- (رابی) وتی: بیر لە (ئەیوب) بکەرەوە. دەیزانی بەرەو مەرگ هەنگاو دەنێت و وەلامێکی ملکەچانەی مەرگی دایەوە.

- شێخ سەری قسەکەی گرتەوەو گوتی: بەو مەرجەی پەسەندی بکەین کوڕی خوا بوە؛ بەو مەرجەی پەسەندی بکەین (سارا) هاوسەری شەرعی و خۆشەویستی (ئیبراهیم) بوو؛ بەو مەرجەی بڕوا بکەین کە (ئیسحاق) کوڕی ئازیزی ئەو بوو، بەلام بەوجۆرە بیری لێناکەینەوە. چونکە بەپێی (قورئان)ی ئێمە ئەوە (ئیسماعیل) بوو خوا چاوی لەقوربانیکردنی پۆشی تا وەچەی بێشومار بخاتەوە ... ئێمەی وەچەی (ئیسماعیل) لەپشتی (ئیبراهیم)و (هاجەرە)ین. وەکو ئەستێرەکانی ئاسمانین و لەو باوەڕەدانین بۆ ئەو مەبەستە قوربانیکردنی کوڕی خوا لەسەر خاچ پێویست بکات. (عیسا) پەیامبەرێکە ئێمە دان بەگەورەییەکەیدا دەنێین؛ کوڕی (مەریەم) بوو؛قسەی خوای پێدەگەیشت، بەلام ئەفرێنەر ناتوانێت کوڕێکی لەسەر شێوەی مرۆڤ هەبێت. گونجاو نییە.

- (تیۆ) وتی: دواجار دەستی حەقیقەت لەو نێوەندەدا لوکوێدایە؟

بێدەنگییەکی درێژ باڵیکێشا بەسەریاندا، چەند کۆترێك لەو هەلەدا باڵیان لەیەکداو فڕین.

- پورە (مارتا) کەمێك بەتوندی وتی: باشە، گوێم بۆ رادێرن. ئێستا نۆرەی منە قسە بکەم. رێگا بدەن قسە بکەم! دەزانم نارازی دەبن. زۆر باشە لەلای من دەبێت بڕوات بەئاین هەبێت یان بڕوات پێی نەبێت. بۆ نمونە خودی من هیچ ئایینێکم نییە، بەڵام باوەڕم هەیە ئاینەکان مرۆڤیان بەرەوپێش بردوەو بونەتە هۆی گەشەکردنیو ئەو خوایەی جولەکە، (تیۆ).. کە لای تۆ خوایەکی توندوتیژە، کاری زۆر خراپترو دڕندانەتری قەدەغەکردوە. (کەنعانییەکان) منداڵەکانیان دەکردە قوربانی بۆ بتەکانیان ئەوەیاد... گەورەیی قوربانیکردنی (ئیسحاق) دروست لەوێدایە، کەنەکرایە قوربانیو نەمرد. خوا لەجیاتی ئەو بەرانێکی نارد، لەوێوە رونیکردەوە مرۆڤ ئاژەڵ نییە تا بۆ شکۆمەندی خوایەك لە میحرابێکدا چەقۆ لەسەر گەردنی بخرێت، ئایا ئەمە باشتر نییە؟

- (تیۆ) وتی: ئەگەر لەو گۆشەیەوە لەبابەتەکە بڕوانیت رازیم، بەڵام ئایا ئەو هەموو کاتەی پێویست تا ئەو ئەنجامگیرییە بکرێت؟

- (رابی) وتی: ئاه... بەڵێ، تیۆ! پاش هەزاران ساڵ وەحشیگەری ئێمە یەکەمین کەسانێك بوین باوەڕمان هێنا خوا مرۆڤی لەسەر شێوەی خۆی دروستکردوە، لەسەرشێوەی خۆی؛ بەو واتایەی مرۆڤ لەخودی خۆیدا بەشێکی لەخواوەند هەڵگرتوە... (ئەبراهام) بوو یەکەمین پەیمانی لەنێوان خۆیو خوای خۆیدا بەستو لەوەدواتر بە (پەروەردگاری پەیمان – ادونە الوهیم) ناودەبرا. پێش (پەیمان – عهد) مرۆڤو ئاژەڵ بۆ قوربانیکردن یەك بەهای یەکسانیان هەبوو. پاشئەوە بەوجۆرە نەماو تەواو بوو. جیاکردنەوەی مرۆڤ لە ئاژەڵ بۆ یەکەمجار لە (تەورات)[1] دا هاتوە.

- پورە (مارتا) وتی: گوناهەش لە(تەورات)ـەوە دێت.خوا رێگای بەمرۆڤ نەدا لەبەهەشتدا نیشتەجێ ببێت.

- باوکە (دۆبۆر) درێژەیپێدا: لەبەرئەوە خوا کوڕەکەی خۆی لەپێناو مرۆڤایەتیدا کردە قوربانی تا ئەو یەکەمین گوناهە پاك ببێتەوە. نەك تەنها بۆ گەلێکی دەستەنێژە، بەڵکو بۆ هەموان. ئەمەش پێشکەوتنێکی بەرچاوبوو.

---

[1]. لێرەو لەجێگاکانی تردا وشەی (Bible) بە (تەورات) وەرگێڕاوە. لەراستیدا تەورات بەشێکە لە (Bible– ئەفساری پێنج دانەو یاساکان)و (Bible) وەك (پەیمانی کۆن – عهد عتیق) واتایەکی فراوانتری هەیە.

- شێخ بەدەنگێکی پچڕپچڕ ئاهێکی کێشاو گوتی: چ پێویستی بەو روداوە خوێناوییە هەبوو؟ بۆچی لەخاچدان؟ بۆچی پەیمانی جولەکەکان بەرگەی یەکەم لێدانی نەگرت؟ ئەم یاخیبون و ژێرەوژوربونە لەکوێوە دێت؟ تەنها ملکەچی و گوێڕایەڵی نواندن لەفەرمانەکانی خوا بەسە...

- (تیۆ) بەنەرمییەوە وتی: ئەمە تەنها تۆ دەیڵێیت.

- شێخ وتی: (ئالیئەزەر)و (ئەنتوان)یش هەمان شت دەڵێن! هەرسێکمان فەرمانی خوامان پەسەندە. تاکە جیاوازی درێژکراوەی روداوی مرۆڤەکانە... لای (ئالیئەزەر) ئەم روداوە چاوەڕوانی سەرهەڵدانی مەسیحە، لای (ئەنتوان) لەخاچدانی (عیسا)و لای ئێمەش بەهۆی بەرەکەتی بونی پەیامبەرەوەیە ناوی موبارەك بێت. هەموو شت رونەو ئاشکراکراوە. بهێڵە دیداری پەیامبەرت بۆ بگێڕمەوە. لەهەیوانی ماڵەکەی لە(مەککە) دانیشتبوو، کە لەپڕێکدا (بۆراق)ی ئەسپ، کە ئاژەڵێکی باڵدار بوو بەسەری ژنێکەوە، دەرکەوت.

- (تیۆ) وتی: تێگەیشتم، ئەسپی باڵدار وەکو (پگاز)[1]. ئەو ئەسپە لەگەمەی ڤیدیۆکەمدا هەیە.

- شێخ لەسەرخۆ وتی: بچکۆل، دەهێڵیت قسەکەم تەواو بکەم؟ باشە، وتمان ماینەکەی پەیامبەر پەیدابوو، ئەوی بۆ ئەم شوێنە هێنا، کە تیایدا وەستاوین. (بوراق)ی لەپاڵ حەسارەکەدا بەستەوە، ئەسپەکە لەسەر بەردەکە سمکوڵیدەکردو فڕی! (جوبرەئیل)ی فریشتە پەیامبەری بۆ حەوت تەبەقەی ئاسمان بردو پەیامبەر لەرێگادا چاوی بە (ئادەم، نوح، یوسف،و موسا) کەوت و پاشان خۆی لەبەردەم (ئیبراهیم)دا بینییەوە، سەرئەنجام دەنگی (الله)ی بیست. پاشئەوەی داواکاری موسڵمانانی پێڕاگەیاند بۆ (مەککە) گەڕایەوە؛ لەبارێکدا، کە (جەزبە)[2]و شۆروشەق بەتەواوی گۆڕیبوی.

- (تیۆ) پرسی: ئایا وێنەی پەیامبەر لەباری (جەزبە)دا هەیە، زۆر حەزدەکەم بیبینم.

- شێخ رونیکردەوە: هەرگیز سیمای پەیامبەر ناکێشینەوە. هەندێکجار لەنمایشی گشتی ئاینیدا وێنە دەبینرێت، بەڵام روخساری پەیامبەر بەتەواوی سپییە. (جەزبە) زیاتر لەخوای گەورەوە نزیکەو ناکرێت بنوێنرێت... دیداری پەیامبەر بەهۆی بەهرەیەکی خودایییەوە بوو؛

---

[1]. pegase لەئەفسانەی یۆنانیدا ئەسپێکی باڵدارە، کەلەخوێنی (مدوز) پاشئەوەی سەری لە (پرسە) لەجەستەی جوداکرایەوە دروستبووە. پەیامبەر یۆنانی پێیدەڵێن (pegasos). (میلینا).

[2]. جزبە: کێشکردنی غەیبی، حاڵەتێکە دوچاری کەسی عارف و خواپەرست دەبێت و بەرەو حەق کێشدەکرێت و ئاگای لەخۆی نامێنێت. فرمنگی عمید.

ـەرنەوە دەرچونە لەكات و هەلكشانی پەیامبەرە بۆ پشت ژیانی مرۆڤایەتی؛ ئۆرشەلیم پاش مەككە) زێدی پەیامبەر بوو. (مەدینە)، كە پەیامبەر تیایدا لەجیهانی خاكی دەرچوو، ـێیەمین شاری پیرۆزی ئیسلام دادەنرێت. لەلایەكی دیكەوە كێ ئەم گومەزەی لەسەر ـەرنێك دروستكردوە؟ خەلیفە (عبدالملك) لە سالی (٦٨٥)ی زاینی.

- (رابی) وتی: بەلام سلێمان پاشا یەكەم پەرستگای لەهەمان شوێن دروستكرد. لەهەمان ـدا.

- باوكە (دۆبۆر) وتی: خاچپەرستەكان لەهەمان شوێندا خاچێكی مەزنیان دروستكرد. ـەجۆرە (تیۆ) هەرسێ ئاینەكەمان لەشوێنی قوربانیكردنی (ئەبراهام)ی باوكە گەورەی هاوبەشمان، پێكەوە روبەڕوبونەوە. بەلام كتێبێكی پیرۆز واتە (Bible) پەسەند دەكەین، كە ـەزمانی یۆنانیدا واتای (كتێب)ـە. لەبەرئەوەیە ئێمەی سێ ئاین بەخاوەنی كتێب ناوزەد ـدەكەن. ئەگەر باش بیربكەینەوە، یەك كتێبی هاوبەشە.

- ئاه ... نەخێر! كتێب قورئانە.

- ئەی (دە) فەرمانەكە (دكالۆگ) چی لێدەكەیت؟

ـشتومڕی قسەكردن دەستیپێكردەوە. (تیۆ) حەوسەلەی گوێگرتنی نەماو بۆ بینینی حەسارەكە، كە زەردەی خۆرنشین لەكاتی ونبونی هێواشیدا رەنگێكی ئالتونی پێبەخشیبوو، ـەكەشی تەمو ئالودەبودا دەنگی سەدەها زەنگی ناقوس دەنگی دایەوەو لەگەل ئاوازی بانگدەرانو دەنگی نوێژكاراندا ئاوێتە دەبوو؟. ئۆرشەلیم، شارێكی ئالۆزو دژواربوو. ئەو شارەی باوەڕداران بەخوای تاكو تەنها بەپەیامبەرو بەكوڕی خوا لەكێشمەكێشو ململانێدا بون. پورە

- (مارتا) كاتێك دەستی خستە سەرشانی (تیۆ) وتی: بیر لەچی دەكەیتەوە؟

- (تیۆ) وتی: لەو خوایەی ئاشتی بەوانە نابەخشێت!

# بەشی سێ

# (دیوارێك و گۆڕێك)

## شیوەن بۆ سندوقی پیرۆز[1]

(ڕەبی) بەردەوام بەبەهانەی لەپێشتری مێژووییەوە پێش (باوکە دۆبۆر) دەکەوت. بڕیاربوو سێ پیاوەکەی خوا چاوپێکەوتنەکەیان لەپاڵ دیواری (ندبە)وە دەستپێبکەن. وردە وردە، کەنزیك دەبونەوە، (تیۆ) لەناخیدا هەستی بەخرۆشاوییەکی سەیر دەکرد. لەدوو هەزار ساڵ لەمەوپێشەوە تائێستا جولەکەکان لەبەردەم ئەم بەردە پانو کۆنانەداو بیست سەدەیە بەسەر وێرانەی پەرستگا ونبوەکەیاندا دەگرین... لەدورەوە دەنگی وێردەکان بەرگوێ دەکەوتن، کەدەتگوت لەقولایی زۆر دوری ڕابردووەوە دێنەوەدەرەوە. (ڕەبی) بەرەو کۆمەڵێك لەباوەڕدارانی ڕەشپۆش کێشی کرد. لەرزەیەك جەستەی (تیۆ)ی داگرت، لەسەرخۆ وتی:

- بەڵێ، ئەوە هەمان ئەو دیوارەکەیە؛ زۆر لەوە گەورەترە لەتەلەفزیۆندا پیشاندەدرێت.

- (ڕەبی) وتی: بەڵێ زۆر گەورەیە، لەسپێدەدا بەردەکان بەشەونم تەڕدەبن، کە ئێمە لەوبڕوایەداین دڵۆپەی ئەشکی گەلی جولەکەیە. ئێمە دەڵێین لەو (دە) کیلۆ ڕەنجو بێبەشییەی خوا کردویەتییە بەشی جیهان نۆ کیلۆی بەر(ئۆرشەلیم)کەوتوە. ئەمە بکەرەسەرت، چونکە ناچارییەو بەزۆرە. (تیۆ) کەکلاوێکی مەخمەڵی شینباوی کردەسەری وتی:

- کیپا؟ زۆر باشە؛ زەرڕی نییە.

---

[1]. سندوق: لێرەدا وەرگێڕاوی وشەی (Arche)ی فەرەنسییە، کە لەوشەی لاتینی (Arca)ەوە دێت، کە وەرگێڕاوی وشەی عەرەبی (Aron)ـە. (سندوف) بەواتی گشتی بەشێك بووە لە مۆبێلی پێداویستی گرنگی چادری گەورە بووە، کە هەم بۆ پاراستنی جلوبەرگو پێداویستی بەکارهاتووە هەم وەك مۆبێلەو کورسی. (سندوق مقدس)یان (Arche) (بە A کەپیتاڵ)، کە ئەو ناوە (٢٠٠) جار لەتەوراتدا هاتووە، (تەختی پادشایی خوای ئیسرائیلە) هەم شوێنی هەڵگرتنی بەڵگەنامەی پەیمانو رێکەوتنەکانی، خوای جولەکە کە لەگەڵ گەلەکەی بەستویەتی. وەك لە (سفری دەرچون – Exode)دا هاتوە، سندوقێکە لەداری (کاسیا) بەدرێژی (١,١٠ – ١,٢٠)مەترو بەرزیو پانی (٧٠–٨٠) سم. (دائرة المعارف اسماء التوراتی).

- (رەبی ئالیئەزر) وتی: ئێستا لەڕیزدا دەوەستین، بەلاّم لەوانەیە ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بین.

ڕیزێکی دورودرێژ لەبەردەمیانەوە دەڕۆشت، کە پیاوەکان ڕەشپۆش بون و لەکاتێکدا بەدەنگێکی ترساو یان ئاوازێکی خەماوییەوە نزایان دەکرد جەستەشیان بۆ پێش‌و دواوە دەجولاند؛ هەموو کلاّویان لەسەردابوو، کەهەبوو نیوە خڕبوو یان بەداو ڕیزێك چەرمی سەیری پێوە شەتەك درابوو. پرچی درێژی هەندێ لەوانەی بۆ زیارەت هاتبون لەلای گوێیانەوە شۆڕ ببۆوە. کاتێك ئەو خەڵکە لە دیوارەکە نزیك دەبونەوە دەستیان دەخستە سەر خڕە بەردەکان‌و سەریان پێوەدەناو کاغەزی پێچراویان لەدرزی بەردەکان ڕۆدەکرد، کەپێشتر بەئامادە کراوی نیەتەکانی خۆیان تێدا تۆمارکردبوو.

کەمێك دورتر، ژنانیش ڕیزێکی تایبەت بەخۆیان ڕێکخستبوو. زۆربەیان بەلەچك توندسەری خۆیان پێچابوو؛ هەندێك جاریش هاوارێکی بەئازاریان دەکرد. پورە (مارتا) لەگەڵ (باوکە دۆبۆڕ)و شێخ لەگۆشەیەکی نزیك لەشوێنێك راوەستابون، کە بەهۆی (فاکس)ی ژمارە (٠٢٦٢١٣٢٢) لەسەرانسەری جیهانەوە پەیام بۆ دیوارەکە دەهات. دیوارەکە ببوە شتێکی ڕۆژانە.

ئەو دیوارەی کریستیانەکان بە(ندبە)و جولەکەکان بەدیواری (خۆرئاوا) ناوی دەبەن تاکە پاشماوەی سێیەمین پەرستگای ئۆرشەلیمە مابێتەوە. پەرستگای یەکەم پەرستگای سلێمان پاشای جولەکە بوو. دووەمین پەرستگا بەفەرمانی (کۆرش) پاشای (پارس) لەجێگای پەرستگاکەی سلێمان، کە وێران ببوو، دروستکرایەوە. سێیەمین پەرستگا بە فەرمانی پاشای سەرزەمینی (یەهودا - Juda) دروستکرا، کە هەوڵیدا مەزنایەتی شکۆمەندی پەرستگای یەکەمی بۆ بگێڕێتەوە. ئەم پاشایە، کە بە (هیرۆد – هرۆدیۆس Herode) ناودەبرا، لەلایەن ڕۆمەکانەوە دانرابوو، لەروی لەدایکبونەوە نیوە جولەکە بوو. جولەکەکانیش بەراستی خۆشیان دەویست، بەلاّم ئەو پەرستگایە وەك ئەوەی یەکەم نەبوو. هەڵبەتە درەوشاوەو بەشکۆو بەئاڵتون ڕوکەش کرابوو، کە ئاوی چاوی دەبرد، بەلاّم لەپیرۆزترین خاڵیدا، واتە ناوەڕاستی پەرستگاکە، تەنها چوارچێوەیەکی خاڵی‌و بەتاڵ ئامادەیی هەبوو. (سندوقی پەیمان)، کە هەڵگری پەیمانبەستن لەگەڵ خوادا بوو، چیدی لەو پەرستگایەدا نەمابوو.

- (تیۆ) پرسی: هەمان ئەو سندوقەیە کە (ئیندیانا جۆنز) لە فیلمی (ڕوداوی سندوقێکی ونبوو)دا بەدوایدا دەگەڕێت؟ ئەوەی تیشکی ئەتۆمی هەیە؟.

- (رەبی)، کە ئەو فیلمەی نەبینیبوو، دوچاری گومان هات... دیارە تیشکی ئەتۆمی نییەو ناشکرایە ئەوە نییە. (سندوقی خودی نەمرو گەلەکەی) بۆ ماوەیەکی دورودرێژ ـمئەرەبانەیەك، کە دوو گای سپی کێشیان دەکرد، لەجیهاندا دەسوڕایەوەو پەرستگاکەش بەماوەیەکی کەم پاشئەوەی جولەکەکان لەسەردەمی (داود) پاشایاندا لە(ئۆرشەلیم) نیشتەجێبون بەفەرمانی (سلێمان) پاشا بۆ پاراستنی سندوقەکە دروستکرا. (داود پاشا) بۆ بەرزراگرتن‌و گەورەیی (سندوق)ەکە لەسەر پەنجە بەرامبەری سەمای کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، کەتوانی لەشەڕەکەیدا بەقۆچەقانی سەرکەوتنێکی مەزن بەسەر دوژمنە پاڵەوانەکەیدا بەناوی (جلوت – گولیات)[1] بەدەستبێنێت، نەیتوانی ببێتە نوێژەنکەرەوەی پەرستگاکە، چونکە گوناهێکی هێندە گەورەی کردبوو شایستەی ئەو چێژو شادمانییە نەبوو.

- (تیۆ) بەوردبینیەوە پرسی: ئەو گوناهەیە چیبوو؟

- (رەبی) وتی: (داود) عاشقی ژنێکی گەلەك قەشەنگ بوو، لەبەر (خۆپەرستی) فەرمانی کوشتنی مێردەکەی دابوو[2].

- (تیۆ) وتی: لەبەرچی؟

- (رەبی) بەبێحەوسەڵەییەوە دوبارەی کردەوە: لەبەر هەوەسبازی، ئەو هەوەسەی لە (دە) فەرمانەکەدا قەدەغەکراوە. باشە ئێستا لە ریزەکە بچۆ پێشەوە.

- (تیۆ) وتی: ئێ، ویستویەتی لەگەڵ ئەو ژنەدا عەشقبازی بکات، وانییە؟

(تیۆ) راستی دەکرد، بەڵام (رەبی) بابەتەکەی بڕی. لەجیاتی ئەوەی باس لەهەوەسبازی بکەن باشتر بوو باس لە (سندوقی پەیمان) بکەن، کەبابەتەکە پرسیاری دەجولاند. (تیۆ) بیریکردەوە، کە بۆ نمونە لەپەرستگاکانی یۆنان‌و رۆمەکاندا هەر پەرستگایەکی پیرۆز خوایەکی هەبوو، یەك خوا بۆ پەرستگایەك، بەڵام ئەو (سندوق)ـە، کە هیچ پەیوەندی بە پەیکەرەوە نەبوو، بەشتێکی سەیر دەهاتە بەرچاو... (تیۆ)، کە بەرامبەر بابەتەکە هەستیار ببوو پرسی:

- لەڕاستیدا ئەو سندوقە چی تێدابوو؟

---

1. Goliath : پاڵەوانی گەلانی فەلەستین، (Philistins). کە بەپێتی کتێبی یەکەمی (سمویل – Samuel) لەشەڕی دەستەو یەخەدا لەگەڵ (داود) کوژرا. و. کوردی.

2. ئاماژەیە بۆ روداوی (بت شبع – بت سایە Beth sabee) ژنی (ئوری) یەکێك لەئەفسەرانی سوپاکەی (داود)ـە. کە داود عاشقی بووە سەرەنجام بەفەرماندەکەی لەبەری جەنگی دژە (ئامۆنیەتەکان) فەرمانیداوە ئەو ئەفسەرە بکوژرێت تا داود بتوانێت لەگەڵ بێوەژنەدا هاوسەرگیری بکات، بەوجۆرە (بت شبع)ی منداڵ. کە لەودیوە، بکاتە شەرعی. و. کوردی.

- هەمان ئەو (دە) فەرمانەی خودی ئەمر لەکێوی (سینا) پاش دەرچون لە (میسر) بۆ (موسا)ی ناردو تەواو!

- کەواتە تەنها وشەبون؟

- وشەی خودی ئەمر! پاشئەوەی ئەو فەرمانانە لەکێوی (سینا) بۆ (موسا) هات ئیدی گەلی جولەکە دەیانزانی (بون)ی بالا چی لێیاندەخوازێت.

- (تیۆ) پرسی: بەڵام وامدەزانی خوا ئەو وشانەی لەسەر لەپەیەکی بەردین هەڵکۆڵیوەو پاشان (موسا) لەکاتی تورەبوندا شکاندونی، چونکە لەکاتی دیارنەمانی (موسا)دا عیبرییەکان گوێرەکەیەکی ئاڵتونیان لەسەر شێوەی خواکانی میسر بۆ خۆیان دروستکرد... کە ئەم کارە (موسا)ی تورەکرد!

- (رەبی) رونیکردەوە کەدواتر لەپەکانی یاسا چاککرانەوەو لەکاتی وێرانکردنی پەرستگاکەدا بزربون و فەرمانەکان بۆ سەر پەڕاوی درێژ گوێزرانەوە. لەسەر ئەو پەڕانە هەموو شتێك بەوردی تۆمارکرابون. دەتوانرێت چی بخورێت، خواردنی چی قەدەغە بوو، دەتوانرێت چ کارێك ئەنجام بدرێت و چی قەدەغەبوو. دەنگی خودی ئەمر، کە لەگەڵ (موسا) دوابوو، خاڵبەخاڵ و بەوردبینییەکی زۆرەوە تۆمارکرابوو. لەوانەش دەربارەی سیستەمی خۆراك، کە بەپێی تۆمارکراوەکانی کتێبی (لاویان)، تەورات، کە (راهێنانی کاهنەکان)ە گۆشتی ئاژەڵی شومی وەك (بەراز، کونەپەپوو، ریوی، مارمێلکە، قومقومە، لەقلەق، واشەو کەروێشك و.... قەدەغە بوو.

- (تیۆ) راوەستاو گوتی: گۆشتی کەروێشك؟

- (رەبی) بەنارەحەتییەوە وتی: بەڵێ، ئەمرۆ ناتوانرێت دەرك بەواتای راستەقینەی ئەو رژێمە خۆراکییە بکرێت، کە بۆ سێ هەزار ساڵ بەرلەئێستا دەگەڕێتەوە؛ ئەمە پەسەند دەکەم. هێندە مەوەستە، سەرەکەمان دەفەوتێت..... واتە کاتێك خودی هەتاهەتایی شتێك رادەگەیەنێت جێگای گفتوگۆ نییە، ئەو پارێزگاریکردنی بەمەرجی رێزدانان بۆ دەستورو رێساکانییەوە بەستۆتەوەو هەر ئەوەو بەس... لەو تافەدا (موسا) فەرمانەکانی بەدەست گەیشت گەلی جولەکە هێندە ئامازەی نافەرمانیکردن و ناڕێکوپێکیان پیشاندابوو، کە ناچارکردنیان بەملکەچی نواندن پێویست بوو.... (رەبی) بەردەوام بوو.. چونکە ئەوە یەکەمجار نەبوو خودی ئەمر لەگەڵ گەلەکەی پەیمان و رێکەوتنی دەبەست. (ئادەم و حەوا) پاش دەرکردنیان لەبەهەشت ئاشنای نەهامەتییەکانی ژیانی خەڵکی ئاسایی بون. وەچە دوای

خەڵکی بەجۆرێك رویان لەگومڕاییو گەندەڵی کرد، کە نەمر بڕیاری سزادانی دەرکردنو بۆ ئەوەش تۆفانێکی گەورەی نارد سەتاسەری خاکی داپۆشیو وێرانکرد، بەلام بۆ پاراستنی ئەفرێنراوی خۆی (نوح)ی هەڵبژارد، کە پیاوێکی چاکەکاربوو. فەرمانی پێکرد کەشتیەك دروست بکات و لەهەر ئاژەڵێك جوتێكو نمونەیەك لەهەموو جۆرە گیاندارێك لەخۆبگرێت. ئەم کەشتییە لەشەپۆلی لافاوەکە رزگاری بوو؛ ئەو کەشتییەکە بە (سندوقەکەی نوح) ناسراو یەکەمین سندوقی پەیمان بوو. کەشتییەکەی نوح لەسەر لوتکەی کێوی (ئارارات) وەستایەوەو لەکارەساتەکە رزگاری بوو. لافاوەکە نیشتەوە، دوبارە خۆر دەرکەوتەوەو پەلکە زێرینە پانتایی ئاسمانی گرت، کە ئەوەش پەیمانێکی نورانی لەنێوان خودی هەتاهەتاییو مرۆڤەکان بوو.

- (تیۆ) وتی: خەریکە گێژ دەبم، چەند پەیمانمان هەیە؟
- (رەبی) وتی: هەمووی سێ دانەیە. یەکەم (کەشتی نوح). دووەم پەیمانی (ئەبراهام)، کە پەسەندی کرد لە سەدساڵیدا خەتەنە بکرێتو سێیەم (سندوقی پەیمان)، کە ئەو فەرمانانەی لەخۆ گرتبوو بۆ (موسا) هاتبونەخوارەوە.
- کەواتە خەتەنەکردنیش عەهدو پەیمانە؟ سەیرە!
- بەڵێ، پەیمانی یەکەم زۆری نەخایاند. گوناهەی دیکەی بەدوادا هاتو سزاش بەدوایدا. نەمر بڕیاریدا دووەمین کەسی چاکەکار بدۆزێتەوە: ئەویش (ئەبراهام) بوو، کە رازی بوو کوڕە تاقانەکەی بکاتە قوربانی. پەیمانی دووەم، کە لەگەڵ (ئەبراهام) بەسترا داوای لێکرا هەموو کوڕان خەتەنە بکرێن، واتە دروستکردنی نیشانەیەکی نەسڕاوە لەسەرجەستەی جولەکەکان، هێمایەکی خواوەندانە. تۆزقاڵێك گۆشتی کەمتر لەجەستەی مرۆڤ تا نیشانەی کەموکوڕی بێت و بەو هۆیەشەوە مرۆڤ (بون- نەمر) نییە.

## سەرگوریشتەی پڕهەورازو نشێوی دواین (پەیماننامە)

بەلام تەنانەت ئەو نیشانەکردنەش لەسەر جەستەی رۆڵەکانی ئیسرائیل بۆ ملکەچپێکردنیان بەس نەبوو. کەواتە پاش سزای کۆیلەکردن لە (میسر) (پەیمانی سێیەم) هاتە ئاراوە، کە لەسەر چیای (سینا) بە کامڵی بۆ (موسا) هاتەخوارەوە.

هەر لەبەر ئەو هۆیە بووپاش دەرچوون لە (میسر) بەدرێژایی رێگای گەڕانەوەیان بۆ خاکی بەڵێندراو عیبرییەکان لە هەموو شوێنێك سندوقی فەرمانەکانی خوایان لەگەڵ خۆیان دەگێڕا.

لەسەر فەرمانی خوا ئەم سندوقە لە داری (ئەکاسیا)[1] و روکەش بەکاغەزی ئالتونی دروستکرا؛ پاشان لەئۆرشەلیم دانرا: سندوقەکە لەگۆشەیەکی پەرستگاکەدا، کە بەپەردەیەکی سورو وەنەوشەیی لەگومەزەکە جیاکرابۆوە، لەسەر چوار ستون، کە لەسەر پایەی نقێمی وەستابون، بەهەڵواسراوی دانراو دوربوو لەچاوی ئیمانداران. هەر ئەوەش هۆی گەڕانی ئەوانە بووو کەجولەکە نەبون...

- (تیۆ) وتی: تێدەگەم، لەو روانەوە هەستی گەڕان دەجولێنێت.

-(رەبی) ئاهێکی کێشاو گوتی: ئەگەر تەنها بەگەڕان دوایی دەهات خەوشێکی نەبوو! بەڵام نەخێر، پاشاکانی یۆنان پاش داگیرکردنی فەلەستین هێندە نەفرەتیان بەئاینی جولەکە هەبوو، کە یەکێکیان لە پەرستگای دووەمدا پەیکەرێکی (زیۆس)ی دانا.

-(تیۆ) رونیکردەوە: لەگەڵ ئەوەدا (زیۆس) لەیۆنان پاشای خواکان بوو، عیبرییەکان بۆچی ناڕازیبوون؟

-(رەبی) بەحەوسەڵەوە وەڵامیدایەوە: تۆ دەزانیت لای جولەکە تەنها یەك خوا هەیە، تەنانەت پاشای خواکانیش لەبەرامبەر خودی ئەمردا هیچ بەهایەکی نییە. عیبرییەکان ئەو کوفرەیان پەسەند نەکردو بۆ دوبارە پاککردنەوەی پەرستگاو شارەکە دەستیاندایە جەنگ. بەمەبەستی خۆیان گەیشتن، بەڵام بەداخەوە! رۆمییەکان بونە جێنشینی یۆنانییەکان و لەوکاتەدا بوو، کە شا (هیرۆد)یان لە (ئۆرشەلیم) نیشتەجێکرد.

- هەمان ئەو دوڕەگە جولەکەکە؟

- بەڵێ، هەمان ئەو پیاوە پیسەی دەیویست هەموو منداڵانی ساوای جولەکە بکوژێت، چونکە (پاشای مەجوسەکان)[2] پێشبینیان بۆ کردبوو، کە یەکێك لەدایکبوانی ناو قەڵەمڕەوەکەی دەبێتە پاشای جولەکەکان. بەوجۆرە (هیرۆد پاشا)، کە دەستەنێژەی رۆمەکان بوو، یەکەم کەسە ستەمی لە(عیسا) کردووەو دەستیدایە دوژمنایەتی کردنی.

- (تیۆ) وتی: تێدەگەم. هاوکارێکی دوژمن، وەك ئەو فەرمنسیانەی لەسەردەمی حکومەتی (فیشی)[3] هاوکاری ئەڵمانەکان بون.

---

[1]. Acacla: ئەم درەختە لەگروپی (زانستی گیایی) نوسینی حسین میر حەیدەردا بە (درەختی ئاقاقیا) ناوبراوە. (ج ٤ ص ٢٢٦). و. کوردی.

[2]. پاشاکانی موغ (Lcs rois majcs) سێ شای موغەکان، کە لەکاتی لەدایکبوونی (عیسا)دا سەردانیان کردووە. و. کوردی.

[3]. دەوڵەتێك بوو بە سەرۆکایەتی (مارشاڵ پێتن) پاش شکستی فەرەنسا لەجەنگی دووەمی جیهانی بە پشتگیری ئەڵمانییەکان دروستکراو سەنتەری لە شاری (فیشی) بوو. و. کوردی.

- دروستە، بەڵام خودی رۆمەکانیش حەزی گەڕانیان هەبوو، (پومپە)ی سەرداری گەورەی رۆمی دەیویست بەهەر بەهایەك بوە بچێتە پەرستگای سێیەم، کە لەلایەن (هیرۆد)ـەوە چاکسازی کرابوو، تا لەوێ (سندوق)ـە بەناوبانگەکە ببینێت، کە ئیدی لەوێ نەمابوو، بەڵام (پۆمپە) جگە لەشوێنێکی بەتاڵ هیچی دی بەرچاو نەکەوت.

- (تیۆ) وتی: باش بوو، بێگومان جولەکەکان پێیان خۆشبوەو ئاهەنگیان گێڕاوە.

- (رەبی) بەناڕەزاییەوە وتی: نەخێر. سەرداری رۆمی چوبوە پشتی پەردەکەوە! گوناهێکی گەورە بوو. جولەکەکان هەرگیز لە (هیرۆد)و رۆمییەکان خۆش نەبون.ویاخیبون. تا ئەوکاتەی سەردارێکی گەورەی تری رۆمی بڕیاریدا ئەو کێشەیە لەگەڵ یاخییەکاندا یەکلایی بکاتەوەو پەرستگاکەی وێرانکردو تەنها یەك دیواری مایەوەو ئۆرشەلیم بوو بەشارێکی رۆمییەکانو ناویان لێنا (ئالیاکاپیۆلینا). ئیدی شاری پیرۆز جگە لەوێرانەیەك هیچی دیکە نەبوو، بەڵام ئەوەش بەسنەبوو. ئیمپراتۆر (ئادری ین) فەرمانی وێرانکردنی تەواوی شاری دەرکرد. شەش سەد هەزار کوژراومانداو ئەوانەش مابونەوە ناچار بون کۆچ بکەن.

- (تیۆ) وتی: پاش شەڕەکە گەڕانەوە؟

- (رەبی) وتی: کام جەنگو شەڕ؟ ئۆرشەلیم زۆری لەوانە بەخۆوە بینیوە. هەندێك جولەکە هەرگیز فەلەستینیان چۆڵنەکرد، بەڵام زۆربەیان شاریان بەجێهێشتو بەدرێژایی سەدەکان لەوڵاتانی دیکەدا بونە پەناهەندەو لەوێ مانەوە تا کڵێسەی مەسیحی سۆراغی دەکردنو دەستیدایە ئازارو ئەشکەنجەدانیان. قەشەیەك بەناوی (دۆمینیك) لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بۆئەوەی کافرەکان بکات بە مەسیحی سیستمی (دۆمینیکەکان)ی دامەزراندو ئەمەش لەلای خۆیەوە رێکخراوێکی بەناوی (دەزگای پشکنینی باوەڕ- ئەنگیزیسۆن)[1] یان رێکخراوی پشکنینی بیروڕای پێکهێنا. بۆ ئیمەی جولەکە ئەو دامەزراوەیە وەك (کورەی ئاسن توانەوە) بوو!

- کافرەکان کێبون؟

- (رەبی) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: لەئاینی کریستیانیدا کافر ئەو کەسەیە ئیمانی بە کریستیانی نییە لەشێوە تەواوەکەیدا. باشە ئێمە کافرەکان بوین، واتە جولەکەکان،

---

[1]. ئەنگیزیسیۆن: ئەنگیزیشن(Inquistion)- کەبەدەزگای پشکنینی بیروباوەڕ ناسراوەو لەسەدەکانی ناوەڕاستدا تۆقێنەرترین دەزگای تیرۆری دەستی کریستیانە کاسۆلیکەکان بوە دژی نەیارەکانیان. هەرچەندە ئەم وشەیە بەو ناوەوە ناسراوە ، بەڵام لەڕاستیدا واتای (الاستقصاء) دەدات. کەبەواتای دورخستنەوەو پەراوێزخستن دێت.

دیارە بەهۆی (عیسا)وە... وریابە، کە دوابەدوای خەڵك دەڕۆیت لەوانەیە خۆتی پیابکێشیت. دیارە دەزانم لەدیدی (دەزگای پشکنینی باوەڕەوە - (دەزگای پشکنینی باوەڕ)) تەنها ئێمە کافر نەبوین، بەڵام لەخەڵکی زیاتر لەبەرچاوان بووین. ((دەزگای پشکنینی باوەڕ)) چاودێریو کۆنترۆڵی ئێمەی دەکرد؛ لەبنەچەو شوێنی جولەکەکانی دەکۆڵییەوە؛ ئێمەی کێشی دادگا دەکردو پاشان لەسەر لیژنە دارێك دەیسوتاندین. باشترین چارەش چونە پاڵ ئاینی کریستیانی بوو، کە ئەوکاتەش دەبوو بەناچاری نەریتی (شەبات) بەدزییەوە جێبەجێ بکەیت. کڵێسە بڕیاریدابوو بە (مەسیحی تازە ئاین) ناوزەدمان بکات، بەڵام خەڵك ناوێکی باشتریان دۆزیبۆوەو بە (بەراز) بانگیان دەکردین، ئێمەی جولەکە بەراز بوین! چ سوکایەتیەکە (تیۆ) .

- دەبا مانگا بوایە نەك بەراز!، بەراز...

- تیۆ، ئەمە سەرەتای کاربوو. دواتر کاری خراپتریان ئەنجامدا. لەگەڵ ئەوەشدا کۆچبەری هەموو جولەکەی نەگرتبۆوە. لە (١٤٩٢) کاتێك پاشای ئیسپانیا جولەکەکانی وڵاتەکەی ناچارکرد لەنێوان مەسیحی بونو کۆچکردندا یەکێکیان هەڵبژێرن زۆربەی جولەکەکان بڕیاریاندا بۆ فەلەستین بگەڕێنەوە، کە ئیمپراتۆری عوسمانی ڕێگای پێدابون خونەریتی ئاینییان ئەنجامبدەن. ئیدی پەرستگا نەبوو، تەنانەت شاریش نەمابوو. بەڵام هەرچۆنێك بێت ئۆرشەلیم هەرلەوێ بوو.

- (تیۆ) پرسی: ئایا ئێستا کەس لەوانە ماوەتەوە؟

- مەبەستت وەچەی جولەکەکانی ئەو چەرخەیە؟ هەڵبەتە، بۆ نمونە خێزانی (ئالیاشار). چوار سەدە دوای ئەوە دوبارە ئۆرشەلیم دەستی بەنوژەنکردنەوەی ژیان کرد. ئەمە لەساڵی (١٨٤٠)دا رویدا، کاتێك ئیمپراتۆری عوسمانی مافی یەکسانی بەجولەکەکان لەگەڵ دانیشتوانەکەی تردا بەخشیو حاخامێکی گەورەش بۆ فەلەستین دانرا، کە یەکەمین حاخامی دوای وێرانکردنی پەرستگاکە بوو.

- لەجێگای خۆتدا مەچەقە، بڕۆ پێشەوە. دەمویست بڵێم جولەکە گەڕاوەکان گەرەکیان دروستکردو دەستیان دایە دروستکردنی نەخۆشخانەو قوتابخانە، چاپکردنی رۆژنامەو خانوبەرە.

- (تیۆ) وتی: بەڵام هێشتا دەوڵەتی ئیسرائیل بونی نەبوو!

- هێشتا نەخێر. لەکۆتایی سەدەی نۆزدەدا روداوێکی سەیر رویدا. پیاوێك بەناوی (تیۆدۆر هرتزل)، کە جولەکەیەکی سکولاریست بوو، لەشاری (ڤییننا) رۆژنامەنوس بوو، چوو بۆ

پاریس... دوباره کەمێکی دیکه بۆ پێشەوە بڕۆ، (تیۆ) خەریکه دەگەیت... ئەرکی (هرتزل) ئامادەکردنی راپۆرت بوو سەبارەت بەدادگاییکردنی (کاپتن دریفۆس)، کە بەدرکاندنی نهێنی دەوڵەت تاوانباریان کردبوو، چونکه جولەکه بوو.

- (تیۆ) وتی: ئەو کێشەیە دەزانم، درۆ بوو.

- بێگومان. کاتێك (هرتزل) گەیشتەوە (ڤییننا) کتێبێکی نووسی بەناوی (دەوڵەتی جولەکە). بەرای ئەو تاکە رێگا بۆ رزگاربونی جولەکە لەدەست چاودێریو ئازاردان ئەوە بوو دەوڵەتێکی سەربەخۆیان هەبێت. (سەهیۆن) ناوێکی دیکەی شاری (ئۆرشەلیم)ە، بەوجۆرە (تیۆدۆر هرتزل) بوە بنیاتنەری (سەهیۆنیزم). لەودەمەدا جولەکه بەگشتی ئەویان بەشێت دادەناو کاتێك رێوڕەسمی بەخاکسپاردنی ئەنجامدرا جولەکە هەزارەکان لە ئینگلتەراو نەمساوە بۆ بەخاکسپاردنی بەشداربون. پاش ئەوە ژمارەی گەڕاوەکان بۆ ئۆرشەلیم روو لەزیادبون بوو تا ئەوەی لەساڵی (١٩٤٨)دا دەوڵەتی ئیسرائیل بەئەنجام گەیشت. لەو سەردەمە بەدواوە ئەم دیوارە هەمیشە گەواهی ئەفسوس، گریانو ئارەزووەکانی جولەکەکان بوە.... گەیشتین دیوارەکە لەپێشتە.

-

## پەیامی دیوار

- (رەبی) وتی: ئێستا نۆرەی تۆیە. کاغەزت ئامادەکردوە؟

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: نەخێر، خۆ من جولەکە نیم!

- (رەبی) وتی: خەوشی تێدانییە، لەو باوەڕەدابوم وادەڵێیت. نوشتەیەکم کردوە تا شیفات بدات. دەستی هاویشتە سەر بەردەکان، ناوچەوانی بەدیوارەکەوە چەسپاندو خەریکی ورتەورتی نزاکردن بوو؛ پاشان نوشتە لولکراوەکەی لەیەکێك لە درزەکان تەپاندو ئیماندارانە گەورەیی نواند، بەلام کاتێك روی وەرگێڕا، کاغەزێکی لولکراوی دیکەی لەناودەستیدابوو. بەهێواشی وتی:

- شتێکی نائاسایی رویداوە. کاتێك نوشتەکەی خۆمانم لەدرزی دیوارەکە رۆکرد پارچە کاغەزێکی دیکەم لەسەر زەوی بینی. بیگرە، پەیامێکە بۆ تۆ.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بۆ من؟ لەلایەن دیوارەکەوە؟

بەپەلە پارچە کاغەزەکەی کردەوە. نوسرابوو (من باوکی خودی خۆمەو باڵندەیەکی نەمرم، کاتێك منت کەوتە چنگ ئەو سەر زەمینە دەناسیت بەنیازیت بچیت. )

پەیامەکە هەر هێندە بوو.

پەیامێك بەزمانی فەڕەنسی؟ ئەمە سیحرو جادویەكی تەواوە! مەگەر ئەوەی... مەگەر یەكەم نیشانەی بەدەسهێنانی گەنجینەیەك بێت، وەك مەتەڵی (گەڕان بەدوای گەنجینەدا)[1].

- (تیۆ) وتی: پورە (مارتا) یەكەم هێمام دۆزییەوە!

- پورە (مارتا) لەدورەوە وتی: زۆر باشە كوڕەكەم. ئیدی نۆرەی تۆیە تێبگەیت مەبەستی چییە؟ بەراستیش كاتی گەڕانەوەیە.

- باوكە (دۆبۆر)، كەنزیك دەبۆوە وتی: (ئالیئەرز) بڵێ بزانم كاتێك باست لە نۆژەنكردنەوەی بینای پەرستگاكە دەكرد لەلایەن (هیرۆد)ـەوە لەیادت نەچوو بڵێیت ئەو روداوە لەسەردەمی لەدایكبوونی (عیسا)دا رویداوە؟

- (رەبی) وتی: چۆن لەیادم چوو. داوای لێبوردن دەكەم.

- باوكە (دۆبۆر) نیوەتوڕەو نیوە دەم بەپێكەنین وتی: (رەبی) خەجاڵەت نابیت؟ لەسەروبەندی (نۆیل)یشدا.

- (تیۆ) بەشداریكرد: لەگەڵ ئەوەشدا بەرێز (ئالیئەرز) تۆ باسی پێشبینی پاشاكانی مەجوس و كوشتوبڕی منالاّنت بۆ كردم، وانییە؟

- (رەبی) لەژێر لێوەوە وتی: بەڵێ راستە. لەیادم چوبوو.

- باوكە (دۆبۆر) بەنارەحەتییەوە وتی:

- باشە. كەئێستا باس لەو پرسەیە بزانم دەربارەی خەتەنەكردن هیچت باسكرد؟

- هەڵبەتە، ئەنتوان! رونكردنەوەم لەسەر بابەتی پەیوەست بە پەیمانی دووەم داوە.

- (تیۆ) وتی: راستە. پێویست ناكات بۆ بەتنی پەیمان لەگەڵ خودا مرۆڤ خەتەنە بكرێت. كاتێك منالّ بوم خەتەنەكرام. باوكم وتی: پارچەیەك گۆشتی زیادەیەو دەبێت ببڕێت.

- پورە (مارتا) وتی: تیۆ، دەزانیت ئەمجۆرە هێمایەی سەرجەستەت لەزۆربەی ئاینەكاندا هەیە؟ لەهەندێك وڵاتدا هەمان كاریش لەگەڵ كچانی بچوكیش دەكەن؟.

- (فاتۆ) لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ كردوم! كارێكی ترسناكە... دەڵێت ئەو تەڵەكەبازییە پیاوان بۆ ئازاردانی ژنان دایانهێناوە.

[1]. (گەڕان بەدوای گەنجینەدا) بەرنامەیەكی تەلەفزیۆنی فەرەنسایە، كە تێیدا خوبەخش بەوەرگرتنی سێ ئاماژە شتێك لەشوێنێكدا شاراوەتەوە، ئەدۆزرێتەوە.

- پوره (مارتا) وتی: ئەوانە خۆشیان ئازار دەدەن. لەهەندێك لەخێڵەكانی زەریای ئارامدا پیاوان وەك ژنان هەموو مانگێك خولی مانگانەیان بۆخۆیان دروستكردووەو خوێن لەخۆیان دێنن.

- (رەبی) وتی: وەحشیگەرییەكی نەفرەتاوییە. ئێمە بەپارچە گۆشتێكی زیادە رازی دەبینو هەر ئێمەش نین موسڵمانەكانیش خەتەنە دەكەن. وانییە سلێمان؟

- بەڵێ، ئیسلام نكوڵی لەراسپاردەكانی پەیامبەرانی سەرەتا نەكردوە، بەڵكو كاملی كردون.

- باوكە (دۆبۆر) چوەناو گفتوگۆكەوەو گوتی: ئێمەی كریستیانی خۆمان لەدروستكردنی برینداری خوێناوی لەسەر جەستەی پەیڕەوان لاداوە. بۆ هێنانی منالێك بۆ ناو جیهانی خوا هێندە بەسە لەناو ئاودا تەربكرێت، ئەوەش بەپەیڕەویكردن لە (ژان باتیست — ژان بابتیست، یەحیای تەعمیدكار)، كە خۆبەخشانی ئیمانداری لە روباری ئوردندا تەڕدەكرد. (ژان پاپتیست)، كە پێستی گیانداری پۆشیبوو، كوللەی لەهەنگوین هەڵكێشراوی خواردووەو موژدەی هاتنی (عیسا)ی بلاوكردۆتەوەو وتویەتی: ( من مەسیح نیم، چونكە من مرۆڤەكان تەڕدەكەم، لەكاتێكدا ئەو مرۆڤ لەرۆحی پیرۆزدا نغرۆ دەكات). ئەوە (پەیمانی نوێ) بوو.

(تیۆ) هاواریكرد: تەعمید! تۆ بۆچی باس لە نغرۆبون لەئاودا دەكەیت؟ تەنها كەمێك ئاو بەناوچەواندا دەپرژێنن‌و پارچە نانێك لەسەر زمان!

- لەسەرەتای سەردەمی كڵێسادا هەموو جەستەیان لەناو هەڵدەكێشا. پاشان ڕێورەسمەكە ئاسانكرا. ئەمڕۆ چیدی خوێ ناخەنە سەر زمانی ساواكان.. تەعمید بەو جۆرە بەهێزترە، چونكە دیاردەو سمبولی هاتنە ناو سەر زەمینی خوایە.

- (رەبی) وتی: بەڵێ، بەڵام هاتنی سمبولیانە نەك بینراو. خودی ئەبەدی دەیەوێت جەستە نیشانەیەكی دیار لەپەیمانەكەی خۆی هەبێت، نیشانەیەكی راستەقینەو واقعی.

## تیۆ كۆبەندی دەكات

(تیۆ)، كەلەسەر جێخەوەكەی درێژ ببوو، ئەو پارچە كاغەزەی دەخوێندەوە لەپاڵ دیوارەكەدا دۆزیبویەوە. باڵندەیەك، كە لەوانەیە باوكی خۆی بێت؟ وەك (مەریەم)، كە كچی كوڕەكەیەتی؟ لەراستیدا پوره (مارتا)ش زیادەڕۆیی دەكات!. لەلایەكەوە (ئۆرشەلیم)یش زیادەڕۆیی دەكات!. (تیۆ) بەمەبەستی پەیداكردنی ڕێكخستنێك بۆ ئەو شڵەژاوییە پەراویچكەكەی دەرهێنا. (خوای جولەكەكان یەكسانبونێكی یاسایی بەگەلی جولەكە بەخشی.

خوای کریستیانەکان = خوای باوك، کە لەڕێگای خوێنی رۆحی پیرۆزەوە عیسای کوڕی بۆ هەموو خوڵك کردە قوربانی. خوای موسڵمانان = بەتواناو مەزن، کە لەڕێگای دوایین پەیامبەرییەوە یەکسانی بەهەموو خەڵك بەخشی، بەو مەرجەی پەیڕەوی لێبکەن). تا رادەیەك بابەتەکە رونبوو. پاشان ئاڵۆز دەبوو. (جولەکەکان = یەکەمین سروش. لەچاوەڕوانی مەسیح. کریستیانەکان = دووەمین سروش. مەسیح هاتوە. موسڵمانان = کۆتایی سروش. پاشئەوە پەیمانی جولەکەکان لەگەڵ خوا - ١) کەشتی نوح. ٢)خەتەنەکردنی ئەبراهام. ٣) سندوقی موسا. ٤) مەسیحییەکان! پەیمانی نوێ). ئەی لەو نێوەندەدا دەوڵەتی ئیسرائیل چییە؟ باشە دەبێت لەپەیمانی چوارەمدا زۆر گرێ کوێرە لەوێدا مابێت!. بۆ نمونە بۆچی پاپا لەڤاتیکانە؟ بۆچی موسڵمانان بۆ مەککە دەچن؟ هەموشیان تاکە خوایەك دەپەرستن.

لەکوێ دەکرێت باڵندەی نەمری چنگ کەوێت؟ لەکام وڵات؟ هندستان یان یۆنان؟.

## نیگەرانییەکانی کڵێسای کریستیانی

رۆژی دواتر پورە (مارتا) سپێدە زوو بێداری کردەوە. هۆکەی ئەوەبوو ئەگەر بیەوێت لەدەستی ئاپۆڕەی توریستەکان رزگاری بێت، کە بەهۆی جەژنی (نویل)ـەوە ژمارەیان زۆر بوو، دەبێت زوو بجولێت. بۆ کوێ؟

- پورە (مارتا) وتی: بۆ شوێنە پیرۆزەکان. باشە، ئەوەش جۆرێکە لە پێناسەکردن، چونکە لە ئۆرشەلیم هەموو شتێك پیرۆزە. وەك دەبینیت رووداوی شوێنە پیرۆزەکان زۆر لەڕووداوی جولەکەکان ئاڵۆزترە.

ئێستا نۆرەی باوکە (دۆبۆر) بوو. ئۆتۆمبیلەکە لەشوێنێکی نزیك لە گۆڕەپانێك، کە گروپێکی توریستو سەیرانکارانی تیا کۆببۆوە، راوەستا. پورە (مارتا) شێخو (رەبی) بردە لاوەو پێیراگەیاند:

- ئەنتوانی هاوڕێمان ناتوانێت لەبەردەمی ئێمەدا هەموو شتێك بۆ (تیۆ) رونبکاتەوە، با لەگەڵ (تیۆ) بەتەنها بێت. ئەگەر بەشداری رونکرنەوەکانی بکەن ئیدی من بەرپرس نیم، دەزانن چۆن پیاوێکە، دڵێکی ئاڵتونی هەیە، بەڵام ....

- (رەبی) وتی: بەڵام زوو توڕە دەبێت. (مارتا)ی ئازیز، تۆ راست دەکەیت. باشترە بچینە بەرخۆرەکەی دەرەوە.

- شێخ لەسەرخۆ وتی: کاتێك هاتنە دەرەوە شتێك هەیە بە (تیۆ)ی رابگەیەنم.

کڵێسای (نزرگای پیرۆز) لەبەرامبەر (تیۆ)دا سەربڵند وەستابوو، تەلارێکی گەورەیە بەگومەزێکی پانی بەردینەوە؛ نەپانتای دیواری (ندبە)ی هەبوو نەجوانیو شکۆی ئالتونی گومەزی بەردین، بەڵام لەو شوێنەدا بوو، کە (عیسا) لەمەرگەوە گەڕابۆوە ناو جیهانی زیندووەکان. کاتێك لەدەرگای کڵێساکە پێیان نایە ناوەوە (تیۆ) وتی:

- کەواتە دەکرێت لێرە گۆڕی مەسیح ببینین.

- باوکە (دۆبۆر) وەڵامیدایەوە: بەتەواوی نا. سەرەتا هیچ شتێك نابینرێت، چونکە پاش لەخاچدانی (عیسا) لێرەدا پەرستگایەکی یۆنانی – رۆمی دروستکرا. پاشان ئیمپراتۆری رۆمی بەناوی (کنستانتین – قوستەنتین) لەساڵی (٣١٣)ی زاینی بوو بەکریستیانیو ئۆرشەلیم بوو بەپایتەختی خۆرهەڵاتی ئاینی نوێ. دایکی ئیمپراتۆر بەناوی (سانتا هێلین – هێلینی پیرۆز) لێرە بەدوای گۆڕەکەدا گەڕاو سەرئەنجام شوێنی گۆڕەکەی سێ لەخاچدراوی دۆزییەوە، کە هی (عیسا)و دوو چەتەبونو پێکەوە لەخاچدرابون. پەرستگا یۆنانییەکەی تێکداو لەجێگای کڵێسایەکی دروستکرد، کە ئەویش پاش چەند سەدەیەکی دوایی بەدەستی جێگرەوەیەك وێرانکرا... (تیۆ) لەکاتی وەستانی لە ڕاڕەوێکدا، کە دەنگی وێردو ترای سەردانکارەکان دەهات، وتی:

- بەو پێیە بێت ئەمە دووەمین کڵێسایە.

- نەخێر، ئەمە سێیەمین کڵێسایە، کە لەلایەن خاچپەرستەکانەوە دروستکراوەو لەو دەمەشەوە تا ئێستا بەردەوام نۆژەنکراوەتەوە. ئەم کڵێسایە بەڵای جۆراوجۆری بەسەردا باریوە. ئاگر کەوتنەوە، بومەلەرزە... لەهەموو شوێنێكو لەهەر گۆشەیەکدا میحراب دروستکرابوو، چونکە لە کڵێساکانی مەسیحیدا شوێنێکیان بەجۆرێك دابەشکردوە لەقۆناغی یەکەمدا مرۆڤ نازانێت لە کام بەشی کڵێساکەدایە. لەسەر سەرت بنوارە. ئەو ریزە چرایە دەبینیت، کە لەسەر شێوەی هێلکەیەکی گەورە هەڵواسراون؟ چوار دانەیان هی کڵێسای یۆنانەو چوار بۆ کڵێسای لاتینو سیانیش بۆ کڵێسای ئەرمەنی دەگەڕێتەوە.

- تیۆ هاواری کرد: ئەو هەموو کڵێسایە بۆ یەك مەسیح؟ ئەوە پەسەند بکە کەمێژوەکەتان بەجۆرێکی سەیر ئاڵۆزو تێکەڵە.

- باوکە (دۆبۆر) ئاماژەی کرد: حەیف... من بۆ رونکردنەوە بۆ تۆ هاتومەتە ئێرە، بەڵام مەرج ئەوەیە هاوار نەکەیت، ئێمە لە کڵێساداین...

- (تیۆ) بەهێواشی وتی: زۆر باشە. ئێستا بڵێ بزانم ئەو گۆڕە لەکوێیە؟

- باوکە (دۆبۆر) وتی: باشە. پرسی گۆڕەکە لێڵو ئاڵۆزە، بەڵام دروست بەرامبەر بە تۆ لەنێو مۆمدانەکاندا سەیری ئەو بەردە رەنگ سەوزە بکە. ئەو خانمە دەبینیت کە دەڵێی بەردەکە دەسڕێتەوە؟ لەراستیدا خەریکە ئاوی تەبەڕوك بەو پارچەیەی دەستی کۆدەکاتەوە، کە مرۆڤەکان بەنییەتی هەتوانکردنی برین بەکاریدێنن؛ ئەوە بەردی (چەورکردنە). کۆی ئەم شوێنە بە (گول گوتا) ناودەبرێت، کەهەمان ئەو جێگایەیە مەسیح تیایدا لەخاچدرا، بەڵام بەردە سورەکە ئەو شوێنەیە پەیکەری مەسیحی تیا مۆمیاکراوە. بەڵام کریستیانە ئەرتەدۆکسەکان لەو باوەڕەدان ئەمە ئەو بەردەیە جەستەی مەسیحیان لەسەر راکێشاوە تا مێخەکان لەدەستو پێی دەربهێننەوە. کاسۆلیکەکان بڕوایان بەو جۆرە نییە.

- (تیۆ) دەنگی هەڵبڕی: تکات لێدەکەم نەڵێیت کریستیانەکانیش لەشەڕو ململانێدان!

- باوکە (دۆبۆر) بەتوندیو راشکاوانە وتی: رێك وەك جولەکەکان نەکەمو نەزیاد. ئێمەش ماف خۆمانە لەگەڵ یەك ناکۆك بین.

- باشە. باشە، تورە مەبە.... بەڵام هەموو ئەوانە باوەڕیان بە (عیسا)ی مەسیح نییە؟

- (تیۆ)..وەك تێدەگەیت کریستیانیش چەندین جۆری هەیە. دەربارەی پرۆتستانەکان نادوێم، چونکە هیچ پەیوەندی بە بابەتەکەوە نییە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: سەیرە! لەبەرچی؟

- (باوکە دۆبۆر) بەنارەحەتییەوە وتی: (تیۆ)، چونکە لای ئەوان... ئاخ، پاشان تێدەگەیت. نەخێر. لێرە من باس لە کلێسای کریستیانی دەکەم، کە بەشدارن لەپارێزگاریکردن لە گۆڕی پیرۆزو تۆ لەبەردەمتا شوێنی نوێژ، دێرەکانی، هۆڵو ژورەکانی دەبینیت. واتە سەبارەت بە کلێسای لاتینی، ئەرتەدۆکس، ئەسیوبی، ئەرمەنیو.....

- (تیۆ) ئاگاداری کردەوە: ئۆو! هێواش!

- لەرێگا بۆت باس دەکەم....

زمزمەی وێردو نزاکان گومەزەکەیان پڕکردبوو. لەلای چەپی ڕاڕەوەکەوە، کە بەکۆمەڵێك توریست ئاخنرابوو، ژمارەیەکی زۆر ستونو پایەی لەبەرد تاشراو یان بەمەڕمەڕ رازاوە دەبینرا. (تیۆ) پێی هەڵگرتو باوکە (دۆبۆر) وتی:

- (تیۆ) پەلە مەکە، گۆڕەکە لێرەدایە.

- (تیۆ) لەپڕ وەستا، کە سەری بادەدا، بەهێواشی وتی: هیچ نابینم. زۆر جەنجاڵە.

- بەڵام (تیۆ) پێشتر وتم، کە گۆڕەکە تاڕادەیەك نادیارە. لێرەدایە کەهەمموو نزادەکەن. بەلایەنی کەمەوە لەم پنتەدا هەموو کریستیانەکان دەتوانن ڕێکبن. بابچینە پێشەوە. ئەو کڵێسایەی بەکڵێسای لاتینی ناسراوە لەروی مێژوییەوە یەکەمین کڵێسایەو لەلایەن (بوترس یان پییەری قەدیس – SAINT- PIERRE)ی یەکەمین هاوەڵانی مەسیحەوە دروستکرا، لەبەر ئەوەشە پێیدەڵێن کڵێسای (هاوەڵان- حواری - ئەپۆستیلك). (ئەپۆستیلك) سیفەیە بۆ وشەی (هاوەڵ – حواری)، کەواتاکەی (نێرراوی خوایە). لەبەرئەوەی (سن پییەر – بوتریسی پیرۆز) لەشاری (رۆما) لەخاچدرا، کڵێساکەی ئێمە (کڵێسای پیرۆزی لاتین) بەحواری (ئەپۆستۆلیك)و رۆمی ناوزەدکراوە. ئەمە گرنگترین کڵێسایە.

- (تیۆ) بەنارەزاییەوە وتی : ئۆو نا! دایکە گەورەم بەو جۆرە بۆ منی باس نەکردوە! ئەی بۆ کڵێسای ئەرتەدۆکس چی دەڵێیت؟

- باوکە (دۆبۆر) بەبڵمەبڵمەوە وتی: دیارە ئەم کوڕە بنەچەو ریشەی یۆنانی هەیە. (تیۆ) نەنکی تۆش هەڵەی نەکردوە، چونکە رێچکەی ئەرتەدۆکسیش بۆ پیرۆزکردنی گۆڕی مەسیح لەسەردەمی ئیمپراتۆری بیزەنتییەکان (بیزانس)دا یەکەمین کڵێسایان دروستکرد. لەبەرئەوەیە کە ئەو کڵێسایەی لەناویدایت زیاتر شێوەو روخساری بیزەنتی پێوەیە.

- (تیۆ) تۆ دەزانی بیزەنتی چیبون؟

- (تیۆ) وتی: بەڵێ. لەقوتابخانە باس لەڕوخانی بیزەنتی دەکرا لەساڵی (١٥٤٣)دا.... نەخێر (١٤٥٣)؛ تورکەکان شارەکەیان ئابلۆقەدا. وەکو (سربەکان) کە لەدواییدا شاری (سەرایڤۆ)یان ئابلۆقەدا، لەگەڵ ئەو جیاوازییەی کە لەکۆتاییدا تورکەکان سەرکەوتن. بابەتەکە ئەوەیە من باش تێنەگەیشتوم بۆچی؟

- قەشە دۆمینیکن (مەبەست باوکە دۆبۆرە، کە سەر بە گروپی دۆمینیکەکانە - و) وتی: چونکە کریستیانەکان بەناوبانگترین پایتەختی خۆیان، کە هەمان پایتەختی خۆرهەڵاتی بوو، لەدەستدا. بەڵام پێش روخانی بیزەنت ناکۆکییەکی ناخۆش کڵێسای مەسیحی لەیەك دابڕی و دوبەرەکی کەوتبوە ناویانەوە. لەلایەکەوە لەسەرانسەری ئەوروپا کڵێسای کاسۆلیکی پەیڕەوی لە (پاپا ) دەکردو لەلایەکی دیکەوە لەئیمپراتۆری بیزەنتیدا کریستیانەکان پەیڕەویان لەئەسقەفی مەزنی بیزەنتی دەکرد. ئەمڕۆ شاری کۆنی بیزەنتییەکان ناوە تورکییەکەی خۆی کە (ئەستانبوڵ)ە پاراستوە. بەڵام لەو بارەیەوە گفتوگۆ لەگەڵ تۆ ناکەم خۆت دەیبینیت.

- (تیۆ) بەشادییەوە وتی: واتە بۆ ئەستانبوڵ دەچم؟ ئەو شارەم لەسەر ئەتلەسی باوکم نەدیوە!

- باوکە (دۆبۆر) بەسەرسوڕمانەوە وتی! لەراستیدا، (تیۆ) ... مەبەستم ئەوە نەبوو.

- نا.... نا.. باش تێگەیشتم!

- باشە، تیۆ دەست لەیەخەم بەردە... راستە ئەستانبوڵ دەبینیت. بەڵام لەو بارەیەوە هیچ بە پورە (مارتا) نەڵێیت.

- پێیدەڵێم پێکەوە دەربارەی بیزەنتییەکان گفتوگۆمان کردوەو ئەو تێناگات...

- باشە درۆیی بەرژەوەندییە. لێگەڕێ ... بەمپێیە تێگەیشتیت، کە پێش روخانی بیزەنتەکان کڵێسای کریستیانی لەسەر رۆڵو ئەرکی سەرۆکی باڵای کڵێسا تێکچون: (پاپا) بۆ گروپێکو (ئەسقەف)ی گەورەش بۆ گروپێکی دیکە. ئەمە ئەو دیاردەیەیە بە(شیزم - Schisme) ناسراوە، کە بەواتای (جودایی) یان (جیابونەوە) دێت. یەکەمین (شیزم) لەساڵی (١٠٥٤)ی زاینی کاسۆلیکی لە ئەرتەدۆکس جیاکردەوە. دووەم (شیزم) لەساڵی (١٤٣٩) کڵێساکانی کاسۆلیکی ئەوروپای لەکڵێسای خۆرهەڵاتی دابڕی؛ کە ئەو کڵێسایانە پەیڕەوییان لە پاپا دەکرد.

- (تیۆ) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: چی لێبەرهەمدێت! ئەمجارە لەسەر چی ناکۆك بون؟

- بۆ نمونە لەسەر پرسی هاوسەرگیری قەشەکان. کڵێساکانی خۆرهەڵات مۆڵەتی بەهاوسەرگیری قەشەکان دەدەن.

- (تیۆ) وتی: وەك ئەرتەدۆکسو پرۆتستانەکان، تەنانەت لە فەرەنساش قەدەغەکردنی هاوسەرگیری قەشەکان کێشەی نابۆوە. من خۆشم سەرم لەوە دەسوڕمێت بۆ مۆڵەتیان پێنادەن.

- باوکە (دۆبۆر) کەمێك دودڵ بوو، ئینجا وتی: لەبەرئەوەی کە، ... تۆ بەم پرسیارانەت خاڕسم دەکەیت!. بەڵێ، لەبەرئەوەی کاروباری خێزانی لەکاروباری ئاینی دوریان نەخاتەوە. فەرموو! کاسۆلیکی لاتینیو کاسۆلیکی خۆرهەڵاتی لەسەر پرسی (تعمید)یش کۆکنین. کاتێك منالێك لە(غوسل - تعمید)ی ئەنجامدا دەتوانێت لە ئاهەنگی (کۆمۆنیۆن)[1] بەشداری بکات.

---

[1]. Communion: لەبنەمادا واتای پەیوەندی ئەو تاکانە دەدات کە ئیمانی هاوبەشیان هەیە. لێرەدا بەواتای ئەوە دێت کە منالێ پاش (تعمید)کردنی دەتوانێت لەرێوڕەسمی (میس)، نیشانەی سیمبولی یادەوەری قوربانی مەسیح (نانو شەراب) لە کەشیش وەرگرێت. و. کوردی.

لەکاتێکدا لەکڵێسای کاسۆلیکی ئێمەدا رێورەسمی (غوسڵ) دەبێت لەتەمەنی پێگەیشتندا ئەنجام بدرێت؛ واتە منداڵ ئازادانە ئاینی باوانی هەڵگرێت. ئایا ئەمکارە لۆژیکانە نییە؟

- (تیۆ) وتی: بۆچی نا، بۆ نمونە دایكو باوکم تەنانەت نەیانویست ئێمە (غوسڵ ) بکرێین تا بتوانین خۆمان بڕیار بدەین. ئەمە لۆژیکیانەترە.

- پیاوی کڵێسا بەتوڕەییەوە قسەکەی پێبڕیو گوتی: زۆر باشە، ئێستا دەگەینە بەشی تایبەت بەکڵێسای ئەرمەنییەکان. ئەم کڵێسایە تەنها کڵێسای کاسۆلیکی پەسەندکردو لەبەرئەوەیە کڵێسای ئەرمەنی شانازی ئەوەی پێبڕاوە بەشداری بکات لەچاودێریو پاراستنی (نزرگەی پیرۆز).

- (تیۆ) وتی: یەکەمجارە پرسەکە لەلام رونو ئاشکرایە، ئەی کڵێسای ئەسیوبی چییە؟

- ئەمە چیرۆکێکی دورودرێژی هەیە.

## منداڵەکانی بەلقیسو سلێمان پاشا

حەبەشییەکانیش نوێنەرانی زۆر دێرینو نەریتی بون، کە لەئەفریقاوەو لەدیو سەرچاوەکانی نیل لەحەبەشە (ئەسیوبیا)وە هاتبون. چونکە لەوانەیە شاژنە (سەبا)، هەمان (بەلقیس)ی ناودار لەئەسیوبیا بێت. لەوێ بازرگانێکی حەبەشە بەجۆرێك باسی شکۆو گەورەیی سلێمان پاشای بۆ کردبێتو هێندە وەسفی کردبێت تا شاژن بڕیاری چاوپێکەوتنی دەدات. ئەم روداوە لەسەردەمی دروستکردنی پەرستگاکەدا رویداوە. پاشای عیبرییەکان لەسەر زەمینە دورە دەستەکانەوە داری گرانبەهاو خشڵی زۆر جوانی دەهاورد. سلێمان لەنهێنیترین رازەکانی ئاسمانو زەمین، پیرۆزترین ئەژمارکراوەکانو موعجیزەترین فۆرمەکان بەئاگابوو.

- (تیۆ) بەسەرسامیەبونەوە وتی: سلێمان پاشا موعجیزەی هەبوو؟

- موعجیزەگەرێکی زۆر شارەزاو بەتوانا. وەك هەموو پاشاکان (سلێمان)یش مۆرێکی تایبەتی هەبوو، کەنیشانەی دەسەڵاتو توانای پیرۆزی بوو. مۆرەکەی سلێمان دوو سێگۆشە بوو. نوکی سێگۆشەی یەکەم روی لەسەرەوەو نوێنەرو هێمای ئاگر بوو، نوکی سێگۆشەی دووەم روی لەخوارەوە بوو، کە نیشانەو ئاماژە بوو بۆ ئاو. کاتێك سێگۆشەی ئاگر بنکەی سێگۆشەکەی دی دەبڕێت ئەو هێمایەی بەدەست دێت (هەوا)یە. کاتێك سێگۆشەی ئاو لەلای خۆیەوە بنکەکەی دەبڕێت هێمای (خاك) بەدەست دێت. بەمپێیە بەدانانی هەردوو سێگۆشەکە لەسەر یەکدی ئەستێرەیەکی شەش لاپەیدا دەبێت، کە کۆی توخمەکانی جیهان پێکدێنێت.

- (تیۆ) هاواریکرد: ئەو ئەستێرەیە دەناسم! لەسەر ئالآی سپیو شینی دەوڵەتی ئیسرائیلە.

- لەراستیدا مۆرەکەی سلێمان، کە بە (ئەستێرەی داود)یش ناودەبرێت لەسەر ئالآی ئیسرائیل هەیە. توانای سلێمان پەیامبەر، کە هێشتا کاریگەری لەسەر جولەکەکان هەیە، دەسەڵاتێکی مەزن بوو... تەنانەت توانای هێندە بوو، کە بەپێی ئایەتێکی قورئانیش پەپوسلێمانکە (هدهد)ێکی هەبووەو لەخاکە دورەکانەوە هەواڵی بۆ هێناوە. ئەو باڵندەیە کە ناوی (جەفور)بوو ناردویەتی بۆ سیخوڕی بەسەر (بەلقیس)ـەوە، چونکە باڵندەکە دەربارەی شاژنە (سەبا) هەواڵی سەرنجڕاکێش، قەشەنگی، ئاقڵیو بەتەگبیری هێناوە. پاشا بڕیاردەدات داواکەی (بەلقیس) بۆ چاوپێکەوتن پەسەند بکات. سلێمانو بەلقیس هەردوکیان لەبەکارهێنانی فرۆفێڵدا ململانێی یەکدیان دەکرد تا توانستەکانی یەکدی ئەزمون بکەن، بەڵام ئەم پێشبڕکێیە هاوسەنگ نەبوو، چونکە بەلقیس جاسوسێکی وەك (جەفور)ی نەبوو. سەرئەنجام بەلقیس، کە پەرۆشی دانایی بێکۆتای ئەو پاشا بەتوانایە بوو، بڕیاری سەفەریدا. سەفەرێکی دورودرێژو نارەحەتو شەکەتهێنەر. سلێمان بەئامێزی کراوەوە پێشوازی لەو شاژنەکرد، کە ئەو رێگا دورەی بڕیبوو. بەڵام چونکە بیستبوی، کە ژنانی وڵاتەکەی شاژن قاچیان وەك سمی بزنە، بڕیار دەدات (بەلقیس) بەرپیچکەی ناو تەلارێکدا ببەرێتەوە کە ئاوی پیارۆشتوە. دیارە بۆ ئەوەی داوێنی تەڕ نەبێت خۆی هەڵدەکات. ئاوەکە ئەرکی ئاوێنەی بینیوەو دەرکەوتوە قاچێکی بچوکی جوانی هەیەو هیچ نیشانەیەکی موی درێژو سمی بزنی پێوە نییە. سلێمان بڕیاریدا لە کۆشکەکەی خۆیدا بیهێڵێتەوە، بەلام (بەلقیس) لەڕوی تەگبیروەرگرتنەوە سوێنی داوە دەستی بۆ نەبات، چونکە پاکیزەیە.

- (تیۆ) رونیکردەوە: بەڵام بەبڕوای من ماوەیەکی درێژ بەو جۆرە نەمایەوە.

- لەبەرامبەردا (سلێمان)یش سوێندی (بەلقیس)یداوە دەست نەبات بۆ شتێکی ناو ژورە تایبەتەکەی ئەم. لەو میوانداریەی بەبۆنەی شانازی شاژنەوە بەرپاکرابوو (سلێمان) جۆرێ خواردنی توندو سوێر خوێی دروستکردبوو. شەو شاژن لەسەرخۆ بەنوکی پێ بۆ ئاوخواردنەوە گەڕاوە، بەڵام (سلێمان) بە فێڵ ئاوەکەی لەژورە تایبەتەکەی خۆی داناوە. لەپڕێکدا سلێمان خۆی دەکات بەژورداو دەبینێت وا(بەلقیس) لەئاوەکەی دەخواتەوە، واتە سوێندەکەی شکاندوەو چۆتە ژوری نوستنی (سلێمان)ەوە.

- (تیۆ) وتی: تەڵەکەبازییەکی سەیربوە.

- (جفور – پەپوسلێمانکەکە) بەخۆشییەوە تەواوی شەو خوێندی ... پێکگەیشتنی پاشاو شاژن بۆ عەشقو خۆشەویستی گۆڕاو منداڵێکی لێکەوتەوە بەناوی (مێلێنك)، کە بوو بەیەکەم پاشای حەبەشە (ئەسیوبیا). کاتێك (مێلێنك)ی لاو گەیشتەوە سەرزەمینی باوکی بەفێڵ (سندوقی پەیمانی) لەو پەرستگایەی باوکی دروستکردبوو، هەڵگرتو لەگەڵ خۆی بردیەوە. دەگێڕنەوە سەرەتا سلێمان زۆر توڕەبوە، پاشان ئارام بۆتەوە، کە هەرچۆنێك بێت لاوەکە شایستەی ئەو سندوقەبوە. هەرلەبەرئەوەیە خەڵکی ئەسیوبیا لەو باوەڕەدان (سندوقی پەیمان)ەکە لەشوێنە بەرزەکەی خۆی نەماوەو لەوەودوا بۆ ئەسیوبیا براوەو لەشوێنێك حەشاردراوە، کەلەوانەیە ئێستاش لەوێ بێت.

- (تیۆ) وتی: کەواتە (ئیندیاناجۆنز)یش بۆ ئەو سندوقە بزربوە گەڕاوە! ئێستا تێگەیشتم!. لەباسی سندوقەکەوە بچینە سەر باسی (بەلقیس). شاژنە (سەبا) چووە سەر ئاینی جولەکە (جودایزم)و ئەو ئاینە لەولاتەکەیدا جێگیرکرد. چەند سەدە دوای ئەوە ئەسقەف (فرومانس) چوو بۆ ئەسیوبیاو خەڵکی ئەوێی کرد بە کریستیانی.

- باوکە (دۆبۆر) وتی: بەڵام کریستیانەکانی ئەسیوبیاش چونکە میراتگری ئەو پەیوەندییەی نێوان بەلقیسو سلێمان بون هەمان ئەو کارەیان کرد، کەجولەکەکان کردیان. واتە نازناوی گەلی هەڵبژێراویان لەخۆیاننا. لەو ولاتەدا کڵێسایەکی مەزن هەیە، کە لەدڵی زەویدا دروستکراوە...

- واتە ئەشکەوتە؟

- نەخێر، هێندە چاڵیان کردوە وەك ئەوە وایە کڵێساکە لەداوێنی بەرزاییەکدایە. سروتی دەستەی ڕێپێوان لەوێ پڕشکۆیە... خۆزگە دەتبینی (تیۆ)! قەشەکان لەژێر چەتری جوانی نەخشینو درەوشاوەی ئاڵتونیو کلاوی مەخمەڵی لێوار نەخشێنراودا بەئامێری مۆزیکی چەندپەل و دەنگی تەپڵەوە سەمای داود دەکەن.

- (تیۆ) لەبەرخۆیەوە وتی: حەزدەکەم ئەو ئاهەنگە ببینم.

دوای چاکبونەوەت. کریستیانەکانی ئەسیوبیا بەو شوێنە دەڵێن (لالی لیلا)و دەڵێن ئۆرشەلیمی نوێیە. لەوێ خەڵکی ئەسوبیا بڕوایان بەپەیڕەویکردنی خونەریتی خۆیان هەیە، کە خەڵکی ئەفریقین و لەپشتی سلێمانو گەلەکەیانن و توانیویانە سەرکەوتن لەوەدا بەدەستبێنن کەڕێگری لەوێرانی ئۆرشەلیمەکەیان بکەن. قەشەکانی ئەسیوبیا بەروکەش

سەرنجراکێشن، تۆ ناتوانیت لێرە لەشکۆو گەورەیی خۆیاندا بیانبینیت؛ دێرەکەیانت لەهەیوانەکە پیشان دەدەم.

بەسەر پلیکانەی زۆر باریکدا سەرکەوتن. دوایین پلە بەرەوی هەیوانێکدا دەکرایەوە، کە لەکۆتاییەکەیدا ژوری بچوکی دەرگا سەوز لەژێر سایەی دارێکی هەناردا دەبینرا.

- قەشە (دومینیکن) وتی: گەیشتین. دەبینی ئەسیوبییەکان لەکۆنترین مەسیحییانی جیهانن. ئەم هەیوانە شوێنێکی ئارامە. لەوانەیە لەناو کڵێسای (نزرگەی پیرۆز)دا ئارامترین شوێن بێت. لەئسیوبیا تا ماوەیەك پێش ئێستا کۆمەڵگەی زۆر دێرینی پێکهاتوو لە جولەکەی ئەفریقی هەبون، کەبۆ گەردەلولی ئەفسانەیی شاژنە (سەبا)و مردەمی کۆیلایەتی میسردەگەڕانەوە. ئەو جولەکە رەشپێستانە بە (فلاشە) ناودەبرێن. ئەوانە پەیکەری (رەبی)و (حاخام)ـە یەهودییەکان دروستدەکەن، کە تەوراتیان لەبندەستدایە. زۆربەیان بۆ ئیسرائیل کۆچیان کردو لەوێ هەندێك (حاخام) پێیانداگرت، کە ئەوانە جولەکەی راستەقینەنین‌و خرانە ژێر پەروەردەو فێرکردن‌و نوێژەنکردنەوەی کەلتورییەوە. ئێمەی مەسیحی کریستیانەکانی ئەسیوبیا ئازار نادەین. ئەوانە خاوەنی دابونەریتی خۆیانن‌و ئێمە رێزیان دەگرین.

جگە لەچەند راهیبێکی باڵابەرزو روخسار لاواز هیچ کەسێکی دی لەهەیوانەکەدا نەبوو، تەنانەت توریستێکیش. (تیۆ) لێرەدا یەکەمین وێنەی خۆی بەوکامێرایە گرت ،کە دیاری باوکی بوو، ئینجا وتی: جوانە... ئایا پێستی جەستەی ئەویش رەش بووە؟

- مەبەستت کێیە؟

- شاژنە سەبا!

- بێگومان. زۆریش جوان بوە.

- (تیۆ) لەباری زیندەخەوندا بەهێواشی وتی: جوان‌و ئەسمەر، وەك (فاتۆ)ی هاورێم. دەرۆینە خوارەوە؟ وابزانم هەموو شتێکم بینی؟

- تۆ نەتهێشت هەموو شتێك تەواو بکەم. کڵێسەی (کپتییەکان – قیپتییەکان - Capte)ماوە؛ مەبەستم کریستیانەکانی میسرە. زۆربەی کیپتییەکانی میسر ئەرتەدۆکسن؛ لەگەڵ کەمایەتییەکی کاسۆلیکی. کریستیانەکانی میسری‌و ئەسیوبی پێکەوە شتێك پێکدێنن کە پێیاندەڵێن (رێچکەی ئەسکەندەرییە). ئەسکەندەرییە لە میسرە.

- (تیۆ) دوبارە بەهەمان خەیاڵەوە وتی: میسر؟ چەند خۆشە، هەست دەکەم لەوێ دەبمە باڵندە.

- باوکە (دۆبۆر) وەڵامیدایەوە: باڵندەیەکی نەمر، بۆچی نا؟

## نیگەرانی شوێنە پیرۆزەکان

- شێخ وتی: دواجار گەڕانەوە! سەردانێکی دوورودرێژ بوو!
- (تیۆ) بەئارامی وتی: حەزدەکەم دانیشم، بەدەست ئاپۆڕەی خەڵك، لەبۆنو بەرامەو ئەو شوێنە تاریكو تارانەوە شەکەت بوم.
- پیاوی کڵێسا دەنگی هەڵبڕیو بەناڕاستەوخۆ لەوڵامی شێخدا وتی: تیۆ، سەبارەت بە ئەسیوبییەکان دەبێت بڵێم....
- (تیۆ) وتی: فەلاشەکان؟
- (رەبی) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بۆ دەربارەی ئەوانیش دوایت؟
- باوکە (دۆبۆر) بەخەندەوە وتی: دیارە، من، من هیچ فەرامۆش ناکەم.
- شێخ بەزەردەخەنەوە وتی: تەنانەت ئەوەشی کە بە (تیۆ) بڵێیت کلیلی شوێنە پیرۆزەکان بەدەست کێیە؟
- (دۆمینیکن) وتی: راستە، تۆ راست دەکەیت... سلێمان. (تیۆ) سەیرکە من لەیادم چوو بەتۆ بڵێم کە کلیلی (نزرگەی پیرۆز) ئەمرۆ لەلایەن موسڵمانانەوە دەپارێزرێت.
- شێخ وتی: بەهۆی خاندانی گەورەی نەسیبە. خەلیفە عومەر، ئەو کەسەی مزگەوتی دروستکرد، بەمەبەستی رێگری لەدروستبونی کێشمەکێشی نێوان کڵێساو کریستیانەکان لەسەدەی حەوتەمدا کلیلەکانی بەو خاندانە بەخشیو هەر لەو ساتەوە تا ئێستا موسڵمانێك دەرگاکانی کڵێسای (نزرگەی پیرۆز) لەسەعات سێی بەیانی دەکاتەوەو سەعات پێنجی عەسر دایدەخات.
- (تیۆ) وتی: ئەم بابەتە سەرنجڕاکێشە، بەوجۆرە دەردەکەوێت ئەگەر بیانەوێت ئاینەکان دەتوانن پێکەوە هەڵبکەن.
- پورە (مارتا) هاواری کرد: ئێ.. ئێ! کەواتە دیارە (دوبۆر)ی دۆستمان جەنگو کێشمەکێشەکانی ناوخۆی کریستیانەکانی بۆ باسکردویت. ها؟ ئێستا مێشکت پڕە لەو رووداوانە، وانییە؟
- (تیۆ) وەڵامیدایەوە: بەڵێ! پەیڕەوی لە(پاپا)، هاوسەرگیری کردنو نەکردنی قەشەکان، بەشداری منالانی ساوا لە(کۆمۆنیۆن) یان چاوەڕێکردن تا تەمەنی پێگەیشتن. بەکورتی و بەڕاشکاوانە بڵێم شتێکی سەرنجڕاکێش نییە. هەموو ئەوانەش تەنها بۆ بەدەستهێنانی مافی چاودێری بەردی کۆنو دێرین لەدەوری گۆڕێك، کە تەنانەت مەسیحیشی تێدانییە!

- پورە (مارتا) لەبارێکدا بازوی (تیۆ)ی گرتبوو گوتی: بەڵام ئازیزەکەم دەبێت ئەوە پەسەند بکەین کەهەموو ئەو کێشمەکێش و ململانێیانە بۆ رابوردوو دەگەڕێنەوە... رەخنەی زیاد مەگرە.

باوکە (دۆبۆر) هاواری کرد: رابردوو، ئەم جەنگانە پەیوەستن بەرابردوەوە؟ ئەگەر رابردوە کەواتە بۆچی لەیوگۆسلاڤیا شەڕیان کرد؟ کرواتی کاسۆلیکی و سربی ئەرتەدۆکس و موسڵمانانی بۆسنیٚ؟

- (تیۆ) وتی: وامدەزانی هەریەکە وڵاتی خۆی دەویست. بۆچی لەسەر ئاین و مەزهەبیش شەڕیان بوو؟

- کەشیشەکە وتی: تا رادەیەك راستە، لەو باوەڕەدایت کەگێڕانەوەی ئەو داستانە دوورودرێژە بۆ من ئاسانەو خەیاڵم پێی ئاسودە دەبێت؟ سی ساڵ لەمەوبەر پاپایەك بڕیاریدابوو کلێساکانی مەسیحی یەکبخات.

- (تیۆ) پرسی: مەبەست ژان پۆلی دووەمە؟

- پورە (مارتا) وتی: نەخێر. ئەو پاپایە بە (جانی بیست و سێیەم) ناودەبرێت، ئەو زۆر پێش لەدایکبونی تۆ مردوە.

- (تیۆ) وتی: باشە، مسیۆ ئەنتوان ئەگەر لەگەڵ پاپا کۆکیت بۆچی توڕەیت؟

- زۆر باشە، پەسەندی دەکەم کە کەمێك توڕەبوم، بەڵام ئەگەر کەمێك بچینە ناو مێژووەوە هیچ لەم جیهانەی ئێستا تێناگەین.

- (تیۆ) بەدەنگێکی هیلاکەوە وتی: ئایا بەڕاستی لەو بڕوایەدایت من هەڵی بینینی هەموو ئەو شتانەم لەبەردەمدایە؟

لەناکاو (تیۆ) زۆر بێهێزو لاواز دەبینراو دوچاری بارێکی ناسك هات، کە باوکە (دۆبۆر)ناچاربوو ئارام ببێتەوە. شێخ پەرۆشی زۆری پێوەدیاربوو، (رەبی) نزیك دەبوەوە. مارتا بڵماندی:

- ئەنتوان، سەیرە تۆ ناگۆڕێیت؛ سەیرکە چیت کرد؟

- باوکە (دۆبۆر) لەبارێکدا (تیۆ)ی لەئامێزگرتبوو گوتی: تیۆ.. دڵنیام بۆ تێگەیشتن تەمەنێکت لەبەردەستدایە. خوا دەستبەرداری ئەم کوڕە نابێت.

- پورە (مارتا) بەتوندی وتی: یەکەم نازانم خوا چیدەکات؛ دووەم ئێمە چاوپێکەوتنی نەخۆشخانەمان هەیە؛ سێیەم (تیۆ) منالْ نییە، پێشتریش ئەوەشم پێراگەیاندبون.

دوباره نەخۆشخانە؟ تەنها پاش دوو رۆژی گەشتەکە؟. (تیۆ) نەیتوانی لەبابەتەکە تێبگات، بەڵام دەیزانی پورە (مارتا) بەڵێنی بە (میلینا) داوە بۆ شیکاری خوێن بۆ نەخۆشخانەی ببات و لەنزیکترین هەلدا دایکی لێئاگادار بکاتەوە. چارەیەکی دیکەش نەبوو.

## (سارا) پەرستاری نەخۆشخانە

نەخۆشخانەکە رێك وەکو نەخۆشخانەی فەرەنسا بوو؛ هێندە نەبێت لێرە بەزمانی عیبری دەدوان. لەرێگادا بەرەو ژوری وەرگرتنی خوێن (تیۆ) لەگەڵ پەرستارێکدا کەوتە گفتوگۆ، کە بەرەگەز فەرەنسی بوو، هەر لەتەمەنی دوانزە ساڵییەوە هاتبوە ئیسرائیل. (تیۆ) واتای وشەی (بالا - Aliya) لەوەوە فێربوو، کە گەڕانەوە بوو بۆ خاکی بەڵێنپێدراو. (سارا) وتبوی هەموو جولەکەکانی جیهان دەتوانن بێنە ئیسرائیل و ببنە هاوڵاتی؛ بەو مانایەی کاتێك جولەکەکان (ئۆرشەلیم)یان بەجێهێشتبوو (بەرەو خواروو داکشابون) و ئێستاکە بۆ (ئیسرائیل) دەگەڕێنەوە (بۆ بالا هەڵدەکشێن).

- پورە (مارتا) جەختی کردەوە: دیارە بەمەرج، پاش کوشتنی (ئیسحاق رابین)ی سەرۆك وەزیران لەلایەن یەکێك لەجولەکە توندڕەوەکانەوە، یاسای گەڕانەوە بەبێ رەچاوکردنی تەگبیر پیادەناکرێت.

پاش ئەوەی دەگەڕێنەوە فێری زمانی عیبری دەکرێن و لە هەژدە ساڵیدا دەخرێنە بەرخزمەتی سەربازی، تەنانەت ژنانیش. (سارا بن هامین)ی پەرستار بەرگی سەربازی پۆشیبوو؛ لەکاتێکدا باسی لەگەڕانەوەو راژەی سەبازی خۆی دەکرد شارمزایانە دەرزییەکەی لەقۆڵی (تیۆ) رۆکردو لەسەرخۆ سرنجەکەی لەخوێنێکی ئاڵ پڕکرد. لەگەڵ ئەوەی خەریکی پشکنینی لولەی تاقیگاکەبوو گوتی:

- تۆ هێندەش نەخۆش دەرناکەویت و گرەو دەکەم بەرەو چاکبونەوە دەچیت.

پەرستارەکە هێندە دڵ و روخۆش بوو، کە (تیۆ) هەستی بەهیوایەکی زۆرکردو بۆ یادگاری وێنەیەکی پەرستارەکەی گرت.

- (تیۆ) پرسی: بڕوات بەخوا هەیە؟

- (سارا) پێکەنی و گوتی: من؟ دروست وەك ئەوەی دەبوو یان دەبێت بڕوام پێی هەبێت، بەڵام خۆشبەختانە کاتی گەڕانەوە بۆ ئیسرائیل ئەم پرسیارە ناکەن. ئێستا پێتدەڵێم؛ (تیۆ) زۆربەی ئەوانەی رێنوێنی دەدەن تا پەیڕەوی لە (دە) فەرمانەکەی خودی هەتاهەتایی بکەن،

کە موسا هێناویێتی، جێگای متمانە نین‌و دەبێت گومانیان لێبکرێت. هەندێکجار خەڵکی وشك‌و زۆردارن‌و لەڕۆژی (شەبات)دا ناهێڵن ئاهەنگ بکەین‌و روناکی بەکاربهێنین... دەیانەوێت ڕێگاکان ببەستن تا لەو ڕۆژەدا ئۆتۆمبیل نەجوڵێت... کەس مافی ئەوەی نییە دەست بە دوگمەی ئاسانسۆردا بنێت بەو بیانوەی لەڕۆژانی (شەبات)دا بەکارهێنانی هەموو وزەیەك قەدەغەیە. نەخێر، دەزانیت بۆچی؟. ئایا سەردەمی هاتنەخوارەوەی تەورات وزەی کارەبا هەبوو؟

- (تیۆ) وتی: ڕاستە، تۆ ڕاست دەکەیت، ئەوانە سەفی‌و شێتن!

- نەخێر! تەنها خەڵکی توندڕەوی دەمارگیرن و خەڵکی ئارام‌و سنگفراوان نین. ژیانیان لە خەڵکی ئۆرشەلیم کردوە بەدۆزەخێك مایەی تەحەمولکردن نییە. بۆ خۆت سەردانی گەڕەکی (میاشریم) بکە، سەیرکە چیڕوودەدات‌و ئینجا تێدەگەیت!. من دەڵێم هەموو کەس بۆی هەیە خواوەند بپەرستێت، بەڵام بەو مەرجەی نەبێتە هۆی سەغڵەتبونی کەسانی دیکە.

بەکورتی بەهۆی بوونی (سارا)وە ساتی خوێن گرتنەکە خۆش بوو. پورە (مارتا) بڕیاڕیدا بۆ فراوینکردن بچین بۆ گەڕەکی هونەرمەندان‌و ماوەیەك خۆیان بەبیروڕای دیکەوە سەرقاڵ بکەن.

- (تیۆ) پرسی: تەنها هەردوکمان؟

- بەڵێ دووبەدوو بەتەنیا.

- (تیۆ) هەوڵیدا دەربارەی باڵندەی نهێنی ئامێز شتێك لە پورە (مارتا) هەڵبکرێنێت، بەڵام بێهودەبوو. لەکاتێکدا نانی خۆرهەڵاتی‌و شیشی کەبابیان بەچێژەوە دەخوارد پورە (مارتا) لە دڵەوە پێدەکەنی، بەڵام هیچ کۆمەکی بە (تیۆ) نەدەکرد. پێیڕاگەیاند بۆ چارەسەرکردنی ئەو پرسە فەرهەنگێکی باشی بەقەرز پێدەدات‌و بەس. (تیۆ) تورەیی خۆی بەسەر ماسییەکی سورکراوەی بەردەستیدا ڕشت‌و خۆی بەجیاکردنەوەی درکەکانی سەرقاڵ کرد. حوکمەکانی پورە (مارتا) بۆ سەعاتەکانی دواتری ئەو ڕۆژە دارێژرابوو: پشودانی بەزۆر، نەگەڕان بەدوای دار زەیتونەکان‌و نەسەردانی گۆڕی (هیرۆد). لەوانەیە بەیانی ... تا ئەوکاتە ... سەرجێگا!

## نهێنی فەرهەنگ

(تیۆ) ماوەیەکی زۆر نوست. کاتێك بێداربووەوە شەو داکشابوو. پورە (مارتا) لەنزیك جێخەوەکەی لەژێر روناکییەکی کزدا خەریکی خوێندنەوە بوو، کە ماکسییەکی درێژی سوری لەبەردابوو؛ جوان، بێجوڵە‌و دروست دەردەکەوت.

(تیۆ) سەری خستە سەر باسکیو بێدەنگ لەپوری ورد دەبۆوە، کە خەریکی هەڵدانەوەی پەڕەکان بوو. پورە (مارتا)، کە روبەڕوی نیگای (تیۆ) بوەوە، لەپڕ کتێبەکەی داخستو وتی:

- سەیری ئەو قرژاڵە، جاسوسیم بەسەرەوە دەکەیت، لەکەیەوە بێداریت؟ زۆر هیلاك نیت؟
- (تیۆ) وتی: باشم. چی دەخوێنیتەوە؟
- فەرهەنگێکی گیرفانە. دەمەوێت بزانم دەتوانێت کۆمەکت پێبکات یان نا. بیگرە خۆت سەیری بکە.

(تیۆ) کەوتە گەڕان بەدوای (باڵندە)دا. بەدەنگی بەرز کەوتە خوێندنەوەی:

- باڵندەیەکی جوان، باڵندەیەکی دەگمەن. باڵندەی ناو ماڵ. باڵندەی کۆچەر. باڵندەی قەفەس. باڵندەی شوم: ئەو باڵندانەی لەکۆندا بڕوایان وابوو هەواڵی ناخۆشو نەگریسیان پێیە.... باڵندەی شوم؟
- پورە (مارتا) وتی: نەخێر، ئەوە ئەو (باڵندە)یە نییە.
- هەلۆ.. پاشان باڵندەکان، تاوس، باڵندەی ژونون[1]، کونەپەپوو، باڵندەی مینرڤا[2]، باڵندەی ڤینۆس[3]، باڵندەی مێشخۆر، هەنگ، زەردەواڵە، باڵندەی بەهەشت..... باڵندەی بەهەشت؟
- پورە (مارتا) وتی: نزیك بویتەوە، بەڵام ئەوە وەڵامەکە نییە.
- باڵندەی لۆقای پیرۆز[4]، لەدیدی باڵندەوە، باڵندە هێواش هێواش هێلانە دروستدەکات. باڵندە: کاسەیەکی بچوکە بۆ دانانی لولە لەسەر شان دادەنرێت. کاسەی بچوك؟
- پورە (مارتا) وتی: گاڵتەجارییە، بەدوای شتێکی دیکەدا بگەڕێ.

دروست وەکو روداوی (تورەیی خواکان) بوو: لەهەرشوێنێك قارەمانی چیرۆکی ناو کۆمپیوتەرەکە دەبوو لەکیسەیەکدا مۆری گونجاو دەربهێنێت، بەڵام ئەگەر بەهەڵە لەجیاتی شمشێر لەسەر مۆرەکە پەنجە ئۆرگی لێبدایە دەنگێکی سەیرو سەمەرە لە کۆمپیوتەرەکەوە بەرز دەبۆوەو بەرێزەوە رایدەگەیاند: (نەخێر، ئەو دانەیە نابێت. دوای شتێکی دیکە بکەوە).

---

[1]. Junon: لە ئەفسانەی رۆمی خوای ژنانو هاوسەرگیریو هاوسەری ژوپیتێری خوای خواکان بەرامبەر بە (هیرا – Hera)یە لەئەفسانەی یۆنانی هاوسەری زێوسە . و. کوردی.

[2]. Mincrve (مینرڤا) خوای رۆمی بەرامبەر (ئاتنا)ی کچی زیۆس لە ئەفسانەی یۆنانی، یەکێك لە دوانزە گەورەکانی ئۆلمپ. خوای جەنگو کاری جۆراوجۆری وەك هونەر. مینرڤا لەئەفسانەی رۆمییەکاندا خوای خێزانو پیشەوەرانە. و. کوردی.

[3]. Vcnos خوای جوانی لەئەفسانەی رۆمییەکان بەرامبەر بە ئەفرۆدێتی یۆنانی خوای عیشقو کچی زیۆسو هاوسەری هەفائیسۆس (ڤلکن) ئاسنگەری خواکان. (میلینا).

[4]. Saimt - Luc یەکێك لەخواییەکان (هاوەڵانی مەسیح)، خاوەنی ئینجیلی لۆقا. و. کوردی.

نەخێر، ئەو دانەیە نابێت. بەدوای شتێکی دیکەدا بگەڕێ. (نەمری: هەتاهەتایی ڕۆح؛ بەردەوامی هەمیشەیی‌و نەمری لەیادی خەڵکدا؛ هێماکەی: نەمری، قەقنەسی ناو کڵپەی ئاگرەکەی).

- (تیۆ) پرسی: لێرەدا (هێما) واتای چییە؟

- پورە (مارتا) وتی: (هێما) یان (ئارم) شتێکە خێزانێکی نەجیبزادە یان شارێك بەهۆیەوە خۆی جیاکردۆتەوە: بۆ نمونە نیشانەی شاری پاریس کەشتییەکە لەسەر پانتاییەکی سورو شین.

- نائومێدانە فەرهەنگەکەی داناو لەپورە (مارتا) پرسی: بۆچی راوەستایت؟ بێسود نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا (تیۆ) سەری بەناو بالیفەکەیدا ڕۆکرد.. ئیدی بەس بوو !.

- پورە (مارتا) لەبەرخۆیەوە وتی: پاڵەوانی بچوك.. بڵێ بابزانم لەیادت کردوە، کە لەساتە سەرگەردانییە تەواوەکاندا دەتوانی داوای کۆمەك لە (پیتی) بکەیت؟.. سەرەڕای ئەوەش خۆشەویستی خۆت بۆ (فاتۆ) دەربڕیت.

- (فاتۆ)! بەڵێ (تیۆ) فەرامۆشی کردبوو! تەلەفۆنە تازەکەی هەڵگرت و ژمارەیەکی لێدا.

## (پیتی) لەسەر تەلەفونە

دەنگی ئازیزەکەی (تیۆ) لە تەلەفۆنەکەوە هات:

- (تیۆ) خۆتیت؟ سلاو...

- (تیۆ) لەخۆشیاندا لاڵ بوو: س .. س.. لاو، چۆنیت؟

- ئەی تۆ چۆنیت؟ (تیۆ)کەی من، هیلاك نابیت؟

- زۆری نوستن شتێکی لەزیندان گێڕاوەتەوە، کەشی پاریسیش ساردە!

- ئێ. خۆ من بەڕێوەبەرایەتی کەشناسی نیم! شتێکی دیکەم پێبڵێ! بەڕێکەوت تەلەفرنت نەکردوە؟. (فاتۆ) بەقاقاوە ئەو رستەیەی درکاند:

- دیارە کارم هەیە! تکا دەکەم ئامۆژەیەکم بدەرێ:

- باشە گوێ رادێرە ئەگەر هەڵبکەیت زۆر دەخایەنێت، باشترە قەڵەم هەڵگریت‌و ئەمە بنوسی: (لەپێناوی دوبارە زیندوبونەوەدا باڵەکانم لێك دەساوێم‌و خۆم لەو ئاگرە دەسوم، کە خۆمی تێدا دەسوتێم). دوبارەی بکەمەوە؟

- پێویست ناکات، سوپاس (فاتۆ)... ئێ زۆر باشە.. راتدەموسم.

- منیش هەروەها.. زۆر بەگەرمی.

پورە (مارتا) لەکاتێکدا زیرەکانەپێڵوەکانی لێکدەدا وتی:

- ئەمجارە تێگەیشتیت؟
- (تیۆ) وتی: نەخێر، هیچ تێنەگەیشتم. من ئەو باڵندەیە ناناسم.
- پورە (مارتا)، کەخۆی لەجێگاکەی راستدەکردەوە وتی: زۆر باشە، هەرچۆنێك بێت بەیانی (نۆیل)ـەو ئەم جەژنە لەهەیوانەکەدا ئەنجامدەدەین. خۆت بگۆڕە، بەڵام پۆشاکی گەرم بپۆشە. (سورپریز)م بۆداناویت؛ شتێکی چاوەڕوان نەکراوە؟

## مۆزیك لەدڵی شەودا

لەهەیوانەکەدا، کە بەگڵۆپی بچوکی شین، سپیو سور (بەڕەنگی ئاڵای فەرەنسا) رازێنرابۆوە، باڵیۆزو پورە (مارتا) چاوەڕوان بون. دیارە (ئالیئەرز، ئەنتوانو سلێمان)یش لەوێبون؛ هەروەها گروپێکی مۆزیکیش، کە خەریکی رێکخستنی ئامێرەکانیان بون بۆی دەخەنێتەوە.

- بالیۆز وتی: شەوباش، پیاوی لاو. ئێمە جگە لە دار کاجێکی بچوكو هەندێك شتی دێرینە هیچی دیکەمان نییە لە (نۆیل)دا پێشکەتی بکەین، لەکاتێکدا بەدەست ئاماژەی بۆ گروپی مۆزیکاکە دەکرد بەردەوام بوو: دیاری من ئەمانەن. باپێتبناسێنم: ئەلیاس، ئەحمەد، ئانوسو ژان.

ئەلیاس بەگیتارەوە گۆرانی دەچڕی؛ ئەحمەد فلوت، ژان تەپڵو ئانوس تارێکی ناوگردی پێبوو، کە بەسەر پەنجە لێیدەدا. دەنگی ئەلیاس وەك خۆرنشینێکی زستانی یۆنانی گەرمو هێندە شیرین بوو، کە ئەشکی زانە چاوی (تیۆ). مۆزیکێك بوو بەجۆرێك سەرنجراکێشو ئارام، کەهەندێك جار بەدەنگی تەپڵەکە دەبڕاو نۆتەکانی ئانوس لەسەر تارەکانی گیتارە گەورەکەوە تێکەڵی نەوای (نەی)یەکە دەبوو. شێخو (رەبی) لەگەڵ ئاوازی مۆزیکەکە سەریان دەجوڵاندو سۆزی ئاوازەکە دڵو سینەکانی لەخۆشی سیخناخ دەکردو دەیلاواندەوە. بەختیاریو خۆشییەکی تەواو بوو، پاش ئەوەی مۆزیکەکە وەستاو پاش بێدەنگییەکی زۆر

- (تیۆ) وتی: چەند جوان بوو.
- بالیۆز بەهێمنی وتی: ئەمانە ئاوازی عیشقو خۆشەویستی دەژەنن. لەبارێکدا سەیری سێ ریش درێژە پیرۆزەکەی دەکرد درێژەیپێدا: بەراست ئێوە لەگفتوگۆکانی خۆتاندا هیچتان دەربارەی عیشقو خۆشەویستی باسکرد؟!

دەمودەست هەرسێکیان دەنگیان هەڵبڕی. باوکە (دۆبۆر) باسی لەعیشقو خۆشەویستی (مەسیح) کرد بۆ هەموو مرۆڤایەتی؛ عیشقێکی مەزن لەپێناوی رەهاییو رزگاری مرۆڤەکان،

کە لەو ڕێگایەدا شانی نایە بەر مەرگێکی زۆردارانە. (شێخ) دەربارەی خۆشەویستی خواو میهرەبانتر لەهەموو کەس قسەی کرد، کە هەردەم ئامادەیە بەندەکانی خۆی، کە بەقوڵی و بەدڵ لەگوناهەکانیان پاشگەز دەبنەوە، ببەخشێت، هەروەها خۆشەویستی و عیشقی پەیامبەر (موحەممەد) بۆ هاوسەرەکانی، کە هەرگیز کەموکوڕی نەبوە؛ بەڵام (ڕەبی) لەو ناوەدا بێدەنگ بوو.

(تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بەڕێز، ئالیئەرز بۆچی تۆ بێدەنگیت؟

- (ڕەبی) لەسەرخۆ وەڵامیدایەوە: دڵنیام جوانترین ئاوازەکانی عیشق لەجیهاندا لەتەوراتەکەی ئێمەدایە؛ ئەویش گۆرانی (سرودەکانە)[1]، کە لەلایەن سلێمان پاشاوە نوسراوە. سرودی دەستگیرانەکان، جوانییەکی سەرسوڕهێنەری عیشقو خۆشەویستی نێوان ژنو پیاوە.

- (تیۆ) بەپاڕانەوەوە وتی: تکات دەکەم هەندێکم بۆ بخوێنەرەوە.

- (ڕەبی) بەدەنگێکی نزم دەستیپێکرد: من ڕەشپێستم، بەڵام قەشەنگ. کچانی ئۆرشەلیم.... کارتان بەوە نەبێت ڕەنگم خورماییە، چونکە تیشکی خۆر منی سوتاندوە... مەحبوبەکەم لەنێو کوڕاندا وەك درەختێکی سێوی نێو دارانی دارستانە.... ئازیزەکەم بەمامز دەکات، بەکارژۆڵەی بزنەکێوی..... ئەمە ئەوەیە کچانی لاو لەچاوەڕوانی دەستگیرانەکانیاندا دەیڵێنەوە.

- ئەی دەستگیرانەکە؟

- (چەندە قەشەنگی مەحبوبەی من! لاواندنەوەکانت چەندە نەرمو نیانە).

دەستگیرانەکەم لاواندنەوەکانی تۆ لەشەراب گەرمترە، بۆنت لەهەموو بۆنێکی تر خۆشترە، کە لەلێوت دەبارێت.. ئاخ دەستگیرانەکەم شیرو هەنگوین لەژێر زمانت هەڵدەقوڵێتو بۆنی جەستەت وەك بۆنی سەرزەمینی لوبنانە.....

- پورە (مارتا) درێژەی پێدا: (ئەمە گوڵستانی سەربەمۆرە، ئازیزم.. دەستگیرانەکەم، ئەی جۆباری داخراو، باخێکی پڕ لەمیوەو هەناری بەتام.. تێکەڵ بەداری خەنە، سمبولی بۆنخۆش، زەعفەران، داری چینی و سینامۆمو هەموو درەختانی شیلەداری بۆنخۆش).

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە هاواریکرد: پورە بچکۆلەکەم تۆ هەموو ئەوانە دەزانیت؟

---

[1]. Cantiqcdcs- Cantiqves کە بەواتای (سرودی ڕەهاو بڵندترین) دێت. یەکێك لەکتێبەکانی (پەیمانی کۆن)، (بەشی کتێبی شاعیرانە)یە، کە دەدرێتە پاش سلێمان پاشا. و. کوردی.

- پوری ئاهێکی کێشاو گوتی: یادەوەری رابردوی تێپەڕە. تۆش رۆژێك دادێت سرودی سرودەکان دەڵێتەوە.

- (تیۆ) بەدڵنیاییەوە وتی: دڵنیام سلێمان پاشا ئەم هۆنراوەیەی بۆ شاژنە (سەبا) هۆنیوەتەوە.

باوکە (دۆبۆر) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بۆ کێ؟

- سلێمان پاشا بۆ شاژنە سەبا؟ چونکە دڵیان بەیەکەوە بوو!

- (رەبی) بەنارەزاییەوە وتی: تەورات شتی واناڵێت!

- (تیۆ) وتی: گرنگ نییە. قەشەنگو ئەسمەر، وەك (فاتۆ) ئازیزی من، دەستیگرانەکەم... هیچ گومانی تێدانییە. لەو هۆنراوەیەدا مەبەست لەدەستگیران هەمان (بەلقیس)ـە!.

- (رەبی) لەباری خۆڕادەستداندا وتی:

- زۆر باشە، باوابێت!

- (تیۆ) درێژەی پێدا: پرسیارێك، ئەو سمبولە بۆنخۆشە چییە؟

- (رەبی) وەڵامیدایەوە: گیایەکە بۆنخۆش‌و بەتام.

- ئەی (سینامۆم)؟

- جۆرێکی دیکەی دارچینییە.

- ئەی سەرچاوەی سەربەمۆر.

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: بەسە... شەوەکە تێك مەدە.

(تیۆ) لەپاڵ هەیوانەکەدا شانی دایاو چاوی لەئۆرشەلیم بڕی، کە بەهەزاران لامپ دەسوتا. ئەگومەزی بەردین، ئەگۆڕی پیرۆزو ئەدیواری ندبە دیاربوو، تەنها ئەو حەسارەی تورکە عوسمانییەکان دروستیانکردبوو. لەژێر روناکییەکی زەرددا نغرۆ ببوو. دوو دەست بەئارامی کەوتە سەرشانەکانی (تیۆ)و دەنگێکی تێکشکاو بەهێواشی وتی:

- ئێستا تێگەیشتیت بۆچی ئەم هەموو بۆ ئەم شەڕە جەنگیون؟ (تیۆ) هێندە توند مەبە لەگەڵماندا. لێرەدا هەناسەی خواوەند لەجوڵەدایە، ئەو خوایەی کە ناوی (الله، ئادونا ئالوەهیم یان عیسا)یە.

## بەشی چوار

## (شەوی چاکەکاران)

- (تیۆ) لەسەر جێخەوەکەیەوە هاواریکرد: پورە (مارتا)!
- پورە گیان لەژێر لێفەکەیەوە وتی: چی بوە؟.. سەعات چەندە؟
- (تیۆ) بەپێکەنینەوە وتی: کاتی بێداربونە، پیرەژن!

پورە (مارتا)، کە لەبیری رێکخستنەوەی خۆیدا نەمابوو لەوەسەریسوڕما چۆن (تیۆ) پێش ئەو بێداربوەو لەسەر پێی راوەستاوەو بە (پیرەژن)یش بانگی دەکات. تا ئەو شوێنەی ئەندامانی خێزانی (فورنە) لەبیران بێت (تیۆ) هەرگیز بەبێ کۆمەکی کەسێکی دیکە لەخەو رانەبوەو لەجێگاکەی نەهاتۆتە خوارەوە. پورە (مارتا) زانی باری تەندروستی (تیۆ) باشترە، بەمۆنییەوە وتی:

بەئەدەب بە! کوڕم. لەجێخەوەکەت کەوتویتەتە خوارەوە؟

- خەریکبوو. لەدەرەوە کەسێك بە سینییەك بەرچاییەوە وەستاوە. بڵێم بێتە ژورەوە؟
- پەلەمەکە. بالاپۆشەکەم بدەرێ لەسەر کورسییەکەیە.

لەکاتی بەرچایکردندا گفتوگۆیەکی دورودرێژ دەستیپێکرد. (تیۆ) دەیویست بۆ (بەیت لەحم) بچێت‌و پورە (مارتا)ش بەنەرمییەوە خۆی دەدزییەوەو دەیوت: قسەی تێدا نییە. ئەمرۆ بەیانی بۆ (میاشریم) دەچین، چونکە (رەبی) بڕیاریداوە.

- خەون دەبینیت! تۆ ناتەوێت بۆ (بەیت لەحم) بچیت؟ (بەیت لەحم) ئەوشوێنەی (عیسا) تیایدا لەدایکبوە. بو رۆژانی (نۆیل)، بیرۆکەیەکی باش نییە؟
- پورە (مارتا) وتی: نەخێر، باشە، ئەگەر ... بەڵام گونجاو نییە.

لەبەرچی؟

- پورە (مارتا) بەسەراسیمەبونەوە وتی: گوێبگرە (تیۆ). دۆستەکان چاوەڕوانمانن‌و ناکرێت نێیان گەرێین چاوەڕوانی بکێشن... خەڵکی گرنگن!
- (تیۆ) وتی: ئێ، ئەو دۆستانەی تۆ تەلەفونیان نییە؟

- پورە (مارتا) هاواریکرد: ئارمم لەبەر برا! ئەگەر هەر دەتەوێت بیزانیت... زۆرباشە ئەمشەو بۆ (بەیت لەحم) دەچین. نەمدەویست بزانیت بەڵام هێندە پێداگری دەکەیت کە... فەرموو! (تیۆ) لەخۆشیدا خۆی هەڵدایە باوەشیو هێندەی نەمابوو بکەوێت.

## گەڕەکێکی تایبەتمەند

(تیۆ) نەیدەزانی ئەو رۆژە چی دەبینێت. (میاشریم) بەشێوەیەکی نهێنی شتێکی بیردەهێنایەوە وەك ئەوەی کەسێك بەخراپە باسی ئەو شوێنەی کردبێت. ئۆو.. بەڵێ (سارا)ی پەرستاربوو. نەخێر راستی کردبوو.

پورە (مارتا) بەبۆنەی شوێنەکەیەوە پرچە کورتەکانی لەژێر لەچکێکدا شاردەوە. کاتێك (تیۆ) پرسیاری ئەوەی لێکرد وەڵامیدایەوە، کە هیچ ژنێك ناتوانێت بەبێ داپۆشینی سەری بەتەواوەتی پێ بنێتە ئەو ناوچەیەی ئۆرشەلیم.

- (تیۆ) تێگەیشت: کەواتە ئەمە گەڕەکی موسڵمانەکانە؟

- پورە (مارتا) وتی: نەخێر... لەهیچ شوێنێك لەجولەکەکانی (میاشریم) جولەکەتر بونیان نییە.

(تیۆ) کەوتە بیرکردنەوەو لەبەرخۆیەوە وتی: بەراستی ئەو شتە سەیرو سەمەرەی مرۆڤی لەسەراسیمەبوندا وشك دەکرد چیبوو؟

- پورە (مارتا) لەژێر لێوەوە وتی: دیارە تێگەیشتنی کەمێك دژوارە. (رەبی) بۆ تۆی روندەکاتەوە.

(رەبی)و دوو هاوڕێکە لەژێر تابلۆکەدا وەستابون، کە نیشانەی چونەناو گەڕەکەکە بوو. لەسەر تابلۆکە نوسرابوو دەبێت ژنان سەریان بەتەواوی داپۆشن، (رەبی) بەوردی لە پورە (مارتا)ی روانیو ئەو تاڵە زولفانەی هاتبونە دەرەوە داپۆشین.

گەڕەکەکە بەگوندێکی سەردەمی کۆن دەچوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو تەلارانەی بەبەردی سپی دروستکرابون، هێندە کۆن نەیاندەنواند، بەڵام بەبینینەوەی هۆکەی رون بێت مرۆڤ هەستی دەکرد بۆ سەدەی هەژدە گەڕاوەتەوە. (تیۆ) لەبارێکدا چاوەکانی کرابونەوە، راوەستابوو تا ئەو شانۆیە لەپانتاییەکی کراوەدا ببینێت. پیاوان لەژێر چاکەتی رەشی درێژەوە پانتۆڵی تاسەر ئەژنۆو گۆرەوی سپیو پێڵاویان لەپێدابوو، کڵاوی دەم پان بەسەرو هەموو ریشداربون. بارێکی پەلەپەلو خێرایان هەبوو، نیگایان قوڵو جدی بوو. هەندێکجار منداڵێك بەپانتۆڵێکی کورتو سۆڵ بەسەر پێوە بەدرێژایی گەڕەکەکە رایدەکرد. زۆربەی ژنان روسەریان بەسەرەوە بوو، کە تا توێڵیان داکشابوو، ئینجا بەپارچەیەکی کەمێك پانی مەخمەڵی بەسترابوو. (تیۆ) سەریسوڕما

كاتێك بينى كچێكى تازە پێگەيشتوو پرچە درێـژەكانى لەپـشتەوە ئازادانـە بـەرەڵڵا كـردوە، بـە (ئاليئەزر)ى وت:

بەڕێز (ئاليئەزر)بڵێ بزانم.. وامدەزانى كچان مافى ئەوەيان نييە پرچيان دەربخەن....

- (رەبى) هەناسەيەكى هەڵكێشاو گوتى: لەم گەڕەكـەدا جولەكـەى زۆر پـارێزەر دەژيـان كـە دەيانويست نەريتەكانى ناوچەى (گيتۆ - Ghetto) وەك خۆى بهێڵنەوە.

- (تيۆ) وتى: (گيتۆ)؟

- (رەبى) وتى: ئا.... بەڵێ.... نازانيت؟.. كەواتە هەر لەسەرتاوە دەستپێدەكەم. لەسـەردەتاى سـەردەمى بەدواداچـون و ئـازاردانى چـەرخى (ئـەنگيزيش – ئەنگيزيـسيۆن) لەسـەدەى پـانزەدا هەموو جولەكەكانى ئـەوروپا لەهـەموو شـوێنێك لەگـەڕەكى تايبەتـدا نيـشتەجێكران، كـە نـاوى گيتۆ بوو، چونكە نزيـك بـەكۆتايى سـەدەكانى ناوەڕاسـت، يەكـەمين نمونـەى ئـەو گەڕەكانـە لـە (فينيسيا) جێگيربوو، هەر بەوناوەشەوە ناونرا. (رەبـى) درێژەيپێـدا: سـەرنج بـدە، كـە سـەرەتا جولەكەكان لايان باشتر بوو پێكەوە بـژين تـاكو نەريتەكـەيان بپـارێزن و تێكـەڵى خـەڵكى ديكـە نەكەن. بەڵام لەدوايدا بارەكە گۆڕا. هێنـدە خـراپ گـۆڕا، كـە بەفـەرمانى (پاپـا)كـان جولەكـەكان مافى ئەوەيان نـەبوو لـەدەرەوەى گەڕەكـە تايبەتييـەكانيان بـژين، واتـا هەرلـە (گيتـۆ)كانـدا بـن. پاشان لەسەانسەرى ئەوروپاى كاتۆليكدا جولەكەكانيان ناچاركرد بۆ ناسينەوەيان نيشانەيەكيان پێوەبێ. ئەو نيـشانانە زۆر سـودى هـەبوو بـۆ ئـەو كاتانـەى دەيانويـست دەسـيگيريان بكـەن يـان لەسـەر ليژنـە دار بيانـسوتێنن. ئـەو نيـشانەيەش وەك بازنەيـەكى بـچوكى زەرد يـان كڵاوێكـى قوچەكى درێژ.

(تيۆ) وتى: يان ئەستێرەيەك.

- ئەستێرەى زەرد داهێنراوى نازييەكان بوو. بەم پێيە (گيتۆ)كان گەڕەكى جولەكەكان بوو (مياشريم)يش دواين (گيتـۆ)ى پاشمـاوە بـوو. هەرچـەندە هـيچ كەسـێكيش ناچارى نـەكرابون پەيڕەوى لە سروتى دێرين بكەن، بـەمجۆرە تـەنها پنتێـك لـەجيهان مـابۆوە، كـە هێـشتا هەسـت بەكەشـى (گيتـۆ)يـەكى ئـەوروپى تێـدادەكراو سـەيرەكەش لـەوەدابوو ئـەو پنتـەش لـەخودى (ئۆرشـەليم)دا بـوو. لەگـەڕەكى (مياشـريم)، گـەڕەكى سـەد قـاپى، كـە لـەخولى هەسـتانەوە دروستكرابوو، واتە لەساڵى ١٨٧٤، هەلومەرجى ژيان زۆر لەسەردەمى رابـردوو باشـتربوو، چـونكە لەسەردەمە كۆنەكاندا جولەكەكانى ئەوروپا زۆربەيان بێلانەو هەژار بون و لە نوايـەكى بێنـازدا دەژيان. لـەو بارودۆخـەى سـەدى هـەژدە لـە (گيتـۆ)كانـدا بزوتنەوەيـەكى بـەهێزى بەهەرەمەنـد لەناو جولەكەكاندا سەريهەڵدا، كە ئەندامەكانى دەيانەويست راستەوخۆ خوا بناسن.

- (تيۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتى: ناسينى خوا ... راستەوخۆ؟

- بەڵێ، تا ئەوکاتە جولەکەکان دەبوو تەنها دەقە پیرۆزەکانی جولەکەگەرایی بخوێننەوە. کتێبەکان میانجگەری نێوان تاکی جولەکەو خودی هەتاهەتایی بوو. ئیتر خواستەکە تایبەت بەتەورات نەبوو، بەڵکو دەربارەی ئەو کتێبە جۆراوجۆرانە بوو، کە لەسەردەمی کۆچبەریدا نوسرابوو. وەك (تەلمود - Talmud)، کە بریتییە لەکۆمەڵێك لێکدانەوەی دنیایی یان لەبەرامبەر ئەوەدا (کابالْ – نەریتەکان - Kabbal)، بەهزری نهێنی ئامێزو رازگری...

باوکە (دۆبۆر) نارازییانە وتی: بەم زوانە کابالْ مەناخنە مێشکییەوە. دەبێت باس لەخاچپەرستەکان بکرێت، کە تولانی و بێکۆتایە.

- (رەبی) لەسەر رونکردنەوەکانی بەردەوام بوو: بەکورتی ئەوانە لەناو ترادیسیۆنی جولەکەدا کتێبیان دەخوێندەوە، راڤەیان دەکردو بێکۆتا مشتومڕیان لەسەر دەکرد. ئەمەش سەردەمانێك باوی بوو، کە لەئۆرشەلیم پەرستگاکە روخابوو. بەلام جولەکەکانی پۆلۆنیا، لیتوانیاو روسیا هێندە دڵبەندی کتێبو نوسراوەکانیان نەبون؛ ئەوان دەیانخوێندەوەو سەمایان دەکرد. (حاخام)ـەکان لەگەڵ باوەڕداران‌و لەگەڵ ئاوازی چەپڵەلێدان شکۆمەندانە تا رادەی سەرگێژبون خۆبەخۆ بەدەوری خۆیاندا دەسوڕانەوە، کە ئەوە ئەو ساتانە بوو لەگەڵ خوای خۆیاندا لەپەیوەندی راستەوخۆدا بون. بەمانەیان دەوت (هاسیدیم - Hassidim). (هاسیدیم) بزوتنەوەیەکی گەورەی عیرفانی[1] بوو.

- (تیۆ) وتی: عیرفانی؟ کەواتە هەمان چەرخی نوێ بەبەردو دوکەڵییەوە؟

پورە (مارتا) ئاگاداری کردەوە باشترە وشەی (عیرفانی) باش لەمێشکیدا بچەسپێت، چونکە لەمەودوا سەروکاری لەگەڵدا دەبێت. (عارف) کەسێکە دەتوانێت راستەوخۆ پەیوەندی بەخواوە بکات.

- (تیۆ) وتی: زۆر سەرنجڕاکێشە؛ کەواتە بەبێ (حاخام)ـەکان.

- بەهۆی ئەوانەوە.. (حاخام)ـەکانی پۆلۆنیا بەگشتی راستەوخۆ ئەو پەیوەندیگرتنەیەیان فێردەکرد. هەموویان مامۆستای مەزن بون، کە دەتوانیت لێرەدا وێنەکانیان ببینیت. (رەبی) لەبەردەم دوکانێکی تاریکدا راوەستا، کە لەناوەوە لەسەر دیوارێکی تەختە پۆستەر هەڵواسرابون‌و لەناو پۆستەرەکاندا وێنەی مامۆستایانی (هاسیدیم) لەگەڵ یاریدەدەرەکانیان بەکلاوی پێستەو زۆریان بەریشی درێژی سپییەوە دەبینران.

- (تیۆ) وتی: باشە، بەرێز (ئالیئەزر) پێمبڵێ، تۆ وەڵامی منت نەدایەوە. من دەربارەی قژی ژنان پرسیارم کرد، کەچی تۆ منت خستە ناو گێژاوی (گیتۆ)کانی ئەوروپاوە....

---

[1] عیرفانی، عارف: خواناس. کەسێکە خواوەند بەئاستی دیدەنی خود و ناوەکانی و سیفاتەکانی خۆی گەیاند بێت. دەوترێت عارف کەسێکە خواپەرستی ڕاستەقینە لەو ڕووەوە دەکات، کەبەشایانی پەرستنی دەزانێت، نەك بۆ پاداشت و لەترسی سزادان.

- (رەبی) هەناسەیەکی قوڵی تری هەڵکێشاو گوتی: باشە، لەدابونەریتی جولەکەکانی (گیتۆ)کانی ئەوروپای ناوەراستدا بڕیارێ توند بەرامبەر ژنان پیادەدەکرا. کاتێک ژنێک هاوسەری هەبوایە دەبوو تەنهاو تەنها خۆی بۆ ئەو تەرخان بکات. بۆ رێگەگرتن لە وەسوەسەی ژنان وردەوردە نەریتی سەیر پەیدابوو، کە بریتی بوو لەتاشینی سەری ژنان پاش رۆژی شوکردنی؛ ئیتر ژنان لەکاتی دەرچونیان لەماڵ بارۆکە (کلاوی مودار)یان لەسەردەکرد.

- (تیۆ) وتی: شتی وانابێت. پورە (مارتا) ئەوە (رەبی) وڕێنە دەکات، وانییە؟

- بەلام (رەبی) وڕێنە ناکات. تەنانەت هەتا ئەمڕۆش لەهەندێك شوێنی ئۆرشەلیم و تەنانەت لە ئەوروپا، لەستراسبۆرگ و پاریسیش سەری ژنانی جولەکە دەتاشن. نابێت ژن قژ و پرچی راستەقینەی خۆی بخاتە بەرچاوان. ئەمە لە ئیسلامیشدا بەهەمان شێوەیە.

- شێخ وتی: راستە. تەنها بەو جیاوازییەی کە ژنی موسڵمان سەری ناتاشێ. ژنانی ئێمە تەنها لەبەردەم چاوی خەڵکیدا سەر دادەپۆشن و ئەوەش لەدەرەوەی ماڵ، نەك لە ناو ماڵدا.

- (رەبی) هاواریکرد: بەلام لەهەندێك ولاتدا ئێوە ماسکی مسین لەسەریان دەنێن! کە کارێکی باش نییە!

خەریکبوو گفتوگۆکە دەچۆ سەر رێگایەکی باریك.

- پورە (مارتا) زۆر تورە بوو، گوتی: ئەم کۆستەبازییە دەربارەی قژی ژنانی جولەکە لەدەقی پیرۆزیاندا نییەو ئێمەش نەهاتوین بۆ (میاشریم) تا دەربارەی ئەوە قسە بکەین. (تیۆ) تۆ دەڵێی چی؟.

- (تیۆ) بەتوندی وتی: ئەگەر لێکۆڵینەوە ئاینییەکان ئەمانەبن واباشتر بچیت هێلکەو رۆنێکم بۆ بکەیت! تاشینی قژەسەری ژنان؟ دانانی ماسکی مسین لەسەر روخساری ژنان؟ مەگەر شێتبون؟ کەواتە سرودی سرودەکان بۆ گاڵتەجارییە؟.

- پورە (مارتا) بەئارامی وتی: فەرموو! لەراستیدا کارەکەتان دەستخۆشی لێناکرێت! ئێستا پاشماوەی بابەتەکانی چۆن بۆ روندەکەیتەوە؟

## بڵێسەی رەنگ شین

(شێخ و رەبی) بەنیگایەکی شڵەژاوانە لەکدیان روانی. لەڕاستیدا چۆن دەکرا بۆ بابەتە سەرەکییەکە بگەڕێنەوە؟

- شێخ وتی: (ئالیئەزر)ی بەرێز.. پێموایە لە (بەعل – شیم - Baal-Chem)ەوە دەستپێبکە.

- باوکە (دۆبۆر)یش پشتگیریکرد: بەڵێ، راستە! (بەعل – شیم)!. بیرۆکەیەکی جوانە!.

- پورە (مارتا) تێگەیشت: (بەعل شیم).. ڕێگاچارەیەکی دیکە نییە!. باکەمێك زیاتر بڕۆین.. بەرێگاوە باشتر لەشتەکان تێدەگەین.

- **(تیۆ) بیریکردەوە، ناوێکی سەیرو سەمەرەیە! لەوانەیە هەمان باڵندەی جاویدی** مەتەڵەکە بێت.(بەعل شیم).

(ڕەبی)، کە بەهێواشی بەسەر چاڵی ناو قیرەکەدا شەقاوی دەهاویشت وتی: (بەعل شیم) ناوێکەو لە پۆلۆنیایە ... لەناکاو قاچی لەسەر زیخێکی درشت خزاو سەرەنگرەیەکیدا، کە شێخ دەستی گرتو بەگوێچکەیدا چرپاندی:

پێشئەوەی بچینە سەر بابەتی دیکە، دەبێت وەڵامی گومانەکانی هاوڕێ بچوکەکەمان بدەینەوە.

- (ڕەبی) کە وریا بۆوە باش شەقاوبهاوێت وتی: بەتەواوی وایە، (تیۆ) با ئەم شتەت پێڕابگەیەنین. ئاشنابون بەئاین لەدوو ڕێگاوە دەبێت. ڕێگای یەکەم ئەوەیە کەپەسەندی هەموو ئەو شتانە بکەین بەڕەواڵەت دەیانبینین؛ لەمبارەدا ئەوەی دەبینرێت لەوانەیە بە ئازار بێت‌و لەئاین دورمان بخاتەوە. ڕێگەکەی دیکە ئەوەیە هەوڵبدەین ئەوەی بەڕەواڵەت بینیومانە زیاتر لێتێبگەین‌و کرۆکی حەقیقەت بدۆزینەوە، کە وەك گەوهەرێکی گرانبەهای ناو (کا) لەپشت زیادەڕۆیی‌و توندڕەوییەکانەوە شاراوەتەوە. (میاشریم) تەنها گەرەکی توندوتیژی‌و ناپەسەندییەکان نییە. دەکرێت لێرەوە لەوە تێبگەین چۆن ئیمانی جولەکەکان بەدرێژایی کاتی کۆچبەری ماوەتەوەو چۆن (شخینە - Shekhina) واتە (ئامادەیی خوا) لەپاڵ جولەکە بێبەختەکاندا ماوەتەوە؟. بەبێ سەختگیری بەهرەی (هاسیدیم) ئاین‌و دینی ئێمە نەیدەتوانی پڕ جۆش‌و بەزیندویی بمێنێتەوە. بەڵێ، ئەو جولەکانەی سەمایان دەکردو گۆرانیان دەچڕی بۆ ناسینی خودی جاوید بوو. بەو جۆرە توانیان بنەماو بنچینەی ئایینەکەمان، کەهەمان ئیمانی سەردەمی کۆچبەرانی (شخینە)یە، بپارێزن. لەزمانی ئێمەدا (شخینە) ژنێکی زۆر قەشەنگی ژێربالاپۆشێکی ڕەشەو دەگری. (شخینە) نوێنەری بەشی مێینەی خودی جاویدە. دەبینی کە نابێت بەڕەواڵەت بەهەڵەدا بچیت.

- (شێخ) وتی: زۆرباشە. (ئالیئەزر) بەردەوامبە.

- (ڕەبی) وتی: (بەعل شیم) دامەزرێنەری (هاسیدیم)ـەو ناوی تەواوی (بەعل – شیم - توڤە)، کە واتای (مامۆستای خۆشناو)ە. لەکاتی سەمادا خۆی دەناساند یان ئەو وزە سەروسروشتییەی خۆی بەکاردەهێنا، کە ئامانەت پێیدرابوو. لەڕۆژێکی جەژندا موریدەکانی (بەعل – شیم - توڤ) کەوتنە سەماکردن‌و هێندەیان نۆشی، کە پەیتا پەیتا شەرابیان لەقشڵەوە دەهێنا. ژنەکەی حاخام سەریسوڕماو پێیڕاگەیاند ئەگەر لەسەر شەرابخۆری بەردەوام بێت شەراب بۆ (شەبات) نامێنێت. مامۆستاش بەخەندەوە وتی (ڕاستە، باشە، پێیاڕابگەیەنە بەسە).

ژنی (حاخام) کەچوە ئەو هۆڵەی موریدەکان خەریکی هەراوزەنا بون چیبینی؟. بازنەیەکی گەورەی بلێسەیەکی رەنگ شین لەسەر سەری موریدەکان سەمای دەکرد. ئیدی ژنەکە بەپەلە چوو لەدەبۆکەدا شەرابی زیاتربێنێ. مامۆستا ئەو موعجیزەیەی کرد تا بەژنەکەی بسەلمێنێت کە یەکێتیو پەیوەندیگرتن لەگەڵ خوادا پێویستی بەنارەحەتییە.

(تیۆ) وتی: لەبەرئەوە ماڤ خۆیان بوو دوبارە شەراب فرکەن. دیارە زۆر مەست ببون.

- باری (حاڵ لێهاتن – فلسە)، جۆرێکە لەمەستبونو ئێمە شەراب قەدەغە ناکەین. رۆژێکی دیکە (بەعل – شیم) حاڵی لێهات، بەجۆرێك هەموو گیانی دەلەرزی. یەکێك لەموریدەکانی بینیوێتی گوڵنگەکانی شاڵەکەی مامۆستا هەموو دەلەرزن ئەمیش دەستی لێداوەو بەئاوی سەر مێزەکەشدا زانیویّتی خۆشی کەوتۆتە لەرزە. حاڵ لێهاتن لەرزینێکی خوداییەو مامۆستا بێئەوەی دڵۆپێك شەرابی نۆشیبێت مەستی بەردەمی خوابوو.

- (تیۆ) بەئارامی وتی: مەستی بەردەمی خوا. هەندێکجار مۆزیك منیش دەخاتە لەرزە.

رۆژێکی دیکەیان (بەعل – شیم) لەوشوێنە تایبەتەی بۆ ئەوکارە تەرخانکراوە چوە گەرماو بۆ غوسڵ کردن. ژورەکە تەنها بە مۆمێك روناککرابۆوە. ئەو رۆژەش هێندە ساردبوو، کە بەسەر گوێسەبانەکانەوە شەختەو بەفرچلورەیان کردبوو. (بەعل – شیم) هێندە زۆر لەناو ئاوی گەرماوەکەدا ماوەتەوە مۆمەکە هێندەی نەماوە بکوژێتەوە. یەکێك لەموریدەکان بەپەشۆکاوییەوە دەڵێت: (مامۆستا، مۆمەکە خەریکە دەکوژێتەوە!). (بەعل – شیم) دەڵێت: (گەلۆر – هێندە بەسە چلورەیەك لەگوێسەبانەکە بکەیتەوەو دەنگی لێبکەیت تا وەك مۆم بسوتێ!). موریدەکەش، چونکە گوێڕایەڵی مامۆستاکەیان بون، بەقسەیدەکات و ئیدی چلورەکە وەك مۆم داگیرساوە.

- (تیۆ) وتی: نەخێر.. درۆیە.

- (رەبی) لەکاتێکدا لەبەرامبەر تەلارێکی گەورەی پەنجەرەکراوەدا وەستابوو گوتی: کێ دەزانێت؟ هەمووی پەیوەندی بەوەوەیە، کە ئایا باوەڕداری یان نا.... بەڵام دیارە سەرنجتدا، کە (بەعل – شیم) بەموریدەکەی خۆی وت: (گەلۆر)، چونکە دەبێت مامۆستایان بەرامبەر موریدەکانیان توندبن. وەرە، نزیك ببەوە، سەیری ئەو پەنجەرەیە بکە.

(تیۆ) لەسەر پەنجەی پێ خۆی هەڵبڕی. قوتابیانی بچوکی قوتابخانەکە بەرێکوپێکی خۆیان دەجوڵاندو بە بڵەبڵم خەریکی خوێندنەوەی نوسراوێك بون؛ پرچە لولەکانیان لەگەڵ هەموو جوڵەیەك لەوبەر بۆ ئەوبەر سەمای دەکرد.

- (تیۆ) وتی: ئەوە قوتابخانەیە، بەڵام سەیرە. مناڵەکان لە جوڵە ناوەستن.

(رەبی) وتی: بەوجۆرە جەستە پەروەردە دەكرێت و ئەوكارەش بەزۆرە. باشە سەیری ئەوانە بكە، لەوێدا دەتوانیت رۆحی كۆچبەری جولەكە ببینت، كە بەدرێژایی سەدەكان ماوەتەوە. لەقوتابخانەی (هاسیدیم)دا جەستە رۆڵێكی گەورەی گێڕاوە. مامۆستاكان، كە دەستێكیان هەڵبڕیوەو ئەویدیان لەسەر گوێچكەیان بوەو بەدەوری خۆیاندا سوڕاونەتەوە: رەوشی خواپەرستیان بەوجۆرە بوەو بە (تساديك - Tsaddiq) ناوبراون. كە بەزمانی عەرەبی واتای (چاكەكارە).

- (تیۆ) وتی: وەك (ئۆسكار شیندلەر)[1]ی نازی پیاوچاك؟

- بەڵێ. (شیندلەر) مرۆڤێكی چاكەكار بوو. دەڵێن (دە) چاكەكار بۆ رزگاربونی هەموو مرۆڤایەتی بەسە، بەڵام لەسەردەمی (هاسیدیزم)دا مرۆڤایەتی چاكەكار مامۆستایانی پەیوەندیگرتن لەگەڵ خوادابون. كاتێك گەلێك لەپەناهەندەیدایە دەبێت ئامرازێك بۆ چاودێریو پاراستنی باوەڕی باوانی خۆیان بدۆزنەوەو (هاسیدی)یەكان بەموعجیزە، چیرۆك، سەماو مەستبونەكانیان ئەوەیان دەكرد. ئەو (ئۆرشەلیم)ەی ئێمە ئێستا پیاسەی تێدادەكەین لەو سەردەمەدا شارێكی دورەدەستو لاكەوتە بوو، بەڵام لای ئەوان (ئۆرشەلیم)ێكی ئاسمانی بوو، كە هەموو جولەكەیەك لەدەرونی خۆیو جەستەیدا هەڵیدەگرێت. لەبەرئەوە چاكەكاران جەژنیان سازدەكردو (ئۆرشەلیم)یان لەناخی خۆیاندا بەگەورە دەبینی.

- (تیۆ) وتی: بەڵام ئێستا (ئۆرشەلیم)یان بەدەستهێناوەتەوە.

- نەخێر، ئەوانە هێشتا لەوباوەڕەدانین (ئۆرشەلیم)ی خۆیان بەدەستهێنابێتەوە. هێشتا لەبیری ئەو (ئۆرشەلیم)ە نورانییەدان، كە پەرستگای تێدا دروستكرابوو، كە ئامادەی پێشوازیكردن بوو لە (مەسیح)ێكی نوێ. زۆر لەوانە تەنانەت بونی دەوڵەتی (ئیسرائیل)یش پەسەند ناكەن.

- كەواتە شێتن!

- (رەبی) وتی: نەخێر! ئەوەی لەدیدی ئەواندا نەشیاوە بونی دەوڵەتێكە بە یاسا، سوپاو دادگاكانیەوە، كە لەوێدا مرۆڤ لەجیاتی خوا خەریكی دەركردنی حوكمو وەرگرتنی بڕیارە. ئەمانە دژی راژەی سوپاو تەنانەت حەزناكەن بەزمانی قەومی خۆیان، كە عیبرییە، قسەبكەن.

- (تیۆ) بەسەرسامییەوە وتی: ئەی كەواتە بە چ زمانێك ئاخاوتن دەكەن؟

---

[1]. Oskar Schindler ئەڵمانییەكی دەوڵەمەند بووە، كە لەكاتی جەنگدا بەبەخشینی پارە هەندێك جولەكەی ئەڵمانی رزگاركردووەو دواجار فیلمی لەسەر دەركراوە.

- بەزمانی (ئیدیش – Yiddish). زمانی جولەکە ئەوروپییەکان، تاکە زمانێکە دەتوانێت ئایدیال و ئارەزووەکانییان بەرجەستە بکات. لەبەرئەوەیە ئەم گروپە دوبارە جیهانی (هاسیدیزمی پۆلۆن) یان پێکهێناوەتەوە تا ئەو (ئۆرشەلیم)ـەی ناخی خۆیان بپارێزن، کە لەم (ئۆرشەلیم)ـە یان پێباشترە. (تیۆ) لەبەرئەوەی جیهانی (هاسیدی) لە (ئۆشویتس)[1]دا مرد. تاڕادەیەك هیچ جولەکەیەك لەپۆلۆنیا نەماوە، هەموو ئەوانە لەئۆردوگاکاندا مردن.

- (تیۆ) پرسی: ئایا ئەوانەی رزگاریان بوو لێرەن؟

- پورە (مارتا) بەشداری گفتگۆکەی کردو گوتی: نەخێر، دەکرێ لەئەمریکاو ئەوروپا ببینرێن. (ئۆرشەلیم)ی ئەڵمانی هێشتا بزر نەبووەو (هاسیدیزم) هێشتا لەجێی خۆیدایە.

- (رەبی) وتی: جولەکەی دیکەش هەیە کەبەئارەزوی خۆیان ویستویانە لەسەدەی رابردودا بژین. بۆ نمونە (سامرییەکان - Samaritains)؛ لەوانەیە لەکۆڵانەکاندا بیانبینین. دەکرێت بە عەمامەو مانتۆ درێژەکانیاندا بناسرێنەوە. خەڵکی زۆر سەیرو سەمەرەن. کاتێک پاش وێرانبونی پەرستگاکە زۆربەی جولەکەکان بڕیاری کۆچکردنیاندا ئەوانە لەفەلەستین مانەوەو لەسەردەمێکدا کەبەسەردەمی (سامریان) ناسراوە ئامادەبون لەگەڵ داگیرکەراندا بژین، بەڵام کاتێك جولەکەکان گەڕانەوە، ئامادەنەبون پەسەندیان بکەن، چونکە بەخیانەتکاریان دادەنان.

- (تیۆ) وتی: بەشێوەیەکی لێڵ بیرەوەرییەکی کەمم دەربارەی (سامری)یەکی چاك لەلاماوە. ئەو (سامری)یە پیاوێکی خراپکار بوو، بەڵام (عیسا) داکۆکی لێکرد. بەوجۆرە نییە؟

- (سامری)یەکان پیس نەبون، بەڵام لەسەردەمی (مەسیح)دا بەهۆی هاوکاریکردنیان لەگەڵ هێزی داگیرکار بەچاوی سوك لێیان دەڕوانین. ئەمانە بڕیاریاندا هەموو پەیوەندییەکی خۆیان بەتەواوەتی لەگەڵ گەڕاوەکان بپچڕێننو پەرستگایەك بۆخۆیان لەسەر چیای (کریزم - Gverizem) دروستبکەن، کە لەو بڕوایەدان هەمان ئەو شوێنەیە (ئیبراهیم) ویستویەتی (ئیسحاق)ی تێدا بکاتە قوربانی؛ هەروەها بڕیاریاندا تەنها لەنێوان خۆیاندا ژنو ژنخوازی بکەن، کە بەمجۆرە هەمیشە یەك بەرئەنجام هەبوو، ئەویش کەمبونەوەی پلەبەپلەی لەدایکبوان بوو. ئەمڕۆ ژمارەیان لە هەزار کەس کەمترە. بەزمانێکی عیبری زۆر کۆن ئاخاوتن دەکەنو تەنها بەشێکی (تەورات)یان قبوڵە.

- (تیۆ) وتی: دواجار ئەوانە چیان بەسەرهات؟

[1] Auschwitz: زیندانی مەرگی بەناوبانگی نازییەکان لە پۆلۆنیا.

ماوەیەك بەرلەئێستا ئامادەبون ببنە بەشێك لەكۆمەڵگەی ئیسرائیلی. دواجارچی؟..
(تیۆ) لەهەموو ئاینەكاندا گروپێك هەیە خۆیان بەنارازی دەزانن، خراپە؟ لەوانەشە دەوڵەمەندی دارایی هۆكە بێت.

- شێخ وتی: ئێمەش لەگەڵ ئەو دیاردەیە ئاشناین. ئێمەش خاوەنی موعجیزەین. خاوەن بەهرەو ئەفسانەی جۆراوجۆرین. ئێمەش مامۆستامان هەیە، كە تاحاڵ لێهاتن بەدەوری خۆیاندا دەسورێنەوە، دەرویش لە (ئەستانبوڵ) زۆرن.

- (تیۆ) هاواریكرد: ئەستانبوڵ! ئایا پێشتر ناوی (باڵندەی جاوید) نەبوو؟

- شێخ بەزەردەخەنەوە وتی: نەخێر، (تیۆ)ی خۆشەویست. ئەستانبوڵ خاكی باڵندەكەی تۆ نییە؟

- (تیۆ) وتی: بەداخەوە لەگەڵ ئەوەشدا لەو باوەڕەدابوم وابێت.

- نەخێر. دەروێشەكان مریشكو باڵندە نین. باشە مامۆستای دەروێشان زۆر بە (بەعل – شیم)ی پۆلۆنیا چوە، تورك بوە. لەسەدەی دوانزەدا ژیاوەو ناوی (مەولانا)[2] بوە، كە بەواتای (گەورەی ئێمە) دێت. ئەویش داستانی جۆراوجۆری هەبوە، نەرمونیان نەبوە لەگەڵ موریدەكانی، چونكە پرنسیپ وایە، كە دەبێت مامۆستا نمونە بێت بۆ كەسانی دیكە، چونكە نوێنەری خوای مەزنە، بەرجەستەی ئەوە.

- (رەبی) وتی: بەراستی دەربارەی (بەعل – شیم) چیرۆكی سەیر دەگێڕنەوە. دەڵێن لەبەهەشت رۆحی هەموو مرۆڤەكانی دەبوو بێتە سەر زەوی لەناو جەستەی (ئادەم)دا كۆببونەوە. كاتێك مارێك لەپاڵ داری زانستدا دەركەوتوە رۆحی (بەعل – شیم) لەجەستەی (ئادەم) هاتۆتەدەرو لەو میوە قەدەغەكراوەی نەخواردوە.

- (تیۆ) پرسی: ئایا (عیسا)ش بەهەمان شێوە بوە؟

(رەبی) وتی: نا.. ئەوەیان نازانم!

- (تیۆ) وتی: ئەی باوكە (دۆبۆر) ئەویش چیرۆكی لەمجۆرەی لەلایە؟

- پیاوی كڵێسا وەڵامیدایەوە: هەڵبەتە، هەموو قەدیسەكان قارەمانن‌و هەمویان ئەفسانەی خوایان هەیە. بۆ نمونە (سن مارتین – مارتینی پیرۆز) سەربازێكی رۆحی بوە، كە كۆڵوانەكەی خۆی كردوە بەدوو بەشەوە، تا بەپیاوێكی هەژاری روتی بدات. سینەی (سانت ئاگات) یان شەقكرد تامرد. (سانت ئانتوان) راهیبێك بوو، كە لەبەرامبەر هەموو وەسوەسەكاندا مایەوەو بەسەریاندا زاڵبوو. (سنت بلاندین) قەدیسێك بوو لەنمایشێكی رۆمیدا بەچنگی شێر پارچە

---

[2] لێرەدا خوێنەر دەتوانێت هەڵەی زەقی نوسەر بگرێت، چونكە بەمەلە ئەو دیاردەیەی [illegible] بان خۆی لێبواردووە.

پارچەکرا.. (ژینەڤیڤاسانت)[1] شاری پاریسی لەبەلای هێرشی بەربەرییەکان رزگارکرد. (سانت سیسل) مامانی دەکردو ئاواز دانەربوو. هیچ ئایینێك لە پیرۆزمەندانی خۆی بێبەش نییە. لەبەرئەوەیە لە کریستیانیدا هەموان باوەرپێکراون و ئەوە ئاسانە.

- پورە (مارتا) بەشداریکردو وتی: دەبێ بەتۆ بڵێم ئەوە خواوەندە شتەکان بەئاسانی ناگرێت. دەکرێت خوا باوکانەو میهرەبان بێت و توندوتیژ و توڕەو جدی. بۆ نزیکبونەوە لەخوا دەبێت بەهرە لەکەسانی چاکەکارو دڵنەرم و دەم و دەست و داوێنپاك وەربگیرێت.

- (تیۆ) وتی: وەك خوشکانی (ئەمانوێلا)[2] لەقاهیرە، لەگەڵ ئەوەشی کە ئەو ژنە...

- پورە (مارتا) بەردەوامبوو: پیاو بن یان ژن هەموویان تونەتەبیەتن. لەبەردەم سیاسەتمەدارانلدا سڵ ناکەنەوە، ئەوەی بەڕاستی دەزانن بەسەرەك کۆمارانی دەڵێن، بە سوڵتان، بەکەشیشی گەورە، بەهەموان. هەروەها هەڵدەستن بەدڵدانەوەو ئازارشکێنی کەسانی بێبەش.

- (تیۆ) وتی: زۆرم بەدڵە ئایا وێنەی (بەعل – شیم) لەو دوکانەدا هەیە؟ ئەم وێنەیەی هەیە.

(تیۆ) بەپارچە کاغەزێك وێنەی ئەو مامۆستایەی داپۆشی، کە بەچاوێکی تیژی واقورماوەوە بۆیدەڕوانی. نزیکەی سەعاتێکی تەواو بەپێ رۆیشتبون و پورە (مارتا) نیگەرانی (تیۆ) بوو، لەبەرئەوە بڕیاری گەڕانەوەیاندا. رێگاکەش تا (بەیت لەحم) هێندە دورنەبوو، بەڵام بۆ شەوی (نۆیل) کاری بەتەگبیر ئەوە بوو خێراتر بڕۆن و زوتر فراوین بکەن.

## رێگای دۆزینەوەی مەتەڵی یەکەم

(تیۆ) لەگەڕانەوەی بۆ ژورەکەی خۆی، کە لەنهۆمی سەرەوەی باڵۆێزخانەکەی فەڕەنسادا بوو، کەوتە خەون و خەیاڵی مامۆستای گەورەوە، کە لەناو ئەڵقەی موریدەکانیدا مژۆڵی جۆشوخرۆشی زکرکردن بوو؛ خۆی لەناویاندا بینییەوە بەو پێڵاوە گەورانەوە بەفریان لێدەتکا خەریکی خواردنەوەو سەمایە. بیریکردەوە چەند خۆشە مرۆڤ خۆی لەو خەونانەدا نغرۆ بکات.

پەراوێچکەکەی دەرهێناو چەند شتێکی زیاتری تۆمارکرد. عارف کەسێکە راستەوخۆ پەیوەندی بەخواوە دەکات. (گیتۆ) گەڕەکی نیشتەجێکردنی بەزۆری جولەکەکانی ئەوروپا. (هاسیدیم) مامۆستایانی تەریقەتی پۆڵۆنی، روسی، ئۆکرانی، کە سەماو مەستییان لەخوێندنەوەی کتێب لاباشترە. (بەعل شیم) پیاوێکی نائاسایی بوو. زاهیدە موسڵمانەکان ئەو دەروێشانەی زیکردەکەن. قەدیسە کریستیانەکان.. خێرخوازان، جەسوران، شەهیدان، قژی ژنان یەکسانە بەپرسێك... نزرگەی پیرۆز یەکسانە بلازاڕێکی جەنجاڵ.

---

[1] Sainte –Geneevive پاسەوانی شاری پاریس، بۆ رێزلێنان کڵێسایەکی بەناوەوە کراوەو ناوی (پانتیۆن)ـەو گۆڕی پیاوانی مەزنی فەرەنسایە.

[2] Sour Emmanuelle راهیبەیەکی چاکەکاری فەرەنسییە، کە سەنتەری چالاکی خێرخوازانەی لەمیسر داناوە. و. کوردی.

کڵێساکانی کاسۆلیکی، ئەرمەنی، ئەرتەدۆکس، ئەسیوبی‌و ....

لەو نێوەندەدا یەکێك کەمبوو، (تیۆ)ش نەیدەزانی ئەو باڵندە نهێنییە بدۆزێتەوە، کە باڵەکانی لەیەك دەسوێ تا ئەو ئاگرە بگەشێنێتەوە خۆی تێدا دەسوتێت.. لەوکاتەدا دەیویست فەرهەنگەکە هەڵگرێت. تەلەفۆن لێدرا... دایکی بوو:

- تەندروستیت باشە، ئازیزەکە؟ شەکەت نیت؟ نەخۆشخانەکە چۆن بوو؟ ئازاریان نەدایت؟ دەرمانەکانت بەکاردێنیت؟و .....

- (تیۆ) هەناسەیەکی هەڵکێشا: دایە بەسە! هەموو شت باشە دەتوانیت وازبهێنیت.

- (میلینا) بەدڵشکاوییەوە وتی: نێ! باشە. ئەوە باوکتە. پاش باوکی (ئیرن) قسەیکردو پاشان (ئاتی) تەلەفۆنەکەی بە (فاتۆ)دا.

- (تیۆ) دۆزیتەوە؟

- بەداوای لێبوردنەوە وتی: کاتم نەبوو. دەتوانی دوو نیشانەی دیکەم پێبدەیت.

- (فاتۆ)، کەدەنگی خۆی گۆڕی بۆ دەنگی (پی تی) یاری ناو کۆمپیوتەرەکە وتی: پێنج ئازیار تەواو دەبێت! لەهەموو ئازیارەکاندا پێنج دانە کەمدەکات.

- (تیۆ) هاواریکرد: بیدرکێنە؟ خێراکە.

- (فاتۆ) لەسەر ئاوازێکی شاعیرانە وتی: من بەباڵندەی نوسەر مەزانە! فەرموو، باشە، ماچت دەکەم.

- (تیۆ) لەبارێکدا تەلەفونەکەی دادەنایەوەو گوتی:

- منیش هەروەها! زۆر بەگەرمی.

باڵندەیەکی نوسەر. ئەمە بەشێوەیەکی نهێنی شتێك بەخەیاڵمدا دێنیت. لەکوێ؟. (تیۆ) لەگەڵ خوایەك روبەڕوو ببۆوە، کە لەسەر شێوەی باڵندەیەکی نوسەر بوو؟ دیارە لەمیسر! باڵندە – نوسەر هەمان خوای (تۆت – Thot) بوو بەسەرلەقلەقەوە. بەمپێیە ئەگەر ئەو گریمانەیە لەئارادا بێت، کەئەو دوو باڵندەیە بەیەك بچوێنرێن، ئەوا دەبێت ئەو باڵندە نەمرە لەمیسر بێت.

- (تیۆ)، کە بەتاسەوە بۆ ژورەکەی دیکە دەچوو، هاواریکرد: پورێ گیان؟

- چییە کوڕم؟

- باڵندەکە لەمیسرە؟

- ئافەرین! لەکاتی خۆیدا بوو.... بەوزوانە بۆ قاهیرە دەچین. چۆن زانیت؟

- (فاتۆ)! دووەمین نیشانە، باڵندەی نوسەر.

بەدڵنیاییەوە. تۆ خواکانی میسر باش دەناسیت؛ هەروەها ناوی باڵندە نەمرەش باڵەکانی لێکدەسوێت؟

- (تیۆ) لەبەرخۆیەوە وتی: نەخێر. ئەوە نازانم.
- لەکتێبی فەرهەنگەکەدا خوێندودمتەوە. باڵندەیەك، لیژنەیەك دار.
- (تیۆ) هاواریکرد: قەقنەس[1] (Phoeni) یان (Pheni).

بەڵێ (تیۆ)، قەقنەسە، کە خۆی باوکی خۆیەتیو هەرگیز نامرێت. قەقنەس لەسەر چاوەکانی ئاوی نیل لەدایك دەبێت، لەدەلتای نیل خۆی ئەو ئاگرە دەگەشێنێتەوە کەدەیسوتێنێتو دوبارە لەناو خۆڵەمێشەکەیدا دێتەوە بون.

- (تیۆ) بەخەمبارییەوە دوبارەیکردەوە: لەناو خۆڵەمێشەکەیەوە لەدایك دەبێتەوە. زۆر حەزدەکەم ئەو باڵندەیە بومایە!

## (نۆیل) لە بەیت لەحم

لەسەر ڕێگای (ئۆرشەلیم) بۆ (بەیت لەحم) ئۆتۆمبیلەکان بەڕیز دەڕۆشتن. باڵۆیز بڕیاریدابوو (تیۆ)و پورە (مارتا) بەئۆتۆمبیلە (دژە گوللە- زرێپۆش)کەی خۆی ببات و سێ هاوڕێکەی دیکەش بەئۆتۆمبیلی قەشەکە لەدواوە بڕۆن. خێرا بازگەی سەر ڕێگا بەسەربازانی تفەنگ بەدەستەوە دەرکەوتن.

- بالوێز وتی: ئەمە سنوورە؟ ئێمە لەئیسرائیل دەردەچین ناچینە ناو ئەو خاکەی لەلایەن حکومەتی ئۆتۆنۆمی فەلەستینەوە بەڕێوە دەبرێت. لەوانەیە ماوەیەك دواکەوین.

ئۆتۆمبیلی باڵۆیز بەهۆی بۆردە سیاسییەکەیەوە پشکنینی بۆ نەدەکرا، لەبەرئەوە لەڕیزی ئۆتۆمبیلەکان دەرچوو، لەلەمپەرەکانی سەرڕێگا پەڕییەوە تاگەیشتن بە (بەیت لەحم) (دە)کیلۆمەتری ڕێگا گیرابوو. لە (بەیت لەحم) باوکە (دۆبۆر) لە پانسیۆنی (سانت – ژوزق) شوێنی بۆ نیشتەجێبون گرتبوو، ژوورێکی زۆر سادە، جێخەوێکی تەنگ، مێزێك، سوراحییەکی ئاو، لەگەنێکی دەستشۆرینو کورسییەك... بڕیاربوو پاش سروتی ئاینی (نۆیل) لەو شوێنەدا شەو بگوزەرێنن.

لەگۆڕپانی ناسراو بە(کریچ Creche)، کە کەوتبوە ناو شورایەکی داخراوەوە، کڵێسای مەزن بەپێشەنگێکی ڕەنگ تۆخەوە قوت ببۆوەو لەژێر ئاڵای بێشوماری فەلەستینی داپۆشراو

---

[1] . قەقنەس: یان قەقنوس بەیۆنانی (Kuknos)ە. باڵندەیەکی ئەفسانەییەو دەنوکی کونی زۆرەو ئاوازی سەیرو سەمەرە دەخوێنێت. هەزاران ساڵ دەژی، کە تەمەنی کۆتایی دێت لەسەر لیژنەدارێك دادەنیشێتو باڵ لەیەکدەدات تا ئاگر دەگرێتو خۆشی دەسوتێت. (ف. ف. ع).

بەزنجیرەیەك لەدانەی وردی كارەبایی لەماڵێكەوە بۆ ماڵێكی دی درێژ ببۆوە. ئاپۆڕەی خەڵكەكە زۆر بــوو. گروپــی جۆراوجــۆری تەلــەفزیۆنی بــەئامێرە گــەورەو قورســەكانییانەوە لــەناو ئاپۆرەكــەدا جێگایــان بۆخۆیــان دەكــردەوە. لاوانــی توریــستی ریــشدار بەبــەرگی ســوك‌و ژنــان بەپۆشاكی رەشەوە لەدوای یەكدییەوە وەستابون. بالوێز لەنێو ئاپۆڕەكەدا رێگایـەكی كـردەوە تـا دڵنیا بێت بۆ دانیشتن جێگا دەسەبەركراوە تا (تیۆ) بتوانێت سودی لێوەرگرێت. لـەو ماوەیـەدا ئەندامانی دیكەی گروپەكە چون بۆ بینینی ئەشكەوتی ناسراو بە (شیر)، كـە دەوتـرا (خێزانـی پیرۆز) پێش هەڵاتنیان بۆ میسر لەوێدا خۆیان حەشارداوە. لەراستیدا ئـەوەی دەبینـرا ئیـدی ئەشكەوت نەبوو، بەڵكو شتێكی وەك میحرابێكی شێوە سادەبوو.

- (تیۆ) وتی: پەلەمەكە، بهێڵە خۆم بیدۆزمـەوە. مەبەسـتان لـە (خێزانـی پـیرۆز) (یوسـفی دارتاش، مەریەم‌و عیسا)ی بچوكە، كە دەیانویست بـۆ میـسر هـەڵبێن، ئـەو كاتـەی پیاوخراپێـك دەستوری دابوو هەموو منداڵە ساواكان بكوژن.

شێخ وتی: بەڵێ، (هیرۆد)شا.

- (تیۆ) بەسەرسامییەوە وتی: هەمان ئەوكەسەی دوبارە پەرستگاكەی دروستكردەوە؟

- باوكە (دۆبۆر) وتی: دروست هـەمان ئەوكەسـەی فەرمانیـدا تامنـاڵانی جولەكـەی تەمـەن خوار دوو ساڵ بكوژن.

- لەوكاتەدابوو هەموو هەڵاتن‌و لەرێگا (عیسا) لەم جێگایە لەدایكبوو.

- پورە (مارتا) دەنگی هەڵبڕی: (تیۆ) هەرگیز وانییە!. (عیـسا) لەئەشـكەوتی (لـەدایكبون)[٢]، كە لەناو هەمان كڵێسادایە لەدایكبوە. هـەمان ئـەو شـوێنەی لەنیوەشـەودا بـۆ سـرودی نزاكـردن لەوێ ئامادە دەبین... هەڵبەتە ئەگەر باڵیۆزی هاورێمان شوێنێكمان بۆ پەیدا بكات.

بــەرێز ژەنــەراڵی بــاڵێۆز لێــزان بــوو. لەگــەڵبونی ئــەو ئــاپۆڕەی خەڵكــە، كــە سەرانــسەری كۆڵانەكانی (بەیت لەحم)ی داگرتبوو، بالیۆز توانی گروپەكەی بگەیەنێتە شانۆی كڵێساكە، كە لەوێدا پلەدارانی سوپاو وڵات، خاوەن پۆستەكانی بەرێوەبردن، پیاوانی ئاینی پلەبەرز، سەرۆكی دەوڵەتی ئۆتۆنۆمی فەلەستین‌و هاوسەرەكەی‌و ژنێكی مەسیحایی جوان، كـە بەپەرۆیـەكی رەش سـیمای داپۆشـیبوو. هـەموو ئەوانـە لەوێـدا گردببونـەوە. چـونكە ژەنـەراڵی بـالیۆز نوێنـەری دەوڵەتی فەرەنسا بـوو، واتـە دەوڵـەتی پـارێزەری شـوێنە پیرۆزەكـان، هەمیـشە لـەرێزی پێشەوە جێگای بـۆ تایبـەت كرابـوو، لەبەرامبـەر ریـزی كەشـیش‌و قەشـەكانی بـەرگی فـەرمی ئـاڵتونی‌و سوریان پۆشیبوو. میحرابەكە، كە بەخامێكی سپی داپۆشرابوو، لەبارێكی زۆر سادەدا دەینوانـد.

---

٢. Nativitc (بە N ی كەپیتاڵ) بەتایبەت واتای لەدایكبوونی عیسایەو تابلۆ بێشومارەكانی بۆ لەدایكبوونی (عیسا) كێشراون بەهەمان وشەدا دەناسرێنەوە. و. كوردی.

ئەسقەفی گەورەی لاتینی، کە کلاوێکی خەوی وەنەوشەیی لەسەرکردبوو، وتارێکی خوێندەوە دەربارەی چاکەو باشەکانی ئاشتی. ئاشتی نێوان مەسیحیو موسڵمانان، هیوای روناکیو سمبولی گەوری[1] کەوتۆتە کۆتایی رارەوەکە، هەمان ئەو جێگایەی لەکۆتایی سروتی نزادا پەیکەری (عیسا)ی ساوای تێدایە، کەدەستی بەرەو ئاسمانێکی نادیار هەڵبڕیوە. کەشی ئەوێ زۆر گەرم بوو. هەراو زەنای ئاپۆرەکەی دەرەوەی کڵێساکە شکۆو گەورەیی سروتی لەدایکبونی لەخۆگرتبوو. هەموو تەلەفزیۆنەکانی جیهان نوێنەرانی خۆیان بۆ وێنەگرتنی ئەو پێشوازییە ناردبوو. نزای نیوەشەوی (بەیت لەحم)، شاری پیرۆزی مەسیحیو شاری موسڵمانان، هەراوزەنای هاندەرانەی ئاپۆرەکە، ئاگربازی شەوانە، ئەستێرە گڕاوییەکانی ئاسمانی سوور، تریقانەوەی منداڵانو ئامادەبونی هەمەلانەی جەژن شتێکی سەرسوڕهێنەر بوو؛ گەرچی سروتەکە دوربوو لەسادەیی رەسەنی لەدایکبونەکە، تەنانەت گەرچی کەس نەیدەتوانی ئاخۆڕی پڕکاو گوێدرێژو مانگا لەگەڵ شکۆمەندی ئەمڕۆی کڵێسە بەراوردبکات، لەگەڵ ئەوەشدا پردێکی نهێنی بوو لەنێوان سپێدەی سەردەمی کریستیانیو ئەمڕۆ؛ لەنێوان لەدایکبونی منداڵێکی خوداو یادی لەدایکبونێکدا. پورە (مارتا) بەهەموو بێباوەڕی خۆیەوە ئەشکی دەڕشت. (تیۆ)ش لەخۆشیدا بەجۆش هاتبوو، حەزیدەکرد دوبارە بەکۆڵانەکانی شاردا پیاسە بکات.

دواجار دەبوو بۆ پانسیۆنەکە بگەڕێتەوە. پورە (مارتا) بەگۆشەیەکی چاو برازاکەی چاودێری دەکردو بەرچاوی دەپشکنی. هێشتا چەند سائێك بەسەر درێژبونی (تیۆ) لەسەر جێگاکەی تێنەپەڕیبوو، کە دەرگای ژورەکە کرایەوەو (شێخ) هاتە ژورەوە.

## چاکەی خۆلادان لە(بۆچی؟) وتن

- پەنجەی هاویشتە سەردەمیو گوتی: ششش!. (تیۆ) دەزانم کە درەنگە، بەلام تۆ شەو درەنگ خەوت لێدەکەوێت وانییە؟

(تیۆ) لەبارێکدا لەسەر جێخەوەکەی دانیشتبوو گوتی: چۆن دەزانیت؟

- (شێخ) وتی: کوڕم، باش چاودێریم کردویت. ئەگەر شەوانە دەسبەرداری بڕێك لەئازارەکانی خۆت ببیت نیوەی رێگاکەت بڕیوە. دەتوانم بۆ سائێك لەلات بمێنمەوە؟

---

[1]. Creche لەزمانی فەرەنسیدا بەواتای (ئاخوڕ) دێت. بەپێی ئینجیلی لۆقا پاش لەدایکبوونی (عیسا) لەگەوڕێکدا دانراوە لە (بەیت لەحم) لەبەرئەوە لەنەریتی مەسیحیدا (Creche) بەواتای نمایشی گەوڕی لەدایکبوون دێت، کە ئەو ئاخوڕە گرنگترین لانکەیە. لەو نمایشەدا پەیکەری خێزانەکەیو شوانو پاشایانی مەجوسو پەیکەری بچوکی کەرو مانگا دادەنرێت. ئەمڕۆ لەزمانی فەرەنسیدا (Crech) بەو شوێنە دەوترێت چاودێری منداڵی کەمتر لە سێ ساڵی لێدەکرێت (حچانە – لانکەی ساوایان).

بەبێئەوەی چاوەڕێی وەڵام بێت لەسەر کورسییەکی دار ڕۆنیشت‌و بەردەوامبوو: لەم دوو ڕۆژەدا زۆر شتیان بەتۆ وتوە، بەڵام زۆر کەم سەبارەت بەخودی خواوەند قسەیان کرد.

- (تیۆ) هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: مەبەستت چییە؟

- (شێخ)، کە بەویقارو شکۆوە قسەیدەکرد، وتی: زۆر کەم‌و زۆرخراپ. تورەییەکان فەراموش بکەین، هەروەها جەنگ‌و کۆکوژییەکانیش سەیربکەین بزانین چ شتێك بەیەکمانەوە دەبەستێت‌و یەکمان دەخات. ئێمە هەمومان یەك خوامان هەیەو بۆمان دواوە، چونکە چ لەگەڵ ئیبراهیم دوابێت یان لەگەڵ موسا، عیساو موحەمەد، خوا لەڕێگای پەیامبەرەکانیەوە پەیامی بەهەموو خەڵك گەیاندوە. بێگومان هەریەك لەو پەیامبەرانە تایبەتمەندی خۆیان هەیە. (موسا) تورەییەکانی خودا، (عیسا) میهرەبانییەکەی‌و (موحەمەد)یش دڵبەندییەکەی بۆ دادوەری‌و چاکەکاری هەبوە...

- (تیۆ) قسەکەی پێبڕی‌و گوتی: چۆن؟

- (شێخ) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: (تیۆ) لەوڵاتی تۆدا باش دەرك بەئیسلام نەکراوەو دوو هاوڕێکەشم زۆر شتیان هەبوو باسی بکەن... من بەباشم زانی گوێ لەتۆ ڕاگرم. بێفەرمانی تۆم بینی، بێفەرمانییەك کۆمەك بەبێخەویت ناکات. بهێڵە باسی (موحەمەد)ت بۆ بکەم.

- بەڵام تۆ پێشتر باسی ئەوت بۆ من کرد.

- (موحەمەد)یش وەك پشتیوانی خۆی بوو. ئەویش بەدوی ئەوەوە بوو بەهۆی ڕێساو بڕیاری سادەوە خواو خەڵکی پێکەوە ببەستێتەوە. (موسا) گوێی لەئاخاوتنەکانی خوابوو، کە لەپەکانی یاسای بۆ ڕەوانەکرد. (عیسا) دەستیکرد بەئامۆژگاری و هەواڵی خۆش، کە لە(ئەناجیل)دا کۆبۆتەوە. (جوبرەئیل)ی فریشتەش (قورئان)ی بۆ (موحەمەد) هێنا. (موسا) بیرۆکەی یاسای هێنا، (عیسا) بیرۆکەی چاکەکاری‌و (موحەمەد) بیرۆکەی دادپەروەری بۆ هەموان. خواوەند هەر عیشق‌و خۆشەویستیە.

- (تیۆ) وتی: بۆچی ئێستا لەو بارەیەوە قسەم لەگەڵدا دەکەیت؟

- (شێخ) وتی: کوڕم، بۆ ئەوەی لەگەڵ هەموان ئاشتت بکەمەوە. بۆ ئارامی بەخشین بەو کەللە بچوکەی تۆ، کە دەست لەیاخیبون هەڵناگریت. ئاخ! گومانت لەوەنەبێت من بمەوێت لەبیرکردنەوەت دوربخەمەوە، بەڵام (تیۆ) ئەو ئازارەی دەتکرۆژێت دەکرێت لەناو بچێت‌و بسڕێتەوە. داوا لەتۆ ناکەم باوەڕ بەخوا بهێنی، ئەوە تۆ دەرمان ناکات، تەنها ئەوە بزانە تۆ بەشێکیت لەخودایی. (تیۆ) ئەو (هەناسە) پیرۆزە لەتۆشدا هەیە، هەروەك چۆن لەهەمومانـدا هەیە... لەگەڕاندابەو ئەو (هەناسە)یە بدۆزەرەوە.

- (تیۆ) وتی: زۆر ئارەزومە، بەڵام چۆن؟

شێخ وتی: هەندێکجار دەبێت فێرببین چاوپۆشی لەو (بۆچی؟)یە بکەین. ئیدی تۆ لە تەمەنی پرسیاری هەمیشەییدا نەماویت، تۆ چیدی منداڵێکی پێنج ساڵانە نیت! خۆت ئارام بکەرەوە!. دەبێت بۆ بەدەسهێنانی ئەو (هەناسە) پیرۆزە خۆت رەها بکەیت، خۆت فەرامۆش بکەیت. (تیۆ) ئەگینا چارەسەر ناکرێیت.

- (تیۆ) بەترسەوە وتی: لەو باوەڕەدایت؟

(شێخ)، کەکەمێك ئاستی قسەکردنەکەی بەرزکردبۆوە، وتی: دەزانم لەشوێنێکی جیهانو یەکێك لەئێمە چارەسەری تۆ دەکاتو ئەو ئازارەی تۆ، کە رۆحێکی خراپەکار هێناویێتی بۆ ئەو شوێنە دەگەڕێتەوە کە لێوەی هاتوە، بەلاّم تۆ بەم (بۆچی)یانەت بەرگری دەنوێنێتو لەو بارەدا هیچ کام لەئێمە ناتوانین تۆ رزگار بکەین. من داواکارم باوەڕ بەو (هەناسە) پیرۆزە بهێنیتو تەواو.

- (تیۆ) بەسەراسیمەبونەوە وتی: بە(هەناسە) پیرۆز؟ ئەم وشەیە چ واتایەکی هەیە؟

- (شێخ) فەرماندارانە وتی: بەڵێ.

لەمکاتەدا، کە شێخ چاوەکانی داخستبوو، دەستەکانی لەسەر سنگی (تیۆ) دانا. لەساتێکی کورتدا گەرماییەك، کە سەرانسەر پشتی (تیۆ)ی دەتەنی، هەستی بەگەرمییەك کرد وەك گەرمی خاولییەك دوای مەلەکردن لەئاوی دەریا. گەرمی تیشکێکی هەتاو لەسەر کەنارەکانی یۆنان، هەستی نەرمونیانیەکی وەك ئەوەی فاتۆ....بەخەودا رۆچوو.

- شێخ لەگەڵ راستبوونەوەیدا بەهێواشی وتی: ستایش بۆ خواوەندی گەورەو مەزن. (تیۆ) ئێمە رزگارت دەکەین. هەرگیز ئەوە لەیاد مەکە.

لەسەر نوکی پەنجە، لەسەرخۆو هێواش لە ژورەکە دەرچوو..

## بەشی پێنج

# (بەلەمێکی خۆرئاساو (دە) دەنکە نیسک)

### ماڵئاوا ئۆرشەلیم

هەرسێ کەسەکە (رەبی، قەشە دومینیکن‌و شێخ) لەبەردەم خاڵێکی کۆنترۆڵی پۆلیسیدا وەستابون. ئەوێ شوێنی جیابونەوەیانبوو لە (تیۆ). (تیۆ) کامێراکەی دەرهێناو... روناکی فلاشەکەی چاوی ئەو سێ کەسەی روناککردەوە. کەدەستی پیاوە بەتەمەنەکەی دەگوشی گوتی:

- باشە، زۆرباشە، سلێمان، خواحافیز. سەبارەت بە (هەناسەی پیرۆز)... دەمەوێت بڵێم هەرگیز شەوی (نۆیل) فەرامۆش ناکەم.

- (شێخ) سەری دادەنەواندو بەهێواشی وتی: ئاشتیت لێبێت کورم. داواکارم بەرەکەتی خوای تەعالا پارێزەرو چاودێرت بێت.

پاشان (تیۆ) روی لە (رەبی) کردو گوتی: تۆ زۆر میهرەبان بویت لەگەڵمدا، بەڵام هێشتا شتێك ماوە تێنەگەیشتوم.

- بەڵێ، دەزانم! تەنانەت نەچویتە کەنیسەیەکەوە! لەسەروتی (شەبات)یش هاوبەشیت نەکرد! باسی مۆمدانی حەوت پەل، (تورا)[1]، تاجەکان، میزۆزاو... ئەوانەم بۆ نەکردیت.

پورە (مارتا) بەئارامی وتی: (رەبی) بەسە. مێشکی تێکمەدە... کەسانی دیکە ئەوکارە تەواو دەکەن دەستی پێکراوە.

- (رەبی) بەگومان‌و دودڵییەوە وتی: بەڵام لەکوێ؟ ئایا ئەوانە جولەکەی چاکەکارن؟

- پورە (مارتا) بەتوندوتۆڵییەوە وتی: ئەوانیش لەجولەکەکانی (دیاسپۆرا)ن. نەخراپتر لەتۆو نەباشتریش.

---

[1]. thora (تەورات) بریتییە لەپێنج کتێبی یەکەم پەیمانی کۆن (عهد عتیق- Pentate vqvc)، کە بەزمانی عیبری بە (تورا یاسا) ناودەبرێت. پێنج کتێبەکە بریتین لە (دروستبوون، دەرچون، لاویان، ئەژمار – اعداد – و دوانەکی – تپنیە –). و. کوردی.

- (تیۆ) پرسی: دیاسپورا چییە؟

- (رەبی) وتی: ئەو گروپە جولەکەیەن هێشتا بۆ ئیسرائیل نەگەڕاونەتەوەو بەوناوەوە ناوزەد دەکرێن.

- پورە (مارتا) وتی: ئەو جولەکانەن پێیان باشترە جولەکەیی خۆیان لە وڵاتی خۆیاندا درێژە پێبدەن. (دیاسپۆرا) بەواتای (پەرشوبڵاوی) دێت. ئەو جولەکانە لەرابردودا پەرشوبڵاوبونەتەوە، بەڵام دەیانەوێت هەرلەجێگای خۆیاندا بمێننەوە، تێدەگەیت. ئەوەش مافی خۆیانە.

- (رەبی) ئحمێکی کردو گوتی: هەردەگەڕێنەوە.

پورە (مارتا) وتی: هەرچۆنێك بێت دڵنیات دەکەمەوە لەئەوروپادا دەیانبینین‌و (تیۆ)ش سروتی (شەبات) دەبینێت.

- (رەبی) وتی: هیوادارم. تۆش (تیۆ) بۆ ئێرە دەگەڕێیتەوە، بەڵام بەتەندروستییەوە!. ئەو نۆبەش لە (دە) بەشەی ئازارو بێبەشییەی بە (ئۆرشەلیم)ی دەدەن لە یادتە؟ هەموو شتێکم بەتۆ نەگوت. (ئۆرشەلیم) لە (دە) بەش نۆ بەشی خۆشبەختی جیهانیشی بردوە.... ساڵی داهاتوو، کە گەڕایتەوە بۆ (ئۆرشەلیم) لەکۆیلایەتی نەخۆشییەکەت ئازادبویت... ئەی کۆرپەکەم.

- پورە (مارتا) لەبێئارامییەوە وتی: زۆرباشە، ئەگەر هەموو شتێك باش بڕوات ساڵی ئایندە لەئۆرشەلیم.

- (تیۆ) وتی: بەڕێزیشتان (ئەنتوان) لەگەڵ من میهرەبان بون. هیوادارم تورە نەبوبیت.

باوکە (دۆبۆر) هاواریکرد: من تورەبوم؟ وەرە کورەکەم، وەرە ئامێزم. نزات بۆ دەکەم... کوڕم.

ماڵئاوایی تەواو بوو. پورە (مارتا) برازاکەی بەرەو کارمەندی پاسپۆرت بردو باڵیۆز بەدویاندا چوو. کاتێك (تیۆ) گەیشتە دەرەوەی پنتی پشکنین روو لەهەرسێ پیاوەکە هاواریکرد:

بەتایبەت لەیادی مەکەن دۆستی باش بن لەگەڵ یەکدی!. ئینجا بەباوەشی کراوە ئاماژەی بۆکردن‌و لەپشت دیوارەکانەوە بزربوو.

- (رەبی) هەناسەیەکی بۆ سینەی کێشاو گوتی: چەند منداڵێکی دیارە. یاخی، بەڵام پڕ هۆش... هیوادارم هاوڕێکەمان بتوانێت چارەسەری بکات.

باوکە (دۆبۆر) وتی: تەنها خواوەند دەیزانێت.

شێخ وتی: ئینشائەڵا نامرێت. ئەوا پێمراگەیاندن.

## (ئەمەل)ی خاتونی میسری

پورە (مارتا) لەنێو ئاپۆڕەو هەراوهوریای بارهەڵگرو ژنانی لەچك بەسەردا بەدوای کەسێکدا وێڵ بوو. لەناو فرۆکەکەی هێڵی (تەلئەبیب – قاهیرە)دا، کاتێك (تیۆ) لێیپرسیبوو لەمیسر کێ ڕێنمایمانە؟، پورە (مارتا) بەخەندەوە وتبوی: (پیاوێکی نائاسایی، لەوەش زیاتر هیچت پێنالێم).

لەبەرئەوە (تیۆ) لەناو بۆنی ڕۆنی سوتاو و تابلۆی لەبەرگیراوەی هەڵواسراوی سەرمەڕمەڕی زەردی کۆپیکراودا بەدوای ئەو نەناسراوە نائاساییەدا دەگەڕا. ڕیشدارێکی دیکەیە؟ ژەنەڕاڵ بالیۆزێکی دی؟ مامۆستایەکی مێژوی میسر؟ لەناکاو پورە (مارتا) هاواریکرد: (ئەمەل، ئەمەل، لێرەدا!).

بەڵام (ئەمەل) ڕیشدار نەبوو، بەڵکو خانمێکی باڵابەرزبوو، بەکراسێکی سەوز، بەگوارەی زۆر [illegible] وانی گیرەی پرچو جوتێك چاوی ڕەشی درەوشاوەوە. (ئەمەل) باڵوێزی فەرەنساش نەبوو. بەڵکو مامۆستای مێژوی شارستانی یۆنان لەزانکۆی (الازهر) لەقاهیرە بوو. ژنێکی ئارامو پڕ وزە، کە بەبێ دەنگ هەڵبڕین دەمودەست جڵەوی کارەکانی بەدەستەوە گرت. چوار چەرخەیەکی زەنگدار بۆ جانتاکان، پێدانی لیرەیەکی کرێکەی، گومرگ، پەنجا (پیاستەر - قرش) بۆ کرێی تاکسیو گوتی:

- ڕاستەوخۆ بۆ ماڵەوە دەچینو ئینشائەڵا (تیۆ) پشوو دەدات! بەڕاست حەزت بە (کارکادە)یە؟

هێندە ئاشنایانە لەگەڵیدا دەدوا وەك ئەوەبوو لەمناڵییەوە (تیۆ) بناسێت، بەگەرمیو میهرەبانی. لەلایەکی دیکەشەوە لەکاتی گفتوگۆدا باسکی هاویشتبوو سەرشانی (تیۆ)و تاڕادەیەك لەباوەشیدا ڕێیدەکرد.

- پورە (مارتا) وتی: باوەڕناکەم (تیۆ) (کارکادە) بناسێت؟

(کارکادە) شەربەتێکی سور ڕەنگی خۆشبوو، لەگیای (نۆبیە)ی (سودان)ی دروستدەکرا؛ وەك (ملوکیە – ملوخیە)، کە بڕیاربوو (تیۆ) بۆ خواردنی ئێوارە پێی ئاشنا ببێت و بەخواردنەوەیەکی تایبەت بەمیسرییەکان دادەنرا. بەڵام (ملوکیە)؟ ئاه .. ناتوانرێت وەسفی ئەو خواردنە بکرێت، دەبێت تامی بکرێت. لەگەڵ هیچ خواردنێکی بەتامی دیکەدا بەراورد ناکرێت. (ئەمەل) هیچ گوێی بەجەنجاڵی ڕێگاکەنەدا، کە پڕبوو لە ئۆتۆمبێل لەگەورەو بچوك، وڵاخو ئاژەڵو تاکسییەکە بەگرانی ڕێگای خۆی دەکردەوە بۆ گەڕەکی (زەمالیك) لەبەشی

(جزیـرە - Gezira) ی کـۆڵانی (بـەرازیل). دواجـار تەکـسیەکە لەبـەردەم ڤێلاکـەی (ئەمـەل) راوەستاو دەنگی هۆڕنی ئۆتۆمبیلەکە جێگای بەئاوازی باڵنـدەکان چـۆڵ کـرد، کـە لـەنێو گوڵـە (یاسەمین)ەکاندا بەنادیاری دەیانخوێند. ڤێلاکە خانویەکی نوێژەن نەبوو. پەڵەی رەنـگ خـاکی لەسـەر دەرگاکـە دەبینـراو چوارچـێوە سـپییەکەی بـە مێخـی پـانی رەنـگ شـین داکترابـوو، کەنیشانەی کۆنی دەرگاکە بـون، بـەڵام هـەر لەگـەڵ چـونە نـاو خانوەکـەوە (تیـۆ) لـە سینەیدا هەستی بەبۆنێکی وەسف نەکراوکرد. ڤێلاکەی (ئەمەل) سەرنجڕاکێش‌و لەبـەردڵانی نـاو خـانوە کۆنەکان بوو، کە دڵنیایی لەمرۆڤدا دەچاند.

بەرەو چـەپکێك گـوڵی گـەورە رۆیـشت. لەهۆڵەکـەدا قەنەفـەی چـەرمی بـەکارهاتوو، فەرشـی دەزوو هـەبوو. لەسـەرمێزەکە چـەپکە گوڵێـك بـەلق‌و پـۆپی درێـژو بەرجەسـتەی سـپییەوە دانرابوو. دڵۆپـەی بـۆن، (تیـۆ) سـەری بەسـەر گوڵەکانـدا شـۆڕکردەوەو هێنـدە پـڕ بەسـییەکانی هەناسـەی هەڵکێـشا گێـژبوو، خۆیـدا بەسـەر قەنەفەکـەدا. پـورە (مارتـا)ش، کـە خـۆی سـەری لەگێژەوە دەچوو، (تیۆ)ی گرتەوەو گوتی:

- باشە، رات چییە؟

- (ئەمەل) وتـی: باشە، دیارە بەهێنـدەی تـەلاری باڵیۆزخانـەی فەڕەنـسا لـە ئۆرشـەلیم جوان نییە.

- (تیۆ) وتـی: ئاه، ئەم گوڵانە چییە؟

- (ئەمەل) وتـی: ناوی (توبوروز)[1]ـە. هەر گوڵێکی بەئەندازەی ملیۆنەها گـوڵی نێرگـز بۆنیـان هەیە.

جانتاکانیان بۆ ژورێك برد. لە ژورەکەی (تیۆ)دا جێخەوێکی گـەورە هـەبوو، کـە لەپـشتەوەی کۆمەڵێك لقی ئاڵتونی لەسەر شێوەی پەلی گوڵ کرابوو. (تیۆ) خۆیـدا بەسـەر جێگاکـەدا. رەق‌و لەداربوو! وەك تەختەیەکی بزمار ریزکرابوو.

- پورە (مارتا) وتی: باشە. بەتەواوی پشوبدە.

پورە (مارتا)و (ئەمەل) بۆ هۆڵەکە چون‌و لەسـەر قەنەفـەکان رۆنیـشتن. (ئەمـەل) مـۆمێکی سوری داگیرساندو پورە (مارتا)ش جگەرەکەی. کاتی گفتوگۆ بوو (ئەمەل) وتی:

- هەر لەیادمابویت .... کەی لەوێوە هاتیت؟

---

[1]. Tvbcreusc گیایـەکی سـەلکدارە لـەخێزانی (نـەماریلیس)ە بـەلقی درێـژی گوڵـدارەوە، کـە گوڵـەکانی بەسـەر توڵـەی لقەکانەوەن و سپی و بۆنێکی نائاساییان هەیە.

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: زۆر نییە. مەبەستم نەبوو بەو زوانە بگەڕێمەوە، ئەگەر (تیۆ)کەم..

(ئەمەل) بەهێواشی پرسی: تەندروستی چۆنە؟

- ئەو شیکاریانەی لەئۆرشەلیم ئەنجامیاندا هێندە جێگای هیوا نین، لەگەڵ ئەوەشدا باری زیندوبونەوەی تێدا دەبینم، گەرانەکان، سەردانەکان، کۆمەڵانی خەڵك، هەموو ئەو شتانە نوێو تازەن... پڕخرۆشە.

- نابێت زۆر شەکەتی بکەیت. دەتەوێت چی پیشان بدەیت؟

- ئارزوی لەگەنجینەی (توت ئنخ ئامون)ە بەڵام زۆریش نا، جگە لەوەش گەرەکی کیپتی. مزگەوتیش، ئەگینا لەیادی دەکات میسر وڵاتێکی موسڵمانە. لەوانەشە شاری مردووەکانیش.

- پورە (مارتا) بەپێداگرتنەوە وتی: نا... نا، شاری مردووەکان نا. نەمۆمیاکانو نەسەردانی گۆڕەکان لە (دۆڵی پاشایان). نابێت لەگۆڕو مردووەکان نزیك ببێتەوە.

- (ئەمەل) بەسەراسیمەبونەوە وتی: واتە... ئەو منداڵە بێگوناهە، وا تێنەگەیشتبوم. ئایا لەبنەڕەتدا هیوایەکت هەیە؟

- هیوام وایە چارەسەری بکەم. لەکۆندا کاتێك لاوێك لەتەمەنی پێگەیشتندا دوچاری نەخۆشی دەبوو گەشتی دەکرد؛ هەندێکجار دەمردو جاریش هەبوو بەیاریدەی وزەی شاراوەی گەشتەوە بەزیندویی دەمایەوە. ئەمەش ئەوشتەیە من دەمەوێت.

- بەڵام تۆ باسی گەشتێکی جیهانی ئاینیت بۆ من کرد!

- پورە (مارتا)، کە جگەرەکەی دەکوژانەوە وتی: بەڵێ، هەرواشە.

## مرۆڤی سەر کۆڵەکەکان

لەکاتی شەودا (تیۆ) واهەستی دەکرد لەماڵی خۆیاندا بێت. کاتێك (ملوکیە) گەیشتە سەرمێز سێ دەفری لێپڕکردو کەوتە پرسیاری جۆراوجۆر. (ملوکیە) لەچی پێکدێت و لەچی دروستدەکرێت؟. پێیانڕاگەیاند کە پیازو سیری پاککراو لەرۆندا سور دەکەنەوەو پاشان بیبەرو برنجو سەوزەیەکی بەناوی ملوکیە تێدەکەن، کەپێشترباش جنراوە. کاتێك کوڵا لەگەڵ مریشکی سوردەوکراو دایدەنێن. بەڵام ئەوەی کە خودی (ملوکیە) چییە؟ هیچ نییە، جگە لەگیایەك، گیایەکی میسریەو تەواو.

پوره (مارتا) به هاورێکەی وت: ئەم هەروایە. کاتێك هاورێکەم باوکە (دۆبۆر) لەسەردانی کلێسای (نزرگەی پیرۆز) هێنایەوە لەپرسیارکردنەکانی پەرێشان ببوو، جیاوازی کلێسای ئەرمەنیو کلێسای (کپتی – قیپتی )، کلێسای ئەسیوبی، شاژنه سەبا....

- (تیۆ) لەبەرخۆیەوە وتی: گەشتکردن بۆ فێربونەو منیش پرسیار دەکەم.

(ئەمەل) وتی: وا دیاره دەربارەی میسری کۆن هەموو شت دەزانیت؟

- نەخێر، نابێت زیادەڕۆیی بکرێت. من تەنها دوو یان سێ لەخواکان دەناسم. (هاتور - Hathor ) مانگا، (سۆییك)ی (کرۆکەدایل - تیمساح)، (سخمەت – شێر)، (ئەنۆبیس – چەقەڵ)، (توت – لەقلەق)، (خۆر)، (ئاپیس - مانگای پیرۆز)، (بەستت - پشیلەی مێچکە)، (کنوم – قۆچ)...

(ئەمەل) وتی: دوو یا سێ خوا؟ خۆ ئەوە گەیشتیتە نۆ دانە.

- (تیۆ) بەلەخۆباییبونەوە وتی: ئەوە تەنها خواوەندە ئاژەڵییەکان بوو، خوای دیکەش هەیە! (تۆیریس خانمی ئەسپی شین)، (ئەبوبیس – مار).

- خەریکە دوچاری سەرسەڕمانم دەکەیت، بەڵام تۆ ناوی نەناوی (ئۆزیریس)[1]و نە(ئیزیس)ت نەهێنا، کە ئەو دوانە لەگەورەترین خواکانن.

(تیۆ) وەڵامیدایەوە: راستە، بەڵام ئەوانە سەری ئاژەڵیان نییەو جیاوازن لەوانی دیکە. (ئۆزیریس) برایەکی خراپەکاری هەبوو، کەبەدەستی ئەو کوژراو پارچەپارچەی کرد. (ئیزیس)ی ژنیشی هەموو شوێنێك گەڕا بەدوای ئەو پارچانەدا تا سەرئەنجام دۆزییەوە، جگە لەیەك ئەندامی، کە ئەویش....

- پوره (مارتا) قسەکەی پێبڕیو گوتی: تیۆ ! ....

- (تیۆ) راستەوخۆ وەڵامیدایەوە: زۆر باشە، مەبەست؟ دەبێت چیبڵێم؟ بڵێم (فالوس - Phallos)؟

- (ئەمەل) وتی: باشە، (تیۆ) پاشان چی؟

- پاشان (ئیزیس) خۆی بەتەنها منداڵێکی بۆخۆی دروستکردو ناوی نا (هۆرۆس). (هۆرۆس) پرچێکی سەیری هەیە، کە لەکەللەی تەواو سفتییەوە هاتوە، لەشێوەیەکی دیکەدا (هۆرۆس) سەری هەڵۆی هەیە. بەڵام (ئۆزیریس) ناتوانێت جارێکی دیکە زیندوو ببێتەوە. دروست وەك (عیسا)یەکی ناتەواوە.

---

[1]. ئۆزیریس (Osiris): یەکێکە لەخواوەندە تایبەتەکانی میسری کۆن. خوای خۆرو پارێزەری مردوەکان، مێردی (ئیزیس)ی خوشکی بوە، کە خواوەندی مانگ بوو هەروەها باوکی (هۆروس)ە. میسریەکان لەوباوەڕەدابون پاش مردن داوەری لەسەرکارەکانیان دەکات. ئەم خواوەندە بەدەستی براکەی خۆی کوژراوە، بەڵام دواجار ( هۆرۆس– خوای ئاسۆ) ی کوڕی سەربەخۆیی... تۆڵەی باوکی کردۆتەوە.

- پورە (مارتا) وتی: خراپ نییە. ئەی فیرعەونەکان چی؟ دەربارەی ئەوانە چیدەزانیت؟

- رامسس، ئامنۆفیس، توت ئنغ ئامون، پپسی....

- خاتونی میسری بەخەندەوە راستیکردەوەو گوتی: پپسی نا، پیپی! بەلام خۆ تۆ بۆ فێربونی ناوی فیرعەونەکان نەهاتویت، لەقاهیرە کلێسای (کپتی) دەبینیت.

- (تیۆ) هاواریکرد: دوبارە؟!

- (ئەمەل) وتی: لەراستیدا (کپت)بەواتای (میسر)ەو تۆ لەناو ئاپۆرەی هەراوزەنای کلێسای (نزرگەی پیرۆز)دا جگە لەمیحرابێکی بچوکی (کپت) هیچی دیکەت نەدیوە... بەبێبونی (کپت)یەکان ناتوانی هیچ لەسەرهەڵدانی مەسیحی تێبگەیت! لێرە لەم بیابانەدا بوو، کە (ئاناکۆرتەکان) گردبونەوەو وردەوردە بون بەلەشکرێکی راستەقینەو چونە ژێر رکێفی یەکەمین قەشەی کریستیانیەوە.

- (تیۆ) وتی: ئەم وشەی (ئاناکۆرت)ە بەوشەیەکی یۆنانی دەچوێت.

- بەڵێ، ئەم وشەیە لەکردارێك داتاشراوە، کە بە یۆنانی واتای گۆشەگیریو گۆشەنشینی دێت. (ئاناکۆرت) راهیبێکی (گۆشەنشین)ە بەتەنیاو دوور لەهەموو کەس بەتەنها لەشوێنێك بەناوی (ئارمتاژ)دەژێت. هەندێکجار یەکێك لەوانە دەبینرێت لەسەر کۆڵەکەیەکی هەشت مەتربەرز دەژی، کە لەنێو لەم بیابانەدا دروستکراون و لەوبارەشدا پێیدەوترێت (ستیلیت)، واتە ئەو زاهیدەی لەسەر کۆڵەکە دەژی.

- (تیۆ) وتی: مرۆڤێك لەسەر کۆڵەکەیەك دەژی؟ ئەی کەواتە چۆن دەخوات و دەخواتەوە؟

- خواردن بەوجۆرەی تۆ مەبەستە نایخوات، بەرۆژو دەبن، نزا دەکەنو دەپارێنەوە. بۆ جیهانی (خەڵوەت و ڕامان – Meditation)[1] دەچن. هەندێکی دیکە هەن لەسەر زەوی بازنەیەك بەتیرەی (دە) مەتر بەدەوری خۆیاندا دەکێشنو هەرگیز نایەنە دەرەوە. هەندێکی دیکە دەچنە کلۆرە دارەوەو هەرلەوێشەوە خواردن وەردەگرن.

(تیۆ) دادومری کرد: ئەوانە شێتن.

- (ئەمەل) قسەکەی بۆ تەواو کرد: بەڵێ شێتن، بەلام شێتی خودان. ئەو زاهیدە گۆشەگیرانە یەکەمین کریستیانی ئەم وڵاتە بونو پیرۆزکراوی پایەبەرزیان تێدا هەڵکەوت. پاشان ئەم گروپە رویان لەتوندوتیژی کرد، تائەو شوێنە رۆیشتن کە بەچەکوش بکەونە تێکدانی

---

[1]. meditation : ئەم وشەیە، کەلەدەقە فەرەنسیەکەدا هاتوە، بەواتای (بونە میانجیگەر– یتوسگ) دێت، بەلام وەرگێڕی فارسییەکە بە( غوروتامل) وەریگێڕاوە. لەوەرگێڕانی بۆ کوردی پشتمان بە وشەی ڕەسەنی (خەڵوەت و ڕامان) بەستوە، کە بیشەیەکی سەرەکی زیکرو تەهلیلەو زاهیدو دەرویشییە

پاشماوەی گرنگی میسرییەکانو دژ بەنوسراوەی سەر پەرستگاکان وستانەوەو دەستیان دایە جەنگ دژ بەوانەی ناویان نابون (کافرو موشریك). ئەم گروپە دەیانویست پیرۆزترین دەستکەوتەکانی میسری کۆنو هەموو ئەو شتانەی یۆنانی دێرین بەجیهانی بەخشیوە لەناویببەنو بیانسڕنەوەو وێرانی بکەن.

- پورە (مارتا) پێشنیازیکرد: ئەگەر روداوی (هیپاتی - Hypathic) بۆ باس بکەیت باشە.

- (هیپاتی) بێنەوا، ژنێکی جوانو دانیار، فەیلەسوفێکی نائاسایی بوو، بەلام بەبڕوای ئەوان کافرو بێدین بوو. ئەسقەفی مەسیحی حەزی بەچارەی نەبوو، چونکە ئەو خاتونە فەیلەسوفە وتاربێژبوو، مشتومڕی دەکرد، زانستو وتارو لێکۆڵینەوەکانی ئازاری کەسی نەدەدا، جگە لەوەی بەهۆی ئەوەوە فەلسەفەی یۆنانی پێشکەوتنی زۆری بەخۆوە بینی، کە رێگر بوو لەبەردەم گەشەکردنی کریستیانی.

- (تیۆ) پرسی: لەبەرچی؟

- چونکە فەیلەسوفانی یۆنانی بڕوایان بەوە نەبوو پیاوێك هەلگری سیمای خودا بێتو بەلەخاچدان گیانی سپاردبێتو دوای سێ رۆژ زیندوو بوبێتەوە. ئەسقەفیش بۆ ئەوەی پرسەکەی کۆتایی پێبێنێت، گروپێکی زۆری لە قەشەو راهیبەکانی نارد بەدوایدا .... راهیبەکانیش کەوتنە لێدانیو ئەو مرۆڤە ناسکەیان هەنجن هەنجن کرد.

- (تیۆ) وتی: فاشیستەکان؟

- بەڵێ، تارادەیەك. سەرئەنجام کریستیانی گەمەکەی بردەوە. ئیمپراتۆرێکی رۆمی بەناوی (تیۆدۆزۆس) فەرمانی بتپەرستی دەرکردو کڵێسای کریستیانی (کیپتی) ماوەیەکی زۆر حوکمڕانیی میسری کرد. بەلام پاشان لە کڵێساکەدا جوداییو جیاوازی پەیدابوو.

- (تیۆ) وتی: ئەوە دەزانم!

- سەردەمێك ئیسلام فەتحی میسری کردو دیسانەوە (کیپتی)ەکان گەمەکەیان بردەوە.

- (تیۆ) وتی: زۆر باشبوو، چونکە (کیپتی)ەکان گرنگن! ئەوانە تاکە گروپن کەمێك لەنوسراوی کۆنە میسرییەکانیان پاراستوەو هونەرێکی جوانکارییەکی پرشکۆیان داهێناوە، کە شێوەی هونەری ناسراو بە(بیزانسی) ئەوەی لە کڵێسای یۆنانیدا بینیوتە لەو هونەرەوە سەرچاوە دەگرێت، تەنانەت کڵێسای ولاتەکەی تۆش بەجۆرێك قەرزارباری ئەوانن.... ئەمرۆ ژمارەی ئەوانە زۆر نییە، بەلام رۆڵی گرنگ دەگێڕن. خولەفاکانیش زۆرشتیان تێکدا... وانییە.

- (ئەمەل)ی خاتونی (میسر) وەلامیدایەوە: بەڵێ، وەك ئەوانی دیکە.

- (تیۆ) پرسی: بەڕاست (ئەمەل) تۆ چیت؟

- من ژنێکی میسریو ژنێکی موسڵمانم.

- پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: تیۆ، سەیری بکە. ئایا سیمای بەرِوخساری ئەو ژنانە دەچێت لەسەر دیوارەکان نەخشێنراوە؟

- (تیۆ) وتی: وایە، بەڵام بەبێ گوارە یان سینە بەندێکی گەورەو بێ کراس.

- (ئەمەل) وتی: دیدێکی دروستی هەیە.

- پورە (مارتا) وتی: هەروابوە، بەڵام وا کات درەنگ بوو.

بریاریاندا لەبەرنامەی رۆژی دوایی بکۆڵنەوە: واتە سەرەتا لە(کیپتی)ەکانەوە دەستپێبکەن، پاشان (تەورات)و ئینجا میسریانی کۆن.

## دوو نیوەو سێ توخم

- (ئەمەل) وتی: ئەمە رێگای سەرەکییە. پاش پەرِینەوە لەدەرگای درکاوییەوە دەچیتە ناو قەڵای مۆمدانەکان، لەناو گەرِەکی دێرینی (کیپتی)یەکان.

- (تیۆ) لێزانانە بیرورِای خۆی دەربرِی: زۆر زۆر کۆن. لەیەکەم بینیندا هەستی پێدەکرێت.

- (ئەمەل) وتی: بەڵام هەرچۆنێك بێت لەهەرِەمەکان کەمتر. لەیادی مەکە میسری کۆن خاوەنی کۆنترین شارستانی جیهانە... پێنج هەزار ساڵ!، لەبارێکدا کەئێرە دوو هەزار ساڵ نابێت، چونکە کریستیانەکان پێکیانهێناوە. برِۆین بۆ کڵێساو کەتیبەو مزگەوتەکان ببینین.

- (تیۆ) هاواریکرد: پەلەمەکە، رونیدەکەیتەوە؟

- چ شتێك؟ کەنیسەو مزگەوت؟ زۆرباشە. ئەگەر (ئۆرشەلیم)ت بینیبێت کەواتە سەرنجتداوە هەموو تەلارێکی ئاینی وێرانبوەو پاشان دروستکراوەتەوەو ئینجا دوبارە وێرانکراوەو هەروا تاکۆتایی. رووداوی کەنیسەی (بن عەزرا)ش بەهەمان شێوەیە. ئەم کەنیسەیە لەسەردەمی رۆمانەکاندا دروستکرا پاشان بۆ کڵێسا گۆرِاو دوبارە لەسەردەمی دوانزەی زاینی بوو بەکەنیسە، بەڵام کاتێك مزگەوت بەخشتی سورکراوە دروستکرا بەکۆنترین مزگەوتی سەرانسەری میسر دادەنرا، کە لەسەدەی پانزەدا دوبارە نۆژەنکرایەوە.

- (تیۆ) وتی: وەك ئۆرشەلیم، ئێستا چی لەسەر تەلاری بنەرِەتی خۆی ماوە؟

- (ئەمەل) هەناسەیەکی کورتی هەڵکێشاو رونیکردەوە: بەردی لەناوچوو. بیردودریو یادەکان، دوو قەڵای سەردەمی رۆمەکانو کتێبەکانی مێژوو، بەڵام (تیۆ) هەموو تەلارە ئاینییەکان هەمان چارەنوسیان هەبوە. پەرستگاکان وێران بون، ناوە جۆربەجۆرەکانی خواکان سرانەوەو تەنها گەلو نەتەوە مانەوەو دەمێننەوە.

(تیۆ) وتی: بەڵام هەرەمەکان هەروا لەجێگای خۆیان ماون. لەلایەکیشەوە پێکدادان و کێشمەکێشەکانی کریستیانەکان لەناوخۆیاندا شتێکی ناخۆشە!.

(ئەمەل) بەبێنەوەی وەڵام بداتەوە (تیۆ) و (مارتا)ی ناچارکرد بچنە ناو کوچەو کۆڵانێك، کە شۆستەکانی پڕبون لەچەپکە گوڵی دروستکراو. چونە ناو کڵێسایەك، کە (تیۆ) هیچ حەزی بەوەستاندن و لێوردبونەوە نەبوو، چونکە لەلای ئەو لەوجۆرانەی زۆر لە یۆنان بینیبوو. پاش دەرچون بەکۆکەوە لەسەر پلیکانەکان رۆنیشت و گوتی:

- ئەمە لەلای من هیچ سەرنجڕاکێش نییە. دەمەوێت هەرەمەکان ببینم.

- (ئەمەل) وتی: بەڵام یوسف و مریەم لەکاتی هەڵاتنیان بۆ میسر لێرە لەژێرزەمینی ئەم شوێنەدا نیشتەجێبون. ئەمە لای تۆ سەرنجڕاکێش نییە؟

(تیۆ) هاواریکرد: نەخێر، دەمەوێت هەرەمەکان ببینم.

خاتونی میسری وتی: بەڵام روداوی (کیپتی)یەکان زۆر گرنگ و پڕ هەورازو نشێوە. تۆ تێناگەیت!

میسر یەکێك بوە لەشارستانییە بەراییە گەورەکانی جیهان و پاشان بەبێئەوەی ئەو شارستانییەی لەسەر شانۆی رۆژگار بسڕێتەوە یۆنانی و رۆمییەکانی پەسەند کردوەو توانیویەتی خولی دەسەڵاتدارێتیان بۆ درەوشاوەترین خولی جیهانی کۆن بگۆڕێت. هەرلەبەر ئەوەش بوو کڵێسای کریستیانی دەیتوانی ببێتە گرنگترین کڵێسای جیهان و ئیمپراتۆریەتێکی واقعی لەجیهانی خۆرهەڵاتدا پێکبهێنێت..... بەڵام ئەو بابەتە زۆر ئاڵۆزە.

- (تیۆ) بەحەزی زانییەوە وتی: سەیرە! چیڕویداوە؟

- پورە (مارتا) وتی: لەوانەیە لەبەرچاوی تۆدا تەواو بێواتا دەرکەوێت.

(تیۆ) بەهەست برینداریەوە وتی: هێندەش بێهەست نیم.

- (ئەمەل) وتی: تیۆ.. کەس واناڵێت. باشە، کەواتە ئامادەی؟ دەستپێدەکەم. تۆ دەزانی لای کریستیانەکان (عیسا) خوایە لەڕوخساری مرۆڤدا. لەدنیای ئەمڕۆدا هەموو کەس خوی بەو نەریتە کۆنەوە گرتوە، بەڵام بەرجەستەی ئەوە بکە لەسەرەتادا ئەم بانگەشەیە توانیویەتی چ ئاژاوەیەك لەهزردا دروست بکات... خوا لەڕوخساری مرۆڤدا؟ ئەگەر وایە کەواتە لەبونی عیسادا بەشی خوا چییە؟ئەی بەشی مرۆڤ کامەیە؟

(تیۆ) وتی: ئێوە بەنیوە؟

- پیاوانی ئاینی ئەو پرسیارەیان لەخۆیان دەکرد، چونکە سروشتی مرۆڤ لێوانلێوە لە هەڵەو گوناه و خەوش، لەبونی (عیسا)دا کام بەش بەسەر ئەویدیدا سەردەکەوێت؟ بەشی خواوەند یان بەشی مرۆڤ؟. لەبنەڕەتدا (عیسا) خەوشی هەبوە یان نا؟ لەوبوارەدا جۆرەها تیۆر دەخرایەڕوو. هەندێك لەو بڕوایەدابون مرۆڤ خراپەو خواوەند چاکەیە، کە ئەمەش تاڕادەیەك تیۆری نیوە بەنیوەکەی تۆیە، جگەلەوە بەدرێژایی چەندین سەدە مشتومڕو لێکدانەوە بۆ جیاکردنەوەی بەشی خراپەی مرۆڤ لەبەشی چاکەی خوا بەردەوام بوو. هەندێك لەکریستیانەکان بڕیاریاندا بەشە خراپەکە بەدەستلێنەدراوی بەجێبهێڵێت تا بمرێت و بەشە چاکەکەش جیابکرێتەوە. واتە جەستەی خۆیان برسی کرد، کە نوێنەری بەشە خراپەکە بوو. بەوجۆرەش خۆکوژیان ئەنجامدا. ئەو گروپە پێیان دەوترا (کاتارەکان - Cathares)، کە بەواتای (پاکەکان) دێت.

- (تیۆ) وتی: دوبارە پاکێتی و دڵسۆزی؟! ئەوەش لەمیسر بووە؟

- نەخێر، بەڵام ئەم تیۆرە لەسەدەی سێیەم لەئەندێشەو بیری کەسێکدا بەناوی (مانی) سەریهەڵدا، کە زێدەکەی هێندە لێرەوە دوور نییە. بیرۆکەکەی بە(مانویزم - Manicheisme) ناودەبرێت و کڵێسای کاسۆلیکیش بەتیۆرێکی هاوبەش پەیداکردن و کوفری دادەنێت. دەزانیت هاوبەش دروستکردن و کوفر چییە؟

- جۆرێکە لەدەستەگەری؟

- بەڵێ، بەڵام دەستەگەرییەکی بەفەرمی لەلایەن کۆمەڵێکی کڵێساییەوە حوکمی بەسەردا درابێت. لەوبارەیەوە ئەو تیۆرانەی ڕووبەڕوی یەکدەبونەوە دوو دەستەیان دیاریکردبوو: ئەکەم ئەو دەستەیەی لەبونی مەسیحدا سروشتی خودایی پەسەند نییە، بەبێئەوەی تاسنوری لەناوبردنی بەشی جەستەی خراپەو ناپەسەندی بڕۆن. دوەمیان ئەو دەستەیەی رایدەگەیەنن سروشتی خودایی ئەو توانیوێتی سروشتە مرۆییەکەی کێش بکات و بیکاتە خودایی.

- (تیۆ) وتی: یەکەم پەلەمەکە! بەمپێیە کەسانێك هەن دەیانەوێت مەسیح تەنها مرۆڤێك بێت، واتە چاکەی کامڵ نەبێت لەبەرامبەر ئەوانەشدا کەسانێك دەیانەوێت (مەسیح) (خوا) بێت، واتە چاکەی کامڵ بێت. وانییە؟

بەتەواوی. دەستەی یەکەم بە (ئاریانیست) ناوزەد دەکرێن، چونکە مامۆستاو ڕێنوێنیان (ئاریۆس) بوە. گروپی دووەم بە (مۆنزفیزیت)دکان ناودەبرێن، کە بەواتای (یەك سروشت) دێت، بەبێئەوەی لێرەدا باسی لە(نەستۆری)یەکان کردبێت، کە بەگشتی یەکێتی مەسیح

رتدەکەنەوەو تیۆری (مانی) پەسەند دەکەن. بەدرێژایی سەدەکان (میسر) لەسەر (سروشت)و (خودی عیسا) سەروپۆتەڵاکی یەکیان کوتاوەتەوە.

- پورە (مارتا) وتی: ئێستا دەبینیت هەموو ئەو روداوانە تا چرادەیەك پوچ (ئاناکۆرت) بێهودەیە؟

- (تیۆ) وتی: نەخێر، بەوجۆرەنا. من هەرگیز بەوجۆرە بیرم لێنەکردبۆوە، ئەی کاسۆلیکەکان لەم بارەیەوە چی دەڵێن؟

- (ئەمەل) وتی: دەڵێن ئەوە رازێکی خودابیە، بنەماو بنچینەی ئەم رازەش لەلوتکەی سێلایەنەدایە (سێکوچکەی پیرۆز - Saintetrinite)، واتا خوا لەسێ کەسایەتیدا.

- پورە (مارتا) هاواریکرد: ئەم بابەتە شتێکم بەیاد دێنێتەوە، کە لەشانۆیەکدا پێناسەیەکی گەلەك سەرنجراکێش‌و سەیرم دەربارەی (سێکوچکە) بەرگوێ کەوت. ئەو پێناسەیەش لەسەر زاری یەکێك لە ئەکتەرەکانەوە دەرچوو، کە رۆڵی (عیسا)ی دەگێراو بۆ یادگاری (سێکوچکەی پیرۆز) بەردەوام دەیوت (پیرەمێرد، کۆتر، من).

- (تیۆ) وتی: بابەتی کۆتریش ناخۆش نییە. دوو نیوە هەمیشە پرسێکی شاراوەو ئاڵۆزە، لەکاتێکدا بوو بە سێ دەکرێت پرسکە حەلوفەسڵ بکرێت. وەك خێزانێکی سێ کەسی لێدێت: باوك، دایك‌و منداڵ.

پورە (مارتا)و (ئەمەل) بەسەر سورمانەوە بۆ یەکیان روانی‌و (تیۆ) درێژەی پێدا:

- باشە، ئێستا بڵێ بزانم (کیپتی)یەکان لایەنگری کامیانن‌و پاشان دەچین بۆ بینینی هەرەمەکان.

(ئەمەل) رونیکردەوە، کە (کیپتی)یەکان (مۆنۆفیزیت)ی بون‌و کڵێسا ئەوانی مەحکوم کرد، بەڵام لەدواییدا خستنییەوە ژێر رکێفی خۆی. بەڵام ئەو ململانێ‌و کێشمەکێشە درێژە (میسر)ی لاوازکردو خستییە ژێر دەستی موسڵمانەکانەوە. چارەنوسی (کیپتی)یەکان کەموزۆر هاوشانی ئازارو بێبەشکردن بوو. هەندێك کات مایەی چاودێری‌و ئازارو سەردەمانێکیش ئازادکراو بون، بەڵام سەرئەنجام لە (میسر)ی تازەدا جێگای خۆیان کردەوە، کەیەکسانی بەهەموو هاوڵاتیانی میسر درا بەبێرەچاوکردنی ئاینیان. ئەوەی مابوو سەردانی مزگەوتی (عومەر) بوو، کەبوە مایەی خۆشحاڵی (تیۆ)، چونکە لەو مزگەوتەدا کەسێکی بیتوانیایە بەماوەی تەسکی نێوان دوو ئەستونگەی پیرۆزدا رەتبوایە بەکەسێکی ئیماندارو چاکەکار دادەنرا. (تیۆ)ش هێندە لاوازبوو توانی بەویدا تێپەرێت‌و گوتی:

ئێستا کەبوم بەمرۆڤێکی ئیماندارو چاکەکار بڕیاردان لەلای من دەبێت، بۆ پێشەوە بەرەو هەرەمەکان.

ئیدی بەرگری نەدەکرا. سەردانی (توت ئنخ ئامون) دانرا بۆ رۆژی دواتر. بۆ فراوین کردن چون بۆ هۆتێلی بەناوبانگ (مناهاوس ئەوبروی)، کە لەکاتی (جەنگی دووەمی جیهانیدا) (وینستۆن چەرچل) لەوێ نیشتەجێبوو. گفتوگۆ دەربارەی سیاسەتمەداری بەناوبانگی ئینگلیزی، کە (تیۆ) هیچ گرنگییەکی پێنەدادا، تاهوتێلەکە رێگاکەی بۆخۆی داگیرکرد. (تیۆ) لەنێو تەلارە مۆدێرنەکاندا، کە لەپاڵ رێگاکەدا ریزببون، نائومێدانە چاوی بۆ یەیکەری سێ دانەیی هەرەمە بەناوبانگەکان دەگێرا، کە لەنێو تەلارەکاندا دەتگوت چاوشارکێ دەکەن، هەندێکجار دەردەکەوتن و هەندێجاری دیکەش بزر دەبوون.

## بەلەمی خۆری (خیوپس)ی فیرعەون

لەناکاوێکدا هەرسێکیان بەرەنگی سپیانەوە لەژێر تیشکی خۆری پاشنیوەڕۆدا لەبەرچاویدا قوتبونەوە. (تیۆ) لەوەی هەرەمەکانی بەبچوکی بینی زۆر سەریسوڕما، بەلام (ئەمەل) تێیگەیاند، کەکاتێك سێبەرەکانیان بەسەر لمی بیابانەکەدا دەکشێت و ئەمیش لەسەر پشتی حوشترێکەوە بەدەوریاندا سوڕایەوە، بۆیدەردەکەوێت چەند زەبەلاحن. کاتێك گەیشتنە بنکەی هەرەمە گەورەکە، سەعات نزیکەی یەکی پاشنیوەڕۆ بوو. دەبوو بۆ بینینی هەرەمەکە سەر بۆ پشتەوە بچەمێنیتەوەو لەبەرتیشکی خۆرەکە لەپی دەست بکەیتە سەیوانی چاوەکانت. تەنانەت لەوبارەشدا گۆڕستانێکی مەزنی سەرسامهێنەر بوو. لەگەڵ بونی ئەو هەموو توریستانەی بەهەموو زمانی جیهان دەئاخاوتن، ئەو فرۆشیارانەی کارتی چاپکراویان لەبازوودەداو خولی گێرانەوەی تەلیسم بون، کەچی (تیۆ) نغرۆی سەیرکردنی ئەو بەردە زۆرانە بوو، کەبەسەر سەرییەوە هەڵواسرابون.

- پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: کڵاوی لەسەردا نییە! شێتییە! هەر ئێستا دەچم شتێکی بۆبکڕم.

- (ئەمەل) هۆشداریدا: ئەگەر زۆر لەبەرتیشکی خۆردا بمێنیتەوە دوچاری لەهۆشخۆچون دەبێت.

بەلام (تیۆ) وەلامینەدایەوە، پورە (مارتا) سەودای خۆی لەگەڵ فرۆشیارێك کردو بەکڵاوێکەوە گەڕایەوەو بۆ برازاکەی درێژکردو گوتی: تکا دەکەم هەرچی زووە ئەو کڵاوە بکە سەرت.

لەو ساتەدا، کە پورە (مارتا) دەیویست بەزۆر کڵاوەکە بکاتە سەر(تیۆ) خولی خواردو کەوتە باوەشییەوە. پورە (مارتا) حەپەسا، (ئەمەل) بەزللەیەك، کە لەڕومەتی (تیۆ)ی سرەواند بەئاگای هێنایەوەو رەنگی هاتەوە سەرخۆی.

- پورە (مارتا) وتی: دەگەڕێینەوە. من هەڵەبوم، دەبوو زوتر بیرم لەکڵاو بکردایەتەوە.

- گەڕانەوە؟. (ئەمەل) لەگەڵ ئەو بیرۆکەیە نەبوو، (تیۆ)ی پشکنی، لێدانی دڵی گرت، لەچاوەکانی نواڕیو هەناسەیەکی ئاسودەیی هەڵمژیو ڕایگەیاند: لەبەرامبەر هەڕەمی گەورەدا لەو جۆرە شتانە رودەداتو (تیۆ)ش کاتی ئەوەی نەبوە دوچاری خۆربردن ببێت. بەڵام وتی: (تیۆ).. نابێت سواری حوشتر ببیت، چونکە توشی رشانەوە دەبیت، وەك ئەوەی لەکەشتیدا توشی دەبیتو باشترە سەردانی ناو هەرەمەکەش فەراموش بکەیت، مرۆڤ لەوێدا تەنگەنەفەس دەبێتو بۆ رۆیشتن دەبێت بەکۆمەکۆم ڕێبکەیت.

- (تیۆ) لەسەرخۆ وتی: بۆ من جیاوازی نییە. ئەوەی من دەمەوێت بیبینم بەلەمە. ئەو بەلەمەی فیرعەون لەگەڵ (خۆر)ی دۆستیدا شەو پێش سپێدە دەریاوانی کردوە.

لەوبارەیەوە گفتوگۆکردن سودی نەبوو. سێ کەسەکە بەهەنگاوی کورت بەرەو دامێنی هەڕەمەکە ڕۆشتن، ئەو شوێنەی بەلەمەکەی (خیوپس) لێبوو، (تیۆ) بەسەرنجێکی وردەوە لەلوتکەی کەشتییەکەی روانی.

- (ئەمەل) وتی: ئەم کەشتییە لەساڵی (١٩٥٤)دا لەناو چاڵێکی داپۆشراودا بەپارچەپارچەکراوی دۆزراوەتەوەو بۆ ڕێکخستنەوەی کاتێکی زۆری خایاندوەو هێشتا دوو چاڵەکەی تر هەڵنەکەنراوە، کە دەبێت جمکەکەی تری تێدابێت و کەسیش نازانێت بۆچی بەکارهێنراوە.

(تیۆ) وتی: نا... چۆن! ئەو کەشتییە بۆ سروتی بەخاکسپاردنی (خیوپس) بەکارهێنراوە تابەهۆیەوە کەناری جاویدانی تەی بکات یان بۆ پەڕینەوەی شەوانە یاخود ئەوەی بەڕاستی هەڵگری جەستەی فیرعەون بوە، کە لەمبارەدا دەبێت بۆ دڵنیابون لەسەر شەپۆلەکانی نیل تاقیبکەنەوە، هەروەها بۆ سەردانەکانی ئاییندەش بەکارهێنراوە. بابەتەکە زۆر ئاڵۆز نییە!

- پورە (مارتا) بەدەنگێکی بەرز وتی: ئەمانەت لەکوێوە هێناوە؟

- لەفەرهەنگی زمانی میسرییەوە لەکتێبخانەی فەڕەنسا. بۆ نمونە زۆر ئارەزوو دەکەم بزانم مردوەکانی میسر لەعۆدەی گەشتوگوزاری شەوانە، کشتوکاڵی کێڵگەی پیرۆزو خواردنی هەموو ئەو خۆراکانەی بۆیان ئامادە دەکران دەهاتن..

- (ئەمەل) وتی: باشە، چۆن؟

- (تیۆ) بەدەنگێکی نزمی خەماوییەوە وتی: بەڵام من ئەقڵم نایبڕێت. هەرچۆنێك بێت کاتێك مردم کەشتی گەڕۆکی شەوان هەڵدەبژێرم‌و تەواو.

- پورە (مارتا) وتی: تیۆ.. زۆر باشە، ئیدی بەسە بابڕۆین.

(تیۆ) لەجیهانی خەیاڵدا وتی: چەند گەشتێکی جوان دەبێت!. خۆر زەوی بەجێدێڵێت، مار سود لەتاریکی شەوان دەبینێت تا (ئەپوپیس) بگەزێت، زیندووەکان نزا دەکەن بگەڕێتەوەو لەوماوەیەدا ئەوانەی مردون هەریەکەیان بەبەلەمی خۆیانەوە هاوەڵی دەکەن. ملیۆنان هاوەڵ بۆ چاودێری‌و پارێزگاریکردنی خۆر کەچۆتە خەو.

- پورە (مارتا) بەتوڕەییەوە هاواریکرد: وتم بەسە!

- (ئەمەل) لەکاتێکدا دەستی (تیۆ)ی گرتبوو گوتی: تیۆ وەرە، کەشتی دیکەش دەبینیت. روباری نیل‌و بەلەمەکانی، بابڕۆین!

(تیۆ) بەئەفسوسەوە شوێنەکەی چۆڵ کرد. (ئەمەل) پێشنیاریکرد بەوڵاخ تاشوێنی (ئەبول هەول - Spahin)ی ناوداری (جیزە) بچن، کەپاسەوان‌و پارێزەری هەرەمەکانە. (تیۆ) نارەزویدەکرد بەدەوری (ئەبول هەول) چەرخە لێبدات، بەڵام بەتەنیا. دوو خاتونەکە دانیشتن.

- پورە (مارتا) هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: هەموو شتێك سەبارەت بە میسر دەزانێت.

- (ئەمەل) وتی: لەگەڵ ئەوەشدا لەلام سەیرە! ئایا هیچ دەربارەی نەخۆشییەکەی دەزانێت؟

- پورە (مارتا) وتی: نەخێر. تەنها دەزانێت زۆر نەخۆشە.

- (ئەمەل) وتی: کەواتە هەستیکردوە لەبەرئەوەشە هێندە هاوبەندی میسرو خاکی مردوەکان بوە.

- پورە (مارتا) وتی: ئەمەل، دەبێت چی بکەین؟

- (ئەمەل) بەدڵنیاییەکی زۆرەوە وتی: دەبێت ژیانی میسری کۆنی پێنیشان بدرێت. دەبێت بەکەشتی لەسەر نیل بڕۆین‌و متمانەمان بەڕوبار بێت. کاتێك بەدرێژایی کەنارەکانی روبارەکە ژنان‌و جوتیاران لەناو کێڵگەکاندا دەبینێت تێدەگات میسری ئێمە نەمردوە.

(تیۆ) کاتێك بەسەر وڵاخەکەوە بوو، کە بەئارەزووی خۆی دەڕۆشت کەمێك ماندوو، بەڵام خۆشحاڵبوو. دەکرێت بوترێت ئەوەی زیاتر ئەوی سەراسیمە کردبوو (ئەبول هەول) نەبوو، بەڵکو وڵاخ‌و جوانوەکەی بوو. وڵاخە سپییەکە بەزیرەکی‌و هۆشیاری‌و چاوە پڕەکانییەوە کەمێك فێڵباز دەردەکەوت‌و جوانوەکەش بە پێچەوانەوە نارەسەن.

پوره (مارتا) وتی: ئەی ئەبول هەول چی؟

- (تیۆ) وتی: هەمیشە هەمان شێری بێهونەرە بەلوتێکی شکاوەوە. باسی ئەو بونەوەرە بکە، کە سەد هەزار کۆیلەی گرت تا هەرەمەکەی بۆ دروست بکەن. هەرچەندە میسرییەکان لەجەنگو شەڕدابون لەگەڵیدا، بەڵام بەراستی مافی ئەو بوو.

- پوره (مارتا) بەجموجوڵێکەوە وتی: دەتوانم بزانم باسی کێدەکەیت؟

- (تیۆ) وتی: دیارە (خفرن – Kephren) ئەو فیرعەونەی وێنەی (ئەبول هەول)ی لەسەر شێوەی روخساری خۆی دروستکردا!.

## (تیۆ) دۆزەخ دەدۆزێتەوە

کاتێك گەیشتنەوە ڤێلاکەی (ئەمەل)، (تیۆ) بەزۆر ئامادەبوو پشوو بداتو هەرهێندە چوە ژورەکەی خۆی پوره (مارتا) هێرشی بۆ تەلەفونەکە برد تا کاتی شەمەنەفەری (قاهیرە – لۆکسۆر) بگۆڕێت، بەڵام دواکەوتبوو. لەسەر مێزی شێوکردن دەربارەی سەردانەکانی رۆژی دواتر ئاخاوتن. شەمەنەفەرەکە لەکاتی نیوەڕۆدا دەجوڵا. لەبەرئەوە لای بەیانییەکەی بێبەرنامەبون (تیۆ) بەهەمان ئاوازی دەربارەی هەرەمەکان دوابوو گوتی:

- دەچین بۆ بینینی (توت ئنخ ئامون).

- پوره (مارتا) بەگومانەوە وتی: واتا کە.... (تیۆ) سەیرکە، مۆزەخانە زۆر شەکەتهێنەرە.

- پورێ گیان، من نامەوێت هەموو مۆزەخانەکە بگەڕێم، تەنها دوو نهۆمەکەی تایبەت بە (توت ئنخ ئامون)ە.

- (ئەمەل) بەگونجاوییەوە وتی: دەتوانی بڵێیت چی؟ ئەوت بەدڵە؟

- (تیۆ) وتی: ئەوشتانەی لە گۆڕەکەیا دۆزراوەتەوە، جێخەوەکەی، مێز، چرپا، میحرابی ئاڵتونی لەگەڵ چوار پەیکەری (ئیزیس)ەکەی.. ئاه پاشان چەپکە گوڵە وشکبوەکەی، کە ژنەکەی لەسەر سینەی دایناوە، دەبینیت هەمووی دەزانم!

- پوره (مارتا) وتی: ئەوە دەزانم. ئەی لەکەیەوە هێندە پابەندی میسر بویت؟

- (تیۆ) وتی: مانگی (ژوین)ی رابردوو بوو. دروست ئەوکاتەی باوەگەورە مردو خانمی مامۆستای مێژوو دوگیان بوو؛ مۆڵەتی وەرگرتو مامۆستایەکی دیکەیان نارد، کە پیاوێك بوو بە سمێڵێکی ئەستورو دوو برۆی رەشەوە، هەر لەبەرئەوەش پێیان دەگوت (زۆرگلوپ)و تەنهاش میسری خۆشیدەویست.

- هەر ئەو (زۆرگلوپ)ـە روداوی گەشتی کەشتی خۆری بۆ باسکردن؟

(تیۆ) وتی: بەڵێ راستە ئەو و فەرهەنگی زمان.

- (ئەمەل) وتی: واتە ... وادەردەکەوێت بەقسەکانی ئەو بێت لەو جیهانەدا لەمیسری کۆندا ژیان هەزارجار لەژیانی ئەم جیهانە باشترە. مرۆڤ لەکەشتیدا پیاسە دەکات، خواردن دەخوات، جوتیار کشتوکاڵ دەکاتو... هەڵبەتە هەموو ئەوانە راستن بەو مەرجەی رۆحی مرۆڤ راستو چاك بێت. جگە لەوبارە... ئایا ئەو بەڕێز (زۆرگلوپە) تۆی لەدۆزەخەکانی میسری کۆن ئاگادارکردۆتەوە؟ بەدڵنیاییەوە نەخێر. زۆرباشە ئەوە بزانە لەو بڕوایەدابون ئەگەر مرۆڤ لەژیانی خۆیدا هەڵەو نادادپەروەری کردبێت دەیسوتێنن، لەتی دەکەن، تیر لەجەستەی رۆدەکەنو دواجار لەناویدەبەن.

- (تیۆ) وتی: ئەوەم نەزانیوە. بەڵام من کاتێك بەنێوان ئەو دوو ئەستونگەیەدا رۆیشتم بومە کەسێکی ئیماندارو پارێزراو، لەبەرئەوە هیچ مەترسییەك هەڕەشەم لێناکات.

- تیۆ، یەك ناداد پەروەری، تەنها یەك زوڵموزۆری...

- تەنها یەك؟! ئاه ...

- چونکە فیرعەون پلەو پایەیەکی خودایانەی هەبوە ئاساییە کەس بیری لەوە نەکردۆتەوە مەحکوم بەدۆزەخی بکات...

- (تیۆ) هاواریکرد: باشە، کەواتە دەچین (توت ئنخ ئامون) دەبینین؟ هێی

- (ئەمەل) وتی: دیارە تۆ سەرگوریشتەکەی دەزانیت؟

- نەخێر، ئەوەی دەیزانم ئەوەیە کاتێ مرد زۆر گەنج بوو. دەتوانم تەلەفون بۆ (فاتۆ) بکەم؟.

- پورە (مارتا) لەگەڵ ئەوەی بەپلیکانەکاندا سەردەکەوت وتی: بەموبایلەکەت .

لەوکاتەوە پێی نابوە ناو میسر بەیەك وشە لەگەڵ خێزانەکەی نەدوابوو. تەنانەت یەکجاریش لەگەڵ (فاتۆ) تەلەفۆنی نەکردبوو، هەرناویشی نەبردبوو.

- پورە (مارتا) بە ئاسودەییەوە وتی: ئافەرین (ئەمەل) بۆ وەسفکردنو باسکردنی دۆزەخ، باش سەرنجت لەسەر ئەوشتەی پێویست بوو گواستەوە. بەلایەنی کەمەوە ئیدی بیر لەخۆشیو چێژەکانی مەرگی میسری ناکاتەوە.

- (ئەمەل) وتی: ئەمە بەس نییە. شتێکی دیکە پێویستە. کێ دەبێت پەیامی دواتر رابگەیەنێت؟

- پورە (مارتا) وتی: لە (لۆکسۆر)، بەڵام هێشتا نازانم چۆنو لەکوێ؟

- خاتونی میسری هاواریکرد: زۆرباشە، کەواتە ئەرکەکە بخە سەرشانی من. بیرۆکەیەکم هەیە.

## نیسکی ژیانەوە

هەرکەپێیان نایە ئەودیو دەرگای مۆزەخانەی میسرەوە (تیۆ) بەجۆرێك کەوتە پەلەپەل دوو خاتونەکە بەئاستەم فریای دەکەوتن.

- پورە (مارتا) هاواریکرد: (تیۆ) پەلەمەکە؟

- (تیۆ) وتی: خێرا دەڕۆم چونکە نامەوێت لەهەموو شوێنێك بوەستم... خۆم دەزانم چیدەکەم!.

لەراستیشدا خۆی دەیزانی چیدەکات و دەبێت چیبکات و بەبێئەوەی سەیری هیچکام لەپەیکەرە گەورەکان بکات، کەبەجەستەی گەورەی رەش هەلگەڕاوەوە ئەو ناوەیان تەنیبوو، هەنگاوی دەنا. تەنها یەکجار لەبەردەم دەرگایەکدا وەستا، کەبەسەر تەلاری مۆمیاکراوی فیرعەونەکاندا دەکرایەوە. هەر لەوێشدا بوو (ئەمەل) بەردەمی لێگرت و بەئاوازێکی فەرماندارانەوە، کە یەکمجار بوو بەو جۆرە لەگەڵی بدوێ، تێیخوڕی و گوتی:

- (تیۆ)، مۆمیاکراوەکان نا!

- بەڵام دەمەوێت بیانبینم!

- (ئەمەل) دەستی لەسەرشانی داناو گوتی: ئازیزەکەم، ئەوانە خۆفناك و تۆقێنەرن: شتێکی شادی هێنەرنین، مردوی بێنەوان، کە خەونی ئەبەدیان تێکدراوە تا بۆ مۆزەخانەیان بگوێزنەوەو بیانخەنە بەرچاوی بینەران.

- (تیۆ) وتی: راستە.

- لەهەموو شتێك خراپتر توریستەکان بەجۆرێك لێیان دەنواڕن گوایە لەهۆڵی هەڵوەشاندنەوەدان. دیارە بێگومان سەغڵەت دەبیت.

- (تیۆ) کە ملی رێگای گرتەوە وتی: بێگومان، وایە!.

سەرئەنجام لەنهۆمی دووەم، لەشوێنی گەنجینەکانی (توت ئنخ ئامون) (تیۆ) هەنگاوەکانی خاوکردەوە. بەجۆشوخرۆشاویەوە لەبەردەم هەر پەنجەرەیەکدا دەوەستا. دووبارەی کردەوە: دروست وەك کتێبەکانە، نا ئاساییە! (زۆرگلوپ) راستیدەکرد. کاتێك چوە ئەو ژورەی سێ تابوتی تێدابوو روانینەکانی توندو دروستبون. بۆ بینینی ماسکی ئاڵتونی بەناوبانگو

پێکەنینی لاوانەو هێماداری تابوتەکە سەری بردە پێشەوە بۆ شوشەکە. لەکاتی دەرچون لەهۆڵەکە ئاهێکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی:

- چەند حەزمدەکرد روخساری راستەقینەی ببینم. مۆمیاییەکەی لە کوێیە؟ لەخوارەوەیە؟

- (ئەمەل) وتی: نەخێر، مۆمیایەکەی لەسروتێکی پرشکۆدا لەدۆڵی پاشایان بەرامبەر (لۆکسۆر) دوبارە لەگۆڕەکەیان هاویشتۆتەوە. باشترە بێیت سەیری (ئۆزیریس سەوز – Osiris Vegtant -) بکەیت. دڵنیام دەزانیت مەبەستم چییە؟

بەڵام لەوڕووەوە (تیۆ) زانیارییەکانی سەبارەت بە میسر سفر بوو. (ئەمەل) لەبەردەم سندوقێکدا ڕاوەستا، کە لەسەر شێوەی پەیکەرێکی مرۆڤ بوو، پڕبوو لەگیای هەززارانساڵەی زەرد هەڵگەڕاوی نێو باخچەیەکی سروشتی سەرنجڕاکێش، کە لەبەرچاودا بوو، دەستیکرد بەڕونکردنەوەکانی: جەستەی (ئۆزیریس)ی مۆمیاکراو نوێنەری خاکی میسرە. هەموو ساڵێك کاتێك ئاوی نیل بەرزدەبێتەوەو خاك ئاودەدات کێڵگەو دەشتەکان دوبارە سەوز دەبنەوە. هەموو ساڵێك لەکاتی بەرزبونەوەی ئاوی روبارو سێلاودا ئەو دەنکە تۆوانەیان دەناشت، کە لەنێو ئەو سندوقانەدان لەسەر شێوەی (ئۆزیریس) دروستکراون. لەهەموو گۆڕێکدا یەکێك لەو سندوقانەیان دەناشت، کە پێیان دەگوت (ئۆزیریسی سەوزبوو) تا فەرامۆشی نەکەن و ئەگەر مەرگ بوو بەجێنشینی ژیان، ژیانیش بۆ هەتاهەتایە دەبێتە جێکەوتەی مەرگ. تەنانەت هەتا ئەمرۆش لەوەرزی زستاندا دەنکە نیسك لەنێو لۆکە دەنێن تا لەبەهاردا شین بێت و خۆشبەختی لەگەڵ خۆی بێنێت.

- (تیۆ) پرسی: پێمبڵێ.. پێشەوەی لەمیسر بڕۆین ئەوکارە ئەنجام دەدەین؟ ئەوکاتە پاکەتەکە لەگەڵ خۆم دەبەمو..... ئینجا کەغەم بەربینی گرت بێدەنگ بوو.

- خاتونی میسری درێژەیپێدا: بەڵێ. (ئینشاڵا) تۆ ناشتنی نیسك دەبینیت. هەروەها ئێستا بۆ کڕینی نیسك دەڕۆین.

(تیۆ) پێش فراوین کردن نیسکەکانی ناشت. (دە) دەنك نیسکی وەك یەك لەپاکەتێکی خڕی شوشەیی رون، کە بەهۆی گەشتکردنەوە بەدوو لاستیك توندی کردبوو. (تیۆ) راسپێردرا هەموو رۆژێك ئاویان بدات و تەنها لەکاتی پێویستدا سەری پاکەتەکە دابخات.

## بەشی شەش

# (ئارکیۆلۆژیست و شێخە)

پـوره (مارتـا) حـەزی بەوەنـەبوو لـەدواین سـاتەکاندا بگاتـە ئێـستگە. لەسـەعات چـوارەوە ئامادەبوو، بەڵام (ئەمەل)ی سەرزەنیشت دەکرد، کە ئامـادە نـەدەبوو. (ئەمـەل)یش هەوڵیـدەدا قەناعـەتی پێبکـات سـەعات نـۆو بیـست دەقیقـە شـەمەنەفەرە خێراکـە دەجوڵێت، لەبەرئـەوە پێویست ناکات پێش سەعات پێنج بکەونە رێ. پورە (مارتـا) لـەوباوەڕەدا بـوو ئەگـەری روودانـی هەموو شتێ لەئارادایە: لەوانەش ئەگەر هـەبوو ئـەو شـەمەنەفەرە میـسرییە پـێش کـاتی خـۆی بجوڵێـت... تەنانـەت ئەگــەر هەرلەسـەردەمی فیرعەونەکانیـشەوە تائێـستا شـتی لـەوجۆرەش روینەدابێت. لەبەرئـەوە هـیچ شـتێك نـەبوو پـورە (مارتـا) ناچاربکات زووتـر نەگاتـە ئێستگە. شـەمەنەفەری ژمارە هەژدە بەبڵندگۆیەك، کە لەهـەموو ژوورەکانـدا هـەبوو، بەکورسـی نوسـتن و پشودانەیەوە شایستەی ناوداریيەکەی بوو. پـورە (مارتـا)ش، کـە حـەزی بەپـشودان بـوو، لەگـەڵ پێی نایە ئـەودیوی فارگۆنەکـەوە هەناسـەیەکی رازیبـونی هەڵمـژی. (ئەمـەل) وانـەکانی کلاسـی لەگەڵ خۆی هێنابوو تاخۆی بۆ هەفتەی ئاینـدە ئامـادە بکـات. (تیـۆ)ش لـەلای خۆیـەوە نغـرۆی خوێندنەوەی پەراویچکەکەی بوو، کە لەوکاتەوەی گەیشتبونە میسر دەستی بۆ نەبردبوو.

پورە (مارتا) بێ پێشەکی وتی: بەڕاست (فاتۆ) لەتەلەفۆنەکەدا چیوت؟

- (تیـۆ) بێئـەوەی سـەر لەسـەر نوسـینەکەی بەرزبکاتـەوە لـەژێر لێـوەوە وتـی: هـا... وتـی لەپاریس بەفر دەبارێت.

- هەرئەوەندە؟ ئەی دەربارەی ماڵەوە؟

شتێکی ئەوتۆی نەدرکاند. ئا! بەڵێ، (ئیدن) سەرمای بوە.

- ئەی دایکت؟

بە بڵەبڵەوە وتی: دەهێڵێت کارەکەم تەواو بکەم؟ وەکو دەبینیت خەریکی نوسینم!

پورە (مارتا) بە توانج تێگرتنەوەوە وتی: ها، بەڵێ، بەڕێز سەرقاڵی نوسینە....

## (موسا)و (یوسف)دوو جولەکەی میسری

بەرێز (تیۆ) بەنیازبوو لەنوسینەکانیدا پێشکەوتن بەدەست بێنێت. کورتی کردەوە:

عیسا = سروشتی خودایی‌و سروشتی مرۆیانە. ئەریانیست = نیوەبەنیوە. مۆنۆفیزیتەکان = یەك سروشت. نەستورییەکان.. ئەمەی نەدەزانی و لەیادی نەمابوو. ئا.. کاتارەکان = جۆرێك مرۆڤی شێت، کەبەشە خراپەکەی جەستەی خۆیان پشتگوێ دەخست تارۆحی چاکەی تێدا ئازاد بکەن. کیپتییەکان = کریستیانی میسری. رەهبانەکانی بیابان = وەرزشەوانەکانی پەروەردگار. راهیبەکانی سەر کۆڵەکە = ئەستیلیتەکان، ئەو راهیبانەن فەیلەسوفە قەشەنگەکەیان کوشت. راهیبەکانی تێکدەری پەیکەرەکانن، ئەو راهیبانەی شارەزای هونەری جوانکارین. کەنیسەی (بن عەزرا): ئەو جێگایەی (موسا) بەهۆی کچی فیرعەونەوە لەسەر ئاو گیرایەوە. مزگەوتێك بە کۆڵەکەی خواپەرستییەوە.

پورە (مارتا) وتی: تیۆ، تەندروستیت باشە؟

- بەڵێ!

لەرێستورانتی فارگۆنەکەدا بەبێدەنگی مایەوە. پورە (مارتا)و (ئەمەل) دەربارەی سەردانی (لۆکسۆر) گفتوگۆیان کردبوو، بەڵام (تیۆ) گوێی رانەداشتبوو.

- پورە (مارتا) وتی: تیۆ، وەك ئەوەی حەزت دەکرد بەرنامەی روناکی‌و دەنگی (کرنك) ببینی، دەمەوێت بەلەمێکی چارۆکەدار بەکرێ بگرم بۆ پیاسەکردن لەسەر نیل ، رات چییە؟

- (تیۆ)، کە ئێستا لەجیهانی خەیاڵات هاتبوە دەرێ، وتی: ها؟ چی؟

- (ئەمەل) وتی: وادیارە ئیدی میسر لەلات سەرنجراکێش نییە.

- وەڵامیدایەوە: بۆچی؟ تەنها هێندە هەیە ناتوانم خاڵی پەیوەندی لەنێوان میسری کۆن‌و جولەکەگەراییدا بدۆزمەوە، بۆ رونکردنەوەی ئەمە کەسێك پێویستە، کە هەم میسری بێت‌و هەم جولەکەو کەسی لەو جۆرەش نییە!

- پورە (مارتا) بەسەغڵەتییەوە وتی: تیۆ، چۆن! بەلایەنی کەمەوە دوو کەسی لەوجۆرە هەیە، کە تۆ یەکێکیان زۆر باش دەناسیت!

جولەکەی میسری؟

- (ئەمەل) وتی: جێگۆرکێ بەوشەکان بکە، میسریەکی جولەکە.

- کەسێك لەمیسر لەدایك بوو بێت‌و جولەکە بێت... ئەها. موساو ئەوی دی؟

- پورە (مارتا) وتى: ئەوى ديكە، ناوى (يوسف)ە، كەجوانترين كوڕى (يەعقوب) بوو. لاوێك بوو شارەزا لەجيهانى خەونەكان.. (تيۆ) وەك تۆ. ڕۆژێك يەكێك لە خەونەكانى بۆ براكانى باسكردو ئەوانيش زۆر توڕەبون، چونكە لەو خەونەدا (يوسف) براكانى بينى بوو هەمويان لەپەوڕوو خەوتون.

خاتونى ميسرى ڕاستيكردەوە: مەبەست لەوەيە (يوسف) لەخەوندا چەپكێك گوڵە گەنمى بينيبوو، كەتەنها ئەوەى هى خۆى بوو ڕاست وەستاوەو ئەوانى ديكە لار بونەتەوە.

- پورە (مارتا) وتى: باشە، مەبەستەكە سادە دەكەمەوە. براكانى (يوسف) لە توڕەييدا بڕيارياندا (يوسف) وەك كۆيلە بەكاروانييەك بفرۆشن، كە بەبيابانـدا تێپەڕدەبون.

- (ئەمەل) بەگونجاوييەوە ڕاستيكردەوە: بەڵام سەرەتا مەبەستيان بوو بيكوژن، تەنانەت فڕێياندايە ناو بيرێكەوە، كە دەكرێت لەناو قەڵاى قاهيرەدا ببينرێت.

پورە (مارتا) بەسەغڵەتييەوە وتى: زۆرباشە، بەڵام دەمەوێت خێراتر مەبەستەكە ڕونبكەمەوە. بەكورتى براكانى (يوسف) توانيان باوكى بەتەمەنيان بخەنە سەر ئەو باوەڕەى (يوسف) لەلايەن دڕندەيەكەوە لەتوپەت كراوە. لەڕاستيدا (يوسف) نەمردبوو، بازرگانان وەك كۆيلە كڕيبويان‌و ئەويش دوچارى گەلەك كێشە بوو؛ خرايە زيندان، بەڵام سەركەوتوانە لەزيندان دەرچوو، كەبوو بەئەستێرەناسى فيرعەون.

- (ئەمەل) وتى: واتە (يوسف) دەيتوانى بەشێوەيەكى زۆر سەير خەونى كەسانى ديكە لێكبداتەوە، ئەوەش هێزێكى نائاسايى پێدەبەخشى.

- پورە (مارتا) پەتى حەوسەڵەى پچڕاو بەتورەييەوە وتى: دواجار كێ لێرە قسەدەكات؟ من يان تۆ؟ ئێستا كە ئەوەندە شارەزابويت فەرموو تۆ قسەبكە!

- (ئەمەل) بێئەوەى چاوەڕێى پرس‌و تكا بێت وتى: زۆر سادەيە. (يوسف) بەهۆى لێهاتويى‌و شارەزايى لەلێكدانەوەى خەونەكان كرا بە وەزيرى گەورەى فيرعەون‌و لەگەڵ خاتونێكى ميسريدا هاوسەرگيرى كردو دوو منداڵى لێبوو. پاشان لەسەر خاكێكى دوور، كە ئەوكاتە بە (كەنعان) ناودەبرا، گرانييەكى گەورە باڵى بەسەر جولەكەكاندا كێشاو ئەوانيش بەكاروانى ڕويان لەميسر كرد، تا ئاژەڵەكانيان بفرۆشن‌و بە پارەكەى گەنم بكڕن.

- (تيۆ) هاواريكرد: گرەو دەكەم ويستويانە ئەو ئاژەڵانە بە (يوسف) بفرۆشن!

- بەڵێ، بەڵام (يوسف)يان نەدەناسييەوەو لەبەرامبەريدا كڕنۆشيان بردو كاڵاكانيان وەك بەخشين پێشنيازكرد... خەونەكەى (يوسف) بەوجۆرە لێكدرابۆوە.

- (تیۆ) گەیشتە ئەم ئەنجامە: ئەویش تۆڵەی لێسەندنەوە.

- نەخێر، تۆڵەی نەکردەوە. سەرەتا خۆراکی پێدان، پاشان خۆی لەلا ئاشکراکردن تا ئەو هەواڵە بە(یەعقوب) بگەیەنن و پێیبلێن، کە کورەکەت (یوسف) نەمردوە. (یەعقوب) هات بۆ میسر بۆلای کورەکەی و لەسەر ئەم خاکە ژیانی کۆتایی هات. چەندین ساڵ دوای ئەوە، کاتێك جولەکەکان لەبەر ئازارو ئەشکەنجە میسریان جێهێشت جەستەی مۆمیاکراوی (یوسف)یان لەگەڵ خۆیان برد.

- (تیۆ) وتی: لەو فیلمەدا ئەڵقەیەك بزرە. تۆ دەربارەی (یەعقوب) قسەت کرد! پاشان دەربارەی مۆمیایی (یوسف)و دەرچون لە میسر.... چیرۆکەکەی تۆ سەیرە!.... بۆچی بەهۆی (یوسف)ەوە هەموو شتێك بۆ جولەکەکان روو لەباشی بوو، بۆچی دوایی هەموو شت روو لەخراپی دەکات؟

- (ئەمەل) وتی: جولەکەکان زۆر دەوڵەمەندبون. لەڕاستیدا (یوسف) بەو لێهاتویی و شایستەییەوە حوکمڕانی میسر بوو، کە پەرەی بە دەسەڵاتی پشتی خۆی دەدا. لەمیسر کەس لەشایستەیدا شانی لەشانی (یوسف) نەدەدا: (تیۆ) دەتوانیت وێنای بکەیت! کاتێك پیرە (یەعقوب) مرد (یوسف) چوو بۆ (کەنعان) تا (یەعقوب) لەوێ بەخاك بسپێرێت و تەواوی دەرباری فیرعەون لەگەڵیدا رۆیشتن. پاشان (یوسف) خۆشی لەتەمەنی سەدو بیست ساڵیدا مرد. فیرعەونیش مردو کەسانی دیکە بونە جێنشینی. گەلی جولەکەش لەڕوی ژمارەوە بەشێوەیەکی نائاسیی زۆرببون.

- ژمارەی دانیشتوان کاتێك زۆر دەبێت، کە لەدایکبوان زیاد بکەن، وانییە؟

- بەڵێ. وەك ئەمڕۆ لەهندستان یان لێرە لەمیسر. رۆژێك فیرعەونێك بوو بەدەسەڵاتدار، کە وەك فیرعەونەکەی سەردەمی (یوسف) چاکەکارو باش نەبوو. بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ئەو گەلە کۆچبەرە، کە زۆر بەهێزببون، چەندین تەگبیری رەچاوکرد. لەقۆناغی یەکەمدا فەرمانی بەمامانە جولەکەکاندا هەموو ساوایەکی لەدایکبوو بکوژن. بەڵام چونکە مامانەکان ملیان بۆ ئەو فەرمانە کەچ نەکرد، فەرمانی دەرکرد هەموو منداڵانی لەدایکبوو رەشەکوژ بکرێن. (موسا) لەو رەشەکوژییە رزگاری بوو، چونکە دایکی لەسەبەتەیەکی هاویشت و دای بەدەم روباری (نیل)ەوەو کچی هەمان ئەو فیرعەونە سەرەڕۆیە گرتییەوە. لەدواییدا موسا زانی کە بەجولەکەیی لەدایکبوە گەلەکەی ئازاد کردو بۆ فەلەستین گەڕایەوە....

- (تیـۆ) قـسەکەی پێـبڕی: خـۆت هـیلاك مەکـە. (موسـا) دژێکـی (یوسـف)ە. یـەکێك لـە فەلەستینەوە دەچێت بۆ میسر و ئەویدیکە لەمیسرەوە بۆ فەلەستین دەچێت، ئەمـەش دەبێتـە دوو جولەکەی میسری. سوپاس!

- پـورە (مارتـا) بەکـەمێك فێڵبازییـەوە وتـی: (ئەمـەل) تـۆ لـەو نێوانـەدا هاوسـەرەکەی (بۆتیفار)ت لەیاد نەکرد؟

- (ئەمەل) وتی: لەگەڵ ئەوەشدا بابەتی سەرەکی ئەوە نییە.

پـورە (مارتـا) وەڵامیدایـەوە: وا تێدەگـەیت؟ باشـە، گـوێرادێرە (تیـۆ). کـاتێ لەسـەرەتادا (یوسـف) وەك کۆیلـە بـۆ (میـسر) هێنـرا کردیـان بەخزمـەتکاری پیـاوێکی گـەورە بـەناوی (بوتیفیار)، کە بڕوای لەسەری هەبوو، هـەموو کاروبـاری ماڵەکـەی خـستبوە ئەستۆی. ژنەکـەی ئارەزوی دەکرد لەگەڵ (یوسف) عەشقبازی بکـات، بـەڵام (یوسـف) رازینـەدەبوو، ئیـدی ژنەکـەی (بوتیفیـار) لەترسـی ئـەوەی ئـەوەکو یوسـف لای مێردەکـەی شـتێك بـدرکێنێت (یوسـف) تاوانبارکرد بەوەی نیازی دەستدرێژیکردنی هـەبوە. بـەوجۆرە (یوسـف) خرایـە زینـدان. (تیـۆ) ئایا ئەو بابەتە سەرەکی نییە؟

- (تیۆ) وتی: نەخێر، ئەوەندە نا. ئەوەش وەك چیرۆکەکانی تەلەفزیۆنە. یەکێك لەکچەکانی هاوڕێی منـیش تەڵەکەبازییـەکی لـەوجۆرەی کـرد تـامن لـە(فـاتۆ) جیابکاتـەوە، بـەڵام فێڵەکـەی سەری نەگرت.

- پورە (مارتا) وتـی: نـەخێر، ئیـدی منـاڵ و لاوان نییـە. ژنـی (بوتیفـار) لەقوتابخانەکانیـشدا هەیە.

- (ئەمەل) وتی: (مارتا)ی داماو، دەبێت دوبارە دەست بدەینەوە خوێندن.

- (تیـۆ) بەشـداریکردو گـوتی: باشـە، کـچینە ئـارام بـن! هیـوادارم ئێـوەش وەك قەشـەی ئـەو کەنیسانە نەکەونە سەروگوێلاکی یەکدی.

دوو خاتونەکە بێدەنگبون. (تیۆ) حەزی بەشەڕو جەنگ نەبوو.

- پورە (مارتا) بە تاڵییەکەوە وتی: پرتەقاڵەکەت بخۆ.

## ئارکیۆلۆژیستی بەڕێز دوادەکەوێت

لەسەر سەکۆی ئێستگەی ڕێگای ئاسنی (لۆکسۆر) بارهەڵگرانی جانتا زۆرەکانی پورە (مارتا) سێ دانەی گەورەی (تیۆ)و بچوکێکی (ئەمەل)یان هەڵگرتبوو، بەڵام (ئەمەل) ئامادەی ڕۆشتن نەبوو. چونکە هاوڕێ ئارکیۆلۆژیستەکەی زۆرجار دوادەکەوت وکەچی (ئەمەل) دڵنیابوو هەردێت....

دوای نیو سەعات سەرئەنجام (ئەمەل) ملیدا بڕۆن. هاوڕێکەی زۆر لاو نەبوو، ئەگەر هەبوو کەوتبێتە ناو یەکێك لەچاڵەکانی کارگەی هەڵکەندن لە(کرنك).

- پورە (مارتا) وتی: دەکرێت ناویمان پێبڵێیت؟

- پیاوێکی فەرەنسی زۆر شارەزایە، کەمێك سەیرو سەمەرە، بەڵام میهرەبان، دەیبینیت دانیارێکی گەورەیە!

بەکورتی هەموو شتێکی دەربارەی بەڕێز ئارکیۆلۆژیست باسکرد، جگە لەوەی (ئەمەل) لەیادی چوو ناوی بهێنێت. لەو سەروبەندەشدا تاکسییەکە گەیشتبوە (وینتەر پالاس). ئەو هۆتێلەی بەدڵی پورە مارتا بوو، کە بەخاوەن شێوازو سەلیقەی دادەنا. لەهۆتێلەکەو بەرامبەر بە پلیکانە پێچاوپێچەکانی ئارکیۆلۆژیستی نهێنی ئامێز چاوەڕوان بوو. کەس نەیدەتوانی ئامادەبونی نادیدەبگرێت: پیاوێکی بەتەمەنی موو سپی بەکڵاوێکی تەپوتۆزاوییەوە، بەشۆرتو پێڵاوی قورسو چاویلکەی ڕەشەوە؛ کەسێك کەدەتگوت لەفیلمی کارتۆنییەوە هاتبێت. کاتێك (ئەمەل)چاوی پێیکەوت بەدەنگێکی تارادەیەك توڕەوە وتی:

- باشە، دواجار هاتیت! دەزانیت لەکەیەوە چاوەڕوانم؟

تێیانگەیاند بڕیاربوە لەئێستگەی (لۆکسۆر) پێشوازیان بکات، ئینجا کابرای ئارکیۆلۆژیستی بەتەمەن دەستیکرد بەپۆزش هێنانەوەو قسەکردن دەربارەی لەیادچونەوە باوەکەیو داننان بەوەی (کە ڕاستە بیرم کەوتەوە شوێنی یەکتر بینینمان ئێستگەی شەمەنەفەر بوو نەك هۆتێل).

- وابزانم ئەم بەڕێزە لاوە بەئەدەبەش (تیۆ) بێت؟ ئایا زۆر هیلاك نییە؟ دەتوانێت لەسەردانی هەڵکۆڵینەکاندا لەگەڵماندا بێت؟ بەجۆرێکی ساویلکانەش، کە بەردەوام لەسەر نوکی پەنجەکانی دەجوڵا درێژمیپێداو گوتی ئەی خاتوو (ماك لاری) پورەخانم ئەویش دێت؟

- پورە (مارتا) لەکاتێکدا (تیۆ)ی دابوە پێشخۆی وتی: جارێك ئەم و جارێك ئەو، ئینجا کێی دیکە؟ پیاوێکی سەیرە، تەنانەت خۆشی ناناسێنێت، دەچم دوشێك دەکەم. (ئەمەل) ئێمە دەچین بۆ ژورەکەمان.

پاش سەعاتێك ئارکیۆلۆژیستی بەتەمەن دەیویست هەرچۆنێکبوە هەمویان بکاتە سەرنشینی ئۆتۆمبیلە بچوکەکەی. لەکاتێکدا ئۆتۆمبیلەکەی پڕبوو لەفایلو شتی جۆراوجۆرو هەرجێگای خۆی دەبۆوە. (ئەمەل) پێشنیاریکرد بەئەرەبانە بڕۆنو دەمودەست پەسەندکراو هەردوکیان کەوتن رێ: ئۆتۆمبیل بەخرەخرێ مەکینە ناتەواوەکەیو ئەرەبانە بە ئەسپەکانییەوە لەسەرخۆ رێیان دەکرد. لەسەر روبارەکە بەلەمە چارۆکەدارەکان باڵەکانی خۆیان کردبۆوە. لەوبەرەکەی ترەوە لەدامێنی چیادا گۆڕستانی (تب - thebes)ی پایتەختی کۆنی ئیمپراتۆری میسر خۆیان لەبەرچاوان حەشاردابوو، کەس نەیدەبینین، بەڵام هەموا دەیانزانی گۆڕستانەکە لەوێدایە؛ دورە لەو ئەرەبانە شاعیرانەیەی بەرزییەکانی بەسەر روبارەکەدا دەیڕوانی تێدەپەڕانو خاوەنی رێڕەوێکی پڕ لەدرەخت، هۆتێلو توریستە بەتەمەنەکە بوو. ئۆتۆمبیلو ئەرەبانەکە بێوەستان لەبەرامبەر پەرستگای (لۆکسۆر) تێدەپەڕینو لەپڕ بەلای راستا شکانەوەو پاش ساتێك لەبەردەم دەرگای پەرستگایەکەدا ڕاوەستان. ئێستا گەیشتبونە (کرنك).

ئارکیۆلیژیستە پیرەکە قسەی زۆر پێبوو. سەبارەت بەو تەلارەی پێش گەیشتنیان بەناوشار بینیبویان، کە سەنتەری لێکۆڵینەوەی فەرەنسا – میسر بوو، ماوەیەکی درێژ قسەی کرد. پورە (مارتا) هەوڵیدا هەرچۆنێکبوە ئەو پیرە پیاوە تێبگەیەنێت، کەسەرەڕای نارازیبونی ئەو و (ئەمەل) دەیویست هەموو کونو قوژبنێکی شوێنەوارە هەڵکەندراوەکان بگەڕێن... پێیانڕاگەیان، کە نایانەوێت لە پایەکانی (ئەبول هەول)ی سێ سەر بکۆڵنەوە. هەرلەبەرئەوەی لەنوێژەنکردنەوەیدا بەردی سەردەمی رۆمانەکان بەکارهێنراوە، ئارەزوش ناکەن لەناسینی مێژوی تەلاری دەروازەکان یان ئەو سیاسەتەی بۆ هەڵکۆڵینەکان دەگیرێتەبەر. پیرەپیاوەکە، کەلەو کاردانەوانە سەغڵەت ببوو، بەبڵمەبڵم وتی:

- بەڵام من وامدەزانی ... باشە، لەبەرئەوە راستەوخۆ بۆ تەلاری کۆڵەکەکان دەڕۆین.

پورە (مارتا) لەکاتێکدا لەدڵەوە نەفرەتی لە (ئەمەل) دەکرد، حەزی دەکرد زوو رزگاریان ببێت، چونکە لەوانەیە ئەم پیرە پیاوە زۆر بڵێیە هەموو شتەکان تێکبداتو (تیۆ) بێهیواو دڵسارد بکات. بەڵام (تیۆ) زۆر ئاسودەخەیاڵ لەم ئەستونگەوە بۆ ئەوی دیکە دەچوو، دەستی لەقاچی ئەو خواوەندانەدەخشاند، کە هەزاران ساڵ لەوەوپێش نەخشونیگاریان لەسەر هەڵکۆڵرابوو؛ (تیۆ) سەرقاڵی گەشتو گوزاربوو لە (میسر)ەکەی خۆیدا. لەبەردەم ئەو روخسارە خوداییانەی، کە چەندین جار دوبارە ببۆوە، هێندە دواکەوت کە پورە (مارتا) گەڕایەوە. (تیۆ)، کە ئاماژەی بۆ ئەندامانی زوزێی خوایەکی نەناس کرد، وتی: ئەمە کێیە؟

پورە (مارتا) وتی: ناوی (مین - Min)ـە، خوای ئاوسبونە. ئاینە کۆنەکان هەمیشە جەختیان لەسەر لایەنی پیرۆزی رەگەزی نێر کردۆتەوە.

- دەبینم دەستێکی بەئاڕاستەی بەرامبەر درێژکردۆتەوەو بەدەستەکەی دیکەی وەك ئەوەیە خۆی ...

- پورە (مارتا)، کە (تیۆ)ی بەدوای خۆیدا کێشدەکرد وتی: بابڕۆین تا دوانەکەوین. سەیری بەردەمی خۆت بکەو ببینە چەند جوانە.

لەنێو وێرانەکانی (تەلاری کۆڵەکەکاندا) پەرستگای (کرنك) دەبینرا، کە زیاتر بەدارستانێکی لەبەرد دروستکراو دەچوو. (تیۆ) لەبەردەم دەروازەی چونە ناوەوە راوەستا. ئەستونگە شێوە سەتڵییەکان هەم بچوك و هەم تایبەت دەردەکەوتن و هێندە هەماهەنگ و گونجاوبون، کە باخی داری خورماکانی پشتەوە وەك ئەوە بوو خۆیان بچوك کردبێتەوە تا بەرزی کۆڵەکەکان زیاتر دەرکەون.

- پورە (مارتا) وتی: تیۆ چی دەڵێیت؟

- (تیۆ) پاش ساتێك بێدەنگبون وتی: مرۆڤ هەست دەکات مێرولەیە، بەلام ئاسمانی سەر تارادمیەك سەغڵەتەکارە. باشتر بوو کاتێك بۆ دیدەنی خودا دێن ئیدی ئاسمان نەبینن... ئایا کەشتی پیرۆزیان بۆ ئێرە دەهێنا؟

دێرینە ناسەکە گوێی تیژکرد: دیاربوو کوڕە هێندە نەزان نەبوو. خێرا هەردوکیان وەك دوو هاوەڵی کۆن کەوتنە ئاخاوتن. خاتونەکان بەرەڵلا لەدواوە دەهاتن.

- پورە (مارتا) وتی: ئەم پیاوە (تیۆ) شەکەت دەکات.

- (ئەمەل) وتی: هەردوکیان رازی دێنە بەرچاو! هاوڕێکەم کەمتر بواری گفتوگۆی هەیە لەگەڵ لاواندا.

- پورە (مارتا) وتی: بەراست یان ناوی ئەو بونەوەرەم پێدەڵێیت یان هەنگاوی دیکە لەگەڵتا ڕێناکەم.

- خاتونی میسری بەسەرسوڕمانەوە وتی: بۆ ناویم پێنەوتویت. ناوی (ژان باتیست لاپلاس)ـە. بێوەپیاوە.

- پورە (مارتا) بەسەرسوڕمانەوە وتی: زۆر باشە بۆکوێ چون؟

- (ئەمەل) لەبەرخۆیەوە وتی: نابێت دوای ئەوان بگەینە دەریاچەی پیرۆز. کەسێك لەوێ چاوەنوارمانە.

## پەیامی شێخە

کاتێـک خانمـەکان لەکـەنار دەریاچـەی پـیرۆز بـە (تیـۆ)و بـەڕێز (لاپـلاس) گەیـشتنەوە هـەردوکیان سـەرقاڵی گفتوگـۆ بـون لەگـەڵ پیرەژنێکـی سـەیرو سەرتاپاسـەوز، کـە لەبەرامبـەر پەیکـەری باڵنـدە گـەورەی لەبـەرد داتاشـراودا دانیـشتبوو. (ئەمـەل) شـەقاوەکانی خێراترکـردو دەستی خستبوە سەر ناوچەوانی وتی: سڵاو شێخە... ببورە لەدواکەوتنمان. ئەمـە (تیـۆ)یـە، کـە دەربارەی باسم بۆ کردیت.

ژنە بەتەمەنەکە بەبزەیەکەوە وڵامیدایەوە: سڵاو .. مناڵەکەم بینی. ئایا ئێستا کاتەکەی گونجاوە؟

بەبێئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بکات بەپەنجەی دۆشاومژەی ئاماژەی بـۆ پەیکـەری باڵندەیـەکی بچوکترکرد، کە لەژێر باڵی پەیکەری باڵندەیـەکی گـەورەتردا بـوو. (تیـۆ) بێـدەنگ بـوو، پارچـە کاغـەزێکی لـەژێر ئـەو شـوێنەدا بـینی . پـەیامێك بـوو بـەهێڵی (هیرۆگلیفـی – هێڵـی وێنـەیی میسری کۆن)، کە بەگەردنی پەیکەرە بچوکەکەوە کرابوو، پەیکەرەکـەش لـە گڵـی سـوری ڕەنـگ شین بوو.

- (تیۆ) لەبارێکدا لەسەر زەوییەکە ڕۆدەنیشت هاواریکرد: ئەمە پەیامە بۆ من! ئێستا دەبێت بیدۆزمەوە! بەڕێز (ژان باتیست) یاریدەم دەدەیت؟

ئارکیۆلۆژیـست بـەرەفتارێکی جـوان و خاکیانـە لەتەنیـشتییەوە دانیـشت. کاتێـك ئـەو دوانـە سـەرقاڵی ڕازی نوسـینەکە بـون، ژنـە بەتەمەنەکـە (ئەمـەل)ی بـردە لاوەو بـەئاوازێکی قـورس و دڵنیاوە پێیڕاگەیاند:

- کچم وەرە بۆ ئێـرە. ئـەو مناڵـە زۆر نەخۆشـە. هیـوادارم تـەنها بـۆ پێـدانی پـەیامێك منـت بانگ نەکردبێت. دیارە بۆ چاەسەر داوای منت کردوە؟

- (ئەمەل) خاکیانە وەڵامیدایەوە: شێخە، بەڵێ وایە، دەزانم دەتوانیت ئەو کارە بکەیت.

- ژنەی بەتەمەن ئاهێکی کێشایەوە وتی: بەیاریدەدەری خوا! هەوڵدەدەم. بەڵام دەبێـت پـارە کوڕەکان بدرێت و دەزانیت بڕەکەی زۆرە. هەروەها ئەو هیچ لەو خواستانەش نازانێت... ئەگـەر کەسێك بوایە لەخۆمان لەئەنجامی کارەکە دڵنیا دەبوم، بەڵام لەگەڵ ئەم مناڵە بێگانەیە...

(ئەمـەل) بەهێواشـی وتـی: کـەس دوچـاری مەترسـی نابێـت، هیـچیش دەسـتکەوت نابێـت. بەهەرحاڵ دەڵێن کاری تەواو بوە.

- پیرەژن وتی: هۆکەی ئەوەیە پزیشکانی ولاتەکەی لەو بارەیەوە بێتوانان. ئەمشەو سەعات حەوت لەماڵەکەی من.

لەپشتی یەکێك لە کۆڵەکەکانەوە دیارنەما. پورە (مارتا) لەدورەوە چاودێری گفتوگۆکانی ئەو دوانەی کردبوو. (ئەمەل) مەبەستی نەبوو هیچی لەلا بدرکێنێت، تەنها داوای لێکرد متمانەی پێبکات. وتی سەردارنی چارەسەرکرنی تایبەتی میسری دەکات، کە لەگەڕەکێکی هەژارنشینی شار پەرەجوو دەنوێنێت. دیارە ئەو چارەسەرکردنە سەیرو تارادەیەك توندوتیژە، بەڵام چونکە هیچ هۆیەکی دیکە بۆ چارەسەرکردنی (تیۆ) بونی نییە...

- پورە (مارتا) ئاهێکی هەڵکێشا: تێگەیشتم. لەڕاستیدا من دژی ئەو جۆرە چارەسەرکردنانە نیم. لەوباوەڕەدام ئەم پەیامانە هەتوانن؟

- (ئەمەل) لەوەڵامدانەوەی خۆیدزییەوە.

- پورە (مارتا) بەردەوامبوو: هەرچۆنێك بێت هیوادارم پەرێشان حاڵم نەکەیت، چونکە ئەگەر سیحرو جادو...

- خاتونی میسری قسەکەی پێبڕیو گوتی: بێدەنگ بە واهات.

## (ئیزیس، ئامون، ئاتون)

(تیۆ) هاواریکرد: تەواوم کرد. ئەمە دەقی پەیامەکەیە بەزمانی فەرەنسی **(من بەبەرزی حەوت گرد فڕیم)**، بەڵام.. بەڵام هیچ لەمە تێناگەم.

- ئارکیۆلۆژیست وتی: سەیرکە کوڕی لاو، حەوت گرد، شتێکی دژوار نییە. حەوت گرد بریتییە لە ....

- پورە (مارتا) هۆشیاری کردەوە: دەتوانیت تەواوی نەکەیت. دەبێت (تیۆ) مەتەڵەکە بدۆزێتەوە... بەو مەرجەی سەرنجی تەواو لەچۆنیەتی بەدەستهێنانی پەیامەکە بدات.

- (تیۆ) بەبیرکردنەوەدا ڕۆچوو: لەژێر پەیکەری زیندەوەرێکدا... پەیکەرێکی بچوك ...! لەوێ دامنا!

کاتێك بەرەو سەکۆی ئەستونگەکە رایدەکردو هاواری لێهەستا (ئەمە ئیزیسە!). (لەڕاستیدا پەیکەری بچوکی ئیزیس لەگڵی چینی شین دروستکرابوو، لەبارێکدا کلاوێکی سێ پەڕی لەسەر بوو، (هوروس)ی بچوکی لە ئامێز گرتبوو؛ خەندەیەکی نهێنی ئامێزی لەسەر لێوان بوو). (تیۆ)

پێشکەوتنی بەدەستنەهێنابوو. خواوەندە تایبەتەکانی میسری لەکام شار حەوت گرد فڕیبوو؟ رازێکی گەورە!. (تیۆ) لەکاتیکدا چنگی لەلکی داوێنی ئارکیۆلۆژیستەکە گیرکردبوو گوتی:

- تکایە یارمەتیم بدە.

- بەڕێز (لاپلاس) بەسوربونەوە وتی: بەلاّم من مافی ئەوەم نییە!. ئەوەی دەتوانم بیلێم ئەوەیە کە (ئیزیس) لەو شارەدا، کە تۆ وێلی بەدوایدا، ئاینی تایبەت بەخۆی هەبوە. خاڵێکی گرنگی دیکەش ئەوەیە لەو چەرخەدا خواوەندە تایبەتەکان دەسەلاّتیان بەسەر تەواوی ئەوروپادا شکاوە.

- (تیۆ) وتی: ئایا بەڕێکەوت لەناو جانتاکانی (کیلۆباترا)دا بۆ گەشتی ئەوروپا نەچوە؟

- ئارکیۆلۆژیست بەسەخلەتییەوە وتی: باشە، هەڵە نییە، بەلاّم ...

- (تیۆ) بەدڵنیاییەوە وتی: کەواتە شاری (رۆما)یە. (کیلۆباترا) دوای (سیزار)ی دەستگیرانی کەوت چوو بۆ (رۆما). هەرچەندە پێشتر لەگەڵ (سیزار)دا (سیزاریۆن)ی منالەکەی خۆی لەسەر کۆش بوو. ئەمە بەدڵنیاییەوە دەزانم.

(تیۆ) بەدڵنیاییەوە مەتەڵەکەی دۆزیبۆوە، بەڵێ. (لاپلاس) پاشئەوەی دەستخۆشی لێکرد، کەوتە باسکردنێکی دورودرێژی شایستەیی خواکانی میسرو گوتی: نابێت ئەو سەرچاوەیە فەرامۆش بکرێت، کە خێزانەکەی (ئیزیریس) لەگەڵ (ئیزیس)و (هوروس)ی کوڕیان لەسەردەمێکی دواییدا دۆزراونەتەوە، لەکاتێکدا (ئامون)ی خوای گەورە خاوەنی پەرستگای (کرنك) زۆر کۆنترو زۆر لە (ئیزیریس) گرنگتربوە؛ هەروەها کاتێك (ئامینۆفیس)ی فیرعەون، کە چوارەم فیرعەونە بەو ناوەوە، بڕیاریدا لەجیاتی (ئامون)ی کۆن خوای تاکی (خۆر) بپەرستێت (میسر) دوچاری کودەتایەکی راستەقینە بوو.

(ئەمەل) وتی: دەست لەیەخەی بکەرەوە... خەریکە شەکەتی دەکەیت.

(تیۆ) بەنارەزاییەوە وتی: من؟ نەخێر، دەمەوێت هەموو شتێك دەربارەی (ئامنۆفیس)ی چوارەم بزانم!.

لەڕاستیدا ئەو فیرعەونە زیاتر بەناوی (ئەخناتون) ناسراوە. (تیۆ) بەشێوەیەکی لێڵ هاتەوە یادی: ئەخناتون مێردی نەفرتیتی، فیرعەونێك بوو روخسار درێژکۆلەو ورگ زلو دەستەکانی درێژ. لەسەر نەخشە هەلکۆلڕاوەکانی سەر کۆڵەکەکان کچانی ناسكو جوانو بالاّبەرزی وەك (فاتۆ) دەبینران.

- پیرەپیاوەکە وتی: بەڵێ، ئەم شێوە تەلارسازییە بە (ئامارنین) ناودەبرێت، چونکە (ئەخناتون) بڕیاریدا پایتەختێکی نوێ دور لەئێرەو لە(تەل ئەل ئەمارنە) دروست بکات. ئەو

هونەرە بەیەکەمین نمونەی (ریالیستی) دانراوە. مەبەستی بوو بچوکترین کەموکوڕی نەبێت. هەڵبەتە کەموکوڕی هونەریو زۆر نهێنی ئامێز. خوای خۆر بە (ئاتون) ناوبراوە.

- پورە (مارتا)، کە هەمیشە لەهەموو دیزەیەکدا ئەسکوێ بوو، چوە ناو باسەکەوەو وتی: بەتایبەتی ئەخناتون زۆر لەپێش (عیبری)و کریستیانەکانەوە داهێنەرو دامەزرێنەری سیستمی (تاك خودایی- Monotheisme)یە. هەرئەو بوو بەیەك پیاکێشان هەموو خواوەندە تایبەتەکانی بۆ بەرژەوەندی خواوەندی خۆر دەرپەڕاند، کە سەرچاوەی هەموو شتێکە.

- دێرینەناسی پیر بەنەرمییەوە وتی: بەڵێ، بەڵام خۆر پێشئەوەش شوێنێکی گەورەی لەناو میتیۆلۆجیای میسردا هەبوو. داهێنانی جیهانی پێوەبەسترابوو، چونکە خۆر، کە بەپێی بڕوای میسرییەکان لەناوکێکەوە لەدایکبوەو پاش دڕینی توێکڵەکەی هاتۆتە دەرەوە بەسوار ئەرەبانەی خودی خۆر لە (مینورد) دیارنەماوە. ئەمە پاش دوو شەو بوو، کەخەڵك بەنزاو پارانەوە خۆیان جارێکی دیکە داوایان کردۆتەوە. (ئامون)ی خوای (کرنك)یش سیمای خۆری هەیە.

- (تیۆ) رەخنەی گرت: لەوبارەدا پرسی شۆڕش لەکوێدایە؟

- لاپلاس وتی: پرسیارێکی باشە. بابەتەکە ئەوەیە ناوی (ئاتون) ڕوخسارێکەو خاوەن پەیکەری مرۆڤ نییە: (ئاتون)، (ئەستێرە — خۆر)[1]ێکە، کە لەسەرشێوەی سینییەکی خڕ. سەپاندنی پەرستنی وێنەیەکی هێندە جیاواز لەگەڵ سیمایەکی مرۆڤانە بەشێوەیەکی نهێنیو بەریەککەوتنی لەگەڵ میسرییەکان وەك کارێکی زۆردارانەو زاڵمانە دەرکەوت... لەبەرئەوە جەختدەکەمەوە کە بۆ رەشۆکییەکەی (ئەخناتون) ئەم پەرستنە وەك شۆڕشێك دادەنرا.

- باشە، ئەگەر ئەمکارە شۆڕشێك بوو، دەبێت بگەینە ئەو ئەنجامەی لەمیسر دادپەروەری نەبوە؟ ئەگینا هۆی چییەوە ئەخناتون گەیشتبۆ ئەو بیروباوەڕە؟

- ئارکیۆلۆژیست تاڕادەیەك پرسەکەی پەسەند کردو گوتی: لەوانەیە وابێت. ئەوە راستە کاهینەکانی پەرستگای ئامون بەشێوەیەکی نائاسایی دەوڵەمەند ببونو ناتوانرێت نکوڵی لەوەش بکرێت، کە ئەگەر هەیە خەڵکێکی زۆری میسریشیان چەوساندبێتەوە. هەرچەندە ئەو زاراوەیەش بۆ ئەم تافە سەیر دێتە بەرچاو ، ئەوە پەسەند دەکەم. بەپێچەوانەشەوە کوڕی لاو، ئەوەش راست نییە، کە (ئەخناتون) سیستمی (تاك خواوەندی) داهێناوە، چونکە ئەو سیستمە

---

[1]. ئاتون: گریمانەیەکی مێژویی هەیە، کە(نەفەرتیتی) هاوسەری(ئەخناتون) شاژنێکی (میتانی) بوەو بەدیاری پێشکەشی کراوە، وەك هێمایەکی ئاشتی نیچوان میسی و میتانیەکان. ئەوەشی ئاشکرایە دەرباری میتانیەکان (خۆر)یان پەرستوە، لەبەرئەوە شاژنە( نەفرتیتی) کاریگەری لەسەر (ئەخناتون) هەبوە تا ئاینی دێرینەی میسری بگۆڕێت و شۆڕشێك بەرپا بکات لەسیستمی تاك خواوەندا. هەروەها ئەو گەلە دێرینەیە ئاگریشیان لەلا پیرۆز بوە. چەندین هۆنراوەو شیعری هەلبەستراوی نەفرتیتی و ئەخناتونی مەعشوقەی هەیە، کەبەناوی میسریەکانەوە بڵاوبۆتەوە.

هەرگیز لەویژدانو ئەندێشەی میسرییەکان دورنەبوە. نەخێر، نقارەکەی ئەخناتون، بریتی نەبوو لەپەرستنی شتێکی ئەبستکراتیو روت، کە پاشان شتی زۆر بۆ زیادکراوە.

- پورە (مارتا) وتی: لەگەڵ ئەوەشدا (ئەخناتون) شۆڕشگێڕێکی خاوەن بەهرە بوو!. دابڕانێکی تەواو ریشەیی بوو لەگەڵ سەردەم و سیستمی کۆنو بەسەرچوو؛ سەقامگیرکردنی هونەرێکی نوێی تازەش قەرزاری ئەوە... ئەگینا بۆچی دوای مەرگی کردیانە کافر؟ (ئەخناتون) پاش روخانی لەلایەن کاهینەکانەوە نەفرەتی لێکرا، ئاینەکەی قەدەغەکراو پایتەختەکەی وێرانکرا.

- بەڕێز (لاپلاس) راستێتی ئەو قسانەی سەلماند: ئەوە راستە. بێچەندوچون تاکە فیرعەونێکە رۆحی دوچاری ئازارو ئەشکەنجەی دۆزەخ بووو. لەنێو خۆشمان دەرنەچێت شایانی ئەومبوو ئەوەی بەسەر بێت.

- پورە (مارتا) تاڕادەیەك تورەبوو: دیارە تۆ نەیاری ئەویت؟ چی لەتۆ کردوە؟

- ئارکیۆلۆژیست بەتاڵی وەڵامیدایەوە: فیرعەونێکی خراپ بوو. لەسەردەمی ئەودا ئیمپراتۆریەتییەکەی توشی بێسەرو بەرەیی ببوو. دامەزراوەکانی بەڕێوەبردنی دەوڵەت هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو. شڵەژانی هزری نابۆوە، گەندەڵی حوکمڕان بوو!. هەروەها ئەمڕۆ لەسەردەمی ئێمەدا ئەخناتون زۆر هەڵکێشراوەو تاجی شانازی لەسەر دەنرێ، بەگوڵاو بۆنداری دەکەنو لەوبەندوداوەشدا شکۆو گەورەییو خاکیانەی ئاینی رۆژانە فەرامۆش دەکەن. شۆڕگێڕێك: لەمیسری کۆندا! تکا دەکەم کەمێك..

پورە (مارتا)، کە خراپ تورەبوو، ئەوەی هێنایەوە یاد کەداهێنەری زانستی سایکۆلۆژی (پسیکانالیز) واتا (سیگمۆند فرۆید) خودی خۆی لەسەردەمی بیستدا گریمانەیەکی سەرنجڕاکێشی پێشنیازکرد، کە پەیوەستە بە ئەخناتونی فیرعەون، دەستوپێوەندەکانی و (موسا)وە. بەڵێ، هەمان ئەو پەیامبەرە مەزنە (موسا)، رزگارکاری جولەکەکان. (فرۆید) دەڵێت بەجولەکەیی لەدایك نەبوە، بەڵکو میسری[1] بوو.

- (تیۆ) وتی: ئاشکرایە، چونکە کچەکەی فیرعەون ئەوی کردبوە منداڵی خۆی...

- پورە (مارتا) درێژەیپێدا: بەڵام فرۆید لەجیاتی ئەوەی موسا لەخێزانێکی هەژارو ئاسایی بپەستێت گەیشتۆتە ئەو دەرئەنجامەی قارەمانی گەلی جولەکە لەڕاستیدا نەك تەنها

[1]. لەراستیدا لەیەك دوو ساڵی کۆتایی تەمەنی خۆیدا (فرۆید) لەبلبەتێکی بەناوبانگدا بەناوی (تاکە خواییو دوو موسا) لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژو تارادەیەك ئاڵۆزی سەبارەت بە بنەچەو ریشەی سیستمی تا خوایی ئەخناتونو موسا نوسیوە، کە هێشتا کاریگەری زۆری ماوە، لەگەڵ ئەوەشدا (فرۆید) خۆی جولەکە بووە.

میسرییە، بەڵکو سەربەخێزانێکی نەجیبزادەی میسریش بوە. پاشان موسا بووبەیەکێك لەگەورەکانی دەرباری ئەخناتون‌و مەبەستی بوو پاش لەناوچونی فیرعەونی کافرو نەفرەت لێکراو ببێتە خاوەنی میراتی رۆحی‌و خودایانەی.

- واتە لەنهێنیدا؟ ئەمە زۆر سەرنجراکێشە. دیارە ناتەوێت بەمن بڵێیت (موسا) بۆ پارێزگاریکردن لەومیراتە جولەکەکانی بەکارهێناوە!. دیارە دەمەوێت ئەوەبڵێم ئەو میسریانەی دیکەی خوای (خۆر)یان نەدەویست ئەوە موسای موریدو شاگردی ئەخناتونە دەچێتە پاڵ جولەکە، چونکە ئەم گەلەش وەك ئەخناتون لەپەرستنی خوای جۆراوجۆری میسری بەسەری زیندەوەرانەوە وەرسببون. (موسا) بوو بەرابەرو فەرماندەی گەلی ئازاردیدەو لەبەرئەوە لەپێناوی خوای تاك‌و تەنهادا خیانەتی لەمیسر کردو بڕیاریدا لەگەڵ ئەو گەلەدا لەمیسر هەڵبێت.

- پیرەپیاوی ئارکیۆلۆژیست بەنارەزاییەوە کاردانەوەی نواندو گوتی: گاڵتەبازارە. هیچ خاڵێکی دروست لەو تیۆرەدا نەبینراوە.

- پورە (مارتا) وتی: پێتدەڵێم لەپاش فرۆید هەروا (دە) ساڵ بەرلەئێستا پیاوێکی ناوداری ئاینی ئیسرائیلیش جەختی لەسەر ئەو بابەتە کردۆتەوە.

پیرە پیاو بەبڵمەبڵم وتی: گەمژەن! ئەمانە خەڵکی میسرناس نین!. ئەمە هەموو پرتەو بۆڵەیەو ئەو قسانەیە ئەخناتون لەگەڵ خۆی هێناویەتی!.

- (ئەمەل)، کە تا ئەوکاتە هیچی نەوتبوو گوتی: هەڵبەتە هەموو ئەوانە نابنە رێگر لەبەردەم ئەوەی ئەخناتون شیعری بەرزی بۆ خواکەی خۆی هۆنیوەتەوە...

لەوێدا پیرەپیاوەکە بێدەنگ بوو. کەس نەیدەتوانی نکوڵی لەبەپێزی‌و جوانی هۆنراوەکانی (ئەخناتون) بکات.

- (تیۆ) لەکاتێکدا وێنەی سیمای ترشاوی ئارکیۆلۆژیستی دەگرت وتی: ئەوەی من دەرکی پێدەکەم ئەوەیە تۆ حەزت بەشۆڕشگێڕان نییە. لەوانەیە هۆکەی ئەوە بێت زۆر پیربویت.

- ئارکیۆلۆژیست بەتوڕەییەوە رایگەیاند: بەتەنها بەجێیان دێڵێت‌و لەگەڵیاندا ناگەڕێتەوە بۆ هۆتێلەکە. کاتێك بەشەقاوی گەورە لێیان دوور دەکەوتەوە پورە (مارتا) هاواریکرد:

- کەی یەکدی دەبینینەوە؟

- وەڵامیدایەوە: بابزانم!

## سەمای (تیۆ)

بۆ پیاسەکردن لەسەر کەناری روباری نیل پاشنیوەڕۆیان تەرخانکرد. (تیۆ) لەبارێکدا لەسەر بەلەمەکە رۆنیشتبوو بەوردی سەرنجی لەدەستی کەشتیوانەکە دەدا، کە سەرقاڵی جێگۆڕکێ کردنبوو بە چارۆکە سپییەکە. نزیکی سەعات پێنج، لەوکاتەدا (خۆری – خواوەند) دەڕۆیشت تا لەژوانگەدا بەڕەشی شەو بگات، گەیشتنەوە هۆتێلەکە. سەعات شەش گەیشتنە شوێن مەبەستە نادیارەکە. لە دەوروبەری (لۆکسۆر) لەبەرامبەر چادرێکی گەورەدا راوەستان، کە بازنەی سپی گەورەو سێگۆشەی سوری تۆخ بە سوژن لەسەری درابوو. ژنێکی نهێنی ئامێزی سەوزپۆش، کەخۆی لەعەبایەکی گەورەوە ئالاندبوو، چاوەڕێی میوانەکانی دەکرد.

- لەبارێکدا دەستی لەسەرناوچەوانی دانابوو گوتی: سلاو. بەخێربێیت کوڕەکەم، ئەم پێشوازییە لەپێناوی تۆدایە.

- (تیۆ) وتی: جوانە. ئایا میوزیکیش هەیە؟

- وەڵامیدایەوە: زۆر زۆر، هەروەها سەماش. تۆش، خودی خۆت، سەما دەکەیت. دەستگیرانی بچوك...

- (تیۆ) نارەزایی دەربڕی: بەڵام من کچ نیم!

- شێخە لەبارێکدا پەلکێشی ژورەوەی دەکرد وتی: کچ‌و کوڕ جیاوازی نییە. تۆ نەخۆشیت، تۆ ناولێنراویت. بۆ سەماکردنی ئێمە ئەوە ناچارییە.

- (تیۆ) لەبەرخۆیەوە وتی: کەواتە دەبێت هەر ئێستا فێرببم. من سەماکەرێکی باش نیم.

لەناو چادرەکەدا نزیکەی (دە) پیاو، کە لەسەر باليف پاڵیان دابۆوەو سەرقاڵی نێرگەلەکێشان بون، لەگەڵ گروپێکی ژنان دەبینران، کە لەدەوروبەری وەجاخێك گردببونەوەو پێستەی تەپڵ‌و دەفەکانیان گەرم دەکردەوە . ئەو پیرەژنەی (ئەمەل)، بەشێخەی ناودەبرد فەرمانی دەرکرد پێلاوی میوانەکان ببەنە دەرەوە تا بتوانن دابنیشن. کاتێك دەنگی تەپڵ‌و دەف بەرزبۆوە شێخە پەلی (تیۆ)ی گرت‌و لەناوەڕاستی چادرەکەدا رۆینیشاندو بەگوێیدا چرپاندی:

- بهێڵە ئەوەی پێویستە ئەنجام بدرێت، هەرگیز نەترسیت.

(تیۆ)، کە زۆر حەزی بەوەدەکرد بزانێت چیدەبێت، بینی پیرێژنەکە جامێك گڵی ئاگراوی بەدەست گرت‌و بەدەم نزاوە چەند دەنکێك بخوردی تێهاویشت، فنجانێکی رشتە ژێر پێی (تیۆ)و دەستەکانی سوڕاندەوە. گەرمییەکی خۆش‌و بۆنخۆش سەراپای تەنی. ژنێکی نەخۆش بەزەحمەت هەستاو بەسوڕانەوەیەکی گونجاوەوە بەدەوریدا دەستیکرد بەسەما. (تیۆ)

بەزەحمەتێکی زۆر دەیتوانی چاوەکانی بەکراوەیی بهێڵێتەوەو پێڵوەکانی قورس ببون. لەناکاو سەری ژنەکە دەستیکرد بەکەوتن بۆ پێشەوەو بۆ دواوەو شێخە شاڵێکی درێژو پاکی کێشا بەسەریدا. پاش کەمێك لەنێو سەرسوڕمانی (تیۆ)دا سەماکەر بەچاوی کراوەو سورهەڵگەڕاوەوە کەوتە سەرزەوی.

- (تیۆ) هاواریکرد: چی بەسەرهات؟

- شێخە بەهێواشی وتی: شش‌ش.. ئیدی نەخۆش نییە. بڕوانە پێدەکەنێت، کوڕە مامەکانی لەژێر خاکەوە بۆ سەردانی هاتون تا شفای بدەن. ئێستا نۆرەی تۆیە کوڕم. تۆش کوڕە مامەکانت ببینەوە! سەما بکە!

(تیۆ) بەترسەوە تاتوانی کەوتە جوڵە. دەستە بەئەزمونەکانی شێخە، کە شانەکانی ئەوی دەجوڵاند تا شەپۆل بدات، ڕێنوێنی دەکرد. پاشان شەکەت و ماندوو بێجوڵە کەوت.

- شێخە وتی: ئامۆزاکانی نایانەوێت لەژێرخاکەوە بێن! قاچەکانی پێویستیان بەخوێنە، کەڵەشێر بێنن!

باڵندەی تۆقیو باڵەکانی لەیەك دەدا. (تیۆ) خۆبەخۆ بۆ دواوە کشایەوە، بەڵام شێخە توند گرتی. کاتێك بەتەمەنترین بەتەمەنەکانی کۆمەڵەکە چەقۆی هێنا بەملی باڵندەکەدا (تیۆ) چاوەکانی لێکنا.... دەستێك شلەیەکی تەڕو گەرمو لینجی بەسەر ناوچاوان، دەست و بن پێکانیدا ڕشت.

- (تیۆ) بەترسەوە وتی: (خوێنی کەڵەشێرە!). لەپڕ هەستیکرد پانتاییەکی بەتاڵ قوتی دەدات و کەوت.

- پورە (مارتا) زریکەیەکی کرد: بێهۆش کەوت! بەسە ئیدی!

ئەمەل لەبارێکدا پەلی گرتبوو گوتی: نەخێر! ئەوە پێویستە. ئامۆزا نەبینراوەکانی هاتن. ئارامیبە!

شێخە بەوریاییەکی زۆرەوە (تیۆ)ی لەئامێز گرتبوو، لەسەر بالیفێك رایکێشا تا ئەوپەڕی رادە ڕەنگی پەڕیبوو. بازنەیەکی وەنەوشەیی لەدەوری چاوەکانی ئاڵابوو، لەسەر ناوچاوانی پەڵەی خوێن مابۆوە.

- پورە (مارتا) لەترساندا تۆقیبوو.. بەترسەوە دەیوت: چ شێتییەکە! خەریکن دەیکوژن.

خاتونی میسری گوتی: بەدڵنیاییەوە وانییە.

شێخە بەبێ کەمترین شڵەژان سەرقاڵی شێلانی (تیۆ) بوو، هێشتا بەهۆش نەهاتبۆوە. پاشان بخورد بەژێر لوتییەوەکرا. دەفلێدەرەکان لەدەوروبەری لەتەپڵ و دەفیان دەداو هەرواش وردەوردە دەنگی لێدانەکەیان بەرزدەبۆوە. پورە (مارتا) بەدڵێکی تەنگەوە چاوەڕوانی بەئاگاهاتنەوەی (تیۆ) بوو.

دواجار کە(تیۆ) چاوەکانی کردەوە بینی منداڵێکی هاوتەمەنی خۆی بەشیاوییەوە بەناو چادرەکەدا هاتوچۆ دەکاتو داوێنی قورسی وەك گۆیەکی گەورەی خۆری ژێر هەورەکان دەدرەوشێتەوە (تیۆ)؛ خەندە گرتیو هەستایە سەرپێ.

- شێخە لەبارێکدا یاریدەی دەدا هەستێتە سەرپێ وتی: حەزدەکەیت بچیت سەمای لەگەڵدا بکەیت؟

ئەمجارە (تیۆ) بەخێرایی سەمای دەکرد. لەکاتێکدا باڵەکانی کردبۆوە بەگۆنەی وەك گوڵەوە، بەلەش سوکییەکی زۆرەوە سوڕیدەخواردو دەسوڕایەوە؛ بەچاوانی نیوە داخراو، بەڕوخسارێکی شادو کراوەو هەمیشە خەندەدارەوە. باوەڕ نەدەکرا بەو لەشسوکیو شادمانییەوە هەرگیز نەخۆش ببێت. لەهەموو سوڕانێکدا پورە مارتا دڵی دادەکەوتو دەلەرزیو سەرسوڕماو بوو، کە (تیۆ) ئەو وزە نوێیەی لەکوێ هێناوە؟.

لەناکاو مۆزیکەکە وەستا. (تیۆ) بەدەستی ئاوێزانو کەمێك سەرمەستییەوە راوەستا؛ لەبارێکدا چاوەکانی هەڵدەگلۆفت وتی:

- هیچم بەسەر هاتوە؟ خەریکبوو سەمام دەکرد؟ بەراستی سەمام دەکرد؟

- شێخە وتی: کوڕەکەم.. زۆرباشە. ئێستا بچۆ سوپاسی دەفلێدەرەکان بکە... بڕۆ!

سینی پڕ لەپیاڵەی چا دەستاودەستی دەکرد. (تیۆ) کە لەناو دەفلێدەرەکاندا ئامێری مۆزیکەکانی هەڵدەسەنگاند، پێدەچوو بەتەواوی نەخۆشییەکەی تەولا بوو بێت.

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: رەنگی بەخۆی هێناوەتەوە.

- شێخە وتی: ئامۆزاکانی لەژێرخاکەوە هاتون، ئەوەی دەمێنێ لەدەستی (الله)دایە.

- پورە (مارتا) وتی: ئێستا چارەسەرکراوە؟

- شێخە وتی: لەگەڵ ئەوەی ئێوەی بیانی باوەڕتان بەهێزە دەرەکییەکان نییە، بەلام لەوانەیە منداڵەکە ڕێگای خۆی دۆزیبێتەوە. ئێمە هەموو هەوڵێکمان بۆداوە.

- (ئەمەل)، کە پارەی لەجانتا دەستییەکەی دەردەهێنا، وتی: شێخە.. ئەمە بۆ دەستەی مۆزیکەکان؛ سوپاسی خێرخوازی تۆ دەکەم، هەرگیز ئەوە فەرامۆش ناکەم.

کاتێك هەرسێ کەسەکە بەئوتومبیلەکە ڕۆیشتن. (تیۆ) بەهەزاران پرسیار دەستیپێکرد. ئەو سورانەوەیە سودی چییە؟ بۆچی لەپڕ لەهۆش خۆی چوو؟ بۆچی شێخە پێیدەگوت (دەستگیران)، کەچی ئەم کوڕێکی لاوە؟

- (ئەمەل) وتی: لەسەرخۆ! هەرپرسیارە لەجێگای خۆیو یەکەیەکە. تۆ لەناو سروت و پێشوازیکردنێکدا بویت بە(زار)ناودەبرێت. ئەمە سروت و دەستورێکی زۆر کۆنە، کەئامانج لێی خاوێن کردنەوەی جەستەیە لە هۆکارە خراپەکان یان لەجنەکان.

- (تیۆ) وتی: کەواتە هەلگری هۆکارێکی خراپم .

- (ئەمەل) بەوریاییەوە وتی: بەڵی ئەگەر بونی ئەو هۆکارە خراپانە پەسەند بکەین ئەوا دەتوانین جۆری چارەسەرێکی دیکەش پەسەند بکەین.

- (تیۆ) وتی: دروستە؛ کەواتە ئەو خاتونە پزیشکی من بوو لەجۆرێکی دیکە.

- (ئەمەل) ڕونیکردەوە، کە سروت و ڕێوڕەسمی (زار) لەقوڵایی گەردەلولەوە دێت؛ بێگومان لەمیسریانی کۆن و ئەسیوبیا یاخود لە ئەفریقای ڕەشەوە... پاشان سروتی (زار) چۆتە ناو سروتی موسڵمانەکانیشەوە، هەرچەندە پەسەندیان نەکرد، بەڵام چونکە چارەسەری نەخۆشی پێدەکرا چاوپۆشیان لێکردو نادیدەگیرا. ئەم سروتە لەگەڕەکە هەژارنشینەکانی (میس)دا سازدەکرا، چونکە لاوە بێکارەکانی ئەو گەڕەکە لەو سەردەمەدا دوچاری جۆرەها نەخۆشی دەبون‌و پارەی تەواویان نەبوو بۆ سەردانی پزیشك.

(تیۆ) وتی: ترسناکە! ئەی سەماکە؟

- (ئەمەل) درێژەی پێدا: سوڕانەوە سودی بۆ گێژبون‌و لادانی هزری بەکاردێت؛ بەجۆرێك کە جەستەی بەبێئەوەی ئاگاداربێت مۆڵەت دەدات هۆکاری خراپەکە بچێتە دەرەوە. بێهۆشبون کارێکی بەزۆرە، چونکە جەستە ڕێگا لەسەماکردن دەگرێت. سەما فەرمان بەسەر هەموو شتێکدا دەردەکات.

- (تیۆ) وتی: لەلایەکەوە ئەم کارە لەخەڵوەتکێشان باشترە، لەوانەشە خوێنی کەڵەشێریش لەخۆیدا هەتوانێك بێت چارەسەرکردن بێت؟

- نەخێر، چونکە نایخۆنەوە. قوربانیدان بەکەڵەشێر میراتی ئاینێکی زۆر کۆنە، کە وێنەی ئەو شێوەیە لە زۆر شوێنی جیهاندا دەبینرێت‌و نەخۆشەکانیش بەچاوپۆشیکردن لەڕەگەزی نێر یان مێیان سیفەی دەستگیران - بەواتا مێینەکەی – پێدەدرێت، چونکە ئەو سروتە لەلایەن ژنانەوە جێبەجێ دەکرێت.

- (تیۆ) وتی: راستە، بەلام موزیك لێدەرەكان هەموو نێرینەن.

- بێگومـان، بـەلام شـێخە ژن بـوو، هـەر ئـەویش بـوو چـاودێری و ڕێنـوێنی دەكـرد. وشـەی (زار)یش هەم بەواتای (دیدار) دێت و هەم بەواتای (رۆح)و (سروت).

- (تیۆ) بەكورتی وتی: دیدار، بەڵێ، من بینیم!

سەیرەكە لەوەدایە (تیۆ) بچوكترین پرسیاری دەربارەی ئامۆزاكانی جیهانی ژێرخـاكی خـۆی نەهێنایە پێشەوە.

- پورە (مارتا) وتی: تیۆ.. راستییەكەیمان پێبڵێ هەستت بەچیكرد؟

- وەلامیدایـەو: تـرس! كاتێـك بـاڵو پـەڕەكانی كەڵەشـێرەكە پەرپـەڕ كرابـوو... لەوسـاتەدا بەڕاسـتی تـۆقیم، بـەلام لەدوایـدا هـەموو شـتێك وەك لانكەیـەك بـوو، زۆر گونجـاو و شـیرین.... تارادەی نائاسایی خۆشبوو.

- (ئەمەل) بەدەربڕینێكی ناسكەوە وتی: ئەی ئامۆزا چی بوو؟

- یەك كەس بوو، بەلام وەك ئەوەی ئەو كەسـە خـودی خـۆم بێـت. دڵێـك رێـك لەتەنیـشتمدا لێیدەدا، چەنـد سەیر بوو... دەتگوت جمكین.

پورە (مارتا) لەجێگاكەی خۆی دەرپەڕی. (تیۆ) هیـچی دەربـارەی هەلومـەرجی لـەدایكبونی و بونی جمكی نەدەزانی، كە بەمردویی لەدایك ببـوو. نیگـەرانبوو لـەوەی نـەوەكو (ئەمـەل) زیـاد لەڕادە پرسیار بكات... بەرێكەوت خاتونی میسری هەمان پرسیاری كرد:

- (تیۆ) ئایا تۆ جمكت هەیە؟

- پورە (مارتا) قسەكەی پێبڕی و بەتوڕەییەوە وتی: (ئەمـەل) بەسـە، زۆر مـەڵێ. دەبێـت ئـەو خوێنە وشكبۆوە پاك بكەینەوە. (تیۆ) هەموو شوێنێكت خوێنە.

لە هۆتێل پەیامێكیان بۆ نێررابوو. بەڵێ (لاپلاس) هاتبوو، ئامادە بوو بـۆ بینـینی (رونـاكیو خـۆر) لەگەڵیانـدا بـچێت، بـەلام چـونكە نەگەڕابونـەوە رۆیـشتبوو. (تیـۆ) بـیری كردبـۆوە، كـە لـەریزی ئـەو نمایـشانەی لـە جـۆری رونـاكیو دەنگـن، سـروتی (زار)یـش لـە سـنوری پەرسـتگای درەخشانی (كەرنك) بەهای هەیە.

## چەپکە گوڵی بەڕێز (لاپلاس)

ڕۆژی دواتر پورە (مارتا)و (تیۆ) لەسەر کەشتی (توت ئنخ ئامون) دانیشتن تا گەشتی پێنج ڕۆژمیان لە (لۆکسۆر)ەوە بۆ (ئەسوان) ئەنجام بدەنو لەو سەریشەوە بۆ پایتەخت بە فڕۆکە بگەڕێنەوە. (تیۆ) باش پشوی دابوو. (ئەمەل) بۆ قاهیرە چوو، کە خوێندکارەکانی چاوەڕوانی بون.

تا یەك هەفتەی دیکە ئینجا پورە (مارتا)و (تیۆ) بۆ لای (ئەمەل) دەگەڕانەوە. بەدڵنیاییەوە بەڕێز (لاپلاس)یش کاتی لەیاد کردبوو؛ (تیۆ)ش تا دواسات چاوەڕوانی ئەوی دەکرد. سەرەنجام وتی:

- بەداخەوە. (ئەمەل) لەلایەن منەوە خواحافیزی لێبکەو بڵێ دەربارەی تەمەنی بەڕاستم نەبوو... هێندە پیر نییە!

(ئەمەل) چاودێری گەیشتنیانی بەکەشتییەکە دەکرد. پورە (مارتا) بەکڵاوێکی (تبت)ی و (تیۆ) بەو کڵاوەوەی نزیك هەرەمەکان کڕیبوی. کەس نەیدەزانی ئەو سروتەی (ئەمەل) سازی کردو ئەنجامی دەبێت یان نا، بەڵام ئاشکرابوو ئەو سروتە هیچ کاریگەرییەکی خراپی لەسەر (تیۆ) بەجێنەهێشتبوو. کەشتییەکە خەریکی جوڵان بوو، لەناکاو بەڕێز (لاپلاس) بەباوەشێك گوڵەوە دەرکەوت، کە لەبازاڕ کڕیبوی.

- بەسەرسوڕمانەوە وتی: ڕۆشتن؟ دواکەوتم؟

- (ئەمەل) وتی: یەك سەعاتی تەواو. (مارتا)ی هاوڕێم زۆر سڵاوی لێدەکردیت.

- دێرینەناسی پیر بەپەلە وتی: ئەی مناڵە لاوەکە چی؟

- (تیۆ)؟ ماچت دەکات و دەیوت بەگشتی هێندە بەتەمەن نییە.

- پیرە پیاوەکە بەکاریگەرییەوە وتی: مناڵێکی ڕوخۆشە، هۆشمەندییەکی نائاساییی! دڵنیام دەبێتە میسری ناسێکی چاك...

- (ئەمەل) ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: (ئینشائەڵا)

- پیرەپیاو بەدەستەپاچەییەوە وتی: ئێستا دەبێت چی لەم چەپکە گوڵە بێسودە بکەم. دەمویست بەبۆنەی چەژنی ساڵی نوێوە پێشکەشی بکەم... ئاها! هاوڕێی ئازیزم بۆ تۆ. بەجوڵەیەکی نەفامانە چەپکە گوڵەکەی هاویشتە باوەشی خاتونی میسری.

## بەشی حەوت

## (حەوت تەپە، بەردێك)

### تیمساحو باڵندەكان

كاتێك لەگەڕانی روباری (نیل) گەڕانەوە، (ئەمەل) بەجلێكی جوانی شینو رەشەوە لەسەر سەكۆی هێڵی ئاسنەكە چاوەڕوانیان بوو.

- (تیۆ) بەگەرمییەكی زۆرەوە خۆی بەملیدا هەڵواسی.

- (ئەمەل) وتی: هەتاوبردە بویت!.

- (تیۆ) وتی: نەك وەك پورێ. گەرماوی هەتاوی كردوە، دوجار هەتاوبردە بوە.

- پورە (مارتا) وتی: بێدەنگ بە، زۆرزان. بۆ تۆ باشە، بەڵام بۆ پێستی ژنان زۆر زیانبەخشە. هەرچۆنێك بێت لەو باوەڕەدام (تیۆ) لەو گەشتە رازییە؟

- (تیۆ) هاواریكرد: بەڵێ، هەڵبەتە وایە. بەتایبەتی جەژنی ساڵی نوێی سەركەشتییەكە، زۆر گەورەو شكۆداربوو. لەناو ئەو ئۆتۆمبیلەی لەوێستگەوە بۆ گەڕەكی (بەرزیل)ی دەگواستنەوە (تیۆ) دەربارەی ئەوانەی بینیبونی دەدوا. بەبڕوای ئەو جوانترین پەرستگا ئەوەی (كۆم ئۆمبۆ) بوو، چونكە كونێكی تێدایە پڕە لە (تیمساح)ی پیرۆزی مۆمیاكراو. چەندخۆش بوو ئەگەر یەكێك لەو خوا ئازیزانەت ببینیایە؟. پەیكەرێك بەسەری شێرەوە، كە دەستەكانی زۆر بەئەدەبو ئارامەوە لەسەر چۆكی داناوە. لەوەڵامی پرسیارێكی (ئەمەل) دەربارەی فیرعەونەكانی (ئەبو سیمبل)، (تیۆ) بەهاكەزایی وتی: (زۆر گەورەن). كاتێك پرسی كامیانی پێباشترە، بێدودڵی وتی:

- كەنارەكانی نیل، ژنان لەكێڵگەكاندا وەك ئەو شازدە خانمە دەچون، كە (موسا)ی لە روبارەكەدا گرتەوە. ئینجا ئەو باڵندە سپیانەی لەناو دەوەنی (پاپیرۆس)دا لانەیان كردبوو، پێنەدەچوو لەقلەق بن، بەڵام جیاوازیان نییە، هەمان رەنگو رویان هەیە، ئینجا.... (ئەمەل) زۆر لەوەڵامەكانی (تیۆ) رازیبوو، چونكە بەچاوپۆشیكردن لە (تیمساح)ەكان، ئەدەربارەی

مۆمیاکان قسەی دەکردو نەکەشتی خۆر. کاتێ گەیشتنەوە ماڵ (تیۆ) راستەوخۆ چوە ژورەکەی تاتەلەفۆن بۆ (فاتۆ) بکات.

- (ئەمەل) وتی: دەتبینم تەندروستیت باشترە، پەلەمە هەرچی زوترە ئەنجامی شیکاری داهاتوو ببینم!

- پورە (مارتا) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا: ئەفسوس. بەڕەواڵەت باشترە، بەلاّم لە کەشتییەکەدا دوچاری سەغڵەتی هات.

- لەبەر خۆردا؟ لەسەر روی کەشتییەکە؟

- ئەمجارە هەتاو بردەبوە! خۆر چەقیوەتە سەر روبارەکە. ئەو روداوانە زۆر ئاساییە.

- پورە (مارتا): خوا لەدەمت وەرگرێت.

## میسر لەگەمەی ڤیدیۆدا

حاڵی (فاتۆ) باشبوو. لەتەلەفۆنەکەدا بە (تیۆ)ی راگەیاند حاڵی دایكو باوكو خێزانەکەی باشن و وەك ئەوەیە هیچ روینەدابێت. (تیۆ) تاڕادەیەك هەستی بەفەرامۆشکردنی خۆی دەکرد. ئایا مەبەستیانە نیگەرانیان نەبم یان ئیدی مایەی گرنگی پێدانیان نیم؟ لەبارێکدا ئێستا دیارە نەخۆشە! ئەی ئەگەر رۆژێك چاك ببێتەوە وەك رابردوو گرنگی پێدەدەن، ئەگەر چاك نەبێتەوە چی؟. ئەگەر ئامۆزاکەی ناو دونیای ژێرخاك، کە هەستی بەئامادەیی نەبینراوی کردبوو، دەستی لەم بەردا چی؟ ئەگەر هەر لەگەڵ بەجێهێشتنی میسر بزر ببێت؟. رۆم شارێکی جوانە، بەلاّم لە دڵی زستاندا ئەو شوێنە سارد دەبێت... دیارە پورە (مارتا) لەو بارەیەوە بیرێکی تایبەتی هەبوو، بەلاّم لای باشبوو لەمیسر بمێنێتەوە.

لەپەڕاویچکەی یادشتەکانیدا میسر جێگایەکی ئاسانو باش بوو. تەنانەت دەیتوانی وێنەکانی میسریش لەوێدا بکێشێتەوە. (تیۆ) (دە) دانە شێوەی جۆراوجۆری سەری ئاژەڵانی کێشابوو. (هوروس- سیسارکە کەچەڵە، شێر- سخمت، گوربە- بەستت، چەقەڵ- ئانوبیس، تیمساح - کرۆکەدایل، لەقلەق - تت). لەسەرو ئەم خواوەندە ئاژەڵییانەوە (ئیزیسو ئازیریس)ی لەسەر شێوەی دایكو باوکی خۆی کێشابۆوە. لەبەرزترین شوێنی لاپەڕەکەدا بازنەیەکی تیشکدەری دروستکرد، ئەمە خوای تاكو تەنیای (ئەخناتون) بوو. هێندە بەسبوو لەسەر روی خۆردکە

ئەستێرەیەکی (داود) زیادبکات تا خولەکە تەواو بێت. وێنەکان جوان بـون. میـسر = ئاژەڵەکان — مرۆڤەکان. ئەخناتون = خوای خۆر، موسا.

ئەوەی مابوو مەرگ بوو. (تیۆ) کەشتییەکی خۆری دروستکرد، بەڵام کاتێك دەیویست وێنەی مۆمیـایی بکێـشێت دەسـتی بەگیروەسـتا. دەنگێـك هاتـە گـوێی: نـا ئـەوە مەکـە، بـرا بـچوکەکەم! (وێنەی مەرگ مەکێشە). (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە روی وەرگێڕا، کەس نەبوو.

## گەردانەیەك لەسەرشێوەی چاو

رۆژی دواتر کاتیماڵئاوایی بوو. (ئەمـەل) کـە ئەشـك لەچوەکانی زابـوو (تیـۆ)ی لەئامێزیـدا دەگوشیو بەردەوام دەیوتەوە، کە لەهەواڵی خۆت بێئاگام مەکە، دەبێـت هەمیـشە تەلـەفۆنم بـۆ بکەیت، دەبێت...

(تیۆ) کەماچی دەکرد وتی: لەگەڵ ئەوەشدا (ئەمەل) نیگەران مەبە، یەکدی دەبینینەوە.

خاتونی میسری، کەجانتا دەستییەکەی ژێرەو ژور دەکرد، وتی: تیۆ، شتێکم بۆ هێناویت.

گەردانەیەك، چاوێك بەسۆمایەکی رەش لەسەر کوژەکەیەکی زۆر شین. (ئەمەل) پێداگریکرد لەگـەردنی (تیـۆ)ی بکـاتو رایـسپارد هـەرگیز لەگـەردنی دانـەڕنێت. ئێـستا (تیـۆ) سـێ زنجـیری لەگەردن کردبوو. دوپشکێکی شێوە مرواری، قورئانێکی بچوکی (فاتۆ)و چاوەکەی (ئەمەل).

- ئەمە تەلیسمێکی خۆشبەختییە، تێدەگەیت، دواجار... واتە! نازانم چۆن رونیبکەمەوە....

- (تیۆ) دوبارەی کردەوە: لەگەڵ ئەوەشدا من، من تێدەگەم.

کاتێك لەکۆنترۆڵ تێپـەڕین بـۆ (ئەمـەل) جگـە لـەو دەسـتەی لـەودیوی شوشـەکەوە ئامـاژەی ماچی بـۆ هەڵدەدا شـتێکی دی نـەمابوو. (تیـۆ) تێگەیـشت، کـە لەهـەر قۆنـاغێکی گەشـتەکەیدا لەکۆمەڵێك هاوڕێ جیادەبێتەوە، کە گریمانەی ئەوە دەکرێت هەرگیز نەیانبینێتەوە.

- (تیـۆ) پرسـی: پـورە مارتـا پـێم بڵـێ ئـەو کەسـەی لـەرۆما لەگـەڵمان دەبێـت مرۆیـەکی سەرنجڕاکێشە؟

- پـورە (مارتـا) وەڵامیدایـەوە: (دۆم لیڤـی) زۆر سەرنجڕاکێـشە، دەیبینیـت. لـە (کـورە — رێکخراوی دەوڵەتی ڤاتیکان) پلەی (کاردینال)ی هەیە.

- کاردینال؟ دوبارە کەشیش؟ دەڵێی هاوبەشی ئەو جۆرە خەڵکانەیت!

پورە (مارتا) بەزمانێکی زبـر وتـی: زۆر مـەڵێو بێـدەنگ بـە! (دۆم لیڤـی) کەسێکی چاکە، زۆرکراوەو مۆدێرنو کوڕی ئەمرۆژەیە...

(تیۆ) لەبەرخۆیەوە وتی: لەخێزانی ئێمەدا چارەی قەشەیان ناوێت، باوکم دەڵێت....

- پورە (مارتا) بەتوندی وتی: باوکت هیچ سەرودەر لەم شتانە ناکات! لەبەرئەوە لەپەروەردەی ئاینیدا لەبەرامبەرت کەموکورت بوە. دەبینیت ئەمڕۆ لەچ بارێکدایت!

بەڕاستیش شاری رۆما لەگەڵ ئەو کاردینالەو کەشە باراناوییەکەی نەیدەتوانی شوێنێکی خۆش بێت بۆ مانەوە. (تیۆ) لە فرۆکەکەدا خیشی کردبوو. پورە (مارتا)ش، کە نغرۆی خوێندنەوەی هەواڵی (نوسانات بورسە)بوو، ئاگای لەو نەمابوو. (تیۆ) بەسەیرکردنی دیمەنەکانی دەرەوەی فرۆکەکەوە خۆی مژۆڵ کردبوو؛ لەنێو گەواڵە هەورەکانەوە چیاکان وەك مشکێکی گەورە دەهاتنە پێش چاوی، لەسەررِوی کەوانەی شەپۆلەکانی دەریاری ناوەڕاست کەشتی بچوك هێڵێکی سپیان لەسەر دەریاکە دەنەخشاند. کاتێك فرۆکەکە لە فرۆکەخانەی (فیومی جینڤا)ی لەرۆما نیشتەوە دەنگێکی وەك هەورە بروسکەی لێ بڵندبوو. دەنگی چەپڵەلێدانی میسرییەکان بوو، کە نیگەرانی سەفەربون بە(کەشتی ئاسمانی).

## کاردینالو کافران

(دۆم ئۆتاڤیۆ لیڤی) باڵا کورتو خرپن بەپەرۆشییەکی تەواوەوە پێشوازی لەدوو میوانەکەی کرد. دەستی لە ملی پورە (مارتا) کردو هەردوو گۆنای (تیۆ)ی ماچکرد، بەبێئەوەی چاوەڕێی وەڵام بێت، دەیان پرسیاری کردو رونیکردەوە، کە هەموو شت بەبەرنامە، سەعات بەسەعات رێکخراوە. کاردینالی زرنگ بەسێ جوڵە هەموو کارەکانی ئەنجامدا، جانتاکانی بارکرد، ئۆتۆمبیل ئامادەبوو بەرەو (بیازادی ئسپانا) بۆ نیشتەجێبون لەهۆتیل (هاستەر) کەوتنە رێ. لەهەمان کاتدا، کە ئۆتۆمبیلەکەی کاردینال بەرەو پایتەخت بەرێکەوت، (دۆم لیڤی) بەرنامەیەکی ئامادەکردبووپیشانی میوانەکانی دەدا.

- بامبینۆ(بچوکۆلە بەزمانی ئیتالی). بەپێی رێکخستنی کات لە (کاتاکۆمپ)ەوە دەسپێدەکەین. گۆڕی مەسیحییە سەرەتاییەکان، کڵێساکانی ژێرزەمین، دوو سەعات بەسە. پاش ئەوان دڵی دنیای کریستیانی: کڵێسای (سان پەی یر – بوترسی پیرۆز). لەرۆما چەتری میحرابی بێنین[1] دەبینیت، کە زۆر جوانە. ئینجا مۆزەخانەی ڤاتیکان، کە پێویستیت بە دوو

---

[1]. Berning یان Bennini جیان لۆرۆنزۆ برنینی وێنەکێش، تلارساز، پەیکەرتاش، شانۆنوسو شاعیری ئیتالی (١٥٩٨–١٦٨٠) شاکاری هونەری جۆراوجۆری هەیە، کە یەکێك لەجوانترینیان چەتری برۆنزی میحرابی کڵێسای (سەن پەی یێر)ی ڤاتیکانە. و. کوردی.

سەعاتی تەواو دەبێت. دەمێنێتەوە (سان ژان دولاتران)و پاشان چەند کلێسایەکی پێویست وانییە بامبینۆ؟.

- (تیۆ) وتی: بەبامبینۆ بانگم مەکە، پێنج ساڵە نیم.

- پیاوی پلەبەرزی کلێسا بەهێواشی قاقایەکی کردو گوتی: ئەم لاوە زۆر سەیرە. ئایا لەبەرنامەکەت رازیت؟

- (تیۆ) بەبارێکی راستەقینەوە وتی: نازانم. زۆر حەزدەکەم (فورۆم)و (کاپیتاڵ) ببینم.

- کاردیناڵ لەژێر لێوەوە وتی: هەمم... ئەم دوو شوێنە هیچ پەیوەندیان بە کریستیانیەوە نییە... بامبینۆ.

- (تیۆ) بەنەرمی وتی: سەرەتا پێش (پەی یری پیرۆز) لەرۆمادا خوا هەبون، دووەم من بامبینۆ نیم.

- زۆرباشە، تۆ خواکانی رۆمی دەناسیت؟

- (تیۆ) وتی: ژونون (هاوسەری ژوپیتێر) دەناسم، کە هەمان (هێرا)ی ژنی (زیۆس)ـ (دیانی) پاکیزە دەناسم، کەهەمان (ئارتمیس)ی یۆنانییەکانە. (ڤینۆس)، کە هەمان (ئافرۆدێت)ی خوای جۆرەکانی عیشقە. (مەرکور) کە هەمان (هرمس)ی پەیکی خواکانەو تەواو. لەکتێبی میتۆلۆژیادا باسی (لارە)کان کراوە، بەڵام باش تێنەگەیشتوم کێن.

- پیاوی کلێسا لەبارێکدا بە بیرکردنەوەدا رۆچوبوو گوتی: تێگەیشتم. لەچاو تەمەنت بێت زۆر شت دەزانیت. (لارە)کان خوای تایبەتی پاسەوانی مەڵبەندی خێزانەکانن، بەڵام دەزانیت ئاینی رۆمی بەقۆناغی جۆراوجۆردا تێپەڕیوە. لەسەرەتادا خواکانی خوای جۆراوجۆری بچوکی خێزانی بونو پاشان خوا گەورەکانی یۆنانی دەستیان بەسەر شاردا گرتو دواتر خولی ئیمپراتۆری ئاینی ئاسیایی جۆاوجۆر (پاندۆمۆنیۆم)ێکی تەواو.

- ئەم (پاندۆنیۆم)ـە چییە؟

- (دۆم لیڤی) بەپێکەنینەوە وتی: جەژنی شەیتانەکانە... بامبینۆ! بەداخەوە... دەتوانم نوسراوت پیشان بدەم، بەڵام جگە لەوێرانە هیچی دیکە نابینیت. نەلەئاینی (ئیزیس)و نە لە (ئەستارتە)[1] ی وێنەیی، نەخوای (سیبل)[2] بەتایبەتی خوای (نزاکیەکان). (میترا)[3]، کە (گا)

---

[1]. Astarte بەرامبەر بە عەشتاری بابلی، خوای فینیقی زاوزێ. و. کوردی.

[2]. Cybele بەیۆنانی (Kobule) لە خودانەکانی جۆری خاکی ئاناتۆلی کە لە فریگیەوە چۆتە جیهانی یۆنانی – رۆمییەکانەوە. کە خوای زاوزێیە بەدایکی خواکانیش ناودەبرێتو ئاینەکەی دوو سەدە پێش زاین گەیشتۆتە رۆما.

**لەبەردەمیدا کراوە بەقوربانی، خوێنەکەی رژاوەتە ژێر ئەوانەی دەیانپەرستو لەدەبۆیەکی ژێرخاکدا خەوتون.**

**- نەفرەتاوییە.**

**- دەزانیت کریستیانی زۆر قەرزارباری (میترا)یە؟. پەرستنی (میترا) ئاینێکی راستەقینەی پاککردنەوەی رۆح بوو، کە قوربانیکردن بە (گا)ی نێر چاکەکاریو رزگاری جیهانی لەپشتەوە بوو. وەك عیسای مەسیح کەبەسەر خاچەوە گیانی لەدەستدابوو. لەسپێدەی ئاینی کریستیانیشدا خوا گەورەکانیش بەتوندی پارێزگاریان لە باوەڕمان دەکرد. بۆنمونە (ئیزیس) لەبەرئەوەی (ئیزیریس)ی زیندوو کردەوە، (ئیستارتە)،کە بەسەر مەرگی (ئەدۆنیس)[4]ی خۆشەویستیدا گریاو دوبارە زیندوی کردەوە... ئەمانە برەویان بەبیرۆکەی هەستانەوەدا، کە دەرئەنجامەکەی (عیسا) بوو.**

**- پورە (مارتا) چووە ناو گفتوگۆکەوەو گوتی: بەڵام تۆ بەشێوەیەکی سەیر سەبارەت بەدابونەریتی خوای (ئەستارتە) بێدەنگیت.**

**- کاردینالّ تاڕادەیەك بەتوندیو نارازییەوە وتی: بۆچی پێویست دەکات؟**

**- پورە (مارتا)چاوێکی لە(تیۆ) داگرت و گوتی: نەخێر، سانسۆرمان نییە؟ بۆچی دەتەوێت برازاکەم لەچیرۆکێکی هێندە جوان بێبەش بکەیت. (ئەدۆنیس)ی جوان، بەهۆی برینداركردنی لەلایەن بەرازێکەوە مرد. ئینجا کاهینەکان بەو یادەوە درەختێکی کاجیان بڕیو بەگریانەوە قەدی درەختەکەیان بەکۆڵانەکاندا لەسەر شان دەگێڕا. پاشان لەپێناو ستایشکردنی (ئەستارتە)یخۆشەویستیدا لەحاڵەتی خرۆشیو خەڵوەتدا، هاوشان بەسرودو مۆزیکەوە، بەمەیلو ویستی خۆیان، خۆیان خەساند.**

---

[3]. Mythro:(خۆڵ) – هەڵەی نوسەر پێویستی بەراستکردنەوەیە – میترای خوای ئێرانی کۆن خوای (خۆر)ـە، کە ئاینەکەی لەجیهانی هێلینیو رۆمیدا برەوی هەبوەو لەسروتی ئاینیدا (گا)ی بۆکراوە بەقوربانی. جەژنەکەی لە (٢٥ ی دیسامبەری) هەموو ساڵێکدایە، کەبنەماو بنچینەی (نۆیل)و لەدایکبونی مەسیحەو لەئێران بەجەژنی (مهرگان) ناسراوە.

[4]. Adonis لەوشەی فینیقی (Adoni)یەوەیە بەواتای (گەورەی من)و رەواڵەتی رەگەزی نێرە لە زاوزێدا. لە ئەفسانەی یۆنانیدا پیاوێکی لای زۆر جوانە، کە ئەفرۆدیت (ڤینۆسی رۆمی، ئەستارتەی سوریو عەشتاری بابلی) عاشقی دەبێت، کاتێك ئەدۆنیس بەهۆی برینداری بەرازێکەوە دەمرێت زیۆسی خوای خواکان لەسەر داوای ئەفرۆدیت دوبارە زیندوی دەکاتەوەو مۆڵەتی پێدەدات بەشێکی ساڵ لەژێر خاکداو بەشەکەی دیکە لەدۆزەخ لەپاڵ مەعشوقە راستییەکەی (پرسیفۆن – پرۆزربین رۆمی) بەسەر بەرێت. ئەدۆنیس لەوەو دوا روخساری ژیانو سروشتە. ئەفسانەی ئەدۆنیس ریوایەتی جۆراوجۆری هەیە. لەوانەش کە ئەفرۆدیت لەخوێنی ئەو گوڵاڵە سورەی رواندووە. لەچیرۆکێکی دیکەدا ماوەی دەرکەوتنی لەسەر خاك بەچوار مانگ دانراوە. کە لەسەرەتای بەهاری هەموو ساڵێك دەستپێدەکاتو وەرزی جوانیو قەشەنگی سروشتە.

- (تیۆ) بەترسەوە وتی: خەساندن؟ وەك پشیلەو سەگ؟ دەتەوێت بڵێیت پیاوەتی خۆیان نەهێشت؟.

- (دۆم لیڤی) وتی: دروست وایە. بەلایەنی کەمەوە کریستیانی لەهاوبەشیکردن لەو وەحشیگەرییە بەدورە. گروپەکانی بۆ بەرز ڕاگرتنی خوای تایبەتو خاتونانی گەورە دەکەوتنە ڕێگا بەجلی ئاڵووالاو تەپڵو دەف سەرنجی خەڵکیان رادەکێشا، بەڵام ئەو سروتانە زۆرجار خویناوی بونو بەسزاو بڕینی ئەندامێکی جەستە دوایی دەهات. ڕۆمییەکانی کۆن ئەو شێوازەیان بەناپەسەندو سوكو ڕەشۆکیانە دەزانی. کریستیانی سادەترو مرۆڤانەترە. ئێمە تەنها بەقوربانیدانی نان، کەجەستەی مەسیحو شەراب، کە خوێنەکەیەتی، دەوەستین؛ ئەم دوانەش لەخواردنێکدا بەش دەکەین.

- (تیۆ) وتی: نەخێر تەنها نانەکە، شەرابەکە خودی کەشیش لەئارامیدا نۆشی دەکات. من جارێك ئەوەم لە (میس — نزای کۆگەلی)دا بینی.

(دۆم لیڤی) خەریکی جوینی نینۆکەکانی بوو. بۆینەدەلوا بامبینۆکەی (مارتا)ی هاوڕێی وابەئاسانی رام بکات. خۆشبەختانە گەیشتبونە هۆتێل. (تیۆ) لەژورێکی پەردە سوردا جێگای بۆدانرا تا بتوانێت پشوو بدات. دەرگای ژوری نێوان ئەمو ژورەکەی پورە (مارتا) جوت نەدەبوو، دەنگ لەوێوە دەبیسترا.

- (دۆم لیڤی) لەسەرخۆ وتی: بەڵام ئەم منالە لەچاو تەمەنیدا زۆر شت دەزانێت!. لەگەڵ تاقیگاکان، کلینیكو رادیۆگرافیو... نازانم کات بۆ دیداری (فۆرۆم) دەمێنێتەوە. ئەو بەڵێنی چاوپێکەوتنە، ئایا بیرت لەو بەڵێنە کردۆتەوە؟. کەواتە بەیانییە! هەرگیز کاتمان نابێت!؛ ئینجا کاتێك لێرە بڕۆین ئیدی تواناو حەزی نابێت!

- پورە (مارتا) وتی: شش... گوێی لەدەنگمانە...

(تیۆ) دڵی کەوتە لێدان؛ (ئەوان؟)، بەڵێنی دیدار؟ بابەتەکە چییە؟ هاوڕێکانی؟ غافڵکردن لەئارادایە؟. خوا بکات کەش خۆش بێت! کەمێك خۆرەتاو بۆ (بامبینۆ)یەکی سەرگەردان. (ئیزیس) خاتون تکا دەکەم کەمێك ژیانم پێبدە!

- کاردینالْ دەیوت: مارتا.. دڵنیات دەکەم. خێرا لەو ئازارە رزگاری بکە، هەروەها من کلینیکم تەگبیرکردوە، چونکە دەبێت ماوەیەك لەوەوپێش بۆ(سکانەر) ئامادەگکاری بکرێت.

پورە (مارتا) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: زۆر باشە تا دوو سەعاتی دیکە لێردوە بەئۆتۆمبیل دەڕۆین.

(تیۆ) خۆی خزاندە ژێر لێفەکەیەوە. (ئەوان) پزیشك بون. (ئەوان) جارێکی دیکە خوێنیان لێدەگرتو دەیانکردە قوربانی خودایانەی پزیشکی. لەبەرئەوە لەرۆژی یەکەمدا لە (رۆما) جگە لەپەرستارو پزیشکان هیچی نەدەبینی.

## ڤیستاڵو ئاینی ئاگر

چونکە (تیۆ) ئارامو گوێڕایەڵ بوو تاقیکردنەوەکانی تاڕادەیەك بەخێرایی ئەنجامدران. پورە (مارتا) کاتێك لەکلینیکەکە هاتە دەرەوە، چەرخەلەیەکی بەدەوری پەرستگا بازنەییو جوانەکەی (ڤێستا)[1]دا لێداو گوتی:

- یەکێکە لەو تەلارە کەمانەی ماونەتەوە. (ڤێستا) خوای کوری خێزان بوو. کاهینەکانی (ڤێستاڵەکان) بۆ چاودێریکردنی ئاگری پیرۆز دەبووٌ بەدرێژایی ژیانیان بەپاکیزەیی بمێننەوە. ئاگر هەردەم گرنگ بووە. چونکە ئەگەر ئاگر بکوژێتەوە ژیان لەسەرتاسەری جیهاندا دەکەوێتە مەترسییەوە. دانیشتوانە رەسەنەکانی ئەمریکای خواروو دەگێڕنەوە، کە (جاگوار) چاوە ئاگراوییەکانی خۆی لەپێناو ژنێکی سەربەتیرەی مرۆڤ بەخشییە یەکەم کەسانی روبەروی بونەوە. گەلانی خاکی (پارس)، کە ئەمڕۆ بە(ئێران) ناودەبرێت، هەموو سەر بەئاینی خوای ئاگر بون. لەهندستان ئەو کۆمەڵگایانەی دواین نوێنەری ئەم ئاینەن پاش سەرهەڵدانی ئیسلام لە (پارس) بۆ هندستان کۆچیان کردو پێیاندەگوترێت (پارسی) واتە خەڵکی (پارس)، چونکە لەئێرانەوە هاتبونو (زەردەشت)ی بون، ئەوەش بەیادی پەیامبەرەکەیان (زورو ئاستەر – زەردەشت) کە پێشی وتراوە (زاراتوسترا - Zarathoustra).

- (تیۆ) وتی: ناوێکی چەند سەرسوڕهێنەرە! وەك قارەمانی چیرۆکی فیلمی کارتۆنی.

- (زاراتوسترا) پەیامبەرێکی گەلەك مەزن بوو!. لەشەش سەدە پێش لەدایکبونی مەسیحەوە لەبیابانەکاندا وێڵ بووەو هەر لەوێش بەهرەی بۆ هاتوەو لەسەرخۆو بەهێواشی بیرۆکەو هزری خوایەکی تاکو تەنیای چاکەی بەناوی (ئاهورامەزدا) داڕشتوە، کە بەواتای (خوای ئاقڵ)ـە. لەبەرئەومیە ئاینی زەردەشتییەکان بە (مەزدایزم) یش ناودەبرێت. بنەمای ئەم ئاینە سادەیە. دوو هێزی دژبەیەك لەململانێدان. سپیپۆشەکان سوپای چاکەنو رەشپۆشەکانیش سوپای

[1] Vesta لەگەڵ (Hestia)ی یۆنانی بەرامبەرەو خوایەکی ئیتالییە. پاسەوانی ئاگری مەڵبەندی خێزان. لە (فۆرۆم)ی شاری رۆما پەرستگایەکی بۆ دروستکراوە. پیاوە ئاینییەکانی (کاهین) بە (ڤیستاڵەکان) ناودەبرێت.

خراپە. جەنگاوەرانی چاکە، کە کەتانی سپی دەپۆشن، دەبێت خۆیان لە قوربانیکردنی ئاژەڵان بەتایبەتی (گا) بەدوربگرن، کە (زەردەشت) پارێزەرو پاسەوانی بوو.

- (گا)؟ بۆچی؟

- دەبوو ئازاد بکرێت تا لەئاشتیو ئارامیدا بلەوەڕێتو سود لەوە وەربگرن بەتاکەکانی مرۆڤی دەبەخشێت؛ تۆ لەهندستان تێبینی ئەوە دەکەیت. بێگومان رێزگرتنی (مەزداییەکان) لە رۆحی (گا) هۆکاربوو بۆ هندستان هەڵبێنو پەنابگرن. (پارس)ەکانی هندستان، کە ئاگر بەرزدەنرخێنن، خەڵکی زۆر چاکو زۆر بەرەفتارن، هەروەها زۆر نهێنی پارێزن. بۆ نمونە بۆ ئەوەی خاك پیس نەکەن مردووەکانیان نانێژن، بۆ ئەوەشی ئاگر ئاڵودەی پیسی نەبێت نایسوتێنن، بەوەندەوە دەوەستن جەستەی مردووەکانیان لەقەڵایەکی بەرز دابنێنو لەوێ....

- لەوێ چی؟

- پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: داڵەگۆشتخۆرەکان لەماوەیەکی کەمدا لەتوپەتی دەکەنو هەڵیدەلوشن، بەڵام جگە لەخودی (پارس)ـەکان کەسی دیکە مافی ئامادەبونی لەو سروتەدا نییە.

- (تیۆ) وتی: تێناگەم بۆچی؟ ناشتنی ناو خاك زۆر لەوکارە باشتر نییە. بۆگەنکردنی ژێرخاك چییە؟ لای ئەوانەی باستکردن باڵندە مردووەکان دەخۆنو دەفڕن.

- پورە (مارتا) قسەکەی پێبڕیو گوتی: بەکورتی ئاینی ئاگر بەیەکێك لەکۆنترین ئاینەکان دادەنرێت لەجیهاندا. تۆ روداوی (پرۆمتە)[1] دەزانیت؟

- بەڵێ. بەهۆی دزینی ئاگر لەخواکان سزادرا. مرۆڤ لەکوێ هەبێت دزینی ئاگری خواکانیش هەیە. لەبەرئەوەیە (ڤێستاڵەکان) ئەرکداربون ئاگاداری ئەو توخمە بنو هەرلەبەر ئەوەیە (ڤێستاڵەکان) هێندە پاكو تەمیزن. ئەگەر یەکێك لەوانە مەعشوقەیەکی هەبوایە زیندە بەچاڵیان دەکرد... رۆژێکیان یەکێك لە(ڤێستاڵەکان) مۆڵەت دەدات خودی ئیمپراتۆری (رۆما) عشقبازی لەگەڵدا بکات، چونکە شتەکە ئاشکرا بوو، دەمودەست زیندە بەچاڵیان کرد. ناشکرێت شۆخیان لەگەڵدا بکرێت.

---

[1]. Promethee بەیۆنانی (Prometeus) یەکێك لە دێوەکان (تیتانەکان) کوڕی ژاپیتو برای ئەتلەس. لە ئەفسانەکەدا دەڵێت ئاگری لەخوا دزیوە. لە دورگەی خۆیدا شاردویەتییەوەو بۆ خەڵکی بردوە. خواکانیش ئەویان لە قولەی چیاکانی قافقاز زنجیرکردو بڕیاریاندا هەڵۆیەك لە جگەری بخوات، کە بەردەوام چاك دەبۆوە. ئەفسانەیەکی دیکە (پرۆمیتە) ئەفرێنەری مرۆڤە. بەریوایەتێکی دیکە (دکالیۆن)ی کوڕی پاش تۆفانەکەی (نوح) نەژادی مرۆڤی پاراستووەو درێژەی پێداوە. و. کوردی.

(تیـۆ) پرسـی: ئایـا لەگـەڵ خوشـکانی دەسـتیان لـەجیهان بـەرداوە هـەمان کاردەکـەن؟. خۆئەوانیش شو ناکەن و بەخوردی دەمێننەوە!

- (تیـۆ).. هێـشتا نەگەیـشتوین بـەو جێگایـە!، بـەڵام لەلێکـچواندنی ئـەو دوانـەدا بەهەڵـەدا نەچویت. (ڤێستاڵەکان) خۆیان نەزری خـوای تایبـەت بـەخێزان کردبـوو. وەك چـۆن خوشـکانی دەستیان لەدنیا بەرداوە خۆیان نەزری مێردەکەیان (عیسا) کردوە.

- (تیۆ) بەسەراسیمەییەوە وتی: بەڵام بۆچی (ڤێستاڵەکان) مافیان نەبوو منالیان هەبێت؟

- دەڵێن منالّ هەموو عیشق و سۆزێکی دایکـی دەبـات. لەبەرئەوەیـە کـە (ڤێـستاڵ، خوشـکانی دەستیان لەدنیا هەلگرتووەو لەگەڵ کاهینە پیرۆزەکان) لـەبونی منـاڵ بێبـەش دەکـەن تـابتوانن باشتر عیشق و خۆشەویستی خۆیان نەزری کەسـانی دیکـە بکـەن. هەرچـۆنێك بێـت نـاتوانم زۆر باس لەعیشقی دایکایەتی بکەم.

- (تیۆ) وەك جۆرێـك لـە دەربـڕینی هـاودەردی وتـی: دروسـتە. تـۆ منـاڵت نییـە، بـەڵام ئـەوە چییە لەو گۆشەیەدا؟

کەمێك دوور لە پەرستگاکەوە شەیتانێك، کە لەبەرد تاشرابوو، بەشێوەیەکی سەرسام سـیمای خۆی بردبوە بارێکی گاڵتەجارییەوە. پورە (مارتا) رونیکردەوە کە لەکۆنـدا ئـەو دەم داپـچڕاوە، کـە پێیـدەوترێت (دەمـی حەقیقـەت)، بـۆ ئـەزمونکردنی تاوانبـاران بـەکاریان هێنـاوە. کەسـی بەرتاقیکردنەوە دەبوو دەستی لەو دەمە رۆکـات، ئەگـەر درۆی بکردایـە دەسـتی لـەناوەوە قوفڵ دەبوو. ئەم بڕوا ئەفسانەییەی رۆمییەکان هەروا مایەوەو ئێستا خەڵك بەترسـەوە دەسـت لـەناو ئـەو دەمـە رۆدەکـەن. (تیـۆ) پەنجەیـەکی بـۆ درێـژکردو تێگەیـشت ئـەو دەمـە داپـچڕاوە زیـاتر هەستی برسێتی لای ئەم جولاندوە.

- پورە (مارتا) وتی: نەخۆشییەکی باشە!

بۆ چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییە دەمودەست لەپشتی مێزە پاکو تەمیزەکانی ریستۆرانتێك رۆنیشتن، کە سەرمێزەکان بەچوارگۆشـەی شـێوە سـورو سـپی روپۆشـکرابوو. (تیـۆ) بەحـەزێکی زۆرەوە دەفرەکەی تـەواو کـردو کەوتـە سـەغڵەتکردنی پـورە (مارتـا). پرسـیارەکەی ئەمـە بـوو، (ئەوان)ی بەنهێنی لەگەڵ (کاردینال)دا باسی دەکرد کێبون؟.

- پـورە (مارتـا) لەسـەرخۆ وتـی: بەتـەواوی سـەغڵەتم دەکـەیت. هەمیـشە دەتـەوێت هـەموو شتێك بزانیت! کاتمان زۆرە!

- (تیۆ) بەدەنگێکی دڵ بزوێنەوە وتی: نەخێر راست نییە. من کاتم زۆر نییە. کەواتە بچۆ دەست بکە بە (زاری حەقیقەت)دا، ئەی درۆزن.

پورە (مارتا) روی وەرگێڕا تا فرمێسکەکانی بشارێتەوە، کە لەسەر گۆناکانی زایەڵەی بەستبوو. لەسەر شەقامەکە خەڵکی شار لەژێر ئاسمانی رەش و بۆردا خەریکی پیاسەکردن بون؛ ئەمانیش حەزیان نەدەکرد زوو بخەون، زیاتر ئارەزویان لە درێژەدان بەژیانی شەوانە بوو، تادۆندرمەیەك بکڕن و بەبێهۆ شەقامەکان تەیبکەن و لەو پرشنگە بڕوانن روناکی هاویشتۆتە سەر تەلاری مێژویی شارەکە، بەلأم مۆڵەتیان نەبوو، دەبوو بۆ هۆتێل بگەڕێنەوە. (تیۆ) لەخەوندا کاهینانی سپی پۆشی دەبینی، کە بەخوێن ئالوده بون و لەدەوری ئەو درەختە کاجە بڕاوەیە دەنوزانەوە، کە لقەکانی بەئاوازی تەپڵ و دەف دەجولانەوە. خوای (ئەستارتە) لەژێر چادری رەشدا شارابۆوە، روخساری نەبوو، جگە لەسیمای مەرگ: لەناکاو (تیۆ) لەخەون راپەڕی. لەناو تاریکی شەودا، ئاوازێکی مۆزیکی ئەفریقی دەنگی دەدایەوە.

## کریستیانە بەراییەکان

(دۆم ئۆتاڤیۆ) بەیانی رۆژی دواتر، کە کۆلۆانەکەی دابوو بەسەر دەستیدا، دەرکەوت:

- باشە، بامبینۆ، ئامادەی بۆ بینینی (کاتاکۆمپ)؟ بەلایەنی کەمەوە دەزانیت بڕیارەکە چۆنە؟

- (تیۆ) وتی: کاتاکۆمپەکان ئەو دەبۆیانەن لەژێر شاردا هەڵکەنراون. لە (پاریس)یش هەیە.

- بەلأم (کاتاکۆمپەکان)ی رۆما گۆڕەکانی کریستیانیە سەرەتاییەکانن. دەبێت لە شار بچینە دەرەوە، چونکە لەسەردەمی کۆندا سنوری شار بۆ مردوەکان قەدەغەبوو، لەدەرەوەی شار بەخاکیان دەسپاردن.

- پورە (مارتا) بەنارەزایی دەربڕینەوە وتی: ئەوەی پەیوەندی بەگۆڕستانەوە هەبێت لەمیسر کاتی تەواوی تێدا بەسەربرد!، باشترە سەردانی کلێساکانی ژێر زەوی بکەین!.

ئۆتۆمبیلەکە گەیشتە شوێنێك، کە (سەروو)و (کاج)ـەکان وەك چەتر لەسەر رێگای ناسراو (بەرێگای ئاپێین) بەگیا کورت و زەرد هەڵگەڕاوەکانیانەوە دەرکەوتن. لەپانتایی ئاسمانی رەشداگەڕاودا چەپکێك روناکی زەردهەڵگەڕاوی خۆر گۆڕستانی (رۆحی)یەکانی روناك کردبۆوە. کەمێك دورتر لەوێوە نیشانەی لاتینی (کوومدیس) دەدرەوشایەوە.

- (تیۆ) وتی: چەند ناوێکی سەیرە، کۆومدیس؟

- کاردینـاڵ وتـی: ئەمـە ئـەو وشـانەیە کـە (پـەی یـری قـەدیس – پیتـەری پـیرۆز) لەهـەمان شوێندا کاتێك (مەسیح)ی لێدەرکەوتوە درکاندویەتی.

- لەهەمان شوێندا؟

- ئەمـە ئـەو شـتەیە کـە دەیڵـێن. (پـەی یـر) بەرامبـەر گەورەکـەی کەوتۆتـە سـەر خـاكو لێیپرسـیوە: (گـەورەم بـۆ کـوێ دەچـی؟). (عیـسا) وەڵامیداوەتـەوە: (بـۆ رۆمـا دەچـم تـا لـەوێ لەجیاتی تۆ لەخاچ بدرێم). ئینجا (پەی یر)ی (حواری- هاوەڵ) بۆ (رۆما) گەڕاوەتەوە تـا لـەوێ لەخاچ بدرێت.

- (حواری - Apotre) واتای چییە؟ (هاوەڵ یان مرید)ە؟.

- ئەمـە ناوێکـە بـۆ دوانـزە کـەس لـە هاوەڵـە سـەرەتاییەکانی (مەسـیح) دانـراوە، جگـە لـە (یەهودای ئەسکەربوتی)، کە (عیسا)ی بە رۆمییەکان فرۆشتو (ماتیاس) جێگای گرتەوە.

- چی؟ لەنێو ئەوانەشدا خەڵك هەبوە ناپاکی لەگەڵ (عیسا) بکات؟

- هەڵبەتە بامبینۆ. کاتێك ماچی کرد ئەوە ئاماژەیەك بوو بۆ سەربازە رۆمییەکان و پێیـانی وتبوو: (هەر کەسێکم ماچکرد ئەوە عیسایە). فرۆشـرا بـەهۆی ماچێکەوە، لـەپێناوی پـارەدا ... یەهودا پاشان لەدەست پەشـیمانی خـۆی هەڵواسـی. بـەڵام (پـەی یـر-پـترس) ناپـاکی لـە (عیـسا) نـەکرد، بـەڵام سـێ جـار بـەدوای یەکـدا درۆی کـرد. وتویـەتی کـە بـەهیچ شـێوەیەك (عیـسا) ناناسێت، ئەوەش لەهەمان ئەو شەوەدا، کە (عیسا) دەستگیرکرا.

- لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەر (حواری)یە؟

- گـەورەترین کەسـانی (حـواری – هـاوەڵ)ی مەسـیح!. (عیـسا) لاوازی دڵـی مرۆڤـی دەناسـی. لەبەرهەمان هۆ کەسێکی لاوازو بێتوانای بۆ بەهرە بەخـشین هەڵبـژارد. (پـەی یـر)ی (حـواری) کاتێك زانی هەڕەشەی مەرگی لەسەرە سەرەتا ویستی پەشیمان بێتەوە، بـەڵام بەخۆیـدا چۆوەو بڕیاریدا وە (مەسیح) بمرێت.

- (تیۆ) بەدەستخۆشیکردنەوە وتـی: رۆمییـەکان مردوەکـانی خۆیـان دەسـوتاندو دەیانـکردنـە خۆڵەمێش، بەڵام کریستیانەکان بڕوایان بەهەستانەوەو زیندوبونەوە هـەبوو لەبەرئـەوە دەبـوو جەستەیان بەدەست لێنەدراوی بمێنێتەوە؛ لەبەرئەوە بەخاکیان دەسپاردن تاوەك چۆنن هـەروا دوبارە زیندوو ببنەوە.

- پورە (مارتا) وتی: چۆن؟

- لەپەیکەرێکی پڕ نور ، روناکیو شەفاف.

- (تیۆ) وتی: ئەی باڵدار؟

- کاردینـاڵ وتـی: کـێ چـوزانێت؟ هەرچـۆنێك بێـت پـێش کریـستیانەکان لەشـاری رۆمـا جولەکەکانیش (کاتاکومپ)ی خۆیان هەبوو.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: کەواتە جولەکەکانیش لەرۆما هەبون؟

- زۆر زۆر... بـامبینۆ! ئەوانـە لەلایـەن زۆر لەئیمپراتۆرەکانـەوە ئـازار دراون. تیبریـۆس، نیرۆن...، هەندەرانی زۆر، بەئاین و مەزهەبی تایبـەتی خۆیانـەوە بـۆ شاری رۆم چون. چـونکە جولەکەکان لەخۆرهـەڵاتی ناوەڕاستەوە هاتبون و سـەر بەچـین و گروپـی زۆری ئاسـیایی بـون و وردە وردە کەوتنە دنەدانی گۆشەو کەنارەکانی ئاینی تایبەتی رۆمەکان.

- (تیۆ) وتی: ئاسیا واتە چین و ژاپۆن. ئەوانە بەهەڵەدا چوبون؟

- نەخێر، بامبینۆ بەهەڵەدا نەچوبون، چونکە رۆمییەکان هەچ زانیارییەکیان دەربارەی ئـەو وڵاتانە نـەبوو. لەدیـدی ئەوانـەوە تورکیـای ئـەمڕۆ، سوریە (شـام)، میـسر، عێـراق و فەلەسـتین لەئاسیادا بون و ئاینی ئاسیاش لای ئەوان کۆمەڵێك ئەفسانەی بێسەروپا بـوو، بـەڵام ئـەم ئاینـە بێگانەیـە سـەرنجڕاکێش بـوو. ئیمپراتۆرەکـانی رۆم سـەردەمانێکی درێـژ بەسـەختی بـەرگریان لەئاینی کۆنی رۆمەکان کـرد. کاتێـك زانیـان لـەژێر هێرشـی ئـەو گروپـە ئاسیاییانەدا نغرۆبـون هەوڵیانــدا ئـاینێکی نـوێ لـەڕێگای بـە(خـودا) کردنـی خۆیانــەوە هەڵبــژێرن یــان لەگــەڵ خواگەورەکانی لەجێگاکانی دیکەوە دەهاتن هاوسەرگیری بکەن.

- پورە (مارتا) وتی: بەڵێ ئەم رێگایە ئاسانتر و سانا بوو.

- تـەنیا ئەومنـەبێت کەلەدیـدی کریـستیانیەوە بـەخودایی بـون لەلایـەن مرۆڤـەوە پەسـەند نــەدەکرا، چـونکە تـەنها یـەك (مـرۆڤ –خـودا) هــەبوو ئـەویش (عیـسا) بـوو. لەبەرئــەوە ئیمپراتۆرەکان دەستیاندایە ئازارو کوشتنی کریستیانەکان. ئەمکارە تاسەدەی چوارەمی خایانـد، تائەو کاتەی کریستیانی بەجۆرێك پەرەی سەند کە (کنستانتین)[1]ی ئیمپراتـۆر بـەئاینی فـەرمی (رۆما)ی راگەیاند. ئەوا بە (کاتاکۆمپ) گەیشتین.

- لەپلیکانەیەکی باریکەوە بۆ خوارەوە ڕۆشتن. لەتەنیـشت دیوارەکانـەوە تێبـینی بـونی چاڵ دەکـرا، کــە لەتەنیــشت یەکدییــەوە ریزکرابــون و نوســراوی هــەڵکۆڵراوی بــەزمانی لاتینیــان

---

[1]. Constantin کۆنستانتینی یەکەم، کە بەلایەنی (فلاویرس ئۆرلیۆس کلۆدیۆك کنستانتینۆس) ناودەبرێت. ناسراو بە مەزن، کە لە(٣٠٦ بۆ ٣٣٧) فەرمانڕەوا بوو. کنستانتین (قسگنگین) کریستیانیی کردە ئاینی فـەرمی رۆماو لەساڵی (٣٣٠) شاری (کنستانتینۆڵ – قسگنگینە – ئەستانبوڵ)ی دروستکردو کردی بەپایتەختی خۆرهەڵاتی رۆما. و. کوردی.

لەسەربوو، کە (دۆم لیڤی) بە پەرۆشییەوە وەریدەگێڕان – (Vivas in dos)، دەبێت لەبونی خواوەندا بژیت) یان ئەو ئاماژەو (سمبولانەی) کاردینالْ رونکردنەوەی دەربارەیان هەبوو. بۆ نمونە دەیوت (لێرەدا ئەو لەنگەرەی دەبینرێت ئاماژەیە بۆ گەیشتن بەدەرگاکانی بەهەشت، لەوێدا ئەو سەتڵەی پڕە لەئاو ئاماژەیە بۆ ئەو ئازارو سوێیەی کە دوچاری دەبیت). (تیۆ) کەوتە لەرزین، ئازارو سوێو مەرگ... ئایا ئەویش بەوزوانە دەکەوێتە بەر ئەو ئەزمونە؟ خواردنەوەی ئاو بۆ رێگرتن لە ئازار، تا رادەیەك دروست وەك... نەخێر نابێت بیری لێبکەیتەوە.

لەپلیکانەیەکی فراوانەوە گەیشتنە گۆڕستانی ژێر زەوی، کەلەسەر دوو کۆڵەکەی سپی راگیرابوو. (دۆم لیڤی) بەرەو پێشچوو تا گەیشتە بەردەم پەکەرێکی مەڕمەڕ، کەچەند ناوێکی لەسەر هەڵکۆڵرابو. لەسەرخۆ گوتی:

- ئەمە گۆڕی (پاپا)کانە. نۆ دانە لە (پاپا)کان لێرەدا نێژراونو هەمویان شەهیدن. لەو نوسینە بنوارن کەسێك سەردانی کردوە لەوێدا هەڵیکۆڵیوە، بەلاتینی واتای ئەوەیە (ئۆرشەلیم، شاری جوانکاری شەهیدانە).

- (تیۆ) هاواریکرد: دوبارە ئۆرشەلیم. ئۆرشەلیمێك لە خودی ئۆرشەلیمدا، یەکێکی دی لای حەبەشییەکان لە (لالی بەلا)و لێرەش ئەمە یەکێکی دیکە. ئەمە دەبنە سیان! کەواتە کاتاکۆمب ئۆرشەلیمی کریستیانەکانە؟

- ئۆرشەلیم تەنها شارێك نییە بامبینۆ، ئایدیایەکە. ئۆرشەلیم شوێنی گردبونەوەی باوەڕدارانە، جولەکە یان کریستیانی. سەردەمانێکی زۆری خایاند تاجولەکەگەرایی (جودابیزم) لەکریستیانی (کریستیانیزم) جیا ببێتەوە. هەردوو لەیەك بنەماوە، یەك کۆو یەك سەرچاوەوە بون... (BiBle – پەیمانی کۆنو پەیمانی نوێ)و ئۆرشەلیم لەنێوان جولەکەو کریستیانەکاندا هاوبەشە.

- پورە (مارتا) بەناڕەزاییەوە وتی: پەلە دەکەی! جگە لەکریستیانەکان کێبوو بەدرێژایی سەدەکان جولەکەکانی ئازاردەدا؟ ئەی ئەنگیزیسیۆن چی؟

- (تیۆ) بەرویەکی ترشوتاڵەوە وتی: (پاپا) نازیزم، لەوبارەیەوە چیدەڵێیت؟ باوکم پێیوتم لەسەردەمی جەنگدا تەنانەت یەك پەنجەشی بۆ رزگارکردنیان درێژ نەکرد[٢]...

---

[٢]. مەبەست لە (پاپا – پی دوانزەیەم)ـە، کە لەسەردەمی جەنگی دووەمی جیهاندا فەرمانڕەوایی کڵێسای کاسۆلیکی لە ڤاتیکان بوو. دەربارەی پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی نازی ئەڵمانەکان هێشتا مشتومڕ هەیە.

- كاردینالْ بەسەرسامییەوە وەڵامیدایەوە: ئەمە دادوەرییەكی قوڵە... قەشەكانی ئەڵمانیا شایستەی دەستخۆشیبون.

- پورە (مارتا) بەنارازیبونەوە گوتی: پاپاكان، كام پاپا؟ سەبارەت بەم گروپەی ئێستا لەژێر ئەم بەردە قورسانەدا راكشاون قسەم نییە، بەڵام دواجار ناكرێت هەرهەمویان لەگوناهەو هەڵەو رەفتاری مایەی سەرزەنشتكردن بەدوربگرین!. ئەوەش لەكاتێكدا كەدەبێت (بەزۆر) بیر لەپلەی بێگوناهەی (پاپا) بكەمەوە! چونكە (تیۆ) ئەوە بزانە (پاپا) بەبێبەری لەهەموو گوناهەیەك دادەنێن و لەو باوەڕەدان هیچ كاتێك سەبارەت بە پرسی ئاین بەهەڵەدا ناچێت!. باوكە! وانییە؟

- (دۆم لیڤی) بەغەمگینییەكی زۆرەوە قسەكەی پێبڕی و گوتی: هاوڕێی ئازیزم، تۆ ئەم لاوە دەخەیتە ژێر كاریگەری خۆتەوە. هەروەها بەمنت راگەیاند هیچ ئاگایەكی ئاینی نییەو دروّت لەگەڵ منداكرد. (مارتا) بزانە، كە ئەو زۆر سادەو سانا خاوەنی پەروەردەیەكی دژە كڵێسایە!

- پورە (مارتا) بەتوندی وەڵامیدایەوە: تۆ تاڕادەیەكی باش مـن دەناسیت و دەزانیـت منـیش هەمان بیروڕای ئەوم هەیە. لەبنەماو بنچینەدا ئاینەكەمان مایەی دەستخۆشییە، بەڵام كاتێك وەك پراكتیك و زنجیرەی پلەداری لێدێت گروپ و دەستەبەندی كڵێسایی لێدەبێتەوەو هەمویان بەڕێگای لێنەبوردندا دەڕۆن.

- (تیۆ) وتی: راستە. بۆ نمونە كاتێك دەبینم ناتوانم قەشەكانم خۆشبوێت چیبكەم؟

- پورە (مارتا) هاواریكرد: تیۆ، بەئەدەب بە، تكا دەكەم!

- (تیۆ) لەسەرخۆ وتی: بەڵێ، دەبێت بەدەب بین!. باوكە، بمبەخشە!

- دەڵێن (بەڕێز كاردینالْ).

- (دۆم لیڤی) بەتوڕەییەوە وتی: وازی لێبێنە!. چۆن دەتەوێت خۆی لەو تۆڕە رزگاربكات؟ خودی خۆت یەكەمین كەسانێكیت كڵێسە رەخنە ئاژن دەكەیت و ئینجا ئەو ناچار دەكەیت بەنازناوەكەم بانگم بكەیت! ئەمە مایەی تێگەیشتن نییە!.

- (تیۆ) وتی: راستە، ئێستا باسی پیشەی (پاپا)م بۆبكە، كە هیچ كاتێك بەهەڵەدا ناچێت.

- رونیدەكەمەوە. (پاپا) مەرجەعی هەموو كاسۆلیكەكانی جیهانەو بێهەڵەیە، بەڵام كاتێك بەفەرمی بەناوی خواوە لەسەر زەوی سەبارەت بەبابەتی كڵێسایی دەدوێت و بیروڕا دەدات. (تیۆ).. هەرچۆنێك بێت پێویستە كەسێك دەربارەی حەقیقەت حوكم بدات. لەلای ئێمە ئەو كەسە هەمان باوكی پیرۆزە واتە (پاپا). جگەلەوە ئەویش مرۆیەكە وەك هەموو مرۆڤەكانی

دیکە. راستە سەبارەت بەدژی جولەکەگەرایی (ئەنتی سامییزم)و ئەنگیزاسیۆن، ژان پۆلی دووەم، پاپای سەدەی بیستەم، دژایەتیو ململانێی کۆن لەگەڵ گەلی جولەکە کۆتایی پێهێنا.

- (تیۆ) وتی: بەو پێیە (پاپا)کانی پێش ئەو هەڵەیان کردوە.

- کاردینال سەرەرای مەیلی دەرونی خۆی پەسەندی کردو گوتی: ئەگەر بتەوێت دەتوانی بەوجۆرە بیری لێبکەیتەوە. کڵێسا لە مرۆڤەکان پێکهاتووەو پەیامە ئاسمانییەکان زیندانی روداوەکانی مرۆڤە، ناتوانم ئەو تیۆرە رەتبکەمەوە. بەڵام هەرچۆنێك بێت کۆتایی هات. ئیدی جولەکەکان بەگەلی (Deicide) واتە (خواکوژ) ناونابرێنو ئێمە بۆ ئەو ریشەو بنەمایانە گەراوینەتەوە کە لێکەوە نزیکین. واتە جولەکە پێش مەسیح ئاینییان هەبوە. ئەو رۆژەی (ژان پۆل)ی دووەم بۆ کەنیسەی جولەکەکانی (رۆما) چوو روداوێکی گەورەبوو بۆجیهان.

- پورە (مارتا) وتی: زۆرباشە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە پەسەند بکە، کە کڵێسای کریستیانی بەدرێژایی سەدەکان دژی جولەکە بووە.

- بەو جۆرە بڵێین، کە کڵێسای کاسۆلیکی لەپێناوی ملکەچی بۆ پەیامە جیهانییەکەی بۆ هێنانە سەر رێگای ئاینی ئەو کەسانە بووە، کە بەکافری زانیون، هەمیشە هۆکاری دروستو باشی بەکار نەهێناوە.

- بەڵێ، بۆ نمونە سوتاندنی خەڵکی رەسەنی بەرازیل بۆ ئەوەی بزانن رۆح لەجەستەیاندا هەیە یان نا.

- کاردینال بەنارازییەوە وەڵامیدایەوە: لەهەمان کاتیشدا دانیشتوانی رەسەنی بەرازیلی هێرشبەرە ئەوروپاییەکانیان لەبەر هەمان هۆ لەروباردا نغرۆ دەکرد. هەموو ئەوانە پەیوەستن بەرابردووەوە.

- (تیۆ) هاواریکرد: Stop، لێرەدا ئیدی ناکرێت هەناسە بدرێت! خەریکە لەهۆش دەچم!

پورە (مارتا)و کاردینال بەپەلە روەو دەرەوە هەڵاتن. (تیۆ) لەسەر زەوییەکە رۆنیشتو لەجوڵەی (بزنێك) وردبۆوە، کە خەریکی لەوەراندن بوو. بیریکردەوە بزنیش وەکو ئەو بونەوەرێکی وێڵە.

## زارەکانی ئاگرو زاری مرۆڤەکان

- پورە (مارتا) بەبێ مەبەستێکی تایبەت وتی: تیۆ، تۆ سەغڵەت دەبیت؟ دەزانی من و ئۆتافیۆ زۆرجار یەکدی ئازار دەدەین.

- کاردینالْ زیادیکرد: راستە، لێکدانەوەو مشتومڕ دۆستایەتی بەتین دەکات. تورەو سەغڵەت مەبە!

- (تیۆ) هاواریکرد: هەردوکتان من گومڕادەکەن!. ئەم بابەتانە تاڕادەیەکی باش ئاڵۆزن و ئێوەش شتی نوێی بۆ زیاد دەکەن...

پورە (مارتا) بەشڵەژاوییەوە لەتەنیشتییەوە دانیشت و (کاردینالْ)یش بەدەسڕێك خەریکی پاککردنەوەی سەکۆیەك بوو تاجلە ئەرخەوانییە کاردینالْییەکەی پیس نەبێت. بێدەنگی زاڵبوو.

- (تیۆ) دەستیپێکردەوە: باشە، دەرکەوت ئێوە هەم جولەکەو هەم دانیشتوانی رەسەنی ئەمریکاتان ئەشکەنجەداوەو لەژێر چاودێری و ئازاری ئێوەدابون، بەبێئەوەی لەروی مەبەستەوە ئەو کارەتان کردبێت؛ بەلاّم لێرەدا شتێك هەیە من ناتوانم تێبگەم بۆچی دەتانویست بەهەر شێوەیەکبوە بیانهێننە سەر ئاینەکەی خۆتان؟

- بامبینۆ، من ئەوەم باسکرد: چونکە کڵێسای مەسیحی جیهانییە؛ واتە بۆ هەموو جیهانە. تۆ وشەی (کاسۆلیك)ت بیستوەو دەزانیت چییە؟ بەلاّم ئایا واتای راستەقینەکەی لەزمانی یۆنانیدا دەزانیت؟ کاسۆلیك رێك بەواتای جیهانی دێت. بێگومان دەربارەی (پانتکوت) شتێکت بیستوە؟

- (تیۆ) وتی: پانتکوت؟ بریتییە لە پشویەکی درێژ لەمانگی (مەی) هەموو ساڵێکدا.

- (دۆم لیڤی) بەهێواشی وتی: خوای میهرەبان!.. ئەم منالە لەراستیدا شتێکی گرنگ نازانێت. لەکاتێکدا (پانتکوت) روداوێکی چەند قەشەنگە... (عیسا) پاش دوبارە زیندوو بونەوەی بەرەو ئاسمان رۆیشت. پەنجا رۆژ دوای هەڵکشانی موریدەکانی لەتەلارێکی تەواو داخراودا کۆببونەوە، کە لەپڕێکدا هەورە بروسکەیەك لەئاسمانەوە هات، رەشەبایەکی بەهێز هەڵیکردە سەرماڵەکەو زارەکانی ئاگر لەسەر سەری هەریەك لەو دوانزە هاوەڵە وەستا.

- (تیۆ) لەژێر لێوەوە وتی: بەڵێ. دێتەوە یادم. ئەمە لەکارە سەیرەکانی هەمان (کۆترە).

- (کاردینـاڵ) بەنارەحەتییـەوە وتـی: رۆحـی پـیرۆز.. کـۆتر!، مێیـەکی سـپی[1]، راسـتە، بـەڵام نێرەکۆتر...

- (تیۆ) وتی: پەیوەندی بەمنەوە نییە؛ پورە (مارتا) وتی.

- (کاردینالّ) بەشڵەژاوییەوە وتی: ئاها باشە.. بەهەرحاڵ لەئۆرشەلیم رۆژێکی جەژنی گشتی بـوو. موریـدەکان لەهـەموو لایەکـەوە کۆببونـەوە. میـسرییەکان، خـەڵکی کریـت، عـەرەب، رۆمیـەکانو ئاسـوری.. کـاتی گوێبیـستی دەنگـی هـەورە بروسـکە نهێنیئامێزەکـەبون پەلـەی پرسـیارکردنیان بـوو.. لەوکاتـەدا هاوەڵـەکان لەماڵەکـە هاتنـە دەرەوەو لەگـەڵ ئـەو خەڵکـە بێگانەیە بەزمانی خۆیان دەستیان بـەگفتوگۆکرد. پەرەجویـەکی گـەورەبوو، کـە هـەتا ئەوکاتـە کەسیان نەیانـدەتوانی تەنانـەت یـەك وشـەش بـەو زمانانـە بـدوێن و بـچوکترین تێگەیـشتنیان بۆیان نەبوو.

- (تیۆ) وتی: گاڵتە ناکەیت؟ بەراستی بەیەك پیاکێشان هەموو زمانەکان فێربون؟

- بامبینۆ.. زارەکانی ئاگر ئامادەیی‌و فێربونی خێرای هەموو زمانـەکانی تێـدا دروسـتکردن. گومانیان لەوەهەبوو زیـاد لـەڕادە شـەرابیان خواردبێتـەوە، بـەڵام (پـەی یـر) پێیڕاگەیانـدن، کـە سەعات نۆی بەیانییەو هێشتا کاتی مەستبوون نەهاتوە. ئەوان مەسـت نـەبون، بـەڵکو سروشـتی پـەیامی جیهانیانـەی (پـەیمانی نـوێ) ئاشـکرابوو. لەکاتەشـدا ئامـادەبون‌و توانیـان بەهـەموو زمانـەکانی سـەر روی زەوی دەسـت بـەئامۆژگاری بکـەن. لەبەرئەوەیـە (پـانتکوت) جـەژنێکی جیهانییە.

- پـورە (مارتـا) سـەلماندی: ئـەم دیاردەیـە پەیوەسـت بەیـەك سەرچـاوەوە نییـە. تەنانـەت زاراوەیـەکی زمانـەوانی هۆشـیارانە هەیـە کـە بـە(Glossolalie)[2] ناودەبرێـت‌و هەنـدێکجار لەنەخۆشخانەی سایکۆلۆژیدا نەخۆش دەبینرێت دوچاری ئەو نەخۆشییە بوە. کاتێك کەسانی وەك تـۆی کڵێـسایی لەسـەدەی حەڤـدەی ئـەوروپادا جادوگـەرەکانیان ئـازارو ئەشـکەنجەدەدا، لەپڕێکدا بەزمانێکی نەناسراو دەستیان بەقسە دەکرد.

- لەوانەیە، بەڵام ئەو دیاردەیە لـەلای رۆح نامۆیـەو هـەتا رونکردنەوەیـەکی زانـستیانەی بـۆ نەدۆزرێتەوە ناتوانرێت رێگری لەو بیرۆکەیـە بکرێـت، کەدەسـتێکی بـەهرەی خـوایی لـەوکارەدا

---

[1]. Lacolombe کۆتری سپی لەئاینی مەسیحیدا رەواڵەتی رۆمی پیرۆزە. (میلینا)

[2]. ئەم زاراوەیە بۆ بەهرەیەکی ناسروشتی قسەکردن بەزمانە جۆراوجۆرەکان دانراوە. سەبارەت بەنەخۆشی هەندێك نەخۆش زمانی تایبەتی بەکاردێنا، کە لەوسەی [illegible] دروست دەبوو.

هەیە. لەسەردەمەکانی دوایدا ئەم بابەتە بەبارێکی دیکەدا خراوەتەڕوو. بزاوتێکی مەسیحی بە(نوێبونەوەی ژیانی بەهرەمەندی کریستیانی) ناوزەدی کردوە. ئەمڕۆ لەگەڵ نەریتی کۆنی سەردەمە سەرتاییەکانی کریستیانی پەیوەندی گرێدراوەو لەکۆبونەوەی ئەندامەکانیدا ئەو بابەتانە کەم نیین، کە ئەم یان ئەو ئەندامی کۆبونەوەکە، بەزمانی جۆراوجۆر پێیدەدوێن. ئایا ئەمە نیشانەی خودایی بونی کڵێسای کریستیانی نییە؟

- (تیۆ) وتی: ئەم (glassilila)یەی تۆ لای من سەرنجڕاکێشە، بەتایبەتی کەلەگەڵ زمانی ئەڵمانیدا گرفتم هەیە!

- پورە (مارتا) وشەکەی راستکردەوەو گوتی: (glossolalie)، سەرەڕای ئەوە زۆر هیوادار مەبە بتوانیت بەئاسانی بەکاریبهێنیت!

- (دۆم ئۆتاڤیۆ) بەشداریکرد: بۆچی؟ مەگەر مەسیح نەیوتوە: (بهێڵە منالەکان بەرەو من بێن).

- (تیۆ) لەسەرخۆ وتی: بەسە!. بەداخەوە زمانی عیبری نازانم، بەڵام زمانی (ورلان)[1] دەزانم. تۆ ئەم وشەیە دەناسیت بەڕێز (تالدیکار)[2].

- کاردینال پێکەنیو گوتی: بەداخەوە، من جگە لەفەشەیەکی حکومەتی کڵێسایی رۆم هیچی دیکە نیم، کارمەندێکی کڵێسا. تەنها تائەو رادەیەی بتوانم واتاو چەمکی جیهانی (پانتکوت)ت بۆ رونبکەوە. هەروەها سەرنجبدە (پاپا ژان پۆل)ی دووەم لەگەشتەکانیدا، کە لەفڕۆکە دادەبەزێت خاکی وڵاتی خانەخوێ ماچ دەکات.. ئەوە شێوازێکە ئەو هەڵیبژاردوە، بۆ ئەوەی ئەوە بەرجەستە بکات، کە خاك لەهەر شوێنێك بێت پیرۆزو موبارەکە.

(تیۆ) وتی: لەتەلەفزیۆندا بینیومە دواینجاریان پیرەپیاوەکە نەیتوانی بۆ ماچکردنی زەوی بچەمێتەوە.

- بەڵام هەروا درێژەی بەگەشتەکانیدا تائەوکاتەی لەیەکێکیاندا بەسەختی بریندارکرا. دیارە ئۆتۆمبیلە گوللەنەبڕەکەیت بینیوە، کە پێیدەڵێن (پاپا مۆبێل). (ژان پۆلی دووەم) سەرانسەری جیهان گەڕاوە، چونکە کریستیانی گشتگیرە. هەموو خەڵك دەتوانن ببنە مەسیحی... هەندێك ئاین داخراونو ئەگەر بەو ئاینەوە لەدایك نەبوبیت چونە ناوی گەلێك دژوار دەبێت. ئاینیش هەیە دەروازەیان بەڕوی هەمواندا والآیەو کریستیانیش یەکێکە لەوانە. هەموو کەس دەتوانێت

---

[1]. لێرەدا (تیۆ) وشەیەکی (بێواتای) بەکارهێناوە..

[2]. لێرەدا وشەی (کاردینال)ی ئاوێتەو تێکەڵ کردووە.

ئەم ئایینە وەرگرێت، لەبەرئەوەی ئێمە جیهانین. (کاردینالٚ) عەباکەی چاککرد، کە بەڕواڵەت ڕونکردنەوەکانی کاریگەری لەسەر (تیۆ) دانابوو.

## شەهیدانو سەرکەوتوان

- (تیۆ)، کە بڕۆکانی هێنابۆوە یەك، لەپڕێکدا وتی: هەر کەسێك ئارەزویکرد دەتوانێت، بەڵام بۆچی دەبێت ناچاربکرێت؟

- کاردینالٚ وتی: ئەمە پەیامێکی ترە!. کەواتە بامبینۆ.. تۆ هەرگیز ناتەوێت کۆتایی بەپرسیارەکانت بێنیت. ئەوە چیرۆکێکی درێژە ئازیزەکەم دەبێت ئەوەش بگێڕمەوە؟

- پورە (مارتا) وتی: بەڵێ ئۆتافیۆ. حەزدەکەم وەڵامەکەت بزانم.

- (دۆم لیفی) ملکەچبوو گوتی: سەرەتا کریستیانەکان لەڕێگای نمونەو بەڵگەکانەوە خەڵکی دیکەیان بۆ سەر ئاینەکەیان رادەکێشا. لەو ڕۆژانەدا ئاینەکانی دیکە ڕێچکەیەکی نهێنی ئامێزیان هەبوو، کەتەنها دەوڵەمەندەکان دەستیان پێڕادەگەیشت، بەڵام کریستیانی ئامێزی خۆی بەڕوی بێنەواترینو هەژارترین خەڵکانو کۆیلەکاندا واڵاکردبوو. مرۆڤ هەر مرۆڤ بوو.. تەواو. ئەم شتە لای هەموان مایەی بڕوابون بوو. پاشان کریستیانەکان لەبەرامبەر ئازارو ئەشکەنجەکانیاندا ئازاییو دلێرییەکیان نواند، کە بۆ قوربانیو شەهیدبون گۆڕاو هەر شەهیدێك موریدی نوێی هێنایە سەر ئاینەکە، چونکە وشەی (شەهید) لەزمانی یۆنانیدا بە واتای (گەواهیدەر) یان (گەواهی) دێت. لەڕاستیدا شەهید گەواهی بۆ باوەڕەکەی دەدات. لەبەرئەوە دەرکەوت ئەو خوایە نوێیە توانایەکی مەزنی هەیە، چونکە دەتوانێت وزەیەکی هێندەمەزن بەپەیڕەوانی ببخشێت... کریستیانەکان هەوڵی شەهیدبونیان دەداو مەرگی سەرجێگایان لەلا شەرمەزاری بوو!.

- (تیۆ) لەسەرخۆ وتی: من جێگاکەی خۆمم لە قەپاڵی شێرێکی برسی پێباشترە.

- کاردینالٚ وتی: منیش هەروەها!، ئەمە مرۆڤانەترە، بەڵام بنەمای کڵێسای کریستیانی لەسەر پەیکەری یەکەمین شەهیدی خۆی بنیاتنراوە. ئەوانە بون تۆوەکەیان وەشاند، ئەوان بونە پیرۆزمەندی بەهێزکردنی کریستیانی.

- پورە (مارتا) وتی: هەرچیش لەوانە مابۆوە وەك تەبەروك هەڵگیرا. پارچەی جلوبەرگ، پارچەی ئێسقان، ددانی زەرد هەڵگەڕاو، هەموو شتێك بۆ پەرستنو پیرۆزکردن. (ئۆتافیۆ).. ئەمە جگە لەکارێکی بتپەرستی لەبەرگێکی دیکەدا هیچی دیکە نەبوو!

- کاردینـاڵ وتـی: لەوانەیـە، کـەمێك، بـەڵام واتـای راسـتەقینەو واقیعیانـەی شـەهیدبون لەجێگایـەکی دیکەدایـە. لەگـەورەترین شـەهیدمان (پـەی یـری پـیرۆز) بڕوانـە... بڕیاریـدا بەخاچەکەوە ملکەچی بنوێنێت تا شەهیدبون مرادی خۆی ببەخشێت.

- هەر لەبەرئەوەیە گەورەترین شەهیدە.

- نـەخێر، نـەك تـەنها لەبەرئـەوە. لەیەکـەمین روبەڕوبونـەوەدا؛ کاتێك مەسـیح ئـەوی بـینی ناوی لە(سیمۆن)ـەوە بۆ (پەی یر) گۆڕیو پێیگوت: (تۆ پـەی یریـت)[1]. منـیش لەسـەر روی ئـەم بەردە کڵێساکەم دروست دەکەم)؛ ئەوەش رویدا.. گەورەترین کڵێسای کریـستیانی لەسـەر گـۆڕی (پـەی یـر) لـە(فاتیکـان) دروسـتکرا. لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم (سـیمۆن – پـەی یـر)ـە پیـاوێکی ترسنۆکبوو، کاتێك مەسیح لە باخی زەیتوندا دەستگیرکرا ئەو هەڵات...

- (تیۆ) وتی: درۆزن، ترسنۆك.. ئینجا دەڵێیت پیاوێکی پیرۆز.

- پەلـە مەکـە بـامبینۆ.. واتـای راسـتەقینەی شـەهید ئەمەیـە، کـە مرۆڤێکـی سـادە بتوانێـت بەناوی خواوە ئازار بچێژێت. دەبێت پیاوێکی هەژاری وەك (پەی یر) بـۆ دروسـتکردنی کڵێـسای جیهـانی هەڵبـژێردرێت!. پیاوێـك بتوانێـت روخـسارو نوێنـەری هـەموو پیـاوانی دیکـە بێـت، بەخـەوش‌و گوناهەکانییـەوە، لەبەرهـەمان هۆیـە کاتێـك (عیـسا) پـاش گەڕانـەوەی بـۆ جیهـانی زینـدوەکان لەکـەنار دەریاچـەی (تـی بـەرباد) لەبـەردەم (پـەی یـر) دەردەکـەوێت‌و پێیـدەڵێت: (مێگەلەکەم بلەوەڕێنە)[2].

- (تیۆ) وتی: بۆ رێگرتن لەجەنگی مەڕان؟

- نەخێر، بامبینۆ. مەبەست (ئاشتی بەمێگەلەکەم ببەخشە) نییـە، بـەڵکو مەبەسـت ئەوەیـە (مێگەلەکەم بۆ لەوەڕ ببە)، واتە خۆراکیان پێبدە. وشەی (بلەوەڕێنە) فـەرمانی (لەوەڕاندنـە)و مەبەست بۆ لەوەڕگایان ببە.

- (تیۆ) وتی: هەمان دەستەواژەی (بهێڵە بلەوەڕێن). کەواتە (عیسا) هاوەڵەکانی خۆی نـاردوە بەلای کاروکاسبی خۆیانەوە.

- کاردینـاڵ هەناسـەیەکی قـوڵی هەڵکێـشاو گـوتی: ئـەم زمانـە فەرەنـسیەی ئێـوە سـەیرو سەمەرەیە. نەخێر مەبەست ئەوەیە (پەی یر)بوو بەشوان‌و خودانی هەموو کریستیانەکان.

---

[1]. Pierre لە زمانی گشتیدا بە واتای گشتیدا بەواتای بەرد دێت.

[2]. کێشە لەوشەی (Paie) بەواتای (بلەوەڕێنە)و وشـەی (Paix) بـەواتای ئاشـتییە، کـە وتنـی زارەکـی هـەردوو وشـەکەیەو دیارە لەواتادا جیاوازن.

- (تیۆ) وتی: کەواتە هەمان مێگەل؟

- (دۆم لیڤی) بەتوڕەییەوە وتی: ئاژەڵان بێدەسەڵاتن!. (تیۆ) ئەگەر بتەوێت هەروا بەردەوام بیت توڕە دەبم!

(تیۆ) وتی: سەیرە، بەناوی خۆمەوە بانگت کردم، ئەمە خۆی لەخۆیدا پێشکەوتنە...

- بامبینۆ.. گوێبگرە. من ئارامیو حەوسەڵەی (پەی یر)م نییە... لەیادی مەکە! شازادەی هاوەڵەکانە (Princepe)و یەکەمین کەسایەتی نێوانیانە. بەهۆی بەرەکەتی ئەوەوە (رۆما) ئاراستەی خۆی گۆڕی. رۆمی (رۆمییە) کۆنەکان تەنها (شاری حەوت تەپە) بوو، لەوەوپاش شاربوو بەیەکەمین بەردی کڵێسای کریستیانی.

- (تیۆ) وتی: بۆچی (رۆما)و شاری (ڤینیس) یان شاری (تۆمبوکتۆ)[٣] نەبێت.

- بامبینۆ...پاپاکان هەمیشە لەرۆما ژیاون. ئەوانیش دوچاری ئازارو ئەشکەنجەبونو ناچار بەهەڵاتنو دەرکەوتنەوە لەشاری پیرۆز کراون. لەسەدەی چواردەیەم ماوەی حەفتا ساڵ لەشاری (ئەڤینیۆن)[٤] بونە پەناهەندە. لەسەدەی نۆزدەدا لەلایەن ناپلیۆنەوە (پاپا)یەك کرایە بارمتەو بەزۆر بۆ فەرەنسای برد[٥]. بەداخەوە ئەم روداوانە بەئاسانی تێپەڕین.

- (تیۆ) لێبڕاوانە وتی: بەوجۆرە روداوی تەلارسازی تۆش هێندە توندوتۆڵ نییە.

- بەڵام بەدەربڕینی (عیسا) کڵێسا تەنیا بینایەك نییە، بەڵکو کۆمەڵگەی هەموو کریستیانەکانی جیهانە. یەکەمین کەسی نێو ئەوانە گیانی سپارد لەشاری رۆمابوو. لەبەرئەوە رۆما بووە خاوەنی ئەم پەیامەیەی کەکڵێسای مەسیح دروستبکات. ئەوسا پاش خولی ئازارچەشتن ئاینی کریستیانی بوو بەئاینی فەرمی دەوڵەتی (رۆما)و لەوەودوا بوە دەسەڵاتدار. کاردیناڵ لێرە بێدەنگبوو؛ پاشان درێژەیپێدا: پاشئەوە بڵاوکردنەوەی ئاین زۆرجار لەرێگای سوپاوە ئەنجام دەدراو ئیدی جەنگ بارێکی پیرۆزی بەخۆوەگرت. ئیسلامیش هەمان شێوەی پیادەکردو قورئان باس لە(جیهاد) یان جەنگی پیرۆز دەکات، کە دژ بەکافر بەرپادەکرێت. لە

---

[٣]. Tombooctoo شارێکە لە (مالی) لەباکوری خۆرئاوای نایجیریا لەسەر سنوری کۆتایی ئەفریقا. ناردن یان چون بۆ ئەو شوێنە واتا شوێنی دورە دەست کە مایەی دەستڕاگەیشتن نەبێت.

[٤]. Avignon شارێکی گرنگە لەباشوری فەرەنسا، کە ئەمڕۆ بە ڤیستیڤاڵی هونەری خۆیەوە بەناوبانگە. سەردەمانێك بارەگای (پاپا)کانی ناسراو بە (پاپاکانی ئەڤینیۆن) بووە.

[٥]. مەبەست (پاپا)ی حەوتەمە، کە ناپلیۆن بەزۆر پەیمانی (Cancordot)ی پێ ئیمزاکردو لەاهەنگی تاجگوزاری ناپلیۆن بەشداریکردو بە ئیمپراتۆری راگەیاند. خۆ بەدوورگرتنی لەهەڵوەشانەوەی (ژوروم بۆناپارتی) برای (ناپلیۆن)و پاشان بەکافرکرتنی (ناپلیۆن) بوە هۆی زیندانی کردنی لە (فۆنتن) بەفەرمانی خودی ناپلیۆن.

کریستیانیدا بەوجۆرەبوو، کە دەبێت ئاین بەتەواوی ناوچەکانی جیهان بگەیەنرێت. ئەگەر لەڕێگای خوایشتەوە مەیسەر نەبوو لەڕێگای زۆرەوە بسەپێنرێت.

- (تیۆ) پێداگری کرد: باشە بۆچی؟

- کاردینال لەژێر لێوەوە وتی: هەڵبەتە لەبەرئەوەی کریستیانەکان لەوباوەڕەدان ئەوان راستن. مێژووی ئاینەکان مێژووی لێنەبوردەییەو سروشتیشە. ئاینی کریستیانیش لەو سیفەتە بێبەری نەبوە. هەروەك چۆن جولەکەگەراییش لەهەندێ سەردەمیدا هەروابووە. ئێمەش بەو بازنەیەدا خولاوینەتەوە. فەرماندەیەکی کاسۆلیکی، کە بەرپرسی دامرکاندنەوەی هەڵگەڕانەوەی (کاتارەکان)بوو، لەڕستەیەکدا ناشرینترین وێنەی ئەوەی کورت کردۆتەوە. (کاتارەکان) گروپێکی بەهرەمەندبون، کە نەفرەتو کینە بۆجیهان تا ئەو شوێنەی بردبون بۆ ڕێگری لە دەسەڵاتداری خراپە رایاندەسپارد خۆکوژی بکەن.

- (تیۆ) وتی: لەیادمە، باوکە (دۆبۆر) لە ئۆرشەلیم باسی ئەو گروپەی بۆکردم.

- کاردینال وتی: سەیرە، وامدەزانی شتێکت فێردەکەم! زۆر باشە، ئەم گروپە لەجۆری ئەو گروپانەن کە ئەمڕۆ نمونەیان زۆر دەبینرێتو بۆ مرۆڤ مەترسیدارن، بەلام ئەوە لەڕابردویەکی دوردا ڕویداوە[1]!

- (تیۆ) بەحەزێکی زیاترەوە پرسی: ئەو سەرداره جەنگییە کێبوو؟

- ناوی (ئامور – ئاموری)بوو. ئەو فەرمانی رەشەکوژی هەموو باشوری فەرەنسای دەرکرد، کە زۆر لە کاسۆلیکەکانیشی تێدابوو، ئینجا بۆ پاساودانی کارەکەی ئەم رستە تۆقێنەرەی گوتوە: **(هەمویان بکوژن، خوا لەناویاندا پەیڕەوانی خۆی دەناسێتەوە).**

- پورە (مارتا) گەیشتە ئەو ئەنجامە: لەبەرئەوەیە من لایەنگری ئاینێکم کە کەمایەتییە، چونکە پارێزگاری لە لاوازەکان دەکەن، بەلام کە ئاینی کاسۆلیکی دەستی بەدەسەلات رادەگات بەپێی پێویست زاڵمانە دەجولێتەوە.

- کاردینال وتی: مارتا.. تۆ لەرۆمادایت، لەناو دڵی دەسەڵاتدارێتی خودی کڵێسای کاسۆلیکیو جیهانی. دڵنیابە ئیدی کریستیانی رزگارکاری جیهان نییە؛ سەردەم سەردەمی گفتوگۆی نێوان ئایینەکانە.

---

[1]. ئەوانە گروپێکی (Neomani cheenne) (نێومانێ)ی بون. لەسەدەکانی یانزە بۆ سیانزە لە زۆر ناوچەی ئەوروپاو بەتایبەتی لەخواروی فەرەنسا جێگیربوون. مەزهەبەکەیان لە ئاینی مانیو کریستیانی ئاوێتە بوو.

- پورە (مارتا) بەدەنگی بەرز وتی: خوابکات تۆ راست بکەیت!. جەنگی لێبوردن بەرشتنی ئەشك رێکنەخرێت.

(تیۆ) مشتێك گیای بۆ بزنێك ڕاگرتبوو، لەچاوشەیتانی و ئازاراوییەکەی ئاژەڵەکە رامابوو. بەبێئەوەی روی لەپورە (مارتا) یان کاردینالْ بێت، وتی: خەڵکانێك هەیە بەرخ دەلەوەڕێنن، خەڵکانێکیش هەیە وەکو من گیا دەدات بە(کار).

## بەشی هەشت

## (هەیبەت، ڕازانەوەو نەداران)

ئێستا ڕۆژە دیاریکراوەکەیەو ڕۆژی چاوپێکەوتنی ئایندە لەگەڵ (ئەوان) (تیۆ)ی زۆر بێحەوسەڵەو نیگەران کرد بوو. ئەمجارە کێ پەیدا دەبێت تا پەیامەکەی بداتە دەست؟. جادوگەرە نوێیەکان لەپشتی کام پایەوە خۆیان حەشارداوە؟. شەوی رابردوو لەسەر مێزی نانخواردن پورە (مارتا)و (دۆم لیڤی) لەسەر (مافیا)و هەڵبەتە قەشەکانیش بۆ ساتێك لەگفتوگۆو مشتومڕ نەوەستان. پورە (مارتا) کەبەتام وچێژەوە دومبەلانەکانی دەخوارد باسی ئەوانی دەکرد. (تیۆ) لەسەر مێزی نانخواردنەکە خەوی لێکەوتو بەباوەش بۆ ژورەکەی خۆیان بردەوە.

بەلام پاش ئەوەی پورە (مارتا) بە هێواشی دەرگای ژورەکەی داخستبوو (تیۆ) لەژێر لێفەکەیەوە تەلەفونەکەی دەرهێنابوو. کارێکی بێسەمەر بوو، چونکە بۆ تەلەفۆن کردن بۆ (فاتۆ)ش درەنگبوو، ئەو زوو دەنوست. لەهەمووی ناخۆشتر ئەوە بوو ڕۆژی دواتریش کەش باراناوی بوو. (تیۆ) نیسکەکانی لەباڵەکۆنەکەدا ڕۆنا، بەو هیوایەی کەش باش بێتو لەهەمان کاتدا بەجۆرێك لەحەسرەتەوە بیری لەتیشکی خۆری میسر کردەوەو نغرۆی خەونی جمکە لەدەستچووەکەی بوو. کەی دوبارە دێتەوە؟ ئەمە رازێکە. دیارە ئەگەر خۆرەتاو نەبێت برا جمکەکەشی ناگەڕێتەوە.

### دەوڵەتێك، جیاواز لەجەوهەری ئەوانی دیکە

ناشتاکردن لەکەشێکی سروشتیدا نەبوو. (تیۆ) دەیویست درەنگ لەخەو رابێت. بەلام پورە (مارتا) بواری پێنەداو بەسەرسەرییەوەبوو تا بەتەشەرلێدان ناچار بەخۆگرینی بکات. کاردینال لەهۆڵی هۆتێلەکە چاوەنواڕ بوو، دەبوو پەلە بکەن!

- بامبینۆ باش خەوتیت؟

- (تیۆ) خێرا وەڵامیدایەوە: ئەی تۆ پیرەمێرد.. چۆن خەوتیت؟

کاردیناڵ وتی: خراپ نەبوو. شەکەت نیت؟

هیچ نییە. ئەمڕۆ چیدەکەین؟

- پیاوی ئاینی پلەبەرز بەنازەوە وتی: ئیتالیا بەجێدەهێڵین!

- بەفڕۆکە؟

- هەرگیز. بۆ (ڤاتیکان) دەچین، چونکە خۆی دەوڵەتێکە. بامبینۆ.. فراوانیەکەی چل و چوار هێکتارە، بۆ خۆی خاوەنی حکومەت، ئاڵا، پارەی تایبەت، پولی پۆستە، رادیۆ و رۆژنامەیە...

- پورە (مارتا) قسەکەی پێبڕی و گوتی: (ئۆسێرڤاتۆر رۆمانۆ)[1] ئۆرگانی فەرمی قەڵەمڕەوی (پاپا)یە، بەڵام لەگیرفانێکدا جێگای دەبێتەوە!

- ئا... بەڵێ سنوری نێوان دوو دەوڵەت بونی نییە، بەڵام کاتێك کەسێك لە ڤاتیکانە لەجیهانێکی دیکەدایە.

(تیۆ) بەخۆهەڵقورتانەوە پرسی: جیهانێکی کە تۆ تێیدا وەزیری؟

- بەبێ هیچ بانگەشەیەك، جێگری یاریدەدەری وەزیر.

- ئەی ئەو دەوڵەتە دانیشتوانەکەی چەندە؟

(کاردیناڵ) وەڵامیدایەوە: حەوت سەد تا هەشت سەد کەس.

- (تیۆ) وتی: کەواتە شوێنی لاف و گەزاف نییە!

- بەڵام بۆخۆمان یاساو سیستمی تایبەتمان هەیە، هەڵبژاردنی پاش مەرگی (پاپا)یەك.

- (تیۆ) بەبڕوایەکی پتەوەوە وتی: کەواتە ئەگەر هەڵبژاردنت هەبێت خاوەنی حکومەتی دیموکراسیت!

- پورە (مارتا) چووە ناو گفتوگۆکە: بەتەواوی نا! پێی بڵێ چۆن (پاپا)ی نوێ هەڵدەبژێرێت.

(کاردیناڵ) وتی: هەموو (کاردیناڵ)ەکانی جیهان لەتەلارێکی داخراودا کۆدەبنەوەو تەنها کاتێك دەتوانن لەو تەلارە بچنە دەرەوە (پاپا)یەکی نوێیان هەڵبژاردبێت. ئەم کۆبونەوەیە بە(کۆمەڵگە - Canclare) ناودەبرێت. مشتومڕی ئەم گردبونەوەیە لەوانەیە زۆر بخایەنێت. لەمێژودا رویداوە (کاردیناڵ)ەکان زیندانی کراون تا زوتر بڕیاربدەن، چونکە ئەو هەڵبژاردنە ئەرکێکی گەلەك گەورەیە. هەڵبژاردنی جێگری (مەسیح) کارێکە رەنگدانەوەی بەسەر جیهانەوە هەیە. کاتێك دەنگدرا ئاگرێکی بچوك دەکرێتەوە: ئەگەر راکان بەدوا ئەنجام

---

[1] Osservatore Romano رۆژنامەی تایبەتی (پاپا)و وتەبێژی ڤاتیکانە .و. کوردی.

نەگەیشتبن ئەو دوکەڵەی لەدوکەڵکێشەکەوە دەردەچێت رەش دەبێت، خۆ ئەگەر دوا بڕیار درابێت دوکەڵەکە سپییەو بەو واتایەیە (پاپا)ی نوێ هەڵبژێراوە.

- پورە (مارتا) وتی: لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵینەوەیەکی دیکەش دەکەن؛ واتە پشکنینی جەستەیی بۆ کەسی تازە هەڵبژێراو دەکەن تا بزانن پیاوە!

- (تیۆ) وتی: چ بۆچونێکی سەیروسەمەرەیە، مەگەر لەرواڵەتیدا دیارنییە؟

- (کاردینالّ) بەنەرمی وتی: زۆرباشە. لە ئەفسانەکاندا هاتوە جارێك بەهەڵە (پاپا)یەکیان هەڵبژاردوە بەناوی (جێن - Jeanne)و ژن بوە. گرەو دەکەم ئێستا پورە گیانەکەت هاوار دەکات بونی ژن بە(پاپا – پاپیس) چ خەوشێکی تێدایە؟

- (تیۆ) وتی: بەڵێ، راستە، چ خەوشێکی تێدایە؟ بۆچی قەشەکان دەبێت هەمیشە پیاوبن؟ ئەی بۆچی هاوسەرگیری ناکەن؟

- (کاردینالّ) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: دوبارە گەڕاینەوە بۆ خاڵی سەرەتا! لەسەرەتای پەیدابونی کڵێساوە بەگشتی قەشەکان لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا دەژیانو هەلومەرج زۆر باش نەبوو: گرنگیان بەئەرکو کارەکانیان نەدەداو هەستو هۆشیان لەشوێنێکی دیکە بوو. دواجار ژن خواستن قەدەغەکرا. دەتەوێت بڵێم چی؟ دەبێت قەشە هەموو ساتێك لەخزمەتی خەڵکدا بێتو ئەگەر ژن بخوازێت ئەو لەخەڵکی لەپێشتر دادەنێت.. لەبەرئەوە هاوسەرگیری قەشەکان قەدەغەکرا.

- پورە (مارتا) وتی: هاوڕێ ئازیزەکەم لە(کاسۆلیکگەرایی)دا جێگای ژن لەکوێدایە؟

- مەبەستت چییە (مارتا)، بێگومان بەڕاستت نییە. لەنزیکەوە لە (پەیمانی دێرین)دا تێبینی رۆڵی ژن بکە! (ئەبراهام) بەبێبونی (سارا)ی بەتەمەن نەدەبوە یەکەمین باوکسالار. بەبێ (مریەم) (عیسا) خاوەنی جەستە نەبووا. لەونێوەندەشدا قارەمانانی وەك (جودیت)[1]، کە بەهۆی عەشقەوە توانی سەری سەرداری دوژمن ببڕێت. لەیادم نەچێت (ئیستار)[2]، کە لەڕێگای شوکردنی بەپاشایەکی بتپەرستەوە ناچاری کرد لەگەڵ جولەکەکان میهرەبان بێت، ژنانی

---

[1] Judith قارەمانی (کتێبی جودیت) (پەیمانی کۆن)، کە لەپێناو رزگارکردنی شاری (بتولی – Bethulie) سەرداری ئاشوری (هۆلۆفێرن – Holopherne) پەرێشانی خۆی دەکاتو لەکاتی مەستبوندا سەری دەبڕێت. ئەم دیمەنە (جودیت لەگەڵ سەری بڕاوی هۆلۆفێرن) بەهرەبەخشی شاکاری زۆر لەوێنە کێشەکان بووە. و. کوردی.

[2] Esther ژنێکی جوانی جولەکە بوو، کە هاوسەری (ئەسویرۆس) (بەقولی خشاریا شا)بوو. بەیاریدەدەری مۆردخای جولەکەکانی پارس رزگار دەکات، کە بەهۆی جموجوڵی (ئەمان)ی وەزیرەوە لەمەترسیدا بووە، ئینجا موردەخای دەکاتە وەزیری (ئەسویرۆس). و. کوردی.

دیکەی گومناوی نەناسی دیکە لەیاد نەکەم، وەك (روت - Ruth) لەگەلی (موئابیت)[٣] و (نۆیمی) خەسوی. (روت) کچێکی هەژارو ناجولەکەو بتپەرستە، خەسوەکەی داوای لێکردوە منالێکی ببێت تا وەجاخیان کوێر نەبێتەوە، چونکە کورەکانی هەموو مردون. هەردوو ژنە لەسەفەردان، برسیو بێلانە ... (روت) نازانێت چی بکات. پاشان دەنگۆ بلاودەبێتەوە یەکێك لەخزمە دورەکانی خەزوری لەو ناوەیە، کە پیاوێکی دەولەمەندە بەناوی (بوز). بیریکردەوە ئەو کەسە دەتوانێت باوکێکی شەرافەتمەند بێت. ئەو بابەتە لەگەلْ (نۆیمی) باس دەکاتو ئەویش رازی دەبێت.

- (تیۆ) وتی: بەلێ، فەرموو! بونی هاوسەر گرنگ بوو!

- ئەم چیرۆکە یەکێك لەجوانترین ئەفسانەکانی (تەورات)ـە. (روت) لەکێلگەکانی (بوز) خەریکی کارکردن دەبێتو (بوز)یش لەکاتی هەلگرتنەوەی بەروبومدا تێبینی ئەو کچە جوانە دەکات. لەکاتی نانخواردندا دەیناسێت. (روت) بەمەبەست لێی نزیکدەبێتەوە، بەلام گرفتەکە لەوێدایە بەپێی یاسای جولەکە هاوسەرگیری کەسێکی جولەکە لەگەلْ کافرو خوانەناسێکدا قەدەغەیە.

- (تیۆ) وتی: ئاخ... سەرکەوتوو نەبوو!

- بەلام (نۆیمی) بەتەمەن رێگاچارەکە بە(روت) دەلێت: رێگا چارە ئەوەیە کاتێك (بوز) خەوتوە (روت) بچێتە سەرجێگایو خۆی پێشکەش بکات. (روت) بەقسەی دەکاتو چاوەروانە شەو دابێت تا لەتاریکی شەودا نەخشەکەی جێبەجێبکات. (بوز) بەسەرسامییەوە بێداردەبێتەوەو دەلێت: (تۆ کێیت؟)، چونکە لە تاریکیدا نایناسێتەوە، (روت) وەلام دەداتەوە (نۆکەری تۆم... ئامێزت بۆ کەنیزەکەت بکەرەوە). (بوز)ی جولەکە سەرەرای یاساکانی ئاینەکەی (روت) دەکاتە هاوسەری، چونکە لە ئاوازەکەیدا خواستێکی مرۆڤانە دەبیستێتو وەلامیدەداتەوە.

- (تیۆ) بەدەرئەنجام دەکاتو دەلێت: واتا لەتاریکیدا جێخەوی لەگەلْ دەکات.

(کاردینالْ) وتی: بەلێ، بەیانی (بوز) پێیدەلێت: (مەترسە.. ئێستا هەرچی تۆ بیلێیت ئەنجامی دەدەم چونکە تۆ ژنی پارسایت). (پارسا) ژنێکی کافربووەو لەخەودا خودانەکەی فریوداوە. (تەورات) هەولی ئەم ژنەی بەچاکە وەرگرتووەو بەرزنرخاندویەتی، کە دەبێتە نەنکە گەورەی (داود پاشا). تیۆ.. من ئەم روداوە...نازانم چۆن بەتۆ بلێم، پرشکۆوخرۆشاو دەیبینم!

- پورە (مارتا) بەوشکییەوە وتی: خرۆشاویو شکۆمەندی لەکوێیە؟ بەگشتی دەتەوێت بلێیت ژنان تەنیا بۆ دروستکردنی منالْ باشن.

٣. Moabit ئەم گەلە ناوەکەیان لەناوی (Moabe) یەکێك لەکەسایەتییەکانی (پەیمانی کۆن) (کتێبی پیکهاتن) وەرگرتووەو لە کەناری دەریای مردوودا ژیاون. و. کوردی.

- (کاردینالْ) وتی: بەلاّم هەرچۆنێك بێت (تیۆ) منالْ لەسکی پیاودا گەورە نابێت. چۆن دەتوانیت هێندە سیفەتی دایکایەتی سوك بکەیت؟ دایك ژیان دەبەخشێت. دایکبون بەهرەی خواییە.

(تیۆ) وتی: OK. لەوبارەدا پێویست ناکات رێگری لەژنان بکەیت نەبنە قەشە، وانییە؟

(کاردینالْ) بێدەنگ بوو. گومانی تێدا نەبوو پورە (مارتا) خەریکی وەلاّمدانەوە بوو. سەرەتا رەخنەی لەتایبەتمەندی دژ بەژنانی کلێسا گرت، پاشان داکۆکی لەبزاوتی بەرگری لەماق ژنان لەنیل کرد،بۆ ئەوەی ببنە قەشە. لەو بێدادییەی دەرهەق بەیەکەم ژنی دانیار (حەوا)کرا بەتاوانی خواردنی سێوێك، کە بوو بەهۆکاری گوناهەی هەموو پیاوانی جیهان... پرسی دیکەش، کە پورە (مارتا) بە وردیو بەحەوسەڵەوە شیکردەوەو چارەکە سەعاتێك بەجۆشوخرۆشەوە دوا. (کاردینالْ) لەبەردەم زریانی پورە (مارتا)دا سورببۆوە. (تیۆ)ش زۆر بەختیار دەردەکەوت.

## گەورەترین کلێسای جیهان

ئۆتۆمبیلەکە لەبەردەم پایەکانی (برنینی – برنن) لەگۆڕەپانی گەورەی کلێسای (بوترسی پیرۆز) راوەستا. تارادەیەك گۆرەپانەکە چۆلْ بوو، کە لەژێر دلۆپەی باراندا دەدرەوشایەوە، تەنها چەند راهیبەیەکی چەتر بەسەر دەبینرا، کە پێبەپێ دەرۆیشتن.

- پورە (مارتا) وتی: کاتێك ئارەزوی ئێرە دەکەم چۆلْ بێت. لەم کاتانەدا مەزنی ئەستونگەکانی مەیدانەکە دەبینرێتو هەماهەنگیان بینەر سەرسام دەکات. (تیۆ) تۆ ئێستا لەدلْی کلێسای کاسۆلیکیدایت، گەورەترین کلێسای جیهان، کە لەسەر گۆڕی (پەیێری پیرۆز) دروستکراوە.

- ئەی (پاپا)؟ دەکرێت لەپەنجەرەوە ببینرێت؟

- (کاردینالْ) وتی: نەخێر، هەموو رۆژێك لەپەنجەرەوە دەرناکەوێت! دلْنیام لەرۆژی جەژنی پاك، لەکاتی نزای چاکە (urbi و orbi) لەتەلفزیۆندا بینیوتە.

- (تیۆ) پرسی: (ئۆربی) چییە؟

- ئەوە دوو وشەی لاتینییە (urbi) شارەو (orbi) سەرانسەری جیهان، نزای پڕبەرەکەتی (پاپا) شارو جیهان دەگرێتەوە. لەم رۆژەدا (پاپا)، کە سەرۆکی دیارو مایەی دیدی کلێسایە بەزمانی هەموو کریستیانیانی جیهان نزادەکات، وەك رابردوو، کە (هاوەلاّن) لەرۆژی (پانتکۆت)دا ئەنجامیان دەدا.

(تیۆ) وتی: بەوجۆرە بێت لەمیسری کۆنیشدا کریستیانی هەبون.

- (دۆم لیڤی) بەپەرێشانییەوە وتی: نەخێر، کریستیانی سێ هەزار ساڵ درەنگتر سەریهەڵداوە.

- ئەی کەوایە ئەم (ئۆبلیسکانە)[1] لەناوەڕاستی گۆڕەپانەکە چیدەکەن؟

- بامبینۆ.. تۆ هەموو شتێك باش دەبینیت... ئەمە یەکێکبوە لەجوانکارییەکانی سێرکی (نیرۆن)ی ئیمپراتۆر، کە (پەیێری پیرۆز)ی پێدا لەخاچ دراوە. ئەمە لەمەیدانی سێرکەوە بۆ ئێرە هێنراوەو پارچەیەك لەخاچی کریستیانی پیاداکراوە.

- (تیۆ) وتی: هەرچۆنێك بێت جوانە. چۆن بچینە ژورەوە؟

(تیۆ) کاتێك پێینایە ناو مەیدانی گەورەو بەرفراوانی کڵێساکەوە نەیتوانی لەتاو سەرسوڕمانی هاوارنەکات. شوێنەکە، کە پڕبوو لەتوریستی دەم بەخەندەو قەشە بەبەرگی تایبەتەوە، دەیتوانی جێگای هەزاران کەسی تێدا ببێتەوە. بنمیچەکانی، کە سەری تەماشاچیان دەسوڕاند بەنەخشو نیگاری وەسف نەکراو رازابۆوە. کاتێك (تیۆ) ئەوانەی تێپەڕاند چاوی کەوتە سەر سابیتەیەکی رەشو ئەستونگەی بریقەداری ئالتونیو بەسەراسیمەبونەوە وتی: ئەمە کڵێسا نییە؟

- پورە (مارتا) وتی: ئەی بەبڕوای تۆ چییە؟

- نازانم! کڵێسا تەلارێکی سادەو سپییە، لەگەڵ میحراب و خاچێك، کە چەپکە گوڵی بۆ دانراوە؛ سەرەڕای ئەوەش کڵێسا جێگایەکی ئارامە، بەڵام ئێرە!

- (کاردیناڵ) بەنیشانەی رەزامەندی وتی: بامبینۆ.. راستدەکەیت. هەموو شتێکی ئێرە بەجۆرێك دروستکراوە تواناو شکۆمەندی خوا بەرجەستە بکات. چەندخۆش بوو ئەگەر ئەو جەژنانەت ببینیایە لێرە بەشکۆو گەورەیی کەماڵەوە بەرپادەکرێت. (پاپا) لەسەر تەخت دانیشتوە، کاردیناڵەکان بە پۆشاکی جوانو تەمیزەوە لە دەوری ئاڵاونو گروپی هاوماڵانی (خوێندکار)یش سرودی خرۆشێنەر دەخوێننو ستایشی خوا دەکەن لە ئەوپەڕی دەسەڵاتیدا. تۆ راست دەکەیت، ئەم پەرستگایە کڵێسا نییە، بەڵکو شاکارێکی مەزنی کریستیانیە. (مایکڵ ئەنجیلۆ)ی گەورەترین هونەرمەندی ئیتاڵی سەدەی رێنیسانس نەخشەی تەلارەکەی کێشاوە، بەڵام دروستکردنی هێندە درێژەیکێشا، کە هونەرمەند خۆی لەجیهان دەرچوو. جوانترین پەیکەرەکانی جیهان لێرەدایە، گەورەترین وێنەکێش، پەیکەرتاشو پەیکەرسازان شتێکیان

---

[1] Obelisque لە هونەری میسری کۆندا ئەستونگەی بەرزن لەسەر شێوەی چوارلا کە لەشی سەرەوەی هەرەمێکی بچوك هەبەو لەگۆڕەبانی کۆنکۆردە لە پاریس، کە لە میسرەوە براوەو جوتێکی دیکە لە میسرە. و. کوردی.

لەبەرهەمەکانیان لێرەدا هەیە. ئەوەی تۆ لەو دورەوە دەیبینی سەیوانی (پاپا)یەو یەکێکە لەسەرسوڕهێنەرەکانی ڤاتیکان.

- (تیۆ) وتی: باشە. ئێستا دەمەوێت شتێکت پیشان بدەم.

(تیۆ) لەپشت ئاوێنەیەکی ئەستورەوە کۆمەڵێك مەرمەڕی زۆر سپی بینی، کە کۆمەڵێك تۆریست لە دەوری ئاڵابون. (کاردینال) بە گوێی (تیۆ)دا چرپاندی:

- ئەو کۆمەڵە پەیکەرەی، کە (مەریەم)ی دایکی مەسیح و کوڕەکەی لەساتی پێش مردندا پیشانداوە (مایکل ئەنجیلۆ) دروستیکردوە. لەسیمای ئەو ژنە بڕوانە، چەند جوان و پڕ ئازارە... ئایا کاریگەر نییە؟

- (تیۆ) بەهێمنی وتی: دەڵێی ساڵو تەمەنیان وەك یەکە!

- لەراستیدا کاتێك بەدیداری ئەو فریشتەیە شادبوو کە هەواڵی دووگیانییەکەی پێبەخشی، هێشتا گەنج بوو، بەجۆرێك لەکاتی مەرگی (عیسا)دا هێشتا نەچوبوە تەمەنەوە.

- لەکاتی مەرگدا سیمایەکی زۆر ئارامی هەیە. بۆچی لەچوارچێوەی شوشەیی نراوە؟

- چونکە چەند ساڵێك پێش ئێستا کەسێك ویستبوی بیشکێنێت[1]. پاشان بڕیاردرا دەبێت بەرهەمەکەی (مایکڵ ئەنجیلۆ) بپارێزیت.

لەڕابردودا گەلە دڕندەکان، کە هێرشیان دەکردە سەر رۆما پەیکەرە کریستیانییکلنیان دەشکاندو ئیدی هیچ قەرەبویەکیش نەکراوەتەوە. بەڵام لێرەدا پەیکەرێکی کۆنی (پەیێری پیرۆز) هەیە، وەك دەیبینیت.

سەری پەیکەرە کۆنەکەی (پەیێر)، کە لەبرۆنزی رەشدا گەڕاوە، بەشێوەیەکی غرورئامێزانە لەئاسۆ دەڕوانێت، بەڵام یەکێك لەپێکانی بەجۆرێکی سەیر ساوێن بوە؛ هۆکەی ئەوەیە بەدرێژایی سەدەکان پیاوچاکان هێندە ماچیان کردوەو دەستیان لێخشاندوە خۆی رادەستداوەو لەوی دیکەیان لوستربوە. (تیۆ) ئەوەی وەکو پەرەجویەکی سەرنجڕاکێش وەرگرت. کاردینال گەڕانەکەی درێژەپێداو لەهەموو شوێنێك رونکردنەوەی لەسەر ئەم پەیکەرو ئەو گۆڕو ... هتد هەبوو.

پورە (مارتا) هۆشیاریدا: بەسە زۆر دورودرێژە، خۆی شەکەت دەکات.

- (کاردینال)، کە دەستی لەپشتی (تیۆ)دەکوتی، وتی: ئەم کوڕە دڵخۆش و پڕ وزەیە.

بەڵام پورە (مارتا) بەنیگەرانییەوە تێبینیکرد (تیۆ) بەگران هەناسە دەدات هاواریکرد:

---

[1]. ئەو پەیکەرەی (عیسا) لەباوەشی دایکیدایە پاش داگرتنی لە خاچەکەی ناوی (پەیتا – Pieta)یە. ئەم بەرهەمەی مایکڵ ئەنجلۆ لە کڵێسای (پەیێری پیرۆز) ناودارترین و جوانترین نمونەی ئەو گروپەیە. چەند ساڵ لەوەوبەر کەسێك بەتەور ویستبوی بیشکێنێت. کە دوای دەرکەوت نەخۆش بووەو زیانێکی بەپەیکەرەکە گەیاندبوو.

- ئۆتاڤیوس بەسە! منالّەکە لەوە زیاتر توانای نییە! بڕوانە قاچی تێکەڵو پێکەڵ دەبێت، خەریکە دەکەوێت. سەیرە!.

قەشەکە بەپەشیمانییەوە ویستی (تیۆ) باوەش بکاتو بۆ پشودان تا باخچەکەی ببات. سەرئەنجام سەرەڕای نارازیبونی (تیۆ) چمکێکی شانی گرتو بەرزی کردەوەو کەوتە ڕۆیشتن. (تیۆ) بێهودە هەوڵی ڕزگاربونیدەدا.

- (دۆم لیڤی) دەنگی هەڵبڕی: بامبینۆ.. دەست لەهەراوزەنا هەلگرە، تۆ لاوازیتو منیش ئەوەندە بەهێزم بتوانم تۆ ل ئامێزدا هەلگرم. لەبەرئەوە کەمێك زیاتر بەئەدەب بە...

بەلّام کاتێك (دۆم لیڤی) (تیۆ)ی لەئامێزی داگرتو لەسەر زەوییەکە داینا، نەیتوانی بەپێوە بوەستێتو کەوت. پورە (مارتا) بە پەلە گەیشتە سەری. کاردینالّ فریای کەوت گرتیەوە. پورە (مارتا) بەتوندی کەوتە پیاکێشانیو ڕومالّینی گۆناکانی بەمەرهەمێکی چینی، کە هەمیشە پێیبوو. ئەم مەرهەممە ڕەنگی زەردو بۆنی کافوری هەبوو. ماوەیەکی زۆری پێچوو تا (تیۆ) چاوەکانی کردەوە. تیشکێکی خۆری بینیو پێڵوەکانی نیشتنەوە سەریەك. وتی:

- سەیرە، چۆن بوو ئەمجارە نەمردم!

- پورە (مارتا) بەسەرسوڕمانەوە وتی: (تیۆ) ئەمەت زۆر لێ ڕوو دەدات؟

- بەئارامی وتی: کەمو زۆر، ڕاهاتوم. ئەمە نەخۆشی منە. ڕۆژێك ئیتر بێدار نابمەوە.

- تکادەکەم ئەم قسانە مەکە...

- تۆ خوانیت، لێرەشدا هیچت لەدەست نایەت.

- پورە (مارتا) بەسەریا گریاو گوتی: سوێند دەخۆم شتم لەدەست دێت. باشە دەبێت لێرەدا بڕۆین، ئەی ئۆتاڤیۆ کوا؟

(کاردینالّ) بەسێ ڕاهیبەوە گەڕایەوە، کە ئۆکسجینو دەسەبەرەیان پێبوو. (تیۆ)یان لەسەر دەسەبەرەکە درێژکردو پزیشکێك خەریکی پشکنینی بوو. لەهەموو ئەو پەڵە شینانەی ڕوانی لەسەر جەستەی دەرکەوتبون. فشاری خوێنەکەی گرت، لەکاتێکدا برۆکانی بۆ سەرەوە بردبوو سەری بادەدا. (تیۆ)، کە چاوەکانی پڕببون لە فرمێسك بەهێمنی وتی:

- باشە، بەسە. تکادەکەم چا، نانو نڤیشکم بدەنێو ئیدی وەك ئەوەی مردوو لەگۆڕ دەهاون سەرت بامەدە.

- کاردینالّ، کە هەموو گیانی کەوتبوە ژێر کاریگەرییەوە، وتی: بامبینۆ... تۆ منالّێکی زۆر چاکی. نانو نڤیشك هەرئێستا.

(تیۆ) کەمکەمە رەنگوڕوی هاتەوەسەرخۆی. قوم قوم چاکەی بەنانو نقیشکەکەوە وەك دەرمان لوش کرد. (کاردینالّ) لەتەنیشتی راوەستابوو.

پورە (مارتا) بە سەغلەتییەوە وتی: ئۆتافیۆ، من پێشتر ئاگادارم کردیت، چەند سەرسەختو مل هوڕیت.

- بەلاّم، ئازیزەکەم...

- بەتوڕەیی قسەکەی پێبڕیو گوتی: بێدەنگ بە، بۆی بپاڕێوە...!

(کاردینالّ) ملکەچی نواندو لەجیهانی رامانداا نغرۆ بوو.

## چەند پەیامێك بۆ (تیۆ)

پورە (مارتا) دەیوست بۆ هۆتێلەکە بگەڕێنەوە، بەلام (تیۆ) رازی نەبوو، دەیوت تەندروستیم باشە، دەتوانم باش بڕۆم، خەوالّو نیمو ئیدی بێهۆش نابم. بەلاّم لەهەمان کاتیشدا زۆر حەزی دەکرد بزانێت (ئەوان) کێن.

پورە (مارتا) بەسەراسیمەبونەوە وتی: تیۆ.. گوێڕادێرە، ئەوان هێشتا نەهاتون، بەلاّم بەو زوانە دێن.. پەلەمەکە. چۆنە بۆ یەکەم پەیام بگەڕێین؟

(تیۆ) بەهۆی حەزی زانینەوە رازی بوو. (کاردینالّ) بەوریاییەوە باسکی گرتبوو، بەرەو سەرچاوەی (پاپاکان) رۆشتنو لەوێ سواری ئۆتۆمبیل بون. تەنانەت نەدەبوو مەترسی دوو سەد مەتر هەنگاویش پشتگوێ بخرێت.

پەیامەکە لەنێوان دوو تاجی گەورەی لەبەرد داتاشراوی (پاپا) دابوو، دروست لەسەرو زاری جمکێك، کە ئاوی لێدەردەپەڕیو دەرژایە ئەستێلێکەوە. کاغەزی پەیامەکە کەمێك تەڕو دوو وشەی سڕابۆوە. نوسرابوو: ( **لەسەر... پیرۆزی من رۆنیشە، من سەمایەکی هەتاهەتایم. بۆ کەناری روبارەکەم وەرە: بۆ کۆنترین شاری جیهان! من دەپەرستنو من... وەرە!**).

- (تیۆ) پرسی: لەسەر پشتم دانیشە؟

پورە (مارتا) وتی: پشتێکی پیرۆز؟ تیۆ بەوجۆرە بیرمەکەرەوە!

کەواتە تەختێکی پاشایانەیە؟ درەختێك؟ تەپلەکێك؟

هیچ کام لەوانە نییە. پورە (مارتا) سەلماندی کە مەتەڵەکە کەمێگ ئالۆزە. پێشنیازی کرد، کە بۆ هۆتێلەکە گەڕانەوە راوێژ بە (پی تی) بکات. (کاردینالّ) بە پەلە (تیۆ)ی فڕاندە ناو ئۆتۆمبێلەکە. پاش بێدەنگییەکی درێژ وتی:

- بەرێز پێمبڵێ ئەم (بازاڕە وەرزییە) سودی چییە؟

- (دۆم ليڤى) بەئاوازێکى خەمناکەوە وتى: چۆنە، ئيتر بە (تۆ) بانگم ناکەى؟

- (تيۆ) بەدڵنياييى و ويقارەوە وتى: ئەگەر ئارەزوو بکەيت بۆچى نا؟ بەڵام سەرەتا وەڵامم بدەرەوە.

- (کاردينـاڵ) بـەوردى لەدەسـتەکانى نـوارِى و بەراسـتى وەڵاميدايـەوە: دڵنيـام مەبەسـتت لـە (بازارِى وەرزى) شارى (ڤاتيکان)ـە. راسـتت دەويێت خـودى خۆشـم هەنـدێك جار ئـەو پرسـيارە لەخۆم دەکـەم. دەزانم لـەم شـارەدا گـەورەييى و مـەزنێتى خـوا لەهـەموو لاو ئاراسـتەيەکدا بـەرز دەنرخێنن، بەڵام هزرێکى لاو لەهەموو ئەوانە چى فێردەبێت؟

- (تيۆ) وتى: ئەوەى کە... هەموو شتەکان بەجۆرێکى سەرسورِهێنەر جوان و دڕەوشاوەن.

- ئۆتاڤيۆ هەناسەيەکى قوڵى هەڵکێشاو گـوتى: باشـە، راسـتە. تـۆ پـەيامى مەسـيح دەزانيـت، گرەو دەکەم نايزانى؟

- (تيـۆ) بەسـەر لەقانـدن سـەلماندى و گـوتى: بـەڵێ، دەيـزانم. ئـەو کـورِى خـوا بـوو، لـەپێناو رزگـاربونى جيهـان سـەرى نايـەوە. هـەموو گوناهـەکانى ئـەوانى ديکـەو هـەموانى لـەکۆڵ گـرت. دايکـى پـاکيزە بـوو، (يوسـف)ى بـاوکى بـەکورِى خـۆى پەسـەندى کـرد. بەگـشتى کەسـێکى سەرنجراکێش بوو.

- ئەگەر شەکەت نيت پێشنيار دەکەم بەئۆتۆمبيل کەمێك بەناوشـاردا بـسورِێينەوە. ئەمـەش سەرنجراکێش دەبێت.

ئۆتۆمبيلەکە لەروبارى (تيبەر)ـەوە تا کۆشکى (سنت ئانژ ئانجولۆ) رۆشت، ئـەو شـوێنەى کـە (ميکايلى پيرۆز – سن ميـشێل)ى فريـشتەى مـەزن بـۆ هەميـشە ئـەژديهاى کوشـت،. (کاردينـاڵ) لەوبارەيـەوە هيـچى نەدرکانـد. پاشـان شـۆفێرەکە ئۆتۆمبێلەکـەى بـۆ دەرەوەى شـار بـردو (دۆم ئۆتاڤيۆ) وەکو خۆى هـيچ قـسەى نـەکرد. پـورە (مارتـا) جارجـارە تـەلارو کڵێـساکانى بـە (تيـۆ) دەناسـاند. لەپرِێکـدا خريـان لەبـەردەم دار کـاج و سـەروەکاندا بينييـەوە، ئـەو شـوێنەى (کاتاکومب)ـەکان دەستيان پێدەکرد، ئۆتۆمبيلەکە راوەستا.

- پورە (مارتا) هاواريکرد: هيوادارم دوبارە پياسەى ئێرەمان پێنەکەيتەوە!

- (کاردينـاڵ) پـشتى بەکوشـنە خاکييـەکانى ئۆتۆمبيلەکـەوە دايـەوەو دەسـتى لەبێـدەنگى هەڵگرت و بەپۆزشەوە وتى: ببورن کە بۆ ئێرەم هێناون، بەڵام بۆ ئەوەى دەربارەى پەيامەکەى گەورەمان (مەسيح) گفتوگۆ بکەين شوێنى لێرە باشتر بۆ نەدۆزرايەوە. لەسەر ئەم رێگا کۆنـە دەتوانرێت هەسـت بـەبونى کـەمێك رۆح و نيگـەرانى سـەردەمە سـەرەتاييەکانى کريـستيانيەت بکرێـت: دەتوانرێـت مێگـەل، شـوانەکان و تـا رادەيـەك دەشـت و کێڵگـەکان بەرجەسـتەبکرێت.

(عیسا) پیاوی دەشتو کێڵگەو شیوو دۆڵەکان بوو، مێرگوزارەکانی دەناسیو لەگەڵ هاتنەوەی گوڵەکان لەبەهاردا ئاشنا بوو. ئەمڕۆ لە ئۆرشەلیم ناتوانرێت پەیامەکەی بدۆزرێتەوە.

- (تیۆ) وتی: دیارە کەناکرێت!

- لەو ساتەدا هەست بەئاشتیو ئارامی بکرێت پەیامەکەی لەهەموو شوێنێکو لەهیچ شوێنێك نییە.

- پورە (مارتا) وتی: تاکە ئاڕاستەکارو هێنەری ئاشتی جیهان نییە! بەرامبەر بەخواستەکانی سەرسەخت بوو. لەسەر بڕیاری خۆی ئەو دەستفرۆشانەی لەگۆڕەپانی بەردەم پەرستگاکەدا خەریکی فرۆشتنی شتی دەستکردو جوانکاری بون بەدەرنران.

- (دۆم ئۆتاڤیۆ) سەلماندی: بەڤامچی، بەڵام هۆکەی ئەوەبوو دژی خۆدەرخستنو جوانکاری بوو. دەیویست هەموان یەکسان بن. لەوسەردەمەدا کەباوی کۆیلایەتی بوو زوڵمو نایەکسانی باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشابوو، ئەوەی ئەو داوای دەکرد وەك شۆڕشێك بوو. ئەو، کوڕی خوا، بەمەبەستی تێگەیاندنی بنەڕەتییانەی ئەو نایەکسانییە بەهەموو کەس (غوسڵ لەخۆدەرکردن - تەعمید)ی داهێنا!. (تیۆ) ئایا تۆ (غوسڵ) کراوی؟

- (تیۆ) وەڵامیدایەوە: نەخێر، دایكو باوکم پێیانراگەیاندم لەتەمەنی پێگەیشتندا خۆم بڕیار بدەم. هەڵبەتە ئەگەر گەورە بووم!.

- (کاردینال) بەگونجاوییەوە گوتی: بەڵێ، بێگومان. بەڵام بنوارە (عیسا) لەکاتی (غوسڵ) کردندا ئەوەی نقار نەکرد، بەڵکو خۆی داوای لە (ژان باپتێست - یەحیای غوسڵدەرکەر)کرد تا (غوسڵ) لەئەویش دەربکات. یەکەم ئەوەی ئاو گوناهە پاك دەکاتەوە، ئینجا ناوی (غوسڵ) بەتایبەتی تاك لەکۆمەڵ دەهاوێت... لەبەرئەوەیە (عیسا) بەهەموو بونێکی خواییەوە داوایکرد ئەویش (غوسڵ) بکرێت.

- (تیۆ) پرسی: بۆ ئەوەی پیشانی خەڵکی بدات لەگەڵ ئەوان یەکسانە؟

- تارادەیەك وایە. پاشان بۆ بەهێزکردنی پەیام دەستیدایە ئازادکردنی دەرکراوانی کۆمەڵگەو نەفرەت لێکراوەکانو کەسی لەوە بەدەرنەکرد: نە روسپی، پەشیمان، تۆبەکار، گومڕا، ژنی زیناکار، نەهەژارو نەداران. چارەسەرو دڵدانەوەیان بەسبوو، تەنها دو وشەو یەك نیگا.

- (تیۆ) زیادیکرد: مردویەکیشی زیندوو کردەوە. ناوەکەیم لەیاد نەماوە.

- ناوی (لازار)بوو. کاتێك (عیسا) جەستەی ئەو مردوەی بەناوی خۆیەوە بانگکرد، لەگەڵ ئەوەشی سێ رۆژ بوو لەخاکدابوو، لەگۆڕەکەی هەستایەوە. (عیسا) دەیویست بەسەر مەرگدا

سەرکەوێت‌و بەو ئامانجەش گەیشت. ئەوەش بەڵگەیە، کە کوڕی خوابوو. یەکسانی، هەستانەوەو ژیان: ئەمەیە پەیامەکەی ئەو. (تیۆ) تۆ (خۆشبەختی) دەناسیت؟

- (تیۆ) بەدودڵییەوە وتی: ها... دیارە ئەوکاتەیە مرۆڤ خۆشحاڵە؟

- دروستە. (عیسا) دوانزە هاوەڵ و موریدی خۆی هەڵبژاردبوو، کە پێکەوە لەسەر ئەو چیایە هاتنەخوارەوە کەلەبەرامبەر خوادا نزای کردبوو. خوا پەرستی لەچیاکاندا هەمیشە باشترو بەرزترە. تۆ ئەمە لەسەرانسەری جیهاندا تێبینی دەکەیت. بەهەرەمەندە راستەقینەکان لەسەر لوتکەو شاخەکانن.

- (تیۆ) هاواریکرد: بەڵێ، راستە. (موسا)ش لەسەر چیای (سینا)بوو.

- (موسا) یان (شیڤا)ی خواوەند لەهندستان‌و زۆری دیکە... لەخوار چیاکەوە خەڵکێکی زۆر چاوەنواڕی بون. ئینجا بەخۆشی‌و شادییەوە بۆیان دواوە. هەزاران خۆشبەختن، بەختیارن ئەوانەی برسین، ئەوانەی دەگرین، لانەوازن، لەکۆمەڵ دورخراوەکان، ئەوانەی بەهۆی کوڕی مرۆڤەوە سوکایەتیان پێکراوە، ئێوە بەختیارو شادن، چونکە عەرشی خواماڵی ئێوەیە.

- (تیۆ) وتی: لەیادت بێت لێرەدا وتت کوڕی مرۆڤ؟ من وامدەزانی کوڕی خوایە...

نەك هەر کوڕی خوا، چونکە لەژنێك ببوو لەبەرئەوە مرۆڤیش بوو. کوڕی مرۆڤ ئازارەکانی ژیانی دەناسی. کەواتە بەختیاری بۆ بێبەختترین کەس بوو. ئەمە بنەماو بنچینەی پەیامەکەی بوو.

(تیۆ) وتی: بەڵێ، رازیم، بەڵام جەنگەکان لەئازاردان.

- دەگەینە ئەوەش. پاشان (عیسا) دەربارەی هۆشمەندی قسەیکردوە یان ئەو شتەی خەڵکی بەهۆشیاری ناوی دەبەن. کەواتە وتی: ئەوانە بەختیارن کە هزرو رۆحی سادەو بێپرتوشیان هەیە. خۆشبەخت‌و بەختیار منالانن، ئەو کەسەی وەك منال خۆی بچوك دەکاتەوە، ئەوانە لەعەرشی ئاسماندا گەورەترین خەڵك دەبن.

- (تیۆ) وتی: سەیرە! دەتەوێت بڵێیت منالان گێلن؟

- (کاردینال) بەنارەزاییەوە وتی: هەرگیز شتی لەوجۆرەم نەوتوە. هەمووی بەهۆی کارەکانی ئەو کەسە سادە هزرانەوەیە. بەڵام (تیۆ) (عیسا) دەیویست باس لەخودی سادەیی بکات! منالێك ساف‌و راستگۆ قسەدەکات. پرسیاری سادە دەکات، فێڵبازو تەڵەکەباز نییە...

(تیۆ) وتی: لەو باوەڕەدایت؟

- بۆ نمونە خودی تۆ. لەچاو تەمەنتدا خاوەن بیرو ئامادەییت، بەڵام ئاوەزت راستەوخۆو لادەر نییە. رێگای گومان بەخۆت نادەیت، پرسیار دەکەیت...

- (تیۆ) بەمەخەنیەوەو گوتی: کەواتە بەم پرسیارانە نارەحەتت ناکەم؟

- پیاوی کڵێسایی هاواریکرد: ئۆو، نەخێر، تۆ بەهەمموو تواناتەوە ناتوانی من بپێچیتەوە. تۆ دڵێکی پاکت هەیە وەك هەموو منالانی دیکە. وەك گولاڵەی دەشتو باڵندەکانی ئاسمان. لەسەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئیتالیا (سن فرانسوای بچوك)[1] لە دێرەکەیدا لەشاری (ئاسیز) ئاژەلانی فێری عیشقی (عیسا) کردبوو. لەگەڵ ئاژەلاندا دەدواو ئینجیلی بۆ دەخوێندنەوە، وەك بێنەواو منالان... تۆ باڵندەیەکی سەیری (تیۆ)، بەلام رۆحێکی سادەت هەیە.

- (تیۆ) بەشەرمەزارییەوە وتی: ئێ.. باشە. ئەی عیسا چیدیکەی وتوە؟

- دەربارەی چارەڕەشی قسەی کردوە. دەڵێت: ساماندارەکان چارەڕەشن؛ سك تێرەکان چارەڕەشن؛ ئەوانە چارەڕەشن لەلایەن کەسانی دیدەوە پێش هەموان ستایش دەکرێن.

- (تیۆ) وتی: جیهانێکی ئاوەژوو.

- جیهانێکی شۆڕشگێڕانە! دەسەلاتدارانی سەردەمەکەی باش لەو تێگەیشتبون. هەر ئەو داناو خاوەن دەسەلاتانەش بون (عیسا)یان حوکمدا. (عیسا) ئەوانی لەئازاردا دەهێشتەوە، رەخنەی لە کاهینەکان دەگرتو لەبازرگانانیش، لەپیاوانی ئاینی، لەدامەزراوەو رێکخراوەکان...

- (تیۆ) وتی: کەواتە (عیسا) وەك (گیڤارا)یە، یان وەك (مارکۆس).

(کاردینال) وەلامی نەبوو. پورە (مارتا)ش لەگۆشەیەکەوە پێکەنینەکەی خۆی شاردەوە.

## خۆشویستنی دوژمنان

- (تیۆ) لەبەرخۆیەوە وتی: قسەیەکی هیچم کرد؟

- پورە (مارتا) بەتەنزەوە پرسی: ئۆتافیۆ .. مەبەستتان چییە؟

- (کاردینال) وتی: بامبینۆ.. نەخێر قسەکەت بێمانا نەبوو. هەندێك خەڵکی یاخیو هەڵگەڕاوە، کە بەچەك بەرگری لەزەحمەتکێشان دەکەن ئەو واتاو لایەنەی (عیسا) دوبارە دەکەنەوە. هەندێك لەقەشەکانیش بەهۆی هاودەردیان لەگەڵ زەحمەتکێشان پشتیوانیان لەو یاخیو هەڵگەڕاوانە کردوە. لەئەمریکای لاتین ئەمجۆرە گروپانەیان لەئاینی کاسۆلیکەوە دروستکرد، کەبە (تیۆلۆژی ئازادیبەخش) ناویان بردوە.

- تیۆلۆژی.. ئەمە واتای چیە؟

---

[1]. (Sante Francoisd Assise) ناسراو بە (Povere) (هەژاری بچوك) کەسایەتییەکی بەناوبانگی ئیتالیا بوو. موریدێکی زۆری هەبووە. پەیڕەوانی لەئێستادا سێ لقی لێبۆتەوە، کە یەکێکیان لقی (فرانسیسکن)ە.

- مەبەست لەوتارە دەربارەی خوا . لەسەرەتای سەرهەڵدانی جولەکەگەراییدا (جودایيزم) خەڵکی لەگەڵ خوادا دەدوان. ئەمڕۆ (پاپا) هەیە تا جۆرە ڕێکخستنێك بەو گفتوگۆیانە بدات. (پاپا) بەڕاستی لەگەڵ ئەو کەشیشە پیرو تیۆلۆژیستە ئازادیبەخشانە روبەڕو بۆتەوەو پێیڕاگەیاندون ئاشتی لەپێش هەموو شتێکەوەیە؛ لەکاتێکدا ئەوان بەناوی خواوە جەنگیان دەوێت. (عیسا) ئەوەی زیادکردوە، کە دەبێت دوژمنەکانت خۆشبوێت، ئەگەر زللەیەکیان لەلایەکتدا، لاکەی تریشان بدەرێ تێیسرەوێنن. دەزانیت بامبینۆ، لەو سەردەمەدا ئەوە دژی ئاینی جولەکە بوو. جولەکەکان پەیڕەوی یاسایەکیان دەکرد بەیاسای (تالیۆن) ناسرابوو: چاوێك بەچاوێك: دانێك بەدانێك. واتە وەڵامی لێدان لێدانەوەیە.

- پورە (مارتا) وتی: ئەوە هەڵەیە! واتای راستەقینەی (یاسای تالیۆن)یان (مامەڵە بەدەستیاو) ئەوەیە کە (ئەوەی بۆ خۆت ناپەسەندە بۆ کەسانی دیکەش نەشیاوە. ئەگەر ناتەوێت لێدان بخۆیت لەکەس مەدە). بەکورتی ئەو کارەی بەڕەوای نازانیت لەگەڵ خۆتدا بکرێت لەگەڵ کەسی دیکەی ئەنجامی مەدە. بەڵام تۆ لەوبارەیەوە دیدو بۆچونێکی کورتت خستەڕوو.

- زۆر باشە، بەڵام ئەگەر جەنگ وەڵامی جەنگ بێت چۆن تەواو دەبێت؟. (عیسا) لەبونی ئامادەیی جەنگەکان بێئاگا نەبوو. جەنگەکانی بە (ئازاری زایین) دەچواند. گەل دژ بەگەل، پاشایەتی دژ بەپاشایەتی، ناپاکییەکان، پەیامبەرانی درۆزن، بومەلەرزەو وشکەساڵی... (عیسا) پێشبینی هەموو ئەوانەی کردوەو گوتویەتی: (بەڵام کاتێك دەسەڵاتی خوای ئاسمان بەسەر زەویدا شکا، ئەوکاتە جەنگو ئەسرینەکان نامێنن). پەیامی (عیسا) پەیامی ئاشتیو ئارامی سەرانسەری جیهانە. لەلایەکی دیکەوە ئێمە لە (ڤاتیکان) دیبلۆماتمان بۆخۆمان هەیە، زۆرجار دەربارەی ئلشتی دانوستان دەکەینو ئەوکارەش ئاسان نییە. جگە لە (گاردی سویسرا)، کەپاشماوەی کۆنی سوپای (پاپا)ی سەردەمی رابردوە، لە ڤاتیکان سەربازمان نییە. بزانە (ستالین) پاش سەرکەوتن لەجەنگی دووەمی جیهانیدا چیوت: (پاپا؟ چەند سوپای هەیە؟) وەڵامەکەی ئاسانە، هیچ، بەڵام ئێمە دەسەڵاتی رۆحیمان هەیە.

- (تیۆ) بەگومانو دودڵییەوە بەئارامی وتی: لەرێگای خۆشویستنی دوژمنانەوە؟ ئایا ئەم شێوازە سەرکەوتوە؟

- (عیسا) وتویەتی (دوژمنەکانی خۆت خۆشبوێتو چاکە لەگەڵ ئەوانەدا بکە چارەی تۆیان ناوێت).

- پورە (مارتا) وتی: ئەم ئامۆژگارییە، ئەو رستەیەی (رۆبرتۆ رۆسلینی) فیلمسازم دێنێتەوە یاد، کە دەڵێت: (ئەگەر دوژمنت هەیە بەخۆشەویستیو عیشقت لەناوی ببە). ڕێگاچارەیەکی جوانە.

- (کاردینالّ) بەوریاییەوە وتی: ئەوەش جوانە.. دەبێت ئەوە بزانین، کە (عیسا) وتویەتی: ( خۆشویستنی ئەوانەی کە تۆیان خۆشدەوێت کارێکی گرانو ئالۆز نییە، وەك خۆشویستنی دوژمنەکەت ).

- (تیۆ) وتی: من بەوجۆرە نابم، لەپێناوی چیدا؟

- بۆ چاولێکردن لە (خوا – باوك)، کە دەبەخشێت. بۆ دەسەبەرکردنی ئاشتی ئەمە باشترە. بەوجۆرە بیرناکەیتەوە؟

- (تیۆ) وتی: نەخێر کەسێك خراپەت دەرهەق بکات نابێت دەسبەرداری ببیت.

- ئەوەی خراپەت دەرهەق دەکات با بیکات؛ ئەمە بیرکردنەوەی شەهیدەکان بوو. ئێستاش دەتوانرێت بەوجۆرە بێت. ئەمڕۆش ژنانی راهیبە لەئەرژەنتینو جەزائیر هەیە ئازار دەچێژن یان ئەوانەی لەپێناوی گەیاندنی کۆمەكو یارمەتی بەکەسانی دی خۆیان دەخەنە بەرمەترسی کوشتن. لەوانەیە ئەو حەوت مۆمەی لەکلێسای پاریس دەسوتان لە یادت بێت... حەوت بۆ یادی حەوت پیاوی ئاینی کەلەجەزائیر فرێنران. ئەوکاتەی کاردینالّ (لوستیژە) یەکیەك فوی بەمۆمەکاندا دەکرد، بەفەرمی هێنایەوە یاد کە دەبێت دوژمنەکانمان خۆشبوێت.

- (تیۆ) وتی: کارێکی راست نییە!

- تەنها خوا راستی دەناسێت. (عیسا) باسی لەچاکە کردوە. دابەشکردن، بەخشین، بۆ خۆهەلگرتن. هەر لەبەرئەوەشە پەیامەکەی دەمودەست خۆشەویست بوو. زەحمەتکێشانی دەدواند.

- (تیۆ) وتی: دەتەوێت گالّتەم پێبکەیت؟ پاش هەموو ئەو رتوشو جوانکاریانەی پیشانی منت داون؟ بەم ئۆتۆمبیلە، ئەو پۆشاکە جوانو گرانبەهایە..؟

- (کاردینالّ) وتی: باشە، باشە، بەلاّم دەبێت ئیمانداران فێرو پەروەردە بکرێنو ئەوەش رۆڵی کلێسایە. دەبێت کۆمەك بە زەحمەتکێشان رێکبخات. رێکخراویش پێویستی بەسیستەم و زنجیرەی پلەداری هەیە.

- پورە (مارتا) وتی: ئەم بەلگەیە لاوازە. ئۆتاڤیۆ... زۆر لاوازە.

- بەلاّم هەرجۆرە جوانکارییەکی زیادەمان لاداوە. پەڕی حوشترمرغی کورسی (پاپا)مان لادا، پێشوازییەکانمان سادە کردۆتەوە، ئێمە خاکییانە ترپەی پێی هەژاران دەبیستین... تەنانەت خودی (پاپا)ش.

- پورە (مارتا) وتی: بەلێ... سالێ جارێك.

- بەلاّم ئێمە زۆر بەخشندەیی دەکەین! ژمارەیەکی بێشومار چاکەکاری دەکەین.

- (تیۆ) بەشداریکردو گوتی: هیوادارم دوبارە دەست بەمشتورِ نەکەنەوە. ئیدی ئەم بابەتە راستە. من کاسۆلیکی وادەناسم سەرپەرشتی بێوەپیاوان دەکەن.

- (کاردینالّ) بەسەرکەوتویی وتی: فەرموو!

پورە (مارتا) بابەتەکەی بۆ گەلێك قەیرانی بێشومار کێشکرد، کە زۆرجار روبەرِوی یاخیبونو هەلگەرِانەوە بوە، چونکە کلێسا پەیامی (ئەناجیل)ی لەبیرکردوە. پورە گیان رونیکردەوە کەکلێسا سامانێکی مەزنی گردکردۆتەوەو لەجیاتی کۆمەککردن بەلانەوازو زەحمەتکێشان سەرمایەگوزاری دەکات. بەجوانکاریو رازاندنەوەی دێرو کلێساکانیو توانای مادی خۆی زۆرجار خۆی هاویشتۆتە بەر کینەو نەفرەتی خەلکیو هەندێجاریش سەرەونگون کراوە.

(کاردینالّ) بەنارەزاییەوە وەلامی (مارتا)ی دایەوە، کە (پاپا)کان زانیویانە چۆن بۆ پەیامی مەسیح بگەرِێنەوە. بۆ نمونە چۆن (پاپا ژانی بیستو سێیەم) لەسەدەی بیستو یەکدا بەقولّی کلێسای کاسۆلیکی بگۆرِێت، کە ئیماندارانو پەیرِەوانی کلێساش مافی خۆیانبوە ئەو درەختە کۆنە راتەکێننو لقو چلّە وشکبوەکانی ببرِنەوە، چونکە هەلّپاچینی درەخت دەبێتە هۆی زیادبونی بەروبوم، کە ئەوە واتای راستەقینەی مەرگو ژیانەوەی مەسیح بوە، کە وەك قوربانیدان پەسەندی کردوە تا خۆی بەدەست مەرگەوە بدات.

- (تیۆ) پرسی: مێگەل یان شوان؟ ئەم دوانە جیاوازن.

- (کاردینالّ) وتی: دروستە، ئەم هەم مێگلو هەم شوانە. شوانی خوا، چونکە دابرِەکان دەگێرِێتەوە. مێگەلی خواوەمدە، کە لەجیاتی هەموو خەلّك دەکرێتە قوربانی.

- باشە، ئەگەر (عیسا) شوانە تۆ یەکێك لەسەگەکانی مێگەلەکەی ئەویت.

- (کاردینالّ) وتی: زۆر باشە، سەگ. وەك دەبینی سەگێکی قەلّەوی تێر. تەنانەت دەتوانم بوەرِم، بەلام ناگەزم.

شەو داهات شوفێری ئۆتۆمبیلەکە بەرەو شار ئوتومبیلەکەی ئاژوو. کاتێك بەپەنای گۆرِەپانێکی فراواندا رەتبون، کە منالان لەژێر روناکی گلۆپەکاندا گەمەیان دەکرد، (دۆم ئۆتاڤیۆ) بەهاورِێکانی راگەیاند، کە نەدارە تازەکانی جیهانەکەمان ئێستا نەلەناو گوندەکانو نەلەشارەکاندان، بەلّکو لەنێوان شارو گوندەکاندان.

(تیۆ) لەرِێگا خەوی لێکەوتبوو. (کاردینالّ)، کەبەباوەش بۆ ژوورەکەی دەبرد تێبینی کرد گۆناکانی ئالّنو سیمای ئارامە. (تیۆ) تاکاتی شێو نوست. پورە (مارتا)و (دۆم ئۆتاڤیۆ) لەسەر لێواری جێخەوەکەی رۆنیشتبونو چاویان تێبرِیبوو.

- پورە (مارتا) وتی: بەراست لەو باوەڕەدایت تەندروستی باشتر بوو بێت؟ زۆر دەترسم!
- (کاردینالْ) لەسەرخۆ وتی: خۆزگە دەتزانی نزا بکەی!
- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: من نزادەکەم ... بەشێوازی خۆم.

## (ئەوان) گەیشتن

دەنگی لێدانی دەرگاکە (تیۆ)ی بێدار کردەوە. تیشکی خۆر لەودیوەوە لەسەر پەردەی پەنجەرەکە کەروێشکەی دەکرد... هێشتا زوو بوو دەنگی جیڕەی کورسییەك بەرزبۆوە. کەسێك هاتە ژوورەکەوە؛ ناشتاکردن لەم کاتەدا؟ کەسێکە؟ لەوانەیە دایە! ناشێت، ئەو لە پاریسە! خەونی بینیوە.

- دەنگی (بابە) بوو گوتی: باشی، کوڕی خۆشەویستم!

(تیۆ) لەناکاو لەخەو راپەڕی. خەون نەبوو! (ئەوان) لەوێ بون! لەکاتێکدا خۆی بەملیاندا هەڵواسیبوو، هاواریکرد!: هێی، کەواتە (ئەوان) ئێوە بون .....

## بەشی نۆ

# (وەك روخسارەكانی خوا)

## نوێبونەوەی دیدارەكان

روداوێكی غافلگیرانـە، دیـدارێكی راسـتەقینە!. (میلینـا)، كـە لەسـەر جێخەوەكـە رۆنیـشتبوو، كۆرەكـەی لەماچـدا نغرۆكـرد. (ژروم) بەچـاوی پـڕ لەئەسـرینەوە دەسـتی (تیـۆ)ی گرتبـوو، بەسەرسەریەوە خۆی دەجولاند بەبێنەوەی بتوانێـت وشـەیەك بـدركێنێت. بـەڵێ، ئامـادەبون. وتیـان ماوەیـەكی زۆر نامێنینـەوە، تـەنها دوو رۆژی پـشوی هەفتـە. باسـیان لـەوەكرد، كـە هەرلەسـەرەتای سـەفەرەكەی (تیـۆ)وە بـۆ رۆمـا ئـەمانیش بەرنامـەی سـەفەریان هـەبوە. لـە پاریسەوە بۆ رۆما رێگایەكی درێژ نییە، فرینێكی دوو سەعاتییە، هیچیش لەوە ئاسانتر نابێت. لەكاتێكدا پاش ئەوەی ....

-(تیۆ) وتی: واتە پاش رۆما؟.. باشە، ئەگەر مەبەسـتتان ئـەوەبێت لـەپاش ئێـرە ئیـدی ئێـوە ناتوانن سەفەر بكەن واتای ئەوەیە من بۆ گەشتێكی درێژ دەرۆم، بۆ شوێنێكی زۆر دورتر.

-(میلینا) هەناسەیكی قوڵی هەڵكێشا. لـە (تیـۆ)ی پرسـی: ئایـا خـواردن بـاش دەخـوات؟ ئـەی خەوی چۆنە؟ ئایا لەخوێن گرتن لەهەموو گەشتێكیدا نارەحەت نەبوە؟

-(تیۆ) بەنارەزاییەوە لەژێر لێوەوە وتی: باشترە لە پورە (مارتا) بپرسیت.

دایكە بۆ شاردنەوەی غەمو نیگەرانییەكانی پێشنیازیكرد بـۆ ناشـتاكردن هـەموو پێكـەوە بـۆ پیاسەكردن بڕۆنو پاشان بۆ پشودان بۆ هۆتێلەكە بگەڕێنەوە.

- (تیۆ) وتی: ها، نا، من لەپشودان بێزارم.

- (ژروم) وتی: زۆرباشە، بۆ گەشت دەرۆین، خۆت بگۆڕە !

- (تیۆ) بۆ دوشكردن بۆ گەرماوەكە رۆشت .

- (میلینا) وتی : ژروم تۆ لۆژیکی  نیت.

- پیاوەکە قسەکەی پێبڕیو گوتی: خرۆکە سپییەکانی زیادیان کردوەو ناشزانرێت هۆکەی چییە!، بەڵام ئەنجامی تاقیکردنەوەکان هەروەکو خۆیەتی.

- لەوانەیە بەهەڵەدا چوبن! ئەم نەخۆشخانانەی ئیتالیا....

- بەسە، ئێمە باشترین نەخۆشخانەمان لەهەموو جیهاندا هەڵبژارد. حەزدەکەیت بۆ نەخۆشخانەیەکی فەرەنسیت بنێرین؟ ها؟ باشە، کەواتە ئارامبە.

- (تیۆ) بەشادییەوە لەگەرماوەکە دەهاتە دەرەوەو هاواریکرد: باشە، بۆ کوێ بچین؟ ئارەزودەکەم سەرەتا ئاشتا بکەین!

## یەکەمین تێزی (تیۆ)

(تیۆ) لەژێر نیگای شادومانانەی (میلینا)وە نان، نفیشك، مرەباو پسکیتی بەچێژەوە دەخوارد. گومانی تێدا نەبوو تەندرەستی باشترە. بچوکترین شتێکی لەوبارەیەوە دەتوانرێت بوترێت ئەوەیە ئەو چارەسەرە سەیرەی پورە (مارتا) داینابوو خەریك بوو بەرئەنجامەکەی دەردەکەوت.

- باوکی پێیدەوت: کورم بۆمان باس بکە. سەرنجراکێشترین شتی بینیوتە چیبوو؟

- (تیۆ) هاواریکرد: هەموو شتێك! مزگەوتەکانو کڵێساکان، کەنارەکانی نیل، لەقلەقە قاچ ڕەشەکان، ژنانی گوندی بەگۆزکانی سەرسەریانەوە، پاپیرۆسەکانو هەموو هەڕەمەکان.

- باوکی وتی: هیچ شتێکی ئاینی لەوانەدا نییە، وەك ئەوەیە گەشتێکی ئاسایت کردبێت.

- (تیۆ) وتی: لێرەدا بەهەڵەدا چویت، چونکە لەهەموی سەیرتر مرۆڤەکان بون، مەبەستم هاوڕێکانی پورە (مارتا)یە، خەڵکی زۆر دەناسیت... ڕەبی ئالیئەزر، باوکە ئەنتوان، شێخ سلێمان، ئەمەل، کەژنێکی نائاسایبە. ئەو پیرەپیاوە سەیرو سەمەرەیەی لە دەرەوەی لۆکسۆر خەریکی هەڵکۆڵینەو تەنانەت ئەم کاردیناڵە بۆشناخە، کە پورە (مارتا) بەناوی بچوککراوەکەی بانگی دەکات.

- (میلینا) پرسی: لەهەمویان زیاتر کامیانت زۆرتر بەدڵ بوو، ئەمەل؟

- هەمویان میهرەبان بوون، (ئەمەل) دەربارەی ئەفسانەناسی میسریو ئەفسانەی خواکانیان شتی فێرکردم. زۆرم خۆشدەویست. بەڵام ئەوانی دیکەش باشن، دەزانیت...

- باوکی وتی: بێگومان لەنێو ئەوانەدا یەکێکیانت هەڵبژاردوە. من تۆ دەناسم.

- (تیۆ) وتی: بەراستی، نەخێر، هەموو ئەوانە ئیماندار بون، جگە لە(ئەمل)، تەنانەت دێرینەناسەکەش پیاوێکی ئیماندار بوو، هەڵبەتە بەشێوازی خۆی.

- مەبەستت چییە؟

- (تیۆ) وتی: بڕوای بەخواکانی میسر هەیە! منیش هەروەها، من!

- باوکی وتی: زۆر باشە، ئەی ئاینەکانی دیکە چی؟

- هەمویان جۆرە لێکچونێکیان هەیە. هەموو بڕوایان بەخوایەك هەیە، چاکەو چاککردنی مرۆڤیان مەبەستەو هەمیشە کێشمەکێشیان هەیە. هەموان باس لەئاشتی دەکەن، بەڵام دەست لەبەهانەگرتن هەڵناگرن!. بۆ نمونە ئەم کریستیانیانە، دەزانیت بون بەچەند گروپەوە؟ ئەرمەنی، کیپتی، ئەسیوبی، ئەرتەدۆکسەکانو زۆری دیکە.

- باوکی بەپێکەنینەوە وتی: بەڵێ، وایە، چ پەرێشان حاڵییەکە!

- (تیۆ) وتی: هێندەش نا. سەرەتا کریستیانیەت یەك مشت خەڵك زیاترنەبون، بەڵام کاتێك هەریەکەیان لەشوێنێك جێگیربون هەریەکەیان بۆ سەپاندنی شێوازی ژیانی خۆیان کەوتنە شەڕو ململانێ. هەڵبەتە هەر گروپە دابونەریتی تایبەت بەخۆیان هەبوو، بۆ ڕێکخستنەوەی ئەو شڵەژاوییە کات پێویست بوو.

- باوکی بەبیرکەوتنەوەوە وەڵامیدایەوە: ناچاری. ئەی جولەکەگەرایی (جوداییزم)ت چۆن بینی؟

- ئۆو، (یوسف)م زۆر خۆشویست، هەروەها (موسا)ش، چونکە هەمیشە ئەو ڕاستە. (تەورات) باسیان دەکات و پڕە لەچیرۆك، ئەفسانەی زۆر سەرنجڕاکێش، چونکە خوا ئاستەنگێکی سەیری لەسەر ڕێمان داناوە... پێکگەیشتنی نێوان جولەکەو بێتپەرستانو کافری قەدەغەکردوە، بەڵام لەو سەروبەندەشدا ڕێگای پیشانداوە تا لەگرفتەکان ڕزگاربن، خواکەیان زۆر سەیرە، جاری واهەیە تورەیە، تاڕادەیەك وەك تۆ کەتورە دەبیت. هەندێکجار میهرەبانە. هەروەکو تۆ کاتێك دەست بەسەرمدا دێنیت. جولەکەکان هەرگیز ناوی ناهێنن، چونکە زۆر خۆشیاندەوێت. بڕیارە هەمیشە پەیڕەوی بکەنو گوێڕایەڵی بکەن، بەڵام ئەوکارە هێندە ئاسان نییە. هەرچەندە ئەو بابەتە ڕێگر نابێت سود لەتازیارەکان وەرگرنو هەندێك جاریش سەبارەت بەژیانی ڕۆژانە خەریکی بەهانەگرتنو نارەزایی بن.

- (میلینا) وتی: وابزانم دەربارەی ئیسلامیش لەوە زیاتر خۆشەویستیو سۆزت نییە؟

- (تیۆ) وتی: بۆچی؟ جارێکیان شێخ سلێمانی هاوڕێم هاتە ژورەکەم سەردانی کردم و نازانم چیکرد خەوم لێکەوت.

- (میلینا) بەنیگەرانییەوە وتی: ئۆهـ. کەواتە هێشتا روبەڕوی زیادەرۆییەکانیان نەبویتەوە. زۆر باشە، دەبینیت.

- (ژروم) بەشداریکرد: (میلینا) بهێڵە (تیۆ) خۆی داوەری بکات.

- (تیۆ) بەقاقاوە وتی: ئەها! هۆکەی ئەوەیە کەدایکم یۆنانییە.

- باوکی بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئەمەت لەکوێوە هێنا؟

- (تیۆ) لەسەرخۆ وتی: لەپاش روخانی ئیمپراتۆری بیزەنتی تورکە عوسمانییە موسڵمانەکان یۆنانیان داگیرکردو ئەرتەدۆکسەکان دەستیان کرد بەبەرگریکردن، وانییە؟

(ژروم)و (میلینا) بۆ یەکیان روانی. دەرکەوت (تیۆ) هەروازوو زانیارییەکانی لەبەرکردوە.

- (میلینا) بەدەربڕینێکی نەرمونیانەوە وتی: بۆچی دەتەوێت مێشکت بەو شتانە بئاخنیت! باشتر نییە لەو گەشتەدا خۆت سەرگەرم بکەیت !.

- (تیۆ) وەك ئەوەی قسەکانی دایکی نەبیستبێ درێژەیپێدا: لەلایەکەوە ئاین دەبێت هەمیشە پایەدارو بەرگریکار بێت، چونکە بەوجۆرە بەدەسەلات دەگاتو بەتوانا دەبێت، بەتەواوی دەرکم بەو خاڵە کردوە. بەبێ کێشمەکێشو نەهامەتی زۆر ئاین ناتوانێت پێشکەوێت. بۆ ئەم مەبەستە دەبێت شار...

- باوکی قسەکەی پێبڕیو گوتی: تیۆ، چۆنە ئێستا هێندە خۆت لەو پرسانەوە دەگلێنی.

- (تیۆ) وەڵامیدایەوە: ئارەزوو دەکەم، بەڵام سەرکەوتوو نابم... ئاه ! لەڕاستیدا جارێکیان لە (لۆکسۆر).. سەیرە، لەیادم نەمابوو...

- دایکی وتی: تیۆ، لەخەونەکانت وەرە دەرەوە!

وەڵامی نەدایەوە. خوێنی کەڵەشێر، سەربڕین، کەشێکی دوکەڵاوی، سەرگێژخواردن... دەنگی تەپڵ ودەف، بۆنی گوڵی سور، ئامۆزای ژێر زەمین، دەستگیران، هەموو بەبەرچاویدا تێپەڕین. دایکی واقیوڕمابوو.

- تیۆ بەدەنگێکی نزم وتی: بەڵێ... دایە دەزانیت... بەتۆم نەگوت، بەڵام ئێستا جمکم هەیە.

- دایکی دەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕیو گوتی: خوای من، لەپاڵ خۆتدا بمانپارێزە!

- (تیۆ) درێژەی پێدا: هەستم پێکرد، من دەستگیرانی ئەو بومو لەگەڵیدا سەمام کرد... جمکەکەم لەژێر زەمیندا.. لەلۆکسۆر.

(میلینا) فنجانێك چای سەرمێزەكەی رشت. (ژروم) دەستی گرتو بەتوندی گوشی، لەژێر لێوەوە وتی:

- تیۆ، باشە. بەڵام نابێت زۆر بیر لەو بابەتە بكەیتەوە كوڕم.

(تیۆ) وتی: بیر لەو بابەتە ناكەمەوە، بەڵام هەستێكی بەختیاریم تێدا دەوروژێنێت.

(ژروم) لەگەڵ خۆیدا بیری كردەوە: (دەبێت لەوبارەیەوە داوای رونكردنەوە لە (مارتا) بكرێت. چ نەخشەیەكی كێشاوە؟).

## خواوەندێك و بەملوانكەیەكی ماری كوبرا

پورە (مارتا) دەیویست ئەو رۆژە بەكارەكانی خۆی رابگات، وتبوی: (ئێوە لەگەڵ (تیۆ) بۆ پیاسە بچن). (ژروم) بڕیاریدابوو بۆ دیدەنی شارۆچكەی (ئادری ین)[1] بچن. (تیۆ) لەوێ بەچاوێكی پڕتاسەوە لەپەیكەرەكانی روانیبوو. باوكی لەكاتێكدا بەرامبەر پەیكەرەكانی (ئیترۆسك)[2] راوەستابوو، كە مردووەكانی بەرجەستە دەكرد، وتی: چەند جوانە؟ (تیۆ) بەرای تۆش وانییە؟

- (تیۆ) وەڵامیدایەوە: دەكرێت وا بوترێت.

- ناساغی؟

- كەمێك. كەی پورە (مارتا) دەبینینەوە؟

لەسەردانی (فۆروم)[3]یشدا (تیۆ) هەستی بەسەغڵەتی دەكرد. لەمۆزەخانەی (كاپیتۆڵ) باوكی باسی ئەو قازانەی كرد، كە رۆمییەكان لەمەترسی بەردی (ترپەنی)[4] هۆشیاركردەوەو گوێی بۆ رونكردنەوەكانی گرت، كە دەیگوت ئەو بەردانە نیشانەی لەناوچونو وێرانبونی رۆم بوو.

---

[1] Hadrien: پۆبلیۆس اولیۆس ئادریانۆس ئیمپراتۆری رۆم (١١٧ – ١٣٨)پ.ز.

[2] Etrvsqves: شارستانی (ئیترۆسك) گرنگترین پێش ارستانی رۆمەكان بووە، لەنیمچە دورگەی ئیتالیادا، هونەری ئەم شارستانییە لەبواری پیشاندانی مردووەكانو نمایشی ژیانو كێشانەوەی رابردودا زۆر دەوڵەمەندە.

[3] Rom: بازاڕی شاری رۆما لەسەردەمی (ئیترۆسیكەكان)، كە پلە بەپلە بووە بەسەنتەری شار. لەسەردەمی خولی ئیمپراتۆری (فۆرومەكان)ی دیدا دروستكراوە. لەوانە فۆرومی ئاگوشتو تریانوس، پاشماوەكانی ئەو شارە ئەمڕۆی بەشتێكی گەشتیاری گرنگ دادەنرێت لەرۆمادا.

[4] بەردی ترپانی Rochetarpeienne بەناوی (Tarpeia) ناونراوە، كە یەكێكە لەجوتیارانی رۆمیو كچی حاكمی كاپیتۆ لە (ئەو شوێنەی ئەمڕۆ مۆزەخانەی كاپیتۆلە). ناوێكیشە بەبەشی باشوری خۆرئاوای گردی كاپیتۆل وتراوە لە رۆمای كۆنو تاسەردەمی ئیمپراتۆری گوناهكاران، لەسەر ئەو گردەوە هاوێژراوە.

پاشان باسی گەورەیی و شانازی (رۆموس)و (ریمۆلوس)ی بیست، کە ئەو جمکەبون شاری رۆمایان بنیاتنایەوە. کاتێك لەگردەکە بەردوخوار دەهاتن دوبارەی کردەوە: پورە (مارتا) لەکوێیە؟

- دایکی بەتەشەرلێدانەوە وتی: کاری چیت بە پورە (مارتا) هەیە؟ بۆ کاری خۆی رۆشتوە.

- باوکی بەسەراسیمەبونەوە وتی: راستە، ئێمە لەپاریسەوە بۆ دیدەنی تۆ هاتوین، ماوەیەکیش لەکاتی خۆت بۆ ئێمە تەرخان بکە!

- زۆر باشە، بەڵام دەبێت تەلەفۆن بۆ (فاتۆ) بکەم یان لەدۆزینەوەی پەیامەکەدا کۆمەکم پێبکەن....

- باوکی وتی: کاتی تەواوت دەبێت. لەدەوروبەری خۆت بنوارە! ئێمە لەشاری نەمریداین.

- (تیۆ) بەبێئارەزوییەوە وتی: بۆ من جیاوازی نییە. دەمەوێت بزانم پەیامەکەم چیم پێدەڵێت؟.

پێویستبوو لەبەردەرگای کافیتریایەك دانیشین، کاغەز بێنن و پەیامەکەی تارادەیەك شێ گرتبوی بخوێننەوە: ( **لە.... پیرۆزی مندا دانیشە، من سەماکەری نەمرم**). باوکی لەوباوەڕەدا بوو بۆشاییەکە شوێنی ناوی ئاژەڵێك بێت.

- (تیۆ) پرسی: بۆ نمونە ئەسپ؟...

- باوکی وتی: نەخێر... بەردەوام بە.

- باشە. کەواتە گوێدرێژێك؟ مانگا؟

- پەلە ئەکەی!

- مانگایەکی درندە... هەمان (زیوس)ـە، کە خۆی کرد بەگایەکی درندە؟ بەڵام (زیوس) سەمای نەدەکرد.

- نەخێر... (زیوس) نەبوو. سەرەڕای ئەوەش دۆزینەوەی مەتەڵەکە هێندە سانا نییە: (**بۆ کەناری روبارەکەم وەرە، بۆ جوانترین شاری جیهان**).

- (تیۆ) لەبەرخۆیەوە وتی: روبار، لەهەموو شوێنێ هەیە. (نیل)ی کەبینیم، روباری (تیبر)ی (رۆما)، کە ئێستا دەیبینین، کۆنترین شاری جیهان (تیب) لەمیسر. ئایا دەبێت بۆ میسر بگەڕێینەوە؟. بەڵام هیچ هەواڵێکی گەڕانەوە بۆ میسر لەئارادا نەبوو. (تیۆ) ژمارە تەلەفونی (فاتۆ)ی لێدا.

## سێیەمین ئاماژە: مارو نێزەی سێ پەل

- دەنگێ: لە دورەوە وتی: تیۆ.. خۆتی؟ تندروستیت چۆنە؟

- باشە. تەنها لەگەڵ سێیەمین پەیامدا دوچاری گرفت هاتوم... سەرەڕای ئەوەی باران دوو وشەی شۆردۆتەوە.

- گرانە. ئاماژەت دەوێت؟ ...

- (تیۆ) وتی: بۆ دەتوانم کارێکی دیکە بکەم؟

- پەلە مەکە... پەیامی ژمارە سێ... دۆزیمەوە (مارێك لەملم ئالاوەو نێزەیەکی سێپەلم بەدەستەوەیە).

- ئۆف، ئەو کەسە؟ ئەو کەسە کێیە؟ شتێکی دیکە نییە؟

- بۆچی نا، لەوێنەکانی ناو فەرهەنگی ئەفسانەکان بڕوانە. باشە؟

- (تیۆ) هەناسەیەکی هەڵکێشا: دەبێت باش بێت. ئەی تۆ چۆنیت؟.

- جێگات دیارە. زۆر ئارەزوو دەکەم بتبینم.

- منیش هەروەها. دەزانیت تەندروستیم باشترە؟

- زۆرم پێخۆشە.

- هیوادارم ئەوەبزانم! دەیبینین.

- ماچت دەکەم... وەك هەمیشە.

دەنگەکە بڕا. (تیۆ) چاوەکانی فرمێسکیان تێزابوو، بەپێداگرتنەوە داوایکرد بۆ خوێندنەوەی کتێبەکان بۆ هۆتێلەکە بگەڕێنەوە. لەفەرهەنگەکەیدا خواکان لەسەر بەردەکان، باڵندەکان، تەختی پڕشکۆی سەڵتەنەتی، لەسەر لقی درەختەکان رۆنیشتبون، لەلانکەدا خەوتبون، بەسەری نێزەوەبون، جەستەیان تیرئاژن کرابوو، بەلام هیچ کامیانماریان لەگەردندانەبوو، گەردانەیان نەبوو... (تیۆ) پەڕەکانی هەڵدایەوەو سەماکەرێکی مار لەگەردنی نەدۆزییەوە. سەرەڕای ئەوەش سەماکەرێکی لەسەر پشتی گایەکی دڕندە دانیشتبێت!. شەکەت و سەرسوڕماو خەریکبوو کتێبەکەی دادەخستەوە، کە پورە (مارتا) خۆی کرد بەژورداو (تیۆ)ی لەئامێزگرتو گوتی: ئێ، قرژاڵە بچوکەکەم وەڵامەکەت نەدۆزرایەوە؟

- (تیۆ)، کە خۆی لەئامێزی هاویشتبوو گوتی: پورە (مارتا)ی ئازیزم... چەند پێویستم بەتۆیە...

- پورە (مارتا) دەستی بەسەریدا هێناو گوتی: چیبوە، دەربڕینی ئەو هەموو هەستو سۆزە زۆرە بۆچی؟

- (میلینا) بەجۆرێك لەهەستی ئیرەییەوە وتی: وەك دەبینم زۆر هۆگرت بوە.

- پورە (مارتا) بەجۆرێکی لەهەست بەئازارکردنەوە وتی: بەسە.. بەسە... تیۆ.. زیاتر هەوڵبدە!

- (تیۆ) بەجۆرێ هیوا بڕاوییەوە وتی: بۆم نادۆزرێتەوە، یارمەتیم بدە!

- پورە (مارتا) کتێبەکەی کردەوەو پەنجەی هاویشتە سەر روی لاپەڕەیەكو گوتی: لێرەدا، دیارە وێنەکە بچوکە، هەر لەبەرئەوەیە نەتبینیوە.

خوایەکی تەواو رووت بەپێستێکی شینباو بەچەند دەستێکەوە، کە رمێکی سێپەلی بەدەستێك گرتبوو؛ لەیەکێکی دیاندا تەپڵی پێبوو؛ لەسێیەم مەشخەڵو لەچوارەم شتێکی وەك لەیستۆك. پێدەکەنیو لەگەردنیدا مارێك هەبوو، مارێکە کوبرای دەمبەخەندە، کە سەری هەڵبڕیبوو.

- (تیۆ) وتی: زۆر سەرنجڕاکێشە. ئەمە کێیە؟ سیڤا... شیڤا، بەڵام سەما ناکات!

- پورە (مارتا) وتی: چۆن؟!.. دیارە، خۆ دوو قاچی لەباری سەمادایە.

- (تیۆ) پرسی: بۆچی چوار پەلی هەیەو تەنها دوو پێ؟

- دەستپێکرا ! پرسیارو پرسیار لەڕاستیدا پرسیارێك هەیە ناپرسێت. بۆ نمونە ناپرسێت بۆ کوێ دەچیت؟...

- (تیۆ) بێدودڵی وتی: بۆ هندستان، لەسەر ئەم پەڕەیە نوسراوە. بەوپێیەبێت روبارەکە روباری (گنگ)ەو شارەکەش (بنارس)ـە، چونکە من هەر لەسەرەتاوە ئەوەمدەزانی. لۆژیکانەیە، بەڵام منیش لەوبڕوایەدام یەکێك لە وشەکانی پەیامەکە بزرە. (من دەپەرستنو من...) من چی؟

- باوکی وتی: (رەهایی دەبەخشم)، وشە شۆراوەکە (رەهایی بەخشینە). (تیۆ).. لەدوایدا ئەمە دەزانیتو بەراستی دەبێت پشوو بدەیت، بەبێ گفتوگۆ.

## تورەیی زۆری (میلینا)

هەر لەگەڵ داخستنی دەرگاکەدا (میلینا) تەقییەوە. لەوبڕوایەدابوو دشەکەی سوێندەکەی شکاندوە!. ئەی سوێندی نەخواردبوو هەرگیز باسی جمکەکە بۆ (تیۆ) نەکات؟ چۆن شتی وایکردوە....

- پورە (مارتا)، کە گیانی کەوتە لەرزە، بەنارازییەوە وتی: میلینا.. سوێنددەخۆم... هیچم نەدرکاندوە!.

- (میلینا) باوەڕی نەکرد: (تیۆ) دەربارەی جمکەکەی قسەیکرد، تەنانەت وتی بەیەك گەیشتون! ئەمە چییە؟

- پورە (مارتا) وەلامیدایەوە: ئەوە هەر ئەوشتەیە بەئێوەم ڕاگەیاند، کە لەمیسر بەشداری سروتێکی (زار)ی کرد...

- باوکی وتی: راستە، وتت کە (تیۆ) خۆشحاڵو دڵشادبوە لەو سروتەدا، بەلام هیچ پەیوەندییەك نابینم.

- پورە (مارتا) بەدودڵییەوە وتی: باشە..

- رونکردنەوەی ئەو پەیوەندییە لای دایكو باوکی (تیۆ) ئاسان نەبوو. ئەم شتە مایەی باوەڕکردنیش نەبوو. پورە (مارتا) وتی: خودی خۆی بینیویەتی، کە (تیۆ) بێهۆش کەوتوەو پاشان بەسەماوە لەدایك بۆتەوە،

- (میلینا) بەسەرسامییەوە وتی: دوبارە لەدایك بۆتەوە؟

- (مارتا) وتی: پاش هەستانەوەی بەبێهۆشی بەڕونی دەبیسترا کە (تیۆ) لەگەڵ جمکەکەی دەدوا. ئەم روداوە رویداوە.

- (ژروم) وتی:(تیۆ) لەباری بێئاگایدا... لەڕاستیدا لام سەیر نییە. زۆر خەیاڵاوییە.

- پورە (مارتا) ئاهێکی بەبەرداهاتەوەو گوتی: بەڵێ، وانییە؟ هەرچۆنێبێت بەپێیئەوەی (شێخە) دەیوت بەراستی جمکەکەی خۆی بینیوە. ئێستا پرسیار لەخۆم دەکەم، کە ئایا نابێت راستییەکەی لەلا بدرکێنن؟

- (میلینا) هاواریکرد: نەخێر... ئەو زۆر هەستیارە؟

- پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: ئەی ئەگەر ئەم جمکە نهێنییە بەبێئاگاداری ئێوە ئەوی بۆ سنوری ژێر خاك کێش کرد چی؟. نهێنییەکانی ناو خێزان هەندێکجار کارەساتی لەوجۆرە لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

(ژروم) وتی: ئەی ئەگەر زانینی ئەو راستییە لەئێستا زیاتر نیگەرانی کرد، تۆ خۆت دەزانی (تیۆ) زۆر نەخۆشە.

- پورە (مارتا) هاواریکرد: من زۆر لەوانە زیاتر دەزانم! یەکەمین کەسیشم دەمەوێت پارێزگاری لێبکەم. بهێڵە کارەکەم بکەم.

- (میلینـا) دەمودەسـت وتـی: بـەمجۆرە باشـترە. شـتی بنـەڕەتی ئەوەیـە ئەنجامەکـەی سەرکەوتوانە بێت، ئەگینا نازانم کوڕە لەسەردەمەگدا چسودێك لەو هەموو تاقیکارییانەی خوێن وەردەگرێت.

پورە (مارتا) دەیویست بلێت جمکەکەی بەمردوویی لەدایکبوەو پیەوەندیشی بەم گرفتەوە هەیە!، بەلام چاوپۆشی کرد. (مارتا) سەبارەت بەچارەسەری (تیۆ) بڕواو متمانەی بەخۆی هەبوو، یەکەمین گەشتیش ئەو هیوای لەلا بەهێزتر کردبوو.

## ئەو خواوەندەی ژنەکەی خۆی گڕی ئاگر سپارد

(دۆم ئۆتاڤیۆ) رۆژی دواتر دەرکەوتەوە، چونکە هەموو شتێك باشبوو پێشنیاری سەردانی مۆزەخانەی ڤاتیکانی کرد. وتی: هەموو مۆزەخانەکەنا، وانەیەك فێربوم! تەنها بەشی گەلاننناسی. لەو باوەڕەدام جێگای سەرنجی تۆ بێت.

- بەومەرجەی دەستم نەگریت، لەهەر شوێنێك ویستم ڕاوەستین، بەلێن دەدەیت؟

- بەلێن‌و سوێند. (دۆم ئۆتاڤیۆ) لەگەڵ چونە ناو تەلارێکی مۆدێرنەوە وتی: تەلارەکانی مۆزەخانەی (میسیۆنری) گەلاننناسی بەتەواوی نوێکراوەتەوە. ئەو دیاریانەی پێشکەش بە (پاپا)و شتە نایابەکان لێرەدا کۆکراوەتەوە. بامبینۆ.. تۆ لەم بەشەدا هەموو ئاینەکانی جیهان دەبینیت. کورتەیەك لە گەشتەکەت.

- پورە (مارتا) درێژەیپێدا: لەهەموو ئەو ولاتانەی کریستیانی هەن. لەبەرئەوەیە بەم مۆزەخانەیە دەوترێت (مسیۆنر)، لێرەدا خواوەندە کۆنەکان دەبینیت، کە قەشەکانی کاسۆلیك ویستویانە جێگاکەیان بەخوای خۆیان پڕ بکەنەوە.

- (کاردینالّ) لەسەرخۆ وتی: هەموو خواکان بۆ خوایەکی تەنهاو تاك دەگەڕێنەوە. بنەڕەت، ئیمان‌و بڕوا بۆ خوایە. ئێمە سەدجار ئەو گفتوگۆیەمان کردوە. (مارتا) ڕێگا بدە (تیۆ) خۆی ئەو شتەی دەیەوێت بیدۆزێتەوە.

- (تیۆ) دەستیهێنا بەسەری دوو شێری چینیدا. بەبەردەم ماکێتی (پەرستگای ئاسمانی پەکین)دا رەتبوو. بۆ ساتێك لەبەردەم (میحرابی چاکەکاران – پەرستگا)دا راوەستا. چاوێکی بەسەر پیرۆزییەکانی (بودا)دا گێڕاو بەبێجیاوازیکردن بەشی (ژاپۆن)ی تێپەڕاند...

- (میلینا) وتی: تیۆ، خێرا دەگەڕێیت!

- (تیۆ)، کەخێراتر شەقاوی دەهاویشت وتی: بەدوای کەسێکدا دەگەڕێم. تبت... نەخێر. دیارە مەغۆلستانیش نییە. هندو چین... ئاها! ئەوەتا، هندستان.

دروست روبەروی پەیکەری خوایەك راوەستا، کەمارێکی کوبرا لەسەرگەردنی ئەڵقەی دابوو. مارەکە سەری بەرزکردبۆوە. ئەم خوایە رێك لەسەر پشتی گایەکی درندە رۆنیشتبوو، گوتی: خۆیەتی. خوای هندستانەکەم. سەیرە، بۆچی بەوجۆرە نوسراوە...

- (کاردینالّ) وتی: ناوە هیندییەکان بەچەند شێوە دەنوسن. (سیڤا) بە (س)یان (شیڤا) بە (ش) هەردوکیان یەك شتن. بەڵام ئەو تەنها هیندی نییە، بەڵکو پەیوەستە بە (هیندۆیزم)ەوە. گاکەی ناوی (ناندی – Nandi)یە.

- گاکەشی ناوی هەیە؟

بامبینۆ، (ناندی)ش خوایەکە تایبەت و دەیپەرستن.

- ئەی ئەو خاتونەی تەنیشتی، ئەوە کێیە؟

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: ئەوە (پارڤاتی) هاوسەرێتی. خواکانی هندستان بەدەگمەن زگورتین. (شیڤا) سەرەتا لەگەڵ خوایەك بەناوی (ساتی) هاوسەرگیریکرد، بەڵام باوکی زاواکەی پەسەندنەکردو زۆر خراپ پێشوازی لێکرد، چونکە (شیڤا) خوایەکی باش پەروەردە نەکراو و توندوتیژو کەللە شەقە. (ساتی) غروری ژنانەی خۆی هێندە بریندارکراو بینی، کە بڕیاریدا بە زیندویی خۆی لەئاگر بهاوێت و خۆی بسوتێنێت تا تۆڵەی خۆی لەمێردێکی رەفتار خراپ و زۆردار بکاتەوە.

- (میلینا) بەتۆقاوییەوە هاواریکرد: جا ئەو کارەی کرد؟ ئەم خوا ئەفسانەییانە سەیر بێبەزەیین!

- ئەو خۆی سوتاندو خاکیش پەیکەرەکەی هەڵلوشی.

- (تیۆ) وتی: شیڤای بێچارە! بەتەنیا مایەوە...

- نەخێر، چونکە (ساتی) جارێکی دیکە لەجەستەی (پەرڤاتی)دا هاتەوە جیهان، بەڵام لەسەرەتای ونبونی ژنەکەیدا (شیڤا) نغرۆی جیهانی خەلۆەت و رامانی هەتاهەتایی بوو؛ هیچ هۆیەك نەیتوانی لەوجیهانە دەریبێنێت. (ساتی)، کەبۆ دوبارە بەدەستهێنانەوەی هاوسەرەکەی چوبووە جەستەی (پەرڤاتی)یەوە، دەردەسەری زۆری هاتەرێگا: لەپێناو ئەودا ملیۆنان ساڵ لەسەر یەك پێ راوەستا، گیا لەسەر جەستەی روا تا وەك درەختێکی لێهات. سەرئەنجام (شیڤا)

لەژێر کاریگەری خۆشەویستیو عەشقی ئەو ژنەدا، کە لەلای نەناسراو بوو، ملی بۆ هاتنە دەرەوە لەجیهانی نەرجسیەتداو لەگەڵی هاوسەرگیریکرد.

- (تیۆ) وتی: پەلە مەکە، لەڕاستیدا هەردوکیان یەك کەس بون؟

بەڵێو نەخێریش. هیندیەکان لەو بڕوایەدان لەگەڵ دەرچونی رۆح لەجەستە دەمودەست دەچێتە جەستەیەکی ترەوە. رۆح ناگۆڕێت، بەڵام جەستە دەگۆڕێت.

- (تیۆ) وتی: گرنگە. چەندجار ئەوە دوبارە دەبێتەوە؟

- پورە (مارتا) وتی: ملیۆنان جار. تا قۆناغێك، کە رۆح لەو هاتوچونەدا دەگاتە پلەی کەماڵو سەرئەنجام لەهەوادا (ئەسیر) شیدەبێتەوە. تیۆ.. بەهەڵەدا نەچیت، چونکە ئایدیاڵو ئارەزوی هیندیەکان ئەوەیە، کە کۆتایی بەشیبونەوەی رۆح یان (دونادون - تناسخ) بهێنن. (شیڤا)ش تاکە بونەوەرێکە دەتوانێت ئەو بازنەیە بوەستێنێت.

- (تیۆ) وتی: ئەو (رەها) دەکات! تێگەیشتم (من دەپەرستنو من رەهایی دەبەخشم)، بەڵام من وەك خۆم ئارەزوی رەهابونم نییە. پێمباشترە لەجەستەیەکی دیکەدا بتوێمەوە.

(میلینا) کەوتە لەرزەو (ژروم) شانەکانی گرت.

- (کاردیناڵ) وتی: بامبینۆ.. هێشتا بەو قۆناغە نەگەیشتوین، چونکە هندیەکان زۆر حەز بەژیان دەکەن! وانییە (مارتا)ی ئازیزم!

- پورەگیان هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: بەڵێ، راستە. (شیڤا) خوای ژیانیشەو خوای مەرگیش، هەروەها خوای سەماو مۆزیك، دەزانیت چییە؟

- (تیۆ) لەبارێکدا هەڵچونی زۆری پێوەدیاربوو گوتی: لەفیلمدا بینیومە هندیەکان لەروباری (گنگ)دا مەلە دەکەن لە (بنارس)، زۆر مایەی سەرنجە. منیش دەتوانم لەوێدا مەلە بکەم؟

- پورە (مارتا) وتی: بابزانم. بۆلای هاورێکەم، کە کاهینێکی گەورەیە، دەچینو ئەو زیاتر لەمن نەریتەکانت بۆ روندەکاتەوە.

- (کاردیناڵ) فیکەیەکی کێشا: ئێ! کاهنی گەورە؟ بەراستی لەهەموو شوێنێك پەیوەندی باڵات هەیە!

- تکا دەکەم، ئەو کاهنی گەورەی پەرستگای مەیمونی خواوەندە.

- (تیۆ) بەبیرکردنەوەوە وتی: مەیمونی خواوەند، کەواتە لە هندستان خوا هەیە مرۆڤ نین؟

- پورە (مارتا) وتی: ژمارەیان زۆر زۆرە! ئەو خوایانە دەتوانن مەیمون، مانگا، مانگای درندە، هەڵۆ، ئەسپ یان تەنانەت بەردبن...

(ژروم) بە پێکەنینەوە پرسی: بەرێز (کاردینالْ) ئەمە هەمان شت نییە تۆ بەبتپەرستی ناوت برد؟

- (کاردینالْ) شانەکانی هەڵتەکاندو گوتی: کریستیانیەت زیاتر لەئاینی جولەکەو ئەوانی دیکە لەبەرامبەر خوای ئاژەڵی ئاسانکاریو سنگفراوانی هەیەو نواندنی خوا لەوێنەی جۆراوجۆردا پەسەند دەکات!. پاش بێدەنگییەکی کەم بەردەوام بوو: بتەکان تەنها ئەوانەن دەستکردی مرۆڤەو لەسەر شێوەی مرۆڤ خۆیەتیو بەس. بەتێپەڕبونی کات مرۆڤایەتی کوڕی مرۆڤی دزییەوە، کە لەسەر شێوەی خوا ئەفرێنرابوو. خوایەتی لەهەموو شوێنێك هەیە... شتێکی نوێ نییەو پێویست ناکات دار هەڵگرینو دوای پشیلە بکەوین.

- (تیۆ) وتی: وایە. لەمیسر خوای تایبەت لەسەر شێوەی پشیلەیە. لەبەرئەوە میسرو هندستان وێکدەچن؟ سەرنجڕاکێشە!

## (تیۆ) دانپیانانەکانی (کاردینالْ) وەردەگرێت

دواین ڕۆژی مانەوە لەڕۆمابوو. (تیۆ) کامێراکەی هلگرتو وێنەیەکی زۆری دایكو باوکی گرت. وتی حەز دەکات وێنەی ئەوانی پێبێت. تەنانەت بەیانی زوو لەسەرجێگا بەفلاشی کامێراکەی بێداریکردنەوە. لەسەرمێز (کاردینالْ)، کە دەیویست هەرچۆنێکبوە پەروەردەکەی (تیۆ) تەواو بکات، بێهودە هەوڵیدا باسی پارادیمەکانی (ئنجیل) بێنێتە گۆڕی؛ لەکاتێکدا چنگاڵی بەدەستەوە بوو دەستیکرد بەبەرگریکردن:

- ئەو پارادیمانە زۆر جوانن. با پارادیمی (هەنجیر)ت بۆ باس بکەم...

- (تیۆ) لەکاتێکدا دەمی لە (ئەسپاگتی – جۆرە خواردنێکە) پڕ کردبوو گوتی:ئێستا وەرزی هەنجیر نییە.

- باشە، پارادیمی پاکیزە ئاقڵەکان؟ زۆرباشە، سێ خزمەتکار....

- (تیۆ) بەئەدەبێکی زۆرەوە وتی: بۆ جارێکی دیکە. ئەگینا دۆو دۆشاو تێکەڵ دەکەم، تێگەیشتی؟

- پورە (مارتا) بەدڵدانەوەوە وتی: (دۆم ئۆتافیۆ) ئەو ڕاست دەکات. ئێمە کریستیانی دیکەش لەشوێنی دی دەبینین.

- (کاردینالْ) وتی: بەداخەوە. دیارە لە(ڕۆما) باشتر دەبوو.

- (ژروم)، کە گلاسەکەی هەڵبڕی بەگاڵتەکردنەوە وتی: بەڕێز کاردینال، گوناهی غرورییە! ئەوە کارێکی باش نییە...

- (کاردینال) بەنارەزاییەوە وتی: سەیرکەن..ئەوە منم دانپیانان لەخەڵك وەردەگرم! بەڕێز بەڕێوەبەری جاسوسی ئەنستیتۆ، تکادەکەم رۆڵەکان هەڵنەگێڕیەوە!

- (تیۆ) وتی: من هیچ کاتێك لەواتای دانپیانان تێنەگەیشتوم.

- (دۆم ئۆتاڤیۆ) بەپەلە وتی: تاکی کریستیان دەتوانێت بەردەوام گوناهەکانی پاك بکاتەوەو بەخشین وەربگرێت. هێندە بەسە بچینە لای قەشەیەك تا بەناوی خواوە لەگوناهە پاکی بکاتەوە (پاکبوونەوە - Absolution)، کە بەواتای (توانەوەی تەواو – Solution Totale)ە. بەمپێیە توانەوە بکەین پاك ببینەوە.

- (تیۆ) وتی: شێوازێکی پراکتیکانەیە. بەمپێیە کریستیان دەتوانێت هەرچی دڵی گرتی بیکات. ئەی تۆ، تۆ هەرگیز گوناهە ناکەیت؟

- (کاردینال) وتی: هەڵبەتە کەدەیکەم، بەڵام من ئەو توانایەم هەیە دانی پێدابنێم، لەکاتێکدا باوکی تۆ ئەوە ناکات. دەڵێیت چی، من نەژنم هەیەو نەمناڵ، بەڵام دەتوانم بەخشندەیی بدەمو گوناهەکان پاك بکەمەوە. ناکرێت هەموو شتێك پێکەوە هەبێت.

- (تیۆ) وتی: لەگەڵ ئەوەشدا خەم ئەنگێزە!

- (کاردینال) پرسی: ئایا باری پەژموردەیی بەمنەوە دیارە؟ راستم پێبڵێ...

- (تیۆ) وتی: نەخێر، تەنانەت تۆ لەبنەڕەتدا بەختیارو گەنجی....

- (کاردینال) بەدەنگی بەرز وتی: گرنگە، لاو، بەبەرەکەتو گەورەیی خوای مەزنی پەروەردگار!

- (ژروم) سەلماندی: بەوکارەی کاردیناڵەکانی وەکو تۆ ئەنجامی دەدەن ناشتی بەکڵێسا دەبەخشن. من چارەی قەشەم ناوێت....

- پیاوی کڵێسا قسەکەی پێبڕیو گوتی: دەزانم، کوڕەکەتان بەرادەی تەواو دوبارەی کردۆتەوە. باشە دەیبینیت کە ئەو (تیۆ) سەرەڕای خواستی تۆ دواجار دەبێتە ئیماندار.

- (تیۆ) وتی: - شش! بەبڕوای تۆ ئیماندار بە چ شتێك؟

- (دۆم ئۆتاڤیۆ) وتی: ئەوە نازانم، بەڵام دەزانم لەگەڕانو بەدواداچونی دۆزینەوەی شێوەکانی خوادا یەکێکیان دەدۆزیتەوە تاچنگی لێگیربکەیت!

- (تیۆ) وتی: ئەگەر وا دەرچوو نامەت بۆ دەنوسم.

## (کاردینالْ) بۆنەی ماڵئاوایی ڕێکدەخات

دایكـ و باوکی (تیۆ) بۆ پێڕاگەیشتن بەفڕۆکەی پاریس ڕۆشتن. پورە (مارتا)و (تیۆ)ش بەرەو (دلهی) نیازیان بوو. لەفڕۆکەخانە (میلینا) هێندە بەتاو گریا، کە (تیۆ)ش کەوتە هاڕەی گریان. (ژروم)و پورە (مارتا) بوێری جیاکردنەوەی ئەو دوانەیان لەیەکدی نەبوو، سەعاتی هەڵفڕین نزیك دەبۆوە. ئینجا (کاردینالْ) دەسرێکی گەورەی لە گیرفانی دەرهێناو بەشێوەی فەرمان بە (تیۆ)ی وت:

- فین بکە ئەم دەسرەوە.

(تیۆ) لەپڕ لەگریان ژیربۆوەو هاتەوە سەرخۆی. ئینجا (کاردینالْ) دەسرەکەی بۆ (میلینا) درێژکردو وتی:

- خاتون بەرێزیشتان، تکادەکەم. خاتون.. بەو فرمێسك ڕشتنە خۆتان ئازار دەدەن. کەمێك ئەسرین خەوشی تێدانییە، بەڵام نابێت زیادەڕۆیی بکرێت.

(میلینا) هەنسکەکانی خواردەوەو گریانی گیرسایەوە. (کاردینالْ)، کە لەسەرخۆ دەسرەکەی قەد دەکرد، وتی:

- زۆر باشە، ئێستا بەسۆزو خۆشەویستییەوە یەکدی لەئامێزدەگرن..... پاشان بامبینۆ باوکت ماچ بکە.... خاتون لەگەڵ هاوسەرەکەتان بەرەو دەرگای چونەدەرەوە بۆ سواربونی فڕۆکە بڕۆن.. تکادەکەم.... (تیۆ) لەگەڵ پورت وەرە بۆ ئێرە. هەموو شت ڕێکخرابوو.

پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: ئەی هاوڕێکەم..تۆ سەرۆکێکی لێهاتوی پێشوازیکردنی!. هەموو شتێکت بەئاماژەیەکی دەست ڕێکخست.

- (کاردینالْ) بەچرپەوە وتی: ڤاتیکان قوتابخانەیەکی چاکە. ئێمە لەبواری پێشوازیکردندا زۆر پێشکەوتوین. دەزانیت کە....

- (تیۆ) کە بەراکردن دوای (میلینا) کەوت وتی: دایکە! نیسکەکانم بگرە! ئەمانە بۆ تۆ دەپشکوێن!

- سوپاس، ئازیزەکەم، چاودێریان دەکەم. ئێستا بڕۆ چاوەکەم.

بەشی دە

# (هندستان بەحەوت روخسارەوە)

## نیگەرانیەکانی پورە (مارتا)

لەگەڵ پێنانە ناو فرۆکەکەوە (تیۆ) کەوتە وەنەوزدان. پورە (مارتا)، کە ئاشنای گەشتە درێژەکان بوو، پێڵاوەکانی داکەند، قاچەکانی درێژکردو رۆژنامەی (هیراڵدتریبۆن)ی کردەوە، بەڵام حەوسەڵەی نەبوو. بیریدەکردەوە: بڵێی ئەم گەشتە درێژە رۆژەکانی تەمەنی (تیۆ) کورتبکاتەوە!؛ ئەی ئەگەر هەر لەسەرەتاوە بەههەڵەدا چوبێت چی؟ ئەگەر پزیشکەکان.... لەبەرخۆیەوە وتی:

- کچێ خۆت رادەستی دڵەراوکە مەدە. پسپۆران بێتوانایو کەمدەستیان نواندوە. مناڵەکە بەلەدەستچوو دادەنێن، بەڵام ناتوانن هۆیەك بدۆزنەوە. (ڤایرۆسێکی) نەناسراو.... ژەهراویبونێکی گەرمەسێریی، کە بەهۆی هەواوە دەگوێزرێتەوە ... پشتگوێی بخە! من راستم...

بەڵام قۆناغی هندستان ئاسان نابێت. شۆکی بەرفراوانیو گەورەیی نیمچە کیشوەریی، زۆریی خەڵك، نزیکبون لە ئاژەڵان، سەیروسەمەرەیی خواکانی هندستان بەچاوانی کاریگەرەوەو گەرموگوڕی ئاینێکی فرە روخسار... (مارتا) یەکبەیەکی ئەگەرەکانی خۆی هەڵسەنگاند. دەبێت چۆن رەفتار بکات تا(تیۆ) ناچاربکات پێش گەشتکردن بۆ (بنارس)ی مەترسیدار ماوەیەك چاوەڕوان بێت؛ چونکە لە کەنار روباری گەورەدا مردوەکان لەسەر لیژنەدار دەسوتێنن... (مارتا)چاوی لەشینایی ئاسمان بڕیبوو، لەگەڵ ئەوەشدا بیری پەرتی مەشخەڵەکانی سپێدەو ئەو خۆڵەمێشەبوو بەسەر شەپۆلەکانی روبارەکەوە دەتوانەوە. بەهێمنی بەخۆی وت:

- نەخێر.. نابێت سروتی سوتاندن ببینێت. دەزانم چۆن (تیۆ) بۆ (بنارس) دەبەم، بەلام لەگەڵ هەموو ئەو ڕوشوێنانەشدا نیگەران بوو. ئاها! بێهودەنەبوو شاری (بنارس) خوای (وێرانیو نابوتی) دەپەرست!؛ ئەو خوایە بە چ شێوەیەك خۆی دەردەخات؟ لە شێوەی مەرگ یان لەشێوەی ژیان. دوبارە بەخۆی وتەوە:

کچێ!باشترە خەریکی شیکردنەوەو لێکدانەوەی هەڵچون و داچونی بۆرسە بیت. لەگەڵ ئەوەی هەمیشە ئەو شتەی لەبەرخۆیەوە دوبارە دەکردەوە بەبێویست چاوی گواستەوە سەر ژمارەی هاوبەشەکانی لەفرانکفۆرد یان تۆکیۆ.

## هەشت ئاینی هندستان

شەش سەعات فڕین، خواردن، زاقوزیقی منداڵ. (تیۆ)، کە بێداربوەوە، لەودایکە هندیانە وردبۆوە، کە منالەکانیان بەدلێریو کەمتەرخەمییەوە بەدرێژیو پانی فڕۆکەکە دەگەڕانو پرچە درێژەکانیان لەناو تۆڕێکی رەشی بەستراو بەتالی سپی بەستبوو. لەو پیاوە بەتەمەنە سەیروسەمەرانەی بەچاکەتو پانتۆڵو کلاوەوە، کە نوکی تیژیان بۆ پێشەوە هاتبوو، لەفرۆشگا بێ گومرگەکەی فڕۆکەخانەکە خەریکی کڕینی شتی رازاندنەوە بون.

- (تیۆ) چرپاندی: پورە (مارتا)، ئەوانە بۆ ریشی خۆیان لەتۆڕ هاویشتوە؟

- پورە (مارتا) وتی: چونکە ئەوانە (سیك- سیغ)ن، ئاینەکەشیان تاشینی هەرجۆرە مویەکی لەشی قەدەغەکردوە. لەژێر ئەو عەمامانەدا هەموو قژەکانیان تۆپەڵ کردوە. کاتێك ریشیان درێژ دەبێت رێکیدەخەن، ئەوە ئاسانترەو لەبەرئەوە لەناو تۆری دەنێن، وەك موی سەر....

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: دوبارە موو!. بۆچی دەبێت بۆ قژی سەر ئەو هەموو یاساو رێسایە داتاشن؟

- بەلام ئەمجارە باس لەکەزیەی ژنان نییە، بەلکو ئەوە پیاوانن کورتکردنەوەی مویان لێقەدەغەکراوە. پیاوان لەیادی ئەو ئازارەی لەرابردودا بینیویانە ئەم خوە پەیڕەودەکەن، چونکە مامۆستای گەورە فەرمانی پێداون تاهەمیشە ئامادەی بەرگریکردنبن. قژەکانیان هی پیاوانی جەنگەو ئەمەش تایبەت نییە بەتاك... هەمان ئەفسانەش لە (تەورات)دا دەبینرێت تۆ رووداوی شەمعون (سامون) دەزانیت؟

- ئەو یارۆیەی مەعشوقەکەی سەری تاشی تا بێتوانا بێت؟

- ئەو یارۆیەی تۆ باسی دەکەیت لەقازیانی خودایی بوو، وەکو دەزانیت قازی دەبێت قژ بەسەرییەوە بێت، چونکە قژی زۆر هێزێکی خودایی بەپیاو دەبەخشێت. بەلآم (شەمعون) عاشقی ژنێك بوو دوژمنی جولەکە. ژنێك لەخێڵی (فەلەستینییەکان)[1]، ئەم ژنە، کە ناوی (دەلیلە)بوو لەکاتی خەودا سەری کابرای تاشی. ئیدی پەیوەندی (شەمعون) لەگەڵ خوا پچڕا. دیلیان کرد، چاویان هەڵکۆڵی، بەکۆڵەکەی پەرستگاوە بەستیانەوەو ماوەیەکی درێژ بەوجۆرە دەسبەرداری بون. لەوماوەیەدا دوبارە موی سەری زیادبووەوە..

- ئەوسا (تیۆ) هاواریکرد: دەزانم.... هێزەکەی بۆ گەڕایەوە، ئەستونگەکانی پەرستگاکەی راتەکاندو بەسەرسەری هەموویاندا نەڕاندیو هەموویانی وردکرد.

- دەزانیت موو ئیماندار بەخواوە گرێدەدات. (بەرهەمنەکان) لەهندستان لەپشتی سەرەوە وەکو پرچ درێژی دەکەنەوە.

(تیۆ) تێگەیشت لەوەدا شتێکی سەیر هەیەو راهیبێکی بودایی بینی قوماشێکی ئەرخەوانی لەخۆیەوە ئالآندبوو. پاشان چاوی بەژنێکی ئەمریکی کەوت، کە پێستی سپی بوو، عەمامەیەکیشی بەهەمان سپێتی کراسە درێژو پانتۆڵەکەیەوە لەسەرنابوو. ئینجا سەیری ئەو موستیلانەی کرد لەپەنجەکانی پیاوێکی هندی دابوو، کە لەسەر کورسییەکەی باوێشکیدەدا. بەڕاستی گەشت بەرەو هندستان گەشتێکی ئاسایی نەبوو. نەیتوانی هیچ بڵێت، جگە لەوەی کە: چ ئاینێکی سەیروسەمەرەیە.

- پورە (مارتا) پرسی: کام ئاین؟

- ئاینی هندستان.

- پورە (مارتا) بەسەرزەنیشت کردنەوە وتی: سەیرە، قرژاڵە بچوکەکەم..مەگەر پێشتر نەمگوت لەهندستان تەنها یەك ئاین نییە؟

- (تیۆ) وتی: بەڵێ، راستە. چەند ئاین هەیە؟

[1]. Philistins لەگەلە دێرینەکانە، کە لەکەناری (کەنعان) لەدەوروبەری ساڵی (١١٩٠)ی زایینیدا نیشتەجێبوون و ناوی خۆیان بەسەر هەموو ناوچەی فەلەستیندا سەپاند. ئەم گەلە دژایەتی سەختیان لەگەڵ جولەکەدا هەبوە. (جلوت – گلیات)یش کە دژ بە(داود) جەنگیوە لەمانەبوو.

- پوره (مارتا) وتی: بەلایەنی کەمەوە هەشت ئاین: هندۆیزم، بودایزم، جینیزم، ئیسلام، زەردەشتی، سیکیزم، کریستیانو تەنانەت جودایزمیش.

- (تیۆ) وتی: هیچ تێنەگەیشتم، دوبارەی بکەرەوە.

- پوره (مارتا) بەوپەڕی ئارامییەوە رونیکردەوە، کە لەسەرەتادا ئاینی (بەرهەمە) بووە...

- (تیۆ) بەناڕازییەوە وتی: ئەمە تازەیە.

- راستە. چونکە ئەم ئاینە بەشێوە کۆنەکەی نەماوە. ئاینی (بەرهەمایی) هێندە کۆن ببوو، کە لەسەدەی سێیەم ناوەکەی بۆ (هندۆیزم) گۆڕا. ئێستا زیاتر لەحەوت سەد ملیۆن کەس پەیڕەوی لەو ئاینە دەکەن.

- (تیۆ) وتی: ئاه.. ئەمە یەك دنیایە...

- بەڵێ، کاتێك باس لەهندستان دەکرێت دەبێت پێوەرەکانی مرۆڤ ئاوەژوو بکرێتەوە. پوره (مارتا) بەردەوامبوو، تەنها شاری (کەلکەتا) بەلایەنی کەمەوە دانیشتوانی دوو هێندەی نەمسا دەبێتو ئێستاش هندستان لەیەك ملیار دانیشتوان هێندەی کەم نییە. ئەو ویلایەتەی هندستان، کەکەمترین دانیشتوانی هەیە لەفەرەنسا زیاترە.

- (تیۆ) وتی: بەسە، سەرم گێژ دەخوات.

- سەرسوڕمانو گێژخواردن ناچارییە، بەتایبەتی کەئاینی (هندۆیزم) خۆی‌زیاتر لەیەك ملیۆن خواوەندی هەیە؛ هەندێك بۆ سێ سەدو سی ملیۆن بەرزی دەکەنەوە. بەکورتی ژمارەی خواکانیان بەتەواوی دیار نییە، بەڵام ناشبێت زیاد لەرادە گوێج بیت، دەکرێت چەند ژمارەیەکیان ئەژمار بکرێت.

- (تیۆ) وتی: من دوانیان دەناسم! (شیڤا- سیڤا)و (پرواتی).

پوره (مارتا) رونیکردەوە: ئەوەش خراپ نییە. دەبێت بنەماو بنچینەی (هندۆیزم) بناسیت، کە بریتییە لە (رێزگرتن لە سیستمی بونەوەرەکان، ملکەچی بۆ چارەنوس، باڵادەستیو دەسرۆیشتن بەسەر هەموو بزاوتێکی ژیان، پاراستنی ئەو دڵسۆزیو پاکیزەییەی هەر لەسەرەتای لەدایکبونەوە خوا لەسەر بنچینەی چینی (چین) بۆ هەریەك لەهندییەکانی دیاریکردوە، چونکە دڵسۆزی بۆ هەموان یەکسان نەبوو: هەرەمی (ڤارنا Varna)کان، کە

تایبەتمەندی ئاینی (هندۆیزم)ە، هندییەکان بۆ سێ چین یان (چین)[1] دابەشدەکات: چینی بالا - بەرهەمنەکان، جەنگاوەران، بازرگانان – کەچینی خزمەتگوزاران بۆ ئەو سێ چینە زیاد دەکات. لەنێو ئەو چینانەدا دڵسۆزترینو پاکترینیان، واتە (بەرهەمنەکان)، مافی خوێندنەوەی دەقە پیرۆزەکانو چاودێریو پیادەکردنی وردیان هەبوو. جەنگاوەردکان دەسەڵاتی سیاسیان پراکتیك و بەرگریان لەخاكو ولات کردوە. بازرگانەکانیش کاروباری بازرگانیان لەئەستۆبوە. هەموو ئەندامانی ئەو سێ چینە (دوجار لەدایك دەبون)، واتە لەتەمەن هەشت ساڵیدا مافی سازکردنی سروتی چونە ناو (چین)یان هەبوەو لە لەدایکبونەوەی دووەمدا بۆ هندۆسی خواپەرستو لاتەریك گۆڕاون و هەر ئەو سێ چینەش هەبوە.

لەژێر ئەم سێ چینە (دوبارە لەدایك بوەوە )دا هەزاران چینی دیکە هەبون، کە بەپێی پلەی دڵسۆزی فراوانی خۆیان تاسنوری ئارامی مرۆڤایەتی چینبەندی کرابون، بەلام کەسانی دیکەش هەبون لەپەرگیری مرۆڤایەتیدا بون. لەخوارترین سنوری چینبەندیدا ناپاکترین کەسەکان هەبون، کە کاری مردوانیان دەکرد: چونکە کاتێ رۆح لەئابلۆقەی جەستە دەردەچوو جەستە دەمایەوە، کە پڕبوو لەناپاکی. لەدەرئەنجامی نەریتی هندۆیزمدا ئەم بەشە لەتاکەکان هێندە (شوم) بون بەپێی پرنسیپ دەکرانە دەرەوەی چینەکانو لەهیچ چینبەندییەك ئەژمارنەدەکران؛ واتە لەکۆمەلگادا جێگایەکیان نەبوو. لەسەردەمی خولی ئیمپریالیزمی (ئینگلیز)دا بەخەڵکانێك ناودەبران کەنابێت لێیان نزیك ببیتەوە یان بە(دەستلێنەدراو) وەسف دەکران. گروپی شومەکان لەدەرەوەو دوور لەهندییەکانی تر دەژیان. چارەنوسیان سوکترین جۆری ژیان بوو، کەنەیاندەتوانی لەچنگی هەڵبێن. چونکە ژیانی هەر تاکێکی هندی بەپێی پلەی کۆمەلایەتی لەدایکبونی دیاریدەکرا، کە ئەو ئاستە کۆمەلایەتییە پێشتر بەپێی سیستمی دابونەوەریتیو چینەکان پێشبینی بۆدەکراو ناوەڕۆکەکەی دڵسۆزیو پاکێتی تەواو بوو، کە ئەوانەی دوبارە لەدایکبونەوە چاودێریو ئاگاداریان دەکرد، بەتایبەتی بەرهەمنەکان، کە لەچینی یەکەم بونو زانستی ئاشنابونیان بەدەقە پیرۆزەکان لەلابوو.

---

[1] . ئەمجۆرە دابەشکردنە کۆمەڵایەتییە، کە یەکەمجار لەهندستاندا بینراوەو ریشەی لە ئاینی بەرهەمانیدا لە زمانی فەرەنسیدا بەواتای یەك گروپی کۆمەڵایەتی دێت، کە وابەستەی سونەتو خوا پەرستی خۆیانو رێگری لەهەموو تێکەڵاوبونێکی تاکی دەرەوەی خۆیان دەکەن

دیارە بۆ پاراستنو چاودێریکردنی ئەو هاوسەنگییە هەستیارەی نێوان پاك و باشەکان، ناپاکەکانی دەرەوەی چینەکان، خودایەتی هندستان پێویستی بەژمارەی جیاواز هەبوو، بەلام بەهەمان شێوەی کەبەرێز (لاپلاس)ی دێرینەناس دەربارەی ئاینەکانی میسر رایگەیاند، ئەم فرە خودابیەش هەموویان بەیەك وێناو ئایدیای هاوبەش و تاك، واتە خواوەندێتی رەها (ABSOLU) کۆتاییان دەهات. بەو واتایەی چاوپۆشی لەوەی هندییەکان سەر بەکام کاست یان چین بون هەموویان (رەها) یان بە(بەرهەمەن) ناودەبرد، کە بەواتای بونی پاك، بێسنور، بێکۆتاو کامڵ دێت، کە هیچ شێوەیەکی نییەو هەر تاکێکی هندی لەدەرونی خۆیدا ریشەیەکی رەهای تایبەت بەخۆی (Atman) هەیەو ئەویش (خودی خۆیەتی). هەمان رۆحی تاکێتییە، کە ئەرکدارە لەرێگای مەرگەوە لەجەستە دەربچێتو پێش (دونادون – تناسخ)ی ئایندەی پەیوەندی بەکۆ یان کاملەوە بکات تا لەپاشاندا بەرەهای بالا بگاتو بەڵکو سەرئەنجام لەبازنەی خودی ژیان دەربچێت. بەرهەمنەکان ناوی خۆیان لە (رەها) یان (بەرهمان - Brahman) بەمیرات بۆ ماوەتەوە، کە ئەرکیان پارێزگاری لێکردنییەتی. بەمپێیە سەرەرای شتە رەواڵەتییەکان (چینی بەرهمانەکان) لەکاتی جێبەجێکردنی نەریتو سروتی ئایندا پەیوەندیان بۆ هەموان لەگەل (رەهای تاك)دا دەسەبەردەکرد. لەوەش زیاتر... پێش ئاینی بەرهمانیزم لەهندستان تەنها یەك خوای (ئیزدبانو) بەناوی (ئاویتی) هەبووە، کەدایکی چاوگەو سەرچاوەی ژیان بوو. دەڵێن پاشئەوەی بەرەهمناکان دەستیان بەسەر هندستاندا شکاوە خوای گەورە لەنێو لیستی خوا نێرەکاندا بزربووە. بێگومان هندییەکان رێزیان لەسیستمی سروشتی گرتوەو بۆ هەر (ئیزد)ێك (ئیزدبانوو)یەکیان هەبوە. پاشان هندییەکان جوتی خواکانیان داهێنا، بەو واتایەی بۆ هەر خوایەك هاوسەرێك وەك ئەرکێك دیاریکرا، بەلام دەرك بەو پرسە کرا، کە کاتێك لەشاردا سەبارەت بەخواکان پرسیار لەهندییەکی ئیماندارەکرا دەیانبینی وێنای تاکەخوایی لەهزریدا نەشۆراوەتەوە: چونکە چەندی هندییەکی باش سوربوبێت لەسەرئەوەی ژیانی خۆی نەزری خوا هەڵبژێراوەکان بکا، بەلام رۆحی تاکانەی لەسەرانسەری جیهاندا هەروا بەدوای (رەها)وە بوو.. خودایەتی هندی بەمەبەستی ئاسانترکردنی هەوڵەکانی ناوخۆی کۆمەڵ هەریەکەیان رەواڵەتو نوێنەری توخمێكو بەشێکی ژیان بونو بۆ هەر چالاکیو هەوڵێك خوایەك هەبوو. بۆسامان خوای (لەکشمیر)، بۆ هونەرەکان خوای (سەرساڤاتی)، بۆ خێزان و بازرگانی خواوەندی (گانیش)...هتد.

- (تیۆ) وتی: بودا؟

- پورە (مارتا) بەدەنگی بەرز گوتی: بودا، خوا نەبوو! شازادەیەك بوو لەپزدانی شازنێك هاتبوە دەرەوەو پاشان تەرکی دنیای کرد. بەڵێ (تیۆ) ئەو ئێش‌و ئازاری مرۆڤایەتی لەژێر دوو روخساری ترسهێنەری نەخۆشی‌و بەتەمەنیدا دۆزییەوە. پاشان لەسەر ئەو رێگایە بوو بەراهیبێك، کە سیمایەکی ئارامی هەبوو. ئینجا گۆشەگیری هەڵبژارد تابۆ دۆزینەوەی حەقیقەت بچێتە خەڵوەت‌و رامانەوە. پاشان دەرکەوت کۆمەڵێکی زۆر دەستیان کردوە بەپەرستنی.

- (تیۆ) وتی: زۆر باشە، کەواتە بودا بوو بەخوا.

- بەڵام پورە (مارتا) هەستی بەکەمتەرخەمی دەکرد، چونکە بەپارێزێکی زۆردوە سێیەمین وێنەی ئێشو بێبەشی لە(تیۆ) شاردبۆوەو بێدەنگی لێکردبوو. ئەوەش هەمان ئەو روخسارەبوو شازادە(گوتاما)ی ناچارکرد روو لە چاوپۆشیکردن لەجیهان بکات: بینینی تەنها جەستەیەك. بەڵام پورە(مارتا) بۆئەوەی لەوەزیاتر بیرلەو پەنهانکارییە نەکاتەوە پێیباشبوو بۆ (تیۆ)ی رونبکاتەوە، کەچۆن لەوکاتەدا و تارادەیەکیش لەهەمان شوێندا لە هندستان شازادەیەکی دیکە لەدایکبوو، کەئەمیش تەرکی دنیای کردو لەژێر ناوی (پاڵەوانی گەورە – مهاڤیرا-Mahavira)دا تەریقەتی (جینیزم)ی بونیاتنا، کەئاینێکە خزم یان ئامۆزای ئاینی بودایی. لەهەموی سەرنجراکێشتر ئەوەیە (بودا)و (مهاڤیرا) هیچکامیان سەبەچینی بالآنەبون، واتە (برهمانەکان)،کە پاسەوان و چاودێری دڵسۆزی و پاکێتی بون؛ بەڵکو هەردوکیان سەربەچینی شازادەوجەنگاوەرەکان بون، کەچینی خوار چینی برهمانەکانە. هەرلەبەرئەوەش هەردوکیان بۆ دۆزینەوەی هاوسەنگی دوو ئاینیان نقارکرد، کە بەبێرەچاوکردنی چینەکان دەروازەیان بەروی هەمواندا والآ بوو، کەئەوەش پێشکەوتنێکی فرەزۆربوو.

لەراسپاردەکانی (مهاڤیرا)ی دامەزرێنەری تەریقەتی ( جینیزم) رێزگرتن بوو لەهەموو جۆرە بونەوەرێك و قەدەغەکردنی ئازارنەدانیان. لەبەرئەوە (جینیستەکان) هەموو رووەك خۆربون، نە هێڵکەو نەگۆشتیان دەخواردو لە کوشتنی هەموو زیندەوەرێك دەسڵەمینەوەو دەترسان؛ تائەو رادەیەی لەکاتی رۆشتندا بەرپێی خۆیان دەماڵی نەوەك زیندەوەرێك بکەوێتە ژێر پێیانەوە؛ هەروەها دەماخیان دەکرد نەوەکو بونەوەرێك لەگەڵ هەوادا بپەرێتە ناو زاریانەوە.

- (تیۆ) شرۆڤەی کرد: وەوە عیشق و خۆشەویستییە.

- پورە (مارتا) وتی: خۆشەویستییە، بەڵام سانانا. سەرەڕای هەموو ئەوانەش ئەو گروپە بۆ دوو گروپی دیکە دابەشبون: کەسانێك بەرگی سپی دەپۆشنو کەسانێکی دیکە هیچ ناپۆشن، واتە تەواو بەڕوتی دەژین.

- (تیۆ) وتی: (نۆدیستن)[1]؟ بۆچی نا؟

- دیارە، بەڵام (نۆدیستەکان) یان لایەنگرانی بەڕوتی ژیان هەموو ژیانی خۆیان بەڕوتی بەسەرنابەن، لەکاتێکدا (جینیستەکان) هەرگیز پۆشاك ناپۆشن.

(تیۆ) دەستیکرد بەئەژماردن: هندۆیزم، بوّدایزم، جینیزم، سەرەڕای سێ دانەی دیکە لەجولەکەگەرایی، کریستیانیەتو ئیسلام. ئەمە تائێرە شەش ئاین. زەردەشتیش، کە پێشتر باستکرد دەبێتە حەوت.

مابۆوە (سیکیزم)، کە خواوەندەکەی لەشێوەی کتێبی زیندودایەو لەلایەن موریدەکانییەوە دەپەرستن، کە (سیکەکانن).

- (تیۆ) وتی: زیندوو؟ گاڵتە دەکەیت!

- پورە (مارتا): کە لەپەرستگای (سیکەکان)دا، کە بە(گورودوارا) یان (ماڵی موراد - ماڵی مامۆستا یان گورو) ناوی دەبەن، تۆ ئەو خواوەندە - کتێبە بەچاوی خۆت دەبینیت. لەهندستان نزیکەی حەڤدە ملیۆن (سیك) لەپاڵ کریستیانەکاندا دەژین، کە ئەمانیش نزیکەی بیست ملیۆنن. موسڵمانەکان نزیکەی سەدو بیست ملیۆن، جینیستەکان چوار ملیۆن، بودییەکان پێنج ملیۆنو زەردەشتییەکان، کە بە(پارسەکان) بەناوبانگن لە سەد هەزار کەس کەمترن، لەکاتێکدا جولەکە لەچەند هەزار کەسێك زیاتر نینو ئەوانی دیکە بۆ ئیسرائیل کۆچیان کرد.

- (تیۆ) وتی: بێگومان بەهۆی ئازارو ئەشکەنجەوە!

- بەهیچ شێوەیەك. ئەگەر وڵاتێك هەبوبێتو بەراستی جولەکەکانی تێدا ئازار نەدرابێت ئەو وڵاتە هندستان بوە. جولەکەکانی هندستان بەئارەزوی خۆیان بۆ ئیسرائیل کۆچیانکرد. تەنها لەبەرئەوەی دەیانویست بۆ ئۆرشەلیم بچن.

- بەناچاری!. کەواتە وتویانە (ساڵی ئاینده لەئۆرشەلیم)، لەبەرئەوە بۆ ئەوێ ڕۆیشتون!. ئەمە پەیوەندی بەوەوە نییە لەهندستان خەڵك ئازادە تابەدڵی خۆیان بجولێنەوە!.

---

[1] Nudistes ئەو گروپەیە لەخۆرئاوا لایەنگری بەڕوتی ژیان بەسەربردنو ژمارەیان زۆر کەمە

- پورە (مارتا) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بەڵێو نەخێریش! نێوانی هندیو موسڵمانەکان کاری هێندە ساناو ئاسان نییە!. لەسەر پرسی ئاڵۆزو نادیار لەجۆری مانگاو بەراز ئاژاوەو روداوی خوێناوی رودەدات. (تیۆ).. بەوجۆرە سەیرم مەکە، وتم مانگاو بەراز! هەندێکجار رودەدات هندیەکان بەرازێکی سەربڕاو فڕێدەدەنە مزگەوتی موسڵمانەکان!، چونکە لەئاینی ئیسلامدا گۆشتی بەراز حەرامەو لە (تەورات)یشدا بەهەمان شێوەیە... ئینجا موسڵمانەکانیش پارچەیەك گۆشتی مانگا فڕێدەدەنە پەرستگای هندەکانەوە، چونکە لەئاینی هندۆیزمدا مانگا پیرۆزە.

- (تیۆ) وتی: بەراستی وایە! کەواتە دەتوانین ئەو مانگایانە ببینین؟

- هەڵبەتە! ناتوانرێت دوو سەد ملیۆن مانگای پیرۆز بشارێتەوە، بەڵام ئەم مانگایانە لەئامۆزا ئەوروپاییەکانیان ناچن، زیاتر لاوازن شیریان کەمە.

- (تیۆ) وتی: باشە چییان لێدەکەن؟

- پورە (مارتا) رونیکردەوە: مافیان هەیە بیدۆشن، بەڵام بەگشتی مانگاکان هەرچی دڵیان بیخوازێت ئەنجامی دەدەن. بەهەموو شوێنێکدا دەسوڕێنەوەو دەگەڕێن. لەسەر هێڵی شەمەنەفەر بەکەماڵی راحەتەوە دەخەون. بەکورتی بەتەواوی ئازادن.

- (تیۆ) بەدەستخۆشی لێکردنەوە وتی: وڵاتێکی لەوجۆرە سەرنجڕاکێشە. ئەی ئاژەڵەکانی دیکە چی؟

- پورە (مارتا) وتی: تارادەیەك هەموو ئاژەڵەکان وەك خوا نمایش کراون، جگە لەسەگ؛ چونکە ئەم ئاژەڵە بێنەوایە، کە لەهەموو شوێنێك تێیهەڵدەدرێت، بەبڕوای هندەکان دونادونی رۆحی دزێکە. لە هندستان دەتوانیت بۆدیداری ئاژەڵانی خواوەندی بچیت وەك: مەیمونی خواوەند، گای درندەی خواوەند، هەڵۆ – خواوەند، ئەسپ – خواوەند، فیل – خواوەند، تەنانەت خوا لەسەر شێوەو سیمای هەزاران مشك... لە (بیکانەر) ئەم ئاژەڵە بچوکانە لە پەرستگایەکدا دەپەرسترێت، کە نەزری رۆحێکی چینی نزمەو بەهۆی بەرەکەتی پەرەجویەکەوە توانیویانە بۆ چینێکی باڵاتر خۆیان بەرزبکەنەوە. لەم چیرۆکەدا دیار نییە کام چین ویستویانە خۆیان بگەیەننە ریزی مشكو جرجەکان!.

- (تیۆ) وتی: ئەی ئەسپێ چی؟ هەڵبەتە پەرستنی مشك زۆر (Zarbi)[1]یە!.

---

[1]. تیۆ لێرەدا وشەی (Bizarri)، کە بەواتای (سەیرە) دێت، تێکەڵو پێکەڵ کردووەو وشەی (Zarbi) لێدروست کردووە. پورە (مارتا) بەوتنەوەی هەمان وشە دەیەوێت پێبڵێت لەزمانە تایبەتو بەئەنقەستەکەی تێدەگات.

- پورە (مارتا)ش بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت باش لەزمانە هەلگەڕاوەکەی تێدەگات وتی: بەلێ، تۆ لەهندستان روبەڕوی لەوە (bizarri)ی تریش دەبیتەوە.

- ئەی ئەو ژنە سپیپۆشەی لەوێدایە، بەو روسەرییە سەیرەوە، ئەوە کێیە؟

- پورە (مارتا) لەڕوی جیاوازی نەکردنەوە وتی: ئۆو، ئەوە ئەنگلۆساکسۆنیە. لەوانەیە سەر بەگروپی (خوشکانی بەرهمانەکان) بێت، کەکاری بەسەر کەسەوە نییە. خۆرئاواییەکان کاتێك خۆیان وێڵو سەرگەردان دەبیننەوە، حەز دەکەن بەو جۆرە رەواڵەتیان بگۆڕن. ئەوکاتە بەپەلە بەردو هندستان دێن تالەناو ئەو سروتەی بۆ ئەم مەبەستە ئامادەکراوە، دەسبدەنە خەلۆەتی کۆگەلی‌و ئەو پەرستنانەی ئەرکی گرانە. هندەکانی ئەوێش پارەیەکی مۆلێیان دەسدەکەوێت. هندەکان بازرگانی لێوەشاوەن. تەنانەت بۆ ئەمجۆرە بازرگانی‌و کاسبی‌و کارە تایبەتە ناوێکیان داهێناوە: (کارما — کولا)

- کارما — کۆلا وەك کۆکا — کۆلا؟

- بەلێ لەگەلْ ئەو جیاوازییەی لەئاینی هندۆیزمدا (کارما) واتایەکی وەك چارەنوس‌و قەدەری تاکی هەیە. وابزانم پێشتر ئەم وشەیەت بیستوە؟

- (تیۆ) وتی: بەلێ. دایکم هاوڕێیەکی هەیە هەمیشە باس لەکارەکانی خۆی دەکات بەجولەو نواندنەوە.. باوکم پێکەنینی بە کارەکانی دێت.

- پورە (مارتا) وتی: باوکت راستە. ئەمکارەی خۆرئاواییەکانیش بەهەمان ئەندازە هندیەکان دەخاتە پێکەنین. چونکە کەس بەو لاسایی کردنەوانە نابێتە هندی. مرۆڤ یان بەهندی لەدایکبوە یان نەبوەو تەواو. لەوبارەشدا خۆرئاواییەکان رەواڵەتیان گۆڕیوە.

- (تیۆ) وتی: باشە، خەوشی ئەوکارە لەکوێدایەو چ ئازارێك بەکەسانی دیکە دەگەیەنێت؟

- لەهیچ شوێنێکدا نییە، هێندە نەبێت لەهندستان هەموو کەس دەزانێت جێگای خۆی لەکوێدایەو چی بکات؟. مرۆڤێکی خۆرئاوایی لەدیدی هندەکانەوە بەلایەنی زۆرەوە دەتوانێت لەژیانی ئایندەدا وەك هندییەك بێتە دنیاوە یان ئەوەی لەژیانی رابردویدا هندی بوبێت، بەلام لەسەردەمی ئێستادا ناتوانێت هیچ بکات.

- (تیۆ) لەبارێکی خەون ئاسادا وتی: دونادون؟ زۆر سەرنجڕاکێشە. کەواتە مرۆڤ چەندین ژیانی هەیە. هەزاران ژیان...

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: ژیانی باشتر، ئەگەر ئاقڵو گوێڕایەڵ بێت، ژیانی خراپتر ئەگەر گەمژەیی‌و گێلی بکات. تکادەکەم دەست پێمەکە؟

- (تیۆ) بەنارەزاییەوە وتی: من هیچم نەکردوە، تەنها هەوڵ دەدەم هەموو ئەوانە ژێرەوژور بکەم، کە دەردەسەرییەکی گەورەیە.

پورە (مارتا) رونیکردەوە، کە هەڵبەتە ئەم گروپە گرفتێکی گەورەیە، بەڵام وەك هەر ئاینێکی دیکە ئاینی هندیش دابونەریت‌و سروتی خۆی هەیەو باوەڕداران پەیرەوی دەکەن. ئێستا دەبێت کۆمەڵگەی گەورەی (ئاینمیستەکان) بخرێتە سەر ئەو هەشت ئایینە، کە تارادەیەك لەسەرانسەری هندستاندا بڵاوبونەتەوەو وەك ئەفریقییەکان ژمارەیەکی بێشوماری خواوەندی تایبەتی جۆراوجۆری شێوە جیاواز لەکەماڵی ئارامیدا دەپەرستن.

(تیۆ)، کە سەری خۆی دەخوراند، وتی: ئێستا من چی لە پەڕاویچکەکەمدا تۆمار بکەم؟ دەتوانیت وێنای بکەیت، کە چۆن دەبێت ملیۆنەها خوا لەو لاپەڕانەدا جێگا بکەمەوە!.

پورە (مارتا) پێکەنی‌و بیریکردەوە، کە (تیۆ) بەمزوانە تێدەگات، کە تۆمارکردنی هندستان لەسەر ئەو لاپەڕانە کارێکی نەکردەیە!

## ئەیلاو چەند ئاژەڵێك

سەعات چواری بەیانی لەپردی نێوان فڕۆکەکەو هۆڵی فڕۆکەخانەکەدا شەپۆلێکی هەوای گەرم ئاوێتە بەبۆنی هەنگوین‌و بۆنی قەتران خۆی بەلوتی (تیۆ)داکرد. خەڵکێکی زۆر لەپشت بازگەیەك راوەستابون، کە هەریەکەیان کارتێکی بەدەستەوەبوو، لەسەر هەریەکەیان بەپیتی گەورە ناوێکی لەسەر تۆمارکرابوو. پورە (مارتا) لەژێر فشاری ئاپۆڕەکەو بەبۆڵەبۆڵ ئەرەبانە دەستییەکەی بەرەو پێشەوەبردو لەهەمانکاتیشدا دەیزانی چونەناو شاری (دلهی)یەوە چەند شوێنێکی پڕ هەراو زەناو ژاوەژاوە.

- دەنگی ژنێك بەرزبۆوە: مارتا!...

- پورە (مارتا) ئاهێکی خۆشیی هەڵکێشاو گوتی: ئەها... ئەوەتا لەوێیە.

ژنێکی گەنج، بەپانتۆڵو چاکەتێکی گوڵ گوڵییەوە بەرەو (مارتا) هات‌و خۆی لەئامێزی هاویشت، پاشان بەچاوێکی ئاوێتە لەسۆزو پەرۆشی بۆ (تیۆ)ی روانی.

پورە (مارتا) وتی: (تیۆ)، ئەیلای هاورێمت پێدەناسێنم.

(ئەیلا) دەستەکانی بەشێوەی چەپڵە بەیەکەوە نوساندو نوشتایەوە. چەند جوان بوو! بەخواوەندی (هێرا) دەچوو لە (تورەیی خواکان)دا. لەسەر لای راستی لوتی ئەڵماسێکی بچوك دەدرەوشایەوە. چاوەکانی، زوڵفە رەشەکەیو ددانە سپییەکانی هەموویان شادی هێنەربون، تەنانەت ئەو خاڵە رەشەشی لەسەر گۆشەی لێوی بوو. (تیۆ)ش بەخۆشحاڵییەوە دەستەکانی پێکەوە نوساند.

- پورە (مارتا) وتی: دەڵێن (Namaskar)، واتا (رۆژ باش).

- (تیۆ) دوبارەی کردەوە: (Namaskar) چۆنیت؟

- بەئەدەبەوە وەڵامیدایەوە: زۆر باشم. سەردار - Sardar) بەتەکسییەکەیەوە چاوەڕێمانە.

(سەردار) لاوێك بوو، بەریشێکی درێژو لولەوە. لەئۆتۆمبیلەکەدا خاتوو (ئەیلا) بۆ (تیۆ)ی رونکردەوە، کە بەهەموو (سیکەکان) دەوترێت (Sardar) زۆربەیان شۆفێری تاکسینو خۆشیدەوێن، چونکە هەموویان زۆر لەبەر دڵان و وەفادارن.

- (تیۆ) بەچرپەوە وتی: پورە (مارتا) ئەمە عەمامەی بەسەردوە نییە، کەواتە (سیك)ێکی راستەقینە نییە!.

- پورە (مارتا) بەتوندی وتی: بۆ من وتم لەسەرکردنی عەمامە بەزۆرە؟ ریشو موو بەڵێ بەڵام عەمامە نەخێر.

بەهۆی تەمی قورسی بەیانییانەوە بەئاستەم ئەو تارماییانە دەبینران لەکەنار رێگاکەدا دەجوڵان. لەناکاو پەڵەی سپی پشتەوەی مانگایەك لەسەر شەقامەکە دەرکەوتو ئۆتۆمبیلەکە خێراییەکەی کەمکردەوە.

- (تیۆ) هاواریکرد: مانگایەکی پیرۆز!

- پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: بەڵێ، لاچونی زەحمەتە. ئایا دواجار دەڕواتە لاوە؟

سەردار ئۆتۆمبیلەکەی سوڕاندو تابەدەوری ئاژەڵەکەدا بسوڕێتەوە، کە خەریکی لوشکردنی رۆژنامەیەك بوو. لەنێو تەمەکەدا پەیکەرێك دەرکەوت و (تیۆ)ش بەگوێچکە پانو لوتە درێژەکەیدا زانی فیلە، کە برێکی زۆر دارو گەڵای هەڵگرتبوو.

- (ئەیلا) وتی: ئافەرین (تیۆ)، کە فیل بەپیرتەوە بێت نیشانەی (Auspicious)ـە.

- پورە (مارتا) دەمودەست وشەکەی وەرگێڕا: (واتە خۆشبەختی دێنێت).

- (ئـەیلا) هەنـدێکجار وشـەی ئینگلیـزی بـەکاردەهێنا. ئـەو وشـەیەش لـە ئینگلیزیـدا بـەواتای (چانسو بەخت چاك) دێت.

- (تیۆ) کە زۆر خرۆشابوو گوتی: چ ئاژەڵێکی دیکە لەسەر ڕێگامان دەبینین؟

کەمێك بەولاوەتر سوپایەك مەیمون، دوو یان سێ بزنی گوێ تەپ، ڕانـە مـەڕێك کـە شـوانێکیان لەگەڵ بوو، لە پشت ئەوانەشەوە ریزێکی درێژ ئۆتۆمبیـل خـەریکی هـۆڕۆن لێـدان بـونو هـەر یەکـەیان تونـدتر لێـدەدا. لەسـەر هەمووشـیانەوە ئـاپۆڕەی خـەڵك. مەشـخەڵی بـچوکی ئـاگر لەهەموو جێگایەك دەبینرا، کە کۆمەڵێکی لێگردببۆوە. لەپشتی درەختە کەمەکانـەوە دوکـەڵێك ئەستونی بۆ ئاسمان هەڵدەکشا. هەواکە بێکۆتا شین دەینواند. روناکییەکی زەردباو بەسەرشـاردا کشابوو. پێش گەیشتن بە (هۆتیـل تـاج) (تیـۆ) هـەلی ئـەوەی بـۆ ڕەخـسا تـا فـرێنی دەسـتەیەك (توتی) ڕەنگاوڕەنگ ببینێتو لەو واشانە بڕوانێت لەبەرزاییەکی زۆرەوە بـۆ خـواردن دەگـەڕان، لەقولایی ئاسمانیشدا بازنەی داڵەکان بەرچـاودەکەوتن، کـە باڵـە گـەورە بۆرەکانیـان بـە شـاپەڕە سـپییەکانەوە کردبـۆوە. ئۆتۆمبیلەکـە لەبـەردەم پلیکانـەی مەرمـەڕی هۆتێلەکـەدا راوەسـتا. دەرگاوانێکی ریشدار بەعەمامەیـەکی قوتـەوە بـەرێزەوە دەرگـای ئۆتۆمبیلەکـەی کـردەوە. پـاش چـەند سـاتێك (تیـۆ) بەسەرسـوڕمانەوە خـۆی لـەژورێکی فراوانـدا بینییـەوە. لەسـەر مێزێـك دەفرێکـی پـڕ میـوە چـاوەڕوانی بـوو، لەپاڵیـدا چـەپکێك گـوڵ، کـە (تیـۆ) هـەر زوو بۆنەکـەی ناسییەوەو هاواریکرد: گوڵی (توبروز)! برسیمە!

(ئەیلا) مۆزێکی پاککردو میوەیـەکی رەنـگ خـاکی (گـوێزی هنـد) کـردە دوو بەشـەوەو (تیـۆ)ی ئاگـادار کـرد لەهندسـتان نابێـت هـیچ میوەیـەك بـە توێکڵـەوە بخـوات. سـەبارەت بـە ئـاوی خواردنەوەش زۆر وریا بێتو جگە لەئاوی کانزایی هیچ ئاوێکی دیکە بەکارنـەهێنێت، تەنانـەت بۆ ددان شوشتنیش.

- (تیۆ) وتی: واتە ئاوی وڵاتەکەتان هێندە مەترسیدارە؟

(ئەیلا) رونیکردەوە، کە لەهندستان پرسی ئاو گرنگییەکی زۆری هەیەو خودی ئەو لەماڵەوە دەزگایەکی پاڵاوتنی ئاوی هەیە، کە زۆر گرانەو تەنها کەسانی زەنگین دەتوانن بەکاری بهێنن.

- (تیۆ) بەبێ پەردە وتی: تۆ چکارەیت؟

- (ئـەیلا) وتـی: ژنـی ماڵـەو کارەکەشـی نوسـینە، واتـە رۆماننوسـە، کـە دەستکەوتیـشی هێنـدە نییە!، بەڵام (سودهیر)ی هاوسەری فڕۆکەوانە، کە کارێکی گرنگ‌و سەرنج راکێشە. خەریك بـوو باسی دوو منداڵەکەشی بۆ بکات..

- پورە (مارتا) وتی: (تیۆ) دەبێت پشوو بدات.

ماوەیەکی زۆری خایاند تا (تیۆ) توانی پەلکەکانی لێك بنێت. لەگەڵ ئەو هەموو ئاژەڵانـەو ئـەو هەموو خەڵکە جۆراوجۆرەدا خەوتن کارێکی ئاسان نەبوو.

## (تیۆ) خواوەندی فیل هەڵدەبژێریت

پورە (مارتا) نزیـك نیـوەڕۆ (تیـۆ)ی بێـدار کـردەوە. لەپەنجەرەکـەوە گومەزەیـەکی شکۆمەندی لەنێوان دوو منارەدا بینی. پەرستگای هندییەکانە!

پورە (مارتا) رونیکردەوە: بەتەواوی وانییە. ئەو گومەزە کۆشکی سـەرۆکایەتی کۆمـارە. شـوێنی نیشتەجێبونی جێگری سەڵتەنەتی ئیمپراتۆری بەریتانی. ئەگەر بکرێت بەپەرستگا ناوبـبرێـت، ئەوا پەرستگای دیموکراسی هندستانە.

پورە (مارتا) دەستی درێژکردو شـوێنێکی پیـشاندا. تـەلاری بـچوکی شـێوە هـەرمێی، کـە لەسـەر پانتـایی بیناکـانی شـاری – گولـستان پەرشـوبڵاوبون، ئینجـا وتـی: گـەورەترین پەرسـتگاکانی هندستان لەپایتەخت نین، تەنانـەت لـە (بنـارس)یـش، بـەڵکو هـەموو لـە خـواروی وڵاتـن‌و ئـەو پەرسـتگایانە کۆمـەڵێکی فـراوان‌و گـەورە لـە حـەوش‌و ئەسـتێڵن، کـە بەزەوییـەکی فـراوان دەوردراون. لەهاویندا ئەو خاکە داخ دەبێت و پێـی ئـەو میوانانـە دائـەپرۆخێنێت بەپێپیـەتی بۆ سەردان دەچن.

- (تیۆ) بەئارامی وتی: بەپێپیەتی؟

- (ئـەیلا) وتـی: ئـەو شـوێنانەی زیارەتگـان لەهەنـدسـتان بـۆ نوانـدنی رێـز دەبێت بەپێپیـەتی تەوافەکـە ئـەنجام بـدرێت. بێگومـان ئـەو سـروتە لـەئاینی هندۆنیزمـەوە داکـەوتوە، چـونکە بـەکارهێنانی چـەرم، کـە لەپێـستی مانگـا دروسـتکراوە لەدەوروبـەری پەرسـتگاکە قەدەغەیـە: لەپاشاندا کاتێك ئیسلامەکان لەهندستان نیـشتەجێبون ئـەوانیش کەدەچـونە نـاو مزگەوتـەوە بـەپێی فـەرمانی ئیـسلام پێڵاویـان دادەکەنـد. تەنانـەت بەپێپیەتییـەوە دەچـونە کڵێـساو

کەنیسەکانیشەوە. لەوانەیە بۆ ئەوە بێت ئەم شوێنە پیرۆزانە بە پیسی کۆڵانەکان پۆخڵ نەبێت.

- پورە (مارتا) گەیشتە ئەودەرئەنجامەی کە: لەبەرئەوەیە ئەو هەموو قاپقاپەم بۆ هێناویت؛ بۆسەر خاکی زۆر گەرم یان بۆ شوێنی قوڕاوی. کاتێك دەوروبەری فراوانی پەرستگایەك ئاوڕشێن دەکرێت تۆ قەدری ئەم پێڵاوانە دەزانیت!. ئێستا کاتی دەرمانەکانتەو پاشان دەچین خواردنی چینی دەخۆین.

ڕێستورانتی چینی پڕبوو لەوخاتونانەی ساری (پۆشاکی تایبەتی هندی) ڕەنگاوڕەنگیان لەخۆوە ئاڵاندبوو، تەنانەت نەرمەی لوتیان پڕ لەزێڕو زیو بوو،

- (تیۆ) لەپڕ پرسی:بۆچی ئەم خانمانە ئەڵماسیان کردۆتە لوتیان؟

- وەك گوارەیە. هێندە هەیە دەبێت پەلکەی لوت بسمن. (ئەیلا) دەڵێت ئازاری نییە.

- (تیۆ) وتی: بۆچی نا! دانەیەك بۆ دایکم دەبەمەوە.

دوای نیوەڕۆیان بەگەڕان لەناو مۆزەخانەیەکی نائاسایدا بەسەربرد. مۆزەخانەکە شوێنێکی گەلەك بەرفراوان بوو، لەتەنیشتەکانەوەو لەکەشێکی ئازادا هونەرمەندەکان خەریکی دروستکردنی پەیکەری بچوك یان وێنەکێشان بون یاخود بەقەڵەم موی زۆر ناسك میناکاریان دەکرد.

پورە (مارتا) وتی: دەبێت یەکێك لەخواوەندەکان بکڕین؛ هەڵبژێرە. (تیۆ) دودڵ بوو. پەیکەرە بچوکەکان هێندە سەرنجڕاکێش نەبون.

- پرسی: بۆچی خواوەندەکان هێندە دەستەیان هەیە؟

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: تەنها بۆئەوەی جوڵە بەرجەستە بکەن، هەروەها لەیەکساتدا یەك کارو کرداری دژو ناکۆك ئەنجامبدەن. بۆ نمونە: بەدەستێك ئەفراندنو لەهەمان کاتیشدا بەدەستەکەی دیکە وێرانیو لەناوبردن. فرەدەستی بواری ئەوە دەدات بەهەر دەستێك چەکێك یان سمبولێك هەڵگرێت. بۆ نمونە: (شیڤا) خواوەندی وەرزشو سەمایە. دەستێکی بۆ گرتنی نێزەی سێ پەلە، هێمایە بۆ وریاییو رامان. دەستەکەی دیکەی بۆ دەهۆڵی بچوك، هێمایە بۆ لەرزە. دوو دەستەکەی دی ئازادن بۆ پاراستنی یەکسانی. سەیری ئەوە بکە لە (بنگال)ـەوە دێت....

خوایەکی چوار دەست لەسەر شێرێك رۆنیشتبوو. لەسەر یەکێك لەچل پەنجەکەی تەور، چەقۆ، نێزەو قولاپێك هەبوو. سەرتاپا چەکدارو دەیویست پەیکەری ئبلیسی ئاژەڵێك بکوژێت.

- (تیۆ)، کە کەوتبوە ژێر کاریگەری پەیکەرەکەوە، وتی: سەیرکە چەند تۆقێنەرە!.

پورە (مارتا) وتی: لەوێنەی خۆیدایە. ناوی (دورگا - Dourga)یە، واتە زۆر بەهێز. خواکان ئەفراندنیان تا شەیتان بکوژێت؛ ئەو گامێشەی هێرشی دەکردە سەر زەوییە کشتوکاڵییەکانو هەموو جێگایەکی وێران دەکرد. هەرلەبەرئەوەشە هندییەکان بە(دایك) ناوی دەبەن و خوای پارێزگارییە. لەو خوایە بنوارە لەتەنیشتیەوەیە، دەبینی؟

ئەم خواوەندە تایبەتە بەپرچی وەك تیرلێکراو، چاوی دەرپۆقیوەو لەباری خەندەیەکی ترسهێنەرو شومدایەو زمانی دەرکێشاوە. لەو چەکەی بەهەشت دەست گرتبوی خوێن دەچۆڕاو بەکەماڵی خەیاڵەوە پەیکەرێکی سپی خستبووە ژێرپێی. زمانی خواوەندەکە هێندە دەرکشابوو تاسەرگەردنی درێژببۆوە.

- (تیۆ)، کە روی ترش کردبوو، گوتی: نەفرەتاوییە.

پورە (مارتا) بەخەندەوە وتی: (کالی) هەمیشە هەمان کاریگەری لەسەر بینەر دروستدەکات. ئەمە لەلایەن گەورەترین خواکانەوە ئەفرێنراوەو هەموان بەهاوبەشی هەوڵیان بەگەڕخستوە تا زەوی لەچەپەڵی شەیتانەکان پاکبکەنەوە. (کالی) خۆشەویسترین دایکە – خواوەندەکانی هندستانە، چونکە هەموو دایکێك دوو روخساری هەیە: یەکێکیان دەم بە پێکەنینو ئەویدیان تورە. وانییە؟.

- (تیۆ) وتی: نەخێر، هەرگیز نەمدیوە دایکم زمان دەربکێشێت.

- ئۆو.. زمان دەرکێشانی (کاڵی) چیرۆکێکی سەیری هەیە. روداوەکە بەوجۆرەیە، کە کاتێ خراوەتە سەر شانۆی جیهان بۆ لەناوبردنی شەیتانە خەیاڵییەکان لەپەلەپەلی خۆیدا پێی بەجەستەی (شیڤا)دا داناوە، کە یەکێك لە ئەفرێنراوەکانی خودی ئەو بووە. پاشان لەتاو سەرسامبون زمانی دەرکێشاوە.

- وەك ئەوەی بڵێیت (ئەی داد ... چ کەلەشەکرێکم شکاند؟!)

- (تیۆ)... سەیرە تۆ قسەی ناشیرین دەکەیت!.هەرچەندە لەبنەڕەتیشدا وایە.(کاڵی) بەراستی ناردەحەتبوو، بەڵام پاشان کەزانی (شیڤا)یەکی ناو جەستە ناتوانێت خودی خواوەند بێت، چاوپۆشیکردو چوو بەلای کاری خۆیەوەو هەرچی لەسەر رێگای بوو وێرانی کرد... ئەگەر لە

ـزیکەوە سەیری بکەیت (شیڤا) دەبینیت لەژێر پێیدایە. لەوەو دوا (کالی)بۆ هەتاهەتایە ـەزمانی دەرکێشراوەوە مایەوە.

(تیۆ) وتی: ئەگەر زمان دەربێنم ناشگاتە چەناگەم! ئینجا زمانی دەرکێشا.

پورە (مارتا) وتی: بۆئەوەی وەکو ئەو بتوانیت زمان دەربکێشیت دەبێت (یۆگی - Yogi) بیت. وەرە لێرە دانیشە، چیرۆکەکە تاڕادەیەك دوورودرێژە. ئینجا دەستیپێکرد:

(یۆگییەکان)، کە لەجیهان گۆشەگیربون، جۆرێك وەرزشیان دەکرد تاڕادەیەك خەڵوەتو جەزبەکێشی دەکردن. شێوەو شێوازی کارەکەیان سەرنجڕاکێش‌و سەیربوو، بەڵام مەبەست لەو وەرزشە گەیشتنە بەتێرامان و خەڵوەت (meditation). ئەوانە بەدرێژایی سێ هەزار ساڵ جۆرەها بەرنامەو پرۆگرامیان بەکارهێنا بۆ پاککردنەوەو چاککردنی جەستە تارێگری لەپیربونی جەستە بکەن‌و هەروەها تەواو پاك‌و خاوێنی بکەن، کەئەوەش لەڕێگای دەرهێنانی ئاوی کونە لوتەوە بەڕۆکردنی پارچە قوماشێکی شەش مەترو پاشان دەرکێشانەوەی.

- (تیۆ) وتی: پەلەمەکە، ئەمە زۆر نەشیاوە!.

- زۆرباشە، ئەگەر حەزت کرد دەتوانیت پەروەردە ببینیت، لەلات زۆر سادە دەبێت.

- ئەی زمان دەرکێشانەکە چییە؟

- بابەتی زمان ئاڵۆزە. بۆگەیشتن بەقۆناغی خەڵوەت دەبێت ماوەیەکی زۆر هەناسە نەدەیت. لەوبارەدا (یۆگییەکان) لەرێگای گێڕانەوەی زمان بۆ پشتەوە دەریچەی قوڕگیان دادەخەن و بۆ گەیشتن بەوەش ئەو ماسولکە بچوکەی زمان بەشەویلاگەی خوارەوە دەبەستێتەوە دەیقرتێنن.

- (تیۆ) هاواریکرد: ئەمە شێتییە! واتە زمانی خۆیان دەبڕن؟

- بەپێچەوانەوە! ئازادی دەکەن، ئەوەش زۆر لەسەرخۆو پلەبەپلە، رۆژبەرۆژو بەدەمەتیغێکی تیژ بەشە وشکبوەکەی دەبڕن. چەندین ساڵ درێژە دەکێشێت، بەڵام بەئەنجام دەگات. (کالی) زمانی دەردەکێشێت، چونکە ئەو (یۆگی - yogini)یە، واتە خوایەك لە رێگای (یۆگا)وە بەهرەمەند بووە. رونە؟

- (تیۆ) کەلەسەر جێگاکەی هەستاو بەهێواشی وتی: نازانم، تا ئێستا هیچ دیاردەیەکی تائەم رادەیە سەیرو سەمەرەم نەبینیوە. من نە(دورگا)م دەوێت‌و نە (کالی). شتێکی دیکەم بۆ بدۆزەرەوە.

- پورە (مارتا) راستەوخۆ پەیکەرێکی سەیرو نامۆی هەڵبژارد. ئەم پەیکەرە فیلێکی قەڵەوە کە بەلوتە لولکراوەکەی ورگی دەشێلێت.

- (تیۆ) وتی: دەیبینم!

- لەو باوەڕەدابوم لەبەردڵت بێت.

- ئەم فیلە بە (فیل – خواوەند)ی (گانش - Ganesh) ناودەبرێت. لەراستیدا لەلایەن (پەرڤاتی) ژنی (شیڤا)وە پاش کێشەیەکی خێزانی داهێنراوە. (پەرڤاتی) بۆ تۆڵەسەندنەوە لە (شیڤا) لە گڵەسوور کوڕێکی بۆخۆی دروستکرد بەناوی (گانش)و لەبەردەم دەرگاکەی خۆی دایناو تارێگری لە چوونە ژورەوەی مێردەکەی بکات. (شیڤا) بەتوڕەییەوە بەجوڵەیەك سەری پەڕاندووە، بەڵام بەهۆی گریەو فیغانی ژنەکەیەوە بەڵێن دەدات سەری یەکەمین بونەوەرێکی بەوێدا تێپەڕ دەبێت بخاتە سەر جەستەی (گانش).

- (تیۆ) هاواریکرد: ئەو بوونەوەرە زیندووە فیل بوو!

- بەڵێ، دیارە (گانش) دەستیکرد بەقەڵەوبون تا ناچار بوو هەمیشە لەسەر زەوی رۆنیشێت. بەوجۆرە خوای مەڵبەندی خێزانی بوو بەخوای بەختیاریو خۆشبەختی منالآن. (گانش) عاشقی شەکرو شیربوو. ساڵێکیان لە هندستان هەموو پەیکەرەکانی (گانش) دەستیان کرد بەخواردنی ئەو شیرەی پێشکەشیان دەکرا!. ماوەی دوو رۆژ ئاپۆڕەیەکی گەورە لەبەرامبەر پەرستگادا بەڕیز وەستابون تائەو پەرەجویە ببینن: منالّ – خواوەند شیر دەخواتەوە!

- (تیۆ) وتی: باوکم دەڵێت نابێت باوەڕ بەپەرەجوکان بکرێت. دەڵێت هەموو پەیکەرەکان، تەنانەت ئەوانەش لە تەختەن شیر دەنۆشن؟

- پورە (مارتا) پێکەنیو گوتی: نەخێر، (گانش)ە تەختەکان هیچیان نەدەخوارد.

- (تیۆ) وتی: مەڕمەڕو کانزاکان، لە فیزیادا ئەوکارەم کردووە. دەکرێت شلەیەك بەکانزایەك یان بەردێك نزیك بکەینەوەو کاتێك بەریەك دەکەون شلەکە کێش دەکرێت. لەنەزانی خەڵکەوەیە.

- لەنەزانی؟.. لەرۆژی دووەمی پەرەجوکەدا رۆژنامەنوسێکی بەناوبانگ پێلاودرویەکی هاوسێی خۆی بۆ بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی بانگهێشت دەکات، کە هەرایەکی گەورەی لێکەوتەوە، چونکە پێلاودرۆکە لەبەرچاوی بینەرانی تەلەفزیۆنەکەدا شیری رشت بەسەر قالبێکی پێلاودا، کە قالبی پێلاوەکانی پێدەگرت، بینیان کە شیرەکە لەلایەن قالبەکەوە هەڵمژرا... نواندنەکە

ئاسانو سانابوو، بەبێئەوەی هیچ جۆرە چاوبەستەگییەکی تێدابێت، بەڵام گروپە ئاینییەکان بەتاوانی سوکایەتی کردن بەپیرۆزییەکان سکاڵایان لەئامادەکاری بەرنامەکە تۆمارکرد، چونکە لەهندستان پەرەجو بەشێکە لەژیانی رۆژانەی خەڵكو (گانش) لەنێو هەموو خواکانی هندستاندا خۆشەویسترە.

- (تیۆ) پەسەندی کردو گوتی: لەراستیدا سەرنجڕاکێشو گرنگە. ئەمە هەڵدەگرم.

ئەو خواوەندە بچوکەی (تیۆ) هەلیبژارد ڕەنگ کرابوو. لەسەر سەری تاجێکی درێژو گوارەی لەگوێ کرابوو. تەنها یەك دانی عاجی هەبوو. (تیۆ) ویستی بۆ فرۆشیارەکەی بگێڕێتەوە، بەڵام پورە (مارتا) نەیهێشتو گوتی:

- نەبونی دانی دووەم بەواتای کەموکوڕی کاری هونەرمەندەکە نییە، بەڵکو لەسەردەمی زۆر کۆندا (گانش) ددانێکی خۆی وەك قەڵەم بەشاعیرێك بەخشیبوو تایەکەمین داستانی گەورەی وڵاتەکەی پێبنوسێتەوە.

## گەشتی ئاینی

رۆژی دووەم پورە (مارتا) بەرێکەوتن لەگەڵ (ئەیلا)دا (تیۆ)یان بۆ پیاسەیەکی ئاینی برد.

- پورە (مارتا) وتی: گەشتێکی گشتی دیمەنی ئاینەکانم بۆ سازکردویت، بەڵام بزانە دەبێت پێش خۆرئاوابون، واتە سەعات شەش، بگەڕێنەوە، چونکە دوچاری دەردەسەری دەبین. یەکەم، پەرستگایەکی هندستانە.

- (ئەیلا) بەنەرمەنیانییەوە رێنوێنی (تیۆ)ی گرتەئەستۆ. سەرەتا پێڵاو داکەندن و پاشان لێدانی زەنگەکان (ناقوس)، نوشتانەوە لەبەردەم محرابەکان. ئیمانداران بەپەلەو لەچاوتروکانێکدا پێڵاو دادەکەنن و بەریز لەزەنگەکان دەدەن، کە دەستیان پێکەوە گرتووە لەبەردەم میحرابەکاندا دەست بەنزاو دوعا خوێندن دەکەن. شەیدایيو دڵسۆزی!. لەگەڵ ئەوەشدا خواوەندەکانی ئەم پەرستگایە لەریزی خوا مەزنەکان نەبون. خواوەندەکە لەبەرگی ئاوریشمی سورباو، بەگەردانەی گوڵی نوێ، سیمایەکی لەیستۆك ئاسا، بەچاوی رێژراودوە روو بەو کەسانەی دەیپەرستن دەخەنێتەوە. (ئەیلا) یەیەکەی ئەوانەی پێناساند: ئەمە

(راماخواوەنـدە) لەگـەڵ (سـیتا)ی یاریـدەدەری. ئـەوەش (کریـشنا) خواوەنـدە لەگـەڵ (رادهـا)ی مەعشوقەی.

- (تیۆ) پرسی: هاوسەری نییە؟

- نەخێر، (رادها)و (کریشنا) بەجیا هاوسەرگیریان کردبوو. بەڵام لەبەرئـەوەی (کریـشنا) خـوا بـوو مـافی ئـەوەی هەیـە مەعـشوقەی هـەبێت، بـەڵام (رادهـا) (فـانی)بـوو. بـۆ ئـەم مەبەسـتەش بەخێراییەکی زۆر بۆ ئاستی خودایی بەرزکرایەوە.

- (تیۆ) راڤەی کرد: بونە خواوەندیش بەختیارییە!

دووەم: (گۆرۆدیڤـارا)ی (سـیك)ـەکان. نابێـت بـەبێ پێـشوازی بـچیتە ئـەو جێگایـە: سـەرەتا داکەنـدنی پێڵاوەکـانو پاشـان شـتنی پێکـان. (تیـۆ) نـاڕازی بـوو، بـەڵام کاتێـك بەپلیکانـەکان گەیـشتن، کـە دەچـووە سەرئەسـتێڵی پـیرۆز، بـڕوای خـۆی گـۆڕی. (مـاڵی سـیکەکان - Gouraudwara) لەڕەنگـە زۆر سـپییەکەیدا لەبـەردەم تیـشکی خـۆردا درەوشـانەوەیەکی شکۆمەندی هەبوو؛ سیخناخ بوو لە(سیکەکان)، بەجلی شین، شمشێر بەکەمـەرداکراو، عەمامـەی گـەورە، کـە هیلالێکـی ئـاڵتونی درەخـشاوەی پێوەبـوو. لێـرە ئیمانـداران بەسـرود خوێندنـەوە خەریکی پەرستنی (کتێبی زیندوو) بونو ئەوانەش بۆسەردان هاتبون لـەریزی دورودرێـژدا دەم بەخەندەوە خەریکی گفتوگۆبونو چاوەڕێی گەیشتنی نۆرەیان بوو.

- (تیۆ) وتی: فەرموو بڕوانە لێرە هەموو شت شادو زیندووە!

- (ئەیلا) پێکەنی. (ئەیلا) خۆی هندی بوو، بەڵام لەناویاندا (سیکە)کانی پێباشتر بوو. لەگەڵ ئەوەی (سیکەکان) لەچینی جەنگاوەران بون بەئـەرکی خـۆی دەزانـی دەربـارەی ئـەو جیاوازییـە رونکردنەوە بدات، وتی: (سیك)ـەکان سودیان لە هندۆیزمو ئیسلام وەرگرتووە.

- (تیۆ) وتی: تکا دەکەم هێواشتر رونی بکەرەوە.

- ئینجا (ئەیلا) دەستیکرد بەگێڕانەوەی سەرگوزشتەی سەیری مامۆستا (نانەك): گوایە کەس نازانێت ئەو مامۆستا مەزنە بەموسڵمانی یـان هندۆسـی لـەدایك بـووە، کـاتێکیش مـرد هـەردوو کۆمەڵگە بەهی خۆیان داناوە، چونکە زۆر بەخشندەو چاکەکار بوو.

مامۆستا (نانەك) بەسودوەرگرتن لەهەردوو ئیـسلامو هنـدۆیزم ئـاینێکی نـوێی دروسـتکرد، کـە بیرۆکەی رزگاربونو پاکبونەوە، کۆمەكو یاریدەدانی بێبەشانی کۆمەڵو یەکسانی هەموو کەسی لەپێدراوەکانی ئیسلام تێکەڵ بە هندۆیزم کرد، کە بەهۆی سیستمی چینایەتییەوە لـەو ئاینـەدا

نەبوو. بەڵام ئیمپراتۆرێکی ئیسلام بەناوی ئەوەی ئیسلام هیچ پێدراوێکی دەرەکی لەناو ئاینەکەیدا پەسەند ناکات هەستا بەکۆکوژکردنی (سیکەکان).

- (تیۆ) وتی: دوبارە جەنگ!

- پاشان حەوتەمین مامۆستای گەورە دوایین موریدو ئیماندارەکانی مابونەوە کۆکردەوەو تادلێری‌و وردیان تاقیبکاتەوە. لەبەرامبەر چادرێکی گەورەدا داوای لێیانکرد هەر کەس ئارەزوو دەکات بمرێت خۆی بناسێنێت‌و رایگەیاند ئەوانەی ئامادەبن دەمودەست هەر لەوێدا لەملیان دەدرێت. تەنها شەش کەس ئامادەبون، کە هەمویان لە ناپاکەکانی پێشووبون. مامۆستا ئەمانەی کربووە ناو چادرەکەو ئەوانی دیکەش لەدەرەوە چاوەڕوانبون. بەترس‌و لەرزەوە دەنگی قرخەقرخ‌و کەوتنی جەستەو سیلاوی خوێنیان دەبینی ، بەڵام کاتێك مامۆستای گەورە دەرگای چادرەکەی هەڵدایەوە هەموان بەچاوی خۆیان ئەو شەش کەسەیان بەزیندویی بینی، کە لەجێگای ئەوان لاشەی شەش مەڕی سەربڕاو لەناو چادرەکەدابوو

- ( تیۆ) وتی: سەیرە، (ئیسحاق) کەرەت شەش!.

- بەڵام سەرگوریشتەکە هەر ئەوەندە نەبوو. چونکە مامۆستای مەزن داوایکرد لەوەدو دوا پەیرەوی لەو شەش کەسە بکەن‌و بەردەوام لەئامادەباشیدابن بۆ جەنگ. لەبەرئەوە (سیکەکان) هەمیشە خەنجەر یان شمشێریان هەلگرتووە تا لەکاتی هێرشدا بەرگری لەخۆیان بکەن. هەروەها مامۆستای مەزن داوایکردن هەمیشە رێز لەدواین مامۆستای زیندوو بنێن‌و ستایشی بکەن، چونکە ئەو مامۆستا زیندوە نەك کەسێتییەکە، بەڵکو کتێبێك دەبێت: ئە کتێبە پیرۆزە ناوی (خودانی مەزنە)، کە هەموو رۆژێك ئایەتەکانی دەکرێتە نزاو هەموو شەوێك ئیمانداران پاش خەوتن دایدەخەن. لەبەرئەوە (سیك)ـەکانیش پەیوەستن بەئاینی تاك خوایی‌و ئەوەشیان لەقوربانیدان بەمرۆڤ لەپێناوی (کتێب‌و خوای تەنیا)دا بەمیرات بۆ ماوەتەوە.

- (تیۆ) گەیشتە ئەنجامێك‌و گوتی: ئەمە دەکاتە چوار ئاینی تاك خوایی نەك سیان.

- پورە (مارتا) وتی: سەرەڕای چەند دانەیەکی دیکەش. لەوانەش دوان کەخۆت دەیناسیت، ئاینی تاك خوایی (ئەخناتون)و ئاینی (زاراتوسترا – زەردەشت)و لێرە تەواو دەبێت...

سێیەم شارۆچکەی موسڵمان (نیزامەدین). ئۆتۆمبێلەکە لەسەری کۆڵانێك لە کۆڵانە هەژارنشینەکان راوەستا. ئەمجارە، کە(ئەیلا) لەئۆتۆمبیلەکە پیادەبوو لەپشت جەستەی پورە (مارتا)وە بە تۆقیوی خۆی دەشاردەوە.

- پورە (مارتا) وتی: گرەو دەکەم دەترسیت!.

- (ئەیلا) بەسەرسوڕمانەوە وتی: نەخێر... بەڵام من هندۆسم و (ئەوان) ئەمە دەزانن.

پورە (مارتا)، کە شانەکانی چاك کردو دەستی کردە سەیوانی چاوەکانی، کەوتە ڕێ. کۆمەڵێك منداڵ دانیشتبون بەدیار سەبەتەی گەورەی پڕ لەنانی شیرین، گەردنبەند لەشێوە گوڵ و ملپێچی سەوزەوە. پورە (مارتا) لەناو ئەوانەدا بۆ کەسێك دەگەڕا.

- لەژێر لێودەوە دەیوت: خۆ ئاگادارم کردبوو. لەکوێ خۆی حەشارداوە؟ ئۆو ... ئەوەتا.

پیاوێکی هەتا بڵێی لاواز، بەکراسێکی ڕەش و کڵاوێکی پەشمینی دەستکردەوە پڕبەدڵ دەستی گوشی. لێرەدا پێڵاو داکەندن پێویست بوو.

- پورە (مارتا)، کە قەیتانی پێڵاوە وەرزشییەکانی (تیۆ)ی دەکردەوە وتی: (تیۆ)، ئاگاداربە... بەڕاڕەوێکی غەریبدا گوزەردەکەین. لەیادت بێت لەم شارۆچکەیەدا پارەبەخشین بەهەژاران قەدەغەیە. بهێڵە (نیزام)ی هاوەڵمان ڕێنمایت بکات.

بەڕێز (نیزام) بەوریاییەوە دەستیدرێژکرد تارێگاکە بکاتەوە. لەڕاڕەوە باریکەکەدا خێزانە هەژارەکان بەکۆمەڵ دەستی تەمەنایان درێژکردبوو، منداڵە خەوتووەکان مێش تێیدابون و ژنەکان بەلاوازی و دەرپۆقینی ئێسکەکانیاندا دیاربوو لەتاو برسێتی لەگیانەڵادان. کابرا بەبێڕاوەستان بەناویاندا تێپەڕی. (تیۆ) لەتاو ئەو دیمەنە سەخت و خەماوی و نیگەرانە دوچاری دڵەلەرزە بوو. بۆ چەپ و پاشان بۆ ڕاست... ڕاڕەوە درێژەکە لەکۆتاییدا بەروناکییەك دوایی دەهات. روناکییەکە چاوی (تیۆ)ی ئەبڵەق کردو ڕاوەستا.

## شارۆچکەی سۆفییەکان

لەناوەندی شارۆچکەکەدا نزرگەیەکی پیرۆز بەناوی (نیزامەدین) هەڵتۆقیبوو. ژنان، کە خۆیان بەدیوارەکانی بەشی دەرەوەی قسنەکەدا چەسپ کردبوو، بەهێواشی خەریکی نزاکردن بون. پیاوان ئەو مافەیان هەبوو بچنە ناو قسنەکەوەو لەبەرامبەر گۆڕێکی درێژی داپۆشراو بەپەردەیەکی سەوزی لێوار ئاڵتونیدا بپاڕێنەوە. لەگۆشەیەکدا خەڵکی سەیرو نامۆ ڕۆنیشتبون، کە کڵاوێکیان لەسەردابوو برێکی زۆر دراوی مسی پێوەکرابوو؛ لەکاتێکدا چاویان بەهەر چواردەوردا دەگێڕا سەرقاڵی کات بەسەربردن بون. لەکۆتایی هۆڵەکەدا چەند پیاوێکی

بەتەمەن بەشکۆو ڕێزەوە پشتیان بەو دیوارانەوە دابوو، کە گەلێك جوانکاریان لەسەرکرابوو؛ لەبێدەنگیشدا تەسبیحاتیان دەکرد. لەگەڵ ئەو ئاپۆڕەو قەرەباڵغییەشدا بێدەنگییەکی سەیر باڵادەستبوو.

- پورە (مارتا) ڕایگەیاند: (تیۆ)... ئێمە لێرە لەبەردەم سۆفییەکانداین.. ئەمانە کەسانێکن لەپێناوی عەشقیان بۆ خوا بیرو ئارامیو بەخشندەیی تەحەمولیان کردۆتە ڕێسای ژیانیان. ئەمانە بەبێ جیاوازی هەموو ئەو کەسانەی عاشقی پەروەردگارنو هەوڵ بۆ پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ خودی تاكو تەنها دەدەن، لەڕیزی خۆیاندا پەسەند دەکەن. لێرە هەموو ئاینەکان پەسەندکراون: هندۆسەکان بۆ ستایشکردنی پیرۆزی موسڵمانان دێن، لەوێدا لەسەرەوەی پلیکانەکان نەخۆشە دەروونییەکان، کە لەسەرانسەری هندستانەوە دێن بەبێ جیاوازی ئاینەکانیان، چارەسەر دەکرێن.

- (تیۆ) لەبارێکی شڵەژاندا وتی: واتە شێتەکان؟ لە کلێسا؟.

- پورە (مارتا) بەنامۆییەوە سەیرێکی کردو گوتی: کلێسا؟ ئەو مزگەوتە بچوکە لەو گۆشەیەدا نابینی؟. دەبێت ئەوەش بڵێم، کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا شێتەکان خۆیان لەکلێساکانی ئێمەدا حەشاردەدا، چونکە شێتەکان لەژێر سایەی خوادا دەتوانن ژیانێکی ئارام بەسەرببەن. (تیۆ) کە ئاماژەی بۆ پۆلێك خەڵکی سەیرو نامۆی دانیشتوی گۆشەیەك کردو گوتی: ئەوانە کێن؟

- ئەوانەش لەوانن. بە(هەژاران) ناوزەد دەکرێنو شێتی خوان. ئەمانە ئەو روناکی دیتوانەن، کە بێزیانن‌و ئازار بەکەس ناگەیەنن. کەس کاری بەوانەوە نییە. کاتێك تورەدەبن بەخوێندنی سرود ئارامیان دەکەنەوە. بەڕاستی (نیزام)ی هاوەڵمان ئاماژەمان بۆ دەکات.

کاتێتی! پورە (مارتا) لەسەر ڕاخەرێك دانیشت، کە ئەڵقەو ئاڵق بەدەوری گۆڕەکەدا ڕاخرابوو، (تیۆ)ش بەترسەوە لەسەر حەسیرەکە ڕۆنیشتو لەدڵێخۆیدا وتی: کاتی چییە؟

ئێستا ساتی موبارەکی گەیشتنی (کاوالی - Kawwali)بوو، واتە ئەو سۆفیانەی سروديان دەخوێند. ئەم گروپە بەئاوازی تەپڵو سەنتورو جوڵەی دەستەکانەوە ئەو کۆپلەیەیان دەگوت، کە پیرۆزکراو هۆنیبویەوە. شێتەکان کەوتنە پێکەنین. سرودەکە سەرسوڕهێنەربوو. ئازارشکێنو ئارامکەرەوەی ڕۆح بوو. ئەوانەی لە شێتی دووربون بەشادمانییەوە گوێیان ڕادەدێرا. هەندێك بەسانایی ئەشکی سۆز لەچاویان دەتکا. پیاوێکی بەتەمەن بەسوڕاندنی

سەری لەراستەوە بۆچەپ دەستپێکردو بەخەندەیەکی حالگرتنەوە ئەو جوڵەیەی خێراتر دەکرد. شادیو سادەیی پڕ بەسیپەکان دەرژاو سیماکانی روناك دەکردەوە.

- پورە (مارتا) بەگوێی (تیۆ)دا چرپاندی: (تیۆ) بنوارە، باش وردببەوە. هەموو ئەوانە سەرقاڵی کارێکن پێیدەوترێت (زیکر - Dikrh) بۆ عەشقی خودایی. هەموو سۆفییەکانی جیهان هەر لەئەفریقای رەشەوە تا ئەندەنوسیاو لەمەراکیشەوە تاخۆرهەلاتی ناوەڕاست شارەزای ئەمجۆرە خوا پەرستییەن. ئەم نزایە جۆرێك راگەیاندنی هاوسەنگ بەئاوازی مۆزیکە، کە بەردەوام (لا اله الا الله) دوبارە دەکەنەوە. ئەو بیروباوەڕە دەبینی؟ جوڵەی ملی دەبێتە هۆی سوڕانەوەی کەللەیو خواپەرستییەکەشی لەوێدایە. بەهۆی زۆر دوبارەبونەوەی ئاوازەکەوە ئەمانە دەتوانن هەناسەدانیان بوەستێنن یان زۆر بەسانایی بچنە باری حاڵ لێهاتنەوەو لەخۆیان بێئاگابن.

- (تیۆ) وتی: بەیاریدەی موزیك ئەمکارە سانایە، بەلام ئایا بەخەیاڵتا نایەت لەتەکنەلۆژیاو زانستی هونەریشدا ئاشنای ئەم شێوازەبن؟ چونکە لەو بڕوایەدایەدام ئەو دوانە تارادەیەك وێکدەچن.

پورە (مارتا) بەوریاییەوە وەلامیدایەوە: گومانم هەیە لە هونەری مۆزیکی تۆدا زیکری خوا بکرێت!، بەلام بیرۆکەیەکی خراپ نییە، چونکە مۆزیك دەتوانێت رۆڵی گرنگی هەبێت.

(تیۆ) سەرکەوتوانە وتی: بەڵێ ئەوە دەزانم!

- ئاوازی قسەکان سادەو بەتوانان. دەنگیان لەقوڵایی ناخیانەوە دێت وەك دەبینی لەکاتی خوێندندا دەخەننەوە. بۆ دەربڕینی عەشق بۆ خوا هەستو خۆشەویستییەکی لەوەجوانتر ناناسم.

- بەمپێیە بەلایەنی کەمەوە باوەڕت بەمە هەیە؟

- پورە (مارتا)، کە دراوێکی سەد روپێی خستە دەستی (تیۆ)وە، بەهێواشی وتی: (تیۆ) بیگرە، بیدە بەئاواز لێدەرەکان.

(تیۆ) وتی: ناوێرم!

- (تیۆ) دورلەچاوانو بەخێرایی لە نزرگەکە تێپەڕیو دراوەکەی لە کیسەیەکی سەر سەنتورەکە هاویشت. سرود خوێنەکان بەخەندەوە سوپاسیان کرد، کە (تیۆ)ی نغرۆی خۆشیو شادی کرد.

باشە، بینیت هێندە گران نەبوو...

- (تیۆ) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: ئاه ... لێرە مرۆڤ چەند هەست بەپشودانو لەش سوکی دەکات. سرود خوێنەکان راوەستان. بانگدەرەکە بانگی هەڵدا. خۆر بەخێرایی ئاسمانی تەی دەکردو ئاوا دەبوو. پیاوەکان لەبەرامبەر نزرگەکە بەیەك دەنگ بۆ نوێژکردن ریزبون. ئەگەر بیانویستایە پێش تاریك داهاتن لەهۆتێل بن ئێستا کاتی رۆشتنبوو. بەرێز (نیزام) بۆ ساتێك بەگەرمی دەستی پورە (مارتا)ی گوشیو بەدەستەکەی تری، کە لەسەر دڵی بوو، سەری رێزی بۆ (ئەیلا) نەویکردو (ئەیلا)ش وەڵامی خواحافیزییەکەی دایەوە.

- لە ئۆتۆمبیلەکەدا (تیۆ) وتی: پرسیارم هەیە. بۆچی پارەدان بەگەداکان قەدەغەیە؟

- پورە (مارتا) وتی: -چونکە خێزانی (نیزام) دیاری هەموو موسڵمانان وەردەگرن. لەسەدەی سیانزەوە تائێستا ئەو نەریتە میراتیە بۆ ئەوانو پیاوانی ئەم خێزانە وەچە بەدوای وەچەدا رێکخەری ئەم شارۆچکەیەن. ئەو پارەیەی گرد دەکرێتەوە بۆ قوتابخانە، راوێژکاری پزیشکی، چاودێری گۆڕەکانو خواردنی گشتی بەکاردێت. خاندانی (نیزام) ئەم ئەرکە باش رادەپەڕێنێت.

- (تیۆ) پرسی: گۆڕستان، قوتابخانە، خواردنی گشتی لەکوێن؟، من هیچم نەبینی!.

- پورە (مارتا) رونیکردەوە: خواردن لەبەرامبەر نزرگەکەو لەشەودا ئەنجام دەدرێت. قوتابخانەش هەر لەو رارەودا بوو، بەڵام بەهۆی تاریکییەوە نەدەکرا ببینرێت. گۆڕستانەکەش لەپشتی ئاواز لێدەرەکانەوە بوو. ئەو دیوارە مەرمەڕییەش چەندین گۆڕی لەخۆگرتوە، کە هەندێکیان چەندین سەدە تەمەنیانە. شوێنی راوێژکاری پزیشکی لەکۆتایی شوێنی گۆڕستانەکەدایە، کەدەکەوێتە نێوان دوو درەختو سێ گۆڕەوە. لەشارۆچکەی (نیزامەدین) ژیان، مردن، عەشقو مۆزیك پێکەوەیەو بەهاوشانییەکی سەیر رۆژگار دەگوزەرێنن.

(تیۆ) ئاهێکی هەڵکێشا، ئاشکرا بوو لاوێکی خۆرئاوایی نەیدەتوانی لەشاری سۆفیانی سەدەی سیانزەدا بۆ هەمیشە ژیانی بەسەر بەرێت. بەداخەوە!

## شێوکردن لەناوخێزاندا

بەسێیەمین رۆژ گەیشتبون. (تیۆ)، کەهندستان هەموو هەستی داگیرکردبوو، هیچی دەربارەی (بنارس) نەدرکاندبوو. بڕیاربوو سێیەم رۆژ بۆدیدەنی کلێساو کەنیسە بچن، بەڵام هیچی گرنگی لەو دیدارە دەستنەکەوت. کەنیسە بینایەکی سادە بوو، هیچ مەزنیو شکۆیی وەکو ئەوانی ئۆرشەلیم پێوە دیارنەبوو، لەسەر شێوەیەکی کلاسیکییانەی ئەوروپی دروستکرابوو، کە نەدەچووە دڵەوە. (تیۆ) لەو دیدارانە شەکەت ببوو بەنارەزاییەوە وتی:

- ئارامم لەبەربڕاوە. دەتوانم بزانم کەی بۆ بنار...

- پورە (مارتا) نەیهێشت وشەی (بنارس) تەواو بکاتو بەتوندی بە (ئەیلا)ی وت: ئەمشەو لەماڵی ئێوە شێو دەکەین وانییە؟

(ئەیلا) خواحافیزی کردو بۆ ئامادەکردنی شێو و سەرپەرشتی موتبەق رۆشتەوە ماڵ. پورە (مارتا)و (تیۆ)ش بۆ هۆتێل گەڕانەوە، خۆیان گۆڕیو بەنیازی ماڵی (ئەیلا) سواری ئوتومبیل بون.

هەرلەسەرەتای دەیەی ساڵانی پەنجاکانەوە شاری (دلهی) بۆ ناوچەی رێکوپێك دابەشکرابوو، کە بەهەریەکەیان دەوترا (کۆلۆنی)و (ئەیلا)ش لەیەکێك لەو ناوچانەدا نیشتەجێبوو. کاتێك دەرگای بەڕوی میوانەکاندا کردەوە، (تیۆ) ئەوی نەناسییەوە. (ئەیلا) سارییەکی ئاوریشمی گولگولی پۆشیبوو، ریزێك ملوانکەو متومووری رەشی لە مل کردبوو، دوو گوارەی گەورەی ئاڵتونی نقێمدار لە گوێکانیدا دەدرەوشانەوە، سوراوکراو، چاوی رشتبوو. (تیۆ)، کە خۆی بەملیدا هەڵواسیبوو گوتی: خواوەندی راستەقینە تۆیت!.

- (ئەیلا) بەخاکیانەوە وتی: گوڵ لەمن بەرەنگو بۆترە.

- ئینجا (تیۆ)ی بۆ ژوری منداڵەکانی برد: (پلافی) کچیو (شیف)ی کوڕی، کە لەهەمان تەمەنی (تیۆ)دابون. (شیف)و (تیۆ) راستەوخۆ چونە سەر کۆمپیوتەرو سەقاڵی گەمەیەکی ژاپۆنی بون. هاوسەرەکەی (ئەیلا) هەمیشە درەنگ بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوەو (ئەیلا) وتی بۆ شێوکردن چاوەڕوانی ناکەن.

(ئەیلا) بەدڵ ئەو خواردنەی سازکردبوو، کە بەدڵی پورە (مارتا) بوو: مریشك، گۆشت، نانی شیرینی گەنمەشامی، تەماتە بەماستو بۆ شیرینی گوێز لەکاغەزی زیودا. (تیۆ) خەریکی

لێکردنەوەی کاغەزە ناسکە زیوییەکە بوو، کە (ئەیلا) ئاگاداری کردەوە گوایە لەهندستان ئەو کاغەزە لەگەڵ شیرینییەکەدا دەخۆن.

- واتە ئێوە کانزاش دەخۆن؟

(ئەیلا) وتی: تەنها ئاڵتونو زیو. ئەمە نەریتێکی زۆر کۆنی هندستانە، ئاڵتونو زیو خۆیان جۆرێك لەدەرمانن.

- پورە (مارتا) وتی: ئێمە بۆ ئەو جۆرە دەرمانانە ناوێکی زانستیمان هەیەو دەڵێین (مادە دەگمەنەکان- Oligo-Elements). لەجیهانی خۆرئاوادا ئەو مادانە وەك حەب دەخۆن، بەلام لێرە بەشێوە سروشتییەکەی. تامی بکە!.

(تیۆ) تاقیکردەوە!. هێندە بەتام بوو بەتەنیا نیوەی خوارد. کاتێك تەواویکرد بینی پورە (مارتا)و (ئەیلا) بەسۆزو میهرەبانییەوە لێیدەڕوانن، وەك ئەوەی (تیۆ) لەگەڵ ئەو هێندە بەرگە زیوییەدا کەمێك لەژیانیشی قوتدابێت. بێدەنگی زاڵبوو، وەرپینی کورتی سەگی ماڵەکە بەئاستەم بێدەنگییەکەی شڵەقاندکاند. (تیۆ) بەدڵێکی گیراوەوە بیری لەئاپارتمانەکەی پاریس دەکردەوەو زانی دوو رۆژە تەلەفۆنی بۆ ماڵەوە نەکردوە.

## بەشی یانزە

## (مەهانەتجی)

- دایە؟

- ئۆف ئازیزەکەم... هەواڵت نەبوو! تەندروستیت باشە؟

(تیۆ) بە (بەڵێ) وەڵامیدایەوەو دایکی بەردەوامبوو:

- بەرێکوپێکی دەرمانەکانت دەخۆیت؟ شەکەت نیت؟ باش پشوو دەدەیت؟. پرسیارە یەك لەدوای یەکەکانی دایکی درێژەیکێشا. پاشان بێدەنگبوو، کە لەهەموی ناخۆشتربوو. (تیۆ) هەستیکرد دایکی باش هەناسە ناداتو دیارە دەسرِی بەلوتەوە گرتبوو. دیاربوو ناتوانێت هەستو نیگەرانییەکانی بشارێتەوە.

- (تیۆ) بەدەنگێکی زۆر هێواش وتی: دایە، دەزانیت خۆشمدەوێیت...

- دایکی لوشکەیەکی کردو گوتی: ئەزانم، نیگەران مەبە، من ئازام. بیدە بە(پورت) باقسەی لەگەڵدا بکەم...

هەروەك باران ئەو دوانە کەوتنە مشتومڕکردن. پورە (مارتا) لەسەرخۆ قسەکانی بڕیو کچەکان قسەیان کردو بەکەمێك سەغڵەتییەوە تەلەفونەکەیان بەباوکیاندا. هەمیشە گفتوگۆ لەگەڵ باوکیان ئاسانتر بوو. پورە (مارتا) باسی ئەوەی بۆ کرد، کە دوو رۆژی رابردویان لە (دلهی) چۆن گوزەراندوە. بەڵێنی پێدان لەوەودوا زیاتر تەلەفونیان بۆ بکاتو سەبارەت بە بابەتێکی دیکەش بەڵێنی پێداو بەکەمێك توڕەییەوە تەلەفونەکەی داخستەوە.

- کاتێـك گەردەلولەکـە نیـشتەوە (تیـۆ) بەتەلـەفون داوای (پـی تـی)یەکـەی کـرد، چـونکە بابەتێکی تایبەتی نەبوو لەگەڵ (فـاتۆ)دا قـسەی لەسـەربکات پێیڕاگەیانـد، کـە زۆر بیریـدەکاتو چەند خۆشبوو رۆژێك پێکەوە لەهندستان گەشـتیان بکردایـە. بـەڵێنی پێـدا کاتێـك گـەورەبون ئەو کارە دەکات. لەوەڵامی هەموو قسەکانی (تیۆ)دا (فاتۆ) تەنها بە (بەڵێ) وەڵامیدایەوە. پـورە (مارتـا) بەبێـدەنگ بـۆ دەرەوە رۆشـتبوو. (تیـۆ)ش کاتێـك گفتوگۆکـەی تـەواوکرد بەگریانـەوەد بەدوی کەوت. پورە (مارتا) بیریکردەوە، کە ئێستا کاتێکی گونجاو نییە تا بە (تیۆ) رابگەیـەنێت سبەینێ کاتی پشکنینی پزیـشکییەو هـەروەها دوای گەڕانـەوەیان لـە (بنـارس) تاقیکردنـەوەکان ئەنجام دەدەن، چونکە مانـەوەیان زۆر ناخایـەنێت. لەبەرئـەوە رۆژی دوایـی لـەجیاتی چـون بـۆ نەخۆشخانە مۆڵەتی بە(تیۆ)دا تاکاتێکی درەنگ بخەوێتو پشوو بدات. فڕۆکـەی (بنـارس) دوای نیوەڕۆ گەشتی هەبوو؛ پورە (مارتا)ش خەریکی کۆکردنەوەی جانتاکان بوو.

## کابینەی فەرماندەیی کاپتن لومبا

فڕۆکەی (سورپەیز) لەلای (تیۆ) مایەی سەرسـوڕمانێکی زۆربـوو. پاشئەوەی پـورە (مارتـا)و (تیـۆ)و (ئـەیلا) پـشتێنی خۆبەسـتنەوەیان گرێـداو فڕۆکەکـە گەیـشتە هـەوای خـۆی کـاپتنی فڕۆکەوان بەبڵندگۆ هەواڵێکی نائاسایی بەزمانی ئینگلیزی راگەیاند:

- پاشـنیوەڕۆتان بـاش، بـەڕێزان.. خوشـكو برایـان، بـەخێربێن بـۆ نـاو فڕۆکـەی (ئینـدییـەن ئێـرلاین). مـن کـاپتن (لۆمبـا)، هیـوام وایـە گەشـتێکی خـۆش بکـەن بـۆ (ڤارناسـی — نـاوی راسـتەقینەی بنارسـە). مـاوەی فڕینمـان یـەك سـەعاتە. رێگـام بـدەن بـەخێرهاتنی میـوانی لاو (میوانی تایبەت) (تیۆ) بکەین...

(تیۆ) تائەو کاتـە گـوێی بـۆ بڵندگۆکـە رانـەدێرابوو، بـەڵام لـەپڕ راپـەڕی. کـاپتنی فڕۆکـەوان بەڕاستی ناوی ئەوی وەك میوانی شانازی برد؟

- (ئەیلا) کە پشتێنەکەی بۆ کردەوە وتی: بڕۆ!

(تیۆ) ماتو حەپەساو بەگوێی کردو رۆیشت. دەرگای ژوری فەرماندەیی فڕۆکەکـە کرایـەوەو کاپتن بەپێکەنینەوە ئاوڕیدایەوەو گوتی: (Hi Theo.. Sit down).

ئەو وشانە هیچ گومانێکیان لە دڵی (تیۆ)دا نەهێشت، کە کاپتنەکە لەگەڵ ئەوێتی، دانیشت!. (تیۆ) لەسەر کورسییەکی بچوکی پشتی کاپتنەکەوە رۆنیشتو کاپتن بەزمانی ئینگلیزی زۆر شتی بۆ باسکرد، کە (تیۆ) تەنها ئەم چەند شتە تێگەیشت: خاچە سەوزەکانی سەر لەپەی کۆنترۆڵەکە ئاراستەی فرۆکەکە دیاری دەکات، کەهەوا رونە؛ بەڵام لەسەر ئاسمانی بنارس دەبێت چەرخەلە بەدەوری هەورەکاندا لێبدات. کاتێك فرۆکەکە ئامادەی نیشتنەوە بوو کاپتن بێدەنگ بوو. (تیۆ) لەنێو تەمی ئێوارەدا سەرنجڕاکێشترین دیمەنی ئاسمانیو زەوی بینی: هەزاران گڵۆپی سورو سپی لەسەر زەوی پرتەیان دەکردو ستونێکی گەورەی روناکی بەدەرکەوت. ئێستا باندەی نیشتنەوە ئامادەی وەرگرتنی فرۆکەکە بوو. کاپتنەکە فەرمانی کورتی دەرکردو فڕۆکەکە بەسوکی باڵندەیەك نیشتەوە.

(ئەیلا) دەرگای کردەوەو چوەژوری فرۆکەوانەکە، کە (سودهید)ی هاوسەری بوو، ماچی کرد. (سودهید) لەگەڵ دابەزین کڵاوی فەرمی لەسەرکردو بەپەلە جانتاکەی پورە (مارتا)ی هەڵگرت.

- (تیۆ) بەشەرمو ترسەوە بەگوێی (ئەیلا)دا چرپاندی: کەواتە ئەوە هاوسەرەکەتە؟ چەند پیاوێکی باشە!

- (ئەیلا)، کە سورهەڵگەڕابوو، گوتی: (I Think So)... ئینجا کردی بەفەرەنسی. داوای لێبوردن دەکەم وابزانم بەوجۆرە دەوترێت!

کاپتن (لۆمبا) بەخێرایی پێشوازیکردنی ئەنجامداو هەموانی لەدوو تاکسی هاویشتو بەشوفێرەکەی وت هەرچی زوترە رێگای (بنارس) بگرێت. لەناو تاریکایی شەودا زۆرشت نەدەبینرا، دەشتێکی پانو پۆڕ، چەند گوندێك، کە بەئاستەم چراکانی نوزەیان دەهات، مانگا لەسەرشەقامەکە، چەندین سێبەری سەراپا داپۆشراو، کە سەرقاڵی جموجوڵ بونو لەهەموو هندستاندا ئەوانە دەبینران؛ بەڵام روبار لەهیچ شوێنێکەوە دیار نەبوو. لەهۆتێل (تاجی ڤارناس)، کە کەوتبۆ ناو باخێکی گەورەوە، بۆنی شوێنی داخراو بەرلوتی دەگرت، بەڵام ژورەکانی جوان رێکخراو کارگوزارەکانی زۆر میهرەبان بون، جگەلەوەش لە پەنجەرەکانیشەوە شوێنەواری هیچ روبارێکی گەورە دیارنەبوو. کاپتن گروپە بچوکەکەی خۆی بەرەو

ڕێستورانتەکە ڕێنمایی کردو لەوێدا لەگەڵ (مارتا) بەزمانی ئینگلیزی کەوتە گفتوگۆیەکی دوورودرێژ. خۆشبەختانە (تیۆ)ش دەیتوانی بەگفتوگۆکردن لەگەڵ (ئەیلا) خۆی سەرقاڵ بکات.

## خواوەندی چوارسەری بەرهمان

- (تیۆ) بەگوێی (ئەیلا)دا چرپاندی: (ئەیلا).. دەتوانم پرسیارێکت لێبکەم؟. تۆ سەر بەکام (کاست — چین)ێکی؟

- (ئەیلا) تارادەیەك بەحەپەساوییەوە وتی: ها... من بەرهمانم... ئایا ئەزانی ئێستا چینەکان قەدەغەکراون؟

- دڵنیایت؟. لەتەلەفزیۆندا باس لەشەوڕو مشتومڕی چینەکانی هندستان دەکرێت....

- (ئەیلا) وتی: ڕاستە. بەڵام ڕژێمی ئەو چینانە هێندە ڕیشەی لەنەریتدا داکوتاوە کاریگەری قوڵی هەرماوە. (بەرهمانەکان) لەسەر بنەمای بنچەی خۆیان هێشتا درێژە بە پەروەردەو فێرکاری سمبولو زانستی خۆیان دەدەن. زۆربەیان مامۆستای زانکۆو فێرکارن. (بەرهمانەکان)لەسەرەتای سەربەخۆیی هندستاندا بەپراکتیکانە فەرمانڕەوای هندستان بون. تەنها بەهۆی خوی سەردەمەوە ناتوانرێت سێ هەزار ساڵ کۆنیو ترادیسیۆن لەماوەی پەنجا ساڵدا بگۆڕدرێت، جگەلەوەی ئێستا چینی هەژارانو خوارەوە دەیانەوێت بەنۆرەی خۆیان جڵەوی حکومەت بەدەستەوە بگرن، کە ئەوەش مافێکی سروشتییە.

- (تیۆ) پرسی: باشە ئەو هەژارانە لە چ شوێنێکی سیستەمو ڕژێمەکەی تۆدان؟

- بۆ دەرککردن بەو بابەتە دەبێت ئەفسانەی دروستکردن بزانیت. خوای ئەفرێدگار، کەناوی (بەراهما)بوو، مرۆڤی لەسەرشێوەی پێکهاتەی پەیکەری خۆی دابەشکردبوو. بۆ سەرو کەللەی بەراهماکان، بۆ باسکەکانی سەرۆكو جەنگاوەران، بۆ ڕانەکانی بازرگانو کاسبکاران. خوا چینەکانی خوارەوەی لەشوێنەکانی مابونەوە دانابوو، وەك سك، قاچەکانو پێکان..

- (تیۆ) وتی: سەیرە، ئەم ڕژێمەی تۆ شتێکی باش نییە.

- (ئەیلا) درێژەیپێدا، کە هیچ باش نییە. لەوەش خراپتر لەژێر ڕژێمی چینەکاندا خەڵکێکی زۆر لە (ناپاکەکان — شومەکان — دورەپەرێزەکان - inthouchables) هەبون، کە هەروەك لەناوەکەیانەوە دەردەکەوێت گوایە ناپاکی نەخۆشییەکی سارییەو مافیان نەبوە دەست لە پیاو یان ژنێکی چینەکانی سەرەوە بدەن، بەشداری خۆراکیان بکەن، خۆراکیان بۆ دروست بکەن

یان چاویان لەچاویان یەکانگیر ببێت... تەنانەت ماف ئەوەیان نەبوو سێبەرەکەیان بخەنە سەر سێبەری (بەراهما)یەك، هیچ مافێکیان نەبوو.

- (تیۆ) پاش ساتێك بێدەنگی وتی: پورم باسی ئەوانەی بۆ کردوم . ئایا ئێستاش بەوجۆرەیە؟

- نەخێر، چونکە ئێستا هندستان حکومەتێکی دیموکراسی راگیر لەسەر یەکسانی تاکەکانە، بەلاَم لەهەندێ گوندو ناوچەی دورەدەست چینە بەرزەکان هەندێکجار... کۆنەپەرستن. دەکرێت چی بوترێت! سەرکەوتن بەسەر خونەریتی کۆن چیرۆکێکی درێژە، کە (مەهماتما گاندی) لەسەردەمی خۆیدا دەستپێکرد...

- (تیۆ) هاواریکرد: فیلمەکەیم بینیوە!. چەند پیاوێکی مەزن بوو!

- (ئەیلا) وتی: (مەهماتما گاندی) لەپێناو چاککردنی هەلومەرج و شوێنی (شومەکان – دەست لێنەدراوان) خەباتی کردو ناوی (رۆڵەکانی خوا - harijan)ی بەسەردابڕین. لەهندستانی کۆتایی سەدەی بیستەم (دەستلێنەدراوەکان)و چینەکانی خوارەوە یەکیان گرت و هەموو توانایان لەپێناوی بەدەسەلاَت گەیشتن خستەگەڕو ئەوکارەش خۆبەخۆ بۆ پێشەوە نەدەچوو تاجێگری سەرکۆماری هندستان لەخوارترین کاستەکان دانراو بوو بەدیپلۆماتێکی بەئەزمون و لێهاتوو...

- (تیۆ) وتی: زۆر باشە بێگومان ئەگەر ئێستا (مەهماتا) لەژیاندا بوایە هەستی بەرەزامەندی دەکرد.

- (ئەیلا) ئەوەی لەیاد نەکرد بلێت خوای (بەرهمان)، کە ئەفرێنەری چینەکانە، بونەوەرێکی سەیربوو، بونەوەرێکی چوار سەر!. بەپێی داستانەکان، هەرچوار سەرەکەی ئەو خواوەندە پێکەوە بزاوتی چاوەکانی بەرجەستە دەکەن، لەو کاتەی عاشقی کچەکەی خۆی بوو...

- (تیۆ) بە توڕەییەوە وتی: شەرمهێنەرە! خوایەکی لەوجۆرە گەورەی ئەم رژێمەبوو؟

- ئافرێندە نەك گەورە، بەلاَم بەپێچەوانەی خواکانی دییەوە (بەراهمان) هیچ کاتێك لە هندستاندا پەرستگای تایبەتی خۆی نەبوو. لەکاتێکدا دوو خوای گەورەتر لەهەموو شوێنێك پەرستگایان هەبوەو دەپەرسترێن.

- (تیۆ) باوێشکێکیداو گوتی: (ڤیشنۆ - vishnou) چاودێرو پارێزگاری جیهان و (شیڤا) خوای مەرگ؛ بەلاَم هێشتا (ئەیلا) قسەکەی تەواو نەکردبوو، کە (تیۆ) سەری لەسەر مێزەکە داناو بەخەودا رۆچوو. کاپتن (لۆمبا) باڵی گرت و تاسەرجێگاکەی برد.

## راهیبی گەورەی مەیمونی خواوەند

پورە (مارتا) لەکاتی بێداربونەوەی لەخەو بیریکردەوە، کە ئەمڕۆ دژوارترین ڕۆژەکانی دەبێت؛ مەگەر هەموو شتەکان وەك پێشبینی بۆکراوە تێپەڕێت!.

- (تیۆ) لەو کاتەدا لەناو جێگاکەی هاواریکردبوو: (کەی ئەم روبای (گنگ)ە دەبینین؟).
- پورە (مارتا)ش بەدەنگێکی پچڕپچڕ وەڵامیدابۆوە: سەرەتا هێلکە کوڵاوەکەو نانی برژاو بخۆ.

ئەو تاکسییەی ئەوانی بۆ روبارەکە دەبرد بەئاستەم دەیتوانی بەناو سێڵاوی ئەوماتۆرانەدا رێبکات، کە زۆربەیان گالیسکەیەکی دوو تایەیان بەدواوەو ژنێکی قەڵەوی ساری لەبەریان لەگالیسکەکەدا هەلگرتبوو.

(ئەیلا) رونیکردەوە، کە لەهندستان بەوجۆرە ماتۆڕانە دەوترێت (ریکشاو)، لەکۆندا پێیوتراوە (ریکشاو – فالاس) و کەسێك گالیسکەکەی راکێشاوە، بەڵام ئێستا شێوەیان گۆڕاوەو ماتۆڕ رایدەکێشێت و دوکەڵێکی زۆریش دەردەکات، کە بۆ سییەکان زیانبەخشە. (تیۆ)، کە نغرۆی سەیرکردنی ئەو ماتۆڕانە بوو، دەنگی تێکەڵبونی هەزاران دەنگی دەهاتە بەرگوێ، کە لەجیاتی هۆرنی ئۆتۆمبیل لێدەدران. جوڵەی ئۆتۆمبیلەکە بەرەو روبارەکە بەهۆی ئاپۆڕەی ژن، پیاو، منداڵ و مانگاوە زۆر لەسەرخۆ بوو. پێدەچوو دەربازبون کارێکی مەحاڵ بێت. لەپڕێکدا، کە رەنگدانەوەی روناکی خۆر لەسەر ئاستی ئاوەکە بەدەرکەوت، ئۆتۆمبیلەکە بەرەو راست بایدایەوەو خۆی بەکۆلانێکی چۆڵداکرد. دەبوو لەوە بەولاوە بەپێ رێبکەن.

- پورە (مارتا) وتی: تیۆ.. کڵاوەکە لەسەرت بکە، دەچین بۆ دیدەنی راهیبی مەزنی هاوڕێم، بەڵام کاتێك گەیشتینە بەردەمی دروست وەك من رەفتار دەنوێنێت. بەڵێن دەدەیت؟
- دەبێت چی بکەم؟.
- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: دەستی راست لەپێکانی بخشێنیت.
- بەڵام وامدەزانی تەنها دەست پێکەوە نوساندن بەسە.
- پورە (مارتا) پێداگریکرد: سەبارەت بەپیاوی خوا دەستخشاندن لەقاچەکانی پێویستە. دەبێت لەگەڵ ئەو جوڵەیەشدا نازناوەکەی بڵێیت و بە(مەهانەت جی) بانگی بکەیت. پاشان

ڕونیکردەوە، کە (مەهانەت) واتە (کاهن)یان (پارێزەر)ی گەورەو (جی-Ji) پاشگرێکە بۆ ڕێزو خۆشەویستی. (جی) گشتییە.

کەواتە دەتوانم بە (مارتا — جی) بانگت بکەم؟

- پورە (مارتا) بەروترشییەوە وتی: ئاوازێکی خۆش نییە، بەوجۆرەش کەتۆ ئێستا رەفتارم لەگەڵ دەکەیت ئەوجۆرە نازناوانە لە رادەبەدەر ڕێزدارانەیە!

گەیشتبونە تەنیشت کەناری روبارەکە. لەژێر دارگوێزێکی هندی گەورەدا چوار پەرستگای زۆر سپی، پەیکەری خواکان، کەزۆر لە(تیۆ) هەڵکشاوتر نەبون، لەگەڵ گوێرەکەیەك، کە (تیۆ) خێرا ناسییەوە، لەوێدا هەبون. (تیۆ) کە هەنگاو بەهەنگاو دەڕۆشت وتی: نانەدی! ئەمە ناندییە! چەند جوان و شۆخە!

پورە (مارتا) روبارێکی پان و بەرفراوانی پیشانی (تیۆ)دا، کە لەژێر تیشکی خۆرەکەدا دەبریسکایەوەو گوتی: ئەوەتا لەبەرچاوتایە، ئەوە روباری (گنگ)ە.

(تیۆ)، کە بریسکەی خۆرەکە لەسەرتەختی روبارەکە ئەبلەقی کردبوو، لە (کرجی — جۆرە کەشتییەکە)یە رەشانەی دەنواڕی، کە پڕبون لەدیدارکاران و هەمویان گۆرانیان دەوت. دورتر کەشتییەکی گەورە بەچارۆکەوە بەهێواشی لەگەڵ روبارەکە بەرەوخوار دەڕۆشت. کەناری بەرامبەر چۆڵبوو، بەرێگای باریك و خاکی و دەشتی سەوزییەوە. دەوروبەر، کەهێشتا بەهۆی دەنگی زەنگەکانەوە نەشڵەقابوو، ئارامی گرتبوو. لەناکاو پورە (مارتا) بەئەنیشك ئاگاداری (تیۆ)ی کردەوەو کاتێك ئاوڕیدایەوە پیاوێکی بەتەمەن بەکراسێکی شۆڕی سپی و جوتێك چاوی رەشەوە بۆیدەڕوانێت: مەهانەتجی.

## وانەی هەناسەدان

پورە (مارتا) بۆ دەستخشاندن لەپێکانی دەمودەست نوشتایەوەو (مەهانەتجی)یش بەنارازییەوە دەستیگرت و بەرزی کردەوە. (ئەیلا)ش هەمان شتیکرد، بەلام ئەمجارە (مەهانەتجی) لەپی دەستی هاویشتە سەرسەری تابەرەکەتی بەسەردا بکات، بەلام کاتێك (تیۆ) لەسەردەستوری پوری نوشتایەوەو (مەهانەتجی)ش لەئامێزی گرت. سیمای سادەو سمێڵەکانی زەرد هەڵگەڕابون و چاوەکانی پڕ لەخۆشەویستی و میهرەبانی دەدرەوشانەوە.

- بەدەنگێکی نەرمونیانو سۆزاوی وتی: (So you are the famous theo my dear - boy)

(مەهانەتجی) لەژورێکی ناوەراست خانوەکەی خۆیدا پێشوازی لەمیوانەکان کرد. لەسەر سەکۆیەکی بەپەردەیەکی سپی داپۆشرابوو رۆنیشت. (مارتا)، (ئەیلا)، (تیۆ) لەسەر راخەرێك دانیشتن. خزمەتکارێك شیرو پسکیتی بۆ دانان، هەموان بێدەنگ بون. (مەهانەتجی) هەروا لە (تیۆ) ورد دەبۆوە. زانی باس لە (discase - نەخۆشی) دەکەن، لەنەخۆشیو لەتەندروستی. (مەهانەتجی) بەپەژاردوە گوێی بۆ چیرۆکە درێژەکەی پورە (مارتا) راداشتبوو.

- پورە (مارتا) وتی: you have to explain to ، Mohant je،But for the time being him what is exactly uour vision of hindousim

- (ئەیلا) چرپاندی بەگوێی (تیۆ)دا: داوای لێدەکات دیدی خۆی سەبارەت بەهندۆیزم بۆ تۆ رونبکاتەوە.

راهیبی گەورە چاوە پرلەروناکییەکانی برییە چاوەکانی (تیۆ)و کە قاچەکانی ئالۆگۆر پێدەکرد (تیۆ)ی بەرەو کۆتایی ژورەکە کێش کرد. لەکۆتایی دیواری راڕەوێکی باریکدا (شیڤا)ی خواوەند بەپێستەی پڵنگەوەو خەندە لەسەر لێو لەباری سەماکردندا قاچێکی هەڵبڕیبوو. (مەهانەتجی) بەبێوەستان بەبەردەمیدا تێپەڕی: لەنێو کۆمەڵێك راڕەوی پێچاوپێچدا (تیۆ) گەیشتە هەیوانێکی بچوك. لەناوچاڵێکی ئەو شوێنەدا پەیکەرێکی بچوکی بێسیما هەبوو، کە دوو جوت سۆڵ لەبەرامبەری دانرابوو. (مەهانەتجی) لەسەر قەراغی هەیوانەکە دانیشتو ئینجا (تیۆ) زانی شەلە. (مەهانەتجی) ئاماژەی بۆ (تیۆ) کرد نزیك بێتەوە: (کورم.. لێرە دانیشە -Sit here my boy). (تیۆ) لەتەنیشت (مەهانەتجی)یەوە دانیشت. دروست لەسەر سەرییەوە زەنگێك هەڵواسرابوو. لەخوارەوە بەدەنگی هەزاران لەوانەی وێردیان دەخوێند روباری (گنگ)کەوتبوە لەرزە. خەڵك بەخێرایی دەستیان لەپێی (مەهانەتجی) دەخشاند. لەبەردەم خواوەندی بێڕوخساردا دەنوشتانەوەو بەلێدانێکی بچوك لەزەنگەکەیان دەدا. دەنگی سوکی زەنگەکە کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر کەشە پڕلەخۆشیو ئارامیەکەی ئەوێ نەبوو. (مەهانەتجی) شانی (تیۆ) گرتو خستییە ژێربالی خۆیو بەعەبا سپیەکەی خۆی دایپۆشیو پاش بێدەنگییەکی زۆر بەگوێیدا چرپاندی: بچکۆل.. لەوەی دەیڵێم هیچ تێناگەیت، وانییە ( will you، Little boy،you will not understand what Iam going to say

- (تیۆ) دڵێرانە وتی: Iam دڵنیابە that I can تێدەگەم. مـن english یەکـەم زمـانی خۆمـە لەقوتابخانە!

- (مەهانـەتجی) لەکاتێکـدا تونـد لـەژێر بـاڵی خۆیـدا دەیوگوشـی وتـی: (shanti - i). پاشـان رونیکردەوە کە (the meaing of shanty is peace).

- (تیـۆ) بیریکـردەوە: (meaning) (واتـا)و (peace) (ئاشـتی)، کەواتـە (shanti - i) واتـە ئاشتی. بەڵام (shanti) چییە؟

- (مهانەتجی) وتی: بۆ هەتاهەتایە روحت لەئاشتیدا بێـت. تێدەگـەیت(?Dyou understand My your spirit been peace for ever.

- تۆ دەوەێت رۆحم بۆ هەمیشە لەئاشتیو ئارامیدا بێت.

- (مەهانەتجی) لەکاتێکدا پڕ بەسییەکانی هەوای هەڵدەمژی وتی: Now...take a breath

(تیۆ) پڕ بەسییەکانی هەوای هەڵمژیو پاشان دایەوە.

- (مەهانەتجی)، کە دەستی (تیۆ)ی خستە سەرسکی وتی: لێرەدا - from here

ئینجا (تیۆ) سنگو سکی بەجۆرێك پڕ هەناسە کرد، کە شانەکانی ئازاریان تێزا.

- (مەهانەتجی) پێکەنیو گوتی: باشە. دوبارەی بکەرەوە good. Do it again

لەجاری دووەمدا (تیۆ) هەستیکرد جۆرێك کرانەوەو سانایی لەناوەوەی بەرەو سەرەوە دێتو لەجاری سێیەمدا کرانەوەو خۆشییەك هەست پێدەکاتو لەچوارەمدا بەتەواوی کەوتە کۆکە.

- (مەهانەتجی) بەقاقاوە گوتی: زۆرباشە.Very good

- پاشان دەستی بۆ زەنگەکە بردو دەنگی لێهێنا، لەکاتێکدا لەجێگاکـەی هەسـتاو بەفەرمانـەوە وتی: بابڕۆین - Let's go

کاتێك دوو بـەدوو چـونە هـۆڵی تەنیـشت روبارەکـە، پـورە (مارتـا)و (ئـەیلا) بەشـڵەژاوییەوە چاوەنواریان بون.

- پورە (مارتا) وتی: باشە، چی پێوتیت؟

- (تیۆ) وەڵامیدایەوە: هیچ تەنیا وانەی هەناسە هەڵکێشانی فێرکردم. ئا، بەڵێ! دەربارەی ئاشتیش قسەی کرد. لەوانەیە ئەمەش پەیوەندی بە چین و خواکانەوە هەبێت.

## (رامایانا)

دیداری ئایندە لەگەڵ (مەهانەتجی) لەکاتی خۆرنشین لەناو پەرستگاکەیدا رێکخرابوو، هەروەها بڕیاربوو تاکاتی دیدارەکە بۆ فراوین و پشودان بۆ هۆتێلەکە بگەڕێنەوە. لەسەر مێزی نانخواردن (تیۆ) سەدان پرسیاری کرد. ئەو خواوەندە نەناسراوەی تاقی دیوارەکە کێبوو؟. (مەهانەتجی) بۆچی دەلەنگێ؟ ئەو هەناسەدانە سەیرەی لای گەدەوەیە چییە؟، (مەهانەتجی) چ بەرپرسیارییەکی خودایی لەئەستۆیە. ئەو درەختە گەورەیەی سێ میحرابی سپی لەژێردایە ناوی چییە؟....

- پورە (مارتا) وتی: خەریکە گێژمان دەکەیت کوڕم، تکا دەکەم یەکە یەکە.

- ئینجا پورە (مارتا) دەستیکرد بەڕونکردنەوەکانی: ئەو خوایەی ناو چاڵە بچوکەکە خوا نییە، بەڵکو مرۆڤێکە. یەکێکە لەگەورەترین نوسەرانی هندستان بەناوی (تۆلسیداس)، هەمان ئەو کەسەی زمانی (سانسکریتی) ئەدەبی بۆ سەرزمانی (هندی) گۆڕیوە، کە زمانی خەڵکەکەیە. چونکە ئەم نوسەرە لە (بنارس) ژیاوە میحرابێکیان بۆ دروستکردوەو کاڵەکانی دەپەرستن.

(مەهانەتجی) لەسەردەمی لەدایکبونەوە دوچاری لەنگی بوە، بەڵام ئەمە نەبۆتە ئاستەنگ تاهەموو رۆژێك سەد پلەی پلیکانەکان بەرەوخوار بۆ سەر روبارەکە ببڕێت و بەپێچەوانەشەوە سەرەوژور هەڵگەڕێتەوە. پورە (مارتا) درێژەیپێدا: هەر لەسەردەمی یۆنانی کۆنەوە لەسەرانسەری جیهاندا بەهەرەوەمران و ناودارەکان زۆرجار کەمئەندام بون. خواکان رێزیان لەشەل و کوێرەکان ناوەو بەرەکەتیان بەسەردا بارانەدون و (مەهانەتجی)ش لەو یاسایە بەدەرنییەو لاقە شەلەکەی خۆی کۆنترۆڵ و رام دەکات. تەنانەت لەرێگای مۆزیك و مەشقی زۆرەوە چاکسازی لەدەنگی ناسازی خۆیدا کردوە.

دەبێت هەرلەوخاڵەشەوە لەومەشقی هەناسەدانە بڕوانیت، کە بەتۆی کرد، چونکە لەخۆرئاوا خەڵکی تەنها بەبەشی سەرەوەی جەستە هەناسەدەدەن، لەکاتێکدا لەهندستان سود لە (سك)

نەبینن، چونکە تەنها گەدەیە مۆڵەت بە سییەکان دەدات باش ئۆکسجین هەڵمژێت. هندییەکان نەسێ هەزار ساڵەوە فێربون چۆن هەناسەبدەن: چونکە لەرێگای هەناسەوە دەکرێت هەموو ێت چارەسەر بکرێت.

(تیۆ) بیری لە (شێخ سلێمان)ی ئۆرشەلیم کردەوە.

- دەربارەی درەختە گەورەکەش پورە (مارتا) وتی: جۆرێکە لە درەختی گوێزو بەگوێزی هندی ناسراوە.

- (تیۆ) پرسی: ئەی خوای (مەهانەتجی) کێیە؟

- پورە (مارتا) رونیکردەوە، خوای (مەهانەتجی) یەك تاك خوا نییە، بەڵکو مەیمونێکی رەبانییە بەناوی (هەنومان - HANOHMAN).

- بەسەرهاتی ئەو مەیمونە چیرۆکێك بوو (ئەیلا) بەئارەزوی خۆی ئامادەبوو بیگێڕێتەوە. لەبەرئەوە سەری قسەکەی گرتەوەو گوتی: هەبوو نەبوو رۆژگارێگك پاشایەك هەبوو سێ کوڕو دوو هاوسەری هەبوو. وەك ئاشکرایە هاوسەری دووەم هێندە کینەی لە مناڵەکانی هاوسەری یەکەم دەبۆوە تاپاشای ناچار کرد کوڕە گەورەکەی بەناوی (شازادە رام) لەشار دەربەدەربکات. (شازادە رام)ی جوانو چاکەکار، کە لەگەڵ (سیتا)ی قەشەنگ هاوسەرگیری کردبوو، ئاقڵانە ملی بۆ فەرمانەکەی باوکیداو بەهاوەڵی دوو براکەی بەرەو دارستان ملی نا. هاوسەری دووەم لەو روداوەدا سەرکەوتوو بوو.

- (تیۆ) منگەمنگی کردو گوتی: باشە، بێگومان ئاشتبونەوە.

- (ئەیلا) وتی: بەڵێ، بەڵام نەك بەو زووانە، چونکە (سیتا) عاشقی بزنە کێوییەکی ئاڵتونی بوو، حەشارگەکەی خۆی لەدارستانەکەدا بەجێهێشت، کەئەوەش گوناهێکی گەورەبوو، چونکە ئاژەڵە جوانەکە لەراستیدا پاشای ترسناکی شەیتانانی (لانکا) بوو، واتە (رافانا)ی بەرهمانی زۆر داناو خراپەکارو ئازاردەر، کە عاشقی ژنی (رام) ببوو. کەواتە (سیتا)ی رفاندبوو، ئینجا نۆرەی شازادە (رام)بوو تابگەڕێت بەدوی هاوسەرەکەیدا. جەنگێکی هەمیشەییو بێکۆتا دەستیپێکرد: لەلایەك شەیتانەکانو لەلاکەی دیکەوە سێ برا، کە لەلایەن سوپای مەیمونەکانەوە پشتگیریان لێدەکرا.

- (تیۆ) هاواریکرد: هێی، مەیمونەکەی (مەهانەتجی)!

- (ئـەیلا) درێژەیپێـدا: (هـەنومان)ی مـەیمونی گـەورە فەرمانـدەی گـشتی مەیمونـەکان بـوو. (هـەنومان) جەسـتەی خـۆی کـرد بـەپردێك تالەشـکرەکەی بتوانێـت بپەڕێتـەوە. درەخـت بـەدرەختی دارسـتانەکەدا هـەڵزنا تاشـوێنی زینـدانیکردنی (سـیت)ی قەشـەنگ بدۆزێتـەوە. بـەکورتی هێنـدە پـەرۆش و چاکەکاربوو بـۆ هەمیـشە بـوو بەنمونەیـەکی تـەواوی بێکەموکوڕی بونەوەرێکی خواپەرست و چاکەکار. لەسـەدەی شانزە لـە (بنـارس) پەرستگای مـەیمونی مـەزن (هەنومان)ی خواوەند دروستکرا. باوانی (مەهانـەتجی) ئـەرکی چاودێری پەرستگاکەیان گرتـە ئەستۆ. بەوجۆرە (مەهانەتجی) ئەو خواوەندی چاکەکارو دڵسۆزە دەپەرستێت.

- (تیۆ) بەدودڵی و گومانەوە راڤەی کرد: هەرچۆنێك بێـت ئـەو مەیمونـە... بـەو روخـساردود چیدەکات؟

- لێرە گرفتێك لـەئارادا نییـە، چـونکە بەیاریـدەی (هـەنومان) شـازادە (رام) تـوانی (راڤانـا)ی ئبلـیس شکـست پێبێنێـت و ژنەکـەی خـۆی دەسـت کەوێتـەوە. بـەوجۆرە هـەنومان (مـەیمونی خواوەند) لەباری ئاژەڵییەوە چوبوە پێستی مرۆڤەوە: هەمیشە وا وێنایان دەکرێـت، کـە لـەباری دامـاڵینی بەرگەکەیدایـە، کـە دڵـە وەفادارەکـەی وەك مادەیـەکی سوری نـورانی دەدرەوشـێتەوە. (هەنومان) وەك خزمەتـچییەکی چـاك (رام) دەپەرسـترێت. شـازادە (رام) پـاش سـەرکەوتنەکەی گەڕایەوە وڵاتەکەی. ئەم داستانە ناوی (رامایانـا)یـە، کـە (تۆلـسیداس)ی گـەورە بـۆ سـەر زمـانی هنـدی وەریگێـڕاوەو هـەموو سـاڵێك لـەمانگی ئۆکتۆبـەردا بـۆ مـاوەی چـل شـەو لەسەرانـسەری هندستان نمایش دەکرێت. داستانی (رامایانا)، کە لەلایەن لاوانەوە بەبـەرگی گۆڕاوەوە — بـەبێ ئامادەبوونی ژنان — نمایش دەکرێت و جۆش و خرۆشێکی گـەورە بـەرپا دەکـات، کـە سـوتاندنی جەسـتەی (راڤانـای) ئبلـیس لوتکەیـەتی و وێنەکـەی بەشـێوەیەکی زۆر گـەورە لەکاغـەز دروسـتدەکرێت و ناوەکەی پڕدەکرێـت لەتەقینـەوە. (ئـەیلا) دڵنیاییـدا، کـە ئـەو گەمەیـە زۆر جوان و خۆشە.

- پورە (مارتا) درێژەیپێدا: دوکەڵێکی زۆر دەکات و هەموو دەکەونە کۆکە.

- (ئەیلا) درێژەیپێدا: پاشئەوە نێوانی (رام) و (سیتا) ئاڵۆزی تێکەوت، چونکە (رام)، (سیتا)ی ژنی بەوە تاوانبارکرد، کە خۆی رادەستی (راڤانا) داوە. (سیتا)ش بۆ سەلماندنی بێگوناهی خـۆی ناچاربوو ئاگر تاقیبکاتـەوە. (ئـەیلا) رایگەیانـد، کـە (سـیتا) لـەو تاقیکردنەوەیـەدا سـەرکەوتوو بـوو، هـەموو شـت بەخۆشـی و کامـەرانی دوایـی هـات. بـەڵام پـورە (مارتـا) سـوێندی دەخـوارد کەداستانە بنەڕەتییەکەی (رامایانا)ی خوێندۆتەوەو تیایدا (سیتا) بەهۆی گرانـی و قورسـی ئـەو

تاوانبارکردنەوە شڵەژاوەو داوای کۆمەکی لەخاکی دایکی کردوەو خاکیش دەمی کردۆتەوەو هەڵیلوشیوە. لەکۆتایی روداوەکەدا (رام) وەك خوایەك نەك وەك شازادەیەك دەرکەوتوەو ئەمەش ئەو چیرۆکە بوو، کە پورە (مارتا) لێی دڵنیاو بڕوای پێیبوو.

پورە (مارتا) بۆ پشتگیری چیرۆکەکەی ئەوەی بۆ زیادکرد، کە هۆکاری بون بەخواوەندی (رام) ئەوەبوو یەکێکبوە لەوێنەو روخسارەکانی خوا (ڤیشنۆ)ی پارێزەری رێکخستنی بونەوەران، کە هەمیشە لەبارێکدا پیشانی دەدەن لەسەر زەریا خەوتوەو مارێکی چەندسەر چاودێرو پارێزەریەتی. (ڤیشنۆ) هەندێجار بۆ سەر زەوی دەهاتو لەجەستەکانی دیدا بەرجەستە دەبوو، کە ئەو دەرکەوتنانەی بە (بەدگۆڕان – مەسخ)ی (ڤیشنۆ) ناودەبرێت. (ڤیشنۆ) خۆی دەکرد بە (کیسەڵ، بەراز، رام، بودا، کریشنا)و تەنانەت هەندێك دەڵێن بە (عیسا)ش.

(تیۆ) وتی: کریشنا؟ وەك ئەو شێتانەی لە (بولڤارسن میشل) بە دەفەکانیانەوە دەگەڕانو گۆرانی (Hara Krishna)یان دەوت؟

- بەتەواوی وایە. لەگەڵ ئەو جیاوازییەی شێتەکانی تۆ باسیان دەکەیت گۆڕانی رواڵەتی خۆرئاواین، لەکاتێکدا (کریشنا)ی خواوەندی راستەقینە گرنگییەکی جیاوازی هەبوو.

- (ئەیلا)ی میهرەبان بەپەرۆشەوە کەوتە گێڕانەوەی سەرگوریشتەی منالّی (کریشنا)؛ باسی لەگالّتەجاری، قۆشمەیی، فێڵبازیو عەشقبازییەکانی سەردەمی منالّی کردو گوتی: ئەم روداوە عەشقبازییانە لەوەسوەسەی دایەنەوە دەستیپێکردو پاشان بەپەیوەندیکردن بەیانزە هەزار ژنی شوان کۆتایی پێهات، کە هەمویان ئەویان بەعاشقو دڵخوازی خۆیان دادەنا.

- (تیۆ) لەناو سەرسامبوندا هاواریکرد: -یانزە هەزار؟ کەواتە بڵێ پیاوێکی سەیر!

- نەخێر، چونکە (کرشنا) خوایەك بوو دەیتوانی بێکۆتا خۆی بگۆڕێت، هیچکام لەو کچانە نامرادو بێئومێد نەدەبون، چونکە خوا لەیانزە هەزار رواڵەتی جیاوازدا هەمویانی دەلاواندەوە. پاشان (کریشنا) پاش تێپەڕاندنی تافی پڕ لەسەرشێتی بالّقبون بوو بەفێڵبازترین خواکانو باشترین راوێژکاری مرۆڤەکانو دلێریو مەردایەتیو هەستی فیداکاریو ئەنجامدانی ئەرکی فێری مرۆڤ کرد. کاتێك مرۆڤەکان لەبەرامبەریدا سەرپێچیان دەکردو بۆ نمونە شەڕو جەنگیان نەدەکرد، تەواوی راستەقینەی خۆی دەردەخست!. (کریشنا)ش وەك (شازادە رام) خوای (ڤیشنۆ)، ئەستێرەو دەریا، سەرەتاو کۆتا، جالّجالۆکەی دەریاو بالّندەکانی ئاسمان، روبارو رۆخی بوو؛ جیهانێکی گەورە بوو لەشێوە جیاوازەکانیدا... ئەوەدەم مرۆڤەکان جادو لێکراوانەو

سەرسام ئەرکەکانیان ئەنجامدەدا تا ئەو جێگایەی بەمەبەستی ڕێزگرتن لەسیستمی جیهانی بەبێ بیرکردنەوە، ئامادەی شەڕو جەنگ لەگەڵ یەکدی دەبون. ئامۆژگاریو راسپاردەکانی (کریشنا)ی خواوەندە بۆ مرۆڤی رارا بەتێبینی کارو ناجێگیری (بگافاد – گیتا) ناودەبرێت، کە ئەم دەقە لەسێ هەزار ساڵەوەو لەکاتی خۆرهەڵاتندا بەگۆرانی دەیڵێنەوە.

- (تیۆ)، کە گۆڕابوو، گوتی: من بومایە بەو سادەییە بڕوام نەدەهێنا، پرسیارم دەکرد؟ دەمپرسی پاشان چی؟ ئینجا هەر دەموتەوە، دەمەویت خۆم ببینم؟

- پورە (مارتا) وتی: بەراستی سەبارەت بەدیداری خواوەندانە شیاو ئەوەیە بزانم جێخەوەکەی چۆنە؟.

(تیۆ) هێندە شەکەت بوو دەمودەست خەو بردیەوە.

(مەهانەتجی) هاوڕێی هیچ پەیوەندییەکی بەوهەموو چیرۆكو رووداوی خواوەندانی شەڕانیو جەنگخوازەوە نەبوو، کە خەڵکیان ناچار بەگوێڕایەڵی دەکرد. لەجیهانی خەونەکاندا (تیۆ) مەیمونێکی لە رواڵەتی مرۆڤدا بینی، کە بەخەندەوە سەرینەکەی ژێر سەری چاکدەکرد.

## نزای چاکەی مەیمونی خواوەند

سەعات پێنجی پاشنیوەڕۆ (ئەیلا) بەنەرمونیانی بێداریکردەوە. کاتی ئەوە بوو لەپەرستگاکە بەدیداری (مەهانەتجی) شاد ببێت.

ڕاڕەوی رازاوەی پەرستگاکە چەند حەوشەیەکی لێدەبۆوە، کە موریدانی لەوێدا خەریکی پێکوتان بون. لەنێوان هەرحەوشەیەکدا پەرستگاکی بچوك دروستکرابوو، لەوێدا راهیبەکان بەملپێچی شاڵی زەردەوە پێشەنگی موریدەکان بونو نزای چاکەیان دەکردو دیارییان بۆ دیداری خوا دەبرد. بەئامادەیی هەموو خواکان، کە لەنێوانیاندا مەیمونی خواوەند بەسیمایەکی خەندەدارو چاوی پڕ لەئەشکەوە ئامادەییەکی بەرچاوی هەبوو، خەڵکەکە بەبێدەنگی بەپێوە پشتیان بە دیوارەکەوە دابوو، کەبۆ وێنەگرتن دەستیدەدا. زەنگەکان لە نێو ورتەورتەکانی لەهەموو شوێنێكو لەهیچ شوێنێکەوە دەهاتن دەنگی دەدایەوە.

لەپڕێکدا (تیۆ) چاوی بە (مەهاەنت جی) کەوت. گەورەی هەموو راهیبەکان سەری هەڵبڕیبوو. موریدەکانی بەسەر پێیدا دەکەوتن یەکەیەکە هەڵدەستانەوە. راستەوخۆ بەرەو (تیۆ) چوو؛ دوو دەستی تا ئاستی ناوچەوانی بەرزکردەوەو پێکەوەی نوساند. (تیۆ)ی وەك پەڕ ئەزەوی بڵندکردو بەدەستی راهیبێکی سپارد، کە وەك سایە بەدویەوە بوو. پێکەوە پلیکانەیەکی درێژیان بڕی، کە لەپشت پەرستگاکەوە کۆتایی پێدەهات. لەوێدا بەهێمنی (تیۆ) یان لەسەر دۆشەکێکی سپی دانـاو پاڵیاندایەوە بەبالیفێکەوە. پورە (مارتا) جێگایەکی بۆ دانیشتن دۆزییەوەو (ئەیلا)ش شارەزایانە قاچەکانی کۆکردەوە. (مەهانەتجی) دەستوریدا مێزێکی بچوك بێنن، کە بەرامبەر بە هەریەکەیان بڕێکی زۆر کەم خواردن، بە ئەندازەی خواردنی بوکێك، دانرابوو؛ کەمێك ماست، یەك کفتەی گۆشت، مۆزێك، شیرینییەك.

- (ئەیلا) بەهێواشی رونیکردەوە: ئەمە (پراساد- prasad)ەو خواردنی تایبەت بەرەهیبەکانەو موریدو پەیڕەوان بۆیانی دەهێننو خواکان پاڵاوتویانە. ئەم خۆراکە تەبەڕوکە: تیۆ.. بیخۆ!

- (تیۆ)، کە کفتەکەی دەخوارد، بە پورە (مارتا)ی وت: ئەمەش وەکو نانە فەتیرە (hosti)ی سروتی میس(masse) کڵێسایە؟

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: نەخێر، ئەم خۆراکە نەجەستەو نەخوێنی خوایە!. ئەمانە ئەو خۆراکەن موریدەکان نەزریان کردوە.

- (تیۆ)، کە لەچاوتروکانێکدا هەموی هەڵلوشیبوو، وتی: هەرچۆنێك بێت بەتامە.

کاتێك خواردن تەواو بوو، (مەهانەتجی) قسەیکردو باسی لەوەکرد، کە ئەو خوایەی ئەو دەیپەرستێت روخسارێکی دەرەکیانەی مەیمونی هەیە، بەڵام ئەو سیمایانەی مرۆڤەکان بەخواکانیان بەخشیوە سودی چییە؟. لەدیدی (مەهانەتجی)یەوە خوا لەهەر شەقڵو روخسارێکدا بێت هەر هەمان خوایەو مرۆڤیش بەشێك لەو خودایەتییەی تێدایە. (مەهانەتجی) (هەنومان)ی خۆشدەویست، چونکە مەیمونی خواوەند سمبولی هاودەردیو خۆشەویستی بوو: لەبەرئەوە لەپێناوی چارەسەرکردنی (تیۆ)دا بەئامادەییەوە ئەو قوربانییەکی پێشکەش کردبوو. ئەو خواردنەشی ئێستا (تیۆ) بەتاموچێژەوە خواردبوی لەلایەن (هەنومان)ەوە پیرۆزکرابوو. بەڵام (مەهانەتجی) ستایشی سێ خواکەی دیکەی هندستانی دەکرد: (ڤیشنۆ)، کە (کریشنا) رەواڵەتی شەهامەتو دلێریو جۆشی بەهاریانەی

بوو. (بەرهما) روخساری ئافراندن و (شیڤا) خاوەنی ژیانو مەرگ، رەوالەتی سەمای بونەوەرانو رامانو خەلوەت. (مەهانەتجی) هەموو خواکانی خۆشدەویست، چونکە هەمویان پێکەوە یەك خوایان پێکدەهێنا. هەر لەبەرئەوەشبوو بەزمانی ئینگلیزی وتی: هندۆیزم پێش هەموو شتێك کاسۆلیکیە.

- (تیۆ) لەجێگاکەی راپەری... کاسۆلیك؟ بەراستی هیچ لەوە تێناگەم.

- بەلام (مەهانەتجی) بەخەندەوە رونیکردەوە: لەزمانی ئینگلیزیدا (کاسۆلیك - catholic) بەواتای جیهانی دێت. واتای راستەقینەی ئەو وشەیە، کە لە یۆنانیەوە وەرگیراوە، هەرئەوەیە.

(تیۆ) ویستی بلێت لە (ڤاتیکان)یش کاردینال (ئۆتاڤیۆ) وشەی جیهانی بەکارهێناوە، بەلام هەلی دەستنەکەوت شیبکاتەوە. ئاواز لێدەران، کە بێدەنگ بون دەستیان کرد بە گۆرانیو مۆزیك ژەنین. ئەو دەنگە خۆشەی لە تەپلە بچوکەکەوە لەگەل ئامێرەکانی تر دەهات لەبێدەنگی شەودا دەنگی دەدایەوە. (مەهانەتجی)، کە دەستێکی لەسەر ئەژنۆی دانابوو دەستەکەی دیکەی بلند کردو ئەو ئاوازەی لەدەنگییەوە دەرچوو بەرەو ئەستێرەکان هەلکشا. روناکییەکانی پەرستگاکە یەك بەدوای یەکدا کوژابونەوەو تەنها هەزاران فانۆسی رۆنی لەحەوشەکاندا دەدرەوشانەوە. مانگ چەپکێ رۆشنایی خۆی خستە سەر لقو چلو گەلای درەختەکان. (مەهانەتجی) گۆرانی دەچریو (تیۆ) هەستیدەکرد جۆشوخرۆش سەرتاپای داگیردەکات.

وەك (ئۆرشەلیم) لەئێواردا بەرامبەر بەحەسارەکانی شار؛ وەك (لۆکسۆر)، پاش سەمای دەستگیران. ئێستاش جارێکی دیکە (تیۆ)، دەنگی جمکەکەی خۆی لەژێر خاکەوە دەهاتە بەرگوێ. دەنگێکی جوانو تیژ، کە باسی لەهەستانەوەو ژیان دەکرد. دوبارە جمکەکەی هاتبۆوەو بەئارامی ئەمی لەجۆلانەکەیدا رادەژەن...

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: (تیۆ) خەوتوە!

- (ئەیلا) بەنەرمونیانییەوە وتی: ئەوە بەرەکەتی (هەنومان)ە. نابێت بێدار بکرێتەوە.

## بەشی دوانزە

# (وانەکانی روبار)

### (گنگ) لەسپێدەدا

کاتێك (تیۆ)یان تالای ئۆتۆمبیلەکە برد، لەخەو بێدار نەبۆوەو تەنها هەناسەیەکی هەڵکێشا. پورە (مارتا) لەسەعاتەکەی روانی: سەعات هەشتە. بەیانی رۆژی دوایی لەسەر روباری (گنگ) سەعات چوار کاتی ناشتاکردن و خۆرهەڵاتن بوو.

هێشتا سپێدەی نەدابوو، کە تاکسییەکە لەسەر شەقامە چۆڵەکانی شار کەوتەرێ. هێدی هێدی، کە لەروبارەکە نزیك دەبونەوە، شاری (بنارس)یش لەخەو رادەبوو. ژنان بەرماڵەکانیان گسکدەدا، فرۆشیارەکان سەوزەو زەمیلەکانیان بەتاڵ دەکرد، هەژاران و گەداکان دەگەڕانەوە شوێنەکانیان و هندییەکان بۆ یەکەمین سروتی پەرستنی بەیانیان بەرەو (گنگ) دەبونەوە. تاکسییەکە لەبەردەم مەیدانێکی بەرفراواندا راوەستا، کە بەلەم و بەلەمچییەکان چاوەڕوان بون. (ئەیلا) بەلەمێکی هەڵبژاردو لەگەڵ ئەوەشی ئاشنایەتی لەگەڵ خاوەنەکەی هەبوو، بەڵام باش پشکنی. لەوبەری روبارەکەوە کازیوەیەك دەبینرا.

لەکەناری روبارەکە زنجیرەیەك پلیکانە هەبون، کە لەپلەی گەورە پێکهاتبون و خەڵکێکی زۆری لەسەر گردببۆوە. ژنان و پیاوانێکی زۆر دەستەکانیان بەجوتکراوی لەسەر سنگیان و قاچەکانیان لەئاوەکە رۆکردبوو. چاوەڕوانی هەڵهاتنی خۆربون، کە خەریك بوو بازنە ئەرخەوانییەکەی دەردەکەوت. خەڵکەکە نزاو رازو نیازیان دەکرد. جارێك و دوان و سیان خۆیان لەئاوەکە هەڵدەکێشا. (تیۆ) ئەژماری جارەکانی کرد. دوانزە جار بوو. لەدوانزدیەمین جاردا دەستەکانیان بەرز دەکردەوە، تا لەسەر سەریانەوە وەك دوو کەوچکی پێکەوەد نوساو ناو

سەرەو خوار بڕژێت، ئینجا لە روبارەکە دەهاتنە دەردەوەو خۆیان وشك دەکردەوە. ئێستا خۆر بەئەندازەی تۆپێکی گەورەی سور دەچۆوە.

لەو دەمەدا گەنجەکان بەتەواوی خۆیان سابوناوی دەکرد، ژنان (ساری)یەکانیان دشوشت و لەسەر سەکۆکە رایاندەخست، منالەکان، کەسابون چاوەکانیانی دەچوزانەوە، هاتوهاواریان بوو. ئێستا خۆر بازنەیەکی گەورەترەو رەنگی نارنجی پۆشیوە.

لەوکاتەشدا فرۆشیارانی چا، نانی شیرین، وێنەی پیرۆز، پەشمەك و کێشراوەی تەبەرروت دەرکەوتن. لەژێر ئەوچەترانەی لەلەلق و پەلی دارخورما دروستکرابون، خەلکی سەیرو نامۆ بەرامبەر بە پارە دەقە پیرۆزەکانیان دەخوێندەوە، کەناری روبارەکە پەرستگایەکی مەزنی بێمیچ بوو، وەرزی بازاڕێکی سەیروسەمەرە؛ نزاکردنێکی پیرۆز، خۆشۆردنێکی کۆگەلی و کۆبونەوەیەکی پڕ ژاوەژاو، کەبەردەوام میوانی نوێ دەهاتن تا جەستەیان لەروبارەکە هەلکێشن و نزاو پاڕانەوە بکەن. خۆرەکە ئێستا بەرزبۆتەوەو تەختی ئاوەکەی دەدرەوشاندەوە و دەیکردە جێگای سەرنجدان و ئاسمان پانتاییە شینباوەکەی بەسەر روبارەکەدا کێشابوو. لەوێوەو دورترو لەسەر روبارەکە ستونی دوکەلی سپی بۆ ئاسمان هەلدەکشا، کە (تیۆ) لەو بارەیەوە هیچی نەپرسی. ئەو دوکولە لەئاگری ئەو لیژنەدارانە بەرزدەبۆوە، کەجەستەیان تێدا دەسوتا.

- هندەکان هەموو رۆژێك ئەم سروتەیان دوبارە دەکەنەوە؟

- (ئەیلا) رونیکردەوە: هەموو رۆژێك، وەك میسر، بۆ دوبارە هێنانەوەی خۆر بۆ سەر زەوی ئەم سروتە ئەنجام دەدرێت تا سیستمی جیهان وەك ئەوەی کە هەیە پارێزراو بێت. لەهندستان هیچ شتێك لەپاڕانەوەی بەیانیان گرنگتر نییە، کەیەکەم چالاکی ژیانی رۆژانەیە. هندەکان دوای ئەنجامدانی ئەم سروتەیە بۆ سەرکارەکانیان دەڕۆن. تەنانەت (یۆگا) کانیش. کەئەرکەکانیان گرانە، بەشداری ئەو سروتە دەکەن. پورە (مارتا) پێشنیازیکرد سەردانی (یۆگا)کان بکەن و لەنزیکەوە بەچالاکییەکانیان ئاشنابن.

خاوەنی بەلەمەکە لەسەر کرێکەی لەگەل پورە (مارتا) خەریکی سەوداو مامەلەبوو، کە لەو کاتەدا لاوترین بەلەمچی کاغەزێکی لولکراوی دایە دەست (تیۆ). پەیامێك!. (تیۆ) لەسەر لێوارەکە رۆنیشت و کاغەزە پێچراوەکەی کردەوەو مات بوو: هیچ لەنوسینەکە تێنەدەگەیشت:

(لەو بەرزاییەوە، نەهاتوچۆ، نەبەردەوامی، نەمەرگو نەدوبارە زیندوبونەوە. رێگای ناوەڕاست بگرەپێش).

(تیـۆ) خۆبـەخۆ سـەریهەڵبڕی؛ لەوبەرزاییـەدا، لەسـەربانی پەرسـتگاکان لـەنێو چـاڵی پەیکەرەکاندا سەوزە رواوەو سەری دەرهێناوە؛ دڵەکان بەئاسمانـدا دەسوڕانەوە، کۆترەکان لە گومەگومیان دەکردو ژیان لەهەموو شوێنێکدا لەجوڵەدابوو، بـەڵام لـەهیچ شـوێنێکی ئاسمانی (بنارس)دا وەڵامەکەی دەست نەدەکەوت. (تیۆ) پەیامەکەی لە گیرفانی ئاخنیو کەوتە شوێن پورە (مارتا)، کە بـەدوای یۆگـادا دەگەڕاو هـەنگاو بەهـەنگاو پلـەکانی دەبڕی، لەسـەرخۆ وتـی: سەیرە! ئەی بڕیار نەبوو لێرە یەکدی ببینین؟

بـەڵام لای بەشـی چـەپی کـەناری روبارەکـە ژنێـك بەتـەنیا روبـەڕوی خـۆر لـەڕامانو خەڵوەتـدابوو، کـە ژنێکـی موسـڵمان بـوو بەسەرپۆشـێکی وەنەوشـەییەوە. پـورە (مارتـا)، کـە فرۆشیارانی مـەدالیا جۆربـەجۆرەکان بەدویـەوە بـون، بەپەلـە خـۆی گەیانـدە ریـزی دووەم، کە لەوێ (یۆگی)یەك بە (لونگی)[1] یـەوە چاوەنواڕی بـوو. ( یـۆگی)یەکە لەسـەر زەوی رۆنیـشتبوو، قاچەکانی لەباری (لوتوس - Lotus)[2] دابوو. کاتێك پورە (مارتا)ی بینی بەبێ ورتە دەستەکانی لەیەکـدانو هـەروا بەبێـدەنگی قاچـەکانی راسـت کردنـەوەو کلاوێکـی پـەشمینی لەسـەرکردو کۆڵوانە کۆنە خاکییەکەی لەخۆیـەوە ئاڵانـدو دوای پـورە (مارتـا) کـەوت. کلاسـی وانـە لـەژوری هۆتێلەکە سازکرا.

## نواندنەکانی پرۆفیسۆر ئۆلیبریۆس

- (تیۆ) لەراڕەوکەدا وتی: خۆ مـن داوای هیـچم نـەکردبوو. ئـەم (ئۆلیبریـۆس)ـە کاری چی بەمن هەیە؟

- (ئۆلیبریـۆس) بـەزمانێکی فەرەنـسی رەوان وەڵامیدایـەوە: دەتوانیـت بـە (ئۆلیبریـۆس)ی تەڵەکەباز بانگم بکەی، ئەم نازناوە هیچ سەغڵەتم ناکات. پورت گومانی هەیە زانـستو زانیـاری ئێمە سودێك بەتۆ بگەیەنێت، بەڵام هەموو شتێك پەیوەستە بەخودی خۆتەوە... بچکۆل بەدڵتە؟

- (تیۆ) وتی: سەرەتا بابزانین چیدەکەیت؟ دوایی بڕیاری لێدەدەین...

---

١. لونگی: جۆرێك قوماشە بۆ گەرما دەبەستن.

٢. لوتوس: چوارمشقی، شێوە دانیشتنی تایبەتی یۆگابەکانە.

- (یۆگی)یەکە لەسەرخۆ وتی: بزانن چییە؟ باشە.

لەسەر شێوەی (لوتوس) لەسەر زەویەکە رۆنیشت. قاچی چەپ لەسەر رانی راستو قاچی راست لەسەر رانی چەپ. دەستەکان لەسەر ئەژنۆ، لەپی دەست روو لەئاسمان، چاو داخرێ (تیۆ) چاوەڕێی جوڵەی دەکرد، بەڵام جوڵە نەبوو. سیمای (یۆگی)یەکە هەر وەك خۆی بوو. پاش ماوەیەکی درێژ چاوەکانی کردەوە.

- (تیۆ) وتی: هەر ئەوەندە بوو!

- (یۆگی)یەکە وتی: کاری ئێمە پەیوەستە بە زانینو هۆشیارییەوە. وشەی (یۆگا) واتە (یۆغ)و مەبەست لەو پارچە ئاسنە قورسو گرانەیە، کە دوو ئەسپی ئەرەبانەیەك پێکەوە دەبەستێتەوە. ئەرەبانەکە جەستەو لەشی تۆیە، ئەسپەکان خرۆشاویەکانتە، ئەرەبانەچی هزرو بیری تۆن و دەمەکان هۆشمەندیت. (یۆگا) هەوڵدەدات لەرێگای رێنوێنی هزرییەوە لغاوی ئەسپەکان لەژێر رەشمەدا توندوتۆڵ بپارێزێت. ئێستا تۆ، کە حەز ئەکەیت (یۆگا) ببینیت بەمن بڵێ چیت بینی؟

- (تیۆ) بەشەرمەزارییەوە وتی: پیاوێکی بێ جوڵەم بینی..

- (یۆگی)یەکە وتی: وەڵامێکی باشە. بێجوڵەو بزاوتن بەمەشقی دوورودرێژ بەدەست دێن، کە ئامانج لەوەش دەسەبەرکردنی ئارامیو پشوی تەواوی بیرکردنەوەیە. تۆ ناتوانیت ئەمە ببینیت، بەڵام من دەتوانم ئەم جوڵانەت فێربکەم کە بەهۆیەوە ئەو کەسە دەگاتە باری بێجوڵەو بزاوتن. بەڵام سەیرکە، ئەو جوڵانە وەك (جومناستیکی) وەرمەگرە، چونکە ئەوەی تۆ بەچالاکی (ئەکرۆباتیك)ی تێدەگەیت شتێك نییە جگە لەشێوازێك بۆ گەیشتن بەقۆناغی جێگیری جەستە. ئامادەیت؟

- (تیۆ) بەورياييەوە وتی: بەڵێ.

(یۆگی) کەوتەجوڵە، کەلەسەر پێیەك راوەستابوو پێکەی دیکەی بە ئاسانی کردە ملیو وەك (قاز) لەسەر یەك قاچ راوەستا. ئینجا جەستەی رێککردەوەو دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی هاویشتو ورگی هێندە قوپاند، کە (تیۆ) بەبینینی موبرەی پشتی لەسەر پێستی گەدەیەوە توشی تۆقین بوو. (یۆگی) بەسانایی یەك بەیەکی بزاوتەکانی دەنواند، لەکاتێکدا سەری داخستبوو جەستەی ئاسۆیی راکێشاو قاچەکانی لەپشتی سەرەوە خستە سەر زەوییەکەو

دەستەکانیشی بە جۆرێك لەگەڵ قاچەکانی تێکەڵ کرد، کە (تیۆ) نەیتوانی لێیتێبگات؛ ئینجا چاوەکانی دەرپۆقاندو زمانی دەرکێشا. (تیۆ) قاقا پێکەنی، پورە (مارتا) بە (شش) ئاگاداری کردەوە.

- (ئەیلا)ش بەگوێیدا چرپاندی: ئەم جوڵەیە بە(رەهایی - RELAXATION) ناودەبرێت، کە دواجوڵەیە.

- (تیۆ) وتی: تۆ دەتەوێت ئەو جوڵەیە فێرببم، چۆن بوو؟

- (یۆگی)یەکە، کە ئێستا گەڕابۆوە باری (لۆتۆس) رونیکردەوە: بنەمای ئەم جوڵەیە سادەیەو ئامانجی ئەوەیە جەستە ئامادەی ئارامیو چەقبەستن بێت، کە بۆ (رامانو خەڵوەت) پێویستە. بەڵام ئەم ئامێرە ئاڵۆزو کاتییەی ناوی (لەشە) بۆ چەقبەستنو بێجوڵە مانەوە دروست نەکراوە، بەڵکو بۆ پێچەوانەکەی؛ دەبێت بۆ ئارامی پێبەخشینو تەنانەت فەرامۆش کردنیشی رابهێنرێت. هەریەك لەجوڵەکانی (یۆگا) کاروکاریگەری لەسەر بڕبڕەی پشت هەیە، بەڵام بەهەمان رادەش کار لەسەر ماسولکەکانو تەنانەت ئەندامەکانی ناوەوەی لەشیش دەکات. بۆ نمونە کاتێك سەر شۆڕکراوەتەوە خوێن هوروژم دەباتو مێشك ئاودێری دەکات. کاتێك پشتی مل بەتەختی لەسەر خاك بێت غودەی (تیرۆیید) دەشێلێت یان ماساژ دەکات، کە تایبەتە بەڕێکخستنی مادە جولاوەکانو خوڕەوشتی تاك.

- (تیۆ) وتی: مەبەست جوان رەفتارییە؟

- رەفتاری جوان یان ناشیرین، مەبەست رێکخستنی هەواو هەوەسە. بەسوڕاندنی (سك) دەمارەکان، جگەرو سپڵ دەشێلێتو یاریدەی هەرس دەدات. (یۆگا) هیچ کام لەماسولکەکان، ئێسقانەکانو هیچ ئەندامێکی لەش پشتگوێ ناخات. سەبارەت بە دڵ (یۆگا) مەشقی هەناسەگرتنی هەیە تا لەورێگایەوە ماسولکەی دڵ ئارام بێتو پشوو بدات. تەنانەت لەرێگای وەرزشکردن بەگەروو دەتوانرێت دەنگەژێکان بەهێز بکرێتو بەوجۆرە مۆزیکێکی ناوخۆیی لەناوەوە دروستبکرێت، کەدەبێتە هۆی ئارامی رۆحو دەروون.

- (تیۆ) پرسی: ئەی بابەتی چاو دەرپۆقانو زمان دەرکێشان چییە؟

- بەڵێ، مەبەست تەنها وەرزش کردنە بە ماسولکەکانی زمانو کاسەی چاو. ئەم جوڵەیە پێیدەوترێت جوڵەی (شێر)، چونکە (یۆگا) زۆرجار لاسایی جوڵەی ئاژەڵان دەکاتەوە.

(یۆگی)یەکەی چوارمشقی لەسەر زەوییەکە رۆنیشتو دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی داناو بەبێئەوەی پاژنەی پێکانی بەرزبکاتەوە کەوتەڕێ. ئەم جۆرە رۆیشتنە لاساییکردنەوەی

(تیمساح)بوو. ئینجا لەسەر سك درێژ بوو، قورسایی خستە سەر باسکەکانیو هەموو لەشی بۆ سەردوە بەرزکردەوە، لاسایی کردنەوەی (ماری کوبرا)بوو. لەسەر چۆك دانیشتو لەپی دەستەکانی توند هاویشتە سەرشانەکانیو سەری خستە نێو شانەکانی، جوڵەی کیسەڵ. زیاتر لەدوو هەزار ساڵە (یۆگی)یەکان لاسایی جوڵەی ئاژەڵان دەکەنەوەو لەوبڕوایەدان هەموو جۆرە ئاژەڵەکان روخساری بەردەوام (بەدگۆڕان — مەسخ)ەکانی خواو (ڤیشنۆ)یە، کە دواجار پەیدابونی وێنەی مرۆڤی لێکەوتەوە.

- (تیۆ) وتی: سەیرو سەرنجڕاکێشە، بەڵام ئێستاش نازانم سودی چییە؟

- (یۆگی)یەکە وتی: جەستەی مرۆڤ شتێکی پیرۆزە، یەکەم بنەمای (یۆگا) دەڵێت: (**بچۆرە ناو پەرستگای جەستەی خۆتەوە**). (یۆگا) نوێژی لەشو رۆحەو دوائامانجی گەیشتنە بەقۆناغی توانەوەو فەنابونە لەبونەوەرەکاندا. هەردوای ئەوەش رۆح راستەوخۆ شیدەبێتەوە. (من) بزر دەبێتو (تاك)، کە ئاوێتەیەکی کاتیو تێپەڕە لەمادەو رۆح، بونی خۆی لەدەست دەداتو بزر دەبێت.

(تیۆ) بەنارەزاییەوە وتی: واتە کاتێك بگەمە ئەو قۆناغە ئیدی من خودی خۆم نامێنم. زۆر سوپاس!

- (یۆگی)یەکە وتی: خۆرئاواییەکان ئەوە پەسەندناکەن، کە لەناوچونی (تاکێتی) گرانبەهایان، ئایدیایەك بێت. بەڵام لای هندەکان لەشو جەستە تەنها روکەشێکی کاتییە، کە رۆح بەجێدێڵێت تابچێتە جەستەو لەشێکی دیکەوەو روکەشێکی دیکە بۆخۆی بدۆزێتەوە تا سەرئەنجام لەقورسایی جەستەرزگاری بێتو جارێکی دیکە پەیوەندی بکاتەوە بەو رۆحە جیهانیەوە، کە لێی جیابۆتەوە.

- (تیۆ) وتی: تێگەیشتم. لەرۆژێکی خۆشدا رۆحی تۆ دەچێتە لەشێکی دیکەوە. بەڵام لە ئێستادا بەشی من چیدەبێت؟

- (یۆگی)یەکە وتی: ئەوەی ئێستا دەبێتە بەشی تۆ ئارامی دەرونە، کە تەندروستی جەستەی لێدەکەوێتەوە. (یۆگی)یەکان لەرێگای مەشقی هەناسەدانی رۆژانەوە بەجۆرێك بەسەر لێدانی دڵدا زاڵ دەبن، کە دەتوانن دڵ لەلێدان بخەنو ئاوازی خەونێکی قوڵ بگێڕنەوەو چەندین رۆژ وەکو مردوو لەژێر خاکدا بمێننەوە، مردویەکی پاش چەند رۆژ دەتوانێت دوبارە ژیانەوە بگێڕێتەوە.

- (تیۆ) بەوورِیو سەرسورِمانەوە وتی: تۆ دەتوانیت ئەو کارە بکەیت؟

- نەخێر، (یۆگی)یەکەی پورە (مارتا) لەجۆری ئەو کەروێشکی تاقیگایانە نەبوو، کە زاناکانی ئەمریکا بخاتە خرۆش و نەیدەتوانی پەسەندی بکات لەسندوقێکدا زیندانی بکەن‌و سوپایەك لەچاودێرو توێژەرەوان بۆ لێکۆڵینەوە لەتەندروستی چاو لەمۆنیتەری دەزگای کۆنترۆڵ هەڵنەگرن. ئەم تەنها ئەوەندەی بەسبوو لەرێگای ئاسانکاری، دورەپەرێزی لەتوندوتیژی، عەشق‌و خۆشەویستی بۆ کەسانی دی ، دورگرتن لە توڕەیی‌و پەنابردن بەهیواکانی ئەم ژیانە بگاتە قۆناغی مەعریفە. (یۆگا) لەسەر دوو ئەسپە راگیرە، ئەمە خۆی دەستکەوتێکی گەورە بوو، پێشنیازی بۆ (تیۆ) ئەوەبوو فێری هونەری ئارامکردنەوەی دەرون بێت.

- (تیۆ) بەهێمنی وتی: واتە خەو لێخستن، خۆم ئەوە دەزانم.

- (یۆگی) رونیکردەوە: مەبەست خەو لێخستن نییە، بەڵکو لە ئارامی رۆحێکی شەپۆل ئاسای سەر تەختی ئاوە. واتە ئاشتی‌و هەروەها بێدارکردنی هێزە شاراوەکان، کە رۆح‌و جەستە پێکەوە بەهێز دەکات، چونکە (یۆگی)یەکان دەستکەوتێکی گەورەیان لەجەستەی مرۆڤەوە بەدەستهێناوەو لەسەر ئەو بڕوایەش بون، کە بەدرێژایی بڕبڕەکانی پشت بازنە هەیە بەناوی (شاکرا Chakra)، کە لەوەوە پرشنگ بەدەوروبەردا بڵاودەبێتەوەو هەریەك لەو بازنانە چاودێری‌و پارێزگاری لەچینێکی لەش دەکات. مرۆڤ دەتوانێت هەریەك لەو بازنانە بێدارو چالاك بکات‌و ئەگەر بەدواین بازنەی سەرەوەی بڕبڕە بگات، کە دروست بەخاڵی پەردەی نەوزاد دەگات و دواین بازنەی (شاکرا)یە، ئەو (لوتوس)ـە یان (نیلوفەرە) هەزار گەڵایە سپێتیەکەی چاو ئەبڵەق دەکات، شکۆفە دەکات. ئەو مەشقە زۆر سەخت بوو، چونکە دەبوو مارێکی دەرونی بێدار بکرێتەوە، کە لەناوچەی (پیرۆز)دایەو زانستی هەڵوەشاندنەوەی خۆرئاوا بە (سکروم)[1] ناوی دەبات.

- (تیۆ) وتی: دروست لەسەروو خانەی مرۆڤ؟

- بەڵێ، خوار شوێنی ئامادەکردن، لەوجێگایەی هێلکەدانەکانی تێدایە... دەبێت ئەو مارەی ناوی (کوندالینی- Kundalini)یە، واتە (پاپۆکەی خواردوە) بێداربکرێتەوە تا هەستێت‌و خۆی بگەیەنێتە مێشك. هەڵبەتە بەگشتی‌و بەشێوەیەکی تایبەت دەربارەی (مارێك) دەدوان. بەڵام ئەو مارە دەرونییە شێوەیەکی تایبەتە لەهێزێکی زۆر بەتوانای ژنانە تا ئەو رادەیەی بەرێز (ئۆلیبریۆس) لای باشتر بوو دەربارەی (مارمێینە) قسەبکات نەك (ماری نێرینە)، چونکە هیچ بەشدارییەکی (شیڤا)ی خواوەند لەسەر روی زەوی ناتوانێت لەسەرهەڵدانی وزەی ژنانە یان

١. Sacrum ئێسقانێکە، کە [illegible]

(شکتی Shakti) بێسود بێت، کە لەهەموو جەستەداو لەوانەش لەجەستەی پیاودا دەجوڵێت. ئەو وزەیەی لەناو دەرونی ماری مێینەدا حەشاردراوە دەبێت ناچاربکرێت بەرەو مێشك هەلکێشێت.

(تیۆ) بیریکردەوە: مارێك لەشوێنی ئامادەکردندا، ئایا ئەم ئەو شلەیە نییە، کە دەبێتە هۆی دروستبونی سپێرم؟

(یۆگی) بەپێکەنینەوە: (تیۆ) باش تێگەیشتبوو، بەلام لەردهەندی (یۆگا)دا ئەو شلەیە لەژنانیشدا هەیە، چونکە وزەو توانای ژنانە لەنێوان هەردوو رەگەزی نێرو مێدا دابەشبووە. هەندێجار لای هەندێك لەگروپەکان درێژکردنەوەی ماوەی پەیوەندیگرتن نەریتە تا شلەمەنییەکە بگاتە ناوچەی سەر.

- (تیۆ) بەدڵ گیرانەوە وتی: زۆر سەیرە... ئەم بابەتە بە (فاتۆ) دەڵێم.

- بەلام (یۆگی)یەکە دەموودەست هۆشیاری کردەوە: ئەوکارە تەنها تایبەتە بەکۆمەڵێکی کەم لە مریدە شارەزاکانو ساڵانێکی دورودرێژی لەمەشقو راهێنان دەوێت تا پیادەبکرێت؛ لەگەڵ ئەوەشدا بێدارکردنەوەی سادەی وزەی دەرونی هەموو خەڵك دەتوانن بەئەنجامی بگەیەنن.

(تیۆ) پرسی: تۆش دەتوانیت؟

- (یۆگی)یەکە دانی بەوەدانا، کە چەند جارێکی کەم هەوڵیداوەو بێئاکام بووە، ئیدی لەرێگای پەیکەرو لەشی خۆیەوە بەوەداسەکناوە بەهەموو توانایەوە خواپەرستی بکات.

(تیۆ) گەیشتە ئەو ئەنجامە: (یۆگا) ئاینێکی خودییەو بۆ خودی خۆت. لەو ئاینەدا خواوەند واتە خودی ئێمەو تەنانەت دەکرێت چاوپۆشی لەخواوەندیش بکرێت، وانییە؟

- (یۆگی) وەلامیدایەوە: نەخێر، لەهندستان کەس ناتوانێت بەبێ ئەندێشەی خودایی وێنای خۆی بکات، بەلام لاوێکی خۆرئاوایی دەتوانێت بەبێ بڕواییەوە وەك ئەو راهێنانی (یۆگا) بکات.

- (تیۆ) وتی: ئۆکەی – OK – من بۆ تەندروستیو ئارامی خۆم دەمەوێت ئەو مەشقە بکەم. فێرم بکە.

## (تیۆ)و (گورو)یەکەی

(یۆگی)یەکە (تیۆ)ی چوارمشقی لەسەر زەوییەکە رۆناو داوای کرد قاچی چەپی لەسەر رانی راستیو هی راستی لەسەر چەپی دابنێت. پاشان سەری پێدانەواندو گەردنی راست کردەوەو پاشان رستێك وشەی دەنگداری پێ دوبارەکردەوە، کە بە (ئەلف A) دەستی پێدەکردو بە

(ئۆم - Om) کۆتایی دەهات. لە (A تا Om)و لەسەر (Om) دەبێت لچو لێو دابخاتو خەندە بکات: (یۆگی) پێیراگەیاند لەوبارەدا دەبێت هەست بکات لێوە لەرزەیەتی.

- (تیۆ) وتییەوە: (ئا.. ئۆم) هەست بەهیچ ناکەم، ئا — ئۆم.
- (یۆگی)یەکە سەلماندی: پێبکەنە.
- (تیۆ) بەخەندەوە کەوتە گۆرانی وتن: ئۆ، ئۆ، ئۆم.... بەڵێ دەلەرزێت. پورە (مارتا) بڵێ بزانم بۆچی وەك مەیمون لاسایی من دەکەیتەوە... خۆ من هندۆسی نیم!

(یۆگی)یەکە وتی: وەك مەیمون، وشەیەکی دروستت دۆزییەوە. چونکە جۆری مرۆڤ لەسیستمی بونەوەرەکاندا هیچ جیاکەرەوەیەکیان نییەو ئاین (تیۆری) یۆگا پەسەند دەکات و پشت بەوەرگرتنو لاسایی کردنەوەی هەموو جۆرەکانی زیندەوەرانی زیندوو دەبەستێت، لە نمونەی مەیمون، شێر، باڵندە، قالۆنچەکانو تەنانەت ماری کوبراش بەژەهرە مەترسیدارەکەیەوە.

- (تیۆ) وتی: تیۆرێکی ژینگەیی دەوروبەرە، باشە.

پاشان وەرزشی هەناسەدان بوو. فن کردنێکی بەهێز بۆ پاككردنەوەی کونە لوتەکان. پاشان هەناسەدان، ئینجا هەناسە هەڵکێشان. هەناسە هەڵکێشان لەرێگای یەکێك لە کونە لوتەکانەوەو داخستنی ئەوی دیکەیان، ئینجا هەناسەنەدان. ئینجا هەناسە هەڵمژین لەرێگای دەمەوەو زیندانیکردنی لەسینەدا.... بەڵام لەو کاتەدا (تیۆ) کەوتە کۆکەکۆك.

(یۆگی)یەکە برۆکانی هێنایەوە یەك و دەستی خستە سەر سکی (تیۆ)و بە روخسارێکی نیگەرانەوە وتی:

- هەست بەجۆرێك لەشڵەژان لەناو خوێنەکەتدا دەکەم. خوێن لە بۆرییەکانتدا هاتوچۆ ناکات، بهێڵە توانای خۆم ئەزمون بکەم.

ئینجا باسی لەوەدەکرد، کە (یۆگی)یەکان بەراستی توانای نائاسایی بەدەستدێنن، کە پێیدەڵێن (سیدهی - Siddhi)و هەندێکیان لەرێگای ئەم توانستەوە دەتوانن چارەی نەخۆشی بکەن. (تیۆ)ی لەسەر زەوییەکە درێژکردو هەردوو دەستی خستە سەربەشی چەپی خواردودی.

- کورِم.. هەست بەهیچ دەکەیت؟
- (تیۆ) وتی: هەست بەگەرمی دەکەم.
- زۆرباشە. ئێستا هەرچیت پێدەڵێم ئەنجامی بدە. قاچەکانت بڵاوبکەرەوە، دەستەکانت بچەسپێنە بەجەستەتەوەو لەپی دەستەکانت بارِویان لەئاسمان بێت. چاوەکانت دابخە. بهێڵە زمانت لەسەر مەلاشوت بجولێت، پەنجەکانی پێت، ماسولکەکان با ئازاد بن....

لەپرێکدا (تیۆ) وەك قورِشمێکی قورس هەستی بەخۆی کرد. (یۆگی)یەکە بەچرپەوە باسی لەباخەوانێك دەکرد، کە جۆگایەکی هەڵدەبەستو گوڵێکی لەسەر شەپۆلەکان دەپشکوت: (تیۆ) هەستیکرد وەك پەرِێك سوك بووەو وەك هەمان گوڵ لەسەر روی ئاوەکە شەپۆل دەدات. کاتێك هەناسەی هاتەوە سەرخۆی چووە خەوەوە...

(یۆگی)یەکە بەهێواشی وتی: منداڵەکە نەخۆشە، زۆر نەخۆشە. بەڵام مەرگ لەنیوەی رێگادا راوەستاوە.

پورە (مارتا) وتی: سەیرە! بۆ چارەسەرکردنی جوڵەیەکت هەڵبژارد، کە پێیدەوترێت (تەرم)، چ رونکردنەوەیەکت لەوبارەیەوە هەیە؟

- (یۆگی)یەکە خەنییەوە: رونکردنەوەکەی ئەوەبوو، کەتەنها باری (تەرم) دەتوانێت دڵەراوکەی مەرگ جڵەو بکات.

(تیۆ) خۆبەخۆ بێداربووەوە. (یۆگی)یەکە چاودێریکرد تایەکەم پەنجەی پێیەکانی بجوڵێنێتو پاشان داوای لێبکات بەهێواشی هەستێتە سەرپێ تادوچاری سەرگێژخواردن نەبێت.

- پورە (مارتا) پرسی: باشیت؟
- (تیۆ) لەژێر لێوەوە وتی: باشم. تەندروستیم باشە. هەست بەشتێکی سەیر دەکەم، وەك ئەوەبوو منداڵ بمو دایکم بمشوات. بارێکی سانا، ئاسودەیی.

(یۆگی)یەکە دوا وێردی خوێندو ئینجا دەستەکانی بەیەکەوە بەستو گەورەیی نواند. وانەکە تەواو بوو. کڵاوەکەی کردەوە سەری، کۆڵوانەکەی لەسەرشانی هاویشتوبە ویقارەوە چووە دەرەوە.

(ئەیلا)، کە تا ئەوکاتە هیچی نەوتبوو، گوتی: تیۆ، تۆ ئێستا (گورو)یەکت هەیە!

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: من؟

(ئەیلا) درێژەیپێدا: (گورو) واتە (ئاوات)، مامۆستا. تۆ ئێستا ئاواتێکت هەیە.

- بەڵام من تەنانەت ناویشی نازانم!

پورە (مارتا) وتی: ناوی بەڕێز (کولکارنی)یە، هەر لەبەرئەوە لە (بۆمبای)یەوە هاتبووە ئێرە. بەڵام لەمەودوا دەبێت بۆ ڕێزلێنانی بە (گورو جی) بانگی بکەیت.

- (تیۆ) وتی: بەڕێز (کولکارنی). ئێستا (گورو)یەکم هەیە... باشتر نییە! دەڕۆم تەلەفۆن بۆ (فاتۆ) دەکەم، ئێستا دەیکاتە گاڵتەجاڕی.

## چاخواردنەوەی ناو کۆمەڵێکی شیاو

(تیۆ) تەلەفونەکەی هەڵگرتبوو، دەیویست ژمارەکە لێبدات.

- پورە (مارتا) ڕێگریکردو گوتی: پێشئەوەی بانگی (فاتۆ) بکەیت ناتەوێت پەیامەکەت تێبگەیت؟

- (تیۆ) ئاهێکی کێشاو گوتی: پەیامەکەم.... فەرامۆشم کردبوو. دەکرێت یاریدەم بدەیت؟

- ئۆو نەخێر، خۆ ئەمە یاری نییە!

(تیۆ) گیرفانەکانی خۆی پشکنی و پارچە کاغەزەکەی دەرهێنا (نەرۆشتن، نەهاتن، نەمەرگ و نەدوبارە لەدایکبونەوە....)،

- وتی: نەرۆشتن نەهاتن، دەڵێی (یۆگا)یە. نەمەرگ نەدوبار لەدایکبونەوە، ئەگەر باش تێگەیشتبم هەرئەوەیە، بەڵام لەم شتانەوە دەرناکەوێت شاری ئایندەی من لەکوێیە؟.

- پورە (مارتا) وتی: تۆ ناوەڕاست پشتگوێ دەخەیت.

- ناوەڕاستی جێخەوەکە؟

- ڕێگای ناوەڕاست. ڕێگا ... تیۆ!

- شەقامێك؟ ڕێگایەك؟ باریکە ڕێیەك، شارێیەك...

- پورە (مارتا) وتی: خراپ نییە. دوبارە هەوڵبدە!

- (تیۆ) هاواریکرد: سەرم لێتێکدەدەیت! واباشە قسە لەگەڵ (فاتۆ) بکەم. هێشتا..!

پورە (مارتا) تارادەیەك بەشەرمەزارییەوە پەسەندیکرد، کە (تیۆ) راستدەکاتو واباشترە پێشنەوەی بیخاتە بەر بەگەڕخستنەوەی مێشکی کەمێك پشوو بدات. بەلاّم تازە درەنگبوو. (ڤاتۆ) لەسەر هێڵی تەلەفون بوو.

- (تیۆ) هاواریکرد: بەڵێ، بەڵێ، خۆمم، (تیۆ)م. باش گوێت لەدەنگم نییە؟ زۆر دورم. دەزانیت... لە (بنارس). ئاها! تەلەفونەکە دەنگ دەداتەوە؟. نەخێر، دەنگی تۆ باش دەبیستم. بەدەستەکانی تەلەفونەکەی داپۆشیو تەواو لەدەمی نزیك کردەوەو بەهێواشی وتی: شتی سەیر فێربوم. ئەگەر دەزانی... دەڵێم (شتی سەیر). ئێستا (گورو)یەکم هەیە... نایبیستیت؟ پەلەمەکە، بەدەنگی بەرز دەیڵێم... وتم ئێستا (گورو)یەکم هەیە. ئێ، باشە؟ لەلات سەیر نییە؟ فێری کردم چۆن... ئەیڵێم، فێری کردم چۆن ماری دەرونم بەئاگا بێنمەوە. گوێڕادێرە.. پیشانت دەدەم. دەڵێیت تەندروستیم باشە؟ بەڵێ، وابزانم، وتم وابزانم! ئای ئەگەر دەتوانی ئاماژەیەك بدەیت زۆر باش دەبوو. کارەکەم مەیسەردەکرد... چی؟ دوبارەی بکەمەوە؟ رێگا؟ ... چ رێگایەکە؟ چا؟ دڵنیایت؟ زۆر باشە. ماچت دەکەم. وتم ماچت دەکەم! منیش هەروەها... (تیۆ) کە هەناسەی سوارببوو، بەتوڕەییەوە لە تەلەفونەکەی راما.

- پورە (مارتا) وتی: کاتێك لە (بنارس)ەوە قسەدەکرێت هەمیشە بەوجۆرەیە، دوجار ئاماژەکەت دەستکەوت؟

- (تیۆ) ، کەمێك ئارامتر بوو، گوتی: بەڵێ، رێگا، رێگای چایە، بەلاّم هیچ لەو ئاماژەیە تێناگەم. رێی ناوەند، چا؟

- پورە (مارتا) پێشنیازی کرد: لەنەخشە بنواڕە، بەڵکو شتێك بەشتێك بکەیت.

(تیۆ) ئەتڵەسێکی کردەوە چووە سەر چینو پەنجەی لەسەر شاری (پەکین) دانا.

- بەدڵنیاییەوە وتی: لێرە! لێرە هەموان (چا )دەخۆنەوەو ناویشی ئیمپراتۆری ناوەڕاستە.. دۆزیمەوە.

- پورە (مارتا) بەحەپەساوییەوە وتی: خراپ نییە، بەلاّم ئێمە باسمان لە (ئیمپراتۆری ناوەڕاست) نەکرد، بوڵکو لەرێگای ناوەڕاست.

- (تیۆ) بەنائومێدییەوە وتی: ئیدی نازانم.

- پورە (مارتا)، کە پەنجەکانی بەناو قژیدا رۆکردبوو، گوتی: وێڵی کە، تائەم شەو کاتت بەدەستەوەیە. ئێستا کاتی فراوینو پشودانە.

## هاوسەرگیری‌و ئازادی

سەعات پێنج پورە (مارتا) بەنیازی پیاسەکردن بەبەلەم (تیۆ)ی بێدارکردەوەو بڕیاربوو بەروبارەکەدا بڕۆن تا پلیکانەکانی دەچونە سەر ماڵی (مەهانەتجی)و خواحافیزی لێبکەن.

(تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: هەروازووو؟ خۆ هێشتا پەیامەکەم نەخوێندۆتەوە!

- پورە (مارتا) بەئاوازێکی نهێنی ئامێزەوە وتی: بەڵکو روباری (گنگ) وەڵامێك بە گوێتدا بدات...

تاکسی، پاسکیل، گاوگۆتاڵ‌و رێگەگیران هاتوچۆیان دژوار دەکرد. ژنان مناڵەکانیان دوردەخستەوە تا لەرِوداوی ماتۆڕەکان بەدوریان بگرن‌و فرۆشیارەکان بە پەلەپرۆزێ چای قۆریان بەملاو بەولادا دەبرد. دواجار ریزێکی درێژو شێواو جوڵەکانی خۆی رێکخست‌و راوەستا.

- (ئەیلا) وتی: (جامبونی ترافیك – Trafic - Jam): بێگومان شاییە.
- (تیۆ) پرسی: جامبونی ترافیك چییە؟

بەزمانی ئینگلیزی رێگاگرتنە. لەراستیدا بڵێم چی... شاییە شایی. دەستەیەك مۆزیکی بەبەرگی فەرمییەوە خەریکی مۆزیك لێدانبون. لەدوایانەوە کەسێکی لاوی عەمامە بەسەر، کە سیمای بەبۆیە خاڵخاڵ وگڵۆپی ورد داپۆشرابوو، بەسەر ئەسپێکی سپییەوە بوو، ئەسپەکە بەمەخمەڵی سور داپۆشرابوو. لاوەکە گەردنبەندێکی گەورەی لەکاغەزی رەنگاوڕەنگ دروستکراوی لەملدا بوو، مناڵێکیش لەبەردەمییەوە رێی دەکرد. خزمەتکارەکان بەجلوبەرگی تایبەتییەوە بەرێوڕەسمی تەواوەوە بەتۆرچی نیۆنی بەدەستەوە بەدویەوەبون. ژنانی ساری لەبەری ئارایشتکراو بەدەم سەمای مۆزیکەوە دەرۆشتن. لەدواڕیزدا لەسەر لۆرییەك، لاوێك لەسەر پاسکیلێك بوو، کە بەگرانی پایدەری لێدەدا.

- (تیۆ) وتی: شاییە؟ ئەی بوك‌و زاوا کوان؟

(ئەیلا) وتی: لەهندستان لەم قۆناغی هاوسەرگیریەدا کەس بوك‌و زاوا نابینێت، خەڵکەکە تەنها دەتوانن روخساری زاوا لەژێر ئەو خاڵخاڵە نورانییەدا وێنابکەن، چونکە ئەو قارەمانی چەژنە، کە دەیەوێت بە رووی سپییەوە ماڵی باوان بەجێبهێڵێت.. ئەم مناڵەش بچوکترین ئەندامی خێزانەکەیتی.

ئەی ئەو گەردنبەندە چییە؟

- (ئـەيلا) وتـى: ئـەوە لـەدراوى جۆراوجـۆر چـنراوەو تەليـسمى دەوڵەمەنديـيە لەئاينـدەدا، بـەڵام ئـەو كـوڕەى لەسـەر پاسـكيلێك بـوو بـەگران پايـدەرى هەڵدەسـوڕاند ئـەوە دەزگايـەكى داينەمۆى بچوكە بۆ هەڵكردنى گڵۆپـە بـچوكە ڕەنگاوڕەنگـەكانو مەشـخەڵى نێۆنـەكان. هـەموو ئەوانەش ئاهەنگى ڕۆژى دووەمـى شـايیەكى هنديـيە، كـە هـەزاران ئاهـەنگى لـەوجۆرە لـەوەرزە گونجاوەكاندا بەرپا دەكەن.

- بوكەكە لەكوێيە؟

- بوك بەسەر شۆڕ، خاكىو شەرمەزارييەوە لەماڵى باوكى چاوەنواڕى زاوايە.

- بەبەرگى سپييەوە؟

- (ئەيلا) وتى: نەخێر. لەهندستان ڕەنگى سپى نيشانەى ماتەمگێڕييەو تەعزێبارييە. سـور ڕەنگى ژيانەو سارى تايبەتى بووكە. من سارييەكى سورى تۆخم لەبەربوو لەگەڵ زێڕو زيـوێكى زۆر بەگوێچكە، لوت، ناوچەوانو پەنجەو دەسـتو هـەموو شـوێنێكەوە!. (سـودهێد)ى هاوسـەرم عەمامەيەكى لەسەرنابوو سەغڵەتى كردبوو، چونكە ڕەواڵەتێكى سەيرى پێبەخـشيبوو... بـەڵام كاتێك كاهينەكە منو ئەوى بەپارچە قوماشێك پێكەوە گرێداو حـەوتجار بـۆ متمانـە بەخـشين بەپێكگەيشتنمان بەدەورى ميحرابدا سوڕاينەوە. هەردوكمان زۆر خرۆشابوين، دەزانيت...

- پـورە (مارتـا) قـسەكەى پێبڕىو گـوتى: وەك هـەموو بـوكو زاوايـانى جيهان، لەگـەڵ ئـەو جياوازييەى ئێوە پێشتر يەكديتان خۆشويستووە.

- (ئەيلا)، كە سوور هەڵگەڕابوو، گوتى: بەڵێ، ئێمە گەلەك چانسمان هەبوو.

- (تيـۆ) بەسەرسـوڕمانەوە وتـى: چـانس، بـۆ هاوسـەرگيرى، لەكاتێكـدا ئێـوە يەكـديتان خۆشويستووە؟ خۆ ئەوە شتێكى سروشتييە!

- (ئەيلا) هەناسەيەكى قوڵى هەڵكێشاو گوتى: لەهندسـتان هاوسـەرگيرى عاشـقانە سروشـتى نييە. بـەپێى نـەريتى بـاو دايـكو بـاوك ئاينـدەى هاوسـەرى كوڕەكـەيان هەڵدەبـژێرنو بـۆ ئـەو دەستنيـشانكردنەش چـەندين خـاڵى ديـاريكراو هەيـە، وەك: ئـاين، چـين، سـامان، پـەروەردەو فێركـارى، خوێنــدەوارى.... لەزۆركاتــدا بــوكو زاوا هــەرگيز يەكــديان نــەبينيوەو ئــەو هاوسەرگيريانەى بە عەشقو خۆشەويستى دەست پێبكات نائاساييو دەگمەنە.

- (تيـۆ) بەنەفرەتكردنـەوە وتـى: كەواتــە بــەوجۆرە بێــت لەهندســتان پيــاو ناتوانێـت هاوسەرەكەى هەڵبژێرێت!

- (ئـەيلا) وەڵاميدايـەوە: لەهندسـتانو ئـاينى هندسـتان مۆڵـەتى هـيچ جـۆرە هەڵبـژاردنێك نـەدراوەو لەبنەماشـدا وشـەى (هەڵبـژاردن) نـازانن، چـونكە هـەموو تـاكێكى هنـدى لەپێـشەوە

بەپێی چارەنوسێکی ئامادەکراو تا (دهارما - dharma) واتە ئەرکە ... دەگونجاویەکی تەزوودوە لەگەڵ سیستمی بونەوەران و جیهان بەئەنجام بگەیەنێت ئازازی و ... پیچی و هەڵبژاردن وەك سوکایەتی بەخواکان سەیر دەکرێت؛ خۆئەگەر تاکێك ویستی لە (چین)دەکەی بچێتە دەرەوە دەتوانێت پەنا بۆ ئاینێکی هندی دیکەی ببات، کە لەسەر یەکسانی مرۆڤەکان بنیاتنراون، هەرلەبەرئەوەشە، موسڵمانەکان سەر بەچینەکانی خواردوەن. چونکە هەر لەسەدەکانی رابردودا باوانیان بۆ بەدەستهێنانی کەسایەتی شیاوی خۆیان بون بەموسڵمان، کە (دە) ساڵ پاش سەربەخۆیی هندستان رابەر لەدەرەوەی (چین)ەکان یان (دورەدەستان) بزووتنەوەی پەیوەندیکردنی بەئاینی بودایی دروستکرد. بەڵام سەبارەت بەهاوسەرگیرییەکان دەبێت بوترێت، کە ئەو پێکگەیشتنە بەجۆرێك لەسەر بنچینەی دێرینی نەریت رۆنرابوو، کە هندێکجار دەوڵەت خەڵاتی دەبەخشییە هاوسەرگیرییە جیاوازەکان، جا چ لەنێوان چینەکاندا بوو بێت یان لەنێو ئاینەکاندا. خەباتی یەکسانکردنی مرۆڤەکان هێشتا کاروانێکی درێژی لەپێشە.

- (تیۆ) وەك خەون بینین وتی: سەرنج بدە هێشتا لەفەرمنسا ئەو خەباتە درێژەی هەیە.
- ئاپۆرەکە کەم ببۆوەو تەکسیەکەش خێراتر دەڕۆشت، ریزی پێشڕەوانی زاوای تێپەڕاند.

## لیژنەی دارەکان

کاتێك گەیشتنە کەناری روبارەکە خۆر ئاوابوو. هێشتا روناکییەکی کەم دەڕژایە سەر پلیکانەکان و فرۆشیارەکان خۆیان دەپێچایەوە. زەنگ و تەپڵەکان بۆ بانگی شێوان دەنگیان دەهات و زیارتکارەکانیش بەپەلە بۆ سەرەوە دەچون. بەڵەمچییەکان لەکەنار روبارەکە چاوەنوارببون. کچە لاوەکان سەبەتەی پڕ لەگوڵی سورو مۆمی بچوکیان بۆ فرۆشتن پێشکەش دەکرد. پورە (مارتا) سێ سەبەتەی بۆ خۆی و (تیۆ) و (ئەیلا) کڕی. لەکاتێکدا مۆمەکانی پێدەکرد بە(تیۆ)ی وت:

- بیگرە قرژاڵە بچکۆلەکەم. سەبەتەکە بدە بەدەم ئاوەوەو هیوابخوازە. ئەگەر لەسەر رێڕەوی روبارەکە بەبێ نغرۆبون سەرەوخوار رۆشت هیواکان دێتەدی.

(تیۆ)و (ئەیلا) سەبەتەکانیان بەدەم ئاوەکەوەدا. هەردوو سەبەتەکان لەسەر روی ئاوەکە کەوتنە خولخواردن. دودڵ بون و پاشان وەك دوو خاڵی روناك لەتاریکیدا ئاوابون.

پورە (مارتا)، کە سەبەتەکەی خۆی بەلاوە ئاوەکەوەدا، وتی: بەهیوای بەرەکەتی خوا.

هەرسێ سەبەتەکە بەسەلامەتی لەسەر ئاوەکەوە مابونەوە.

(تیۆ) هاواریکرد: هێی، من لەگەڵ (فاتۆ) هاوسەرگیری دەکەم.

بێدەنگی باڵی کێشابوو بەسەر روی ئاوە پان و پۆڕو رەشداگەڕاوەکەی بەگران لەژێر زەبری سەوڵەکاندا دەبزواو شار خەواڵو دەردەکەوت. تەنها چەند مەشخەڵێك لەدورەوە لەناو تاریکی شەودا سەمایان دەکرد.

(تیۆ) وتی: سەیرکەن، ئاگر. سەیرە! ئەو هەمووە لەپاڵ ئاوەکەدا!

دوو ژنەکە لەیەکدیان روانیو بێدەنگیان لێکرد.

(تیۆ) وتی: لەوانەیە ئەوانە لیژنە داربن! بەڵێ، دڵنیام، بۆ سوتاندنی جەستەکان.
پورە (مارتا) بەدڵێکی گوشراوەوە چاوەڕێی درێژەی قسەکان بوو، بەڵام (تیۆ) رووی وەرگێڕاو مات بوو. بەدرێژایی رێگاکە دەستی لەناو ئاوەکە هاویشت، وەك ئەوەی هیچ روینەدابێت. پاشان وتی:
پورێ گیان.. نیگەران مەبە. من دوێنێش ستونی دوکوڵە سپییەکەم بینی. ئەزانم تۆ نەتدەویست بیبینم. هەموو ئەو دوکەڵە لەلیژنە دارەکانەوە بەرزدەبێتەوە وانییە؟. باشە، نەخشەکەت وادەرنەچوو! هەروەها شتێکی گرنگیشەو وەك ئەو دیمەنانەیە کە لەفیلمەکاندا نیشان دەدرێن!.
(ئەیلا) دەستی (تیۆ)ی گوشیو (تیۆ)ش دەستی هاویشتە سەرشانیو گوتی: دەزانیت.. ئەو زۆر بەلاوازم دەبینێت، بەڵام چونکە مرۆڤ پاش مەرگی ژیانێکی دیکەی دەبێت هەرباشە..
(ئەیلا)، کە بەتوندی لەنێو ئامێزیدا دەیگوشی، گوتی: باشە، تۆ منداڵێکی نائاسایت، بەڵام تیمارکراویت!

بەلەمەکە لەتاریکیەکی تەواودا لەکەنارەکە نزیك دەبوەوە.. گەیشتن.

## (مەهانەتجی) پەیام دەدات

لەو شوێنەدا بەراستی پلەکان بەرزبون. (تیۆ) وەك بزن هەڵزناو سەرکەوتو دوو خاتونەکەش چاودێری بون.

- پورە (مارتا) بەهاوارێکی کورتەوە وتی: هێندە توند رامەکە!
- (تیۆ) لەسەرەوەی پلیکانەکانەوە بانگی کرد: بزانم من نەخۆشم یان تۆ! خێراکە پیرەژن.

پیرەژن بەزەحمەت بە پلیکانەکاندا سەرکەوتو پاش بڕینی هەر پلەیەك پشویەکیدەدا.

- بەتەنگە نەفەسییەوە وتی: وامدەزانی مەشقی یۆگام کردووە. زۆریش هەڵخەڵەتاوم.

(تیۆ) کەباڵی گرت و بەرەو سەرەوە کێشی کردو گوتی: نەهەنگێکی راستەقینەیە!

(مەهانەتجی) لەپۆشاکە سپییەکەیدا چاوەنوارڕ بوو. سپی میحرابە سپییەکە رەنگێکی شینی بەخۆوە گرتبوو. مانگیش هێواش هێواش ورشەی خۆی بەسەر روبارەکەدا دەکشاند. (مەهانەتجی) لەلێواری هەیوانەکە رۆنیشتو بانگهێشتی میوانەکانی کرد لەنزیکەوە دانیشتن. پاشان گەلەك پرسیاری لە (ئەیلا) کرد، کە (تیۆ) هیچ تێنەگەیشت، چونکە بەزمانی هندی دەدوان. (مەهامنت جی) جارجارە سەری دەلەقاندو چاوانی خۆی زیاتر دەکردەوە یان هەندێکجار قاقا پێدەکەنی. کاتێك سیمای دەدا بەیەکدا (تیۆ) تێدەگەیشت باس باسی ئەوە. سەرئەنجام (مەهانەتجی) روی لە (تیۆ) کردو دوا پرسیاری کرد.

- (ئەیلا) وتی: (مەهانەتجی) حەزدەکات بزانێت ئەمڕۆ هەست بەچی دەکەیت؟ نزای بۆ کردویت.
- (تیۆ) وەڵامیدایەوە: پێیبڵێ نزاکەی گیرابووەو من تەندروستیم باشە. جگەلەوەی هێشتا مەتەڵی پەیامەکەم نەدۆزیوەتەوە، بەڵام جگە لەوە....

(ئەیلا) وتەکانی وەرگێڕا. (مەهانەتجی) بەپێکەنینەوە پێشنیازی بۆکرد یارمەتی بدات.

- وەڵامەکە دەزانێت.
- (ئەیلا) وتی: هەڵبەتە. خودی خۆی نوسیوێتی.

- (تیۆ) هاواریکرد: ئای ... مانگا!

(مەهانەتجی) سەبارەت بەمانگا رونکردنەوەی لە (ئەیلا) خواست. لەفەرەنسیدا ئەو وشەیە ناشیرینە!. (تیۆ) بەخەجاڵەتییەوە داوای لێبوردنی کرد.

- (مەهانەتجی) قسەکەی پێبڕیو گوتی: کە چوو بوو بۆ فەرەنسا جگە لەفرۆکەخانەی (رۆیسی) شوێنێکی دیکەی نەبینیوە. لەو دیدارە کورتەدا تەنها شتێك سەرنجی راکێشاوە، کە ئەویش رەشپێستەکان بووە لەکاتی گسکداندا. پاشان یەکێك لە هاوڕێکانی بڕیاریداوە بیروڕای بگۆڕێت سەبارەت بەفەرەنساو بۆ (نۆرماندی) بانگهێشتی کردووە. (مەهانەتجی) لەو گەشتەید دیقەتی رێگاوبانی رازاوە، سەوزی چیمەنەکان، درەختی سەیرو مانگا زۆر گەورەکانی دابوو. وەك سەرەتایەك وتبوی: (کاتێکی کەم بەسەر ژیانی ئێستامدا تێپەڕیوە، بەڵام بۆ ژیانی داینەد زۆر حەزدەکەم وەك فەرەنسییەك لەدایك ببم). بەمپێیە هیچ شتێکی خراپ ناتوانێت ئەو وێنەیەی ئەو هەیەتی بۆ فەرەنسا بیرۆشێنێت.

- (تیۆ) پرسی: لەوێ چی لەهەموو شت جوانتر بوو لەلات؟

(مەهانەتجی) شکانەوەی مانگی لەسەر ئاوی روباری (گنگ) پیشانداو گوتی، باشترین دیمەن لەلای من شکانەوەی مانگ بوو لەسەر دەریای بەرامبەر بە (مۆنت سانتامیشێل)[1]، رێگای ناوەڕاست.

ئێستا کاتی رونکردنەوەی پەیامەکە بوو. (مەهانەتجی) رونیکردەوە: فەلسەفەی هندی لە هەزاران ساڵ لەمەوبەرەوە بەدوی خاڵی روبەڕوبونەوەی رۆح و رەهاوە بووە. بۆ گەیشتن بەو رەهاییە هەندێك لە فەیلەسوفان لۆژیکێکیان لەسەر شێوەی نەفیکردنی دوالیزمانە دروستکرد. کە بە (Neti .. Neti) یان (نا ... نا) ناویان بردووە، نەئەم نەئەو. نەرۆشتن و نەهاتن. نەمەرگ و نەدوبارە لەدایکبونەوە... مەشقی جەستەش دەخرێتە سەر مەشقی چاوپۆشی و بڕینی پەیوەندی، کە ئامانج رامکردنی دڕندانەی جەستەیە. رۆژێك شازادەیەك چاوی لەکۆشکەکەی خۆی پۆشیوەو بووە بەزاهیدێکی تەواو. پاشان بینی زاهیدییەکەی بۆ بەدەستهێنانی رەهایی بەس نییەو بۆیدەرکەوت زیادەڕۆیی بەهای نییەو دەبێت میانڕەویی هەڵبژێرێت.

---

[1] Mont saint- Michel: ناوچەیەکی شاخاوییە دەکەوێتە دورگەیەکی بچوکەوە، کە درێژیەکەی لەسەر شێوەی بیناسازی (گوتیك)ی دروست کراوەو زۆر بەناوبانگە، لەشوێنە گەشتیارییەکانی نۆرماندییە لەباکوری فەرەنسا.

- (تیۆ) وتی: ئەو ڕێگایە دەگرم. ئەوە (بودا)یە.

ڕاست بوو ئێستا ئەوەی مابۆوە شوێنی نیشتەجێبوون بوو.

- (تیۆ) بەهێواشی وتی: چایەکی ناسراوی جیهانی؟ من پسپۆڕێکی چام، دەبینیت. (ئەریل گری) باش نییە، ئەوە چایەکی ئینگلیزییە. (ئۆرنج بیکۆ). بەڕاستی ئایا پەیوەستە بەناوی شارێکەوە؟

لێرەدا، چونکە دەرکەوت بلیمەتی (تیۆ) کارناکات، (مەهانەتجی) بڕیاریدا ناوی ئەو شارە بدرکێنێت، کە بەباخی زۆر بەرفراوانی گەورەی (چا) دەورەدراوە. دارمیلینگ.

(تیۆ)، کە بەتوندی کێشای بەنێوچاوانیدا، وتی: ئاخ، چەند گێلم!. تەنانەت پورە (مارتا) باسی ئەو شارەی بۆکردم! کەی دەڕۆین؟

- نۆو، بەمزوانە نا، چونکە کەش ساردە.

بۆ (تیۆ)یان ڕونکردەوە، کەکەمێك لە (بنارس) دەمێنینەوەو پاشان بۆ چەند تاقیکردنەوەیەك بۆ (دلهی) دەگەڕێینەوە. لەوێوە بۆ (سیلگوری) فڕۆکە دەگرن‌و لەوێشەوە بەئۆتۆمبیل بۆ کوێستانەکان دەچن. ئێستا دەبێت خواحافیزی لە (مەهانەتجی) بکات، چونکە ئەو بۆ بەشداریکردن لەکۆنگرەی خاوێنی ڕووبارەکان هندستان بەجێدێڵێت. (مەهانەتجی)، کە کاهینێکی گەورەیە، لەژیانی دەرەوەی ئاینیدا ئەندازیاری پاككردنەوەو خاوێن ڕاگرتنی ئاوەکانە. ڕووباری (گنگ) لەجیهاندا بەئالۆدەترین ئەژمار ڕووبار دەکرێت. (مەهانەتجی) بەدرێژایی ساڵەکان وەك شێر نەڕاندویەتی لەپێناو ڕووباری پیرۆز، لەپێناو دایکی خۆی، کەهەموو ڕۆژێك لافاوی ئاوەڕۆی شاری (بنارس)ی تێدەڕژێت.

بەپێی ئەفسانەکان (گنگ) خوایەك بوو، کە لەچیاکانی (هیمالایا)وە بۆ تێرئاوکردنی دەشتە وشك‌و بەیارەکان دەڕژا، بەڵام (گنگای) لاو زۆر هەوەسباز بوو، دەیویست بەمەبەستی گەمەکردن هەموو زەوی داپۆشێت. خواکان نیگەران بون‌و بەخۆیان وت ئەم کچە هەموو شت وێران دەکات. دروست لەوکاتەدا کچۆڵە مەبەستی هەڵچون بوو (شیڤا) هاتە سەر زەوی‌و بەبازنەی پرچەکانی دەستبەندی کرد. (گنگا)ی ڕام‌و ئارام کراو بووبە بەخشندەترین دایکان.

ئیدی ئاوی (گنگا)ی خودایی بەراستی دڵسۆز بوو. میوانەکانی بروایەکی پتەویان پێیهەبوو. لەدیدی ئەوانەوە (گنگ) خودی پاکیو دڵسۆزی بوو. (مەهانەتجی) هەمیشە بەیادی هێناونەتەوە پاکوخاوێنی ئاینی تارادەیەك خاوێنی ئاو نییەو لێرەدا دوو جۆرخاوێنیمان هەیە. یەکەم خاوێنی رۆحیو ئەخلاقییە، خاوێنیو پاکی دووەم خاوێنی زانستییە. (مەهانەتجی) کاهینی گەورە پارێزەری خاوێنی (گنگا)بوو. پیاوێك بوو دانیارو بەسەختی بۆ پاکڕاگرتنی ئەو روبارە مەزنە تێکۆشاوە. لە دیدی ئەوەوە هێندە بەسبوو بۆ خاوێن راگرتنی رێڕەوی ئاوی پیسو خراپ بگۆڕنو لەو بوارەشدا خەباتی کردووە...

(تیۆ) بەدڵتەنگییەوە لەڕەنگدانەوەی ورشەی مانگی لەسەر روبارەکەی دەنواڕی. ئایا ئەو ئاوە رونە دەبێت جێگای هەزاران باکتریا بێت؟ ئایا (گنگ)ی خاوێن شتێکی جگە لەوەهم زیاتر نەبوو؟

- (مەهانەتجی) وەك ئەوەی بیرکردنەوەکانی خوێندبێتەوە وتی: مایا.. وەهم!.

پاشئەوە بۆ (تیۆ)ی رونکردەوە، کە سەرانسەری جیهان جگە لە (Maya وەهمێك). روپۆشێکی رواڵەتی شتێکی دیکە نییە. ئەوی بۆ بەرامبەر میحرابە بچوکەکە هێنا، کە لەوێدا پێڵاوە دارەکانی (تۆلسیداس)ی شاعیری گەورە دەپەرسترا. ئێستا کاتی دوایین قوربانی بوو. قوربانی شەو. راهیبێك[1] بەمەشخەڵێك بازنەیەکی ئاگری دروستدەکرد، کە روناکیان لەسەر بەردە سورەکان سەمایان دەکردو بۆ ماوەیەکی درێژ زەنگەکانی بەدەنگ هێنا. (مەهانەتجی) (تیۆ)ی بەجەستەی خۆیەوە چەسپاندو کوڕەی لاویش ئارام بووەوە. لەوانەیە روباری گەورەی (بنارس) بە پۆخڵی ئالودە بووبێت، بەڵام ئاسمانی ئەو شارە هێشتا وەك دڵی (مەهانەتجی) بەپاكو خاوێنی مابۆوە.

---

١. راهیب: پارێزگار، چاودێر، دێرنشین، ئەوکەسەی ژیان لە پەرستگادا بەسەر بەرێت و هەرخەریکی خواپەرستی بێت.

## بەشی سیانزە

## (ئبلیس و سەیروسەمەرەکان)

### لەدەشتەکانەوە بۆ بازاڕەکان

لەگەڵ نیازی رۆشتنی (مەهانەت جی) پاشماوەی کاتی مانەوەکان لە (بنارس) وەك خەونێك تێپەڕی. پورە (مارتا) بەرنامەیەکی رێکخستبوو. سەعات حەوت (چا) خواردنەوە لەسەر جێخەوەکە لەسەر نەریتی ئینگلیزی بەمەبەستی ئەوەی خەو بەریبدات. سەعات حەوتو نیو وانەی (یۆگا) لەلایەن پرۆفیسۆر (ئۆلیبریۆس). سەعات هەشتو نیو دوشێكو ناشتا کردن. سەعات نۆ پیاسەکردن بەشاردا تاپاشنیوەڕۆ. پاشان پشودان. دواسەعاتەکانی رۆژ بۆگەڕان بەبازاڕەکانی شاری (بنارس).

پاش سێ رۆژ (تیۆ) دەیتوانی قاچەکانی لەبۆشاییدا ڕابگرێت. جوڵەی (رەهابون) کاریگەری باشی تێدا دروستکردبوو. کوڕیژگەکە لەهەناسەداندا گرفتی هەبوو، بەڵام بەڕێز (کولکرنی) لەوەودوا بوو بەئەندامێکی هەمیشەیی گەشتە بەکۆمەڵەکانو چونکە زۆر شتی دەزانی سەدان چیرۆکی نائاسیی بۆ (تیۆ) گێڕایەوە. بەکۆمەڵ بۆ دەشتی سەوزی دەرەوەی شار رۆشتن تا شوێنێکی فراوانی پیرۆز بگەڕێن، کە ناوی شاری(کاشی)و ناوە راستەقینەکەی (بنارس) بوو. (کاشی روناکی - کاشی پشنگدار). کاشی شاری روناکی لەڕاستیدا دڵی سەنتەری جوگرافیای هندۆیزم بوو.. ئەرکی هەموو هندییەك بوو کۆمەڵێك قۆناغی ئەو نەخشەیە بەپێ ببڕێت، کە هەریەکەیان پەرستگایەکی تایبەت بەخۆیان هەبوو؛ لەشوێنی تایبەتی نوستنی میوانانیشدا رۆژبکاتەوە. رێگاکە پێچاوپێچو بەناو گوندی بچوکدا تێدەپەڕێ. گوندییەکان بەحەزو سەرسوڕمانەوە لەوگروپە بچوکەیان دەنواڕی، کە پێکهاتبوو لە (خاتون Mem sahib) ئەوەش ناوێکە لەلایەن هندییەکانەوە بەخاتونە ئینگلیزەکان وتراوەو کورتکراوەی وشەی ئینگلیزی

(madam)ە، کە ئەوەش لەسەر شێوەی (Maam)و (خودان - Sahib) پێکهاتوە. هەروەها خاتونێکی قەشەنگی هندیو (یۆگی)یەك بەشاڵێکی کۆنەو گۆپاڵێکەوە لەگەڵ مناڵێکی لاو بەقژی رەشی لولەوە، کە ئەگەر چاوەکانی سەوز نەدەبوو بەخوای (کریشنا) دەچوو. بەڵام گوندییەکانی (بنارس) ئاشنای هاتوچۆی خۆرئاواییەکان بون. لەهەموو شوێنێك ئەم گروپە چوار کەسییە دەچونە پەرستگاکانەوەو دەنگیان لە زەنگەکان دەهێناو لەهەموو شوێنێکیش بەرێز (کولکرنی) بەتاسەوە هەندێجار لەبەردەم (دورگا)، (شیڤا)و هەندێکجار (گانش)دا نزای دەکرد. خۆئەگەر نەیزانیایە خوای ئەو ناوچەیە کێیەو ئەو گوندە کام خواوەندی تایبەت دەپەرستن بەناچاری ستایشی خۆی رەوانەی بەرقاپییەکی نەناس دەکرد. هەندێجار پەرستگاکان لەنزیك ئەستێڵی گەورەدابونو موریدەکان دەیانتوانی هەر لەوێدا بچنە ئاوەوە. لەوئاوەدا ژنان جلوبەرگیان دەشۆریو پیاوانیش خۆیان تێهەڵدەکێشا. لەهەموو شوێنێکیش وەك روباری (گنگ) دەستەکانیان پێکەوە دەنوساندو سەرقاڵی خواپەرستی دەبون، چونکە لە هندستان هیچ روبارو ئەستێڵێك نییە کوڕی (گنگ)ی دایە گەورە نەبێت. لەلای هندیەکان ئاو. کە رەگەزێکی سەرەکیو پێویستی ژیانو خواپەرستییە، رەگەزێکە پیرۆزکراو. بەڵام ئەوەی زۆر بەلای (تیۆ)وە باشتربوو گەڕانی ناو بازاڕەکانی شاربوو. کۆڵانەکان هێندە تەسکبون کاتێك مانگایەکی شاخداری گەورە لەوێوە تێدەپەڕی رێبواران بەدەگمەن دەیانتوانی بەخۆچەسپکردن بەدیوارەکەوە لەزیانی ئەو شاخانە رزگاریان ببێت. (تیۆ) مانگاکانی بەسەرمڕۆو خۆپەرست دادەناو کردبوی بەخو ئەویش وەك مناڵە هندییەکان لەپشتەوە لەپە دەستێك بدات بەلاشیپانەی مانگاکەدا، کە هیچ کاریگەری نەبوو. (تیۆ) لەدوکانێك نقێمێکی درەوشاوەی بچوکی بۆ لوتەوانە بۆ دایکی کڕی. پورە (مارتا) خۆی گەیاندە دوکانی ئاوریشم فرۆشێك، کە زۆری حەزپێدەکرد. فرۆشیار بەدەستکارییەوە تاقی ئاوریشمەکانی ناو هۆڵەکەی دەکردەوەو جۆرێك خواردنەوەی بەناوی (لاسی - Lassi) لەجامی فەخفوریدا بەکڕیاران پێشکەش دەکرد. کە بریتی بوو لەماستی شلکراوە لەناو ئاودا (دۆ). لەلای (تیۆ) هەموو ئەو دیمەنانە سەرنج راکێشبون و لەوانەش سەرنجراکێشتر پۆستەری خواکان بوو.

خواکانی هندستان لێو بەخەندە، تەندروست، باشو خۆشحاڵ و بەچاو ی درەوشاوەی رەشەوە لەبینەرەکانی دەنواڕی. (تیۆ) دەستیکرد بەکۆکردنەوەی پۆستەرەکانو سەرەتا لە(فیل-خواوەند)ە خۆشەویستەکەیەوە دەستیپێکرد. پاشان چوە سەر (شیڤا) خواوەندی پێست شین. کە لەپشتی سەرییەوە کەلەی بچوكو جوانی (گنگا) بوو، کە لەدەمییەوە ئاو هەڵدەقوڵی.

پۆستەرەکانی دیکەی (شیڤا) بەتورەییەوە رمێکی سێپەلی هەڵدەسوڕاند، هەروەها شێوەکانی باری رامان و خەڵوەتی بەچاوانی داخراوەوە لە قوڵایی هیمالایای بەفرگرتودا پیشاندەدا. تەنانەت پۆستەرێکی (شیڤا)ی زۆر سەیر دەبینرا، کە نیوەی جەستەی پیاو و نیوەکەی دیکەی ژن بوو. (کۆڵکرنی) رونیکردەوە کە خوای گەورە، کە هەم پیاوەو هەم ژنە، لەرێگەی ئەو وێنەیەوە دەیەوێت رەگەزی جیاواز دیاریبکات، کە هەم لەژن و هەم لەپیاویشدا هەیە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: کەواتە منیش لەناو خۆمدا هەلگری رەگەزی ژنم؟ نازانم لەکوێدایە.

- پورە (مارتا) وەبیریهێنایەوە: ئایا لەلۆکسۆر پێشئەوەی بکەویتە سەماکردن شێخە بە (دەستگیران) بانگی نەدەکردی، کە بەواتای کچ دێت؟

- (تیۆ) بەوریاییەوە کەمێك نیگەران بوو: چونکە دروست لەو کاتەدابوو جمکەکەی لەژێرخاکدا بوو دەرکەوت.

ئێستا زەنگەکان لەسەرانسەری شاردا لێدەدران ئاسمانی (بنارس) لەژێر تیشکێکی پرتەقاڵیدا روەو تاریکبون دەڕۆشت و باڵندەکان بەخوێندن وەڵامی بانگهێشتی شەویان دەدایەوە. دەنگێکی نەناس و شیرین بەگوێی (تیۆ)یدا چرپاند: (من لێرەم، برا بچوکەکەم، بەجێتناهێڵم...)

- پورە (مارتا) وتی: تیۆ... لەجیهانی خەونەکاندایت؟

بەڵێ، خەونی دەبینی. بۆ یەکەمینجار (تیۆ) لەخۆی پرسی، ئایا ئەو جمکەی لەبەزمورەزمەکەی سەماکەیدا لەمیسر لەپڕ پەیدابوو کچ نەبوو. ئینجا چاوی کەوتە سەرپۆستەرێکی دیکە: لەم پۆستەرەدا (شیڤا) لەلایەك لەپاڵ (گانش)و لەلایەکی دیەوە لەپاڵ لاوێکی زۆر قەشەنگدا وەستابوو، کە نێزەیەکی بەدەستەوە بوو.

وتی: سەیرە، وێنەیەکی نوێ، ئەمە کێیە؟

## دوو پاسەوانى دەرگا

چونکە روداوەکە دورودرێژ بوو بەڕێز (کۆڵکرنی) لەسەر زدوییەکە رۆنیشت وگوتی:

ئەو لاوە ناوی (سکاندا)یەو کوڕی (شیڤا)یە. ئەو کوڕەی کە(شیڤا) نەیدەویست. رۆژێ کەخواکان بۆ سەرکەوتن بەسەر شەیتانەکاندا پێویستیان بەکەسانی جەنگاوەر بوو، گەڕانەوە بۆ لای (شیڤا)و داوایان لێکرد منالێك دروست بکات. (شیڤا) پەسەندی کردو لەگەڵ (پەرڤاتی) جوتیگرت، بەڵام چونکە زاهیدو مەشقکار بوو هەزاران ساڵ لەگەڵ (پەرڤاتی) ژیاو نەیتوانی منالێك بخاتەوە.

(تیۆ) وتی: تێناگەم، هەزاران ساڵ لەپاڵیدا ژیا؟ بابەتەکە چییە؟

- چونکە (کۆڵکرنی) بەسەختی کەوتە کۆکین، پورە (مارتا) بەپەلە کەوتە فریایو گوتی. مەشق دیدەکان دەتوانن شڵەی ژیان تا مێشك ببەنو هەزاران ساڵ لەپاڵ ژنداین بەبێئەوەی منال بخەنەوە. (تیۆ) دووبارە هیچ حاڵی نەبوو. (ئەیلا)، کە سوور ببۆوە، وتی: واتە دەتوانن خۆیان بپارێزن.

- پورە (مارتا) درێژەیپێدا: سەرئەنجام خواکان تورەبونو داوایان لە (شیڤا) کرد بەرەڤتارەکانیدا بچێتەوە. کەواتە (تۆوە)کەی (شیڤا) کەوتە ئاگرەوە، ئاگر بەئاوی بەخشی، ئاو بە نزارەکانو لەکۆتاییدا منالێك بەناوی (سکاندا) هاتە جیهانەوە، کە بەواتای (هەڵچونی تۆو)دێت. لەڕاستیدا (یۆگی)یەکە وەك مرۆڤێك، کە عاشقی خوای (گنگا)یە چیرۆکێکی کورتتری پێباش بوو؛ بەو واتایەی (شیڤا)ی خواوەند کاتێك (گنگا)ی جوانی بینی، کە بەئاسماندا تێپەڕێ هێندە دڵی پێیداچوو تۆوەکەی خۆی کردە روبارەکەوەو (سکاندا) لەوێدا لەدایکبوو هەرچۆنێك بێت (شیڤا) دوو منالی لێبوو: گانشی قەڵەوو سکاندای جوان.

- (تیۆ) پرسی: سەبارەت بەگانش چەند ریوایەتێك هەیە؟

- زۆر زۆر! بەتایبەتی کە ئەم (فیل – خواوەندە) گەلەك گەشتی کردوە. لەچینو تبت لەشێوەو روخساری منالێکی ورگ هەڵماسیوە لەبەرگێکی سوردا، چەکدار بەنێزە سێ پەلەکەی (شیڤا) وەك خواوەندی چێشتلێنان دەرکەوتوە. لەژاپۆنیش وەك هندستان خوای خۆشبەختییە. سەرەڕای ئەوەش خوای سامانو وەك پیاوێکی قەڵەوی کورتەبنە پیشان دەدرێت، کە لەسەر دوو فەردە برنج وەستاوە. بەڵام (گانش) هەمیشە قەراوڵو پاسەوانی دەرگایەکە: پاسەوانی دەرگای (پەرڤاتی) دایکی، دەرگای پەرستگاکان یان موتبەق. لەودیو

دەرگاکەوە (سکاندا)ش پاسەوانە. هەموو دەرگاکان دوو پاسەوانی هەیە: (سکاندا)ی لاو، کە لەتۆوی باوکی دروستبوەو (گانش)ی ورگە، کە لەعیشقی دایکی دروستبوە. یەکێك لەئاگری باوکی هاتۆتە دەرەوەو ئەوی دیکە لەئاوی دایکی.

- پورە (مارتا) چووە ناو پاسەکەوەو گوتی: ئێستا ئێمە تارادەیەك لە (چین)ین. لەو وڵاتەدا دوو بنەما سیستمی بونەوەران بەڕێوە دەبەن: (یانگ)، کە خۆرەو نێرە، (پین) کە سێبەرەو مێیە. خۆت دەیبینیت.

- (تیۆ) بەشێوەی پاڕانەوە وتی: چیرۆکێکی دیکەی گانش بگێڕەوە.

- بۆ نمونە چیرۆکی ددانەکانی، کە لەجیاتی دوو یەك دانی عاجی زیاتری نییە. هەڵبەتە بەپێی باوترین ریوایەتەکان (گانش) ئەو عاجەی هەڵکەندوە تا بەیەکەمین نوسەری ببەخشێت‌و بەوجۆرەش بوو بەخواوەندی نوسەرو ئەدیبان. بەڵام بەپێی چیرۆکێکی دیکە، رۆژێکیان (گانش) بەسەر پشتی مشکەکەیەوە غارغارێنی کردوە لەرێگا روبەڕوی مارێك بۆتەوەو مشکەکە تۆقیوەو (گانش) کەوتۆتە خوارەوە؛ ورگی تەقیوەو ئەو شیرینی‌و ئاوی نەباتانەی خواردویەتی رژاوەتە سەر خاك. (فیل – خواوەند) بۆ ئەوەی ئەوشتانە بەهەدەر نەچن مارەکەی کردوە بەپشتێن. بەرێز مانگ (چونکە لەهندستان مانگ خواوەندبووە) کەوتۆتە پێکەنین. (گانش) کە لەپێکەنینەکەی توڕەبووە دانە عاجێکی خۆی دەرهێناوەو گرتویەتییە مانگ‌و ئەویش رەشداگەڕاوەو بزربووە. لەوەو دوا ئیدی مانگ وەك خولی مانگانە بۆر دەبێت.

- (ئەیلا) بەواق ورماویەوە وتی: ئەم ئەفسانەیەم نەدەزانی.

- شەوێکی دیکەیان کاتێك (تیۆ) لەبەردەم پۆستەری (ڤیشنا)ی خواوەندا وەستابوو بەرێز (کۆلکرنی) باسی ئەوەی کرد، کە بۆچی ئەو خواوەندە لەسەر زەریا نوستوەو مارێکی گەورەش چاودێرو پاسەوانێتی. پرسەکە ئەوەبوو لەسەرەتای زەمانەوە ئاگرێکی ترسناك زەمین، دۆزەخ‌و ئاسمانی گرتودو ئەوەش یەکەمین قوربانییە. پاشان هەورەکان لەسەر یەك کەڵەکەبون‌و باران سەرانسەری جیهانی گرتووە. ئیدی (ڤیشنۆ) بووە بەپارێزەرو چاودێری هەموو ئافەریدەکانی جیهان، کە لەگڵ‌و ئاسن دروستبون‌و بۆ جیهانی ژیان دەگەڕانەوە. (ڤیشنۆ) بۆ هەمیشە لەسەر زەریای بونەوەراندا خەوت. (کۆلکرنی) گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە: ئەو زەریایە شیرە.

(تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: دەریایەك شیر. دەبێت هەواڵ بۆ کۆمپانیای نەستەلە بنێرین!

- پورە (مارتا) وتی: جۆری ئەم شیرە، شیری (ئەفرێنراوە).

- (تیۆ) وتی: کەواتە نقیشکە.

- نقیشك نا، چونکە لەهندستان نقیشکێکیان دەخوارد بەناوی (گهێ - ghce)، کە جۆرێکی نایاب بووە و لەپێنج جار کولاندنەوەی نقیشك بەدەستهاتووە تا لەئاساییەکە جیایبکەنەوە. (گهێ) نایاب رۆنێکی پیرۆز بوو، کە لەجەستەی ئەو مردوانە دەدرا کە دەیانسوتاندن.

- (تیۆ) وتی: (کۆلکرنی).. سەرگوریشتەیەکی سەیرە... باشە ئەی ئەو مارە گەورەیە؟

- مار؟ ئەو مارە پەیوەستە بەئیمپراتۆری فراوانی (ناگا)کانەوە، کە دەکەوێتە ژێر ئاوەکان. هەر لەبەرئەوەشە دەبێت خۆڵەمێشی مردوەکان بکرێتەوە ناو روبارو هەروەها مشتێکی بکرێتە روباری (گنگ)ەوە: بەو جۆرە جەستەیان جارێك دەبێتە قوربانی ئاگرو جارێکی دیکەش قوربانی ئاو. بەپێی نەریت قوربانییەکی بەمجۆرە پێشکەش بکرێت خودی جەستە لەواتای راستەقینەیدابووە.

- (تیۆ) بەهێواشی وتی: زۆر باشە. جەستە وەك کەباب بەرۆنی لەنقیشك دەرهێنراو دەهەنون و دەیبرژێنن، بەلام دواجار من لەو بڕوایەدام بۆگەنکردنی لەژێر خاکدا شێوازێکی گونجاوترە.

- بەڕێز (کۆلکرنی) گرژبوو، رونیکردەوە، کە ئەوەی بەسەر جەستەی مرۆڤدا دێت هیچ پەیوەندییەکی بەرۆحی جاویدو نەمردنییەوە نییەو پیشەی ئەوەیە رۆح فێربکات تا باشتر جەستە بۆ مەرگ ئامادە بێت.

- پورە (مارتا) کەهەستی کرد گفتوگۆکە بەرەو لادان دەچێت، وتی : کاتی ئەوە هاتووە هندۆیزم بەئەفسانە پڕ لەسەیرو سەمەرەکانی بسپێرین و بەرەو (بودا) بگەڕێینەوە، کە هیچ پەیوەندی بەو وێناکردنەوانە نییە.

## ئەفسانەی خرۆشێنەری بودا

رۆژی دواتر بۆ (سارنات)ی چەند کیلۆمەتری دوور لەشار رۆشتن. چونکە لەوێدا شوێنێك هەبوو بەناوی (پارکی ئاسکان)و، کە (بودا) یەکەمین ئامۆژگاری خۆی تێدا راگەیاندبوو بۆ یەکەمینجار (بازنەی یاسا)ی خستبووە گەڕ: بازنەی (دارما-Dharma).

پارکەکە، باخێکی فراوانی رازاوە بوو بە درەختی گەورەوە، کە کەمێك دوورتر لە وێرانەکان تەلارێکی بازنەیی لەخشتی سورکراوە دروستکرابوو. (تیۆ) لەژێر سێبەرێکدا رۆنیشتو تا رادەی سەرگێژبوون بیری لەوە کردەوە، کە چۆن دەتوانرێت لەو دیمەنە ئارامەدا وێنای (بودا) بکرێت؟

پورە (مارتا) بەوردەکارییەوە رونیکردەوە، کە (بازنە)ی سمبولو روخساری سەرەکی (بودایزم) (بودایی گەرایی)بوەو ئاماژەی بازنەی هەتاهەتایی لەدایکبوونو دونادونەکان (تناسخ) دەبوو لەو بازنەیە دەربچێت تا بەئارامی نەمری بکات. دەکرێت ئەو بازنەیە لەنێو ئالای هندستانی مۆدێرنو ئەمرۆدا ببینرێت، کە یادێکە بۆ یەکەمین پاشای (بودایی) یەکخەری سەرانسەری هندستان، کە ئەویش ئیمپراتۆر (ئاشوکا) بووە. پاشان پورە (مارتا) ئاماژەی بۆ تەلارێکی مەزن کرد لەنێو درەختانی سەد ساڵەی پارکەکەو گوتی: ئەوە یەکەمین (ستۆپا – تەلاری یادی بودا)یە، کە پاشماوەی ئێسقانەکانی (بودا)ی لەخۆگرتوە. (ستۆپا)کان هەمویان پاشماوەی چەند ئێسپقانێکی (بودا) یان جێگرەکانیان لەخۆگرتووە. (تیۆ) باوێشکێکیدا. پورە (مارتا) کەوتە ئەژمارکردنی ناوە جیاوازەکانی کوڕی سوڵتان (شودودانا)(ئاناکۆرت) شاژنە (مایا)(ئاناکۆرت) گوتی: ئەو کوڕە بەناوی (سیدهارتا) لەدایکبووە، کە بەواتای (ئەو کەسەی بەئامانج گەیشت) دێت، کەوانچییەکی لێهاتوو بوو، ناوی بۆ (گۆتاما) گۆڕا، بەناوی خەندانەکەیەوە (شاکیا)کان، پاشان بوو بە (شاکیامونی)، واتە زاهیدێك لەخەندانی (شاکیاکان)و سەرئەنجام (بودا) کە بەواتای (بێداربوون)ە. (تیۆ) خەریك بوو خەو دەیبردەوە. پورە (مارتا) بە پەرۆشییەوە وتی:

- ئەگەر سەرنج راکێش نییە لەلات بیڵێ!

- (تیۆ) بەشەرمەوە وتی: زۆرباشە، نۆرەی تۆیە گورو جی.

- (یۆگی) شارەزایانە بەگوێیکردو کەوتە دواندن. باسی لەوەکرد، کە شازادە (سیدهارتا) لە (کاپیلاڤاستۆ) لە شازادەنشینێکی بچوکی باکوری خۆرهەڵاتی هندستان بوو. لەوانەیە لەکۆتایی بەهار یان هاوینی ساڵی (٥٨٨ پ. ز) لەدایك بووبێتو نزیکەی هەشتا ساڵ دوای ئەوە لەجیهان دەرچووە. لەشانزە ساڵیدا ژنی هێناوەو لە بیستو نۆ ساڵیدا کۆشکی باوکی بەجێهێشتوەو لە ساڵی (٥٢٣)و لەوانەیە لە (٥١٧)دا بە (بێداری) گەیشتبێت....

- (تیۆ) لەسەرخۆ وتی: حەوسەڵەی ئەو رونکردنەوانەم نەما. (کۆلکرنی).. (٥١٧) یان (٥٢٣) بۆمن جیاوازی هەیە؟ لای کێ سەرنجڕاکێشە؟ بۆ مشکی کتێبخانەکان باشە، کە هەمیشە لەناو کتێبەکاندا هاتوچۆ دەکەن! ئەگەر ئەو مشکانە بۆ سواربونی (گانش) باش بونایە شتێکی دی بوو!

- درێژەی بە ئەفسانەکەداو گوتی: ئەو کەسە بوو بە (بودا) دایكو باوکی هەڵبژاردو وەك فیلێکی سپی کەوتۆتە بەرپێی راستی دایکی.

- پورە (مارتا) وتی: نەخێر، بەو جۆرە نییە. ئەگەر بەراستی شاژنە (مایا) بونی هەبێت، کە هێندە دڵنیایی لەو بارەیەوە نییە، ئەو روداوەی لەخەوندا بینیوە. واتە لە خەونیدا بینیوێتی. کە (بودا) لەسەر شێوەی فیلێکی سپی کەوتۆتە بەرپێی و هەر ئەوەندەو بەس.

- (تیۆ) وتی: ششش...

- سەرەڕای ئەوە (بودا) لەپزدانی دایکیدا گەورە نەبووە، بەڵکو لەسندوقێکی پیرۆزی لەبەردی گرانبەهادا. (بودا) لەرێگای سروشتییەوە لەدایك نەبوو، بەڵکو لەهەمان ئەو شوێنەوە بوو، کە چۆتە ناو جەستەی دایکییەوە. هەر لەگەڵ لەدایك بونیشدا وەك شێر نەڕاندویەتیو بەدەنگی بەرزو گەورە رایگەیاندووە وەك باشترین منالی جیهان هاتووەو منالی جیهانەو ئەم لەدایکبونە دواین لەدایکبوونە.

- پورە (مارتا) قسەکەی بە (یۆگی)یەکە بڕیو گوتی: پێکەنیناوییە. نەڕاندن وەك شێر؟ ئەو بابەتە دژ بەئاینەکەی خودی ئەوە.

- (تیۆ) هاواریکرد: تۆ بێدەنگبە! ئەم چیرۆکە زۆر لەریزکردنی ناوەکانی تۆ باستکرد خۆشترە!

- (یۆگی)یەکە بەردەوامبوو: کاتێك (بودا)ی ئایندە بۆ یەکەمجار بۆ پەرستگاچوو پیرۆزکراوانی خواوەند لەبەری هەستانو گەورەییان نواند. کەسێکی نێرینە، کە لە(هیمالایا)وە بۆ ئەوێ فڕیبوو تکای کرد ئەو منالە نائاساییە ببینێت. کاتێك چاوی پێبکەوێت لەئامێزی گرتو ماچی کرد، چونکە دەیزانی هێندە نازی تاسود لەزانیارییەکانی ئەو ئەفرێنراوە خوداییە وەرگرێت و کەوتە گریان. کاتێك پاشا پرسیاری لێکرد، کە ئایا کوڕەکەشی وەکو ئەو دەبێتە پاشایەکی مەزن، کابرای پیرە وەڵامیدایەوە، کە کوڕەکەی دەبێتە هیواو مامۆستای جیهان. حەوت رۆژ پاش لەدایکبونی (بودا) شاژنە (مایا) مرد. ئەوجا باوکی (بودا) بڕیاریدا کوڕەکە گەورەبکاتو بیکاتە پاشایەکی مەزن؛ لەناو خۆشییەکانی کۆشکدا زیندانی کرد. شازادەی لاو لەگەڵ دوو شاژندا هاوسەرگیری کردو منالێکی بوو. لەتەمەنی بیستو نۆ ساڵیدا

بەیاریدەی خوایانی هوشیارو چاودێر لە کۆشك دەربەڕیو لە کۆڵانەکانی شاردا نەخۆشێك، پیرەپیاوێكو مردوویەکی بینی..

- (تیۆ) وتی: سەیرە، کەواتە بەو جۆرە بوو. پورە (مارتا) تۆ پرسی مردوەکەت لەیاد نەبوو.

- ئینجا لەسەر ڕێگاکەی راهیبێکی بینیبوو، کە روخسارێکی ئارامی هەبوو. شازادە تێگەیشت، کە لەناو چوار دیواری کۆشکی رازاوەدا لەجەوهەری ژیان، کە ئازارو بێبەشییە بێئاگابووە، بەڵام دەتوانێت لەرێگای رامانو خەڵوەتەوە بەسەر ئازاردا بالادەست بێتو بەئارامی بگات. پاشئەوەی شەوداهات ژنو منالەکەی بەجێهێشتو هەڵات. لێرەدا ئەفسانەی لەدایکبونی (بودا) کۆتایی دێت.

- (تیۆ) وتی: وەك عیسا؟ لێرەشدا باوك بونی نییە، چونکە بەپەرەجویەك لەداوێنەوە دەچێتە جەستەی دایکەوە، دوبارە وەك عیسا (موغ)ێك بەبەرگێکی دیکەوە لەرێگایەکی دورەوە لە (هیمالایا)وە بەفڕین بۆ دیدەنی دێت. هەردوو وێکدەچن.

- بەڵام پاشئەوە ئیدی هیچ لێکچونێك لەنێوانیاندا نامێنێت. شازادە، کە پشتی لەژیانی ئەم جیهانە کردبوو، دەستیکرد بەجۆرە مەشقێك کەلەو سەردەمەدا باوی بوو: بەدرێژایی یەك ساڵ بوو بە (یۆگی). پاش شەش ساڵ گۆشەگیری دەستیدایە رۆژوگرتنی دورودرێژو تائەوەی ئیدی هیچ خواردنێکی نەدەخوارد. یەکپارچە ئێسقان بوو. گری زوهدو وەرزش بەجۆرێك سوتاندبوی زیاتر لەتەمو سێبەر دەچوو. لەوکاتەدا روداوێك رویدا: بەو واتایەی بودا لەبێهودەیی خۆ سپاردن بەمەرگ بەئاگا هاتەوەو بەپەسەند کردنی برنجی کوڵاوی ژنێك، کە پێشکەشی کرد، کۆتایی بەرۆژووە بێکۆتاکەی هێنا. ئەوکارە هێندە گۆڕانێکی گەورەبوو، کە یەکەمین کەس لە موریدەکانی دوچاری سەراسیمەگی بون؛ چونکە هیچ تێنەگەیشتنو وازیان لێهێنا. لەدیدی ئەوانەوە وازهێنانی (بودا) لەمەشق مەحاڵ بوو.

بەڵام وەك ئەوەی شازادەی تەرکی جیهان پێشتر وتبوی هەموو چێژەکانی ناسیوە، لەناویاندا خۆشگوزەرانی، ژنان، باوك بون، یۆگاو مەشق. ئێستا دەتوانێت بچێتە جیهانی رامانو خەڵوەتەوە. ئیدی لەژێر سەیوانێکی گەورەدا رۆنیشتو چاوەڕێی بارێکی دەکرد، کە لەوکاتەدا بە (بێداری) ناودەبرا. لەودەمەدا چاوەڕوان بوو (مەرگ) لەبەرگی شەیتانو دێودا بێتە دیداریو دوچاری وەسوەسەهات، بەڵام هەروا مایەوە. پاشان عەشق لەشێوەی ژنانی روتدا هاتنە بەردەمیو هەربەرگری نواند. لەراستیدا لەهەردوو بارەکەدا ئەوە ( مارا – خواوەند) بوو، کە هەم لەبەرگی مردنو هەم عیشقدا شکستی هێنابوو، کە بەناچاری لەسپێدەدا

پاشەکشەی کردبوو. (بودا) لەیەکەمین شەودا لەگەڵ ڕۆحی خۆیدا هەموو جیهان تەی کرد. لەدووەمین شەودا بیری لەژیانی پێشینەکانی خۆیو ژیانەکانی پێشوی هەموو بونەوەران کردبۆوە. لەشەوی سێیەمدا فێربوو چۆن بازنەکانی لەدایکبونەکانو دوبارەبوونەوەی بوەستێنێت. لەسپێدەدا بێدار ببۆوە. پاشان (بودا) موریدەکانی بەدەست هێنایەوەو بۆ (سەرنات) بانگهێشتی کردنو بەردو ئەم پارکە ڕێنوێنی کردنو لەسەر بنەمای هاودەردیو میهرەبانی ئاینەکەی خۆی ڕۆنا.

بەڕێز (کۆلکرنی) لێرەدا بەدڵنیاییەوە چەمییەوەو کۆتایی بەچیرۆکەکەی هێنا.

## پورە (مارتا) دەستدەداتە فێربونی بودایزم

- پورە (مارتا) بەبیریهێنایەوە: سەبارەت بەئاینی (تیۆری) بودا ڕونکردنەوەی پێویست باسنەکرا.

(ئەیلا) وتی: بۆچی! ئەوە حەقیقەت بوو.

پورە (مارتا) لەبارێکدا چاوی لەدۆستە هندییەکانی بڕیبوو بەهێواشی دژ بەو لێکدانەوە سادەو کورتە هەستایە سەرپێو گوتی (بودا) فەلسەفەیەکی ڕاستەقینەی بۆ جیهان هێنا، کە هیچ پەیوەندییەکی بەئاینی خواکانو شەتانەکانەوە نییە. نەخێر، ئەوەی (بودا) لەگەڵ زۆر شتی دیکەدا دۆزییەوە (چوار ڕاستی گرانبەها)کەی ئەوە، کە تا ڕاستەقینەتر لەستانەیە کە خستویانەتە ڕوو. پاشان ڕووی لە (تیۆ) کردو گوتی: تیۆ باش گوێڕادێرە. زۆر سادەیە: ڕاستی یەکەم ئەوەیە کە هەموو شتێك ڕەنج وئازارە.

- (تیۆ) وتی: هیوادارم کە دوورودرێژ نەبێت، تێگەیشتم. پاشان؟

ڕاستی دووەم ئەوەیە ڕیشەو بنەمای ڕەنج وئازار لەئارەزووی خۆپەرستیدایە، کە (بودا) بە(تینوی خویبون) ناوی دەبات؛ تەنانەت ئارەزوش بۆ باری خەڵوەتیش جۆرێکە لەوە.

- (تیۆ) وتی: زۆرباشە، چۆن دەکرێت لەوە دەربچێت؟

لەڕێگای ڕاستی سێیەمەوە. لەپێناوی لەناوبردنی ئازاری ناپایەدارو ناهەمیشەیی بوندا دەبێت بە (نیرڤانا) بگەیت. بەو شتەی پێیدەوترێت (نێرڤانا)و ڕاستی چوارەم وەسفی ڕێگاکانی چۆنییەتی گەیشتن بە (نیرڤانا)دەکات.

- (تیۆ) بەسکاڵاکردنەوە وتی: دەباشە، ڕونیبکەرەوە.

زۆرباشە، ئەم ڕێگایە هەمان (ڕێگای ناوەڕاستە). خۆلادان لەگەیشتن بەبەختیاری لەڕێگەی جێژخوازییەوە، گەڕان بەدوای بەخشندەیی لەڕێگای وەرزشەوە. واتە دەبێت دیدێکی دروستت هەبێت، دروست لەناوەڕاستدا. لێرەوە ڕێگای گەیشتن بەحیکمەت مەیسەردەبێتو لەم قۆناغەدایە میهرەبانیو سۆزداری دەگات نەك تەنها بەرامبەر بەخەلکی، بەلکو بۆ هەموو بونەوەرێکی زیندوو. چونکە کۆی هەموو شتەکانی جیهان ناهەمیشەییە؛ کاتێك دێت تەنانەت هۆشمەندییەکانیش لەنێو دەچن. کەواتە ئیدی (خود) بونی نییەو خۆپەرستی ناتوانێت جێگایەك بگرێت. بەلام مرۆڤ لەژیانێکی دیکەدا یان لەئاسمانێکی دیکەدا بە(نیرڤانا) ناگات، بەلکو ئەو پێگەیشتنە لێرەدایە، لە ئێستادا.

- (تیۆ) بەهێمنی وتی: (نیرڤانا) ناوی گروپێکی مۆزیکی (ڕاك)ە. جگە لەوەش هیچی دیکە لەو وشەیە تێناگەم.

- پورە (مارتا) وتی: بۆتۆی ڕوندەکەمەوە. ئەو کەسەی بەدوای ڕێگاکانی (بودا)دا دەڕوات، کاتێك لەباری ڕامانو دۆزینەوە دەردەچێت دەتوانێت بلێت: (ئای... نیرڤانا! وێرانی! ئارامی، چەند ڕێچکەو ڕێبازێکی نائاسایت!)، چونکە (بودا) بەتەواوی باس لە(وێرانکردنی مال) دەکات. دیارە مەبەست لەوێرانکردن بەبلدۆزەر نییە، بەلکو خۆجیاکردنەوە لەمالو وێرانکردنی کرۆکی پارێزەرەکەییەتی و مالیش وەکو جەستە ناپایەدارە. لێرەدا (بودا) شتێکی نوێی نڤار نەکردوە. لەڕاستیدا لەئایینی هندۆیزمدا بونەوەران لە (کۆسمۆس)، لەشی مرۆڤو مال، هەرسێکیان پەیڕەوی یەك سیستمی جیهان دەکەنو ئەو سیستمەش هەرلەسەرەتای لەدایکبونەوە بۆ تاك کراوەتە چارەنوس. (گورو جی) بەمجۆرە نییە؟

- (یۆگی) وەلامیدایەوە: بەلێ وایە.

- پاشان (بودا) دەلێت، سیستم بەندی بەسە. ئەگەر مرۆڤ بتوانێت بەقۆناغی وێرانکردن بگاتو بەوێناکردنی مال، جەستەو بونەوەران بگات ئیدی (تابو)کان یان پیرۆزکراوە کۆنەکانی هندۆیزمیش، وەك ڕژێمی کاستەکانو بڕیارە کۆمەلایەتییەکانی لەوەوە سەرچاوە دەگرن لەناوبچن. وانییە (گورو جی)؟

بەرێز (کۆلکرنی)، کە بەرهەمان بوو، بەبێ دەربڕینی نارەزایەتی پەسەندی کرد.

- ئینجا دوایئەوە هەموو خەلك بەئارامیو بەرزی دەگەن. هەموو خەلکی، نەك تەنیا چینە باشەکان، دەتوانن لەئازارو بێبەشبون ڕەها ببن. تێگەیشتی؟

- (تیۆ) وتی: وابزانم بەڵێ. بەگشتی (بودا) لەتەك (هندۆیزم)دا هەمان کاری کردوە، کە (عیسا) لەگەڵ ئاینی جولەکەدا کردویەتی، بەهەموو جیهاندا پەخشی کردوە.

- پورە (مارتا) هاواریکرد: ئافەرین، پێکانت جوت کردو راستەوخۆ بازتدا بەسەر (فەلسەفەی ناپایەداری)دا، بەڵام دیدێکی خراپیش نەبوو.

- (ئەیلا) وتی: تۆ هیچت سەبارەت بەخەندەلێوییەکەی (بودا) نەدرکاند.

پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: بابڕۆین بەچاوی خۆمان ئەو خەندە بەناوبانگە ببینین... واباشترە.

- لەدەرەوەی باخچەکە، لەمۆزەخانەیەکی بچوکدا پەیکەرێکی (بودا) لەباری (رامان)دا دەبینرا. خەندە نهێنیئامێزو ئارامەکەی لەرونکردنەوەکانی پورە (مارتا) زیاتر لەگەڵ بینەردا دەدوا. (تیۆ) دەستی لەدوو قاچە بەردینە لوسەکەیداو لەخۆی پرسی مرۆڤ چۆن دەتوانێت ئەو تینوێتییە بشکێنێت، کە ئەم بەنوێنەری ژیانی دادەنا. بەشەرمەوە وتی: ئایا ئێستا دەتوانین نان بخۆین. من برسیمە.

- پورە (مارتا) وتی: بۆ کەس باسی رۆژوگرتنی کردوە؟. وەرزشێکی بێمەبەست بونی نییە!. ئارەزوو دەکەیت بۆ کوێ بچیت؟

## مزگەوتی ئیمپراتۆرییەتی تۆقێنەر

ئینجا دوا رۆژی مانەوە لە (بنارس) گەیشت. پورە (مارتا) وتی: نابێت سەردانی مزگەوتی گەورەی شار لەیاد بکەین. چونکە لەوانەیە لەیاد دەرچوبێت، کە (بنارس) لەچەرخە کۆنەکاندا سەرەڕێیەکی گەورەی بازرگانی بوەو موسڵمانەکانی ئەم شارە پێکهاتەیەکی گرنگی کۆمەڵگان و ئەو مزگەوتەشی، کە بەسەر ئەم شارە پیرۆزەدا دەڕوانێت، بۆ خۆی مێژویەکی هەیە.

مزگەوتێکی فراوان بەرەنگێکی خاکی پڕشکۆوە لەسەرو پەرستگاکانی (گنگ)ـەوە بوو، بەڵام نەدەبوو لێینزیك بکەویتەوە. بەردەم دەرگای مزگەوتەکە بەئاستەنگ تەنرابوو.

(ئەیلا) بەسەرسەڕمانەوە وتی: دەبێت لەترسی هێرشی هندۆسە توندڕەوەکان بێت؛ دەیانویست مزگەوتەکە وێرانبکەن.

- پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: وەك ئەوەی لەساڵی (١٩٩٢)دا دژ بەمزگەوتی (ئەیودییە) کردیان! جیاوازکارییەکە!

- (تیۆ) پرسی: بۆچی دەیانەوێت هێرش بکەنە سەر ئەو مزگەوتە؟ چخەوشێك لەو مزگەوتەدا هەیە؟

- تا رادەیەك هیچ!. بەڵام خەوشەکە لەدروستکردنی مزگەوتەدایە. ئەم مزگەوتە لەلایەن (ئۆرنگ زیب)ی ئیمپراتۆرەوە دروستکراوە، کە یەکێك بوو لەکوڕەکانی (جەهان پاشا). بەڵام پرسەکە ئەوەیە، کە (جەهان) پاشا، ئەو پاشایە رەفتارێکی لێبوردەیی بۆ ئاینەکان هەبوو. سامانێکی زۆری بۆ تەلاری (تاج محل)و گۆڕی ژنە مردووەکەی خەرج کردبوو. (ئۆرنگ زیب)ی جێنشینی بەمەبەستی قەرەبوکردنەوەی زیادەڕۆییەکانی باوکی بوو بەموسڵمانێکی توندڕەو، پەرستگاکانی هندۆسی وێرانکرد، ئیمپراتۆرییەکی دروستکردو ئەو مزگەوتەی بەبەردی پەرستگا وێرانکراوەکان دروستکرد. لەهندستان ئەو یادەوەرییەی بۆتە پاشماوەی یادی پاشایەکی زاڵم‌و کەللە شەق، کە بەهەر شێوەیەك بۆی لواوە هندییەکانی ئازارو ئەشکەنجەداوە. لەبەرئەوە پارتە سیاسییە توندڕەوەکان، کە ئامانجیان دروستکردنی دوبارە (هندۆتفا - وڵاتی هندییەکان)ە مەبەستیانە مزگەوتی (ئۆرنگ زیب) وێران بکەن. هەرچەندە ئەم مزگەوتە بەبەشێك لەمیراتی گەورەی هندستان دادەنرێت.

پورە (مارتا) وتی: تیۆ ... باش سەرنج بدە. هەرچەندە مزگەوتی (ئۆرنگ زیب) تەلارێکی زۆر شکۆمەندە، بەڵام گۆڕەکەی هەتا بڵێی سادەیە. چوار دیوار، روپۆشێکی سپی، کە کونێکی تێدایەو لەوێوە گوڵێکی جوان رواوە. هەر ئەوەندەو بەس.

(تیۆ) نزیك بووەوە. لەنێو درزی بەردەکانی مزگەوتەکەدا زەردە زیرە هێلانەیان دروستکردبوو. دیاربوو بەرگریکردنی ئەوان لە مزگەوتەکە لەبەرگریکردنی چاودێرە هندییەکان کاریگەرتربوو.

## پۆستکارتێکی (گانش)

کاتێك بەڕێز (کۆلکرنی) لە (تیۆ) جیابۆوە فرمێسکی هەڵڕشت. (تیۆ) دەستیکردە ملی‌و (گورو جی) ئازیزەکەی لەئامێزگرت‌و ماچیکرد. بۆ کارێك، کە تایبەت بە ئەو نەبوو، بڕیاربوو دوای سێ رۆژ بەشەمەندەفەر بگاتە (بۆمبای). لەڕاستیدا گەڕانەوەی گروپە سێ کەسییەکە بۆ (دلهی) هێندە دڵخۆشکەرە نەبوو. هەرچەندە کابتن (لۆمبا) بۆ گەڕاندنەوەی (ئەیلا)ی هاوسەری‌و هاوڕێکانی هاتبووە (بنارس)، بەڵام تەنانەت زوری کاپتنی فرۆکەکەش نەیدەتوانی

(تیۆ) شادبکات، چونکە لەلایەك جێهێشتنی (بنارس)و لەلایەکی دیکەوە دوبارە خوێنگرتنو تاقیکردنەوە.

ئەنجامی تاقیکردنەوەکان یەکسانیو جێگیری باری تەندروستیان پیشاندەدا. پورە (مارتا) بەدڵتنگییەوە بڕیاریدا تەلەفۆن بۆ (پاریس) بکات. (میلینا) خەریکبوو تێکدەچوو.

- پورە (مارتا) لەتەلەفونەکەیدا بەئارامی دەیوت: گوێبگرە ئازیزم، بەتۆم ڕاگەیاند، کە تەندروستی بێ... گۆڕان... وەستاوە!. واتای ئەوەیە نەبەلای چاکدا ڕۆشتوە نەبەلای خراپیدا...کەی دەگەڕێینەوە؟ بۆچی؟ هەڵبەتە دەرمانەکانە دەخوا،... لەبنارس؟ ئاو؟ تەنیا ئاوی کانزایی دەخۆین.. ئاوی ڕوباری (گنگ) بەراستت نییە! زۆرباشە! ئەگەر باوەڕ بەمن ناکەیت لەخۆی بپرسە!..

- تەلەفۆنەکەی بە(تیۆ)دا: دایە! نەخێر.. تەنانەت دڵۆپێکیش، زۆر پیسە! هیچ لەوێ نەبینی؟ ئا... لەوێ.. زۆر شت. (یۆگا)شم کرد!. لەگەڵ مامۆستایەك، بەڵێ، ... بۆ نمونە ئایا دەزانیت مارێکت لەپشتدا هەلگرتووە. واتای چییە، نازانم ؟. سەیرە، چونکە پورە (مارتا) وتی کە ئەنجامی تاقیکردنەوەکان ئەوە پیشان دەدەن کە تەندروستیم نەگۆڕاوە! باشە، پاشان، واتا تەندروستیم لەسەرەتا خراپتر نەبوەو تەواو! ئەی نیسکەکان؟ هەموو سەوز بون، بەو خێراییە؟ بەڵێ... زۆر تاسەت دەکەم. بەڵێ، هەموو شەوێك لەکاتی نوستندا، تۆم هەر لەبیرە. هەروەها کاتێکیش بێدار دەبمەوە. خۆشمدەوێیت.. ماچێکی لەتەلەفۆنەکەوە ناردو پەیوەندییەکەی بڕی.

- وتی: زۆر خەفەت دەخوات، دەتوانم چی بکەم؟

- پورە (مارتا) وتی: کارتێکی بۆ بنێرە.

دەمودەست ئەوکارەیان کرد. (تیۆ) پۆستکارتێکی وێنەی (گانش)ی هەڵبژارد، کە فیلێك بەسکی هەڵاوساوییەوە لەسەر تەختەیەك ڕۆنیشتوەو لەهەموو کات زیاتر ڕەنگی سوربوو. بەوردەکارییەوە پەیامەکەی خۆی تۆمارکرد: ( بۆ دایکی ئازیزم، ئەمە ئەو خوایەیە بووە بەپارێزەرم، خوای کوانوی خێزانەو یەك دانی کەمە، کە بۆ نوسین بەخشیوەتی). ئێستا نۆرەی (میلینا) بوو، بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕازە سەر بەدیواردا بکێشێت.

## بەشی چواردە

## (هەورەتریشقەی پیرۆز)

### ڕووداوی دوو (هۆکار)

- (تیۆ) لەکاتێکدا پشتێنەکەی دەبەست وتی: بەراست ئەگەر لەباخی (سەرنات)دا ئێمە لەڕێگای ناوەڕاستدا بوبین ئیدی چسودێکی هەیە بۆ (دارجیلینگ) بچین؟ بۆ (چا)کڕینە؟

- پورە (مارتا) وتی: لەوێدا کات بەسەر نابەیت؟ لە (دار جیلینگ) ئاشنای جۆرێکی دیکەی (بودایزم) دەبیت.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: واتە دوو جۆر (بودایزم) هەیە؟

- پورە (مارتا) گوتی: یەکەم، بەهۆکاری بچوك[1] ناودەبرێت؛ ئەوەیە کە لە(سەرنات) لەژێر درەختەکاندا باسمکرد. دووەم، هۆکاری گەورەی[2] پێدەوترێت، کە وردە وردە سەرتاسەری خاکی هیمالایای گرتۆتەوە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: واتە (تبت).

بەبێئەوەی (نیپاڵ، بەهوتانو سیکیم) فەرامۆش بکەین، ئەو شوێنەی کە دەچینە ئەوێ.

- بەڵام (سیکیم) لەهندستانە!

- ماوەیەك پێش ئێستا وانەبوو. سیکیم قەڵەمڕەوی پاشایەتییەکی کۆنە، کە بەهندستانەوە بەستراوەو سەنتەرەکەی (دارجیلینگ)ە؛ ئەمڕۆ دەکەوێتە باکوری دەوڵەتی (بنگال)ەوە، کە لەخۆرئاوای هندستانە. (بودایزم) لە (هیمالایا)وە بۆ (چین)و لەوێوە بۆ (ژاپۆن) گەشتیکرد. ئەم (بودایگەری)یە لەو گەشتەیدا نازناوی (هۆکاری گەورەی) پێدراوە.

---

١. Petit Vehicyle لە تایبی بودادا ئەم هۆکارە بچدەوترێت (hinayana).

٢. Grand Ve (Mahayana).

- (تیۆ) لەباری بیرکردنەوەدا وتی: هۆکار، چ ناوێکی سەیرە بۆ ئاینێك!

پورە (مارتا) وتی: ئەم هۆکارە بۆ جولاندن لەسەر (ڕێگای ناوەڕاست) داهێنراوە، سەرەڕای ئەوەش بازنەی هەیە. لەوانەیە لەیادت بێت، کە یەکەمین ئامۆژگاری (بودا) لە (سەرنات) بەخستنەگەڕی (بازنەی یاسا) نابراوە.

(تیۆ) وتی: ڕاستە! ئەوکاتە نەمدەزانی واتای چییە؟.

- چونکە (بودا) لەکاتی دۆزینەوەو رامانو خەڵوەتی خۆیدا لەراستیدا بازنەی لەدایکبونو مەرگەکانی وەك بازنەی خەوشدار لەلابەرجەستە بوو، بەڵام یاسا مۆڵەت دەدات تا بەیاریدەدەری (ڕێگای ناوەڕاست) لەو بازنەی ئازارانە رەهای بەدەستبێت. خستنەگەڕی (بازنەی یاسا) بەواتای ئاوێتەکردنی بازنە دۆزەخییەیە بەهۆی بازنەیەکی دیکەوە، کە هەڵبەتە ئەویش بازنەیەکەو بازنەی پەروەردەو فێرکارییە. بازنەی یەکەم دەناسیت، کە هەمان (باشترین چوار حەقیقەتە). بازنەی دووەم پەیوەستە بەبەتاڵایی تەواوەوە. (تیۆ).. دەبینێت دروست پێچەوانەی (جولەکەگەراییە). لای جولەکەکان خوا بونە، پرە لەباشە. لای (بودا) بەپێچەوانەوە بەتاڵاییە. حەقیقەت بون نییە حەقیقەت سادەو روتە.

- دەتەوێت بڵێی بەپێیئەوە (بونی هەتاهەتایی) جولەکەکان سادەو روت نییە؟

- بۆچی نا، وایە. بەڵام لای (بودا) بون پایەدار نییە. کاتێك تینوێتی خۆپەرستی شکا بەتاڵایی بەرفراوان دەبێتو دڵ ئامادەی میهرەبانی دەبێت، تاریکیەکان دەرەوێنەوە. لێرەدایە بازنەی کۆتاییو مەعریفە ڕێگا بۆ روناکی یان (بێداری) دەکاتەوە. لە (دارجیلینگ) (هۆکاری گەورە) دەدۆزیتەوە.

- چی لەنێوان هۆکاری بچوكو گەورە رویداوە؟

بەڵێ، هەمان روداوی لەنێوان ئاینەکانی جیهاندا رویانداوە. پاش بزربونی (بودا) یەکێتیو یەکبونی بزوتنەوەکەش تێکشکا. (بودا) پرسیارێکی بەبێ وەڵام جێهێشتوە!. ئایا خودی ئەو هەر لەسەرەتاوە گەیشتبووە ئاستی (بێداری) یان پلەبەپلە خۆی پێگەیاندو بەپلەو ئاستی بێداری گەیشت؟.

(تیۆ) وتی: پەیوەندی بەخۆیەوە هەیە. لەئەفسانەدا لەئاستی خواوەندایەو لەژیانیشدا نەخێر.

- پورە (مارتا) وتی: ئەمە دروست یەکێکە لەهێڵە جیاکەرەوەکان. هەندێك ڕێگاچارەیان دۆزییەوە، واتە ئەو (بودا)یەی هەموو وەك بونەوەرێکی زیندوو بینیویانە وێناو تارماییەك بووە، کە بەهۆی (بودا)ی ڕاستەقینەوە بزوێنراوە.

(تیۆ) بەنارەزاییەوە وتی: خۆ ئەوە لەیستۆك نییە! ئەو نەیویستوە خوا بێت.

- پورە (مارتا) قسەکەی پێبڕیو گوتی: خوایەکی ناتەواو. (بودا) ڕێگەی پێکگەیشتنی تاکی لەگەڵ خواوەند پیشاندەدا؛ بەڵام خەڵك هەمیشە پیویستیان بەوەیە ڕێنمایی بکرێن. پاشان راهیبە (بودایی)یەکان جۆرە (قەدیس)ێکیان داهێنا، کە بتوانن بەمەبەستی رزگارکردنی مرۆڤایەتی تاڕادەی نادیار گەیشتن بە(بێداری) کۆتایی دوابخەن. ئەو کەسایەتییانە پێیان دەوترا (بودی ساتڤاس – Bodhi sattvas). ئەم (شاگردانەی بودا)، کە خۆیان زۆر بێداربون، لێوانلێو دەبن لەپەرۆشی، فیداکاریو میهرەبانی، کە بەهۆی گەورەییو مەزنایەتی خۆیانەوە پەرۆشبونێکی رەها دەئافرێنن. ئەوانە خاوەنی وزەیەکی تارادەیەك خودایین. (بودا)ی شێوە هەڵم جێگای لە دۆڵێکی دورە دەستدایە. ئێستا دەزانێت بۆچی (گوروی) یەکەت بەنەفسانەکانی منی تورە دەکرد؟

- تۆ (بودا)یت؟

- پورە (مارتا) دانیپێدانا: تارادەیەك، بەڵێ. چونکە فەلسەفەکەی (بودا) تاك ناچاردەکات بۆ بەدەستهێنانی ئارامی رۆحو گیانی خۆی بکەوێتە گەڕانو ئەوەش شتێکە من تێردەکات. (تیۆ) باوەڕبکە من تاکە کەس نیم بەرەو (رێگای ناوەڕاست) ئاراستەکراون، لەئێستادا هەموو رۆژێك (بودا)ییەکان لەهەموو گۆشەو کەنارێکی جیهاندا دەبینن. لە ئەمریکا، کەنەدا، سویسرا، ئەڵمانیا....

- (تیۆ) بەپێکەنینەوە وتی: بەلایەنی کەمەوە لەفەڕەنسا نییە!

- هەڵبەتە لەفەڕەنساش هەیە!. تۆ دەڵێیت چی؟ بۆچی فەرەنسییەکان بەرامبەر بەهاودەردیو سۆزی جیهانی گوێیان لیخەواندووە؟ لەوڵاتەکەی تۆدا ژمارەیەکی گەلێك زۆر (بودا)یی هەیە، تەنانەت لەبەرنامەی ئاینی بەیانیانی یەکشەممەدا بەرنامەی تایبەتیان هەیە... بەبڕوای من ئەوە ئاگادارکردنەوەیەکە. (بودا)ییەکان کەس سەغڵەت ناکەن؛ ئەوان خەڵکی لێبوردەو ئارامن. بێگومان لەسەرەتادا سەیر دێنە بەرچاوت، بەرگەکانیان، شێوازی خواپەرستیان و رێکخراوەکانیان هەموو سەیرن، بەڵام هەمویان لەلای خۆیانەوە رونکردنەوەو ئاراستەی خۆیان هەیە. دەبێت باس لەوەبکرێت، کە بوداییگەری لە (تبت) لە رێچکەی خۆیدا روبەڕوی ئاینێکی زۆر دێرین بوەوە، کە پێویستی دەکرد هاوشانی بێتو بگونجێت لەگەڵیدا.

- (تیۆ) لەسەرخۆ وتی: ئاینێکی زۆر کۆنی تبتی.. ئاینی (باردو تۆدۆل Bardo Thodol)، کتێبی مردووەکان؟

- پورە (مارتا) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: ئاخ لەیادم چووبوو. باشە! ئەم کتێبە شتێکی ئەوتۆی دەربارەی ئەو ئاینە ناڵێت، کە بەئاینی (بۆن Bon)ناودەبرێت.

- ب - ۆ - ن ؟

- بەڵێ، وایە. لەزەمانی کۆنی تبتدا ئەم وشەیە بەواتای ئاینی مرۆڤەکان یان (بۆنپۆس - Bonpos)ـە. ئەوەش بزانە روداوی توانەوەو ئاوێتەبونی ئاینی بۆن‌و بودایزم سەرگوریشتەیەکی سەیرە.

## تەنافێك‌و شەش مەیمونی بچوك

روداوەکە هێندە سەیرو نامۆ بوو، کە دوو سەعاتی لەکاتی پیاسەکردنیان گرت. مارتا بەمجۆرە دەستیپێکرد:

- بەپێی ئەفسانەو میتۆلۆژیای ئاینی کۆنی تبت لەسەرەتای ئەفراندندا خواکانی جیهانی باڵا لەسەر چیاکان ژیاون‌و ئەوانەی خوارەوەش لەژێر خاك‌و ئاوەکاندا؛ مرۆڤەکانیش لەنێوان ئەو دوانەدا... یەکەمین پاشای تبت لەگەڵ خوایەکی چیاییدا هاوسەرگیری کردو لەوێوە یەکەمین مرۆڤەکان دروستبون. لەرۆژدا پاشا لەسەر زەوی نیشتەجێدەبوو، شەویش بەهۆی تەنافێکی پەرەجوئاسای شێوە روناکییەوە، کە لەسەرسەری بوو، بۆ ئاسمان دەگەڕایەوە.

- (تیۆ) وتی: تۆ پێشتر باسی ئەو پرچانەت بۆ کردم، کە بەسەرەوەیە، وەك سیکەکان. بەرهماکان، شەمعون نەدیر...

پورە (مارتا) راستیکردەوەو گوتی: نەزیر!. ئینجا بەردەوامبوو: ریشەی تەناف، کە مرۆڤ بەئاسمانەوە دەبەستێت، شتێکی جیهانی بوو. ئەو پرنسیپە لەلای دانیشتوانانی رەسەنی بەرازیلییەکانیش هەیە. هەمیشەش کەسێکی نەزان هەڵدەکەوێت ئەو تەنافەی هۆکاری هەڵکشانی مرۆڤە بۆ ئاسمان بپچڕێنرێت. ئەوەش ئەو کارەساتەبوو بەسەر شەشەمین پادشای تبتدا هات. ئەو پاشایە کەسێکی زۆر خۆپەرست‌و خۆبەزلزان بوو. داوای لەمەیتەرەکەی خۆی کرد زۆرانبازی لەگەڵدا بکات‌و هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی خوداییانەی خۆشی پێنەدا. چونکە زۆرانبازییەکە نایەکسان بوو مەیتەرەکە داوای لە پاشاکرد بەلایەنی کەمەوە تەنافەکەی سەر سەری بپچرێنێت. پاشاش بەهۆی لەخۆباییبون‌و لوتبەرزییەوە پەسەندیکرد. پاشان مەیتەرەکە سەد (گا)ی هێنایە مەیدانەکەوە، کە بەشاخەکانیانەوە سەردنێزەو ئاردبانەی پڕ لەخۆڵیان

کێشدەکرد. ئاژاوەو هەراوزەنا لەوناوەدا وێنەی نەبوو. لەبەرئەوە مەیتەر لەوشەڕەدا پاشای کوشتوو بووو بەیەکەم پاشا. پاشئەوە ئیدی هیچ پاشایەکی دیکە نەیتوانی بەتەنافی ئاسمانییەوە خۆی هەڵکێشێت و تەنها موعجیزەگەرانو قەدیسییەکان دەیانتوانی سەرکەون. ئەمەش ئەفسانەی ئاینی کۆنی تبتە.

- (تیۆ) پرسی: چی لەم ئایینە ماوەتەوە؟

- پورە (مارتا) گوتی: هێشتا (بونپوست)ـەکان ماون، کە لەشاییدا تەنافێك بەسەر سەری زاواوە دەبەستن. ماوەیەك پێش ئێستا لە(لهاسا)و لەکۆشکی (دالایی لاما) بەناوی (پۆتالا) سێ پیاو خۆیان هەڵدایە بۆشایی یان بەواتایەکی دیکە لەبۆشاییدا فڕین تا بەتەنافێك لەلوتکەکەوە بۆ خوارەوە شۆڕببنەوە. پاشان لەکاتی گەیشتنی (بودایی) بە(تبت) ئەفسانەی پاشاو تەنافی ئاسمانیو بنەماو ریشەی مرۆڤ بەتەواوی گۆڕا. بەمجۆرەی کە.. بەپێی ئەفسانەی بوداییەکان لەسەرەتای ژیانەوە مەیمونێکی گەورە بەهۆی وانەکانی بوداییەکەوە رازی بوو بچێتە سەر ئاینی بودایی. ئەو بوادییە ساتوایەکی پیرۆز بوو، کەناوێکی گەلەك ئاڵۆزی لەخۆی نابوو. (ئەڤەلۆکیتێسڤارا). کابرای قەدیس مەیمونەکەی بۆ ناو بەفرەکانی تبت نارد، چونکە چەندین خەڵك لەئاسمان نزیکتر بێتەوە دەتوانێت زیاتر ورد بێت. لەوکاتەدا مەیمونەکە سەبارەت بەهاودەردی سەرگەرمی رامانو خەڵوەت بوو، دێوێکی مێینە لەوێوە تێپەڕیوەو شێتانە شەیدای مەیمونەکە بووەو خۆی بۆ ژنێك گۆڕیوە. مەیمون، کە پەیمانی دابوو بۆ درێژەدان بەخواپەرستیو تەقوا خۆیٔ تەرخان بکات داواکاری عاشقانەکەی رەتکردەوە، بەڵام ژنە دێوەکە هێندە پاڕایەوەو کڕوزایەوە مەیمون ناچاربوو رێگای بدات لەتەنیشتییەوە دابنیشێت. چونکە مەیمون هەروا بەرگری دەنواند، دێوەکە ناچاربوو هەڕەشەی لێبکات، کە ئەگەر خۆی رادەستی ئارەزووەکانی نەدات هێندە دێو دەرێژێتە سەر زەوی نەژادی مرۆڤایەتی هەنجن هەنجن بکەن. مەیمون، کە تیامابوو نەیدەزانی چیبکات، بەرەو کابرای قەدیس فڕی و ئەویش فەرمانی پێکرد لەڕووی هاودەردیو میهرەبانییەوە هاوسەرگیری لەگەڵ بکات؛ قەدیس هەموو شتێکی پێشبینی کردبوو.

پاشان شەش بێچووە مەیمونیان لێکەوتەوە، کە دایکیان بەپێی بنەماو ریشەی خۆی دەیویست هەمویان قوتبدات. باوکە مەیمون هەر شەش بەچکەکەی رزگارکردو بەرەو دارستان هەڵاتو لەوێ ئازادی کردن. دوای سێ ساڵ شەش مەیمونەکە زۆر بونو ژمارەیان بوو بەپێنج سەد دانەو لەناو برسێتی سەردەمەرگدابون. مەیمونی بێچارە جارێکی دیکە پەنای بۆ پیاوە

قەدیسەکە بردەوەو بۆ سەرچیایەکی بەرز چوو، لەوێوە پێنج جۆر تۆوی هێناو چاندنی. ئینجا پێنج سەد مەیمونەکەی هێنایە سەر کشتوکاڵەکەو لەو کاتەدا خەریکی خۆراك خواردن بون چاو، دەمو موی خۆیان لەدەستداو بون بەیەکەمین دانیشتوانی تبت.

- (تیۆ).. گەیشتە ئەو دەرئەنجامە: بەوپێیە بێت دانیشتوانی ئەمڕۆی (تبت) هەمویان لەپشتی ئەو مەیمونەن.

- بەڵام تۆ ئەو مەیمونە گەورەیە دەناسیت، ئەوە هەمان (هنومان)ـە خودی ئەوە.

- (تیۆ) هاواریکرد: ئای چەند ڕێکەوتێکی سەیرە، ئەویدی (ئاڤالو) نازانم چی؟

- (ئاڤالوڤاکیتسڤارا)؟ بۆئەوەی خەڵکی لەدەوری ئاینی (بودا) کۆبکاتەوە بۆ چیای (پۆتالا) ڕۆشت. لەوێوە لەناو لەپی دەستییەوە روناکییەکی بەودەورددا پەخشکردەوەو گۆڕا بۆ مەیمونێك.

- (تیۆ) لەبەرخۆیەوە پرسی: چەند هەویرێکی سەیرو سەمەرەیە. (هنومانی) هاوڕێمان لەلەپی دەستی قەدیسێکی (بودا)و دێوێکی مێینەیە، کە بونەوەرێکە هیچ مایەی سەرنج نییە.

پورە (مارتا) بەجۆرێك ساکارکردنەوە وتی: بەڵێ ئێستا کاتی ئەوەیە بوترێت، کە دێوە مێینەکە لەسەرچاوەی ئاینی (بۆن)ـەوە دێتو لەتەنای ئاسمانیش جگە لەتیشکێکی روناکی هیچی دیکەی لێنامێنێتەوە. دەبینیت چۆن هەموو شت ئاوێتەیە.

- بەڵێ. چێشتی مجەورە. لەخۆم دەپرسم دەبێت لە دارجیلینگ چی ببینم؟

## شارێك لەناو تەما

هەر لەسەرەتادا یەکەمین شت کە (تیۆ) بینی فڕۆکەخانەی بچوکی (سیلیگۆری)بوو. لەوێدا ئۆتۆمبیلێکی (ئامباسادۆر)ی گەورە چاوەڕێ بوو، کە بەگران بەپانکەیەکی بچوك سارد دەکرایەوە. سەرەتای هاوین بوو، کەشیش زۆر گەرم بوو، بەڵام پورە (مارتا) (تیۆ)ی لەوە دڵنیاکردەوە کاتێك بەرەو بەرزاییەکانی (دارجیلینگ) دەڕۆن هەوا فێنكو تارادەیەك سارد دەبێت. ڕێگا پێچاوپێچەکە بەناو سەوزەڵانییدا فراوانەکاندا تێدەپەڕی، کە دەومنی سەوزی درەخشانی شێوە گۆ هەموو ناوچەکەی گرتبۆوە. ژنان بەکڵاوی حەسیرییەوە خەریکی گەڵا رنین بون، ئەوەش باخی گەورەی (چا) بوو.

پورە (مارتا) وتی: ئەوەش دەوەنی چای ئازیزی تۆیە.

- (تیۆ) بەئومێدەوارییەوە وتی: بابوەستین، زۆر ئارەزوو دەکەم گەلایەك ببینم.

ژنەکان بەیەك جوڵە گەلاکانی بەشی سەرەوەی دەوەنەکانیان لێدەکردەوە؛ رەنگیان سەوزو ناسك بوو. (تیۆ) گازی لەگەلایەك گرت و تامی تاڵو تفت بوو. پورە (مارتا) بەڵێنی پێدا لە (دارجیلینگ) یەك پاکەت چا دەکڕێت. ئۆتۆمبیلەکە بەهێواشی بەناو سەوزەلانییەکاندا تێدەپەڕی. (تیۆ) بەدرێژایی رێگاکە خەوت و کاتێك گەیشتن بێداربۆوەو لەگەڵ چاو کردنەوەی حەسارێکی بەفرینی لەبەردەمیدا بینی، کە زەردەی خۆرنشین لەخۆ هەڵچنیبوو.

(تیۆ) بەواقوڕماوییەوە وتی: هیمالایا! جێگای باوەڕ نییە.

- شار لەنێو تەمو دوکەڵی چێشتخانە روکراوەکاندا بەپانایی کیلۆمەترێك بەسەر بەرزاییەکاندا دابەش ببوو. لەناو تەمەکەدا ئەو سێبەرانە دەبینران، کە هێواشو لەسەرخۆ دەجولان یان لەشێوەی گروپێکی چەند نەفەری بەدیار قۆرییەکی گەورەی سەر سۆپایەکی بچوکەوە رۆنیشتون. لەخۆرنشیندا شاری (دارجیلینگ) بەشاری خێوەکان دەچوا. زنجیرە چیاکانی هیمالایا لەقولایی شەودا نغرۆ ببونو (تیۆ) هەستی بەسەهۆڵ بەندان دەکرد. خۆشبەختانە ئەو هۆتێلەی پورە (مارتا) هەڵیبژاردبوو لەسەردەستوری ئینگلیزی بوو؛ بەگەرمی هەڵمی ناودیوارو قەنەفەی گەورەوە. خاتونی خاوەن هۆتێلەکە بەتامو چێژەوە باسی لەگەشتیارە گەورەکان دەکرد، کەدیواری حەسارە کۆنەکەیان تێپەڕاندوە. لەو کەسانەش خاتوو (ئەلیکساندرا داڤید نیل) گەشتیاری ناودارە، کە ببووە شارەزایەکی بێوێنەی تبت.

- پورە (مارتا) درێژەیپێدا: باش دەیزانی چۆن لەناو ئەو شەختەیەدا خۆی گەرم راگرێت.

- (تیۆ) وتی: سەیرە! خۆبەهۆی ئەو ئاگرەوە شتێکی سەخت نییە.

- پورە (مارتا) وەلامیدایەوە: راستە، بەلام بەبێ دارو کبریت!. ئەمکارە لەلای (یۆگی)یەکانی ناوچەی تبت مەشقێکی کۆنە. (یۆگی)یەکان لەناو بەفردا خۆیان روتدەکەنەوەو جلەکانیان لەسەهۆلاو هەڵدەکێشنو لەخۆیانەوە دەئاڵێننو چاوەڕێ دەکەن تا لەبەرەیاندا وشك دەبێتەوەو لەرێگای هەناسەدانەوە گەرمی لەشیان دەستەبەر دەکەن.

- (تیۆ) وتی: ئێ.. تۆ دەتەوێت باوەڕ بەو چیرۆکە بکەم؟

پورە (مارتا) وتی: پەیوەندی بەخۆتەوە هەیە. (ئەلیکساندەر داڤید نیل) رایگەیاندوە، کە خۆی ئەوکارەی ئەنجامداوە. باشە ئێستا برۆ لێفەکەت گەرم بکە.

## پەرستگای تبتی

رۆژی دواتر بۆ سەردانی پەرستگایەکی سەروی شار رۆشتن، کە بەبەرزی لەتەنیشت شەقامەکانەوە پارچە کوتاڵی رەنگاورەنگ بەتەنافەوە کرابوو یان وەك بۆردی ناونیشان هەڵواسرابوو. لەهەندێك شوێندا کوتاڵەکان لەژێر تەپوتۆزدا زەرد هەڵگەڕابون و هەندێکیشیان دڕابون.

- (تیۆ) وتی: خەڵکەکە دەسڕەکانیان لەبەرامبەر بەپەرستگاکانیاندا وشك دەکەنەوە؟

- پورە (مارتا) وتی: جوان بڕوانە ئەو پارچە کوتاڵانە. دەسڕ نین و شتی لەسەر نوسراوە کە نزاو پاڕانەوەن؛ لەسەر روتەختی هەریەکەیان دەقێکی پیرۆز تۆمارکراوەو بەدەستی (با)ی دەسپێرن تا لەناو نەچێت.

- (تیۆ) وتی: کەواتە لەبەرئەوەیە چڵکن و دڕاون، بەڵام یەکێکیان رەنگێکی سورو جوانی هەیە!

- پورە (مارتا) وتی: نیشانەی ئەوەیە کە خاوەنەکەی کەوتۆتە پاڕانەوەو لاڵانەوە.

- (تیۆ) پرسی: لەکام خوا؟

- زۆر خواوەند.. دەبینیت.

- بەمجۆرە (تیۆ) تێگەیشت، کەجیهانی (بودا)یی تبت پڕیەتی لەخواوەندی ترسناك و ئیلیسی. خواوەندەکان تۆقێنەربون، بەڵام لەبنەڕەتدا ئارام و بێزیان. ئیلیسەکانیش وەك وەهم و تابۆکانی جیهان ژمارەیان زۆرو جۆراوجۆربون. لەلایەکی دیکەوە چونکە خواوەندە سەرکەوتوەکان لەتبت هەمیشە وەك ئاماژەیەك بۆ سەرکەوتن لەبارێکی دۆڕاویدا دەردەکەوتن. لەبەرئەوە جیاکردنەوەی خواوەندی چاکەکاری سەرکەوتوو بەسەر شەیتانە تێکشکاوەکاندا کارێکی دژوار بوو.

- پورە (مارتا) دڵنیای کردەوە: هەموو ئەوانە بەوێنەکێشراوی لەسەر دیوارەکان دەبینیت. ئێستا دەبێت بۆ (لاماگامپۆ)ی هاوڕێم بگەڕێیین.

- (تیۆ) وتی: ئەمە شتێکی نوێیە. پورە ئازیزەکەم هاوڕێیەکی هەیە (لاما)یە[1].

---

١. لێرەدا (تیۆ) بۆ گاڵتەوتویەتی (لاما) کە جۆرێك حوشترە.

- پورە (مارتا) دەمودەست وەلامیدایەوە: (Lam) بەواتای (مامۆستا) دێت. (لاما)کان لە دێرەکاندا بنەماکانی ئاین دەڵێنەوە. پەرستگاکە بەدوراییی جیاوازو تەخت، لوتکەی ئاڵتونی، رەنگی سپیو وێنە شێوە بۆرەکانییەوە لەبەردەمیاندابوو. دەنگی لێدانی زەنگ وتەپەی تەپڵێك لەناو پەرستگاکەدا دەنگی دەدایەوە: تی – تی – بۆم – تی – تی – تی . تی – بۆم. راهیبێکی مناڵێکاری سورپۆش، کە دارعودێکی بەدەستەوە بوو، لە پەرستگاکە هاتە دەرەوەو چەپۆکێکی سروانده پشتی سەگێك، کە بەتەنیشتییەوە دەرۆشت. کورێژگەیەکی دیکەش یەکێکی لەسەگەکە هەڵداو لەگەڵ راهیبە بچوکەکە قاقا پێکەنیو دەستیان کرد بەزۆرانبازی. پاش کەمێك دەنگی زەنگێکی وەك کاتی پشوی قوتابخانە سەرانسەری پەرستگاکەی گرتەوە. پورە (مارتا) لەنێو ئاپۆرەکەدا دەستی بە جوتکراوی لەسەر ناوچەوان کەوتە گەڕان بەدوای لامای هاوڕێیدا.

- لاما، کە بەخۆشییەوە دەستی لێکدەخشاند، بەخەندەوە نزیکبۆوە. (لاما گامپۆ)، سەری پاك تاشیبوو، پارچە کوتاڵێکی سورو سەرشانێکی زەردی تۆخی پۆشیبوو؛ چاویلکەیەکی چوارچێوە سیمی لەسەر لوتی دانابوو. کاتێك گەیشتە تەنیشت پورە (مارتا) گەورەیی نواندو کەوتە سەر زەوی. لەگەڵ لادانی چاویلکەکەی بە (تیۆ)ی وت: ئاستیت لێبێ ئەی کوڕی ..و. تەندروستیت باشە؟

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بەفەرەنسی دەدوێیت؟

- (لاماگامپۆ) وەلامیدایەوە: سروشتییە. لەساڵی ١٩٥٩ کاتێك (دالائی گاما) ناچار بوو (تبت) بەجێبێڵێت لەگەڵیدا کۆچم کرد. سەرەتا چوو بۆ هندستانو لە (دارام سالا) بوە پەناهەندەو ئێمەش بەجیهاندا پەرشو بلاوبوین. چارەنوس منی بە (فەرەنسا)ی خاکی پیرۆزکراو گەیاند یان وردتر بڵێم لەشارۆچکەی (ئانییەر)ی نزیك (پاریس) بوم.

- (تیۆ) هاواریکرد: ١٩٥٩ کەواتە دەبێت زۆر بەتەمەن بیت؟

- (لاما) بەجۆرێك تەنزەوە وەلامیدایەوە: کێ چوزانێت؟

- باشە ئەگەر دانیشتوی (ئانییەر)یت لێرە چی دەکەیت؟

- (لاما) بەجوڵەی دەست (هیمالایا)ی پیشاندا. دەبێت جارجارە هەوای پاکی بەفر هەڵمژیتو لەوبەری چیاکانەوە هەست بەخاکی دایكو زێدی خۆت بکەیت. لەگەڵ چاککردنی چاویلکەکەی لەسەر لوتی وتی: باشە، با بچینە ژوورەوە.

- بەڵام کاتێك (تیۆ) خەریك بوو پێ بنێتە ناو هۆڵی کۆڵەکەکانەوە (لاما) رایگرتو پێیراگەیاند باشترە پێش چونە ژوورەوە ئاشەکانی نزا بەگەڕ بخەیت. لەبەردەم دەرگای پەرستگاکەدا دوو دەستاڕ هەبوو، گەورەو رەنگ زەردو هێندە قورس، کە (تیۆ) بەهەموو هێزییەوە نەیتوانی بەگەڕیان بخات.

- (لاما) وتی: یەکەم لەبەرئەوەیە ئاراستەی سوڕانەوەکەت هەڵەیەو ئەوەش باش نییە تەنانەت هەندێك لەو بڕوایەدان ئەوە شومە. دەبێت هەمیشە دەستاڕەکەت لەگەڵ ئاراستەی جوڵەی سەعات بسوڕێنیت.

- (تیۆ) بەئاڕاستەی پێچەوانەوە فشاری خستەسەرو دەستاڕەکە سوڕا. بەخۆشییەوە بەدەنگی بەرز وتی: سوڕا! ئەمە سودی چییە؟

- (لاما) وتی: لەناو ئاشەکەدا چەند لولەکێکی تێدایەو نزاو پاڕانەوەیان لەسەر تۆمارکراوەو بۆ نزاکردن هێندە بەسە ئەم دەستاڕانە بسوڕێنیت.

- (تیۆ) وتی: سادەو پراکتیکانەیە!

- (لاما) وتی: بەڵێ، بەڵام دەبێت زۆر بسوڕێتەوە، خۆ ئەگەر ئەو سوڕاندنە پڕ بەدڵو خواست نەبێت بەرهەمی نابێت. ئایا دڵی تۆ پاكو پەرۆشە؟

- (تیۆ) بەراڕاییەوە لەنوکی پێڵاوە وەرزشییەکانی خۆی روانی. ئایا دەیزانی بەراستی پەرۆشە یان نا؟ دانیپێدانا: بەراستی بڵێم نازانم!.

- زۆر باشە. بەئاگابون لەنەزانی سەرەتای گومانە، کە بەرەو حیکمەت رێنوێنی کەسەکە دەکات. ئێستا دەتوانیت لە وێنەی سەر دیوارەکان بنواڕیت.

لەیەکەم بینیندا (تیۆ) جگە لەکۆمەڵێکی تێکەڵاو لەوێنەی ترسهێنەری رەشو سور هیچی دیکەی نەبینی، کە چاو لەکاسەی سەر دەرهاتبوو، لەسەر زەوییەکەو لەژێر گەواڵە هەوری تۆفانی زۆردا، خەریکی شەڕو جەنگ بون.

- سیماکان هێندە تۆقێنەربون (تیۆ) ماوەیەکیی ویست تارام بێت لەگەڵیاندا. کۆمەڵێك لەسەر لایەکی دیوارەکە بەهەڕەیەکی گەورە خەریکی بڕینەوەی لاشەکان بون. لەگۆشەیەکی دیکەدا لەسەر ئاگر جەستە هەڵدەکڕوزاو لەشوێنێکی دیکەشدا زمانەکان بە نێزە دەسمران.

- (تیۆ) هاواریکرد: پێمبڵێ ئایا ئەمە دۆزەخە؟

(لاما) لەسەرخۆ وتی: ئەمانە دۆزەخەکانن. ئەوەی سەرنجڕادەکێشێت شکستو پەرێشانی ئبلیسەکانە. ئەگەر باش سەرنج لەسەنتەری وێنەکان بدەیت دیمەنو وێنەکانی بەهەشت پێش شانۆکانی دۆزەخ بەرچاو دەکەون، خۆت دەیبینیت.

(تیۆ) لەنێو وێنەکاندا روخسارێکی ئەندازەیی بینی، کە هێندە تێکەڵو ئاڵۆزبوو ناچار زۆر بەدیقەتەوە بڕوانێت تا بتوانێت لەنێو ئەو بازنانەی بەئاڵوگۆڕکراوی نەخشێنراوبون ئەو (بودا)یانە ببینێت لەباری (لیتۆس)و خوای هەشت پەلیدا بون. سەرئەنجام کاتێك لەگەڵ وێنەکان راهات تێبینی ئەوەیکرد یەکێك لە وێنەکان سادەیە. وێنەی ژنێك یان لەوانەیە خواوەندێك بووبێت، کە لەباری راماندا لەگەڵ (یۆگی)یەکدا کێشرابوو.

- (تیۆ) بەبڕواوە وتی: باشە، ئێستا دەبێت بۆ من رونبکرێتەوە، ئەم شەیتانانە کە دژ بەیەکن، ئەم وێنە جوانانەی بازنەیی یان شێوە چوارگۆشەو هەروەها ئەم ژنو یۆگییەی لەحاڵەتی راماندان.

(لاماگامبۆ) لەجاران زیاتر بەپێکەنینەوە رونیکردەوە: دیمەنەکانی دۆزەخ نمایشی شەڕی هەتاهەتایی خواکان لەگەڵ شەیتانەکانی ناو بازنەی خەوشدار دەکەن، کەهەمان بازنەی بونەکانو ژیانەکانن. لەناو سەنتەری بازنەکانی ئەم وێنە باوانەدا، کە بە(ماندالا) ناودەبرێت، دەتوانرێت خواکان لەباری (لیتۆس)دا ببینرێت: (ماندالا) لەچوارگۆشەیەك پێکهاتوە، کە بەبازنەیەك چواردەورە دراوەو خودی ئەو بازنەیەش لەناو چەند بازنەیەکی دیکەدایە، کە ئەوانیش لەناو چوارگۆشەیەکی دیکەدان. ئەم چوارگۆشەیە چوار دەرگای هەیەو بازنەکەی ناوەڕاستیشی، کە لەهەموی بچوکترە، جیهانی بونەوەران دەخاتەڕوو؛ لەوێدا (حیکمەتی باڵا) لەزەریای خۆشیو بەختیاریدا مەلە دەکات. (ماندالا) شانۆیەکی خەونئاسایە لەکۆشکی ئایدیاڵی خودایی، کە (بودییەکان) بە (خواوەند) ناوی دەبەنو لەناوەڕاستیدا جوتێ ژنو پیاو لەسەری رۆنیشتون.

بۆ دەرککردن بە (ماندالا)و زەریای بەختەوەری پێویست بوو زۆر لەنزیکەوە سەیری وێنەکە بکرێت.

(لاما) رونیکردەوە: ئەوەی لەو وێنەیەدا دەبینرێت خستنەڕوی وزەی ژنانە، کە بریتییە لە (شاکتی - Shakti). ئەوەی وێنەکە پیشانی دەدات ئەنجامدانی رامان وخەلۆوەتە لەدوا شێوەدا.

لەبەرئەوە ئامادەیی خوایانەی ژنو پیاو گەیشتنی تەواوە بەچڕبونەوەی رۆحو هزر، کە لەناکاو زەریای خۆشی لێوە هەڵدەقوڵێت.

- (تیۆ) وتی: ئایا ئەمە هەمان باسی مار لەبەشی خوارەوەی مۆرەگەی پشت نییە؟ (کوروی)یەکەی من بابەتەکەی بەوجۆرە بۆ من باسکردوە، چونکە لێرەشدا ژنو پیاو بۆ هەتا هەتایە لەپاڵ یەکدیدا دانراون، وەك (شیڤاو پرڤاتی)، وانییە؟

- (لاما) کە دڵخۆش بوو بە زانیارییەکەی (تیۆ) رایگەیاند: ئەو وێناکردنە دروستە، هێندە نەبێت کەئیدی لێرەدا باسی (شیڤاو پرڤاتی) لەکایەدا نییە، بەڵکو باسی ژنو مێردە لەباری رامان وخەڵوەتداو ئەو بابەتە زۆرتر ئاڵۆزە، چونکە ئەگەر لەیەکێ لە لقەکانی (هندۆیزم)دا، کە بە(تانتریزم) ناودەبرێت، جوانی ژنو پیاو ئامادەیی هەیە، ئەوا لە (بودایزم)ی (تبت)یدا بەپێچەوانەوە راهیب بەبێ ژنە، چونکە ئەگەر (بودا) وەك جوتێك ژنو مێرد بێت بۆ ئەوەیە تابتوانێت لایەنی تەواوکردنی نێوان ژنو پیاو دەربخات، کە مێرد هەمان میهرەبانیو هاودەردییەو ژنیش ئارامیو بەتاڵیی. راهیب بەوەی قورسایی خۆی دەخاتە سەر بەشە ژنانییەکە، کە سەرچاوەی روناکییە، بە باری رامانو خەڵوەت دەگات.

(تیۆ) هەندێك وێنەی بە کامێراکەی گرت تا پیشانی (فاتۆ)ی بدات، چونکە ئەوە باش تێگەیشتبوو، کە دواجار (شاکتی)یەکەی ئەم (فاتۆ)یە.

- (لاما) بەئەدەبەوە وتی: ئێستا دەتوانین بچینە پەرستگاکەوە. لەسەر زەوی پەرستگاکە ریزێك لە راهیبانی منداڵ لەگەڵ لێدانی تەپڵی گەورە خەریکی نزاکردن بون، جارجارە راهیبێکی قەڵەو، کە شولکێکی بەدەستەوەبوو، هەڕەشەی لەو منداڵانە دەکرد هەڵەیان دەکردو هەندێکجاریش بەهێواشی پێیدادەکێشان. لەنێو پەرستگاکەدا راهیبێك وەرزشێکی سەیری دەکرد: هەر بەپێوە دەستە پێکەوە نوساوەکانی بۆ سەرسەری دەبرد، سەری تاسەرسنگیو ئاستی دڵی شۆڕدەکردەوەو لەسەر پارچە تەختەیەکی درێژکراو رادەکشاو ئینجا بەهۆی ئەو قولاپانەی لەسەر زەوییەکە قایم کرابون هەڵدەستایەوەو ئیدی ئەو وەرزشەی دوبارە دەکردەوە.

- (تیۆ) وتی: ئەو رهیبە بچوکانە چیدەڵێن؟

- (لاما) وەڵامیدایەوە: ئامۆژگاری (بودای ساتواسەکان)ە. دەتوانیت ئەو نزایانە لەسەر رێگاو لەدەمی میوانەکانیەوە ببیستیت: (Om mami podme houng). (بودا) کڵێشەی زۆر بەجیهان بەخشیوە، کە ئێمە بە(مانتراس - Mantras) ناوی دەبەین: ئەوە لەهەمویان بەناوبانگترە.

لەکاتێکدا (مانتراسەکانی) دیکە، کە پاشان راهیبەکان فێری دەبن، هێندە دژوارە زۆرجار بەهەڵەدا دەچن.

(تیۆ) وتی: بەڵام ئەوە هۆکار نییە تا بەشوڵك لێیان بدرێت!

- (لاما) وتی: لێرە باس لە سیستەمو دیسپلینە. یەکەم ئەو شولکە ناسکە ماسولکەی پشتی راهیب لەگرژی رزگار دەکات، هەروەها دەبێت مامۆستا کەمێك لەگەڵ خوێندکاران توندبێت.

(تیۆ) وتی: لە(ئۆرشەلیم)یش ئەو ئامۆژگارییەیان کردم. ئەی ئەوەی لەناوەراستی پەرستگاکەدا ژمناستیك دەکات چییە؟

- (لاماگامپۆ) وتی: چەمینەوەو راستبونەوەی شەکەتهێنەرە، بەڵام ئەوە هەتوانی نەخۆشی لەخۆباییبونو غرورییە. باشە بابگەڕێین.

لەناو بومەلێڵی پەرستگاکەدا (تیۆ) پەیکەرێکی (بودا) ئاسای دەم بەپێکەنینو رەنگکراوی بینی، کە دەستەکانی بۆ پێشەوە بردبوو، شاڵێکی لەگەردن بوو، پانتۆڵێکی دەڵبی لەئاوریشمی زەرد لەپێدابوو، لەبەرامبەریدا میحرابێك هەبوو، کەمۆمدانی شێوە گوڵی مینایی رەنگاورەنگ یان مۆمی بەرامبەر دانرابوو.

- (تیۆ) بەخرۆشاوییەوە وتی: (بودا)!

- (لاما) قسەکەی بۆ راستکردەوەو گوتی:نەخێر، بودای ساتوایە، بەڵام ئەگەر پێتخۆش بێت دەتوانی بە (بودا) وێنای بکەیت، چونکە هەرکام لە (بودای ساتوا)کان بەرەو (بێداری) لەجوڵەدان.

- (تیۆ) وتی: گوڵەکان زۆر جوانن.

- پورە (مارتا) وتی: ئەم گوڵانە لە نفیشك دروستکراون.

- لەنفیشك؟. (تیۆ) باوەڕی نەدەکرد، چووە پێشەوەو پەنجە توتەی لێدانو تامی کرد، تێگەیشت بەراستی وایە. وتی: زوو دەتوێتەوە!

- پورە (مارتا) وتی: شش.... لەهیمالایا ئاو کەم نییە، بەڵام هەموو شوێنێك ساردە. لێرە چەوری بۆ ژیان پێویستە. لەبەرئەوە چەوری مادەیەکی گرانبەهایە، وەك ئاو لەهندستان. سەرەڕای ئەوەش لەم ناوچە ساردە نفیشك ناتوێتەوە.

(تیۆ) نزیك بووەوە، (بودا) بەچاوی نیوە داخراوەوە بۆیدەڕوانی. زەردەخەنەیەك لەسەر لێوە ئەستورەكانی نەخشی بەستبوو، كە دەتگوت بۆ هەتا هەتایە خامۆش‌و مەنگە... راهیبە بچوكەكان دەنگیان زیاتر هەڵبڕیبوو. قامچی هاتە خوارەوە، زرمەی تەپڵ بەگەورەیی دەنگی دەدایەوەو دارەكانی سەر زەوی پەرستگاكەی دەجولاند. هێلم، نقیشك، چەوری، خرۆشی گۆرانی بێژان، نیگای تیژی راهیبە منداڵەكان هەمووی توندوتۆڵی‌و سەرسوڕمانی تایبەتیان هەبوو. (تیۆ) هەستی بەتەنگی دەكرد. گرمەی لەرینەوەی بەرزی تەپڵە گەورەكە بەجۆرێك لەبۆشاییدا دەنگی دەدایەوە كە (تیۆ) پێیوابوو پەیكەرە گەورەكە بەپەلەكانییەوە بەسەریدا دەڕمێت. سەری گێژیخواردو لەژێر خەندەی ئالتونی پەیكەرەكەدا كەوت. (لاماگاپۆ) دروست پێشكەوتنی (تیۆ) گرتییەوە. پورە (مارتا) بەنیگەرانییەكی شێتانەوە بینی خوێن لەلوتی هاتوە. (لاما) دەمودەست بۆ دەرەوە فڕاندی سەری بەپشتدا خست‌و تۆپەڵە بەفرێكی هەڵگرت‌و لەسەر ناوچەوانی دایناو بەئارامی وتی:

- هەر ئێستا خوێنەكە دەوەستێت. بێگومان بەهۆی بەرزی شوێنەكەیەوە. نیگەرانی ناوێت.

- پورە (مارتا) هاواریكرد: تۆ باش دەزانیت كە نەخۆشە! لێرە نەخۆشخانە لەكوێ دەستدەكەوێت؟

- (لاما) بەهێواشی وتی: لەنەخۆشخانە باشترمان هەیە. بابێتەوە سەرخۆی بۆ ئەوێ دەچین.

## پزیشكە نامۆكەی دارجیلینگ

كاتێك لەئۆتۆمبیلەكەدا رۆنیشتن (لاما) بە (تیۆ)ی وت: كوڕم، بەمن بڵێ چیڕویدا؟

- (تیۆ) بەهێواشی وتی: نازانم، شەیتانەكان، خەندە، شەكەتی، هەمویان لەیەك ساتدا هاتن.

- (لاماگامپۆ) پژمی‌و گوتی: ئێ.. تەنها شت بەرزی شوێنەكەیەو هیچی دی.

- پورە (مارتا) وتی: بەدڵنیاییەوە بەوجۆرە نییە. من پێشتر ئاگادارم كردیت، كە لەناو ئەو وێنانەی سەر دیوارەكاندا جۆرە شێوەی تێدایە بەسە بۆ تۆقاندنی فەوجێك سەرباز.

- (لاما) وتی: جیهانی وەهمی دەرونی بەوجۆرەیە... ترسناكە. هەر لەبەرئەوەیە ئەو جیهانە پیشان دەدەین تا ترس بكەینە شتێكی ئاسایی. ئێستا دەبێت بەوردی بزانین چ جۆرە ترسێكە؟. (تیۆ)ش دەبێت خۆی وەڵامی ئەو پرسیارە بدۆزێتەوە. بەراستیش چاودێری‌و چارەسەری بكەین.

ئۆتۆمبیلە (ئامباسادۆر)ـەکە، لەبەردەم دوکانێکدا راوەستا، کەریزێك موشتەری نورەیان گرتبوو. (لاما) بەهۆی باری تەندروستی (تیۆ)وە، کە هێشتا خوێن لەبەرلوتیدا مەیی بوو، بەدەنگێکی فەرماندانەوە ریزەکەی بڕیو کاتێك (تیۆ)ی دەبردە ژورێکی تاریکەوە وتی: دکتۆر (لۆبسانگ).. بارێکی بەپەلە.

ژنێکی تەمەن مامناوەندی، بەبەرگێکی سپی درێژەوە لەسەرچوارپاییەك رۆنیشتبوو بەبێ درکاندنی وشەیەك کەوتە پشکنینی (تیۆ). پاشان (تیۆ)ی بەرامبەر خۆی داناو رەنگی روخسارە جوانەکەی پەڕی. پاش پرسیارێکی زۆر دەربارەی پشودان، خەو، باوێشکدان، ئازاری رانەکان، سەرگێژخواردنو رشانەوە، کە هەمووی بەهۆی (لاما)وە وەردەگێڕدرا، گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی (تیۆ) ئاوێتەبونی هەوا (Rlung)ی هەیەو ئازارەکەی لەجگەردایەو ئێستا فشاری خوێنی بۆ دەگرێت.

دکتۆر (لوبسانگ) چاوەکانی خۆی داخستو خۆی خستە بارێکی ئارامەوەو هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو لەسینەیدا رایگرتو پەنجەکانی دۆشاومژە، باڵایەرزەو برای توتەی دەستە راستی لەسەر دەمارەکانی دەستە چەپی (تیۆ) داناو بەهێزێکی سەیرەوە فشاری لەسەردانا. چەندین چرکەو خولەك بەوجۆرە تێپەڕی، پاشان بەسێ پەنجەی دەستی چەپی خۆی هەمان پرۆسەی لەسەر دەستی راستی (تیۆ) ئەنجامدا. بێدەنگی باڵی بەسەر ئەوێدا کێشابوو. سەرئەنجام پزیشکەکە چاوەکانی کردەوەو هەناسەی دایەوەو بەدرێژی کەوتە قسەکردن لەگەڵ (لاما)، کە کورتەکەی ئەوەبوو:

- راستە نەخۆشییەکەی سەختە. نەلەخۆراکەوەیەو نەکەشو هەواو ناوچە. دیارە لە سێکسیشەوە نییە... لەهیچ بەلایەکی سەر زەوییەوە نییە. (لوبسانگ)ی پزیشك لەوبڕوایەدایە نەخۆشییەکەی (تیۆ) سەرچاوەکەی خراپەیەکەو رۆحێکی ژێر خاك تەندروستی وێران دەکات. ئەوەش کەسێکە بێگومان لەژیانی پێشوی (تیۆ)دا بەدەستی ئەو کوژراوە.

- (تیۆ) بەخەمساردیو تانەوە وتی: دیارە دەبینیت من روخساری پیاوکوژێکم هەیەو هەموو کەس لەیەکەم بینینەوە تێبینی ئەوەم دەکات!

- (لاماگامپۆ) درێژەپێیدا: لێدانی دڵی لاوازەو جێگیرییەکی نائاسایی هەیە، ئەمەش بەو واتایەیە، کە فشاری خوێنی ناوەوە لەنزمترین ئاستدایە. (لوبسانگ)ی پزیشك بەپەنجە گەورەی

دەستە چەپی ڕێڕەوی دەمارە خراپبووەکانی دیاریکردوە. دەبێت بە خێرایی نەشتەرگەری بۆ ئەنجام بدرێتو لەپێش هەموو شتێکەوە لەخۆراکی تاڵ، تفت دورکەوێتەوەو زیاد (چا) نەخواتەوە.

- (تیۆ) وتی: سەبارەت بە (چا) ناتوانم.

- (لاما) بەردەوامبوو: دووەم دەبێت شەکر، ترشیو شتی قەبزی بخوات؛ شەربەتی لیمۆ زۆرباشە. سەبارەت بەدەرمانی ئەوەی پێویست بێت لای پزیشکەکە خۆی دەستدەکەوێت: زیو، خوێ، ئاسن، سەدەفی خڕ، گوڵەزەعفەرانو چەوری جگەری بەراز.

- (تیۆ)، کە لەتاوترسو سڵکردنەوە لەباری مەرگدابوو، وتی: چەوری جگەری بەراز لەگەڵ زەعفەرانی زیوییو کانزاو سەدەف! هەر راچێتەکە ئەخۆم!

لەهەمان کاتدا پزیشکەکە سەری چەند قوتوی بەستراوی کردەوەو بەوردی پارچەی نەزانراوی لێدەردەهێناو خەریکی دابەشکردنی یەکسانو رۆکردنی بۆ ناو لولەی بچوك بوو. پورە (مارتا) دەرمانەکانی وەرگرتو نرخەکەیانی پێدا. پزیشکەکە خەندەیەکی کردو دەستی بەرومەتی (تیۆ)دا هێناو جارێکی دیکە لەگەڵ (لاما) کەوتە قسەکردنو ئەویش بەمجۆرە وەریگێڕا...

- دەڵێت پێویستە هاوکات لەگەڵ ئەو دەرمانانە جەستەی بەڕۆنی (ئاڤوکا) بهەنونو ئەگەر دەرمانەکان باشو بەردەوام بەکاربێنێت چارەسەردەبێت. چونکە پزیشکی (تبت) تاکە چارەسەرە بۆ نەخۆشییەکەی (تیۆ).

- (تیۆ)، کەنیگەرانی گەروی دەگوشی، دەستە لەرزۆکەکانی بۆ سوپاسکردنی خانمی (تبت)ی درێژکرد. پزیشکەکە دەستی (تیۆ)ی گرتو ماچی ئەنگوستیلەکەی پەنجەی (تیۆ)ی کرد، کە هی دایکی بوو. هەرچەندە ئەوکارە شتێکی ئاسایی و باوبوو، بەڵام دڵنیاییەکی لە (تیۆ)دا دروستکرد، بەتایبەتی کە ماچەکەی بۆسەر ئەنگوستیلەکەی دایکی بوو. پزیشکەکە خەنییەوە. کاتێك لەوێ هاتنە دەرەوە پورە (مارتا) پرسی: ئەوە کێیە؟

- (لاماگامپۆ) وەڵامیدایەوە: دکتۆر (لوبسانگ دڤرژە) یەکێکە لەبەناوبانگترین پزیشکەکانمان. لەزۆر شوێنی دەرەوە بۆ چارەسەرکردن دێنەلای.

- چۆن هەروا بەو خێراییە توانی نەخۆشییەکەی دیاریبکات.

- ئەوە جۆرێکە لەدیاریکردنی پزیشکانەی مۆدێلی (تبت)ی، ئەگەر بەباشی رێچکەی پەرینەوەی دەمارەکانی جەستە بناسرێت دەتوانرێت بەفشارخستنە سەرخاڵێکی گونجاو وردبونەوەیەکی تەواو بابەتی نەخۆشییەکە دیاریبکرێتو چارەسەری پێبدرێت.

- پورە (مارتا) وتی: ئێ بەوردی، هەرلەبەرئەوەشبوو هەناسەی خۆیگرت.

- (لاما) وتی: بۆ ئەوەی هەست بەلێدانە جۆبەجۆرەکانی نەخۆشەکە بکات. ئەم شێوازە کۆنە پزیشکییە لە (چین)ەوە بۆ ئێرە هاتوە.

- (تیۆ) وتی: جادوگەرییە.

- (لاما) بە پێکەنینەوە گوتی: لەراستیدا، بەو مەرجەی لەوە بگەین، کە لەو سیحرو جادوگەرییەدا هیچ شتێکی نالۆژیکی لەئارادا نییە، رۆح دەتوانێت هەموو شتێك بەسەر جەستەدا پیادەبکات. بەڵام بۆ چارەسەرکردن پێویستە پەیرەوی لە رژێمێکی خۆراکی بکرێتو دەرمانە رێپێدراوەکانیش بەکاربهێنرێت. ئاخ.. خەریکبوو لەیادی بکەم، بەبڕوای من پێویست بوو هەموو دەرمانەکانی دیکەت رابگریت. لەوبڕوایەدام چارەسەری نەخۆشییەکەی لەدەرەوەی بازنەی ئەو دەرمانانەی ئێوەدایە. دیارە ئەمە تەنها ئامۆژگارییەو بەس.

## پشکخستنێکی گران

دەستبەردان لەهەموو چارەسەرکردنەکانی دیکە! دایكو باوکی (تیۆ) چی دەڵێن؟

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: بۆ ئەوکارە دەبێت مۆڵەت لەپاریس بخوازین.

- (لاما) بەراگەیاندنێکی سوکایەتییەوە وتی: لە پاریس؟ پزیشکەکانی خۆرئاوا ناتوانن هیچ بکەن، خودی خۆشت چەندینجار ئەمەت بۆ من دوبارە کردۆتەوە!

- بەڵام تۆ دایكو باوکی ئەوت لەیاد کردوە.

- (لاما) وتی: دیارە ئەوە راستە... کەواتە دەپارێمەوە رازی ببن.

لەتەلەفونەکەدا (میلینا) کەوتە هاوارکردن. دەیوت دەیانەوێت (تیۆ)کەی بکوژن!. دەیزانی ئەو گەشتە کارێکی شێتئاسای روتەو (تیۆ) بەزیندوێتی ناگەرێتەوە...

- پورە (مارتا) لەلای خۆیەوە بەتوڕەییەوە بەسەریدا دەیقیژاند: وا دەزانیت لەپاریس بەزیندوێتی دەمێنێتەوە؟

دایکی (تیۆ) کەوتبوە گریانو فیغان. پورە (مارتا) تاتوانی دڵیدایەوەو داوای براکەی کرد، چونکە دەیتوانی لەگەڵ (ژروم) باشتر پرسەکە باس بکات، کەخۆی پیاوی زانست بوو؛ هێشتا هیوا مابوو.

- (ژروم) گوێبگرە... لێرەدا چ مەترسییەك هەیە؟ تاقیگا پزیشکییەکان بەهیچ ئەنجامێك نەگەیشتونو تێبینی پێشکەوتن ناکرێت. راستە نەخۆشییەکە پێشکەوتنی بەخۆوە نەبینیوە، بەلام هەلومەرجەکەش وەك خۆیەتی، بهێڵە هەوڵێکی دیکە بدەم.

- (ژروم) بەهێمنی وتی: ئەزانی ئەو بڕیارە چەند گرنگە؟

- پورە (مارتا) وتی: ئەی کەواتە بۆچی لە (دارجیلینگ)ەوە تەلەفۆنت بۆ دەکەم؟. هەڵبەتە دەزانم بڕیارێکی گەلەك گرانە.

لەوبەری هێڵی تەلەفونەکەوە بێدەنگی زاڵبوو.

- سەرئەنجام (ژروم) وتی: باشە، وابزانم تۆ راستدەکەیت. هەروەها ئێستا پزیشکییە فەرمنسییەکان سەرقاڵی لێکۆڵینەوەن لەپزیشکایەتی (تبت). باشە، رازیم، ئەو چارەسەرانە راگرە.

- پورە (مارتا) وتی: ئۆف... منیش هەرئەوەم پێباشە.

- پەلەمەکە... بەلام لەجیاتی هەفتەی تەلەفۆنێك هەموو رۆژێك تەلەفۆن بکە.

- رێکەوتین.

(تیۆ) پاکەتە بچوکەکانی لەکیسەیەك هاویشتو دەستیکرد بەبەکارهێنانی دەرمانە (تبت)ییەکان. ئەوەی گرنگ بوو هەر رۆژی دواتر هەستیکرد تەندروستی باشترە. شەو لەخەونیدا بینی لەقولایی رەواڵەتێکی نامۆدا تواوەتەوە، کە باسکی سپیو قاچی رەش پێکەوەن. ئەم خەونە لەپرێکدا بێداری کردەوە.

## ئابە[1]، چا، نڤیشك و نزا

(لاما) سوپاسی ئەو خواوەندە ئاشتیخوازانەی كرد بەسەر شەیتانەكاندا زاڵ ببون و ئاشەكانی نزای بەگەڕخست.

- (تیۆ) بەگوێی پورە (مارتا)دا چرپاندی: دەزانیت؟ بە (تریشقەی پیرۆز) دەچێت.
- پورە (مارتا) سەریسوڕما: تریشقەی پیرۆز؟ مەبەستت چییە؟
- قەشەی (بۆم... بۆمەكەی تبت)، ئەو قەشەیەی لەسەر زەوییەوە بەرز دەبێتەوەو لەجیهانی ئەندێشەدا وێنەكان دەبینێت... (لاماگامپۆ) بەبێ چاویلكە دروست وەك بەو قەشەیە دەچێت.. سوێند دەخۆم، لەوباوەڕەدایت ئەمیش بتوانێت بفڕێت و لەسەر زەوی بەرزبێتەوە؟
- پورە (مارتا) هەناسەی هەڵكێشاو گوتی: باشە بابزانم. خۆت ناتەوێت ئەوەی لەگەڵدا باس بكەیت؟ ها؟ بەڵێ؟ بەڵام درەنگبوو ...

(تیۆ) بەرەو (لاما) رایكردبوو تائەو پرسیارەی لێبكات، بەڵام (لاما) زۆر پێكەنی.

پورە (مارتا) بەسەراسیمەبونەوە پرسی: بیبەخشە! بەهۆی خوێندنەوەی كتێبەكانی (تۆم تۆم)ـەوەیە.

- (لاماگامپۆ) بەخەندەوە وتی: پێویست بەپۆزش هێنانەوە ناكات. لەفەڕەنسا هەموو رۆژێك ئەو پرسیارەم لێدەكەن. سەرەڕای ئەوەش (تیۆ) من دڵنیام واتای وشەی (دارجیلینگ) نازانێت. ئەم وشەیە بەواتای (شاری هەورەتریشقە)یە...
- ئێستا بابچین بۆ سەردانی ئابەی قەشەمان.

(ئابە) لەكوخێكی بچوكی پشتەبانەكەدا دەژیا. هێندە بەتەمەن بوو، كە دەبوو میوانەكان لەنزایەكی خێرو پیرۆزی و خواردنەوەی پیاڵە چایەك زیاتر نەوەستن. (ئابە) بەجلە كۆنەكانی، سەری تاشراو، ریشێكی كەمو چاوانێكی بێدرەوشانەوەو وێڵبوی ناو جیهانی خەونەكانەوە تەنانەت تێبینی چوونە ژورەوەی ئەمانی نەكرد. چەند پارچە كاغەزێكی بەدەستەوەبوو، كە چەند دەقێكی پیرۆزی لەسەر تۆماركرابوو؛ بەچاوە شەكەتەكانی بەوردی

١ - Abbe: لە كلێسای كاثۆلیكی و ئەرسەدۆكسدا نازناوێكە بەسەرپەرشتانی (دێر)ەكان.

دەیخوێندنـــەوە، پاشــان کاتێــك (لامــا) لەبەردەمیــدا گــەورەیی نوانــد چــاوەکانی هــەڵبڕیو خەندەیەکی کـەمی خسـتە سـەر لێوەکـانیو کاغـەزەکانی کـۆکردەوەو چاوەڕوانی پرسـیارەکانی بوو. لەتەرمۆزیەکی چینی نەخشێنراو بەگوڵ چایەکی بەناوبانگی نفیشکی لەکوپێك کرابوو.

- (تیۆ) بەبێ ئۆقرەییەوە وتی: بەڵێ، ئەڵێی شیر قاوەیە، بەڵام سوێرە.

- (لامـا) وتـی: سـوێرییەکەی بـەو هۆیەوەیـە ئـاوی سـوێری تێدەکـەن، رەنگـە نارنجییەکـەی دەبینیت؟

- (تیۆ) سەیرێکی کردو گوتی: تامی تیژی تیا دەبینم.

- (لاما) وتی: پارچەی نفیشکە.

- (تیۆ) وتی: لەڕاستیدا هەویرییە.

- (لاما) وتی: بەڵێ، چونکە کوڵێنراوە. بەتایبەتی بۆ سەرما زۆر کاریگەرە. پاش دوو رۆژ واخوی پێوە دەگریت ناتوانیت دەستبەرداری ببیت.

- پورە (مارتا) چرپاندی: بەلایەنی کەمەوە سوپاسێکی بکە.

- (تیـۆ)، کەنەیـدەزانی چـۆن سوپاسـگوزاری بکـات، هـەردوو دەسـتی پێکـەوە جـوت کـرد. روخساری پیرەپیاوەکـە تێکشکاو بەدەسـتی لەرزۆکـەوە بەرەکـەتی پێبەخـشی. (لامـا) دەسـتی (تیۆ)ی گرتبوو، پـورە (مارتـا)ش وەك پیـشەی خـۆی لەدوایانـەوە دەڕۆیـشت، سێ بەسـێ هاتنـە دەرەوە.

- پاش دوورکەوتنەوەیان (تیۆ) وتی: هەرگیز کەسێکی هێندە بەتەمەنم نەبینیوە.

- (لاما) وتی: بەڵێ زۆر بەتەمەنە. زیاتر لەسەد ساڵ تەمەنی هەیە.

- (تیۆ) بەدەنگێکی لەرزۆك، کە ئاماژەی خەفەتی تێدابوو، وتی: چـۆن بـەو تەمەنـە دەگـەن. من تەنانەت دڵنیانیم بە پانزە ساڵیش بگەم.

- چـونکە کحـول ناخۆنـەوە. جگـەرە ناکێـشن، زیـادەڕۆیی ناکـەن، رازونیـاز دەکـەنو چـای نفیشکی دەخۆنەوە. تۆش ئەو شێوازە تاقیبکەرەوە دەتوانیت بیبینیت.

- (تیۆ) وتی: چا لێنان لەوانەیە، بەڵام رازو نیازو نزا نازانم.

- (لاما) وتی: چۆن! خۆتۆ لەبەردەم (بودای ساتۆ)دا ئەومت ئەنجامدا.

- لوت پژان خواپەرستییە؟

- (لاما) بەواتاوە وتی: نەخێر، دروست پێشئەوە.

- دروست پێشئەوە؟ چی رویدابوو؟ پەیکەرەکە نوشتابۆوەو...

- (لاما) وتی: تۆ لەناو خەندەکەی ئەودا سڕایتەوە. وانییە؟
- (تیۆ) وتی: بەڵێ، ئەگەر خواپەرستیو ڕازو نیاز ئەوەبێت کەواتە ئێستا دەیزانم.
- (لاما) دەستی گوشیو (تیۆ) خامۆش بوو. پڕ بەسییەکانی هەناسەیەکی هەڵمژی.
- لەناکاو لەناو بێدەنگیدا دەنگی پورە (مارتا) بەرزبۆوە: ئێوە باسی چی بۆ یەکدی دەکەن؟ نەکەی بۆ کەسێکی سۆفیو عیرفانی بگۆڕیت؟

(لاما) وتی: پێویست ناکات. هەر لەسەرەتای لەدایکبوونیەوە خۆی وابووە، هیچ گومانێك لەژیانی رابردوی نییە.

## هەورەتریشقە - خەنجەر

رۆژی دواتر (لاما) میوانەکانی بۆ ئۆردوگای پەنابەرانی (تبت) برد، کە هەراو زەنایەکی زۆری تێدابوو. لەبەردەرگای ئۆردوگاکەدا جۆرەها شتی ئاینی دەفرۆشرا، کە (تیۆ) ئارەزووی دەکرد نمونەیان لێبکڕێت. (سیخ)ەکانی لەکانزای جۆراوجۆر دروستکرابونو گۆرانی سەیریان دەوت. کاسەیەك، کەکاتێك بەدارێکی بچوك لەلێوارەکەی بدرایە دەنگێکی سەیرو نامۆی لێبەرز دەبۆوە. ئاشێکی بچوکی مسینی دەستکرد.

- (لاما) پێشنیاری کرد: ئاشەکە بکەرەوە، لەناویدا نزاکان دەبینیت.
- (تیۆ) بەگوێی کردو لەناو ئاشەکەداو لەکۆتایی خولگەکەیدا دەستەیەك کاغەز دەبینرا.
- (تیۆ) بە کۆکەوە وتی: زمانی (تبت)ی نازانم.
- هەوڵبدە.
- (تیۆ) بەسەر سوڕمانو سەرسامییەوە نوسینەکەی خوێندەوە: **(من، کە لەناو دڵی مەزنترین شاری گەورەترین دورگەی ناو دورگەکانم، حیکمەت بەکۆچبەرانی خاوەن بەهرە دەبەخشم، چونکە من نەخوایەکم، نەقەدیس. من کوڕێکی نائاسایی رووە ناشیرینەکانم)**
- (تیۆ)، کە لەخرۆشاویدا سورهەڵگەڕابوو گوتی: سەیرە!
- (لاما) وتی: ئێستا دەبێت بیربکەیتەوە، ئەو بیرکردنەوەیەش خوا پەرستییە، نزاکردنە، دەزانیت...
- وامەدزانی نازانم، بەڵام گومان پەیدادەکەم لەوەی دەیبینم. هونەربازی ئێوە، ئبلیسەکانتان، خواکانتان، خەندەکانتان... وڕبوم، سەرم گێژ دەخوات.

- (لاما) وتی: زۆرباشە، ئەوەش پێویستە. لەهەمانکاتدا بیرکردنەوە جۆرێکە لەمەشق و وەرزش. بیگرە ئەمە دیاری منە.

لەسەر رەفەکە خەنجەرێکی سەیری برۆنزی بەئاڵتون رووکەش کراوی هەلگرت. نوکی خەنجەرەکە سێ پارچە بوو. دەسکەکەی لە سێ روخساری ناشیرین پێکهاتبوو. دوابەشی دەسکەکەی لەشێوەی هەژدیهایەکدا هەڵکۆڵرابوو. سەرەڕای ئەوەش زۆر قورس بوو.

- (تیۆ) وەك ئەوەی لە شتێکی نهێنی وردبێتەوە وتی: زۆرسوپاس.

- (لاما) وتی: کەمێك تۆقێنەرە، وانییە؟ رێگا بدە رونیبکەمەوە، راهیبەکانی (تبت)یش وەك (یۆگی)یەکانی هندستان گرنگی زۆر بەمەرگ، رامانو خەڵوەت دەدەن. چونکە کاتێك راهیبەکان دڵنیابون بەقۆناغی کامڵبون نەگەیشتون ئیدی دەزانن لەبێکۆتادا شینابنەوەو بەیەقین دەگەن، کە جارێکی دیکە بۆ (دونادون) دەچنو لەبەرئەوە دەمرن، جێگای ترس نەبوو، هەر ئەو بابەتەش هۆکاری گەورەی نهێنی مردنە لەشتە زیندووەکاندا. هەندێکجار بۆ ئاو خواردنەوە جامولکەیەکیان بەدەستەوە دەگرت، کە لەدوو نیوەی کاسە سەری مردویەکی روپۆشکراو بەکانزا ئامادەکرابوو.

- (تیۆ) بەترسەوە وتی: کاسە سەرێکی راستەقینە.

- بەڵێ، راستەقینە. بەوجۆرە دەیانتوانی سروشتی ناپایەدار بناسن، کە جەستەی مرۆڤ یەکێکە لەسەغڵەترین دیاردەو روەکانی. هەروەها دەیانزانی چۆن کاسەسەری ئەم (لاماگامپۆ)ـە، بۆ جامولکەیەکی ئاو خواردنەوە بگۆڕن بۆ (لاما)یەکی دیکە. لەو هزرەدا هیچ شتێك مایەی نیگەرانی نەبوو، بەپێچەوانەوە بیرۆکەیەك بوو شەقڵی بەژیان دەبەخشی، چونکە (بودای ساتواس)ـەکان هەوڵیاندەدا تا (بودا)ییەکانی (تبت) بەرەو حیکمەتو دانایی رێنوێنی بکەن. لەو بڕوایەدابون، چەندە مرۆڤ دەربارەی مەرگی خۆی هۆشمەندی زیاتری هەبێت، تەندروستترەو بێگومان بەختیاری بەدەستدێنێت.

- پورە (مارتا) درێژەیپێدا: لەفەرەنساش، لەسەدەکانی رابردودا، کاتۆلیکە زۆر ئیماندارەکان بەرامبەر بەکاسەسەرێك دادەنیشتنو دەکەوتنە باری رامانەوە. وەك دەبینرێت ئایندەی سەرەکیو بنەڕەتی یەك شتەو لەبنچینەدا لەبابەتێکی (تەورات)ـەوە وەرگیراوە، کە دەڵێت: (خۆپەرستی، خۆپەرستەکان، هەموو شتێ خۆپەرستییە).

- (لاما) وتی: نەخێر. ئەمە لەگەڵ ئاینی ئێمەدا گەلەك جیاوازە. ئێمە لەحیهانی نائومێدیدا ناچینە رامان و خەڵوەتەوە. بەپێچەوانەوە، (رێگای ناوەڕاست) لەعەدەم روانین نییە. گومانی تێدانییە ئێمەش دەتوانین بڵێین (وەهم، هەموو شت جگە لەوەهم هیچی دیکە نییە). بەڵام مامۆستا گەورەکانمان، ئەو پایە بەرزانە دەتوانن بەبێ هیچ وەهمێك دۆنادونی رۆحی ئایندەی خۆیانمان پیشان بدەن. کاتێك دەمرن مۆمیایان دەکەین پێش بەخاك سپاردنیان یەك ساڵ چاوەنواڕیان دەکێشین، پاشان بەدووی ئەو منداڵەدا دەگەڕێین رۆحی مامۆستای گەورەمانی هەڵگرتووە.

- (تیۆ) هاواریکرد: دەزانم، ئێوە شێوازێکتان بۆ ناسینەوەی...

- ئێمە شتی ئاشنای جۆراوجۆر پیشانی منداڵەکە دەدەین، کەلە پرێکدا خۆبەخۆ تاکە شتێکی پەیوەستە بەمامۆستاوە هەڵیدەبژێرێت و هەڵیدەگرێت. ئیدی ئەو منداڵەی هێشتا پێینەگرتوە وەك دونادونێکی نوێ تەماشا دەکرێت، چونکە گەورەکان و مامۆستا پلە بەرزەکانمان بەدرێژایی سەدەکان هەمیشە ئامادەییان هەبووە. بەمپێیە مەرگ هیچ نییە، تەنها کاسە سەرێکی دەفەر ئاسای کاتی و تێپەڕە.

- (تیۆ)، کە خەنجەرەکەی لەسەر زەوی دادەنا، وتی: نەخێر، ئەمە لەلای من سەرنجڕاکێش نییە.

- (لاما) وتی: پەلەمەکە. ئینجا (لاما) رونیکردەوە: مەبەستی تەنها ئەوەنەبوو دەربارەی کەللە سەرەکان قسەبکات. خەنجەرەکە تەنها بۆ رشتنی خوێنی کەس نییە، بەهیچ شێوەیەك، چونکە میهرەبانی بۆ هەموو بونەوەرانی زیندوو لەئاینی بودادا رێگرە لەبەردەم بەکارهێنانیداو تەنها بۆ لێدانی جەستەی ئبلیسانی ژێر خاکەو ئەوەش بە (فوربوو - Phurbu) ناودەبرێت، کە بەواتای (خەنجەر - هەوردتریشقە)یە.

- (لاماگامپۆ) بۆئەوەی بابەتەکە زیاتر شیبکاتەوە وتی: لەسەردەسکی خەنجەرەکە پێنج کەللە سەری مرۆڤ هەیە، چونکە توخم و هەوەسەکان پێنج دانەن، کە ژمارەی حیکمەتەکانە. لەناو کەللەسەری بەتاڵی مرۆڤدا خۆفریودان بونی نییە، چونکە خۆفریودان لەمێشکدایە، ئەو مێشکە سەیرەی کە هەرگیز لەبیرکردنەوە ناوەستێ...

- (تیۆ) وتی: سەیرە، شێخ سلێمانیش لە ئۆرشەلیم هەمان شتی بەمن راگەیاند!

- بەڵێ. راگرتنی هزرو بیرۆکەکانی ئاسان نییە!. (تیۆ) ئەوانە وەهمن... لەهەموو ئەوانە گرنگتر لەمێشکدایە لە پنتێکی بەرزتر لەهەموان و ئێمە بە (کرۆك) ناوی دەبەین. کاسەی سەر نوێنەری رواڵەتی ئەو کرۆکەیە، نوێنەرێك بە کرۆکی راستەقینە و واقعی، لە روناکی پاك.

- (تیـۆ) بـەهێمنی وتـی: دەتوانیـت ئـەو خەنجـەرەم بـدەیتێ تـامن دەسـت هـەڵبگرم لەپەرێشانحاڵی؟

- (لاما) بەشەرمەوە وتی: چونکە تۆ منت بە (تریـشقەی پیرۆز) بـەراورد کـرد، منـیش بـیرم کردەوە ئەمە ناو بنێم (خەنجەری تریشقە).!

- سوپاس.

- (خەنجەر – تریشقە)کەت ئاشتیو ئارامی دێنێت، دڵنیام.

- (تیۆ)، کە گەنجینە گرانبەهاکەی بەدەستەوە گرتبوو، گـوتی: زۆرباشـە، بـەڵام کاسەسـەرم ناوێت.

- (لاما) پێکەنی.

- لەدوکانـە توریـستییەکەی بـەردەم ئۆردوگاکـە کاسەسـەر نەدەفرۆشـرا. لەوێـدا تـەنها شـتی بێمەترسی هەبون. کە بۆ مەبەستی کۆمەك کردن بوو بەو پەناهەندانەی دەچوونە (تبت).

- (لاما) دەناسەیەکی تۆڵی هەڵمژیو گوتی: کۆچەری!

- (تیۆ) وتی: سەیرە، هەمان وشەیە، کە لەپەیامە نوێکەی مندا بەکارهێنراوە.

## نابودترین حەکیمەکان

لـە هۆتێلەکـەدا (تیـۆ) نغـرۆی بیرکردنـەوەبوو. دورگەیـەك لـەنێو دورگەکانـدا... کۆمەڵـە دورگەیـەك. ئەتڵەسـەکەی کـردەوە. کۆمـەڵێك دورگـەی زۆرهـەبون. بـەپێی وەسـفەکانی ئـەو (ژاپۆن)بوو... (تۆکیۆ)یە؟

- پورە (مارتا) وتی: کۆمەڵەی کۆچبەر لە ژاپۆن نییە.

- کۆچبەران لەراستیدا کێن؟

- وتی: ئەو کەسانەی پێیان باش بووە لەوڵاتێکی دیکەدا کاربکەن.

- (تیۆ) بیری لە(ئەندەنوسیا) کردەوەو گوتی: لەوێ چ جۆرە خەڵکانێك دەژین؟

- پـورە (مارتـا) وەڵامیدایـەوە وتـی: زۆرینـەی خـەڵکی ئەندەنوسـیا موسڵمانن. ژمارەیـەکی زۆریش هندۆسی. ئەو گروپە پێشتر هەمویان (ئانی میست)بون، وەك بەشێك لەئـەفریقا، بـەڵام کۆمەڵێکی دیکەش بۆ بازرگانی چونەتە ئەوێو لەوێ نیشتەجێبون.

کەواتە دەکرێت بوترێت، کە ئەو بازرگانانە هەمان ئەو کۆچبەرانەن؟

- پورە (مارتا) رونیکردەوە: دەکرێت بەکۆچبەر دابنرێن. بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەی، کە ئەو گروپەی دواییان لە کوێوە هاتبون، وتی: باشترە بەدوای ئەو کورە زۆر ناشیرینەدا بگەرێیت... لەناو فەرهەنگی ئاینەکاندایە؟

- لە فەرهەنگی ئاینەکاندا خوایانی روخسار ناشیرین گەلێك بون. لە یۆنان (هیفا لستۆس)[1]ی ئاسنگەر، زۆر ناشیرین بوو. لەهندستان (کالی) بەسیمایەکی تۆقێنەرەوە، لە (تبت) ئبلیسەکان بەروخساری ناشیرینو پێکەنیناوییەوە. لە مەکسیك، لە بەرازیل، لە ئەفریقا... هەریەکە لەویدی ناشیرینترو نابودتر!

- پورە (مارتا) وتی: بەڵام خۆ پەیامەکە باس لەخوایەکی سیما ناشیرین ناکات. ئەگەر مرۆڤ بێت چی؟

- (تیۆ) بەوردبینەوە لەفەرهەنگەکەی روانی. (سوکرات) بەڵام ئەم کۆچبەر نەبوو. (عیسا) ناشیرین نەبوو. پاشان سیمای کابرایەکی بینی، کەمووەکانی سەری رەق راوەستابون، بەچاوی دەرپۆقیوەوە،دوو ددانی بەسەر لچیدا هاتبونە دەرەوە. (تیۆ) بەخۆی وت: ئەمە بەراستی ناشیرینە. ناوی چییە؟ (کنف – وس – یوس)؟ کێ؟ ئاها! چینییە. لە پورە (مارتا)ی پرسی: ئەو بازرگانانەی تۆ لەچینەوە هاتبون.

دروستە.

- ئێستا ئەوەی مابوو دیاریکردنی مەزنترین شار لەناو گەورەترین دورگەی ناو کۆمەڵە دورگەی (ئەندەنوسیا)بوو. (جاکارتا) لە دورگەی (جاوە).

- پورە (مارتا) هاواریکرد: ئافەرین! ئەمجارە زوو سەرکەوتوو بوویت!

- (تیۆ) بەلەخۆبایبونەوە وتی: بینیت؟ ئەمە کاریگەری تریشقەی پیرۆزە!

- ئەی دەرمانە تازەکانت چۆنە؟

- (تیۆ) روی خۆی ترشاندو گوتی: وەك هەموو دەرمانەکانی دیکەیە، خراپە! ئایا لە (جاکارتا)ش پزیشکی دیکە دەبینین؟

- پورە (مارتا) وتی: چینییەکان لەهەر جێگایەك بن پزیشکی گرنگیش لەوێ هەیە. تارادەیەك وەك خاتونەکەی (دارجیلینگ).

- (تیۆ) بەسەرسورمانەوە پرسی: ئەی بۆچی راستەوخۆ بۆ چین نەرۆین؟ ئەوە ئاسانترە!

---

١. Hephaa Istos بەرامبەر بە (ڤولکان) لە ئەفسانەی رۆما، لە خواکانی ئۆلۆمپییەو ئاسنگەری خواکانە. لەحەنگی تەروادە دروستکەر زرێپۆشی بەناوبانگی (ئشیل)ە.

- پوره (مارتا) رونیکردەوە: هێندەش ئاسان نییە. سەرەتا یەکەمین ئاینی چینی لەسەر دوو تەوەرەی کات‌و شوێن وەستابوو، کە بینینی ئاسان نییە. ئاساییە دوو کەس نەتوانن بەئاسانی حەوت هەزار پلیکانەی میحرابی (تایپمان) بۆ سەرەوە بڕن، کە لەلوتکەیدا، واتا لەبەرزی هەزارو پێنج سەدو چل‌و پێنج مەتردا، هیچ نابینرێت. جگە لەو نوسراوانەی پاشاکانی چین پێگەی پەرینەوەکانی خۆیان تێداتۆمار کردووە؛ ئیدی بۆشاییو بەتاڵاییەکی بێپایانە. سەرکەوتن بەسەر (پلیکانەکانی ئاسمان)دا گرنگترین سەردان بووە لەچین، چونکە رۆحەکان بۆ ئەوێ هەڵدەفڕین تا لەخۆنواندنەوەی ژیاندا بگەڕێنەوە سەر زەوی، بەڵام (تیۆ) نەیدەتوانی وەرزشێکی لەوجۆرە شەکەتهێنەری پێویستی بەوزەو توانایەکی زۆربوو ئەزمون بکات، چونکە لەچین خواپەرستی میوانان بریتی بوو لەهەوڵوتەقەلا بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەو پلیکانانەداو تەحەمول کردنی ئەو رێگایە.

- (تیۆ) وتی: - زۆرباشە، بەڵام لەراستیدا هیچ شتێکی دیکە نییە؟

- پوره (مارتا) خۆی لەسەر کورسییەکە چاککردو گوتی: چۆن؟ چەند شوێنی پیرۆزی دیکەش هەیە. پرسەکە لەوێدابوو پوره (مارتا) هەرگیز نەیدەتوانی فیزای وڵاتی چین وەربگرێت و رونیکردەوە، کە چەند ساڵ لەوەوپێش لە (پەکین) کاتی خۆی لە خۆپیشاندانە قەدەغەکراوەکان نزیککردبۆوەو مشتێکی پڕ بەدڵی خۆی بەدەستی پیاوانی پۆلیس خواردبوو.

- (تیۆ) وتی: روداوێکی سەیرە! کەواتە هیچ ناکرێت.

- نەخێر، چونکە ئاینەکانی چین زیاتر لەناو کۆچبەراندا بەردەوامبوو. لە (جاکارتا) دەتوانرێت بەئاسانی ئاشنایەتیان لەگەڵ پەیدابکرێت.

- (تیۆ) هەناسەیەکی هەڵمژیو گوتی: زۆرباشە. ئێستا کەبەمجۆرەیە باوابێت. زۆر ئارەزوم دەکرد چین ببینم. کاتێك گەورەبوم دەچم. بەراست چۆنە بۆ پاریس تەلەفۆن بکەین؟ باباوکم سەغڵەت نەبێت. پوره (مارتا) تێبینیکرد یەکەمجارە (تیۆ) باس لەئایندەو گەورەبونی دەکات.

## دوو ملپێچی سپی

پێش دەرچونیان (تیۆ) یەك بەیەکی دوکانەکانی دەوروبەری مەیدانی ناوەراستی پشکنی، کە ئەسپی کورتەباڵای یاڵ بۆر لەهاتوچۆدا بوو. بەدوای (چا)دا دەگەڕا!، (چا)کەی خۆی دەویویست!. پوره (مارتا) لەسەر راخەری فرۆشیارێك کۆمەڵێکی بینیو دایە دەست (تیۆ). (تیۆ) کە لولەکەکەی لەلوتی نزیك کردەوەو بۆنیکرد وتی:

- شتێکی سەیرە بۆنی خۆش نییە. چییە؟ توتنە؟
- پورە (مارتا) وتی: نەخێر، هەمان (چا)کەی تۆیە.

(تیۆ) بەگومانەوە لەلولەکەی روانی.

- پورە (مارتا) رونیکردەوە، کە خەڵکی تبت گەڵای چا لەسەر یەك دادەنێنو بەیەکییەوە چەسپ دەکەنو (چا)ی پەستێنراوی لێدروست دەکەنو لەو مادە قاوەییە رەنگەیە بە نقیشکەوە دەیکولێننو ئەو کولاوە تایبەتەی لێدروست دەکەن. (چایەکی سەیرو سەمەرەیە).
- (تیۆ) وتی: بەڵام چای خۆش لە (دارجیلینگ)ە، تکادەکەم...
- پورە (مارتا) رونیکردەوە، کە بەوجۆرەنییەو باشترین چای هندستانی هەناردەی دەرەوە دەکرێت.
- (تیۆ) رازیبوو بۆ یادگاری شتێکی دیکە هەڵگرێت لەیەکێك لە دوکانەکانی گۆڕەپانی (گۆیۆ)، کە لەسەر دەرگاکەی تابلۆی (هاجیت – مهاتا)ی فرۆشیار بۆشتومەکی لەیادنەکراو هەڵواسرابوو. (تیۆ) وێنەی ژنو مێردێکی یۆگی وەك ئەوەی پەرستگاکە، کە لەناو شەیتانەکاندا بوو، لەگەڵ پەیکەرێکی بچوکی برۆنزی دەم بەپێکەنین لەباری (لیتۆس)دا، کە نیوە تاجێکی ئاڵتونی لەسەربوو، کڕی. ئەو خوایە ناوی (تارا) بوو، سیمایەکی میهرەبانو دەم بە خەندەی هەبوو. (هاجت – مهاتا)ی خاوەن دوکان وەك پەیکەری خواکە دەم بە پێکەنین بوو، بەڵام وتی بودایی نییە، بەڵکو هندییەو هەوڵیداوە ب (تیۆ) رابگەیەنێت کە لە (تارا) تارادەیەك یاریدەدەری (ئاڤالوکیتسڤارا)بووە، چونکە لەفرمێسکەکانی ئەوەوە لەدایك بووەو لەکاری چاکەدا کۆمەکی پێدەکات.
- (تیۆ) وتی: پەیکەرەکە تارادەیەك بەپەرستیاری نەخۆشخانە دەکاتو لەگەڵ ئەوەشدا دەیکڕم. پەیکەرە گەورەکەی (بودا) بەرزییەکەی بەئەندازەی (تیۆ) دەبوو.
- پورە (مارتا) بەنارەزاییەوە گوتی: بیرت لەکێشی زیادە کردۆتەوە؟ ئەو پەیکەرە زۆر قورسە!.
- (تیۆ) بەناچاری دەبوو چاوپۆشی بکات. (لاماگامپۆ) دیارییەکی دیکەی بۆ (تیۆ) دۆزییەوەو لەدواین ساتەکاندا، دروست لەوکاتەدا (تیۆ) دەیویست سواری ئۆتۆمبیلی (ئامیاسادور) توندوتۆڵەکە ببێت، راهیبەکە ملپێچێکی سپی بۆ گرتو وتی:

- ئەمە نیشانەی ئاشتیو خۆشی پێشەکییە. کاتێك هاتیت نەمتوانی پێشکەشت بکەم، چونکە هۆشم لەسەرخۆم نەماو لەکاتی سەلام کردندا چەمیمەوەو چاویلکەکەم لێکەوت. ئێستا دواکەوتنەکەم قەرەبوو دەکەمەوە.

- پورە (مارتا)، کە لەجانتاکەی هەمان جۆر شاڵی دەرهێناو بەتیۆی راگەیاند: بیگرەو بیدە بە تریشقەی پیرۆز. گۆڕینەوەی ملپێچ دەستورێکی نەریتییە لەناو خەڵکی (تبت)دا.

- (تیۆ) بەدەستورێکی فەرمییەوە ملپێچەکەی بەرەو (رەهبان) راگرتو بەگەورەیی نواندنەوە وتی: جێگات دیار دەبێت. نازانم بەبێ تۆ چیبکەم؟

- (لاما) بەخەندەیەکی لەبەر دڵانەوە وتی: زۆرباشە، تریشقەی پیرۆز لەخەونەکانتدا سەردانت دەکات. بەڵێن دەدات.

## بەشی پانزە

# (لەنێوان ئاسمان و زەویدا)

### هەڵوێستەیەك لە كەلكەتا

گەشتەكە بۆ (جاكارتا) كارێكی ئاسان نەبوو. دەبوو لە(سیلیگۆری)یەوە بۆ (كەلكەتا) بەفرۆكە بڕۆشتنایەو لەوێشەوە بەیەكەم فڕۆكە بۆ (بانكۆك). لە (بانكۆك)ەوە بەفڕۆكەیەكی دیكە بۆ (جاكارتا). پورە (مارتا) لەباشترین هوتێلی (كەلكەتا) ژورێكی گرتبوو.

(تیۆ) لەكاتی هاتنەخوارەوە لەچیاكانەوە چاوەكانی لێكنەنابوو. هێواش هێواش لوتكە بەبەفر داپۆشراوەكانی نغرۆی ناو تەمی قورس بزر دەبون‌و لەگەڵ درێژی رێگاكە ژمارەی پەرستگاكانیش كەم دەبونەوە. دوربەودور روباری (برامپۆتەر) بەلقە زۆرەكانییەوە لەنێو دەشتەكەدا پێچاوپێچ دەڕۆشت. كەش وشك‌و زەوییەكە زەرد هەڵدەگەڕا.

لەناو فڕۆكەكەی (كەلكەتا)دا (تیۆ) خەو بردییەوەو كاتێك پورە (مارتا) بەئاگای هێنایەوە فڕۆكەكە خەریك بوو بەسەر شارەكەدا دەسوڕایەوە.

- (تیۆ) بەقرخەیەكەوە وتی: شارێكی سەرنجڕاكێش نییە. دەڵێن هەژارترین شاری جیهانە.

- پورە (مارتا) وەڵایدایەوە: راستە كوڕەكەم، بەڵام بزانە بەهەڵەدا چویت، باشترە لەجیاتی ئەو قسانە لەفڕۆكەخانەكە بنوارێت.

هۆڵی فڕۆكەخانەكە گەورە، رازاوەو هاوچەرخانەكەی (كەلكەتا) لەخاوێنیدا دەدرەوشایەوە. لەكاتی چونەدەرەوەدا پورە (مارتا)، كە بەدەست ئەو گەدایانەی لەخۆی دوردەخستەوە هوروژمیان بۆ هێنابوو، وێڵی تەكسی بوو. هەندێك لەسواڵكەرەكان بەشێوەیەكی بەزەیی جوڵێن كەمئەندام بون: دەستبڕاو، قاچ بڕاو....

(تیۆ) وتی: پورە (مارتا) بنوارە...

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: لە (بنارس)یش ئەوەندە سواڵكەر هەبون!.

- بەڵام لەوێ (مەهانەت جی) وتی نەریتێکی ئاینیە...

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: بەڵێ، لەهندستان سواڵ دەکەن و تەنانەت بۆ ئەو کەسانەشی تەرکی دنیایان کردوە ئەرکێکە. بەڵام من نەموت ئەو سواڵکەرانە لەدەستەی ئەوانەن تەرکی دنیایان کردووەو بەراستیش وا باشە بیر لە (کەلکەتا) نەکرێتەوە!. هەر لەهەرجێگایەك گەشتیار هەبێت سواڵکەریش هەیە. ئێمە رەواڵەتێکمان هەیە ئاماژە بۆ زەنگینیمان دەکات... هەرچۆنێك بێت بەشێکە لەوەی خووت بەسامانەوە گرتووە!

- (تیۆ) بەنارەزاییەوە وتی: من؟ خۆ من نەخۆشم!

- پورە (مارتا) بەرەقییەوە وتی: ئەوانیش بەهەمان شێوە!. پورێکیشیان نییە تابیر لەچارەسەریان بکاتەوە!. نیوەی مرۆڤی سەر زەوی بەمجۆرە ژیان دەگوزەرێنێت و نیوەکەی دیکەشی بەهۆی زۆر خۆرییەوە هێندە قەڵەوبون دەبێت بەبەرنامە لاواز ببنەوە!.

- (تیۆ) وتی: باشە، کەواتە دراویان پێبدە!

- پورە (مارتا)، کە خەریکی دەرهێنانی دراو بوو، ئاماژەی بۆ پیرەمێردێك کرد لەگۆشەیەکدا وەستابوو... لەیادت بێت لێرە گروپێکی (مافیا)ش هەیە دەستی منداڵانیان دەبڕن و دەیانکەنە هۆکارێك بۆ سواڵکردن. هاورێ هندییەکانم رایانسپاردوم بەهیچ جۆرێك یارمەتی ئەوانە نەدەم...

- ئەی ناتوانن ئەو کەسانە دەستگیریان بکەن؟

- بۆچی نا، بەڵام وا کەسێکت دەستگیرکرد ئەی هەزارانی دیکە چی لێبکەیت؟... باشە بابڕۆین؟

سەر رێگای فرۆکەخانەکە پڕ لە ئەستێڵی ئاوبوو، کە منداڵان مەلەیان تێدا دەکرد. لەهەموو شوێنێك تابلۆی گەورە چەقێنرابوو، کە دروشمی (کەلکەتا.. شاری خۆشی) لەسەر نوسرابوو. بەگشتیش وادیاربوو دروشمەکە هێندەش لەراستییەوە دوور نەبێت. وەك هەموو شوێنەکانی دیکەی هندستان ریزی دورودرێژی خەڵکی لەهاتوچوندابون، بەڵام لەهەموو شوێنەکانی دیکە زیاتر خەڵکەکە خەندە لەسەر لێویان بوو.

لە (کەلکەتا) شتێکی دیکە نەدەبینرا جگە لەوەی شار لەژێر سایەی دوو خواوەندابوو. (دورگا)ی خواوەندی (شەیتان — گامێش) یان خوشکە جمکەکەی (کالێ) ناشیرین. چونکە (تیۆ) حەزی بەچارەی ئەو دوو خواوەندە نەبوو، هیچ خەمی بینینی شاریشی نەبوو. پورە(مارتا) پێشنیاری خۆراکی چینی کرد، بەڵام (تیۆ) رازینەبوو؛ رای وابوو دواشەوە لەهندستان دەمێننەوەو پێویست ناکات خۆراکی چینی بخۆن... پورە (مارتا) رازی بوو. نیسك، نانی گەرم، ماست و برنجی سپی.

## زۆرینە دژ بەکەمینە

- پورە (مارتا) وتی: (تیۆ) ... نزیکەی نیوەی گەشتەکەمان بڕیوە! چۆنە باسی هەستەکانی خۆتم بۆ بکەیت؟

- (تیۆ) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: هەم هەست بەرازیبوونو هەم بەنارازیبوون دەکەم. تائەو شوێنەی من تێگەیشتبم لەپێناوی خواوەندا کوشتارکراوە.

- واتە تا ئەو رادەیە؟

- باشە، بۆ تۆی ئەژمار دەکەم: جولەکە، سیك، موسڵمانەکانی ئەمڕۆی هندستان، کریستیانی شەهیدەکان، کارتاکان، هیپاتی... بێگومان زۆری دیکەش، کە لەیادم نەماون!

- ئایا بنەماو جێگیرییەك لەو روداوانەدا نابینیت؟

- بۆچی نا، هەرکاتێك ئاینێکی نوێ بۆ جیهان هاتبێت؟

- تا رادەیەك نزیکبویتەوە، جگە لەموسڵمانەکانی ئەمڕۆی هندستان...

- (تیۆ) وتی: بەڵێ... مەبەستت ئەوەیە کوشتوکوشتار کاتێك رودەدات، کە لەوڵاتێکدا ژمارەی بڕواداران بەئاینێکی تایبەتی کەمینە بن. بابەتی سەرەکی ئەوەیە، کە بۆ رزگاربون لەچنگی چاودێریو ئەشکەنجەدان دەبێت ژمارەی ئیمانداران زۆربێت.

- بەڵێ وایە. ئاینی کەمایەتییەکان هەمیشە دەبنە ئامانجی رەفتاری خراپ، بەڵام ئەوەش بزانە دەربارەی تاکەکانیش بارودۆخەکە بەهەمان شێوەیە، ئەگەر زۆر لەوانی دەوروپشتت جیاوازبیت دۆخێکی باشت نابێت.

- لەو بڕوایەدایت؟. لەپۆلدا هەمیشە بەمن دەڵێن لەوانی دیکە جیاواز تری بەڵام کەسیش سەغڵەتم ناکات!

- زۆرباشە، بەڵام ئەگەر لەسەردەمە کۆنەکاندا بوایە بەتاوانی جادوگەری دەیانسوتانیت... لەوڵاتی خودی ئێمەدا تاسەدەی حەڤدەش هێندە بەسبوو کەسێك رەنگی چاوێکی قاوەیی ئەوی دیکەش شین بێت تا لەسەر گورزە دارێك بیسوتێنن! یان ژنێك بەرگێکی سەوز بپۆشێت، کە رەنگی شەیتان بووە، تا بەرەو دادگای (ئەنگیزیسیۆن) کێشی بکەن...

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: لەفەرەنسا؟

- کەواتە تۆ هیچ دەربارەی جەنگەکانی ولاتی خۆمان نازانیت؟ هیچ دەربارەی (سن – بارتملی)[1] نازانیت؟ سەبارەت بەرەشەکوژی (پرۆتستانەکان)؟

- (تیۆ) وتی: دەزانم، بەلام ئەو روداوانە زۆر کۆنن.

- پورە (مارتا) پەسەندی کردو گوتی: بێگومان ئێمە ئێستا لەودۆخەدا نین، بەلام ولاتەکەی ئێمەش لەو بنەمایە بێبەش نەبوە.

- (تیۆ) وتی: لەبەرئەوەیە خەلکی زۆرتر هەمیشە هەولێ لەناوبردنی کەمترەکان دەدات.

- قرژالێ بچوکم، بۆ خەلکی زۆر بەوشەی (زۆرینە)و بۆ کەمتر (کەمینە) بەکاردێت.

- (تیۆ) گوێڕایەلانە دوبارەی کردەوە: هەمیشە زۆرینە نابوتکردنی کەمینەی دەوێت... دوای ئەوەی کەمینە بوو بە زۆرینە هەمان هەلومەرج دوبارە دەبێتەوە!. براوەکان بە کۆکوژکردنی دۆڕاوەکان تۆلە دەکەنەوە. کریستیانەکانت لەیادە؟. (دۆم ئۆتافیۆ) زۆرباش بابەتەکەی بۆ رونکردەوە: سەرەتا شەهید دروست دەکەن، پاشان بۆ جەنگ دەڕۆن. سەرەتا (کاتار – زەندیق)ەکانی خۆیان رەشەکوژی دەکەن پاشان بۆ جەنگی خاچپەرستان دەڕۆن.

- پورە (مارتا) وتی: تائەو سالانەی دوایی هندییەکان پەیڕەوانی ئاینەکانی دیکەیان ئازار نەدەدا، هەروەها (بوداییەکان)ی (تبت)یش. رات چییە؟

- (تیۆ) وتی: راستە. دەزانی کێ ئاگری جەنگ خۆش دەکات؟ کریستیانیو موسلمانەکانن.

- پورە (مارتا) وتی: جولەکەکانیش.

- لەبەرئەوەی بەدرێژایی مێژوو چەوسێنراونەتەوە.

- نەخێر. چونکە خاوەنی ئاینی تاك خوداین... ئەوانیش بڕوایان بەیەك خوا هەیەو ئاینە تاك خواییەکان بڕوایان بە هاوەلێکردنو پێکەوە هەلکردن نییە. (ئۆرشەلیم) بێنەرەوە یادت. هەموو ئاینێك بەرگری لەباوەڕو دیدی خۆی دەکاتو پەیڕەوی لەخوای خۆی دەکات. بزانە لەئێستادا هندییە توندڕەوەکان بۆئەوەی خۆیان کۆبکەنەوەو بەهێزتر ببن هەولدەدەن ژمارەی خواکانیان کەم بکەنەوە، لەنێو ملیۆنان خواوەندا (ڕام) قارەمانی داستانو (رامایانا)یان هەلبژاردوەو دەیانەوێت بیانکەنە تاکە خوومندی هندستان.

---

[1] Saint.Bartholomew: ئەم رەشەکوژییە گەورەیە لەپاریس، لە رۆژی جەژنی (سن بارتملی) لە (ئۆت/١٥٧٢) لەسەردەمی دەسەلاتی (کاترین دمەدیس) دا رویداوە، پاشان بۆ هەمو ناوچەکانی فەرەنسا بلاوبۆتەوەو هەزاران (پرۆتستانت)ی فەرەنسیو گەورەکانیان کوژراون، لەوانەش – ئەمیرال دوکلین یێ)و ناسراوەکانی (کالوینیست).

- (تیۆ) بەهێمنی وتی: دەتەوێت بڵێیت ئەو کەسانەی هەزاران خوایان بۆخۆیان دروستکردوە بڕوایان بەگونجان‌و هاوەڵیکردن هەیە، بەڵام من نازانم ئەو پێکەوە هەڵکردن‌و گونجانە دەتوانێت چ هۆکارێکی هەبێت؟.

## سانکریتیزم چییە؟

پورە (مارتا) بەهێنانەوەی نمونە دەستیکرد بەروونکردنەوەو رایگەیاند، کە لەسەدەی شانزەدا یەکەمین (مـوژدەدەر– مـسیۆنیر)ی کریـستیانی دەسـتیان کـردوە بـەئامۆژگاریکردن لـەناو هندییەکانداو لەنێوان خواوەندە جۆربەجۆرەکانی هندستان‌و سیمای قەدیسە کریـستیانیەکاندا هاوسەنگیان دروستکرد. (عیسا)یان بە(کریشنا) ناساندو ...

- (تیۆ) وتی: دیارە بەبێ یانزە هەزار مەعشوقەکەی کریشنا....

- بێگومان (مەریەم)یان بەخوایەکی تایبەت ناساند، کە لەژێرپێیدا سەری مار پان دەکاتەوە. هەروەك چۆن (دورگا) (شەیتان – گامێش)ی پانکردەوە. سەبارەت بەسێ (لوتکـە – پـیرۆز)یـش (پرنسیپی سێ لایەنـە) هـیچ جۆرە گرفتێك لـەئارادا نـەبوو. چونکە خـودی هندییـەکان پاش چـەند سـەدەیەك (بـەرهما، ڤـیشنۆو شـیڤا)یـان لـە سـێ لوتکەیەکـدا کۆکردبـۆوە بـەناوی (تریمۆرتی)، لەوێوە کە (سێ لوتکەی – پیرۆز) بریتی بوو لەخوایـەکی ریـشدار (باوك)، لاوێکی قۆز (کوڕ)و کـۆترێکی سپی (رۆحـی پـیرۆز). هندییـەکان گەیـشتنە ئـەو ئەنجامـەی بـۆ ئـەوان هێندە بەسە سێ خواوەندی کۆکراوەیان لەیەك شوێندا هەبێت‌و تاکە خوایـەکیش بـۆ ئـەو سـێ لوتکەیە زیادبکەن تا ببنە کریستیانی.

- (تیۆ) لەسەرسامبوندا هاواریکرد: واتە کۆترەکەیان کردە خۆراکی ئەوان.

- بەوجۆرە (هۆکاری گەورە)ش بەبێ شەڕو شۆڕ لەگەڵ هەموو ئـەو مەزهەبانـەی لەخۆیـەوە ئالانـدبوو لەهـەموو جێگایـەك ئاوێتـەکراو یـەکیان گـرت. لەشـوێنێك ئبلیـسەکان هـەبون‌و لەویدیکـە ئەسـرینی خواکـان. بـەکورتی بەحەوسـەڵەو ئارامییـەوە دەسـتی کـرد بەچـنینی خواوەندو بەرگەکەشی بەپێی قەدو باڵای ئـەو وڵاتانـە دوری، کـە دەکەوێتـە سـەر رێگای. ئـەم پرۆسـە سـەیرو سـەمەرەیە بـە(سـانکریتیزم) ناودەبرێـت، کـە لەریـشەی یۆنـانی وەرگـیراوەو مەبەسـت لەیـەك گەیـشتنی هاوبـەش‌و (یـەکگرتن)ـە. یـەکێك لەپاڵـەوانانی ئـەو پرۆسـەیە (مەهماتما گاندی)بوو، کە بەبێ سێ کتێبە ئاسمانیەکە بۆ هیچ شوێنێك نەدەرۆشت، قورئـان بـۆ موسڵمان، ئنجیل بۆ کریستیانەکان‌و (بەهاگڤاد – گیتا) (Bahagavad - Gita) بۆ هندۆسەکان.

- (تیۆ) پرسی: کامەیە؟ ئەوەم نەبیستوە.

- چۆن. ئەوە هەمان ساتی ناسكو قەیراناوییە، كە خواوەند (كریشنا) بۆ ئەوەی هانی خەڵكی بدات بۆ جەنگ دژ بەیەكدی لەروخساری راستەقینەی خوایەتی خۆیدا لەبەردەمیاندا دەردەكەوێت.

- (تیۆ) بەئحمێكەوە وتی: كەوتەوە یادم. هەموو ئەوكارانە لەپێناوی جەنگداو (مەهماتما)ش سودی لەوە بینیوە؟. ئنجیلو قورئان بەجێگای خۆیان. بەڵام (بواراداجیتا)...

- پورە (مارتا) بەنارەحەتییەوە راستیكردەوە: (باگڤاد – گیتا)، هێندە بەسە بڵێیت (گیتا)و بەردەوامبوو:

- (گیتا)، كە دەقێكی پیرۆز نییە، خەڵكی بانگهێشتی جەنگ دەكات. (قورئان)یش باس لە(جیهاد) دەكات. لە (ئنجیل)یشدا رستەی وای بەكارهێناوە مرۆڤ دەخاتە لەرزە. دەڵێت: **(گومانت لەوە هەبێت كە من بۆ چەسپاندنی ئاشتی هاتبمە سەر زەوی، بۆ جیاكردنەوەی ئاشتی نەهاتوم، بەڵكو لەپێناوی جیاكردنەوەی شمشێردا هاتوم).** خەڵكی ئەم دەقەیان بەبانگەوازی جەنگ راڤەكردوە. ئیمان هێنان بەخوا لەژێر هەر ناو و ناونیشانێكدا بێت زۆرجار داوا لە ئیمانداران و پەیڕەوانی خۆی دەكات پەیمانی جەنگو سەربازی پەسەند بكەن... بەڵام ئەم وتەزایە هیچ كاتێك بنچینەو بنەمای ئاین نەبوە.

چونكە (عیسا) باس لە (خۆشەویستی)و (موحەمەد) لە (دادپەروەری)و (گیتا) درەخشانەوەی خواوەند دەكات. جەنگی پیرۆزی قورئان یان (جیهاد) لەپلەی یەكەمدا جەنگە دژ بەخودە، دژ بەو نادادپەروەرییەی كەخودی مرۆڤ بەڕەوای دەزانێت. هەرچەندە روالەتییەكانی (عیسا) هانی كریستیانیەكان دەدات بۆ ئازایەتیو سنگفراوانی. (گیتا) چاوی هندییەكان دوكاتەوە بەرامبەر حەقیقەتی روناكی سیستمی جیهان.

- (تیۆ) بەریسواكردنەوە گوتی: ئەی (مەهماتما گاندی) چی؟

- (گاندی) بەشێوازی خۆی جەنگاوەرێكی راستەقینە بوو!. هەڵبەتە پیاوی ئاشتی، بەخشندەییو ئارامی بوو، بەڵام كەسێك بوو هەموو بەیانییەك پشتێنی دەبەست دژ بەخۆیو دژ بەداگیركەری بێگانە. بەرزترین جۆری جەنگی هەڵدەبژارد. دیسپلین، ئازادی و دەقە جەنگییەكانی لەگەڵ ئارەزوی خۆی دەگونجاند. دادپەروەری، خۆشەویستیو ئازایەتی هەمووی لەیەك شوێندا بۆ پەرستنی خواوەند. سەرەڕای ئەوەش باشترین شێواز بوو بۆ یەكخستنی هندییەكان لەنێوان خۆیاندا. ئێستا باش تێگەیشتی؟

- (تیۆ) گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە: بەگشتی ئەگەر بیانخواستایە دەیانتوانی لەرێگای (سانکریتیزم)ـەوە، نەك لەرێگای جەنگو شەڕو شۆڕەوە، هەموو جیهان یەکبخەنو بەیەکییەوە ببەستنەوە.

سپێدە (تیۆ) بەدەنگی (ریگشاو – ڤالاس)ـەکان لەخەو رابوو. لەپەنجەرەی ژورەکەیەوە لەشاری روانی، کە تازە ئۆتۆمبێلەکان لەهاتوچۆدابون. دورتر دیمەنی جۆرێك پەرستگای یۆنانیو کڵێسایەکی شێواز (گوتیك)[1] درشتی بەرچاو کەوت.

- (تیۆ) بەسەراسیمەبونەوە هاواریکرد: دوبارە (سانکریتیزم)ێکی دیکە!. پیرەژن.. بنوارە بەشانازی (دورگا)وە کڵێسایان دروستکردوە.

بەڵام ئەوەی (تیۆ) بینیبووی کڵێسای گەورەی (کاتدراڵ)ی (کەلکەتا) بوو، کەسەردەمانێك بە پایتەختی ئیمپراتۆری هندستانی بەریتانیا دادەنرا، بەڵام پەرستگا یۆنانییەکە تەلارێك بوو بۆ شکۆمەندی شاژنە (ڤیکتۆریا)و ئەم تەلارە، کە بەپێشەنگی ئیمپریالیزمی سەرکەوتوو پێشکەش کرابوو زۆر بە (سانکریتیزم) نامۆبوو. دانیشتوانی (کەلکەتا)، کە ئەو تەلارەیان خۆشدەویست زیاتر بەوهۆیەوە بوو ئاماژەیەکبوو بۆ تەمەنی ئەو رژێمەی دروستیکردبوو.

## قوربانی: لەمرۆڤەوە بۆ ئاژەڵ، لەئاژەڵەوە بۆ نان

لەو فڕۆکەیەدا، کە لە (کەلکەتا)وە بۆ (بانکۆك) لەگەشتدابوو، پورە (مارتا) کەوتە پرخەپرخو (تیۆ)ش پەڕاویچکەکەی دەرهاورد تا بۆ شکۆمەندی هندستان چەند دێرێك تۆماربکات.. (شیڤا)و نێزە سێ پەلەکەی، (کریشنا)و خانمە شوانە عاشقەکانی، (دورگا) بەشمشێرو چەکەکانییەوە هەروەها چوار سەری خوای (بەرهمان). بەدلگەرمی بەهرەی (سانکریتیزم) هەوڵیدا (هوروس)چەقەڵ – خواوەندی میسریو (گانش) خواوەند - فیلی هندی (هنومان)ی مەیمونی خواوەند ئاوێتەبکات، بەڵام نەدەگونجان. هەروەها لەکاروانی گەشتەکەیدا دەگەڕایەوە روبەڕوی قوربانییەکەی (ئیبراهیم) پەیامبەر بووەو بیری لەوە کردەوە ئەو قوربانییە خالی دەستپێکی گەشتێکی ئاینی گەورەبوو. ئەو بەرانەی دەبوو لەجێگای (ئیسحاق) بکرێتە قوربانیو دوای ئەویش مەسیح بەسەر خاچەوە خۆی قوربانی بکات، پاشان جەستەی مرۆڤەکان پاش مردنی فیزیکیان لەتەنیشت روباری (گنگ)ـەوە بەسوتاندن بکرێتە قوربانی. گەیشتە ئەو باوەڕەی هەموو ئەو قوربانییانە لەیەك چاوگەوە سەرچاوە دەگرنو لەپڕ جەستەی کەوتە لەرزین؛ کەواتە لەخاچدانو سوتاندنی جەستە دوو

[1] گوتیك: شێوەیەكی فەرەنسییە، هونەری تەلارسازییە، كە لەسەدەی دوانزەوە سەریهەڵداوە.

وێنەی جیاوازی قوربانیکردنی مرۆڤن!، لەکاتێکدا لە ئیسلامدا لەجولەکەگەرایی و لەئاینی سیکەکاندا تەنها ئاژەڵ بۆ خواوەند دەکەنە قوربانی!. درەختێکی دوو پەلی لەسەر پەراویچکەکەی دروستکردو لەسەر پەلێکیان جەستە قوربانیکراوەکان و لەسەر پەلەکەی دیکە کتێبێك کە وشەکان لەناوییەوە دەهاتنە دەرەوەو بۆ ناو ئەو دوکەڵە دەرۆشتن، کە لەسوتانی جەستەی ئاژەڵەکانەوە بەرەو ئاسمان هەڵدەستا.

- (تیۆ) شانی پورە (مارتا)ی راتەکاندو گوتی: ئایا ئێستاش قوربانیکردن بە مرۆڤ پیادە دەکرێت؟

- پورە (مارتا) بەتورەییەوە تەقییەوەو بەخەواڵوەوە وتی: چی؟ بۆئەو پرسیارەبوو لەخەوت کردم؟

- (تیۆ) بەشەرمەزارییەوە وتی: ئاخ... تکادەکەم بمبەخشە.

- پورە (مارتا) هەناسەیەکی هەڵکێشاو، دەسرێکی لەگیرفانی دەرهێناو ئارەقی دەموچاوی سڕی و داوای دوو چای کردو گوتی: باشە، پرسی بەقوربانیکردنی مرۆڤ چیبوو؟

(تیۆ) وێنەی درەختەکەی و پرسیارەکانی پیشاندا.

- پورە (مارتا) وتی: دەتوانیت دورتریش برۆیت. سەرەتاکان فەرامۆش بکەو تەنها بیر لەوە بکەرەوە کە دەکرانە قوربانی. بۆ نمونە لە کریستیانیدا لەجیاتی گۆشت و خوێنی مەسیح نان و شەرابیان کردە قوربانی. هەمووشت لەوێدایە!. ئێستا لەهەموو ئاینەکاندا لەجیاتی قوربانیدان بەمرۆڤ، قوربانی بە شتی دیکە دەدەن.

- (تیۆ) پەراوێزەکانی خۆی رێکخست، کریستیانیت = نان و شەراب. بودایزم = نفیشك و کەندر. هندۆیزم = شیرو گوڵ میوە. جولەکەگەرایی، ئیسلام، سیکیزم - هیچ، تەنها کتێبێك.

- پورە (مارتا) وتی: خراپ نییە. بەڵام دەبێت باس لەوە بکرێت، کە هەرچەندە ئەمرۆ ئەو رێورەسم و دابونەریتە لەناوچوە، بەڵام خودی نەمر فەرمانی بەپارێزەرانی جولەکە کردوە تا (گا، باڵندە) بکەنە قوربانی. لەکۆتایی دەیەی نەوەدەکاندا روداوێکی سەیر لەئیسرائیل رویدا، واتە مانگایەکی رەنگ خەنەیی تەواو لەدایکبوو. ئێستا وێنای بکە لە (تەورات)دا بەتەواوی وتراوە، کە بەپێی یاسای بێکۆتا ئەو شلەمەنییەی پارێزەرەکان (رەهبانان) پاکوخاوێن دەکاتەوە، شلەیەکە لە ناوی چاو و پاشەڕۆی مانگایەکی خەنەیی رەنگ دروستبووە. ئاژەڵی رەنگ خەنەیی تەواو، کە تەنانەت یەك تاڵەمووی رەنگێکی دیکەی تێدانەبێت، هێندە دەگمەنن کەهەر لەسەرەتای دروستکردنی پەرستگاکەوە تەنها حەوت ئاژەڵی لەوجۆرە پەیدابووە!.

(حاخامە) کۆچبەرەکان لەو داستانەوە گەیشتونەتە ئەو بڕوایەی هەشتەمین ئاژەڵ نوقلانە بەخشی هاتنی (مەسیح)ـە.

- کەواتە (حاخام)ـە ئیسرائیلییەکان مانگاکەیان کردە قوربانی.

- لەناو خۆیاندا لەسەر ئەو پرسە کێشەو ململانێیان زۆر کردو نازانم دواجار بڕیاری چییاندا. جولەکەکانی (تەورات) راوچی نەبون، بەڵکو جوتیاربونو لای جوتیاریش چ شتێك لە رەشەوڵاخ بەبەهاترە؟ لەمانگاش بەبەهاتر چی هەیە تا بیکەنە قوربانی بۆ خوای خۆت؟ کەواتە کاتێك نەیەوێت کوڕەکەی بکرێتە قوربانی، مانگاکەی، کە سەرچاوەی بژێوێتی، دەکاتە قوربانی. ئەوەش هۆکاری ئەوەیە هێشتا قوربانیکردن بەئاژەڵ لەهەندێك ولاتانی جیهان درێژەی هەیە. لە (نیپاڵ) هندۆسەکان لەملی (گا) دەدەن. هەروەها لە (کەلکەتا)ش بزنی سەربڕاو پێشکەش بە (کاڵ) دەکرێت. بەگشتی لەهندستان لە دەیەی پەنجاکانەوە قوربانیکردن بەئاژەڵ قەدەغەکراوە.

- (تیۆ) وتی: بۆ وا درەنگ؟

- بەڵێ، هێشتا پرسی قوربانیدان بەمرۆڤ چارەسەر نەکراوە. دەبێت بپرسیت ئایا ئەمجۆرە قوربانیدانە هێشتاماوە؟ وەڵامەکەشی بەڵێیە. هەندێکجار رۆژنامەکانی هندستان هەواڵی خوێناویو نەگریس بلاودەکەنەوە، بۆ نمونە، جوتە هاوسەرێك لەپێناوی بەدەستهێنانی کوڕدا بەهۆی (کاهین)ێکەوە کچەکەی خۆیان سەربڕیو کردیانە قوربانی.

- (تیۆ) بەسەرسامیەوە وتی: لەئێستادا؟ دەبێت بەلایەنی کەمەوە زیندانی کرابین!

- بێگومان. بەلام ئەمجۆرە روداوانە تەنها تایبەت نین بەهندستان. گروپە شەیتانەکان لەویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەدەیەی شەستەکاندا هەمان کاریان ئەنجامدەدا. ئەگەر باش بڕوانین بیرۆکەی قوربانیدان بەمرۆڤ هێشتا نەسڕاوەتەوە.

- (تیۆ) هەناسەیەکی هەڵمژیو گوتی: هەرچۆنێك بێت ئیدی مرۆڤخۆران نەماون.

- پورە (مارتا) وتی: لەوبڕوایەدایت وابێت؟ لەهەندێك لەخێڵەکانی بەرازیل خەڵك هەیە گۆشتی دوژمنەکەی دەخوات تا بەخەیاڵی خۆیان تواناکەی لێبسێنن. لای دوژمنی دۆڕاو جیاوازی نییە لەچ گۆڕستانێك دەیشارنەوە، دیارنییە گەدەی ئەو کەسەی بەسەریدا زاڵ بووە لەگۆڕ ناخۆشتربێت. تۆش لەوبڕوایەدا نیت وابێت؟

- (تیۆ) وتی: (Maaleck). لێرەدا وەك دەبینم تەنها موسڵمانانو جولەکە دژ بەقوربانیدانن بەمرۆڤو بەفەرمیش رەتیان کردۆتەوە، لەکاتێکدا دەربارەی (عیسا) بارەکە تەواو روونە،

چونکه (باوك — خوا) ڕێگای داوه تا کوڕەکەی لەخاچ بدرێت لەپێناوی پاکبونەوەی گوناهەکانی جیهان.

- پوره (مارتا) وتی: جوانە. کوڕم..بێگومان دیاره (فرۆید)ت نەخوێندۆتەوه؟

- ئەو کەسەی وتبوی (موسا) هاولاتییەکی میسرییه؟

- پوره (مارتا) وتی: ئەو پیاوه ماوەیەکی زۆر دەربارەی قوربانیکردنی مرۆڤ بیریکردبۆوەو ئەفسانەی تایبەتی خۆی داتاشیوه. دەڵێت، هەر لەسەرەتاوه گروپی مرۆڤه سەرەتاییەکان سەرکردەیەکی بەهێزیان هەبوو، کە هەموو ژنانی خێڵەکەی لەژێر دەستدابوو. پیاوانی خێڵ، کە ئیرەییان پێبردووه هەستاون بەکوشتنیو پارچه پارچەیان کردوەو گۆشتەکەیان خواردوه. پاشان پەشیمان بونەتەوەو قوربانییەکەی خۆیان ناوناوه (باوك)و ئاینە تایبەتەکەیان بەرقەرارکرد. (فرۆید) لەوبڕوایەدایە بنەماو بنچینەی هەموو خواوەندەکان لەویەکەم قوربانییەوه هاتووه.

- (تیۆ) بەمجۆره ڕاڤەیکرد: تیۆرەکەی (فرۆید) شتێکی ئاساییو لەبەردڵان نییه.

- پوره (مارتا) وتی: حەوسەڵەت هەبێت... پاش ئەم ڕووداوه مرۆڤایەتی گۆڕا. پێش هەمووشت جولەکەکان قوربانیکردنیان بەمرۆڤ قەدەغە کردو خۆیان هاویشتە ژێر سایەی باوکێکی نادیاری لەشکان نەهاتوو. بەوپێیەش نەدەخوارا. بەڵام گەلی عیبری زۆرجار لەفەرمانەکانی باوك لایانداو سەرپێچیان کرد. لەوبارەیەشەوه (فرۆید) بۆخۆی ڕونکردنەوەی هەیەو دەڵێت: ڕێزگرتن لە یاساکانی (باوك)ی نادیار هێندە دژوارو دژ بە(باوك کوشتن) بوو، کە جولەکەکان ڕویان لەپەیکەری (گوێرەکەی ئاڵتونی)کرد، واتە یادگاری کۆیلایەتیان لەمیسر.

- (تیۆ)، کە لای خراپ نەبوو شارەزایی خۆی لە (میسرناسیدا) بخاتەڕوو، گوتی: خوای هاتور -Hathor -

- پوره (مارتا) ڕونیکردەوه: بەلای جولەکەکانەوه ئەوه ئاسانتر بوو، کەلەجیاتی پەرستنی خوایەکی نادیار خوایەك بپەرستن مایەی خواردن بێت، بەڵام لەوێدا نوێنەری خوا، واتە (موسا)یان فەرامۆش کرد. ئەم نوێنەرەی خواوەند کاتێك لەسەرشاخی (سینا) دابەزی سەرقاپی ئەو مەنجەڵانەی بۆ هەتاهەتایە نایەوه، کە پەشیمانی، حەزی خوێنڕێژیو ئارەزوی پەرستنی خوای تایبەتی تێدا دەکوڵا. لەجیاتی ئەوه سزای خودی (نەمر) پیادەکرا؛ سزایەکی تۆقێنەر!. (موسا) سێ هەزار جولەکەی پەیمان شکێنی خەڵتانی خوێن کرد. سێ هەزاری تری بەتاعون کوشتو سێ هەزاری دیکەی توشی (گەڕی) کرد. ئیدی گەلی جولەکە ئەو کارەیان دوباره

نەکردەوە. بەلام وەکو ئەوەی (پاپا فرۆید) باسی دەکات کاتێک کریستیانیت لەدایکبوو قوربانیدان بەمرۆڤ بەهەموو هێزو توانای خۆیەوە گەڕایەوە سەر شانۆی مێژووی مرۆڤایەتی. ئەمجارە قسە لەسەر (باوك)ی ئەو گروپە مرۆڤە سەرەتاییە نەبوو، بەڵکو باس باسی (کوڕ)بوو. ئەوەتا خواوەند خۆی کوڕەکەی دەکاتە قوربانی. مرۆڤەکان ئەم بیرۆکەیەیان لەلا مایەی تەحەمول کردن بوو، هەر ئەوەش پریشکی سەرکەوتنی ئاینی نوێ بوو.

- (تیۆ) پرسی: چۆن مایەی تەحەمولکردن بوو؟.

- پورە (مارتا) وتی: چونکە بەپێی تیۆرەکەی (فرۆید) باشتر ئەوەبوو کوشتنی یەکەم (باوك) راستەوخۆ دەست بەسەر نەکرێت.

- (تیۆ) بەسەراسیمەبونەوە وتی: دەستبەسەرکردن؟ وەك ئەوەی پۆلیسەکان دەیکەن؟

- تارادەیەك، بەلام لێرەدا دەستبەسەرکردن واتای دواخستن، رامکردن و بەتایبەتی فەرامۆشکردن دێت، بەلام روداوی فەرامۆشکراو هەمیشە نەیاریو لەباربردن دێنێتە ئاراوە. واتە چونکە روداوەکە لەیادچووە کەسێکی دیکە بیری لێناکاتەوەو نایناسێت. بەلام رۆژێك لەرۆژان لەناکاوێکدا هەمان رازی دێرینو پشتگوێخراو دەتەقێتەوەو ئاشکرا دەبێت. لەم کاتەشدا ئەگەر هەیە خاوەنی نهێنییەکە نەخۆش بکەوێتو تارادەیەکیش بکەوێتە بەرچنگی مەرگ. کاتێك پۆلیس لەخۆپیشاندانەکاندا راستەوخۆ خەڵکی بۆ دواوە راودەنێن دەمودەست هەلومەرجەکە روو لەشڵەژانو تەقینەوە دەکات. وانییە؟

- OK. لەبەرئەوە جولەکەکان کوشتنی خوایان بۆ دواوە گێرایەوە. ئەی کریستیانیکان چیانکرد؟

- ئەمان شتێك کەمتر. بەو واتایەی بەقوربانیکردنی کوڕە تاقانەکەی خودا کەمێك لەتیژی دەستبەسەراگرتنە سەرەکیەکەی هێواشتر کردۆتەوە.

- تیۆ بەسوکایەتییەوە وتی: واتە دوبارە بەسودوەرگرتن لەکات دەتوانرا جارێکی دی منالان بکرێنە قوربانی!. ئینجا ئەم (پاپا فرۆید)ەی تۆ قوربانیکردنی لەئابلۆقەدان رزگارو ئازادکرد؟

- پورە (مارتا) وتی: نەخێر، بەوجۆرە نییە. چونکە بلیمەتی کریستیانیش ئاگاداری ئەو لایەنەیە نانو شەراب لەجیاتی جەستەو خوێن بکاتە قوربانی. لەهندستان پاش خولێکی ترشوتاڵی بەقوربانیکردنی مرۆڤو پاش چەندین سەدەی قوربانیکردنی (سیلمییەکان) روداوێك رویدا وەکئەوەی لەکریستیانیدا دروستکرا؛ واتە پەیکەرێکی بچوکی مرۆڤیان لەمیحرابێکدا

ڕۆناو ئیدی ئەوە بەسبوو. پاشماوەی دیکەی قوربانییەکان بەمیوەو هەنگویندا قەتیسکرا. هەموو ئەو ڕوداوانە لەبەرئەوەبوو تا جێکەوتەیەکی باش بۆ قوربانیدان بەمرۆڤ بدۆزرێتەوە.

- (تیۆ) بەئاشکرا ڕایگەیاند: من هیچ جێگرەوەیەکم پێباش نییە، جولەکەو ئیسلام.

- پورە (مارتا) وتی: بەڵام زۆر نەرمو گونجاو نین. ئایا هیچ پەیوەندییەك لەو نێوانەدا نابینی؟

- چونکە گەیشتنەجێ پرسیارەکەی پورە (مارتا) وەك خۆی هەڵپەسێرا.

## ڕێگاکانی ئاسمان

هەر لە (بانکۆك)ەوە تا (جاکارتا) بۆ ساتێکیش (تیۆ) دەستی لەکێشانی هێڵی ئاڵۆزو شڵەژاو هەڵنەگرت. ئەمجارە خەریکی تەنافو موی پرچکراو بوو. لەپەڕاوێچکەکەیدا وێنەی (سیك)ێکی بە زولفە لولو عەمامەیەکەوە کێشا. پاشان پاشایەکی (تبت)ی بەتەناف لەسەرسەری. بەرهەمانێك بەقژی ئاڵۆزکاوی سەرناوچاوانی. سەرئەنجام (شەمعون) بەپرچی درێژو لەخوارەوە کەمێك کراوە.

- پورە (مارتا) وتی: ئاسمانو دۆزەخیشی بۆ زیاد بکە.

(تیۆ) بەگوێڕایەڵی لە پورە (مارتا) وێنەی گەواڵە هەور لەئاسمانو کورەی ئاگری لەژێر وێنەکانی دیکەدا کێشا.

- پورە (مارتا) دەستیکرد بەڕونکردنەوەو گوتی: بیرۆکەی درەختەکەت خراپ نییە. هەموو ئاینەکان دەیانەوێت ئاسمان بەزەوییەوە ببەستنەوە: بەتاڵە مویەك، بەتەنافێك، بە پەیژەیەك، جیاوازی نییە... لەئەفسانەکاندا هەمیشە مرۆڤ هەیە بەبنچینەی درەختەوە بەپلیکانەی ئاسماندا هەڵدەگەڕێتو هەمیشەش بونەوەرێکی خراپ لەسەر ڕێگای هەیە ڕێگری دەکات.

- (تیۆ) وتی: کەواتە لێرەدا خاچەکەی مەسیح درەختێکە.

- بەتەواوی دروستە. منارەکانی مزگەوتیش بەهەمان شێوەیە، کە بەرەو ئاسمان سەریان هەڵبڕیوە. بەڵام لەهەردوو بابەتەکەشدا هۆکارێك هەیە بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ خواوەند.

- زۆرباشە، ئەی دۆزەخ؟

- دەبێت خەڵکی لەترسی سزاداندابن ئەگینا دەست لەهیچ کارێك ناگێڕنەوە. دەبینین کاتێك (بودا) بەسادەیی (ڕێگای ناوەڕاست) و شادی دەرون پێشنیاز دەکات وێنەکانی سەردیواری پەرستگای (تبت)یەکان بەوێنەکردنی جەنگی خواوەندە تایبەتەکان لەگەڵ ئبلیسە

خەیاڵییەکان دەستپێدەکەن. لەو بابەتانەشدا شوێنی ئەو سزادانە ترسناکانە بزرە لای جولەکەکان (شول - Sheol) یان عەدەمو تاریکی هەیەو لای هندۆسەکانیش ئازارو رەنجی دۆنادون لەسەر رێگایە. مرۆڤ خۆی خوازیاری سزادانە.

- لەم گەمەیەدا چونکە سزادان هەیە براوەش هەیە، بەڵام خۆشبەختانە شتێکی دیکە پەیدا دەبێت.

- سەیرە، بڵێ بزانم چییە؟

- هێشتا نازانم. بۆ نمونە ساتە خۆشەکان شتێکی وەك بەریەككەوتن، روبەڕوبونەوەیەك. سەیرە، بەڵام دڵنیاکەرەوەیە.

- دەتەوێت باس لەپەیوەندیگرتن لەگەڵ خواوەندا بکەیت؟

- (تیۆ) وتی: پەیوەندیگرتن لەگەڵ ئەو کەسانەی بڕوایان بەخودا هەیەو لەمندا ئارامی دروست دەکەن.

- پورە (مارتا) بێدەنگبوو. کاتی ئەوەبوو بکەوێتە پرسیارکردن لە (تیۆ) دەربارەی ئەو پەیوەندیگرتنانەی ئەگەر هەبوو ببنە هۆکارێك بۆ چارەسەرکردنی.

## چین یان سیستمی جیهانی

- (تیۆ) لەجیهانی ئەندێشەدا درەختێکی لەسەر شێوەی خاچ دروستکردو لەسەر دارەکەش مناڵێکی قژ لول، کە بەرەو ئاسمان دەستی هەڵبڕیبوو. لەکاتێکدا پەڕاوێچکەکەی دادەخست لەپورە (مارتا)ی پرسی: ئەی چینییەکان؟ ئەوان چیدەکەن؟

- بەگشتی رێڕەوێکی دیکەیان هەیە. بنەمای پەسەندکراویان (سیستمی رەهایە). ئەگەر خۆت لەگەڵ ئەو رژێمە بگونجێنیت هەموو شتێك راست بەڕێوەدەچێت، بەڵام ئەگەر سەرپێچی بکەیت کارەکانت سەخت دەبن.

- باشە، وەك هندۆسەکان.

- بەڵێو نەخێر، هیچ ئاینێك نییە جیهانبینیەکی تایبەتی نەبێت. واتە پێناسەیەکی تایبەت بەخۆی نەبێت بۆ پەیدابونی جیهان. جیهانناسی جولەکەگەرایی (جودابیزم)و کریستیانیت دەزانیت...

- پەلەمەکە... خودا بەهەشتی ئەفراند، ئەوەیە؟

- پورە (مارتا) وتی: دیارە لەوبارەیەوە شتێکی ئەوتۆ نازانیت. لەسەرەتادا تاریکی هەبوو، زەوی بەتاڵایی بوو، رۆحی (نەمر)یش خۆی بەسەر دەریاکاندا کێشابوو. وتی: (روونـاك

بەرەوە)و روناك بوەوە. ئەوەيان ناونا (رۆژ)و تاريكيش بە (شەو)، پاشان ئاسمانى لەئاو جياكردەوەو پێوت: (وشكانى)و زەوى دروستبوو. گياى رواند، ئەستێرە، زيندەوەرانو دواجار مرۆڤى ئەفراند. ئەم دەستكەوتە شەش رۆژى خاياند، واتە دوا رۆژى هەفتە خوا پشويدا.

(تيۆ) هاواريكرد: ئەوە دەزانم، لەو رۆژەدا هيچ كارێكى نەكرد.

- پورە (مارتا) وتى: ئێمە روبەروى خەڵكو گەلى وادەبينەوە، كە لەوبڕوايەدان خودا لەو رۆژە بەدواوە بۆ هەميشە خەوتوە. بەلام هندييەكان بڕوايەكى ديكەيان هەيە. ئەمانە لەو بڕوايەدان بونەوەرەكان لەتۆوێكى سەرەتاييەوە دێن، كە (كردگار) شتى هاوشێوەى لێدروست كردوە، واتە جيهان، ماڵو جەستە هەمويان يەك پێكهاتەيان هەيە. پرنسيپى چينييەكانيش مايەى بەراوردكردنن لەگەڵ ئەو بەدەستهێنراوانە. لەلاى ئەمان جيهان كۆمەڵەيەكى گەورەو بەرفراوانە، كە ناوچە شاخاوييەكانو پەيكەرەكان، رەنگو ئاراستەكان، خۆراكو خولانەوەى وەرزەكان هەمويان لەناويدا وەك دەزگايەكى گەمەى (ميكانۆ) رێكخراوە، كە مرۆڤيش ناتوانێت لەو بازنەيە بچێتە دەرەوە.

- مەبەستت چييە؟

- بۆ نمونە، پشتى چياكان لەرێگاى پەيوەندييەكى نەبينراوەوە پەيوەستە بەو كورپيەى لەپشتى كەسانى كۆمدا هەيە.

لەبەرئەوە چياكان چەمانەوەو كۆم بون؟

- بەڵێ، لەبەرئەوەيە چينيەكان كۆمەڵە لەيەكچوەكانيان ئەژماركردبوو. باكور زستان بوو، ئاو، چوارەمين(هێما) لەهەنگاو و ژمارە (٦)ى باشور هاوين بوو. ئاگر، (هێما)ى دووەم لەهەنگاو و ژمارە (٧)ى خۆرهەلات بەهاربوو. دار، پێنجەم (هێما)و ژمارە(٨)ى خۆرئاوا پايزبوو. كانزا، شەشەم (هێما)و ژمارە (٩)ى لەناوەراست سەنتەر بوو. خاك، (هێما)ى يەكەمو ژمارە (١٠)، كەدەيانتوانى بە (١+٠=١) بهێننەوە.

- ئا.. دەزانم! دايكم ئەم بابەتەى لە گۆڤارى (ئيل – Elle، هەفتانەى ژنانەيە لە پاريس) بۆ خوێندومەتەوەو ناوى (ژمارە ناسى)يە.

- هەڵبەتە، بەلام ئەو ژمارە ناسييەى لەچەمكو دەقو زەمينەكەى جيابوبێتەوە شتێك نييە جگە لەجۆرێك لەئەستێرەناسى سادە... بۆ دەككردن بەو (ميكانۆ) مەزنە دەبێت دوورتر برۆين، چونكە لە(چين) (شوێنو كات) يەك كۆمەڵە رێكخراويان پێكدێنا، كەبازنەيەك بوو لەشێوەى وەرزەكانى ساڵ. كات زياتر بەبازنە دەچوو، لەكاتێكدا شوێن زياتر لەشێوەى

چوارگۆشە نزیك بوو. لەبەرئەوە سەرانسەری جیهان بۆ چوارگۆشە دابەش دەبوو. دیواری ماڵەکان، حەساری شارەکان، زەوی کشتوکاڵو دەشتەکانو کۆبونەوەی ئیمانداران لەسەر شێوەی چوارگۆشە دەبوو. بەجۆرێك چوارگۆشەی پیرۆز کۆمەڵی ئیمپراتۆری چینو بەواتایەکی دیکە سەرانسەری جیهان پیشاندەدا. بەڵام کات لەسەر بنچینەو بنەمای کاری ناو کێڵگەو زەوییە کشتوکاڵییەکانە رێکدەخرا: بەوجۆرەی کە پاش خولی چالاکی گەرمو گوڕ بەمەبەستی کێڵانی زەوی، خولی کۆبونەوەی خەڵك بۆ سازکردنی جەژنەکان، هەڵگرتنەوەی بەرهەمو رێزلێنانی کاری پیرۆز دروست دەبێت. هەموو ساڵێك کۆمەڵێك خەڵکی کۆدەبونەوە بۆ بانگهێشتی کاتی ئاینده (دەهەزار ساڵ! دەهەزار ساڵ!)، چونکە بەهەمان شێوەی میسرییەکان، کە بەبێ پارانەوەو نزای خەڵکی خۆر لەئاسماندا هەڵنەدەهات، لەچینیش بەبێ کۆبونەوەی خەڵك لەوەرزی بەهاردا (کات) لەنیوەی رێگادا دەمرد.

بەڵام دوو بنەمای گرنگ، کە بە(یین - Yin)و (یانگ - Yang) ناودەبران دوو بازنەی (کات)یان لەنێوان خۆیاندا دابەشکردبوو: (یین) بەسەر شێداری، تاریکی، مانگو رەگەزی ژنانە حوکمڕانی دەکرد، (یانگ) کاروباری وشکی، روناکی، خۆرو رەگەزی پیاوانەی بەڕێوەدەبرد.

- (تیۆ) لەژێر لێوەوە وتی: وابزانم پێشتر دەربارەی ئەو دوو دیاردەیە قسەمان نەکرد. بەراستی (گانش)یش چوبوە ناو ئەو روداوەوەو... منیش لەناویدام! (ئیسکاندا)! ئاگر واتە پاپا، گانش، ئاو واتە دایك.

- پورە (مارتا) سەلماندیو گوتی: راستە. ئەم دوانە (ئاوو ئاگر) تەواوکەری یەکدین. دەبینیت، نۆرەکاریو بەدوای یەکداهاتنی ومرزەکانی وشکیو شێدار بەم دوو بنەمایەوە بەستراون. (یانگ)ی روناكو خۆرمتاوی لەلایەن تاریکی خاکەوە کێشدەکرێتو بۆ ژێرخاك دەڕواتو لەکاتێکدا بە پاژنەی پێ زەوی دەکوتێت تا سەهۆڵەکان بشکێنێت و سەرچاوەی ئاوەکان بێدار بکاتەوە تا لەژێر زەوییەوە هەڵقوڵێن. بەمشێوەیە (یانگ)و (یین) لەپەیوەندییەکی بێ کەموکوڕیو کامڵدا کۆی ژیانو ژینگە دروست دەکەن. ئەم پرۆسەیەش وێنەیەکی جوان بوو، کە پورە (مارتا) لەسەر پەڕاوێچکەکەی (تیۆ) کێشای.

- (تیۆ) وتی: جوانە، ئەو دوو خاڵە چییە؟

- پورە (مارتا) رونیکردەوە، کە هەریەك لەو دوو بنەمایە لەناو ئەویدیدا هەیە ئەم دوو خاڵە بەشی (یین)ی ژنانە لەناو (یانگی) پیاوداو بەشی (یانگ)ی پیاو لەناو (یین)ی ژناندا دەردەخات.

- (تیۆ) وتی: دوباره دەستپێکردەوە، دروست وەك هندستان! راستە، کەوا منیش هەلگری رەگەزێکی ژنانەم؟

- پورە (مارتا) بەبیریهێنایەوە، کە لەو دواییانەدا زانایەکی بواری (بایۆلۆژی) بونی کرۆمۆسۆمی هەر یەك لەدوو رەگەزەکەی لەویدیکەیاندا دۆزیوەتەوە. ئەم دۆزینەوەیە دەستخۆشی لەئاگایی ئاینەکانی ئاسیایی دەکات لەوبوارەدا.

- (تیۆ) بەگومانەوە وتی: بەلێ، (رەبی ئالیئەزر)یش باسی لەئامادەیی خانمێکی داپۆشراو، ئامادەیی ژنانەی خواوەندی کرد، وانییە؟

- پورە (مارتا) وتی: (رەبی) ئەو بابەتەی لە (تەورات)ەوە وەرنەگرتبوو. (شخینە) یان هەمان ژنی داپۆشراو لەکاتی کۆچکردندا وەك فاکتەرێکی دلدانەوەی گەلی جولەکە سەریهەلدابوو.

- (تیۆ) وتی: لێرە هیچ دەربارەی (کۆنفوشیۆس) نابینم.

- پورە (مارتا) وتی: ئۆو، ئەو تەنها منالێك بوو. لەبنەماو بنچینەدا ئاینێکی چینی نییە، چونکە ئاینی رەسەنی چین (تاو - Tao)ە، کە بەواتای رژێم، رێچکە یان رێگا دێت.

## تاو

- پورە (مارتا) رونیکردەوە: (تاو) بنەماکانی (یانگو یین)ی وەرگرت: دەقی پیرۆز دەیوت: (تاو وێنەیەکە لە یینو وێنەیەکە لە یانگ). (تاو) بنچینەی هاوبەندیو بەدواداهاتنی تەواوی ئەو دوانەیە. (تاو) لەهیچ رویەکەوە خواوەند نییە، هیچ نائافرێنێت، بەلکو رێکیدەخات. (تاویستەکان) یان پەیرەوانی (تاو) بۆ بەرزڕاگرتنی ئاینی (تاو)، واتە سیستمی جیهان، تەنها بەجۆشوخرۆشەوە پەیوەندییان بەشوێنەکانەوە هەبوو. بۆ نمونە ئەو حەوت هەزار پلەیەی دەبوو پیایدا هەلگەڕێیت تابەهۆی کاتەوە بە شوێنو بۆشایی بێکۆتا بگەیت. بەلام هەندێك (تاویست)ی کەللەشەق گۆشەنشین دابڕانو تەنیاییان لەناو ئەشکەوتو قوللەی چیاکاندا پێباشتر بوو لەوەی لەگەل خەلکدا بۆ زیارەتکردن بچن.

- (تیۆ) راڤەیکرد: ئەوانەش رامانو خەلوەتیان دەکێشا، شتێکی نوێی تێدا نییە.

پورە (مارتا) وەلامیدایەوە: ئەمانە تەنها بەرامانو خەلوەتەوە نەدەوەستان، بەلکو راڤەو شرۆڤەشیان دەکرد، چونکە فەیلەسوفانی (تاویست) بەمەبەستی رونکردنەوەی زیاتری سمبولەکانی (یین)و (یانگ) لەبواری ئەژمارکردنو گریمانەی ئەندازیاریدا رژێمێکی هوشیارانەیان داهێنا، کە بووە بنەماو بنچینە بۆ فیزیا، کیمیاو پزیشکی باش، بەلام ئەم گروپە

سەرشێتی خۆشیان هەبوو: واتە بەهەمان شێوەی کیمیاگەرانی ئەوروپا، کەوێڵکی کێشی فەلسەفیو سەرچاوەی هەتاهەتایی بون، (تاویست)ەکانیش دەیانویست بەهەر بەهایەك بووە ڕێگای فەلسەفی جوانبون بەدەستبێنن. ئەم کۆپییە لەدرێژایی تەمەن لایەنی سەیروسەمەرەی هەبوو. سەرەتا دەبوو وزەی ژیان پارێزراو بێتو لەزیانی شەیتانەکان یان (کرمی سێتا) دوربێت، چونکە شەیتانەکان بەردەوام بەدەرکردنی ئەو وزانە لەچاڵەکانی جەستەدا بەدوی لەناوبردنو هەڵلوشینیدان. ئینجا دەبێت شەونمو خوێنی بونەوەران بخورێت. بەوجۆرە (تاویست)ەکان هەوای مانگ، خۆرو ئەستێرەکانیان هەڵدەمژی. سێیەم دەیانتوانی کارەکانی ناسراو بەزۆری خەوتن ئەنجامبدەن: واتە لەکاتی پرۆسەی سێکسیدا (شەهوەت - نطفة)یان رادەگرت تابگاتە ئەوپەڕی جەستەو چاککاریو باشکاری لەمێشکدا بکات.

- (تیۆ) گەڕاو گوتی: سەیرە، ئەم بابەتەم لەشوێنێکی دیکەدا بیستووە.

- پورە (مارتا) درێژەیپێدا: تاویستەکان هەروەها کەوتنە گەڕان بەدوی ئەو مادە کانزاییانەی دەتوانن نەمری بۆ مرۆڤ دەسەبەرو ڕێگری لەمەرگ بکەن. لەو بڕوایەدابون ئاڵتونو گەوهەری بەرد چونکە (یانگ)ن بۆگەنو گەندەڵبون لادەبەنو (سینابر - Cinabr) بەهۆی ئەوەی ڕەنگی جەرگییە دەتوانێت بەشە گەندەڵبوەکانی جەستە چاکبکاتەوە.

- (سینابر) چییە؟

- پورە (مارتا) وتی: بەردێکی کانزایی سولفات جیوەیە. تۆ جیوەت بینیوە؟

- بەڵێ، ڕۆژێکیان گەرمیپێوێکم شکاندو جیوەکەی وەك مار هاتە دەرەوە. دایکم وتی کانزایەکی زیندوە.

- دانبەوەدا بنێ دیاردەیەکی سەیربوو. لەبەرئەوەیە (سینابر) یان بەردی جیوەیی، کە جیوەی لێدەردەهێنرێت، تا ئەو رادەیە مایەی سەرنجی (تاویست)ەکان بوو. کیمیاگەرێکی گەورەی چینی ڕێگای داوە ئەگەر دەنکی (سینابر) لەگەڵ هەنگویندا بۆ ماوەی یەك ساڵ بخورێت پاش ئەو ماوەیە دوبارە موەکان ڕەش دەبنەوەو دانە کەوتوەکان دوبارە دێنەوە.

- (تیۆ) وتی: ئەم چینییانە شێتن. زۆر لەو ژاپۆنیەکان لەرێگای ئەو جیوەیەی لەگەڵ مادەی دیکەدا فرێدرابونە ناو دەریاوە ژەهراوی بونو مردن.

- جیوە بەبڕی تۆزقاڵ شتێکی خراپ نییە. ئەم مادەیە لەماسی، باڵندەو درەختی (تمشك)دا هەیە.

- (تیۆ) وتی: ئەوانەیان ڕەنگی سورە.

- بەڵام (سینابر) بەردە کانزاییەکی جەرگی نییە. (تاویست)ەکان لەو باوەڕەدان لەژێر تیشکی سیستمی جیهانـدا لەناوچەیەکی نهێنی، کە ئەویش پەیوەستە بە کوێستانێکی ئەفسانەیی لەدەریای خۆرئاوا، (کێڵگەیەکی سینابر) هەیەو (تامیست)ەکان دەتوانن بە دڵۆپاندنی تۆوەکانی کاریگەرییەکانی لەمێشکدا دەربخەن. دەیانگوت ئەو دۆخە وای لەپەیڕەوانی (تاو) کردوە بگەنە باری بێئاگایی، کە بەباری ئارامو بەختیاری جیهانی پێش ئەفراندن چوێنراوە.

- (تیۆ) وتی: زۆر جوانو زۆر ئاڵۆزە.

- تائەو رادەیەی ئاینی (تاو) بەم کۆپییە ئەفسوناوییەوە لەدۆڵی کۆبونەوەی گەندەڵیو ئارەزوە کۆگەلییەکاندا نغرۆ بون. تێگەیشتیت؟

- (تیۆ) بەبێ سەرنجدان وتی: دواکەوتنی ئارەزووەکانو گەندەڵی کۆگەلی؟ کارێکی ناشیرینو بەدرەفتارییە.

## کوڕی ناشیرینو کوڕی شاراوە

- پورە (مارتا) ئەنجامگیرییەکەی پەسەند کردو گوتی: ئەم گردبونەوانە دواجار بەئاژاوەو ناڕێکوپێکی گەیشتو بەمجۆرە درێژەی پێدا: ئینجا لەدەوروبەری سەدەی شەشەمی پێش زاین (کۆنفۆشۆس) سەریهەڵدا، کە ناوی راستەقینەکەی مامۆستا (کونگ کی)[1]یە. ئەم هەرگیز بەدوی نەمرییەوە نەبوو. سیحرو جادوگەریو نەزانی دوردەخستەوەو دەیگوت: ( **داواکاری توێژینەوەی دورودرێژ، ئەفراندنی شڵەژاوییەکان، وەك کەسێکی بۆ هەموو شتێك وێنەیەکی هەبێت بۆگەیشتن بەئاییندە شتێك نییە من داواکاری بم**). ئەو چی دەویست؟ رێزگرتن لەسیستم، پەیڕەویکردن لەرێساکانی کۆمەڵگا، کە لەسەر بنچینەی یاساکانی بونەوەران رۆنراوەو بەهۆی فەرماندەوە بەرێوە دەبرێت. بۆ ناسینەوەی ئاماژەکانی جیهان هێندە بەسە چاودێربین وبڕوانین: مامۆستا (کۆنگ) چاودێرو تێبینیکارێکی بلیمەت بوو. بەبەردبوەکانی دەدۆزییەوەو ناوی نەناسراوترین ئاژەڵانی دەزانی، بەڵام هەرگیز نەیدەوت: **(من دەزانم)**. بەڵکو دەیوت: **(فێریان کردوم کە...)**، چونکە هیچ شتێکی دانەدەهێنا، بەڵکو ئەو سونەتانەی لێکدەدایەوە کە لەقوڵایی سەدەکانەوە هاتبون. تەنها یەك شتی لەخەڵك دەخواستو دەیوت: **(کەسی بەشەرەف خۆی بەئەدەب دەکاتو رێز لەکەسانی دیکە دەنێت)**.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: هەرئەوەندە؟

---

[1] Kong Kicou: کۆنفۆشیۆس کراوە بەناوی لاتینیو خۆرئاوایی دزو پاکونگ – تسو (Kung Tzu) وە لەم کتێبەشدا روبەروی شێوەی دیکەی ناوی (کۆنگ تزو) دەبینەوە.

- ئەمەش بەراستی هەمان ئەو شتەیە پەیڕەوانی پێیان وتوەو ئەویش ئەمەی زیادکردوە بۆئەوەی وتبووی: (کەسی بەشەرەف خۆی بەئەدەب دەکاتو ئارامی بەوانی دیکە دەبەخشێت)، چونکە هێشتا بەس نەبوو، درێژەیپێداوە: (کەسی بەشەرەف خۆی بەئەدەب دەکاتو ئارامی بەهەموو خەڵك دەبەخشێت)، چونکە ئەگەر هەموان سیستمی جیهانی بپارێزن کۆمەڵگە تەندروست دەبێت. ئەمەش بەهیچ شێوەیەك ئەوشتە نەبوو گەورەترین مامۆستایانی (تاو) بەناوی (لاوتزۆ - Laotzo) رایگەیاندبوو، چونکە بەناوی پەیڕەوی (تاویزم)ـەوە لەدوای رامان و خەڵوەتێکی گۆشەگیرانەو نەمریدا بوو.

- ئەمەم هەر نەبیستوە..

- پورە (مارتا) وتی: (تاو – تۆ – کینگ)، کە دانەرو نوسەری پیرۆزترین دەقی چینییە بەمامۆستا (لی)ش ناسراوەو ناوە بچوکەکەی (EUL)بوە، بەڵام بە (تان - Tan) بانگکراوە.

- (تیۆ) وتی: هەتا ئێرە چوار ناوە بۆ کەسێك.

- پورە (مارتا) وتی: بەڵام تەنها لەژێرناوی (لاو - تزۆ)دا بوە نەمر. ئەویش وەك مامۆستا (کۆنگ) ئەگەر زۆرە لەپارێزەرانی دەربارى زنجیرەی زۆر کۆنی چین بووبێت، کە پاش سەرکەوتنی (میرچیۆ) دەسەڵاتیان وەرگرت.

- (تیۆ) پرسی: ئەم کەسە کێیە، کە ئاوازی ناوەکەی وەك پژمەیە؟

- پورە (مارتا) وتی: ئەمە راڤەکردنی تۆیە، بەڵام ئەو میرە لەدوایدا بوە پاشایەکی زۆر گەورە!. کۆتای بەدەسەڵاتدارێتی زۆردارو خوێنمژان هیناو بووە دامەزرێنەری چین. (لایۆتزۆ) لەدەرباری ئەمدابوو. پاشان بەرەو خۆرئاوا ملی ناو کتێبە بەناوبانگەکەی نوسی: پاشئەوەی لەرازی درێژی تەمەن شارەزابوو دوو سەدەی تەواو لەژیاندا مایەوە. بەهەمان شێوەی کە سیسرك کاژ فڕێدەدات ئەویش تەرمەکەی خۆی لەشوێنێك داناو لەجیهان هەڵات، هەر لەبەرئەوەشە سیسرك پیرۆزن.

- (تیۆ) وتی: لەبەرئەوەیە هەرگیز نەمنتوانیوە لە (پرۆڤێنس)[1] یەکێك لەوانە بگرم.

لەوانەیە خەڵکی (پرۆڤێنس)یش بەپەرستنی سیسرکی نادیار تارادەیەك چینی بن. باشە دەتوانین درێژەی پێبدەین؟ بەردەوامبوو: چونکە بۆ رێکخستنی دوو دیدی مامۆستای گەورە، واتە رامان و خەڵوەتی (لاوتزۆ) لەگەڵ (کار)ی مامۆستا (کۆنگ) دوجار سەردانی کردوە. لەسەردانی یەکەمدا (لاوتزۆ) زۆر نائاسایی بوەو بەمامۆستا (کۆنگ)ی وتوە: (خۆت لە

١. Provence: ناوچەیەکە لەخوارووی خۆرهەڵاتی فەرەنسا.

خورەوشتە ناشیرینەکانت رەها بکە. ئەو هەوەسانە لەخۆت دابڕەو دەست لەو سەرچ... خۆبەزلزانیو فیرعەونیانەت بشۆ، کە لێت دەڕژێت: ئەو رەفتارانە سود بەوبونە ناگەیەنێت ئەمە هەموو ئەوشتە بوو دەمویست بەتۆی بڵێم). مامۆستا (کۆنگ) بەدڵی شکاو... نیگەرانییەوە بۆلای موریدەکانی گەڕاوەتەوەو پێی راگەیاندن، کە وایزانیوە هەموو بونەوەر... جیهان دەناسێت، بەلام ئێستا روبەروی زیندەوەرێك بۆتەوە، کە تائێستا نەیناسیوە: لەگە... هەژدیهایەك بەناوی (لایۆ – تزۆ) لەسەر پشتی (با)و هەورەکانەوە بۆ ئاسمان دەچێت.

- جاری دووەم مامۆستا (کۆنگ) کەچووە (لایۆ – تزۆ) جەستەیەکی بێجوڵە بووە. چاوەنۆ... بووە تا (لایۆ – تزۆ) چاوی کردۆتەوە. مامۆستا (کۆنگ) پێیراگەیاندووە (ئایا بەهەڵەداچو... تۆ وەك پارچە تەختەیەك وشك بویت، ئەم جیهانەت بەجێهێشتبوو، لەگۆشەگیری... تەنیاییەکی دورەدەستدا جێگیر ببویت). (لایۆ – تزۆ)وەلامیدایەوە (بەڵێ، رۆشتبوم تا گەمە... گەڕان بەبنەچەو سەرچاوەی هەموو شتەکان بکەم).

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانێکی تەواوەوە وتی: چ خەونێکە! گەڕان بەناو بنەچەی شتەکان!. م... ئەو پیرەمێردەی تۆ بەخۆبەزلزان تێگەیشتبوم!... تۆ کامیانت لەلاباشترە؟

پورە (مارتا) دودڵی نواند، لەوانەبێت مامۆستا (کۆنگ) بەسەلیقەی ئەم کەسێکی زیات... نەریتیانە بوو بێت. هەروەها (لایۆ – تزۆ)ی ئەهلی رامانو خەڵوەت دیارە لەگەورەیی... مەزنایەتی دورنەبوو، بەلام رامانەکانی نەیدەتوانی دیاردەیەکی گونجاو بێت بۆ بەڕێوەبردنی مرۆڤ. (تاویست)ـەکان دەربارەی (لایۆ تزۆ) دەڵێن: (هیچ کارێك ناکات لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کارێك نەماوە نەیکردبێت). لەراستیدا ئەو بابەتە گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو. چونکە سەرەڕای ئەوەی هەموو کەس لەبونو ئامادەیی مامۆستا (کۆنگ) دڵنیابوو، بەلام بونی (لایۆ – تزۆ). کە بە(کوری شاراوە) ناوزەدیان کردبوو، کارێکی وێناکردنو خەیاڵی بوو. بەکورتی، ئەگەر بڕی... لەسەر هەڵبژاردنی رابردوو بێت پورە (مارتا) بەلای مامۆستا (کۆنگ)دا دایدەشکاند. گەیشت... ئەو دەرئەنجامەی کە: کەسێکی هیومانستی بووە. کوڕێکی پڕ قەدەر.

- (تیۆ) وتی: بەلام زۆر ناشیرین، جگە لەوەش دەتوانرێت بوترێت بودایەکی دیکە.

- بەلام، نەخێر، چونکە (بودا) (رێگای ناوەڕاست)ی بۆ هەموو کەسبوو بەبێ جیاواز... کاستو چینەکان. لەبارێکدا مامۆستا (کۆنگ) ئاودارێکی بلیمەتبوو، کە چاپۆشی لەهیچ شتێک... جیهان نەدەکرد لەبەرامبەر ئەو وێنەیەی هەیبوو، لەنادادپەروەرییەکانی، نا یەکسانییەکانی سزاکانی.

- (تیۆ) بەجۆرێك لەزرنگییەوە پرسی: لەهەمان کاتدا دەیگوت: دەبێت بەدرێژایی ژیان کاربکەیت بەبێئەوەی بەدوی ئەوبەری دیکەی جیهانی بالآدا بگەڕێیت.

- پورە (مارتا) بەدڵنیاییەوە وتی: هەڵبەتە وایە (تیۆ).

- کەواتە هەردوکیان یەکن. ئەوەش شێوازێکە بۆ هێشتنەوەی خود لەناوەراستدا.

- پورە (مارتا) بەنارازییەوە وتی: بەلاَم بەبێ بەدەستهێنانی روناکی!

(تیۆ) وتی: نیگەران مەبە! ئازاری (بودا)کەی تۆ نادەمو دەهێڵم لەئارامییەکەیدا سەربنێتەوە.

## (سودهارتۆ)ی نهێنی ئامێز

فڕۆکەخانەی (جاکارتا) جوانترین فڕۆکەخانەی جیهان بوو. بەشە جیاوازەکانی، وەك پەرستگاکان، بەدیواری رازاوەی ناو باخچەکانەوە یەك لەدوای یەك ریزببونو هەریەکەیان لەپێشوازی ئاسایی فڕۆکەخانەدا تایبەتمەندبون. چونەدەرەوە، جانتاکان، کۆنترۆڵی ئاسایش بەزمانە نێودەوڵەتییەکان. (تیۆ) نیگەرانی ئەوەبوو، کە دەبێت کێ چاوەنواریان بێت.

- لە پورە (مارتا)ی پرسی: پیاوە یان ژنە؟

- پیاوەو چینییە، لەبەرئەوە لەکاتی خۆیدا تەلەفۆن دەکات.

هەربەوجۆرەش بوو. بەرێز (سودهارتۆ) نزیکەی چل ساڵ دەبوو؛ ئەندام بچوك، بەخۆو بەکراسێکی زۆر شیکەوە. بەگەرمی دەستی پورە (مارتا)ی راتەکاند.

پورە (مارتا) کە بەرەو پێشەوە لەگەڵ خۆی دەیبرد وتی: (تیۆ)ی برازامت پێدەناسێنم.

- (تیۆ) وتی: ناوی بچوککراوەی تۆ چییە؟

کابرای شیکپۆش وتی: ناوی بچوککراوە لە (ئەندەنوسیا) نییە. بە (سودهارتۆ) بانگم بکە.

- پاش ئەو گەشتە دورودرێژە دەبێت شەکەت بیت. ئۆتۆمبیلەکەم لەوێدایە. (مارتا)ی ئازیز... لەهۆتێل (بۆربۆدۆر کنتینانتاڵ) شوێنم بۆ گرتون. هیوادارم گونجاوبێت.

- بۆ گەیشتنە هۆتێل دوو سەعاتی پێدەچوو. جەنجاڵی سەر رێگاکانو پیسبونی ئاوو هەوا بەرادەیەکی زۆر ترسناك بوو. (تیۆ) لەجامی ئۆتۆمبیلەکەوە شەقام، درەختەکانی سەر شۆستەکان، تەلارە هەرمەبەرزەکان، کۆشكو گۆڕەپانە خڕەکانی دەبینی، کە ئۆتۆمبیل تیایدا دەسوڕانەوە، هەروەها گومەزێکی بینیو هاواریکرد: پەرستگا! چینییە؟

- (سودهارتۆ) وتی: لەئەندەنوسیا ئاینی یەکەم ئیسلامەو ئەوەش گومەزی مزگەوتی (ئیتکیتال)ـە. ئەو مزگەوتە جێگای دوانزە هەزار ئیماندار دەبێتەوە، چ لە ژنانو چ لەپیاوان، دیارە هەریەکەیان بەجیا.

- دوانزە هەزار کەس؟ دیارە گەورەترین مزگەوتی جیهانە؟

- بێگومان.. ئێستا مزگەوتی گەلەك گەورە دروست دەکرێت.

- بەلاّم خۆ تۆ موسڵمان نیت؟

- (سودهارتۆ) وەلاّمیدایەوە: خۆ ئێمە لە ولاّتێکداین ئازادی ئاینی بەخشیوە!

- پورە (مارتا) بەشداریکرد: بەم پرسیارانەت هاوڕێکەمان سەغڵەت دەکەیت.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بۆچی؟

- هاواریکرد: دوبارە پرسیار؟ کەمێ بێدەنگ بە.

- (تیۆ) بەبێئەوەی بزانێت هۆکەی چییە! زانی نزیکە هەڵە بکات..

گەیشتبونە بەردەم هۆتێلەکە، کە تەلارێکی قەشەنگی نێو درەختی نارگیل، مۆزو درەختی گوڵی بۆنداربوو. باخەکانی (کرتامانی) بەهۆی گوڵی یاسەمینو بەرزی نائاسایی دارخورماکانییەوە لای گەشتیارانی بەناوبانگ بوو.

- هەر کە (سودهارتۆ) بەتەنیا بەجێیهێشتن، (تیۆ) بە پورە (مارتا)ی وت: بڵێ بزانم چ هەڵەیەکم کرد؟

- دیارە تۆ نازانیت. بەڕێز (سودهارتۆ) وەك هەموو چینییەکانی دیکەی دانیشتوی ئەندەنوسیا ناوی خۆی گۆڕیوە. لەراستیدا ناوی (کونتای – کوان)ـە. لە (ئەندەنوسیا) چینییەکان زۆر خۆدەپارێزن.

- (تیۆ) هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: کەواتە گرنگ نییە. هیوادارم دوچاری ئەشکەنجەدانو بەدواداچون نەبوبێت.

- ئەوەش رویداوە. لەساڵی (١٩٦٥)دا پارتی کۆمۆنیستی ئەندەنوسیا بووە خاوەنی دەسەلاّتو توانایەکی زۆر، تائەو رادەیەی لەهەموو شوێنێك دەنگۆ بلاّوبوو، کە کۆمۆنیستەکان بەیاریدەی (مایوزدونك – مایوتسەتۆنگ – ماوتسی تۆنگ)ی رابەری پارتی کۆمۆنیستی چینی بەنیازن کودەتا بکەن. ئیدی سوپا کەوتە دەستگیرکردنی کۆمۆنیستەکانو یەك ملیۆن کەس کوژرانو چینییەکانی ناو ئەندەنوسیا بەهای ئەو خوێنەیان بەخشی.

(تیۆ) پرسی: هەموو ئەوانە کۆمۆنیست بون؟

دیاره نەخێر. ئەوانە هەموو لەئەندەنوسیا لەدایك ببون و هەر لەكۆنەوه خەریكی ـزرگانی بون. بەڵام هەمویانیان بەناپاكی تاوانباركرد، تەنها لەبەرئەوەی وەك چینی مابونەوە ـۆكوژ كران. گومانو بەهەڵەچون هەر بەردەوام بوو، بۆ بەڵێ یان نەخێرێك دوكانی جینییەكانیان دەسوتاند، چونكە ئەم گروپە كاركەرو تێكۆشەرو زۆربەیان دەوڵەمەندبونو ـردیان بەسوو دەدا بەكەسانی دیكە. پورە مارتا درێژەیپێدا، بەڵام ئەمكاره هەرگیز جێگای ـەسەندكردن نییە. (سودهارتۆ)ی هاوڕێم خاوەنی پیشەو كۆمپانیایەكی فره نەتەوەییە، كە ـەبواری چنینو تەختەدا تایبەتمەندە. بەڵام فرۆكەیەكی تایبەتیشی لەیانەیەكی ئاسمانیدا ـەیە، تا ئەگەر هەر شتێك...

- هەرشتێك چی؟

پێویستی بەهەڵاتنی دەمودەستانە بێت، هەڵبێت...

- بەهۆی ئاینەكەیانەوەیە؟

- تارادەیەك.. لێره بۆ مرۆڤ واباشترە موسڵمان بێت.

## بەشی شانزە

## (باوان و نەمرەکان)

### کۆکتێلی خوێنی مار

قسەی تێدا نەبوو، هەر لەگەڵ گەیشتنی (تیۆ) بە (جاکارتا) دەبوو سەردانی نەخۆشخانە بکات.

- بەنارەزاییەوە وتی: خاتونە پزیشکەکەی (دارجیلینگ) چارەسەری کردوم، ئیدی نەخۆشخانە چییە؟ بۆ ئەوە بەسنەبوو؟

نەخێر. لەدیدی پورە (مارتا)وە بەسنەبوو، چونکە مانگێك دەبوو تاقیکردنەوەی خوێنی بۆ نەکرابوو. پورە (مارتا) لەژێر سوێندا بەڵێنی دابوو درێژە بەچارەسەرەکەی (لۆبسانگ دڤرژە)ی پزیشك بدات، بەومەرجەی بەرێکوپێکی شیکاری بۆ خوێنەکەی (تیۆ) بکات. (تیۆ) خۆی رادەستدا. ئەرکی بەڕێز (سودهارتۆ) بوو بەسرنجێکی تایبەت لەخوێنی (تیۆ)وە بۆ نەخۆشخانەیەکی تایبەتی (سەنگافورە)ی بنێرێت تا لەوێ بەهۆی باشترین پسپۆڕانەوە شیکاری بۆ بکرێت. پاشان زانیان چەند رۆژێکی دیکە ئەنجامی شیکارییەکە دەردەچێت.

- (تیۆ) وتی: بەمجۆرە بێت دایکم دوبارە دەیکاتەوە بەهەڵا !.
- پورە (مارتا) بەنیوە دلنیاییەوە وتی: نیگەران مەبە... (تیۆ)کەم.
- بەلام من زۆر ئارامو باشمو تەندروستیم زۆر باشترە.
- بەڕێز (سودهارتۆ) وتی: لەوانەیە ئەم لاوە حەزبکات شتێکی دیکە ببینێت. من لەگەڕەکی خۆمان (پاگۆد)ێك[1] دەناسم.
- پورە (مارتا) وتی: بیرۆکەیەکی زۆرباشە.

---

[1] Pagode: ناوێکی گشتییە بۆ پەرستگاکانی جینی، ژاپۆنی، بیرمانیو بەشێوەیەکی گشتی وڵاتی خۆرهەلاتی دورە. کە شێوازێکی تایبەتی بیناسازیان هەیە.

(پاگۆد) هێندە دوورنەبوو، بەڵام بەهۆی قەرەباڵغییەوە یەك سەعاتی ویست تا گەیشتنە گەڕەکی چینییەکان. کۆڵانەکان تەسك بون. ماتۆڕی سێ تایەی ڕەنگ سورو دەستفرۆشانی گوڵی وەنەوشەیی ڕێیان لەرێبواران دەبەست. لەمەنجەڵی سەربەتاڵدا، کە لەهەموو جێگایەك دەبینران، چەندین جۆر گۆشتو سەوزە بەهێواشی دەکوڵان. لەپڕێکدا (تیۆ) لەجێگای خۆی چەقی؛ پیاوێکی بینی خەریکی کەوڵکردنی مارێك بوو، کە هێشتا زیندوو بوو، خۆی بەئەملاو ئەولادا بادەدا.

- (تیۆ)، کە هەناسەی لەسینەیدا قەتیس کردبوو، بەگوێی پورە (مارتا)دا چرپاندی: بینیت؟

- چی؟ ئۆو... مار !. بەڵێ. ئستا سەری دەبڕن تا خوێنەکەی بکەنە گلاسێکەوە. کۆنیاك تێکەڵی ئەو خوێنە دەکەن؛ زۆر وزە بەخشە. دەخۆیتەوە؟

- (تیۆ) سەری بەواتای نەخێر باداو گوتی: بەدڵنیاییەوە نەخێر.

- پورە (مارتا) بۆئەوەی کەمێك بیجوڵێنێت وتی: لەوانەیە حەزت لەئەندامی سێکسی بەور بێت لەدۆشاوی تەماتەدا یان قاچی برژاوی کەڵەشێر؟.

- (تیۆ) بەفیکە لێدانەوە وتی: ئیسپاگتی[2]! بەدۆشاوی تەماتەوە.

- بەڕێز (سودهارتۆ) وتی: ماکەرۆنی چینی حەزلێدەکەیت؟ زۆر ئاسانە.

پاشان کاسەیەکی بچوك سوپی کڕی، کەبرشتەی ماکەرۆنی تێدابوو. (تیۆ) بەبێ هیچ سەغڵەتییەك لوشیدا. پاشان رۆشتن بۆ گۆڕەپانێکی گەورە، کە دەروازەی (پاگود)ەکە بەزەردو سپی ڕەنگکرابوو، بانەکەشی لەسەر شێوازی چینی بوو.

## پاگود، فالگرتنەوەو غەیبزانی

ناو (پاگود)ەکە ڕەنگی زەرد بوو. دیوارەکان، مۆمی گەورە، مۆمدانەکان هەموویان بەرەنگی سوری تۆخی وەك خوێنی (گا) دەیاننواند. لەکۆتایی پەرستگاکەدا پەیکەری ئاڵتونی دەدرەوشانەوە. لەبەرامبەردا سینییەکی پەلی پڕ لە زیخ و لولەیەکی بچوکی کندر[3] چەقێنرابوو. ژنێك چەند (بامبۆ)[4] یەکی بچوك و قامیشێکی درێژی بەدەستەوە گرتبوو. لولەکەی بەدەوری دوکوڵی بۆنداری (کندەر)ەکەدا دەگێڕاو هێندە لاری دەکردەوە تا خەریك

٢. جۆرێك ماکەرۆنی وردە.

٣. کندەر: شێوەی قامیشەو داری هێلمەو دڕکدارەو بۆنی خۆشە، باش لەئاگردا دەسوتێت.

٤. بامبۆ: Bambou ی هندی؛ حەیزەران.

ـیت یەکێك لە لولە بامبۆکان بکەونە سەر زەوی. ئینجا بەخێرایی بەرزی دەکردەوەو ئەوەی ـجولەی دوکەڵەکەوە دەردەچوو دەیخوێندەوە.

- (تیۆ) وتی: ئەوە جۆرێك گەمەیە؟ بەرێز (سودهارتۆ) دەتوانیت بۆ منی شیبکەیتەوە.

- ناتوانرێت بوترێت، کە ئەو خاتونە گەمە دەکات. بێگومان بۆ راوێژکردن بە(پاگود) ـەتۆتە ئێرە. لەوانەیە بۆ زانینی ئایندەی ئەو کوڕەی بێت کەپێشنیازی کارێکی بۆکراوە یان بۆ چارەسەری نەخۆشییەك بێت؛ هەرچۆنێك بێت هاتوە تاڕاستی کارێك بزانیت.

- (تیۆ) وشە بەوشە وتی: ئەمە چ روداوێکە؟ راستی لەکۆتایی بۆرییەکی داردا؟

- (سودهارتۆ) وتی: چینییەکان شێوازی جۆراوجۆریان بۆ غەیبزانی داهێناوە، کە ـەناوبانگترینیان (یی – کینگ – Yi – King )ە. هێندە بەسە شێوازێك یان هەلگری پیرۆزی وەك ئەو دارە زەلە بگرێتو بەمجۆرە... من بەئاڕاستەی دروستی خۆیدا ببەم. پاشان دارەکە بەسەر سینییە (کەندەر)ەکە دەسوڕێنمەوە تا رۆحە پیرۆزەکانی لێدوربخەمەوەو پاشان وەك دەیبینی رایدەوەشێنمو هێمایەکی لێدەکەوێتەخوارەوە؛ خودی خۆم هیچ هەڵنابژێرم. پاشان دەیخوێنمەوەو وەڵامی پرسیارەکەم بەدەستدێنم.

- ئینجا بەرێز (سودهارتۆ) کەمێك چووە لاوە تا ئەو پەیامە غەیبزانییەی لەسەر زەوییەکە بوو هەڵیبگرێتو بیخوێنێتەوە. سیمای گەشایەوەو بەئارامی وتی: جوانە، خواکان زۆر جوانیان وتوە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: کەواتە تۆش باوەڕت بەوە هەیە؟

- (سودهارتۆ) وەڵامیدایەوە: بۆچی نابێت پەیڕەوی لەنەریتی باوانم بکەم؟. لەهەزاران ساڵەوە ئەو شێوازە بەکارهاتووە.

- پورە (مارتا) وتی: تیۆ .. چۆنە تۆش تاقیبکەیتەوە؟

- (تیۆ) وتی: باشە، مەترسی نییەو خۆم دەزانم چ پرسیارێك دەکەم.

پاشان لولەی بەدەستەوەگرتو هێندە بەتوندی تەکانی پێدا، کە پێچراوەیەکی دیکەی ناوی کەوتەخوارەوە. بەرەوە پێچراوەکە رایکرد تا بیخوێنێتەوە، بەڵام بۆیدەرکەوت بەزمانی چینی نوسراوە.

- (سودهارتۆ) ئامادە بوو بۆی وەربگێڕێتو گوتی: (تافێکی خۆش، تافێکی نیشتەجێبون).

- (تیۆ) وتی: هیچ لەو وشانە تێناگەم.

- (سودهارتۆ) وتی: لەوانەیە لەبیرت کردبێت لولەکە بەسەر (کندەر)ەکەدا بسوڕێنیت؟

- (تیۆ) وتی: راستە! دوبارەی دەکەمەوە!

سەرەڕای نارەزایی پورە (مارتا) دوبارەی کردەوە. جارێکی دیکە پێچراوەیەك کەوتەخوارەوە.

- (سودهارتۆ) وتی: لەگەڵ ئەوەشدا دوبارە کردنەوەی راوێژ بەپێی دابونەریتی ئێمە رێگە پێدراو نییە، بەڵام رێز لەنیەتی دۆستە لاوەکەمان دەگرمو وەرگێڕانەکەی دەخوێنمەوە: (یانگ بانگەشە دەدات، یین وەڵام دەداتەوە).

- (تیۆ) بیریکردەوە. (یانگ) خۆر بوو، (یین)یش مانگ. (یانگ) وشكو (یین) شێدار (یانگ) کوڕبوو، (ین) کچ. لەخۆشیدا هەڵبەزییەوەو هاواریکرد: دۆزیمەوە!. (یانگ) منە تەلەفۆن بۆ (فاتۆ) دەکەم... ئەو (یین)ە و وەڵامم دەداتەوە. بەم پێیە من لەگەڵ (فاتۆ هاوسەرگیری دەکەم.

- پورە (مارتا) وتی: خەریکە کەمێك زیادەڕۆیی دەکەیت!.

- هەرگیز!. سەرەڕای ئەوەی ئەو پەیامە پێشبینی دەکات، کە من چارەسەر دەکرێە. تێگەیشتیت؟

- (سودهارتۆ) وتی: ئەی پەیامەکەی یەکەمجار؟

- (تیۆ) وتی: زۆر ئاسانە! (تاڤ خۆشی) خولی سەفەرەکەمەو (تاڤ نیشتەجێبون گەڕانەوەمە بۆ پاریس، وانییە؟

پورە (مارتا) وەکو خوڕادەستدان (تیۆ)ی لەئامێز گرت.

- (تیۆ) هاواریکرد: چەند جوانو سەرنجراکێشە!. ئەگەر ئەمە (تایۆ)یە، من ...

لەپڕ چەند ژنێك بەتوڕەییەوە رویان وەرگێڕا. رەهیبێکی (بودایی) بڕۆکانی بۆ سەرەوە برد. چەند میوانێك لەدەوری (تیۆ) کۆبونەوەو کەوتنە پشکنینی.

- بەڕێز (سودهارتۆ) پەلی (تیۆ)ی راکێشاو گوتی: کوڕی لاو جێگای داخە ناتوانیت بەدڵی خۆت شادییەکەت دەربڕیت، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئێمە لە پەرستگا داین و...

- (تیۆ) بەشەرمەزارو هەست بەسەغڵەتیەوە دەستی لەسەر دەمی دانا. پاش سەردانی پەرستگای پڕ لەدوکەڵی (کندەر) یەکەم پرسیاری وتی : ئەو مۆمە گەورانە چین؟

- (سودهارتۆ) وتی: ئەو مۆمانە بەجۆرێك دروستکراون یەك ساڵی تەواو بگرێت و پاشان دەیانگۆڕن.

- (تیۆ) وتی: بۆ دوبارە ئەفراندنەوەی کاتو پەیکەرەکان؟

## رۆحی خراپەکارو پەریانی چاکەکار

ـبێ یەکێك لە لولە بامبۆکان بکەونە سەر زەوی. ئینجا بەخێرایی بەرزی دەکردەوەو ئەوەی ـجولەی دوکەڵەکەوە دەردەچوو دەیخوێندەوە.

- (تیۆ) وتی: ئەوە جۆرێك گەمەیە؟ بەرێز (سودهارتۆ) دەتوانیت بۆ منی شیبکەیتەوە.

- ناتوانرێت بوترێت، کە ئەو خاتونە گەمە دەکات. بێگومان بۆ راوێژکردن بە(پاگود) ـتۆتە ئێرە. لەوانەیە بۆ زانینی ئایندەی ئەو کوڕەی بێت کەپێشنیازی کارێکی بۆکراوە یان بۆ ـەردەسەری نەخۆشییەك بێت؛ هەرچۆنێك بێت هاتوە تاڕاستی کارێك بزانیت.

- (تیۆ) وشە بەوشە وتی: ئەمە چ روداوێکە؟ راستی لەکۆتایی بۆرییەکی داردا؟

- (سودهارتۆ) وتی: چینییەکان شێوازی جۆراوجۆریان بۆ غەیبزانی داهێناوە، کە ـناوبانگترینیان (یی – کینگ – Yi – King )ە. هێندە بەسە شێوازێك یان هەلگری پیرۆزی وەك ئەو دارە زەلە بگرێتو بەمجۆرە... من بەئاڕاستەی دروستی خۆیدا ببەم. پاشان دارەکە ـەسەر سینییە (کەندەر)ەکە دەسوڕێنمەوە تا رۆحە پیرۆزەکانی لێدوربخەمەوەو پاشان وەك ـدیبینی رایدەوەشێنمو هێمایەکی لێدەکەوێتەخوارەوە؛ خودی خۆم هیچ هەڵنابژێرم. پاشان ـدیخوێنمەوەو وەڵامی پرسیارەکەم بەدەستدێنم.

- ئینجا بەڕێز (سودهارتۆ) کەمێك چووە لاوە تا ئەو پەیامە غەیبزانییەی لەسەر زدوییەکە بوو هەڵیبگرێتو بیخوێنێتەوە. سیمای گەشایەوەو بەئارامی وتی: جوانە، خواکان زۆر جوانیان وتوە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: کەواتە تۆش باوەڕت بەوە هەیە؟

- (سودهارتۆ) وەڵامیدایەوە: بۆچی نابێت پەیڕەوی لەنەریتی باوانم بکەم؟. لەهەزاران ساڵەوە ئەو شێوازە بەکارهاتووە.

- پورە (مارتا) وتی: تیۆ .. چۆنە تۆش تاقیبکەیتەوە؟

- (تیۆ) وتی: باشە، مەترسی نییەو خۆم دەزانم چ پرسیارێك دەکەم.

پاشان لولەی بەدەستەوەگرتو هێندە بەتوندی تەکانی پێدا، کە پێچراوەیەکی دیکەی ناوی کەوتەخوارەوە. بەرەوە پێچراوەکە رایکرد تا بیخوێنێتەوە، بەڵام بۆیدەرکەوت بەزمانی چینی نوسراوە.

- (سودهارتۆ) ئامادە بوو بۆی وەربگێڕێتو گوتی: (تافێکی خۆش، تافێکی نیشتەجێبون).

- (تیۆ) وتی: هیچ لەو وشانە تێناگەم.

- (سودهارتۆ) وتی: لەوانەیە لەبیرت کردبێت لولەکە بەسەر (کندەر)ەکەدا بسوڕێنیت؟

- (تیۆ) وتی: راستە! دوبارەی دەکەمەوە!

سەرەڕای نارەزایی پورە (مارتا) دوبارەی کردەوە. جارێکی دیکە پێچراوەیەك کەوتەخوارەوە

- (سودھارتۆ) وتی: لەگەڵ ئەوەشدا دوبارە کردنەوەی راوێژ بەپێی دابونەریتی ئێمە ڕێگا پێدراو نییە، بەڵام رێز لەنیەتی دۆستە لاوەکەمان دەگرمو وەرگێڕانەکەی دەخوێنمەوە: (یـەگ بانگەشە دەدات، یین وەڵام دەداتەوە).

- (تیۆ) بیریکردەوە. (یانگ) خۆر بوو، (یین)یش مانگ. (یانگ) وشكو (یین) شـ... (یانگ) کوڕبوو، (ین) کچ. لەخۆشیدا هەڵبەزییەوەو هاواریکرد: دۆزیمەوە!. (یانگ) مـە تەلەفۆن بۆ (فاتۆ) دەکەم... ئەو (یین)ە و وەڵامم دەداتەوە. بەم پێیە من لەگەڵ (فـ... هاوسەرگیری دەکەم.

- پورە (مارتا) وتی: خەریکە کەمێك زیادەڕۆیی دەکەیت!.

- هەرگیز!. سەرەڕای ئەوەی ئەو پەیامە پێشبینی دەکات، کە من چارەسەر دەکرێـ... تێگەیشتیت؟

- (سودھارتۆ) وتی: ئەی پەیامەکەی یەکەمجار؟

- (تیۆ) وتی: زۆر ئاسانە! (تاقی خۆشی) خولی سەفەرەکەمەو (تاقی نیشتەجێبو... گەڕانەوەمە بۆ پاریس، وانییە؟

پورە (مارتا) وەکو خوڕادەستدان (تیۆ)ی لەئامێز گرت.

- (تیۆ) هاواریکرد: چەند جوانو سەرنجراکێشە!. ئەگەر ئەمە (تایۆ)یە، من ...

لەپڕ چەند ژنێك بەتوڕەییەوە رویان وەرگێڕا. رەهیبێکی (بودایی) برۆکانی بۆ سەرەوە بـرد... چەند میوانێك لەدەوری (تیۆ) کۆبونەوەو کەوتنە پشکنینی.

- بەرێز (سودھارتۆ) پەلی (تیۆ)ی راکێشاو گوتی: کوڕی لاو جێگای داخە ناتوانیت بەدڵی خۆت شادییەکەت دەربڕیت، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئێمە لە پەرستگا داین و...

- (تیۆ) بەشەرمەزارو هەست بەسەغڵەتیەوە دەستی لەسەر دەمی دانا. پاش سەردانی پەرستگای پڕ لەدوکەڵی (کندەر) یەکەم پرسیاری وتی : ئەو مۆمە گەورانە چین؟

- (سودھارتۆ) وتی: ئەو مۆمانە بەجۆرێك دروستکراون یەك ساڵی تەواو بگرێت و پاشان دەیانگۆڕن.

- (تیۆ) وتی: بۆ دوبارە ئەفراندنەوەی کاتو پەیکەرەکان؟

## رۆحی خراپەکارو پەرییانی چاکەکار

پەیکەرەکان هەندێکیان بەخواوەندی تایبەتو لەخواکان دەچونو هەندێکی دیکەیان لەشەیتانەکان، بەڵام ئەو وزیەی دەیسوڕاندن وزەی چاکەکاری بوو. شەیتانەکان خێوی مردووەکانن، کە بە(کۆوی - Kouei) ناودەبرێت.

- بەڕێز (سودهارتۆ) چەند دانەیەکی ئەژمارکردو گوتی: زۆرجار رۆحەکان یان ئاژەڵانی خراپەکار، کە لەجەستەی دیدا بۆ جیهان گەڕاونەتەوە تۆڵە لەزیندووەکان دەکەنەوە. بۆ نمونە بەرەواڵەت کچێکی قەشەنگ دەبینیت، بەڵام لەراستیدا وێڵو درندەی جەستەیەکە یان رۆحی رێوییەکی دەهەزار ساڵەیە، کە دەتوانرێت بەهۆی موی وەنەشەیی بروی چەپییەوە بناسرێتەوە.

- (تیۆ) وتی: ئەگەر ئارایشت بکات ئەگەر هەیە خەڵکی بەهەڵەدا ببات.

- من دەتوانم سەبارەت بەرۆحی قسەبکەم، کە وەك پیرەژنێکی ناشیرینو نابوت لەکاتی شەودا دەچێتە سکی منداڵانەوەدو رۆحیان دەدزێت. خێوەکان پەیوەندی زۆریان بەرۆحی زیندووەکانەوە هەیە.

- (تیۆ) بەهێواشی وتی: جوانە! دەبێت ژمارەی ئەو خێوانە زۆربن.

- زۆرزۆر!. هەندێك نائاسیی نین. قرژاڵێکی بەتەمەن ببوو بەکچێکی جوانی پاکیزە، کە لەکەنار ئاو دانیشتبوو دەگریاو کاری بەسەر کەسەوە نەبوو. هەندێکجار رۆحەکان چاکەکارو بەسودن: رۆحی دراوی ئاڵتونی بەکارهێنراو وەك لاوێکی چوستی مەشخەڵ بەدەست سەرقاڵی پیاسەیەو رۆحی دراوی زیو بەدرێژایی رێگا لەگەڵ ماسییەکان گەمە دەکات.

- (تیۆ) بەخاترجەمییەوە وتی: باشە، بەلایەنی کەمەوە ئەوەیان گرفتی نییە؛ ئەی لەگەڵ رۆحە خراپەکان چیبکرێت؟

- بەڕێز (سودهارتۆ) درێژەیپێدا: خەڵکی دەزانن چۆن بەیاریدەی هێزەکانی خواوەند رێگری لەو رۆحانە بکەن. لەسەردەمە زۆر کۆنەکاندا دانیارە (تایویست)ەکان لەجەستەی خۆیانەوە ئاگری زۆر بەهێزی ئاسمانیان دەردەهێنا. بەوجۆرەی بەرەنگێکی سوری تۆخ لەسەر پارچە کاغەزێك تەلیسمێکیان دەنەخشاندو پاش سوتاندنی خۆڵەمێشەکەیان دەخوارد. لەگەڵ ئەوەشدا دەکەوتنە سەمایەك بەناوی (یو Yu).

- مەبەستت سەمایەکی نەناسراوە؟

- بەپێچەوانەوە. سەمایەکی زۆر بەناوبانگە. بەو واتایەی کە (یو - Yu)ی مەزن بۆ جەنگی دژ بەتۆفانی سەرانسەری جیهان هەڵدەستێت... بەڵام هێندە بەنداو و ئەستێل لەشوێنە

جیاوازەکان دروست دەکەن سەرئەنجام گۆج دەبێت؛ لەبەرئەوەیە سەمای (یـو) بەیەك قاچ دەکرێت.

- (تیۆ) لەسەر یەك پێ هەنگەشەلێی کردو گوتی: واتە بەمجۆرە؟

- پورە (مارتا) بەنارەزاییەوە وتی: خۆ تۆ راهیبی (تایۆیست) نیت.

- (تیۆ) وتی: جیاوازی چییە؟ منیش دیارە مافم هەیە ئەگەر بمەوێت خێو و رۆحێکی خراپ لەخۆم دوربخەمەوە. من ئەم سەمای (یو)وە وەك سەمای (لامبادا)ی تەلەفزیۆن دەکەم. زریان دەبێت!

- پورە (مارتا) ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: تیۆ.. تۆ تۆ هیچ رێزێك بۆ پیرۆزییەکان دانانێیت.

(تیۆ) لەپەیکەرێکی جوان نزیك بۆوە، کە لەژێر باڵی باڵندەیەکی گەورەدا بوو. لەدەوروبەری خواوەندی تایبەتو هاوەڵە ئاڵتونییەکانی لەژێر روناکی مۆمەکاندا سەمایان دەکرد...

- وتی: زۆر جوانە. دڵنیام ئەمە رۆحو خێوی مردویەك نییە. (سودهارتۆ) ئەم کچە کێیە؟

- (سودهارتۆ) وەڵامیدایەوە: ئەو خانمەی لەپەرەوە ئاڵاوە (شاژنی دایکی خۆرئاوا)یەو گەورەترین خاتونی چینە. رۆژێك شازادە (مو mou) لەویلایەتی (چیو —چو) روبەروی (شاژنی دایکی خۆرئاوا)بوەوە، تێکەڵوییەکەی هێندە بەتامو چێژ بوو لەیادی کرد بگەرێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی.

- (تیۆ) وتی: چەند قەشەنگە! ئەڵێی شیعرە.

- (سودهارتۆ) بەخرۆشاوییەوە وتی: (شاژنی دایکی خۆرئاوا) چینییەکانی بەلای خۆیدا کێشکرد، کە دەسەڵاتداری کۆشکێکە لەبەردی گرانبەهاو دیواری ئاڵتونەو دانشتوانەکەی بونەوەری نەمرن: پیاوان لەلای راستو ژنان لەبەشی چەپی کۆشکەکەدان. ئەمرۆ (شاژنی دایکی خۆرهەڵات) تەنیایە، بەڵام لەرابردودا برایەکی جمکی هەبوو بەناوی (شازادەی پلەبەرزی خۆرهەڵات)، کە لەژێر باڵی چەپی هەمان باڵندەدایەو شاژنیش لەژێر باڵی چەپیدا. ئێستا بەتێپەربونی کات میوانەکان شازادەی خۆرهەڵاتیان لەبیرکردوەو تەنها شاژن ماوەتەوە.

- (تیۆ) پرسی: سەیرە! کەواتە لەبرا جمکەکەی بێبەشیان کرد!. ماف ئەوەیان نییە.

- ئەوانی دیکە دەتوانن دەربارەی تواناکانی شازادەی پلەبەرزی خۆرهەڵاتی رونکردنەوەت پێبدەن، بەڵام من دەتوانم بڵێم، کە شاژن لەفۆرمی تەمەن درێژیو درەختی قۆخی پەرەجوئاسادا شارەزابوو. لەبەرئەوەیە لەوڵاتەکەماندا (قۆخ) رەواڵەتو سیمبولی نەمرییە.

- (تیۆ) هاواریکرد: من زۆر ئارەزوم لە(قۆخ)ە، کەواتە منیش نەمرم.

- بەداخەوە، هاوڕێی لاوم... قۆخی پەڕەجوئاسا ئەو تایبەتییەی هەیە، بەڵام قۆخی شاژن هەموو سێ هەزار ساڵێك یەكجار بەردەگرێت.

(تیۆ) بەسەراسیمەبونەوە بۆ دەردوە هەڵات تا بەلایەنی كەمەوە لە سوری خوێنی (گا) بەدوربێت.

## فراوین لەماڵی بەڕێز (سودهارتۆ)

لەبەندەرەكە بەلەمە گەورەكان گوریسی لەنگەرگرتنیان لەسەر ئەسكەلەكە ریزكردبوو. كەشتییەكان هەر لەسپێدەوە خەریكی داگرتنی بارەكانیان بون، كە تەختەو داری گرانبەها بوو.

- بەرێز (سودهارتۆ) رونیكردەوە: چیرۆكێكی سەرنجڕاكێشە. یەكەمین هێرشبەرانی پەلاماری ئەم وڵاتەیاندا لە (چین و ڤێتنام)ەوە هاتبون. (با)ی سەختی وەرزی بارانبارین هە١٠ دورگەی (جاوا) پاشەكشەی پێكردبون. هێرشبەرە سەرەتاییەكان هەریەكەو ئاینی خۆیان بۆ سەرئەم خاكە هاورد : تایۆیزم، كۆنفۆشیۆسی و بودایزم. هێرشبەرەكان ئەوكاتە زانیویانە لەدورگەكانی (پاشاكان)دا مێخەك دەڕوێت.

- (تیۆ) پرسی: درەختی گوڵە مێخەك؟

- پورە (مارتا) وتی: نەخێر، مەبەستی ئەو رووەكەیە كەخونچە وشكبوەكەی لەسەر شێوەی (مێخ)ی بچوكەو لەگۆشتاوی تایبەت دەكرێت. نەتبینیوە؟ هەروەها دەكرێتە كەمپوتی سێویشەوە.

- بەڕێز (سودهارتۆ) بەردەوامبوو: ئەو رووەكە لەسەدەكانی ناوەڕاستدا زۆر جێگای سەرنجبوو. لەدورگەكانی (پاشاكان)ەوە بۆ (جاوا)، بۆ هندستان و سەرئەنجام بە(ڤینسیا) گەیشت و ئیدی ئەم جڵەوی بازرگانی مێخەكی بەدەستەوە گرت تا ئەوكاتەی (پرتوگال)یەكان بۆ شكاندنی ئەو تەوقی بازرگانییە لەرێگایەكی دیكەی دەریاوەو لەئەفریقا دەماغەی نومێد (راس رجاء صالح) یان دۆزییەوەو بۆ دورگە دورەدەستەكانی (ئەندەنوسیا) رۆشتن و كریستیانیشیان لەگەڵ خۆیان گەیاندە سەر ئەو خاكە. بەوجۆرە كریستیانیش چووە سەر ئاینەكانی دیكەی ئەو دورگەیە.

- (تیۆ)، كە لوتی فش كردبوو، وتی: بەراست هەست بەبۆنی مێخەك دەكەم.

- پورە (مارتا) وتی: لەوانەیە، ئەگەر لەگەڵ بۆنی چیمەنتۆی شەقامەكە بەهەڵەدا نەچوبیت، باوەڕناكەم ئێستاش وەك سەدەكانی ناوەڕاست لەسەر مێخەك شەڕو شۆڕ بكەن!

- (تیۆ) وتی: من کارم بەسەر چیمەنتۆو مێخەکەوە نییە، برسیمە. دەبێت بۆ خواردن بچینە کوێ؟

- بەڕێز (سودهارتۆ) بەمیهرەبانییەوە وتی: هەموو شت ڕێکخراوە.. هاوڕێی ئازیز. مایەی شانازیمە ئەمڕۆ لەماڵی خۆمدا پێشوازیت بکەم.

لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان بەماڵی بەڕێز (سودهارتۆ) گەیشتن. لەڕێگا بۆنی خواردنی جۆراوجۆر ختوکەی ئارەزوی خواردنی (تیۆ)یان دەدا. لەپڕ (سودهارتۆ) لایدایە کۆڵانێکی تەسك، کەدەرگایەکی بچوك لەدیوارێکی بەرزدابوو. کاتێك لەو دەرگایە تێپەڕین خۆیان لەبەردەم دیوارێکی نزمتردا بینییەوە، کەدەبوو پێچاوپێچ پیایدا ڕەتببن.

- بەڕێز (سودهارتۆ) لەپێچاوپێچی ڕێگاکە داوای بەخشینی کردو گوتی: ئەم ڕێگایە زێگری لەهاتنی ڕۆحی خراپ دەکات، چونکە خێوەکان بەڕێگەیەکی ڕاستدا دەجوڵێن. ئەوا گەیشتن. ئەمە ماڵە سادەکەمە.

ماڵە سادەکەی بەڕێز (سودهارتۆ) بۆ گەیشتن بەناو خانوەکەی سەرەتا دەبوو بەداڵانێکی چوارگۆشەدا ڕەت ببیت، کە لەدەوروبەری سێ خانوی بچوك دروستکرابوو. پاشان دەگەیشتە ئەستێلێکی بازنەیی، کە قرژاڵی زەرد مەلەیان تێدا دەکرد. لەکۆتایی داڵانەکەدا شوێنی دانیشتن بوو. خانوەکە لەناوەوە تاریك‌و پڕ لەمۆبێلەی گەورەبوو، کە لەداری ڕەنگ ڕەش دروستکرابون‌و بەپێستەی سەدەف جوانکاری تێداکرابوو. قەنەفەکان جوان بون، بەڵام تاریك‌و دڵگەرەوە نەبون. (تیۆ) وەك ئەوەی سەری بەکڵێسایەکدا کردبێت لەسەر کورسییەك ڕۆنیشت، کە هەێندەش دانیشتنی خۆش نەبوو.

- بەئەدەبەوە وتی: خانویەکی باش‌و دڵگەرەوەیە.

بەڕێز (سودهارتۆ) خەنییەوە. دیاربوو فەلسەفەکەی ئەوەبوو، کەکاتێك یەکێك دەوڵەمەند بێت ئاقڵانەترین شت ئەوەیە سامانەکەی نەخاتە بەرچاو، بەر ڕەخنەی ئەوانی دیکەو ڕونیکردەوە، کە ئەم خانوە چۆن لەباوانییەوە بەمیراتی بۆیماوەتەوە هەروەك خۆی ماوەو لەسەر بنچینەو دەستوری جیهاننانسی چینی دروستکراوە.

- پورە (مارتا) لەکاتێکدا لەچکەکەی لەگەردنی دادەماڵی وتی: لەدوایین سەردانمەوە هیچ نەگۆڕاوە.

- بەڕێز (سودهارتۆ) وتی: وابزانم تەلەفزیۆنە نوێیەکەمت نەدیوە. ئێستا ئەنتێنێکی شێوە درەختی نوێمان هەیە.

- لەتەنیشت تەلەفزیۆنە دوا مۆدێلەکەیەوە (پاگواد)ێکی بچوك هەبوو، کەدەرگاکەی بەرەوی فریشتەیەکی ئەفسانەیی لەتوخمی پیرۆزدا کرابۆوە. لەسەرو (پاگواد)ەکەوە وێنەیەی ناو چوارچێوەیەك هەڵواسرابوو، کە وێنەی پیرە پیاوێکی سەرتاشراوی ڤیتوقنج بوو بەسیمایەکی خەماوی‌و بۆینباخێکی دەرزی لێدراوەوە لەپاڵ خانمێکی شیکپۆش‌و قەشەنگدا راوەستابوو. لەبەرامبەر ئەو (پاگواد)ە میناتۆرییەدا تاسێکی بچوکی پڕ لەزیخ بەهەمان لولەکی بچوکی بەختگرتنەوەوە دانرابوو.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە پرسی: تۆ (پاگواد)ێکت لەماڵەوە هەیە؟

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: نەخێر! ئەم تەلارە میناتۆڕییە میحرابێکی باوانەکانە. وانییە هاوڕێ ئازیزەکەم؟

- بەڕێز (سودهارتۆ) بەسەراسیمەییەوە وەڵامیدایەوە: وابزانم هاوڕێ بچوکەکەمان راست دەکات، چونکە میحرابی باوانەکان دروست کۆپییەکی (پاگواد)ی راستەقینەیە؛ جگەلەوەی ئێمە تەنها ستایش‌و بەگەورە سەیرکردنی پێشینەکانمان لەم جیهانەدا دەکەین. ئەم خونەریتەی ئێمە چینییە.

- پورە (مارتا) ئاگاداریدا: خوو نەریت؟ بۆچی بە (تیۆ) ناڵێیت، ئەوە هەمان کۆنفۆشیزمە؟

- واتە کە...

لێرەدا بەڕێز (سودهارتۆ) کەوتە رونکردنەوەیەکی ئاڵۆز، کە بەگشتی بەمجۆرە بوو: هەڵبەتە میراتی باوانەکان لەپەندو ئامۆژگاری کۆنفۆشیۆزمەوە دەربارەی رێزگرتن لەباوانەکان‌و رژێمی کۆمەڵایەتی سەرچاوە دەگرێت، بەڵام ئەوە فریشتەی پیرۆزی (خواوەندی مانگ)ە لەسەر بۆقەکەی خۆی رۆنیشتوە. مانگ، بۆق‌و بەختگرتنەوە لەنەریتی (تایۆ)وە سەرچاوە دەگرێت.

- (تیۆ) گەشتە ئەو ئەنجامە: کەواتە تۆ (تایۆ)و (کۆنفۆشیۆس) ئاوێتە دەکەیت.

- بەڕێز (سودهارتۆ) بەسەراسیمەبونەوە گوتی: ئۆ.. نەمرەکان من لەو بانگەشەیە دەپارێزن... من خزمەتکاری بچوکترین نەریتی بۆم‌و بەس.

- (تیۆ) وتی: نەمرەکان؟ کەواتە تۆ خوای خۆشت هەیە؟

- بەڕێز (سودهارتۆ) رونیکردەوە، کەناکرێت بابەتەکە بەوجۆرە بخرێتەڕوو. لەگەڵ ئەوەشدا بەخوێندنەوەی دەقە پیرۆزەکان گومانی بەهێز ئەوەیە کە (تایۆیزم) لەبنەماو بنچکی خۆیدا سەر بەزنجیرەیەکی درێژی بونەوەری خودایی بوود. پاشان بەهێمنی وتی: لەو بارەیەوە کوڕەکەم دەتوانێت بەدورودرێژتر باسی بکات . ئنجا بانگیکرد:

- (مان — لی) دەتوانیت بێیتە لای ئێمە لە هۆڵەکە؟.

- پیاوێکی گەنج وەك (با) گەیشتە هۆڵەکە. لەکاتێکدا چاکەتەکەی دادەکەند، کاڵەودرزشییەکانی لەسەر مێزێکی گلێنە رۆنا. دەستی بەرەو پورە (مارتا) درێژکردو گوتی: هەلەو! تەندروستیت باشە؟

- بەڕێز (سودهارتۆ) وتی: تکادەکەم ئاگاداری رەفتارت بە.

لاوەکە لەسەر کورسییەکەی جێگای بۆخۆی خۆشکردو بێدەنگ بوو.

- بەڕێز (سودهارتۆ) پاش بێدەنگییەکی کەم وتی: (مان — لی) لەزانکۆی (شیکاگۆ) زانستی پراکتیکی حیکمەتی خودایی خوێندووە. کوڕم، ئەوە خاتوو (ماك لاری)یە، کە دەیناسێتو ئەمەش (تیۆ)یە برازایەتی. هاوڕێکانمان دەیانەوێت شتی زیاتر دەربارەی خواوەندەکانی وڵاتەکەمان بزانن. رانانێکیان بۆ بکە؟

## (کایۆ)، یزدان، مرۆڤو شازادەکان

لاوەکە بەبیرکردنەوەدا رۆچوو، قاچەکانی لێڕاکێشا.

- بەڕێز (سودهارتۆ) وتی: تکادەکەم دوا مەکەوەو جوان دانیشە.

- (مان — لی) لەکاتێکدا قاچەکانی کۆکردەوە وەڵامیدایەوە: زۆرباشە باوکە. بەدوی ئەوەدا وێڵم چۆن چیرۆکی جۆربەجۆری بنەماو بنچکی سەرچاوەی جیهان رونبکەمەوە.

- زۆر باشە کوڕەکەم، دیاریبکە.

- (مان — لی) سەری خوراندو دەستیپێکرد: لەسەرەتای سەرەتاوە تەمێکی تاریكو بێڕوخسار دەسەڵاتی بەسەر هەموو شوێنێکدا شکاوە. پاشان (تایۆ) یەکێکی ئەفراندو یەکەش بوو بە دوو. لەدووەوە سێ لەدایك بوو. سێ دەهەزار بونەوەری لەسەر زەوی خستەوە، کە (یین)یان لەکۆلگرتبوو (یانگ)یش لەئامێز. بەڵام بەپێی ریوایەتی دیکە دوو خوا لەو تەمو تاریکییەی سەرەتاوە دروستبون. یەکێکیان چاودێریکردنی ئاسمانو ئەوی دیکەیان زەوی لەئەستۆ گرت. ئەم دوو خوا تایبەتە بونە دایكو باوکی هەموو بونەوەرانی جیهان.

- (تیۆ) بەشداریکردو گوتی: بۆ ساتێك راوەستە. کەواتە (دوو) ژمارەی (دایكو باوکە)و سێ ژمارەیە بۆ (خێزان).

- (مان — لی) وەڵامیدایەوە: بەدڵنیاییەوە بەوجۆرەیە. شێوازێکی دیکەش بۆ لەدایکبونی جیهان هەیە. بەو واتایەی، کە شازادەی زەریای باشور لەگەڵ شازادەی زەریای باکور لەماڵی شازادەی سەنتەر، واتە (کایۆ - Chaos) پێکگەیشتون. (کایۆ) پێشوازی گەرمی لێکردون. ئەو

دوانــەش ویــستویانە قــەرەبوی خۆشەویــستیو پێــشوازییەکەی بکەنــەوەو بڕیلریانــداوە کــون لەجەستەی بکەن تاخواردنو هەناسەدانی ببینن.

- (تیۆ) پرسی: تکادەکەم پەلەمەکە، ئەو پاشایە کێبوو: پاڵەوان؟

- لەراستیدا (کایۆ) شەقڵێکی نەبوو، نـەخڕو تـۆپ ئاسابوو، نەچوارگۆشـەش بـوو. کـونکردنی (کایۆ) لەراستیدا دەستکەوتێکی پڕ بەهابوو. بەداخەوە: لەرۆژی حەوتەمدا (کایۆ)ی فەرماندە مردو...

- بەڕێز (سودهارتۆ) قسەکەی پێبڕیو گوتی: (مان – لی) سادەتر بدوێ. هێشتا نەبویتە مامۆستا.

- (مان – لی) بەردەوامبوو: بەکورتی (کایۆ) لەتۆوی بونەوەرێك چووە، کە یەکـەمین مرۆڤـی لێدەرپەڕیوەو بەناوی (پان – کو)ە. پاش هەژدە هەزار ساڵ کاتێك ئـەم مرۆڤـە مـرد چاوەکانی بـون بـەخۆرو مـانگ، کەللـەی بـوو بەچـیا، چـەورییەکەی دەریـا، مووەکـانو پێـستی جەسـتەی درەختو گیا، ئەشکەکانی روباری شینو زەرد، هەناسەی (با)و دەنگی هەورەگرمـە؛ لەرەشـێنەی گلێنەیــەوە تریــشقە دروســتبوو، لــەرەفتارو گوفتــاری جوانییــەوە ئاسمــانی رونــاكو لەکینــەو تورەییەوە هەورەکان.

- (تیۆ) تێگەیشت: کەواتە بەو لێکدانەوەیەی تۆ بێت مرۆڤ جیهانی ئەفراندووە. بەبێ خوا؟

- بەڵێ. پاشان ئەو دژوارییە دروستبوو، کە هیچ کەس نەیدەزانی یەکەمین مرۆڤ واتـە (پـان – کـو)و (لایـۆ – تـسو)ی کـوڕانی (تـایۆ) لـەچ مێـژوو سـەردەمێکدا ئاوێتـەبونو خواییـەکیان دروسـتکرد. چـاوی چـەپی (کـوڕی شـاراوە) بـوو بـەخۆر، چـاوی راسـتی بـوو بـەمانگ، مووەکـانی ئەسـتێرەکانو ئێـسکەکانی هــەژدیها، گــویی بەچــوارپێکان، دەمارەکــانی بــەمارەکان، ســکی بەدەریاکان، مووی جەستەی بەگیا، دڵی بەچیای پیرۆزو دواجار بونـەوەرێکی سمبولئاسـاو نهێنی بەناوی (خوای پیرۆز) پەیوەندی نێوان ئاسمانو رێسمانی پچڕی.

- (تیـۆ) چـرپاندی بـەگوێی پـورە (مارتـا)دا: دوبـارە دەسـتیپێکردەوە. دوبـارە سـەروکەللەی بونەوەری سەغڵەتکار پەیدابۆوەو رێگای بڕی...

- پورە (مارتا) بەهەمان ئاواز وەڵامیدایەوە: هەموو دانیشتنێك مۆری کۆتایی خۆی هەیە.

- (مـان – لـی) درێژەیپێـدا: ئەمـە ئەفـسانەی (تـایۆ)بـوو. بـەمجۆرە ناتوانرێـت چاوپۆشـی لـەدرەختی پاشـایانی مــەزن بکرێـت. بـەوجۆرەی مامۆسـتا (کـونگ) رێکیخـستووە نەحــەزی بەخواکان بووەو نەپشت سروشت. لەپێش هـەموو شـتێکەوە (سێ خـودی پـیرۆز) هـەبون، دوو پیاوو یەك ژن. کۆنترینیان هەمیان (شازادەی پلەبەرز)بوو، کە جەسـتەی لەشـێوەی مـاردا بـوو. بەهۆی خوێندنەوەی پەڕی فریشتەکانو جۆراوجۆری بونەوەرانو بەشە جیاوازەکانی جەستەی

خۆی (کتێبی فاڵەکانی) داهێنا. (خاتونی پیرۆز)ی هاوسەریشی خوێنی مار لەپشتیدا دەگەڕاو لەو رووەشەوە هەربەو دەچوو.

- (تیۆ) وتی: وەك حواکانی سیامی.

- (مان – لی) راستیکردەوەو گوتی: چینی! ئینجا بەردەوامبوو:

- بەڵام سێیەمین (خودی پیرۆز) خوای چاندن و رواندن بوو، کە کشتوکاڵی داهێنا. پاش ئەو (پێنج خاقانەکان) هاتن. یەکەمیان (خاقانی زەرد) کتێبی پزیشکی، پەیوەندی سێکسی، ئەستێرە ناسی، هونەری سوپایی نوسی. دووەمیش هەرهەمان (خاقان)بوو ئاسمانی لەزەوی جیاکردەوە. سێیەم (زغن – خان)بوو، کە دایکی (دە خۆر)و (دوانزە مانگ) هاوسەری بوو. چوارەم بازنەی وەرزەکانی رێکخست، بەڵام حوکمڕانیو دەسەڵاتدارێتی خۆی بەیەکێك لەپیاوەکان بەخشی بەناوی (چوئۆن)، کە خواناسترین پیاوی خێڵەکەی بوو.

- (تیۆ) وتی: واتە نە بەخوایەكو نەبەپیاوێکی دەوڵەمەند. ئەمەم پێباشە.

- (مان – لی) وتی: (جوئۆن) وەك خەڵکی دیکە نەبوو، (خان) پێشئەوەی دیاریبکات خستییە بەرتاقیکردنەوەیەکی سەخت. بەو واتایەی (جوئۆن) دەبوو بەنێو گڕی ئاگردا تێپەڕێت، بەناو لافاوێکی گەورەدا بپەڕێتەوە، لەزیندە بەچاڵکردن بێتە دەرەوە، لەگەڵ گەردەلولدا بجەنگێت. دژوارترین تاقیکردنەوەکانی ئەوەبوو (جوئۆن) خۆی بخاتە بەرجنێو لێدانی دایكو باوکی. (جوئۆن) ئەو تاقیکردنەوەیەشی تێپەڕاند بەبێئەوەی لەرێزو بەرز راگرتنی دایكو باوکی کەمبکاتەوەو بەوجۆرەش (ئاینی باوانەکان)ی دامەزراند. ئینجا چوار ئبلیسی لەچوار دەرگای جیهانەوە دەرپەڕاند. پاشان دەسەڵاتی بەپێنجەمین (خان) یان ئیمپراتۆر بەخشی، کە دواین (خان)بوو بەناوی (یۆ - Yu)و لەبەرد لەدایك ببوو: (خاقانی خاك).

- (تیۆ) هاواریکرد: هەمان (یۆ)ی مەزن، کە لەسەر پێیەك سەمای دەکرد؟

- بەڵێ، ئەوەیە. درەختیچاکەکاریی (سێ خودی پیرۆز)و (پێنج خاقان)ەکە بە(یۆ - Yu)ی مەزن دوایی دێت. پاش ئەوان پاشایانی کافرو تۆقێنەر دێن. ئەم پاشایانە زۆردارانی خراپەکاربون، کە ئازارو ئەشکەنجەو گەندەڵیان نایەوە. یەکێك لەوانە، کە لەجەسارەتی پیاوێکی حەکیم شێتگیرببوو فەرمانیدا ئەو پیاوە دوو لەت بکەن تا دڵی ببینێت. لەو دەمەدا بوو (میرچو- چیۆ) سوپای رێکخستو سەری ئەو پاشایەی بڕیو کردی بەسەر ئاڵا سپییەکەیەوە. ئیدی لەوەودوا مێژووی چین دەستپێدەکات.

- (تیۆ) وتی: ئۆف! ئەم چیرۆکە بەئەندازەی چیرۆکەکانی (تیانۆ)ی دایە گەورە ئاڵۆزو دژوارە!

- پورە (مارتـا) تارادەیـەك بەنیگەرانییـەوە وتـی: (تیـۆ).. نیـوە یۆنانییـەو لەمنالّیـدا نـەنکی ئەفسانەی خواكانی یۆنانی بەگوێداداوە.

- بـەڕێز (سـودهارتۆ) بەئەدەبـەوە لـە (تیـۆ)ی پرسـی: دەتوانیـت چـەند بەشـێکی ئـەو ئەفسانانەی بۆ بگێڕیتەوە.

- (تیۆ) باوێشکێکی داو گوتی: دورودرێژەو لەبرساندا خەریکە دەمرم.

پورە (مارتا) بەشەرمەزارییەوە توند باسکی (تیۆ)ی گرت.

- (تیۆ) ناڵەیەکی لێبەرزبۆوەو گوتی: ئازارت پێگەیاندم. بۆ هیچی خراپم وت؟

بەڕێز (سودهارتۆ) پێکەنیو میوانەکانی بانگهێشتی سەر خوانەکەی کرد.

- دەفری خواردن لەسەر شێوازی چینی لەسەر مێزێك، کـە ناوەڕاسـتەکەی دەسـوڕا، دانرابـوو. پورە (مارتا) لەبەرامبەر نیگا گوماناوییەکانی (تیـۆ)دا ئاگاداری کـردەوە، کـە سـەغڵەت نـەبێت، چونکە دەزانێت خواردنەکە چییە.

## تایبەنمەندی خۆراکی چینی

خۆراك لەهەشـت پێـی سورکراو بەشـەکر، لاقـی بـۆق بەزەعفـەران، سـوپی هێلکـە، کـوتراوەی مریشکی شەکراوی کراوی بەهـەڵم کوڵێنـراو و ئـاملێتی قـرژاڵ پێکهاتبوو. کاتێـك نـۆرەی ئاملێت هات (تیۆ) داوای لێبوردنی لەخواردنیکرد.

- پورە (مارتا) بەتەشەردوە وتی: بخۆ، دەکرێت کەمێك بەئەدەب بیت؟

- بەناچـاری بـەداری تایبـەتو بەخەمـەوە ئاملێتەکـەی کـردەوە، لەناویـدا لولەیـەکی بـچوك دەرکەوت. بەگومانو دودڵییەوە وتی: دەبێت ئەمەش بخۆم؟

- (سودهارتۆ) پێکەنیو گوتی: سەرەتا دەیکەتەوە.

- (تیۆ) پەنجەکانی پاك کردەوەو لولەکەی کردەوە، لەناویدا پارچە کاغەزێکی بـچوك هـەبوو. هاواریکرد: بڵێی پەیامێکی نوێ بێـت!

- پورە (مارتا) وتی: بەڵێ. پـێش نانخواردنەکـە نـەمگوت دەزانم (نیـەتی) خۆراکەکـە چـییە؟ ئێستا تێگەیشتیت بۆچی؟

- پەیامەکـە بـەمجۆرە بـوو: (مـن خـۆرم و ئـارەزوم لەئەسـپی رووت نییـە. ئەگـەر ئـارەزوو دەکەیت لەمیحرابەکەمدا بەمن بگەیت وەرە بۆ دیدەنیم !).

- ئەسپی رووت؟ بۆ خۆر؟ ئەم خوا سەیرە لەکام وڵاتە؟

- پورە (مارتا) بەشادییەوە وتی: گرفتە، وانییە؟

- (تیۆ) وەلامیدایەوە: سفری سفر. لەراستیدا سەر ودەری لێناکەم.

- (سودهارتۆ) وتی: بۆچی؟. (مان – لی) یاریدەیت دەدات.

- (مان – لی) وتی: بەخۆشحاڵییەوە، بەڵام گرفتەکە لەوێدایە خودی خۆشم هیچ حاڵی نابم.

- بەڕێز (سودهارتۆ) بەجۆرێکی فێڵبازییەوە وتی: باشە، کەواتە دەتوانیت راوێژ بەباوانەکان بکەیت.

- هەموان هەستان‌و (تیۆ) بەڕێوڕەسمی پێویست قامیشەکەی بەسەر لوتی (کندەر)ەکاندا هەڵسوڕاندو پاشان رایتەکاندو لولەیەکی لێبەربوەوە، کە لەسەری نوسرابوو: (کاتێك من دەچمە دەرەوە جیهان بەتاریکی شەو ئاشنا دەبێت). ئەمە ئیدی غەیبزانی نەبوو!

- (مان – لی) بەپشودانەوە هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: ئێستا تێگەشتم، باس لەکۆنترین خوا دەکات.

- پورە (مارتا) بەهێمنی وتی: ئەکرێت بێدەنگ بیت!.

- (تیۆ) وتی: ئەمکارە فێڵێکی تێدایە. پێشبینییەکان پاش‌و پێش خراون‌و ناهێڵن (مان –لی) راڤەیان بکات. ئێستا کە بەمجۆرەیە تەلەفۆن بۆ (فاتۆ) دەکەم. کوا موبایلەکەم؟!. هەر ئێستا.. لەهۆتێلەکە بەجێمهێشتووە!

- بەڕێز (سودهارتۆ) تەلەفۆنەکەی لەگیرفانی دەرهێناو گوتی: ئەوە تەلەفۆن.

## لەسەر خاکی جەژنی ماسییەکان

- (فاتۆ)؟ بەڵێ. تەندروستیم باشە. تەنها پەیامە نوێکە وری کردوم... لای تۆ سەیرنییە؟. زۆرباشە... تکادەکەم ئاماژەیەك دەدەیت؟. (ماسییەکان جەژنی منالان دەگێڕن‌و داری گێلاس جەژنی بەهار). هەر ئەوەندە؟. بەو چەند ووشەیە چیبکەم؟. ناتوانیت دەربارەی ئەسپی روت رونکردنەوەی زیاتر بدەیت؟. بێپێست؟. ئەوەش یاریدەم نادات!. ناتوانیت شتێکی دیکە زیاد بکەیت؟. بەداخەوە. بەڵێ، منیش ماچت دەکەم. کەش زیاتر گەرمە. نەخێر، ئارەق ناگەمەوە. بەڵێ... هەروەها تۆش... زۆر زۆر. پاشان بەدوودڵییەوە تەلەفونەکەی بڕی. لەبەرخۆیەوە وتی: دەڵێت ئەسپی روتە، گورویانە!. (مان – لی) هیچ تێگەیشتیت؟

- (مان – لی) بەخەندەوە وتی: بەڵی. برای خواوەندەکە ئەسپێکی بێپێستی لەئەشکەوتەکەی هاویشتیبوو.

- ئەم بابەتە ناوی ولاتم ناداتێ.

- پورە (مارتا) وتی: کوڕم، دەتوانیت ئەو ناوە بدۆزیتەوە. لەکوێ بەماسی جەژن منالان سازدەکەن؟

- نازانم، لەمەکسیك؟

- (مان — لی) وتی: نەخێر، لەکام ولاتە جوانترین درەختی گێلاس دەڕوێت؟. لەکام ولاتە هەموو چالاکییەکی رۆژانە رادەگرن تا سەیری شکۆفەکردنی گێلاس بکەن؟.

- (تیۆ) هاواریکرد: لەژاپۆن!.

- پورە (مارتا) هەناسەیەکی هەلکێشاو گوتی: دواجار! بەس درەنگ زانیت!

- (تیۆ)، کە لەنەزانی خۆی زۆر تورەبوو، گوتی: ئەو خاتونەی حەزی بەئەسپی رووت نییە کێیە؟

- (مان — لی) رونیکردەوە: ناوی (ئۆماتراسۆ)یە. ژنێکی چاکەکار، رازیو ناسك بووە، کە بەهاوەلی هاوڕێکانی لەئەشکەوتێکدا ژیاوە. هەموو رۆژێك (کیمونو)یەکیان بەرەنگی کات دەڕست. (ئۆماتراسۆ) هەموو رۆژێك بەیانیان لەئەشکەوتەکە دەهاتە دەرەوەو زەوی روناك دەکردەوە. تا رۆژێکیان (سوزانۆ)ی برای، کە سەغلەتی دەکردو خوای (مانگ)و پاشای (زەریا)بوو، بۆ گالتەکردن ئەسپێکی گورواوی لەسەر دەزگای چنینەکەی کچەکان رۆنا. کچەکان سەراسیمەبونو وەك هار بۆ دەرچون لەئەشکەوتەکە پێشبڕکێیان بوو. لەنێو فشارو هەراو زەنادا (دوك)، کە یەکێك بوو لەکچەکان، بەدەزگای چنینەکە بریندار بوو، مرد. (ئۆماتراسۆ)ی خواوەند زۆر لەو گەمەیە تورەبوو. هەرگیز لەئەسپی روت نزیك نەبۆوە، چونکە چارەی نەدەویست. ئیدی بەتوڕەیی و کینەوە خۆی خزاندە ئەشکەوتەکەیو روناکی لەجیهان بڕی.

- (تیۆ) هاواریکرد: چۆن شێتێك بووە!. ئەو مانگرتنە چەندی کێشا؟

- تائەوکاتەی تۆوی ترسو تورەبون نەما لەئاسماندا، کە شوێنی دانیشتنی خواکان بوو. چونکە خواکانیش وەك مرۆڤەکان لەتاریکیدا هیچ نابینن، کۆبونەوەو فێلێکی گەورەیان داهێنا. داوایان لە (ئۆزۆم)ی جوانترین خواوەند کرد تا لەبەرامبەر ئەو ئەشکەوتەی (ئۆماتراسۆ)دا دەستبکات بەجموجولی سەرگەرمی. (ئۆزوم) لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا دەرکەوت. خۆی روت کردەوەو دەستیکرد بەجولەی سەیرو پێکەنیناویو لێهاتویی واینواند قاقای خواکان لەهەموو شوێنێك دەنگیدایەوە. (ئۆماتراسۆ) بەهۆی خۆ تێهەلقورتاندنەوە دەرگای ئەشکەوتەکەی کردەوە تابزانێت چییە! بەلام خواکان دەمودەست ئاوێنەیەکیان راگرتو ئەویش لە ئاوێنەکەدا ژنێکی هەتا بلێی جوانو قەشەنگی بینی، بەسەرسوڕمانەوە نزیك بوەوە. خواکان بەپەلە داوێنی جلەکەیان گرتو بۆ هەتاهەتایە (ئۆماتراسو) لەئەشکەوتەکەی دەرهێنرا. بەوجۆرە جیهان رزگاری بوو.

- (تیۆ) وتی: ئەفسانەیەکی جوانە. بەڵام لەناو خۆماندا دەرنەچێت، خواکە ناحەقی نەبوو توڕەببێت.

- (مان – لی) وتی: لەژاپۆن چیرۆکی دورودرێژ هەیە. چانست هەیە بۆ ئەویّ دەچیت.

بەڵام (تیۆ) پێش گەشتەکەی بۆ (ژاپۆن) دەبوو چاوەڕێی ئەنجامی تاقیکردنەوەکەی بێت‌و بەراستیش بۆ پشودان بگەڕێتەوە بۆ هتێل. بەمەخابنەوە هاوڕێکانی جێهێشت.

کاتێك دەرگاکە داخرا (سودهارتۆ) بەرەو میحرابەکە رۆشت‌و قامیشەکەی خستەکارو لەگەڵ باوانەکاندا کەوتە راوێژکردن سەبارەت بە چارەنوسی (تیۆ). خەندەیەك نیشتە سەر لێوەکانی. وەڵامی باوانەکانی باش بوو.

## ئەنجامە سەیرەکان

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، کاتێك ئەنجامی تاقیکردنەوەکان لە(سەنگاپورە)وە گەڕایەوە، وەك پێشوو نەبوو. باری تەندروستی (تیۆ)ش هەروا بەجێگیری مابۆوە.

- پورە (مارتا)، کە تەلەفۆنی بەدەستەوەبوو، گوتی: جێگیرە. زۆر تەمەڵە... چارەسەری چی؟. بەڵام لەراستیدا... کاتێك بیستەری تەلەفۆنەکەی دادەنایەوە هێندەی نەمابوو لەهۆش بچێت‌و هاواریکرد: تیۆ.. دەزانی چی؟ تاقیکردنەوەکان هەر باری جێگیریان تۆمار کردوە.

- (تیۆ) وتی: زۆرباشە. ئەو هەموو خۆ سەغڵەتکردنەی بۆ چییە؟و هەر وەك جارانە.

- نەخێر! گرنگ ئەوەیە دەرمانەکانی (پاریس)چیدی بەکارناهێنیت‌و دەرمانە نوێکان سودبەخش بون!. خاتونە پزیشکەکەی (دارجیلینگ) سەرکەوتوو بوو.

- (تیۆ) وتی: زۆرباشە، راستە. بۆچی سەراسیمەبویت؟

- پورە (مارتا)، کە لەخۆشیدا تێکچوو بوو باوەشی بە (تیۆ)دا کردو کەوتە سەماکردن.

- (تیۆ) هەوڵیدا پێکانی بەدووربگرێت و گوتی: ئەو دەنگە سەیرو سەمەرەیەی ناو تەلەفونەکە چییە؟

- ئەی خوایە گیان لەبیرم چوو بیستەرەکەی باش لەجێگای خۆی دابنێمەوە.

- (تیۆ) سودی لەو هەلە وەرگرت تا قسە لەگەڵ دایك‌و باوکی بکات.

## بەشی حەڤدە

# (دایکان و کچانی ژاپۆنی)

### پورە (مارتا) لەگرفتا

کاتێك (ژروم) لەتەلەفوندا لەرونکردنەوەکانی خوشکەکەی تێگەیشت، هەناسەیەکی ئاسودەی هەڵکێشا. ئەنجامە سەرەتاییەکان هێشتا مامناوەندی بون، بەڵام پزیشکی (تبت)ی بەهەمان دەرئەنجامی هونەریانەی پزیشکانی جیهانی خۆرئاوا گەیشتبون، کە ئەوەش لەخۆیدا هەنگاوێکی گەورەبوو. باوکی (تیۆ) تەنها تکای کرد هەفتەیەکی دیکە لە(جاکارتا) بمێنێتەوەو تاقیکردنەوەکان دوبارە بکەنەوە. پورە (مارتا) رایگەیاند دەتوانن هەمان کار لە(تۆکیۆ) بکەن، بەڵام باوکی (تیۆ) ئامادەنەبوو گوێ لەو قسانە بگرێت. پورە (مارتا) ناچار ملیدا.

- (تیۆ) بەهۆی پێداگرتنەکانی باوکییەوە بەپورە (مارتا)ی وت: ئێرە زۆر خۆشە. کەواتە دەتوانین دوبارە (مان – لی) ببینینەوە. چۆنە ئێستا بچین بۆ مزگەوت؟.

چونە ئەو مزگەوتە بۆ ناموسڵمان قەدەغە بوو، بەتایبەتی بۆ پورە (مارتا)؛ جگە لەو رۆژەی تایبەت بوو بەژنان، بەڵام دەیتوانی لەبەردەم دەروازەی مزگەوتەکەدا بوەستێت و سەیر بکات. دوانزە هەزار ژن بەبەرگی سەراپا سپییەوە بەرێکوپێکی خەریکی (رکوع و سجود)ی نوێژکردن بون. ئیسلامەکانی (ئەندەنوسیا) لەدەمارگرژی بەدووربون، بەڵام موو بەموو دەستوری قورئانیان جێبەجێ دەکرد.

- (تیۆ) لەسەرشەقامەکە بەپورە (مارتا)ی وت: تۆ وتت لێرە خێڵی (ئامیست)یش هەیە؟

- پـــوره (مارتـــا) وەڵامیدایـــەوە: هەڵبەتـــە لەسەرســـوڕهێنەرترین دیاردەکـــانی (ئەندەنوسیا)ئەوەیە بەدوری سێ سەعات لە(جاکارتا)وە جۆرە خێڵی دەوار نشین هەیە نـەبون بەئیـسلام. بـەرگی سـپی دەپۆشـنو رێگـاش بەئەندامـەکانیان دەدەن بەدەسـتوری خۆرئـاوایی بجوڵێنەوە، بەڵام دەبێت لەوبارەدا بەرگی شین بپۆشن. ئەم گروپە تەنانەت نوێنەرێکیـشیان بـۆ کۆشـکی کۆمـاریی (ئەندەنوسـیا) رەوانـەکردبوو. ئـەو نوینـەرە بـۆ پاراسـتنی سـەرکۆمار لەبـەڵا جادویـەکی پێـشکەش کردبـوو؛ پاشـئەوە بێـدەنگ گـەڕابۆوە. هـیچ کەسـێك ناتوانێـت بـچێتە قەڵەمڕەوی ئەو خێڵەوە.

- (تیـۆ) وتـی: چـەند خـەڵکی سـەیر لـەم جیهانـەدا سـەرهەڵدەدەن. هیـوادارم هێنـدە بـژیم تاهەموو ئەو گەلانە بناسم!

- پورە (مارتا) وتی: کەواتە دەبێت زانستی (خێڵ ناسی - Ethnologe) بخوێنێت.

- (تیۆ) وتی: گوێم لەناوی ئەو زانستە بووە، بەڵام نازانم چییە؟ دەتوانیت باسێکی بکەیت؟

- بۆ دەستپێکردن دەبێت شوناسـی تیرەیـەك دیـاری بکـەیت و پاشـان لـەنێو ئەندامەکانیـدا ماوەیـەك بـژیت. کاتێـك بـەوجۆرە هاوبەشـی ژیانیانـت کـرد خونـەریت، جـۆری بیرکردنـەوەو خواکانیان دەناسیت.

- (تیـۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتـی: بـەڵام ئێمـە بـەم گەشـتەمان لـەم وڵات بـۆ ئـەو وڵات هـەر هەمان کار دەکەین.

- ئێمە خەڵکمان بینی، بەڵام خێڵمان نەبینیوەو گومانم هەیە بتوانین هیچ کام لەو خێڵانە ببینین. باری تەندروستیت بـۆ ئـەو کارانـە گونجاو نییـە. ئـەم خێڵانـە لەمافـە سـەرەتاییەکان بێبەشن.

- (تیۆ) بـەڕقێکی زۆرەوە وتـی: نەمیحرابـەکانی (تـایۆ)، نەخێڵەکان، نەسـەرکەوتن بەسـەر پلەکاندا، ئیدی دەتەوێت لەچیدیکە بێبەشم بکەیت؟

- تۆ بەپلەی یەکەم دەبێت چارەسەر بکرێیت، کوڕی بەنازی من!.

## ماویزمو تایۆیزم

مانـەوە یـەك هەفتەییەکـەی (جاکارتـا) بـەرەو کۆتـایی دەچـوو. پـورە (مارتـا) (تیـۆ)ی بـۆ شـانۆگەرییەك بـرد، کـە (داسـتانی رامایانـا) پێـشکەش دەکـرد. (تیـۆ) هـەرپاش یەکـەم پـەردەی ڕازاوەی شـانۆگەرییەکە دەسـتیکرد بـە باوێـشکدان وسـەماکەرانی ئاڵتونپۆشـی بـینی، کـە زۆری

لەبەردڵ نەبوو. (تیۆ) گفنوگۆکردن لەگەڵ (مان — لی) لەشانۆگەری‌و هونەری (ئەندەنوسیا) لا باشتربوو. بیری لەچین دەکردەوەو حەزی بەدیدەنی دەکرد. چینی ئیمپراتۆری بێبەزەیی، چینی سەرۆك (ماو)، چینی ملیۆنان خەڵك، کە لەسەر شەقامەکاندا لەهاتوچۆدان یان لەسەر زەوییەکان خەریکی کشتوکاڵن. چینی لاوەکانی (شانگهای)، ئۆپرا پڕشکۆو سەرسوڕهێنەرو تەلارە مۆدێرنەکانی. چینی لاوانی دوایین مۆدێل، ئەو چینەی هیواداربوو رۆژێك لەرۆژان کەگەورەبوو سەردانی بکات.

- لە (مان — لی) پرسی: تۆ چینیت بینیوە؟
- بەوریاییەوە وەڵامیدایەوە: کەمێك!
- لەوێ لەئاینەکەتان هیچ ماوەتەوە؟
- (مان — لی) وتی: هەموو شتێك‌و هیچ شتێك. نیشتمانەکەمان دوچاری زۆر هەورازو نشێوی و جموجوڵ بووە. بەهۆی شۆڕشی ساڵی (١٩١١)ەوە ئیمپراتۆری لەناوچوو. لەگەڵ هزرو وێنای ئیمپراتۆری سیستمی جیهانیش گۆڕا. پاشان (ماو) دەسەڵاتی وەرگرت.
- (تیۆ) وتی: وەك (زۆرۆ). (رێپێوانی گەورە)، بەڵێ ئەوە دەزانم.
- پورە (مارتا) بەتوڕەییەوە وتی: ئایا هیچ لەبارەی شۆڕشی گەورەی رۆشنبیری پرۆلیتاریاوە دەزانیت؟. ئەو بزوتنەوەیەبوو ئاینەکانی چینی سڕییەوە!
- (تیۆ) وتی: شۆڕشی رۆشنبیری؟ (ماو) چیکرد؟ هەموو خەڵکی ناچار بەکاری کەلتوری‌و هونەرەجوانەکان کرد؟
- پورە (مارتا) وتی: لەوباوەڕەدابوم ئاگاداری ئەو سەردەمە تۆقێنەرە بیت. (ماو) خەڵکی بەهونەرە جوانەکانەوە سەرقاڵ نەکرد. چەند ساڵ لەودوبەر دەستیدایە زنجیرەیەك ریفۆرم لەبواری ئابوریدا، کە بە(رابونی مەزن بۆ پێشەوە) ناوی برد. بەرهەمی ئەو رابونە گرانییەکی کارەساتاوی بوو لەسەرانسەری چینداو لەهەموو شوێنێك نوشوستی پلانەکەی دەبینرا. لەساڵی (١٩٦٦) رۆژێکیان لەبەردەمی خەڵك دەرکەوت‌و لەوتارێکی خرۆشێنەردا بەلاوانی چینی راگەیاند: ( **کاتی ئەوەیە یاخی ببن، یاخیبون مافی ئێوەیە**)، واتە کاتی ئەوەیە لاوان یاخی ببن و بکەونە رەخنە ئاژنکردنی بەرپرسانی پارتی کۆمۆنیست!. هەزاران خوێندکاری زانکۆ ، کە (ماو) بە (گاردی سور) ناوی نابون وەڵامی پۆزەتیڤانەی داخوازییەکانیان دایەوەو بەجۆش‌وخرۆشێکی زۆرەوە (کتێبی سوریان) بەدەستەوە گرت، کە هەڵبژاردەی وتارەکانی (ماو)

بــوو. رایاندەوەشــاند: قوتابخانــەو زانکۆکــان داخــران. لەسەرانــسەری چــیندا خوێنــدکاران دەستیاندایە ڕێپێوان تارەخنە لەخاینانی پارت بگرن.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئەو ناپاکانە کێبون؟

- پورە (مارتـا) رونیکـردەوە: (مـاو) فـەرمانی بـە ئەنـدامانی (گـاردی سـور)ی خۆیـدابوو دژ بەچوار سمبولو ڕەواڵەتی (دێرینە) ڕاپەڕن. (بیری کۆن)، (سـروتی کـۆن)، (دابونـەریتی کـۆن)و (سـونەتە کۆنـەکان). (گـاردی سـور) دەسـتیدایە دەرکردنـی خورافـات لـەرۆحی چـینییەکاندا. لەپلەی یەکەمدا (مارشـاڵ لـین پیـاو)ی دۆسـتی هـەرە نزیکـی (مـاو) کەوتەبـەر رەخنـە، چونکە مارشــاڵ پــشتی بەگوتــەی مامۆســتا (کــۆنگ) بەســتبوو. (گــاردی ســور)یــش رایگەیانــد کــە (کۆنفۆشــیۆس)ەو رەواڵــەتی فیــوداڵیو نایەکــسانی کۆمەڵایــەتی بەرجەســتە دەکــات. لاوە خوێنگــەرمو پڕجۆشوخرۆشــەکان لــەژێر کاریگــەری شێتئاســای ئــەو وەهمــەی خــودی خۆیــان دەتوانن جڵەوی شـۆڕش بەدەسـتەوە بگـرن پەرسـتگاکانیان هـەموو وێرانکـرد، مۆزەخانـەکانیان لەگـەڵ خـاك یەکـسان کـرد، پەیکـەرەکانیان تێکشکاند، پـەلاماری مـاڵانی خەڵکیانـداو هەرچـی پەیوەندی بەرابردووەوە هەبوو لەناویان برد؛ چونکە (ماو)ی گەورەیان هانی وێرانـیو راوڕوتـی دابــون. کــڵاوی بوقــداریان لەســەری دانیــاران، مامۆســتایانی زانکــۆ، توێــژەرەوانی زانــستیو ســیمبولەکانی خاوەنــدارە گــەورەکان کــرد. رەشمــەیان لەگــەردنیان کــردنو بەشــەقامەکاندا سوڕاندیاننەوە؛ چونکە گوناحیان ئەوەبوو زانستو زانیاری رابردویـان بـۆ ئاینـدە دەگواسـتەوە. هـەموو ئەوانـەیان لـەژێر لێـدانو پێلەقـەدا کوشـت. بـۆ یـەکمجار لەچـین بەفـەرمانی سـەرۆکی مـەزن، کـە بـە(ئاراسـتەگێڕی مـەزن – Le Grand Timonier) ناویانـدەبرد، وەچـەکان ئـەو زنجیرەی ڕێـزو حورمـەتو بەخـشندەییەی بـۆ دایکـانو باوکـانو گـەورەترانیان هـەبوو تێکیـان شکاندو لەبەریەکیان هەڵوەشاند.

ئینجا لەناو لاوە هاربووەکاندا جەنگی ناوخۆیی هەڵگیرسا. پاش دوو ساڵ (مـاو) گـاردی سـوری خۆی بۆ گوندەکان رەوانـەکردو کردنییـە کارمەنـدی کوشـتوبڕی جوتیـاران. چـەندیان کوشـت؟ ملیۆنان خەڵك!. سەرئەنجام پاش یەك خولی تیرۆرو کوشتوکوشـتارو خوێنڕێـژی ڕێنیـشاندەری گەورە لەساڵی (١٩٧٦)دا مرد.

- (مــان – لــی) روو بــە پــورە (مارتــا) وتــی: لەوانەیــە تــۆ ســیمای شۆڕشــی رۆشــنبیریت بــەجۆرێکی دی نمـایش کردبێـت. ئامـانجی سـەرۆکی پـارتی کۆمۆنیـست ئـەوەبوو لەوڵاتەکەیـدا

جۆشوخرۆش‌و رابونێکی نوێی شۆڕشگێڕانه دروست بکات. لەو بڕوایەدابوو بەروکردنه لاوان ئەو هێزه بەگەڕ دەخات کەهێشتا بەگەندەڵی ئالۆده نەبوه. گومانی تێدا نییه ریفیژینزمی رویدا، بەڵام ئەوه تاکه رێیەکی وێڵبون بوو!.

- (تیۆ) روی له پوره (مارتا) کردو گوتی: تۆ چ رەخنەیەکت لەلاوان هەیه؟

- هیچ. تاکه رەخنەی من لەکاتێکدایه چەکیان دەدرێته دەست. ئەوانه بەفەرمانی باوکێکی گەورەو کۆنه ساڵ‌و کەللەشەق چەکیان بەرووی دایك‌و باوکی خۆیاندا هەڵبڕی. زۆر سەیره!

- (تیۆ) وتی: باشه، ئاساییه!

- تکا دەکەم بەسه. هەموو ئەوانه ئەمڕۆ لەکارەکانیان پەشیمانن!. سەریان لەوه سوڕماوه چۆن لەئەشکەنجەدانی بەتەمەنەکان‌و بەتایبەت ژنان تام‌و چێژیان وەرگرتوه. ئەی تۆ، مەگەر نەفرەت لەکوشتاری ئاینی ناکەیت؟. ئەی نازانی که (ماویزم)یش ئاینێکی کوژەربوو!

- (مان – لی) وتی: هەڵبەته راسته سەرپێچیکردن لەرێزدانان بۆ باوانەکان فەرمانێکی شۆڕشگێڕانەبوو، بەڵام لەلایەکی دیکەوه (کۆنفۆشیۆس)یش کۆڵێکی گران‌و قورس بوو لەسەر شانی لاوەکان...

- باشه، کوڕی لاو... ئەوه دەبێته هۆکار بۆ ئەو هەموو زیادەرۆیی‌و توندڕەویانه؟

- (مان – لی) بەهێواشی وتی: نەخێر. بێگومان نەخێر. سەرۆك (ماو) هەڵەی کرد، تا رادەی لەسەدا سی.

- پوره (مارتا) بەتوڕەییەکی زیاترەوه وتی: ئێستا بەخشراوەو بێگوناهه!؛ بەگوڵاوپرژێن نێژراوه، وەك خوا لەگۆڕەکەیدا له مەیدانی (تیان – ئان – مین) (ئاشتی ئاسمانی) راکشاوەو هێشتا پارێزگاری لەحورمەتی دەکەن!. ئاینەکه بەبێ کەموزۆر ئاینێك بوو شایستەی خوایەکی تایبەت؛ چینیەکان سەرەڕای هەرکارێکی هەیانبوو ناچاربون دوجار لەرۆژێکدا بۆ شکۆمەندی ئەو (سەمای وەفاداری) بکەن!. به (خۆری سور) ناویان نابوو، هەموو دڵەکان...

- (تیۆ) وتی: واته دەتەوێت بڵێیت که (خۆری سور) خوایەکی نوێی چین بوو...

- پوره (مارتا) بەتوندی هاواریکرد: بەڵێ! بەتوانا، بەسود، ئاندەر، بەڵام رەق‌و زۆردار وەك خواوەندێکی ئەفسانەیی‌و بێگیان‌و خوێنڕێژ! ئیمپراتۆرێکی وێرانکارو کارەساتاوی.

- (تیۆ) وتی: زۆر زیادەرۆیی دەکەیت. سەیر نییه لەچین دەریانکردیت!

- (مان – لی)، کە پەردەی شەرمی دڕاندبوو، بەمست دەیکێشا بەمێزەکەداو گوتی: خاتون.. تۆ لاوانی ئەمرۆ ناناسیت. چین وڵاتێکی گەورەیەو دەتوانێت مێژووی خۆی هەرس بکات. تۆ بەناوی کێوە داوەری دەکەیت؟

- هەر ئاینو مەزهەبێکی دەستیدایە تیرۆرو کوشتوکوشتار خراپەکارە. ئاینەکەی (ماو)یش لەو وتەزایە بەدەرنییە. زۆر بەختیارم بەوەی ئێستا چینییەکان خەریکی پەرستنی خوای سەرمایەدارن.

- (مان – لی) وتی: بمبەخشە، بەڵام من نازانم مەبەستت لەکام خواوەندەیە.

- پورە (مارتا) وتی: خۆتان سەغڵەت مەکەن، مەبەستم خوای دراوە!

- (مان – لی)، کە ڕەنگی پەڕیبوو، گوتی: خاتوو (ماك لارن).. ڕێگابدە بەیادتانی بێنمەوە چینییەکان هەرگیز دوژمنی سامان نەبون، باوکم پیاوێکی ساماندارەو من هیچ ناشەرمەزەندییەکی تێدا نابینم.

- پورە (مارتا)، کە سوورهەڵگەڕابوو، گوتی: داوای لێبوردن دەکەم، مەبەستم ئەوەبوو...

- بەڵام هەرچۆنێك بێت درکاندت. خودی خۆشت تارادەیەکی باش ساماندار یت. لەبەرئەوە نەدەبوو شتی وابڵێیت.

پورە (مارتا) بێدەنگ بوو، سەری داخست.

- (تیۆ) بۆ ئەوەی بابەتەکە بگۆڕێت وتی: هەرچۆنێك بێت ئەو خۆرە سورە سەرنجڕاکێشە.

## پەرێشانیو شڵەژان

ئیدی (مان – لی) نەهاتەوەو (تیۆ)ش سەغڵەت بوو. هەفتەکە تێپەڕیو ئەنجامی تاقیکردنەوەکان باسیان لەجێگیری دۆخەکە دەکرد، بەڵام پسپۆڕەکانی نەخۆشخانەی (سەنگاپورە) لەسەر کارتی تاقیکردنەوەکەیان نوسیبوو، کە ئەنجامەکان (دڵخۆشکارن). لەبەرئەوە پورە (مارتا) بەرەو تەلەفونەکە رایکردو داوای مۆڵەتی دەرچونی لەباوکی (تیۆ) خواست. (تیۆ)ش لەگەڵ دایکی قسەی کردو پاشنەوەی هێڵەکەی بڕی وتی:

- دایکم بەهۆی زۆر شەکەتییەوە مۆڵەتی نەخۆشی وەرگرتووە. سەریشی گێژدەخواتو بابە وتویەتی بۆ پشودان بۆ (بروژ)ی دەبات تا پشوو بدات. دەزانیت (مانگی هەنگوین)یشیان لەهەمان شار بەسەر بردبوو؟

- پورە (مارتا) وتی: زۆرباشە. تەواو پشوو دەدات.

- کاتێ بیرلەوە دەکەمەوە بۆ شاری (بروژ)ی جوان دەچن..!

- ئێمەش بۆ ژاپۆن دەڕۆین!. زۆر درەنگ نییە؟

فرۆکەی هێڵی ئاسمانی (گارودا ئێرلاین) بەوێنەی هەڵۆی (ڤیشنۆ) رازابۆوە. کەلەسەر لوتی فرۆکەکە نەخشێنرابوو، بەڵام ئەم هەڵۆیە بەڕەواڵەت شەکەتو ماندوو بوو، لەبەرئەوە گەشتەکەی (جاکارتا – تۆکیۆ) چەند سەعاتێك دواکەوت.

خەفەتو ماتەمینی (تیۆ) نەڕەویبۆوە. پورە (مارتا) لەبیری ئەوەدابوو بۆچی برازاکەی دڵشاد نییە؟. دەیبینی (تیۆ) وەکو جاران حەزی بەزانینی هەموو شتێك نییەو ئێستا ماتە. ئایا لەگەشتکردن هیلاك بووە؟. لەبەرخۆیەوە وتی: بەڵام ئیدی ناتوانم پاشەکشە بکەم. چۆن دەبێت دڵشادی بۆ بگێڕمەوە؟

(تیۆ) لەخەویشدا شڵەژاو بوو، کەبەدەم خەوەوە قسەی دەکرد داوای دایکی دەکردو سکاڵای لەتەنیاییەکەی خۆی دەکرد. پورە (مارتا) تێگەیشت، کە رۆحی (تیۆ) لەنێوان بزری دایکیو جمکە نادیارەکەی دوچاری سەرگەردانی بوەو ئەم نەخۆشیید بەدەرمانی (تبت)ی چارەسەر ناکرێت. بیری کردەوە ئایا جارێکی دیکە لەدایکی (تیۆ) بپاڕێتەوە تا بێتە لایان؟. (نەخێر، لەلایەکەوە ئێمە لەوپەڕی جیهانداین، لەلایکی دیکەشەوە (میلینا) سەرسامو شێت دەبێت. نەخێر بەڕاستی ئێستا کاتی هێنانی ئەو نییەو دەبێت بەرگری بکەم...). دەبێت متمانە بەژاپۆن بکرێت. دەستی لە (تیۆ) بەردا تا لەو سەرزەمینەدا ئاینی گوڵو دارستانەکان بدۆزێتەوە. چای سەوزی (ژاپۆنی پێ بنۆشێو ناچاری بکات هەموو بەیانییەك وەرزشی (یۆگا) بکاتو ماسی خاو بخوات، کە پڕە لەفسفۆڕو لە ژپۆن خوراکێکی گشتییە. لەهەمان کاتیشدا لەجانتا پڕ لەدەرمانە ئەوروپییەکانی روانیو بینی دەرمانە پێویستییەکان ماون. جگە لەوەش تێگەیشت، کە خودی خۆشی لێوان لێوە لەخەمو شڵەژانو پەرێشانی.

## (ئاشی کو) خانم

پورە (مارتا) لەنێو ژاپۆنییە کامێرا لەملەکاندا بۆ خانمە ژاپۆنییەکەی دەگەڕا، کە دیاربوو لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا ئامادە نەبوو. سەغڵەت بوو، بڕیاریدا سەردانی بەشی ڕاگەیاندنی فرۆکەخانەکە بکات.

(تیۆ) وایبەبیردا هات لەوێدا چاوی بەژنێکی بەتەمەنی ژاپۆنی دەکەوێت، کە چاوە بچوکەکانی پڕن لە سۆزو میهرەبانی. بەڵێ هاوڕێکانی پورە (مارتا) هەموان باشبون، بەلاّم بریا هێندە بەتەمەن نەبونایە!. خۆ ئەگەر لاوێکی وەك (مان – لی)ش هەڵکەوێت ئەوا پورە (مارتا) لەگەڵیدا دەکەوێتە مشتومڕ. لەنێو روخسارەکانی ئەو ناوەدا (تیۆ) بۆ بەتەمەنەکان وێڵ بوو تا هاوڕێ تازەکەی پورە (مارتا) بدۆزێتەوە.

- لەپڕ دەنگێك لەپشتییەوە وتی: سلاّو، ببورە، بەئەرك نەبێت؟

(تیۆ) ئاوڕیدایەوە، کچە ژاپۆنییەکی قەشەنگ بەرویدا پێدەکەنی. چاوی رەش، دەمێکی بچوك پرچێکی بریقەدار، کە تاکەمەری درێژبوو. سەرەڕای مینی ژۆپو بۆدییە سورەکەی سیانزە ساڵە؟ پانزە ساڵە؟دەبوو.

- (تیۆ) بەرویەکی پەرێشانحاڵییەوە وەلاّمیدایەوە: فەرموو.. هیچ ئەرك نییە، بەلاّم من هەر ئێستا لەگەڵ پورم گەیشتومو چاوەنواڕی کەسێکم. ئایا تۆ لە تۆکیۆ دەژیت؟
- وەلاّمیدایەوە: نەخێر، لە (تۆکیۆ). منیش بۆ کەسێك دەگەڕێم. بۆ خاتونێك دەگەڕێم وەکو تۆ فەرەنسییەو دەبێت مێردمنداڵێکی لەگەڵ بێت، بەلاّم کەسی لەو بابەتە نابینم. لەوانەیە تۆ ئەوت بینیبێت؟
- (تیۆ)، کە بەپەلە دەستی گرت، وتی: ئەو ژنە روخساری چۆنە؟
- هەمیشە جلوبەرگی سەیر دەپۆشێت. زۆرجار کلاّوێکی شێوە (تبت)ی دەکاتە سەر.
- (تیۆ) هاواری کرد: جوانە! پورەکەی منیش هەر بەوشێوەیەیە. ئێستا دوو پیرەژن لەم فرۆکەخانەیەنو هەردوکیشیان فەرەنسین. ئۆو... ئەوە پورەکەی منە... دەیبینی... ڕاستم کرد، کلاّوی پێستەی (تبت)ی لەسەردایە!
- پورە (مارتا) بەبینینی کچە جوانەکە روی گەشایەوەو بانگیکرد: ئاهـ ... دواجار. چی بوو؟

- کچەکە، کەسەری وەك سڵاوکردن شۆڕکردەوە، وتی: خاتوو (ماك لاری) زۆر داوای لێبوردن دەکەم. تەکسیەکەم لەژاوەژاوی ڕێگادا دواکەوت.

- پورە (مارتا)، کە بەئحم کردنەوە لە دەست لەناو دەستی ئەو دوانەی دەڕوانی، وتی: دیارە (تیۆ)ت دۆزییەوە.

(تیۆ) بەدەمی داچەقیوەوە چاوی لەسەر سیمای سەرسامی پورە (مارتا)وە گواستەوە سەرسیمای کچەجوانکە، کە ئەویش چاوەکانی لەسەراسیمەبوندا کرابونەوە. کەواتە هاوڕێکەی پورێ ئەو کچە ژاپۆنییە شەنگەیە!

- کچە بەهێوری وتی: کەواتە (تیۆ) خۆتیت؟ خۆشحاڵم...

- (تیۆ)، کەدەستی لەدەستی بەرەڵڵا کرد، وتی: منیش هەروەها.

- کچەکە سورهەڵگەڕابوو، گوتی: من وامدەزانی منداڵ تری. خاتوو (ماك لاری) هەمیشە باسی (تیۆی بچوك)ی دەکرد.

- (تیۆ) وتی: وەکو ساتەکانی پێشوتر هەربە (تۆ) بانگم بکە. باشە، تۆ ناوت چییە؟

- پورە (مارتا) لەتاو سەراسیمەبون هاواریکردو گوتی: ئای! کەواتە ئێوە پێشئەوەی یەکدی بناسن خەریکی گفتوگۆ بون؟. باشە، زۆرباشە... (تیۆ) خانم (ئاشی کواکارا)ی خوێندکاری زمانی فەرەنسیت پێدەناسێنم.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: خوێندکاری زانکۆ!

- پورە (مارتا) ڕونیکردەوە: (ئاشی کو) زۆر بەتوانایە. تەمەنی لە شانزە ساڵ تێپەڕناکات.

- (تیۆ) نائومێدانە گەڕایەوە دواوە: شانزە ساڵ!

- (ئاشی کو)ی کچۆڵە بەبڕواوە وتی: لەوبڕوایەدام هاوتەمەن بین.

- (تیۆ) بەپەژارەیەکی زۆرەوە وتی: من چواردە ساڵم.

- خانمەکە دەمودەست وەڵامیدایەوە: وامزانی شانزە ساڵی. باڵات زۆر بەرزە.

- پورە (مارتا) بەنارازییەوە وتی: بەرز؟ (تیۆ) ڕێك بەقەد باڵای منە!. وەرە ئێرە (تیۆ) کەی من.

کەشانەکانیان لەتەنیشت یەکدییەوە ئەندازەگرت (تیۆ) سەروملێك لەو بەرزتربوو. پورە (مارتا) خەمباربوو. گومانی تێدانەبوو (تیۆ) هەڵیدابوو.

- باشە، راستەوایە، بەڵام سەیرە! چۆن لەپڕێکدا...
- (تیۆ) بەشادمانییەوە وتی: پیرێژن.. گەشت لاوان گەورە دەکات.
- زۆرباشە. ئیدی لەمەودوا لەحیاتی (قرژاڵی بچوك) بە (کوبرای گەورە) بانگت دەکەم! ئێستا بابڕۆین.
- بێگومان هۆتێلەکە بەپێی حەزی پورە (مارتا) بوو؛ کەمێك دێرین، بەرەواڵەت قەشەنگو خۆش بوو، کە جگە لەخاولیو پێڵاوەکان هیچی دیکەی ژاپۆنی نەبوو.
- (تیۆ) لەیەکەم بینینەوە پرسی: باشە چ شتێکی ئێرە ژاپۆنییە؟
- پورە (مارتا) وتی: گوڵی ناو ئەو گوڵدانە!
- دایکم لەشێوازی رازانەوەی ئەو گوڵانەدا شارەزایی هەیە. وانەی (ئیکانا)ی خوێندووە.
- پورە (مارتا) راستیکردەوە: (نیکەیانا) نەك (ئیکانا). بەهۆی حەزی هەموو شت زانینەوە زۆر پەلەدەکەیت کوبرا گەورەکەم.
- بەراستی ئەو هاورێیەت زۆر گونجاوە.
- ئەوکاتەی من ناسیومە بچوك و زۆر خڕوخەپان بوو، ئێستا کچێکی گەورەو جوانە، وانییە؟
- (تیۆ) ملیدا: بەڵێ وایە. لە (سۆق مارسۆ – ئەکتەری فەرەنسی) دەچێت. جگەلەوەی خوێندکارە چیدیکە دەکات؟
- پورە (مارتا) وتی: ئەمە (سورپریز)ە.. ئێستا دەرمانە (تبت)یەکەت بخۆو پشویەك بدە!

بەڵام خەو لەچاوانی (تیۆ) زڕابوو. سەیرکردنی شکۆفەکانی گێلاس لەگەڵ (ئاشی کو) شتێك بوو لەشێوەی سەردانی شاری (ڤاتیکان) لەگەڵ کاردینـاڵ. لەزیندە خەونیدا شکۆفەی گوڵی گێلاس لەسەر پرچی زۆر درێژو رەشی کچە شۆخێك بوو، کە دەستە ساردەکانی لەناو دەستی نابوو، دەیویست بەگەرمایی دەستی گەرمیان بکاتەوە.

## تفتی ماسی کاڵ

لە دوایین سەعاتەکانی پاش نیوەڕۆدا کاتێك پورە (مارتا) بێداری کردەوە سەعات شەش بوو. (تیۆ) پرسیاری کاتی شێوکردنی کرد.

- پورە (مارتا)ش وتی: سەعات شەشە. دوبارە جیاوازی نێوان کاتەکانت لەیادکردوە.

- (تیۆ) سەعاتەکەی لەگەڵ کاتی لۆکاڵی میقات کردو گوتی: جارێ کاتی زۆرماوە بۆ شێوکردن. باشە چیبکەین؟
- بەسەر شەقامەکاندا پیاسە دەکەین و پاشان بۆ چێشتخانەیەکی دەریایی دەچین، باشە؟.
- (تیۆ) بەتاڵییەکەوە وتی: بۆخواردنی سوشی؟ دەزانم.
- بەم رەفتارەت دەهریم دەکەیت. ئەگەر بڵێم (ئاشی کو)ش بۆ شێو لەگەڵمان دەبێت چیدەڵێیت؟
- لەو بارەدا هەلومەرجەکە جیاوازە، بەڵام یادت دەخەمەوە ڤێز لەماسی کاڵ دەکەمەوە.

لەسەر شەقامەکان (تیۆ) کاتێکی زۆری بەتەماشاکردنی جۆرەها شت بەسەربرد: کەلوپەلی ئەلکترۆنی، تەلەفزیۆنی میناتۆری و کامێراکانی لەکۆگاکاندا خرابوونە روو. لەبەردەم چێشتخانەیەکدا راوەستا، کە قرژاڵ و هەشتپێی خاکی گەورە لەدەفری تایبەت لەپشتی جامی پێشانگاکەوە دانرابون و حەزی کڕیارانیان دەجوڵاند.

- پورە (مارتا) وتی: ها، دەمت ئاوی تێزاوە؟ زۆرباشە، هەموو ئەوانە لەپلاستیك دروستکراون و وەك نمونە دانراون.

(تیۆ) بۆ گاڵتەکردن لەگەڵ خوشکەکانی هەندێك سەوزە، گیانەوەرانی دەریایی و گلاسێك کۆکاکۆلای پلاستیکی کڕی، پورە (مارتا)ش لەدەستگێرەکان قۆرییەکی شینی کاڵ و نەخشێنراو بەوێنەی باڵندە لەگەڵ کتلییەکی گەورەی رەشدا کڕی.

- (تیۆ) بەفیکە لێدانەوە وتی: ئەمانە شتی زیادەنین؟
- پورە (مارتا) بەتوندی وەڵامیدایەوە: ببورە.. ئەمانەم بۆ دایکت کڕیوە.
- (تیۆ) وتی: ئەوانە جوان نین، رێگام دەدەیت خۆم دانەیەك هەڵبژێرم؟

ئیدی بەبێەوەی رێگای نارەزایەتی پورە (مارتا) بدات کتلییەکی شیری بەلێوارێکی ئاڵتونی و نەخشێنراو بە گوڵی رەنگ کاڵ هەڵبژارد.

خانم (ئاشی کو) بەبەرگێکی شینی کاڵ و کراسێکی سپییەوە، وەك خوێندکاران لەبەردەم رێستورانتەکە چاوەنواری دەکردن.

- (تیۆ) بەجۆرێك مەخابنەوە وتی: تۆ كتلی بەكارناهێنیت؟

- پورە (مارتا) لەحیاتی كچە شەنگەكە وەلامیدایەوە: جۆرێكی تایبەت... دەیبینیت. زۆر پەلە مەكەو خواردنێك هەلبژێرە.

- (تیۆ) جۆرێك ماسی سوركراوەی داواكرد، بەلام ئەو جۆرە خۆراكە لەچێشتخانەكەدا نەبوو. گیانەوەرانی زیندووی دەریایی، كە لەناو ئەستێلێكی بچوكدا دەجولان، دەهێنرانە بەردەم كڕیارەكان. (تیۆ) تێبینیكرد خانم (ئاشی كو) هەشت پێیەكی زیندوی برد بۆ دەمی. سەرئەنجام پاش چەند ساتێك (تیۆ) كەوتە هێلنجدانو لەترسی رشانەوە هەلاتە دەرەوەی چێشتخانەكە.

- (ئاشی كو) بەدوی كەوتو گوتی: تیۆ.. تەندروستیت باش نییە؟ با بۆ ڕێستورانتەكە بگەڕێینەوە.

- نەخێر، خواردنی ماسی خاو، هەرگیز!

- پورە (مارتا) بەدەنگێكی زبر وتی: بۆ نمونە بەكولاوی خواردنی باشترە؟

- (تیۆ) هاواریكرد: پەیوەندی بەمنەوە نییە! نامەوێت ئەو خۆراكانە ببینم، گەدەم دێشێتو زۆریش برسیمە!.

(ئاشی كو) كۆتایی بەمشتومڕەكە هێناو بۆ ڕێستورانتێكی دیكە رۆشتن. لەوێ (تیۆ) بەحەزێكی زۆرەوە كەوتە خواردنی پلی باریكی گۆشتی گا، كە لەبەرچاوی كڕیاردا لەناو مەنجەلێدا سازدەكراو پاشئەوەی زەردێنەی هێلكەی تێهەلدەسورا بۆ كڕیار دادەنرا.

- لەهەمان كاتدا بەكچۆلەكەی وت: ئێوەی ژاپۆنی چەند بێبەزەیین. گۆشتی كولاو بەلایەنی كەمەوە لایەنی مرۆڤایەتی تێدایە.

- پورە (مارتا) وتی: كولاو یان كال، هەرچۆنێك بێت گۆشتی بونەوەرێكی زیندووەو دەخورێت.

- (ئاشی كو) بەسەرسوڕمانەوە بەشداری گفتوگۆكەی كردو گوتی: دەزانم دەتەوێت چیبلێیت.

- پورە (مارتا) هاوارێكی دیكەی كردو گوتی: بۆ نمونە، تۆ، كە داكۆكی لە كۆنترین نەریتو ترادیسیۆنی ولاتەكەت دەكەیت، ئەمجۆرە دادوەرییە رەخنەئامێزانە دەربارەی خۆراك پەسەند دەكەیت؟ ئەوەش دەیلێیت زۆریش ژاپۆنییانە نییە.

- (ئاشی کو) وەڵامیداوەوە: بەدرێژایی سەدەکان شارستانییەتی ئێمە لەژێر دەسەڵاتو حوکمڕانێتی جەنگاوەراندا بوو. ئێوەش دەزانن ئەم بنەمایانە لەکەللەرەقیو بێبەزەیی بێبەری نەبووە.

- ئاهـ... مەبەستم ئێوە (سێپوکو - Seppuku)ـە. (تیۆ) تۆ شارەزای ئەوجۆرە مردنەیت؟ کە لەئەوروپا پێیدەڵێن (هارا – کیری).

- (تیۆ) وتی: باوکم لەماڵەوە گۆڤارێکی کۆنی هەیە بەناوی (Hara - kiri)، کە تەنزو سیخوڕمە ئاسایە، بەڵام سروتو ئاینی مەرگ لەژاپۆن نازانم.

## داستانی کچو کوڕێكو شمشێرێکی خودایی

(هارا – کیری) جەنگاوەرێکی ژاپۆنی بوو. پیاوی جەنگاوەر ئەگەر شەرەفی لەدەستبدایە، لەشەڕدا بدۆڕایە، ناپاکی بکردایە یان گەورەکەی فەرمانی مەرگی بەسەردا بسەپاندایە بەپێی سروتو بڕیاری تایبەتو نەگۆڕ خۆی دەکوشت، واتە بەرگێکی سپی دەپۆشیو دەهات ناو گرووپی هاوڕێکانییەوەو بەخەنجەرێکی دەسك کورت گۆشاوگۆش ورگی خۆی هەڵدەدڕی. لەسەردەمە زۆر دێرینەکاندا متمانەدارترین کەسی ناو گروپەکە، کە لەلایەن ئەو کەسەی خۆکوژییەکەی ئەنجامداوە دیاریدەکرا، هەڵدەستا بەلێکردنەوەی سەری خۆکوژەکە لەجەستەی تا کۆتایی بەئازارەکانی بهێنێت.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئەمە (هارا – کیری)یە؟

- (ئاشی کو) راستیکردەوە: (Seppuku). ئەم خووە ئێستا تارادەیەك سڕاوەتەوە.

- پورە (مارتا) وتی: بەڵام ئێوە هێشتا هەموو ساڵێك بەجەژن یادی ئەو چلو حەوت پیاوە دلێرە دەکەنەوە، کە بڕیاریاندابوو تۆڵەی فەرماندەکەیان بکەنەوەو کاتێك بەئامانج گەیشتن یەکەیەکە ورگی خۆیان هەڵدڕی.

- (ئاشی کو) خەنییەوەو گوتی: ئەو چلو حەوت کەسە شمشێربازانە دەڵێیت؟ ئەوانە بەرجەستەکاری ئەرکی وەفاداری بون. چارەنوسێکی باشیان نەبوو. یان خاوەنەکانیان مردبوو یان ئیدی توانای پێدانی دراوی نەبوو. لەبەرئەوە ناچابوون بەشمشێرە بێبەرهەمەکانیانەوە وێڵو سەرگەردان ببن. ئەو چلو حەوت کەسە ئەرکێکیان بۆخۆیان دیاریکردبوو. رێزی ئێمە

بۆ ئەوان بەهۆی خۆڕاگری‌و کۆششی سەخت‌و وێناکردنی ئەو واتایەیە کەلەلای خۆیان بۆ شەرافەتمەندی لەپێناوی کاری (سێپوکو).

- پورە (مارتا) پێداگری لەسەر دیدەکەی خۆی کرد: دەبێت بزانین (می شیما)[1]ی نوسەری گەورە ماوەیەکی دورنییە بەهەمان شێوە خۆکوژی کرد. چ مەرگێکی سەرسوڕهێنەر بوو. (تیۆ) گوێڕادێرە، سەرەتا چۆتە ژوری سەرۆکی گشتی سوپای ژاپۆن‌و بەتەناف بەستویەتییەوە. پاشان لەبەرامبەر تەلەفزیۆندا بەداخ‌و کەسەرەوە باسی لەداتەپین‌و گەندەڵبونی بەها بەرزەکانی ژاپۆنی دێرین کردوە، کە ئێستا یەکێك لەو نەریتانە لەجوانترین و شکۆدارترین روخساریدا پیشاندەدات.. پاش تەواوکردنی قسەکانی ورگی خۆی هەڵدڕی‌و هاوڕێکەشی سەری لەجەستەی کردەوەو ئینجا خۆشی هەمان کاری کرد. ئەوەش لەدەیەی حەفتاکاندا رویدا.

- (ئاشی کو) وەڵامیدایەوە: (می شیما) لەرابردویەکی بەسەرچودا دەژیا. ئێمەی ئەنداماني وەچەی لاوان لەسەردەمی ئێستاو لەرۆژی ئەمڕۆدا دەژین.

- (تیۆ) پرسی: لەکەیەوە؟

- پورە (مارتا) بەشداری کردو گوتی: هیوادارم تۆ بۆمبی ئەتۆمی (هێرۆشیما)ت فەرامۆش نەکردبێت.

- (تیۆ) بەتوڕەییەوە وتی: هەڵبەتە نەخێر، بەڵام ئەو بۆمبە لەچ مێژوویەکدا بوو؟

- لەساڵی (١٩٤٥) ئەمریکییەکان بۆ کۆتایی هێنان بەجەنگی دووەمی جیهان بۆمبێکیان بەسەر ژاپۆندا ئەزمونکرد. ژاپۆن هەر لەسەرەتای ئەو جەنگەوە هاوپەیمانی ئەڵمانیای نازی‌و ئیتاڵیای فاشی بوو. ئەو دوو وڵاتە خۆیان رادەستدابوو، بەڵام ژاپۆن هەموو رۆژێك (کامیکاز)ی خۆی دەناردە سەر کەشتییەکانی دوژمن.

- دەزانم (کامیکاز) چییە؟ مەبەستی (خۆکوژی)یە.

- (ئاشی کو) وتی: بەتەواوی وانییە. وشەی (کامیکاز) بەواتای (سروەی خودایی)ـە. ئەو ناوانەیان بەو فرۆکەوانانە دابوو، کە فرۆکەکانی خۆیان دەکێشا بەکەشتییەکانی دوژمنداو دەتەقینەوەو بەوخۆکوژیەشیان زیانی گەورەیان لەگەمێکانی ئەمریکادا.

- (تیۆ) وتی: چ جوامێرییەکە!

---

[1]. Mishima: یۆکۆمی شیما (١٩٢٥ – ١٩٧٠) یەکێکە لەگەورەترین نوسەرانی ژاپۆنی، کە زیاتر لەدوانزە رۆمان‌و شانۆنامەی زۆری نوسیوە. (می شیما) ستایشکارو پەرۆشی خونەریتی ئاینی کۆنی ژاپۆن بوە، بەتایبەتی چاکە کارییەکانی سامورایی‌و زۆر دژی مۆدێرنیزم‌و جیهانی نوێ بووە.

- ئەمجۆرە رەفتارانە دروست هەمان خوونەریتی بنچینەی جوامێری سامورایی بوو.

- لەسەدەی نۆزدە بەدواوە ئیمپراتۆر لەئاستی خواوەندو لەوەچەی راستەوخۆی خواوەندی (ئۆماتراسو) دادەنراو لەویوە کە ئیمپراتۆر هەڵگری ماهییەتێکی خودایی بوو، هەموو ژاپۆنییەکان ئەرکداربون گیانی خۆیانی بۆ فیدابکەن. پاش بۆمبەکەی (هیرۆشیما) کاتێك ئیمپراتۆر خۆی رادەستدا هەندێك لەسەربازانی ژاپۆنی پەسەندکردنی شتێك، کە لەدیدی ئەوانەوە مایەی قبوڵکردن نەبوو، بەلایانەوە گران بوو، سەرپێچیان کردو بەتەنها بۆ ماوەی چەند ساڵ لە دورگەکانی زەریای ئارامدا درێژەیان بەجەنگدا. چونکە لەدیدی ئەوانەوە ئیمپراتۆر – خواوەند نەیدەتوانی لەئاستی خۆی بێتە خوارەوەو گەلەکەی نەیاندەتوانی دەستی لێبەربدەن.

- (تیۆ) وتی: ئەوەش نمونەیەکی دیکەیە لەقوربانیدانە بەمرۆڤا. خواوەندی (ئۆماتراسۆ) لەو روداوەدا چ رۆڵێکی هەیە؟ لەو بڕوایەدابوم بەهاتنە دەرەوەی لەئەشکەوتەکە تەنها زەوی روناك کردۆتەوە!

- (ئاشی کو) رونیکردەوە: کە ئەوە راستە، بەڵام (ئوماتراسۆ) کچی جوتێك هاوسەری بنیاتنەربوو، کە روداوە خەماویەکەیان کاریگەرییەکی قوڵی لەسەر رۆحو دەرونی ژاپۆنییەکان داناوە. (ئیزانکی – باوك خواوەند)و (ئیزانامی – دایك خواوەند)ی ژاپۆنییەکان بون. لەو تافەدا کەهێشتا زەوی پەیدا نەببوو، کۆمەڵی خواکان ئەو دوانەیان لەسەر پردێکی شێوە کەمان رۆنا تا خەریکی ئەفراندنی (ژاپۆن) بن. (ئیزاناکی) لاو هێندە قۆز بوو، کە (ئیزانامی) خواوەند لەسەر لوتکەی رەنگە ئاوییەکانی کەمانەکە راوەستاو بەئەوی وت: ( حەز دەکەیت ببیتە هاوسەرم؟). ئیدی بەیەکگەیشتن، بەڵام بەسەرسامییەوە بینیان یەکەم وەچەیان بونەوەرانی دێوناسان، هەشت پێ، گوڵاڵەی دەریاو جروجانەوەری دەریایی شێوە مێروەکان.

هەردوو خوا بەنائومێدییەکی زۆرەوە بەرەو جیهانی ئاسمان گەڕانەوەو خواکان دوبارە بۆ سەر کەمانە رەنگکراوەکە رەوانەیان کردنەوەو داوایان لێکردن تامیهرەبانی خۆیان یەکانگیری فەرمانەکانو پێداویستییە سروشتییەکان بکەن. ئینجا لەناوەراستی پرد کەمانی رەنگکراودا (ئیزاناکی) خواوەند وەستاو بەخوای وت: (ئایەزوو دەکەیت ببیتە هاوسەرم؟). لێرەوە، کە ئەمجارە داوای هاوسەرگیری لەرەگەزی نێرەوە بوو(ئیزانامی) جوانترین منالی لێکەوتەوە: کەدورگەکانی ژاپۆن بوو!

- (تیۆ) وتی: تائێرە روداوێکی خۆشە.

- بەڵام (ئیزانامی) بەسەر دوا سکییەوە مرد. (ئیزاناکی)، کە لەتاو خەمو خەفەت بەرەو شێتبون دەچوو، بریاریدا بچێت لە دۆزەخ بەدوایدا بگەڕێت. بەهۆی پەرەجووەوە مۆڵەتی پێدرا بۆ جیهانی زیندووەکانی بگەڕێنێتەوە، بەڵام بۆ دواوەی نەڕوانێت. بەداخەوە! (ئیزاناکی) سەرپێچی کردو ئیدی خواوەندە خۆشەویستەکەی وەك تەرمێکی بۆگەنکردو گەڕایەوەو سەری خستە سەر قاچەکانی (ئیزاناکی) تا ماڵئاوایی لێبکات. (ئیزاناکی) تۆپەڵێك لەپرچی خۆی داکێشا بەسەریدا ئیدی هەرگیز نەیبینییەوە.

- (تیۆ) وتی: ئەم روداوە چیرۆکێکم بیردێنێتەوە کە (تیانۆ)ی نەنکم بۆ منی گێڕاوەتەوە. لە یۆنان ژنەکە بە (ئیریادیس - Euryadicc) ناوبراوە، بەڵام ناوی ئەو خواوەندەم لەیادکردوە.

- ناوی (ئۆرفە)[1]یە، جادوگەر، شاعیرو ئاوازدانەر. (ئۆرفە) بووە بەهرە بەخشی قوتابخانەیەکی بەتوانای عیرفانیو وەجاخ کوێربوو. (ئۆریدیس)ی هاوسەری بەژەهری مارێك مردو کاتی ئەوەی بۆ نەگونجا منالێکی بۆ بخاتەوە. لەکاتێکدا (ئیزانامی) بەرجەستەکاری دایکێکی میهرەبانە، کە دەتوانێت لەقولایی دۆزەخدا خۆی بۆ دایکە دێوێك بگۆڕێت. (ئیزانامی) لەرەواڵتی دایکێکی باڵاو تۆقێنەردا سروشتێکی تەواوی لەسەر شێوەو روخساری خودایانەی لێکەوتەوە، واتە ژاپۆن. بەپێی ئاینی (شین تو) (ئوماتراسۆ)ی خواوەند، کە کچی (ئیزانامی)یە شمشێرەکەی (سوزانۆ)ی برای، کە هێمای خواوەندییە، بەیەکەم ئیمپراتۆری ژاپۆن بەخشیوە. چونکە (سوزانۆ) خوایەکی رەقەو وێنەی شەوانەی بونەوەرەکان بەرجەستە دەکات. لەکاتییێکدا (ئوماتراسۆ) رەواڵەتی بەشی روناکی نورانییە. ئیمپراتۆر – خواوەند بەوەرگرتنی شمشێرەکەی (سوزانۆ) دەبێتە دەستەی خواکانی میراتگری دوو بنەچەو سەرچاوەی پیاوانەو ژنانە.

- (تیۆ) وتی: باشە، ئەمەش تەڵەکەبازییەکی دیکەیە بۆ هێشتنەوەی دەسەڵات.

- (ئاشی کو) نارەزایەتی دەربڕیو گوتی: بەپێی نوسراوی مێژونوسانی ئاین ئەو ئەشکەوتەی (ئوماتراسۆ) خۆی تێدا ترنجاندبوو ئەگەر هەیە گەواهیدەری سەردەمی کۆن بێت، کە ئەوکاتە ژاپۆنییەکان مردووەکانی خۆیان لەئەشکەوت دەنا. بەمپێیە گەڕانەوەی کچەکەی

---

[1]. Orphee: ئەفسانەی ئۆرفە، کە یەکێکە لە پڕنهێنی ترین ئەفسانەی میتۆلۆژیای یۆنانی پەیوەندی زۆری بەئاینی عیرفانەکانەوە هەیە، کە ریشەشیان لە مەسیحییەتدا هەیە. لەمۆزیکدا ئورفە بەدامەزرێنەری (سیتار) دادەنێنو ئەوە باوە کە چنگی حەوت تار لە ئەپۆلون وەردەگیرێتو دووتاری بۆ زیاد دەکات تا ببێتە نۆ دانە، یان نۆ خوای هونەر. ئاینو ئەفسانەی ئۆرفە بەهرەبەخشی بەرهەمی هونەری فراوانە لەمۆزیکو شانۆو شێوەکاریدا!

(ئیزانامی) نەك هەر گەڕانەوەی روناکییە، بەڵکو ئاماژەی ژیانی دوای مەرگیش بوو. واتە مردووەکانیش وەك خۆر بزر دەبونو پاشان زۆرجار وەك خێو بۆسەر زەوی دەهاتنەوە؛ ئەو خێوانەی سکاڵایان لەدەست هەلومەرجی خۆیان دەکردو داوایان دەکرد ئەوانی دیکە دڵخۆشییان بدەنەوە. ئیمپراتۆر وەك پارێزرو پاسەوانی شمشێری خودایی دەسەبەری جاویدانی ژاپۆنییەکانیشی دەکرد.

- (تیۆ) وتی: پرسیارێکم هەیە، (شین تۆ) کێیە؟

- (شین تۆ) بەواتای رێگای خواکانە. ئاینی (شین تۆ)ی بەرایی، کە دێرینترین ئاینی ژاپۆنییەکانە، خواکانیان لەسادەترین شەقڵو شێوەدا دەپەرست: خۆر، با، بەردەکان، چیاکان، گوڵ، دار، هەورەکان؛ ئەوانە خواوەندە تایبەتمەندییە سروشتییەکانن، کە (شین تۆ) بە (کامی - Kami) ناویان دەبات. بەسەر هەموو شوێنێکی زەویدا روناکیان پەخشدەکردو دەستڕاگەیشتن پێیان بۆ هەموو کەس شیاوو بەدەستهێنانی رەزامەندیان بەکەمێك تازیار مەیسەر دەبوو؛ بۆ نمونە: بەبەستنی پەتێك لەسەر کەمەر یان پارچە پەڕۆیەك بەسەرەوە بەستن و نزاو نوێژێکی سادە. (شین تۆ) تاماوەیەکی دورودرێژ سادەترین ئاینی جیهانو پەیوەندیو پەیوەستییەکی جەزمەو خەڵوەتگەیی لەگەڵ سروشتی ژاپۆن هەبوو، سروشتی گرکانی، هەرەشە ئامێز، سەرسەوزو ئارام، تەماوی، بەفراوی، گەرمەسێری باشورو بەستەڵەکی باکور.

- (تیۆ) بەگومانەوە وتی: (شین تۆ) هەر هێندە بوو؟ بەوپێیە لەدواییدا گۆڕاوە.

- بەڵێ، چونکە دوایی لەژێر باری گرانی ئاینی وەك (کۆنفۆشیۆس)ی چینیو (هۆکاری گەورە)ی بودایيگەریدا شارایەوەو بزر بوو. بەڵام حەقیقەت ئەوەبوو (شین – تۆ) لەناو نەچوو بوو، بەڵکو بەگونجاندنی خۆی لەگەڵ ئایینە نوێیەکان لەسەرخۆ درێژەی بەژیان دەداو لەوەش هەویری کولاوی (شین تۆ – بوداییزم) پەیدابوو.

- (تیۆ) هاواریکرد: دوبارە نمونەیەکی نوێ لە سانکریتیزم.

- وەك هەرجێگایەکی دیکە لەجیهان بوداییزم هیچ ئاستەنگێکی نەهاتە سەر رێگا تا لەگەڵ ئایینێکی دیکە ئاوێتە ببێت، کە تەنها خوا سروشتییەکانی دەپەرستو فەلسەفەیەکی واقیعی نەدەخستە روو. یەکەمین (راهیب)ی بودایی وێردو پاڕانەوەکانی خۆیان لە پەرستگاکانی (شین تۆ)دا بەشانازی ئەو خوایانەوە دەستپێکرد، کەناوی (خواناسەکانی روناکی)یان لێنابون. کەس رەخنەو رێگر نەبوو. پاشان ژمارەیەکی زۆر ئەفسانە ئەفرێنراو خوا تایبەتەکانی (شین تۆ)یان روندەکردەوە، کە چۆن ئەوانیش لەراستیدا (بودایی ساتواس)بون. لێرەدا هەندێك دژو ناکۆکی

هەبوو، کە چارەسەرکردنیان ئاسان نەبوو. بۆ نمونە چۆن دەکرا ئاشتی لەنێوان خۆشەویستیو هاودەردی بۆ هەموو گیان لەبەرانو ئەو ماسییە مردوانەی پێشکەش بەخواکانی (روناکی ناسك) دەکران سازبکرێت؟

- (تیۆ) وتی: پرسیارێکی جوانە.

- ئینجا خواکان پەیامیان بە راهیبێکی پیرۆز بەخشی، کە ئەوان گوناهەی هەموو ئەو کەسانەی بەبێ بیرو بیرکردنەوە دەست بۆ کارێك دەبەن لەئەستۆدەگرنو راهیبەکەش وەلامێکی پێنەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا خوا تایبەتەکان بەوردی چاودێری گێرانەوەی ماسییە بەتەمەنەکانیان دەکرد، کە بەکۆتایی ژیانی ماسییانەی خۆیان گەیشتبون؛ بەجۆرێك مرۆڤەکان لەرێگای یاریدەدەری خواوە دەستگیریان دەکردن. بەوجۆرە دەچونەوە سەر رێگاو تەریقەتی بودایی.

- (تیۆ) وتی: ئەو بوداییانە زۆر زیرەکن.

- لەگەڵ ئەوەشدا هێندە زرنگ نین بتوانن رێگری لەجیاوازیو ململانێی نێوان خۆیان بکەن. ماوەی چەندین ساڵی درێژ بوداییەکان بۆ چەندین گروپ دابەشبون، کە دەرئەنجامەکەی بەرپاکردنی نەریتو یاسای شەرافەتمەندی جەنگاوەران بوو. دواجار پاش چەندین سەدە لەململانێی خوێناوی ئیمپراتۆر دەسەلاتی بەدەستەوە گرتو فەرمیەتی بەئاینی (شین تۆ) بەخشیو لەوەودوا ئاینی گەلی ژاپۆنو ئاینی ئیمپراتۆر بووبەیەك، چونکە بەهۆی بەرەکەتی شمشێرەکەی (سوزانۆ)ی خواوەند ئیمپراتۆر وەك جێکەوتی راستەوخۆو بێمێملی (خۆر) دەپەرستراو تاساڵی (١٩٤٥) یش لەو ئاستەدا مایەوە.

- (تیۆ) گەیشتە ئەو ئەنجامە: کەواتە لەو مێژووەوە ئیدی ئیمپراتۆر جێگای لەق بووەو نەماوە، لەگەڵ ئەوەشدا من لەتەلەفزیۆن بینیومە رێزێکی نائاسایی لێدەنرێت.

- خۆرادەستدانی ژاپۆن، کە بەهۆی ژەنەراڵی ئەمریکییەوە (ماك ئارتۆر) فەرمی بوو، بەراشکاوی داوای لە ئیمپراتۆر دەکرد تا لەئاستی خودایەتی خۆی بێتەخوارەوە. بەلام ئیمانی ناو رۆحو دڵی ژاپۆنییەکان لەجێگایەکدابوو هەروا رێزیان لەئیمپراتۆر دەنا. هەرچەندە ئیدی پاشایەکی وەك هەموو پاشاکانی دیکە بوو، لەسەر حکومەتێکی دیموکراسی راوەستابوو. چەسپاندنی دیموکراسی بەسەر کۆمەڵگەی ژاپۆنی بابەتێکی ئالۆز بوو، چونکە وتەزای (ئازادی)و تەنانەت چەمکی (تاك)یش لەژاپۆنی کۆندا بچوکترین واتای نەبوو.

- لەرابردودا هەموو کۆمەڵگە بەناوی (خواوەند – ئیمپراتۆر)ـەوە دەژیا، کە خودی ئەو هەموو ژاپۆنی بەرجەستە دەکرد. بیرۆکەی بڕیاری ئازادی خەڵك لەسیستمێکدا، کە تەنها نیشتمانو ئیمپراتۆر – خواوەند بونی هەبوو، نەیدەتوانی بونی هەبێت. ژەنەراڵ (ماك ئارتۆر) داوای ماف دەنگدانی بۆ ژنانیش کردبوو، ئەوەش کارەساتێکی گەورەتربوو. مەگەر کچانی (ئیزانامی) دەتوانن دەنگ بدەن؟. ئەگەر ئەوە رویبدایە جارێکی دیکە ژاپۆن دوچاری داهێنانو کاری کارەساتباری خوای بێرەوشتی سەر پردی رەنگداری کەوانەکە دەبووەوە!. بەوجۆرەش حوکمڕانی رەهای پیاوان لەنیشتماندا کۆتایی دەهات.. ژاپۆنی کۆنیش بەتەواوی دادەڕما!. ئینجا (ئاشی کو) بەئارامی وتی: بەڵام ژاپۆن دانەڕماو هەر لەبەرئەوەشە من تێدەگەم بۆچی بەکینەوە دەدوێیت. بەڵێ، نەریتە کۆنەکانی دژ بەژنن هێشتا لەوڵاتەکەماندا هەرماون.

- پورە (مارتا) بەتوندی وتی: چەند باشە! کچە بچکۆلانەکەم، بۆچی خۆتان هێندە توندوتۆڵ کردە پاسەوانی ئاینی (شین تۆ)؟

- چونکە ئەم ئاینە لەگەڵ سروشت دەگونجێت. (کامییەکان) بەواتای رێزدانانە لەبونەوەرانی زیندوو. لەوڵاتێکی تەنگو بچوکی وەك وڵاتی ئێمەدا، کە خەڵکەکە ناچارن شانبەشانی یەك لەسەر کەنارو لێرەوارەکاندا بەبێ درەختو گیا بژین، ئەرکی ئێمە چی دەبێت؟ ئۆکسجینو ژیان لەکوێوە دێت؟ لەشارە چیمەنتۆو شوشەکانمان بنوارە لەهەناسەدان کەوتون. ئایا لەراستیدا سروشت پرێتی لەخواکان؟ من نازانم، بەڵام بەجۆشو خرۆشەوە پاسەوانی ئاینی سروشتی دەکەمو جێبەجێی دەکەم.

- (تیۆ) پرسی: کەواتە تۆ (بودایی) نیت؟

- بۆ هەندێك شت، بەڵێ. بۆ نمونە ئاینی گوڵ یان رێورەسمی (چا). کاتێك ئەم ئایینە لەگەڵ هونەری جەنگدا ئەگونجێت تەریقەتی (زەن -zen) بەباشتر دەزانم.

- چاوەکانی (تیۆ) لەسەرسوڕماندا کرانەوە، زەن، جەنگ، چا، چ پەیوەندییەکیان پێکەوە هەیە؟

## یەکەمین وانەی (زەن)

- پەلەمەکە. لەلای من (زەن) واتە (بێئەندێشە). لەقوتابخانە دەڵێن کاتێك یەکێك لەوانەیەکدا نمرەی خراپ بێنێت دەبێت (زەن) بێت، واتە بەگشتی لەو بابەتانەی مرۆڤ دوچاری دەردەسەریو گرفتارییە. جەنگ (زەن) نییە!

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: ژاپۆنی کۆن دەستورو ڕێساکانی جەنگی لەبەرزترین ئاستیدا ڕێکخستوەو بەکەماڵی گەیاندوەو لێرەدایە (زەن) دەچێتە کارەوە. گومانم هەیە لەوەی بزانیت واتای چییە؟. (زەن) هزرو بیرێکی بەتاڵە، واتە بیرنەکردنەوەی هزرە!.

- (تیۆ) وتی: تێناگەم. وتت بیرنەکردنەوە؟

- پورە (مارتا) درێژەیپێدا: ئەگەر تۆ بیربکەیتەوە ئەوا دوبارە بیرت کردۆتەوە، وا نییە؟. ئەم بابەتە لەدوا قۆناغی فەلسەفەی (دیکارت)دا دەخوێنیت. ( **لەبەرئەوەی من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم). لە (زەن)دا بابەتەکە پێچەوانەیە! (زەن) دەڵێت بۆ ئەنجامدانی کاری کامڵ‌و تەواو دەبێت بەقۆناغی بەتاڵی هزر بگەیت.**

- (تیۆ) لەبارێکدا جوڵەیەکی دوالیزمانەی دەکرد وتی: من بیردەکەمەوە ئەم فنجانە دەگرم‌و دەیگرم. ئەمە کارێکی کامڵ‌و بێ کەموکوڕییە، پنت، کۆتایی.

- پورە (مارتا) بەگاڵتە پێکردنەوە وتی: نەخێر، کامڵ نەبوو. چەند دڵۆپە چایەکت ڕشتە سەر زەوی. لەپێناوی ئەنجامدانی کاری کامڵ تۆ نابێت بیر لەفنجانەکە بکەیتەوەو دەبێت خودی دەستت بیگرێت، بەبێ بیرکردنەوە.

- (تیۆ) چاوەکانی داخست. هەستەکانی کۆکردەوە. بەدودڵی دەستی درێژکردو فنجانەکەی بەتەواوی ڕشت.

- (ئاشی کو): پێکەنی.

- (تیۆ) بەتوڕەییەوە وتی: ئەگەر دەتوانیت خۆت تاقیبکەرەوە!

- (ئاشی کو) وتی: ئێرە گونجاو نییە. دەبێت لە ژورێکی ئارام‌و بێدەنگدا بێت.

- (تیۆ)، کەسەردەستەکەی پاکدەکردەوە، وتی: هەرچۆنێك بێت هیچ پەیوەندییەك لەنێوان فنجان‌و جەنگدا نابینم.

- پورە (مارتا) وتی: باسی تیر هاویشتنی لەگەڵدا بکە، زۆر ئارەزووی لەومیە.

- (ئاشی کو) وتی: هونەری جەنگ لەسەر بنەمای ڕاسپاردەکانی (زەن) بریتییە لەوەی پیاوی جەنگاوەر بونی خۆی وێڵ بکات تا باشتر بتوانێت خۆی لەگەڵ جموجوڵەکانی دوژمن ڕێکبخات. تیر هاویشتن یان ڕەهاکردنی تیر لەکەوان ساتێکە بەدوا ساتی وردی خۆی دەگات، کە تیرەکە بەخودی خۆی پاش جوڵەیەکی تەواو، واتە جوڵەیەکی لەباری بۆشایی‌و بەتاڵبونی کامڵدا ئەنجام دەدرێت، بەرەو ئامانجەکە دەربچێت. ئەگەر تیرهاوێژەکە زۆر بەوردی نیشانەگیری کرد ئەوا زیاد لەرادەی خۆی لەبەردەم فشاری دەماریی دەهاوێت، لەوەی بتوانێت

دروست تیرەکە لەئامانجەکە بدات. بەپێچەوانەوە ئەگەر تیرهاوێژ لەگەڵ تیرەکەیدا ببێتە یەك و یەکبگرێت، ئەگەر هزری خۆی ئارام رابگرێت و رەهای بکات، ئەوکاتە تیر کەوانەکە کاری خۆیان دەکەن و تیرەکە لەئامانجەکە دەدات. بۆ گەیشتن بەو ئەنجامە پێویستە کەسەکە بەتەواوی خۆی رەهاو فەرامۆش بکات.

- (تیۆ) وتی: بەتەواوی تێگەیشتم، لەبەرئەوەیە بەپاڵەوانانی وەرزشەکان دەڵێن لەکاتی پێشبڕکێ یان کاری وەرزشیدا ئارامی خۆیان رابگرن. لەیارییەکانی (ئۆلۆمپی)شدا لەتولەفزیۆندا هەمان شتم بیستووە.

- (ئاشی کو) تا رادەیەك بەخەمبارییەوە وتی: (زەن) سنوری وڵاتەکانی بڕیوەو ئێستا لەجیهاندا بۆ هەموو شتێك بەکاریدێنن، بۆ ئارام راگرتنی کارمەندان، وەرزشکاران و جوانی رەفتارو خووەکان... تەنانەت لێرە بووە بەبازرگانی.

- پورە (مارتا) وتی: بەسە. رۆڵە گیان، تۆ کە ئاشتیخوازیت یان وەك دەڵێن (پەسیڤیست)یت نابێت مەخابن بۆ هونەری جەنگ بخۆیت.

- (ئاشی کو) وتی: بەبڕوای من (زەن) باشترین چاکەکارییەکانی خۆی لەکاتی سروتی (چا)دا دەردەخات.

- (تیۆ) وتی: ئەمە زۆر جوان و سەرنجڕاکێشە. کەواتە ئێوە بەسروت و رێوڕەسمی تایبەتەوە (چا) نۆش دەکەن؟

- پورە (مارتا) بەزبرییەکەوە وتی: وشەی رێوڕەسم شیاو نییە. پەلە مەکە تادەبینیت رێوڕەسم چییە؟ پاشان قسەی لێدەکەین.

- (ئاشی کو) بەسەرسوڕمانەوە وتی: خاتوو (ماك لاری) بۆچی؟ جاری پێشوو حەزت بەو رێوڕەسمە نەبوو؟

- ئۆو... بەڵێ.. تەنها کەمێك دورودرێژ بوو.

- خاتوو (ماك لاری) تۆ هێشتا رۆحی (زەن) فێرنەبویت. تۆ کاتێکی زۆری خۆت لە دودڵی و رارایدا بەسەر دەبەیت. ئەوە لەباری تۆدا باش دەبینم.

- (تیۆ) وتی: پورێ گیان بیری لێمەکەرەوە (زەن)بە!.

- پورە (مارتا) وتی: تۆ ئارامم لەبەر دەبڕیت. بەهۆی بونەوەرێکی وەك تۆوە نازانم کەی بەبەتاڵی هزری دەگەم!

- (ئاشی کو) وتی: دڵنیام (تیۆ) دەگاتە ئەو بارە. ئەوەی پێویستە کەمێك هۆشمەندیو متمانەی سادەیە بەئەوی دیو ئەم تایبەتمەندییەی هەیە.

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: هەروەها دەتوانیت من بەنەزانو خانەگومان وەسف بکەیت. من پرنسیبو بنەماکانی (زەن) دەزانم، بەڵام دەمەوێت بەئارامی بیربکەمەوە، هەر هێندەو بەس.

- (تیۆ) وتی: بەڵام پورە (مارتا) ئەم یەکەم کەس نییە باسی بێخودیو رەهاکردنی منی کردبێت. لە (ئۆرشەلیم)یش (شێخ) هەمان شتی بەمن راگەیاند. (ئۆلیبریۆس)، هەمان (کوروی)یەکەی من لە (بنارس) هەموو رۆژێ هەمان شتی دوبارە دەکردەوە. (لاماگامپۆ)ی هاورێشت لەکاتی نوێژو نزادا، کاتێك من لەبەردەمی (بودا)دا سەرم لەگێژەوەچوو، ئایا هەمان خاڵت باس نەکرد؟

- (ئاشی کو) بەسەرسوڕمانەوە وتی: لەبەرامبەر (بودا)دا بێهۆش کەوتی! خاتوو (ماك لاری) دەبینیت؟

- پورە (مارتا) وتی: (تیۆ) لەگەشتەکەماندا بۆ ئاسیا کاردانەوەی چاکی پیشانداوە، بەڵام دەبێت بوترێت، کە کۆتایی گەشتەکە هێشتا رێگایەکی درێژمان لەبەردەمدایە!

- (ئاشی کو) وتی: تۆ حەزت بەخود فەرامۆشکردن نییە؟

- نەخێر، دەمەوێت ئازادبم!

- (ئاشی کو) پرسی: جا چ ئازادییەك لەخود فەرامۆشکردن گەورەترە؟

- خۆرامکردن.. کچۆڵە. لەکۆمەڵگەی ئێمەدا ئاینی خوکۆنترۆڵکردن باوێتی. هەوڵدەدەن تا بەرونی بیروخەیاڵ بکەنەوە. بەراستی تکادەکەم بۆچی زمانی فەرەنسی دەخوێنیت.

- (ئاشی کو) وەڵامیدایەوە: بۆ دۆزینەوەی کار، چونکە کەمێك وڵاتی فەرەنساش دەناسمو دەزانم لەوێ مرۆڤ دەتوانێت ئازادانە هاوسەری خۆی هەڵبژێرێت، لەکاتێکدا لێرە بەوجۆرە نییە.

- پورە (مارتا) بەگاڵتە پێکردنەوە وتی: دەیەوێت بەئازادی مێرد هەڵبژێرێت. چ ناکۆکییەکە! لەروی هاوسەرگیرییەوە هەڵگەڕانەوە لەباوان! ئەی ئەو خۆفەرامۆشکردنەی تۆ بۆکوێ چوو؟

(ئاشی کو) سووربۆوەو سەری دانەواند.

- (تیۆ)، کەدەستی گرت، وتی: نیگەران مەبە بەدرەفتارە، بەلام توخمێکی خراپ نییە. دەیەوێت هەمیشە خۆی راست بێت. من تێدەگەم تۆ چیدەڵێیت.

- (ئاشی کو)، کەچاوەکانی لێکنابوو، گوتی: لەراستیدا؟

- (تیۆ) بەگوێیدا چرپاندی: تۆ دەتەوێت بەئازادی خۆشبەختی خۆت هەڵبژێریت ئینجا خودت فەرامۆش و رەها بکەیت. باشە لەمن بروانە. (ئاشی کو) بەهێمنی سەری هەڵبڕی و نیگاکانی لەنیگاکانی (تیۆ)وە ئالا. (تیۆ) پێداگری کرد: ئەمە باشتر بیرمەکەرەوە. (ئاشی کو) نیگایەکی روناکی بەرویدادا.

- (تیۆ) بەخۆشحاڵییەوە وتی: پورە (مارتا) دەبینیت، بەمە دەوترێت (زدن).

- پورە (مارتا) تورەییەوە وتی: باشە، گەمەی عاشق و عیشق بەسە. من شەکەتم بابگەڕێینەوە.

(ئاشی کو) هەستی بەئازارکردو دەستی لەناو دەستی (تیۆ) دەرکێشاو (تیۆ)ش لەلای خۆیەوە سورهەڵگەڕا. عشق و عاشق؟ ئەو؟ ئەوەش لەکاتێکدا کە دەیەوەێت بەپەلە فریای کچۆڵەیەك بکەوێت کە دوچاری سەرسوڕمان بووە.

## بەشی هەژدە

# (گوڵەکان، ژنەکان، چا)

### رازەکەی ئاشی کو

پورە (مارتا) بەدرێژایی ماوەی گەڕانەوەیان زمانی نەگەڕاو هەر کەگەیشتە هۆتێلەکە خۆی بەگەرماوەکەدا کرد. (تیۆ) بەرگی خەوتنی پۆشیو چووە سەرجێگاو خۆیکرد بەخەوتوو. پورە (مارتا) بەروخسارێکی مۆن، بەبەرگێکی ئاوریشمی رەشی خەوتنو پرچی تۆپەڵەکراوی ناو تۆڕێکی سورەوە هاتەژورەکەو بەبێ پێشەکی کەوتە سەرزەنشتکردنی (تیۆ) سەبارەت بەو رەفتارانەی بەرامبەر بە (ئاشی کو) نواندبوی.

- بەسەرزەنشتکردنەوە وتی: خەریکە رەفتارەکانت لەسنور دەردەچێت، گۆڕاویت. پێشتر لەگەڵ من میهرەبان بویتو ئێستا بەردەوام رەخنە دەگریتو پلار دەهاویت... سەرت نایەشێتو پەڕۆی لێدەبەستیت. لەگەڵ ئەو کچۆڵەیەدا خەریکی رازو نیازی!

- مەبەستت چییە؟. سروشتییە. ئێمە هەردوکمان لاوین.

- دوبارە دەستتپێکردەوە!. هەر لەسەرەتای چونمان بۆ (ئەندەنوسیا)وە هەمیشە دەتەوێت واپیشانی بدەیت ژنێکی بەتەمەنم... (تیۆ) لەلایەکی دیکەشەوە (ئاشی کو) دووساڵ لەتۆ گەورەترەو تارادەیەك باڵق بووەو تۆ هێشتا باڵق نەبویت.

(تیۆ) بەهێمنی وتی: ئێمە هاوبیرینو تەنها هاوەڵی یەکدین.

- پورە (مارتا) زمانی گۆڕیو گوتی: هەرچۆنێك بێت دەمەوێت بڵێم وریای بە.

- چی؟ مەگەر ئەویش نەخۆشە؟.

- پژمەیەکی کردو گوتی: نەخێر، بەڵام... نابێت لەوبارەیەوە لەگەڵ تۆ بدوێم، بەڵام باشە، ئەگەر سوێند بخۆیت نهێنی پارێز بیت ئاشکرای دەکەم. پورە (مارتا) درێژەیپێدا: روداوەکەی (ئاشی کو) وێنەیەکە لەروداوی ژاپۆن. نەنكو باپیری (ئاشی کو) لەپاڵ چیایەکدا دەژیان

لەزیانی بۆمبی ئەتۆمی دووەم بەدوربون، کە بە(ناکازاکی)دا کێشرا. ئەو بۆمبە بووە هۆی کوشتنی سیو نۆ هەزار کەس لەو شارە.

پورە (مارتا) رایگەیاند، کە لەیادی سالانەی (هێرۆشیما)دا چاوی بەو دووانە کەوتوە، چونکە خۆی بەهاوبەشی ئەو کارەساتە زانیوەو دۆستایەتی لەگەڵ خێزانی (ئاکارا) گرێداوە، کەتاکە کورێکیان هەبوو بەناوی (هیرۆ)و زۆریان خۆشویستووە. (هیرۆ) لەتەمەنی بیست سالێدا! وەك زۆر لەهاوتەمەنە ژاپۆنییەکانی بۆ خوێندن بۆ ئەمریکا رۆشتوەو لەوێ عاشقی کچێکی فەرەنسی بووەو خواستویەتیو (ئاشی کو)یان بووە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: کەواتە نیوە فەرەنسییە؟ هەستم پێنەکرد.

- پورە (مارتا) وتی: گوێڕادێرە بۆ پاشماوەی روداوەکە: لەگەڵ ئەوەشی منالیان ببوو ئەنجامی هاوسەرگیریەکەیان هەڵوەشانەوەبوو. ژنەی فەرەنسی دەیویست کاربکاتو کابرای ژاپۆنی ملی نەدەدا. پاش جیابونەوەی ئەو دوانە (هیرۆ) لەگەڵ (ئاشی کو)ی بچوك گەڕایەوە ولاتی خۆیو ئیدی دایكو باوکی بەپێی خونەریتی کۆن ژنیان بۆهەڵبژارد، بەبێ ئەوەی پرسوڕا بەخۆی بکەن. ژنی دووەمی (هیرو) وەك کچی خۆی (ئاشی کو)ی گەورە کرد. (ئاشی کو) ببوە کچێکی ژاپۆنی راستەقینەو لەگەڵ کچە ژاپۆنیەکانی دیکە زۆر جیاوازبوو، کە پرچیان سوردەکردو باکیان نەبوو بەهۆی (تەلەفون کلاب)ی (تۆکیۆ)وە بەلەشفرۆشی پارەیان پەیدادەکرد. بەپێچەوانەوە (ئاشی کو) زۆر وەفاداری دابونەریتی ژاپۆنی بوو، لەهەموی سەیرتر دەربارەی دایکی راستەقینەی خۆی هیچی نەدەزانیو هیچ ئاگایەکی لەرازی هەڵبژاردنی زمانی فەرەنسی بۆ خوێندن نەبوو.

پورە (مارتا) پاش ئەو رونکردنەوەیە باسی لەوەکرد، کە نیگەرانە چونکە لەم گەشتەدا هەستی بەگۆڕانی رەفتاری (ئاشی کو) کردەوەو گوتی: بەڵێ، سەیرە. زۆر گۆڕاوە. هەرگیز نەمدیوە رەخنە لەدابونەریتەکانی (ژاپۆن) بگرێت. پێشتر کچێکی گوێڕایەڵو نەریتی بوو.

- (تیۆ) بەسەغڵەتییەوە وتی: لەوانەیە گوناهی من بوو بێت. هەر وەك وتت لەمەودوا وریای خۆم دەبم، هیوادارم گلەییت لێم نەبێت.

دوای ئەوە پورو برازا ئاشتبوونەوە.

## شانۆگەرییەکی سەیر

رۆژی دواتر (تیۆ) خواردنی بەیانی بۆ پوری بردە سەرجێگاکەی‌و دەرمانە (تبت)ییەکانی بەبێ یارمەتی پوری بەکارهێناو تەنانەت پێلاو و پۆشاکەکانیشی بۆ بردە سەرجێگاکەی.

- پورە (مارتا) وتی: زۆر خۆت سەغڵەت مەکە، لەجیاتی ئەوانە واباشە خۆت بۆ بیاسەکردنی ئەمڕۆ ئامادە بکەیت.

ئەمڕۆ چیدەکەین؟ سەردانی پەرستگا دەکەین؟

- لەلایەکەوە بەڵێ. بۆ شانۆگەری دەچین..

ئەو شانۆگەرییەی پورە (مارتا)و (تیۆ) دەچون بۆ بینینی ژاپۆنی بوو. کۆنترین شانۆگەری ژاپۆنی، کە پێاندەوت (شانۆی نوێ). پورە (مارتا) بۆ (تیۆ)ی روونکردەوە، کە لەم شانۆیەدا داستان‌و چیرۆکی خێوەکان دەگێڕینەوە. پورە (مارتا) یەکەمجار کەئەم شانۆگەرییەی بینیبوو زۆر بێهەواس‌و تەمەڵ ببوو، لەکۆتایشدا بەخەواڵوەوە خۆی رادەستی ژینگە شاعیرانەکەی شانۆ سەیرەکەدابوو. سەیرکە لەویدابوو رۆژی دواتریش بۆ هەمان شانۆگەری چوو بوو؛ رۆژێکی تەواوی بەبینینی ئەو شانۆ تەنزئامێزو گاڵتەبازی ژاپۆنییەکان بەسەربردبوو، کەناسراوە بە(کیۆگۆن - Kyogon). بەدرێژایی ئەو شانۆیە ژاپۆنییەکان هێندە دەخەننەوە ئاو لەچاویان دەردەپەڕێت، بەڵام ئەمجارە پورە (مارتا) نەیدەزانی (تیۆ) چ کاردانەوەیەك بەرامبەر بەشانۆگەری ژاپۆنییەکان پیشاندەدات.

پورە (مارتا) بۆئەوە (ئاشی کو)ی بانگهێشت کردبوو تا پێشئەوەی بچنە شانۆگەرییەکەوە زانیاری پێشەکی بە (تیۆ) بدات. هەرسێکیان بۆ یەکێك لەهۆڵەکانی هۆتێلەکە رۆشتن. پورە (مارتا) داوای پێشکەشکردو (تیۆ)ش لەکاتی فرکردنی کوپە (چا) سەوزە بەتامەکەیدا یەك پەنجەی بۆ ئاسمان بەرزکردبۆوە.

- پورە (مارتا) وتی: ئەو رەفتاری چییە؟ وامزانی دەبێت بەرێورەسمی تایبەتییەوە (چا) بخۆمەوە.

- هیچ وانییە. پەنجەت لابدەو گوێرادێرە بزانە (ئاشی کو) چیدەڵێت.

- (ئاشی کو) وتی: سەرەتا دیکۆری (شانۆگەری نوێ ) زۆر سادەیەو هەمیشە یەك شێوەیە: لەقولاییدا درەختێکی کاج، پردێك، چەند لقێك قامیش و لەپاڵ شانۆکەشدا چەند کۆرپەیەك بەبەرگی ردش و خاکییەوە. هەموو شانۆگەرییەکە لەدار دروستکراوەو بەگشتی یادەوەرییە بۆ پەرستگای (شینتۆ)، کە ئەو پەرستگایانەش لەدار دروستدەکران.

- (تیۆ) پرسی: ئەم بابەتە گرنگی هەیە؟

- بەڵێ، چونکە هەموو بیست ساڵ جارێك پەرستگاکان دەرمێنن و سەرلەنوێ دروستیدەکەنەوە... ئێمە لەرێگای تازەکردنەوەی پەرستگاکانی خواکانەوە بەرز دەیاننرخێنین. لەو نوێژەنکردنەوەیەدا پەیرەوی لەسروشت دەکەین، چونکە لەسروشتدا هیچ شتێك بەکۆنی نامێنێتەوەو لەهەر وەرزێك و خولێکدا هەموو شت دەگۆڕێت.

- کەواتە لەژاپۆن تەلارو خانوی کۆن نابینرێت؟

- چۆن؟ پەرستگاکانی بوذا، کۆشکەکان، خانوی نەجیبزادەکان... بەلام میحرابی کۆنی (شینتۆ) بونی نییە. وەك وتم دیکۆری شانۆگەری (نوێ) بەناو پەرستگاکە دەچوێت، بەبێ گۆڕانی شێوەکەی، بەلام هەمیشە نوێژەنە. دەبێت بەپێی رێسا شانۆگەرییەکە بەکراوەیی پێشکەش بکرێت و لەپاڵ روبارێك یان رێگایەکدا یان بەلایەنی کەمەوە نزیك لەسەرچاوەیەکی ئاو بێت، چونکە لەشانۆگەرییەکەدا پەڕینەوە لەئاو هەیە. ئەکتەرەکانی بۆ سێ دەستە دابەش دەبن: دەستەیەك بۆ گێڕانەوە، دەستەیەك بۆ راقەکردن و دەستەکەی دیکە بۆ جێبەجێکردن. گێڕەرەوە چیرۆکەکە باسدەکات و گروپی هاوەلان (کۆرس) هاوکاری دەکەن، وەك تراژیدیاکانی یۆنانی، بەلام پاڵەوانی راستەقینەی روداو، واتە ئەو کەسەی دوچاری ئێش و ئازار دەبێت، ماسکێکی دارینەی لەدەموچاو گرتوە، کە لەئاستی دەم ولوتیدا هیچ کونێکی تێدا نییە.

- (تیۆ) هاواریکرد: کەواتە ئەگەر لەئاستی دەمیدا هیچ بۆشاییەك نەبێت چۆن دەقی شانۆگەرییەکە دەخوێنێتەوە؟

- (ئاشی کو) وتی: هەمیشە نوێنەری چارەڕەشییە. لەبەر ئەودشە ئەو ماسکە هەمیشە دەنگی خەفەدەکات تاباشتر بتوانێت رەنج و ئێش و ئازار بەرجەستە بکات. دەنگی ئەکتەرانی (شانۆگەری نوێ) دەنگدانەوەیەکی سەیری هەیە: هەناسە لەناو سینەوە دەردەپەڕێت و بەهاوارێکی تۆقێنەر دەچوێت. کەسایەتی سەرەکی شانۆگەرییەکە بەزمانی مرۆڤ نادوێت...

(تیۆ) پرسی: ئایا ئەو کەسە بونێکی خوداییە؟

- نەخێر. پاڵەوانی سەرەکی پیاوێك یان ژنێکە، بەڵام بونەوەرێکە هێندە دەردو ئازاری چەشتوە دەنگێکی هێندە بەئازاری هەیە، کەوادەردەکەوێت لەجیهانێکی دیکەوە بەرگوێمان بکەوێت. پاڵەوانی (شانۆگەری نوێ) بونەوەرێکی تارادەیەك پیرۆزە، ورێنە دەکات، دەلورێنێت، دەناڵێنێت، دەگری.... ئاها! شتێکی گرنگت پێڕادەگەیەنم، بۆ گریان بەسەر دەستەکانی چاوی دەسڕێت و تەواو. هەندێکجاریش وەك رۆژانی رابردوو دەکەوێتە سەماکردن، وەك ئەوەی ژاپۆنییەکان لەبەردەم خواکانی (شینتۆ)دا دەیانکرد.

- (تیۆ) وتی: پاشان چیدەبێت؟

(ئاشی کو) پێکەنی و گوتی: ئیدی هیچ. گێڕەرەوەو گروپی هاوەڵی لەکۆرسەکە بەشداری گریانی قارەمانەکە دەکەن، لەدوایەوە سەما دەکەن و بەخەم و پەژارەوە بەرەو تاریکی شانۆکە دەڕۆن و تەواو.

- شتێکی سەرسوڕهێنەر نییە، باشە ئەمڕۆ چ شانۆگەرییەك دەبینین.

- روداوی شانۆگەری ئەمشەو سەرگوریشتەی ژنێکی چارەڕەشی شێتە، کەخەڵکی وەك جانەورێکی سەیرو سەمەرە لێیدەڕوانن. گێڕەرەوەکە پیاوێکە خەڵك لەروبار دەپەڕێنێتەوە. چونکە بەرگوێی دەکەوێت، کە ژنێك لەکەنارەکە سەرگەردانە ئامادە دەبێت بیپەڕێنێتەوە. کاتێك ژنە لەناو بەلەمەکەدا رۆدەنیشێت باس لەوە دەکات وێڵی دوای کوڕەکەیەتی و چەتەکان دزیویانە. لەپڕ گێڕەرەوەکە بەیادیدا دێتەوە، کەپێشتر مناڵێکی وێڵی لەکەنار روبارەکە بینیوەو کوڕەی هەژار لەتاو شەکەتی و برسێتی لەباری مەرگدابوەو داوای لەخەڵك کردووە کاتێك مرد تەپۆلکەیەك لەسەر گۆڕەکەی دروست بکەن و درەختێکی (بی) لەسەربڕوێنن. ژنەی دێوانە، کە ئەو روداوە دەبیستێت دەستدەکاتە گریان و دەڵێت ئەو مناڵە هەمان کوڕە بزرەکەیەتی. گوێزەرەوەکە گردەکە پیشانی ژنەکە دەدات. ژنە بانگی کوڕەکەی دەکات و ئەویش دەردەکەوێت. دەست بۆیەکدی درێژ دەکەن، بەڵام کوڕەکە بەرەو گردەکەی دەگەڕێتەوەو ژنەش دەکەوێتە سەرچۆك و بەتەنیا دەمێنێتەوە.

- (تیۆ) وتی: چیرۆکێکی دڵخۆشکەر نییە.

- پورە (مارتا) دەمودەست وتی: (تیۆ)ی من... ئەگەر وەڕس دەبیت چاوپۆشی لەشانۆگەرییەکە دەکەین!.

- پرسی: ئەو ئەکتەرەی رۆڵی دایك دەبینێت سەرنجڕاکێشە؟

- (ئاشی کو) وتی: تەنها ڕێگا بەپیاوان دەدرێت لەشانۆگەری (نوێ)دا ڕۆڵ بگێڕن، بەلام ئەو ئەکتەرەی لەرۆڵی دایکدا دەردەکەوێت هونەرمەندێکی کامڵە.

- (تیۆ) هاواریکرد: کەواتە پیاو رۆڵی ژن دەبینێت؟

- (ئاشی کو) وتی: هەرگیز ناتوانیت هەست بەجیاوازییەکەی بکەیت.

- پورە (مارتا) وتی: (ئاشی کو) توخمێکی (شانۆگەری نوێ)ت لەیادنەکرد؟

- (ئاشی کو) پەسەندیکرد: بەڵێ. (تیۆ).. کاتێك گوێت لەوشەی (نامرامیدا – بوتسور)بوو بزانە ئەوە نزایەکی (بودایيە)، کە ژاپۆنییەکان بەردەوام دەیخوێنن.

- (تیۆ) وتی: باشە، دواجار ئەم شانۆگەرییە بودایيە یان (شینتۆ)یی؟

- (ئاشی کو) بەمجۆرە کۆتایی بەقسەکانی هێنا: هەردوکیانە، هەر وەك چۆن هەمیشە لەژاپۆن بەهەمان شێوە بووە.

## منداڵ - خێو

لەشانۆکەدا دەرزیت هەڵدایە نەدەکەوتە سەر زەوی‌و بینەرەکانیش هەمویان نوسراوەیەکی بچوککراوەی ناوەرۆکی چیرۆکەکەیان بەدەستەوە بوو. بەسەر پەردەی پشتەوەی شانۆکەوە وێنەی دارێکی کاج بەجوانی کێشرابوو، کە پەلوپۆی بەسەر پردێکدا شۆڕکردبۆوە. بەبەرچاوی بینەرانەوە پەیژەیان هێناو پارچە کوتاڵێکی سەوزیان هەڵواسی‌و لق‌و پۆپی درەختیان پێوەکرد.

- (ئاشی کو) وتی: ئەوەش گردەکەیە، کە درەختی (بی) لەسەرە!

- (تیۆ) راڤەی کرد: سەیرە، بۆ دیکۆر هیچ کارێکی ئەوتۆ ناکەن!

تیپی مۆزیك هاتنەناوەوەو ئەندامەکانی پاش گەورەیی نواندن بۆ بینەران لەجێگای خۆیان رۆنیشتن. دەنگی زرمەی تەپڵێك بەرزبووەو دوایی دەنگی تیژی فلوتێك لەگەڵ ئاوازێکی قورسی دەنگدەرەوە.

- (تیۆ) چرپاندی بەگوێی (ئاشی کو)دا: ئەڵێی میاو میاو دەکەن!

بەڵام (ئاشی کو) پێنەکەنی، بەپێچەوانەوە زۆر بەراستیو بەهۆشەوە دەیڕوانیو گوێی بۆ مۆزیکی پێشەکی نمایشەکە راداشتبوو. شانۆی بەردەمی دارە کاجەکە تاماوەیەك چۆڵبوو. سەرئەنجام پیاوی تایبەت بەپەڕاندنەوەو پاشان دایك هاتنە سەر شانۆ، کە دایکەکە کلاوێکی پانی لەسەرو و دارێکی (بامبۆ)ی بەدەستەوە بوو.

(ئاشی کو) بەسرپە وتی: داری (بامبۆ) نیشانەی شێتییە، ئێستا سەیرکە.

ماسك یان روپۆشی دایکی پاڵەوانی سەرەکی شانۆکە هێلکەیی بوو؛ لە سپێتیدا دەدرەوشایەوە، کە دەمێکی سورو دوو بڕۆی ناسکی لەسەر کێشرابوو. ئەکتەرەکە باڵایەکی بەرز، جەستەیەکی بەهێزو باسکی ئەستوری هەبوو. چۆن دەکرا ئەو جەستەیە بەهی ژن وێنابکرێت؟.

(تیۆ) بەسەغڵەتییەوە کەوتە جوڵەکردن لەسەر کورسییەکەی.

ئەکتەرەکە بەهێواشی لەسەر سەرپاژنەی سوڕایەوە، رویکردە هۆڵەکەو دەستی بەقسەکرد. دەنگی، کە لەقوڵایی سنگییەوە دەردەپەڕی، گیانی (تیۆ)ی هێنایەلەرزە. ژنە شێتە چارەڕەشەکە تاڕادەی مەرگ ئازاری دەچەشت. هیچ ئەشکێك، هیچ گریەو نالەیەکی دڵبزوێن لەجیهاندا نەیدەتوانی بەئەندازەی ئەو هاوارە نامرۆڤییەو هاتوهاوارە خەمئەنگێزو لەهەمان کاتدا پڕسۆزە بێت.

ئەسرین زایە چاوی (تیۆ). بەبێئەوەی لەهیچ تێبگا گوێی بۆ ناڵە بەجۆشەکە رادەگرت، بەنارامی چاودێری جوڵەکانی دەکردو نغرۆی شانۆگەرییەکە بوو، پاش کەمێك چووە باری خەڵوەتئاساوەو دەنگی میاو میاوەکە نزیکتر دەبووەوە.

تەپڵەکان توندتر دەکوترا، دایکەکە زەنگێکی بەدەستەوە گرت، کە دەنگی تادوا پنت دەزرنگایەوە. لەپڕ مناڵە مردووەکە بەقژێکی ئاڵۆزکاو و بەخوێندنەوەی کتێبەوە هاتەسەرشانۆ (Namu Amida – Butsu، Namu Amida – Butsu،Namu Amida – Butsu).

- چاوەکانی (تیۆ) ئەبڵەقی روناکییەکە ببون. مناڵە مردووەکە لەگەڵیدا دوا. (مناڵی – خێو). بەودەنگەی لەو دنیاوە هەڵدەستا گۆرانی دەوت: (براکەم من لەگەڵ تۆدا لەدایکبومو لەناو ژیانی تۆدا دەژیم... ئەمە بەدایکم بڵێ!) (Namu Amida – Butsu....).

(تیۆ) لەترسدا بەدەستی روخساری خۆی داپۆشیو لەنێو پەنجەکانییەوە لەشانۆکەی دەنواڕی. پەیکەری سپیپۆشی مناڵەکە وەك جادو و سیحر لەناو گردۆڵکەکەدا بزربوو، دایکی بەگریان، کەبەسەر دەستەکانی چاوانی دەسڕی، لەسەر شانۆ چووە دەرەوە.

- پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: تیۆ.. هەستە. شانۆگەرییەکە تەواو بوو.
- (ئاشی کو) وتی: وامدەزانی ناخەوێت، رەنگی زۆر تێکچووە.
- پورە (مارتا) بەسەراسیمەبونەوە وتی: (تیۆ) .... وەڵامبدەرەوە! تەندروستیت باشە؟
- (تیۆ) ناڵەیەکی کرد: نەخێر واهەست دەکەم تەواو وڕبم...
- پورە (مارتا) بە (ئاشی کو)ی وت: زووکە، بڕۆ بەدوای پزیشکی ئێشکگردا. کوڕم... درێژبە. ئایا دوبارە بێهۆش بویت؟
- (تیۆ) دوبارە بەناڵەناڵەوە وتی: ئم م م ... سەرم گێژدەخوات ... (ئاشی کو) لەکوێیە؟ سەرت دەسوڕێت. نەخێر، دەبێت بیرێکی لێبکەمەوە. ئاهـ... ئەوە پزیشك هات.

پزیشکەکە (تیۆ)ی لەسەر راخەرێك پاڵخست، لێدانی دڵی گرت، بەئامێری (ئەلکترۆ کاردیۆگرام) کەوتە پشکنینی پێستو دەوروبەری سکی، بەدڵنیاییەوە هەستاو دەنکێك شەکری لەگیرفانی دەرهێناو لەزاری (تیۆ)ی رۆکرد.

- (ئاشی کو) بە پورە (مارتا)ی وت: مایەی نیگەرانی نییە، شەکرەکەی دابەزیوە.
- پورە (مارتا) بەسەرسوڕمانەوە وتی: هیچی دیکەی نییە؟
- (ئاشی کو) وتی: خاتوو (ماك لاری) هیچی دیکەی نییە... سوێند دەخۆم.
- بەڵام تۆ پێشتر ئاگادارت کردبوو؟
- (ئاشی کو) وەڵامیدایەوە: هەموو چیرۆکەکەم بۆ گێڕابۆوە، بەڵام ئەوە پەیوەندی بەنەخۆشییەکەیەوە نییەو تەنها شەکرەکەی دابەزیوە.
- پورە (مارتا) بەدەنگێکی بەرز وتی: کوڕەکەم... گوێت لێمە؟
- (تیۆ)، کە کلۆ شەکرەکەی دادەکرماند، چەند وشەیەکی درکاند.

پورە (مارتـا) هیـچی لێحاڵی نـەبوو، وتـی: نابێـت بـەدەمی پـڕەوە قسە بکـەیت! خێراکە شەکرەکە قوت بدەو دوبارەی بکەرەوە!.

- (تیۆ) وتی: جمکەکەی خۆم بینییەوە. ئەو منالەی سەر شانۆکە خۆیبوو. لەگەڵمـدا قسەی دەکرد.

(ئاشی کو) بەسەرسامبونێکی نائاسیاییەوە سەیری پورە (مارتـا)ی کـرد. بـینی خـاتوو (مـاك لاری) هیچ تورڕەیی پێوەدیارنییە.

- بەچێچەوانەوە لەکاتێکدا برازاکەی لەئامێز گرتبوو، بەئارامی وتـی: تـۆ تـا ئێـستا هـەرگیز نەتبینیوە، وانییە؟

- (تیۆ) بەگوێیدا چرپاندی: نەخێر... قژەکانی وەك منە! خۆشحاڵم..

- پـورە (مارتـا) وتـی: راسـت دەکـەیت. هـەروا درێژبـە. پزیـشك چـاودێریت دەکـات. پـورە (مارتا)لەسەر نوکی پێ دەرکەوتەوە.

- (ئاشی کو) پورە (مارتا)ی کێشکردە پەنایەکەوەو گوتی: خـاتوو (مـاك لاری). منـاڵ لەسـەر شانۆ نەبوو. لەم شانۆگەرییە نوێیەدا دەستوور وایـە تـەنها دایـك دەتوانێـت ببینێـت، بینـەران نایبنن‌و تەنها دەنگی دەبیستن.

- پورە (مارتا) قسەکەی پێبڕی‌و گوتی: خۆم دەزانم.

- تۆ بینینت؟

- دیارە نەخێر، خۆ من شێت نیم.

- باشە، ئەی کەواتە چۆن (تیۆ) دەبێت منالێکی لەسەر شانۆکە بینیبێت؟

- پـورە (مارتـا) هەناسـەیەکی قـوڵی هەڵکێـشاو گـوتی: ئـەو منـاڵی نـەبینیوە، بـەڵکو جمکە مردووەکەی خۆی بینیوە. (تیۆ) لەژیاندا خێوێکی لەگەڵدایە.. تێگەیشتیت؟

- (ئاشی کو) بەنیگەرانییەوە وتی: وڕێنەیە؟

- پورە (مارتا) پێداگری نەکرد: لەوانەیە. بەڵام دڵنیانیم.

- خاتوو (ماك لاری) ئایا تۆ بڕوات بەبونی خێو هەیە؟

- پورە (مارتا)، کە چاوی بڕیبـووە چاوی کچەی ژاپۆنی وتـی: ئـەی چۆن؟ تـۆ بـڕوات پێـی نییە؟

## هونەری گوڵ

(تیۆ) پاش داکرماندنی شەکرەکە لەجێگا راستبوەوە هەمیشەش پاش وڕبونو لەهۆشخۆچون چاك دەبوەوە. پورە (مارتا) لەوبارەی تێیگەیشتبوو، کە (تیۆ) هەرچی زیاتر بەرەو ژیانی ناوەوە بڕوات پاشان هەست بەبرسێتی دەکات. بۆ چێشتخانەیەك رۆشتنو سوپێکی بەتامیان خوارد.

- (ئاشی کو) رونیکردەوە: (نوێ) هونەرێکی سەختە. بۆ ئەوەی دەنگ لەناخەوە دەربێت پێویستی بەمەشقی دورودرێژ هەیە. لەسەر شانۆ دەبێت ئەکتەر دەنگی ئاسایی خۆی لەیاد بکات.

- پورە (مارتا) وتی: لەئۆپێراشدا بەوجۆرەیە. ئەو جۆرە قوڕگە بەهەموو کەس نادرێت.

- لێرەدا تەنها پرسی ئامادەیی نییە، بەڵکو پرسی رامان وخەڵوەتیش لە ئارادایە. جاری وا هەیە هونەرمەند سێساڵ تەرخان دەکات تابەقۆناغی هونەری گوڵ بگات.

- (تیۆ) وتی: دوبارە گوڵ.

- (ئاشی کو) وتی: دەکرێت بەئاسانی هەست بەپەیوەندی نێوان (گوڵ)و (شانۆی نوێ) بکرێت. لەسەدەی پانزەدا کاتێك ئەم شانۆگەرییە سەیرە پەیدابوو ماوەیەکی بەسەر ئاوێتەبونی (بودایزم)و (شینتۆیزم)دا تێپەڕیبوو. (شینتۆ) لەجوڵەی جەستەی ناسراو بە(Kyogen)دا بەکاردەهێنرا، کە ئەم جموجوڵە لە(Kagura)وە نزیك بوو. ئەمەش هەمان سەمای هەرزەییە کە پەیوەستە بەخواکانەوەو نمونەکەش (خوای ئۆزۆم)ـە بۆ هێنانەدەری (ئۆماتراسۆ)ی خواوەند لەئەشکەوتەکەی. بەڵام (زیامی گەورە)ی مامۆستای شانۆگەری (نوێ) بێگومان بۆ شیکردنەوەو وەسفکردنی سروشتی هونەرەکەی سودی لە (زەن) وەرگرتبوو.

- (تیۆ) پێداگری کرد: ئەوەی دەیڵێیت زۆ جوانە، ئەی گوڵ چییە؟

- (ئاشی کو) درێژەیپێدا: (زیامی) لەو بڕوایەدابوو، کە هونەری (نوێ) دەبێت لەسەر ستایڵو ناسکی گوڵ زوو تێپەڕبێت. جوڵەکانی دەست، یاری روناکی لەسەر ماسکی دارینە، جوڵەی مل و هێواشی هەنگاو هەموو ئەوانە دەبێت هەستی گوڵێك لەلای بینەر بەرجەستە بکات، کە لەباری شکۆفەدایەو بەرەو پەژموردەیی هەنگاو دەنێت. بەمپێیە هونەرمەندی (نوێ) لەساتێکدا دەگاتە ترۆپکی هونەر کە لەجۆشو خراپەی لاوێتی دوربێت، بەڵام هێشتا پیری پشتی شەقار نەکردووە. ئەم ساتی کامڵبونە هەمان ساتی وێڵیو بەتاڵییەو کاتی (هیچ نەوتنە):

بۆ هونەرمەندی کامڵ ئەو لوتکەیەی پاش ساڵانێکی درێژی مەشقی سەر شانۆ دەگاتە جێ هێندە بەسە لەبەردەم بینەراندا ئامادەیی هەبێت‌و دوور لەهەموو قسەو وتەیەك بێت. چەندە کەمتر وێڵی ئەزمونکردنی کاریگەری‌و خرۆشاندن بێت، کاریگەری‌و خرۆشاوی بینەر زیاتر دەبێت: چونکە گوڵ قسەناکات، دەپشکوێ‌و پەژموردە دەبێت. ئەمەیە کرۆك‌و بنەمای (شانۆی نوێ)یە.

- (تیۆ)، کە باوێشکیدەدا، وتی: دروست وەکو پورێ گیان، پێشئەوەی بگاتە خولی خۆی پیربووە.

- پورە (مارتا) هاواریکرد: تیۆ..! بەڵێنت دابوو ئەو گاڵتانە نەکەیت.

- (ئاشی کو) بەپەلە چووە ناو بابەتەکەوەو بەردەوام بوو: کە لە(شانۆی نوێ )دا پاڵەوانی سەرەکی هەمیشە باوەشێنێکی پێیە بۆ هاوسەنگکردنی سەما دەیکاتەوە. لێرەدایە وێناکردنی گوڵ واتایەکی شاعیرانە بەخۆوە دەگرێت. باوەشێنە گەورەو پانەکانی (نوێ ) لەریزی جوانترین باوەشێنەکانی ژاپۆنین. ماسکەکانیش زۆر جێگای سەرنجن‌و ئەگەر (تیۆ) دڵی پێوەبێت دەتوانێت یەکێك بکرێت...

- (تیۆ) بەخەواڵویی وتی: نازانم، ئەمە .... دەنگی... سەری خستە سەر مێزی چێشتخانەکە.

- پورە (مارتا) وتی: ئەمجارە بەراستی خەوی لێکەوتووە. خرۆشاوییەکی زیاد لەڕادەبوو.

- (ئاشی کو) وتی: بەهۆی خێوەکەیەوە؟. ئایا ئەو بابەتە هۆکاری سەرەکی نەخۆشییەکەیەتی؟

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: بێگومان... (تیۆ) بەهۆی رازێکی نەناسراوەوە ئازار دەچێژێت‌و ئەو جۆرە رازانەش خراپەکارن.

- (ئاشی کو) کە سورهەڵگەڕابوو گوتی: دەزانم.

- پورە (مارتا) بەبێئەوەی باش تێگەیشتبێت وتی: باشترە تەکسییەکمان بۆ بانگ بکەیت.... کچەکەم.

- (تیۆ) لەتەکسییەکەدا پرخەی دەهات. پورە (مارتا) بەبیرکردنەوەوە لەیەکەمین شکۆفەی درەختی گێلاسی دەنواڕی. درەختی گێلاس، کە لەسەرانسەری شاردا بڵاوبوو، هەمان شێوەی دەستکردی ئەو شوشە کۆکا کۆلایەی دەنواند (تیۆ) کڕیبوی.

## گفتوگۆی پورە (مارتا)و میلینا

(تیۆ) تادرەنگانی رۆژ هەرخەوت. پورە (مارتا)ش دەیویست پشوو بدات، بەلام بیرۆکەی جۆراوجۆر خەویان لەچاوی تاراندبوو. بابەتی جمکەکە مایەی نیگەرانی بوو. گەیشتبووە ئەو دەرئەنجامەی، کە دەبێت جارێك لەگەڵ (میلینا)دا گفتوگۆ بکات. تەلەفونەکەی بردە گەرماوەکەوەو بڕیاریدا ئەمجارە بەراستی کێشەکە لەگەڵ دایکی (تیۆ)دا باس بکات.

- پورە (مارتا) بە(میلینا) وت: گوێبگرە، بابەتێکی گرنگ هەیەو دەمەوێت لەگەڵتدا باسی بکەم. پێویستە زۆر بەوردی گوێڕادێریت بۆ ئەوشتەی دەیڵێم. (تیۆ) دوبارە دەربارەی جمکەکەی قسەدەکات. پێویست ناکات هاوار بکەیت. وامەزانە لەوبارەیەوە شتێکم بە (تیۆ) وتبێت!. ئەی چۆن دەزانێت؟. نەخێر، هیچ نازانێت!.

(میلینا) بەجۆرێك کەوتە گریان، کە پورە (مارتا) تەلەفونەکەی لەخۆی دوورخستەوەو بەپاڕانەوەوە وتی: ئازیزەکەم.. تکات لێدەکەم، سەرنج بدە. (تیۆ) لەهەندێك بارودۆخدا دەنگی جمکەکەی دەبیستێت، کە دەیەوێت قسەی لەگەڵدا بکات... بەڵێ، خودی ئەوە، ئەو ناوەی لێناوە. جمکەکەی لەژێرخاکەوە..... بەڵێ. منیش دوچاری سەرسامی هاتوم... لەچ دۆخێکدا؟ زۆر باشە، کاتێك ئارامی لەدەوروبەریدا سەقامگیرە یان دەنگی زەنگی ئاهەنگی مۆزیك بەرزبێتەوە. ناتوانم هیچ جۆرە شرۆڤەیەك بۆ بارە بکەم. بەلام ئەمرۆ رێك‌و راست ئەو جمکەی بینیوە!. بەڵێ، باش گوێت لێبوو بینیوێتی!. نەخێر لەجیهانی راستەقینەدا نا، بەڵکو لەسەر شانۆی شانۆگەرییەك. ئاخ.. روداوی دایکێك، کە وێڵی دوای کوڕەکەی بوو. بۆچی بۆ شانۆگەری چوین؟ چونکە شانۆگەرییەکی جوانی (نوێ) بوو. بۆچی رێگریم لێنەکرد؟ بەڵێ، خۆ (تیۆ) تەمەنی (دە) ساڵان نییە. تکا دەکەم (میلینا)....

پورە (مارتا) ناچاربوو لەتاو دادو هاواری (میلینا) تەلەفۆنەکەی لەخۆی دووربخاتەوەو سەرئەنجام بەتورەییەوە وتی:

- بێدەنگ دەبیت؟ هێشتا قسەکانم تەواو نەکردوە. بەتەواوی دیارە ئەوجمکە خۆشحاڵی دەکات. باشتر دەخەوێت. خەونی پێوە دەبینێت؟. نەخێر. هەست بەدەنگێکی دەرونی دەکات. دڵنیام لەو بارەیەوە قسەت لەگەڵدا دەکات و ویستم پێشتر ئاگادارت بکەمەوە. هەوڵبدە

نەگریت، ئەو کارە سەغڵەتی دەکات. تەواو لەبابەتەکە تێگەیشتیت؟ کە راستییەکەی لەلا بدرکێنیت؟ ئیدی من ئەوە نازانم... ئازیزم. لەو بارەیەوە قسە لەگەڵ (ژروم) بکە... هەرگیز منی تێدا نیم. ئەگەر بەتەنها خۆی هەستیپێکرد؟ ئەوکاتە جیاواز دەبێت... وەڵامم لێبگێڕەوە. منیش ماچت دەکەم.

پورە (مارتا) هەناسەیەکی بارسوکی هەڵکێشا. یەکەمجار بوو (میلینا) ئامادەبوو قسە راستەکانی ببیستێت.

- بەکەمێك چانس‌و قەدەرەوە دواجار رازەکەی دەدرکێنێت...
- (تیۆ)، کە نیوەی دەرگاکەی کردەوە، وتی: کێ؟ رازی چی؟
- ئەوە تۆیت؟ رابویت! من... لەگەڵ دایکی (ئاشی کو) قسەم دەکرد.
- بۆ دەیناسیت؟
- تارادەیەك.
- حەز دەکەیت (ئاشی کو) دایکی راستەقینەی بناسێت؟
- واباشترە. نهێنیە خێزانیەکان هەمیشە کارەساتاوین. ساڵانێکی درێژ بەشێوەیەکی شەرمهێنەر نهێنیەکان لەگەڵ خۆیاندا کێشدەکەن‌و کە تەقییەوە وەك گوللە تۆپ دەوروبەر وێران دەکات.
- (تیۆ) وتی: خۆشبەختانە لەخێزانی ئێمەدا هیچ نهێنییەك نییە!
- پورە (مارتا) خۆبەخۆ وتی: کوڕم... دڵنیایت؟
- (تیۆ) بەئازارەوە وتی: وادیارە... یان ئەوەی کە... نەخێر، دەبێت بەهەڵەدا چوبم!
- بیر لەچی دەکەیتەوە؟
- بیر لەجمکەکەم دەکەمەوە. لەخۆم دەپرسم ئەم بونەوەرە لەکوێوە دێت؟ دەبێت لەو بارەیەوە قسە لەگەڵ دایکم بکەم.
- پورە (مارتا) بەتوندوتۆڵییەوە وتی: پاشان لەو بارەیەوە بڕیار دەدەین. ئێستا خۆت بۆ شێوکردن ئامادە بکە. دەبێت زوو بنویت. سبەینێ بەشەمەندەفەر بۆ (کیوتو) دەچین.
- لەگەڵ (ئاشی کو)؟
- بێگومان، لەگەڵ ئەودا. (کیوتو) شاری ئەوە.

## کاهین‌و شەمەنەکان[1]

شەمەنەفەرە تیژڕەوەکەی بە (شی کان سن) ناسراوە هێندە خێرا دەڕۆشت پەنجەرەی خانووەکانی سەر ڕێگاکەی دەهێنایە لەرزە. چونکە چەند دڵۆپە بارانێکی ورد لەسەر ڕوی پەنجەرەی شەمەنەفەرەکە دەنیشت درەختەکانی پشت پەنجەرەکان لەبارێکی وێڵبوندا دەردەکەوتن. (ئاشی کو) گرنگی زۆری بارانی لەژیانی ژاپۆنییەکاندا بۆ (تیۆ) ڕوندەکردەوە، بەڵام ئەو گوێی نەدەگرت‌و ناوچاوانی بەشوشەکەوە چەپاندبوو؛ لەو شارۆچکانەی دەڕوانی کەبەدوای یەکدا لەبەردەم شەمەنەفەرەکەوە تێدەپەڕین.

- پرسی: کەی گێلاسەکان دەبینین؟
- بەوزوانە نا. دیارە لە (کیوتو) درەختی زۆر جوانی گێلاس هەن، بەڵام ئەم درەختانە بەزۆری لەکەنارەکانی دەریاچە بچوکەکانی دەوروبەری (ماکون).
- لە (کیوتو) چیدەبینین؟
- ئاشنای ڕێوڕەسمی (چا) دەبین.
- ئەم (چا)یە چ خاسییەتێکی تایبەتی هەیە؟
- پورە (مارتا) گفتوگۆکەی بڕی‌و گوتی: لەو هەموو پرسیارو چەندوچونە شەکەت نەبویت؟ چی ڕویداوە!
- (تیۆ) بە نحەم کردنێکەوە وتی: من چارەی بارانم ناوێت.
- پورە (مارتا) وتی: لەژاپۆن کەس نەیاری باران نییە، باران هەمیشە هەیە.

(ئاشی کو) وتی: درێژە ناکێشێت. لە (کیوتو) کەش هەمیشە خۆشە. دڵخۆش دەبیت، چونکە خاتوو (ماك لاری) لەیەکێك لە(هۆتێلە) گوندییەکانی (هاکون) بەناوی (ریو کان – Ryo-Kan) ژورێکی گرتووە.

- بەدیواری ڕازاوە بەکاغەزی تایبەت‌و (تاتامیەکان)[2]؟

---

١. کاهین: غەیبزان، پیاوی ڕۆحانی لەلای میسرییە کۆنەکان‌و جولەکەو نەسرانییەکان. شەمەنەکان: ڕاهیبی بودایی، هەڵبژاردەی نێو بودلییەکان.

٢. Tatamis: فەرشی تایبەت، کۆ بۆ کەشتییە بەناوبانگەکانی ژاپۆنیش بەکاردەهێنران.

- پورە (مارتا) وتی: تەشتی شێوە ئەستێلی گەورد، کە لەگەڵ هاوبەشەکانی تردا بەروتی مەلە دەکەن.

- (تیۆ) بەجۆرێك پەرێشانییەوە: ئاه، لەگەڵ (ئاشی کو)؟

- پورە (مارتا) وەلامیدایەوە: بنو بێتە خەونت!. لەگەرماوی هەلمدا بەڕوتی لەگەڵ پیاواندا!.

- (تیۆ) وتی: کارێکی بێ سەمەرە. بۆچی لێرە هەمیشە هەوڵدەدەن ژنانو پیاوان لەیەکدی جودابکەنەوە؟

- پورە (مارتا) وتی: لێرە پیاوەکان بڕیاردەدەن. دیارە ژنان لەدیدی ئەواندا بونەوەری مەترسیدارن. بۆ نمونە (کالی) بێنەوە یادت... وێنای ژن لای (بەنگاڵ)ییەکان: خوێن تکان، چەکدار لەتەپڵی سەرەوە تا نوکی پێ، لەگەڵ ئەوەشدا دەیپەرستن!

- (ئاشی کو) وتی: لێرەش هەلومەرج لەوە باشتر نییە. ژن دەبێتە سێبەرو لەپێناوی کوشتنی رێبوارانـدا لەسەر شەقامەکان وێڵ دەبێت یان رێوییەکەو شەقلی کچێکی جوان دەپۆشێت تا قورتمی هاوسەرەکانی هەڵهێنێتەوە... ئەگەر بیر لەم بنەماو سەرچاوەی ئەم رێبازە بکەینەوە بە (ژنە – راهیبەکان) دەگەین.

- (تیۆ) بەحەزەوە وتی: ئۆو، زۆر باشە. واتە (قەشەی ژن)؟

- (ئاشی کو) بەردەوامبوو: تەنها لەئاینی (شینتۆ)دا ژنان مافیان هەبوو قاڵبو شوێنگەی رۆحی خوداییان هەبێت. ئەم ژنانە پەڕەجوگەربونو لەرێگای بەدەستهێنانی خانەخوێکەوە لەباری زیندە خەوندا داخوازییەکانی ئاشکرا دەکرد.

- (تیۆ) وتی: بەدەستهێنانو زیندەخەون؟ کەواتە جادوگەربون؟

- پورە (مارتا) وتی: تۆ دیارە بەهۆی بینینی فیلمی (جنگیر)و بابەتی (خودان بون)ـەوە بەوجۆرە باس لە ساحیرو جادوگەر دەکەیت؟ وانییە؟

- بەڵێ، بەهۆی ئەو شلەمەنییە سەوزەوەی لەگەڵ دەنگی مردووەکانی ئەو ناودوە کە لەدەمەوە دەهاتە دەر، بەراستی سەرنجڕاکێشە!

- واباشترە ئەو شلەمەنییە رەنگ سەوزە لەیاد بکەینو ئاگات لەدەنگی مردوانی ناو گۆڕەکان بێت. هەموو ئایینە کۆنەکان ئاشنای رۆڵی غەیبزانی ژنان بون. ئەی تۆ لەشاری (دلف) نەبویت؟ لە یادتچوو لەوێ بۆ ئاینی کێ گەورەییان دەنواند؟

- (تیۆ) هاواریکرد: ئا، بەڵێ! ئاینی (پی تی)[1]، ژنێکی شێت لەسەر وەجاخێك!

- پورە (مارتا) وتی: شێت. لەهەمان بابەتی تۆبوو!. ماوەیەکی دورودرێژ باوەڕ وابوو (پی تی) بەهۆی دوکەڵی درەختی گێلاسەوە خۆی دەخاتە باری خەڵوەتەوە... ئەم بابەتە دروست نییە، بەڵام گومانی تێدا نییە (پی تی) بەناوی خواوە غەیبزانی دەکردو بەگرنگترین غەیبزانی سەردەمی کۆنی یۆنانی دادەنرا.

(تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئایا غەیبزانی دیکەش هەبون؟

- پورە (مارتا) وتی: لەئەفریقا ئێستاش لەوجۆرە غەیبزانانە هەیە. لەهندستان پێیان وتراوە (دایك)و لێرە لەژاپۆن ئاینی (شینتۆ) بەهۆی (شەمەنە) ژنەکانەوە باسکراوە.

- (ئاشی کو) وتی: (شەمەن)؟ من ئەو وشەیە ناناسم.

- (تیۆ) وتی: من دەزانم چییە. شەمەنەکان جادوگەری ئەمریکایین.

- پورە (مارتا) هاواریکرد: نەخێر، تیۆری (شەمەنیزم - Chamonism) بەهۆی خوێندنەوەی باری(یاکوتەکان - Yakoute)وە لەدایکبووە.

- (تیۆ)و (ئاشی کو) بەیەك دەنگ وتیان: کێ؟.

- پورە (مارتا) رونیکردەوە، کە (یاکوتەکان) گەلێکی دانیشتوانی (سیبریا)ی خۆرهەڵاتی بونو جادوگەرەکانیان بە (شەمەن)ـەکان ناودەبران و لەروی کۆمەڵایەتییەوە لەبارێکی تایبەتدابون. واتە لەناو گەلی (یاکوت)ـەکاندا ئەو خەڵکانە هەڵدەبژێران بۆ پەیوەندیکردن بە (شەمەنیزم)ـەوە کەلەڕوی جەستەییەوە خەوشداربون. بۆ نمونە خێل، شەل یاخود خاوەنی خوردوشتی خەڵکی خەیاڵپلاو، خەوناوی. رۆمەکان لەو بڕوایەدابون باری قەیراناوی و شۆك ئامێزیان لەلایەن خواوە دیت: تەنانەت ئەوە ئاشکرایە کە (سیزار)ی ئیمپراتۆری گەورەی (رۆم)یش بۆ سەقامگیرکردنی دەسەڵاتەکەی سودی لەو قەیرانە دەرونیانە وەرگرتووە...

(تیۆ) هاواریکرد: پراڤۆ! لەفیلمی (ئەلیزابیت تایلەر)دا پارچەدارێك لە نێودەمی رۆدەکەن تازمانی خۆی نەقرتێنێت.

---

[1]. Pythie: (بەیۆنانی – Puthia)/ لەئەفسانەی یۆنانیدا (پی تی) راهیبەی ئەبۆلۆنی خوای دەسەڵاتداری یۆنانییەو لەلای ئەوەوە ئەرکداری گواستنەوەی سروتی غەیبییە. (پی تی) لەو ئاستەدا لە پەرستگای دلق لەسەر سێ پایەیەکی بەرز بەسەر چاڵێکی زەوییەوە دانیشتووە، کەهەڵمی لێ بەرز دەبێتەوەو لەباری زیندەخەوندا وشەی سەیر دەدرکێنێت کە بەهۆی رەهبانەکانەوە وەك وەڵامی خواوەند بە پرسیارکەران دراوەتەوە. گرنگی غەیبزانییەکانی (پی تی) هێندە بووە، کە سەردارو ماکانی یۆنان بڕیارە گرنگەکانی خۆیان بەبێ راوێژکاری ئەو وەرنەگرتووە.

- پوره (مارتا) وتی: بەڵێ، بەڵام لەفیلمی (کیلۆباترا)دا هیچ رونکردنەوەیەك دەربارەی ئەو نەخۆشییە خودایيە نادرێت، کە لەئەوروپا بۆ چەندین سەدە بەجۆرێك لەترسی پیرۆزو بە (نەخۆشی ئاسمان) ناویانبردووە. کەسانی پەرکەمیان لێدەهات دەیانتوانی ببنە (شەمەن). بۆ ئەوکارە بارێکی لەهۆش خۆچون یان خەون ئاسایی بەسبوو. پاشئەوە (شەمەن)ی ئایندە، بۆئەوەی شایستەی پیادەکردنی چارەنوسی خۆی بێت جۆرێك شلەمەنی دەنۆشی، کە لەجۆرەها دانەوێڵە ئامادەکرابوو؛ ئیدی بەرەو گەشتی دەنارد. سەرەتا دەچووە دۆزەخەوەو لەوێدە هێزە غەیبییەکان پێستیان لەئێسقان دادەماڵی‌و یەك بەیەکی ئێسقانەکانیان دەگۆڕی. (شەمەن) لەگەشتە دورودرێژەکەی بەجومگەی ئێسکی ئاسن‌و توانایەکی نائاساییەوە دەگەڕایەوەو ئینجا بەکۆمەکی سەمایەکی تۆقێنەرەوە، کە بەهۆیەوە وێنای رۆحەکانی ژێر خاك دەردەکەوتن، دەیتوانی پێشبینی ئایندە بکات‌و نەخۆشەکان چاك بکاتەوە. بەوجۆرەی ناچاریان دەکرد تاتوخمی زیانەڕۆو زیانکار وك مادەیەك لەدەمەوە بهێنێتەوە. لەوەودوا ئیدی ئەو مادەیە نەیدەتوانی زیان بەجەستەی نەخۆشەکە بگەیەنێت.

- (تیۆ) وتی: نەخێر، ئایا بەوجۆرە دەبوو؟

- پوره (مارتا) وتی: نەخۆشەکان تەواو چاکدەبونەوە، چونکە بڕواو متمانەیەکی پۆڵاینیان بەوجۆرە چارەسەرکردنە هەبوو. (شەمەنیزم)ی (یاکوتەکان) بابەتێکی تایبەت‌و سنورداری نییە. نەتنۆلۆژییەکان بەپێی نەریتی ئەو ژن یان پیاوەی لەژێر کاریگەری مادەو توخمی نهێنیدا بۆ گەشتی درێژی (دۆزەخ) دەرۆشت بە (شەمەن) ناوی دەبەن. (پی تی)ش (شەمەن)بوو، کاهینەکانی (شینتۆ)ش (شەمەن)بون.

- (ئاشی کو) وتی: بەڵام تۆ وتت لەژاپۆندا تەنها ژنەکان (شەمەن)ن.

- پوره (مارتا) وتی: پیاو یان ژن گرنگ نییە، چونکە لەسەر خاکە نەناسراوەکان نەچاکە هەبوو نەخراپە، نەپیاو نەژن. (شەمەن) لەگەشتەکەیدا بەگۆڕاوی دەگەڕایەوە؛ بەچاوپۆشی لەرەگەزەکەی. لەپاش گەڕانەوەی ئیدی نەپیاو بوو نەژن. لەبەرئەوە بوو (شەمەن)ی پیاو دەیتوانی بەدەنگی ژن قسەبکات‌و بەپێچەوانەشەوە بەدەنگێکە زبری وەك خوای (ئاپۆلۆن)[1]

---

[1]. Apolloh: خوای روناکی یۆنانی (کە بەم واتایە بە فوبوس Pheobus ناوی دەبەن). کوڕی (زیۆس)ی خوای خواکان‌و (لتۆ)و برای (ئەرتمیس) (دیان)ـە. ئەپۆلۆن لەخوا گەورەکانی ئەفسانە نییەو چاکەی زۆری هەیە. خوای مۆزیك‌و شیعرو پارێزەرو پشتیوانی (موزە)ی نۆ دانەییە. ئەپۆلۆ، پشتگیرکار، شەفادەر، جەنگاوەرو شوان‌و خوای غەیبزانیشە، کە لەو وتەزایەدا (پی تی) نوێنەری ئەوە.

بدوێن. (شەمەنیزم)ـەکان پەیوەندیان بەجیهانی مرۆڤەوە نەمادەما. ئەوانە بەهۆی گەشتەکەیانەوە بۆ بونەوەری ناسروشتی گۆڕابونو ببونە نێوەند نێوان مرۆڤو خوا. دەسەڵاتیان لەئامادەکردنی رۆحدا لەهەمان سەرچاوەوە بوو، بەجۆرێك بەوهۆیەوە نەخۆشیان دوچاری سەمایەکی توندوتیژو پڕ جوڵە دەکرد تا ئامادە بێت بۆ گەشتێکی کورتی ژێر خاك.

- (تیۆ) وتی: بەراستی ئایا (شێخەی لۆکسۆر)یش لە هەمان ئەو (شەمەن)انەبوو؟

- پورە (مارتا) وتی: تێڕوانینی خودی خۆت لەوبارەیەوە چییە؟

- بیریکردەوەو گوتی: وابزانم بەڵێ وابوو. دوکەڵ لەهەموو جێگایەکدا هەبوو، سەما، جیهانی ژێر خاك، جمکەکەم... بەڵام ئەو بە(دەستگیران) بانگی دەکرم! کەواتە منیش (شەمەن) بوم؟

پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: بۆچی نا، بەهەرچییەکدا تێپەڕین تۆ سەرقاڵی گەشتی سەیرو سەمەرەیت، کوڕم...

- (ئاشی کو) وتی: ئەی من چی؟ ئایا جێبەجێکردنی سروتی ئاینی...

- پورە (مارتا) قسەکەی پێبڕیو گوتی: شش! ساتەکە وێڵ مەکە.

(تیۆ) چاوی بڕییە چاوی کچۆڵە شەنگەکەو ئەویش سورهەڵگەڕاو سەری داخست. هیچ شتێك بەئەندازەی سورهەڵگەڕانی گۆنای (ئاشی کو) جوان نەبوو، کاتێك بیرۆکە راستەقینەکانی خۆی دەشاردەوە.

## بەهەڵە لەیەکگەیشتن لەژێر درەختی گێلاس

هۆتێل (میکایۆ) لە (کیوتو) بەچیمەنی جوانو درەختانی بیو کاج دەوردرابوو. لەگۆشەیەکدا درەختێکی گەورە لقو پۆپە گەورەکانی بەرەو ئاسمان هەڵبڕیبوو.

- (تیۆ) بەخۆشییەوە وتی: هەرگیز درەختی هێندە جوانم نەبینیوە!

- گێلاسە...

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: درەختێك بەو گەورەییە گێلاسە، لەفەرەنسا زۆر بچوکترن!

- پورە (مارتا) وتی: من پێشتر باسمکردو تۆ نەتدەویست باوەڕ بەقسەکانم بکەیت. جوانیو هەیبەتی درەختە شکۆفەدارەکانی گێلاس لەژاپۆن...

(تیۆ) وتی: راستە. وێنەیەکی بۆ دایکم دەگرم. بەوجۆرە بۆ هەتاهەتایە وێنەیەکی ئەو درەختەی ئاخنییە ناو کامێراکەیەوە.

- (ئاشی کو) لەسەرخۆ وتی: تکادەکەم، باشتر بوو...

- باشە. ئەمجارە باشتر کامیراکە رادەگرمو دڵنیام وێنەیەکی جوان دەبێت، وێنەیەکت بۆ دەنێرمەوە.

- (ئاشی کو) بەدەنگێکی سرپە ئاساوە وتی: سوپاس. (تیۆ)... وێنەگرتن باشە، بەلاَم باشتر بوو لەجیاتی ئەوە لەو پەڕەی گولاَنە بنواڕی بەسەر لقو چلّەکانەوە دەفڕن...

- (تیۆ) بەگوێیکرد. سروەیەکی کەم سەرچلّەکانی دەلەرزانو پەڕەی گولّە سپییەکان بەئارامی بەئاسماندا دەفڕین.

- (تیۆ) بەبێئەوەی زۆر وردبێتەوە وتی: باشە، سەیرمکرد. مەبەستت چییە؟

- (ئاشی کو) لەسەرخۆ وتی: شکۆفەکانی گێلاس وەك رۆژەکانی ژیانی ئێمە دەفڕن، ساتێکی تێپەڕو سەرسوڕهێنەرە. ئایا هەست بەئامادەیی خواوەند ناکەیت؟. گولّ دەپشکوێن، تیشکی سپێتی خۆی بەسەر دەوروبەریدا پەخشدەکاتەوەو ئیدی پاش تافێك بزر دەبێت، پەڕ پەڕ دەبێت، دەمرێتو (با) لەگەلّ خۆیدا دەیبات، وەك رۆژەکانی ژیانی ئێمە.

- (تیۆ) بەسەراسیمەبونەوە لەهاوڕێ لاوەکەی روانی، کە چاوەکانی ئەبلّەق ببونو لەقولاَییەکی بێ کۆتادا وێلّبون. بەئارامییەوە ماچێکی گۆنای کردو گوتی: (ئاشی کو)... تۆ شکۆفەی گێلاسیت، بۆچی باس لەمردن دەکەیت؟ خەمئەنگێزە.

- (ئاشی کو) لەژێر لێوەوە وتی: دەبێت ئەم ساتە خۆشبێت. وێنەگرتن بەکامێرا تارادەیەك ناپاکییە. باشتر وایە خۆت لەگەلّ شکۆمەندیو گەورەیی گولّدا کێش بکەیت.

(تیۆ) بەتوڕەییەوە وتی: بەلاَم من دەمەوێت بەتۆ بلّێم کە تۆ خۆت گولّی.

- پورە (مارتا) بەشداری کردو گوتی: (تیۆ).. بەسە. (ئاشی کو) هەولّ دەدات شتێکی گرنگت پێبلّێت... لێرە جوانی لای ئەو شتێکە روو لەتێپەڕینەو هیچ شتێك هەتا هەتیی نییە.

(تیۆ) دەستی (ئاشی کو)ی بەرداو بەرك و توڕەییەوە وتی: زۆرباشە، تێگەیشتم. بەگشتی داوام لێدەکەن تێبگەم ئێمە پیرو بەتەمەن دەبین. (ئاشی کو) لەسەر روخساری تۆش، هەر وەك روخساری پورە (مارتا) چرچو لۆچ رۆدەنیشێتو منیش بەگۆچان دەڕۆم.

- پورە (مارتا) بەبینینی ئەسرینی ناو چاوەکانی (ئاشی کو) توڕەبوو گوتی: بەراستی بێئەدەبیت.. خستتە گریان.

- (تیۆ) بەسەر سورمانەوە وتی: من؟ (ئاشی کو) تۆ بەراستی دەگریت؟... باشە، پەلەمەکە، سەیرکە، ئەوەتا لەشکۆفەکانی گێلاس دەنوارم. لەراستیدا جگە لە پەرەگولەکانی لەگەڵ سرووەدا سەریان ناوە بەیەکەوە هیچی دیکە نابینم و بیر لەهیچ شوێنێك ناکەمەوە.

- (ئاشی کو)، کە فرمێسکەکانی دەسرِی، وتی: بەڵێ، شکۆفەکانی گێلاس لەلای ئێمە زۆر گرنگن.

- (تیۆ) لەژێر لێوەوە وتی: یەکجاری دیکە ورتە لەدەمم نابیستیت.

- پورە (مارتا) بەتوندی وتی: نەخێر، ناتوانیت.

- (ئاشی کو) دەمودەست وەڵامیدایەوە: بۆچی نا، دەتوانێت.

- (تیۆ) بەناسکییەوە وتی: دەبینیت، هیچ نەبێت دەمناسێت.

- پورە (مارتا) هەر بەهەمان توندییەوە وتی: هیچ وانییە، ئەو وەك کچێکی بەئەدەب و شایستەی ژاپۆنی رێز لەمیوانەکەی دەنێت. بەراستی دەبێت کەی ئامادەی رێورەسمەکە ببین؟

- (ئاشی کو) وتی: خاتوو (ئازاکی) دوای دوو سەعاتی دیکە چاوەنوارمان دەبێت.

- پورە (مارتا) وتی: تەنها دوو سەعات. دەبێت زوو جانتاکان بکەینەوە، ئینجا گەرماو، خۆ گۆرِین... پەلەبکەن.

## چوار حیکمەتەکەی (چا)

لەگەڵ ئەوەی خزمەتکاری هۆتێلەکە دەرگاکەی داخست، پورە (مارتا) دوشێکی کردو بەرگە (کیمونۆ) شینەکانی پۆشی و (تیۆ)ی ئاگادار کردەوە جوانترین جلوبەرگ بپۆشێت، کە پانتۆڵێکی رەش و کراسێکی شینی دەریایی لەجانتاکەی دەرهێنا.

- لەوەڵامی (تیۆ)دا، کە لەوجۆرە پۆشاکانە سەغڵەت بوو، وتی: تکادەکەم، مشتومرِ مەکە. بۆ ئاهەنگی (چا) خواردنەوە دەبێت پۆشاکی رێکوپێك بپۆشرێت.

- (تیۆ) لەبەرخۆیەوە وتی: بەمەیمونێکی زانا دەچوێم.

- پورە (مارتا)، کە رایدەموسی، وتی: بەڵێ، (هنومان)ێکی بچکۆلە. برِۆینە خوارەوە. (ئاشی کو) چاوەرِوانە.

(ئاشی کو)ش (کیمونە)ی پۆشیبوو، بەرەنگێکی ناسکترو جوانتر. پرچە رەشەکانی بەئەڵقەیەکی ئاوریشمی سوور بەستبوو، ئارایشتە سپیکارییەکەی روخساری سمبولێکی نهێنی ئامێزی خواوەندێکی جوانی پێبەخشیبوو.

- (تیۆ) لەبەرامبەریدا گەورەیی نواندو گوتی: خاتون، ئیدی بوێری ئەوە ناکەم دەستت راموسم.

- (ئاشی کو) بەناسکیو ویقارەوە گوتی: دەتوانیت لەو کارەدا دودڵ نەبیت، بەڵام سەرەتا دەبێت وانەی (چا) خواردنەوە فێرببیت.

ئەو وانەیەی دەبوو (تیۆ) فێری ببێت ئەوە بوو، کە سەرەتا بەتەواوی بێدەنگو جوڵە بێت. پاشان (ئاشی کو) هەرچییەکی کرد لاسایی بکاتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەژنۆکانیشی کەوتنە ئازار تاکۆتایی هەر بەوجۆرە دانیشێت.

- (تیۆ) پرسی: ئەم رێورەسمە چەند درێژە دەکێشێت؟

- (ئاشی کو) وتی: تەنها دوو سەعات.

- (تیۆ) سەراسیمەبوو: دوو سەعات بۆ چا خواردنەوە! بۆچی چیبووە؟

- (ئاشی کو) رونیکردەوە، کە رازی ئاهەنگی چا خواردنەوەکە لەوەدایە خانەخوێی (چا) یەکەم پێشوازی لەمیوانەکان دەکات، پاشان لەو کاتەی لەکتلیدا ئاو گەرم دەکات قۆرییەکە خاوێن دەکاتەوەو تۆوە چای تێدەکاتو دەمی پێدەکێشێت تا بۆ خواردنەوەی ئامادە دەبێت.

- (تیۆ) وتی: هەر هەمووی لە (دە) خولەکدا ئەنجام دەدەم.

- پورە (مارتا) وتی: بۆ نمونە، بۆ خاوێن کردنەوەی قۆرییەکە چەند کاتت پێدەوێت؟

- نازانم، لەوانەیە (دە) چرکە.

- خانەخوێی (چا) ئەو کارە بەبیست خولەك دەکات.

- لەوانەیە زۆر لەسەرخۆو بەهێمنی ئەوکارە بکات، وایە؟

- (ئاشی کو) رونیکردەوە، کە تارادەیەك بەوجۆرەیە. یەکەمین کەسی هونەری (چا) ئامادەکردنی رونکردەوە (سن ریکی یو)بوو. مامۆستایەکی مەزن بوو، کە لەسەدەی شانزەدا ژیاوە. وتویەتی: (بۆ سازکردنی چا دەبێت ئاوەکە گەرم بکرێت، (چا) کە ئامادە بکرێت، بەشایستەییەوە بخورێتەوە).

- (تیۆ) لەژێر لێوەوە وتی: زۆرباشە، کەواتە ئەو هەموو دورودرێژیو وردەکارییەی پێویست نەبوو.

- بەڵام،هەمان ئەوجۆرە ئامادەکردنەی (چا) بەبەهای ژیانی (ریکی یو) تەواو بوو. (ریکی یو) لەخزمەتی حاکمی شار (تایکو هیدە یۆشی)دابوو. حاکم رێزێکی شایستەی وەك مامۆستایەکی مەزنی چایچی لێدەنا. بەڵام روون نییە چیرویدا، کە خودان رکی لە (یوك یو)گرتو هێندە تورەبوو کە شمشێری لێهەڵکێشاوە، بەڵام لەدوا ساتدا بڕیاردەدات چایچی لێزان دوربخاتەوە. مامۆستا سەری دورخرانەوەی خۆی هەڵگرتو لەوێ فەرمانی پێدرا خۆ کوژی بکات، بەڵام دروست لەو ساتەدا حاکم رایدەگەیەنێت ئامادەیە خزمەتکارەکەی ببەخشێت. (ریکی یو)، کەورگی خۆی هەڵدەدرێت وتبوی: مەرگ باشترین دیارییە، کە خودانەکەی دەتوانێت پێشکەشی بکات.

- (تیۆ) وتی: خۆکوژی لەپێناوی کوپێك چادا؟ گێلایەتییە.

- (ئاشی کو) درێژەیپێدا، مامۆستایانی (چا) لێنان بەتەواوی لەپشکی خودانەکانی خۆیاندابونو ئەرکێکی سەختیان هەبوو، کە هەندێکجار دەبونە مایەی پیاهەڵدانو رێزی خودانەکانو هەندێکجاریش مایەی کینو رکو تورەییان. سەبارەت بەمامۆستا (ریکی تو) دەکرێت خۆکوژییەکەی بەدوو دیودا لێکبدرێتەوە: مامۆستا لەدوا وتەیدا یان پەیرەوی لەبڕیارەکانی شەرافەتمەندی جەنگاوەرانی ژاپۆنی کردوە یان - ئەمەیان کە زیاتر ئەگەری هەیە – کاری (سپوکو – هاراکیری) بەکۆتاو پنتی دواین ژیانێکی درێژی راگیر لەسەر رامان وخەڵوەت داناوەو تاکە ئامانجو مەبەستی هەستی خواوەندێکی شێوە (چا)یە، کە ژیانی خۆی لەپێناویدا فیداکردو رۆحی خۆی بەئارامی گەیاند. چونکە وەك ئەوەی (ئاشی کو) پێداگری دەکرد، ئاهەنگو سروتی (چا خواردنەوە) بەشێك بووە لەئاینێکی سەیر، کە هەندێك لەفەیلەسوفانی هاوچەرخی ژاپۆنی بەئاینی (تییزم - theiesme) یان (چاگەرایی) ناویان بردووە.

- (تیۆ) وتی: بەراستی لەهەموو شتێکی ئەم جیهانە ئاین دروست دەکەن.

- (ئاشی کو) سەری لەتێڕوانینەکانی (تیۆ) سوڕماو رونیکردەوە، کە خەڵکی رۆشنبیر نابێت سەبارەت بەهونەری (چا) دوچاری تێگەیشتنی هەڵە ببێت. راستە لەو نێوەندەدا تەنها کوڵاندنی ئاو و بەشایستەیی خواردنەوەی چا بەس بێت، بەڵام تەنها یەك خولی درێژی پەروەردەیی دەتوانێت لەم هونەرەدا کەسێك بەئاستی کامڵبون بگەیەنێت، چونکە سروتی (چا)

چوار حیکمەت لەتاك دەخوازێت: (هاو ئاهەنگی، رێز، خاوێنیو ئارامی). هەر یەك لەو چوار حیکمەتە لایەنێکی مادیو لایەنێکی نامادیان هەیە. (هاوئاهەنگی) پەیوەستە بەهونەری دروستکردنی ژینگەکە، کەشو باری پێویستی ناو هۆڵی چاخواردنەوەکە، هەروەها بەندوبۆنەی بانگهێشتکراوانو بەشدارانی ئاهەنگەکە. (رێز) نەك تەنها بۆ بانگهێشتکراوەکان، بەڵکو بۆ هەر پارچەیەکی ئاهەنگەکە لەقۆری، کەوچك، کەوچکی دارو شتەکانی لەو بابەتەن، کە دەبێت ئاگاداریان بکرێت. (خاوێنی) پەیوەستە بەلایەنی روکەشی شتومەكو کەلوپەلەکانی (چا)کەو لەوەش گرنگتر پەیوەندیشی هەیە بەخاوێنیو دڵ ساف و سادەییو بێڕتوشی رۆح. دواجار (ئارامی) دەرئەنجامو بەرهەمی سێ حیکمەتەکەی یەکەمە، کە لەم قۆناغەدا ئیدی خۆی فەراموش دەکاتو بەبەتاڵایی (بۆشی) دەگات.

- (تیۆ) وتی: ئەگەر باس باسی (بەتاڵی – بۆشی) بێت، کەواتە دەبێت سروتی (چا) پەیوەست بێت بە (زەن)ـەوە، بەڵام بۆچی دوو سسەعات دەخایەنێت؟

- (ئاشی کو) رونیکردەوە، دوو سەعات بۆ بانگهێشتکراوێك، دە ساڵ بۆ نزیکبونەوە لەرۆحو جەوهەری (چا)و تەمەنێك بۆ گەیشتن بە کامڵبون... چونکە پەیڕەوکردنی دروستی سروتی (چا) دەبووە هۆی دەرکەوتنی ئەو کەموکوڕیو خەوشەی لەتاکێکدا شاراوە بوو. قورسی کێشی جەستە، پەنجەی نەشارەزا، دەستی بێئەزمون، ئەو شتومەكو کەلوپەلانەی لەدەست بەردەبنەوە، قۆرییەك دەڕژێتو ...

- (تیۆ) وتی: وەك ئەوەی دوێنی کردم، بەراستی پرسی قۆری چییە؟ تەنها یەك قۆری هەیە؟

- بەڵێ، چونکە هەموو سروتەکە پشت بەهاوئاهەنگی دڵەکان دەبەستێت. قۆری دەست بەدەست دەسوڕێت تا (چا) لەنێوان هەمواندا دابەش ببێت.

- پورە (مارتا) وتی: کوڕم... بینیت، ئێستا لەبەردەم رازی گەورەی ئاینو مەزهەبەکانداین، کە بریتین لە(دابەشکرن). لەسروتی (میس) لەکڵێسا نانو شەراب دابەش دەکرێت. لەرۆژی (پاك – پسح) جولەکەکان بەرخو پوش دابەش دەکەن. موسڵمانان لە(رەمەزان)دا پاش رۆژویەکی دورودرێژو لەکاتی بەربانگدا خۆراك دابەش دەکەن. خواردنو خواردنەوە کارێکی پیرۆزە.

- (تیۆ) وتی: من دایکم (چا)ی بۆ دەهێنامە سەرجێگاکەم.

## بەشی نۆزدە

# (لەخەمی درەختی گێلاسدا)

### وانەکەی ئاسکی خاتون

کاتی ئەوە هاتبوو چاویان بە (ئاسکی) خاتون بکەوێت. شەوی (کیوتو) ساردبوو. (تیۆ) خۆی لەناو بەرگەکەیدا گرمۆڵە کردبوو، چاوەڕوانی خواردنی ئێوارەی دەکرد. (ئاشی کو) تەکسسیەکەی لەبەردەم راڕەوێکی تاریکدا راگرت، کە چرا کزەکان بەروناکییەکی لەرزۆك روناکیان دەکردەوە. رێگا بەرد رێژکراوەکە بەدەوری باخچەیەکدا دەسوڕایەوە، کە بەوردی گسك دراو و خاوێن بوو؛ تەنها چەند پەڕە گوڵێك نەبێت، کە لەگۆشەو کەناری چیمەنەکەدا بڵاوببونەوەو هەواڵی پشکوتنی گێلاسیان رادەگەیاند. لەبەردەم دەرگاکەدا (ئاشی کو) مانتۆکەی کردەوە. پورە (مارتا)و (تیۆ)ش وەکو ئەویان کرد. پاشان بەمەبەسینەیەکی، کە لەداری (بامبۆ) دروستکرابوو، دەموچاویان شوشتو بەپێی نەریت لەسەر راخەرێکی دارینە بۆ ساتێك رۆنیشتن‌و ئینجا (ئاشی کو) هەستاو لەپێشەوەیان بەرەو دەرگایەکی بچوك رۆشت. دەرگاکە هێندە بچوك بوو، کە ناچاربوو خۆی بچەمێنێتەوە. کاتێك (تیۆ) ویستی لەدەرگاکەوە ئاودیو بێت پورە (مارتا) ئاگاداری کرد وریای سەری بێت بەر دەرگاکە نەکەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی بایەخ پێنەدانەوە (تیۆ) نەیتوانی بێئەوەی سەری بەر چوارچێوەی دەرگاکە نەکەوێت تێپەڕێت.

- پورە (مارتا) وتی: وتم ئاگاداری خۆت بیت. ئەم دەرگایە ناوی (خاکیبونە).

روبەری چایخانەکە بچوك بوو، کە لەکۆتایی ژورەکەدا نامەیەك هەڵواسرابوو قوڵنگێکی پیشاندەدا بەدەنوکێکی درێژەوەو لەژێر سەرمێزێکی رەش گوڵە مەریەمێکی نیوە پشکوتو دەبینرا. (ئاشی کو) دەستی (تیۆ)ی گرت تا قۆرییەك ئاوی ساردو قوتویەکی چینی چای سەوزی پیشانبدات، لەسەر رەفەیەك.

- (تیۆ) پرسی: دەتوانم سەیرێکی ناو قوتوەکە بکەم؟

- (ئاشی کو) بەوریاییەوە سەری قوتوەکەی هەڵپچڕیو گوتی: خۆی نابێت کاری وابکرێت بەلاَم.

(چا)کە رەنگێکی سەوزی تێری هەبوو، وەك رەنگی سەر پەنجەرەکان. (تیۆ) پەنجەی دۆشاومژەی دەستی راستی بەناو قوتوەکەدا کردو بردی بۆ دەمی. تامێکی تاڵی هەبوو.

- (ئاشی کو) ئاگاداری کردەوە: (تیۆ) ئەزانی بەوکارەت بێڕەوشتییەکی گەورەت کرد؟ تەنها مامۆستا دەتوانێت دەستی بۆ ببات.

- (تیۆ) بەپێداگرتنەوە وتی: ئارەزومە خۆم ئەزمونی بکەم.

- شش... وەرە گوێ لەدەنگی کتلی بگرە. (ئاسکی) خاتون وردە زیخی پاککراوی تێکردووە تا لەکاتی کوڵاندندا دەنگی بێت، گوێت لێیە؟

- (تیۆ) بەتامەزرۆوە وتی: ئەی خۆی لەکوێیە؟

- (ئاشی کو) دەرگایەکی دیوار ئاسای پیشانداو گوتی: دڵنیابە لەپشتی ئەو دیوارەوە هەموو جموجوڵێکی تۆی بینیوە.

لەپڕ دیوارەکە کرایەوەو مامۆستای (چا) لەگەڵ ئەوەی دەستەکانی لەسەر ئەژنۆی داناود نوشتایەوەو گەورەیی نواندو هاتە ژورەوە. (ئاسکی) خاتون دەم بەخەندە بوو، چرچو لۆچ بەری چاوە میهرەبانەکانی گرتبوو. بەجموجوڵێکی رێکوپێك، کە کەمەری بۆ سەرەوەی راست گرتبوو، لەسەر ئەژنۆ رۆنیشت. میوانەکانی لاساییان کردەوەو لەبێدەنگییەکی تەواودا ئاهەنگی (چا) خواردنەوە دەستپێکرد.

(ئاسکی) خاتون سەرەتا خاولییەکی کردەوەو لەناوی ساردی رۆکرد، قۆرییەکەی شوشتو خاولییە تەڕەکەی تاکرد، قۆرییەکەی بەخاولییەکی دیکەی ئاوریشم وشك کردەوە. ئەو خاولییەشی تاکردو قۆرییەکەی بەمدیوو ئەودیودا سوڕاند تا خاوێنی قۆرییەکە بخاتە روو.

پاشان بەناسکییەکەوە کەوچکێکی دارینەی هەڵگرت، کە لەسەر شێوەی پەڕبوو، بەکەوچکەکە تۆوە (چا) سەوزەکەی لە قۆرییەکە کرد. بەبێ هیچ دەنگێك روپۆشی کتلییەکەی لاداو لەسەر مێزێکی لەدار دروستکراوی داناو ئاوی کوڵاوی بەکتلییەکە رۆکردە سەر تۆوە چایەکە. بەچیلکە دارێکی لەبامبۆ دروستکراو کەوتە شێواندنی (چا)و ئاوەکە تا توێژاڵێك کەف نیشتە سەر (چا)ی ناو قۆرییەکە. ئێستا (چا)کە ئامادەبوو.

جموجوڵەکانی (ئاسکی) خاتون وەك باڵەکانی باڵندەیەك لەکاتی فڕیندا هێندە سوكو وردو سروشتیانە بوو هەرگیز وێنا نەدەکرا لەو باشتر کەس بتوانێت لەئاستی ئامادەکردنی (چا)دا بێت. پورە (مارتا) چاوێکی لەسەعاتەکە کرد، نیو سەعات تێپەڕیبوو، کە هیچ کەس لەئامادەبوان سەرنجی کاتەکەیان نەدابوو. (تیۆ) لەبێدەنگییەکی تەواو ئەفسوناویو واقوڕماوبدا دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی دانابوو. پورە (مارتا) جوڵەیەکی کردو ئەژنۆکانی لەتاو سڕبون قرچەیەکییان لێبەرزبووەوە. (ئاسکی) خاتون قۆرییە (چا)کەی لەسەر خاولییەکی سپی رۆنا. پورە (مارتا) بەوریاییەوە زمانێکی بۆ شلەکەی ناوی بردو قۆرییەکەی بۆ (تیۆ) درێژکرد.

(تیۆ) بەجۆرێك دەمی بەناو شلەکەدا برد، کە بەهۆی تاڵییەکەیەوە سیمای گۆڕا. هێندە بەخێرایی هەڵیقوڕاند کەفی شلەمەنییەکە لێوی سەوزکرد. (ئاشی کو) قۆرییەکەی سوڕاند. دەستخۆشی لەجوانییەکەی کردو پاش بێدەنگییەکی تەواو دڵۆپێکی لێچەشت. ئێستا بەشی یەکەمی سروتەکە بەکۆتا گەیشتبوو. ئینجا نۆرەی دابەشکردنی (چا)کەبوو لەکوپەکاندا. ئەم (چا)یەی دووەم کەفی لەسەر نەبوو، چونکە کەفەکە لەگەڵ خودی شلەمەنییەکەدا ئاوێتە ببوو؛ تامەکەشی گۆڕابوو، بەجۆرێك تامێکی سەیرو شیرین ناودەمی پڕدەکرد. (تیۆ) بەخۆشییەوە دەستیدرێژ کرد بۆ پڕکردنەوەی فنجانەکەیو (ئاسکی) خاتون بەروویەکی خۆشەوە پێشوازی لێکرد. ئینجا خاتوونی خاوەن ماڵ لەسەر سینییەکی رەش چەندجۆر خواردنی بەبڕی کەم پێشکەش بەمیوانەکان کرد. ئێستا کاتی گفتوگۆ هاتبوو.

- (ئاسکی) خاتون لە (تیۆ)ی پرسی: ئایا لەو دیدارە خۆشحاڵە؟.
- (تیۆ) وەڵامیدایەوە: بێگومان .
- خاتوو (ئاسکی) دەربارەی تامی (چا)کە پرسیاری لە (تیۆ) کرد.
- ئەویش گوتی: ئۆو بەڵێ، نەمدەزانی چای سەوز تامی چۆنە. بەراستی مرۆڤ وەك توخمێکی زیندوو هەست دەکات دارستانیك فڕ دەکات.

- خاتوو (ئاسکی) پرسی: ئایا دەرکی بەواتای ئەو سروتە کردووە.

- (تیۆ) دەمودەست وەڵامیدایەوە: ئەگەر ئەو شتە بێت من بیری لێدەکەمەوە دەبێت بڵێم مرۆڤ لەوێدا هەست بەئارامی و ئاشتی دەکات. هەرچۆنێك بێت ئەوە ئەو دۆخەیە من هەستم پێکرد. ئایا راست تێگەیشتوم؟

خاتوو (ئاسکی) خەندەیەکی بەرویداداو سوپاسی (ئاشی کو)ی کرد، کە میوانێکی لەوجۆرە شایستەی بۆ هێناوە.

پورە (مارتا) دوچاری سەرسوڕمان بوو، کە (تیۆ) بەجۆرێك لەگەڵ خانەخوێکەدا دەربارەی ئەزمونەکەی دووا وەك ئەوەی لەچارەیدا نوسرابێت ببێتە یەکێك لە موریدانی وەستای (چا).

- (ئاسکی) خاتون وتی: ئەم کورێژگەیە خاوەنی رۆحییەتێکی (چا)یە. بۆ لاوێکی خۆرئاوایی ئەم سەلیقەیە شتێکی دەگمەنە. خاتوو (ماك لاری) مۆڵەت دەدەیت ماوەیەك لای من بمێنێتەوە. دەتوانێت زۆر بەباشی لەوبوارەدا کامڵبون بەدەستبێنێت.

- پورە (مارتا) بەسەراسیمەبوونەوە وتی: واتە کە ...

- (تیۆ) بەئارامییەوە وتی: پورم دودڵە لەوەی پێتانڕابگەیەنێت کە من نەخۆشم، بەڵام کاتێك کە چاکبومەوە بەوپەڕی ئارەزومەوە لەوانەکانتا ئامادە دەبم.

- پورە (مارتا) وتی: وشەکان لەزارم دەفڕێنێت، لەوانەیە کاتی ئەوە بێت ئیدی...

- خاتوو (ئاسکی) قسەکەی پێبڕی و گوتی: بەبۆنەی ئەو یادە لەبیرنەکراوانەوە مۆڵەتم بدە ئەم باوەشێنەی پێشکەش بکەم. ئینجا لەلکی قۆڵەکەیدا باوەشێنێکی پێچراوەی دەرهێناو بەنیوە نوشتانەوەی گەورەیی نواندنەوە پێشکەشی کرد.

- (تیۆ) وەڵامی ئاشتییەکەی دایەوەو باوەشێنەکەی وەرگرت و کردییەوە... لەژێر لێوەوە وتی: ئاهـ.. نا... خۆ ئەوە پەیامێکە.

- خاتوو (ئاسکی) وتی: بەڵێ وایە، بەڵام بۆ دۆزینەوەی رۆحی (چا) بەجێتناهێڵێت. بێهیوا نەبیت... چونکە ئەگەر دابونەریتی ئێمەت پەسەند نەکردایە من نەمدەتوانی باوەشێن و پەیامەکەت پێببەخشم. ئەگەر ئارەزوو بکەیت دەتوانیت پەیامەکە بخوێنیتەوە. (تیۆ) ئەمەی خوێندەوە: ( لەژێر چەکوش و بەئامرازێکی بچوکەوە بوم بەدروێنەکاری زەمانە. بەناوی خۆمەوە، کە دوو وشەی یەکەمی لەناو شارێکدا هەیە و لەوێ چاوەنواری تۆم، درێژە بەژیان دەدەم ).

- (تیۆ) وتی: بەراستی حەز ناکەم بیر لەم پەیامە بکەمەوە، وابزانم ناتوانم.

- خاتوو (ئاسکی) وەڵامیدایەوە: زۆرباشە، ژیانی (چا) رێ بەوەهەمەکانی خەیاڵ دەگرێت. وانییە (ئاشی کو)؟

- (ئاشی کو) وتی: بەڵێ وایە خاتون. جاری یەکەم، کە مۆڵەتی ئامادەکردنی (چا)ت پێدام هەستم بە واتاکەی نەکرد. دەمویست جوڵەکانی خۆم کۆنترۆڵ بکەمو دەستەکانم هێندە زۆر دەلەرزین، کە تۆوە (چا)کەم رشتە سەرزەوی.

- خاتوو (ئاسکی) بەویقارێکی تەواوەوە وتی: ریشەی پرسەکە ئەوەیە، کە کەسەکە، تەواو خۆی فەراموش بکات. جوانترین (چا)کان دڵ ئامادەیان دەکات.

- پورە (مارتا) وتی: تۆ تەواو بەو واتایە کاردەکەیت. زۆر سوپاست دەکەم ئەم ئاهەنگەت بۆ ئێمە رێکخست.

- خاتوو (ئاسکی) ئاهێکی کێشاو گوتی: ئەم کارە پیشەمە. ئەمڕۆ مامۆستایانی (چا) ناچارن بەرامبەر کارەکەیان دراو وەربگرن، بەڵام من ژیانم لەپێناوی (چا)دا هەڵبژاردووەو شادومانم ئەمشەو کەمێك ئاشتیو ئارامیم بۆ ئێوە دەسەبەرکرد.

دوو سەعاتەکە تەواو ببوو، کاتی ماڵئاوایی بوو. خاتوو (ئاسکی) بۆ ماڵئاوایی کردن لەمیوانەکان تا سەر زەوییەکە نوشتایەوەو ئیدی لەپشتی دیوارە دەرگا ئاساکەوە بزربوو. میوانەکان لەبێدەنگییەکی قوڵدا ماڵەکەیان بەجێهێشت.

- پورە (مارتا)، کە هەنگاوی بەسەر پردێکی تەختەدا دەنا، بە (تیۆ)ی وت: بەراستی سەیرم لەتۆ دێت، چۆن توانیت وا زوو خۆت لەو جیهانە بهاوێژیت، کە زۆر لەتۆوە دورە؟

- (تیۆ) هەناسەیەکی هەڵمژیو گوتی: لەرێگای هەڵبژاردنی بێدەنگییەوەو حەزیش دەکەم بەیارمەتی خۆت کەمێك درێژە بەو بارەبدەم.

## رازە کتوپڕەکەی پورە (مارتا)

- پورە (مارتا) وتی: سبەینێ رۆژێکی گەورە دەبێت، چونکە بەشداری ئاهەنگی (شینتۆ) دەکەن لەنێو باخێکدا. دیارە نابێت ئەو ئاهەنگە بەپێشوازی پاكو بێگەردی بنەماو ریشەکەی بەرپا بکرێت، چونکە سازکردنی لەسەر بنەماو بنچینە رەسەنەکەی دەبێتە هۆی نیگەرانی تۆریستەکان. لەگەڵ ئەوەشدا ئاهەنگێکی سەیرو سەمەرە دەبێت، دەبێت پەلە بکرێتو بگەینە شوێنەکە.

بەڵام (ئاشی کو) لەکاتی دیاریکراودا ئامادەنەبوو. راهیبەکان لەبەردەم دەرگایەکی رەنگ سوردا ریزیان بەستبوو. پۆشاکە درێژ درێژەکەیان تا لەری پێیان دەخشا. بەگشتی بێجوڵە بون و بەقوچەکە رەشەکانی سەر سەریانەوە زیاتر بە پەیکەر دەچون.

- (تیۆ) پرسی: چاوەڕوانی کێ دەکەن؟
- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: چاوەڕوانی راهیبەکانن.

راهیبەکان بەپۆشاکی سوری تێکەڵ بەپارچەی سپییەوە گەیشتن. پرچە رەشەکانیان لەپشتەوە بەستبوو. لەگەڵ دەنگی فلوتێکی تایبەت وسەرنجڕاکێش، کەهاوەڵی دەنگی قوڵی تەپڵ بوو، سەمایەکی نەرمیان دەستپێکرد. دواین راهبە چووە ناو ریزەکەوە. جلوبەرگەکەی هێندە قورس بوو، کە بەهەنگاوی گران بەرەوپێش دەڕۆشت!. (کیمونو)یەکی گوڵگوڵی بەسەر (کیمونو)یەکی لێوار ئاڵتونی و لەژێر ئەو دوانەشەوە (کیمونو)ی سێیەمی پۆشیبوو، کەلێوارەکانی بەئاوریشم نەخشێنراوبوو... لەژێر پاژنەی پێکانیدا روپۆشێکی سپی شەپۆلی دەدا.

- (تیۆ) پرسی: ئەم کچە چەند کیمونوی پۆشیوە؟
- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: دوانزە (کیمونو) هەموشیان کۆنن. لەئارایشتکردنی پرچەکانی بنواڕە. ئەو ئەڵقە جوانانە دەبینی تا سەر ئەژنۆکانی هاتون؟
- (تیۆ) وتی: گرفتەکە لەوێدایە ناکرێت بەهەموو زێڕو زیوەوە روخساری ببینرێت.

راهیبەی دوانزە بەرگ بەپۆشاکە جوانەکانییەوە لەنیوەی رێگاکە راوەستا. لەپڕ بەخۆشەویستی و شەرمەوە گەردنی بلوری بڵندکرد.. و (تیۆ) بەئەفسون لێکراوی و سەرسامییەوە (ئاشی کو)ی ناسییەوە؟

- هاواریکرد: ئەمە خەونە!
- پورە (مارتا) شەیتان ئاسا وتی:  نەمگوت غافلگیردەبیت؟
- دەکرێت وابێت.
- ئەویش وەك زۆر لەخوێندکارەکانی دیکەی زانکۆ بەهاوبەشیکردن لەو ئاهەنگانەدا پارەی گیرفانیان بەدەستدەهێناو تەواو. بەڵام تۆ ئەو دەناسیت و دەزانیت هیچ کارێکی روکەشانە ناکات و بڕوایەکی قوڵی بەوکارە هەیە ئەنجامی دەدات. مەرج دەکەم لە دڵەوە ئەوکارە دەکات.

- (تیۆ) وتی: ئیدی ناوێرم قسەی لەگەڵدا بکەم. پێشتر بەیەك (کیمونو)ییەوە کاری تێکردبوم چجای ئێستا بەدوانزە دانەوە!

- کاتێ ئاهەنگەکە تەواو بوو (ئاشی کو) بەدوانزە بەرگەکەیەوە هێواش هێواش بۆ دواوەی شانۆکە گەڕایەوە. پاش چەند ساتێك بەمینیجۆبو (تی شێرت)و پرچی کراوەوە دەرکەوتەوەو لەبارێکدا سەری بادەدا وتی: ئۆف! چەند قورسە! وتم ئەوجارە دەکەوم بەزەویدا.

- (تیۆ) وتی: زۆرجار ئەمکارە دەکەیت؟

- وەڵامیدایەوە: ساڵی یەك یان دوجار. لەلای خۆم باوکیشم کارێکی پڕ چێژە.

- پورە (مارتا) رەخنەی گرت: تەنانەت ئەگەر بەهونەرمەند بچوێیت تا راهیبە؟

- وتی: ئۆو، خۆم ئەوە دەزانم! دەزانم لەساڵی (١٨٦٨)ـەوە (شینیۆ) بوو بەئاینی فەرمی (ژاپۆن)، چونکە پاشا دەیویست لایەنێکی خودایی بەدەسەڵاتەکەی بدات. ئەوەش دەزانم، کە ئیمپراتۆر بەدەرکردنی بڕیارێك (بودا)ی لەپەرستگاکان وەدەرناو لێکجواندنو بەیەکگرتنی (کامی)و (بودا)کانی قەدەغەکردو هەر لەو سەردەمەشدا کەشیشە کاتۆلیکەکانی لەژاپۆن دەرکرد.

- پورە (مارتا) وتی: زانیاری گشتیت هەیە. لەلاتان ئەستەم نییە وەك بێگانە لەئاینێکی لەوجۆرە بڕوانیتو لایەنگری لەنەتەوە گەرایی (ناسیۆنالیزم)ی مەترسیدار بکەیت؟

- تۆ باش دەزانیت (شینتۆ)کەی من لەو بابەتە نییە. ئەم جلوبەرگانەی لەلای من یادەوەری مەزنایەتیو شکۆمەندی ئەم شارەیە لەو سەردەمەدا پایتەختی ژاپۆن بوو. ئەوکاتە ناوی (کیوتو) نەبوو، بەڵکو ناوی (هیان – کو)[1] بوو، کە بەواتای (پایتەختی ئاشتیو ئارامی)یە.

- پورە (مارتا) وتی: ئەو (کیمونو)یانەی پۆشیبوت بۆ ئەو سەردەمە دەگەڕێنەوە، وانییە؟

- کچۆڵە کەژاڵەکە هاواریکرد: بەڵێ، پۆشاکی راستەقینەی مۆزەخانەن! بەتەنها پۆشینیان شانازی کردنە!

- (تیۆ) قسەکەی پێبڕیو گوتی: بەراستی تۆ خواوەندی ژاپۆنیت!

- کچۆڵەکە، کە کەزییەی دەشنانەوە، کەوتە پێکەنینو پاشان لەپڕدا خەمبارو سورهەڵگەڕا بەهێواشی وتی: ماوەیەکی زۆر بەیادی رۆژانی رابردووەوە حەزمدەکرد لەم شارەدا بژیم، بەڵام ئێستا واهەست دەکەم تەواو بوویێت.

- پورە(مارتا) وتی: چۆن؟

١. Heian - Kyo: (کیوتو) تاساڵی (١٨٦٨) پایتەختی ژاپۆن بوو، پاشان جێگای خۆی بۆ (تۆکیۆ) چۆڵ کرد.

- نکوڵی لەئاینی سروشتی ناکەم. زۆر ئارەزوی ئاهەنگەکەی دەمی خۆرئاوای دوێنێ بوو، بەڵام ژنان لەوڵاتی مندا ئازاد نین.

- ئایا بەرێکەوتە وا باوکت حەزناکات بەشوت بدات؟

- ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: بۆچی لەو بابەتە دەدوێیت؟

- (تیۆ) لەکاتێکدا دەستیگرتبوو گوتی: باشە، چی دەکەیت؟

- لێرە کۆچ دەکەم، هەر لەبەر ئەوەش زمانی فەرەنسی دەخوێنم.

- (تیۆ) بەمەخابنەوە وتی: ئەگەر ئێرە بەجێبهێڵیت ئیدی نابیتە راهیبە، (کیمونو)ناپۆشیتو (چا) ئامادە ناکەیت.

- بەسەرسوڕمانەوە وتی: بۆچی؟ لەبەرچی؟ بۆ مەگەر (چا)ی سەوز لەفەرەنسا دەستناکەوێت؟ دەمەوێت لەو وڵاتە بژیم.

- پورە (مارتا) ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: راستی نەناس، هیوادارم لەوێ قژتان بژ نەکەنەوە؟

- نەخێر، (ژاپۆن) بەتەواوی دەستبەردارم نابێت.

- پورە (مارتا) وتی: تا پەرستگای (ئیز) لەگەڵماندا دێیت؟

- (ئاشی کو) وتی: دیارە، نامەوێت دەستبەرداری (تیۆ) ببم!

## لەئۆتۆمبیلەکەدا

پەرستگاکانی (ئیز) لەژاپۆندا گەورەترین میحرابی (شینتۆ) بون. لە (کیوتۆ)وە تەنها چەند سەعاتێك دوربون. لەرێگا پورە (مارتا) (تیۆ)ی ناچار کرد لەخەیاڵی پەیامەکەیدا بێت، کەگوایە بەگشتی فەرامۆشی کردبوو.

- (تیۆ) بڵماندی: ئارەزوناکەم. لەسروشت بڕوانە، زۆرجوانە.

- (تیۆ) گوێبگرە، دەزانم زۆر پەرۆشی ئێرەبویت، بەڵام ئێمە ماوەیەکی زۆر لێرە نامێنینەوە.

- ئەمشەو لەناو جێگاکەدا بیری لێدەکەمەوە، بەڵێن دەدەم.

- نەخێر، تۆ زۆر لەوجۆرە بەڵێنانە دەدەیت. وتم هەر ئێستا بیخوێنەرەوە!

- (ئاشی کو) بەشداریکردو گوتی: خاتوو (ماك لاری) راستدەکات، ئەگەر ئارەزوو دەکەیت کۆمەکت پێدەکەم.

- (تیۆ)، کە بەنائومێدییەوە وشەکانی دەخوێندەوە دوبارەی کردەوە: ( لەژێر چەکوشدا، بەئامرازێکی بچوکی سەردەمەوە درووێنەکرام. بەناوی خۆمەوە، کەدوو پیتی لەناوی شارێکدایە، درێژە بەژیانم دەدەم). چەکوش لەکام شاردا هەیە؟

- (ئاشی کو) زیادی کرد: داسێکیش، ئامرازی سەردەم؟

- (تیۆ) لەخۆی پرسی: ئامرازی سەردەم، سەعاتی سەردیوار؟ ئەو سەعاتە کۆنەم لەسەر دیواری قەلاّکانی سەدەی ناوەڕاست بینیوەو ئێسقانێك یان چەکوشێك لە ناو سەعاتەکەوە دێتە دەرەوەو لە زەنگەکە دەدات.

- پورە (مارتا) وتی: نەك بەچەکوشێك، لەلایەکی دیکەوە ئەم بونەودرە دەڵێت، کە خودی ئەو درووێنەکراوە.

- (ئاشی کو) وتی: کەواتە دەرکەوت پیاوە، ئەی کەواتە چۆن توانیوێتی درێژە بەژیان بدات؟

- پورە (مارتا) وتی: ئاها! پرسەکە لەوێدایە! لەو باوەڕەدا مەبە بتوانیت بەئاسانی بیدۆزیتەوە.

- (تیۆ) بەهێواشی وتی: دوو پیت لەشارێکدا، (ماو) نییە؟ نەخێر (ماو - Mao) سێ پیتە، ئەی کەواتە کێیە؟

- (ئاشی کو) بیریکردەوە: لەژێر چەکوشدا! لەچ ئاینێکدا چەکوش هەیە؟ لەلای ئێمە شتی لەوجۆرە نییە.

- پورە (مارتا) وتی: (تیۆ) دەبێت داوای کۆمەك لە (فاتۆ) بکەیت، رێگا چارەیەکی دیکە نییە.

- (ئاشی کو) وتی: (فاتۆ) کێیە؟

- (تیۆ) سورهەڵگەڕاو گوتی: هاوپۆلە، کاتێك وەڵامی پرسیارێکم بۆ نادۆزرێتەوە دەتوانم تەلەفۆنی بۆ بکەمو هێمایەکی لێوەرگرم.

- پورە (مارتا) وتی: مۆبایلەکەت بەکار بهێنە. ئۆتۆمبیلەکە رادەگرین. فەرموو!

- (تیۆ) بەدەستەپاچەییەوە وتی: نەخێر ئێستا خەوتووە!

- پورە (مارتا) وتی: سەیرە! ئەوکاتەی لەهندستان بوین هیچ دودڵ نەبویت لە بێدارکردنەوەی دۆستە خۆشەویستەکەت!

- (ئاشی کو) بڵماندی: دۆستی خۆشەویست؟

- (تیۆ) لەژێر لێوەوە وتی: شتێك نییە. هەمیشە هەروایە. هێندە بەسە لەگەڵ کچێکدا گفتوگۆ بکەم تا ئەو نازانم... بیری بەلای شتێکی دیکەدا بڕوات!

- پورە (مارتا) بەهۆی شۆکی قسەکانی (تیۆ)وە لەئۆتۆمبێلەکەدا خۆی متکردو لەگۆشەیەکی کورسییەکەوە کەوتە سەیرکردنی دزە نیگاکانی دوو لاوەکە. لەوانەیە زیاد لەڕادە بیری لێکردبێتەوە، بەلاَم هەر چۆنێك بێت دیاربوو کارەکەیان بەرەو دلّداری دەڕۆشت. خۆیکرد بەخەوتوو. بینی ئەو دوانە دەستیان لەناو دەستی یەکدیایە. (فاتۆ)ی چارەڕەش!

## پەردەی پەرستگای (ئۆماتراسۆ)

ئۆتۆمبیلەکە لە(یامادا)ی شوێنی پەرستگاکانی (ئیز) نزیکبۆوە. پورە (مارتا) بەتوڕەییەوە داوای لە (ئاشی کو) کرد سەبارەت بە شوێنەکە رونکردنەوە بدات.

- (ئاشی کو) دەستیپێکرد: لەساڵی (٦٩٠)وە ئەم پەرستگایانە هەر بیست ساڵ جارێك تێکدراوەو دوبارە نوێژەنکراوەتەوە. ئەمە بەخونەریتی (سنگۆ - Sengu) ناودەبرێت: ئامانجو ئەرکی سەرەکی (سنگۆ) پاککردنەوەو دورخستنەوەی پەرستگابوە لەگەندەڵی؛ بەتایبەتی کاتێك پاشا دەمرێت باشتر بتوانێت دوبارە ژیانو وزە بەجیهان بداتەوە. دوایین نوێژەنکردنەوەی پەرستگاکە لەساڵی (١٩٩٣)دا ئەنجامدراوە، کەهاوکات بوو لەگەڵ شەستو یەکەمین (سنگۆ)دا، بەلاَم چونکە تێچونی نوێژەنکردنەوەی هێندە گرانە پێدەچێت ئیدی ئەنجام نەدرێت.

- پورە (مارتا) بەرویەکی گرژەوە وتی: دەزانم بیرت لەشوێنێکی دیکەیە، بەلاَم حەزدەکەم تەنها بەخوێندنەوەی ئەوەی نوسراوە نەوەستیت.

- (ئاشی کو) کەمێك سورهەلگەڕاو گوتی: خاتوو (ماك لاری) بمبەخشە. نازانم چیبلێم.

- پورە (مارتا) وتی: بۆ نمونە لادانی پەردەی پەرستگاکە قەدەغەیە، کە (ڤیکنۆت مۆری)[1] لەساڵی (١٨٨٩) بەنوکی گۆچانەکەی پەردەکەی لاداو شەش مانگ دوای ئەوە لەلایەن مامۆستایەکی دەمارگیرەوە کوژرا. بکوژەکەیان لەسێدارەدا، بەلاَم هێشتا ژاپۆن یادەکەی بەرز رادەگرێت. سەرەڕای ئەوەش دەتوانیت بڵێیت کەمیحرابی (ئیز) هەمان پەرستگای (ئۆماتراسۆ)ی خواوەندە.

- (ئاشی کو) بەتوندی بۆی زیادکرد: تەنها ئیپراتۆر مافی چونە ژورەوەی پەرستگاکەی هەیە. (تیۆ) زۆر وریابەو بەتایبەتی وێنە مەگرە! پاسەوانەکان دەستگیرت دەکەن.

---

[1]. Mori: (مۆری ئەرینۆری) دیپلۆماتو سیاسەتمەدارو وەزیری رۆشنبیری ژاپۆنی. خاوەنی بیرۆبۆچونی پێشکەوتوخوازانە بوو بەهۆی ئەوەی ریفۆرمی لەسیستمی پەروەردەی ژاپۆندا ئەنجامدابوو بە (باوکی پەروەردەی مۆدێرن) ناودەبرا. لەساڵی (١٨٨٩) لەلایەن مامۆستایەکی ژاپۆنی دەمارگیرەوە کوژرا.

- (تیۆ) پرسی: ناو پەرستگاکە چیتێدایە؟

- پورە (مارتا) وتی: دوو (سمبول): ئەو ئاوێنەیەی (ئۆزوم)ی خواوەند، کەساتی دەرچونی لەئەشکەوتەکە بەرامبەری گرتویەتی لەگەڵ شمشێرە پیرۆزەکەی (سوزانۆ)ی برای. هێماکانی ژیانی جاویدانی ژاپۆن!

- تۆ بینیوتن؟

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: نەخێر، لەکتێبدا خوێندومەتەوە. لەناویدا جگە لەبینایەکی گەورەو فراوان‌و زۆر سادەی لەدار دروستکراو، کە بەتەواوی نوێژەنکراوەتەوە، هیچی دیکە نابینیت، بەڵام دەتوانیت ئەگەر ئارەزوو بکەیت پارەی ئاسن بەژێر پەردەکەدا رۆبکەیت یان تەنانەت پەیامێك بنێریت.

- (تیۆ) وتی: بۆ نمونە، ئەگەر ئەم پەیامە لەژێر پەردەکەدا دابنێم ئەگەر هەیە خواوەند کۆمەکم پێبکات؟ ئایا وەڵامم دەداتەوە؟

- پورە (مارتا) وتی: باشە، تاقیبکەینەوە.

لەوبەری پردەکەوە یەکەمین دەروازەی پەرستگاکە، لەپاڵ درەختێکی گەورەو مەزنی (کافور)دا بەبەرزی شەست مەتر دەبینرا. کەمێك لەوێوە دورتر گومەزی پەرستگاکە بوو، کە لەداری روت دروستکرابوو. لەپشتەوە بانێکی نزم هەبوو، کە بەرزییەکەی هێندە لەبەرزی درەختەکە زیاترنەبوو. لەسەر گوێسەبانەکان میچە زۆر نزمەکان‌و تیری داری گۆشەدار گردبونەوەیەکی رووەو ئاسمانیان دروستکردبوو. لەناو مەیدانی پەرستگاکەدا ئەستێڵێك بۆ ئەوانەی سەردانیان دەکرد دروستکرابوو.

- (ئاشی کو) وتی: سەرەتا دەبێت خاوێن ببینەوە. دەبێت دەست‌و روخسار بشۆین. مەسینەی (بامبۆ) هەلگرە، بەڵام دەمت مەکەرەوە. ئاوەکە پڕە لەگڵ‌و خڵتە.

(تیۆ) بەقێزو بێزەوە دەست‌و دەموچاوی شوشت‌و بەسەر دەستەکانی سڕییەوە. (ئاشی کو)، کە بلوزەکەی دادەکەند، بە (تیۆ)ی راگەیاند وەك ئەو بکات: تۆش کراسەکەت دابکەنە. ئێستا بەبێڵادان ئەو پەردەیەی لەچاوی خەڵکی دەشارێتەوە رێز لەخواوەند دەنێین.

لەسەر پلیکانەی پەرستگاکە ئەوانەی بۆ زیارەت چوبونە ئەوێ دادەنیشتن‌و ناوچاوانیان دەنوساند بەبەردەکانەوە. (ئاشی کو) لەلای خۆیەوە نزیك بووەوەو گەورەیی نواند. پورە

(مارتا)و (تیۆ)، بێجوڵە وەستابونو لەجوڵەی پەردە نهێنییەکەیان دەنواڕی. ئینجا کچۆڵە جوانەکە هەستایەوەو گەڕایەوە بۆلای هاوڕێکانی.

- فەرموو. هەر ئەوەندە بوو. (شینتۆ) ئاینێکی بێ کتێب، بڕیار، وێنەو بێ نوسراوە.

- (تیۆ) وتی: بەکوختێکی گەورە دەچێت. لەراستیدا باشتریشە.

- پورە (مارتا) وتی: لەچی باشترە؟

- وەڵامیدایەوە: باشترە لەو دامودەزگایانەی لێوان لێون لەشتی سەیرو سەمەرە. تەنانەت لە (ئۆرشەلیم)یش پەردەیەك هەبوو بۆ جیاکردنەوەی بۆشاییو چۆڵیی.

- پورە (مارتا) پێشنیاری کرد: بابڕۆین بۆ پەرستگایەکی دیکە.

شەش کیلۆمەتر ماوەی نێوان پەرستگای (ئۆماتراسۆ)و پەرستگای (جێنشین)بوو. کوڕیژگەو کچۆڵەکە هەموو ئەو ماوەیەیان بەپێبڕیو پورە (مارتا)ش بەتەنگە نەفەسییەوە دوایان کەوتبوو. لەشەکەتیدا لەبن درەختێکی سەدری گەورە رۆنیشتن. بەهۆی زۆری گوێسوانەکانەوە میچەکانی ئەم پەرستگایەش بەپەرستگای دووەم دەچوو، بەڵام (تیۆ) تەنانەت سەیری پەرستگاکەشی نەکرد، بەڵکو چووە پشت درەختێك و دەستی کچۆڵە شەنگەکەی توند گوشی .

- (ئاشی کو) لەکاتێکدا هەوڵیدەدا دەستی لەناو دەستی (تیۆ) بکێشێتەوە وتی: نەخێر ئەمە کارێکی راست نییە. خاتوو (ماك لاری) لەپشتمانەوە وەستاوە.

- لەراستیدا پورە (مارتا) بەقینەوە بەرەوڕویان رایدەکردو لەتاو توڕەیی کەوت.

- (تیۆ) هاواریکرد: پورە (مارتا)، هیوادارم ئازارت پێنەگەیشتبێت؟

- پورە (مارتا) لەژێرلێوەوە چەند قسەیەکی رەقی بە (تیۆ) وتو لەکاتێکدا بەگران بەهۆی کۆمەکی (تیۆ)و (ئاشی کو) هەڵدەستایەوە، تاکە پێڵاوەکەی هەڵگرتەوە، کە پەڕیبوو.

- بەهاوارکردنەوە وتی: هەردوکتان گوێڕادێرن. (ئاشی کو) دەتوانم هەموو ئەمان بۆ باوکت بگێڕمەوە. نەخێر، وانەزانیت شەرم دەکەم، بەتەواوی دەتوانم ئەو کارە بکەم، ئەگەر ئەوەش نەکەم بەو مەرجە دەبێت کە ئارام بیت. بەڵام تۆ (تیۆ)، ئەگەر جارێکی دیکە ئەو هەڵانە بکەیت لەگەشتکردن پەشیمان دەبمەوەو تەواو!

- (تیۆ)، بەیاخیبونەوە جوڵایەوەو یەکەم زللەی بەدەستی پورە (مارتا) خوارد.

(تیۆ) بەواقوڕماوییەوە دەستی بەروومەتییەوە گرت.

- پورە (مارتا) بە(ئاشی کو)ی وت: نازانم بۆچی نابێت زللەیەکی لەوجۆرەش لەتۆ بسرەوێنم!. کە یەکدی لەئامێزدەگرن واتی ئەوەیە دەبێت من بەقاچی شەکەتەوە بەدوتاندا رابکەمو ئینجا بکەومو ئەمەش مایەی پەسەندکردن نییە!.

کچەو کوڕە لاوەکە بەڵێنیاندا ئیدی ئەوکارە دوبارە نەکەنەوە.

- نەخێر، من ئێوە دەناسم، فێڵو تەڵەکەبازی دەکەن! بەراستتان نییە.
- (ئاشی کو) هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: خاتوو (ماك لاری) ئێمە پەروەردەکراو نین.
- پورە (مارتا) وەك گەورەیەك وتی: داننان بەگوناهەدا خۆی لەخۆیدا بەخشینی نیوەی گوناهەکەیە. (تیۆ) چەند جۆرە تەلیسمێکم لەرێگا بینی و یەکێك لەوانەم بۆ کڕیت. بەلام سەیرکە! تەنها کاتێك پێتی دەدەم کە چارەی پەیامەکەت دۆزیبێتەوە.
- (تیۆ) ملکەچانە وتی: زۆرباشە، پوریٚ گیان.

## (ڤـ. ئای. ئۆ) ناسراو بە (ل)

هەمان شەو (تیۆ) فەرهەنگەکەی ژێرەوژوور کرد، بەلام هیچ هەواڵێك لەشارێك نەبوو، کە هێماکەی چەکوش بێتو (کەسێکی پاش مەرگی جارێکی دیکە درێژەی بەژیانی خۆی دابێت) هەروا نەناسراو مابۆوە. بەلام ئەو (دوو وشەیە)ش دەبێت لەمەتەڵە نهێنیەکانی چین بێت!. پورە (مارتا) وتییەوە: باشە، تەلەفۆن بۆ (فاتۆ) بکە.

- (تیۆ) بەشەرمەزارییەوە وتی: لەو باوەڕەدایت بتوانم ئەوە بکەم؟
- مەرج ئەکەم ناوێریت..
- بەلام (تیۆ) بەمەبەستی سەلماندنی بوێری خۆی ژمارەکەی لێدا: فاتۆ، منم... دەزانم. کاتم نەبوو... دڵنیابە. هەمیشە لەم گۆشە بۆ ئەو گۆشەیە لەهاتوچۆدابوم. هەڵبەتە بیرتدەکەم. بڕوانە، پێویستم بەئاماژەیەکی دیکەیە.. دەتوانیت بیڵێیت؟ باشە، ئاماژەیەکم دەدەیتێ؟ چی، دەنگم؟ دەنگی من هەروەك جارانە! پەلەبکە! ڕەفتاری خراپ دەکەم؟. هەرگیز! کەمێك توڕەم، ڕاستە، بەلام هیچ نییە... باشە بەسە! دەڵێم ئاماژەیەکم بدەرێ... فاتۆ!
- (تیۆ) بەسەرسوڕمانو واقوڕماوییەوە لەتەلەفونەکەی ڕوانی... لەژێر لێوەوە وتی: دایخستەوە!

- پورە (مارتا) وتی: کچان، زوو هەست بەو شتانە دەکەن.. بچکۆلەکەم! ... دوبارە تەلەفۆنی بۆ بکەرەوە، خێرا.

- بەڵام توڕەبوو.

- هەر لەبەرئەوە خێراکە.

- فاتۆ؟ بمبەخشە... بەڵێ، شەکەتم. زۆر شەکەتم، نەخێر، هیچ شتێکی گرنگ روینەداوە. ئێرە ساردەو باران دەبارێت... ژاپۆن؟ خراپ نییە، تکایە دەتوانیت ئاماژەیەکم بدەیتێ؟ (دوو پیتی یەکەمی ناوی خۆم لەشاردان)... بەخێرایی قسەدەکەیت! پەلە مەکە... (بەڵام پیتی سێیەم دووەمین پیتی ناوی ئەم شارەیە. لەکاتێکدا نازناوەکەم بە (ل) دەستپێدەکات)... دەتەوێت ئازارم بدەیت یان چی؟ بیر لەچی دەکەیتەوە؟ کە لە (ژاپۆن) بمێنمەوە؟ من؟ هەندێ کات. تۆش لەوباوەڕەدایت!... نازانم، لەماوەی دوو تا سێ مانگدا ... بەڵێ، دورودرێژە، بەڵێ، منیش هەروەها، زۆر زیاتریش. بەپەرێشانیو لەسەرخۆ تەلەفۆنەکەی داخستەوە.

- پورە (مارتا) زۆر بەراستەقینەوە وتی: تیۆ، کامیانت لەلا باشترە؟

- (تیۆ) هاواریکرد: ها.. مەبەستت چییە؟ (فاتۆ) زۆر سەغڵەتە...

- پورە (مارتا) درێژەیپێدا: هەروەها (ئاشی کو)ش. پاش هەفتەیەکی دیکە ئیدی تۆ نابینێتەوە.

- (تیۆ) بەهێمنی وتی: بەیەك هەفتە... چ چارەڕەشییەکی گەورەیە!

- ئاخ.. ئێستا لەبەردەممدا (تیۆ)یەکی نوێ دەبینم، کە ئێش و ئازار ئەزمون دەکات!. بەڵام ئامۆژگاریت دەکەم بیر لەپەیامەکەت بکەیتەوە.

(تیۆ) بەمەخابنو هژارەییەوە لەپشت مێزەکەوە رۆنیشت. سێ پیتی یەکەمی شار... لەوانەیە ئەو وشانە لەخودی وشەی (شاردا) بێت؟ باش دەبێت: (ڤ. ئای. ل)[1]. (تیۆ) دەستی دایەوە فەرهەنگەکەو بەڵام لەپیتی (ڤ)دا هیچی نەدۆزییەوە.

- پورە (مارتا) وتی: بەرێگایەکی هەڵەدا رۆیشتویت. دەبێت زیاتر بیر لەو (ئامرازە بچوکە) بکەیتەوە.

- داس؟ داسێکی بچوك؟

- نافەرین! چەکوچ، داس... (تیۆ) هاواریکرد: وڵاتێکی کۆمۆنیستی!. نەخێر، ئیدی وڵاتی کۆمۆنیستیمان نییە. مەگەر ئەوەی کە... بزانم (ڤ. ئای. ل)؟ (ڤاسێلاڤ هاڤێڵ)[1].

---

١. لەزمانی فەرەنسیدا (شار) وات (Ville) کە سێ پیتی یەکەمی (ڤ. ئای. ل).

- پورە (مارتا) وتی: نەخێر، لەوناوەدا نە (ئای) هەیەو نە (ل). (لەسەرەتای وشەدا) دوای نازناو بکەوە.

- ئەمە گرفتە چونکە ژنانەیە!

- بەلگەت چییە؟

- چونکە (فاتۆ) بەمنی وت کە (دووەمین پیتی نازناوی بە (ل)[2] دەست پێدەکات.

- نێ، (Elle) تێگەیشتم!... گاڵتە جارییە! چونکە (فاتۆ) لەتەلەفۆنەکەدا ئاماژەکەی پێدایت تۆ لەجیاتی پیتی (L)، (ل) وشەی (elle)ت نوسیوە.

- نەخێر، ئەو مەبەستی (elle) راناوە بۆ مێ نییە، بەڵکو پیتی (ل) وەك (لیۆ). (تیۆ) دوبارە سەری بەسەر فەرهەنگەکەدا شۆڕکردەوە.

- بەڵێ، فیلادمیر ئیلیچ ئۆلیانۆڤ ناسراو بە (لینین) (V. I. O) ناسراو بە (L).

- پورە (مارتا) وتی: ئێستا ناوی شارەکە ماوە.

- دیارە (مۆسکۆ)یەو (O) پیتی دووەمی شارەکەیە.

- پورە (مارتا)، کە کاغەزێکی لەگیرفانی دەرهێنا، وتی: ئەوەش تەلیسمەکەت.

- لەسەر تەلیسمەکە بە(ژاپۆن)ی نوسرابوو (**یەکەمین چاکەکاری مرۆڤ وەفادارییە**).

- (تیۆ) بەئارامی وتی: گرەودەکەم بەئەنقەست ئەم رستەیەت پێنوسیون.

- لەوانەیە، لەوانەشە وانەبێت، وابزانە ئەوەش پەیامێکە لەخواکانەوە.

## (تیۆ)و پەشیمانییەکانی

گەڕانەوە بۆ (تۆکیۆ) مایەی شادمانی نەبوو. (ئاشی کو) هەوڵیدەدا چاوی بە (تیۆ) نەکەوێت و (تیۆ)ش لەسەغڵەتیدا نینۆکی دەکرۆشت. پورە (مارتا) دەمی هەڵنەدەهێنایەوەو وەك رێگایەکی درێژو بێکۆتا دیاربوو. رۆژی دواتر رۆژی سەردانی نەخۆشخانە بوو، پاشان سێ رۆژ چاوەڕوانی کردنی ئەنجامی شیکاریەکان. ئەو سێ رۆژە (ئاشی کو) هیچ هەواڵێکی نەبوو. (تیۆ) غەمگین و نیگەران کاتەکانی لەمۆزەخانە بەسەردەبرد؛ بەزەحمەت شتی دەخوارد، خراپ دەنوست و بەتەمەڵی لەجێگادا رادەبوو. پورە (مارتا) سۆزی جوڵابوو. مۆڵەتی پێدا تەلەفون بۆ (ئاشی کو) بکات.

---

١. گوتنی پیتی (L) (ئێل)و راناوی مێ (Elle) (ئێل) یەکسانە.

٢. Vacilav Havel: سەرۆك کۆمارو نوسەری چیکی.

- (تیۆ) بەهێمنی وتی: نەخێر، شتێکی راست نییە. نامەوێت ئازاری (فاتۆ) بدەم. لەلایەکی دیکەشەوە تۆ راست دەکەیت سودی چییە؟

- پورە (مارتا) وتی: دەبێت کاردانەوەت هەبێت، بیر لەجمکەکەت بکەرەوە. لەو باوەڕەدایت شانازیت پێوە بکات؟

- (تیۆ) وەلامیدایەوە: بێدەنگ، وابزانم حەزی بە (ئاشی کو) نییە.

- پورە (مارتا) بەجۆرێك لەهاودەردییەوە وتی: تۆ بەهۆی پەشیمانییەوە دوچاری پەژاردو رەنج بویت. زۆرباشە!. مۆڵەتتان پێدەدەم پێکەوە پیاسەیەکی سەر دەریا بکەنو ئینجا ماڵئاوایی لە (ئاشی کو) بکە. ئەوە زۆرباشە... دەبینیت...

شتێکی دیکە نەدەکرا. (تیۆ) لەژورەکەیدا مایەوەو خۆی بەسەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە مژۆڵ کرد. پورە (مارتا) سەعاتی دەژمارد. سەرئەنجام پاش دوو رۆژ شڵەژاویو نیگەرانی ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی گەیشتن. بۆ یەکەمجار بوو بەرەو پێشچون تێبینی دەکرا.

- پورە (مارتا) هاواریکرد: (تیۆ) زۆرباشە! تیماردەکرێیت!

- (تیۆ) بەبێئەوەی ئاماژەی خۆشی تێدا دەرکەوێت وتی: بەڵێ، پاشان؟.

- تکادەکەم، بجوڵێو خۆشحاڵ بە، ئەگینا نەخۆشییەکە بۆ سەرەتای دەگەڕێتەوە.

- (تیۆ) ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: لەوانەیە واباشتر بێت...

- پورە (مارتا) بەراگەیاندنێکی لێبڕاوانەوە وتی: بەسە. بەیانی لەگەڵ (ئاشی کو) بۆ (هاکوت) دەچین. هیوادارم ئەم دواین رۆژەی مانەوەمان لەژاپۆن نەکەیتە خەمو پەژارە!. ئێستا واباشترە تەلەفونەکە هەڵگریتو لەگەڵ دایکت بدوێیت، هەر ئێستا!

- دڵم پێوەنییە!

- ئەی کەواتە رۆحییەتی (چا) بۆ کوێ چوو؟ (زەن) بە!

- (تیۆ) تەلەفۆنەکەی هەڵگرت. (میلینا) بەبیستنی هەواڵی چارەسەرەکەی (تیۆ) خۆشحاڵبوو، بەڵام هەستی کرد دەنگی (تیۆ) خەماوییەو نیگەران بوو.

- (تیۆ) بەناچاری سوێندی خوارد: دایە، سوێند دەخۆم هیچی خراپ نییە. لەگەڵ پورە (مارتا)؟. ئەوانەش روودەدات، بەڵام شەڕمان نەبووە!. باشە، تەنها دوێنێ هەندێك خێرا رامان کردو ئەویش بەدوامادا هاتو کەمێك تورە بوو!؛ تەنانەت کەمێك بۆڵاندنی، بەڵام لەدواییدا ئاشتبووەوەو ماچی کردم. وەك دەبینیت هیچ نەبووە. بەراستی دایکە من جمکەکەی خۆم بینی، لەلات سەیر نییە؟ مەبەستت چییە؟ شتێکی میراتی لەخێزانەکەماندا هەیە؟ چەند

سەرنجڕاکێشە! لەو باوەڕەدایت من حەز دەکەم برام هەبێت؟ نەخێر، هەر ئێستا پێمبڵێ... دایکە؟ (تیۆ) دایخستەوەو پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: باشە، چۆن بوو؟

- دایکم زۆر باشە، کاتێك لەپڕ تەلەفونەکە دەبڕێت واتە دەیەوێت بگری، سەرەڕای ئەوەشی کە وتم ئەنجامی تاقیگەکە باشبوە!.

- پورە (مارتا) وتی: (تیۆ)ی من.. دیارە خرۆشاوە. من هەست بەهیچی دیکە ناکەم.

- (تیۆ) بەگومانەوە وتی: دیارە، هەروایە! لەگەڵ ئەوەشدا گومانم هەیە.

- تکا دەکەم، بەسە! حەزت بەسەردانی مۆسکۆ نییە؟ کڵێساکان بەگومەزی شێوە پیازەوە. (پاپا)کان بەبەرگە سەرسوڕهێنەرەکانیانەوەو ئاوازو گۆرانییەکان..

- مۆمیاکەی (لینین).

- پورە (مارتا) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: زۆرباشە، هەرچۆنێك بێت خراپ نییە بەدواین ئەو خوایانە ئاشنا ببین، کە لەلایەن مرۆڤەوە ئەفرێنراوە!.

## ماڵئاوایی لەسەر دەریاچەی ئاشتی

دوای دوو رۆژ بەهاوەڵی (ئاشی کو) بۆ (هاکون) چون. (ئاشی کو) وەك ئەوەی هیچ روینەدابێت گۆنای (تیۆ)ی راموسیو ئەویش بەدڵخۆشییەوە دەستیگرت. پورە (مارتا) لەهۆتێل (ریۆ – کان) ژوری گرتبوو. هۆتێلەکە لەسەر کەناری دەریاچەی (ئاشی) بوو. کاتێك پەنجەرەکانی دەکرانەوە لەوێوە لوتکەی ئەفسانەیی بەبەفر داپۆشراوی (فوجی – یاما) دەبینرا. رۆژی دواتر، دواین رۆژی مانەوە بوو لەژاپۆن: چەند گەواڵە هەورێکی سپی لەشینایی ئاسماندا مەلەیان دەکرد، کە کەشتییەکی سێ ئەستونگە بەلاشەیەکی رەنگ ئەرخەوانیو پاشکۆیەکی ئاڵتونییەوە چاوەنواڕی گەشتیاران بوو.

- (تیۆ) هاواریکرد: چەند جوانە! بەکەشتییەکەی (پیتەر – بان)[1] دەچوێت!. ئایا ئەم کەشتییەش بۆ سەردەمی (هیان)[2] دەگەڕێتەوە؟

- پورە (مارتا) وتی: نەخێر، ئەم کەشتییە لە (دیزنی لاند) وەرگیراوەو پیاسەیەك بەو کەشتییە دەکەمە دیاری بۆ تۆو (ئاشی کو). ئێوە هەردوکتان تەنیا دەبنو من لێرە چاوەڕوانتان دەبم.

١. Peterpan: پاڵەوانی ئەفسانەیی ناوداری فیلم کارتۆنی والت دزنی.

٢. Heian Kyo: یان (شاری ئازاد)، ناوی کۆنی شاری (کیوتۆ)یە، کە لەساڵی (٧٩٤) بەهۆی ئیمپراتۆر (کامە تینۆ)وە دروستکراوە.

بەوجۆرە پیاسەکردن بەو کەشتییە لەسەر دەریاچەی (ئاشی) شوێنی دوا ژوانگەی ئەو دوانە بوو، کە پورە (مارتا) ڕێکیخستبوو. کەشتییەکەی (پیتەربان) لەسەر دەریاچەکە کەوتە جوڵەو دوو لاوەکەش بەبیانوی بینینی لوتکەی (فوجی – یاما) چونە سەر تەختایی کەشتییەکە.

- (تیۆ) وتی: بەڵێ، زۆرجوانە.
- کەشەکەش لەبەر دڵانە.
- بەڵێ، زۆر.
- (تیۆ) دەبێت بەتۆ بڵێم کە...
- منیش هەروەها.. دەزانیت..
- بەڵێ، بەڵام. هەموو شت نازانیت..
- (تیۆ) بەپەلە وتی: تۆش نازانیت. سەبارەت بە (فاتۆ)، لەیادتە؟ هەندێك درۆم کرد. (فاتۆ) تەنها هاوپۆلم نییە، دۆستمە.
- (ئاشی کو) لەژێر لێوەوە وتی: دەمزانی.. منیش دۆستێکم هەیە.
- بەسەر سوڕمانەوە وتی: شتی وانابێت!.. ژاپۆنییە؟
- لەکاتێکدا گۆناکانی سورهەڵگەڕابوون وتی: نەخێر، فەرەنسیە. سکرتێرە لەباڵیۆزخانە. باوکم نازانێت. بەڵام (ئۆلیفیە) نامەیەکی لەدایکمەوە، لەدایکە راستەقینەکەمەوە بۆ هێناوم...
- ئۆو، کەواتە تۆ راستییەکە دەزانیت! ئایا سەردانی دەکەیت؟
- هێشتا نازانم، کاتێك ئەوەم بیست زۆر گریام. دایکە ژاپۆنییەکەم زۆر خۆشدەوێت. تێدەگەیت... (ئۆلیفیە) دەیویست دڵم بداتەوە..
- سەرکەوتوش بوو. باشە ئێستا چیدەکەیت؟
- لێرە دەڕۆم. (ئۆلیفیە) وتی دەیەوێت بمکاتە هاوسەری خۆی.
- ئاهـ. پێشنیازەکەی بەراستە؟
- زۆر بەراستێتی.
- باشە، من، ئەی من چی؟
- تۆ، تۆ زۆر میهرەبان بویت، زۆر فەرەنسیت!. بەڵام کە تۆ نەخۆشی باوەڕ ناکەم... لەلایەکی دیکەوە هیچ روینەداوە. تۆ (فاتۆ)ی خۆت هەیەو منیش (ئۆلیفە)ی خۆم.
- ئینجا هەردوکیان دەستی یەکدیان گرتو (ئاشی کو) وتی: باشە، ئێستا دەبینیت دۆستایەتیمان وەك پشکوتنی گێلاس هەڵفڕی... بەڵام یادو بیرەوەری هەمیشە دەمێنێتەوە.

پورە (مارتا) بینی هەردوکیان دەست لەناو دەست کەمێك خەمبارو هەندێك شاد بەرەو لای ئەو دەگەڕێنەوە. شەو لەکاتی خەوتندا (تیۆ) بەبێویست کەوتە گریان.

- پورە (مارتا) بەبەزەییەوە پرسی: باشە،ماڵئاواییەکە چۆن بوو؟
- دەتوانیت یەخەم بەردەیت!
- چیرۆکێکی (زەن)ت بۆ دەگێڕمەوە. رۆژێکیان راهیبێك سەردانی مامۆستاکەی دەکات و دەڵێت: (بەبێئەوەی هیچ بارێکم بەسەرشانەوە بێت هاتوم بۆ سەردانت). دەزانیت مامۆستا لەولامدا چی گوت؟ گوتی: ( زۆرباشە، لەسەر زەوی دایبنێ!).
- (تیۆ) وتی: بەلام خۆ وتی هیچی بەکۆڵەوە نییە!
- راستەو هەرلەبەرئەوەش وایگوتوە. بەبێ ( بارێکی بەرجەستە بەکۆڵێك ویژدانەوە هاتوە). بەو واتایەی کەسەکە دەیەوێت ئەو بیرۆکەیە رابگەیەنێت کە شتێکی لەدەروندا هەیە.

بەلام راهیبەکە لەوتەی مامۆستاکە هیچ تێنەگەیشت تورە بوو. ئینجا مامۆستاکە بەئارامی و توندو تۆڵییەوە وتی: ( تکا دەکەم دایبنێ و بگەڕێوە بۆ لای خۆت ). (تیۆ)ی ئازیزم. تۆش ئەمرۆ ئەو (هیچ)ەت لەسەر زەوی دابنێ، چونکە هیچت لەدەستنەداوە.

- (تیۆ) بەهێواشی وتی: چۆن، شکۆفەی گێلاسەکان. ئەمجارە باش لەواتای هەڵوەرینی پەڕەی گەڵاکانیان تێگەیشتم.

**بەشی بیست**

## (ئاینی ئێش و ئازار)

### بەرگری (تیۆ) تێکیدەشکێنێت

سەعات دووی بەیانی دەنگی گریانی (تیۆ) پورە (مارتا)ی بێدارکردەوە.

- پورە(مارتا) کە گلۆپەکەی پێدەکرد وتی: هیوادارم تا سپێدە درێژە بەگریانەکەت نەدەیت.. (تیۆ)کەم. هەر ئێستا ئازارشکێنێکت پێدەدەم.

- (تیۆ) بەناڵاندنەوە وتی: نەخێر، تەواو ...

- لەو باوەڕەدایت.. ئەمجۆرە ئازارانە بەئاسانی لاچن؟

- هاواریکرد: بەڵام من ئازارم نییە، تەنها هەندێك هەست بەتێکشکان دەکەم...

- لەپێناوی عەشقێکی بچوکدا؟ لەژیاندا شتی لەوجۆرە زۆر دەبینیت.

- ئەم ئامۆژگارییانەش خراپ نین.

- پورە (مارتا) بەئارامییەوە وتی: بڕوانە.. لەوباوەڕەدام کەمێك ئازار چەشتن خراپ نەبێت. (تیۆ) ... ئایا تا ئێستا گرفتاری شۆكو رەنج و ئازار بویت؟

- بەدەنگێکی خەمبارییەوە وتی: لەمجۆرە، نەخێر.

- کاتێك لە (ڕۆما) لەدایکت جودابوینەوە فرمێسکە گەرمەکانت بەسەر گۆناتدا سێڵاویان نەبەستبوو؟ جیابونەوە هەمیشە هاوەڵی ئازارو بێبەشییە...بچکۆلەکەم. بۆشایی و بەتاڵییەك لەناو دەرونی مرۆڤدا دروست دەکەن، کە بۆ زانینی کاریگەرییە باشەکانی کات پێویستە.

- چاکەکانی گرفتاریی؟ واتای چییە؟

- بەڵێ، زانینی ئەوە دژوارە. خەمو پەژارە ماوەیەك لەگەڵتدا دەمێنێتەوەو پاش سپێدەی رۆژێك لەرۆژان ئارامی دەگەڕێتەوە. سەرەتا ئارەزووت نابێت و درەختو گوڵەکان نابینیت تارۆژێك لەپڕ بێدار دەبیتەوەو خۆت بەمرۆڤێکی نوێ دەبینیت. لەدەوروبەرت دەنواڕیتو دەبینیت ژیان بەردەوامەو تۆش پاش تێپەڕاندنی خولێکی سەختی ئەزمونکردن خۆت بەبەهێزتر لەجاران دێتەبەرچاو.

- وەك ئەوەی دەتەوێت رێگای (بودام) فێر بکەیت!

- نەخێر، هەرگیز. من ئەوشتە سادەیەت پێدەڵێم کە ئەگەری هەیە لای هەموو کەس روبدات.

- (تیۆ) بەشێوەی هێرشکردن وتی: ئەمەی خودی خۆت، تۆ چی دەربارەی رەنج و ئازار دەزانیت؟

- خۆت بیزانە. من ئەو پیاوەم لەدەستداوە، کە خۆشمدەویست.

- (تیۆ) بەمخابنەوە وتی: یەکەمجارە باسی دەکەیت، ئایا دوچاری گرفت بویت؟

- ئای (تیۆ) ... چ پرسیارێکە! بلێ دەمەوێت وەك گەمژەیەك دڵت بدەمەوە.

(تیۆ) لەناکاو کەوتە گریانێکی بەخوڕ، کە پورە (مارتا) لەئامێزی گرتو ماوەیەکی زۆر ئارام ئارام رایژەند. کوڕیژگەکە وەك منداڵ بەدەم گریانەوە خەو بردییەوە. (مارتا) ئەوی لەخۆی جیاکردەوەو سەری خستە سەر بالیفەکەی.

کاتێ لەخەو رابوو چاوەکانی سورهەڵگەڕابونو بەقوربانیەك دەچوو، کەبەرەو قوربانگاکەی ببەن. پورە (مارتا) سەرفراز دەستی لێبەردابوو. بەبێئەوەی یەك وشەی لەگەڵدا بلێت خەریکی ئامادەکردنی جانتاکان بوو؛ لەهەمان کاتیشدا تەلەفزیۆنەکەی رۆشنکرد. (تیۆ) لەپەنجەرەکەوە لەوخەڵکە زۆرەی دەنواڕی دەپەڕینەوە، بەڵکو بۆ جارێکی دیکەش (ئاشی کو) لەنێوانیاندا ببینێت. چونکە بێهیوابوو لەبەرامبەر تەلەفزیۆنەکەدا رۆنیشت و پرسی: ئەم بەرنامەیە چییە؟

- هیچ، فیلمی پوچی فەرەنسییە بەوەرگێڕانی ژاپۆنی.

- فیلم، ئەکتەرەکە کێیە؟

- هونەرمەندێکی کۆنە (بریژیت باردۆ)، چەند بەو قژە لولەیەوە نابوتە!

- (تیۆ) بەجۆرێك مەخابنەوە وتی: منیش قژم لول بوو.

(تیۆ) لەجێگاکەی نەبزوتو هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا. پورە (مارتا) تەلەفۆنی بۆ بەشی پێشوازی هۆتێلەکە کرد تاجانتاکان ببەنە خوارەوەو ئەوەش کاتی دەویست. (تیۆ) دەیویست بە سودوەرگرتن لەو ماوەیە دوبارە پشوو بدات.

- پورە (مارتا) شانەکانی گرتو گوتی: خێراکە، کوبرای گەورە.. دەبێت بڕۆین.
- ناتوانین کەمێکی دیکەش بمێنینەوە.
- ئەی بەڵێنی چاو پێکەوتنەکەمان لە (مۆسکۆ) چی؟ تۆ نازانیت ئەوێ چەند ئاڵۆزو دژوارە!
- (تیۆ) بەئحم کردنێکەوە وتی: لەوێ دەبمە پارچەیەك سەهۆڵ! زۆر ناخۆشە!
- تارادەیەك وایە. بەبڕوای من ئێستا لەبارێکدایت دەتوانیت (روسیای پیرۆز) بناسیت.

## زەلاتەی روسو سۆڤیەت

(تیۆ) لەفڕۆکەکەدا ئارەزووی خواردنی بۆ گەڕایەوە، زۆر قسەی نەدەکرد، بەلام هەر خواردنی دەخوارد.

- پورە (مارتا) بە وریاییەوە سەری باسەکەی کردەوەو گوتی: بەتەواوی دەربارەی روسیا چیدەزانیت؟
- ئێستا حەزم بەقسەکردن نییە.
- لەبرسامردووا هیچ نەبێت لەبەرخاتری من ... باشە، چی دەربارەی ئەم ولاتە دەزانیت کە بەوزوانە پێ دەنێینە ناوی؟
- بەنارەزاییەوە وتی: پێشتر ناوی یەکێتی سۆڤیەت بوو، بەهۆی بونی پیاوێکی ترسناکەوە بەناوی (ستالین) رژێمێکی سەرکوتکەری تەواو هەبوو. ئەستێرەیەکی سوری گەورەیان لەسەر باڵەخانەیەکی قەلائاسا لە (مۆسکۆ) داناوە، کە پەیامنێرەکان هەموو رۆژێ لەبەردەمی ئەو شوێنەوە روداوەکان بەبینەرانی تەلەفزیۆنەکان دەگەیەنن. ناوی ئەو قەلایە (کرملین)ە.
- باشە. ئەی دەربارەی روخاندنی دیواری بەرلین چی؟
- نازانم. زۆر منداڵ بوم. لەیادمە دایكو باوکم روخساریان بەتەلەفزیۆنەکەوە چەسپ کردبوو نەدەجولان. خەڵکی بەخۆشییەوە خەریکی روخاندنی دیوارەکەبون.
- ئەی پێش (ستالین) چی؟
- (تیۆ) بەدڵنیاییەوە وتی: پێش (ستالین) لەروسیا (تزارەکان) هەبون، وەك (لینین).
- پورە (مارتا) هاواریکرد: ئای... ئای،دەزانیت (لینین) هەمان ئەو کەسەیە لەساڵی (١٩١٧) لەروسیا شۆڕشی بەرپاکرد؟

- وەلامیدایەوە: بەلْێ. دروست پێش کۆتایی جەنگ: هەلومەرجی روسیا خراپ بوو... ئەم فەرمانیدا (تزار) گوللەباران بکرێت، تابەبەکارهێنانی کرێکارانو بانگکردنیان بۆ شۆرش دەسەلات بگرێتەدەست. ناوی لەمە ناوە (کۆمۆنیزم)، بەلام دواجار وەك هەمیشە چارەرەشبون. مامۆستاکەمان دەلێت، (لینین) یەکەمین (تزاری کۆمۆنیست)بوو. من نازانم، بەلام پێموایە (لینین) زۆردارێکی کاملْبوو.

- پورە (مارتا) وتی: باشە. دیارە کاتێك ئارەزوو بکەیت باش قسە دەکەیت. ئایا هیچ دەربارەی کۆمۆنیزمی روسی دەزانیت؟

- هاواریکرد: شتێکی پشتگوێخراو، کولاگ! ولات پربوو لەبەندیخانە، خەلکی لەئازادی بێبەشکرابون. کاتێك ئەوەی بیریان لێدەکردەوە دەیاندرکاند لەنەخۆشخانەی دەرونیدا زیندانی دەکران، بەلام باوکم دەلێت ئەمرۆ ئەو ولاتە پرە لەهەژارانو نەداران.

- راستی دەکات. ئەی دەربارەی ئاینەکەی؟

- هیچ نازانم. لەتەلەفزیۆندا بینیومە قەشەکانیان.. نانا.. ئەسقەفە مەزنەکانیان کلاوی قوت لەسەر دەکەن. ئاینەکەیان جۆرێکە لەکریستیانی، وانییە؟

- (تیۆ) تۆ ناوی ئاینەکەیان دەزانیت، ئەوانە ئەرتەدۆکسن.

- بەدەنگی بەرز وتی: ئۆو.. نا.. ئەرتەدۆکس یۆنانین!

- پورە (مارتا) بەپێداگرتنەوە وتی: یان روس. (ئۆرشەلیم) بێنەوە یادت. سەردانی (نزرگەی - پیرۆز)...

- (تیۆ) بەسکالاوە وتی: بەلْێ، ئالۆزترلەهەموو ئەو تەلارانەی بینیبوم. لەوێدا چوار یا پێنج لەپەیرەوانی کلێسای جیاواز سەریاننابوو بەیەکەوە...

- ئەگەر لەیادت بێت باوکە (دوبۆر) دەیوت کریستیانەکان لەنێو خۆیاندا چەند لقێکیان هەیە. کلێسای ئەرتەدۆکسی یەکێك لەیەکەمین پرشنگەکانی بوو، کە کلێسای خۆرئاوای لەخۆرهەلات جیاکردەوە. کلێسای خۆرئاوا پەیرەوی لە (پاپا) دەکردو خۆرهەلاتیش لە (ئەسقەفە گەورەکان)ی خۆیان.

- واتە کلێسای خۆرهەلاتیش دوبارە بوو بەچەند لقێکەوە؟

- بەلْێ، ئەرتەدۆکسی یۆنانی، کیپتیەکان، سیریاکەکان[1]...

- سیریاکەکان؟ ئەوانە ناناسم.

---

[1] سریاکەکان: پێموایە مەبەست لەو کریستیانیانەیە بە سریانی – ئاشوری ناودەبرێن.

- سەیر نییە! زۆربەی (سیریاکەکان) لە(لوبنان)و (هندستان)دا دەژین. بەهۆی زمانی تایبەتی ئاینیانەوە لەگەڵ لقەکانی دیکەی کریستیانیدا جیاوازن. لەسروتی نزای بەکۆمەڵدا هەندێکجار بەزمانی (ئارامی) پاڕانەوە دەکەن، کە زمانێکی باوی (فەلەستین)ی کۆنەو لەوانەیە زمانی خودی (عیسا)ش بوو بێت.

- ئەم ئاڵۆزییانە گومڕام دەکەن. ئەرتەدۆکسەکانی روسیا چ تایبەتمەندییەکیان هەیە.

- تێناگەم. ئێمە دەچین بۆ بینینی روسیا یان ئاینی روسەکان؟

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: ئەو دوانە لەیەکدی جیاناکرێنەوە. حکومەتە کۆمۆنیستەکان بەدرێژایی حەفتا ساڵ هەوڵیدا ئەو دوانە لەیەکدی دابڕێت. (پاپاکان)یان خستە ژێرچاودێری و ئەشکەنجەوەو دژی ئاینی (روس) جەنگیان بەرپاکرد، بەڵام هەر کەئیمپراتۆرییەکەیان لەبەریەك هەڵوەشا ئەفسانەی (روس) بەیەك پیاکێشان هەڵسایەوە.

- باشە، ئەگەر کریستیانی کەواتە بڕوایان بە (عیسا) هەیە..

- بەڵێ، بەڵام بەلای ئەوانەوە خاکی (روسیا) وەك (دایك)ێکە، کە دروست وەك (مەسیح) بەسەر خاچێکەوە دوچاری گرفت بوو. شتە سەرەکییەکە دوچاری رەنج و ئازاربونە.

- وەك (بودا) خۆشەویستەکەی تۆ؟ (هەموو شتێك لەم جیهانەدا ئێش و ژانە).

- بێئەقڵ مەبە! رەنج و ئازار یەکەم وتەزای چوار حەقیقەتە بزرەکەیە.

- لەگەڵ سێ حەقیقەتی دیکەدا (بودا) ئەوەی پیشانداوە کەچۆن دەبێت (رەنج و ئازار) پارێزراو بێت. کەچی لە (روسیا) باسی ئێش و ژان دەکەن‌و رێزی لێدەنێن.

- (تیۆ) بەسوکایەتییەوە وتی: زیرەکانەیە! بۆ رەنج و ئازار چ رێگایەکیان داهێناوە؟

- ئاڵۆزنییە. هێندە بەسە ژیان بەخۆت بسپێرێت تاکاری خۆت بکەیت، بەڵام ئیمانداەرەکانی (روس) هەندێك لەوەش زیاتردەڕۆن. بۆ نمونە خۆیان فڕێدەدەنە ناو ئاگرەوە.

- (تیۆ) هاواریکرد: هیوادارین نەچین بۆ بینینی ئەو شانۆیە!

## مەرگی سور

- نەخێر، بڕیار نەبوو لە (مۆسکمۆ) خۆکوژی لەو شێوانە ببینن، بەڵام ئەو دیاردەیە لە (روسیا) رویداوە. لەسەدەی حەڤدەدا، لەوکاتەدا کە (خۆر – پاشا) واتە (لویس چواردە) لە (فەڕەنسا) حوکمڕان بوو هەزاران کەس لەئیمانداەرە روسەکان خۆیان لەکۆلیتەی گوندەکاندا (isba) زیندانی دەکردو ئاگریان لەکۆلیتەکە بەردەدا. پیاو، ژن‌و مناڵ هەموو ئەوەیان بەلاوە پەسەندتربوو لەناو ئاگردا بسوتێن نەوەکو دەست لە ئاینەکەیان بەربدەن.

- (تیۆ) وتی: شەهیدانی ئەشکەنجەدراو!

لەرویەکەوە وایە. بەلام لەو روداوەدا ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە سروشتو ماهییەتی ئەشکەنجەدەربوو. پرسەکەش ئەوەبوو، کە لەژێر فشاری نەجیبزادەکانی (روس) یان قەشە (پاپا) ناساییەکانی ولاتدا (تزار ئەلکیسی)[1] زۆر ئیماندار دەیویست کڵێسای روسی چاك بکات، کە جۆرەها رەفتاری شێتئاسایانەی تێدا روویدەدا. لەپێناوی ئەوکارەشدا داوای لە (نیکۆن)ی ئەسقەفی گەورەی (نۆڤۆگۆرۆد) کرد یارمەتی بداتو ئەویش داوای ملکەچیو گوێڕایەڵی تەواوی لە (تزار)کرد.

هۆی هەڵبژاردنی (نیکۆن) ئەوەبوو دەیتوانی وەك ئەسقەفێکی گەورە (پۆتریارش - Potriarchc)ی روسی لەسەر بابەتە جیاوازەکان لەگەڵ ئەسقەفە گەورەکانی (یۆنان) گفتوگۆ بکات، چونکە زنجیرەی پلەداری روسی زۆر خۆی دوور رادەگرت لەدوو کڵێساکەی دیکە: لەگەڵ کڵێسای کاسۆلیکی بەهۆی بوونی (پاپا)وەو لەگەڵ کڵێسای ئەرتەدۆکسی (یۆنانی) بەوهۆیەوە کەئەم کڵێسایە نەیاری سەرسەختی کڵێسای روسو میراتگری کڵێسای ئیمپراتۆری (بیزانس)ی بوو، کە لەسەدەیەك لەوەوپێشەوە پەیوەندی لەگەڵ پچڕاندبوو.

لەناکاو (نیکۆن) لەو میانەدا ناپاکی لەئۆردوگاکەی خۆی کردو هەندێك خونەریتی روسی لەگەڵ چەند بەشێك لەئادابی یۆنانیدا گونجاند. باوەڕداران دەستیاندایە هەڵگەڕانەوەو یاخیبون. کڵێسای خەڵکی روس کڵێسای هەزارانو نەداران، دانیشتوانی روس و ئۆتۆنۆم لەئیمانی خەڵکەوە سەرچاوەی گرتبوو. زۆرداری گەورەش لەو روداوەدا هەمان ئەسقەفی ئەرتەدۆکسی بوو، کە دوای ریفۆرمی ئاینی کەوتبوو.

- (تیۆ) وتی: باشە، چ گۆڕانکارییەکی گەورەی ئەنجامدابوو؟

- روداوەکە بەوجۆرەبوو، کە سەرەتا بۆ ئەنجامدانی ریفۆرمی ئاینی لەجیاتی دوجار وتنی (ئالالویا)[2] سێجار بوترێت. لەنزای (من بڕوام بەخوا هەیە) یەك وشەی یەکەم بسڕێتەوە: بەکورتی چەند داواکارییەکی بچوکی لەوجۆرەبوو. لەنێو ئەو گۆڕانکارییە سادانەدا (نیکۆن)ی ئەسقەف ئالوگۆڕی لەوێنەکێشانی خاچی سەر سینەی کریستیانەکانیشدا ئەنجامدا.

---

[1]. Alexis: ی یەکەم (میخایلۆڤیچ) لە (١٦٤٠ – ١٦٧٦) تزاری روسیا بوو، باوکی (بگرس)ی گەورەیە. لەسەردەمەکەیدا راپەرینێکی جوتیارانەی گەورە بەرابەری (ستانکارازین) رویدا.

[2]. Alle Livie: ئەم زەبورە، کە لەبنچینەدا بەمانای (پەهوە ستایش بکە)یە، وەك ئاماژەیەکی خۆشی لە سرودەکانی مەسیحیدا دێت.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: واتە چەند جۆرێك وێنەكێشانەوەی خاچ هەیە؟. ئاماژەی خاچ بەدەست دەكێشنەوە، ئەمە شتێكی ئالۆز نییە.

- باشە، بەڵام بەكام پەنجەی دەست؟. تائەوكاتە روسەكان بەدوو پەنجە دەیانكێشا. ئەسقەفی ریفۆرمخوازی ئاینی فەرمانی دەركرد لەوەودوا دەبێت روسەكان بەسێ پەنجەی دۆشاومژە، بالابەرزەو برای توتە ئاماژە بكەن؛ وەك ئەرتەدۆكسەكانی یۆنان. واتە دەبوو پەنجەیەكی دیكەش زیاد بكەن.. لەوكاتەدابوو، كە هەڵگەڕانەوەو یاخیبون دەستیپێكرد لەناو ئەو كەسانەی پێیان دەوتن (باوەڕدارە كۆنەكان)، بەرابەرایەتی قەدیسێكی خاوەن بەهرە بەناوی (ئۆڤاكۆم)، كەخۆشی لەدەستەی قەشە سادەكانی لایەنگری ریفۆرم بوو. ئەم یاخیبونە بەپشتیوانی بازرگانانو چینی نەجیبزادەكانی بە(بویار) ناودەبران ماوەیەكی زۆری خایاندو بەخۆكوژی بەكۆمەڵ لەناو ئاگردا یان (مەرگی سور) دوایی هات. باوەڕدارەكان بەبەرگی سپییەوەو بەمەشخەڵێك بەدەستەوە دەچونە ناو ئاگرەوە.

- (تیۆ) وتی: مردن لەپێناوی پەنجەیەكی زیادەدا، ئەوەش شتێكی پوچە!.

- بەڵام ئەم پەنجە زیادكردنە لەنێو ریفۆرمی ئاینی ئەسقەفدا لەدیدی توندرەوەكانەوە هەموو شوناسی كڵێسای روسی دەخستە بەرمەترسی. ئاینی ئەو خەڵكە لەناو دڵو كرۆكی ئیمانی گوندو شارۆچكەكانی روسیادا رەگی داكوتابوو. ئەو فەرمانەی لەسەرەوە دابەزیبوو زریانێكی دروستكرد، چونكە بەزۆرو توندوتیژی دەسەپێنرا. (باوەڕدارە كۆنەكان) بەهەڵگەڕانەوەیان تەنها مەبەستیان ئەوەنەبوو پارێزگاری لەئاماژەی خاچەكە بكەن، بەڵكو دەیانویست درێژە بەو باوەڕە بدەن كەبەقوڵی بەخاكەكەیاندا رۆچووبوو. ئەوان واهەستیان دەكرد دەسەڵاتێكی زۆرداریی دەیەوێت لەجیاتی ئەوان سەبارەت بەئاینو باوەڕیان بڕیاردەر بێت. لەبەرئەوە دەستیاندایە روبەڕوبونەوەو شەڕو ئاگرنانەوەو لەماوەی بیست ساڵدا بیست هەزار كەس كوژران.

- (تیۆ) وتی: كۆكوژییەكی راستەقینە. لەژاپۆن باشتربوو، بەلایەنی كەمەوە لەوێ تەنها خۆیان دەكوشت! كەچی لێرە لەپێناوی پەنجەیەكی زیادەدا خەڵكیان كوشتوە.

- هەمویان نەمردن. (باوەڕدارە كۆنەكان) توانیان ئاماژەی كۆنی كێشانی خاچ وەك رەواڵەتێكی ئازادیان لەبەرامبەر دەوڵەتدا بپارێزن. هێشتا سێ ملیۆن كەس لەسەر بڕوای كۆن مابونەوەو ملكەچی ئەرتەدۆكسی فەرمی نەبون، چونكە پاش ریفۆرمی توندوتیژانەی كڵێسای روس (نیكۆن) لەپۆستەكەی بەدەرنرابوو. بەڵام تازە درەنگ وەختبوو. (تزار)ێكی نوێ هاتە

سەرحوکم.. (بوترسی گەورە)، پیاوێکی، کە خاوەنی خوونەریتێکی سەربازیانەبوو، لەقوتابخانەی ئایدیالّی پروسەکاندا گەورەببوو. دەیویست وڵاتەکەی نوێبکاتەوەو لەخۆرئاوای نزیك بکاتەوەو ئامادەش نەبوو لەو رێگەیەدا هیچ جۆرە ئیمتیازێك بەکڵێسە بدات. واتە خۆی کردە ئەسقەفی گەورەی کڵێسەی روسیو کڵێسای کێشایە ژێر دەسەڵاتی رەهای دەوڵەتەوە.

- (تیۆ) پرسی: ئەمکارەی چ بەرهەمێکی هەبوو؟

- پورە (مارتا)، کەدەنگی گۆڕا، وتی: مەبەستت چییە لەوەی چ بەرهەمێکی هەبوو؟ دەزانیت لەفەرەنسا لەکاتی جیاکردنەوەی ئاین لەدەسەڵات نزیکبوو جەنگی ناوخۆیی لێبکەوێتەوە؟

- کوشتنی هەموو پرۆتستانەکان؟

- بچکۆلی نەزان!.. پێش ساڵی (١٩٠٥)ی سەرەتای هەمان ئەم سەدەیەدا کڵێسای کاسۆلیکی دەسەڵاتێکی بەرچاوی لەبواری پەروەردەو فێرکاریدا هەبوو. کۆماریخوازەکان، کەخۆیان بەمیراتگری شۆڕشی فەرەنسا دادەنا، لێبڕاوانە بڕیاریاندا پەیوەندی دەوڵەتو کڵێسا بپچڕن، کە تا ئەوکاتەش دەوڵەت موچەی پێدەدان.

- (تیۆ) وتی: سەیرە! ئەگەر موچەیان بەقەشەکان بدایە چ جیاوازییەکی دەبوو؟

- باشە، ئەگەر بڕیاربوایە سیستمی کاسۆلیکی ئاینی فورمی بێت، ئەوکاتە ئەرکی کەمایەتییەکەمان چیدەبوو؟. پێش (١٩٠٥) فێرکاری ئاینی لەقوتابخانەکاندا شتێکی ناچاری بوو. (فاتۆ)کەی تۆش کە موسڵمان بوو ناچاربوو راسپاردەی کریستیانی بخوێنێت.

- (تیۆ) بەگاڵتەکردنەوە وتی: باشە، هەردوکمان باش پێکەوە دەگونجاین.

- ئایا دەتەوێت (فاتۆ) بکەیتە کریستیانی؟. لەئیسرائیل کامەیان بەباشتر دەزانیت سکولاریزمەکان (لاییکەکان) یان دەمارگیرەکان؟

- (لاییکەکان). بەڵام ئەمە نابێتە رێگر لەوەی لەقوتابخانەکاندا وانەی ئاینی بوترێتەوەو فێری ئاین بکرێن.

- پورە (مارتا) وتی: ئەگەر مەبەستت هەموو ئاینەکان بێت رازیم. دەبێت مێژوی ئاینەکان لەقوتابخانەدا بخوێنرێت، بەڵام ئاین...

- (تیۆ) وتی: بڕوانە، ئەگەر بەوجۆرە بوایە ئیدی پێویستی نەدەکرد بۆ ئەم گەشتە بچین.

- ئەگەر سەبارەت بەئاینەکان ئاگایی زیاتر لەناو کۆمەڵدا هەبوایە دەمارگیری ئاگری بەهەموو شوێنێکەوە نەدەناو گروپە ئاینییەکان نەدەکەوتنە کوشتنی خەڵکی بێگوناه.

- (تیۆ) باوێشکێکیداو گوتی: وەك ئەو روسە شێتانەی خۆیان لەکوانوی ئاگر دەهاویشت. لەبیستنی ئەوجۆرە بەسەهاتانەی خەڵك لولبومو هەر کاتێك دەچمە ولاتێکی نوێوە یەکێك لەو چیرۆکانە لەهەگبەکەت دەردەکێشیت.

- ئەوە پەسەند دەکەم، کە تارادەیەك قسە زۆر دەکەم. چی بکەم (سیناریۆ)کان لەهەموو شوێنەکان وەك یەکە. بیهێنە بەرچاوت، کە کۆکوژییە ئاینییەکان، گرنگترین پرس...

- (تیۆ) بەناڵەکردنەوە وتی: حەز ئەکەم بخەوم.

- باشە، راستدەکەیت.

## کۆڵیت لەسەر شێوەی پەنجەی مریشك

- بەلام لەوکاتەدا، کە پورە (مارتا) دەیویست چاو گەرم بکات، (تیۆ) شانی گرتو رایتەکاندو گوتی: دەترسم. خەو لەچاوانم تاربوە. بۆ لەروسیا جادوگەرو ئەفسونبازان نییە؟. کاتێك منالبوم دایکم چیرۆکی روسی بۆ دەخوێندەوە لەوێنەی کۆلیتی شێوە قاچی مریشکەکانو ئەو ژنانەی رەفتاریان لەگەڵ منالان خراپبوو...

- پورە (مارتا) وتی: دوبارە بەهانەیەکی تازە. تۆ لەشەیتانەکانی (تبت)و خواکانی هندستان ناترسیت ئێستا لەتاو مریشکی جادویی دەلەرزیت؟ لەپەرییەکان ناترسیت؟.

- نەخێر، چونکە لەگەڵ ئەوەی روسەکان جیاوازە.

- بەهیچ جۆرێك وانییە. لەلای ئێمە جنۆکەو فریشتەکان لەلای خواکانەوە دێن. لەلای روسەکان (بابایاگاس - babaaiEgas)ـەکانو خانوی پەنجە مریشکەکانیان بریتییە لەمیراتییەکی کۆنی بڕواو ئیمانی دێرینەیان، کە تەریقەتی ئەرتەدۆکسی هارپوێتیو تێکیشکاندوە. ئەوەباشتربوو ئەو باوەڕانە بەزیندویی سەرنجڕاکێش دەبون..

- (تیۆ) لەرزی: لەلای تۆ سەرنجڕاکێشن، لەلای من کاموسن...

- هۆکەی ئەوەیە دایکت ئەفسانەی (روسالکاس - rousalkas)ەکانی بۆ باس نەکردویت، کە خواوەندی دارستانین. روسیاش وەك زۆربەی سەرزەمینەکانی دیکەی ئەم جیهانە زۆرجار کەوتۆتە بەرهێرشو پەلامارو شەڕی بەردەوامبوە. بێگومان لەهەندێك بەشیدا خونەریتی جیهانگیری ماوەتەوە. (مەغۆل)ـەکان ماوەیەکی زۆر روسیایان داگیرکردبوو. ئەم خاکەش ئەفسانەی جوانی ئەوانی پاراستوە، کەتیایدا خراپە بەسەرچاکەدا زاڵ دەبێت. بڵێ بزانم دەبێت چی لەگەڵ خراپەدا بکرێت؟

- دەبێت شەڕو جەنگی لەگەڵدا بکرێت. ئاسانە.

- بۆ ریشەکێشکردنی خراپە، سەرەتا دەبێت روخسارێکی پێبدرێت، روخساری شەیتان. جادوگەر، خوانەناس، جولەکە. پێرستی بونەوەری (خراپ) بێکۆتایە، بەڵام رێگایەکی دیکە بۆ بەرجەستەکردنی (خراپە) ئەوەیە بەپێرستە دێرینەکاندا بچینەوەو ژیان بەبەر ئەو بەرجەستانەدا وەك خێوو خواوەندی تایبەت بکەیتەوە. بەچاوپۆشی لەخواوەندی تایبەتی چاکە یان خراپە دوبارە زیندویان بکەیتەوەو بیانگەڕێنیتەوە بۆ جیهان. هیچ وڵاتێك لەسەر زەویدا نییە لەلای خۆی فریشتەی چاکەکارو میهرەبانو جادوگەرانی خراپەکارو پیس، چاکەو خراپە، کەسی پیرۆزکراو و مرۆڤی گورگئاسای نەبێت، بۆ نمونە (روسیا) پێشئەوەی ببێتە کریستیانی وڵاتی (ئانیمیست)[1]ەکان بوو. ئەم باوەڕە هەرگیز لەناو کۆمەڵدا بەتەواوی نەسڕاوەتەوە.

- کەواتە هەموو روسەکان ئەفریقایین؟

- پورە (مارتا) وتی: هەمویان. باشترە بڵێین (پولیتێست)، کە کەسێکە ئیمانی بەخواوەندە جۆربەجۆرەکان هەیە.

- (تیۆ) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: دوبارە وشەی سەیرو سەمەرەو ئاڵۆز! ناتوانیت ئاینێکی سادەترم بۆ بدۆزیتەوە. بۆ نمونە ئاینێك بەچەند خوایەکی باشو میهرەبانو بەبێ شەیتانو جنۆکەو فریشتە؟

- بەداخەوە. لەم دەبۆیەدا لەوجۆرە کاڵایە دەست ناکەوێت. بەڵام ئەگەر تۆ دەرك بە (ئاینی ئێش و ژان) لەروسیادا بکەیت دەبینیت، کە جنۆکەو جادویان نییە.

- پێویستی بەدوبارە رونکردنەوە هەیە...

- پورە (مارتا) بەسیمایەکی راستەقینە، بەڵام دەستکردەوە وتی: بەڵێن دەدەم لەروسیا روبەڕوی هیچ پێیەکی مریشك نابیتەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا بەڵێن دەدەم لەشوێنەکانی دیکەدا پەنجەکانی مریشك دەبینیت.

- کەواتە بڵێ ئەوەی ئێستا وتت لەپەیامێکی دیکە دەچێت.

- بەخەندەوە وەڵامیدایەوە: هێشتا زووە. بەوجێگایە نەگەیشتوین.

- (تیۆ) بەئحمەوە وتی: حەز بەم وڵاتە ناکەم.

- کەواتە بڵێ حەزت دەکرد لەژاپۆن بمێنینەوە!

---

[1]. هەر وەك لەپێشتردا رونکرایەوە (ئانی میست – Animiste)ـەکان پەیڕەوی لەوە دەکەن کەرۆح لەهەموو دیاردەیەکی ژیاندا هەیەو هەموو شتێك وەك مرۆڤ خاوەنی رۆحە.

- لەویش نا. (ئاشی کو) دەستگیرانی خۆی هەبوو.
- کەواتە ئەوە هۆی خەمبارییەکەتە!. بەڵێن دەدەم لەروسیا دۆستت دەبێت. ئێستا سەرەتای بەهارەو درەختی (بی) نغرۆی لق و پۆپی نوێ دەبن.
- کەسێکی گێلاسی نغرۆی پشکوتن بینیبێت درەختی (بی) بەلق و پۆپی نوێوە ترسهێنەرە.
- تارادەیەك ئەوە هەمان شتە دەربارەی گێلاسی ژاپۆنی دەتوت پێشئەوەی (ئاشی کو) ببینیت.

## (ئەلێکس ئیفرۆمۆڤیچ)

فرۆکەخانە گەورەکەی (مۆسکۆ) زۆر لەوەترسهێنەرتربوو، کە (تیۆ) بیری لێدەکردەوە. لەناو لافاوی ئاپۆڕەکەدا گەشتیارەکان لەهەموو لایەکەوە لەژێر چاودێری کارمەندانی گومرگدابون.

- پورە (مارتا)، کە یەك بەیەکی جانتاکانی بۆ پشکنین دەکردەوە، لەبەرخۆیەوە وتی: خودا دەزانێت چەند نەفرەتم لەیەکێتی سۆڤیەت هەبوو، بەلام بەلایەنی کەمەوە ئەوکاتە جانتای خەڵکیان نەدەخستە ژێر پێوە!.
- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە پرسی: ژێر پێی کێ؟
- پورە (مارتا) بەلێبڕاوانە وتی: کاتێك سیستم تێکدەچێت هەموو شت ئەگەری رودانی هەیە. لەسەردەمی پێشودا لەریزی کۆنترۆڵ کردنی پاسپۆرتدا دەمایتەوە، جانتاکانت بەکارمەندانی گومرگ دەسپارد تاتەواو پشکنینیان بۆ بکرێت. پۆلیسەکان بەتوندی چاودێرییان دەکرد، بەلام هیچ نەبزر دەبوو نەدەدزرا... ئێستا ناچارم هەموو جانتاکان دابخەم.
- (تیۆ) بەنیگەرانییەوە وتی: بێگومان لە (مۆسکۆ) دۆستتان هەیە؟
- پورە (مارتا) ئەودیو دیوارێکی لەشیش دروستکراوی پیشانداو گوتی: دەبێت لەوێ بیاندۆزمەوە، با بڕۆین.
- پورە (مارتا) رۆشت و پاش کەمێك بەهاوەڵی ژنێکی موو خورمایی شێوە پشیلە گەڕایەوەو بەهەناسە توندییەوە وتی: بەداخەوە نەمتوانی (ئەلیوشا) بۆ ئێرە بێنم، بەلام ئەم خاتونە ژنێتی.
- (ئیرینا)، کە ژنێکی قەشەنگ بوو، لەکاتێکدا پێڵوەکانی چاوی بەسەرسامییەوە دادەخست وتی: I chbin soglucklhch، mein kind،Gruss Cott! Theo
- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئەوە زمانی روسییە؟

- پوره (مارتا) رونیکردەوە: (ئیرینا) لە (نەمسا) فێری زمانی ئەڵمانی بووە. دەڵێت خۆشحاڵە بەبینینت.

- (تیۆ)، وەك رێز كەمێك نوشتایەوەو گوتی: Ich itou .باشە ئێستا چیبکەین؟

- هیچ، (ئەلیۆشا)ی هاوسەری (ئیرینا) زمانی فەرەنسی باش دەزانێت، (ئەلیۆشا)...

- ژنە جوانەكە، كە بەپەنجەی دۆشاومژە ئامـاژەی بۆخۆی دەكرد، قسەكەی پوره (مارتا)ی بڕی‌و گوتی: sine freu، mein mann. Und ich،Alioh

- پوره (مارتا) پێش هەردوكیان كەوتو گوتی: راستە (ئەلیۆشا) مێردێتی‌و ئەمیش ژنی ئەوە! ئێستا بابەخێرایی بڕۆین‌و مێردەكەی بدۆزینەوە.

- (ئەلیۆشا) بەبالأیەكی بەرزو پەرچەمی سەر ناوچاوانییەوە، بەجۆشوخرۆشەوە باوەشی بە پوره (مارتا)دا كردو بەچاوی ناو تێزاوەوە وتی: (مارتا گریگۆری ڤنا، dorogiaEa ...) زۆر بەختەوەرم!

- پوره (مارتا) ئەوی لەباوەش گرت‌و گوتی: (ئەلیۆشا)ی ئازیز..

- (ئەلیۆشا) دەسرەكەی لەگیرفانی دەرهێنا بۆ وشك كردنەوەی چاوەكانی‌و گوتی: ئای چەند خۆشحاڵم !

- (تیۆ) چرپاندی بەگوێی پوره (مارتا)دا: چیڕویداوە؟ بۆچی دەگری؟ چاوی توشی هەوكردن بوە؟

- شش، دوایی رونیدەكەمەوە.

- (ئەلیۆشا)، كە سەری بەرووی (تیۆ)دا شۆڕكردبۆوە وتی: هەروەها (تیۆ)كەی ئێمە، تەندروستیت باشە؟ لەماڵەوە خواردنم بۆ ئامادە كردووە، لەگەڵ جێگایەكی گەرم‌و نەرم.

- پوره (مارتا) وتی: ئەی ئۆتۆمبیل؟

- (ئەلیۆشا)، كلیلێكی لەدەستیدا هەڵسوڕاند، وتی: ئۆتۆمبیلی (ڤلادیمێر ئیڤانۆڤیچ)م هێناوە، بەڵام بۆ جانتاكان لەوانەیە پێویستیمان بەتەكسی بێت.

جانتاكان‌و (ئیرینا) لەتەكسیەكەدا سواربووو پوره (مارتا)و (تیۆ) لەگەڵ (ئەلیۆشا) بەئۆتۆمبیلێكی كۆن بەرەو شار بونەوە. (تیۆ) ریزێك باڵەخانەی بەرزی بینی، كە لەژێر تەمدا رەش دەهاتنە بەرچاو.

- (تیۆ) پرسی: بۆ كوێ دەچین؟

- (ئەلیۆشا) وەڵامیدایەوە: بۆ ئاپارتمانەکەمان. پورە (مارتا) لەژوری سەر ڕاڕەوکەدا دەبێت‌و تۆش لەژوری نوسینگەکەی من.

- کەواتە بۆ هۆتێل ناچین؟

- (ئەلیۆشا) وتی: دۆستەکانم لە هۆتێل دابنێم؟ کاتێك (مارتا گریگۆری ڤنا) دێتە (مۆسکۆ) لەماڵی ئێمە دەمێنێتەوە.

- (تیۆ) پرسی: بۆچی هەمیشە بە (مارتا گریگۆری ڤنا) ناوت دێنێت؟

- پورە (مارتا) وتی: لەروسیا هەمیشە بەناوی بچوکراوەی خۆت‌و باوکتەوە بانگت دەکەن. باوە گەورەت ناوی (جۆرج)بوو، کە بەروسی دەبێتە (گریگۆری) سەرئەنجام ناوەکەم دەبێت بە (گریگۆری ڤنا) واتە کچی گریگۆر.

- بەوجۆرە بێت من دەبم بە (تیۆ ژرومۆڤیچ). راستە؟

- (ئەلیۆشا) راستیکردەوە: (فیۆدۆر بەریمیمۆڤیچ).

- جوانە ئەی ناوی تۆ چی دەبێت؟

- (ئەلیکسی یفرەمۆڤیچ)، بەڵام ئێمە نازناوەکەمان پێباشترە. بە(ئەلیۆشا) بانگم بکە. بەڵام ژنەکەم بە (ئیرینا بۆریسڤنا) بانگ نەکەیت... سەغڵەت دەبێت!

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە پرسی: سەیرە، کەواتە نابێت بڵێیت (بۆریس)؟

- پورە (مارتا) دوبارەیکردەوە: شش! دوایی بۆتۆی باس دەکەم..

- (تیۆ)، کە لەو هەموو ناوو نازناوانە وڕببوو، کەوتە سەیرکردنی قەڵاکان، کە دوربەدور لە ژێر ئاسمانێکی سورباودا لوتیان هەڵبڕیبوو. لەکەناری شەقامەکاندا گردۆڵکەی بەفر هەڵدرابۆوە، بەڵام خەڵکەکە بەسەر بەفردا دەڕۆشتن. ئاسمان، کە بەئاستەم بەروناکی تیشکی خۆر روناك ببۆوە، وردە وردە تاریك دەبوو.

- (ئەلیۆشا) وتی: چانسمان هەبوو. کەش خۆشە. بەهارێکی خۆش بەڕێوەیە.

- (تیۆ) بەپەرێشنابیەوە وتی: بەم هەموو گڵ‌و خۆڵ‌و پاشەرۆیەوە!

- (ئەلیۆشا) بەپۆزشەوە وتی: هەرچۆنێك بێت بەفرەکە دەتوێتەوە. ئەو گڵ‌و خاکەش ئێمە بە(raspoutitza) ناوی دەبەین‌و نیشانەی توانەوەی بەفرە. پاش زستان دڵەکان دەکرێنەوەو دوبارە ژیان دەگەڕێتەوە.

- پورە (مارتا) پرسی: ئەمساڵ پلەی گەرما گەیشتبوە چەند؟

- ژێر پانزە پلە. زۆر سارد نەبوو.

- (تیۆ) بەترسەوە پرسی: ئێستا چەندە؟

- دوو پلە ژێر سفرو خۆر دەدرەوشێتەوە!

- (تیۆ)، کەباشتر خۆی دەپێچایەوە، وتی: کەواتە وەرزشێکی زستانەمان لەپێشە..

- بەڵام ئاپارتمانەکەی (ئەلیۆشا) گەرمو باشبوو. جێخەوەکەی (تیۆ) لەهەموو رویەکەوە خۆشبوو. دیواری ژورەکە بەکتێب داپۆشرابونو گیتارێکو کەمانچەیەك لەڕارەوەکەدا هەڵواسرابون. لەبەرامیەر ڕاڕەوەکەداو لەهەرگۆشەیەکدا بڕێکی زۆر کیسە دانرابونو لەسەر هەموو قەنەفەکان گوڵێك دانرابوو. (تیۆ) هەستی بەئاسودەیی دەکرد. خانویەکی چاكو ڕێکوپێك بوو، بەخەڵکە چاكو ڕاستەقینەو شتومەکی ناوماڵەکەشەوە. ئەو شتانەی مێزی نانخواردنەکانی پێڕازابوۆوە گەشێکی ئەفسانەیی بەزوری نانخواردنەکە بەخشیبوو. کاتێك (ئیرینا) بەسینییەکی گوڵدار قۆرییەك (چا)ی بۆ ژورەکەی (تیۆ) برد، (تیۆ) لەخۆشیدا هەڵبەزییەوە، (ئیرینا) بەئەڵمانی پرسیاری کرد. (تیۆ)ش بەدودڵییەوە پرسی: من (چا)م پێباشترە. (Kirschen) گێلاسە؟

- پورە (مارتا) وتی: دەبێت تاقیبکەیتەوە، زۆر بەتامە، مرەبای قۆخە.

- (ئەلیۆشا) لەژوورەکە چووە دەرەوەو بەدوو دەفری ماسی سورکراوەوەو خەیار شۆرەوە گەڕایەوەو پاش دوو سێ جار هاتوچۆ مێزی نانخواردنی ڕازاندەوە: نان، گۆشت، هێلکەی کوڵاو.

## دەربڕینی هەستەکان بەجۆرێکی دیکە

- دەمەوبەیانی دەنگە دەنگێکی تۆقێنەر (تیۆ)ی بێدارکردەوە، کەبینی پورە (مارتا) لەتەنیشت جێخەوەکەیەوە دانیشتوە گوتی: چی رویداوە؟ بومەلەرزەیە؟

- نەخێر، دەنگی لولەکانی تەلارەکەیە. لەم باڵاخانە کۆنانەی سەردەمی (ستالین)دا کەس لەو مەترسییە بەدور نییە.

- بەراست. دەمەوێت بزانم بۆچی دوێنێ دوجار ڕێگربویت قسەبکەم؟ دوجار! کاتێك پرسیارم کرد ئایا (ئەلیۆشا) نەخۆشی هەوکردنی چاوی هەیە؟

- باشە، لێرە بەوجۆرەیە، کە لەکاتی بینینەوەی دۆستانی روسیدا نابێت ڕێگری لەهەستەکان بکرێت. لێرە کاتێك دوو هاوەڵ پاش ماوەیەك دابڕان یەکدی دەبیننەوە دەگرین، ئاساییە.

- (تیۆ) بەهێمنی وتی: کەواتە نازانن خۆشی چییە؟

- (تیۆ) ..ئەوە بەتەواوی ئەوپەڕی دڵشادبونە. فرمێسکی روسەکان خۆشخاڵی، پەژارەی رابردوو، ئازار یان بەختیاریو شادمانیان دەردەبڕێت. ئەو ئەسرینە ئاماژەو نیشانەی رۆحە،

بارێکە لەنێوان چێژو ئازاردا. لە روسیدا بەوبارە دەڵێن (doucha) یان (رۆح)و شتێکە گەرم، مەفتونبونو خۆش. لەفەرەنسا ئێمە تەنها سۆزو پەرۆشییەکی وشكو بەتاڵمان هەیە. دۆستە روسەکانم خاوەنی سۆزو پەرۆشی گەرمن. (ئەلیۆشا) بەپێچەوانەوە زۆر تەندروستو باشە، بەڵگەش فرمێسکەکانێتی، کە بەهۆی لێوان لێوی لەخۆشەویستییەوە لەچاوانی دەرژێن.

- (تیۆ) بەدودڵیو گومانەوە وتی: ناتوانم هەستێکی لەوجۆرە پیشان بدەم، کاری چییە؟

- مێژووی مۆزیك لەزانکۆ دەڵێتەوەو (ئیرینا) وەرگێڕە.

- ئەوجارەی دیکەش، کە رێگری قسەکردنت لەمن کرد باس باسی (ئیرینا)و ناوی بچوکی (بۆریس)بوو! کەنابێت ئەو وشەیە بدرکێنم؟

- پورە (مارتا) بەخەندەوە وتی: ئەمەیان بەهۆی سیاسەتەوەیە. (ئیرینا) دەربارەی حکومەت هەستێکی شلوقو شڵەژاوی هێندە خراپی هەیە تارادەی سەرگێژبون. ماوەیەك زۆر بەتوندی بەرگری لە(بۆریس)[1]ـە، ئازیزەکەی دەکردو پاشان بەهەمان گەرموگوڕییەوە نەفرەتی لێکرد.

- (تیۆ) بەهاودەردییەوە وتی: وەکو دایکم! لەیادتە لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا چۆن دەفرەکانی بەزەویدا کێشاو شکاندی؟

- بیهێنە بەردیدی خۆت، کە نزیکەی یەك سەدە روسەکان نەیانتوانیبوو بەئازادی بیروڕا دەربڕنو گفتوگۆو مشتومڕ بکەن. پۆلیسی شاراوە مایکرۆفۆنی لەهەموو شوێنێك دانابوو. ئەگەر کەسێك نارەزایەتی دەربڕیایە رەوانەی پزیشکی دەرونی دەکراو بەرەفتاری ناشایستەی کۆمەڵایەتی تاوانباردەکرا، ئەوکاتە بەهۆی دەرمانی تایبەتەوە نەخۆشەکەیان لە هێزی داریکردنو جیاکردنەوەدادەماڵی.

- (تیۆ) پرسی: ئەی سایکۆلۆژیستە راستەقینەکان چیاندەکرد؟

- بەگشتی زانستی سایکۆلۆژی قەدەغەبوو. بەرهەمەکانی فرۆید وەرنەدەگێڕان. نوسراوەکانی لەنێو زانستەکانی دیکەدا مۆرکی وردە بۆرجوازی لێدرابوو؛ بەگڕی ئاگر سپێرابوو. دەقو کتێبە قەدەغەکراوەکان بەنهێنی دەستاودەستیاندەکرد. دەنگی کەس دەرنەدەهات.

- هەرگیز شتی لەمجۆرەم نەبینیوە. بەستنی زمان؟! ئەوە شتێکە هەرگیز پەسەندی ناکەم.

- خوانەتکاتە بەندو دیلی دیکتاتۆر. لەو رژێمانەدا ژیان سەختە. پاشان کاتێك لەپڕ مرۆڤ لەدیلێتی ئەو جۆرە سیستمانە رزگاری دەبێتو دەبینێت دەتوانێت دوور لەمەترسی قسەبکات، جڵەوی هەڵبژاردنی لەدەستدەدات، زۆر سەرنجڕاکێشە.

---

[1]. مەبەست لە (بۆریس یەلتسن)ی سەرۆك کۆماری روسیایە.

- (تیۆ) لێوەکانی خۆی گەستو گوتی: من باوەڕم بەوەنییە. ئارەزووش لەکێشمەکێشو شەڕناکەم. هەر ئێستاو لەهەموو شوێنێك کوشتوکوشتار دەبینین، ئینجا سیاسەتیشی بچێتەسەر.

- بەڵام (تیۆ)، دیموکراسی پەیوەستە بەگفتوگۆو مشتومڕەوە. بەتایبەتی بۆ کەسانی وەك تۆ، کە زۆربەی کاتی بۆ رەخنەگرتن لەکەسانی دیکە تەرخان دەکات!

- (تیۆ) بەغرورێکەوە وتی: بەڵێ، بەڵام من هیچ سنورێك نابەزێنم. لەقوتابخانە هەوڵ دەدەم هاورێکانم پێکەوە کۆك بن‌و تەنانەت لەو پێناوەشدا مشتیش دەخۆم!

- پورە (مارتا) بەبیرکردنەوەوە وتی: ئەوەم لەلا سەیرنییە. باشە ئێستا حەبەکانت بخۆو پاشان ناشتا بکەو خۆت بگۆڕە. تەلەفۆن بۆ دایکت بکە، کە ئاپارتمانی مۆسکۆ گەرمەو تۆش قەمسەڵەو نیوپوت لەپێدەکەیت. بەکورتی دڵنیای بکەرەوە کە سەرمات نابێت. دەبێت بۆ (کرملین) بچین.

- (تیۆ) هاواریکرد: جوانە، مۆمیاکراوێکی مۆدێرن دەبینم.

- بەم رەفتارە خراپانەت بێزارمان دەکەیت. ئەوە بزانە دەبێت لەریزدا بوەستین.

- (تیۆ) لەجێخەوەکەی دابەزیو گوتی: وەك مۆزەخانەی قاهیرە لەکاتی چاوەڕوانیکردن بۆ بینینی مۆمیاکان بەڵام ئەمجارە بەئارەزوی خۆم دەوەستم.

## ئازار - ئارامیەکان

بەڵام (ئەلیۆشا) سەبارەت بەمۆمیاکراوەکە تێڕوانینێکی دیکەی هەبوو. بەلای ئەوەوە پەیکەری مۆمیاکراوی (لینین) تەرمێك بوو، سمبولی رژمێکی زۆردار، کە لەساڵی( ١٩١٧ )بەدواوە وڵاتەکەی وردوخاش کردبوو،

- پورە (مارتا) بەبێ حەوسەڵەیی‌و تارادەیەك بەتوڕەییەوە گوتی: بەڵام من وتم، (تیۆ) ئەمڕۆ تەنها دەیەوێت مۆمیاکراوێك ببینێت‌و تەواو!

- (ئەلیۆشا)، کە زۆر بەئازاربوو گوتی: ئاخ شتی وانابێت. تۆ دەزانی خێزانەکەم چەند دوچاری ئێش و ئازاربون. ناتوانم ئەوە پەسەندی بکەم.

- (تیۆ) وتی: زۆر ناخایەنێت. بەڵێنت پێدەدەم خۆشمناوێت. فەرموو!

- (ئەلیۆشا) بەدەربڕینێکی راستەقینەو توندوتۆڵەوە وتی: ئەمکارە سوکایەتیکردنە بەرۆحی باوکم؛ بەهۆی کۆمۆنیستەکانەوە بیست ساڵی رەبەقی لە (گولاگ) گوزەراندو کاتێك گەڕایەوە پیرەپیاوێك بوو.

- پورە (مارتا)، کەدەستی لەملی کردبوو، گوتی: (ئەلیۆشا)ی ئازیز.. دەزانم، بەڵام ئەو کوڕە بچوکەم حەزی لەزانینە تا ِسەرودەر لەهەموو ئاینەکان بکات؟ تێدەگەیت.

- (ئەلیۆشا) فیکەیەکی کێشا: کۆمۆنیزم، ئاین؟ چ درِندایەتیەکە!

- (تیۆ) وتی: پورێ گیان وێڵی کە. (ئەلیۆشا) مـن هیـچم دەربـارەی باوکـت نـەدەزانی بمبەخشە، لەبەرئەوە سەردانەکەیان بەکڵێسای (کرملن) دەستپێکرد، کە گومەزە شێوە بازنەییە ئاڵتونییـەکانی لـەژێر تیـشکی خـۆردا دەدرەوشـایەوە. لێـرەداو لەومەیدانـە فراوانـەدابوو، کـە ئەسـقەفی مـەزن لـە ئاهـەنگێکی پڕشـکۆدا بـاری گرانـی روسـیای وەك تاجێـك لەسەرسـەری (تـزار)ەکـان دەنـاو پاشای نـوێی بەکێـشانی ئـازاری گـەورەی دەسـەڵات مـەحکوم دەکـرد تـا ئـەو رادەیەی (تزار)ی نوێ لەبەرامبەر ئەو شانازیو شەوکەتە ترسهێنەرەدا دوچاری دودڵیو شڵەژان دەبـوو. تـزاری نـوێ، کـە بـەهۆی نـەجیبزادەکانی وڵاتـەوە (بۆیاردەکـان)، لەئـەرکی ئاینـدەی ئاگاداردەکرایەوە، لەدێرێکدا خۆی توند دەکرد. تاجو تەختی پەسەند نەدەکردو تەنها لەبەردەم خواستو داوای خەڵکیـدا، کـە داوایـان لێدەکرد دەسـەڵات پەسـەندبکات رازی دەبـوو. هەڵبەتـە دەیانتوانی هەست بەوە بکەن ئەو جموجوڵە هەموی دەستکردە، بـەڵام گۆشـەگیربون لەدێرێکـدا راستییەکی شێوە خودایی لەدەروندا پەنهان دەکرد.

(تزار) لەژێر قورسایی پۆشاکە رازاوەکان و کڵاوی گەورەو جوانکاریدا نازناوی (باوکی گەل)ی پێدەدرا، کەهەندێکجار سوڵتانێکی تۆقێنەرو هەندێکجاریش بەخشندەو میهرەبان بـوو. بـەپێی هەلومـەرج سـەردەمێك (بـاوکێکی تۆقێنـەر)بـوو، کـە وەحـشەتی لـە دڵەکانـدا دەچانـدو هەندێکجاریش باوکێکی میهرەبانو بەبەزەیی. رۆڵەکەی هێندە گرانو پڕدەردیسەری بـوو، کـە رێدەکەوت هەندێکجار دەست لەدونیاو هەموو شتەکان بەربداتو خۆی بکاتـە راهیبـی دێرێـك. لەسەدەی شانزەدا کاتێك زوڵمو زۆرداری (تـزار ئیڤـانی تۆقێنـەر)، کە بەراستی نازنـاوێکی پـڕ بەپێستی خۆی بوو، بوەجێگای نارەزاییو رەخنەی زۆر، بڕیاریدا لەتەختو تاج دەستهەڵگرێت. لەبەرئـەوە رۆشـت بـۆ دێریـكو جلوبـەرگی رازاوەو شـایانەی بەعەبایـەکی رەش گـۆڕی. ئینجـا خـەڵکی، کـە تـادوێنێ بەسەرچاوەی نەهامەتییـەکانی جیهانیـان دادەنـا بەپاڕانـەوەو لاڵانـەوەوە تکای گەڕانـەوەیان لێکـرد بـۆ دەسـەڵات. (ئیڤـانی تـزار) پـاش داواکـاریو پاڕانـەوەی بـەردەوامی خـەڵکی بەدەسـەڵاتو هەیبـەتی بـەهێزترەوە بـۆ (مۆسـکۆ) گەڕایـەوەو بەوپـەڕی بێبـەزەیی ئەفـسانەییەوە بـۆ پاراسـتنی سـنورو تخـوبی (روسـیا)، کـە وڵات پێویـستی پێبـوو، کەوتـەوە هەڵسوڕاندنی دەسەڵات. چونکە بەرپرسیارێتی بـەڕێوەبردنی روسـیا (تـزار)ی ناچار بـەرەنج و

ئیش دەكرد. كاتێك خەڵكی تەمێ دەكرد خۆشی ئازاری دەچێژا. كاتێك ناكام دەبوو خۆشی دوچاری ژان دەبوو. قوربانییەكی (روسیا)بوو ئازاری دەچەشت، چونكە مافی سزادانی هەبوو. (تزار) كاتی خۆی بەئازاردانی خۆی دەگوزەراندو جنێوی بەخۆی دەداو خۆی بەكۆیلە، ناشایستە، گوناهكارو زەبون وەسفدەكرد، بەڵام دەسەڵاتی خۆی‌و ئەركی كوشتنی كەسانی دیكەشی لەو ئەشكەنجەدانەی خۆیەوە بەدەست دەهێنا. كاروانی درێژی (تزار)ەكانی روسیا لەزنجیرەیەك تاوان‌و كۆكوژی تێپەڕاندووەو ئەو چارەنوسەی (لینین) بۆ دوا (تزار) (نیكۆلای دووەم)ی سەر بە(رۆمانۆ)ی دیاریكرد جگە لەكۆتاییەكی لۆژیكانەی ئەو كاروانە شتێكی دیكە نەبوو. دواین كەسی خاوەن تاجی روسیا، كە لەگەڵ هەموو خاو و خێزانی كوشتوبڕكران بۆ ئەوەی ببێتە (تزار)ی روسیە بەهایەكی گەلەك گەورەی بەخشی. دواجار (باوكی گەلی روسیا) مرد، بەڵام خێرا پاش مەرگی (لینین) ئەوە ستالین بوو پەسەندیكرد نازناوی (باوكی بچوكی خەڵكانی روسیا) هەلگرێت، خەڵك گۆڕا بە(خەڵكان)و هۆكەشی فرەڕەگەزی سەرزەمینی ئیمپراتۆری سۆڤییەتی بوو؛ بەڵام (باوك) جارێكی دیكە بۆ روسیا گەڕابۆوە!

- (تیۆ) وتی: پەلەمەكە، ناتوانم باش بابەتەكە هەرس بكەم. ئەوە خەڵك بوو (تزار)یان دەكوشت یان (تزار)بوو خەڵكی دەكوشت.

- بنەمای پرسەكە لەوێدابوو. چەند كەس لەتزارەكانی روسیا كوڕەكانی خۆیان كوشت. (ئیڤانی تۆقێنەر)و (پیتەری گەورە) وەك دوو قوربانی دوچاری ئێش و ژان بون، بەڵام لەبەرامبەر پیادەكردنی دەسەڵاتدا بچوكترین پاشەكشەیان نەكرد. هەردوكیان فەرمانیاندا میراتگرەكانیان، ئەوانەی یاخیبون یان دوچاری لاوازی رۆحی‌و ئەقڵی هاتون لەسێدارە بدرێن. بەمجۆرە (تزار)یش وەك (باوك – خواوەند)، كە پشتیهەڵكرد تا كوڕەكەی بەسەرخاچەوە گیان لەدەستبدات، لەرەنج‌و ئازادا بوو. (تزار) بەرجەستەی (خواوەند)بوو. هەموو گوناهەكانی خەڵكەكەی خۆی پەسەند دەكرد، میراتگرەكەی (تزارڤیچ)[1] لەو میانەدا دەبوو (رەنجی مەسیح) بەسەر خۆیدا هەموار بكات.

- (تیۆ) هاواریكرد: چ جۆرە خێزانێك بون!

- پورە (مارتا) وتی: پاشاكانی فەڕەنسا لەوبوارەدا هێندە خراپ نەبون.

- بەڵام پاشاكانی تری جیهان ناچار بەرەنجدان نەبون. لەكاتێكدا لە(روسیا) شەهیدبونی زیاتری باوك‌و كوڕ پەیوەست بوو بەقوڵایی عیرفانی روسەكانەوە، چونكە یەكەمین

---

1. TsARe VITCHs: ناونیشانی شازادەكانی روس لەسەردەمی تزارەكان.

قەدیسەکانی (روسیا) دوو شازادەی لاو بون بەناوی (بۆریس)و (گلیب)، کە هەردوکیان کوژران. لەگەڵ ئەوەی بکوژەکەیان برایان بوو نەك باوکیان، بەڵام مێژووی تاوانکاری (تزارەکان) لەناو پیرۆزی ئەو دوو شازادە شەهیدەدا ریشەی داکوتاوە، کە وەك دوو بەرانی بێگوناه خودایی بەبێ بەرگریکردن ملیان بەچەقۆی جەلاد سپارد. هەر دوای ئەو رووداوە جۆشوخرۆشی ئیمان خەڵکی روسیای گرتەوەو شازادە کوژراوەکان لە(رەنجی مەسیح)دا دوبارە بۆ ژیان گەڕانەوە، لەپێناو ئەو دوانەدا زاروەی (رەنجی - بەخشندە)یان داهێنا، کە لەهیچ فەرهەنگێکدا بونی نەبوو. بەجۆرێك، کەکاتێك (تزارەکان) کوڕەکانی خۆیان، واتە هەمان (تزارڤیچ - شازادە)کانیان، لەسێدارەدەدا. دەمودەست بۆ قەدیس دەگۆڕان و هەرچەندە ئەم (قەدیس)سازییەش لەگەڵ ئاینی ئەرتەدۆکس نەدەگونجا.

- (تیۆ) بەنەڕاندنەوە وتی: واتا ئامادەنەبون بچوکترین مافی منداڵەکانیان بسەلمێنن. دەبێت تزارەکان بە(وەچەکوژان)ی تەواو دابنرێن.

- خەڵکی پاشان (تزار)یان بە(هیرۆد)ناونا، هەمان ئەو پاشایەی بۆ رێگەگرتن لەسەرکەوتنی (عیسا)، کە دەبوو بە (مەسیح)، فەرمانیدا هەموو کۆرپەلەکانی فەلەستین بکوژن. (تزار)ێکی چارەرەش لەسەدەی شانزەدا کوشتنی شازادەیەکی لاوی خرایە گەردن، هەرچەندە بێگوناهیش بوو، هیچ پەیوەندی بەو کوشتنەشەوە نەبوو. ئەو (تزار)ە ناوی (بۆریس گۆدۆنۆڤ)بوو، کەرەنجی دەکێشاو پیشەکەشی ئەوەبوو. پاشان لەتاو پەشیمانبونەوە مرد. هەروەها دیاردەیەکی دیکەش بۆ ئەو ئاینە سەیرە زیادکراوە. چونکە ئەگەر (تزارڤیچ)ـەکان بکوژرانایە زۆرجار زیندوو دەبونەوە.

- (تیۆ) بەسەرسامییەوە وتی: واتە بەراستی زیندوو دەبونەوە؟ شتی وا نابێت!

- نەخێر، نەك بەجۆرێکی راستەقینە، بەڵکو خەڵکی بڕوایان بەدوبارە هەستانەوەی ئەوانە هەبوو. لەسەر ئەو بڕوایەبون، چونکە ئەوانیش دوچاری هەمان (رەنجی مەسیح) ببون. ئەی کەواتە بۆچی نابێت وەك مەسیح دوبارە بۆ ژیان بگەڕێنەوە؟. دەرئەنجامی ئەوە هەندێکجار دەبیستڕا شازادەی سەیر، کە پەرەجوئاسا بونەتە جێگای بەخشینی سامان، لەسەر سنورەکانی وڵات دەرکەوتون و بۆ تەمێکردن و سزادانی (تزار) بەرەو (مۆسکۆ) بەرێکەوتون. بەراستیش یەکێك لەو شازادانەی گەڕابونەوە بۆ ژیان چووە ناو (مۆسکۆ)وە. کەس نەیدەزانی ئەو کەسە کێیە؟ لەکوێوە دێت و رووداوە راستەقینەکەی چییە؟. لەگەڵ ئەوەشدا (ئیمپراتۆر) ئەو شازادەیەی سەرپەهەڵدابوو کردییە کوڕی خۆی، چونکە کوڕەکەی لەبەرچاوی خۆیدا مردبوو.

ئەم كورە بەناوی (تزار دیمیتری)یەوە لەكۆشكی (كرملین) تاجی لەسەرنا... بوو بەجێنشینی (بۆریس گۆدۆنۆڤ)ی چارەڕەش، كە بەهۆی تاوانێكی ئەنجامی نەدابوو لەتاو پەشیمانی بەئازارە مرد. ئەم رووداوە بووبەهۆی دروستبوونی ریزێكی دوورودرێژ لەبانگەشەدەرانی درۆزن، كەهەمویان خۆیان بەشازادەی زیندوبوەوە رادەگەیاندو خەڵكیش بەكوێرانە وەدویان دەكەوتن.چونكە تواناو دەسەڵاتی شەهید لەبێگوناهبونییەوە دروستدەبوو.

- (مەسیح) وتویەتی: ( رێگر مەبە لەوەی منداڵەكان بەرەو لای من دێن، چونكە عەرشی خوا بۆ ئەوانە). منداڵ، بەرۆح و هزری سادەو پوختی خۆیەوە راستی شاراوە ئاشكرا دەكات. لەسەر ئەو بنەمایە لەدیدی خەڵكی روسەوە (تزارڤیچ)ـە گەڕاوەكان راستیاندەكرد. هەرلەبەرئەوەشبوو پیرۆزی شازادە كوژراوەكان بەسەر هەموو خەڵكی روسیادا بڵاوبوو. پەیامی بەلاوازەكان، بەتەمەنەكان، ژنانو منداڵان دەدا تا هەمویان ببنە (رەنجی بەخشندە)و لەبەرامبەریشدا تەنها شازادە پیرۆزەكان دەیانتوانی بەئازادی بدوێن.

- (تیۆ) وتی: منیش بڕوام بەوە هەیە.

- لەئەنجامی ئەو هەموو رەنجكێشانەی خەڵكی لاوازو بێتوانا یەكێك لە سەیرترین روخسارەكانی ئاینی روسی لەدایكبوو، كە نازناوی (شێتی مەسیح - Jurodstvo)ی هەبوو. ئەم شێتی مەسیحە لەراستیدا بەواتای شێتی واقیعی نەبوو، بەڵكو دەیتوانی بڕیاری ئەوە بدات رۆڵی شێتی راستەقینە ببینێت. بۆ ئەو گەمەیەش پۆشاكی سەیری هەبوو، واتە خۆی دەگۆڕی، نیوە روت بوو – تەنانەت لەزستانیشدا –. زنجیرەی گەورەی بەگەردندا هەڵدەواسی یان وەكو مەسیحی لەخاچدراو تاجی دڕكاوی لەسەردەكردو روی لەبیابان دەكرد، پاشان روتو رەجاڵو وەك سواڵكەر لەناو شارەكاندا دەسوڕایەوە تا پێشبینی خێرو خۆشی یان نەهامەتیو كارەسات بۆ خەڵك بكات!

- رێبواران گاڵتەیان پێدەكردو بەردیان تێدەگرت، بەڵام كەس بوێری ئەوەی نەبوو بیكوژێت، چونكە تەنها ئەوبوو لەبەرامبەر (تزار)دا راستی دەدركاند. تاكە كەس بوو خراپ بەكارهێنانی دەسەڵاتی بەرویدا دەدایەوە. بەجۆرێك یەكێك لەوانە بەرامبەر (ئیڤانی تۆقێنەر)دا توانیبوی پارچە گۆشتێكی كاڵی خوێناوی تێبگرێت تا تاوانكارییەكانی بەیادبێتەوە. یەكێكی دیكەیان (بۆریس گۆدۆنۆڤ)ی بەمنداڵ كوژ تاوانبار كرد. لەگەڵ ئەوەشی كە ئەو تزارە بێگوناهبوو داوای لەشێتەی مەسیح كرد نزای بۆ بكات. كابرای شێت داوای كردبوو بەروتی خۆی لەبەر سەرمای زستانی روسیا رابگرێت تا بەوجۆرە لەتەمێكردنو سزادان ببەخشرێت.

- پورە (مارتا) وتی: لەو باوەڕەدام ئەوجۆرە مرۆڤانە لەگەڵ رژێمی سۆڤیەتیدا نەمابن.

- (تیۆ) بەقەشمەرییەوە وتی: دەتوانی مرۆڤێکی روتو قوتی زنجیرکراو لێرە بهێنیتە بەرچاو؟ ئەگەر شتی وا هەبێت دەمودەست پۆلیس بۆ نەخۆشخانەی دەبەن.

- (ئەلیۆشا) بەخەندەوە وتی: باشە، کەواتە سەیری لای راستت بکە.

(تیۆ) نەیتوانی باوەڕ بەچاوی خۆی بکات. پیرەژنێك لەبەرگێکی دڕاودا لەسەر پلیکانەی کڵێساکە هەڵتروشکاوبوو. زنجیری قورس لەملدا، پێڵاوی دڕاو لەپێدا. ئالآیەکی هەڵدەسوڕاند وێنەی چەکوچو داسو خاچێکی لەسەربوو. نەورتەی دەکردو بەهاوار. تەنها لەوێدا رۆنیشتبوو چاوەڕێی هاتنی کەسێکی پایەبەرزی دەوڵەتی دەکرد.

- پورە (مارتا) داخێکی کێشاو گوتی: جێگای باوەڕ نییە! شێتەکانی مەسیحی گەڕاونەتەوە!

- (ئەلیۆشا) وتی: جۆشوخرۆشو ئیمانی ئەفرێنەر سنورو رادە ناناسێت. لەهەموو شوێنێکی (مۆسکۆ)دا سەرقاڵی دوبارە دروستکردنەوەی کڵێسان، رێك لەپشتی تەلاری (کرملین) کڵێسای (فریادڕەسی پیرۆز) هەیە، کە لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە تێکدرابوو، ئێستا وادوبارە وەك رۆژی یەکەم دروستکراوەتەوە.

- پورە (مارتا) وتی: ئەو ئالآیەی بەدەستییەوەیە مانای چییە؟. نیشانەی پارتی کۆمۆنیستو خاچ بەیەکەوە؟ مرۆڤ وادەزانێت خەون دەبینێت.

- (ئەلیۆشا) وتی: لەدیدی ئەم ژنە شێتەوە مەسیح بۆ رزگارکردنی جیهانو پارتی کۆمۆنیست بۆ رزگارکردنی خەڵکی سەر زەوی هاتون. پارت پارییەکەی دۆڕاند، بەڵام مەسیح گەڕاوەتەوە. ئەوەی کە جیهانی کۆن چییەو جیهانی نوێ کامەیە؟ ئەم ژنە هیچ لەوبارەیەوە نازانێت.

- (تیۆ) پرسی: یادەوەری لەدەستداوە.

- (ئەلیۆشا) وەڵامیدایەوە: نەخێر، بەڵام نمونەکانی وەك ئەم ژنە ئیدی هیچ سەرچاوەو پنتێکی بۆ گەڕانەوە نەماوە. لەکاتی دووەم جەنگی جیهانیدا وڵاتەکەمان بەملیۆنان سەربازی خۆی فیداکرد تارێگری لەهێرشی نازییەکان بکەن. (ستالین) جەنگی بردەوەو بوو بەباوکی خەڵکان. خەڵکی کردە کۆیلە، بەڵام نانی بۆ دابین کرد. ئازادی نەدا، بەڵام کار دەستەبەربوو، سەرەڕای مافی خانەنشینیو تەندروستیش.

- پورە (مارتا) وتی: راستە، بەڵام بەچ بەهایەك!

- بەبەهای وەحشەت. کاتێك رژێمی سۆڤیەتی وەك کۆشکێك لەکارتۆن روخا ئەم ژنانە پیرببون. لەماوەی چەند مانگێکدا جیهانەکەیان دیارنەما. پارت سەرەوژێربوو، خانەنشینی نەما، گرانیو قەیرانی دارایی گەیشتە لوتکە. خەڵکی بەتەمەن بێکارن و هاوسەنگی خۆیان لەدەستدەدەن. لەبەرئەوەیە داسو چەکوچو خاچ ئاوێتە دەکەن. جۆرێکە لەنارەزایی.

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: لەبنەچەدا ئەمانە هەمان کەسانی ئیماندارو ئایینزای کۆنن. بەمجۆرە رابردوی دێرینی گەلی روس بە(روسیترین) شێوەی خۆی گەڕاوەتەوە.

- (ئەلیۆشا) وتی: ئیماندار یان بێئیمان، بابەت ئەوەیە ئەمانە دژ بەدیموکراسینو حەزم بەچارەیان نییە.

- (تیۆ) وتی: پیرەژنی بێنەوا!

- پورە (مارتا) وتی: باشە. دەتویست رەنج و ئێش و ئازارەکانی روس بەچاوی خۆت ببینیت؟ فەرموو. هیچ کەموکوڕی نییە.

- (ئەلیۆشا) وتی: بەڵام ئاینی روسی تەنها رەنجو ئازار نییە. پەرستنی جوانیشی تێدایە. سرودەکان، ئەیکۆنەکان[1]، نیگای مەسیح، فریشتەکان، دەبینیت...

- پورە (مارتا) بەسەرسوڕمانەوە وتی: لەو باوەڕەدا نەبوم گەڕابیتەوە بۆ کڵێسا!

- (ئەلیۆشا) بەپۆزشەوە وتی: ئۆپراکانمان پڕە لەئاینو مۆزیکمان زۆر عیرفانییە.

- (تیۆ) وتی: دەتوانین بچینە ژورەوە؟

- (ئەلیۆشا) وتی: چاوەڕێی (سێلوتکەی سێرجی پیرۆز)بە. لەوێ دەتوانیت لە (کرملین) ئیمانت دەستکەوێت. لە (کرملین) تۆریستی زۆر لێیە.

## مۆزەخانەیەك بەبێ خواوەند

- پورە (مارتا) وتی: زۆرباشە. ئێستا نزیکین. بهێڵە (تیۆ) لە (لینین)ەکەی بڕوانێ.

- (ئەلیۆشا) هاواریکرد: باشە، بەڵام بەبێ من. لەبەردەم کڵێسا نوێیەکەی ئەوبەری گۆڕەپانی سور چاوەڕێتان دەکەم.

- پورە (مارتا) پرسی: کام کڵێسا نوێیە؟ نازانم کامەیە؟

- لەبەرئەوەیە ماوەیەکە نەهاتویتە ئێرە. لەلای راست کڵێسایەکی بچوکە لەبەردەم ئاپارتمانێکی سەوزدا. تاقەکانی گولگولین، چەند زەنگێکی هەیەو گومەزی شێوە پیازەو ئاشکرا دیارە. رێبواران بەڕیز دەچنە ژورەوەو دێنە دەرەوە.

---

[1]. Icone: تابلۆی کێشراوی ئاینی، کە بەتایبەتی لەروسیادا باوە.

- بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئەم کڵێسایە لەکوێوە سەوز بوو؟

- (ئەلیۆشا) بەخەندەوە وتی: لەسەر زەوی! لەئازادیدا!. ئەوکاتە سەوزبوو کەدوبارە ژیان بۆ روسیا گەڕایەوە. هەمیشە پڕە لەخەڵك.

- تائەو رادەیە؟

- (مارتا گریگۆری یڤنا) بنوارە، لەساڵی (١٩٣٠)وە لەروسیای ژێر ئازارو چاودێریدا کڵێسا روی لەژیانی نهێنی کرد، وەك کریستیانە سەرەتاییەکان. تا ئێرە کڵێسای روسی ناوی (کڵێسای کاتاکۆمب)ی لەخۆینا. یەکێتی (بێخواکان) کڵێساو باوەڕدارانی رەشەکوژدەکرد. لەساڵی (١٩١٨) تا (١٩٣٨) چل هەزار قەشەو شەش سەد ئەسقەف کوژران.

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: ئەو ژمارانەم نەدەزانی.

- هەموو ئەوانەش لەپێناو گۆڕینی خەڵکی روس بەخەڵکێکی بێئیمان. ئایا دەزانیت لەسەردەمی کۆمۆنیزمدا لە(لینینگراد) سۆڤێتییەکان جوانترین کڵێسای شارەکەیان دەستبەسەرکردو گۆڕییان بۆ (مۆزەخانەی بێ خواوەند) یان (خوانەناسی)؟.

- وەڵامیدایەوە: باش ئەوەم لەیادە. لەساڵانی دەیەی شەستەکاندا ئەو مۆزەخانەیەم بینیوە. بەو تابلۆیانەوە کە (پاپاکان)ی (قەشەی ئەرتەدۆکس)ی وەك شەهوانی، رەق و بێبەزەیی بەریشی ئاڵۆزکاوەوە وێنەکرابون. ئەوپەڕی گاڵتەجاڕی و سوکایەتی بوو.

- زۆرباشە، ئەنجامەکەشی ئەو جۆشوخرۆشە ئاینییەی ئەمڕۆی روسیایە!. ئێستا کڵێسای مەزنی (نۆتردام قازان) لەبەندی راگەیاندنی کۆمۆنیست ئازادەو بەقەشەکانی ئەرتەدۆکس دراوەتەوەو شارەکە ناوی (سن بیترس بۆرگ)ی خۆی وەرگرتۆتەوە. هەندێکجار لە کڵێساکانماندا، کە کرابونە دەبۆی شتومەك، ئەیکۆنەکان لەپەلەپەلەیدا لەناو شتومەکدا وەك خۆیان ماون.

- پورە (مارتا) بەبیرپهێنایەوە: بەڵام لەگۆڕەپانی سوردا کاری باشتریان ئەنجامدا.

- (تیۆ) بەروترشییەکەوە بەئاماژەکردن بۆ کڵێسا گەورەکەی گۆڕەپانەکە وتی: ئەڵێی دۆندرمەی رەنگاوڕەنگە!

- (ئەلیۆشا) دەستێکی بەسەریدا هێناو بەبێدەنگی دورکەوتەوە.

- (تیۆ) بەئارامی وتی: چەند زوو دەرەنجێت. هەموو روسەکان بەوجۆرەن؟.

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: هەستیارن، بەبەراورد لەگەڵ ئەواندا ئێمە رەقین. (ئەلیۆشا) دەمارگیری ئاینی نییە، بەڵام نیشتمانەکەی خۆشدەوێت و هیچی دیکە!

- (تیۆ) وتی: باشە، بابڕۆین پیرەپیاوەکە ببینین.

## مۆمیاکەی لینین

لەبەرامبەر گۆڕێکی مەرمەڕی تاریکدا سەربازەکان بەتەمەڵییەوە پاسەوان بون. ژمارەیەك لەبینەرەکان بەپەلە دەچونە ژورەوە. ئیدی بۆ بینینی تەرمە مۆمیاکراوەکەی (لینین) خەڵکێکی ئەوتۆی لێنەبوو.

- پورە (مارتا) بەسەرسوڕمانەوە وتی: لەڕابردودا ئێرە.. کەبیری لێدەکەمەوە! ریزی دورودرێژی بینەران هەبوو. بوك و زاوا بەجلوبەرگی بوکێنییەوە دەهاتن بۆ دیدەنی... چ گۆڕانکارییەکی قوڵە!.

- (تیۆ) بەخەمساردییەوە وتی: وەك ئەوەیە ئیدی خۆشیان نەوێت. بۆچی هێشتویانە لێرە بمێنێتەوە؟

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: مۆمیاکەی (ستالین)یان هەڵگرت و بەدزییەوە ناشتیان، بەڵام (لینین) بابەتێکی ترە. شۆڕشی کرد، هیوای بەئایندە هەبوو. ئەی ئێمە بۆچی گۆڕی (ناپلیۆن)مان لە(پاریس) پاراستوە... ها؟

- (تیۆ) وتی: بێگومان مەبەستیان هەبوە. (ناپلیۆن)یش لەسەرەتادا خراپ نەبوو. باشە بڕۆین سەیری بکەین؟

- بەڵام (تیۆ) نائومێدبوو لەبینینی روخساری زەردهەڵگەڕاو، خامۆش و گرفتاوی (لینین). کەبەهیچ نەدەچوو؛ تەنانەت بەمەرگیش. (تیۆ) ماوەیەکی زۆر بەرامبەر پەیکەرە خەوتوەکە راوەستاو بۆ هێمایەك دەگەڕا، کە هیچ شوێنەوارێکی نەبوو. هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: کاتێك مرۆڤ بیر لەوەدەکاتەوە، کەسەرانسەری روسیا لەبەرامبەر ئەو پیاوەدا دەلەرزی. بۆچی دەیانەوێت ئەم قاڵبە کۆنە لێرە بمێنێتەوە؟

- وابزانم بۆئەوەبێت کریستیانەکان جەستەی پیرۆزکراوەکانیان دوای مردنیان لەناو خۆیاندا دابەشدەکرد. هەموان لەسەر هێشتنەوەی ئەم مۆمیاکراوە لێرە کۆك نین، بەڵام هەتا ئێستا کەس نەیتوانیوە بڕیاری لادانی بدات. پاراستنی شتی مردوەکان ئارەزویەکی نهێنی ئامێزە!. دەیانەوێت بۆخۆیانی بسەلمێنن، کە جەستەی مرۆڤ مایەی فەوتاندن نییە.

- ئەگەر لەڕاستیدا وابوبێت؟

- کریستیانی شتێکی گرنگتری لەمۆمیاکردن داهێناوە: دەڵێت لە(رۆژی لێپرسینەوەدا) لەجەستەیەکی نوێو شکۆمەندا هەڵدەستینەوە. بەگۆشتو پێستەوەو بەمجۆرەش پرسەکە چارەسەرکراوە.

- (تیۆ) ئاماژەی بۆ تەرمەکە کردو بەهێواشی وتی: بەڵام خۆ ئەم کریستیانی نەبوو؟

- نەخێر. هەروەها (ماو)یش. مۆمیاکردنی دامەزرێنەرانی کۆمۆنیزم ئەوە دەسەلمێنێت، کە ئەم رێچکەیە ئاینێکی راستەقینەیەو لەرِوسیادا لەدایکبوو.. بەدڵنیاییەوە.

- (تیۆ) پرسی: بۆچی بەدڵنیاییەوە؟

- باشە. لەساڵی (١٩١٨)و ساڵێك دوای ئەوە (لینین) بەدەسەڵات گەیشت شاعیرێکی گەورەی روسی شیعرێکی سەیری بۆ شانازیکردن بە شۆڕشەوە نوسی. شیعرەکە وەسفی دوانزە سەربازی هەزار بوو، کە لەژێر بەفر، روبەڕوی (با)یەکی توند، کڵاوبەسەر، جگەرە بەلالێوەوە، چەك بەسەر شانەوە هەنگاو بەهەنگاو رۆشتون. ئەم دوانزە سەربازەی شۆڕش وتیانە، کەچیدی (روسیای پیرۆز)، (روسیای ورگن)و روسیای کۆلیتەی گوندنشینیان ناوێت. تەقەیان لەرێبواران دەکردو لەتاو پەشیمانی هۆن هۆن دەگریانو پەیکەری جیهانی کۆنیان بەدوی خۆیاندا کێش دەکرد. دەزانیت کێ رابەرایەتی ئەو گروپە سەربازانەی دەکرد؟

- (تیۆ) هاواریکرد: لینین!

- نەخێر، (عیسای مەسیح)، کە تاجێکی لەگوڵی سوور دروستکراوی لەسەرسەرەو ئاڵایەکی خوێناوی بەدەستەوەیە. ئەوە (عیسای مەسیح)بوو، کە فەرماندەیی ئەو دوانزە سەربازەی دەکرد؛ ئەوەش بەلەبریدانانی دوانزە (حواریەکە - هاوەڵەکان). چونکە لەلای خەڵکی روس لەهەموو بارەکاندا تاکە فریادرەس تەنها (عیسا)یەو ئەم ئازادییە تەنانەت دەتوانێت رێچکەی خوێنو ئاگر تێپەڕێنێت. خەڵکی روسیا بەشێوازی خۆیان شۆڕشیان وەك یاخیبونو هەستانەوەی (عیسا)ی مەسیح دژ بەزۆرداریو نادادپەروەری هەموو جیهان دانابوو، لەبەرئەوە رازیبون تا (باوك)ی ئاسمانی لەدەستکەوتەکانیدا بەئازادی بەجێبێڵن.

- (تیۆ) وتی: هەست دەکەم لەناو ناخی (لینین)دا ئەو بیرۆکەیە هەبوو بێت.

- تاڕادەیەك هەمان بیرکردنەوەی لەناو (عیسا)دا هەبوو. یەکسانی بۆ هەموان، نەهەژارو نەدەوڵەمەند، خۆشبەختی ئایدیال، بەهەشتی سەر زەمین... بەڵام بەهەشتێکی بەلێدانی گوللەی تفەنگ دروست دەبێت.

- ئەو شاعیرە ناوی چیبوو؟

- ناوی (ئەلیکساندەر بلیک)[1]بوو. شیعر هیچ سەرکەوتنێکی بۆنەهێنا. هەلی بۆ رەخسا تاببێتە گەواهی زیادەڕەوی‌و لادانەکانی شۆڕشە ئازیزەکەی؛ پاشان لەدۆخێکدا مرد، کە ئەم وشانە لەقەڵەمەکەیەوە تکانەوە: (ئەم دایکی نیشتمانە، ئەم روسیا ئاڵودمیە منی هەڵدڕی، هەر وەك مالۆس، بێچوی تازە زاوی خۆی).

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: تۆ ئەو شیعرەت دەرخ کردوە؟

- بەڵێ. زۆر گومانم لەدایکانی نیشتمان هەیە. گوێبگرە، عارفێکی هندی دەناسم، کە سرودی بۆ ستایشکردنی خولی تیرۆری سەردەمی شۆڕشی فەرەنسا هۆنیبوۆوە، چونکە دەیزانی ئەرکی (دایکی شۆڕش) ورگ درین‌و هەڵلوشینی رۆڵەکانێتی.

- (تیۆ) هاواریکرد: ئای چەند سەرنجڕاکێشە! بێگومان منیش دایکم بەدوو سەلك پیازەوە دەبرژێنێ‌و دەمخوات.

- پورە (مارتا)، کە بەپەنجەی دەست هەڕەشەی لێدەکرد وتی: قوربانیدانی مرۆڤ! وەك دەبینی مرۆڤ هیچ کاتێك هێندە لەریشەی خۆیەوە دوور نییە.

- بەڵام ئەم(لینین)ە هەزارە خوێنمژ نەبوو، تەنها هەڵەی کردبوو.

- سەیرە! ئەی ملیۆنان خەڵکی (گولاگ)چی؟. راستە (لینین) خودی خۆی ژیانێکی سادەی هەبوو. بەگالیسکەی سوڵتان هاتوچۆی نەدەکردو وەك پاشا نەدەژیا، بەڵام ئەی تاوانە گەورەکان! داهێنراوەو نایدیای نوێ لەرەوشی پۆلیسیدا! رەشە کوژییەکان، بێبەزەیی‌و توندوتیژو خراپەکارییەکان بەدرێژایی حەفتا ساڵی دیکتاتۆری.

- (تیۆ) وتی: باشە، کەواتە دەبێت بڵێین روسەکان حەز بەرەنجکێشان دەکەن.

- رەنجکێشان لەبونی مەسیحدا، نەك لەبونی دیکتاتۆری. ئەم دوانە بەیەك ناچوێن.

- (تیۆ)، کە دواین دیدی لەتەرمەکەی (لینین) دەگرت بەهێواشی وتی: کەواتە دەبوو ئەم پارچە پارچە پێکەوەنراوانە بەو چاوە خەواڵوانەوە...

- پورە (مارتا) قسەکەی پێبڕی‌و گوتی: تکات لێدەکەم رێزی مردوو بگرە. گوناهی ئەم نییەو تەنانەت لە گۆڕێکیش درێغیان لێکردوە.

[1] ALEXANDRE BLIK: ئەلکساندەر ئەلکسانرۆڤیچ بلیك (١٨٨٠ – ١٩٢١) شاعیرو رۆشنبیری روسی لەساڵی (١٩١٧) چۆتە ریزی بەلشەفیکەکان‌و لەساڵی (١٩١٨) بەشیعری (١٢ کەس) ناوبانگو خۆشەویستی بەدەستهێنا. لەساڵی (١٩٢١) زیادەڕۆیی شۆڕشی بەلشەفیکەکان نائومێدیان کرد بوە هۆی مەرگی. بەگەورەترین شاعیری سمبولیستی رەسیا دادەنرێت.

## بەشی بیست و یەك

# (خاكی دایك و بەهرەی فرمێسك)

### پورە (مارتا) نەخۆشە

پاش فراوینێكی، كە (ئەلیۆشا) بەدڵ سازی كردبوو، (تیۆ) مۆڵەتی پشودانی وەرگرت.

پورە (مارتا) بەنیگەرانییەوە پرسی: هەست بەناڕەحەتی دەكەیت؟

- نەخێر، بەڵام ئارەزوو دەكەم بەخەیاڵی ئاسودەوە كتێب بخوێنمەوە. كەی بۆ نەخۆشخانە دەچین؟

- بۆ نەخۆشخانە ناچین. موچەكان كەم بونەتەوە، لەبەرئەوە باری چاودێری پزیشكی باش نییە. ئەو كارە لە... باشە، دوایی دەیزانیت.

- (تیۆ) وتی: دەتویست بڵێیت... پەیامی نوێ چییە؟

- سبەینێ. باوكت بەدڵی نییە زۆر لێرە بمێنینەوە، لەبەرئەوە كاتی زۆرت بۆ دۆزینەوەی مەتەڵ نابێت!.

- (تیۆ) باوێشكێكیداو گوتی: باشە، كەمێك خوێندنەوەو ئینجا خەوتن.

بەڵام پێش خوێندنەوەی رۆمانەكە خەو بەسەر (تیۆ)دا زاڵبوو.

- (ئیرینا)و (ئەلیۆشا) لەژوری نانخواردن (چا)یان خواردەوەو پورە (مارتا)ش چوو بۆ لایانو بەشەكەتیو ناڵەوە خۆیدا بەسەر قەنەفەكەداو لەبەرامبەر نیگەرانی (ئیرینا)دا وتی: هیچ نییە، دڵنیابە (تیۆ) بەرەو چاكبونەوە دەچێت، بەڵام هەندێكجار خۆم هەست بەماندویەتی دەكەم.

- (ئەلیۆشا) وتی: چۆن دەزانیت تەندروستی باش دەبێت؟

- وەڵامیدایەوە: بەرگریكردن لەبەرامبەر گەشتدا ئەو هیوایەم پێدەبەخشێت. لەماوەی ئەم دوو مانگەی رابردودا شێوازی چارەسەركردنی (تبت)ی بووە بەرێگر لەبەردەم زیادبونی نەخۆشییەكە.

- (ئەلیۆشا) وتی: ئێمەش لەڕوسیا ئاشنای ئەو شێوازەین. دانیارەکانمان ئەزمونی زۆریان لەبواری (هیپنۆتیزم)دا هەیە، کە زیاتر بۆ چارەسەری نەخۆش سودی لێدەبینرێت. ئایا ئەگەر هەیە (تیۆ) زیاتر نەخۆشی دەرونی هەبێت تاجەستەیی؟

- لەوبارەیەوە هیچ نازانم! چاوپێکەوتنی لەگەڵ شفادەرانی خۆرهەڵاتی باری تەندروستی بەرەو باشتر بردووە، بەڵام هێشتا زووە بوترێت ئەو چارەسەرکردنانە کاریگەر دەبن.

- (ئەلیۆشا)، کە لەسەعاتەکەی دەنواڕی، وتی: دەبێت بۆ بینینی (ئەیکۆن)[1]ـەکان سەردانی مۆزەخانە بکەین. ئێستا بابخەوێت.

- پورە (مارتا) وتی: بەیارمەتی خۆتان منیش دەچم دەخەوم. سەیرە هەرکاتێك (تیۆ) دەخەوێت منیش خەو دامدەگرێت.

- (ئەلیۆشا) وتی: ئەوە هەستی هاودەردییەو بەیۆنانی (سمپاتی - Sympathie) پێدەوترێت پەیوەندی رۆحیو لێکچونی هەستەکان. تۆ وەك دایکی ئەوی!.

- پورە (مارتا) دەمودەست کاردانەوەی پیشاندا: لێرەدا بوەستە! ئەمە تەڵەیەکەو من تێناکەوم!. (میلینا) هێشتا گەنجەو دەتوانێت منالّی دیکەشی ببێت. نەخێر، من دایکی نیم لەوانەیە من ئەو کەسە بم بەیۆنانی پێیدەڵێن (Psychopompo)، واتە کەسێك وەك رێنیشاندەری دەرونی...

- (ئەلیۆشا) وتی: باوەڕناکەم بتەوێت بەرەو خواوەندی ببەیت.

- نەخێر، ئەمەیان نەخێر! دەبێت خودی (تیۆ) ئەوە بکات!. لەلایەکی دیکەشەوە (تیۆ) زیاتر ئارەزوی بەلای عیرفانیدا دەچێت.

- ئیرینا بەشداری گفتوگۆکەی کردو بەئەڵمانی شتێکی وت: Du bist olso ein bisschen mystisch،

- پورە (مارتا) بەنارەزاییەوە وتی: من عارف بم؟ دان بەوەدا دەنێم ئارەزوم لەو بابەتە هەیەو هیچی زیاترنا. شتێکی سەرسوڕهێنەرە مرۆڤ هەمیشە هەوڵدەدات پەنایەك لەپاڵ خواوەندا بدۆزێتەوە!. من بۆ ئەوەی هۆکاری ئەو پەناگرتنە بدۆزمەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدەم.

- (ئەلیۆشا) وتی: ئەوەش هەمان ئەوشتەیە عارف ئەنجامی دەدات.

- پورە (مارتا) بەگومانەوە وتی: واتە کە... ئاخ! بەراستی ئێوەش بەم تەڵقین کردنەتان خەریکە تێکمدەدەن. دەڕۆم پشویەك بدەم.

---

[1] ـ ئەیکۆن: تایبەتە بە کڵێسای خۆرهەڵاتی و بە بەیکەر یان وێنە پیرۆزەکان دەوترێت.

(ئیرینا)و هاوسەرەکەی بەشەیتانانە لەیەکدیان روانی. پورە (مارتا)ی دۆستیان کاتێك پشتی وەردەگێڕا زمانی خراپ دەسوڕا.

## توانەوەی بەفری شێداری دایك

(ئیرینا) لەدەوروبەری سەعات (دە)ی شەودا (تیۆ)ی لەخەو بێدار کردەوەو ئەویش پاش هەلقوڕاندنی چەند کەوچکێك شۆربای گەرم وەك مردوو خەو بەسەریدا زالبووەوە. پورە (مارتا)ش کاتی شێو لەخەو رابوو، بەلام بێهەواس بوو بەشداری هیچ گفتوگۆیەکی نەکرد.

- رۆژی دواتر بەئۆتۆمبیل بۆ دێری (سێرجی پیرۆز) رۆشتن. پورە (مارتا)، کە لەسەر کورسی دواوەی ئۆتۆمبیلەکە جێگای خۆی چاکدەکرد وتی: سێرجی پیرۆز؟ بۆچی ناوەکەیان گۆڕیوە؟ (زاگرۆسك) جوانتر بوو!.

- (ئەلیۆشا) وەلامیدایەوە: ئازیزم... بەلام ئەم ناوە ناوی راستەقینەی نەبوو. ئەو شارەی دێرەکەی تێدابوو بەهۆی سۆڤێتییەکانەوە ناوەکەی گۆڕابوو. (زاگرۆسك) کەسێکی شۆڕشگێڕ بوو، کارێکی باشیانکرد بۆ رابردویان گەڕاندەوە؛ بۆ ناوە کۆنەکەی.

- پورە (مارتا) وتی: گۆڕینی ناو، تازەکردنەوەی ناو، ناوی راستەقینە، ناوی شۆڕشگێڕانە، دوبارە ناوی راستەقینە! چ بابەخولێیەکە!، ئەگەر هەر وەچەیەك گەواهی گۆڕینی ناوی شارو شەقامەکانی بێت دوچاری سەرلێتێکچون دەبێت.

- (تیۆ) بەگاڵتەجارییەوە وتی: بۆ نمونە، تۆ حەزتدەکرد ئەو ناو و ئاماژانەی ئەلمانەکان بۆ (پاریس) دایاننابوو لەکاتی جەنگ لەدوای جەنگ هەر وەك خۆی بمێنێتەوە؟

- (ئەلیۆشا) وتی: (تیۆ) زوو لەهەموو شتەکان دەگات!. دۆخی ئێمەش بەباری داگیرکردنێکی سەربازی دەچوێت.

- پورە (مارتا) ئیدی وەلامی نەدایەوەو سەرقالی تەماشاکردنی دەرەوە بوو. بەفر وەك دەنکی درەخشاوە لەسەر دەشتو کێلگەو لەسەربانەکان دەردەکەوت. بەخۆشحالییەوە لەقەدی ئەو درختە بەبەفر داپۆشراوانەی دەنواڕی، کە دەتگوت خەم دایگرتون. (ئیرینا) گۆرانییەکی خەمئەنگێزی دابەست.

- (ئەلیۆشا) وتی: توانەوەی بەفر چەند جوانە. لەلای ئێمە هیچ لەوە گرنگترنییە. پاش خەوی درێژی زستان گەڕانەوەی ژیانو خۆشی.

پورە (مارتا) وتی: ئەو گۆرانیو ئاوازە دەناسم، چییە؟

- (ئەليۆشا) وتى: يەكێكە لەئاوازەكانى (كيتاج – شارى نەبينراو) لە ئۆپراى (ريمسكى كۆرساكۆف)[1]، رۆڵى (فيڤرۆنيا)ى پاڵەوانى داستانەكە لەپەردەى چوارم، كاتێك سەهۆڵ قوتى دەدات. دوا ئازادى....

- (تيۆ) بەياخيبونەوە وتى: بەستنو مردن؟ ئازادييەكى سەيروسەمەرەيە!

- (ئەليۆشا) وتى: دەبێت فێرى ئەفسانەى (ئۆپرا) ببيت. (فيڤرۆينا) كچە دێهاتييەكە، كە لەدارستاندا دەژىو هێندە بێئارايشتو سادەو پاكە شازادەى شارى (كيتاج) لەئاهەنگێكى پڕشكۆدا دەيكاتە هاوسەرى خۆى. بەڵام لەرۆژى هاوسەرگيرييەكەيدا (تاتارەكان) هەڕەشە لەشار دەكەن. شارى (كيتاج)، كەبەهۆى ئەفسونو جادوى خوداييەوە دەپارێزرێت، لەبەرچاو بزر دەبێتو خەڵكەكەى رزگاريان دەبێت؛ جگە لە(فيڤرۆينا) كەپياوێكى پيس دەيفڕێنێت. كچۆڵە شەنگەكە سەرەڕاى ئەوەى لەژێر ئەشكەنجەو ئازارو لێداندا دەبێت، بەڵام هيچ لەسۆزو ميهرەبانييەكەى لەدەستنادات. كاتێك خۆى فڕێدەداتە ناو دەرياچەيەكى سەهۆڵبەندەوە لەناكاو شارى نەبينراوى (كيتاج) دەبينێتەوەو دەبێتە شاژنى ئەو شارە.

- (تيۆ) وتى: زۆرباشە، بەڵام هەرچۆنێك بێت مرد.

- نەخێر (فيڤرۆينا) سمبولى توانەوەى بەفرە. شازادە لەبەهاردا لەناو گياندارانو دڕندەو گوڵانى ناودارستاندا دەيدۆزێتەوە. كاتێك بزردەبێت كۆتايى وەرزى زستانە، چونكە سەهۆڵەكە بەرەو توانەوە دەچێتو كچەش دەتوانێت بچێتە ناوييەوە. (فيڤرۆينا) خاكى روسيايە: بەستەڵەك لەزستاندا، سەوزەڵان لەبەهارداو بيرۆكە كە رويەكى شارى ئاسمانييە.

- پورە (مارتا) وتى: وەك ئۆرشەليمى جولەكە كۆچبەرەكان. لەسەردەمێكى ديكە، لەجيهانێكى ديكەدا، ساڵى ئايندە...

- (ئەليۆشا) درێژەيپێدا: (تيۆ) نازانى پاش روخانى (بيزانس) شارى (مۆسكۆ) وەك (رۆما)ى سێيەم هەڵبژێرا. (رۆما)ى يەكەم شارى (بوترسى پيرۆز). (رۆما)ى دووەم شارى (قوستەنتينيە)و (رۆما)ى سێيەم شارى (مۆسكۆ)بوو.

- (تيۆ) پرسى: ئايا (رۆما)ى ديكەش هەيە؟

- پورە (مارتا) وتى: ناتوانرێت بڵێيت نەخێر، چونكە (رۆما)ى كريستيانەكان دوچارى هەمان چارەنوسى (ئۆرشەليم)بوو. دامەزراندنى شار هەميشە وەك كۆچى شتێكبووە لەئۆرشەليم. شارى (رۆما) سێجار گوازراوەتەوە؛ هەر وەك ئۆرشەليم، كە سێجار پيرۆزە.

[1] Rimski Kosrakov: مۆزيكىو كۆميارسى بەناوبنگى روسى (١٨٤٤ – ١٩٠٨).

- (تیۆ) وتی: هەر چۆنێك بێت دروستکردنی شارێك شتێکی مەزنە، دروستکارانی شار هەلی ئەوەیان نییە تاکاتی خۆیان بۆ خوا تەرخان بکەن...

- نەخێر، ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە. دەستوری دروستکردنی شارەکان هەمیشە سەرچاوەیەکی گەڕانەوەی هەبووە بۆ لایەنە خوداییەکەی. بیر لەشارەکانی چین بکەرەوە. چوارگۆشەیەك لەناو بازنەیەکدا، کە رێکو گونجاوە لەگەڵ (تایۆ – رێگا)... پێش نەخشەکێشانی شوێنی شارێك کێڵانەوەیەکی پیرۆز دەکێشن، بەدوای سەرچاوەیەکی پەرەجوئاسادا دەگەڕێن و پاشان بەدوای ئاماژەو هێمایەکی پشت سروشتی دەکەون. ئەگەر ئەو سمبولە نەبوو دەتوانن بیئافرێنن. تاکو ئێستا چەندین حەسارو دەروازەی تونەوتۆڵ لەسەر پەیکەری پاکیزەیەکی قوربانیکراو دروستکراوە، ئەمە باشە؟

- (ئەلیۆشا) بەهێواشی وتی: خاكو نیشتمانی روسیا خۆی لەخۆیدا قوربانییەکە. دایکێکە لەمەیدانی جەنگدا فرمێسك بەسەر رۆڵە شەهیدو رەشەکوژراوەکانیدا دەرێژێت. پێش سەرهەڵدانی کریستیانی لەروسیا خواوەندێکی تایبەت هەبوو بەناوی (دایکی نیشتمان – شێدار)، کە رێگاینەداوە بیکێڵن تائەو رۆژەی خواوەند پێیراگەیاندوە (مەگری، تۆش خۆراك بەمرۆڤ دەبەخشیت و هەروەها ئەوانیش دەخۆیت). ئێمە ئەم خواوەندە تایبەتە خۆراك پێدرمان پاراستوە. ئەو خاكو سەرزەمینی ئێمەیە! دەکەوینە سەر زەوی تادەست لەم خاکە بخشێنین، بەرێزەوە رایدەموسین، بەپاڕانەوەو گرییەو زاری داوای بەخشینی لێدەکەین.

- پورە (مارتا) وتی: لەمکارەشدا ئێوە بەتەنها نین. دەزانیت ئەو کۆیلە رەشپێستانەی بۆ بەرازیل دەبران چۆن خۆکوژییان دەکرد؟ بەخواردنی خاك، ئەوەش لەداخی لەدەستدانی خاکی زێدی خۆیان!

- (ئەلیۆشا) بەئاهێکی قورسەوە وتی: ئێمە خاك ناخۆین. ئێمەی روس خاکی خۆمان و دایك خواوەند ئاوێتە دەکەین. نغرۆکردنی خاك لەو فرمێسکانەی بۆی هەڵدەرێژین کارێکی پیرۆزە...

- ئاودێرییەکی سەیرە!

- (تیۆ) بەشداریکرد: بهێڵە وتەکانی تەواو بکات.

- پورە (مارتا) بەروویەکی گرژەوە وتی: بۆچی (زەوی – دایك) لەلای تۆ سەرنجراکێشە؟

- (تیۆ) وەڵامیدایەوە: زۆر زۆر. دایکیشم زۆرجار دەگری. تەنانەت کاتێك دڵشادیشە. (تیانۆ)ی دایە گەورەم دەیوت: ئەوە یۆنانە لەو هەستەدا خۆی بەرجەستەدەکات.

- پورە (مارتا) وتی: (تیانۆ) نەنکە یۆنانییەکەی (تیۆ)یە، لەبەرئەوەیە بەرامبەر بەروسیا هەستیارە.

- (ئەلیۆشا) وتی: لەوانەیە ئێمە لە(یۆنان)یەکان باوەڕمان لاوازتر بێت. لەلای ئێمە (زەوی – دایك) هێرشبەران نابوت دەکات، ناپلیۆن، هیتلەر.... ئەم خاکە بەرگری لەئێمەدەکات.

## جوان پەرستی

کاتێك (تیۆ) چاوی بەگومەزە شینو ئەستێرەی ئاڵتونی کەوت نەیتوانی لەدەستخۆشیکردن خۆی بەدوور بگرێت. پێدەچوو دێری (سێلوتکەی سێرجی – پیرۆز) بەسەر گردۆڵکەیەکەوە بانگهێشتی هەموو مرۆڤایەتی بکات. (تیۆ) بەشەقاوی هێمن چووە ناو گۆڕەپانەکەوە. باریکە ڕێگاکانی بەفری ئەملاو لای وەك ڕاستەهێڵێکی سپی کێشرابون بەرەو ئەو کڵێسایانە دەچون، کە زۆر پیرەژنو کچانی شێوخی لێوبەخەندە یان کوڕانی گەنجی سیما ڕاستەقینە تیایدا مژۆڵی هاتوچۆبون. (پاپا)کان پۆشاکی ڕازاوەو ڕێکوپێکیان پۆشیبوو، کە بەدەم ڕێکردنەوە خاچەکانی سەرسنگیان دەجوڵاندو لەناو ئاپۆرەکەدا دەبزوتن. کۆمەڵێك دەستیان ڕادەموسینو هەندێکی دیکەی وێنەی پیرۆزیانی دەگرت.

پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: جێگای گومانە! جاری پێشوو، کە سەردانی ئێرەم کرد جگە لەیەك دوو (بابۆشکا - Babouchka) زیاترم نەبینی.

- (تیۆ) پرسی: (بابۆشکا) چییە؟

- (ئەلیۆشا) وەڵامیدایەوە: دایکە گەورەی بەتەمەن، کە مایەی ڕێزێکی زۆرە. بابڕۆینە پێشەوە. بەهۆی ئاپۆرەی خەڵکەوە چونە پێشەوە ئاسان نەبوو. (تیۆ)، کە لەناو ئاپۆرەی باوەڕدارەکاندا ڕێگای بۆخۆی دەکردەوە، دەنگی جۆراوجۆرو شێوە نهێنییەکی دەبیست، کە بەورتەورتی قوڵو میهرەبانانە دەچوو. لەبەردەمیدا هەزاران مۆمی بینی بۆ ڕوناککردنەوەی گۆڕەپانەکە دەسوتا. پرسی ئەو دەنگی مۆزیکە لەکوێوە دێت؟

- (ئەلیۆشا) لەسەرخۆ وتی: باوەڕدارانن، کە بەچەند دەنگێك گۆرانی دەڵێن.

- (تیۆ) بەواقوڕماویو کاریگەری ژێر ئەفسونەوە وتی: دەڵێی دەنگی پەریانن! لەبەرامبەر کۆمەڵێکی زۆردا، کەسنگیان دەکوتا. (تیۆ) چاوی بەپەردەی گەورە کەوت، کەلەسەرەوە تاخوارەوە وێنەی ناو ورشەیەکی ڕوناکیان بەرجەستە دەکرد، نیگا هاوتاکان ڕوخساری خەماویو چاوانی پڕ لەئەسرینیان هەبوو؛ وا دەردەکەوت پەریو پیرۆزکراوەکان بەسەر ئاپۆرەکەدا بگرین.

- (ئەلیۆشا) چرپاندی بەگوێی (تیۆ)دا: ئەکۆنەکان. مەسیح دەبینی؟ لەهەموان گەورەترە.

- (تیۆ) ئەفسوناوی ببوو گوتی: چاوە گەورەکانی لەمن بڕیوە.

مەسیح گەورەی هەموانە. بەزمانی یۆنانی پێی دەوترێت (Pantocrator)، سیمای ڕاستەقینەی مرۆڤ لەبەردەمی خوادا. ڕوخساری عیشقو خۆشەویستی لەکاتی ڕەنجو ئازارداو

چاوەنوارە خەڵکی خۆیان لەناو ئەودا بناسنەوە. وردبوونەوە لەنیگاکانی مەسیح توانەوەیە لەناو رەنجی خودایانەی ئەودا.

- (تیۆ) لەرز گرتبوی. وتی: کاریگەرییەکی سەیری لەسەر من هەیە، وەك ئەو کاتانەی (تا) دامدەگرێت...

- (ئەلیۆشا) بەهێمنی وتی: سروشتییە. روانین لەئەیکۆنەکان، بیستنی سرودەکان، بینینی روناکییەکان، بۆنکردنی (بخورد) هەمان تەماشاکردنی جوانی هەیە. کاتێك هەموو هەستەکانی مرۆڤ دەکەونە ژێر کاریگەری سمبولی سێ لوتکەوە، باوك لەوێدا نییە، بەڵام کوڕەکەی بەخۆشەویستییەوە بۆمان دەڕوانێت و ئەو دایکەشی، کە دەگری، خودی تۆیە. ئێمە ئەم حاڵەتە بە(ئازاری خۆشی) ناو دەبەین.

- (تیۆ)، کە پڕ بەلوتی بۆنی هەڵدەمژی، وتی: چ ئاوێتەبونێکی سەیرە! مرۆڤ حەزدەکات بگری..

- (ئەلیۆشا) وتی: رێگری لەگریانت مەکە. بهێڵە فرمێسکەکانت هەڵقوڵێن، ئاسودەیی و بۆشایت پێدەبەخشن.

- بۆچی؟ خۆ من بەئەنقەست ئەوە ناکەم، بەراستی ناتوانم بەرگری بنوێنم.

(ئەلیۆشا) دوبارەی کردەوە: بهێڵە هەڵقوڵێن. ئاسودەیی لەوەدایە. کاتێ نزا تەواو ببوو، ئەسرین بەدڵۆپی گەورە بەسەر رومەتی (تیۆ)دا هاتبونەخوارەوە.

- پورە (مارتا) دەسرێکی بۆ درێژکردو گوتی: بیگرە لوتت تەڕە.

## سەرچاوەی فرمێسکەکان و (غوسل)ی دووەم

کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر لەگۆڕەپانی بەردەم دێرەکەدابون. باوەڕداران لەبەردەم ئەو دوکانانەی (ئەیکۆن)ی بچوك و خاچیان دەفرۆشت ئاپۆڕەیان دابوو. کوڕێکی لاو بەلوتێکی سورهەڵگەڕاوەوە لەگۆشەیەکی دوور لەخەڵکەکە دانیشتبوو دەیناڵاندو سەری لەنێو هەردوو دەستیدا گرتبوو،

- (تیۆ) پرسی: چیرویداوە؟ لێیانداوە؟.

- (ئەلیۆشا) وتی: لەرۆژانی یەکشەمەدا لەمجۆرە لاوانە زۆر دەبینرێن. رۆژی شەممان بەمەی خواردنەوە بەسەردەبەن و شەوەکانی بەشەڕو تێهەڵدان و رۆژی دواتریش بۆ رێوڕەسمی خواپەرستی دێنە کڵێسا. رۆژی شەممەی هەفتەی ئاییندەش هەمان شت دوبارە دەبێتەوە...

(تیۆ)، کەبەزەیی بەرامبەر لاوەکە جوڵابوو، دوبارە گریا.

- پورە (مارتا) وتی: (تیۆ)...خەریکە زیادڕۆیی دەکەیت، وەك ئەوەی ویستی خۆت لەدەست دابێت.

- (ئەلیۆشا) بەسەغڵەتبونەوە ناڕەزایی دەربڕی: (مارتا گریگۆری یڤنا) ئەو بارانەی دەتبزوێنن لەمێشکەوە نایەن، بەڵکو لەدڵەوە دێن. باوەڕی روس داوا لەباوەڕدار دەکات دەست لەئەقڵ بشوات.

- پورە (مارتا) بەسوکایەتییەوە وتی: لەیادم چوبوو. ناوی چییە؟ مێشکی ناو دڵ؟

(ئەلیۆشا) وتەکانی راستکردەوەو گوتی: لەکاتی خواپەرستیدا دەبێت رۆح لەمێشکەوە بۆ دڵ دابەزێت، مێشك کار لەسەر ویستو هۆشمەندی دەکات، بەلاّم دڵ سەرچاوەی هەستو وروژانەکانە. هۆشمەندی نازانێت نزاو پارانەوە بکات. خواپەرستیو نزا داوای چڕبونەوەی رۆح لەسەر وشەکان ناکات.. هێندە بەسە وشەکان وەك منالێك بەلالّی بدرکێنن، تا سەرچاوە لەناو دڵدا بتەقێت.

- پورە (مارتا) وتی: پوچو منالانەیە!. (تیۆ) دەزانێت قەشە ئەرتەدۆکسەکان چ کارێکی سەیرو بێهودە دەکەن؟. خۆیان دەچەمێننەوە، هەناسە لەخۆیان دەبڕن، بەوپەڕی تواناوە چاو لەناوکیان دەبڕنو تارادەی بێهۆشبون و بەبێوەستان زیکری (عیسا) دەکەن.

- (ئەلیۆشا) بەناڕەزاییەوە وتی: شێوازێکی سادەی خەڵوەتکێشانە لەناو فرە شێوازەکاندا. سەرەتا ئەو کەشیشانەی ئەمکارە دەکەن لەبنەچەدا (یۆنان)ین. دووەم مەبەستیان لەهەناسەدا دابەزینی روحە لەمێشکەوە بۆ ناو دڵ.

- (تیۆ) پرسی: لێرەدا ناوك واتای چییە؟

- (ئەلیۆشا) وەلاّمیدایەوە: ناوك دەکەوێتە ناوەڕاستی سکەوە، پنتێکە لەوێوە لەدایکمان جیادەبینەوە. کاتێك پەتی ناوك پچڕا چۆن دەتوانی دوبارە پەیوەندی دروست بکەیتەوە؟. ناوك ناوەڕاستی سکە، هەروەها ناوەڕاستی جیهانە بۆ گەیشتن بەخەڵوەت؛ هێندە بەسە هەناسەو نزا هەردوکیان هەمئاهەنگ بکەین.

- (تیۆ) هاواریکرد: راستە وەك (یۆگا). پورە (مارتا) دەبینیت لەگەڵ هەمان (ئۆ. م)ی (ئۆلیبریۆس)ی (یۆگی)یەکەی مندا هیچ جیاوازی نییە.

- پورە (مارتا) بەتوندی کاردانەوەی پیشانداو گوتی: چۆن جیاوازی نییە؟. یۆگییەکان ناگرین، بەڵکو پێدەکەنن. حەزم بەو قسانە نییە.

- (ئەلیۆشا) بەتوڕەییەوە وتی: (مارتا گریگۆری یڤنا) تۆ هیچ لەم بابەتە تێناگەیت. من بۆ تۆ سودی گریان روندەکەمەوەو درێژەیپێدا: پەیامبەرانی ئیسرائیلی ئەومیان دوپاتکردۆتەوە کە جیهان پەیوەستە بەرەنجو ئازارەوە. کە مەسیحی لەخاچدراو بەرجەستەکاری ئەو رەنجەیە. هەرلەبەرئەوەشە مرۆڤی روس هەمیشە لەرەنجو ئازارو پەژارەدا ژیاون، کە لەلایەن خواوەندەوە بەهرەمەندبووە.

- (تیۆ) وتی: دوبارەبونەوەیەکی ئاشنا. هەموو شت رەنجو ئازارە!

- (ئەلیۆشا) بەردەوامبوو: بەلاّم ئازاری مرۆڤ دەتوانێت لەڕێگای فرمێسك رشتنەوە شێوەکەی بگۆڕێت. ئەگەر تەنها پەنا بۆ وەرزشکردنی جەستەیی لەگۆشەگیریدا ببرێت بەزڕی

دەمێنێتەوە. ئەگەر لەجیاتی ئەوە تاك لەبۆتەقەی پەژارەی تەنهایدا دەربهێنرێت دەتوانیت خۆی بەتامی چێژبەخشی فرمێسکەکان بسپێرێت. گریان بەهرەیەك نییە بەهەموو کەس ببەخشرێت. چاکەی فرمێسك بەرەکەتێکە تایبەت بەدڵە پاكو نایابەکان. لەڕوسیا پیاوە پیرۆزەکان توانای بەگریان هێنانی خەڵکیان هەبووە ئەو بەهرەیەش بواری بۆ دەرەخساندن تیماری باوەڕداران بکەنو شیفا بەخشبن. ئەم پیاوانە بە (پەیامبەر – راهیب - Startsy)ناودەبران، کەتاکی ئەو وشەیە (ستارتز - Starts)ە.

روسیا لەچەندین رووەوە ستارتزی زۆری بەخۆیەوە دیوە. یەکێك لەسەدەی پانزەدا کاتێك ئاژاوەی سیاسی وڵاتی گرتبۆوە، ئەودی لەسەدەی نۆزدە کاتێك کڵێسای روس بوو بەکۆیلەی دەوڵەتو دواجار لەژێر نێڵی دەسەڵاتی سۆڤیەتی لەسەردەمی ئازارو چاودێریدا.

کاتێك خەڵکی روس هیچ دەرەتانێکیان نەدەما ئەوجۆرە (راهیب پەیامبەر)انە سەریان هەڵدەدا تا ترسەکان بڕەوێننەوە، پەرۆشانی ئیمان خۆراك بدەن. ستارتزەکانیش وەك (پاپا) هاوسەرگیریان نەدەکرد وەك (موسا)و (مەسیح) رویان لەبیابان دەکرد.

(تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بۆ بیابانەکان؟ لەناو بەفردا؟ بەفر یا لم جیاوازی نەبوو. مەبەستە سەرەکییەکە لەبیابان گۆشەگیریو چۆڵی بوو. ستارتز لە دێرێکدا گۆشەگیر دەبوو، هەر لەوێدا بەهۆی ئەو سۆزو خۆشەویستییەی لەچاوانیدا دەدرەوشایەوە گەلێ کەس لەدەوری گردەبونەوە. جێگای رێزو ستایشی هەموان بون، زیاتر لەپۆستی باڵای دەوڵەت، بەرزتر لە (پاپا)یەكو زیاتر لە (تزار)ێکی دڵسافو بێرتوش. لەپەیوەندیو (کۆمۆنیۆن)ێکی کۆگەلیدا روسەکانی کۆدەکردەوەو پێکەوەی گرێدەدانو دەیکردنە یەك. ستارتز دەیتوانی فرمێسکی خۆشی بەچاوانی خەڵکدا بێنێتەخوار. هەرئەوبوو دەیتوانی لەدواجاردا وشکی ئەو رۆحە ئاوبدات، کە لەمێشکەوە بەرەو دڵ هاتبوە خوارەوەو تێر ئاوی بکات.

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: من ئەو بزاوتە بەدەربڕینو بنەمای هەستیاری ناو دەبەم. هەمیشە فرمێسك رشتن لاوازییەکە!

- (ئەلیۆشا) وتی: لاوازی؟ بەڵێ. مرۆڤ بەحوکمی سروشتەکەی بونەوەرێکی لاوازو گوناهکارە، بەڵام نابێت هەمیشە بگری، چونکە ئەو فرمێسکانەی لەڕشتن نابنەوە جگە لەیەکسانییەکی ترسناك واتایەکی دیکەیان نییە؛ فرمێسکە راستەقینەکان ئەسرینی کتوپڕو خۆبەخۆن، وەك (غوسل)ێکی دووەمجارە، کە لەکاتی خواپەرستیدا دڵی مرۆڤ نغرۆ دەکات، ئەم فرمێسکانە دڵ لەخەوشەکانی دەشۆنەوە، سوكو شادی دەکەن. روو بە (تیۆ) وتی: (تیۆ)، ئایا فرمێسکەکانت ئارامو هێوریان نەکردیتەوە؟

- (تیۆ) وەڵامیدایەوە: دەبێت بڵێم بەڵێ، بەڵام شەکەت بوم.

- پوره (مارتا) هاواریکرد: ئەلکسی یفرمۆڤیچ... فەرموو بەتەواوی لەپەلوپۆت خستوەو لەرێگات دەرکرد. ئێستا بەوحاڵەی ئەوی تێدایە هونەریت نواند!.

(تیۆ) کە لەکینەو تورەیی پوره (مارتا) سەری سورمابوو بەتوندی فنی لەدەسرەکە کرد...

## شارێك‌و سێ ناو

- پاشان پوره (مارتا)ی ئاگادار کردەوە: پێویست ناکات زیادەڕۆیی بکەیت!. تەنها کەمێك هەستیاربوم. سەرەڕای ئەوەش ئێستا زۆر برسیمە.

- (ئەلیۆشا) بەپەلە وتی: ئارەزوو لەپیرۆشکی - Pirojkis دەکەیت؟ لەپاڵ دوکانەکان لەنزیك دێرێك کۆشکێك بۆ فرۆشتنی (پیرۆشکی) هەیە.

- پوره (مارتا) رونیکردەوە: (پیرۆشکی) جۆرێکە لەنان، کەناوەکەی گۆشتی تێدایە، ئارەزوی دەکەیت؟

- (تیۆ) لەگەڵ خواردنی (پیرۆشکی)و خواردنەوەی کۆکاکۆلادا لەتۆریستەکانی دەنواڕی، کە سەرقاڵی کڕینی دیاری جۆراوجۆربون. بوکەڵەی روسی، (ماتریۆشکا)ی گەورە لەگەڵ وێنەی (تزار)ـەکان‌و شاڵی رەشی نەخشێنراو.

پوره (مارتا) پێشنیاریکرد: چۆنە (ماتریۆشکا)یەك بکڕیت؟ بۆ نمونە ئەم دانەیە، بەگۆنای جوان‌و چاوی شینەوە...

- (تیۆ) وتی: پێشتر سیانت بۆ هێنابوم، لەجیاتی ئەوە سێ شاڵ هەڵدەبژێرم بۆ دایکم‌و (ئاتی)و (ئیرن).

- پوره (مارتا) پێداگری کرد: زۆرباشە، بەڵام دەمەوێت (ماترۆیۆشکا)یەکیشت پێشکەشش بکەم، تکادەکەم زوو بیکەرەوە.

- (تیۆ) بەهێواشی وتی: مەرج دەکەم پەیامێکی تێدا حەشاردراوە. ئینجا بوکەڵەکەی کردەوەو گوتی: راستە، دەمزانی. پەیامی ناو لەیستۆکەکە بەمجۆرە بوو: **(لەبەرئەوەی دوو کیشوەر پێکەوە دەبەستم زۆرجار داگیرکراوم‌و سێجار ناوم گۆڕاوە. ئەگەر منت دۆزییەوە دەتوانیت بەئەقڵەوە ماڵئاوایی بکەیت).**

(تیۆ) بەبێ هیچ وتەیەك پەیامەکەی لەگیرفانی پەستاوت‌و خەریکی هەڵبژاردنی شاڵ بوو بۆ خێزانەکەی.

- پوره (مارتا) بەسەرسوڕمانەوە وتی: زانیت کوێیە؟

- (تیۆ)، کەدەستی لەکوتاڵەکان دەخشاند وتی: چەند پەلەتە! کاتمان بەدەستەوەیە.

- بەداخەوە کاتمان نییەو سبەینێ ئێرە بەجێدێڵین. بەتۆم راگەیاندبوو تەنها یەك رۆژت لەبەردەمدایە.

- (تیۆ) خۆی رادەستدا: زۆرباشە، لەئۆتۆمبیلەکەدا. نرخی شاڵەکان دەدەیت؟

لەم کاتەدابوو زەنگەکان کەوتنە لێدانو بەدوایاندا زەنگە بچکۆلەکانی دیکەش دەستیان بەلێدانکرد. (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە، کەشاڵەکانی بەدەستەوەبوو، ڕەق لەجێگای خۆیدا چەقی.

- (ئەلیۆشا) وتی: زەنگەکانی ڕوسیا بونەوەری زیندون. کاتێك کلێسای ڕوسیا دامەزرا لێدانی زەنگەکان کارێکی پیرۆز بوو، چونکە دەنگی زەنگ دەنگدانەوەی خوایە.

- (تیۆ) وتی: هەرگیز ئاوازێکی هێندە جوانم نەبیستوە.

(ئەلیۆشا)و پورە (مارتا) بەزۆر (تیۆ)یان ڕازیکرد تا دێری (سێرجی پیرۆز) بەجێبێڵێتو سوار ئۆتۆمبیل ببێت.

- (تیۆ) پارچە کاغەزەکەی لەگیرفانی دەرهێناو گوتی: زۆرباشە، (نێوان دوو کیشوەر) دەبێت سەیری نەخشە بکەم. (زۆرجار داگیرکراوم)... شتێکی گرنگ نییە، تێپەڕین، (سێ جار ناوم گۆڕیوە)، چۆن ئەوە بزانرێت؟ بەڵام ڕستەی کۆتایی: (بەئەقڵ ماڵئاوایی کردن)؟.

- پورە (مارتا) وتی: دەزانم هێندە ئاسان نییە؟

- (ئەلیۆشا) وتی: نێوان دوو کیشوەر دەکرێت (مەکسیك) بێت، یان (تەنجە)، دەروازەی (بیرینگ)ی نێوان ڕوسیاو ئەمریکا.

- پورە (مارتا) وتی: ئێمە کۆمەکی پێناکەین!

- نێوان تورکیاو یۆنان، پەلەمەکە... ئەستانبوڵ!

- پورە (مارتا) بەکەمێك مۆنییەوە وتی: دەتوانیت ناوی گەلەك شوێنی دیکەش ببەیت. زۆرباشە، ئێستا سێ ناوی ئەو شارە چییە؟

- (تیۆ) تارادەیەك بەتوندی وەڵامیدایەوە: تۆ هیچ کات ڕازی نیت. هەندێ کات خێرامو هەندێکجاری دیکەش لەسەرخۆ. ئێستا دەتەوێت سێ ناوی ئەوشارە بڵێم؟ باشە، قوستەنتینییە (کنستانتی نۆپڵ). بیزانس، ئەستانبوڵ، دروستە!. ئێستاکە ئەرکەکانم تەواوکردوە دەتوانم کەمێك پشوبدەم؟. ئینجا سەری خستە سەرشانی (ئەلیۆشا)و چاوی چوە خەو.

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: لەوکاتەوەی (ژاپۆن)مان بەجێهێشتوە زۆرجاران دەگری، پەژارەی ئەشق.

- کوڕێکی میهرەبانە. دەبینیت فرمێسکەکانی تیماری ڕۆحی دەکەن.

## کۆتری بچوك

بۆ دواشەو (ئیرینا) هەموو شتی سازدابوو. ماسی، چەوەندەری سور، دۆندرمەی پرتەقاڵ، لەسەر مێزەکە چەند مۆمێكو زۆری نانخواردن لەجاران گەرمترو جوانتر.

- (ئەلیۆشا) لەکاتێکدا پەرداخی گیلاسەکەی بۆ لێوی دەبرد وتی: بەخۆشیت (goloubatchik)!.

- (تیـۆ)ش چـاوی لـەوکردو لـەپڕ بـەدەنگێکی گڕتـرەوە وتـی: ئـای.. زۆربـەهێزە. هـەموو جەستەم گەرمداهات.

(ئیرینا) وتی: otchin et was bortsch? Das ist sehr gut!

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: I ch habe genug.، Irinam،Stratvoutie

- (تیۆ) بەتوڕەییەوە وتی: ئەم گەمەی ئەڵمانیە کەی تەواو دەبێت؟ دەچم تەلەفۆن بۆ دایکم بکەم. تەلەفۆنەکە لەڕاڕەوەکەدا بوو. پورە (مارتا) لەدورەوە گفتوگۆکەی بەرگوێ دەکەوت.

- (تیۆ) ئەوەی رونکردەوە، کە هەمووشت رێکوپێکەو تاقیکردنـەوەکانی دواتـر لەئەستانبوڵ ئەنجام دەدەن. (روسیا) ئا... بەڵێ زۆر جوانە، ئەی (فاتۆ)؟ تەندروسـتی باشـە؟ نـەخێر؟ ئـاخ... کاتێـك گەڕایـەوە بـۆ ژورەکـە وتـی: سـبەینێ تەلـەفۆن بـۆ (فـاتۆ) دەکـەم. خـۆم واپیـشان دەدەم کەدەمەوێت هێمایەکم پێبدات.

- پورە (مارتا) وتـی: لـەوباوەڕەدایت پێویـستیت بەبەهانەیـەکی لـەوجۆرە بێـت؟ هـەر ئێـستا دەتوانیت تەلەفۆنی بۆ بکەیت!

- لەسەرخۆ وەڵامیدایەوە: دەبێت خۆم ئامادەبکەم، هەروەها ئەم خواردنەوەیە وڕی کردوم.

- (ئەلیۆشا)، کە لەسەر لێواری جێگاکەی رۆنیشتبوو، دەستیگرتو گوتی: بڵێ بزانم، تۆ ئێستا بەچ ناوێك منت بانگکرد؟ نازانم (گالو) چییە؟

- (ئەلیۆشا) وەڵامیدایەوە: (Goloubtchils) لەزمانی روسیدا واتە (کۆتری بچوك).

- (تیۆ) باوێشکێکیداو گوتی: کۆتری بچوك دەفڕێت!

## بەشى بيست‌و دوو

# (ئيسلام: خۆڕادەستدان بەخودا)

### (تيۆ) درۆ دەكات

- لەگەڵ بومەلێڵدا بەدەستەكۆتى بەرەو تەلەفۆنەكە چوو؛ لەتاريكيدا ژمارەكەى لێدا: (فاتۆ)؟ من...م..م. بەڵێ، باوێشك دەدەم. ئێستا لەخەو رابومو دەمودەست تەلەفۆنم بۆ كرديت. شەوە؟. بمبەخشە. چۆن؟ سێ هەفتەيە تەلەفۆنم بۆ نەكردويت؟ دڵنيايت؟ لەبەرئەوەيە هێندە دڵتەنگيت؟ تۆم فەرامۆش كردبێت؟ بەو دوو ملوانكەيەى سەردڵمەوە؟ هەميشە لەيادماى. باشە، هێمايەكم بدەرێ. ( **لەكاتى تەماشاكردنى ئەو مرۆڤانەى سوورپەخۆن دەست لەئەقڵ بەردە)**!. هيچ تێناگەم. دواى ناشتاكردنى بەيانى تەلەفۆنت بۆ دەكەمەوە، ئێستا كاتى نييە. ژاپۆن؟ خۆشبوو. لەگەڵ كێ؟ خانمێك، دوبارە پيرەژنێك، بەڵێ. بێگومان تۆم خۆشدەوێت.

- پورە (مارتا)، كە لەپشتييەوە راوەستابوو، گوتى: درۆزن!

- (تيۆ) ئاهێكى هەڵكێشاو گوتى: ناچاريببوو. هەرچۆنێك بێت ئێستا حاڵى باشترە.

(تيۆ)، كە پاش خواردنى (چا)يەكى خەست‌و نان‌و نقيشك‌و مرەبا، هاتبۆوە سەرخۆى، نەيدەزانى خۆى لەو گرفتە رزگار بكات. دوبارە (فاتۆ)ى دڵنياكردەوە، كە بەبێ يارمەتى ئەو، واتە بێيارمەتى (پى تى) ميهرەبانى هيچ كات ناتوانێت چارەسەرى مەتەڵەكانى بكات‌و ئێستاش نازانێت چۆن سەرودەر لەرازى (مرۆڤەكانى سورپەدەخۆن)بكات. پرسى: ئايا لە (ئەستەنبوڵ) دەچين بۆ ديدەنى سەماكەران؟

- پورە (مارتا) وەڵاميدايەوە: تارادەيەك. يارمەتيت دەدەم: ئەو سەماكەرانە سپيپۆشن.

- (تيۆ) بەبيركردنەوەوە گوتى: سوڕدەخۆن. ئەمە چ فێڵێكە؟ هەموو سەماكەران سوڕدەدەن؟

- نەبەدەوری خۆیانداو نەبەردەوام. ناتوانیت بیدۆزیتەوە. ئەوانە دەرویشانێکن سوڕدەخۆن. ئێستا برۆ تەلەفۆن بۆ دۆستە خۆشەویستەکەت بکە.

## لەعیشقەوە بۆ دەمارگیری

وەك شتێکی ئاسایی لەفڕۆکەخانە ماڵئاوایی بەهۆی فرمێسك رشتنەوە روخسارەکانی گۆڕی (ئیرینا)و (ئەلیۆشا) بۆماوەیەکی درێژ لەپشتی شیشەکانەوە دەستیان رادەتەکاند. پورە (مارتا) بەسیمایەکی ترشەوە خۆی مژۆڵی جانتاکان کردو (تیۆ)ش بەبیری (فاتۆ)وە. لەناو فڕۆکەکەد بۆ سەرگەرمی خۆی بەهەڵدانەوەی پەڕەکانی گۆڤاری (تورکیش ئێرلاینز)ی تایبەت بەکۆمپانیای فڕۆکەوانی سەرقاڵکرد. چاوی بەسەر وێنەیەکەوە رواو گوتی: بەراستی ئەم (ئەستەنبوڵ)ـە پڕە لەمزگەوت!.

- پورە (مارتا) جەختی کردەوە: بەڵێ. زۆرترین‌و جوانترن مزگەوت. باشترین شوێن بۆ ناساندنی ئیسلام بەتۆ.

- مەگەر (مەککە) باشترین شوێن نییە بۆناساندنی ئیسلام؟

- بۆچی نا؟ بەڵام بەداخەوە رێگا بەناموسڵمانەکان نادرێت بچنە ئەو شارەوە!. دەتەوێت من‌و تۆ چۆن بچینە ئەو شارەوە؟ هیچ چانسێك نییە!

- ناتوانین خۆمان وادەربخەین موسڵمانین؟

- محاڵە. هەر لەگەڵ نزیکبونەوە لە تخوبی شارەکە لەسەر تابلۆی گەورە نوسراوە: (**بوەستە. دەڤەری قەدەغە. تەنها موسڵمانان مۆڵەتی چونە ژورەوەیان هەیە**). هەموو ساڵێك لەرێوڕەسمی گەورەی سەردانی (حەج) بەهۆی فشاری ئاپۆڕەکەوە کۆمەڵێك دەبن بەژێر دەستوپێوەو دەمرن.

- (تیۆ) وتی: بەراستی ناکرێت رێگری لەوەبکرێت؟

- نەخێر. لەهندستانیش لەسەردانە گەورەکانی روباری (گنگ)دا چەند سەد کەسێك دەمرن. ئەوەش دیاردەیەکە پەیوەستە بەژمارەی زۆری ئەوانەی دەچنە سەردان‌و هیچ پەیوەندییەکی بەدەستورو رێسای ئاینیەوە نییە.

- (تیۆ) بەجۆرێك لەڕاراییەوە وتی: نەخێر، دەبێت من بەچاوی خۆم ببینم و دڵنیابم هەموو موسڵمانان وەك (شێخ)ـەکەم بن لەئۆرشەلیم.

- هەموو هندییەکانیش وەك (مەهانەت جی) نابن!. ئاینێك دور لەکەسانی دەمارگیربونی نییە، بەڵام بەبێدەمارگیریش بەخشندەیی نابێت. ئەمە دەستورو رێسایە.

بابەتەکە لەوەدایە تۆ تەنها کەسانی بەخشندە دەناسیت. من تەنها باشترینەکان دەبینم‌و هیچ کاتێك خراپترینەکان ناناسم.

- ئەوانەی خراپترینن هەرگیز لەگەڵ تۆ گفتوگۆ ناکەن. هەر ناشیانەوێت تۆ هەموو ئاینەکان پێکەوە بخوێنیتەوە. بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەوەی خۆیان راستەقینەیە، پنتێك دابنێ تەواو.

- دوای ئەوە هۆی چییە کەماڵگەرایان بەخشندە نین‌و بێ ئارامن؟ مایەی ناڕەحەتییە!

- بەڵام لۆژیکیانەیە. بڕوانە... دەمارگیرەکان لەسەر خاکە هەژارەکان پەیدادەبن. بۆ نمونە، لەهەژارانی دەوروبەری شارەکان بنواڕە، لەهەرشوێنێك دڵت دەخوازێت، لە (بۆمبای) یان لە (قاهیرە)، ئەو خەڵکانە لەگوندەکانیانەوە بەرەوشارەکان دەخزێن، چونکە لەشوێنی خۆیاندا خاوەنی هیچ نین. وشکە ساڵی ئاژەڵەکانیانی لەناوبردووەو زەوییەکانیان بەرهەمی نەبوە. بێکارو خۆراك ماونەتەوەو بەدوای کاردا دەستیان لەگوندەکانیان بەرداوە.... وێناکردن‌و هیوایەکی بەتاڵ. ئێستا هەموو شتێکیان لەدەستداوە، گوندەکەیان، ئاژەڵەکانیان، درەخت‌و کێڵگەکانیان، هەموو شتێکیان، تەنها ئاین‌و مەزهەبیان نەبێت.

- بیر لەوە دەکەمەوە ئاینەکەیان چ سودێکی هەبێت؟

- بۆ ئەوەی لەدەوروبەری خۆیان ژینگەیەکی تاڕادەیەك هەماهەنگ دروستبکەن، ئەوانە لەپەرستگا یان مزگەوتەکادا خۆیان لەنێو خەڵکێکی ئاشنادا دەبیننەوە، کە لەگروپی خۆیانن. لەناو ماڵەکانیاندا دەتوانن شتێکی بچوکی ئاینپەروەری، فەرشێك، وێنەیەك، خۆشنوسییەك یان پەیکەری خواوەندەکان دابنێن. سەرەڕای ئەوە بڕوادارانی واهەیە چاودێری هەژاران‌و بێکاران دەکەن، چونکە بزوتنەوە کەماڵگەراییە ئاینییەکان بەلێبڕاوییەکی بەرچاوەوە دەستگیرۆیی هەژاران دەکەن.

- بەڕاست؟ کەواتە کاری چاکەش دەکەن؟

- ئەگەر باش بنواڕین بەڵێ. تەنها هێندە هەیە، کە لەبەرامبەر ئەو کۆمەك پێکردنانە شتێك لەهەژاران داوادەکەن، واتە ئیدی لەوە بەدواوە ئەوانە دەبنە وابەستەی بزوتنەوە کەماڵگەراییە ئاینییەکان‌و بەوشێوەیەش جۆرەها دەمارگیری دێتەئاراوە.

- (تیۆ) گەیشتە ئەو ئەنجامە: بەو پێیە سەرکردە ئاینییەکان ئەو خەڵکانە دەخەنە ژێر هەژمونەوە.

- بابەتەکە بەوسادەییە نییە. ئەوەی ئاینەکان دەیبینن ئەوەیە هەزاران لەدەوروبەری شارەکان جێگیر دەبێت. لەساڵی دوو هەزاردا دانیشتوانی جیهان دەبێتە شەش ملیار کەس، کە نیوەی ئەم ژمارە زۆرە لەناو شارە گەورەکاندا نیشتەجێدەبن. واتە سێ ملیار کەس.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بەوجۆرە بێت، دەتوانرێ چیبکرێت؟

- کەس نازانێت. ئاین لەتخوبی شارەکاندا ئامادەییەکی بەرچاوی هەیەو ئامادەیە ئارامبەخشی بێبەشان بێتو دڵیانبداتەوە. هەر ئەوە دڵەکان گەرمو هیواکان زیندوو دەکاتەوە... تێدەگەیت؟

- (تیۆ) ئحمێکی کردو گوتی: ئەوەی من تێدەگەم ئەوەیە، کە هەلپەرستان سود لەو واقیعە وەردەگرن.

- پورە (مارتا) وتی: نەخێر، بەوجۆرە نییە، ئامانج سەقامگیرکردنی دادپەروەرییەو دەبێت لەوە تێبگەیت.

- (تیۆ) بەتوڕەییەوە پەرچەکرداری نوادو گوتی: واتە چەك هەڵگرتنو بۆمب هاویشتن؟

- من هەرگیز نەموتوە پشتگیری بۆمبو تەقینەوە دەکەم. من هەوڵدەدەم ریشەی شتەکانت بۆ روندەکەمەوە، کە بۆچی جەنگو کوشتار هەیە!.

- (تیۆ) وتی: بەناوی عیشق بۆ خواوە جەنگ بەرپا دەکەن، شتێکی تۆقێنەرە. ئەوەی من دەیزانم ئەوەیە ئەگەر مرۆڤ هاورەگەزی خۆی خۆشبوێت ناتوانێت بیکوژێت!.

- باشە، تۆ ئەفسانەی (تریستانو ئیزۆت)[1] دەزانیت. ئەو دوانە وەکویەك یەکدیان خۆشدەویستو لەبەرئەوەش مردن...

- دەیانتوانی هاوسەرگیری بکەن؟

- نەیانتوانی! (ئیۆزت) لەگەڵ پوری (ترستان) هاوسەرگیری کردبوو.

- کەواتە باشتر، چونکە پورو برازا ناتوانن هاوسەرگیری بکەن. بۆنمونە منو تۆ؟. باشە ئەو دوانە دەیانتوانی ببنە دۆستی یەکدی.

- هەوڵی خۆیان بەکارخست. عیشق زۆرجار کوشندەیە! رویداوە دایکان بەهۆی زیادەڕەوی لەخۆشەویستی عیشقیاندا هەناسەیان لەسینەی رۆڵەیاندا بڕیوەو بوەبەهۆی مردنی رۆڵەکەیان. لەزۆر روداویشدا هۆکاری جەنگ بوە.

---

1. TRISTAN ET ISEULT: ئەفسانەیەکی (سلتی)یە، کە بەهرەبەخشی بەرهەمی ئەدەبیو مۆزیکە (لەوانە ئۆپرای بەناوبانگی واگنەر بەهەمان ناوەوە). (تریستانو ئیزۆت عاشقی یەکدی دەبن. لەو عیشقە بێسەمەرەدا تریستان لەبەرامبەر (مارك)ی پاشای کرنۆڤایو مێردی ئیزۆت تاوانبار دەبێت. ئیزۆت لەبەرامبەر ژنی تریستانو سەرئەنجام مەرگ کۆیان دەکاتەوە.

- (تیۆ) وتی: من باوەڕم بەوە نییە. عیشق ئاشتییە، خۆ ئەگەربۆ شتێکی دیکە گۆڕا ئەوە بێبەهایە.

- باکەمێك وردتر بنوارین. وایدابنێ لەگەڕانەوەتدا بۆ (پاریس) ئیدی (فاتۆ) تۆی خۆشنەویێت. ئایا هەوڵ نادەیت ناچار بەو کارەی بکەیت؟

- (تیۆ)، کەسورهەڵگەڕابوو، گوتی: شتی لەوجۆرە محاڵە. ئێمە بەراستی یەکدیمان خۆشدەوێت، سەرزەنشتی یەکدی دەکەین، بەڵام شەڕ ناکەین.

پورە (مارتا) بەهێمنی وتی: سەرزەنیشت، تێبینی بکە، پێشەکی جەنگە. هەربەهۆی ململانێو مشتومڕەوە بوو ئیمپراتۆری (بیزانس) پارچەپارچە بوو. هەر ئەو کێشانەیە ئاینەکانی لەناو خۆیاندا دابەشکردوە. سەرەتا لەنێوخۆیاندا مشتومڕو بێنەوبەردە هەیەو رۆژێك دەبێتە هۆی جیابونەوەو بەهۆیەوە چەکدار دەبنو دەکەونە وێزەی یەکدی. جەنگ بەناوی خواوە، بەناوی عیشقو خۆشەویستی.

- چ دیمەنێکی ترسناکە!. هەرچۆنێك بێت بابەتەکە سادەیە. من باوەڕم بەوشتانە نییە تۆ فەرموت.

ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: ئارەزوی خۆتە. بەڵکو روداوی ئەستانبوڵ رونیبکاتەوە.

## (نەسرەت)، خاتونێکی موسڵمان

جانتاکان، باربەرەکان... فرۆکەخانەکان لەسەرەتای چونەژورەوەدا بەیەك دەچوێن. لە (ئەستانبوڵ)یش وەکو (قاهیرە) ژنان هەندێك بالاپۆشو هەندێکی دیکەیان سفوربون. پورە (مارتا) لەنێو خەڵکەکەدا چاوەنواڕی چاوساغی داهاتوی دەکرد.

- (تیۆ) یارمەتیم بدە. خانمە چاوساغەکەمان کەسێکی ئەسمەرو چاوڕەشە.

- (تیۆ) بەنیگەرانییەوە وتی: زۆر گەنجە؟

- قەیرەیە. ژنێکی زۆر سەرنجراکێشە.

- (تیۆ)، کەئاماژەی بۆ ژنێکی قەڵەوی دەم بەپێکەنین دەکرد، وتی: ئەوە نییە؟

- پورە (مارتا) بەسەرزەنیشتکردنەوە وتی: (نەسرەت) بەژن قەڵەمییەکی رێکە!، وەك ئاسکە. بڕوانە، درۆم نەکرد، راست بوو. جوانییەکەی (نەسرەت) لەبەردڵانو لەیادنەچوو بوو. چاوانی قەترانی، خەندەیەکی هەمیشە بەهاری، روسەرییەکی ئاوریشمی، گوارەی گەورەو زمڕود، دەتگوت لەتابلۆیەکی میناتۆری هێنراوەتەدەر.

(تیۆ) بەدەمێکی نیوەکراوەی واقوڕماوەوە لەجێگای خۆی وەك مێخ چەقیبوو، چاوەکانی تێبڕیبوو.

- (نەسرەت) بەدەنگێکی تارادەیەك گڕەوە وتی: هەلەو!.. پورە (مارتا) دەربارەی تۆ زۆری بۆباسکردوم. ئینجا ماچێکی (تیۆ)ی کرد.

- (تیۆ) لەنزیکەوە بینی نەرمایی پەڕەکەی لوتی بەدەنکە ئەڵماسێك سمراوە وتی: تۆ هندستانیت! بەهۆی لوتەوانەکەتەوە دەڵێم.

- بەخەندەوە وەڵامیدایەوە: من پاکستانیم.

- (تیۆ) بەوریاییەوە وتی: ئاینی وڵاتەکەی تۆ چییە؟

- پاشان ئەوە بەتۆ دەڵێم. بەراستی دەبێت هەرچی زووە لەم قەرەباڵغییە رزگارمان ببێت.

(نەسرەت) سەرەڕای ئەندام باریکییەکەی جەربەزەش بوو، وەك فەرماندەیەکی راستەقینە فەرمانیدەدا. شۆفێری تاکسییەکە بەبێ مشتومڕکردن کەوتەڕێ. ئۆتۆمبێلەکە بەهۆڕن لێدان لەناو ئاپۆڕەو ژاوەژاوەکە دەرچوو. بازاڕ، مزگەوت، خانوی دوو نهۆمی دار، تەلارو باڵەخانەی چیمەنتۆیی، دوکانو کۆگاکان، هەموو ئەوانەی تێپەڕاند. لەهەموو شوێنێکەوە دەریا ئامادەبونی هەبوو. بڕیاربوو پورە (مارتا)و (تیۆ) لەنهۆمی حەوتەمی ئاپارتمانەکەی (نەسرەت)دا نیشتەجێبن، کە باڵەکۆنەکەی بەسەر (بسفۆر)دا دەینواڕی.

(نەسرەت) لەگەڵ چوون ناو ئەپارتمانەکەوە روسەرییەکەی لابردو پێڵاوەکانی داکەند. بازنە ئەڵماسەکەی داماڵیو بەکەماڵی پشودانەوە لەسەر فەرشەکە رۆنیشت. ژنێکی رەشپۆش بەبێدەنگییەوە بەسینییەك قاوەوە هاتە ژورەوە. (نەسرەت) بەزمانی عەرەبی سوپاسی کردو لەتەنیشت خۆیەوە داینیشان.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: تۆ بەو لوتەوانەو ئەو گوڵە (توبروز)انەوە چۆن دەڵێیت هندی نیت؟!.

- پورە (مارتا) وتی: لەساڵی (١٩٤٨)دا هندستانو پاکستان لەوڵاتی گەورەی (هندستان)ی دایك لەیەك دابڕان. (پاکستان) دەکەوێتە باکوری خۆرئاوای (هندستان)ەوەو زۆربەی دانیشتوانەکەی ودك (نەسرەت) موسڵمانن.

- (تیۆ) پرسی: کەواتە ئێستا بەزمانی موسڵمانی وڵاتەکەی خۆت ئاخاوتیت؟

- (نەسرەت) وەڵامیدایەوە: لەوڵاتی من بەزمانی (ئۆردو) ئاخاوتن دەکەن. لەئەستانبوڵ خەڵکی بەتورکی دەدوێن. من لەگەڵ (مریەم)ی دۆستم، کە فەلەستینییە بە عەرەبی دووام. زمانێك نییە ناوی زمانی موسڵمانان بێت.

پورە (مارتا) وتی: بەڵام (نەسرەت) قورئانی بەزمانی ئەدەبی عەرەبی نوسیوە.

- (نەسرەت) بۆ پشتگیری راگەیاندنی وتی: خواوەند لەدڵی باوەڕدارانـدا بـەزمانی خۆیـان لەگەڵیان دەدوێت. لەگەڵ (موسا) بەزمانی عیبری دەدواو لەگەڵ (موحەمەد) بەعەرەبی. لـەلای ئێمە عیشق بۆ خـوا لـەزمان گـرنگترە. (تیـۆ) ئـارەزوت لـەم شـیرینیانە هەیـە؟ وریابـە پـڕن لـە هەنگوین.

- (تیۆ) بەرویەکی خۆشەوە وتی: پاقلاوە! هەنگوین، تامی بەهەشت دەدەن.

- پورە (مارتا) وتی: (نەسرەت)، باکاتی زۆر بەفیڕۆ نەدەین.

## قورئان

- ژنە گەنجەکە قاچەکانی کۆکردەوەو چوارمشقی رۆنیشت و گوتی: باشە، با دەستپێبکەین. دەبێت (قورئان)ت بۆ راڤەبکەم؟

(تیۆ) بەسەراسیمەبونەوە وتی: هەواڵێکی نوێیە. لە (ئۆرشەلیم) (شێخە) باسی کرد. (الله)، (موحەمەد)، (ئەبراهام)... هەموو ئەوانە دەزانم!

- (نەسرەت) بەخەندەوە وتی: باشە، بابزانم لەیادت ماوە (قورئان) واتای چییە؟

(تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە دەمی داچەقاندو هەنگوین لەلالێویەوە هاتەدەر.

- پورە (مارتا) یادی هێنایەوە: (سلێمان)ی هاوڕێمان بەمنی راگەیانـد، کـە ئەگـەر هەیـە ئـەو بابەتـە لـەیاد بکـەیت. بـەڵێ یەکدی دەناسـین‌و باشـیش لەیەکدی تێدەگـەین. لەگـەڵ ئەوەشـدا بەتۆی راگەیاند، کە (قورئان) واتـە (لەبەرخوێندنـەوە). بەلایـەنی کەمـەوە دەزانیـت (ئبلـیس Iblis) لەئاینی ئێمەدا کێیە؟

- (تیۆ) وەڵامیدایەوە: ئێستا پێتدەڵێم: کاتێك ئەفرێنـەری جیهـان (ئـادەم)ی لـەقوڕی سـور دروستکرد فـەرمانی بەهـەموو فریـشتەو پەرییـەکانی کـرد سـوژدە بـۆ ئـەو ئافرێنـەرەی ببـەن؛ تەنها یەکێك یاخی بوو، ئەویش (ئبلیس)بوو. (ئبلیس) وتی: من سوژدەی بۆ نابەم، چونکە مـن لەئەو باشـترم. تـۆ منـت لـەئاگر ئەفرانـدووەو ئـەو لەقوڕەسـور. دەمودەسـت پـەروەردگار ئـەوی گومڕاکردو فەرمانیدا: (لێرە برۆ دەرەوەو هەتا رۆژی لێپرسینەوە (قیامەت) نەفرەتت لێبێت). لەگەڵ ئەوەشدا ئەو فریشتەیە راست بوو!

- نەخێر، وانییە، چونکە دژ بەپەروەردگارەکـەی جوڵایـەوە. بـەڵام (ئبلـیس) داوای لـە(خـوا) کرد رێگای بدات مرۆڤ بەلای خۆیدا کێش بکات. وەڵامەکەی (الله) بـۆ ئـەو سمبولیانـەو نهێنی ئامێزە. پەروەردگار بەپەسەندکردنی خواستەکەی وتـی: (تـۆ لەدەستـەی ئـەو کەسـانەی یـەك

**مۆڵەتیان پێدەدرێت)**. تا ئێرە پەروەردگار ئەو توانایەی پێبەخشی تا بتوانێت مرۆڤ بەردو دۆزەخ پەلکێش بکات. (ئبلیس)، کە یەکەمین کافرە بە (شەیتان - SATAN)نیش ناودەبرێت.

- باشە، هەمان (دیابل - DIABLE)ی ئێمەیە!

(ئبلیس) لەگەڵ خواوەندا پەیمانێکی بەست، بەڵام لەشەیتانی کریستیانیدا باسی ئەو پەیمانە نییە. واتە ئەوە دەکەوێتە ئەستۆی باوەڕداران، کە لەنێوان (ئبلیس)و پەیامبەردا یەکێکیان هەڵبژێرن. (قورئان) باوەڕداران ئاگادار دەکاتەوە: **(ئەگەر رێز لەوتەکانی موحەمەد نەنێن، ئەوا لە(کاتی بەڵێنپێدراو)دا ئاگری دۆزەخو قیری تواوە چاوەنواڕیان دەکات)**.

- واتە هەمان ئاوازی ئاسایی!

- نەخێر، زیاتریش لەوە. (قورئان) پێداگرییەکی زۆر زۆر لەسەر ئەشکەنجەی دۆزەخ دەکاتەوە، لەگەڵئەوەشدا باس لەچێژە بێکۆتاکانی بەهەشتیش دەکات؛ لەباخی پڕ لەرووباری شیرو هەنگوین، کە لەوێدا هەموو ئارەزووەکانی بەهەشتییەکان جێبەجێ دەکرێت. کوڕانی لاو بەبەرگی ئاوریشمی سەوزەوە شەرابی بەهەشتی دەنۆشنو حۆرییەکانیش بۆ دانیشتوانی ئەو فەردۆسە سەما دەکەن...

حۆری؟

- پورە (مارتا) بەشداری گفتوگۆکەی کردو گوتی: حۆرییەکان ئەفرێنراوی ئاسمانن، کچانی لاوی ئەبرۆ کەوانین. ئەم حۆرییانە پاکیزەی هەتاهەتاینو دەبنە هاودەمی ئیمانداران.

- (تیۆ) بەڕوخۆشییەوە وتی: بەهەشتی (الله)، زۆر لەبەهەشتی کریستیانەکان خۆشترە. چونکە دانیشتوانەکەی هیچ کارێك ناکەن.

- (نەسرەت) درێژەی بەرونکردنەوەکانیداو گوتی: ئەمانە وێناو خەیاڵاتنو خەونئاسان. چونکە بۆ خۆدورگرتن لەدۆزەخو گەیشتن بەفەردۆسی خواوەند رێگایەکی سادە هەیە. هێندە بەسە پێنج بنەماکەی ئیسلام پەیڕەو بکەیت. یەکەم، پەسەندکردنی ئەوەی خوایەك نییە جگە لە(الله)و (موحەمەد)یش پەیامبەرێتی. ئەم راگەیاندنە بە (شایەتومان) ناودەبرێت. کەواتای (گەواهیدانە). دووەم، ئەنجامگەیاندنی ئەرکی نوێژ. سێیەم، بەخشینی دەیەك، کە ساڵانە لەسەر هەموو دەوڵەمەندان کارێکی بەزۆرەو بە (زەکات)ناو دەبرێت.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: دە یەك؟ لەمێژودا خوێندومە، کە لەرژێمی پێشودا[1]، قەشەکان (دە یەك)یان لەبەرهەمی جوتیاران هەڵدەگرت.

---

[1] Ancien Regime: لەفەرەنسا بەرژێمی سەڵتەنەتی پێش شۆڕشی مەزنی فەرەنسا دەوترێت، کە لەساڵی (١٧٨٩) رویدا.

پوورە (مارتا) بەشداریکردو گوتی: لەئیسلامدا قەشە نییە. باوەڕدار ئەم (ددیەك)ـە بەخواستی خۆی پێشکەش دەکات و جۆرێکە لەدارایی‌و لەناو هەژاران‌و نەداران دابەشدەکرێت. وابزانم خێرکردنێکی ئارەزومەندانەی دیکەش هەیە، وانییە (نەسرەت)؟

- ئەو خێرکردنەش راسپێردراوە. بنەمای چوارەم رۆژوگرتنی مانگی رەمەزانە. هەرلەسپێدەی بەیانییەوە تاخۆرئاوابون نابێت نەهیچ بخورێت‌و بخورێتەوە. نەزەرڕەیەك نان‌و نە دلۆپێك ئاو، تەنانەت رێگای تامکردنیش نادرێت.

- (تیۆ) وتی: ئاهـ ... زۆر سەختە!.

- (نەسرەت) وتی: تواناو کۆشش بۆ نەفسگرتن بەشێکە لەئەرکی مانگی رەمەزان، بەلاّم کاتی بەربانگ لەناو خێزاندا وەك جەژن بەرپا دەکرێت. بنەما یان ئەستونگەی پێنجەم. ئەرکی سەردانی (مەککە)یە، ئەگەر باوەڕدار توانای هەبوو. وەك دەبینیت پرنسیپەکانی ئیسلام سادەن‌و زۆریش. هەڵبەتە راسپاردەو بەشی دیکەش بۆ ئەم بنەمایانە زیادکراوە، کە بەهێندی راسپاردەکانی (موسا) دەبێت بۆ گەلی جولەکە.

- پوورە (مارتا) رونیکردەوە: ئەو راسپاردانە زۆربەیان بەیەك دەچوێن: دورکەوتنەوە لەخواردنی گۆشتی بەراز، سەربڕینی ئاژەڵ بەپێی سوننەت، خەتەنەکردن‌و...

- (نەسرەت) بەنەفرەت‌و بێزەوە وتی: کەبەداخەوە، زۆرجار بەهەڵە خەتەنەکردنی ژنانیشی بۆ زیادکراوە. کاتێك بیر لەوە دەکەمەوە، کە هەندێك لەسوننەتگەرایانی ئێمە ئەو نەریتە ئەفریقییە دەخەنە پاڵ راسپاردەکانی موسڵمانان دوچاری سەراسیمەبون‌و ناڕەحەتی دەبم. پەیامبەری ئیسلام بەگشتی نەریتی لەوجۆرەی رەتکردۆتەوە!

- پوورە (مارتا) پێکەنی‌و گوتی: ئازیزەکەم خۆت سەغڵەت مەکە. سەبارەت بەشەراب پەیامبەری ئیسلام خودی خۆی قەدەغەی کردوە! گومانیشی تێدانییە.

- (نەسرەت) وتی: ئەمە وردە وردە هاتوەو سەرەتا بەو جۆرە نەبوە. بەلاّم پەیامبەر بەهۆی ئەو ئاژاوەو ناڕێکوپێکییەی بەهۆی مەستبونی باوەڕدارەکانەوە دروستدەبوو وەك سەرۆکی دەوڵەتێك جولاّوەتەوە. بۆ نمونە، لەیەکێتی سۆڤیەت کاتێك (گۆرباچۆڤ) لەددیەی هەشتاکاندا گەیشتە دەسەلاّت یەکێك لەکارەکانی قەدەغەکردنی (کحول) بوو لەسەرانسەری یەکێتی سۆڤێتدا. سەرەڕای ئەوە پەیامبەر ئیسلام بەتوندی قومارکردنیشی قەدەغە کردوەو بەبێهودەو مەترسیداری داناوە.

سەرەڕای شەراب، قورئان لەبارەی هەندێك خۆراکی دیکەوە راسپاردەی هەیە. کە بە(تەورات) دەچوێت.

- (نەسرەت) رونیکردەوە: لەوبارەیەوە نکوڵی لێناکرێت! پەیامبەری ئیسلام بەردەوام دوپاتی کردۆتەوە، کە پێش ئەو (الله) نێردراوی دیکەی بۆ ناو خەڵك رەوانەکردوە، لەبەرئەوەیە پەروەردگار دوایین پەیامی خۆی بەهۆی دوایین نێردراوییەوە بۆ جیهان رەوانەکرد؛ هەرلەبەرئەوەش رێزی لەپەیامبەرانی پێشوو ناوە. پەیامبەری ئیسلام لەلای خۆیەوە نوێنەرانی بۆ لای جولەکەو کریستیانەکان رەوانەکردوە، بەڵام ئەوان، لەگەڵ بونی (وحی — سروش)یشدا نەیانویستوە گوێ لەقسەکانی بگرن. ئەوەش ئەو بابەتەیە (قورئان) ئاماژەی پێداوە.

- (تیۆ) پرسی: کەواتە ئەوەی (سلێمان) بەمنی راگەیاند راستە. پاش ئەو کەسی دیکە نایەت؟

(نەسرەت) وتی: ئارامبگرە. لەناو خودی قورئاندا هیچ ئاماژەیەك نییە، بەڵام راڤەی زۆر بەناوی (گوفتار - حدیث) هەیە، کە (سونەتەکان)ی پەیامبەرن و لەسەر بنچینەی یەکێك لەو (حەدیس)انە کەسێك بەناوی (مەهدی) دێت، کە هەمان ئەرکی (مەسیح)ی عیبرییەکان ئەنجامددات، بەڵام باوەڕدارانی ئیسلام بەوچاوەوە سەیری ناکەن وەك ئەوەی جولەکەکان لە (مەسیح)یەکەیان رەچاوی دەکەن و وەك کریستیانەکانیش بڕوایان بە دونادونی نییە، بەڵکو موسڵمانان چاوەڕوانی رۆژی دوایی(هەستانەوە- قیامەت) دەکەن و بەکۆتایی کاتی دادەنێن و لەو باوەڕەدان ئەو رۆژە دێت و پاداشت بەباوەڕداران دەدرێت و کافران ردوانەی دۆزەخ دەکرێن.

پورە (مارتا) چووە ناو باسەکەوەو گوتی: دەمویست دەربارەی کافرەکان پرسیار بکەم: چونکە بەپێی ئامۆژگارییەکان (قورئان) جەنگی دژ بەکافران ئەرکێکی سەرشانە.

(نەسرەت) وەڵامیدایەوە: دیارە باس لە(جیهاد) یان (جەنگی پیرۆز) دەکەیت؟. دەزانیت ئەم وشەیە پێش هەموو شتێك بەواتای (جەنگ لەپێناوی خواوەند)و (خەبات لەپێناو ئامانجێکی دیاریکراو)دا دێت؟

- (تیۆ) وتی: جەنگ دژ بەنەفسی خود. دەبینیت هەموو شتێکم لەیاد نەکردوە.

پیرۆزباییت لێدەکەم (تیۆ)!. تۆ لەپورت باشتر لەشتەکان تێدەگەیت. سەرەڕای ئەوەش هەموو کافرەکان هەر ناموسڵمان نین!

- پورە (مارتا) وتی: ئۆو... بەڵێ دەزانم. دەتەوێت بەمن بڵێیت پەیڕەوانی ئایینەکانی دیکەی خاوەن (کتێب)، جولەکەو عیسایەکان لەلایەن ئیسلامەوە پەسەندکراون، بەو مەرجەی باج و خەراجی تایبەت بدەن. لەو بارەیەوە نمونەکەی (سلێمان) دێنمەوە، کەباسی سوڵتانی ئیمپراتۆری عوسمانی کرد کەباوەشی گەرمی بۆ جولەکە کۆچبەرەکانی ئەوروپا کردبۆوە،

پاشئەوەی فەرمانی دەرکردنیان لەلایەن پاشاکانی کاسۆلیکی[1] لەساڵی (١٤٩٢)دەرچووبوو. هەموو ئەو روداوانە دەزانم، بەڵام ئەم زانینە رێگر نییە لەبەردەم ئەوەی ئەگەر تۆ کەسێکی (ئانیمیست)، (بودایی) یان هندییەك بیت ناچار دەبیت بچیتە سەر ئاینی ئیسلام یان مەترسی مەرگ پەسەند بکەیت!.

- (نەسرەت) وتی: (جیهاد) بەشەشەمین بنەمای ئیسلام پێناسەکراوە؛ بەدەروازەی بەهەشتی دەزانن... من خودی خۆم گێرانەوەکەی (غەزالی)ی فەیلەسوف بەباشتر دەزانم، کە دەڵێت: **(دەتوانیت بەبێ دەستهەڵگرتن لەکوانوی خێزان جەنگاوەرێکی گۆڕەپانی جیهاد بیت).**

- (نەسرەت)، کەمێك ساویلکانەیە. خراپ نییە سەبارەت بە ئامۆژگارییەکانی (قورئان) بۆ ژنان لەگەڵ (تیۆ) گفتوگۆ بکەیت. ئەم بابەتە زۆر هەڵدەگرێت.

- (نەسرەت) بەپێکەنینەوە گوتی: بەڵێ.. (تیۆ)، ئەوە راست نییە من بەبێ باڵاپۆش لەبەردەمی تۆدا دەرکەوم؛ چونکە تۆ نەباوك، نە براو ئەندامی خێزانی منی‌و مناڵیش نیت. ئێستا بیربکەرەوە خۆت بخەرە سەردەمی پێش ژیانەوەوە، واتە لەسەردەمی (نەزانی جاهلیەت). پەیامبەر لەپلەی یەکەمدا روی قسەی لەپیاوانە، کە هەموویان شەڕانی‌و کەللەشەق بون. پێیان دەڵێت ماف ئەوەتان نییە بەئارەزوو ژنەکانتان تەڵاق بدەن. ئەرکداریان دەکات، ئەگەر هاوسەرەکەیان تەڵاقدا دەبێت لەروی داراییەوە سزاکەی بدەن. فەرمانیان پێدەدات لەگەڵ ژنەکانیان بەمیهرەبانی بجوڵێنەوەو ئەگەر ئاگادارکردنەوەش پێویستبوو زیادەڕەوی تێدانەکەن. ئەم کۆمەڵە شتە دەتوانێت وێنای هەلومەرج‌و دۆخی ژیانیان لەئەرەبستاندا بەرجەستە بکات. لەوکاتەی پەیامبەر (وتە)کانی خواوەندی بۆ دەخوێندنەوە.

- پورە (مارتا) وتی: رازیم، ئینجا پەیامبەر فەرمان بەژنان دەدات.

- (نەسرەت) وتی: راستە، بەڵام ئەگەر لەنزیکەوە لەبابەتەکە بنوارین دەبینین زیاتر لایەنی ئەقڵانی‌و لۆژیکانەی هەیە. ژنان دەبێت زیاتر لایەنی چاکەکاری لەبەرچاوبگرن. هاوسەرێکی باش‌و دایکێکی میهرەبان بن. ژیان بەپاکی‌و شایستەیی بەسەرببەن. پەیڕەوی باڵاپۆشی بکەن‌و تەنها لەبەردەم خێزانی خۆیدا لایبدات. لەم واتایەشدا هیچ شتێکی دوور لەشتی ئاسایی نابینم. تۆ ژنە هاوچەرخە روتەکانی پاریس بەباشتر دەزانیت؟

- (تیۆ) بەدزە نیگایەکەوە گوتی: ژنی روت! جوانە!

---

[1]. مەبەست پاشاکانی ئیسپانیایە بەتایبەتی (فردینان دووەم)ی مێری (ئیزابێل دوکاستیل)، کە ئەنگیزاسیۆنی دروستکرد. جولەکەکانی لە ئیسپانیا دەرکردو بەسەر موسڵمانەکاندا سەرکەوت‌و (غرناتە)ی گرتەوەو لەلایەن (پاپا)وە ناونیشانی (پاشایانی کاتۆلیك) بەخۆی‌و هاوسەرەکەی بەخشرا.

- (نەسرەت) بەتوڕەیی‌و راشکاوییەوە وتی: بۆ نمونە پێتباشە دایکت بەسینەی روتەوە لەسەر شەقامەکانی پاریس پیاسەبکات؟

- ئەگەر وابێت دوچاری سەرسوڕمانم دەکەیت. حەقیقەت ئەوەیە ئەگەری زیادەڕەوی لەهەردوو سەرەوە هەیە.

- پورە (مارتا) تکای کرد: کەواتە بۆ (تیۆ)ی رونبکەرەوە، کە دەکرێت زیادەڕەوی موسڵمانان لەکوێوە بێت.

- (نەسرەت) رونیکردەوە: موسڵمانەکان نە(پاپا)یان هەیەو نە(ئەسقەفی) گەورە. هەموو باوەڕداران، کە بەعەرەبی پێیدەڵێن (ئومەت) یەك سەرۆکی هەڵبژێرراو و دەسەڵاتیان نییە... هەرلەبەرئەوەشە بەدرێژایی سەدەکان زانا ئاینییەکان هەریەکەیان راڤەی خۆی هەبوە هەندێك فتوایان داوە نەك هەر سەرو سنگ، بەڵکو دەبێت روخساریشی بپۆشێت. ئەتوانی ئەم خاڵە وەك تێبینی‌و پەراوێزی کورت لەهەندێك وەرگێڕانی قورئاندا بۆ سەر زمانی فەرەنسی بخوێنیتەوە. بەڵام لەناو خودی کتێبەکەدا داخوازی لەو جۆرە نییە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: باشە، ئەی بۆچی تۆ لەبەرامبەر مندا باڵاپۆشەکەت لاداوە؟

من خۆم لەگەڵ هەلومەرج‌و دۆخەکاندا دەگونجێنم. بۆ نمونە کاتێك بۆ سەردانی هاوڕێکانە لەهندستان دەچم باڵاپۆش ناکەم، هەروەها لەئەورووپاش، من (کەماڵگرا -- سەلەفی)نیم.

(تیۆ) وەڵامیدایەوە: هەستم پێکردبوو، ئەی مێردەکەت، چەند ژنێکی هەیە؟

نەخێر، سیستمی چەند ژنی، کە تۆ پێیدەڵێیت (پۆلیگام - Polygamie) لەگەڵ ئەو سیستمەی، کە پیاو مافی نییە لەیەك (ژن) زیاتر بهێنێت، جیاوازە. لەسەردەمی پەیامبەردا چەند ژنێتی خونەریتی دەوارنشینان‌و بیابان نشینەکان بوو. پەیامبەری ئیسلام دوانزە ژنی هەڵبژاردوە، بەڵام تەنها دوای مردنی هاوسەری یەکەمی. بەمپێیە پەیامبەریش ماوەیەکی درێژ تاکە هاوسەرێکی هەبووە. بۆچی لەدواییدا رای گۆڕیوە؟ بێگومان چونکە چەند ژنێتی یەکێك بوە لەتازیارەکانی سەرانی گرنگی عەرەب، بەڵام لەهەمان کاتیشدا یاسای سەختی بۆ چەند ژنێتی دارێژا. لەوانەش ژمارەی هاوسەرگرتن بەچوار دانە سنوردارکرا، بەو مەرجەی پیاوی باوەڕدار بتوانێت بیانژێنێت. (قورئان) فەرمان بەپەیڕەوانی خۆی دەکات لەهەموو رویەکەوە دادپەروەری لەنێوان ژنەکانیاندا بچەسپێنن‌و هەر شەوەی لەگەڵ یەکێکیاندا بەسەرببەن.

- (تیۆ) هاواریکرد: دەتوانم روخساری دایکم بهێنمە بەرچاوم، ئەگەر باوکم بیەوێت رەفتاری لەوجۆرەی لەگەڵدا بکات!

(نەسرەت) وتی: دایکی تۆ ناتوانێت رژێمێکی لەوجۆرە پەسەندبکات. مافی خۆیەتی! ئاھ ... دەزانم ئەمرۆ راڤەکارانی موسڵمانی زانا هەن هانی چەند ژنی دەدەنو دەڵێن ئەم رژێمە لەگەڵ بیمەی کۆمەڵایەتی (فەرەنسا) گونجاوەو پشتیوانیێکی بەهێزی ژنانە، چونکە بەبێ ئەو پشتیوانییە کۆمەڵایەتییە لەگۆشەگیریو نەداریدا درێژە بەژیان دەدەن. ئەمەش بەو واتایە دێت، کە ژنان مافیان نییە لەڕوی ئابورییەوە سەربەخۆبنو بەو پێیەش ناتوانن کاربکەن!. من ئەوە پەسەندناکەم. من بەکاری خۆم ژیانم دەسەبەردەکەم، لەگەڵ ئەوەشی کە مێردەکەم کریستیانی نەك موسڵمان.

- پورە (مارتا) دەنگی هەڵبڕیو گوتی: کەواتە تۆ بێدینو کافری! بەپێی راسپاردەکانی (قورئان) پیاوێکی موسڵمان دەتوانێت لەگەڵ ژنێکی جولەکە یان کریستیانیدا هاوسەرگیری بکات، بەڵام پێچەوانەکەی مەحاڵە.

- (نەسرەت) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: هۆکەی ئەوەیە راڤەکارانی قورئان لەگەڵ سەردەمدا نەڕۆشتون. ئەو حوکمانەشی دەربارەی ژنان دراوە بەهەمان شێوەی سەردەمی پەیامبەر ماوەتەوە. لەلایەکەوە، ئەم راسپاردانە کەمو زۆر خۆیان لەگەڵ بارودۆخی وڵاتە جیاجیاکان گونجاندوە. هەندێك دەوڵەتی موسڵمان بەپراکتیکانە بواری فرەژنێتی نادات. لەشوێنێك خوێندنی کچان قەدەغەیە، کەچی لەشوێنی دیکە رێگای پێدەدرێت. هەرچۆنێك بێت (الله) یەكو یەکتایە، بەڵام باوەڕداران پارچە پارچەو چەند لقێکن.

- (تیۆ) بەسەرسامییەوە وتی: تەنانەت لەئیسلامیشدا؟

## فرە لقەکانی ئیسلام

- (نەسرەت) بەردەوامبوو: بەڵێ، پاش مەرگی پەیامبەر، وەك ئەوانیدیکە.

(تیۆ) هاواریکرد: پێویست ناکات درێژەی پێبدەیت. خۆم لەحیاتی تۆ دەیڵێم. جێنشینەکانی لەپێناوی بەدەستهێنانی دەسەڵاتدا دەستیاندایە جەنگ دژ بەیەکدی.

- بەدڵنیاییەوە. دەبێت کێ حوکمڕانی موسڵمانەکان بکات؟ کێ ببێتە جێنشین (خەلیفە)؟ لە هەشتی حوزەیرانی ساڵی (٩٣٢) لە شەوی کۆچیدا، لەوکاتەدا، کە هێشتا (ئایشێ — عائشە)ی هاوسەری (خۆشەویستی) پەیامبەر چاوەکانی پڕ لەفرمێسك بوو، سێ گروپ کەوتنە ململانێ لەگەڵ یەکدی. گروپی هاوەڵانی (مەدینە)، گروپی هاوەڵانی پەیامبەرو گروپی (عەلی) نزیکترین میراتگری پەیامبەر، کە کوری مامیو زاواشی بوو. ئەم گروپەی دواییان دەمودەست ناوی (حزب) یا (الشیعە -- al - Shyia) یان لەخۆیاننا. دوای چەند ساڵێك گروپێکی شیعەی

دیکە جیابونەوە، چونکە پێیانوابوو (عەلی) سەرکردەیەکی لاوازە بۆ ئۆمەتی موسڵمانان: ئەم گروپەش ناوی (خەوارج)یان لەخۆیاننا و دواتر یەکێك لەمانە بەشمشێر (عەلی) کوشت. کوڕەکەشی بەناوی (حسێن) لەشەڕێکدا، کەپاش چەند ساڵێك لەوە رویدا بەدڕندەترین شێوە کوژراو هاوەڵەکانی کوشتوبڕکران. یەکەمجاربوو گروپێکی موسڵمان (نەوەی پەیامبەر)یان دەکوشت!. لەبەرئەوەشبوو موسڵمانان بەسەر دوو باڵدا دابەشبون: باڵێکیان (سەلەفیەکان)بون، کەخۆیان بەپەیڕەوی سونەتی پەیامبەر راگەیاندو سەرۆکی کۆمەڵەکەی خۆیان لەرێگای رێکەوتنی ئومەتەوە هەڵدەبژارد. باڵەکەی دیکەیان پەیڕەوانی جێنشینی شەرعیو یاسایی (عەلی)بون، واتە(حزب al - Shyia). لەوسەردەمە بەدواوە باڵی یەکەم بەپەیڕەوانی (سونەت) یان (سونی)و باڵی دووەم بەپەیڕەوانی (عەلی) یان (شیعی - Chiites) ناسران.

- خەلیفەکانی پەیڕەوانی سونەت داوایان لەزاناکان کرد یاساکانی ئیسلام دابڕێژنو بەرایش بەرێکەوتنو ئاشتیو هاوبەندی نێوان باوەڕداران بدەن. باڵی سونەت، کە لەوەودوا لەناو کۆمەڵگەی باوەڕداراندا زۆرینەی پێکهێنا، وەك مەرگی سەرکردەیەکی سوپایی لەشەڕێکدا لەشەهیدبونی (حسێن)ی نەوەی پەیامبەری دەنواڕی؛ لەکاتێکدا لەلای (شیعەکان) کوشتنی جێنشینی یاساییو رەوای پەیامبەری ئیسلام کوشتنێکی زاڵمانە بوو، (حسێن) شەهیدێکی پیرۆزبوو. هەموو ساڵێك (شیعەکان) یادی شەهیدبونی (حسین)و ئەو رووداوە خوێناوییە لەرێوڕەسمێکی شکۆدارو مەزندا دەکەنەوە. بزاوتێکی گەورەی دەستەی ماتەمگێڕی سازدەکەنو لەو رێپێوانە گەورەیەدا بۆیادی خوێنی رژاو لەجەستەی (حسین) بەزنجیر لەخۆیان دەدەنو هەندێکجار خۆیان خوێناوی دەکەن.

- (تیۆ) پرسی: ئایا ئەمڕۆش ئەو یادە دەکرێتەوە؟

- (نەسرەت) وەڵامیدایەوە: بەڵێ... بەڵام مێژووی شیعە بەشەهیدبونی حسین کۆتایی نایەت. لەسەرەتادا شیعەکان ئیمامو سەرۆکی خۆیانیان هەبوو، بەتێپەڕبونی کات چەندین باڵ لەلقی سەرەکی شیعە بوەوە، کەهەمویان بەهۆی ساتی ناسکی هەڵبژاردنی جێنشینەوە بوو، چونکە لەو ساتانەدا هەمیشە ئەو پرسیارە گەورەیە دەکرا، کێ شایستەی جێنشینییە تا ببێتە ئیمامی راستەقینەی ئیسلام؟. هەندێك لەپەیڕەوان پاش مردنی شەشەمین ئیمام بڕیاریاندا پەیڕەوی لە (ئیسماعیل)ی کوڕی بکەن، کە ماوەیەك بەرلەباوکی مردبوو، چونکە (ئیسماعیل)

مردبوو بڕیاریاندا بەزیندوی دابنێن‌و راییبگەیەنن رۆژێك لەرۆژان دەگەڕێتەوە، ئەم گروپەیان ناونا (ئیسماعیلییەکان)[1]

- (تیۆ) وتی: واتە جۆرێکە وەك مەسیح.

- (ئیسماعیل)یەکان بەجۆش‌و پەرۆشییەوە چاوەنواڕی هەستانەوەی گەورەی ئەون. رۆژێك لەرۆژانی ساڵی (١٠٩٠) لەمانگی رەمەزاندا لەشوێنێکی ئێران کەسێك خۆی ناونا (ئیمام حەسەن)و رایگەیاند رۆژی (هەستانەوەی گەورە) گەیشتوە. دیمەنێکی سەرسامهێنەربوو. (حەسەن) لەنێو گۆڕەپانێکی فراوانی قەڵایەکدا بەناوی (مەرگ — الموت) داڵانێکی گەورەی دروستکرد، کەمیحرابەکەی بەپێچەوانەی (مەککە)بوو. روو بەهەموان رایگەیاندوە، بەفریشتە، جنۆکەو مرۆڤەکانیشەوە، کە (هەستانەوەی گەورە) لەناو ئەودا بەدیهاتوەو بۆجیهان گەڕاوەتەوە. پاشان رۆژوەکەی شکاندوە. لەوێدا دوجار دەستدرێژی کردۆتە سەر بنەماو پێگەی ئیسلام. جارێك بەوەرگێڕانی روی لە(مەککە)و جارێکی دیکەش بەشکاندنی رۆژوی رەمەزان. (حەسەن)، کەخۆی بەئیمام دەناساند، رایگەیاندبوو خۆی خاوەن‌و خودانی حەقیقەتەو تەنها ئەوە دەتوانێت درێژە بەو ئاینە بدات.

- لەبەرئەوە (ئیسماعیل)یەکان بەوجۆرە بەشێوەیەکی لێبڕاوانە لەباڵی سەرەکی جیابونەوە، بەتایبەتی لەجیهانی خۆرئاوادا، (ئیسماعیل)یەکان بەناوی (ئەساسینس - Assassins)[2]ـ دەناسن، چونکە لەخولێکی مێژویی پڕ لەهەورازو نشێوی خۆیدا ئەو گروپەی لە (هەستانەوەی مەرگ) دروست ببوو (تیرۆریزم)ی لەریزی کارە پیرۆزەکان دانابوو. ئەو گومانە هەیە، کە (ئەساسینس)ەکان لەژێر کاریگەری حەشیشەدا کاری تیرۆرکردنیان ئەنجام دابێت‌و ناودکەشیان لەکاریگەری دەرونی ئەو مادە بەهەشتیەوە هاتبێت. بەڵام بەپێی هەندێك بیروڕای دیکە لەوانەیە ناوی (ئەساسینس) لەوشەی حەشیشەی عەرەبییەوە هاتبێت (حەشیشی hashishi)، کەواتای تاکێکی دەمارگیری تاقمێکی ئاینی دەدات.

- (تیۆ) وتی: ئایا ئەو کەسانە نابنە بەهرەبەخشی تیرۆریستەکان؟

---

[1]. لەراستیدا (بانگەشەدەرانی پاراستنی ئیمامەت لەناو خێزانی ئیسماعیل، کە بە ئیسماعیلییەکان یان ناوەکییەکان بەناوبانگن... لەو باوەڕەدان پاش کۆچکردنی (ئیمام جەعفەر) چونکە (ئیسماعیل)ی کوڕی پێش باوکی مردووە دەبێت ئیمامەت بۆ (محمد بن اسماعیل) بێت کە (حەوتی تەواوە). خولی حەوتەم تەواو دەکات‌و ئیمامەت لەناو خێزانەکەیدا دەمێنێتەوە) (ف. معین).

[2]. Assassins : ئەمڕۆ ئەم وشەیە لەفەرهەنگی فەرەنسادا بەواتای پیاوکوژ دێت. هەروەها بەهەڵۆکانی (هەڵەموت) یان حەشیشەکان ناسراون.

- (نەسرەت) وەڵامیدایەوە: توندوتیژی بەکۆمەڵی (ئیسماعیل)یەکان لەنزیکبونی (هەستانەوە) سەرچاوەی گرتوە. ئەم موسڵمانە مۆدێل نوێیانە وەك وەفادارێك بەخێرایی دەجوڵان و کاریان دەکرد، بەپەلە دەست بەسەراگرتنی دنیای نوێ کارو هەنگاوێانی لێدەخواستن. ئاینەکەیان (تیۆرەکەیان) بەشێکی ئاشکراو گشتی لەخۆگرتبوو، کە راگیربوو لەسەر رۆڵێکی مێژویی دابەشکراو بەسەر حەوت خولدا، کە هەر خولێکیش خۆی لە(وتەبێژێك natig)، (پیاوی دامەزرێنەر) و پاشان ئیمام یان پێشەوایەکی هۆشمەندو خاوەنی راستییەکی حەشاردراودا دەنواندو بەرجەستە دەکرد، چونکە بەشێکی دیکەی ئاینی شاراوە (واتای نهێنی قورئان)ی لەخۆدەگرێت. کە لەدوا رۆژدا لای هەموان ئاشکرا دەبێت، بەڵام تایبەتمەندەکان دیانتوانی لەسەردەمەکەیاندا ئەو واتایە بەدەست بێنن و لەو نهێنییە تێبگەن[٢]. سەرئەنجام پاش هەورازو نشێوییەکی زۆر لەسەدەی نۆزدەدا (ئیسماعیل)یەکان لەشاری (بۆمبا)ی هندستان لەژێرباڵی (ئاغاخان)ی سەرۆك و رابەریاندا پەنایان گرت.

- (تیۆ) وتی: پورە (مارتا)، تۆ لەیادتچوو لە(بۆمبا)ی شوێنی ئەوانەم پیشان بدەیت؟

- پورە (مارتا) بەنارازیبونەوە وتی: هەرچۆنێك بێت (ئیسماعیل)یەکان بەهەموو لایەنە سەیرو سەمەرەکانیانەوە موسڵمان بون، هەروەها تاکە گروپیش نین بۆخۆیان و بەئارەزوی خۆیان پەیامبەرێکیان بۆخۆیان دروست کردبێت. ئەو روداوەش بەسەر شیعەکانیشدا هاتوەو ئەوەش کاتێك بوو، کە مەسەلەی چارەسەرنەکراوی جێنشین هاتۆتە پێشەوە، چونکە ئیمامی یانزەیەمین مردبوو. کێ دەبێتە دوانزەیەمین ئیمام؟

- (تیۆ) وتی: (کتێبێکی پیرۆزی)، وەك سیکەکان؟

- (نەسرەت) وەڵامیدایەوە: نەخێر، شیعەکان لەچاوەڕوانی دوانزەیەمین ئیمامدا مانەوە. تەنها لەبەرچاوی خەڵکیدا شاراوەیە. هەندێکجار بەشێوەی نهێنی لەبەرچاویاندایە، بەڵام کەس روخساری ناناسێت. رۆژێك لەبەرامبەر جیهاندا دەردەکەوێت.

- ئایا گروپی دیکەش سەریان هەڵدا؟

- (نەسرەت) وەڵامیدایەوە: گروپی (درۆزی)یەکانیش لەلای خۆیانەوە لەچاوەڕوانی (ئەلدەرەزی) ئیمامیاندان، کە رۆژێك خۆی لەکۆشکەکەیدا بزرکردوەو دیار نەماوە. (دروزییەکان) بۆ خۆیان کتێبێکیان هەیە بەناوی (نامە ئەقڵانییەکان)، کەبە (نامەکانی

---

[٢]. ئیمامەکان دوای (محمد) بۆ دوو دەستە دابەش بوون، کە دەستەیەکیان نهێنی بوون و بەنهێنی بەشارەکاندا دەگەڕان، لەکاتێکدا، کە بانگەشەدەرەکانیان بەئاشکرا خەریکی بانگهێشتکردن بون و پاش ئیمامی نهێنی رۆڵەکە بە(عبیدالله مهدی)دەگات، کەبانگهێشتەکەی ئاشکراکردو پاش ئەو کوڕەکانی دەقاو دەق ئیمامن. (ف. معین).

برایانی سەفا – اخوان الصفا)ش ناودەبرێت. دابونەریتی ئەم گروپە بەتەواوی شاراوەیە. بەلام (شیعە) راستەقینەکان نە پەلەپەلکردنی گروپی (ئیسماعیل)یەکانیان هەبوو نە ئارەزوی ئالۆزی (درۆزی)یەکان.

- (نەسرەت) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: (تیۆ)... مێژوی ئیسلام مێژوییەکی سەرسورهێنەرە. شیعەکان بەدرێژایی دیارنەبونی دوانزەیەمین ئیمام ئاینی خۆیان لەسەر بنچینەی (خواوەندی تاك، سروشی پەیامبەرو رەوایی وەچەی (عەلی) زاواو ئامۆزای پەیامبەر) دارشت، کە دوانزەیەمین ئیمام رۆژێك وەك جێنشینی (عەلی) لەجیهاندا سەرهەڵدەدات. هەر بەهۆی ئەو (دوانزە)یەوە هەندێکجاریش بەشیعەی (دوانزەیی – اثنی عشری) یان (دوانزە ئیمامی) ناودەبرێن. ئەمانە باوەریان پتەوترو هیوایان گەورەترە لەپەیرەوانی (سوننە)، چونکە شیعەکان لەپێناوی چاککردنو رابەرایەتی کردنی مرۆڤایەتی بۆ سەر رێگای چاکەو رزگاربون باوەرو ئیمانیان بەو ئیمامە پیرۆزانە بەستووە، کە دڵپاكو بەرزترین سەرانی ئاینینو هەموان لەپشتی (حوسەین)ی شەهیدن. گوێرایەڵی نواندن بۆ ئیمامەکان ئەركو کارێکی پیرۆزە.

- (تیۆ) وتی: حەزم بەوە نییە. گوێرایەڵی کردنی کوێرانە هەمیشە ئەنجامی خراپی هەیە!

- (نەسرەت) دەمودەست وەلامیدایەوە: (تیۆ).. پەلەمەکە لە هەڵسەنگاندنو بریاردا. (ئێران)ی چاوەنواری دوانزەیەمین ئیمام هێندە هیوای بەشۆرشی ساڵی (١٩٧٩) بەست تابوو بەشۆرشێکی ئیسلامی. ئەوەش لەو کاتەدابوو (ایت الله خومەینی) بەفرۆکە هاتەوە وڵاتو خەڵکێکی زۆری (تاران)یش کەوتنە هاوارکردن: (ئیمام هاتەوە!).

- (تیۆ) وتی: زۆرباشە، بەلام من وامدەزانی (موحەمەد) دواین پەیامبەر بوو.

- (نەسرەت) وتی: ئەوە بەتەواوی لای پەیرەوانی (سونی) وایە، کە لەلایەکەوە رێز لەکەماڵو تەواوی (قورئان) دەنێنو لەلایەکی دیکەشەوە (گوفتار - حدیث)ـەکان بەقورئانێکی تەواو و خاوەنی (شەریعەت)ی دادەنێن. یاسای تەواوی قورئانو کۆی گشتی قورئان شتێکی زۆر گرنگە، چونکە ئێمە لەئیسلامدا هیچ (پاپا) یەکی بێگوناهو دور لەهەڵەمان نییە بۆ دەرکردنی دوابریارو جێبەجێکردنی لەسەر مەیدانی کارکردندا.

- (تیۆ) بەروبەروبونەوەوە وتی: لەم رووەوە خراپ نییە، جگە لەوەی کڵێسای کاسۆلیکیش هیچ کاتێك شێوازێکی گونجاوتری بەرامبەر بەژنان نەبوە.

- (نەسرەت) سەرنجی بۆ ئەوە راکێشا، کە لەئیسلامی سەدەی بیستەمدا دوو بزاوت سەریانهەڵداوە، کە هیچ پەیوەندییەکیان بەگروپەکانی پێشوترەوە نەبوو. یەکێك لەوبزاوتانە

دەیەویّت بەھەر نرخیّك بوە حوکمەکان بەبیّ کەموکوڕی جیّبەجیّ بکریّتو پەیڕەوی وردی (شەریعەت) بکریّت. لایەنگرانی ئەم سیاسەتە ئاینییە لەقۆناغی کاملّیو تەواوی قورئانەود چونەتە سەر ریّچکەی (کەمالّ گەرایی - integrisme)؛ هەمموو شت یان هیچ!. بەپیّچەوانەشەوە بزاوتیّکی دیکە هەیە، کە بە(ریفۆرمیستەکان) یان (چاکخوازان) ناودەبریّن‌و رایدەگەیەنن، کە پەیامبەر توانیویّتی بەپیّی هەلومەرجی کۆمەلگەی سەردەمەکەی پەیامەکەی بگونجیّنیّت، لەبەرئەوە هیچ ریّگرییەك لەئارادا نییە ئەو حوکمانەش بەپیّی سەردەم بن‌و لەگەلّ سەردەمی نویّدا بگونجیّنریّن.

- (تیۆ) وتی: لەوانەیە زۆر گویّ بۆ قسەی ئەمانە نەگیریّت!.

- لەبەرئەوەی ئەم گروپەی دواییان لەهیچ شویّنیّك (بۆمب) دانانیّن‌و تەنها نوسراو و کتیّب بلاودەکەنەوە!. بەبڕوای من هەلّەیەکی گەورەیە گویّ بۆ ئەم دەستەیە رانەگیریّت، چونکە دەیانەویّت جودایی نیّوان موسلّمانان نەهیّلّن. زۆرجار روبەڕوبونەوەی سەختیان لەگەلّ (کامل گەراکان) دەبیّت، چونکە لەلای ئەمان هیچ شتیّك لەبەئەمرۆ کردنی یاساکان مەترسیدارتر نییە. دواجاریش (تیۆ) دەبیّت بەتۆبلّیّم، کە لقیّکی دیکەش لەئیسلامدا هەیەو بەرادەی خودی (قورئان) کۆن‌و بەبیّئەوەی بچوکترن جیاوازی بنیّنەوە سەرانسەری میّژوی ئیسلام‌و ئاینی موسلّمانانیان تەیی کردوە.

- پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: (تیۆ) باش گویّڕادیّرە، چونکە (نەسرەت) باشترین بەشی پیّناسەکەی بۆ کۆتایی هەلگرتوە.

(نەسرەت) بەردەوامبوو: ئەم موسلّمانانە تەنها لەپیّناوی عەشقی خواوەندا دەژیان. لەدیدی ئەمانەوە هەموو ئاینەکان خوایان خۆشویستوە: لەبەرئەوەیە دوا لقی ئیسلام لقی لەیەك بوردن‌و ئارامگرتن بوە. باوەرداران بەو ئیسلامەتییە بەزۆر یان بەریّگای راڤەو ئامۆژگاری کافرانیان بەئیسلام نەدەکرد، ئەمانە چاوەنواڕی هیچ ئیمامیّك نەبون‌و هیچ باسیّکی (هەستانەوەیان) لەلانەبوو. ئەوانە تەنها خەلّکیان فیّردەکرد چۆن راستەوخۆ بتوانن عیشقی خواوەند بەدەستبیّنن.

- (تیۆ) هاواریکرد: راستەوخۆ؟ ئەمانەش هەمان ئەو (عارفانەن) وەك سۆفیەکانی (نیزامەدین)!.

(نەسرەت) دریّژەی پیّدا: بەلّیّ، دواین لقی ئیسلام لەراستیدا سۆفیگەرییە. بەلّام چونکە تایبەتمەندی سۆفیگەری لەویّدایە خەلّك ئازادبیّت تاعیشقی خۆی بۆ خواوەند بەشیّوەو شیّوازی خۆی رابگەیەنیّت، رەوالّەتی جۆراوجۆری بەخۆوە گرتوە. (تیۆ) تۆ لە(هندستان)

گۆرانی (چاکەکاران — قەوالات)ت بیستوە، بەلام لە (تورکیا) دوو شێوازی دیکەیان بۆ پەیوەندیکردن بەخواوە دۆزییەوە. سەماکردن یان نالاندن (هۆکێشان)ـە پیرۆزەکان. لەسەرانسەری جیهاندا ئەوشتەی لەنێوان هەموو سۆفییەکاندا هاوبەشە عیشق بۆ خوایەو (زکر) یان ناو هێنانێتی.

- (تیۆ) پرسی: ئەی تۆ، لەکام بزاوتەدایت؟
- (نەسرەت) وتی: لەدواین لقدام. من سۆفیم!
- پورە (مارتا) زیاتری وت: نەك تەنها سۆفی بەڵکو دەروێشیشە.
- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: کەواتە تۆ دەخولێیتەوە؟ باشە، بابزانین چۆنە؟
- ژنە لاوەکە کاردانەوەیەکی توندی پیشانداو گوتی: خۆ سێرك نییە!. خولانەوە واتا خۆشویستنی خوا. (تیۆ) تر دەبێت هێشتا دەربارەی ئیسلام شت فێر ببیت. ئاینێکی زۆر جوانو شکۆدارە! خۆشەویستیو عیشقی پاکە، برایەتیو دادپەروەرییە.
- (تیۆ) بەشەپتانانە وتی: جگە لەوەی پیاوان زیاتر یەکسانن تا ژنان!
- (نەسرەت) وتی: ژنان لەرابردودا مافی ئەوەیان نەبوو ببنە دەروێشو ئێستا دەبینی من دەروێشم. ئیسلام ئاینی یەکسانییە.

## زیارەتکردنی مەککە

- (تیۆ) پرسی: ئەی زیارەتکردنی گەورەی (مەککە) چییە؟ ئایا تۆ چوویت؟
- (نەسرەت) بەسەرسوڕمانەوە وتی: نەخێر، هێشتا نەچوم. ئینجا رونیکردەوە، کە سەردانی (مەککە) یەکجار لەژیاندا ئەرکەو پەیامبەر خۆی دووجار ئەو ئەرکەی بەجێهێناوەو وەکو هەموو بابەتەکانی دیکە لەوەشدا میانڕەوبوە. کەسێك لێپرسیوە: (ئایا دەبێت هەموو ساڵێك ئەو ئەرکە ئەنجام بدرێت؟). پەیامبەر وەڵامی نەداوەتەوە. ئەو کەسە سێجار پرسیارەکەی دووبارە کردۆتەوەو سەرئەنجام وتویەتی: (ئەگەربڵێم بەڵێ، ئەو کاتە دەبێتە ئەرکو ئێوەش ناتوانن ئەنجامی بدەن. لەبەرئەوە تەنها ئەو باوەڕدارانەی زەنگینن ئەرکە لەسەریان ئەنجامی بدەن).

(نەسرەت) لەرووی داراییەوە دەستکورت نەبوو، بەلام نەیدەتوانی لەگەڵ هاوسەرە کریستانیەکەی ئەو ئەرکەش جێبەجێ بکات. هەروەها زانایانی ئاینیش لەمشتومڕی ئەوەدان، کە دەبێت ژن بەتەنها زیارەتی مەککە بکات یان نا؟ بەبێئەوەی کەسێکی نزیکی لەگەڵدا بێت. (نەسرەت) لەوە دڵنیا نەبوو مۆڵەتی ئەو سەردانەی پێدەدرێت...

ئینجا وتی: کە باوکی (حاجی - hadji)یەو ئەوەش ناونیشانێکە بەو کەسانە دەدرێت زیارەتی (مەککە) دەکەن. باوکی (نەسرەت) هەموو سروشتو رێوڕەسمەکانی بەتەواوی ئەنجامداوەو

وردەکارییەکانی بۆ کچەکەی گێڕاوەتەوەو ئێستاش (نەسرەت) چاوەڕێی هەلێکە ئەو ئەرکە بەجێبگەیەنێت.

- (تیۆ) وتی: بێگومان ئەرکێکی سەختە.

- نەخێر، هێندە سەخت نییە، بەڵام بڕیارەکانی بەوردیو موبەمو دانراون هێندە بەسە چواربنەماو ئەستونگەی سەردانەکە پەیڕەوبکەیت.

- کەواتە لەوێشدا بنەماو ئەستونگەی بنەڕەتی هەیە؟

بەڵێ، ئیسلام گونجاوە. ئەوەی باوکم بۆمنی باسکرد وا بۆ تۆی دەگێڕمەوە: ئەرکی رۆژی یەکەم (حەرەمکردنە). (حەرەم) کاری سەرەتاو خاڵی راستەقینەی جوڵەیە. (حاجی) ئاینده تازە گەشتۆتە (عەرەبستانی سعودی)و لەشوێنی دیاریکراودا، کە پەیامبەر خۆی لەسەر بنچینەی ولاتی زیارەتکارەکان دیاریکردوە، نیەتی خۆیان بۆ زیارەتکردنەکە رادەگەیەنن. بەمەبەستی یەکسانی نێوان میوانەکان دەبێت هەموو یەك جۆر بەرگ بپۆشن، کە بریتییە لەپارچە کوتاڵێکی سپیو پارچەیەکیش بەسەرشانەوە. ئینجا نوێژ دەکەن. نینۆکەکان دەکەنو بۆنی خۆش لەخۆیان دەدەن. چونکە پاش دەستپێکردنی سروتی حەج ئیدی ئەوکارانە قەدەغە دەبێت.

- باوکت لەرێگای میسرەوە چووبوو یان لەعێراقەوە؟

- (نەسرەت) وتی: حەوسەڵەت هەبێت. لەکۆندا کاروانی گەورە بەبیابانەکاندا تێدەپەڕین. بۆ نمونە، موسڵمانەکانی (کان — سو) لە (چین) ماوەی سێ ساڵ لەسەفەردا دەبون تاخۆیان دەگەیاندە (مەککە). ئەمڕۆ ژمارەی ئەوانەی بۆ سەردان دەچن دەگاتە دوو ملیۆن کەس. باوکم بەفڕۆکە چووبوو. کاتێك گەیشتبوە (جدە) لەناو فڕۆکەکەدا خۆی گۆڕیبوو. کاتێك گەیشتبوە (مەککە) سەری لەشارەکە سوڕمابوو. تەلاری بەرزو منارەی مزگەوتەکان لەنێو چیاکانی ئەو ناوەدا سەریان هەڵبڕیبوو. لەشارە کۆنەکە شتێکی ئەوتۆ نەماوەتەوە، بەڵام وتی سەرەڕای هۆتێلو میوانخانەی بچوك هەزاران چادری سپی هەڵدراون. ئاپۆرەی خەڵکەکە لەو رۆژەدا بەجۆرێکە، کەدەوڵەتی (عەرەبستانی سعودی) سەرەڕای ئەرکەکەی بۆ رێکخستنی ئەرکی حەج کردن، بەڵام دوچاری شڵەژانو کەموکورتی دەبێت. هەروەها روداوی سەیریش روودەدات. بەڵام باوکم هیچی لێرونەدابوو.

- پورە (مارتا) وتی: هەرچۆنێك بێت تەگبیروەرگرتن پێویستەو ئەگەر بەتەنها رۆشتیت ئاگاداری خۆت بە.

- (نەسرەت) وتی: دیارە ئەگەر بەختم هێنای. باوکم زۆر پەرۆشی سەفەری (حەج)بوو. بەڵام دیارە ئەو پیاوەو بەدڵنیاییەوە.. هەرچۆنێك بێت لەدووەمین رۆژی سەردانەکەی زۆر

دڵخۆشبوو. لەو رۆژەدا باوەڕداران رودەکەنە (عەرەفات)، کە لەزمانی عەرەبیدا بەواتای (ئاشنایی) دێت. هەر لەو شوێنەدابوو پاش دەرکردنیان لەبەهەشت (ئادەم)و (حەوا) یەکدیان دۆزیوەتەوە: چونکە (ئادەم) لەسەر خاکی (هندستان) دابەزیوەو (حەوا)ش لەسەر خاکی (یەمەن). ئەوەو وەچەی ئەو دوانە دەبێت بەیادی ئەو یەکتر بینینەوە روو لەخوای خۆیان بکەنو داوای بەخشین، یارمەتیو کۆمەك بۆ ئایندە بکەن. ئەوەش مانای دووەمین بنەمای زیارەتی (مەککە)یە. ئەوەی لەم وتەزایەدا بەجوانی دەردەکەوێت ئەوەیە (حاجیەکانن)ی لەسەرانسەری جیهانەوە لەهەمان ئەو شوێنەی باوانی مرۆڤایەتی یەکدییان گرتۆتەوە چاویان بەیەك دەکەوێت. بەگوتەی باوکم (عەرەفات) جۆرێکە لە (بابل)ی کۆن، کە مرۆڤەکان بەهەموو زمانێك تیایدا دەدوێن! لەوێوە لەسێیەم رۆژدا باوکم بۆ کۆکردنەوەی بەردە وردە بۆ (مزدلیفە) چووبوو.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: وردە بەرد بۆچی؟

- بۆ هاویشتن(رجم). رۆژی دواتر لە(منی)، کە کەمێك دورە لە(مەککە)وە، دەبێت باوەڕداران یەکی حەوت بەرد بگرنە (شەیتانەکان - Cheytanes)، کە بەشێوەی سێ ستونی خڕ، بەئاماژەی ئبلیس بەرجەستەکراون. ئالێرەدابوو، کە (ئادەم) یان لەوانەیە (ئیبراهیم) بوو بێت بەهاوەڵی (ئیسماعیل)ی کوڕی بەبەردەبارانکردن شەیتانی دەرپەڕاندوە. هەرچۆنێك بێت باوکیشم لەلای خۆیەوە بەبەرد کەوتۆتە بەردەبارانکردنی شەیتان. لەهەمان رۆژیشدا مەڕێکی کردۆتە قوربانیو سەری خۆی سفر کردوەو چۆتە باری (مەحرەم) بونەوە. پاشان بۆ ئەنجامدانی (تەواف) گەڕاوەتەوە بۆ مەککە، کە بریتییە لەحەوت جار سوڕانەوە بەدەوری (کەعبە)و (بەردەڕەش – حجر الاسود)ی تێدایەو ئاماژەو هێمای دەستی راستی خوایە لەسەر زەوی. بێگومان وێنەی کەعبەت بینیوە.

(تیۆ) وتی: نازانم (بەردەڕەش) چییە؟ چ شێوەیەکی هەیە؟

- (نەسرەت) وتی: باسی دەکەم. (کەعبە) خانویەکی بەرزە، کە بەپارچە کوتاڵێکی بەئاڵتونی چنراو داپۆشراوە، بەڵام بەردە رەشەکە (حجر الاسود) تیرەکەی لە سی سانتیمەتر زیاتر نییەو لە سێ پارچە بەردی سادە پێکهاتوە، کە رەنگدانەوەیەکی سورباویان هەیە. ئەم بەردە لەلایەن (جوبرەئیل)ەوە هێنراوەتە سەر زەوی و لەکاتی دروستکردنی (کەعبە)دا (ئیبراهیم) پەیامبەرو (ئیسماعیل)ی کوڕی وەریانگرتوە. ئەوانەی بۆ زیارەت دەچن بەپێچەوانەی میلی کاتژمێردوە بەنزا خوێندن بەدەوریدا دەسوڕێنەوە، بەڵام نایپەرستنو سوژدەی بۆ نابەن تا بەبتپەرستی لێکنەدرێتەوە. باوکم بەردەکەی ماچکردوەو وەك ئاماژەیەك بۆ پەرستن دەستی

لێخشاندوە، کە دیاردەی دەستی خوایە. بەمجۆرە ئەرکی (تەواف)کردنی بەجێهێناوە، کە بەنەمای سێیەمی (حەج)کردنە.

- (تیۆ) وتی: باشە، وابزانم ئیدی زیارەتکردن تەواو بوو؟

- تا رادەیەك. بەڵام (تیۆ) هێشتا بنەمای چوارەم دەمێنێت، کە بریتییە لە رۆشتن لەنێوان دوو گردۆڵکەی (سەفاومەروا – صفا ومروە) پێی دەڵێن. هەوڵی نێوان (سەفاو مەروا)و ئەو رۆشتنەش بەپیادەو حەوت جار بەردەوام دەبێتو لەنێوان هەرجارێکیشدا دەبێت بگریت.

- (تیۆ) پرسی: هۆی ئەو رێپێوانە چییە؟

- (نەسرەت) بەمیهرەبانییەوە وتی: سەرچاوەی ئەم سروتە سەیرە روداوێکی خرۆشێنەرە!. روداوەکە سەردەمانێك رویداوە، کە (ئیبراهیم) (هاجەرە)ی ژنی خۆی بۆناوجەرگەی بیابان دەباتو دروست لەوشوێنەدا (هاجەرە)و (ئیسماعیل)ی کوڕی بەخوای گەورە دەسپێرێت. دایکەش بۆ پەیداکردنی ئاو بۆ کۆرپەکەی لەنێوان ئەو گردۆلکانەدا ئەمسەرو ئەوسەر دەکات. ئەترسێت مناڵەکەی لەتینواندا بخنکێت، کە لەپڕ... وەك پەرەجویەك سەرچاوەیەکی ئاو لەناوجەرگەی ئەو بیابانەدا دەتەقێت.

- (تیۆ) وتی: کەواتە لێرەش پەرەجوو رویداوەو ئەگەر بەوجۆرە نەبوایە ئێستا وەچەی ئیسماعیل لەدنیادا تۆزیشیان نەمابوو تا بچن بۆ زیارەت.

- (نەسرەت) وتی: ئەو سەرچاوە پیرۆزە، کە ناوی (زمزمە)، ئەو منالەی رزگار کردو و ئێستاش وەك خۆی ماوە. هەر لەبەر سەرگەردان بونی (هاجەرە) موسڵمانەکان لەکاتی (حەج)کردندا دەبێت ئەو رێپێوانە بکەنو لاسایی ئەو بکەنەوە. دەبێت بزانیت ئێستا ئەو رێگایە لەناوجەرگەی بیاباندا نییەو گردۆلکەی (سەفا) بەگومەزێك داپۆشراوە. هەرچۆنێك بێت باوکم پاش حەوت جار رێپێوانی ئەنجامداوە. سێ شەو لە (مینا) ماوەتەوەو هەر رۆژەش حەوت جار بەردبارانی شەیتانی کردوە.

- (تیۆ) وتی: بەوپێیە بێت دەبێت برێکی زۆری وردەبەردی پێبوبێت.

- پاش ئەوە باوکم چووە بۆ دووەمین شاری گرنگی موسڵمانان. زیارەتکاران لەوێدا خۆیان خاوێن دەکەنەوەو دەچن بۆ مزگەوتی پیرۆزی پەیامبەر. ئەو مزگەوتە بینایەکی گەلەك گەورەو شکۆدارە، کەناوەکەی بەفەرشی سورو جوانکاری رازاوەتەوە. مزگەوتی پەیامبەر یان (مسجد النبی) باوکمی دوچاری شۆكو سەرسوڕمان کردبوو... باوکم لەوێدا لەبەرامبەر ئارامگای پەیامبەردا زکرو نزای کردوەو پاشان چووە بۆ زیارەتی ئەو گۆڕستانەی دەهەزار لەکەسوکاری هاوەڵانی تێدا نێژراون.

ئێستا سروتەکە تەواو بوو؟

- بەڵێ. باوکم بەمنی راگەیاند، کەشێوازی (حج)کردن زۆر راستەقینەو زۆر وردەکاری تێدایە، بەلاّم بەڕای ئەو بنەماو بنچینەی هەر چوار بنەماکەی (حەج) بریتین لە: مەحرەمبون، حەوتجار سوڕانەوە بەدەوری کەعبەدا، رۆشتنی نێوان سەفاو مەرواو دوو رکات (رکعات) نوێژی کێوی (عەرەفات). بەو جۆرە بەهۆی ئەو سروتەوە باوەڕداران رێزو حورمەت لە (ئادەمو حەوا)، (هاجەرە)و (ئیسماعیل)ی کوڕی، (بەردەرەش)ـەکەی وەك جێدەستی راستی خواوەند لەسەر زەوی دەنێن. ئەوەی باوکم باسی کردبوو بەوجۆرەش بۆتۆم گێڕایەوە.

(تیۆ) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: سەردانیکردنی (مەککە) زۆر دژوارو ئاڵۆزە.

- پورە (مارتا) وتی: لەجۆرەکانی دیکە دژوارتر نییە. لەلای کریستیانەکانیش زۆرجار دەبێت لەسەر ئەژنۆ بەپلیکانەی دورودرێژدا سەرکەویت. هندۆسەکانیش پەیڕەوانی ئاینەکەیان ناچار دەکەن ماوەی دورودرێژ بەپێ برۆنو لەوەشدا بێوێنەن. لە(چین)...

(تیۆ) قسەکەی پێبڕیو گوتی: سەرکەوتن بەسەر حەوت هەزار پلیکانەی پەرستگاکەدا، بۆ شەکەتکردنی جەستە، حەزئەکەم هۆی ئەوکارە بزانم.

- (نەسرەت) بەپێکەنینەوە گوتی: هەموو ئەوانە بۆ ئەوەیە رۆح ناچار بکرێت لەبەرامبەر خواوەندا بسرێتەوە. تۆ، کەواتای وشەی (قورئان)ت نەزانی ئایا دەزانیت واتای ئیسلام چییە؟

- (تیۆ) وتی: راستت دەوێت، بەراستی نازانم.

- وشەی ئیسلام لەزمانی عەرەبیدا واتایەکی رونو رەهای هەیە. (ئیسلام) واتە (خۆڕادەستدان – تەسلیم بون). ئافرێنەر داوای ملکەچی لەئەفرێنراوەکەی دەکات، هەر لەبەرئەوەە (ئیسلام) واتای (ئەرك بەجێگەیاندن)یش دەگەیەنێت. لەو میانەدا ئیسلام ئاینێکی تایبەت بەتاك نییە. هەموو دابونەریتو ئادابێکی جیهان بەگرانکردنو بەرتەسککردنەوەو ئەرکدارێتی روبەڕوی جەستەی مرۆڤ دەبێتەوە. ئایا دەزانیت شەکەتکردنی جەستە یەکێکە لەباشترین رێگاکانی گەیشتن بەخەڵوەت؟. ئیدی پێویست نییە مرۆڤ کریستیانی، بودایی یان موسڵمان بێت تابەو قۆناغە بگات. وەرزشەوانانو پیادەڕۆکان هەموو شارەزای ئەو دیاردەیەن. لەکۆتایی شەکەتبوندا روناکی بالاّدەکات، جەستە لەئازارو رەنج رزگار دەبێت، رۆح ناسك دەبێتەوە، دەسڕێتەوەو لەپڕ رۆشنایی شکۆفە دەدات. پیشانت دەدەم چۆن دەتوانیت بەسوڕانەوە خۆت شەکەت بکەیت.

- لەلای ئێمە هەرکاتێك کەسێك هیلاك بوو پشوو دەدات. کێ ئەو شتە شێتئاسایانەی نوسیوە؟

- (نەسرەت) بەروخسارێکی جدییەوە وتی: جیهانی خۆرئاوا کاروانی رۆحی ونکردوە. کاتێك ئامرازی پشودان لەبەردەستدابێتو کۆششی بۆ نەکرێت ژیان تەسكو چروك دەبێت. لەبەرئەوە سەیرنییە ئەو هەموو لاوانە پەیوەندی بەدەستەو تاقمەکانەوە دەکەنو خۆیانی تێدا وێڵ دەکەن.

- (تیۆ) شڵەژاو گوتی: بەراست پرسیارێکم هەیە. ئەگەر من بێهۆش ببمو پاشان خۆبەخۆ بکەومە سەماکردن، ئایا ئەوە ئەوەیە تۆ بەرێگاو کاروانی رۆحی دادەنێیت؟

- وەڵامیدایەوە: بێگومان، لەوباوەڕەدام بیر لەسەماکەی (شێخە) لە(لۆکسۆر) دەکەیتەوە.

- (تیۆ) بەنارەزاییەوە وتی: ئەم گەمەیەم بەدڵ نییە. تۆ هەموو شت دەزانیت!. دیارە لەهەموو شوێنێك باسی کارەکانم کراوە.

- پورە (مارتا) بەتوڕەییەوە وتی: بەڵێ، مافی خۆتە سکاڵا بکەیت. بلێ بزانم کێ هەیە لەم جیهانەدا هەیە بەئەندازەی تۆ چاودێری بکرێت.

## ئەستانبوڵ

(تیۆ) بێدەنگبوو، روناکییە زۆرەکە بەرەو نەمان دەچوو. ئاسمان لەودیو پەنجەرەکانەوە خاکی دەبوو. لەو بڕوایەدا بوو، کە فەرمانەکانی (قورئان) هێندە سادە راگەیەنراوە پێشبینی ئەو هەموو توندوتیژیو خوێنڕشتنە ناکرێت، کە بەناوی ئەو فەرمانانەوە ئەنجام دەدرێت. هیلاك بوو. خۆیدا بەسەر نەردەی هەیوانەکەدا. دەنگی ئاژێری نەوتکێش، جموجوڵی کەشتییەکان، هۆڕنی ئۆتۆمبیلەکانو هەندێجار قیڕەی کزی باڵندەیەکی دەریایی وەك ئاوازی شمشاڵێکی ناو ئۆرکسترایەك بۆ لای خۆی کێشی دەکرد. گەلەك کەشتی بارهەڵگر، ماسیگرتن. بەلەمو کەشتی جەنگی لەکەناری (بسفۆر) لەنگەریان داخستبوو. شاری (ئەستانبوڵ) لەوبەری تەنگەکەوە دەتگوت بەسەر رابردوی پڕ لەشکۆداری خۆیدا خەوی لێکەوتوە.

- پورە (مارتا) چرپاندی بەگوێیدا: لەجێگاکانی دیکەدا ئیسلام روخسارێکی سادەتری هەیە. ئاینی ئیسلامیش وەك ئاینی جولەکە لەبیابان لەدایکبوە. ئاو هەموو شتێك دەگۆڕێتو ناسکی پێدەبەخشێت، بەڵام نابێت بەهەڵەدا بچیت. ئەو گومەزە روناکانەی لەناو دڵی تاریکی شاردا دەبینی گەواهیدەری روداوی مەترسیداربون، کە هەموی بەناوی خواوە ئەنجامدراون. لەیادی مەکە پێش ئەو مزگەوتە جوانو رۆشنو لەبەردڵانەی (ئەستانبوڵ) بە (بیزانس)ناودەبراو ئێستا (بیزانس) لەسەر شانۆی رۆژگار سڕاوەتەوە.

- (نەسرەت)، لەکاتێکدا دەستی لەسەرشانی (تیۆ) دادەنا، وتی: جوانە، وانییە؟

- لەسەرخۆ وەڵامیدایەوە: بەڵێ. پورە (مارتا) ناتوانێت بێدەنگ بێت. دەبێت هەمیشە شتێك بڵێتەوە.

## بەشی بیست و سێ

# (عیشق و شەیدایی)

### سەردانەکەی (لاماگامپۆ)

(تیۆ) رۆژی دواتر بەشڵەژاوییەوە لەخەو رابوو. (لاماگامپۆ) هاتبوە خەونی!. (لاما) پارچەکاغەزێکی رادەوەشاند، کەچەند ژمارەیەکی نەناسراوی لەسەر تۆمارکرابوو. پاشان جەستەی وردە وردە گەورەدەبوو، وەك دێوێك و بۆ شێوەی پەیکەری (بودا) گۆڕاوە. لەکۆتایدا -- هەرچەندە رون و ئاشکرا نەبوو- (لاما) و باوکی (تیۆ) دەستی دایکیان گرتبوو، کە بەزەحمەت دەیتوانی هەستێتە سەرپێ و بەبێئەوەی هیچ شوێنەوارێکی نەخۆشی و ئازاری تێدا بێت؛ لەگەڵ ئەوەشدا خەونێکی دڵخۆشکەربوو.

- پورە (مارتا) وتی: زۆرباشە. بەڵێنەکەی خۆی بردەسەر. مەگەر بەڵێنی نەدابوو لەخەوندا سەردانت بکات؟

- (تیۆ) بڕیاریدا بەتەلەفۆن هەواڵی دایکی بپرسێت. هێندەی بەپێی تەلەفۆنەکە ئاشکرابوو جگەلە ئازارێکی کەم لەقاچیدا، کە ببوە هۆی هەوکردنی ماسولکەکان، هیچ سەغڵەتییەکی دیکەی نەبوو، بەڵام ئەوە لای (تیۆ) مایەی سەرسوڕمان بوو، چۆن (لاماگامپۆ) ئەو ئازارە بچوکەی پێی دایکی لەجیهانی خەوندا بەئەم راگەیاندبوو.

- (نەسرەت)، کە بەوردییەوە گوێی بۆ گفتوگۆی نێوان ئەم دوانە راگرتبوو گوتی: من (لاماگامپۆ)ی تۆ ناناسم، بەڵام ئاشکرایە خاوەنی توانای پشت سروشتی هەیە. ئێمەی سۆفی لەگەڵ ئەمجۆرە بەهرە نائاساییانەدا ئاشنایەتیمان هەیە. پیرۆزەکانمان دەتوانن لەیەك ساتی دیاریکراودا لە دووخاڵی جیهاندا ئامادەییان هەبێت.

- (تیۆ) وتی: ئۆو .. نەخێر، من ئارەزوم لەفێڵو تەڵەكەبازی نییە!

- (نەسرەت) بەبێئەوەی كاردانەوەیەك پیشانبدات وتی: زۆرباشە. بابمێنێت بۆ جارێكی دیكە. ئێستا دەتوانیت بچین بۆ بینینی ئیسلام لەشوێنگە دیارەكەیدا.

- پورە (مارتا) وتی: باشە، بەڵام هیوادارم لە (سانتا — سۆفیا)یەوە دەستپێبكەین... هەڵبەتە ئێستا ئەم مزگەوتە شێوەیەكی دیكەی هەیە. بەڵام ئارەزوو دەكەم (تیۆ) كەمێك لەچوارچێوەكەیدا كەشو هەوای (بیزانس)ی هەڵمژێت.

## ئەیكۆن لەنێوان خاچو هیلالدا

(سەنتا — سۆفیا)(مزگەوتی ئایە سۆفیا) لەدیمەنی دەرەوەی بەجوانترین مزگەوتی (ئەستانبوڵ) دادەنرێت، كە لەپەیكەری تێكشكاوی ئاژەڵێكی گەورە دەچوو. لەناوەوە جوانكاریو شكۆمەندی مۆزایكەكانی چاوی ئەبڵەق دەكرد. گومەزە مەزنەكەی بەفریشتە چاو درشتەكانییەوە بەسەر دوو لایدا پەلی راكێشابوو. لەدیواری بەرامبەریشدا وێنەی پیرۆزكراوەكان لەچوارچێوەی زۆر شەنگدا لەسەر تەختێكی ئاڵتونی هەڵواسرابون.

- (تیۆ) بەدەسنخۆشیكردنەوە گوتی: مزگەوتێكی شكۆدارە.

بەڵام (نەسرەت) بروایەكی دیكەی هەبوو. بەبڕوای ئەو (سەنتا — سۆفیا) مزگەوتێكی سادەنەبوو. رونیكردەوە ئەوەی ئەمڕۆ بەمزگەوتی (ئایە سۆفیا) ناودەبرێت یەكەمجار لەلایەن ئیمپراتۆر (كنستانتین)ەوە دروستكراوە؛ هەمان ئەوكەسەی كریستیانی لەسەرانسەری ئیمپراتۆرییەكەی كردە فەرمیو ناوی خۆی بەشاری (كنستانتی نۆپڵ) بەخشی. ئەم كڵێسەیە، كەلەپاشاندا ناونرا (سانتا — سۆفیا) ناوی خۆی بەپێچەوانەی ئەوەی وێنادەكرا لەپیرۆزكراوێكی شەهیدەوە نەهێنابوو. بەڵكو كڵێساكە پێشكەش بە (هەژیا سۆفیا — Hagia Sophia) یان (ئەجیا سۆفیا — ئایە سۆفیا — ئایە سۆفیە) كرابوو، كە لەیۆنانیدا بەواتای (ئەقڵی باڵا) دێت. كەرۆخسارێكە ژنانە بەرۆحێكی خوداییو نیوە ژنانەوە — نیوە فریشتانە. كڵێسای (ئەجیا سۆفیا)، كە لەتەمەنی خۆیدا چەندینجار وێرانو نوێژەنكرابۆوە لەساڵی (٥٣٧) بەفەرمانی ئیمپراتۆر (جوستی نینی یەكەم)[1] بەكاری بەردەوامی رۆژو شەوی (دە) هەزار كرێكار نوێژەن

---

[1] Flavivs Petrus sebbatius Justinianus: (٤٨٢ – ٥٦٥) ناسراو بەئیمپراتۆری خۆرهەلات، (ژوستی نییت) یاسادانەرو دامەزرێنەری شارستانی بیزانسییەو لەكارە تەلارسازییەكانی كڵێسا سانت سۆفییە. ئەم ئیمپراتۆرە هاوشانی سەردەمی (خەسرەو ئەنەوشیروان)ی پاشای ساسانییەكان بوەو لەجەنگی ساسانیو بیزەنتییەكاندا دوچاری شكست بوەو بۆتە باجدەری پاشای ساسانییەكان.

کرایەوە. ئیمپراتۆر، کە پیاوێکی خۆ بەزلزان و فیرعەونی بوو، کاتێك چوتە ناو مەیدانی کلێسا تازە تەواو بوەکەوە هاواریکردوە: ( **سوپاس بۆ خوا منی کردە شایستەی ئەنجامدانی کارێکی لەمجۆرە. من بەسەرتۆدا زاڵ بوم ئەی سلێمان...)**

- (تیۆ) وتی: ئۆو... تائەورادەیە! کارێکی بەراوتەگبیری نەکردوە.

- (نەسرەت) وتی: بەڵێ. هێندە دور لەئەقڵ، کە بیست ساڵ پاشئەوە بەهۆی بومەلەرزەیەکەوە گومەزی کلێساکە وێران بوو. هەموو بیست ساڵ جارێك کلێساکە بەهۆی بومەلەرزەوە وێران دەبوو. هەموو جارێکیش نوێژەن کراوەتەوەو لەجاران جوانتریش. (ئەجیاسۆفیە) گەوهەری درەخشاوەی ئیمپراتۆری کریستیانی خۆرهەلات بوو، هەروەها دیمەنێکی رێکخستنی ئیمپراتۆری خواوەند بوو بەسەر سەنتەری جیهانەوە، کەشاری (کنستانتین نۆپڵ)بوو، بنەمای ئیمپراتۆری (بیزانس – بیزەنتی) سادە بوو. لەلوتکەی دەسەلاتدا ئیمپراتۆر هەبوو، کە سێبەری خواوەند بوو لەسەر زەوی و لەخەرمانەیەکی شکۆو رازاوەدا دەردەکەوت و خەلکی دەیانپەرست. روداو و تۆمارکارانی سەردەمەکە نوسیویانە: **(مەسیح حوکمڕانیکردنی تەواوی خەلکی سەر زەوییان بەئیمپراتۆران بەخشیوە، ئەویش کە خاوەنی توانایەکی کامڵەو پاشای مەزنی ئەم جیهانەیە وێناو رەنگدانەوەی خوای مەزن و شکۆدارە)**. کەس مافی ئەوەی نەبوو رەخنەو گلەیی لەئیمپراتۆری بیزانس بگرێت، لەبەردەمیدا هەموو بێدەنگ دەبون و کڕنۆشیان بۆ دەبرد.

- (تیۆ) وتی: بەگشتی شتێکی تەواو پێچەوانەی دیموکراسییە.

- (نەسرەت) وتی: بەراستی لەهەرەمی دەسەلاتداری ئاینی بیزانس زۆردارتر لەجیهانی ئەو رۆژەدا وێنەی نەبوو، بەلام لەهەمان کاتیشدا ئەو سیستمانەی لەسەر بنچینەو پایەی ئاینی دروستبون لەرژێمی بیزانسی کەمتر بە جۆشوخرۆشەوە ئاوڕیان لەهونەری جوانکاری داوەتەوەو توانای خۆیان لەسەرچڕکردۆتەوە. وێنەی ئەیکۆنەکان، دروستکردنی کلێساکان و کاری هونەری مۆزایکی، کە هەمویان دەڕژانە رێچکەی بەرزڕاگرتن و درەوشانەوەی ئیمپراتۆر و خواوەندەوە.

- (نەسرەت) درێژەیپێدا: بەلام ئیسلام لەدەوروبەری ئیمپراتۆری (بیزەنتی) لەباری پێشکەوتن و دەرکەوتندابوو. ریشەی ئیسلامی پەیوەست بە قەدەغەکردنی نوێنەرایەتی خواوەند لەسەر زەوی تخوبی ئیمپراتۆری (رۆما)ی دەسمی و هێورهێور زیانی بەئاینی (بیزەنتی) دەگەیاند تا ئەو جێگایەی کە یەکێك لەئیمپراتۆرەکانی (بیزانس)ی بەناوی (لیۆنی سێیەم) جۆشوڕۆشی ئاینی گشتی، کە ببوە هۆی ئەوەی خەلکێکی زۆر لەسەرانسەری

ئیمپراتۆرییەکەیدا لەدەرەوەی (ئەیکۆن)ـەکانی بثاڵێن، بەشتێکی زیادەڕۆیی ناوببات. مەگەر (ئنجیل) بتپەرستی قەدەغە نەکردبوو؟. ئایا باشتر نییە مەسیح وەك بەرانێك یان خاچێکی سادە بخرێتە روو؟. هەرچۆنێك بێت ئەم ئیمپراتۆرە وردەکارو وەسواسە هەستا بەداگرتنی ئەو (ئەیکۆنـە) گەورەیـەی، کـە وێنـەی (مەسـیح)بـوو لـەکاتی چـونە ژورەوەی بـۆ نـاو کۆشـکە رازاوەکەی‌و لـەجیاتی ئـەوەش یـەك خاچی گـەورەی هەڵواسـی. دوابـەدوای ئـەمکارە بزاوتێکـی بەرفراوان لەسەرانسەری ئیمپراتۆری (بیـزانس)دا بـەرپابوو بـۆ تێکشکاندنی (ئـەیکۆن)ـەکان‌و بڕوادارانیش بۆ دوو دەستە دابەشبون: (وێنە تێکشکێنەکان) یان (ئەیکۆنۆ کلاستەکان)[1] و (وێنە پەرستەکان)، کە هەمان سوننەتگەراکان بون.

پـورە (مارتـا) وتـی: (وێنـە شـکێنەکان) جگـە لەخـەڵکی بێئـەقڵ‌و توندوتیـژ هیـچی دیکـە نەبون. ئەوانە زۆر بەرهەمی هونەریی گرانبەهایان لەناوبرد.

- (نەسرەت) بڕوای بەوجۆرە نەبوو، رونیکردەوە: ئیمپراتۆرانی (وینە شکێن) بەدانانی خـاچ لەجێگای وێنە سـوننەتگەرایی‌و دەمـارگیری بیزەنتیـان بـۆ روبەڕوبونـەوەی ئیـسلام سـازدەکرد. ئـەو واتایـەی دەیانویـست ئـەوەبوو (خـاچ)، کـە رەواڵـەت‌و سمبـولی یـەکێتی هـەموو کریـستیانی جیهـان بـوو، لەبەرامبـەر (هـیلال)ی ئیـسلامدا رابگـرن‌و لـەو بڕوایـەدابون دانـانی (خـاچ) لەبەرامبەر (هیلال)دا بەڵگەیەکی دڵنیاترە لە (ئەیکۆنە) جوانەکانی (بیزانس). لەهەمان کاتدا لەسەر ئەو سکەی دراوانەی لەدەرەوەی سنورەکانی ئیمپراتۆردا دەستاودەستیان پێدەکرا وێنـەی خاچ جێگـای وێنـەی (عیـسا)ی گرتـەوە، بـەڵام هـەموو ئـەو کۆشـشانە بێهودەبـوو. پـاش ساڵەها ململانێـی سـەخت لـەنێوان (وێنەشـکێن)و (وێنـە پەر ـتن)دا سـەرئەنجام (ئـەیکۆن) بەسـەر (خاچ)دا زاڵ بـوو. لـەدەروازەی چـوونە ژورەوەی کۆشـکدا وێنەیـەکی گـەورەی (مەسـیح) دانـراو بەرگە تایبەتەکەی لەناو ورشـەیەکی روناکیـدا لەسـەر دراو چاپکرا. شۆڕشـی رۆشـنبیری (وێنـە شکێن)ـەکان گەمەکەیان دۆڕاندبوو.

کڵێسای (سانتا - سۆفیە) لـەناو رۆشـناییەکی شانازی‌و مەزنیـدا لەبەرامبـەر هێرشـە یـەك لەدوای یەکـەکانی ئیـسلامییەکان بـەرگری لـەجیهانی خۆرئـاوا دەکـرد. ئیمپراتـۆری هاوشـێوەی خواوەند لەسایەی بونە میحرابدا لەهـەموو مەترسییەك پـارێزراو بـوو تـا رۆژی ئـاخر زەمـان،

[1] Icon oclastes : لەبنچینەدا ئەم دەستەواژەیە بەو لایەنگرانەی ئیمپراتۆری بیزانس دەوترێت، کە دژ بەپەرستن‌و ئایینی وێنە پیرۆزەکان بون، ئەمڕۆ لەزمانی فەرەنسیدا لایەنێکی گشتی وەرگرتوەو بەگشتی بەدەستەوتاقمی سوننەت شکێن دەوترێت.

واتە تا ئەو رۆژە چارەنوسسازەی لەساڵی (١٤٥٣) گەیشتو تورکانی داگیرکاری جیهان هەر بەئەسپەوە چونە ناو کڵێسای (ئەجیا – سۆفیا)!.

- (تیۆ) وتی: دیارە حەزیان بەچارەی ئەرتەدۆکسەکان نەبوو.

- (نەسرەت) وتی: (سولْتان محمەدی فاتح)[1] پیاوێکی موسڵمانو زۆر باوەڕداربوو. سوێندی خواردبوو بەهەر بەهایەك بوە پایتەختی خۆرهەڵاتی کریستیانی بگرێت. بەکۆمەکی ئەو هێزە گەورەو بەتوانایانەی لەمەملەکەتە کریستیانەکانەوە دەهاتنو ئەو قەڵا سەختانەی بەسەر بەرزاییەکانەوە بون شارەکە لەبەرامبەر هێرشبەرانداخۆڕاگری دەکرد. ئابڵوقەدان ماوەیەکی دورودرێژی کێشا. ئەو تۆپە ترسهێنەرەی بە (پاشایی) ناودەبراو نازناوی (ترسناك)ی هەبوو، کە لە(ئاندرینۆپل)[2] دارێژرابوو، بەهۆی چوارسەد گامێشەوە کێشدەکرا، بەهۆی فشاری گوللەکانی خۆیەوە تەقییەوە. بەڵام سولْتانی عوسمانی لەداگیرکردنی شارەکە پاشگەز نەبۆوە. هێمایەك بووبەهۆی بەرزبونەوەی ورەی سولْتان. سۆفییەکی بەتەمەن خەونی بینیبوو، کە یەکێك لەهاوەڵە ناودارەکانی پەیامبەری ئیسلام بەناوی (ئەیوبی ئەنساری)، کە لەکاتی نیشتەجێبونی پەیامبەر لە (مەدینە) کۆمەکی پێکردبوو، لەژێر قەڵاکانی (کنستانتی نۆپڵ)ـەوە رۆچۆتە ژێر خاك. لەو خەونەشدا شێخی سۆفیو سولْتانی عوسمانی لەخزمەت (موحەمەد)ی پەیامبەری ئیسلامدا دانیشتونو پەیامبەر شاڵە سورەکەی خۆی دادەگرێتو دەڵێت: (ئەی موحەمەد، ئاڵاکەی ئەیوبی ئەنساری بەتۆ دەبەخشم). ئینجا شاڵە سورەکە بەئاڵایەکی سەوز دەگۆڕێت، لەهەمان کاتیشدا لە (بیزانس) بەهەراو هوریایەکی زۆرەوە وێنەکانی پاکیزەی پیرۆز دەشکێنرێن.

سولْتان لەبەردەم حەساری گەورەی شارەکەدا فەرمانیدا چاڵ هەڵبکەننو گۆڕی هەوەڵی پیرۆز دەردەکەوێت. ئینجا بۆ هێرش کردنە سەر (بیزانس) سولْتان بڕیار دەدات بەهۆی تەنگەی قەدی داری گەورەوە پاپۆڕە جەنگییەکان بەسەر گردۆلکەکاندا تێدەپەڕێننو گەمییەکانی تورك بەهەزاران مانۆڕ بەرەو لایەکی دیکەی دەریاکە گواسترانەوە، بۆئەو جێگایەی حەساری شارەکە باشتر دەتوانرێت زیانی لێبدرێتو سەرئەنجام (کنستاتین نۆپڵ) دەڕوخێت. دوایین ئیمپراتۆری بیزانس لەشەڕی داگیرکردنی شاردا دەکوژرێتو تەنها بەپێڵاوەکانیدا دەناسرێتەوە،

---

[1]. سولْتان محەمەدی دووەم: ناسراو بە(فاتح – رزگارکار) (١٤٢٩ – ١٤٨١) لە (٢٩ی حوزەیرانی ١٤٥٣) بەرزگارکردنی (کنستانتی نۆپڵ) دوایی بیئیمپراتۆری رۆمای خۆرهەڵاتی هێناو بەو سەرکەوتنەش سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست لەئەوروپا دوایی هاتو سەردەمی (رێنیسانس) دەسپێپێکرد.

[2]. Andrinople: ئەندریانۆ پۆلیس)، کە ئەمڕۆ پێی دەوترێت (ئادرنە). لەساڵی (١٣٦١) لەلایەن سولْتانی مورادی یەکەمی عوسمانییەوە داگیرکراو کرادی بە پایتەختی عوسمانییەکان.

کە لەبزماری ئالتون دروستکرابوو. سولتان (موحەمەد) دەستوری بەسوپاکانی دابوو هەتا دەتوانن چەپاوڵی لەشاردا بکەن، کاتێکیش شار وەکو وێرانەیەکی لێهاتبوو، سولتان بەناو لاشەی مردواندا چۆتە کلێسای (سانتا سۆفیا)وە. رۆژی دواتر (هیلال) لەجێگای (خاچ) دانرا، کلێسا بوو بەمزگەوتو (کنستانتی نۆپڵ — قوستەنتینیە) بوو بە (ئەستانبوڵ). وێنەی فریشتەو پیرۆزکراوەکان بە گەچ داپۆشران. ناوی (الله) هەڵکۆڵرا، ئاین گۆڕاو هێمای ئیسلامییەکان جێگای هێما کریستیانیەکانی گرتەوە. (سانتا — سۆفیا) تا ساڵی (١٩٣٥) وەك مزگەوتێك مایەوەو لەو ساڵەدا (ئەتاتورك)ی باوکی تورکیای نوێ، کە پیاوێکی توندڕەوی سکولاریزمی (لاییك)بوو، بڕیاریدا بیگێڕێتەوە سەر ریشەی خۆی. پاشان فەرمانیدا روکەشی سەر مۆزایکی بیزانس لابدەن. (سانتا — سۆفیا) کرا بەمۆزەخانە.

(نەسرەت) بەردەوامبوو: هەندێکجار ئەو گفتوگۆیە دێتە ئاراوە، کە لەگۆڕەپانی دەرەوەی کلێسا مەزنەکە ڕێوڕەسمی ئاینی بەرپابکرێت، بەڵام لەوبارەیەوە تائێستا دودڵی هەیە، چونکە لەشاری ئەستانبوڵ هەچ تەلارێکی دێرینەی دیکە نییە تاببێتە هێماو سمبولی پەیوەندی کریستیانی خۆرهەڵاتی لەگەڵ ئیسلام.

(تیۆ) وتی: هیچ خوایەك نییە جگە لە (الله). پاشماوەی ئەوە ئیدی لەلای من سەرنجراکێش نییە. من لە (سانتا — سۆفیا)دا عیشقو خۆشەویستی خواوەند دەبینم، هەروەك هەیە، ئارەزو دەکەم هەموو پێکەوە ببینم، ناوی (الله)، فریشتەکانی بیزانسی، هیلالو خاچیش.

## پێنج جار لەرۆژێکدا

(تیۆ) بەبیرکردنەوەدا رۆچوبوو. چ جیاوازییەك لەنێوان وێنەی مەسیحو روخساری خاچدا هەیە؟ چ نهێنییەکی تێدایە؟ بە (نەسرەت)ی وت: پرسیارێکم هەیە بۆچی ئیسلام وێنە قەدەغە دەکات؟

- وەڵامیدایەوە: لەبەر هەمان هۆی، کە لەجولەکەگەریشدا قەدەغەیە. ئەو ئەفرێنەرەی لەهیچ کەس نەبوە ناتوانرێت وێنەی بکێشرێت. خوای جولەکەکان هەرگیز خۆی دەرنەخستوە، بەڵکو تەنها دەنگی بیستراوە، ئەمەش جیاوازە. لە (تەورات)دا وێنەی کێشانی خوا بەهەموو شێوەیەك قەدەغەیەو لەلای موسڵمانەکانیش بەهەمان شێوە. خوا لەسەروی مرۆڤایەتییەوە. ئەگەر تۆ وێنەی مەسیحی پێببەخشیت کەواتە دەبێتە مرۆڤ.

- (تیۆ) هاواریکرد: راستە! زۆر ئاسانترە مرۆڤ خۆی لەنیگای خەمئەنگێزیو کریستیانیدا ببینێتەوە!

ئەگەر باوەڕ بکەیت کوڕی خوایە و خواچۆتە پێستی مرۆڤەوە، بەڵێ، بەڵام ئەگەر باوەڕت نەبێت ئەوکاتەی ئەوەی رویداوە سوکایەتییەکردنە بەخواوەند. لەوەش خراپتر گەڕانەوەیە بۆ سەردەمی نەزانی، بۆ پەرستنی بتو بەردی پیرۆز.

- (تیۆ) وتی: بەراست تۆ واتای هیلالت بۆ من رون نەکردمەوە. هەڵبەتە ئەوەم بەدڵە، کە ئیسلام هیچ وێنەیەکی خواوەند ناکێشێت، بەڵام ئەو مانگی یەك شەوەیە چییە؟

زۆرباشە.. باسی دەکەم. پەیامبەر هێندە لەپەرستنی خۆر لەلایەن پەیڕەوانی خواوەندەوە تورەبوو، کەمانگی کردە دیاردەو سمبولی ئیسلام، بێگومان دەبوو کارێك بکرێت تا مانگو خۆر تێکەڵ نەبن.

- (تیۆ) بەهێواشی وتی: ئەوەی من بڕوام پێیەتی ئەوەیە نزاکردن لەچۆڵەوانیو بۆشاییدا دژوارە.

- (نەسرەت) وتی: وانییە. وەرەو ببینە ئەوکارە لەوبەری گۆڕەپانەکە لەمزگەوتی شین چەند ئاسانە. هونەری ئیسلامی خۆشنوسی و جوانکاری لەو مزگەوتەدا شادییەکی خواوەندانە بەسەر ئیماندارانـدا دەڕژێنێت. مزگەوتی شین (لەنێو منـاری جوانو ئەو گومەزانەی هەریەکەیان تالوتکە ئاڵتونییەکەی هەڵگری گومەزەی دیکەن، ناوی خۆی لەگەشاوەیی ئەو کاشییە شینانەوە هێناوە، کە وەك گوڵی بێشومار دیواری مزگەوتەکەیان رازاندۆتەوە. بەهەمان شێوەی کەتاریکی ناوەوەی (سانتا – سۆفیا) باس لەرابردویەکی خوێناوی دەکات، (مزگەوتی شین) لەشێوازو شەنگی لێوان لێوە.. مزگەوت هەروا وەك پەرستگایەکی گەورە ئەرکەکەی ئەنجام دەداتو لەکاتی نوێژی جەماعەتدا (مەلا)کان رێگا بەچونە ژورەوەی تۆریستەکان نادەن.

(نەسرەت) لەگەڵ چاودێرانی مزگەوتەکە کەوتە گفتوگۆ. سێ کەسەکە لەنێو پۆلێك کۆتردا چاوەنوارِی دەنگی بانگبون، کە نیشانەی گەیشتنی پاشنیوەڕۆ بوو. پاش چەند ساتێك دەنگی (الله اکبر) لەبڵندگۆی چوارگۆشەی مزگەوتەکەوە بەرزبۆوە.

- (تیۆ) وتی: چیدەڵێت؟

(نەسرەت) وتی: دەڵێت: (خوا گەورەو مەزنە، جگە لە (الله) هیچ خوایەکی دیکە نییەو (موحەممەد)یش نێرراوی ئەوە). راگەیاندنی ئیمانی موسڵمانانە.

- پورە (مارتا) وتی: هەمان ئەو وشانەیە لەزاری گۆرانیبێژەکانی (نیزامەدین) لەهندستان بەرگوێت کەوتن.

- بەڵام ئەوان بەدەنگێکی خۆش دەیانخوێند.

- (نەسرەت) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: لەرابردودا بەهۆی دەنگنەدانەوە ناو ئامێرە ئەلکترۆنیەکان دەنگی بانگدەرەکان زۆر ساف و بێخەوش بوو. بڕواداران لەبەردەم حەوزەکاندا دەستنوێژیان هەڵدەگرت و ئامادەی نوێژ دەبون. ڕێوڕەسمی نوێژ بەمجۆرە بوو، کەرەخسار و دەستەکان تامەچەك، ناوچاوان و پێکان تا قولەپێ بەئاو دەشۆرێ.

(تیۆ) وتی: هەموو جارێك ئەوکارە دەکەن؟

- (نەسرەت) وەڵامیدایەوە: دەستنوێژ هەڵگرتن پێش نوێژ ئەرکە. بۆچونە حزوری خوا دەبێت لەپۆخڵی دوربیت، بەڵام ئەگەر باوەڕدار لەگەشتدابێت و ئاوی دەستنەکەوێت ماڤ هەیە سود لەخاك و لم وەربگرێت بەوەمەرجەی پاکوخاوێن بێت.

- (تیۆ) وتی: ئەمکارە هێندە تەندروست نییە.

مەبەست ئەوەیە خەوش و پۆخڵی تەنها مادی نییەو بەڵکو ئەخلاقیشە ئاساییە موسڵمانان بەهۆی ئەوەی لەرۆژێکدا پێنج جار دەستنوێژ هەڵدەگرن زیاتر لە کریستیانەکان پاکوخاوێنترن.

- لەرۆژێکدا پێنج جار! (نەسرەت) بەپەنجەکانی کەوتە ژماردن: نوێژی بەیانی، نیوەڕۆ، پاشنیوەڕۆ، سەعات (٣ - ٥)، (شێوان) لەکاتی خۆرئاوابونداو دواجار نوێژی شەو، تێبینی دەکەیت پێنج جار.

- (تیۆ) بەنارەزاییەوە وتی: ئەی لەکاتی کارکردندا چیدەکەن؟

لەکاتی کارکردندا هەندێك لەشوێنی کارەکەیان دوور دەکەونەوە. بەرماڵێك بەرەو (مەککە) رادەخەن و لەوە دڵنیا دەبن لەکاتی نوێژ دابەستندا هیچ ئاژەڵێك تێپەڕ نابێت ئینجا نوێژ دادەبەستن. زۆر ناخایەنێت ئێستا لەگۆشەیەکی مزگەوتەکەوە دەچینە ژورەوەو دەیبینین.

لێرەش وەك (جاکارتا) ئیمانداران هەمان جموجوڵیان بەڕێکوپێکی و تایبەت و پێکەوە ئەنجامدەدا، کە پێشنوێژێك روو بەمیحرابێکی بچوك لەبەردەمیدا بوو. شانبەشان بەدەستی کراوەوە، بردنی دەستی چەپ بۆلای راست و وێردو نزا. نوشتانەوە تا دەستەکان لەسەر ئەژنۆکان دادەنرێت، وێردو نزا هەستانەوەو دوعاکردن.

- (تیۆ) بەئارامی وتی: بۆچی دەبێت هەموان ئەو جوڵەیە بەیەکەوە ئەنجامبدەن؟

پورە (مارتا) وتی: بابچینە دەرەوە لێرە ناکرێت هەموو شتێك باسبکرێت.

- (تیۆ) لەبێدەنگییەکی تەواوداو لەژێر روناکییەکی شینباودا لەریزی پشتی چەماوەی باوەڕدارانی دەڕوانی، کەبۆ شانازی خوای نەبینراو و یەکتاوە دانەویبون. سەرئەنجام کۆمەڵەکە

پاش ورتەورتی نزا هەستانەوەو دوبارە نارێکوپێکی ژیانی رۆژانە دەستی پێکردەوە. نوێژ کۆتایی هاتبوو.

- (تیۆ) بەهێوری وتی: باشە ئێستا دەتوانم پرسیارێك بکەم؟

(نەسرەت) وتی: گوێت لێدەگرم!

- ئاراستەی مەککە لەمزگەوتەکە لەکوێدایە؟

- (نەسرەت) وتی: لەهەمووی ئاسانترە، ئەو میحرابە بچوکەی ئیمامی مزگەوتەکە لەبەردەمیدا وەستابوو، ئاراستەی مەککەیە.

- بۆچی هەموو باوەڕداران بەیەك شێوازی یەکسان خواپەرستی دەکەن؟. لە کلێساکان هەندێکجار دەکەونە سەرچۆك، کۆمەڵێك دانیشتون هەندێکی دیکە بەشداری لە (کۆمۆنیۆن)دا دەکەن و هەیە کاری (کۆمۆنیۆن)ـەکە رادەپەڕێنی.

- بەڵام هەموو کەسەکانی لە کلێسادا ئامادەن، پاش ئەوەی قەشەکە پاڕانەوە ئەنجامدەداتو نانی فەتیرە (Hostic)، کەنوێنەری جەستەی مەسیحە لەسەر دەست دەنێت، هەموان گەورەیی دەنوێنن. لەئیسلامدا نوێژی جەماعەت دەنگی هاوبەشی هەموو موسڵمانانە، هەموو یەکن.

- (تیۆ)، کە هێندە بڕوای نەهێنابوو، گوتی: بەڵێ کاتێ لەرۆژێکدا پێنج جار دوبارە بۆوە ئیدی کاتی فەرامۆشکردنیت نابێت.

- راستە. نوێژی رۆژانە بوار بەموسڵمانان نادات تاپەیوەندی خۆی لەگەڵ کۆمەڵگەی ئیسلامی بپچڕێنێت. لەڕاستیدا مەبەستێکی تایبەت لەمکارەدا هەبوو.

- کەواتە ناتوانێت بەتەنیا نوێژ بکات؟

- بەڵێ، دیارە کە دەتوانێت. لەشەودا، لەکۆچو گەشتدا ناچارە بەتەنها نوێژ بکات. باوەڕدار دەتوانێت کەی ئارەزوو بکات نوێژ دادەبەستێت، بەڵام بەپێی فەرمانەکانی (قورئان) باشترین نوێژ ئەوەیە لەمزگەوتو لەناو کۆڕی ئیمانداراندا بکرێت.

- تۆش ئەوکارە دەکەیت؟ نەمبینی کڕنوش ببەیت!

- (نەسرەت) بازی بەسەر وەڵامەکەدا دا: من بۆ نوێژکردن شێوازێکی دیکەم هەیە.

- (تیۆ) بەمجۆرە تێگەیشت: چونکە تۆ (سۆفیت). ئێوە شێوازی تایبەتی خۆتان هەیە!

- وەڵامیدایەوە: ئەم شەو ئەو تەریقەتە دەبینیت. بەراست پورت دەیەوێت پێکەوە بۆ کلینیك بچین.

## کاریگەری (کلۆفۆرم)[1]

پزیشکەکە بەجەستەیەکی قەڵەو و روخسارێکی پێکەنیناوییەوە بەخۆشەویستییەکی زۆرەوە پێشوازی لە (تیۆ) کرد، بەڵام چونکە قسەی زۆر دەکرد دەرزییەکەی لەشوێنی خۆیدا رۆنەکردو ناچار دوبارەی کردەوە. بۆنی (کلۆفۆرم) هۆڵە سپییەکەی پڕکردبوو. (تیۆ) ددانەکانی جیڕکردبۆوەو پزیشکەکەش پاش سێ چوار جار بەپۆزش هێنانەوە ئینجا دەمارەکەی دۆزییەوە.

- (تیۆ) پاش خوێنگرتنەکە بەهێواشی وتی: نەشارەزا، بۆخوێنگرتنێك مردنێکە!.

- (نەسرەت) وتی: پزیشکێکە زۆربلێ، بەڵام کاری دروستە. لەگەڵ ئەوەشدا لەئەنجامی تاقیکردنەوەکانی دڵنیام. وەرە رەچێتەکەت وەرگرە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: رەچێتە؟ من دەرمانی خۆم هەیە!

- (نەسرەت) پێشنیازیکرد: ئێستا بیخوێنەرەوە، بەزمانی فەرەنسیە. لەوانەیە دەرمانی نەناسراوی تێدابێت..

(تیۆ) بەتوڕەییەوە وتی: وتویانە نابێت دەرمانەکانت بگۆڕیت.

- پورە (مارتا) وتی: بەراستی سەلیقەی وردبونەوەت نییە.

- (تیۆ) راچێتەکەی خوێندەوە، بەڵام پەیام بوو، کەلەسەر راچێتەیەکی پزیشك نوسرابوو. کورتبوو: ( **بۆ ئەو شوێنە برۆ، کە ئێمە لێوەی هاتوین، کاتێك هاوڵاتییەکانت بەملیۆنان کەسی لەئێمەی بۆ تاراوگە برد**).

- (تیۆ)، کە رەنگی پەڕیبوو، وتی: ئەمە پزیشکە چەنەبازەکەی تۆ نەینوسیوە؟ ئەمە پەیامێکە؟

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: بێگومان، سەغڵەت بویت؟

- (تیۆ) بەهێمنی وتی: زۆر سەرنجڕاکێش نییە، هاوڵاتییەکانم خەڵکیان بۆ تاراوگە بردوە؟ فەڕەنسیەکان؟

- (نەسرەت) وتی: دەبێت خۆت بیزانیت. دڵنیات دەکەم ئەم پەیامە راستە.

- (تیۆ) بەبیرکردنەوەدا رۆچوو، گوتی: کۆچبەران نین، چونکە ئەوانە بەئارەزوی خۆیان دێن. لەزیندانەکان، بەڵام خۆ ملیۆنان کەسیان نەگرتوە... بەراستی ملیۆنان؟

- پورە (مارتا) وتی: تەنانەت لەوەش زیاتر. تۆ ئەو روداوە دەزانیت.

---

[1]. کلۆفرم: یان (ئەتر – ایپر) بە یۆنانی واتا هەوا یان بەئاسمان دەوترێت. لەکیمیادا شلەمەنییەکە لە ئەسیدو ئەلکۆل دروستدەکرێت. دەرمانی بێهۆشکردنە.

- (تیـۆ) پەیامــە نیگەرانکارەکــەی دەخوێنـــدەوەو دوبــارە دەیخوێنـــدەوە. لــەکوێ‌و کــەی فەرەنسیەکان ئەو ژمارەیەیان دورخستۆتەوە؟. لەپڕ راستیەکە بەبەرچاویدا تێپەڕی. کۆیلە ئەفریقییـەکان! کەشـتییە رەشـەکانی کەشـتیوانە فەرەنـسییەکان! ئـەفریقای (فـاتۆ) ... سـەری داخست.

- پورە (مارتـا) ئاماژەیـەکی کـرد: دەبیـنم تێگەیـشتیت. ئـەوەی مـاوە بزانیـت بـۆ کـام وڵاتـی ئەفریقا دەڕۆین.

- بڵمانــدی: بــۆ (ســنیگال). (فــاتۆ) باســی دورگەیــەکی بــۆ کــردوم، کەلــەوێوە کۆیلــەکان بەزنجیرکراوی سواری کەشتیان کردون.

- راستە. چەند رۆژێکی دیکە دەچینە ئەوێ.

- (نەسـرەت) بەمەبەسـتی سـڕینەوەی کاریگـەری پەیامەکـە رایگەیانـد: بـۆفراوین کـردن بـۆ چێشتخانەیەك دەچن دەڕوانێت بەسەر (بـازاڕە بـچوك)ی (ئەسـتانبوڵ)؛ باشـترین رێـستۆرانتی ئەو ناوچەیەیە. بەڵام (تیۆ) ئارەزوی خواردنی نەبوو، ئەو ماسییە سورکراوەی رەتکـردەوە، کە کارگوزارەکـە لەســەر دەفرێکــی پاکوخــاوێن پێــشکەشی کــرد. لەگــەڵ ئەوەشــی هــەموو جــۆرە خواردنێکی خۆشی بۆ هێنرا، کەچی نەیخوارد.

- (تیۆ) وتی: برسیم نییەو لەگەڵ ئەوەشدا دەستم ئازاری هەیە.

- پورە (مارتا) پرسی: ئایـا زیـاتر بـەهۆی پەیامەکەوەیـە؟ دانبـەوەدا دەنـێم سـەخت‌و رەقـە. وانییە؟ باشە، دە شتێك بڵێ؟ هیوادارم نەخۆش نەبیت؟

وەڵامی نەدایەوە. (تیـۆ) زۆر رەنگـی پـەڕیبوو. لـەپڕ بـەرەو دەسـتشۆرەکە رایکـردو رشـایەوە. (نەسـرەت) بەئارامییــەکی تــەواوەوە ناوچــاوانی گــرت‌و دەمــی بــۆ پــاککردەوە. پــورە (مارتـا) لەجێگای خۆی نەدەبزواو زۆر دڵتەنگ بوو. ئایا (تیۆ) دوچاری قەیرانێکی دیکە بووە؟

- (نەسرەت) بەزۆر (تیۆ)ی لەسەر کورسییەکەی رۆنیشاندەوە: لێرە دانیـشە. ئێـستا دوچـاری هەژانێکی توند هاتویت. دەبێت ئاوێکی زۆر بخۆیتەوە. شەکرت پێیە؟ بیگرە.

- (تیۆ) لەسەرخۆ وتی: (چا) دەخۆمەوە، (چا)ی راستەقینە، وەك (چا)ی ماڵەوە.

کارێکی سادەنەبوو. چێشتخانەکە (چا)ی (ئـەرل گـری) نـەبوو. لـەبازاڕی (ئەسـتانبوڵ)دا ئـەو چایە دەستنەدەکەوت. بەناچاری بەشـلەمەنیەك رازیبـوو، کـە لـەروی بـۆن‌و رەنگـەوە لـە(چـا) دەچوو. بڕیاریاندا ئەو دوانیوەڕۆیە لەماڵی (نەسرەت) بمێننەوە. (تیۆ) بەبێدەنگی خەوت.

- پورە (مارتا) ئـاهێکی کێشاو گـوتی: لـە (ژاپـۆن) بـەدواوە دوچـاری هـیچ گرفتێـك نـەبوو. دەبێت چ شتێکی نوێ رویدابێت؟

- (نەسرەت) بەتوندی وتی: بێهودە خۆت دوچاری سەر یەشە مەکە. لەبۆنی (کلۆفۆرم)ـەکەوە بوو! ئەو پزیشکە نەفرەتییە سەری شوشەیەکی دانەخستبوو، خودی خۆشم خەریکبوو لەهۆش بچم.

لەوباوەڕەدایت! چەند ترسام!

- (نەسرەت)، کەنوازشی دەکرد، وتی: دەزانم، ئازیزەکەم، بەلاّم وەکو زانراوە رشانەوە نەخۆشی نییە.

- پورە (مارتا) پەسەندی کرد: راستە. ئەی ئەگەر دوچاری (هپاتیت)ی بکات چی؟

- (نەسرەت) وتی: لەوانەیە (تا)ی هەبێت. ناوچاوانی وەك ئەو منالاّنەی دەرشێنەوە دەلێی بەفرە. پێویستە برشێتەوە. ئەوە دەزانیت! رشانەوە زیادەڕۆییەکانی ناو گەدە دەکاتەوە دەرەوەو پاکیدەکاتەوە... لەدیدی منەوە (تیۆ) دەبوو دوچاری ئەوە ببێت. کارێگەری (کلۆفۆرم) لەگەڵ پەیامە نەشیاوەکە شتێکی زیاد لەڕادەبوو.

- پورە (مارتا) وتی: هیوادارم ئەمشەو تەندروستی باش ببێت. لەوانەیە سەمای (سماع)[1]ی دەروێشەکان سەغڵەتی کردبێت.

(نەسرەت) وەلاّمیدایەوە: دەستی لێبەردە. وەك کەسێکی لەسەرە مەرگدایە رەفتاری لەگەڵ مەکە. ئەویش وەك هەموو کەس دەشێت سەغڵەتی هەبێت.

## جبەی پەشمینی

(نەسرەت) راستیکرد. (تیۆ) لەدەمەو ئێوارەدا بەبرسیبونەوە لەخەو رابوو. ژنێکی لاو (چا)ی راستەقینەی بۆ هێناو ناچاریکرد قاپێك برنجی سپی بخوات.

- پرسی: ئەگەر باش تێگەیشتبم ئەمشەو دەچنە دەرەوە؟

- بەڵێ، بۆ (تەکیە)یەك دەچین، کە دەوێشەکان تیایدا سوڕدەخۆن. بانگکراوەکان لەرێزێکدا دادەنیشن، شوێنی مامۆستاش، کە جوڵەی سەماکە رێکدەخات، لەبەرامبەر ئەواندایە، چونکە سەمای دەروێشان زنجیرەیەك خونەریتی سروتی ئاینییە.

- (تیۆ) پرسی: وشەی (دەروێش) واتای چییە؟

- واتە (مورید). هەر دەروێشێك پەیڕەوی لەشێخێك دەکات یان لە مامۆستاو مرادێك.

- مەبەست لەو سوڕانەوەیە چییە؟ سەرگێژدان؟

[1]. سماع: لەزاراوەی سۆفیگەریدا گۆرانی وتن و تەپڵ و دەف کوتان و زیکرکردن و سوڕانەوەی بەردەوامە.

- (نەسرەت) رونیکردەوە: نەخێر، سەمای دەروێش سەمای (ڤالس)[1] نییە سەرت گێژبخوات. بەپێچەوانەوە، کاتێك سەماکە دوایی دێت دەروێش بەملاولادا ناکەوێت. بۆئەوەی دروست بسوڕێتەوە چەندین ساڵی دەوێت تافێر دەبێت و ئەم سەمایەش خۆی پاشینەیەکی لەسەدە دورەکاندا هەیە.

- (تیۆ) بەداواکارییەوە وتی: تکا دەکەم پیشانم بدە، کەمێك.

- (نەسرەت) هەستاو پێیەکی روتی هاویشتە سەر پێکەی دیکەی و لەپێکی دەستی بۆ سەرەوەو لەپێکی روو لەزەوی. ئینجا لەسەر خولگەی دوو قاچە خاچییەکەی هێواش بەدەوری خۆیدا سوڕایەوە، کە وەستایەوە وتی: لەوە زیاتر ناتوانم بسوڕێم، چونکە لەوە زیاتر پێویستی بە مۆزێکە. مامۆستاکەم لێرە نییەو لەباری نزاکردندا نیم. ئەوەی دەتوانم باسی بکەم ئەوەیە بۆچی پێیەك لەسەر پێکەی دیکە دادەنێیت و رونیکردەوە: ئەم روداوە بۆ سەدەی سیانزە دەگەڕێتەوە، بۆ سەردەمی دامەزرێنەری زنجیرەی دەروێشەکان، کە ناوی (جەلالەدینی رۆمی)بوو؛ بە (مەولانا) واتە (مامۆستا)و مرادمان بانگ دەکراو هەستاوە بەکۆکردنەوەی پەیڕەوان و موریدەکانی لە دەوری خۆی؛ ئەوانەی لەجۆشوخرۆشی گڕی عیشقی خوادا دەسوتان. لەنێو ئەوانەدا چێشت لێنەرێك هەبوو، رۆژێکیان لەکاتی سوڕاندنەوەی دەروێشەکاندا هێندە خۆشەویستی و سۆزی بۆ مامۆستا هەبوو، کە خۆبەخۆ ئاگای لەچێشتەکەی نەمابوو. مەنجەڵ دەرژێت و قاچی بەچێشتە گەرمەکە دەسوتێت. بۆ ئەوەی مامۆستاکەی نیگەران نەبێت پێیەکەی دەهاوێتە سەر قاچە سوتاوەکەی. مامۆستا، کە بەو فیداکارییە زۆر کاریگەربوە بڕیاریداوە رێزی لێبنێت و بۆ شکۆمەندی ئەو دەروێشەکان لەسەر یەك قاچ دەوەستن و دەستپێدەکەن.

- (تیۆ) وتی: پەلەمەکە. ئەو دەروێشانەی تۆ خوایان خۆشدەوێت یان مامۆستا؟.

- پرسیارێکی بنەڕەتی بوو، چونکە سۆفییەکان لەرێگای بونی مامۆستایەکی زیندووەوە بەدوای عیشقی خوادا وێڵن و بەبێ مامۆستا سۆڤ بونی نییەو بەبێ ئەویش ناتوانێت زکرو نزا بکات. مامۆستا روناکیەکە لەلای خواوە. موریدان ناچاری ملکەچین بۆ ئەو، بەتایبەتی کاتێك وتەی دژ بەئەقڵی تەندروست و دەرککردنی راست ئەدرکێنێت، چونکە لەناو ئەو هەموو وتە سەیرو سەمەرانەدایە مامۆستا پەیامێکی خودایی دەگوێزێتەوە.

[1] ڤالس جوریك سەمای ئەڵمانییە بەسازێك تایبەتە بەو سەمایە.

- (تیۆ) وتی: سەیرە. لێرەش وەك حاڵەتی (زەن) توشیو تەزای نالۆژیکی دەبین، وەك عیشق لەلای روسەکان یان خۆڕادەستدانو ملکەچی، کە وەك ئەوەی لای موسڵمانانە.

- (نەسرەت) وتی: وەك (یۆگا). رەهاییەکی بێسنور. ئێمە دەڵێین مورید لەناو دەستی مامۆستادا وەك جەستەیەکە لەبەردەستی گۆڕهەڵکەندا. وابزانم تۆ وانەی (یۆگا)ت خوێندووە؟ دواین جوڵە بێنەرەوە یادی خۆت، ئەوە پێی دەوترێت (تەرم)، وانییە؟ پاشان رونیکردەوە: سۆفییەکان وەك ئیسماعیلیو شیعەکان بۆ ئەوەی ئیسلام پیادە بکەن پێویستیان بەڕابەرو پێشەوای رۆحانی هەبوو، بەڵام چاوەنواڕی هیچ هەستانەوەو ئیمامێك نەبون. لەلای ئەمان مامۆستا لەپشتی زنجیرەیەکی دورودرێژی مامۆستایانی پێشوتر بوو، کە ئەرکی رێنوێنی سۆفییەکانی بەوەچەکانی پشتی خۆی سپاردووەو کۆی ئەوانە لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامەوە زنجیرەیەکی نورانیان لەروناکی خوا پێکدەهێنا، چونکە تەنها ئەم خاوەن بەهرانە دەیانتوانی لەهەموو کەسێکدا بەشی دەرەکی خواوەند، کە تەنها رەنگدانەوەیی سەر زەوییە، لەگەڵ بەشی دەرونییەکەی، کە لایەنی بەرزی رەواڵەتە، کۆبکەنەوە. سۆفییەکان لەجیهان گۆشەنشین دەبونو رۆژگاریان بەهەژاری بەسەردەبرد.

- (تیۆ)، کە لەبازنە قورسو گرانبەهاکەی (نەسرەت)ی دەنواڕی وتی: رەواڵەتی تۆ پێچەوانەی ئەو بانگەشەیە دەردەخات.

- بەڵێ. باشە نابێت زیادەڕەوی لەهیچ شتێکدا بکرێت. هەرچۆنێك بێت لەسروتو جێبەجێکردنی ئادابدا پۆشاکەکان لەسادەترین شێوەدانو دەبێت سۆق تەنیا جبەیەکی لەبەردابێت. لەرێچکەی سۆفیگەراییدا هیچ شتێك لەجبە گرنگتر نییە. جبە لەلۆکە دروستکراوە، کە بەعەرەبی پێیدەڵێن (صوف - Souf)و وشەی سۆفیش لەهەمان شتەوە هاتووەو بەو واتایە دێت کەسێکە بەرگی (لۆکەیی) پۆشیوە؛ هەر وەك چۆن (موسا)ش لەچیای (سینا) هەمان بەرگی پۆشیبوو.

- (نەسرەت) وتی: ئەم پۆشاکە لەیەکێك لەبەناوبانگترین راڤەکانی قورئاندا هاتوە، کە پەیامبەر لەباری پەرۆشیدا چوّتە بەهەشت و (جوبرەئیل)ی فریشتە دەرگای بۆ دەکاتەوەو پەیامبەر سندوقێك دەبینێت. (موحەمەد) بۆ ئەوەی بزانێت سندوقەکە چی تێدایە داوای مۆڵەتی لەخواوەند کردوەو ئیدی لەناو سندوقەکەدا تەنیا بێنیازیی راستەقینەو جبەیەکی بینیوە. دەنگی خواوەند بڵندبووە: (ئەمە دووشتە کە من بۆ گەلەکەی تۆم هەڵبژاردوە. ئەوەش تەنها بەو کەسانە دەدەم کە خۆشمدەوێن، شتێکی لەو دوانەش ئازیزترم نەئەفراندوە).

پەیامبەر بۆ سەر زەوی گەڕاوەتەوەو جبەکەی بە (عەلی) زاواو ئامۆزای خۆی بەخشیوەو ئەویش بەوەچەکانی.

- (تیۆ) پرسی: تۆش لەو جبەیەت هەیە؟

- پێش دەستپێکردنی سروتەکە، بەڵێ! ناچارییە. عەبایەکی لۆکەی قاوەیی وەك خاك لەبەر دەروێشەکاندا دەبینی. کلاوێکی قوچی لار لەسەردەکەن، کە دیاردەی گۆڕەو سۆفییەکان هەرگیز فەرامۆشی ناکەن، بەڵام پۆشاکیان سپییە وەك رەنگی کفن لەزیارەتکردنی (مەککە)دا... چونکە پێچەوانەی ئەوەی دەربارەی ئێمە وتراوەو ئەو ئەشکەنجەیەی بەدرێژایی سەدەکان بەسەرماندا سەپێنراوە، ئێمەی سۆفی موسڵمانی راستەقینەین. ئێمە (خوا)مان خۆشدەوێت و خۆمان بەئەو دەسپێرین... بەڵام لەبنەڕەتدا باوەڕی ئێمە ئەوەیە، کە تەنها بەشی دەرەکی (خوا) بەپێی بنچینەی وڵاتان و گەلە جیاوازەکان جیاوازە، لەکاتێکدا بەشە دەرونییەکەی لەتیشکی روناکی خودی جیهاندا گشتگیرەو بۆ هەموان یەکەو یەکسانە!. هێندە بەسە خود رادەستی مامۆستا بدەین تائەو رۆحمان بەرەو سەنتەری راستەقینەی خۆی دور لەشڵەژاوی رەواڵەتەکان رابەرایەتی بکات.

- پورە (مارتا) بەکینەو تورەییەوە وتی: پەیوەندی نێوان مامۆستاو قوتابی، مرادو مورید لەهەموو جیهاندا هەیە.

- (تیۆ) لەتورەییدا سورهەڵگەڕاو گوتی: بەئاگابون لەوە پێویستە!. مەگەر بڕیار نییە هەموو ئایینەکان بەسەر بکرێنەوەو بیانناسین؟. ئەگەر تۆ هەمویان تێکەڵ بکەیت چۆن بەو هۆشیارییە دەگەم؟

- هەڵبەتە بەبێئەوەی بهێڵم بکەویتە داوی ئەو ئامۆژگارییە زەردو سورانەوە.

- (ئەسرەت) بەمیهرەبانییەوە بەشداری کردو گوتی: تۆ شتێك زیاد لەرادە بێ (خوا)یت. ئاینی سۆفیگەرایی ئازارت دەدات. بەتەواوی لەوە تێدەگەم، بەڵام ئەوەش نابێتە هۆکار تاکەسانی دیکە لەدین دووربخەیتەوەو بێزاریان بکەیت.

- (تیۆ) بەشداریکردو بەو ئەنجامەوە گوتی: زۆرباشە، ئایا دەتوانم چەند پرسیاری دیکە بکەم؟

## لەسەرو (من)و (تۆ)وە

(ئەسرەت) یەکێك لەجوانترین خەندەکانی بەروی ئەوداداو ئامادەی وەڵامدانەوە بوو.

- پێمبڵێ ئەو سەنتەری رۆحەی دەیڵێیت چییە؟

- وەڵامیدایەوە: من بەشیعر وەڵامت دەدەمەوە. گوێڕادێرە بۆ ئەم شیعرەی (شیستەری) سۆفی:[1]

بۆ من و ئەو باڵاپۆش بوە ڕێگا — باخواوەند پەنهان بێت تاتۆ ئاشکرا
باڵاپۆشەکەمان یەك نەفەسی قەشەنگ بوو — لەئاستی وەسڵەتی ئەودا بەمن بڕا
بۆ ڕێگای گردبونەوە کەگەڕاین من و تۆ — لەو نێوەندەدا یان تۆبیت یان ئەو
هەموو حوکمێکی شەریعەتی من لەتۆوەیە — کەوابەستەی گیان و جەستەی تۆیە
من و تۆ کەنەماین لەونێوانەدا — چییە کەعبە، کونج و دێر.

- (تیۆ) وتی: خراپ نییە. بەڵام ئایا ئەوساتەی نێوان دوو کەس، (من)و (تۆ) نامێنێت ئەوە دەگات؟

- وەڵامیدایەوە: لەساتی عیشقدا، کاتێك دوو کەس بەو رادەیە یەکدیان خۆشبوێت، کەجگە لەبون بەیەك هیچی دیکە نەبن، ئەوەش ئەو بارەبوو بەسەر مامۆستای دامەزرێنەری تاقمی دەروێشان (مەولانا)دا هات. لەسەردەمی لاویدا جگە لەزانایەکی رۆحانی ئاینی هیچی دی نەبوو، کەچاوی بە(شەمسی تەبریزی) کەوتوە. ئەو چاوپێکەوتنە شۆڕشێکی رۆحانی لە(مەولانا)دا دروستکردوەو بەتوندی پەرۆشی (شەمس) بووە تا ئەو رۆژەی (شەمس)بزربوو. (مەولانا) زۆر بەدوایدا وێڵبوو، وەك ئەوەی وێڵی دوای (خوا) بوو بێت. بەڵام چونکە (شمس) لەلایەن دوژمنەکانییەوە کوژرابوو هەرگیز سەری هەڵنەدایەوە[2]. وشە دەستەوەستانە لەبەردەم ئەو عیشقە خرۆشاوەی (مەولانا) بۆ (شەمس) هەیبوو، پەیوەندییەکی خودایانەبوو، کە راستەوخۆ (مەولانا)ی بەرەو (هەق) رێنوێنی کرد.

- (تیۆ) پرسی: ئایا پەیوەندی ئەو دوانە دەچێتە قاڵبی هەتیوبازییەوە؟

- ئەم پرسە دەبێت چ گرنگییەکی هەبێت؟. ئەوجۆرە عیشقە رۆحانییە رەگەز ناگرێتەوە. گەورەترین سۆفی ئیسلام ژنێکی ئێرانی بوو.

- پورە (مارتا) بەسەرسامی و قسەی بەتوێکڵەوە وتی: لەئێران؟ چەند شتێکی سەیرە؟

- ئەوەش نازانی؟ بەڵێ، (رابیعە) لەسەدەی نۆیەمی زاینییدا گەورەترین پیرۆزکراوی جیهانی موسڵمانان بوو. لەهەموو ژیانیدا بەنەداری ژیاو لەناو گڕی ئاگری عیشقی خودایدا سوتا[3].

---

١. شێخ سعدالدین محمود عبدالکریم عارف معروف لەساڵی (٧٢٠ هـ.ق) کۆچی دوایی کردووە. لەناوچەی (شبستەر) لەدایکبووە. لەریزی زانایانی تەبریز بووە. وەڵامی (شازادە سەید حوسەینی هرەوی عارفی خوراسانی)و خەلیفە (شێخ بهاءالدین ملتانی) بەشیعر داوەتەوە بەناوی (گوڵشەن راز). پێش ئەم شیعرەی شاعیر نەبوو، بەڵام شتی زۆر لەسەر پرسی عیرفانی نوسیوە.

٢. (... ئەوەی کە دەڵێن (شەمسی تەبریزی) لەلایەن گروپێکی خەڵکی (قونیە)وە کوژراوە نابێت هیچ بنچینەیەکی هەبێت. (ف. معین).

٣. رابیعەی عەدەوییە: ژنێکی عارف بوو، لەلوتکەی زنجیری عیرفانی (ابن عربی)، کە لە (بەسرە) مردووە. بەمناڵی رفێنراوەو بەکەنیزەیی فرۆشراوە. پیرۆزبوونی لەژیاندا بوو، بەهۆی ئەوەی ئازادی بۆ بگەڕێتەوە. لەروی کەراماتەوە گەلێك ریوایەتی لێدەگێرنەوە.

سوڵتانەکان لەرێگای دوورەوە بۆ بینینی دەچون، زاناو بیریاران دەستخۆشیان لێدەکردو ئەو بەلای چاوێکیشەوە سەیری نەدەکردن. رۆژێك نەیزانیوە وردەدار چۆتە ناوچاوییەوەو تەنانەت هەستی بەهیچ ئازارێك نەکردووە...

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: ئێمەش لەکریستیانیدا لەوجۆرە پیرۆزکراوانەمان هەیە، تایبەت بە ئیسلام نییە.

- (نەسرەت) بەهەست بەئازارکردنەوە بەدەنگی بەرز وتی: من وتم تەریقەتی سۆفی هیچ ئاینێك ئاوارتە ناکات.

- (تیۆ) وتی: عیشقی خودایی راستە، بەڵام نەك عیشقێکی خودایی لەنێوان پیاو و ژنێك.

- بۆ دەبێت عیشقێکی لەوجۆرە قەدەغە بێت؟ ئایا جوانترین چیرۆکی خۆشەویستی ناو جیهانی موسڵمانان دەزانیت؟

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بەراست؟ تکادەکەم باسی بکە.

- (نەسرەت) وتی: دوو منداڵ بەعیشقێکی پاکەوە یەکدیان خۆشدەویست، بەڵام کچەکە بەناوی (لەیلا) بەپێی دابونەریتی سەردەم، کە هێشتا لاو بوو، بەپیاوێکی دیکە درا بەشوو، دەبوو ئیدی کوڕە لاوەکە مەیدانەکە چۆڵ بکات.

- بۆچی؟

- چونکە لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا باوك خاوەنی هەموو مافێك بووە بەسەر کچەکەیداو هەڵبژاردن مایەی مشتومڕو رەخنەگرتن نەبوەو عیشق لەدەرەوەی هاوسەرگیری قەدەغەبوو. دەزانیت بەپێی رێساکانی ئیسلام سزای زیناکردن چییە؟ دەکرێت مەرگ بێت.

- (تیۆ) بەناڕەحەتی پرسی: چۆن (دەتوانن)؟ وێنەی بەردەبارانکردن (رەجمکردن)ەکانم بینیوە! بەراستی عاشقان دەکوژن!

- نەك لەهەموو وڵاتە موسڵمانەکاندا!. ئێستا باشتر لەوە تێدەگەیت، کە بۆچی لەچیرۆکەکەماندا بۆ سەردەمی منالّی (لەیلا) خۆڕادەستدانو کەنارەگیری باشتربوو. بەڵام ئەو ئەمکارەی نەکردو سەرەڕای نەریتەکانی کۆمەڵگە سەرسەختی لە ئاواتەکانیدا نواند. بەدەوری ماڵەکەی (لەیلا)دا دەسوڕایەوەو گۆرانی هێندە دڵتەنگو نائومێدانەی دەوت، کە بۆ هەموان ئاشکرابوو شێت بوەو کوڕەی لاو بوو بەشێت (مجنون).

- (تیۆ) وتی: کوڕەکانی (ئۆرشەلیم)یش بەو کەسانەی بانگەشەی (مەسیح) بونیان دەکرد هەمان شتیان پێدەوتن.

باشە، (مجنون)یش وەك مەسیح وێڵی (لەیلا)کەی بوو. سەری نابوو بەبیابانەوەو عیشقی (لەیلا)ی بەئەستێرەکان رادەگەیاند. هەر لەو غەمو پەژارەیەدا سەری نایەوە، (لەیلا)ش مرد. کۆمەڵگەی داخراوو توندوتیژی عەرەب لەبەرامبەر عیشقێکدا، کە هیچ پەیوەندییەکی بەپرسی سێکسەوە نەبوو، هەموشی گرێکی خودایی شێتییەکی پیرۆزکراو بوو، سەری داخست. ئێستاش روداوی (لەیلا)و (مجنون) لەسەرانسەری جیهانی عەرەبدا بەناوبانگە. ئەوە عیشقە.

- (تیۆ) وتی: زۆرباشە، ئەوە بەجێی خۆی، بەڵام من (رۆمیۆ)م لاباشترە، بەلایەنی کەمەوە عیشقێکی ئەم دونیایەی بۆ (ژولێت) هەبوو.

- بەڵام (رۆمیۆ) کاری بەلایەنی خوداییەوە نییە، لەکاتێکدا سۆفییەکان پەرۆشی عاشقی خوداین. (هاتفی ئەسفەهانی) سۆفییەکی ئێرانی بووەو عاشقی ژنێکی کریستیانی بوو، لەگەڵیدا بۆ کڵێسا دەچوو. لەکاتی رێورەسمی نزاکردندا وتویەتی: **(ئاخ، تۆ کەدڵی من لەتۆری ئەودا دیل دەکەیت، هەموو تاڵە مویەکی من لەپشتێنی تۆوە ئاڵاوە بەنیازی تاکەی شەرمەزاری سێ لوتکە بەسەر ئەو کەسەدا بسەپێنیت، کە (یەکتا)یە؟ چۆن دەتوانرێت خوای تاكو تەنها بەباوكو رۆحی پیرۆزو کوڕ ناو ببەیت؟)**.

- (تیۆ) وتی: مەرج دەکەم ژنە کریستیانەکە هیچ وەڵامێکی نەداوەتەوە؟

- چۆن، شاعیر بەخەندەیەکی شەکراوی وەك ئاوی گوڵاو رایدەگەیەنێت... ( **ئەگەر تۆ لەرازو نیازی یەکبونی خوا بەئاگای.. زنجیری کافران مەخە گەردنی ئێمە.. جوانی جاویدانی لەسێ ئاوێنە، تیشکی پاكو بێگەرد لەروناکی ئەوەوە دەشکێنێتەوە**). ئینجا زەنگی کڵێساکە لێیداوەو شاعیر بەو ئەنجامە گەیشتوە: ( **سرودەکەی پێمان دەڵێت کەئەو تەنهایەو جگە لەئەو هیچ نییە، خوایەکی دیکە بونی نییە**).

- (تیۆ) وتی: بەمپێیە بێت دوا قسە شاعیر کردویەتی.

- (نەسرەت) بەپێکەنینەوە وەڵامیدایەوە: بەڵام ژنەکە وەڵامی دابۆوەو شاعیر تێگەیشتبوو.

- پورە (مارتا) هەستاو گوتی: زۆرباشە. ئێستا (تیۆ) هێندەی پێویست بکات بۆ بینینی سەمای دەروێشان فێربووە.

- (نەسرەت) وتی: نەخێر، هێشتا دوو خاڵی تر باسدەکەم. ئەو سروتەی تۆ دەیبینیت ناوی (سماع - Sama - زکر)ە، ئەم وشەیە وەرناگێڕێت. دەتوانین بە (گوێڕاداشتن) یان ئەگەر لات باش بێت بە (گوێگرتن) ناوی ببەین. دەچنە (ساماع)وەو ئەفسوناوی دەبن. هەندێك لەدەروێشەکان لەکاتی (سەماع)دا بەگریانەوە بەرگ لەبەرخۆیان دادەدرن. لەعێراق دەروێش

هەیە بەسەر پشکۆدا دەڕوات، یان دەیخۆن و زرگ لەخۆیان رادەکێشن، بەبێئەوەی دڵۆپێک خوێنیان لێبێت.

- (تیۆ) وتی: پورە (مارتا) ئەو دیمەنانە ئاینین؟

- (نەسرەت) وتی: بەوجۆرە نەخێر. (سەماع)کەی ئێمە هیچ شتێکی لەوشتە شێتئامێزانەی تێدانییە. گوێ بۆ ئاوازی خوداییانەی شمشاڵ رادەگرین. ئەوە ئاوازی شمشاڵە بەزنجیرکراوی لەناو بازنەی خۆماندا رێنوێنیمان دەکات. ئێمە لەدەوری ئەستێرەی ناوەڕاست، کە روخساری نەبینراوی خوایە، بازنەیەک پێکدێنن. هەرلەبەرئەوەیە دەروێشەکان لەناو بۆشایی فراواندا وەک ئەستێرە دەسوڕێنەوە. کە دەبینیت ئەوانە لەپێکی دەستیان بۆ ئاسمان هەڵبڕیوەو ئەویدیان رووەو زەوییە، لەبەرئەوەیە جەستە خولگەیەکە دوو جیهان بەیەک دەگەیەنێت.

- (تیۆ) وتی: سەیرە، واتە ئێوە گوێزەرەوەی تەزون.

- بەڵێ. وەک کانزای گواستنەوەی کارەبا. خاڵێکی دیکەی دەمەوێت باسی بکەم واتای ئەو گۆرانییەیە لەسەرەتادا دەوترێت: (ماڵئاوایی بکە لەئەقڵ، ماڵئاوایی، ماڵئاوایی، ماڵئاوایی....)

- (تیۆ) وتی: ئای، پەیامەکەم کامڵ بوو، لەئەقڵ ماڵئاوایی بکە، بەراستی تێناگەم. دوبارە تەریقەتێکی دیکە، کەمرۆڤ خۆی تێدا وێڵ دەکات!

- بەپێچەوانەوە! دەبێت خۆی بدۆزێتەوە.

## سوڕانەوەی ئەستێرەکان

ئێستا کاتی بەیەکگەیشتن بوو لەگەڵ دەروێشەکان. (نەسرەت) لەجبەیەکی نەشمینندا متەقی لەخۆی بریبوو. پورە (مارتا)و (تیۆ) بوێری ئەوەیان نەبوو بێدەنگییەکەی تێکبدەن. لەتەکیەکەدا خەڵکی بەریزو بەبێدەنگی دەهاتنە ژورەوەو هەربەریزیش لەپشت هەیوانێکی لەدار دروستکراودا رۆدەنیشتن. (نەسرەت) پێشتر پێیڕاگەیاندبوو ئەو شوێنە تەکییەی ئەو نییە، چونکە مامۆستاکەی لەوێ نەبوو. وتبوی ئەو (زکر) ناکات، بەڵکو بەچاوو بەدڵ بەشداریدەکات.

- دەروێشەکان بەپێی پەتی و باڵی شێوە خاچ و بەکۆڵوانەیەکی قاوەییەوە دەچونە ریزەوە. مامۆستا بەجبە پەشمینە خاکییەکەیەوە راوەستابوو. دەنگی بزوێنەری فلوت بەرزبۆوە... سیمای (نەسرەت) نورانی داگەڕا. بەهێواشی وتی: شمشاڵە، ناڵەی نەی، هۆکارێکی بێچەندوچونی دەروێش، ئاوازەکە باس لەجودایی دەکات...

(سەماع) بەلێدانێکی لەسەرخۆی تەپڵەکان و شێوازێکی راهێنراوی شارەزاییانەوە دەستپێیکرد. (مامۆستا) چووە مەیدانەکەوە. دەروێشەکان یەک یەک شاڵەکانیان دانا و

بەبەردەمی مامۆستادا تێپەڕین و بازنەیەکیان بەدەوریدا دروستکرد. شانەکان کەوتنە جوڵە... سەماکردنەکان، پێکانیان بەرامبەر یەك دانا، لەپی دەستێك روو لە ئاسمان و لەپەکەی دیکە روو لە زەوی، لەسەرخۆ دەستکردن بە سوڕانەوە... داوێنە پانە سپییەکان وردە وردە وەك پەڕەی گوڵ کرانەوەو ماڵئاوایی کردن لەئەقڵ کەوتە خێرایی خۆی... پیاوەکان چیدی مرۆڤ نەبون، بەڵکو ببونە ئەستێرەی گەڕۆك، تیشك دەرەوە، گەڕان بەدەوری خۆرێکی ونبودا، شکۆفەکانی گێلاس، لەسەر ڕێگای بزربون، مۆمی ناو سەبەتە بچوکەکانی سەر ئاوی روباری (گنگ)، خەندەکەی بودا، روناکییەکی تێپەڕ.

- پورە (مارتا) وڕوومەنگ چاوی نابووە سەریەك. (تیۆ) بۆ ساتێکیش چاوی لەسەر دیمەنەکە لانەدەدا. لەگەڵ ئەوەی روانینی بەسەر سوڕانەوەی رێکوپێکی سۆفییەکانەوە روابوو دەنگی جمکەکەی دەهاتە گوێ، کە لەناخەوە لەگەڵیدا گفتوگۆی دەکرد. دەنگێکی ئارامبەخش و ئاشتیخوازانە.

شمشاڵ، لەلای خۆیەوە هێور بوەوەو تاجە گوڵەکان چونەوە ناو یەك. (نەسرەت) لەجێگای خۆی نەجولابوو.

- پورە (مارتا) چاوەکانی کردنەوەو لە (تیۆ)ی روانی، لەکاتێکدا (نەسرەت)ی رادەتەکاند وتی: هێی! سەیرکە (تیۆ) لەچ حاڵێکدایە..

(نەسرەت) بەبێئەوەی کاردانەوەیەك پیشانبدا وتی: دەستی لێنەدەیت. بۆ گەڕانەوە بۆ جیهانی ئەقڵ کات پێویستە.

دەروێشەکان یەکەیەکە چوونە دەرەوە. مەیدانەکە چڕ ئبوو، هیچ لەئەستێرە گەڕۆکەکان نەمابۆوە. (تیۆ) سەری راوەشاندو بەجۆرێکی سروشتی لەخەونەکەی بێداربۆوە.

- پورە (مارتا) وتی: بۆ کوێ چووبویت؟

- هەر لێرەبوم، شتێکی هێندە ئالۆز نەبوو.

- لەو باوەڕەدام جمکەکەشت لەگەڵدا بوو.

بەخۆشییەوە هاواریکرد: دواجار کاتی بوو بگەڕێتەوە...

- (نەسرەت) وتی: ئێمە هەمومان دوو کەسین. هەمووومان یەك روخساری دەرەکیمان هەیەو سیمایەکی دیکەش...

## بەشی بیست و چوار

# (نوسراو یان وتەزا؟)

### کاری (عارفەکان)[1]

(تیۆ) بەبێئەوەی متەقی لێوە بێت چووە جێگاوە. پورە (مارتا)ش خۆی بەژێر لێفەکەوەکرد، گڵۆپی کوژاندەوەو ئامادەبوو بخەوێت.

- دەتوانم کەمێك قسەت لەگەڵدا بکەم؟
- بڵێ کورەکەم .. دەتەوێت گڵۆپەکە داگیرسێنم؟
- نەخێر! واباشترە لەتاریکیدا بدوێین. ئایا (نەسرەت) عارفە؟
- بێگومان، چونکە دەروێشە. بۆ ئەو پرسیارە دەکەیت؟
- چونکە وتی کاردەکات، کارەکەی چییە؟
- (نەسرەت) ئەنـدامی لیژنـەی بـاڵای پەناهەندەکانـە، کـە سـەنتەرەکەی لـە(جنێـف)ـە. ئـەو لیژنەیە بەشێکە لەرێکخراوی نەتەوە یـەکگرتوەکان، کـە گرنگـی بەپرسـی پەناهەنـدەیی دەدات لەسەرانسەری جیهاندا.
- راستە. بەڵام لە (ئەستانبوڵ) چیدەکات؟
- کاتێك مۆڵەت بێـت بـۆ دیـداری شـێخەکەی دێتـە ئەسـتانبول، بـەڵام هەمیـشە موبایلەکـەی لەجانتا دەستییەکەیدایە... لەکاتەکانی دیکەدا هەمیشە بەئەرکداری دەڕوات.

---

[1] . عارف: ناسێنەر، دانا، بەسەبرو ئارام، خوپێگر ـەکیـ ـی خودایی، خواناس، بەوتەزای ئەهلی عیرفان (عارف) کەسێکە خـوا بەپلـەی گـەواهی ئاسمـانو ئاوەکـانو سـیفاتەکانی خـۆی گەیانـدبێت. هـەروەها وتـراوە کـە (عـارف) کەسـێکە خواپەرسـتی راستەقینە لەبەرئەوە دەکات، کە بەشایانی پەرستنی دەزانێت، نەك لەروی هیواو چاکە دانەوەیان ترسو سزاوە. (ف. عمید).

- (تیۆ) بیریکردەوەو گوتی: کەواتە دەبێت دەروێشیش بیت‌و کاریش بکەیت. وامەزانی دەبێت خۆت لەدنیا دابڕیت.

لەئیسلامدا بەوجۆرەنییە. ئامادەبون لەکۆمەڵی باوەڕدارانـدا (ئومەت) هەرگیز جیابونەوەو گۆشەگیری لەخۆناگرێت. وەك بینیت باشترین نوێژ نوێژی بەکۆمەڵە (جەماعەت). ئاینەکانی دیکە لەنێوان ئەو کەسانەی (لەجیهاندان)و ئەوانەی لێی گۆشەگیربون نزا دابەشدەکات. هەندێك لەڕاهیبە کریستیانەکان دەخزێنە گۆشەیەکی دێرەکانەوەو قسەو رەفتار لەخۆیان قەدەغە دەکەن. ئەوە لەهەندێ سیستمی ژنانی کریستیانیدا هەیەو ئەو راهیبە ژنانەی لەو تاقمەدا گۆشەگیریان هەڵبژاردوە پێیان باشە بە (خوشکانی ئاینی) ناویان ببرێت. هەرچۆنێك بێت لەنەریتی کریستیانیدا ئەم راهیبە ژن‌و پیاوانە جگە لەنزاو دوعاکردن هیچ کارێکی دیکە ناکەن‌و بەوانە دەوترێت (تەرکی دونیایان کردوە).

- (تیۆ) وتی: خەڵکی سودبەخش نین، کارکردن بەخەڵکی دیکە بسپێرن.

- خۆیان باوەڕیان وانییە!. لەو باوەڕەدان هەرکەسەو لەبەرامبەر خودادا ئەرکێکی هەیەو کارێك ئەنجامدەدات. بۆ نمونە، لەهندییەکان بڕوانە: کاتێك منالێ پێگەیشت ماڵی هەیە ماڵ بەجێبێڵێت‌و بچێتە ریزی (ئەوانە چاویان لەدونیا پۆشیوە)و سەرگەردانی شەقامەکان ببێت. (بودا)ییەکان دێری خۆیان هەیەو (تایۆیست)ـەکانیش، بەڵام ئارەزوی خەڵوەت‌و گۆشەنشینی (نەسرەت) جیاوازەو دوو جۆر کاری هەیە. لێرە لە(ئەستانبوڵ) بۆ بەرزڕاگرتنی خواوەند دەسوڕێت‌و لەجێگایەکی دیکە ژنێکی موسڵمانەو مێردی هەیەو کاردەکات.

- هاوسەرەکەی کاری چییە؟

- پیشەگەرێکی سویسرییە. لاوێکی چاکەو رێگری لەهاوسەرەکەی ناکات. کاتێك (نەسرەت) دێتە ئێرە بۆ بینینی مامۆستاکەی هەرگیز ئەو لەگەڵیدا نایەت.

- پێمبڵێ ئەو پیاوە ئیرەیی نییە؟

- هاوسەرەکەی دەناسێت. دەتوانی (نەسرەت) بەژنێکی پەیمانشکێن وێنا بکەیت؟ مەحاڵە! گومانم هەیە لەڕێگای پەیوەندیگرتن لەگەڵ خودادا هاوسەرەکەی فریودەدات. لەکاتی چونە دەرەوەی لەتەکیە چاوەکانیت بینی؟

- کەواتە ئەگەر بەوجۆرە بێت دەتوانیت ملیۆنەها هاوسەری زۆر بەبڕواو خواپەرست بخەیتە ریزی ئەو ژنانەوە، کە هاوسەرەکانیان فریو دەدەن. دیارە تۆ ئەوانەت پێباشترە کە (تەرکی دونیایان کردوە)!

- (تیۆ) دانیپێدانا: بەڵێ، بەلایەنی کەمەوە ئەوانە لەگەڵ خوای خۆیان پەیمانی هاوسەریان بەستوە. ئەی من، ئایا منیش عیرفانیم؟

تۆ... تۆ بونەوەرێکی سەیریت. هەندێجار دەبینم نغرۆی جیهانی خەونەکان دەبیت. ئێستا دەمەوێت بزانم باری تەندروستیت ئاساییە؟

- خۆت بیزانە... بەراستی گرنگترین شتم پێنەوتیت! جمکەکەم کچێکە.

- پورە (مارتا) لەسەر جێگاکەی راست بووەوەو گوتی: چۆن دەزانیت؟!.

- (تیۆ) بەئارامی وتی: چەند ساتێك پێش ئێستا تێگەیشتم. دەبێت ناوەکەی لەدایکم بپرسم. بەبڕوای من دایکم شتێکی لەمن حەشارداوە. تۆش بڕوات وانییە؟ لەوانەیە ئامۆزایەك یان پورزایەکی مردوو بێت؟

- پورە (مارتا)، کەپژمەی گرتبوو، گوتی: بەراستت نییە! ئەوە... بەهۆی نەخۆشییەکەتەوەیە.

(تیۆ) وتی: هیچ بیر لەوە ناکەمەوە. هەرچۆنێك بێت لەدایکم دەپرسم.

- پورە (مارتا) بەهانەی هێنایەوە، کە دەیەوێت بخەوێت، درۆی دەکرد. (تیۆ) هەوڵیدا درێژە بەگفتوگۆکە بدات، بەڵام پورێ گیان خۆی وا پیشاندا پرخەپرخێتی.

## ئاشکرابونی نهێنی

- رۆژی دوایی (نەسرەت) پەیامێکی بەتەلەفۆن لەپزیشکە زۆر بلێکەیەوە وەرگرت، ئەنجامی تاقیگەکە سەرسوڕهێنەرو سەیربوو. نەخۆشییەکە بەشێوەیەکی سەیر پاشەکشەی کردبوو... (نەسرەت) بەبێ گوێدانە نەریتی ئاینی (تیۆ)ی ماچکردو بۆ سازکردنی جەژن بەبۆنەی ئەو هەواڵە خۆشەوە بەرەو موبەق رایکرد.

- (تیۆ) وتی: وەك دەبینیت من راستمدەکرد، هەر لەبەر ئەوەشبوو (تریشقەی پیرۆز) هێندە بەخۆشییەوە هاتە خەونم! ئەو کاغەزەی لەخەونمدابوو هەمان ئەم ئەنجامی تاقیگەیەبوو.

- پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: باشە. بەراستی دەست لەم بابەتە بەردەو تەلەفون بۆ دایکت بکە!.

- لەتەلەفونەکەدا (تیۆ) بەدەنگی بەرزەوە کەوتە قسەکردن، بەڵام پاش ماوەیەك دەنگی نزمکردەوە، چونکە دیاربوو (میلینا) کەوتۆتە گریان. لەپڕ پورە (مارتا) گوێ قوڵاغ بوو. (تیۆ) دەیپرسی: باشە، وەڵامم دەدەیتەوە؟ ئۆو، کەواتە تۆ دەیناسیت؟ کێیە؟ جمکە خوشکەکەم؟

ئـەوە دەزانم، سـوپاس... جمکێکـی راسـتەقینە؟ مەبەسـتت چـییە؟ دەتـەوێت بڵێـی چـی؟ پەلەمەکە... دوبارەی بکـەرەوە... ئـاخ... زۆرباشـە. نـەخێر، هـیچ گـرنگ نییـە. بۆچـی تائێـستا شاردبوتەوە؟ دایکە بەدبەختەکەی من. نەخێر، تورەنیم. نەخێر، هەڵەی تۆ نییە، بەسە! هـیچ کارێکی خراپـت نـەکردوە!. دەتوانیـت دانەیـەکی دیکـەم بـۆ دروسـت بکـەیت! یـەك چـی دیکـە؟ خوشکێکی بچکۆلە، سەیرە... ئەم بیرۆکەیە...

- کاتێـك تەلەفونەکـەی داخـستەوە تارادەیـەك رەنگـی پـەڕیبوو. لەتەنیـشت پـورە (مارتـا)وە رۆنیشت خۆی خزاندە ئامێزییەوەو گوتی: کـچە جمکەکـەی مـن، لەسـەرەتای لـەدایك بونییـەوە مردوە. هەردوای من. تۆ ئەم بابەتەت دەزانی؟

- پورە (مارتا) دانیپێدانا: نەمـدەزانی کـچ بـوو. باشـە، دواجـار راسـتییەکەی لـەلات درکانـد؟ زۆرباشە. ئێستا دەزانیت بۆچی لەناختدا هەڵگری جمکێکیت.

- بـەڵام ئەگـەر لەگـەڵ منـدا بـدوێت نابێـت مردبێـت، باشـە... مەبەسـتم ئەوەیـە بەتـەواوی نەمردبێت.

- وەك ئەوەی زۆر لەلات سەیرنەبوو.

هێنـدەش گەمـژەنیم. تـەنها دەمـەوێت بـزانم شـێوەی کارچۆنە، چـۆن مردوەکـان دەتـوانن لەجەستەی مرۆڤدا لانە بکەن؟

پورە (مارتا) وتی: لەئەفریقا ئەو دیاردەیە لەهەموو شوێنێك زیاتر دەبینرێت. دوور نییـە راستی لای ئەوان نەبێت.

(تیۆ) بەنیگەرانییەوە وتـی: لـەو باوەڕەدایـت بەدرێـژایی تەمـەنم هـاوەڵم بێـت؟ لـەوبارەدا دەبێتە هۆی سەغڵەت بون!

- پورە (مارتا) وتی: کاتێك چارەسەرکرایت ئـەویش دەڕوات. مـەرج دەکـەم بـۆ یارمەتیـدانت هاتبێت.

- لەوانەیە. دوێنێ شەو، وەك ئەوەی ئەنجامی تاقیگە بزانێت گەلەك نارام بوو!.

- پـورە (مارتـا) قـسەکەی پێـبڕیو گـوتی: کـوڕم، بەسـە خـەونو خـەیاڵ! پێویـست ناکـات لەقەڵەمڕەوی مردوەکاندا گەشتوگوزار بکەیت. بۆ شوێنی دورت دەبەن!

ئاهـ ! تائێستا زۆر وڵاتم بینیوە. دەبینـم لەهـەموو شـوێنێك سـەروکاریان لەگـەڵ مردوانـدا هەیە جگە لەوڵاتی خۆمـان. (تیـانۆ)ی دایـە گـەورە هەمیـشە سـەردانی گۆڕسـتان دەکـات. ئێمـە هەرگیز. ئەگەر ئەو کارەی ئێمە دەیکەین باش نەبێت ئینجا چی؟

پورە (مارتا) پێکەنیو گوتی: هەتا ئەفریقا ئارام بگرە. لەوێ هەرگیز ئەوە بەکارێکی ڕاست نازانن.

کەئەنجامی تاقیکردنەوەکان لە (ئەستانبوڵ) شۆڕشێکی بەرپانەکردبوو، بەپێچەوانەوە لەپاریس لەگەڕەکی (ئابەگرگور) ڕوداوەکە لایەنێکی دیکەی بەخۆوە گرتبوو. (ژروم)ی باوکی (تیۆ) دوای ساتێك تەلەفونی کردو پێداگری کرد بەوردی ئەنجامی تاقیگەی بۆ بخوێننەوە. گومانی لەئەنجامەکان کردو سەرەڕای توڕەبونی داوای لە(تیۆ) کرد تاقیکردنەوەکە دووبارەبکاتەوە، بەڵام چونکە (تیۆ) هێندە باسی ئەزمونی خوێنگرتنەکەی لەگەڵ پزیشکە چەنەبازەکەو ئەو دەردو ئازارەی چەشتبوی بەدەستییەوە گێڕایەوە باوکی ڕازیبوو دووبارەی نەکاتەوە. لەکاتی فراویندا خوشکەکانی (تیۆ) تەلەفونیان کردو پێخۆشحاڵی خۆیان دەربڕی. پاش سەردانی کۆشکە بەناوبانگەکانی سوڵتانەکانی عوسمانییەکان نۆرەی (فاتۆ) بوو تەلەفۆن بکات، هیچی پێنەبوو بۆ وتن، بەڵام بەشادییەوە دەخەنییەوە.

- (تیۆ) وتی: چیان بەسەرهاتوە؟ شێتبون؟
- پورە (مارتا) وتی: با تێبگەین. ئەو کچانە بیروڕای ئاینییان نییە.
- جگە لە (فاتۆ)! کە نزاکانی هەمیشە لەگەڵمدایە.
- (نەسرەت) وتی: نزاکردن دروستە، تەلیسمو قورئانێك لەگەردنتا دەبینم. بەڵام ئەوانە پەیوەندییان بەیەکەوە نییە؛ (تیۆ) ئیسلام پارێزەرو چاودێری تۆیە!.

ڕۆژەکانی دیکەی هەفتەیان بەپیاسەو گەڕان بەسەربرد. (نەسرەت) میوانەکانی خۆی بۆ نزرگەی (ئەیوبی ئەنساری) برد، کەلەوێش وەك گۆڕی (نیزامەدین) باوەڕداران ڕوخسارییان بەگۆڕەکەوە لکاندبوو نزایان دەکرد. کۆترەکان خەریکی خواردنی ئەو دانەوێڵەیە بون، کە گەشتیاران بۆیان ڕۆدەکردن. (تیۆ) تابلۆیەکی گەورەی کڕی، کە لەسەر تەختێکی ڕەش بەهێلێکی ئاڵتونی وشەی (الله) نوسرابوو: بەلەمێکیان بەکرێ گرت بۆ پیاسەکردن لەسەر کەناری (بسفوڕ). لەکەنارەکە خانوی کۆنی تایبەت بەرابواردن بەباڵەکۆنەکانیانەوە ڕیزببون، کە بەسەر ئاوەکەدا دەیانڕوانی. گۆڕستانەکان دیمەنێکی شاعیرانەیان هەبوو. مزگەوتەکان بانگی باوەڕدارانیان بۆ نوێژ دەکردو خواردنی ماسیی پرتام و چێژ بوو.

- (ژروم)ی باوکی (تیۆ) پاش گفتوگۆیەکی دوورودرێژی تەلەفونی لەگەڵ پزیشکە چەنەبازەکە دواجار ئارام بۆوەو تاڕادەیەك باوەڕی بەوەهێنا. چونکە (تیۆ) چارەسەرکراوە

دەبێت درێژە بەگەشتەکەی نەدات. پورە (مارتا) بەردەقییەوە ئاگاداریکرد، کەئەگەر راستەوخۆ بۆ (پاریس) بگەڕێینەوە (تیۆ) دوبارە نەخۆشییەکەی لێهەڵدەداتەوە.

## مشتومڕ سەبارەت بەئیسلامی رەش

پاش چەند رۆژێك پورە (مارتا) رایگەیاند بۆ ئەفریقای رەش دەچن.

(نەسرەت) وتی: مەبەستان ئەفریقای ئیسلامییە. (سنیگاڵ) وڵاتێکی موسڵمانە.

- پورە (مارتا) قسەکەی بۆ راست کردەوە: کۆنترین دیموکراسی ئەفریقا. بەتەواویش نـ ئاینییە.

(نەسرەت) وتی: بەڵام هەموو هاوڵاتیانی موسڵمانن.

- پورە (مارتا) وتی: نەخێر، تۆ کریستیانیو (ئانیمیست)ـەکان پشتگوێ دەخەیت.

- پەسەندی دەکەم، بەڵام زۆرینەی سنیگاڵییەکان نەك تەنیا موسڵمانن، بەڵکو سۆفیشن.

- (تیۆ) هاواریکرد: دوبارە سۆفی ئەفریقی؟!

- (نەسرەت) وتی: بەڵێ.

- پورە (مارتا) هاواریکرد: نەخێر.

- لەنێوان دوو هاوڕێکە مشتومڕێکی توند دروستبوو. (نەسرەت) دەیوت، کە موسڵمانەکانی (سنیگاڵ) سۆفی راستەقینەن، بەڵام پورە (مارتا) پێداگری دەکرد، کە تەنیا بەناو سۆفین- (نەسرەت) جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە شێخەکانی (سنیگاڵ) خاوەنی نەریتی عیشقی خوداینو پورە (مارتا)ش وەڵامیدەدایەوە، کە ئەوانە پەیڕەوی کردنو بەڕێوەبردنی موریدەکانیان لەبری عیشقی خودایی داناوە. لەهەردوولاوە دەنگ هەڵبڕا.

(تیۆ) هاواریکرد: هێی، کچینە، بەسە! هێندە ئەقڵم هەیە راستو چەپی خۆم بناسم؛ بێدەنگ بن، ئەگینا...

هەردوو خاتونەکە بێدەنگبونو بەبێ جوڵە بۆ یەکتریان روانی.

- (تیۆ) بەسەرزەنشت کردنەوە وتی: پێویست ناکات لەدوایین شەوی (ئەستانبوڵ) دوچاری دەمارگیری ئاینی ببین!

- گەردەلولەکە نیشتەوەو (نەسرەت) بەپێی پەتی بەردو پورە (مارتا) رۆشتو لەئامێزی گرتو داوای لیبوردنی کرد.

که دەستی بەرەو (تیۆ) درێژکرد وتی: جێگاتان دیار دەبێت. هەرسێکمان رۆژی خۆشمان بەسەربرد.

دەرچون لە (ئەستانبوڵ)یش وەك جێگاکانی دیکەبوو: دەستراوەشاندن لەفرۆکەخانەوە تا لەژێر باڵی فرۆکەدا بزر دەبوو. پورە (مارتا) بۆ یەکەمجار دڵۆپە فرمێسکی لەسەر چاوی سڕی. (تیۆ)ش بۆ دواجار چاوی لەئاوی (مەرمەڕە) بڕی.

## بایەمی خاکی[1]و خواپەرستی

- لەفرۆکەخانەی (داکار)، کە (تیۆ) لەپلیکانەی فرۆکەکە دابەزی، هەوایەکی گەرم خۆی بەڕویدادا. پورە (مارتا) ئاگاداری کردەوە: کڵاوەکە لەسەربکە، لێرە وەك (میسر) تیشکی خۆر بەتینە... پێهەڵگرە... دەبێت لەکاتی دیاریکراودا بگەین.

- (تیۆ) پرسی: پیاوە یان ژنە؟

- پیاوە. کەسێکە باشی دەناسیت.

- غافلگیربونێکی خۆشبوو. ئەو پیاوەی چاوەڕوانیان بوو، جگە لەبەڕێز (عەبدوڵڵایە دیوپ)ی باوکی (فاتۆ) کەسی دیکە نەبوو، کە سەرەڕای گەرماکە بەچاکەت و بۆینباخەوە چاوەڕێ بوو.

- لەکاتێکدا (تیۆ)ی وەك پەڕ بەرزکردەوە وتی: تەندروستیت باشە، دایکت و باوکت رایانسپاردوم باش ئاگاداریت بکەم. ئەی تۆ (مارتا) تەندروستیت باشە؟

- زۆر باشم، سوپاس. خێزانەکەت چۆنن؟

- (دیوپ) بەپێکەنینەوە وتی: هەموان باشن. باجانتاکانتان وەرگرینەوە بۆ ماڵی خۆمان دەچین. هەموان چاوەنواڕی ئێوەن.

- لەسەر شەقامەکانی (دکار) پیاوان بەکراسی تایبەتی و ژنانیش بەپۆشاکی درێژ و عەمامەی تایبەتەوە لەهاتوچۆدابون. چەند ژنێك لەسەر شۆستە دانیشتبون و لەناو مەنجەڵی تایبەتدا بایەمی خاکیان دەبرژاند و فرۆشیارە دەستگێڕەکانیش سەتڵی ئاودێری پلاستیکی، پێڵاوی بریقەدار، زەرف شێو، مێشکوژ و شقارتەیان دەفرۆشت. لەهەرچوار رێیەکدا منداڵێك بەڕوخسارێکی پاڕانەوەوە مژۆڵی سواڵکردن بون. بەڕێز (دیوب) ئاوڕیدایەوە.

---

[1]. بایەمی خاکی: گیایەکی یەکساڵەیە، باڵای نیو مەتر بەرزە. بەرهەمەکەی بەرگێکی ناسکی هەیە دوو یان سێ ناوکی تێدایەو تامی بەتامی ناوکی فندق دەچوێت و نیوەی چەورییەو بەچیتامینی (A و B و D) دەوڵەمەندە. بەبەستەی چیایی؛ خاکی، شامیش ناودەبرێت.

- پورە (مارتا) وتی: (تیۆ) بڕوانە، بەو سواڵکەرە بچوکانە دەڵێن (تەلەبە Talibes).

- (عەبدوڵلایە دیوب) وتی: واتە (خوێندکار)

- بەڵێ، وەك وشەی (تالیبان Taliban) لەئەفغانستان. هەڵبەتە مەبەست ئەوەنییە ئەم منالانە بەسواڵکردن بیانەوێت بخوێنن.

- (عەبدوڵلایە دیوب) هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: نەخێر، بەهیچ جۆرێك وانییە، بەلام بەتۆ دەڵێم، کە نەریتی کۆمەلگەی سۆڤی ئێمە تەنها لەچەند منالێکی سەرگەردانی سەرشەقامەکاندا کورت نابێتەوە.

- (تیۆ) بەحەزی زانینەوە چوەناو گفتوگۆکەو گوتی: سەیرە، لە(ئەستانبوڵ)یش پورە (مارتا)و هاوڕێکەی هەمان گفتوگۆیان کرد.

(عەبدوڵلایە) دەتوانیت بابەتەکەم بۆ رونبکەیتەوە؟

هەڵبەتە بەگشتی چوار (کۆمەڵی برایان)[٢]ی سۆڤی هەن، کە (سینگاڵ)یان لەنێو خۆیاندا دابەشکردوە.

- (کۆمەڵی برایان)؟ راستە لەتەلەفزیۆندا یەکێکیانم بینیوە. کەسانێکن خۆیان بەپۆشاکی سەدەکانی ناوەڕاست دەڕازێننەوەو شەراب دەنۆشن. هێندە سەرنجڕاکێش نییەو دواکەوتوو دەردەکەوێت!.

- (عەبدوڵلایە) وتی: (تیۆ) راست دەکات. دواکەوتوو بوو، چونکە هەر وەك لەناوەکەیەوە دەردەکەوێت (کۆمەڵی برایانە) کۆمەڵێك پێکدێنێت بڕوایان بەباوەڕو ئیمانێکی هاوبەشەو ئەگەر لەکۆتایشدا بتوانێت لەڕێگای شەرابی فەرەنسیەوە بۆ بەرزڕاگرتنی ئاین هاوبەشبن، بەلام ئاینو باوەڕی ئیسلام لەڕێکخراوێکی زۆر راستەقینەتردا باوەڕداره جیاوازەکانی جیهان لەکۆمەڵێکی برایانەدا کۆدەکاتەوە. لەناوچە موسڵمان نشینەکانی ئەفریقادا کۆمەڵی برایانە هەبوو، کە هەریەکەیان ژمارەیکی زۆر موریدیان لەدەوری مامۆستایەکی گەورە کۆدەکردەوە. (سنیگاڵ) یەکێك لەو ولاتانەبوو، کە ئیسلامی سۆفیگەری گەلێك گەلی لەبازنەی خۆیدا یەکخستبوو، کەدەکرێت لەناویاندا ناوی (پولەکان، تۆکیو لەرەکان، لیبۆکان، ماندینگۆکان، ولۆفەکان) ببرێت، کە لەخەلکێکی زۆری پەیڕەوانو باوەڕداران پێکهاتبون.

---

[٢]. ئەم دەستەواژەیە لەفەرەنسا بە (Confreries) ناودەبرێت. سروتێکە لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە ماوەتەوە. ئەندامەکانی بەپۆشاکو نەریتی تایبەتەوە سروتەکە سازدەکەن. لەفەرەنسای ئەمڕۆدا کۆمەڵی برایەتی بەتایبەتی لەبواری ئامادەکردنی شەرابدا چالاکن.

کۆنترین گروپ کۆمەڵی (قەدیرییە)بون، کە راستەوخۆ لە (بەغداد) لەقوتابخانەیەکی سۆفیزمی سەدەی دوانزەوە هەڵقولابون. دووەم کۆمەڵی زۆر ناودارو بەرێزی (تیجیان)ەکان بون، کە بەهۆی شێخێکەوە لەکەناری ئەفریقا لە(مەغریب - مەراکیش)ەوە بلاوبونەوە. ئەو شێخە رابەرە لە(جەزائیر) لەدایکبوەو لەسەدەی هەژدەدا لەشاری (فاس)ی (مەراکیش) مردوە. لەسەدەی بیستدا گەورەترین مامۆستای رۆحی کۆمەڵی برایانی (تیجیان)ەکان (تنیرۆ بۆکار)بوو، کە خەڵکی (مالی)و ناسراو بە(دانیاری باندی یاگارا)و خاوەن هزرێکی رۆشنو دردوشاودبوو. سێیەمین کۆمەڵی برایانی (سنیگاڵ) کۆمەڵی (لاین)ەکانە، کە پەیڕەوی لەپەیامبەرێکی نوێی ئەفریقی دەکەن بەناوی (سیدینالایە)، کە لەوبڕوایەدان خواوەند لەسەدەی نۆزدەدا بۆ نەژادی رەشپێستانی ناردوە. بەلام دواین گروپ، کە ئەمەیان شتێکی دیکەیە! قەرزارباری ئەفریقییەکی نائاساییە بەناوی (ئەحمەدو بامبا)، کە دامەزرێنەری کۆمەڵی موریدانەو موریدیش بەواتای (خۆبەخشی ئاین) دێت.

- پورە (مارتا) کەوتە نارِدزایی دەربرِینو گوتی: دیارە چوار خەلیفەی بەرێزی ئەو چوار کۆمەڵەیەی باسکران هەمویان خاوەنی دەسەلاتێکی بەرچاوبونو مایەی رێزی دەسەلاتی دیموکراسی ولاتن، بەلام هەرچەندە ناکرێت لایەنی رۆحانی تاکێتییان نادیدە بگیرێت ئەو رێنوێنیو رابەرایەتی موریدەکانو ئەو دیسپلینەی بەسەریاندا دەسەپێنرا هەمیشە یەك چۆنایەتی نەبوو، هەروەها رایگەیاند نابێت فەرامۆش بکرێت، کە دامەزرێنەری کۆمەڵەکە یەکێك بووە لەو کەسانەی دژ بە(فەرەنسا)ی کۆلۆنیالزی راپەرِیودو دەوڵەتی (فەرەنسا)ش بەهۆکاری سیاسی بۆ (گابۆن)ی دورخستەوە. بەگومانی پورە (مارتا)، ئەوە شتێکی سەرەکیو بنچینەیی بوو.

- (عەبدوللایە) رایگەیاند، کە ئەو دیدە دروست نییە، چونکە شێخ (ئەحمەدوبامبا) لەبیری دژایەتیکردنی دەسەلاتی کۆلۆنیالیزمدا نەبوو. مامۆستای گەورە تەنها یەك ئامانجی هەبوو، ئەویش بەرزراگرتنی ئیمانی موریدەکان بوو. لەسەرەمەرگدا باوکی، کە پیاوێکی گەلەك باوەردارو چاکەکار بوو، رابەرایەتیکردنی برا موسڵمانەکانی بەئەو سپاردوەو بەپێی وەسیەتی باوکی لەکۆمەڵەیەکی زۆر کۆنی (قەدیرییە)دا زانستی ئیلاهی خوێندوەو بووە بەپیاوێکی روحانی، بەلام هەر لەو سەرەتایەشدا لەبیری رەوشتو تێرامانو خەڵوەتگەریدا بوو. لەدارستانەکاندا بزردەبوو، لێکدانەوەی ئەنجامدەداو شوێنگەیەکی پیرۆز چاوەنوارِی بوو. رۆژێك بەهۆی روناکییەکی سەیرەوە کەوتۆتە رێو لەژێر سایەی درەختێکی (بایۆباب)دا

وەستاوە، لەو شوێنەدا تیشکەکە نەماوە. لەژێر سایەی درەختەکەدا تێگەیشت، کە گەیشتۆتە سەنتەری رۆحی. هەرلەوێدا بوو (سروش)ی بۆهاتە خوارەوەو لەخۆشیاندا کەوتە پێکەنین. قاقاکەشی هێندە زوڵاڵ بوو جوتیاران بەدوری سێ کیلۆمەتر گوێیان لێبووە. لەهەمان رۆژیشدا منالێکی بوو، کەناونرا (موحەمەد).

پورە (مارتا) وتی: هەموو ئەو شتانەی وتت سەرنجراکێشە، بەلام هیچ کەسێکیش ناتوانێ نکوڵی لەبونی (مارابۆ) کەلەکچییەکان بکات، کە لەهەموو شوێنێکی (دکار)دا دەسورێنەوە. هەروەها وتی، کە رۆژێکیان یەکێك لەو (مارابۆ)یانەی بینیوە، کەلەکۆتایی کۆلانێکدا دەرکەوتوەو رێبواران هەر کەبینیویانە گەورەییان بۆ نواندوە. (مارابۆ) لەگەڵ کۆبونەوەی خەڵکدا وتارێکی سەیری بۆ داونو رونیکردۆتەوە، کە پێویستی بەدراو نییە، چونکە بەرادەیەکی باش دەوڵەمەندە، کە بتوانێت سێ ژن لەماڵەوە بەخێو بکاتو تەنها مەبەستێتی یارمەتی خەڵك بدات.

زۆرباشە، پیاوێکی بەرێزبوە.

- پورە (مارتا) درێژەیپێدا: بەڵێ، (مارابۆ) دەیویست هەشت کەس لەناو خەڵکەکە هەڵبژێرێتو ئینجا بانگیان بکاتە لای خۆیو لەهەریەکە پێنج سەد (فرانك)ی ئەفریقی وەرگرێت تابەقامکی دەستو پێ بەرەکەتیان بەسەردا ببارێنێت. ئەو هەشت کەسە دراوەکە دەدەن، بەلام چونکە (مارابۆ) تێدەگات هاورێکەی پورە (مارتا) لەفێڵەکەی گەیشتوە دەڵێت: (بۆ تۆ نزایەکی تایبەتی دەکەم). لەبەرئەوە دەیباتە پەنایەکەوەو دوو هەزار فرانکی پێدەدات تابێدەنگبونی بکرێت.

- (عەبدوڵلایە) شانەکانی هەڵتەکاندو گوتی سەرگوریشتەی لەوجۆرە زۆر دەزانێت!. هەڵبەتە خەڵکی فێڵبازو تەڵەکەچی زۆرن، بەلام کەس ناتوانێت لەگەڵ (مارابۆ)کانی کۆمەڵەی برایان تێکەلاویان بکات. (مارابۆ) راستە قینەکان خاوەنی شەرەفو متمانەیەکی بالانو تەنها یەك ئاستی بالا بەفەرمی دەناسن، کە هەمان خەلیفەکەی خۆیانە. ئەو (مارابۆ)یانە هیچ کارێکی فریو دەرانە ناکەن. موریدەکانیان بەرێوەدەبەن، چاودێری پەروەردەو فێرکردنیان دەکەن، ئەو دراوەشی موریدەکان دەیدەن بۆ سودی کۆمەڵەکە بەکاری دەهێنن. هیچ تاکێکی (سەنیگاڵ)ی ناتوانێت گومان لەرەسەنایەتی (مارابۆ)یەکی راستەقینە بکات. خۆئەگەر خەڵکی ساویلکەو خۆشباوەر پەیدا نەبن، کە خاوەنی باوەرێکی پتەونین، ئەوە خوا بەحاڵیان!.

(تیۆ)، کە هێندە ئارەزوی لەو گفتوگۆیە نەبوو، لەپڕ سەرنجی لەئاهەنگی ئەفسونئامێزی (تام تام)دا، کە بەتەپڵ لەگۆشەیەکی شەقامەکەدا سازکرابوو؛ بەدەم تریقانەوەوە بۆپێشەوە دەڕۆیشتن. کەسانی ئەو گروپە بەجلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ، گەردنبەندی چەرم و قژی ئاڵۆزکاو و گۆپاڵ بەدەستەوە بەدەستێك لەدەهۆڵیان دەداو بەدەستەکەی دیکەیان کولەکەی کولاویان هەلگرتبوو، وەك گومڕا هەڵبەزو دابەزیان بوو، جموجوڵی سەیریان دەکرد.

(تیۆ) وتی: جوانە، ئۆرکسترای مۆزیکە؟

- (عەبدوڵلایە دیوب) وتی: ئاه، نەخێر... ئەوانە (بای فاڵ)ن و ئەندامی لقێکی کۆمەڵی (موریدان)ن، کەتاڕادەیەك خاوەنی تایبەتمەندی سەیرن. هەموو ئەوانە بەگشتی موریدی شێخ (ئەحمەدو بامبا)ن.

- پورە (مارتا) توڕەبوو گوتی: بۆچی ڕاست ناڵێیت. ئایا (بای فاڵ)ەکان زیاتر وەك چەکداری ئاینی نین، کە بەرگری لەجوتیاران دەکەن بەرامبەر بەسوخۆرەکان؟

(عەبدوڵلایە دیوب) بەئارامییەوە وتی: پرسی (بای فاڵ)ەکان زۆر لەوە ئاڵۆزترە، کە پورە (مارتا) وێنای دەکات. واتە شازادەیەك بەناوی (ئیبرا فاڵ) ناوبانگی چاکەی عارفێکی گەورەی وەك هەمان (شێخ ئەحمەدو بامبا) دەبیستێت، کە لەشوێنێکی خاکی (سنیگاڵ)دایەو نۆ ساڵ بۆ گەڕان بەدوایدا بەسەردەبات. بەڵام لەو گەڕانەدا (ئایبرافاڵ)، کە پاڵەوانێکی بەهێزو یارمەتیدەر بوو، دەستدەداتە ئاو گواستنەوە بۆ ژنان و داربڕین و شکاندنی دارو بەتەنیا کاری هەفتەیەکی کۆمەڵەکە ئەنجام دەدات و ڕۆژی دواتر دەستدەداتەوە گەڕان. سەرئەنجام پاش ئەو ساڵانە سەرگەردانی و پڕکارکردنە لە شوێنێکی شاری پیرۆزی موریدەکان بەناوی (توبا) شێخ دەبینێت. شێخ (ئەحمەدو بامبا) لەسەر بنچینەی وشەیەك (فۆلۆف)، کە بەواتای (گەڕانەوە بۆ لای خوا) دێت، بڕیار دەدات ئەو شوێنە ناوبنرێت (توبا). ئینجا (ئایبرافاڵ) پاشئەوەی بەسەرپێی ئەو شێخەدا دەکەوێت، کە ساڵەهایە وێڵێتی، سەروکار بەدەستەوە دەگرێت، پاسەوانی شێخ دەکات و ئەوانەی لێدوردەخاتەوە کەسەغڵەتی دەکەن. سیستمێك بەرقەرار دەکات و مۆڵەت لە(شێخ ئەحمەدو بامبا) وەردەگرێت تاسروتێکی تایبەت سازبکات. بەو پێیەی هەموو کەس بتوانێت بەرامبەر ئەنجامی کارەکەی لەنوێژ و خواپەرستی ببەخشرێت. (ئایبرافاڵ) بەخێرایی قوتابی و مورید پەیدا دەکات، کە بە (پەیامبەر) ناویدەبەن. بەوجۆرە ئاینی (کار) خێراییەکی سەرسوڕهێنەر بەدەست دێنێت. پەیڕەوان لەبەرامبەر ئەنجامدانی کارەکانیاندا لەخواپەرستی ئەبەخشرێن، بەرامبەر بەو لادانە دەبوو گەدایی بۆ پارچە پارچەی

پۆشاکەکانیان بکەن‌و لەو پارچانەش جبەی سۆفێتی خۆیان بدورن. ئەندامانی گروپ بەویەڕی فیداکاری‌و پەرۆشییەوە تائەوپەڕی رادە کاری گرانیان ئەنجام دەداو تایبەتمەندییەکی دیکەشیان هەبوو، کە لەنێو موریدەکاندا تەنها (بای فاڵ)ـەکان دەیانتوانی لەسەر بنەماو بنچینەی دابونەریتی کۆنی ولأت ئاهەنگی (بام - بام) بەسەماو گۆرانییەوە بگێرن. (بای فاڵ)ـەکان شەوانە لەناوخۆیاندا بەبازنەیی دەچونە جیهانی زکرو بەهرەکانی سۆفیزمەوە.

- پورە (مارتا) وتی: ئەفسانەیەکی باوەڕدارانە!. لەراستیدا (بای فاڵ)ـەکان رێکخراوێکی سوپایی بون! بەڵام (ئاینی کار) ناوەڕۆك‌و کرۆکی موریدەکانی پێکدەهێناو موریدەکانی (سنیگاڵ) سیستمێکی هۆشیارانەیان پێکهێنابوو. لەلای ئەمانە کارکردن بەواتای خواپەرستی بوو. بەڵێنی موریدەکان لەگەڵ مامۆستاکەیاندا پەیمانێکی سادەبوو. مامۆستا چاکەو ئازادی موریدی دەسەبەردەکرد، بەو مەرجەی مورید بەخۆڕایی کاری بۆ بکات. موریدە بلیمەتەکان کارگەو پێکەوەنانی کۆمپانیایان هەبوو، پەرەیان بەچاندنی بایەمی خاکیدا، کە سامانی بنچینەیی‌و ریشەیی (سینگاڵ)بوو. پاشان رویان کردە کڕینی کۆگاو بەدەستهێنانی بازاڕ. بەکورتی موریدەکان بازرگانانی زۆر دەستبەسەربون. پورە (مارتا) بەم رونکردنەوەیە سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

- (عەبدوڵلایە) بەخاترجەمییەوە وتی: ئەوە دەسەڵاتدارانی کۆلۆنیالیزمی فەرەنسی بون پێش هەموان گرنگی سیستمی ئابوری موریدەکانیان بۆ دەرکەوت‌و موریدەکانیان ناچار بەچاندن‌و هەڵگرتنەوەی بەرهەمی بایەمی خاکی کرد... (شێخ) لەو روەوە رۆڵێکی نەبوو.

- پورە (مارتا) بەتوندی وەڵامیدایەوە: فەرەنسیەکان سودیان لەسیستمی ئەو پیاوە وەرگرت؟ فەرەنسییەکان (شێخ ئەحمەد بامبا)یان دورخستەوە!

بەڵام لەدوایدا گێرایانەوە. تۆ سیاسەتی کۆلۆنیالیزمی‌و رەفتاری عیرفانیانەی شێخێکی کەرامەتدار تێکەڵ دەکەیت. ئەو وەك سۆفی راستەقینە خۆی لەهاوکاریکردنی دامەزراوەی بەڕێوەبردنی (فەرەنسی) دوردەگرت تا سۆفییەکان خۆیان نەکەنە پاشکۆی پلەدارانی دەوڵەتێکی سیاسی. لەلای ئەوانە سوڵتانەکان، پاشا، ئیمپراتۆر، بەڕێوەبەرو سەرۆك گرنگییەکی ئەوتۆیان نەبوو. (شێخ ئەحمەدو بامبۆ) بۆ هەژاری‌و نەداری هانیدەدان.

- پورە (مارتا) تا رادەیەك بەکینەوە وتی: دەتەوێت کێ بەم ئەفسانانەت رازی بکەیت؟ هۆکەشی ئەوەیە خودی خۆشت لەو موریدانەی.

- (عەبدوڵڵایە دیوب) بەتورڕدییەوە رونیکردەوە: کە بەڵگەو مەدرەکی مێژویی لەوباردیەوە جێگایەك بۆ قسە لەسەرکردن ناهێڵێتەوە. هەروەها سیستمی هاوبەشی موریدو قوتابییەکانیش رۆشنە. لەلای ئەو پەروەردە لەپێش هەموو شتێکەوە بوو. شێخ بەپەروەردەو فێرکاری دیارییەکی گەلەك گرانبەهای بەموریدە دەبەخشیو لەبەرامبەریشدا داوای کاری لێدەکرد، شێخ موریدی لەپێناوی ژیاندا پەروەردە دەکرد. هەرچۆنێك بێت سەرەڕای ئەوەش شێخ لەسەر بنەمایەکی سەرەکی راوەستابوو، واتە هیچ کام لەموریدەکان بەپێچەوانەی ئارەزوویانەوە ناچار بەکارکردنی نەدەکردن. شێخ بەهۆی گروپی براکانی خۆیەوە رێکخستنو پەروەردەیەکی بۆ کۆمەڵگەیەکی پڕ ئاژاوەو توندوتیژیو شەڕوشۆڕ هێنابوو. بەهۆ بەرەکەتی بونی ئەوەوە خەڵکی (سینگاڵ) لەدەوری یەکدی کۆببونەوە، لەکاتێکدا ئیمپریالیزمی فەرەنسی هەموو گەلو خەڵکی (ئەفەریقا)ی پەرێشانو نیگەران دەکرد. خەڵکەکە لەزەوییەکانی خۆیاندا کشتوکاڵیان دەکردو لەگەڵ کۆلۆنیالیزمی (فەرەنسی)دا گەیشتبونە جۆرێك رێکەوتنو وڵاتیان دەوڵەمەندکرد.

- (تیۆ) وتی: هەموو ئەوانە ئابورییەن. لەو نێوەندەدا جێگای ئیسلام لەکوێدایە؟

(عەبدوڵڵایە دیوب) سودی لەشوێنگەکە وەرگرتو لە پورە (مارتا)ی پرسی: ئایا شارەزایی لەشیعرە عارفانەکانی (ئەحمەدو بامبا) هەیە؟ ئایا کتێبەکەی بەناوی (کاروانەکانی بەهەشت) خوێندۆتەوە؟

ئەی هاوڕێ، دەروازەی خەیاڵت بخەسەر پشت
بەڕوی ئاسمانو خاكو بەڕوی ئەستێرەکانیشدا
بەڕوی ئاگرو ئاودا، بەسەر بەردو بەردەڵانییەکاندا،
بەڕوی هەموو شتێکی دیکەدا، وەك بەڕوی شەو، بەڕوی خۆردا، ئینجا بەتۆ دەگات
سەفای دڵو روناکی رۆح.

ئێستا (عەبدوڵڵایە دیوب) سەرکەوتنی بەسەر پورە (مارتا)دا بەدەستهێنابوو.

- پورە (مارتا) بەهێمنی وتی: شیعر وتن دژوار نییە. وەك عارفێك پەلەدەکەیت!

- کەواتە بۆ (توبا)ی شاری پیرۆزی موریدەکان برۆ! لەوێ مزگەوتی مەزنو شکۆدار، گۆرانی پوختی سۆفیانەت گوێ لێدەبێت، کە شیعری بەهرەوەری شێخ ئەحمەدو بامبان.

- (تیۆ) وتی: دەمەوێت یەك شت بزانم، ئایا ئاینێك هەیە پەیڕەوانی خۆی ناچار بەکارکردن نەکات؟

بێدەنگی باڵی کێشا بەسەر ئەو ناوەدا، دوابەدوای ئەو (عەبدوڵلایە دیوب)وتی: بەڵێ، هەموو ئاینەکان بەبێ جیاوازی، هیچ کام لەم ئاینانە لەسەر بنچینەی خوازیاری کارکردن راگیرنین، هەریەکە بەشێوازی خۆی رێگای گەیشتن بەخواوەند دەکێشێت.

- پورە (مارتا) وەلامیدایەوە: نەخێر، هیچ ئاینێکی لەوجۆرە نییە نەگۆڕێت بۆ سیستمێکی وەبەرهێنان. لەمبارەیەوە من هاوڕای (کارڵ مارکس)م، کە وتویەتی: (ئاین ئەفیونی گەلە). خەڵکی بۆ خەو کێش دەکەن تائەژماری کارەکەی لێورگرن.

- (تیۆ) وتی: تا ئێستا باش بەردو پێشەوە رۆیشتوین. پرسیارێکی دیکەم هەیە؟

- دوبارە بێدەنگی زاڵ بوو. پورە (مارتا) وتی: دەکرێت بوترێت، کە (ئەفەریقای رەش) هەرگیز لەژێر نیری ئاینە گەورەکاندا نەسراوەتەوە. کۆمەڵی برایانی (سنیگاڵ) لەئیسلامکردنی گەلی (فۆلۆف)دا بەکۆتا گەیشتوە. پێش سەرهەڵدانی کۆمەلانی برایان تاکە بەهای بونی (فۆلفوەکان) کاری جەستەیی سەر خاك بوو. (شێخ ئەحمەدو بامبا) بەشێوەو شێوازی خۆی ئیسلامی ئەفریقایی کردوە. بەهاکانی (فۆلفوەکان) بەتەواوی لەسیستمی موریدەکان دیارە.

- (عەبدوڵلایە دیوب) وتی: لەگەڵ تۆدا ناکۆکم، (فۆلفوەکان) خاوەنی (کاست – چین)و (کۆیلەکان)بون. بۆ نمونە بڕوانە (شێخ ئەحمەدو بامبا) (زونیدە)ی کچی بە پیاوێك بەخشی پێشتر کۆیلەبوو. کاتێك موریدەکانی نارازیبون بنەمای یەکسانی لەئیسلامی بەیاد هێنانەوە. رۆژی دواتر گروپێك لەئەندامانی چینی نەدارانی بۆ ئاستی کەسایەتییە بالاکان بەرزکردەوە. (شێخ ئەحمەدو بامبا) بەراستی یەکسانی لەنێو گەلی (فۆلۆف)دا جێگیرکرد، کە بێئاگابون لێی.

- (تیۆ) وتی: باشە، لێرەدا دەگەمە ئەم ئەنجامە: (ئیسلامی سینگالی) = سۆفی + کاستەکان + کۆیلەکان + بایەمی خاکی). کاستو کۆیلەکان، لەئەفریقا؟ هیچ لەمە تێناگەم.

- بەمجۆرە (تیۆ) بۆیدەرکەوت. کە پیاوە سپی پێستەکان لەئەفریقادا کۆیلایەتیان دانەهێناوە، بەڵکو کۆمەڵگەی (فۆلۆف) خۆی کۆمەڵگەیەکی چینایەتیە، کە بۆ سێ چینی نەجیبزادە، مرۆڤە ئازادەکانو کۆیلەکان دابەشدەبێت. کۆیلەکانی ناو ماڵ، کە پەیوەست بون بەدایکەوە، لەناوماڵی خۆیاندا دەژیانو رەفتاری خراپ دەرهەقیان نەدەکرا. کۆیلەکانی باوك، هیچ نەبون، هیچیان نەبوو، بەهیچ ئەژمار دەکران. دواجار کۆیلەکانی سەرۆك لەجەنگدا هاوەڵیان دەکردو لەدەستکەوتدا بەشیان هەبوو، مافیان هەبوو پەلاماری گوند بدەنو ئازارو ئەشکەنجەی خەڵك بدەن. مرۆڤە ئازادەکان هەمان ئەو جوتیارە چارەڕەشانەبون، کە زۆرجار دەبونە چەشەی زۆرداریی کۆیلەی رەزاگران، بەلام چەکدارەکان.

- بەڕێز (دیوب) وتی: دەتوانیت ئەو دۆخە بەئەوروپای فیودالی بەراورد بکەیت. لەکۆمەڵگای فیودالیدا جوتیاران سیفەی (کرێکاری کشتوکاڵیان) هەبوو، ملکەچی خودانەکانی نیشتەجێی ناو کۆشکەکان بون. ئەگەر کۆیلەدارانی ناو ماڵ بخەیتە سەر ئەو کرێکارانە دوو چینی جیاواز پێکدێت، کە ئیسلام لەنێوانیاندا یەکسانیو وەکیەکی دروستکرد، واتە کەمو کوڕیان لەچیدا هەبوو.

- پورە (مارتا) چوە ناو گفتوگۆکەوەو گوتی: لەوەش خراپتر! پاشاکانی ئەفریقا خۆیان دەیاندا بەسەر یەکتریداو کەسە دیلکراوەکانیان لەبازاڕدا دەفرۆشت. بەبێ ئەوانە سپی پێستەکان هەرگیز نەیاندەتوانی بەهۆی بازرگانی ڕەشپێستەکانەوە سامانێکی گەلەك زۆر کۆبکەنەوە: ئەوانە (سپی پێستەکان) لەشوێنی خۆیدا کەسانێکیان هەبوو کۆیلەیان بۆ کۆدەکردنەوە.

بەڕێز (دیوب) ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: ئەفسوس! تا سەدەی نۆزدە خاڵی لاوازی راستەقینەی ئیسلامی سەرکەوتوو لەئەفریقادا هەمان بازرگانی کۆیلە ڕەشپێستەکان بوو. چەند ئیمپراتۆرییەتێکی ئەفریقی هەن لەسەر بنەمای تەواوی خێلآیەتی دروست نەبون! ... ئیمپراتۆری (گایۆ) کە تا (سنیگال)ی خواروی هاوشانی (بیابان) درێژ ببۆوە. (مالی)، کە (کۆنگۆ موسا)ی سەرۆك لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەکۆیلە ڕەشپێستەکان بۆ زیارەتی (حەج) دەچوو... کۆیلەیان بەئەسپ دەگۆڕییەوەو بۆ کاری کشتوکاڵ بەکاریان دەهێنان! ئێمە سەرزەنشتی سپی پێستەکان دەکەین، کە هاوڕەگەزەکانی ئێمەیان بەدیلیو کۆیلایەتی بردوە، بەلآم پەسەندی دەکەم، کە بەشێك لەو شەرمەزارییە داوێنی خودی ئەفریقییەکان دەگرێتەوە.

## منالەکانی تەرم

گەیشتنە ماڵی (دیوب). ڤێلایەکی سپی نغرۆی گوڵێکی زۆری لەکاغەز دروستکراو. (عەبدوڵلایە) (تیۆ)ی پێشی خۆیدا بۆ ژوری نانخواردن، کە سێ ژنی عەمامە بەسەر دانیشتبونو باوەشێنی خۆیان دەکرد. بەڕێز (دیوب) یەکە بەیەکەیانی بە پورە (مارتا) ناساند: دایکم، پورم، خوشکم، (ئانتا) منالەکان نوستون؟

- لاوترین ژنیان وەلامیدایەوە: بەڵێ، بەلآم باوەڕ ناکەم خەویان لێکەوتبێت. (ئامینتە) ددانی دێشێ.

لەتەمەنی ئەودا ئاساییە. هەرچۆنێك بێت ئەگەر گریا بیهێنە بۆ ئێرە.

گفتوگۆکان هێندە خۆییانە بوو (تیۆ) هەستیکرد لەژینگەیەکی خێزانیدایە. نانی شێوان ئامادەبوو.

خاتوو(دیوب)ی بەتەمەن بەبێدەنگی بەویقارەوە هەستاو ئامادەبوانیش چونە سەرمێزی نانخواردن. خواردنەکە بریتیبوو لە(کۆسکوسی هەرزن، مریشکی سورەوە کراو، ساس پیاز، سەوزەی کولاو. (تیۆ) هەستی بە برسێتیکرد. ژنەکان کەمدوبون. هەرچۆنێك بێت ئاخاوتنەکان هێواش بون.

- (تیۆ) سەری لەسەر دەفرەکەی بەرزکردەوەو روو بە (عەبدوللایە) وتی: پرسیارێکم هەیە. لەو گفتوگۆیانەی پێشودا هیچت دەربارەی (کاست)ەکانی (سنیگال) باس نەکرد. ئایا ولاتەکەی تۆش وەك هندستانە؟

خاتوو (دیوب)ی بەتەمەن چاوێکی داگرتو پوردەخانم چنگاڵەکەی لەدەست بەربودەوەو دایکی (ئامینتە) بەبەهانەی گریانی منالەکەیەوە لەسەر مێزەکە هەستاو بەپەلە بەرەو ژورەکەی دیکە رایکردو بەمنالێك بەباوەشەوە گەڕایەوە.

- (عەبدوللایە) بەخەندەوە وتی: ئەگەر ئارەزوو بکەیت پاش نانخواردن لەوبارەیەوە دەدوێین. رونکردنەوەی کەمێك دورودرێژە.

- پورە (مارتا) خێرا بابەتەکەی گۆڕیو پرسیاری تەمەنی (ئامینتە)ی بچوکی کرد.

لەوکاتەدا میوەی دوای نانخواردن دانرا. ژنەکان (ئامینتە)یان بۆ ژوری نوستن برد،

- (عەبدوللایە) بۆ جێگاکەی خۆی لەسەر قەنەفە گەڕایەوەو پاش پشویەکی کەم وتی: باشە، ئێستا دەتوانین درێژە بەگفتوگۆکەمان بدەین. (سنیگال)یەکان زۆر حەزناکەن باسی (کاست)ەکان بکەن.

- پورە (مارتا) قسەکەی پێبڕیو گوتی: بەتایبەتی لەبەردەمی (تۆباب - Toubab)ێکی بچکۆلەدا!

- (تیۆ) وتی: مەبەستت لە (تۆباب) منە، تۆباب واتە خۆتێهەڵقورتێنەر؟

- (دیوب) خەندەیەکی کردو گوتی: نەخێر، (تۆباب)ەکان واتە بیانییەکانو لەواتا فراوانەکەشیدا واتە سپیپێستە ئەوروپییەکان. لە (سنیگال) سەبارەت بەکاستەکان قسە لەگەڵ تۆبابەکان ناکەن. لەلایەکەوە لەجیهانی تیۆریدا ئیدی کاست لە (سنیگال) نەماوە، بەلام لەجیهانی واقیعدا دەبێت بڵێین هێشتا کەمێك کاریگەری هەیە.

(ئانتا)، کە هاتبووە ژورەکەوە وتی: تەنها کەمێك؟ تۆ لەپاریس کاردەکەیت، بەڵام من لێرە دەژیم و گوێکانم سوکن!. لەگەڵ بونی کۆمەڵناسان، مێژونوسان و توێژەرەوانیش هێشتا خەڵکی لەباسکردنی پروپاگەندە دەربارەی کچی خێزانێکی (گریۆتی - Griot) دەمیان ناگرن. بۆ نمونە من لەوانەکانی خۆمدا هەوڵدەدەم بابەتی سڕینەوەی بێدادی چینایەتی رونبکەمەوە، بەڵام هەموو ئەوانە دەتوانن چ سودو ئەنجامێکی هەبێت؟ سەیرە.

- بەڕێز (دیوب) وتی: (ئانتا) مامۆستای کۆمەڵناسییە لەزانکۆ. بۆ (تیۆ)ی رونبکەرەوە، تۆ لەمن باشتری.

- (ئانتا) وتی: (کاست — چین)ـەکان بەشی سەرەکی ئەفریقایان پێکدەهێنا، تەنانەت باس لە چینە باڵاکان نەدەکرا. لەسەرێکەوە کۆمەڵێك کەسانی ئازا هەبون و لەلایەکی دیەوە نزمترین ئاست. پێکهێنەرانی کۆمەڵگە لەوێنە ی ئاسنگەرەکان، گۆزەکاران، پینەچی، زەڕنگەران، پیشەوەرانی رستن و چنین و (گری یۆ)کان.

- (تیۆ) وتی: (گری یۆ)کان لەجۆری جادوگەران و گۆرانیبێژان. (فاتۆ) لەوبارەیەوە باسی بۆ کردوم. پێدەچێت خەڵکی سەرنجڕاکێشش بن!

بابەتی (گری یۆ)کان مایەی سەرنجە، ئەمانە بەهۆی کاری گێڕانەوەوە، کە پیشەیان بوو، بەدەنگی بەرز باسیان لەبنەچەو رەچەڵەکی سەرۆکی خێڵەکان دەکردو کەس نەیدەتوانی خۆیان لێبەدور بگرێت و لەگەڵ ئەوەشدا هەموان چارەیان نەدەویستن. (گری یۆ)کان بەگۆرانی و ئاوازی مۆزیکەوە خەڵکیان لەخۆیان گرد دەکردەوە، بەڵام بۆیان نەبوو بچنە ناو ماڵانەوە یان پاش مردن لەگۆڕ بنرێن. هەرگیز بەخاکیان نەدەسپاردن. چونکە لەژێر خاکدا جێگایەکیان بۆ لاشەیان دەست نەدەکەوت و بەپێوە لەناو کلۆرە دارێکی گەورەی درەختی (بایوباب) دەنراو دەمی کلۆرە دارەکەشیان بەقوڕەسور دەپەست.

(تیۆ) بەهێمنی وتی: زۆر سەیرە! ئایا ئەمڕۆش ئەو کارە دەکەن؟

- (ئانتا) وتی: نەخێر. چونکە خوونەریتی کۆن لەبەردەم دیموکراسیدا پاشەکشەی کردووە و هەلومەرجی کۆمەڵایەتی (گری یۆ)کان گۆڕاوە. بەجۆرێك لەهەموو شانۆگەرییەکدا ئامادەییان هەبوو. رێوڕەسمی فەرمی لەکاتی ئامادەبونیاندا پێویستبوو. لەشێوە پیشەکەیان جگە لەپیاهەڵدان هیچی لێنەماوەتەوە، کە ئەو کارە لەبەردەم ئاپۆرەی خەڵك ئەنجامدەدرا بەڕێزو ستایشێکی زۆرەوە ببوە نەریتێکی نەتەوەیی.

(تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: دواجار لەدەرکردنیان لەکۆمەڵگە تێنەگەیشتم.

- (ئانتا) وتی: سەبارەت بەبنەچەو رەچەڵەکیان گەلەك ئەفسانە هەیە، کە سەیرترینیان بەندە بەچینێکی (گری یۆ)کانەوەو پێیانوتراوە (نیۆلی  Nioli). هێشتا رون نییە، کە دەبێت ئەم گروپە لەچینی (گری یۆ)کان دابنرێت یان لەچینێکی یەك پلە باڵاتر، بەڵام چیرۆکەکەیان زۆر سەیرەو نازانم باسی بکەم یان نا؟

(تیۆ) وتی: زۆر ئارەزوو دەکەم ئەو روداوە بزانم.

(ئانتا) رونیکردەوە، کە لەناوچەی (کەنار) رۆژێك پیاوێك بەهۆی نەخۆشییەکی نهێنی نامێزەوە دەمرێت، کەکەس ناتوانێت چارەسەری بکات. کاتێك دەرودراوسێکانی بۆ ناشتنی لەسەرتەرمەکەی کۆدەبنەوە بەسەر سوڕمانەوە دەبینن هەلامەی کابرای مردوو رەپ بوە.

(تیۆ) پرسی: واتە پیسبووە؟

- نەخێر، بابەتەکە بەوجۆرە دەبێت، کە گوایە مردوەکە ژنێکی گەلێك شۆخی دەبێت. یەکێك لەپیرە پیاوەکانی ناو ئەو کۆمەڵە ژنەکەی رادەسپێرێت بۆ دواجار سەرجێی لەگەڵ مێردەکەی بکات... ژنە بەقسەی دەکات.. پاشئەوەی ژنە کاردکەی تەواو دەکات هەلامەی کابرای مردوش سیس دەبێتەوەو ئیدی وەك ئەوەی هیچ روینەدابێت، دەینێژن. بەڵام پرسەکە لێرەدا کۆتایی نایەت. بێوەژنەکە لەپاش ئەو جێگاکردنەی لەگەڵ مێردەکەی دوگیان دەبێت و جمکێکی دەبێت: کچێك و کورێك.

- (تیۆ) پرسی: هەردوکیان زیندون؟

- بەتەواوی زیندوو. لەگەڵ ئەم پەرەجوو سەیرەدا لەدایکبونی جمکەکە هیچ سەغڵەتییەك دروست ناکەن. گەورە دەبن، هاوسەرگیری دەکەن و وەچەی زۆر دەخەنەوە، بەڵام رۆژێك لەرۆژان (ڤۆلۆف)ەکان دەبینن هەموو ئەو منالانەی لەو تەرمەوە لەدایکبون هەموو نەفرەتاوین. واتە پاش مەرگ هەریەکەیان بەماوەیەك جەستەیان هەڵدەوەشێت! سەرەتا پێستەکە هەڵدەوەرێت و پاشن گۆشتەکەی بەبەرچاوەوە دادەرزێت. ئیدی ئەو بڕوایە دروست دەبێت کە (گری یۆ)کان بەواتای وشە مرۆڤ نین. لەوکاتەشەوە (چین)ەکانی دیکە خۆیان لەهەموو هاوسەرگیرییەك لەگەڵ ئەوانەی بە(منالی تەرم) ناودەبران بەدور دەگرن. لەبەرئەوەش بووە خەڵکی خێرا ئەوجۆرە مردوانەیان لەکۆڵەکەداری (بایوباب) ناوەو بەقوڕ سواخیان داوە.

(تیۆ) بەنەفرەتەوە وتی: کەڕوو! زۆرناخۆشە!

- پورە (مارتا) وتی: ئایا ئەم چیرۆکە هیچت بەیاد دێنێتەوە؟

- وەڵامیدایەوە: نەخێر، ئاه، بەڵێ! ئەفسانەی (ئازیریس)م بیردێنێتەوە، لەگەڵ ئەو جیاوازییەی (ئیزیس) هەرگیز نەیتوانیوە لە (ئازیریس) نزیك ببێتەوە.

- (ئانتا) رایگەیاند، کە بەپێی تیۆری زۆر راستو متمانەدار یەکەمین ئەفریقی هەمان ئەو (میسریانە)بون، کە باپیرەی ئەفریقای رەشنو خودی ئەوانیش رەشپێستبون، کەلانی (سنیگال) لەسەردەمە زۆر کۆنەکاندا (میسریان) بەجێهێشتوەو پاش پەڕینەوە لەچیاو بیابانەکانو تەیکردنی خاکی ئەفریقای رەش هەر لەزەریای هندستانەوە تا ئەتڵەسی لەدواین خاڵی ئەفریقاو لەبەرامبەر (بەرازیل)دا رەچەڵەکێکی (میسر)یان جێگیرکردوە، لەبەرئەوە جێگای سەرسوڕمان نییە لەئەفسانەکانی ئەفریقادا رەنگدانەوەو جێگا پێی میسرییە کۆنەکان مابێتەوە، کە سەربوردەی ئەو تەرمە نمونەیەکی بێت.

بەڵام بابەتی ئەم گروپەی (گری یۆ)کان لەوێدا سەیرە، کە هەموو چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگە لەنمونەی ئاسنگەرەکان، گۆزەکارەکان، پێڵاودروەکان، زەرنگەرەکان هەموویان یەك روخساری هاوبەشیان هەبوە، کە ئەویش کاری دەستیبوەو ئەندامەکان پیشەسازی لێوەشاوەبون. لەکاتێکدا (گری یۆ)کانی بابەتەکەی ئێمە جگە لەگۆرانی وتنو گێڕانەوە هونەرێکیان نەبوە. لەوکاتەی ئەمانە بەگۆرانیو ئاوازی خۆش ناوبانگیان دەردەکرد هەر بەبونەوەری نەفرەتی دادەنران. رویدەدا ئەم کەسانە بەفەرمانی گەورەکانیان لەمەیدانی جەنگدا دەکوژران، کەچی لەوباوەڕەشدا مافی ناشتنیان پێڕەوا نەبینراوەو جێگایان هەرناوداری (بایوباب)بوە!

- (عەبدوڵڵایە) بەیادی هێنایەوە، کە باوەڕی ئیسلام دژی هەموو هەڵاوێردنێکی چینایەتیەو هەموو موسڵمانێك تەنانەت (گری یۆ)کانیش مافیان هەبوە ئارامگەیەکی ئارامیان هەبێت.

- پورە (مارتا) وتی: لە (فەڕەنسا)ش پیشەگەرەکان مافی ئەوەیان نەبوە لەگۆڕستانی کاسۆلیکەکاندا بنێژرێن. ئەو بڕیارە، کەلەلایەن کەنیسەی کاتۆلیکەوە دانرابوو، تاسەدەی نۆزدەش کاری پێکراوە!. لەوەدواو لەپاش سەردەمی شۆڕشەوە ئیدی چینەکان نەماون! بڕوام بەچیرۆکەکە نییە. بەبڕوای من بنچینەی بابەتەکە ئەوەیە دەسەڵاتداران سڵ لەو کەسە دەکەنەوە دەتوانێت بدوێتو شت بەخەڵك بگەیەنێت! چ (گری یۆ)، چ (هونەرپیشە)و چ هەرکەسێکی دیکە بێت. ئەوانەی کاریان قسەکردنە خەڵکی مەترسیدارن.

- (عەبدوڵڵایە) وتی: ئیسلام شاعیران بەرز دەنرخێنێتو قەدریان دەزانێت.

- پورە (مارتا) وتی: بەراست؟ ئەوەی بەڵگەکان دەریدەخەنو هەتا ئەم سەدەی بیستەمەش بەوجۆرە نییە.

- بابەتەکە ئەوەیە ئەوانەی پیشەیان قسەکردنە هەستی سەیر لەمرۆڤدا دەبزوێنن. (ئەفلاتون) ئەو فەیلەسوفە مەزنە (یۆنان)ییە دەیویست شاعیر لەشار دەربەدەر بکات. گومان لەناودان و قسە قەدەغەکردنی ئەوجۆرە مرۆڤانە گومانێکی هەمیشەییە. ئاینیش کاتێك نەتوانێت خۆی لەوشە بپارێزێت بێگومان خۆشی لەوانە نایەت لەبارەیەوە دەدوێن. دەرکردنی (گری یۆ)کانیش لەکۆمەلگەی ئەفریقایی لەو رێسایە بەدەرنییە.

## بەشی بیستو پێنج

## (ژیانی باوانەکان)

### دڵتەنگی ئەفریقا

رۆژی دواتر بۆ دیدەنی مزگەوتو کڵێسای شار رۆشتنو کەوتنە پیاسەکردن. ئاسمان بێڕەنگ، خۆر سپیو دەریا خاکی بوو. لەدورەوە ریزێك خانوو بەسەربانی قوڕەوە لەسەر دورگەیەك دەبینرا.

- پورە (مارتا) وتی: ئەویّ (گۆرە)ی پێدەوترێت، شوێنی کڕینو فرۆشتنی رەشەکان بوو.

- (عەبدوڵلایە) وتی: پاشان سەردانی ئەویّ دەکەین. (تیۆ) دەمەوێت سەرەتا ئاشنای ئەفریقاکەمان بێتو لێی شارەزا ببێت. هەمیشە ئەو هەلە رەخساوە تابزانین ئێمەی ئەفریقایی لەچ هەلومەرجێکی مێژوویدا دەستمانپێکرد.

- (تیۆ) پرسی: ئایا لە (داکار) دەمێنینەوە؟ ئێرە وەك شارێکی فەرەنسیە، لەبەرئەوەیە کە...

- بەڵێ (داکار) بەتەلاری شارەوانی، سەربازگەکان، وێستگەی شەمەنەفەرو تەلاری پۆلیسەوە بەشارێکی فەرەنسی دەچوێت. فەرەنسییەکان (داکار)یان دروستکردو ئێستا ئێمە خاوەنین.

لەسەر شەقامەکان ژنان بەعەمامەی تایبەتو پیاوان بەکراسەوە لەهاتوچۆدابون. فرۆشیارانی (توتی)، ماسکی جۆراوجۆرو هەموو کاڵایەك لەسەر شەقامەکانی نێوان دوو ریز درەخت خەریکی کاری خۆیانبون، بەڵام ئەوەی (تیۆ) دەیبینی ئەفریقای (فاتۆ) نەبوو.

(فاتۆ) باسی لەدرەختی (بایوباب)ـەکان، ماسی زۆرو سەدەفەکان و فڕینی باڵندەی ماسیگرەکان دەکرد، هەروەها لەخاکی سور، رەنگی سەوزی درەختی مۆز، تامی بۆنداری ئەنبە، لمی سپی کەنارەکان، قەدی زیو ئاسای درەختی (بایۆباب).

- (فاتۆ) بەچاوە نیوەداخراوەکانییەوە لەخەونی درەختانی پیرۆز، گەڕانەوەی ماسیگرەکانو ئاسمانی پڕ تریشقەی پێش زریاندا نغرۆ ببوو، لەقسەکانیدا هەمیشە بۆ (بایۆباب) دەگەڕایەوە.

- (تیۆ) پاش پیاسەی سەرشەقامەکان وتی: باشە، هەموو ئەمانە سەرنجڕاکێشن، ئەی (بایۆباب)ـەکان کوان؟

- بەرەو شوێنی (بایۆباب)ـەکان رۆشتن. لەنێو ریزی درێژی لۆرییەکان، گەڕەکەکانی دەوروبەری شارو باخی (ئەنبە)ی ئەوناوە، کە بەرەکانیان لەژێر تیشکی خۆردا وەك ئالتون دەبریسکایەوە، پەیکەری سەیر لەدورەوە دەرکەوتن. دارستانێك لەخێوی مەزن بە پەلی بێگۆشتیانەوە...

- پورە (مارتا) وتی: فەرموو، ئەمەش (بایۆباب)ـەکانت.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئەمانە؟ ئەم درەختە ناشیرینو بێ گەڵاو روتانە؟

- (عەبدوڵلایە) لەپڕ ستۆپێکی کردو دەنگی جیرەی تایەکانی بەرزبووەوە، وتی: (بایۆباب)ـەکان لەلای ئێمە پیرۆزن. توێکڵەکەیان بۆ دروستکردنی تەناف دەبێت، گەڵاکانی وەك هەوێنو میوەکەیان پڕە لەشیلەیەکی نەرمو سپی، کە بۆ جوین بەکاردێت. پاش هەفتەیەکی دیکە لقەکانی سەرەوەی پڕ دەبنەوە لەگەڵاو ئەم پەیکەرە بەقسەی تۆ ناشیرینو روتە لەسەر ترۆپکی لقەکانییەوە گوڵێکی سپی پڕ لەئاو دەگرێت. قەدە وەفادارەکەی پاشماوەی وەچەکانی پێشوو دەپارێزێت، تەنانەت ئەگەر ناچاربون بیبڕنەوە دەبێت سەرەتا بەشیر تیری بکەن تا لەتوڕەبونی پارێزراو بن.

- (تیۆ) وتی: قسەی بێسەرو پام کرد.

- (عەبدوڵلایە) وتی: گرنگ نییە، بەڵام دەبێت لەئەفریقا فێری روانین ببیت. ئەگەر درەختی (بایۆباب) نەبینیت چۆن دەتوانیت بیروڕا لەسەر گوندەکانمان دەربڕیت؟

- (تیۆ) بەدەنگێکی هێورەوە گوتی: ئەوە گۆڕستانێکی (گری یۆ)کانن؟

- (عەبدوڵلایە) پێکەنیو پرسی: کێ چوزانێت؟ لەوڵاتی دڕندەکانی وەك ئێمەدا...

(تیۆ) بێدەنگ بوو. خەمێك ختوکەی گەروی دەدا.

- (عەبدوڵلایە) درێژەیپێدا: بارانی هاوین هەموو شتێکی ئێرە دەگۆڕێت. هەموو (سنیگال) بەرگێکی سەوزی جوان دەپۆشێت. گوڵەکان بەشێوەیەکی سەیر دەپشکوێن، دوبارە ژیان دەگەڕێتەوە. ئاسمانی پڕ لەهەوری پاش زریان رەنگی شینی بۆ دەگەڕێتەوە...

- پورە (مارتا) وتی: بەڵێ، کەنارەکە ناوچەیەکی وشکە.

(عەبدوڵلا یە) پێشنیازی کرد: بابچین بۆ دارستانی (بایۆباب)ەکان... شتێکت پیشان دەدەم.

## رۆحیانەتی جمکێك لەبەردەم (بایۆباب)دا

جەنگەڵێکی بێ گەڵا، بێ پەناگەو بێتاریکی، وەك بێشەیەکی جادویانەی نێوان بیابانەکان. بزنەکان قەدەکان دەکرێننەوەو مانگاکان لەبنیدا خەوتونو چاوەڕوانی کۆتایی رۆژەکە دەکەن. (عەبدوڵلا یە) (بایۆباب)ێکی گەورەی پیشاندان، کە قەدەکەی سێبەرێکی کەمی خستبوو؛ دەکرا لەژێریدا دابنیشن. پورە (مارتا) دەسرێکی دەرهێناو عارەقی روخساری سڕیو شانو ملی وشك کردەوە.

- (عەبدوڵلایە) وتی: لەهەندێك شوێن بەفری کوێستانەکان خەڵك دەکوژێتو لەوڵاتی ئێمە لی بیابان. نزیکەی بیست ساڵ بوو باران ئێمەی فەرامۆش کردبوو، بیابانی (کەنار)یش وردەوردە لەپێشڕەویدا بوو، بەڵام ئێستا باران گەڕاوەتەوەو تا دوو مانگی دیکە دەکرێت تۆو بکرێت، تۆو ژیانە... ئەم رستە کورتە قسەی کۆنەکانی (کەنار)ەکەیە. خەڵکانی سەر زەمینی (دۆگۆن - Dogon). گوندەکانی (دۆگۆن) بەسەر بەرزایی بەردی زەردەوەبونو خەڵکەکەش بۆ هێنانی ئاو دەبوو ماوەیەکی زۆر بەدۆڵو بەرزاییەکاندا رەت بن. خەڵکەکە بەدوای تەنانەت درزی بەردەکانیشدا دەگەڕان بۆ تۆوکردن. ئەم گەلە هێندە دابونەریتی ئاینیان پاراستبوو، کە تۆریستەکان چۆن لەپاریس سەردانی کڵێسای (نۆتردام) دەکەن، بەوجۆرەش سەردانی ئەم خەڵکەیان دەکرد. (دۆگۆن)ەکان بەماسکەوە، سەماو دەبۆی دانەوێڵەکانیانەوە بەشێك بوون لەسەردانیکردنی ئەفریقای سەرسوڕهێنەر، خۆشبەختانە ئەو سەردانانە سودی بۆ ئەوانیش هەبوو، بەبێەوەی شێوازی ژیانیان بگۆڕێت.

- پورە (مارتا) بەدەنگی بەرز وتی: ئێ، (دۆگۆن)ە ناسراوەکان. وا دەردەکەوێت تەنانەت ئەفسانەو داستانە ئاینییەکانیان لەبنەماو ریشەی کەلتوری یۆنانی – لاتینی نزیك بێت، وانییە؟

- (عەبدوڵلایە) وتی: بڕوانە! (مارتای) ئازیز، لەلام خراپ نییە رەچەڵەك ناسان (ئەتنۆلۆژی)یەکانتان ئاینەکانمان بەرەو لای ئاینەکانی ئێوە کێشبکەن، چونکە لەوە باشترە ئێمە وەك دڕندە سەیربکەن، بەڵام (دۆگۆن)ەکان ئەفریقینو ئەفریقاش دەتوانێت بەکەماڵی خەیاڵەوە دایکی هەموو ئەفسانەکان بێت.

- پورە (مارتا) وتی: (تیۆ) گوێبگرە، تۆ ئێستا پێدەنێیتە ناو (جیهان ناسی - Cosmologie) ئەفریقاوە. باش سەرنج بدە...

- (عەبدوڵلایە) وتی: لەسەرەتادا خواوەند بچوکترین تۆوی جیهانی ئەفراند، دەنکەی دانەوێڵەیەك، کە پێیدەوترێت (فۆنیۆ - Fonio). لەناو ئەو (دەنکە جیهانی)یەدا (با)یەکی هێندە توند هەڵیکردبوو، کە دەنکەکە تەقیو بۆ (تۆودانی جیهان) گۆڕا. لەنێو دیواری ئەو تۆودانەدا دوو جوت ماسی هەبوو، کە بوون بەدوو جوت جمك. تۆوەکە، وەك کۆرپەلەی ناو پزدانی دایك، لەسەرخۆ گەیشتە قۆناغی پێگەیشتن و کورێکی تاقانە، پێش کاتی خۆی هاتە دنیاوەو ناوی (ئۆگۆ - OGO)بوو.

- (تیۆ) وتی: سەیرە! چۆن تەنها؟

- بەڵێ، تەنها! هەڵبەتە ئەوە کارێکی ئاسایی نەبوو! بەڵام ئەم کورە زیرەکەی زوو لەدایك بوو پارچەیەك لەزنجیرەی جوتەکەی خۆی بردوەو فڕێیداوەتە خوارەوەو ئیدی ئەو پارچەیە بووە بەزەوی. (ئۆگۆ) بەورەو وزەوە دابەزیوەتە سەر زەوی و کەوتۆتە گەڕان بەدوای (یازیگی - Yosigui) جمکیدا، کە لەوباوەڕەدابوە کچێکەو لەگەڵیدا لەدایك بوە... ئینجا دەنکە (فۆنیۆ) کە بەئاوێتەکردنی خوێن و خاك ئەڵقەی جوتەکەی ناشت، بەڵام جمکەکەی دەستنەکەوت، چونکە خواوەند لەناو پاشماوەی تۆوەکەدا هەڵیگرتبوو.

- (تیۆ) وتی: ئۆگۆی چاردڕەش! لەدەستدانی خوشکی جمك شتێکی خۆش نییە.

- دەڵێیت (ئۆگۆ)ی چارەڕەش؟ بەپێچەوانەوە، زیاتر خاسیەتی دەستدرێژی و هێرشبردن بەسەریدا زاڵە! چونکە بەئاوێتەکردنی (تۆوی جیهان) لەگەڵ خوێنی پیس هەموو خواردنەکانی سەر رووی زەوی گەندەڵ کرد!. پاشان خواوەند (ئۆگۆ)ی خراپەکاری کرد بەرێوبیەکی بێڕەنگ، کە هۆکارو بەرپرسی هەموو کارە خراپەکانی جیهانەو بەمەبەستی قەرەبوکردنەوەی خراپەکارییەکان یەکێك لەجمکەکانی مابونەوە کردە قوربانی، واتە دابەشیکرد بۆ شەست و شەش بەش و روخساری مرۆڤی لێپێکهێناو ئەلقەی جوتەکەی بۆ بەستنەوەی پارچەکان بەکارهێنا. ئەوەش  یەکەمین مرۆڤ بوو، کە ناونرا (نۆمۆ - Nommo)، کە بەواتای (نۆشین) دێت. (نۆمۆ) بووبە (خاوەنی ئاخاوتن و ئاو).

- (تیۆ) وتی: قوربانیکراو، مردن و دوبارە بۆ جیهان گەڕانەوە، هەندێجار کارەکانی خواوەند دوبارە دەبنەوە.

- هێندە بەخێرایی بەراورد مەکە! ئینجا خواوەند چوار جوت جمکی کوڕو کچی ناردە سەر زەوی ناپاکی ڕێوی بێڕەنگو لەچوارچێوەی ژوورێکدا نیشتەجێکردن، کە لەکۆبەندی جوتەکانیان دروستکرابوو. ئەستێرەکان کەوتنە جوڵەو خۆر پاکی زەوی ڕۆشنکردەوە... کاموسی ئەفراندنی ناتەواو ئیدی بەکۆتا گەیشتبوو. بەپێی بنچینەو وەکیەکی ئەژماری خواوەندانە جمکە پیرۆزەکان زیادبون، بەڵام دوو بەدوو.

- (تیۆ) وتی: باسوخواسێکی خۆشبوو، هەموو کەس جمکێکی خۆی هەیە!

- نەك بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ! چونکە لەئەفرێنراوی نوێشدا هێشتا ناپاکی (فونیۆ) ئامادەیی هەیە، کە بەخوێنی ئەلقەی جوتی نەفرەت لێکراو سووربوو... لەچوارەمین ڕۆژدا لەکاتی یەکەم ڕۆژگیراندا (یازیگی)یان جمکی بزربوو، لەسەر شێوەو روخساری ژنێك هاتە سەر زەوی.

- ئۆو! ئەو یەکەیان لەیادچووبوو!

- باشە، بەهەڵەدا چوبون. (یازیگی) لەگەڵ یەکێك لەجمکەکان هاوسەرگیری کردو پاشان بەغافلگیرانە دەنکێکی (فۆنیۆ)ی خوێناوی دەرخواردا. بەڵێ دەبوو هاوسەرەکەی (یازیگی) بکرێتە قوربانی تا بەپاکیو بێگەردی کشتوکاڵ بکات.

- (تیۆ)، کە مشتێك لی کۆکردبۆوە، وتی: ڕێك وەك پێشبینی پێشوو. دووەمین قوربانی مرۆڤ...

- چۆنت بەدڵە ئەوها، بەڵام پاشماوەی سەربوردەکە سەیرە. جمکە دوگیانەکان کۆرپەی تاقانەیان بوو... ئیدی مرۆڤ بەهرەی گەورەو گرانبەهای جمك بونی لەدەستدا.

- (تیۆ) بەهێمنی وتی: پاکیزە!

- بەڵێ، کورم. هەر لەبەرئەوەیە هەموو تاکێکی مرۆڤ بۆ یادی ئەو خەونە لەدەستچووە خاوەنی جەستەیەکە، بەڵام بەرۆحێکی جمکەوە. یەکێك لەو رۆحانە ژیان دەبەخشێت، کە ئەگەر کوڕ بێت خاوەنی رۆحێکی پیاوانەیەو ئەگەر کچ بوو رۆحی ژنانەیە، بەڵام هەرگیز رۆحی جمك لەجەستە بەدورنییە. لەقوڵایی دەریاچەیەکدا، کە لەژێر چاودێری (نۆمۆ)ی باوانی دوبارە بۆ ژیان گەڕاوەدایە، رۆحی ژنانەو پیاوانە لەجەستەی کوڕدا دەپارێزێتو رۆحی کوڕانەو ژنانەش لەکچاندا. هەریەکەیان نیوەی رۆحەکە لە نهێنیدا ڕێنوێنی دەکات، چونکە هەموو بونەوەری مرۆڤ لەو (نۆمۆ) بەراییەوە، کە مرێنراو وەك جوتێکی جمکی کوڕو کچ گەڕایەوە بۆ جیهان، سەرچاوە دەگرنو لەوەچەی ئەون.

- (تیـۆ) بەهێواشـی وتـی: بـەوجۆرە بێـت هـەموو کـەس خـاوەنی ڕۆحێکـی جمکـە، کـە لەوجێگایەدا ئامادەیەو ئەوەش هەمان شتە لەمنـدا هەیـە، بـەڵام لەگـەڵ ئـەو جیاوازییـەی مـن جمکەکەی خۆم دۆزیوەتەوە. من وەك ئەو ڕێوییـە بێـرەنگ نـیم! بـەڵام مـن (فەرەنـسیم) نـەك (دۆگیۆن)... ئەم ڕاستییە چۆن ڕوندەکەیتەوە؟

- (عەبدوڵڵایە) وتی: لەوانەیە (دۆگیۆن)ـەکان ڕاستییەکەیان درکاندبێت، کە هێشتا کەسانی دیکە لێی بەئاگا نین. سەرانسەری ئەفریقا لـەژێر نیـشانەو هێمـای جمکەکانـدا دەژی... ڕێزیـان لێدەنێن یان سڵیان لێدەکەنەوەو یەکەمین هەڵگرتنەوەی بەرهـەم پێشکەش بەئـەوان دەکرێـت، لەگەڵ یەکێك لەجمکەکان لەگەڵ لەدایکبونـدا دەکوژن، بەڵام هەرگیـز فەرامۆشیان ناکەن.

- پورە (مارتا) بەسەرسوڕمانەوە وتی: کێ دەوێرێت یەکێك لەو دوو جمکە بکوژێت؟

- ئـۆو.. ئێـستا شـتی وا ناکـەن! لـەیادی نەکـەیت جمکـەکان بـاوانی مرۆڤایـەتین، لـەدایکبونی ئەوانە لەجیهانی ئێستادا لەوتەزای پشت سروشتەوەیە.

- (تیـۆ) بـەم دەرئەنجامـە گەیـشت: ئەگـەر بـاش تێگەیـشتبم بـەهۆی ئـەو جمکـە بزرەمـەوە نەمتوانیوە بەئاسایی لەدایك ببم. کەواتە تا ڕادەیەك خواوەند...

- (عەبدوڵڵایە) هاواریکرد: بەپێچەوانەوە! تۆ تەنیایت! لەبەرئەوە سروشتیو ئاسایت. ئەوەی لەتۆدا سەرنجڕاکێشە ئەوەیە خوشکە بچوکە مردوەکەت لەگەڵتا دەدوێت.

- (تیۆ) سورهەڵگەڕاو گوتی: ئاه.. کەواتە تـۆ لەڕوداوەکـە ئاگاداریـت؟ پـورە (مارتـا) ئاشـکرای کردوە.

- (عەبدوڵڵایە) وتی: بەڵێ ڕاستەو هەرلەبەرئەوەش بوو ڕوداوی (نۆمۆ)م بۆ ڕونکردیتـەوە... چـونکە بـاوکی مرۆڤایـەتی واتـە هـەمان جمکـی بـەقوربانیکراو، کـە دەیخۆنـەوەو دەیهێننـە قـسەکردن. (ئاخـاوتن و ئـاو ) دوو ڕەگـەزی سـەرەکی پێکهێنـەری ژیـانن. دوێـنێ وتـت کاتێـك قسەدەکەیت وەك ئەوەیە خۆت بگۆڕیت، تۆ ڕاست دەکەیت... ئاخاوتن بـەناوی بـاوانی تـۆوە تـۆ دەپۆشێت.... چاکەو فریـادڕەس هەمیـشە لـەباوانی مـردووەوە دێـت، هـەر لەبەرئەوەیـە ئێمـەی ئەفریقی هەرگیز بەیـەك ناسـنامەوە ناگیرسێینەوە... پیاوێك بەتـەنیا ناتوانێـت خـودی خـۆی بێت، ئەگەر برازا، نەوە، کوڕی بـرا، منـاڵانی بـراو ئەنـدامانی خێزانەکـەی نـەبێت. کوڕێـك یـان کـچێك بـە هـەرگیز لەجیهانـدا تـەنیا نـین... دایـكو بـاوك، چ مـردوو چ زینـدوو، جەسـتەیان دادەپۆشن.

- پورە (مارتا) پرسی: ئەی عەشق لەو نێوانەدا لەکوێدایە؟ چی لێدەکەیت؟

- (عەبدوڵلایە) بەگومانەوە وتی: عیشق؟ لەوانەیە هەروەك (یازیگی) وێڵی (ئۆگۆ)ی ناپاك بوو، هەر نیوە دوانەکەش دوای دوو نیوە جمکەکەیان دەکەون....

- (تیۆ) وتی: من دەزانم. عیشق دانەی هەگبەی باوانەکانە لای کەسێك کە مرۆڤدۆستە، هەگبەکان دادەنێن و مانویێتیان دەردەچێت.

- (عەبدوڵلایە) وتی: لەلای ئێمەی ئەفریقی ئەوانە دەکەونە قوربانی باوانەکان و بۆ نوێژەنکردنەوە هەگبەیان پێدەدرێت. ئەمەش خراپ نییە.

- ئینجا لەگەڵ تەکاندنی خۆیدا هەستایە سەرپێ. دەستی هەڵبڕی و چڵێکی باریکی لەدرەختەکە کردەوەو توێکڵە تەنکە زەردباوەکەی، کە تازە دەیهێنایەوە، پیشانی (تیۆ)ی داو گوتی: ئەمە ئەو شتەبوو دەمویست پیشانی تۆی بدەم. (بایۆباب) بەبێ ئاو تەنها بەرگ و خۆراکی خۆی ئامادە دەکات. وەك ئێمەی ئەفریقی هەرچۆنێك بێت ژیان دەگوزەرێنێت و گرفتەکان چارەسەر دەکات.

## لەدایکبونی مردوەکان

قۆناغی دووەم قۆناغی (ئاو)و سەردانی گوندی (فادیۆت)ی بەراستی سەیرو نائاسایی بوو. ئەوەی یەکەم شت دەکەوتە بەرچاو گۆڕستانێکی سپی شارەکە بوو، کە دەکەوتە ئەوبەری ئاوێکی رەنگ رەشەوەو رەگە دەرکەوتوەکانی درەختی گەرمەسێری تێرئاو دەکرد. گۆڕستانەکە بەخاچی سپی و (بایۆباب)ی سەدساڵە داپۆشرابوو. دانیشتوانی (فادیۆت)، کە زۆربەیان کاسۆلیکی بون، ئەو گۆڕستانە سەیرمیان لەئاینی (سیریر)[1]ەوە بۆ مابۆوە.

- خاکەکە لەژێرپێی رێبواراندا خرمەی دەهات. گۆڕەکان لەپاڵ گردۆلکەکاندا ریزببون. پورە (مارتا) جارێك لەسەر تۆپەڵە سەدەفێك هەڵخلیساو خۆیگرتەوە. گردەکان بەرزبون و ئەگەر لەپولەکەی سەدەف دروست نەکرانایە دەتوانرا بەو هەرەمانە دابنرێت، کە بۆ مەبەستی نەمری دروستکراوان.

- (تیۆ) پرسی: ئایا ئەم گردانەش جۆرێکن لە هەرەم؟

- (عەبدوڵلایە) وەڵامیدایەوە: کاتێك یەکێك لەسەرانی خاکی (سیریر)ەکان دەمرد لەهەورەبانێکیان دەنا. پاش تێپەڕبونی ماوەیەکی دیاریکراو دانیشتوانی گوندەکانی دەوروبەر دەهاتن بۆ دروستکردنی گردو درەختی خورمای تایبەتیان دەناشت، کە دارەکەی نارزێت. پاشان

[1] Sereres: لەگەلانی رەشپێستی ئەفریقای خۆرئاوان، بەتایبەتی لە (سنیگال) دەژین و بەگشتی خەریکی کشتوکاڵن.

کاتێك (سیریر)ـەکان چونە سەر ئاینی کاسۆلیکی گۆڕەکانیان وەك گردی سەدەفی دروستدەکرد و خۆراکی پێویستیان تێدا حەشاردەدا بۆ مردوەکەو بۆ گەشتە دورودرێژەکەی تاگەیشتنی بە (شاری باوانەکان).

- (تیۆ) وتی: سەیرە. لێرەش وەك میسر خۆراکیان بۆ مردوەکان ئامادەکردوە.

- ئەمە تاکە لێکچونێکی نێوان خاکی (سیریر)ـەکان‌و میسرییەکان نییە!. لەم ولاتەشدا (گا) هاوتەمەنی مرۆڤ بوو، بەجۆرێك کاتێك سەرۆکی خێڵە گەورەکان پێش ناشتنیان لەپێستی (گا)دا هەڵیاندەدوری، هەر وەك (میسر)، ئەگەر خۆراکیان بەمردوو نەدایە رۆحی ئارامی نەدەگرت. لەرۆژی چوارەمدا دەبوو بەپێی حەزی خولی زیندوێتی خۆی، ساوەر (کوسکوس)ی ئاو یان شیری پێبدرێت. تەنانەت بیستومە کە یەکێك لەگەورە دەوڵەمەندەکانی خێڵەکانی (سیریر) ژمارەی رۆڵەکانی دەوروبەری زیاد دەکرد بەو هیوایەی وەچەکانی بتوانن بڕی زیاتری شیر پێبگەیەنن.

- بڕی زیاتر بۆچی؟

- بڕی زیاتر تاگەیشتن بەشاری باوانەکان. هەڵبەتە گەشتی مردودکانی ئێرەش وەك گەشتی ئەوانەی (میسر)بوو. مردوی چاك‌و شایستە دەبوو بڕی تەواوی خۆراکی پێبێت، ئەگینا مردوی راستەقینە دانەدەنرا... ئەو پیاوە دەوڵەمەندەی باسمکرد یانزە باوانی پیرۆزی هەبوو، دڵنیاش بوو خۆی دەبێتە دوانزەی باش، بەو مەرجەی بڕێکی تەواو شیری پێبدەن. باوانی باش دەبوو پردێك لەنێوان کوڕەکانی‌و خواوەندا، هەروەها بەو مەرجەی خێزانەکەی لەگەشتە درێژەکەیدا هاوەڵی بکەن. لەنێوان زیندوو مردوەکاندا سیستەم‌و کۆمەك بەرامبەربون.

- ئەوەی لەسروتی (میسر)یەکان جیابوو رێوڕەسمی بەخاك سپاردن‌و ناشتنی تەرمی خێڵەکانی (گلوار) بوو، کە ئەمانە لەنەوەی شاژنێك بون، کە بەپێچەوانەی دابونەریتی چینەکەیەوە شوی بە (گری یۆ)یەك کردبوو. لەناو ئەم خێڵانەدا یەکەمین ناشتنی مردوو لەو شوێنەدا ئەنجامدەدرا، کە تیایدا ژیاوە؛ واتە سەرۆکی خێڵەکەیان لەپێستس (گا) هەڵدەدوری‌و تەرمەکەیان لەتابوتێك دەناو بەپێوە لەچاڵێکی سێ مەتر قوڵیان رۆدەکرد. ئیدی سەرۆکی خێڵ بۆ (گا – خواوەند) دەگۆڕا، کە شوێنی ناشتنەکەشی نهێنی بوو. سروتی ناشتنی دووەمجاری لەبەردەمی خەڵکداو لەتابوتێکی پڕ لەخاشاك ئەنجام دەدرا. هەڵبەتە هەموو کەس ئەو راستییەیان دەزانی، کە تابوتە فەرمییەکە بەتاڵەو کەسی تێدا نییە. بەڵام کەسیش چاڵە نهێنییەکەی سەرۆکی تیانێژرابوو نازانێت، تا شەقڵی خۆی بۆ کەسێکی نەمر بگۆڕێت.

- (تیۆ) پرسی: کەواتە ئەو گۆڕانە پێویستی بەکات هەبووەو دەمودەست نەبوە؟

- (عەبدوڵلایە) درێژەیپێدا: لەئەفریقادا هیچ شتێك لەژیانی مرۆڤدا بەخێرایی‌و هەنوکەیی روونادات‌و کات دەخایەنێت. مانەوەی کۆرپەلە لەپزدانی دایکیدا بۆ نۆ مانگ نەك خۆی دروست دەکات، بەڵکو میراتی باڵای هەموو رەچەڵەکی خۆی لەخۆیدا کۆدەکاتەوە. کاتێکیش لەدایکبوو بەدرێژایی قۆناغە جیاوازەکانی ژیان درێژە بەدروستکردنی خۆی دەدات‌و ئەو دروستکردنەی خۆشی بە مەرگی دوایی نایەت‌و بەڵکو درێژەی دەبێت. فەلسەفەی سازکردنی دوو جۆر ناشتنی سەرۆك خێڵ لەهەمان ئەو راستییەوە سەرچاوەی گرتوە: زیندوەکان مەرگێکی کۆمەڵایەتیانەی (یورۆك) لەبەرامبەر تابوتێکی بەتاڵدا ئەنجامدەدەن، بەلام خۆ دروستکردنی مردوەکە، لەوچاڵەی بەپێوە تیایدا رۆنراوە، درێژەی دەبێت.

- (تیۆ) بەنارەزاییەوە وتی: من لەم رووداوە هیچ تێنەگەیشتم. مردوەکە چی بەسەردێت؟

- (عەبدوڵلایە) وتی: نمونەیەکی دیکە دێنمەوە، کە پەیوەستە بە (یۆروبا)کانی (بنەنی خوارو). خێزانی مردوەکە پێش ناشتنی مردوەکەیان جلوبەرگی نوێی لەبەردەکەن‌و شتومەکی پێویستی خێزانی لەگەڵ دەنێژن، شتەکانی دیکەی پەیوەندی بەوەوە هەبێت دەیسوتێنن تامردوەکە لەشتە زیادەکان رزگاری ببێت. ئینجا ئەندامانی خێزانەکە دەستپێکردنی ژیانی نوێی مردوەکە دەکەنە جەژن‌و ئینجا چاوەڕوانی‌و نهێنی دەستپێدەکات...

- (تیۆ) پرسی: چاوەڕێی چی؟

- چاوەڕوانی جیابونەوەی ئەوشتەی تەرمی مردوەکەی داپۆشیوە! مردوەکە رێگایەکی پێچەوانەی کاروانی لەدایکبونی دەگرێتەبەر. کەمکەمە گۆشتەکە لەجەستەی دەکاتەوەو دوای پێنج یان شەش ساڵ لەمردنی ئامادەی سروت دەبێت. لەو سەردەمەدایە کە قۆناغی فێربونی لەمەرگدا دەستپێدەکات.

- (تیۆ) وتی: بۆ ساتێك راوەستە! چۆن دەزانرێت مردوەکە ئامادەیە؟ ئایا لەژێر خاکەوە سەر دەردەهێنێت‌و ئاماژە دەدات... (هێی!) من لێرەم؟

- تارادەیەك! رووداوەکە بەوجۆرەیە، کە یەکێك لەئەندامانی خێزانەکە نەخۆش دەکەوێت یان ژن‌و مێردێکی خێزانەکە ناخۆشی دەکەوێتە نێوانیان، بەکورتی رووداوێکی نائاسایی روودەدات. ئیدی تێدەگەن مردوەکە ئاماژە دەدات‌و کاتی کارکردن هاتوە پەیکەری مردوەکە دەردەهێننەوەو بەگیایەکی پاککەرەوە دەشۆن، مریشکێك دەکەنە قوربانی‌و خوێنەکەی دەکەن

بەسەر سەری مردووەکەدا، مریشکەکە دەکەنە دوو بەش، نیوەی بۆ خێزانەکەی‌و نیوەکەی دیکەی بۆ مردووەکە ئەوەش بەپەروەردەی مردوو ناو دەبرێت.

(تیۆ) هاواریکرد: واتای چییە؟ سەری مردووەکە پەروەردە دەکەن؟ چ سودێکی هەیە؟

- (عەبدوللایە) پێداگری کرد: ئەوەش بەراستی جۆرێکە لەپەروەردەکردن. لێرەدا پەروەردەکردن بەواتای (فێرکردنی نهێنی) دێت... رازی نوێ فێری مردووەکە دەکەن. وەك لاوێك، بەرگی سپی دەکەنە بەر پەیکەرەکەو پیرۆزبایی گەڕانەوەی لێدەکەن: چونکە ئیدی بۆ ژیانی زیندوەکان گەڕاوەتەوە! سەرئەنجام پەیکەرەکە بەجلوبەرگ‌و نیوە مریشکەکەوە لەدەلقێك رۆدەکەن‌و لەژوری مردووەکەدا هەڵیدەواسن. رووداوەکە هێشتا تەواونەبوە، چونکە سروتی ناشتنی دووەم ماوەو چاوەڕوانی دەکات. چونکە راستە بۆ ژیانی زیندوەکان گەڕاوەتەوە، بەلام هێشتا تەنهایە، لەبەرئەوە بەدواین رێوڕەسم بۆ ناوکۆمەڵی گوندەکە دەگەڕێتەوە...

(تیۆ) بەسەرسامییەوە وتی: پورە (مارتا) ئێمە هەرگیز بەخاك سپاردنی لەوجۆرە سەیرو سەمەرەیەمان نەبینیوە!

- پورە (مارتا) وەلامیدایەوە: گوێ لەپاشماوەی رووداوەکە بگرەو دوایی بڕیاربدە.

- (عەبدوللایە) بەردەوامبوو: لەقۆناغی دواتردا چەندین خێزان کۆدەبنەوە. هەریەك لەو خێزانانە پەیکەری مردووەکە لەناو سەبەتەیەکدا دەهێنێت‌و هەموویان لەخانوی گشتی باوانەکاندا رۆدەنێن. ئێستا ساتی هەستیاری سروتەکە گەیشتوە: ئەو کەسەی بەرپرسی سروتەکەیە پەیکەرەکان دەشوات‌و ئاوەکەشی بەوردی کۆدەکانەوە، پاشان دیاری پێشکەش بەپەیکەرەکان دەکرێت، جلوبەرگیان لەبەردەکرێت‌و هەریەکەیان لەکوپەی تایبەت دەکرێن‌و پیاسەیان پێدەکرێت، خۆراکیان پێدەدرێت‌و وەك کۆرپەی تازە لەدایکبوو بەگوندەکەی دەناسێنن.

- (تیۆ) وتی: مردوی لەدایکبوو!

- بەڵێ، دەمخۆش. پاشان بۆ جاری دووەم هەموویان لەجێگایەکی نهێنیدا بەخاك دەسپێرن‌و ئەمجارە دواجارو هەتا هەتایە. دەڵێن مردووەکان لەسەر بەلەم رۆنیشتن‌و بۆ ناو دەریا رۆشتن.

- (تیۆ) وتی: ئۆو ... ئیدی تەواو بوو!

هێشتا ماوە! دەبێت مردوو لەناو گوندەکەیدا جێگەی هەبێت لەبەرئەوە چەترێك بەناوییەوە لەناو خانوی باوانەکاندا هەڵدەدەن، بەوجۆرە جێگای شایستەی خۆی دەگرێت‌و دەچێتە ریزی باوانەکان.

- هیوادارم ئەوە دواقۆناغ بێت؟ زۆر دورودرێژە؟

- (عەبدوڵلایە) وتی: لەناو کۆمەڵگەی ئێوەدا یەکجار مردوو دەنێژرێت‌و تەواو!. لەرۆشتوانی خێزانەکەت چی دەمێنێتەوە؟ هیچ!. هەموو رۆژێك لە (جەژنی پیرۆزکراوان)[1]دا بۆ گۆڕستانەکان دەچن‌و گوڵ پێشکەش دەکەن، کە ئەوەش هیچ نییە. ئێوە واتای درێژکردنەوەی خێزانتان لەیادکردوە. بەبڕوای من ئەو واقیعە زۆر دڵشادتان ناکات، بەپێی باوانەکان ژیان محاڵە. باوانەکان پشتیوانی ئێمەن‌و دەمانپارێزن، بەڵام ئێوە ئیدی شتێك لەبارەی پشتیوانی‌و پاراستن نازانن. ئێوە تەنهان!

- (تیۆ) بەنارەحەتییەوە وتی: هەرگیز بەوجۆرە نییە! ئێمە لەکوانوی خێزانداین!

- زۆرباشە! ئەی دوای ئەوە؟ درێژەدان‌و بەردەوامی لەگەڵ رابردوو کوانێ؟ ئەی ئەو خێزانەی باسی لێوە دەکەن چییە؟ شتێکی سنوردارو فشەڵە. ئێوە گروپی بچوکن، لەناو بەلەمێکداو لەسەر ئاوی زەریا بەرەڵاکراون.

- (تیۆ) وتی: هیوادارم مەبەستت ئەوە نەبێت بچم پەیکەری باپیرەم دەربهێنمەوەو دەست بکەم بەشۆردنی؟

- نەخێر. ئەو بەشە لەنەریتی ئێوە نییە. چارەڕەشی لەوێدایە لەئەوروپا ئێوە ئیدی تارادەیەك هیچ سروت‌و رێوڕەسمتان نییە. تەنها بەخوایەکەوە گیرساونەتەوە، کە بەخشندەو میهرەبانەو تەواو!. ئێمە بەهۆی باوانمانەوە بۆ خۆمان خواوەندی تایبەتمان دروستکردوە! ئەوەش دڵنیاترە.

ماوەیەکی درێژ بوو پورە (مارتا) لەنێوان گۆڕی سەر سەدەفەکان‌و گوێچکە ماسییەکاندا بێدەنگ دانیشتبوو.

## خواوەند شەکەت نابێت

- بۆ فراوێنکردن چونە چێشتخانەیەك، کە تایبەتمەندبوو لەئامادەکردنی گوێچکە ماسیدا.

- کاتێك نانخورا، (تیۆ) رویکردە (عەبدوڵلایە)و گوتی: ئەوە چۆنە کریستیانەکان دەستکاری ئەو گۆڕانەیان نەکردوە؟

- (عەبدوڵلایە) وتی: بەراستی تۆ شەکەت نابیت!

---

[1]. Toussaint: لەفەرەنسا لەو رۆژەی تایبەتە بە هەموو پیرۆزکراوەکان خەڵکی جەژنی مردوەکان دەگێڕن‌و دەچن بۆ زیارەتی گۆڕی مردوەکان.

- پورە (مارتا) وتی: سەرەتا پێموتیت هەرگیز مێشکی لەچالاکی ناکەوێت. دەبێت خۆمان لەبەڵاکەی رزگاربکەین!

- (تیۆ) بەبێدەنگی مژۆڵی سەیرکردنی درەختی خورماو نارگیل بوو. پاشئەوەی لەسەر کورسییەکە کەوتە جموجوڵو گوتی: حەوسەڵەم نەما، دەتوانم بڕۆم؟

- پورە (مارتا) هاواریکرد: سەرەتا کڵاوەکە بکەرەوە سەرت!

(تیۆ) بۆ دەرەوە رۆشتو پورە (مارتا)و (عەبدوڵڵایە) بەئارامی دەستیان کرد بەخواردنەوەی پەرداخە گێلاسەکەیان. پورە (مارتا) دوبارە داوای شەرابی سپی کرد.

- (عەبدوڵڵایە) وتی: لام وایە (تیۆ) بەتەواوی گۆڕاوە. دەتوانم بڵێم ئیدی نایناسم! گەورەبوە، باری رەواڵەتی باشە، تەندروست دیارە، وێنا نەدەکرا هێندە نەخۆش بێت.

پورە (مارتا) وتی: بەڵام ئیدی نەخۆش نییە.

بەراست وادەڵێیت؟ ئەگەر وابێت زۆر سەرنجڕاکێشە!

دڵنیام.

- (مارتا)... دەبینم بێدەنگ بویت، تەندروستیتان باش نییە؟

- بەهۆی شەرابەکەوە وڕبوم.

ئیدی پورە (مارتا) سەری خستە سەر مێزەکەو خەوی لێکەوت.

- کاتێك (تیۆ) گەڕایەوە (عەبدوڵڵایە) وتی: وابزانم پورت زیادەڕۆیی کردو ئێستا پێویستی بەحەوانەوەیە. پاشان وتی: پێش چەندێك بەرلەئێستا پرسیارێکت لێکردم. پرسیت بۆچی کریستیانەکان (گردۆڵکەی گۆڕستانەکان)یان پاراستوە؟.

(تیۆ) وتی: ئا... بەڵێ، لەیادم کردبوو.

- باشە، بەڵام من لەیادم نەکردبوو. لەئەفەریقا ئاوێتەکردنی کۆنو نوێ قەدەغە نییە. خوای کریستیانەکان باوانەکانی ئێمە سەغڵەت ناکات. بەپێچەوانەوە (هەستانەوە)ی مەسیح بەباشی لەگەڵ گەشتی مردوەکانی ئێمە دەگونجێ.

- پرسیارەکەی من ئەوەیە، کەجێگای خوا لەو هەموو شتە لەکوێدایە؟

- خوای ئەفریقییەکان بەهیچ کلۆجێك لەناو خەڵکدا نییە. لەلای (دۆگۆن)ـەکان ئەم خوایە ناوی (ئاما - Amma)یە. لێرەو لەسەر خاکی (سیریر)ـەکان ناوی (رۆگ – سێن - Sen - Roog)ـەو هەرچۆنێك بێت ئەفرێنەرو دروستکەری جیهانە.

(تیۆ) وتی: خودی مەبەستەکە پڕ لەواتایە!

- بەڵام ئەوەی وتم هێشتا کامڵ نییە. خواوەند مەبەستی خراپی نییە، ئەو لۆژیکییەو ئەوەی بتوانێت دەیکات. کاتێك ئەفرێنراوەکانی بەدەستی ئەو دوچاری چەرمەسەری دەبن (ڕێوی بێڕدنگ) دەردەکاتو دەست دەکات بەنوێژەنکردنەوە. ژیانی خەڵك بەڕێوەنابات، بەڵکو رۆحەکان، واتا باوانەکان ئەوە دەکەن. خواوەند تەنها لەکاتی بەلا گەورەکاندا بەشداری دەکات.

(تیۆ) پرسی: بۆ نمونە زریانێك؟

- وەلامیدایەوە: لەسەر زەمینی (سیریر) لەوەش خراپتر رودەدات. سەرەتا لەدارستانەکاندا مرۆڤەکان، گیانەوەرانو درەختەکان دەژیان، پاشان کەوتنە شەڕو ململانێ. رۆژێکیان لەوکاتەی مرۆڤو گیانەوەران لەدارستانەکاندا خەریکی شەڕو کوشتاربون دژ بەیەکدی درەختەکانیش لای خۆیانەوە بۆ پیاوکوژان گۆڕان... دەبێت یادت بێنمەوە، کە لەوکاتەدا درەختەکانیش دەیانتوانی بدوێن، ببیستنو بجوڵێن. دارستان لەنێوان ئەو سێ لایەنەدا (مرۆڤ، ئاژەڵ، رووەك)دا شەڕگەیەکی تەواو بوو، ئیدی نۆرەی خواوەند بوو بەشداری روداوەکە بکات. سزای درەختەکانیداو لاڵو کوێرو ئیفلیجی کردنو بۆ هەتاهەتایە لەجوڵەکەوتن، بەڵام (رۆگ – سێن) گوێی لێنەسەندنەوە: هەر لەبەرئەوەیە دارودرەخت پیرۆزن، چونکە هەموو شت دەبیستن.

- (تیۆ) وتی: بەڵام ناتوانن هیچ بڵێنەوە.

- ناکرێت لەو بابەتە دڵنیابین. دەبێت بەوریاییەوە مامەڵە لەگەڵ درەختدا بکرێت، رێکوپێك نین، بەڵام (رۆگ – سێن) رەمەکی لێنەسەندونەتەوە. بەڵام سەبارەت بە مرۆڤەکان (رۆگ – سێن) بەوەندەوە وەستا ئەندامو تەمەنیان کورت بکاتەوە، بەڵام نەك هزرو رۆحیان. ئیدی لەوە بەدواوە (رۆگ - سێن) دەستی لەکاروباریان وەرنەدا.

- (تیۆ) وتی: بەوجۆرە بێت ناپەرستن.

- چۆن! (رۆگ – سێن) لەدالآندا وەك رەواڵەتی خۆ ئەستونگەیەکی لەدار دروستکراوی هەیە، کە لقو گەڵاو رەگی جۆراوجۆرو بەردی هەمەچەشنە لەبنیدا دادەنرێتو ئەگەر بەرهەم باش بێت سەرۆکی خێزان برێك شیر دەڕێژێتە بنی. بەڵام بۆ یارمەتیدان داوا (پانگۆل - Pangols)ەکان دەکرێت نەك (رۆگ - سێن).

- (تیۆ) بەدەنگی بەرز وتی: دوبارەی بکەرەوە! پورە (مارتا) ئەوەندە پرخەپرخ دەکات هیچ تێنەگەیشتم!

- وتم (پانگۆڵەکان).

- لەپڕ پورە (مارتا) لەخەو راپەڕیو (تیۆ) وتی: زۆرت پرخاند پیرەژن!
- پورە (مارتا) بەهەراو هوریاوە وتی: ها؟ چی؟ ... خەوتبوم؟ سەعات چەندە؟
- (عەبدوللایە)، کە هەستایە سەرپێ وتی: سەعات، کاتی سەردانی (پانگۆڵ)ـە.

## پێستێکی پەری دەریاییو کوپێك هەرزن

- ئینجا بەناو دارستانێکی (کالیپتۆس)دا رەتبونو گەیشتنە ئاوێکی شین، کە دەچۆوە سەر دەریا.

- (تیۆ) پرسی: ئەم دەریاچەیە (پانگۆڵ)ـە؟

(عەبدوللایە) وتی: نەخێر. (پانگۆڵ) رۆحێکە، بەلام شاعیرێکی گەورەی خاکی (سیریر) گێڕاوێتەوە، کە پەری دەریایی بۆ تێر ئاوبون بۆ ئەم دەریاچەیە هاتونو ماسیگرانی ناوچەکە باش ئەو پەریانەیان ناسیوە!. بۆ راوکردنی پەری دەریا پێویست بوو (پانگۆڵ)ـەکان ئارامییان پێببەخشنو دڵیان بدەنەوە. ئارامکردنی پەری دەریاییەکانیش لەڕێگای گۆرانیو قوربانییەکانەوە مەیسەر دەبوو. تەنها لەو بارەشدا پەرییەکان رازیدەبون بکەونە ناو تۆڕی راوچییەکان، چونکە رەفتاریان لەگەڵیاندا جوانبوو.

(تیۆ) پرسی: ئەوانە بەراستی پەری دەریایین، بەلەشی مرۆڤو کلکی ماسیو دەنگی خۆشەوە؟

- باشە، نەك بەوجۆرە. ئەم پەریانە لەراستیدا جۆرێك گوێرەکەی دەریایین، چونکە ئەم ئاژەڵە ئەندام درشتانە شیردەرن زۆرجار لەگەڵ پەریانی ئەفسانەیی تێکەڵکراون. لێرەدا رۆحی گوێرەکەی دەریایی لەپشتێنێکی سپییەوە دەئاڵێننو وەك ژنی لێدەکەن...

- (تیۆ)، کە بەسەر چاڵاوەکەدا چەمابۆوە، وتی: ئەی پەری گوێرەکە دەمەوێت بتبینم! لەوێدایت وەڵامم بدەرەوە خۆتم پیشان بدە!.

باڵندەیەکی دەریایی، کە لەسەر ئاوەکە بوو، لەدەنگی (تیۆ) ترساو بەپەلە هەڵفڕیو رووی ئاوەکە جوڵەی تێکەوتو پاشان هیچ.

- تیۆ) دەستی بەئاوەکەدا کردو مشتێك پێستی گولگولی رەشی بەدەستەوە هات. هاواریکرد: پێستی پەری دەریایی! پێستی پەری!

- (عەبدوللایە) وتی: لەوانەیە کاژی مار بێت. مارێکی پێستی فڕێدا بێت. هەرکامێکیان بێت چانست هەیە. (تیۆ) رۆحی ماریش (پانگۆڵ)ـە.

- پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: بۆنێکی ناخۆشی لێدێت. تکادەکەم خاوێنی بکەرەوە... بیکەرە زەرفێکی نایلۆنەوە.

- (عەبدوڵلایە) لەکاتێکدا ریزێك قەدی درەختی کۆنی پیشاندەدان، کە پارچە کوتاڵیان پێوەکرابوو، گوتی: لەوێدا لەسەر درەختێکی پیرۆز دایدەنێینو لەوجۆرەش خۆی دەکاتە هاوڕێی (پانگۆڵ)و لەگەڵیدا دەبێتە یەك. ناتەوێت پێستی مارەکەت بۆ ئەو درەختە بکەیتە دیاری؟

- (تیۆ) وتی: هەرگیز مەبەستی ئەوەم نییە.

بەوجۆرەو لەگەڵ راوەشاندنی کیسە نایلۆنەکەی دیارییە خاکێکەی تێدابوو بەهاوەڵی (عەبدوڵلایە) تا یەکەم ماڵی گوندەکە رۆشت. لەناو سێ درەختی گەورەدا، کە دوو چاودێر پاسەوانیان دەکرد، شفابەخش لەکۆلیتەکەیدا دانیشتبوو.

(عەبدوڵلایە) لەگەڵ پاسەوانی بەردەرگاکە، کەوتە چۆنو چاکییەکی دورودرێژو (سنیگال)یانە: تەندروستیت باشە؟ باشیت. ئەی خێزانەکەت باشە؟ دایکت؟ باشە؟ منداڵەکان باشن؟ کاروبار؟ خراپ نییە، دەنگوباس؟ خۆشە. پاش کۆتایی سلاّوو ئەحواڵ پرسی پاسەوان (عەبدوڵلایە)و (تیۆ)ی کردە ژورەوە. پورە (مارتا) پێیباش بوو لای دەریاچەکە بمێنێتەوەو ساردەمەنییەکەی بخوات.

ژورێکی تاریك، کە لەسەر سێ قەد راگیر بوو، زۆر بچوكو سارد بوو. سەربانەکەی لەگەڵاو لقی داری خورما بوو. پارچە کوتاڵێك هەڵواسرابوو. لەناو ژورەکەدا چاڵاوێکی گەورەی پڕ ئاوی سەوزباو چاوەڕێ بوو. ئێسقانی شکاوی مریشك لەگۆشەکەیدا کۆکرابونەوە. شفادەرەکە لەتاریکیدا رۆنیشتبوو.

پیرە پیاوێك بوو یەك لنگ، کلاّوێکی گەورە لەسەر، شاڵێکی سوری لەمل ئاڵاندبوو، دارێکی نەخشکراو بەدەستێکیو دەستەکەی دیکەی لەسەر زەوی بوو. لەسەر سیما پڕ چرچولۆچەکانی رۆڵێکی بێ متمانەیی دەبینرا. ئەم لاوە (تۆبابە – بێگانە)یە دەیتوانی لەچی تێبگات؟ سلاّوو ئەحواڵ پرسی دەستپێکرد. پیرەپیاوەکە گومانی هەبوو. (عەبدوڵلایە) کەوتبوە پاڕانەوە... دواجار پاش بێنەوبەرەیەکی زۆر پیرە پیاوە لەنگەکە کەوتە پێکەنینو ئامادەبوو قسەبکات. رونیکردەوە، کە شفادەر کاتێك رازیدەبێت کەسێك چارەسەر بکات سەرەتا مریشکێك دەکاتە قوربانیو پاشان لەناو ئێسقانی مریشکەکەدا، کە دەیکاتە دوو بەشەوە هۆکاری نەخۆشی کەسەکەی هاتۆتە لای دەدۆزێتەوە. پاشان لەتەشتی تایبەتی وەك گەرماوی دەنێت. نەخۆش

بەروتیو بەچوارمشقی لەناو تەشتەکەدا رۆدەنیشێتو ئینجا شفادەر بەکەوچکێکی دار ئاوی شفا بەسەریدا دەکات. ئاوی ناو لەگەنەکە قوڕاویو جادوییانە دەردەکەوێت.

(تیۆ) پرسی: چی لەناو چاڵاوەکەدایە؟

(عەبدوڵڵایە) وتی: هێندە بەسە دەستی تێڕۆبکەیت، دەتەوێت؟

(تیۆ) دەستی بەناو ئاوەکەدا رۆکردو وردە زیخی خاکیو شێوە سەیری دەرهێنا. پوشو پەلاش بەسەر ئاوەکەوە بوو، کە نەخۆش پاش خۆشۆردنی ئاینیانەی وەك دورخستنەوەی بەلا لەگەڵ خۆی دەیبرد. ئەو زیخو بەردانە بەهۆی بەهرەی سروشتییەوە لەناو دارستانەوە هێنرابون، لەو شوێنەی هەورە تریشقە لەزەویدابوو. ئەوەش زۆر پێشئەوەی شفادەرەکە ئەو بەردانە بدۆزێتەوە رویدابوو. گرفتەکە لەوێدابوو شفادەر چۆن توانیبوی ئەو بەردانە لە ئاساییەکان جیابکاتەوە: وادیاربوو تەنها ئەو دەیتوانی ئەو بەردە خواوەندیانە بناسێت.

(تیۆ) کەتارادەیەك بۆربوو گوتی: شتێکی دیکەش هەیە دەبێت بیزانم.

پیاوە پیرەکە لەکاتێکدا دەمە بێدانەکەی خۆی پیشانی ئەو دەدا وتی: بەڵام وشە هەیە لەم زارەی دەنێم. ئەگەر حەز بکەیت دەتوانم (پانگۆڵ)ی ئەم ناوچەیەت پیشان بدەم.

ئەو (پانگۆڵ)ـەی پیاوە بەتەمەنەکە دەیویست پیشانی بدات دەستەیەك دەسکەوان بوو بۆ گۆتانی هەرزن، کە لەناو خاکیان نابوو. نهێنییەکەش بەهۆی ئەوەوە نەمامەوە بۆ برازا، وەچە بە[illegible]بلاوە. بێدەنگی باڵی بەسەر ئەوناوەدا کێشابوو. ئەو شتەی پیاوە پیرەکە بە (پانگۆڵ) تاوی دەبرد کۆتایی دۆڵێك بوو، کە کەوتبوە نێوان سێ درەختەوەو توانا و وزەی رۆحێکی تێدا حەشاردرابوو...

(تیۆ) هەوڵیدا شتی زیاتر لەو بارەیەوە بزانێت، بەڵام شفادەر بەتوندی خۆی لەرونکردنەوە بوارد. قسەکردن دەربارەی (پانگۆڵ)و ئاشکراکردنی نهێنییەکەی بەتەواوی قەدەغەبوو.

## ئەستێرەی سیریر

لەئەفریقادا رۆژ کورت بوو. کاتی گەڕانەوە هاتبوو. ئۆتۆمبیلەکە ملی رێی گەڕانەوەی گرتبوو، دارخورماو (ئەکاسیەکان) ونبون. پورە (مارتا) هەر باوێشکیدەدا. وردە وردە، کە لەشار نزیك دەبونەوە، پەیکەری زەبەلاحی (بایۆباب)ـەکان دەردەکەوتن.

(تیۆ) هاواریکرد: (بایۆباب)ـەکانمان لەوێدان!

(عەبدوڵلایە) ئۆتۆمبیلەکەی راگرت و گوتی: بڕۆ بزانە (گری یۆ)کانی تێدایە یان نا.
ــەوێت بیروڕای تۆ بزانم. (تیۆ) بڕۆ!

(تیۆ)، کە کاژی ماردەکەی بەدەستەوەبوو، لەسەر نوکی پێ نزیک بووەوە لەسەرخۆ سەری
ـكلۆرێکی گەورەی دارەکەدا رۆکردو کاغەزێکی لولکراوی لەسەر زەوییەکە بینی. هاواریکرد:
ـۆ باسی (گری یۆ)کانت کرد، خۆ ئەمە پەیامێکە!

بەڵێ، بەڵام پەیامی ناو درەختێکی پیرۆز!

- چ شتێکی ئەم درەختە پیرۆزە؟ تۆ دەربارەی ئەوە هیچت بەمن نەگوت!

- لەوانەیە (بایۆباب)ەکەی تۆ پەرەجوی هەبێت.. تیشکی خۆری نێو پەلەکانی دەبینیت؟
ـەڵێ؟ زۆرباشە. رۆحیش بەو جۆرە خۆی پیشاندەدات. رۆژێکیان دوو (سیریر) بەوجۆرە
ۆشنایی ناو پەلەکان دەبینن، بەڵام کاتێك نزیك دەبنەوە هیچ شوێنەوارێکی (بایۆباب)
ـیارنەبوە!. بۆ راوێژکردن چون بۆ لای ژنێکی غەیبزان. ژنە لەو شوێنەدا دانیشت کە ئەو
ـوانە پیشانیان دابوو. لەکۆتایی رۆژدا بەسەرسوڕمانەوە بینیبوی (بایۆباب)ێك لەسەرخۆ
ـەخاك دێتە دەرەوە.

- ئێ، کەواتە درەختەکە یاری چاوشارکێی کردوە؟

- ئەو (بایۆباب)ە زۆر شەرمن بوو. شەو لەخاکەوە دەهاتە دەرەوە تا بەبراکانی بگات، کە
ـەسەر زەوی بون، بەڵام بەرۆژ دەچۆوە ژێرخاك. ژنەکە تەنافێکی لەیەکێك لە لقەکانی بەست و
ـەسەر زەوییەکە جێگیری کرد.

- (تیۆ) هاواریکرد: ئای، لەوێدا پارچەیەکی شڕودڕ دەبینم! ئایا ئەمە (بایۆباب)ی ئەفسوناوییە؟

- (عەبدوڵلایە) پێکەنی و گوتی: کێ چوزانێت؟ لەسەر خاکی (سیریر) هێندە بەسە پارچە دارێك بە دیاردەی پیاودتی لێکبدرێتەوەو گۆزدیەکی سەردو ژێریش ئامازەی ژنێتی بێت... بەڵام (تیۆ) باش گوێم لێبگرە، ئەگەر تۆ ئەستێرەی (سیریر) نەناسیت نە (پانگۆڵ)ەکان و نە (رۆگ — سێن) واتایەکیان نابێت. بڕوانە.

- ئینجا (عەبدوڵلایە) لەسەر زەوی بەچۆکدا هات، خۆڵ و خاشاکەکەی لاداو بەپەنجە ئەستێرەیەکی پێنج گۆشەی دروستکردو گوتی: لێرە، لەنوکی سەرەوەی ئەستێرەکە شوێنی (رۆگ — سێن)ە. لێرەش لەناوەوەی ئەستێرەکە دەرگای (گۆدی) لەنێوان دوو پەلدایە. ئەوەش جێگای مرۆڤە، کە بەهۆی خولگەوە بەخواوەندەوە بەستراوە، کە لەسەنتەری ئەستێرەکەداو

لەسـەنتەری جیهاندایـە. ئێـستا تکادەکـەم لـەژێر (بایۆبـاب)ـەکەدا دانیـشەو پەیامەکـەت بخوێنەرەوە.

- **(سپیو گەنم ئاسا، من خوای تایبەتی ئاوەکانم، لەسەر خاکەکـەم، لەسـەر زەمـینی پـەریانی دەریاییدا چاوەڕێی تۆ دەکەم).**

(تیـۆ) کـە سـوار ئۆتۆمبیلەکـە دەبـوو گـوتی: بـەلام خـۆ مـن ئێـستا لەسـەر خـاکی پـەریانە. مەبەستی چییە؟

- (عەبدوللایە) ئاماژەی کرد: راوێژ بەغەیبزانان بکە... لێرە غەیبزانی شارەزامان هەیە.

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: هەڵنەگەڕێیتەوە!

(تیۆ) توڕەبوو: دەکرێت بێدەنگ بیت؟! تۆ بەتەواوی مەست بویت!

- (عەبدوللایـە) پێیناخۆشـبوو گـوتی: دەوێریـت بێئـەدەبی بەرامبـەر پـورت بکـەیت؟. لەئەفریقادا ئەمکارە قەدەغەیە. کوڕی لاو دەبێت هەرچی دەڵێت جێبەجێی بکەیت.

- (تیۆ) بەناچاری پورە (مارتا)ی ماچکردو لەوەلامی (عەبدوللایە)دا، کەداوایکرد پەیامەکەی بخوێنێتەوە، وتی: ناتوانم، دەبێت لەفەرهەنگەکە بڕوانم.

(عەبدوللایە) وتی: زۆرباشە، هێمایـەکت پێـدەدەم. پـەرییانی دەریـایی لـەوڵاتێکی دیکەشد هەیە. دور، زۆر لێرەوە دورە. بەلام لەهەمان کاتیشدا زۆر نزیکە.

- هەرلەئەفریقایە؟

- بەڵێو نەخێر، لەئەفریقایەکی دیکە.

## بەشی بیستو شەش

# (مانگا، بزنو کەڵەشێرەکانو قوتابی)

### (ندۆپ)

- (عەبدوڵلایە) لەسەر مێزی نانخواردنی بەیانی بابەتەکەی بەمجۆرە دەستپێکرد: (تیۆ)، بەشداری سروتو مەراسیمێك دەکەین کە پێیدەوترێت (ندۆپ – N Doeup). ئەوەش جۆرێکە لەچارەسەرکردنو پیشەی گەلی (لیبۆ - Lebou)یە. ئەوانە پیشەیان ماسیگرتنەو لەسەردەمێکی زۆر کۆنەوە لە (داکار)دا دەژین. ئەم تیمارکردنە زۆر گرنگەو سروتی (ندۆپ)یش نمایشکردنی تێدایە، چونکە خودی نمایشەکەش بەشێکە لەچارەسەرکردن.

- (تیۆ) وتی: کەواتە سەمای ماسکدارەکان دەبینین؟

نەخێر، بەڵام سروتی (ندۆپ) لەسەمای ماسکەکان سەرنجڕاکێشترەو سەرسوڕهێنەرتریشە. ئێوە لەئەوروپا دەرمانو نەشتەرگەری بەکاردەبەن، کە دیارە بەسودە، بەڵام نەك بۆ هەموو شتێك.

- پورە (مارتا) وتی: ئێمە ئەم سەفەرەمان بۆ شارەزابون لەهەمان بابەت کردوە. گەشت زۆرگران تەواو دەبێت، نازانیت چەند گران...

- لەگەڵ ئەوەشدا (مارتا)ی ئازیز ئەوە باش دەزانیت کاتێك باس لەنەخۆشییەك دەکرێت، کە رۆح ئازار دەدات، پزیشکەکانتان دەستەوەستان دەبن لەئاستیدا. لەپێناو ئەوەدا ئێمە گرد دەبینەوەو گروپەکەمان دەستبەکار دەبێت. هەر لەوپێناوەشدا شانۆی خۆمان هەیە.

- (تیۆ) پرسی: شانۆیەکی راستەقینە، بەشانۆو کورسیو شتەکانی دیکەیەوە؟

- نـەخێر. شـانۆی نمایـشەکە خانویـەك، کـەنارێکی دەریـاو دواجـار شـەقامێکە، کـە روداوەکـە لەوێـدا کۆتـایی دێـت. روداوەکە بەوجۆردیـە، کـە لەسـەرەتادا ژنێـك هەسـت بەتەمـەڵی دەکـات، قسەناکات، هەموو رۆژەکەی بەخەوتن بەسەر دەبات، دەگری، خەونی ترسناك دەبینێـت، پاشـان دەچێتە لای پسپۆرێك، کە ئەویش هەر ژنە، چونکە ئەو نەخۆشیانە زیاتر دوچاری ژن دەبن.

- پورە (مارتا) وتی: تا ئێرە ئەو خانمە پسپۆڕەی تۆ بەپزیشکی (دەرونی) ئێمە دەچوێت.

- (عەبدوڵلایە) وەڵامیدایەوە: باوەڕناکەم سایکۆلۆژست یان (پسیکانالیـست)ـەکەی ئێـوە سـود لەکاڵەکی کولاو وەرگرێت، کە بەساغی دەیکولێنێتو ریشەو دەمارەکانی دەکەونـە سـەر ئاوەکـە. پسپۆڕەکەمان ئاوی ناو کولەکەکە دەشێوێنێتو لەسەر بنچینەی درێژی ریشەو دەمارەکانی سەر ئاوەکە دەکەون لەقۆناغی یەکەمدا جۆری قوربانییەکە دیاریـدەکات: نـەخۆش دەبێـت خـەرجی مانگا، بزن، مریشکێك بدات.

- پورە (مارتا) وتی: پسپۆڕی ئێمە دراو دەسەنێتو ئەوەی ئێوەش کرێکەی بەشـێوەی تـوخم، ئەوەش هێندە جیاواز نین!

- (عەبدوڵلایە) سەغڵەتبوو، گوتی: بەلام مانگاکە بۆ خـانمی پـسپۆڕ نییـە، بـەڵکو بـۆ (راپـە - rap)! ئەو داوای مانگاکە دەکات!.

- خوشـکەکەی (عەبدوڵلایـە) وتـی: لـەجیاتی ئـەوەی تورەبیـت باشـترە رونیکەیتـەوە (راپ) رۆحێکە. شفادەر بەپێی ناوەرۆکی خەونەکە دەزانێت کام (راپ) جەسـتەی نەخۆشـەکەی داگیر کردوە. ئایا (رۆح)ـەکە لەلایەن دایکەوەیە یان لەلایەن باوکەوە.

- (عەبدوڵلایە) درێژەپێدا: هەڵدەکەوێت (راپ) بـەهۆی روداوێکـەوە، بـۆ نمونـە پـاش ماتـەم گێڕانێك، روداوێك یان شتێکی نائاساییەوە، بەسەر نەخۆشـەکەیدا زاڵ ببێـت. پـاش چارەسـەری یەکەم نەخۆش بۆ سروت ئامادە دەکرێت، کە ئەگەر هەیە هەشت رۆژ بخایەنێت.

- پورە (مارتا) بەخێرایی وتی: ناتوانین هەفتەیەك بۆ بینینی ئەو شانۆیە بمێنینـەوە، ئیـدی برسـتم لێـبڕاوە. بـەلام قـسە لەسـەر ئـەوە نـەبوو سـ روتی (نـ ـدۆپ) بـەکاملی بـەرپابکرێت، لەبەرئەوەی بەشەکانی یەکەم لەنێوان ئەندامانی خێزانو ـدەبونی گروپی (ندۆپ - کات)، واتـە ئـەو شـفادەرانەی لـەو بـوارەدا پـسپۆربون، سـازدەکرا. لـەم قۆناغـەدا ئـاوی تێکـەڵ بـەگیا دەکرێـت بەسەرنەخۆشـەکەداو وەك سـەردەمی منـاڵی کـوپی شـیری پێـدەدەنو ماودیـەکی زۆر بەماست جەستەی دەهەنون. پاشان سروتەکە دەسپێدەکات، بەجۆرێك کە شفادەر بەبـەردەوامی لەپـەنا گوێـچکەی نەخۆشـەکەدا زەنگۆڵەیـەك لێـدەدات. (گـری یـۆ)کـان تـەپڵ لێـدەدەن، ژنـانی

شفادەر دەستدەکەنە سەماکردنو داوای یارمەتی لەهەوت خودانی (راپ) دەکەن... نەخۆشەکە لەژێر فشاری دەنگی زەنگۆڵەدا هەڵدەستێتە سەرپێو دەکەوێتە سەماکردن.

(تیۆ) وتی: مەرج دەکەم دەچێتە باری بێهۆشیو خەڵوەتەوە.

راستە. بەلام خەڵوەت بەس نییە. پێویستە نەخۆش لەکاتی گواستنەوەیدا بۆ ناو ئەو حاڵەتە بتوانێت ناوی (راپ)ەکەی خۆی بدرکێنێت. لەپێناوی ئەو ئامانجەشدا تەپڵی ژنە شفادەرەکان بەپێی (راپ)ە جۆراوجۆرەکان لێدەدرێت تا سەرئەنجام ئاوازی گونجاو بدۆزنەوە. تەنیا لەوکاتەدایە نەخۆش لەگەڵ ئاوازی (راپ)ەکەی خۆیدا بەناڵەی بەردەوامەوە ناوی ئەو (رۆح)ە دەدرکێنێت، کە ئەوی کۆنترۆڵ کردووەو دەکەوێتە سەرزەوی. ئیدی کارەکە باش ئەنجام دەدرێت!

- (تیۆ) وتی: وەك ئەوەیە بزێیت.

باشە. لەراستیدا دەکرێت بەمەرگیشی بچوێنیت. ئینجا قۆناغی دووەمی (ندۆپ)ەکە بەبەرچاوی کۆمەڵێك خەلکەوە ئەنجام دەدرێتو ئێستا کاتی ئەوەیە بچین بۆ سەردانیان.

پورە (مارتا) بەدەنگێکی کەنەفتو ئارامەوە وتی: هیوادارم دوچاری سەغڵەتیمان نەکات؟

## (راپ)ەکان لەناو زەمیلەیەکدا

بەگۆڕەپانێکی چۆڵو بێدەنگ گەیشتن، کە بەخانوی بچوك دەورە درابونو منالانی خەوالوو ژنان بەباوێشکدانەوە دەهاتنە دەردوە. دانیشتوانەکە خەریکی خواردنەوەی ئاوی هەرزنو ماست بون لەسەر ئەو مەنجەلانەی بەپشکۆ دەکولان، هیچ پەلەپەلێك لەئارادا نەبوو. لەژێر درەختێکی ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا پیرەژنی شەفادەر چاوەنواڕی لەخەو رابونی پیادەکان بوو.

- (عەبدوڵلایە) بەچرپەوە وتی: ئاگادارتان دەکەمەوە کەمێکی دیکە شتێك دەبینین کەموزۆر دەگمەنە. ئەمجارە نەخۆشەکە پیاوە نەك ژن.

پیاوە نەخۆشەکە بەبێجوڵە بەچاوانی نیوەکراوەوە لەژێردەستی پیرەژنەکەدا دانیشتبوو، کوڕێکی لاو بوو بەکراسێکی سپی سادەوە، کە بەنێکی چەوری لەناوچاوان بەستبوو. کەمێك لە (تیۆ) منالتر دیاربوو، بەلام لەراستیدا تەمەنی سی ساڵان بوو.

پیرەژنی شفادەر نەخۆشییەکەی دۆزیبۆوە. کوڕە لاوەکە بەهۆی زاڵبونی دوو رۆح لەلایەن دایکیەوە نەخۆش کەوتبوو: رۆحی دارستانو رۆحی دەریا؛ نەخۆشییەکەی نەخۆشییەکی راستەقینەبوو. پێشتر (راپ)ەکان دایكو باوکی ئەو لاوەیان کوشتبوو. لەبەرئەوە پیرەژن رونیکردەوە؛ کە بۆ چارەسەرکردنی هەڵدەستێت بەتیمارکردنێکی گەورەو نۆبەنێك، بزنێك،

سێ کەڵەشێر دەکاتە قوربانی. پێشئەوەش دەبێت سروتی پیرۆزو نهێنی ئەندازەگرتنەکان ئەنجام بدات.

- (تیۆ) لەسەرخۆ وتی: ئەندازەگرتنەکان؟ بەئامێر ئەندازەگیری بۆ دەکەن؟

- (عەبدوڵڵایە) وتی: هەمووجۆرو چەشن! بەڵام دەبێت بێدەنگ بیت.

لەسەر راسپاردەی (عەبدوڵڵایە دیوب) (تیۆ)و پورە (مارتا) بەپێی پەتی چونە ژورێکەوە، کە گروپی شفادەرەکان لەوێدا تیماری نەخۆشیان دەکرد. ژنانی ئەندامانی خێزان، کە لەسەر حەسیرێك درێژببون. بەلولەیەکی بچکۆلە ددانەکانیان خاوێن دەکردەوە. نەخۆشەکە لەناوەڕاستی ژورەکەدا قاچەکانی درێژکردبوو، بێدەنگ لێیڕاکشابوو، شفادەرەکان بەشی سەرەوەی جەستەی نەخۆشەکەیان روت کردەوە. پارچە کوتاڵێکیان وەك کفن لەسەروی سەریانەوە داناو لەسەر ناوچاوانی قەدکردو خستیانە ژێر ناوچاوان بەنەکەیەوە. سازکردنی نەخۆشەکە لەبێدەنگییەکی تەواودا دەستیپێکرد.

خانمە شفادەرەکان حەوت تاڵ دەزوی سپیان لەبەکرەیەك کردەوەو لەسەر ناوچەوانییەوە تا نوکی پێیو لەسەر ئەژنۆکانی دەزوەکانیان دانا. پاشان خانمی سەردەستەی شفادەرەکان لەکیسەیەکی پلاستیکیدا تورەکەیەکی سوری هەڵدوراوی دەرهێنا، کە ریشاڵو لقو پۆپی تێدابوو، پاشان هەمویانی لە زەمیلەیەکی پڕ لەهەرزن کرد، ئینجا بەهۆی لولەیەکەوە بۆ سەر سەری نەخۆشەکە فوی پیاداکرد. دەستوری ئەندازەگیری دەستیپێکرد. زەمیلەکەی خستە ژێرپێی نەخۆشەکە، دەستی لەسەری خشاندو دەستی هێنایە سەر کەمەریو لەسەر ئەژنۆکان وەستا.

ژنەی سەردەستەی شفادەرەکان بەهێواشی فەرمانی دەرکردو کەسە نەخۆشەکە دەستی هاویشتە سەر زەمیلەکە، هەرزنی بەسەرداکرد، دوو ریشاڵ راستبونەوە. دەنگێکی پەسەندکردن لەئامادەبونەوە هەستا.

- (عەبدوڵڵایە) وتی: ریشاڵەکان نیشاندەری دوو (راپ)ن. ئێستا دەبێت لەگەڵ دوو (راپ)ەکان زەمیلەکە لەسەرەوە هاوسەنگ بکات.

ئەوکارە بەباشی بەئەنجام نەگەیشت. زەمیلەکە ملکەچ نەدەبوو، بەملاولادا دەخزا. شفادەرەکە بەجوڵەیەکی فەرماندارانەوە لەریشاڵو هەرزنەکەی دەدا تا (راپ)ەکان ناچار بەهاوسەنگی بکات... دواجار زەمیلەکە لەجێگای خۆی وەستا. (راپ)ەکان خۆیان رادەستدابوو. شفادەرەکە بەسەر نەخۆشەکەدا شکایەوە، لەکاتێکدا پەنجەی دۆشاومژەی دەجوڵاند لەگەڵیدا گفتوگۆی دەکرد.

- (عەبدوللایە) وتی: دەیەوێت ناچاری بکات ناوی (راپ)ـەکانی بڵێت.

نەخۆشەکە بەگرانی دوو ناوی درکاند. کفنەکەی هەڵگرت، جلەکانیان لەبەرکردەوە، بەنێکی چەرمیان لەسەر ناوچاوانی بەست.

(عەبدوللایە) وتی: ئێستا (تیمار) کراوە. بۆ پاشماوەی سروتەکە جلوبەرگی لەبەردەکەن.

کاتێك (تیمارکراو) لەماڵەکە چوە دەرەوە لەبارێکی بەخۆنازیندابوو. کلاوێکی رەشی نوك تیژ لەسەری، بەنێك بەناوچاوانی، سێ پشتێنی (رەش – شین) لەسەر کراسەکەی‌و دەزویەکی سپی، کە حەوت گرێی لێدرابوو، بەدەستی راستەیەوە بوو، کە بەرزی کردبۆوە. نۆبەنە قاوەییەکەیان بەبەستراوەیی هێنایە گۆڕەپانەکە، دەنگی لێدانی (تام - تام)ی تەپڵەکان بەرزبۆوە، قوتابییەکە کەوتە سەماکردن‌و ریزێك منالّ بەرەو کۆڵانەکان کێشیانکرد...

- (عەبدوللایە) وتی: دەبێت لەبەردەم هەموو ماڵێکی گوندەکەدا سەما بکات، با بچین بۆ کەنارەکە، لەوانەیە ئەم نمایشە درێژە بکێشێت.

## سوارچاك بەسواریی

لەژێر کۆڵێتەیەکی لەپوش دروستکراودا دانیشتن. پورە (مارتا) هەر باوێشکیدەدا. ئاسمان گری دەباراندو (با)یەکی توند هەڵیکردبوو. لەو دەوروبەرە منالآن راکەراکەیان بوو. کچە بچوکەکانیش بۆیان دەڕوانین... پاش ساتێ: دەنگی (تام – تام)ی دەهۆڵەکان کەوتنە بەرگوێ، ریزی منالآن لەسەر لەپالّ و شەپۆلی کەنارەکەدا دەرکەوتن. (تیۆ) بەراکردن خۆی گەیاندە ئاپۆرەکە. کەنارەکە پڕبوو لەخەڵکی رەشپێست.

بەراستی دەریا ئارام بوو. کەفی سپی شەپۆلەکان بەسەر لە قاوەییەکەدا دەخشا. ئاسمان رەنگێکی قوڵی هەبوو، وا پێدەچوو نۆبەنەکە بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ جەژنێکی بێگوناهانە بۆ خۆشۆردن بچێت. لەهەموی سەیرتر لاوە ناوچاوان بەستراوەکە پەتەکەی دەستی بەئاماژەی سەرکەوتن رادەوەشاندو وەك چالاکی کارمامزێك لەسەر بەردەکان ئەمبەرو ئەوبەری دەکرد.

- (عەبدوللایە) وتی: دەیانەوێت نۆبەنەکە بەرەو زەریا ببەن تا پیشانی (راپ)ی دەسەلاتداری (داکار)ی بدەن، کە لەسەر کەفی سپی شەپۆلەکان دەژی... بڕوانە ئاژەڵەکە ورپایە.

- (تیۆ) وتی: وامدەزانی ئاژەڵێکی دڕندەیە!

- (عەبدوللایە) وتی: ئێمە هەمیشە دەڵێین مانگا، چ دڕندە بێت یان نا.

پیرەژنی شفادەر لاوەکەی لەخۆی نزیك کردەوەو هاویشتییە سەر پشتی ئاژەڵەکە، کە لەپێ
شەپۆلەکاندا وەستابوو. تیمارکراوەکە بەئاماژەی سەرکەوتن دەستی بەرزکردەوەو خەڵکەکەت
هاوکات لەگەڵ بەرزبونەوەی دەنگی تەپڵەکان هاواری خۆشیان کرد.

- (عەبدوڵلایە) وتی: دەزانیت چی دەڵێن؟ هاوار دەکەن (سوارچاك سواری ئەسپ بود!
ئێستا تیمارکراوەکە لەباری بەریەککەوتنێکی جەستەییدایە لەگەڵ نۆبەنەکەی‌و دەبێت ود
ئەوەی (راپ)ـەکان لێیدەخوازن بیکاتە قوربانی.

- (تیۆ) هاواریکرد: تکادەکەم نەڵێی دەیکوژن!

- (عەبدوڵلایە) وتی: (راپەکان) داوای لێدەکەن، ئەگینا هەر بەنەخۆشی دەمێنێتەوە. یان
ئاژەڵ یان ئەو!

- (تیۆ) وتی: لێرەدا ئاژەڵەکە چی لەدەست دێت؟ خۆ ئەو نەخۆش نییە!

(عەبدوڵلایە) وتی: تا ئێستا نەخێر، بەڵام ئەوکارە لەویشدا رودەدات.

ئینجا دووبارە (گا)کەیان بۆ گۆڕەپانەکە بردەوەو پاڵیان خست‌و نەخۆشەکەیان خستە
سەرپشت‌و دەستێکیان خستە سەر پێستەکەی. پاشان بزنێکیان هێناو لەتەنیشتییەوە دایاننا.
شفادەر بۆ ئەوەی (گا)کە بکاتە قوربانی پیرۆز سێ قۆچی نەزرکراوی گەورەی لە دەوری
ئاژەڵەکە چەقاندو ریشاڵێکی رەشی لەورگی رۆکردو پاشان ژنانی ئەندامانی خێزانەکە پشتێکی
رەنگاوڕەنگیان بەسەر لاوەکەو دوو ئاژەڵەکەدا هەڵدا. جگە لە هەناسەکانی (گا)کە لەژێر پارچە
کوتاڵەکانەوە هیچ جوڵەیەکی دیکە نەبوو. شفادەر کەلەشێرە سپییەکانی گرت، کەبەیەکەوە
بەسترابون، سەرەوخوار دەیگێڕان.

- (عەبدوڵلایە) بەچرپەوە بە (تیۆ)ی وت: ئەوە نوازشیان دەکات. پەڕی کەڵەشێرە
زیندووەکان نەرم‌و خۆشییە بۆ (راپ)ـەکان کاتێك دەچنە جەستەی گاکەوە.

کات تێدەپەڕی‌و (تام – تام) دەنگی دەدایەوەو لەپڕێکدا هەمووشت بێدەنگ بوو، ئینجا ژنە
شفا دەرەکان ژنانی خانە خوێیان هەستاندو کەوتنە سوڕانەوە بەدەوری ئەوانەی ژێر
پەردەکانداو لەگەڵ چەرخەلە لێدانی هێواش‌و دەنگی تەپڵەکاندا گۆرانیان دەوت.

(تیۆ) بەنیگەرانییەوە وتی: ئەو لاوەی ژێر پەردەکە لەگەڵ (گا)کەدا چیدەکات؟ ئەی ئەو
ژنانە چ جۆرە گۆرانییەك دەڵێن؟

(عەبدوڵلایە) بەچرپەوە وتی: خەریکن لەهەموو جنەکان دەپاڕێنەوە. لە (راپ)ی لاوەکە
دەپاڕێنەوە تا لەجەستەی نەخۆشەکە دەرچێت‌و بچێتە جەستەی ئاژەڵەکەوە. تیمارکراوەکە
لەو رێچکەیەدا دەمرێت‌و زیندوو دەبێتەوە.

- چۆن دەمرێت؟.

بەڵێ، بەڵام بەجۆرێك هەڵسوكەوت دەكەن وەك مردبێت تا بتوانن دوایی وایدەربخەن لەدایك دەبێتەوە. كەمێك لەمەوبەر كە سەبەتە هەرزنەكەیان رۆدەكردە ژێرپێی بۆ ئەو مەبەستە بوو تا (راپ)ەكەی لەسەریەوە بۆ قاچەكانی بەرەوخوار كێش بكەنو ئامادەی هاتنە دەرەوەی بكەن. تێگەیشتیت؟ بۆ جۆرێك لەدایكبونیان ئامادەكرد، كە تیایدا رۆڵی كۆرپەلە دەبینێت.

(تیۆ) وتی: هەمان كاری بۆ باوانەكانی دەكەن؟ مردو پاشان زیندوبونەوە؟

دەكرێت بەوجۆرەش بوترێت. ئێستا ئەگەر بیانەوێت رۆحەكە بچێتە جەستەی (گا)كەوە دەبێت سۆزی بجوڵێنن...

- هەر لەبەرئەوەیە ئەم ژنانە دەگرین؟

- ئەوە كارێكی پێوسیتە! رشتنی فرمێسك سۆزی (راپ)ەكان دەجوڵێنێت. ئەگەر بیانەوێت جارێكی دیكە نەخۆشەكە لەدایك ببێتەوە دەبێت بگرین... دەبینیت، خەریكە لەنێو پەردەكەوە دێتە دەردەوە. دیارە ئێستا راپەكان چونەتە جەستەی (گا)كەوە.

- (تیۆ) پرسی: بۆچی دەچنە جەستەی مرۆڤەوە؟ چ بیركردنەوەیەكی سەیرە؟

- (راپ)ەكان زۆر بەدگومانو راوچین! ئەگەر توڕە ببنو دەچنە ناو جەستەی تۆوەو لەسەرتدا دەبن... ئیدی هیچ چارەیەك نییە ئەوە نەبێت بخرێنە ناو جەستەی (گا)، (بزن)یان كەڵەشێرێكی سپییەوە، بەپێی حەزو ئارەزوی خۆیان. ئەمڕۆ پێشبینی زیاتریان هەیە، بێگومان چونكە دوانن. بڕوانە، ئێستا شفادەر دوبارە تیماركراوەكە زیندوو دەكاتەوە. ژنەكان ژیربونەوە. شفادەر لە بێدەنگیەكی رەهادا نەخۆشەكەی خستەسەر پشتی گاكەو كە بەلولەیەك ئاوی دەكرد بەسەریداو (تعمید)ی دەكرد لە دواجاردا چوار هێلكەی بەسەر ئاژەڵەدا شكاندو شلەمەنیە سپیو زەردەكەی بەجەستەیدا هاتەخوارەوە.

- (عەبدوڵلایە) رونیكردەوە: هێلكەتۆی ژیانە. ئێستا (گا)كە هەڵگری خوایەكە، لەبەرئەوە هەموو كەس دەتوانێت لەگەڵیدا بدوێت... باشە چاوەكانت بكەرەوە!

سەری ئاژەڵەكەی هەڵبڕی، دەمی داپچڕی، بیمارەكە چەمییەوەو چەند وشەیەكی بەگوێی (گا)كەدا چرپاند. لیكی هاتە خوارەوە. ژنانی خانەخوێش یەكە بەیەكە هاتن، چەند وشەیەكیان لەگەڵ (گا)كە وتو تفیان لەدەمی پیرۆزی رۆكرد. شانۆگەرییەكی سەرنجڕاكێش بوو!

- (عەبدوڵلایە) بەهێواشی وتی: ئێستا ئاژەڵەكان دەكەنە قوربانی. تۆ هیچ نابینیت، پێویست ناكات چاوت بگریت... ئێستا دەیانەوێت لەگۆڕەپانە بێدەنگەكەدا سەریانبڕن.

- (تیۆ)، کە بەپەنجەکانی گوێی ئاخنیبوو، بەناڵەناڵەوە وتی: چۆن لاوەکە چارەسەرکرا؟

- هیچ مەترسە: بەیەك لێدان دەیانکوژن تا ئازارو رەنج نەکێشن دوای ئەوەش خوێنی قوربانییەکان کۆدەکرێتەوەو تاجەستەی قوربانییەکەی پێبشۆن.

- شتن بەخوێن؟ شتێکی نەفرەتاوییە؟

- بەڵام لای ئێمە خوێن پاکژکەرەوەیە، پارێزەرو چاودێرە... لەژێر چاودێری ئەو خوێنەدا تەواوی شەو دەنوێت. شفادەر لەدەمارەکانی (گا)کە ملوانکەیەك بۆ ملیو دوان بۆ قاچەکانی نەخۆشەکە دروست دوکات. سپێدە دەم نەخۆشەکە دەتوانێت ئەڵقەکان لەگەردنو ملی داماڵێتو خۆی بشواتو ئیدی جەستەیەکی نوێی دەبێتو (راپ)ەکان لەجەستەی دەرچون.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە پرسی: بۆ کوێ دەچن؟

لەهەمان کاتدا لەسەر کەنارەکە، کە پێستی گاکە دەگرون تا گۆشتەکەی ببەخشنەوە، بەرێز (دیوپ) بەئارمییەوە بۆ (تیۆ)ی رونکردەوە، لە بۆ نیشتەجێکردنی (راپ)ەکان شفادەر لەناو ماڵی خانەخوێکەدا میحرابێکیان بۆ دروست دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا شفادەرەکە لەچەندین مەنجەڵدا کولەکەی کولاو، گۆشتی قوربانی، قۆچەکان، دەمارەکانو هەرزنی لەبەردەستدایە رۆیان دەکاتە سەرخاكو دەسنەی تایبەتی کوتانی هەرزن لەدۆڵدا، کە بۆ (پانگۆڵ) خۆی گۆڕیوە دەکاتە ئەوێوەو لەو ساتە بەدواوە نەخۆشی تیمارکراو دەبێتە ردهبانی (راپ)ەکانی خۆی.

دەنگی تەپڵەکان نەمان. تیمارکراو لەگەڵ شفادەرەکانیدا بەرەو ماڵ بووەوە. خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد، گۆڕەپانەکە بێدەنگیو دەریا شڵپوهوڕی خۆیان بۆ گەڕایەوە. (تیۆ) لارەولار دەڕۆشت. (عەبدوڵلایە) ئەوی دانیشاند. ئینجا زانی، کە پورە (مارتا)ی دیارنەماوە. بەڵام پورە (مارتا) بزر نەببوو، لەناو بەلەمێکی ماسیگرتندا سەری خۆی کزگرتبوو، دەسرێکی بەدەمییەوە گرتبوو. (عەبدوڵلایە) کۆمەکی پێکرد هەستێتە سەرپێو بۆکسێکی تونی سرەوانده پشتیو نزگرەکەی نەما.

- (عەبدوڵلایە) وتی: رەنگت بەڕوتەوە نەماوەو برازاکەشت دوچاری هەمان حاڵەت بوە. وەرە لەتەنیشتیەوە دانیشە.

پورە (مارتا)و (تیۆ) لەتەنیشت یەکدییەوە لەسەر لەکە درێژبون تا هێدی هێدی هۆشیان هاتەوە بەخۆیاندا. (عەبدوڵلایە) بەبیانوی گەڕان بەدوای گوێچکە ماسی لەکەنار دەریاکە کەوتە پیاسەکردن تا ئەو دوانە پێکەوەبن.

- (تیۆ) بەهێوری وتی: پێمبڵێ ئایا (ئاینمیزم) هەمان ئەوشتە بوو بینیمان؟

- پورە (مارتا) وتی: بەڵێ، ئەگەر (ئاینمیزم) بریتی بێت لەرێزدانان بۆ ئەو رۆحانەی نابینرێن‌و دەتوانن کۆنترۆڵی ژیانی خەڵك بکەن، ئەوا هەمان شتە.

- بەڵام من وامدەزانی (سینگاڵ)یەکان موسڵمانن! لەقورئاندا باس لەو جۆرە رۆحانە نەکراوە!

- لە (قورئان)دا باس لە (جنۆکە – جن)کراوە، لێرە بەجنۆکە دەڵێن (پانگۆڵ) یان (راپ). (گا) دەکەنە قوربانی، بەڵام لەهەمان کاتیشدا ناوی (الله) دەبەن.

- ئێ، وەك هەموو شوێنەکانی دیکە. هەمان (سنکرتیزم)!

- پورە (مارتا) بەناڵەکردنەوە وتی: بریا ئەم (تام – تام)ی دەنگی دەهۆڵانە منیان کاس نەدەکرد!. ئەو دەنگە نەخۆشم دەخات!

- (تیۆ) وتی: بەهۆی بینینی خوێنەوەیە.

- پورە (مارتا)، کەچاوی لێکدەنا وتی: ئیدی بێدەنگ بە، زۆر ماندوم.

کچۆڵەیەك بەپشیلەیەکی بچوك خەنییەوە لەنێوان شەپۆلەکاندا یاری دەکرد. (تیۆ) بەرەو لای رۆشت. کچۆڵەیەکی شۆخ بوو، کە کراسێکی سوری لەبەردابوو، قژەکانی لەسەر تەپڵی سەری کۆکردبۆوە. کاتێك (تیۆ) لێینزیك بووەوە سەری هێنایە پێشەوەو پشیلەکەی بۆ راگرت ئاژەڵێکی خەنەیی جوان چاوشین بوو، (تیۆ) لەسەرخۆ پشیلەکەی وەرگرت. کچۆڵەکە، کە وردە وردە دوردەکەوتەوە، هاواریکرد (بۆخۆت!).

- (تیۆ)، کە بەپەنجە پشیلەکەی دەلاواندەوە، لەژێر لێوەوە وتی: پورە (مارتا) پێیخۆش نابێت! هەرچۆنێك بێت بەخێوت دەکەم بچکۆلەکەم!

سەیرەکە لەوەدابوو پورە (مارتا) لەتاو کەنەفتی خۆی هیچی نەگوت. (عەبدوڵلایە) پێشنیاریکرد، کە لەوانەیە پشودانێکی کورتی پێش نانخواردنی نیوەڕۆ خراپ نەبێت. پورە (مارتا)و (تیۆ) ئیدی چاوەنوارِی درێژەی بابەتەکە نەبون. هەر کەگەیشتنەماڵەوە هەردوکیان چونە سەرجێگای خەوتن. بێچوە پشیلەکە خۆی گرمۆڵە کردو لەلای قاچی خاوەنە نوێیەکەوە نوست. (عەبدوڵلایە) لەهۆڵەکەدا چاوی بەخوشکەکەی کەوت.

(ئانتا) پرسیاری روداوەکەی لێکردو ئەویش وەڵامیدایەوە: هاورێکانمان نەیانتوانی باش تەحەمول بکەن. بۆ لاوەکە ئاساییە، بەڵام خۆ (مارتا) ئەفریقا دەناسێت!

- (ئانتا) وتی: دەبێت وەك منالی تازە لەدایکبوو رەفتاریان لەگەڵدا بکەین. کاتێك لەخەورابون دەبێت نانبخۆن.

هێشتا زەردەی مابوو لەخەو رابون: پورە (مارتا)، (تیۆ)و بێچوە پشیلەکە. (ئانتا) شیری بۆ منالەکەی خۆی کردو بۆ میوانەکانیش مریشکی ساردو سێوی دانا. پشیلەکە، کە لەسەر باوەشی (تیۆ) رۆنیشتبوو پاشماوەی خواردنەکەی خوارد.

- (تیۆ) بەبیرکردنەوەوە پرسی: کامیانە؟ گای قوربانی؟ لەئاسیاش ئاژەڵ دەکەنە قوربانی، کە رۆحەکان جەستە داگیردەکەن؟ لەهەموو جێگایەکی جیهان، تەنانەت لە (فەرەنسا)ش، ئەگەر باش گۆشەو کەناری گوندەکان بپشکنێت هەمان دیاردە دەبینیتەوە.

- (تیۆ) هاواریکرد: بەڵام لەهیچ شوێنێکی جیهان خەڵکی وادەست ناکەوێت ناوسکی ئاژەڵان دەربهێنن و لەسەر زەوی رایکێشن.

- بۆ نابێت! لەیادی مەکە من کۆمەڵناسم و کتێبم خوێندۆتەوە... لەخوارووی ئیتالیا ژنان وەك جاڵجاڵۆکە تەون دەچنن و خۆیان دەڵێن لەکێلگەدا جاڵجاڵۆکەی ژەهراوی بونی نییەو دوودم لەدیدی پزیشکییەوە هیچ ژەهرو پێوەدانی زیندەرێك نییە، کە کاریگەرییەکەی دوای ساڵێك دەرکەوێت. بەمپێیە...

- (تیۆ) گەیشتە ئەو دەرئەنجامە: پشوو دەدەن.

- (ئانتا) وتی: نەخێر، ئەو ژنانە کراونەتە خانەخوێ. بەڵگەش ئەوەیە کەدەڵێن تەنها ئۆرکسترایەکی مۆزیکا دەتوانێت چارەسەریان بکات. لەبەرئەوە ئاواز دانەران دەهێنن و نەخۆشی (پەزپەزە گەستو) بەلاساییکردنەوەی جوڵەی جاڵجاڵۆکە لەگەڵ ریتمی مۆزیکا لەسەر زەوی دەخزێت و دەڕوات. ئەمکارەش چەندین رۆژ دەخایەنێت و ژنە چارەسەر دەبێت. ئینجا ساڵی دواتر لەرۆژی ساڵیادەکەدا رووداوەکە دوبارە دەبێتەوە. باشە، ئەی ئەوە چ جیاوازییەکی لەگەڵ سروتی (ندۆپ)ی ئێمە هەیە؟

- (تیۆ) وتی: جاڵجاڵۆکەکان (راپ) نین.

- دیارە وایە! لەتۆ دەپرسم چ جیاوازییەك لەنێوانیاندا دەبینێت؟

- (تیۆ) وتی: نەقوربانیی و نە خانەخوێی... مەرگو دوبارە ژیانەوە؟

- (ئانتا) وەڵامیدایەوە: ئەوە یەکەم جیاوازییە. بەبڕوای تۆ ئایا جیاوازی دیکەش هەیە؟

- پورە (مارتا)، کەتا ئەوکاتە هیچی نەگوتبوو، گوتی: دەنگی (تام — تام)ەکان.

- (ئانتا) بەپێکەنینەوە وتی: بەڵام هێشتا ئەو رووداوە تەواو نەبوە! سبەینێ بەدوورودرێژی دەیبینیت!

- پورە (مارتا) بەروترشییەوە وتی: دەزانم!

- (تیۆ) بەخۆشییەوە وتی: چەند باشە، تەنها (تام - تام)؟

بەراستی ئەوە ناخۆشە.

## (جن گرتوەکان)

دواین بەشی (ندۆپ) لەگۆڕەپانێکی بچوکدا ئەنجام دەدرا. ئاپۆرەکە بەوردی لەو بازنەیەیان دەنواڕی لەلایەن شفادەرەکانەوە دروستکرابوو. قوتابی نوێ، کە لەخوێنی (گا) کە پاککرابوەو ریخۆڵە لەگەردن و قاچەکانی کرابۆوە، بەنێوچەوان بەسترَاوییەوە لەناوەڕاستی ژنانی شفادەردا دانیشتبوو.

شفادەری راستەقینە بەزدنگۆڵەکەی بەگوێچکەی نەخۆشەکەدا زەنگی لێدا. هەموو کەوتنە لەرزە. قوتابییەکە لەرزەیەکی توندی گرت و (گری یۆ)کان دەستبەکاربون. لەگەڵ دەنگی گەورەی دەهۆڵەکان (راپ)ـەکانیان دەجولاندو بەدڵنیاییەوە فەرمانیان پێدەدات، کە خۆیان بەجەستەی جنۆکە گیرەکاندا بکەن و بەتوندی کەوتنە دوای ژنانی ناو بازنەکە. یەکەمین ژن خۆیرادەستدا، لەکاتێکدا چاویان دەرپۆقیو بوو بەهەناسە بڕکێوە بەدەوری خۆیاندا دەسورانەوە. بەلەرزەوە، لەکاتێکدا خۆیان رادەتەکاند سەریان بۆ دواوە دەبرد.

- (تیۆ) وتی: بۆچی وادەکەن؟

- چونکە هەریەك لەو ژنانە (راپ)ـەکەی خۆی بجولێنێت تا قوتابییەکە بخاتە ناو بازنەی شفادەرەکانەوە. دەبێت هەموو ئەو ژنانە بێهۆش ببن، چونکە بەبێئەوە سروتەکە دوایی نایەت.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: هەریەك لەو ژنانە (راپ)ێکی هەیە؟ کەواتە هەمویان لەلایەن (راپ)ـەکانیانەوە کراونەتە خانەخوێ؟

- بەڵێ، بەبێ جیاوازی! بەوجۆرە دەتوانن چارەسەربکرێن. سەرەتا دەبێت خۆیان تیماربکەن. بەڵام تیمارکراوە لاوەکە هێشتا نەگەیشتۆتە قۆناغی کۆتایی... بڕوانە.

- (گری یۆ)کان چواردەوری تیمارکراویان دابوو ئیدی رەهایان نەدەکرد. قوتابییەکە. کە بەهۆی دەنگی تەپڵەکانەوە راستببۆوە، زمانی دەرکێشاو بەقریشکەوە کەوتە سەر زەوی. بەڵام هێندە بەس نەبوو. (تام – تام) هێشتا تینوی ئەو ژنانەبوو خۆیان رادەستنەدابوو. (راپ)ی ناو ئەو ژنانە هێشتا بەرگریان دەکرد!. لەنێوان ژنەکان و (تام –تام) جەنگێکی مەغلوبە بەرپاببوو. ئاوازی تەپڵەکان وەك دەنگی هەورەبروسکەیان لێهات و هەروەها هاوارو قیژەی ژنەکانیش گوێیان کەڕدەکرد.

- (تیۆ) هاواریکرد: پورە (مارتا) ئاگاداری خۆتبە!

- پورە (مارتا) بەگێژبون و بێئاگاییەوە پێ لەسەر پێ لەگەڵ دەنگی ئاوازەکە سەمای دەکرد. (عەبدوڵلایە) هەوڵیدا رایگرێت.

- (تیۆ) بەسەر سوڕمانەوە وتی: ئاگاداری بکە خەریکە دەکەوێت!

پـوریٚ گیـان بـەریتمێکی رێـك هـەروا دەجـولاو چـاوەکانی داخـستبوو. (تیـۆ) شێتئاسـا لـە (عەبدوڵلایە)ی دەنواڕی کە پـورە (مارتـا)ی گرتبـوو، لـەپڕ هـەموو شـتێك وەسـتا. هـەموو ژنـە شفادەرەکان لەسەر زەوی کەوتبوون. (تام – تام)ی پیرۆز لەلێدان کەوتبوو. (عەبدوڵلایە) پـورە (مارتا)ی بۆ ناو ئۆتۆمبیلەکە بردو ئاژوی.

- بە (تیۆ)ی وت: قسەی لەگەڵ نەکەیت.

- مەترسی هەیە؟

- نەخێر، بێهۆشبونێکی بچوکبوو، شتێکی ئەوتۆ نییە، رودەدات.

- چۆنە بۆ نەخۆشخانە برۆین، لەوانەیە واباش بێت.

- نەخێر، لێرە هەر هێندێك ئازار شکێنی پێدەدەن... ئەگەر ماوەیەك بخەوێت باشدەبێت.

- (تیۆ) پێداگریکرد: دڵنیایت؟ پورم خەڵکی ئەفریقا نییە، ئایا باش دەبێت؟

- وەکو تۆ لە (لۆکسۆر). فەرموو، چاوەکانی کردەوە. هیچ نەڵێیت!

- پـورە (مارتـا) لـەو حاڵەتـە خەوئاسـایە بەئاگاهاتـەوە. بەهێواشـی ورتـەی دەهـاتو وشـەی ریزدەکرد، کە لەهەمووی ئەوە دەزانرا، کە روناکییەکی بەتینی بینیوە، هەستی کردوە وەك پەڕ سـوك بـوەو گـەرم داهـاتوە. (تیـۆ) دەسـتی گـرت. پـورە (مارتـا) نـەخۆش نـەبوو، بـەلام زۆر خۆشـحاڵبوو. خەندەیـەك بەسـەر لێوییـەوە بـوو، (ئانتـا) یارمەتیـدا جلـەکانی بگۆڕێـت. شلەمەنییەکی گەرمی پێداو ئیدی چووە خـەوێکی قوڵەوە. پـشیلەکەی (تیـۆ) هەوڵیـدا بـەمیاو میـاو کارێـك بـۆ بێدارکردنـەوەی بکـات، بـەلام سـەرکەوتوو نـەبوو. بـۆ نـانخواردنی ئێـوارەش هەرسێکیان ماندووبون.

- (ئانتا) کاتێك بۆ فراوێن دەگەڕایەوە وتی: عەبدو، تۆ راستت کرد! ئەم دۆستەمان شەپۆلێك لەسەر رۆحی هەیە.

منیش لەلام سەیرە... لەوانەیە وا پێویست بکات رونکردنەوە بدات.

- بەرپرسیارێتی زۆر دەبێتە هۆی نیگەرانی گەورە. ئـەم لاوە شـێوە مـردووە بـەدوای خۆیـدا بەهەموو جیهاندا دەگەڕێت... من بومایە ئەوەم نەدەکرد خەریکە سزای ئازایـەتیو چاکەکاری خۆیدەدات.

زۆرباشە، دەتوانین تێبگەین کەلەو سـاتانەدا (تیـۆ) بـەرەو چـاکبونەوە هـەنگاو دەنێـت ئـەم ئیـدی پـردی تەحـەمولی روو لەڕوخاندنـە، بـەلام ئـەم (مارتـا)یـەی هێنـدە لـۆژیکیو ئاقـڵو خۆپارێزە چۆن دوچاری بێهۆشی هات!. هـیچ کاتێـك هێنـدە تێکشکاو، ورەڕوخـاو خـۆی پیـشان نەداوە.

(ئانتا) وتی: چونکە هیچ کاتێك خۆی دوچاری روداوی لەوجۆرە نەکردۆتەوە. بڕۆ بزانە (تیۆ) چی لێتێگەیشتوە؟

- (عەبدوڵلایە) کەوتە بیرکردنەوەو تێگەیشت ئەویش شتێکی ئەوتۆی دەربارەی ژیانی رابردوی پورە (مارتا)ی نازانێت. خودی پورە (مارتا)ش دەربارەی خۆی هیچی وای نەدرکاندوە. لەوانەیە مردنی مێردەکەی کاریگەر بوو بێت؟ مادام (مارتا) نەیتوانیبوو هاوسەرەکەی رزگاربکاتو دەربارەی (تیۆ)ش زۆر سەرسەختی کردوە. بەڵێ، بێگومان ئەو شەڕە درێژو وزەپڕوکێنە دژ بەمەرگ وزەو توانا زۆرەکەی لەبنهێناوە.

- (ئانتا) وتی: ژینگە کاریگەری هەیە. تۆ (تام – تام)ـەکان لەیاد دەکەیت. لەو دەنگە دەتۆقیت.

(تام - تام)! بەشەپۆلەکانی هەموو مۆزیكو گۆرانییەکانی پورە (مارتا)ی نغرۆکردبوو. لەبەرامبەر ئەو دەنگانە هێندە بەرگری نواندبوو، کە سەرئەنجام (تام - تام)ـەکان لەدوا فشاری خۆیاندا زاڵ ببون.

(ئانتا) وتی: هەرچۆنێك بێت ئێستا پاکبۆتەوە. ئەوەی بەلای منەوە سەیرە کوڕە لاوەکە نەکەوتە ژێر کاریگەرییەوە.

- لەوبارەیەوە (عەبدوڵلایە) رونکردنەوەی خۆی هەبوو. بەبڕوای ئەو (تیۆ) لەسەرەتای گەشتەکەیەوە لە (میسر) شارەزای حاڵەتی بێهۆشبون بوە. هێندەش خوی بەو بارەوە گرتوە، کە هێواش هێواش توانیویەتی لەدۆزینەوەی جمکە مردودەکەیدا هەر لەسەرەتاوە سەرکەوتن بەدەست بێنێت. لەوەودواش ئیدی هەموو شتێکی لەلا رونبوە. (تیۆ) ئیدی پێویستی بەباری لەسەرخۆچون نییە، چونکە چارەسەر کراوە.

- (ئانتا) وتی: باشە، بەڵام هێشتا شتێك کەمە، ناوی خوشکە جمکەکەی! دواجار جمکەکەی هەمان (راپ)ی دەرونێتی.

## ئەفریقایەکی دیکە

رۆژی دواتر رۆژی سەردانی نەخۆشخانەبوو؛ بەڵام ئەمجارە لەجێگای (تیۆ) پورە (مارتا) خرایە ژێر تاقیکردنەوەوە، کە ئایا بێهۆشییەکەی نیشانەی نەخۆشییەکی راستەقینە نییە. لە (تیۆ)ش خوێن وەرگیرا، بەڵام پورە (مارتا) چوار سەعاتی لەبەشی (رادیۆگرافی)، فشاری خوێنو لاوازی جولەی خوێن بەسەربرد، کە بۆ دڵنیابون دەبوو چاوەنوارېن. ئەنجامی سەرەتایی لێکۆڵینەوەکان کەمی فشاری خوێنی دەسەلماند. پورە (مارتا) لەو تاقیکردنەوانە رازی نەبوو، ساتێك لەنەفرەت ناردن بۆ (تام – تام)ـە ئەفریقییەکە رانەدەوەستا. (عەبدوڵلایە) بۆ

لەیادبردنەودی پێشنیازی بۆکرد ماودیەك لە(کازامانس)[1] بمێنێتەوەو رونیکردەوە لەو ناوچەیە دەریای جوان، سروشتی پڕ شکۆو رازاوەو هەورازو نشێوی هەیەو سەرەڕای ئەوەش ناوچەیەکی پڕ رازو نیازە. بڕیاردرا سبەینێ بۆ ئەو جێگایە بڕۆن. بەفڕۆکەیەکی بچوکی پێنج کەسی بۆ (کازامانس) رۆشتن. کاتێك فرۆکەکە بەسەر دەشتودەری سەوزی فراوانی مەرەزەو دارستانە چڕەکاندا تێدەپەڕی. پورە (مارتا) بۆ (تیۆ)ی رونکردەوە، کە (کازامانس) ئەفریقایەکی دیکەیە، ئەفریقای دارستان.

- (عەبدوڵلایە) وتی: خاکی (دیۆلا - Diolas)کان. ئەمانە ئامۆزاکانی (سێریر)ـەکانن. پاشان وتی: (ئاگواین)و (دیامبۆنی)، کە دووکچی جمك بون. بەدرێژایی کەنار تادەریاچەکانی (سالوم)هاتبون، کە هێندە لەگوندی پیاوە پیرەکەی (سێریر)ـەوە دورنییە. لەوبەری دەریاوە درەختی جوانو بەلەمێکیان بینیوە، هەردوکیان سوار بەلەمەکە دەبنو زریان بەلەمەکە دەکات بەدوو کەرتەوە. خۆ ئەگەر پەرییە دەریاییەکان ئەو دوو خوشکەیان نەگەیاندایە کەناری روباری (گامبی) هەردوکیان تیادەچون. (ئاگواین)، کە لەکەناری باشوری روبارەکە مابۆوە بوو بەدایکی (دیۆلا)و (دیامبۆنی) لەکەناری باکور، کە بوو بەدایکی (سێریر)ـەکان. بەمجۆرە ئەم دوو گەلە لەپشتی ئەو جمکەوە هاتون، کەبەهۆی زریانەوە لەیەکدابڕاون.

- (تیۆ) وتی: لەئەفریقا جمکەکان لەهەموو شوێنێك هەن.

- (عەبدوڵلایە) وتی: هەریەك لەجمکەکان ناوچەیەکی جودایان لەئەفریقا دروستکردوە. خاکی (سێریر)ـەکان پانتایی دارستانەکانی (تونوك)و کەم درەخت، دارخورمای پانو (بایۆباب)ـەکان. خاکی (دیۆلا) لەژێر درەختی گەورەی ناوچە گەرمەسێرەکان، کەشوێنی چڕو تێپەڕبون بەوێدا سەختو دژوارە. لەسەر خاکی (سێریر) هەرزن دەکەن، لە(کازامانس) برنجی سوری گردە. (سێریر) وڵاتی ئەستێرەو (پانگۆڵ)ـەکان، (دیۆلا) خاکی نهێنی بێشە پیرۆزەکان، کە هیچ بێگانەیەك ناتوانێت بچێتە ئەوێ.

- (تیۆ) بەجۆرێك بەدگومانییەوە وتی: ئەو دوو کچە بەراستی جمك بون؟

لەوانەیە (هۆمۆزیگۆت)[2] نەبوبن!، چونکە تایبەتمەندی (دیۆلا)کان بەوەندە ناوەستێ. کارکردنی هەرتاکێك کاریگەری بەسەر هەموو کۆمەڵگەی (دیۆلا)کانەوە دەبێت، بەڵام لەهەمان کاتیشدا هەر تاکێك بەوپەڕی تواناوە وابەستەی سەربەخۆیی تاکێتی خۆیەتی. (دیۆلا)کان

---

[1] Casmance: روباری کەناری سنیگاڵی باشورە، کەناوچەی کشتوکاڵی بادامی زەوی لەبەشی باکورەکەی، کەناوچەیەکی تایبەت بە مەرزەیە، لەیەك جودادەکاتەوە.

[2] Homozygote: تاك خانەی کەسێکە. کە دوو ژنی هاوشێوەیان هەیەو لەیەك کرۆمۆسۆمن.

بەخەڵکی یاخیبوو، قەرەچەناخو ناکۆمەڵایەتی دادەنرێن. ئاینەکەیان بەشێوەیەکی نائاسایی تاراوەیە. بەجۆرێك ئەگەر کەسێك نهێنییەکەی بدرکێنێت لەدیدی خۆیانەوە هەموو گوندەکەیان هەموو خەڵکی جیهان دەخاتە بەر مەترسی. بێگومان ئەو شاردنەوەیەش بودبەسەرچاوەی پڕوپاگەندەیەکی زۆر سەبارەت بەسروتو دابونەریتی بێشەی پیرۆزەکراوەکان، وەك بەقوربانیکردنی مرۆڤ، مل پەڕاندن، برژاندنی تەرمی ژنانی دوگیان تا بەکۆمەڵ بیخۆن.

- پورە (مارتا) تەقییەوە: چ قسەیەکە! تۆش بەجۆرێك دەربارەی (دیۆلاکان) دەئاخافتێی هەروەك چۆن هێرشبەرە ئیسپانییەکانی ئەمریکای خواروو بەدڕندەی کیشوەر باسیان دەکردن! مرۆڤ خۆرەکان، بتپەرستی دواکەوتوو! شەرمەزار نابیت!

- (عەبدوڵلایە) بەتوڕەییەوە وەڵامیدایەوە: وتم هەموو ئەوانە پڕوپاگەندەن! گومانم لەوەش هەیە لەو دارستانە پیرۆزەدا وەك شوێنەکانی دیکەی ئەفریقا تەنانەت ئاژەڵیش بکەنە قوربانی!. لەراستیدا شتێك لەوبارەوە نازانم، چونکە من (دیۆلا)نیم. خەریکە دەنیشینەوەو هێندەی نەماوە.

## پاشاکانی دارستان

- فڕۆکەخانەکە بچوكو لەکەنار دەریاو تەم گرتوو بوو. هەوا شێدارو (با) نەبوو: وەرزی بارانی ئەفریقایی دەستیپێکرد. (عەبدوڵلایە) بەهەموو توانایەکییەوە هەوڵیدەدا بۆ سڕینەوەی کاریگەری ئەو پروپاگەندانەی کرابون. پێش هەمووشت دەبوو لەهۆتێل جێگا بگرن. لەناو ئەو کوختانەی لەناو باخێکی گەورەدا دروستکرابون. هۆتێلەکە ئاسایی‌و رێکوپێك بوو. (تیۆ) شۆرتی لەپێکردو پورە (مارتا) لەژێر چەترێکدا لێیڕاکشا.

- (عەبدوڵلایە) هەناسەیەکی هەڵکێشاو بەترس‌و لەرزەوە گوتی: مارتا شوێنێکی خۆشە، وانییە؟

- (تیۆ) هاواریکرد: وادەزانیت لەکالیفۆرنیایت، لەفیلمێکی ئەمریکایی دەچێت.

- پورە (مارتا) بەهێوری وتی: بەڵام لەکالیفۆرنیا خەڵکی مرۆڤخۆرنین. (عەبدوڵلایە) تۆ نابێت ئەو وڕێنانە دەربارەی (دیۆلا)کان بڵێیتەوە. تۆ شایانی ئەوەنیت!

- ئەگەر ئەم خەڵکە تۆزقاڵێك کەمتر نهێنیئامێز بونایە ئەو شتانەیان نەدەوت. لەلایەکەوە کەسێکی بۆ ناوخاکی (دیۆلاکان) دەتبات من نیم، بەڵکە هاوڕێیەکمە بەناوی (ئارماندیاتا)، کە شارەزایەکی بواری ژینگەیە. من بەمەبەستی ئامادەکردنی راپۆرتێك لێرە دەمێنمەوەو چاوەڕوانتان دەبم.

- (تیۆ) وتی: ڕێنوێنێکی نوێ؟ لەکوێیە؟

- دەنگێکی ئاسایی لەپشتەوە وتی: لێرە!

- بەڕێز (دیانا) نزیکی پەنجا ساڵ دەبوو. خەندە لەسەرلێو، دوو چاوانی درەوشاوەو تەڕی هەبون. بەوپەڕی ڕێزەوە پێشنیازی بۆ پورە (مارتا) کرد، کە ئەگەر حەزبکات دەتوانن سەردانی چەند کەسێکی پایەبەرزی ئاینی بکەن... باشە؟

- (تیۆ) لەجیاتی پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: بەڵێ، با پیاسەکەی ئێرە بمێنێت بۆ دواتر.

- بەڕێز (دیانا) هەر کە ئەو وەڵامەی بەرگوێ کەوت ڕۆشت بۆ تەلەفۆن کردن.

- (عەبدوڵلایە) وتی: ڕۆشت هەواڵی هاتنتان رابگەیەنێت. لە (کازمانس) ناکرێت متمانە بەهیچ بەڵێنێك بکرێت. بەراستی خراپ نییە بزانیت ئەم هاوڕێیەم سەر بەخێزانی دەسەڵاتدارە، کەلەوانەیە خۆی نەیدرکێنێت.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: کەواتە (کازامانس) پاشای هەیە.

- (عەبدوڵلایە) وتی: ئەمە بەشێك لەنهێنی نییە. دەتوانم لەو بارەیەوە قسەتان لەگەڵ بکەم. لەئاینی (دیۆلا)دا پاشا ڕۆڵی (ئەسقەف)ێکی گەورە دەگێڕێت و پەیوەندی نزیکی بەخواوەندی گوندەوە هەیە، کە خودی ئەو خودایانە نێوانگری مرۆڤو خواوەندن. چۆنییەتی دانانی پاشایەتی (دیۆلا) لە(کازامانس) شتێکە تەنها ژمارەیەك لەوانەی شارەزای نهێنییەکان دەتوانن ئاگاداری بن. ئەم بابەتە هەموو دەیزانن، کەپاشایەتی میراتگری نییەو کۆمەڵێك لەدانیارانی دەبێت پاشای ئاینده دابنێت، کە بەپێی چەند هێمایەکی تایبەتەوە لەناو خێزاندا دەبێتو پاشای نوێ پاش دانیشتنی لەسەر کورسی دەسەڵات دەبێت دەسەڵاتی ئاینی خۆی لەهەلومەرجی سەختدا پیادەبکات. پاشا پاش هەڵبژاردنی دیمەنێکی خواوەندی تایبەت بەخۆوە دەگرێت، چونکە پێدەنێتە جیهانێکی دیکەوە؛ جیهانی ڕۆحەکان.

پاشای ڕۆحەکان لەدارستانی پیرۆزدا بەتەنها دەژی. نەمافی ئەوەی هەیە لەناو کۆمەڵدا بژی، نەهاوسەرگیری بکات، نەلەناو خەڵکدا خواردنو خواردنەوە بخوات، جگە لەناو گروپی دەستوپێوەندو ئاشناکانی خۆی بەنهێنی. ئەو ئەرکە گرانو قورسەی سەر شانی پاشاکانی (کازامانس) ڕۆژێکیان ڕوداوێکی خەمئەنگێزو ترسناکی لێکەوتەوە. لەساڵی (١٩٢٠) یەکێك لەپاشاکانی (دیۆلا) بەناوی (سیهابلە) لەلایەن فەرەنسیەکانەوە دەستگیرکراو لەگەڵ گروپێکی دیکەدا فڕێدرایە زیندانەوە، چونکە مافی نەبوو لەبەردەم خەڵکیدا خواردن بخوات بەناچاری مرد.

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: ئەی خوای من، تاوانێکی ڕاستەقینە لەنەزانییەوە!

- (تیۆ) وتی: کەواتە پاشا زۆر پیرۆزە!، چونکە بۆئەوەی بەجیا لەوانیدیکە بژی دەبێت بەشێوەیەکی سەیر مەترسیداربێت!

- بەلاّم ئەرك و کارەکانی گەورەو پڕگرنگییە. پاشا ئەرکی ڕاگرتنی ئاسایش و ئارامی گوندەکەی لەئەستۆدایە. سروتی باران ئەنجامدەدات، کە بۆ کشتوکاڵ و ئینجا بۆ ژیانی مرۆڤەکان پێویستە. ئەگەر باران نەبارێت یان جەنگ بەرپا ببێت پاشا بەرامبەر بەگوناهەکەی باجی گران دەدات!.

- پورە (مارتا) وتی: ئەم ڕوداوە ئەفسانەیەکی ڕۆمی کۆن و سەردەمێکی زۆر پێش کۆماری و ئیمپراتۆری بەبیرمادێنێتەوە. لەو سەردەمەدا شاری (ڕۆما) هەر هێندەی گوندێك بوو. سەرۆکی گوندەکە لەدارستانێکی چڕدا ژیاوە بەناوی (دارستانی نیمی). ئەو سەرۆکی گوندەکە بە(پاشای دارستان) ناوبراوە. پاشای (نیمی)ـەکە وەك بونێکی خودایی، لەلای دانیشتوانەکە بونێکی مەترسیداری هەبوو؛ کەبەتەنها دور لەخەڵکی ژیاوە. دەستیان لێنەدەدا، چونکە ببوە پیرۆزکراوێکی دەستلێنەدراو. لەهەمان کاتیشدا نەیاندەتوانی پشتگوێی بخەن و بەهۆی توانستەکانیەوە لێیدەترسان. دوای ساڵێك پاشایەکی دیکە هەڵدەبژێراو پاشا کۆنەکەی پێشویان دەکوشت!

- (تیۆ) وتی: قەدەرێکی سەیرو بێکەنیناوییە! باشە چێژی ئەو پاشابونە لەکوێدایە؟

- پورە (مارتا) وتی: لەهیچ شوێنێکدانییە. پاشای ڕاستەقینە هەمیشە پەیوەندی بەلایەنێکی خوداییەوە هەیە. پاشا خۆی بۆ پاشایەتی هەڵنابژێرێت!و دەسەلاّت وەك چارەنوسێك رویتێدەکات؛ وەك کارەسات و بەلاّیەك، کەماڤ ئەوەشی نییە پەسەندی نەکات. پاشا ڕاستەقینەکان بەهەڵبژێراوی خاوەنی ماڤ خودایی دانراون. بۆ نمونە، ئایا دەزانیت پاشاکانی فەڕەنساش شفادەربون؟ ئەوان دەیانتوانی لەوزەتێن چارەسەربکەن!

- (تیۆ) وتی: چ درۆیەکی گەورەیە! ئایا ئەوە سەلمێنراوە؟

لەسروتی ئاینی شفادەرەکانی (سیریر) زیاترنا.

- (عەبدوڵلاّیە) سەری بۆجولاّند. لەدیدی ئەوەوە زۆر ئاسانتربوو مرۆڤ خۆی بەدەست چارەنوس — دەسەلاّتی (الله)وە بسپێرێت خۆی نەکاتە کۆیلەی هێزی ترسێنەری پیرۆزی جیهانی. (ئارمان دیاتا) گەڕایەوەو (عەبدوڵلاّیە) سەری بۆ لەقاند. هێشتا ئەو ڕۆژە نەگەیشتبوو تا لەرازەکانی هاوڕێ (کازامانسی)یەکەی شارەزا بێت.

## رەنگی سوری ئاماژەی پاشایەتی

ئەو ریچکەیەی بەرێز (دیاتا) پێشبینی کردبوو بەرەوالەت گرێیەکی تێدانەبوو. لەگوندێکدا لەدرەختێکی بەرچاویان روانی. دەهۆڵێکی گەورە لەنێو گۆرەپانو قەدی درەختێکی مەزن، کە ئەو پەیامانەی تێدا دەنگ دەدایەوە لەدوری پانزە کیلۆمەترەوە دەنێرران ئەو پەیامانە تەنها ئەو کەسانە دەیانتوانی ببیستن پێشتر لەرێگای چونە ناو رێچکەی خاوەنانی دارستانی پیرۆزەوە لە کلیلەکەی شارەزابون. سەرۆکی گوندەکە شەرابی خورمای پێشکەش بەمیوانەکان کرد، کە پورە (مارتا) بەوریاییەوە رەتی کردەوەو (تیۆ) لێی چەشت. لەسەر دارخورما پانەکان زۆر باڵندەو لەقلەق جێگایان خۆشکردبوو لەدورەوە ژمارەیەکی زۆر بێشە، پیرۆز یان ناپیرۆز، دەبینرا. چاویان بەتۆریستەکان کەوت. هەندێك بەپایسکیلو هەندێك بەئۆتۆمبیل سەرقاڵی گەشتوگوزاربون. لەبازاڕ (شەفادەرێکی) گۆرانیبێژیان بینی. لەسەر تابلۆیەکی بەردەمی دوکانەکەی کەرەسەکانی بۆ جۆرەها نەخۆشی نوسیبوو، لاوازیو بێهێزی، مایەسیری، ژانە سك، کرمی ریخۆڵە، میزەچرکە...

- (تیۆ) کەتارادەیەك نائومێدببوو گوتی: باشە، بەو زوانە هاورێکانت دەبینین؟

- (دیاتا) وەڵامیدایەوە: لەسەرەتای چوونە ژورەوەی گوندەکە چاوەرێمان دەکەن.

- ئینجا؟

ئیدی وەڵامینەدایەوە. ئۆتۆمبیلەکە لەبەردەم پیاوێکی کاسکێت بەسەر وەستاو (ئارماند) لەگەڵیدا کەوتە گفتوگۆ. دیارە دەیوت هەلومەرجەکە باش نییە، چونکە (ئارماند) تورەببوو. دواجار دەنگی بەرزکردەوە کابراش بەبێدەنگی کەوتەوە رێ.

- بەرێز (دیاتا) وتی: گرفت دەبێت، بەڵام هەرچۆنێك بێت رێنمایی دەکەین. دەبێت دوو کیلۆمەتر بەپیادە برۆین. (مادام مارتا) ئەگەر شاڵە سورەکەت لابدەیت باشترە... تکایە..

- شاڵە سورەکەی من،؟ هۆی سەغڵەتییە؟

ئەم رەنگە رەنگی ئەوە، ئەو شوێنەی بۆیدەچین نابێت شتی سورت پێوەبێت. خۆشبەختانە هەردوکتان بەرگی شینتان پۆشیوە. پاش تێپەرین لەرێگا باریكو کێڵگەو لەبەردەم ئەو ماڵانەی ژنان لەدەرەوەی ماڵەکانیان خەریکی هەرزن کوتاندن بون سەرئەنجام بەتخوبی دارستانی چرگەیشتن.

- پورە (مارتا)، کە عارەقەی دەموچاوی دەسری، وتی: ئاه.. ئایا ئەم دارستانە پیرۆزکراوە؟

- بەڵێ، تەنانەت ئەرکێکی پیرۆزی منە ئەوەتان پێبڵێم. ئێستا لەبەردەم شوێنی دەسەڵاتدارێتیداین. بابچینە ژورەوە، پاشا چاوەنوارمانە.

- (تیـۆ) هـاواریکرد: خـودی پاشـا خـۆی؟ کەواتـە چـاوم بەپاشـا دەکـەویت؟ لەدارسـتانی پیرۆزکراو؟ بەراستیش ئەلقەکەی دایکم پێیە! گرنگە!. (پـی تـی) کاسێتی (تـورەیی خواکـان) راستی دەکرد!.

- پورە (مارتا) وتی: بەمجۆرە هاوارمەکە. کەمێك بێدەنگ بە.

پاش تێپەڕین بـەناو گژوگیایـەکی زۆردا گەیـشتنە شوێنێکی سێبەری بـێ درەخـت. (ئارمانـد دیاتا) هاوڕێکانی لەسەر قەدە دار دانیشاند.

لـەکۆتایی ئـەو مەیدانـەدا ریزێـك درەخـتی خورمـا رێگاکـەی بڕیبـوو. جۆرێـك لـەدەرگا بەئەسـتونگەی سـەیرەوە لـەو دیـوارەدا دەبینـرا، بـەلام کـەس لـەوێوە نەهاتـە دەرەوە. لەسـەر پەلەکانی درەختێکی گـەورە هـەلۆکان بێخـەیال بالەکانیان کردبـۆو. ئـارامی تـەواو چاوەنواڕی بێکۆتابوو.

(تیۆ) بۆ شکاندنی بێدەنگییەکە وتی: ئەو دیوارە چییە؟

(ئارماند) وتـی: دەتوانیـت بلێیـت ئـەوێ تارادەیـەك وەك کۆشکە، بـەلام لەراسـتیدا شـتێکی دیکەیە. بەکورتی ئەگەر شـتێکی زیـاتر بلێم لەوانەیـە دژ بەکۆمەلگەی خۆمـان جولابێتمـەوە، لەمەبەستەکەم تێدەگەیت؟. زۆرجار ئاینەکەمان وەك سونەتێکی کۆنو دێـرین پێناسـەکراوەو لەبەرئەوەش دەبێت چاودێریو پارێزگاری لێبکەین. پاشا بۆ ئێمـە زۆر گرنگە. نیگـەران مەبـە پێشوازیتان لێدەکات. چونکە پێشبینی ئەو دیدارە کراوە. ئاه... هات.

- پورە (مارتا)و (تیۆ) خۆبەخۆ لەجێگای خۆیان بلندبون. پیاوێکی زۆر بەتەمەن بەریـشێکی سـپی سەرچـەناگەوە بەبێـدەنگ لـەنێو دارخورماکانـەوە هاتـەدەرەوە. پاشـای گونـد بەتـەواوی سـورپۆش بـوو. کلاوێکـی رازاوەی حەسـیرو کۆلوانەیـەك، کـە هـەمووی بـەرەنگی سـوربوو. بەدەستێك گسکێك لەگەلاو لقی وشكو بەدەستەکەی دیکەی کورسییەکی هەلگرتبوو، کە دایناو رۆنیشت لەسەری. (ئارماند دیاتا)میوانەکانی ناساند. چونکە دیدارەکە جۆرێك لەشـەرافەتداری بـوو پـورە (مارتـا) سوپاسـی پاشـای کـرد. پاشـا چـەند وشـەیەکی وەك پێـشەکی درکانـد، بـەلام فەرەنسی نەدەزانی.

- (ئارمانـد دیاتـا) وتـی: پاشـا پێخۆشـحالە بـەهاتنتانو داوای لێبـوردن دەکـات ناتوانێـت بەجۆرێکی دیکە پێشوازیتان لێبکات، چونکە گوندەکە خەریکی خۆ ئامادەکردنن بۆ ئاهەنگ.

- پورە (مارتا) وتی: وابزانم دەبێت خودی ئەویش بەشداری بکات.

- بەرێز (دیاتا) دودلی نواندو گوتی: باشـە، دوای ئـەوە... لەوانەشـە بەشـداری نـەکات. لـەلای ئێمە پاشا بەرجەستەی راستیو دروستی بونەوەرانەیەو بە(ئاتا – ئمیت)ی خـوای خۆمانییـەوە

گرێدەدەین، کە لەئاسمانە. تەنها یەك خوای تاكو نەبینراومان هەیە، کە دەبێت بیپەرستین. دەڵێین (Atcmit – Sembc – خوا بەدەسەڵاتو هێزە).

- (تیۆ) پرسی: ئێوە (پانگۆڵ)تان نییە؟

- (ئارماند دیاتا) بەوریاییەوە وەڵامیدایەوە وتی: ئێمە میحرابو رۆحمان هەیە، بەڵام دوایی لەوبارەیەوە قسە دەکەین، چونکە لێرە لەحزوری پاشادایین، کە دەسەبەری هاوسەنگی وزەو خواوەندییەکان دەکات.

- پورە (مارتا) وتی: دەتوانم پرسیار لەپاشا بکەم، کە سەروکاری لەگەڵ جەنگیشدا هەیە؟

کاتێك پاشا پرسیارەکە تێگەیشت رەنگی گۆڕا. هەموو گیانی کەوتە جموجوڵ، چاوەکانی دەبریسکانەوە... دەستی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو کەوتە قسەی سەیرو لەگەڵ جموجوڵ گسکەکەی پیشانداو دەستەکانی وەك ئاماژەی بەرەکەت بۆ ناوچەکە والاکردەوە، ئینجا بێدەنگبوو.

- پورە (مارتا) وتی: پرسیارەکەم لەجێی خۆیدا نەبوو؟ پاشا خرۆشاوە...

- (ئارماند) وتی: دەڵێت مافی نییە تەنانەت لەرژانی خوێنیش بڕوانێت. تاکە چەك ئەو گورزی پاشایانەیە، واتە ئەو گسکەیە. دەڵێت ئەرکەکەی بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵك نییە، ئەو تەنها پارێزەرو پاسەوانی پیرۆزە. فەرماندەو سەرۆکێکی سوپایی نییە. بەپێچەوانەوە لەبنەڕەتدا سەر بەخەڵکی ئەم جیهانە نییە. هیچ شتێك لەوە کفرئامێزتر نییە پاشایەك خوێن لەجەستەی خەڵکی بڕێژێت.

- (تیۆ) پرسی: بەلایەنی کەمەوە دەتوانێت ئاشتی بکات؟

- پاشا رایگەیاند لەبەرقەراربونی ئاشتی خۆشحاڵەو پیرۆزی دەکات. بەڵام ئەوە دەربڕینی رای خۆیەتیو دەتوانێت خۆی پەیماندار بکات. پاشا تەنها کاروباری پیرۆز رایی دەکاتو هەر ئەویش گرنتی باش جێبەجێکردنی ئەو کارانەیە.

چاوپێکەوتنەکە دوایی هاتبوو، پاشا هەستاو لەنێو سەوزایی زۆری دارستانەکەدا بزربوو. لەپڕ دەوروبەرەکە چۆڵ دەهاتە بەرچاو.

- پورە (مارتا) وتی: بەهۆی سوری جلوبەرگەکانییەوە بوو داوای کردبوو شاڵەکەم لابدەم؟

- (ئارماند) وەڵامیدایەوە: لەکاتی فەرمیدا تەنها ئەو دەتوانێت پۆشاکی سور بپۆشێت. سور لەهەمان کاتیشدا رەنگی ئاگرە. ئەگەر کوژایەوە کارەسات دەبێت، کاتێك گوندەکان پاشایان نەبێت کارەکان مەیسەرنابن. پاشا خولگەی وزەو هێزە.

- پورە (مارتا) پرسی: ئەم پاشایە ناوی چییە؟ بەناوی خۆی بانگی ناکەن؟

ناوی نییە، پێیدەڵێن (مان - Man)، وشەیەکە جگە لەناونیشانی پیرۆز هیچ واتایەکی دیکەی نییە. پاشاکانمان هیچ دەسەڵاتێکیان نییە، تەنها بەرجەستەکاری خواوەندن.. نامرن!.

(تیۆ) هاواریکرد: چۆن؟ دەمرن! ئەوەی بەهۆ فەرەنسییەکانەوە دەستگیرکرابوو، خواردنی نەخواردو لەتاو برسێتی مرد...

- (ئارماند دیاتا) بەویقارەوە وتی: (سیاهبلە) پاشا نەمرد، بزربوو. دەڵێن لەکاتی دەستگیرکردندا زەوی قڵیشاوەتەوە، چونکە فەرەنسییەکان بۆ نابوتکردنی دەسەڵاتەکەی کلاوەکەیان سوتاند دوکەڵەکەی تا قولایی ئاسمان هەڵکشاوە.

- پورە (مارتا) پرسی: ئێوەش بەپێی دابونەریتی ئاینی بەخاکتان سپارد.

- ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: ئەفسوس. پاشماوەی (سیاهبلە)ی پاشا بەداخەوە لە (کازامانس) نییەو نابێت بەئێوە بڵێم لەکوێیە، بەڵام ئێوە فەرەنسین‌و پێتانڕادەگەیەنم لەکوێیە. جەستەی پاشا لە (مۆزەخانەی مرۆڤناسییە) لەپاریس.

- پورە (مارتا) بەهێوری وتی: چەند شتێکی سەرسوڕهێنەرە.

- (ئارماند) بەپەلە وتی: بەڵام چونکە ئەو نەمردوە باس لەو بابەتە ناکەین. لەیادی بکە.

- (تیۆ) پرسی: بۆچی دەبێت رەنگی شین بپۆشرێت؟

- وەڵامینەدایەوە. (تیۆ) وتی: میحرابەکان؟

- لەگەڕانەوەدا میحرابەکان دەبینین. بەرامبەریان تێپەڕین بەڵام سەرنجمان نەدا. ژێر میحرابەکان وەکو دوو ژورن. یەکێك گەورە کراوە ئەویدیان بچوك‌و داخراوە، کە بەکوتاڵ داپۆشراون‌و لەسەرەوەیان گۆزەیەکی گڵێنە دانراوە. لەدورەوە دەهۆڵەکان دەبینرێن، کە بەدارەوە ئاوێزانن‌و هەمویان بەیەك ئاراستەن.

(ئارماند) وتی: ئێرە شوێنی خوا پەرستییە. بەئێوەیان وتوە تەلیسمێکمان هەیە بە (بۆیکین - Boekin) ناسراوە، بەڵام ئەوە هیچ راست نییە. ئەو (بۆیکین)انە تەنها نوێنەری وزەو توانای تاکتاین. تێبینی دەکەیت، ئێمەی (دیۆلا)کان کەمێك لەجولەکەکان دەچین. (حاخام)ـە گەورەکانی جولەکەش بەرجەستەکاری سیستمی دەردبەگایەتی بون‌و ئەگەر دەتەوێت زیاتر دەربارەی قوربانییەکان بزانیت کتێبی (لویتەکان)ی (تەورات) بخوێنەرەوە، هەروەها کتێبی (ژمارەکان - اعداد).

- (تیۆ) لەژێر لێوەوە وتی: (لویت)؟ (رەبی ئالیئەزر)یش لە (ئۆرشەلیم) لەبارەی ئەو کتێبەوە قسەی بۆ کردم. وابزانم هەمان ئەو دەستورانەیە گۆشتی کەروێشکی حەرامکردوە... مەبەست گۆشتە حەرامکراوەکانن؟

- (ئارماند) وەڵامیدایەوە: نەك هەر ئەو بابەتە، هەڵبژاردنی ئاژەڵ بۆ قوربانی، چۆنییەتی سەربڕین‌و پاشان چۆنییەتی بەخشینەوەشی.

- (تیۆ) بەئارەزوکردنەوە پرسی: ئەی لەژورە بچوکەکەدا چیدەکەن؟

(مارتا) وتی: تۆ پرسیاری قەدەغە دەکەیت، تێناگەیت؟

- (ئارماند) بەخەندەوە وتی: راستە، بەڵام دەتوانم بەسادەیی رونیبکەمەوە. لەژورە بچوکەکەدا هەناسەی رۆحی زیندوو دەژی.

(تیۆ)و پورە (مارتا) بەبێدەنگی سوار ئۆتۆمبیلەکەبون. (ئارماند دیاتا) هەوڵیدا شتێکی زیاتر لەوبارەیەوە بڵێت، بەڵام چونکە روبەڕوی ڕێگری ئاینی دەبوەوە بەناچاری بێدەنگەی لێکرد. لەرێگای ئاشکراکردنی رازەکانەوە نابێت ناپاکی لەگەڵ جیهانی پیرۆزکراودا بکرێت.

## کچانی بینۆنا

سەرئەنجام (ئارماند) بەوەی بابەتەکەی تەواو کردوە وتی: ئەو شوێنەی ئێستا دەچین ئیدی نهێنی نییە، دەچین بۆ (بینۆنا) بۆ لای ئەو ژنانەی تەرکی دنیایان کردوە. لەشوێنی نیشتەجێبونی قەشەکان، کە بەکڵێسایەکەوە نوسابوو، لەژێر درەختێکی گەورەی (ئەزگیل)دا ژنان‌و دەستەی مۆزیك چاوەنواڕبون. خوشکانی ئاینی بەخێرهاتنی میوانەکانیان کردو میوانەکان لەسەر ئەو کورسیانە رۆنیشتن، کە ریزکرابون. کچانی (بینۆنا) لەکەناریەکدیدا راوەستابون و بەسنگ‌و ملی پڕ لەملوانکەی لەسەدەف دروستکراوەوە چاوەنواڕی لێدانی تەپڵەکانیان دەکرد، کە لەسەر ئاگرەکە گەرمدەکران لەوکاتەدابوو لەپڕ دەنگی (تام — تام) بەرزبوەوە.

- کچانی (بینۆنا) بەپێی پەتی (بۆوبوو)[1]ـە دەڵبەکانیان فڕێداو بەدوو چڵەدارو لەگەڵ ئاوازی (بام - بام) لەشوێنی خۆیاندا کەوتنە جوڵە. لەپشت دارو درەخت‌و کۆمەڵێك پیاوەود سەماکەرێك پەڕییە ناو بازنەکەوە، کە کلاوێکی لەسەردابوو بەقۆچی بزنەوە لەگەڵ مرواری شین لەمل ، بازنی لەموو چنراو لەمەچەك‌و فلوتێك بەدەستیەوە. هەربەخوای جوانی دەچوا. کە لەنێوان خوا تایبەتەکاندا بێت.

- پورە (مارتا) وتی: ئەگەر هندی بوایە دەتوانی سوێند بخۆیت (کریشنایە).

---

[1] Boubou : جۆرێك پۆشاکی درێژو دەڵبە، کە ژنە ئەفریقییە رەشپێستەکان دەیفرۆشن.

(تیۆ) وتی: یان (دیۆنیازۆس)[1] ژنە پەرستراوەکانی (بەکانت)[2]ـەکان. دەزانیت هەمان خوای مەستی دەڵێم؟

- پورە (مارتا) وتی: سوپاس، خۆم دەزانم، بەڵام ... وردبەرەوە!.

سەماکەردکە لەجموجوڵەکانیدا بەرەو لای ئەم دەهات تا بچێتە باوەشی، بەڵام لەدوا ساتدا، کە دوو هەنگاوی مابوو بۆ پورە (مارتا)، بەئامێزی کراوەوە لەجێگای خۆی وشکبوو؛ وەك ئەوەی بۆ سەما بانگی بکات. پورە (مارتا) لەجێگای خۆی جوڵاو سورهەڵگەڕا. سەماکەرەکە هەروا بەویقارو بڕوابەخۆبونەوە کشایەوەو پورە (مارتا)ش خەجاڵەتبوو. ژنەکانی (بینۆنا) لەبەرامبەر ئەو ژنەی لەپڕ ترسابوو دارەکانی دەستیان توند بەیکدا کێشاو ئینجا کەوتنە پێکەنین.

- سەماکەرەکە ماوەی دوو سەعات بەئاوازی (تام — تام) سەمای کرد هەندێجار لەو سەمایەدا کچێکی جوان هاوەڵیدەکردو بۆ هاندانی بەدەوریدا دەسوڕایەوە، بەڵام هەمیشە ئەوە ژنانی (بینۆنا) بون دەچونە بازنەکەوەو بەجموجوڵی خێرا هاوشانیان دەکرد. هەندێجار یەکێك لەوانە شاڵە تەنکەکەی خۆی دەهاویشتە کۆشی یەکێك لەو کچانەی تەرکی دنیایان کردبوو، ئیدی خوشکی ئاینی بەخەندەیەکی گونجاوەوە هەڵدەستا. لەگەڵ شاڵەکەی لەکەمەری دەبەست بەشداری سەماکە دەبوو.

- پورە (مارتا) بەدەسرێك شانو ملی سڕییەوەو گوتی: ئاه... بۆ ساتێك وامزانی ناچار بەسەماکردنم دەکەن!

- (ئارماند) وەڵامیدایەوە: نەیوێرا بەڵام هەموان حەزیان دەکرد.

- پورە (مارتا) وتی: تەنانەت خوشکانی ئاینیش سەمایان کرد! ئایا لەم سەمایەدا حاڵەتی بێهۆشبون هەیە؟

- نەخێر، بەهیچ شێوەیەك. ئەم سروتە لایەنی پیرۆزی نییە. ئێمە لەباوەشی شوێنی نیشتەجێبونی قەشەی کاسۆلیکیداین. تەنها سەمایەکەو تاکە کەسێك ئەم سەمایە لەگوندەکەدا نەبینێت لەگرنگی ئاین لەلای ئێمە تێناگات. جەستەمان بۆ سەماکردن دروستبوە. ئایا(تام - تام) ئێوەی سەغڵەت نەکردوە؟

- پورە (مارتا) وتی: بەپێچەوانەوە، زۆر هەست بەشادیو خۆشی دەکەم... غافڵگیربوم!

- کەواتە ئێستا بەلایەنی کەمەوە ئاشنای تەپڵی (دیۆلا) بویت.

---

[1] Dionysos : خوای شەرابە لەمیتیۆلۆژیای یۆناندا، کە بەرامبەرە بە (باکۆس) لەمیتیۆلۆژیای رۆمی کۆن.
[2] Bacchante.

لەپڕ پورە (مارتا) بەنیگەرانییەوە لەدەوروبەری خۆی نواڕیو گوتی: (تیۆ) لەکوێیە؟ بزربوو...

- (تیۆ) بزرنەببوو، بەڵکو لەگۆشەیەکدا لەگەڵ جوانترین خوشکانی ئاینیدا خەریکی گفتوگۆبوو، گوتی: ناوی (ئۆگستین)ەو کچێکی زۆر نائاساییە! فێری سەمای کردم.

پاشان لاسایی سەماکەی کردەوەو خوشکە (ئۆگستین) قاقاپێکەنی.

- پورە (مارتا) وتی: هەموو پرسەکانی ئەم سەمایە لەگەڵ یادەوەریدا هاوسەنگە! بۆ ئەوە ماوەیەکی زۆرت لەپێشە.

- (ئارماند) وتی: ئیدی شتێکی نوێم لانەماوە پیشانتانی بدەم. لەوانەیە رۆژێکی دیکە..

لەهۆتێلەکە (عەبدوڵلایە)ش خەریکی ئامادەکردنی راپۆرتەکەی خۆیبوو. (تیۆ) رایکرد تا لەئامێزی بگرێت. بەلام ئەو خۆی دورخستەوەو گوتی: چیرویداوە؟

- (تیۆ) هاواریکرد: چیرویداوە! چاومان بەپاشای دارستان کەوت! سەرتاپا سورپۆش بوو.

- خۆ من ئەوەم بەئێوە راگەیاندبوو، ئەی چیدیکە؟

- پاشە تۆ پاشات بینیوە؟

- نەخێر، دەربارەی (دیۆلا)کان لەکتێبدا خوێندومەتەوە، چونکە چارەیەکی دیکەم نییە. دەبێت لەم رۆژانەدا (ئارماند) ئەو بابەتانەم بۆ رون بکاتەوە.

- دەزانیت ئەوە بۆ کەسێك لەناو بۆتەقەی کاری نهێنیدا بێت دژوارە... ئێوەی موسڵمان وەك شەیتان لەئێمە دەنوارنو ئیدی چۆن دەتوانین دنیای خۆمانتان بۆ رونبکەینەوە؟

- (عەبدوڵلایە) ئاماژەی بۆ (تیۆ)و پورە (مارتا) کردو گوتی: ئەی ئەمانە چین؟ تائەو شوێنەی دەزانم ئەوانە (دیۆلا)نین.

- (ئارماند) بەهێواشی وتی: نەخێر، بەلام ئەوانە دەیانەوێت بەناو ئاینەکانی جیهاندا بگەڕێنو ئاینەکەی ئێمەش یەکێکە لەو ئاینە جیهانییانە. ئەوەش دەزانن.

شەو پورە (مارتا) خۆی خستە سەرلاو کتێبی (لاویان)ی دەرهێنا. لەو کتێبەدا (خودی نەمر) (موسا)ی بانگهێشت کردووەو فەرمانی پێدەدات: **(سەبارەت بە رەشەولاغەکان، خوێنی (گا)یەکی تەواو کامڵ وەك پاکژکردنەوە بەسەر میحرابەکەدا برێژە، پاشان کەوڵی بکەو گۆشتەکەی دابەش بکە)**. فەرمانیدەدا هەموو کەس تەنانەت ئەگەر بەبێ ئاگاداری خۆشی بێت، گوناهە بکات دەبێت (گا)یەك بۆ (خودی نەمر) بکاتە قوبانیو لەبەردەم ئامادەبواندا دان بەگوناهەکەیدا بنێت. تەنها لەو کاتەدایە، کە (حاخام)ی گەورەی ماڵراوی خودی نەمر، دەتوانێت گەلەکەی لەژێر بەرەکەتی خواوەند بپارێزێو پاسەوانی لێبکات.

- پوره (مارتا) وتی: پاشا – کاهینێك، (گا)یەك، قوربانی، کۆمەڵێکی یەکگرتوو، هاوبەند، باوەڕێکی گشتی، خوایەکی ردها، میحرابەکان. زۆرباشە! ئەوە ئاینێکی راستەقینەیە، بەبێ هیچ گومانو دودڵییەك.

- (تیۆ) وتی: پەلەمەکە، هەموو ئەوانە لەپەڕاوێچکەکەمدا تۆمار دەکەم. باشە، پاشای دارستان، (گا)یەك، باوەڕێك، میحرابێك، یەك خوا. ئەمە هەموی ناچارییە... پیرەژن تۆ پاكو ناپاکیت فەرامۆشکرد. جودایزم، هندۆیزمو ئێستاش دیۆلاکان. کاهینە گەورەکان هێندەپاكو بێگەردن ناکرێت دەستیان لێبدرێت. ئەی ئەوانیدیکە، باشە بۆ پاککردنەوەیان دەبێت قوربانیان بۆ ئەنجام بدرێت، وانییە؟

- بەبڕوای من مایەی پەسەند نەکردنە، بەڵام تۆ کۆمەڵگەی یەکگرتوو فەرامۆش دەکەیت. (ئارماند) وتی کتێبی (ژمارەکان)یش بخوێننەوە، بابزانم.

- لەکتێبی ژمارەکاندا (خودی نەمر) فەرمان بە (موسا) دەدات تاخێڵەکانی ئیسرائیل ئاگادار بکاتەوە، کە بەپێی رەچەڵەکی درەختەکەیان دابەشبون. پاشان فەرمان دەدات تا ناپاکەکان چ ژنو چ پیاو لەگەڵ گەڕەکان بکاتە دەردوە. پاشئەوەی خێڵەکان پاکبونەوە (خودی نەمر) ئەرکێکی بەسەر هەریەکەیاندادو یەکی دەڵقێك شەراب، ئاردو رۆنی پێبەخشین، کە هاوشانی قوربانییە. تەنها ئەندامانی خێڵی (لاوی)، کە بە (لویت – لاویان)ناودەبران، ماڧ ئەوەیان هەبوو (سندوقی پەیمان) هەڵگرن.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئەم گەمانە چین؟

- پوره (مارتا) وتی: ئەو گەمانە بۆ رێکخستنی کاروباری ناوخۆی خێڵەکانە. (لاوی)یەکان کاهینی شەریفن تارادەی (بەرهمەندەکان)ی کۆمەڵگەی هندییەکان. (دیاتا) کەی ئێمەش لێرەدا لە ئاینەکەی خۆیدا (لاوی)یەکە نەك تەنها لەناو بازنەی نهێنیدایە، بەڵکو هەڵگری خوێنێکی پاشایانەشە. تاکە کەسێتی، کە نەلە(ژمارەکان)و نە لە(لاوی)اندا هەیە دارستانی پیرۆزە. لەخۆم دەپرسم دەبێت چۆن دەسەڵاتی خودایی لەو جەنگەڵەدا پیادە بکرێت.

## دورگەی کۆیلەکان

پاش (کازامانس) کاتی ئەوە هاتبوو دارستانەکانی ئەفریقا بەجێبێڵنو بۆ پایتەخت بگەڕێنەوە. (عەبدوڵڵایە) هەوڵیدا شتێك لە میوانەکانیەوە هەڵکڕێنێت ودەربارەی ئەوەی بینیویانەو سەباردت بەوەی لەلایان ئاشکرابوە ناچار بەقسەکردنیان بکات، (تیۆ)و پوره (مارتا)

نیازیان نەبوو بەدوورودرێژی باسی پاشای دارستان بکەن، لەبەرئەوە هەوڵەکەی (عەبدوللایە) سەرینەگرت.

لەگەڕانەوەدا ئەنجامی تاقیگە ئامادەبوو. تەندروستی (تیۆ) رووەوچاکبونەوە دەچوو. قەیرانەکەی پورە (مارتا)ش بەجۆرێك لە گرژبونی ماسولکەکان لێکدرابۆوە، بەڵام زۆر دڵنیانەبوو.

- ئێستا، کە نەخۆشەکان، چارەسەرکرابون، (عەبدوللایە) پێشنیازیکرد کاتی سەردانی دورگەی (گۆرە)[١]هاتوە. پورە (مارتا) بڕیاریدا تەلەفۆن بۆ پاریس بکات، ئەمجارە لەجیاتی قسەکردن دەربارەی نەخۆشییەکەی (تیۆ) سەبارەت بەوگرژبونەی خۆی لەگەڵ باوکی (تیۆ) گفتوگۆ بکات. تەلەفۆنەکەی هەڵگرت لەوبەری هێڵەکەوە (ژروم)ی باوکی (تیۆ) بوو...

- نەخێر، ئازاری نەبوو. بارێکی سوكو زۆرخۆشبوو. چیم کرد؟ نازانم چیرویداو دەزانم لەهۆش خۆچوم... بەڵی، من. دەتوانی بیهێنیتەوە بەرچاوی خۆت؟ باشە، هەرچۆنێك بێت، زۆریش رازیم. دواجار منیش کەمێك چومە ئەو جیهانەوە... بەڵێ، لەنەخۆشخانە، راستە... دەربارەی گرژبونی دەمارەکان قسەیان لێوەکرد، بەڵام ئەوانە سەرودەر لەوشتانە ناکەن. (تیۆ) تەندروستی باشە؟ دەتەوێت قسەی لەگەڵدا بکەیت؟ تەلەفونەکەی پێبدەم، لەراستیدا تاقیکردنەوەی خوێن زۆرباشە!.

- (تیۆ) راستی قسەکانی پورە (مارتا)ی سەلماند. لەپڕ بێدەنگبوو، باوکی دەیوت (فاتۆ) زۆر غەمبارەو تاڕادەیەکیش هیچی وای نەماوەبگری. دەڵێت (تیۆ) دوبارە پشتگوێی خستوەو تەلەفۆن ناکات؟ ئەی پەیامەکانی؟ هێشتا بیری لەپەیامەکانی نەکردۆتەوە. ئەی پورە (مارتا) چیدەکات؟ لەپڕ پورە (مارتا) هاواریکرد: سەیرە! یەکەمجارە پەیامەکەی (تیۆ)م فەرامۆش کردوە!. ئێستا ئیدی کاتی هاتبوو. (عەبدوللایە) باسی لەئەفریقاییەکی دیکە کردبوو. بەخودایەکی سپیو ئاوی وەك گوڵە گەنمەکان سپی؟ ئەو هێندە لۆژیکانە دەرنەکەوت! (تیۆ) سودی لەهەلەکەوە وەرگرت. تا تەلەفۆن بۆ (فاتۆ) بکات، داوای لێکرد هێمایەکی پێبدات. (فاتۆ) هێمای (پی.تی) بەمجۆرەپێدا. **(خواوەند لەرێگای کەشتییەکانی تۆوە لەئەفریقاوە هاتوە).**

- (تیۆ) شتێکی ئەوتۆی لەو هێمایە هەڵنەکراند. ئەوشتە راستبوو، کە کۆیلە رەشپێستەکانیان لەنیشتمانی خۆیانەوە بۆ شوێنەکانی دیکەی جیهان بردبوو، بەڵام لەکام یەك لەنیشتمانی کۆیلەکانی رابردودا خوای تایبەتی (ئاوەکان) ژیاوە؟.

---

[١]. Goree : دورگەیەکی بچوکە لەسنیگاڵ. کە روبەرووی داکاری پایتەختی ئەو وڵاتەیە.

- (عەبدوڵڵایــە) لەسـەعاتەکەی روانــیو گـوتی: ئەگـەر دوا بکـەویت فریـای دوایـن کەشـتی ناکەوین، کەبۆ (گۆرە) دەچێت.

بـەخێرایی خۆیـان گەیانــدە کەشـتییەکە. لەســەر تــەختی کەشـتییەکە (تیـۆ) دەسـتیکرد بەئەژمارکردن: فولوفاکان، سیریرەکان، دیۆلاکان، دەبێتە چواردانە. تا ئێرە چوار ئەتنیك لـەناو گەلێکدان.

- (عەبدوڵڵایــە) وتــی: زۆر لــەوەش زیـاترە تــۆ وێنــای دەکــەیت. دەبێــت (تۆکۆلۆرەکـان، ماندنگاکان، بەسەرییەکان، پولەکانو سونینەکان)یش ئەژمار بکەیت. ئەوەش دەبێتە نۆ دانە.

(تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: لەهندستان زیاترە، کەواتە (سنیگاڵ) لەو رودوە زیـاترە! ئـەی تۆ لەچ نەتەوەیەکی؟

- (عەبدوڵڵایە) وتی: باوکم (فولۆف)ـە، دایکم (پوڵە) بەڵام باوە گەورەم لە (لەبۆ)بوو. ئەگەر باش وردبینەوە (مانـدنگا)کـانیش لـەناو خێزانەکەمانـدا هـەن. (سـنیگاڵ) بریتییـە لەکۆمەڵـەی ئەتنیەکان. ئاهـ... بەڕاستی (سنلویزیان)ـەکانم لەیادنەبوو.

- پورە (مارتا) پرسی: بۆ ئەوەش ئەتنین؟ وامدەزانی (سنولویس) شارە!.

- بـەڵێ، مارتـا، بـەڵام ئـەو شـارەیە کەنوێنـەرانی سپیپێستی دورەگـەی تێدایـە!. دانیـشتوانی (سنولویس) وەك شوێنەکانی دیکەنین، دیارە زۆر شارستانیو زۆر ....

- (تیۆ) وتی: بۆ تۆ شارستانی نیت؟

- دایکـە گـەورەم خـەڵکی (سـنولویس)بـوو، تێگەیـشتی؟ دەزانــی دەڵـێم چـی؟ پـەروەردەو فێرکردن...

- (تیۆ) وتی: تێگەیشم، تۆ خاوەنی ئەقڵێکی باڵایت. (سنۆپ)[1]یت!

- (عەبدوڵڵایە) وتی: زۆرباشە، مەبەستت چییە؟ بۆچی (سنوپ) خراپە؟

(تیۆ) بێدەنگبوو. پاش نزیکەی بیست خولەکێك گەیشتنە دورگەی (گۆرە)و بەسەر لی داخدا بـەپێ هـەتا مـاڵی کۆیلـەکان رۆشـتن. مـاڵی کۆیلـەکان تـەلارێکی رەنگـاوڕەنگی گـەورە بـوو، پێپلیکانەی جوانی هەبوو، کۆشکێکی راستەقینەبوو.

- بەڕێوەبەری مۆزەخانەکە زانیاری تەواوی کۆکردبۆوە. ئـەو تابلۆیانـەی بەدەسـت نوسـرابون باسیان لە ملیۆنان مرۆڤی دیلی ئەفریقی دەکرد. ئەو ئەشکەنجانەی دژیان بەکارهاتبوو، مردنی

---

[1] Snob : کەسێکە لەجوڵەی دەست تێدەگات یان دەتوانێت لاسایی بکاتەوە. (پۆل ڤالری) نوسیویەتی (سنوبی راستەقینە کەسێکە کاتی وەرسی دەترسێت دانی پێدابنێت، دوچاری وەڕسی بووەو لەکاتی خۆشیدا دڵخۆشەو دەترسێت بڵێت دڵخۆشەو شادە).

بێبەزەییانـە لەئـەمباری کەشـتی تایبـەت بـەبارکردنی رەشپێـستەکان، خۆکوژییـەکان لـەکاتی دەرچـون لـەخاکی نیـشتمان، لەجیاکردنـەوەی منـاڵانو دایکـەکانیان، دەربـارەی توندوتیـژی دڕندانەی بازرگانی مرۆڤ، ئەو مرۆڤانـەی تـەنها وەك کاڵایـەکی بازرگانیکردن سـەیریان دەکـرا. مۆزەخانەکە بەوردی رەنج و ئـازار، بێبەشـکردن، نـزاو پاڕانـەوەکان و ئـاوازە غەمئـەنگێزەکانی ئەو بونەوەرانەی زۆر خاکیانە گردکردبۆوەو بەجۆرێك باسوخواسیانی بەرجەسـتە دەکـرد دڵی بینەری دەهێنایە جۆش. گروپێکی رەشپێستی ئەمریکی، کە بۆسـەردانی مۆزەخانەکە لـەوێبون بەیەك دەنگ دەگریان.... پورە (مارتا)و (تیۆ) بەخەم وخەفەتەوە گریـان. لـەژێر زەمینەکـەدا، لەو شوێنەی دیلەکانیان لەسەریەك کەڵەکە دەکرد بەڕوی زەریای ئەتلەسیدا دەرگایـەکی بـچوك دەکرایـەوە. بەڕێوەبـەری مۆزەخانەکـە رونیکـردەوە، کـە لەوێـدا لەسـەر ئـەو بـەردە رەنـگ تاریکانەی کەنار دەریاکەدا لەژێر شەقەی شـەلاقدا رەشپێـستە ئەفریقییـەکانیان بـەزنجیرکراوی بـەرەو کەشـتییەکان کێشدەکرد. لـەوێوە گەشـتی درێـژی کـەنار بەدەسـتکەوتەکانەوە، کـە دیلـە رەشپێستەکان بون، بەهاوەڵی سەرانی ئەفریقی درێژەی دەبوو؛ ئینجا کەشـتییە سـپییەکان کاڵا رەشـەکانیان بـاردەکرد، کـە هـەمان ئـەم مرۆڤانـەبون و کرابونـە ئـاژەڵ. ئـەو کـاڵا رەشـانە بـۆ دروستکردنی هۆتێلی شکۆدار بەکاردەبران. لـەتاریکی سـەر زەریاکانـدا ولایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا، دورگەکانی ئانتیل یان بەرازیل وەك شوێنی دوورخستنەوە بەرویاندا دەکرانەوە.

- (تیۆ) وتی: بەرازیل؟ ئایا خواوەندە تایبەتییەکان لەو وڵاتەدا هەیە؟

- بەڵێ، ئەو خواوەندە تایبەتە بە(یمانجە)ناودەبرێتو لە (بێنن)ەوە هاتون. کاتێك کۆیلەکان لەژێر لێدانی قامـچی خاوەنەکانییانـدا سـوار کەشـتییەکان دەکـران تاکـە سـامانێکی خۆیـان، کـە کـەس نەیـدەتوانی لێیـان زەوتبکات، لەگـەڵ خۆیانـدا دەبـرد. واتـا خواوەنـدەکانیان. خواوەنـدە تایبەتـە ئەفریقییـەکان بـەهاوەڵی پـەیڕەوەکانیان لەگەشـتدابون، بـەڵام هەرچـەندە هـەموو کاهینەکانی (تیماجا) ئەفریقی بونو لەئـەفریقاوە چـوبونە ئـەوێ، خـودی (یمانجـە) پێستـسکی سپی شیرئاسای هەبوو، کەبەسەر (پانگۆڵ)ەکاندا رژابوو.

بەشی بیست و حەوت

# (شۆڕەسواریی خواوەندەکان)

## کەشتی بارهەڵگری بلمۆنت

بەجێهێشتنی (داکار) هەڵگری ئەفسوس و کاریگەری بوو. (تیۆ) باوکی (فاتۆ)ی لە (پاریس) دەبینییەوە؛ ئەمجارە هاوەڵێکی نوێشی لەگەڵ خۆی دەیردەوە، واتە (ئارتۆر)ی پشیلە، کە بەزۆر لەناو قەفەزێکی تایبەتدا خەواندبوی. فڕۆکەی هێڵی (ئێر — ئەفریکا) شەو گەیشتە (لیشبۆنە)و گەشتیارەکانی پیادەکرد.

- (تیۆ) بەناڕەحەتییەوە وتی: ڕێچکەی (لیشبۆنە — ریۆ) ڕێگایەکی دوورودرێژەو وەڕسکارە.

- پورە (مارتا) وتی: کێ باسی گەشتی ئاسمانی کردووە، ئێمە بەپاپۆڕ دەڕۆین!.

- (تیۆ) سەریسوڕماو گوتی: کەشتییەکی زەریابڕی سپی جوان و رازاوە، بەکورسی درێژ و خۆشی کەنار مەلەوانگەی سەر کەشتییەکە و هۆڵی سینەما....

- پورە (مارتا) قسەکەی پێبڕی: خەون دەبینیت؟! هێڵی زەریایی ئەورووپا — بەڕازیل بڕاوە. بەکەشتی بارهەڵگر گەشتەکە دەکەین.

- (تیۆ) بیریکردەوە: کەشتی بارهەڵگر؟ وەك کۆیلە ئەفریقییەکان؟ دەست و پێ لەزنجیر راکێشراو لەپاڵ هەراوزەنای ماتۆڕی کەشتییەکە؟ بۆچی چ گوناهێکم کردوە شایانی ئەو سزایەبم؟!

- پورە (مارتا) قاقا پێکەنی و گوتی: ئەم کەشتییە هەموو شتێکت فێردەکات. لەو گەشتە دەریاییەدا بەرەنج و تێکۆشانی یەکەمین دەریاوانی (پرتوگالی) ئاشنا دەبیت. هەرچۆنێك بێت ئەو دەریاوانانە یەکەمین کەسانێك بون بەکەشتی چارۆکەدارەوە گەیشتونەتە خاکی هندی

خۆرئاوا، بەڵام ئیدی ئەو گرفتانەمان نییەو کەشتییەکانی ئەمرۆ ماتۆڕیان هەیەو چارۆکەدار نین!، کە دیارە خێراتر دەریاکان دەبڕن.

بەڵام (تیۆ) باوەڕی بەقسەکانی پورە (مارتا) نەکرد تاکەشتییەکەی بەچاوی خۆی بینی.

کەشتی (بلیمۆنت) بەئاڵای (پرتوگال)ییەوە تەواو نوێ بوو. پورە (مارتا) چوستو چالاکانە بەپلەکانـدا هەڵزناو (تیـۆ)ی بـەدوی خۆیـدا کێشکرد. مەلەوانـەکان جانتـاو کەلوپەلـەکانیان هەڵگرت. ئەو ژوورەی بۆیان تەرخانکرابوو دوو جێخەوی لەداری کاجی سپیو کورسیو مێزی تێدابوو، سەرەڕای گەرماویش.

- (تیۆ) وتی: ئەم کەشتییە لۆکسە یان بارهەڵگرە؟!

- پورە (مارتا) ئۆفێکی کێشا.. ئۆ..ۆ..ف..ففف

- کاپتن (داسیلڤا) رونیکردەوە: زۆر لەکەشتییە بارهەڵگرەکان بۆ میوانەکان ژوری ئامادەکراوی وەك هۆتێلـەکانیان تێدایـە. هەڵبەتـە کەشتی بارهـەڵگر نەمەلەوانگەی تێدایـەو نـەژوری نـانخواردن. پـورە (مارتـا)و (تیـۆ)ش دەبێـت ژوری تایبـەتی نـانخواردنی کاپتنەکـە بەکاربهێنن، لەژوری بەشەکەی خۆی.

- (تیۆ) بەخۆشحاڵییەوە هاواریکرد: زۆر سەرنجڕاکێشە! ئێوە هەردوکتان باش منتان فریودا، بەڵام ئێستا دەمەوێت تۆریستەکانی کەشتییەکە ببینمو سوکانی کەشتییەکەشم پشانیدەیت. دەمەوێت بزانم چۆن دەئاژۆی؟

کاپتنی کەشتییەکە ئـەو بەڵێنـەی پێدا، بـەڵام رونیکردەوە، کە ئیـدی بەپێچەوانەی ئـەوەی لەکتێبـدا پیـشاندەدرێت، کەشـتییەکان بەسـوکان لێناخورێـت. پاشـان ئـەوێی بەجێهێـشتو گەڕایەوە شوێنی تایبەتی خۆی تا (بلیمۆنت) لەبەندەرەکە دەربکات.

## کوانوی تواندنەوەی ئاینەکان

- پورە (مارتا) لە (تیۆ)ی پرسی: باشە رات چییە دەربارەی بەرنامەکەم؟ وتم ئیدی گەشتی فڕۆکە بابەس بێت، بەدڵتە؟

- زۆرم بەدڵە. تەنها دەترسم دوچاری نەخۆشی دەریایی بم.

- زۆر گرنگ نییە... رادێیت.

بەڵام (تیۆ) بۆ پارێزکردن پێیباشبوو درێژببێت. (ئارتۆر)ی پشیلەش خەوتبوو.

- پاش ماوەیەك (تیۆ) پرسی: پورە (مارتا) پرسیارێکم هەیە.

- بەڵێ، ماوەیەکە پرسیارت نەکردووە!

- دەربارەی (گا)کەیە، کە ئەو رۆژە کردیانە قوربانی، هێشتا لەلام شتێکی سەیرە.

- بەڵام خۆ قوربانیکردنی (گا) لەهەمووو جیهاندا هەیە، تەنها لای ئێمە ئەو نمایشە نائاسایی‌و مایەی بەرگەگرتن نەبوو.

- بەڵێ، وایە، بۆچی؟

- خۆت بیربکەرەوە. چەندجار لەتەلەفزیۆندا منالانت بینیوە لەم جیهانە فراوانەدا لەبرساندا لەسەر لێواری مەرگن یان دەمرن؟ ئایا ئەو روداوانە هەزارانجار بەئازارترنین لەقوربانیکردنی (گا)یەك؟

- راستە، بەڵام ئەوە هەیە لەتەلەفزیۆندا مرۆڤ پێکگەیشتنی راستەوخۆی نییە لەگەڵ بابەتەکەو بەڕاستی نایبینێت. بۆچی نەدەکرا بۆ ئەو نەخۆشەی بۆ چارەسەر هێنرابوو وەك هەموو نەخۆشییەکی دیکە دەرمانی پزیشکی بدەنێ؟

- پورە (مارتا) شانەکانی هەڵتەکاندو گوتی: هەڵبەتە دەکرا نمونەی وەکو ئەو لەنەخۆشخانە دەرونییەکاندا چارەسەر بکرێت، بەڵام دیارە ئەو چارەسەرکردنە ئەنجامی نەدەبوو؛ لەکاتێکدا چارەسەرکردن لەسەر شێوازی ئەفریقی چانسی سەرکەوتنی هەیە.

- (تیۆ) درێژەیپێدا: پرسیارێکی دیکەشم هەیە. دەمەوێت بزانم کام ئاین لەئەفریقادا دەمێنێتەوە؟ ئیسلام، کریستیانی یان ئاین‌و مەزهەبە کۆن‌و دێرینەکان؟، چونکە باوەڕناکەم بەناوی (الله)وە خوێنی (گا)ی قوربانیکراوەکەیان بەسەرکەسەکەدا رشتبێت...

- پورە (مارتا) قسەکەی پێبڕی‌و گوتی: ئەفریقاش وەکو هندستانە. ئەم دوو کیشوەرە هەردوکیان گەدەیەکی کاوێژکردنیان هەیە. خۆراکی بێگانە دەخۆن‌و لەگەڵ دەردراوی گەدەی خۆیان ئاوێتەی دەکەن‌و باش نەرمی دەکەن‌و بەئارامی هەرسی دەکەن، بەڵام بەدرێژایی ئەو بارە خودی (ئەفریقا) بەدەستلێنەدراوی دەمێنێتەوە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە پرسی: خوای تاك‌و تەنیا هیچ کارێکی بەسەریانەوە نییە؟

- بەهیچ جۆرێك. چۆن هندییەکان (مەریەم)ی پیرۆزیان لەگەڵ چەندین خوای خۆیان تێکەڵ کردوە، (ئەفریقا)ییەکانیش بەبێ خۆ هیلاك کردنێکی زۆر خوای مەزنی (عیسای مەسیح‌و پەیامبەری ئیسلام)یان پەسەندکردووەو ناسیویانن، بەڵام ئەو پەسەندکردنە نەبۆتە رێگر لەبەردەم لێدانی (تام - تام)ی تەپڵەکان‌و بێهۆشبون‌و دەرکردنی (ئبلیس)و پاکژکردنەوەو رەوانکردنی دڵەکان بەپێی شێوازی خۆیان. لەسروتی نزای بەکۆمەڵی (کاسۆلیك)یدا (میس)،

کە بەبۆنەی پاکیزەی پیرۆزەوە لەکەشێکی کراوەدا بەرپا دەکرێت زۆر لەژنە باوەڕدارەکان قاوقیژی گوێکەڕکەر دەکەن و لەهۆش دەچن، چونکە تیشکی بەهێزی خۆری (ئەفریقا) کاریگەری زۆری لەسەریان دەبێت. بەپێچەوانەوە دەبینین لەناو دڵی کریستیانە بەهرەمەندەکاندا کەسانێك دەردەکەون خۆیان بە پەیامبەرو دامەزرێنەری ئاینێکی نوێ دەناسێنن.

(ئەفریقا)ش کەسانی بەناوبانگی لەوجۆرەی بەخۆوەبینیوە. وەك قەشە (هاریس)، کەبەناوی (جوبرەئیل)ی فریشتەوە ئامۆژگاری پاککردنەوەی دەکرد. یان (ئالبراتکۆ)، کەبەیاریدەدەری تەلەگرام و لەرێگای خوێندنەوەی پەروەندەی کەسەکان لەتۆمارگادا بەناوی خواوەندەوە چارەسەری نەخۆشی دەکرد. یان (سیمۆن کیم سان) خزمەتگوزاری خواوەندو رزگارکاری گەلەکەی. ئیمپریالیزمەکان هەموو ئەو بانگەشەدەرانەیان سڕیەوە، چونکە پەیامبەرە ئەفریقییەکان ململانێیان لەگەڵ کریستیانیدا دەکرد. پاشان خاوەن بەهرە رەشپێستەکان لەوڵاتانی خۆیاندا بێدەنگکران تاکاتێك جێگایان چۆڵکرد بۆ ئەو پەیامبەرانەی لەناوجەرگەی دارستانەکانەوە هاتنە دەرەوەو ئەمجارە بە (عیسا)و (تەلیسم) چەکداربون.

- (تیۆ) گەیشتە ئەم ئەنجامە: هەرچۆنێکبێت ئەفریقیەکان مافی ئەوەیان هەیە مەسیحی خۆیان هەبێت. بۆچی دەبێت پەیامبەری سپی پێست بەسەریاندا بسەپێنرێت؟

- پورە (مارتا) وتی: راستە. دیارە ئاینەکان تائەو شوێنەی ئەگەرهەبوە هاوشانبوە لەگەڵ هێرشبەران و رزگارکەرانی گەلانی سەرزەمینەکانی دیکەو لەگەڵیاندا لەگەشتدابوە، بەلام لەهەموو جێگایەکیشدا لەلایەن یادەوەری کۆمەڵێك گەلانەوە دوچاری روبەڕوبونەوە بوەو راگیراوە. ئەم راستیەش لەبەرازیل دەبینیت!

- کێ لەبەرازیلە؟ مەسیح، موسڵمان و (ئانیمیست) یان کەسانی دیکە؟

- پورە (مارتا) رونیکردەوە: دەتوانرێت لە(بەرازیل یقی، کریستیانی، ئیسلامی، سپییە کاتۆلیك یان پرۆتستانەکان، سورپێستی دوڕەگ و تەنانەت خودی گەلە رەسەنەکانیش ببینرێت، کە بەئەرك و ماندوبونێکی زۆرەوە ئاینە تایبەتەکەیان لەبەردەم سەرمایەداران، ئەوانەی بۆ ئاڵتون گەڕاون و رێگاوبانیان دروستکردوە پاراستوە. (بەرازیل) فراوانترین کوانوی توانەوەی ئاینەکانە؛ شوێنێکی هەموو ئاینەکان بەبێ پەشیمانی ئاوێتەبون. خاکی (سنکریتیزم)ی رەهاو وڵاتی شێتی خواوەندە.

- (تیۆ) پرسی: ئەی رۆڵی (کارناڤاڵ)[1] لەونێوددا چییە؟

- کارناڤاڵیش بەشێکە لەئاین. کاپتن (داسیلڤا) لەوبارەیەوە شت دەزانێت، چونکە (بروتوس)ی ئامۆزای بەرازیلییەکی رەسەنە.

## سور، رەش‌و سپی پێستەکان

لەشوێنە تایبەتەکەی کاپتن (داسیلڤا) ژەمی نیوەڕۆ ئامادەکرابوو.

- (تیۆ) پرسی: بەڕاست (بروتوس)ی ئامۆزات بەرازیلی رەسەنە؟

- کاپتن پرسی: بروتوس؟ کێ پێیوتویت؟

- ئاشکرایە.. پورە (مارتا)، بۆچی؟

- کاپتن کەوتە پێکەنین. ئامۆزاکەی بەرازیلی بوو، بەڵام دیارە بەرازیلی رەسەن نەبوو، چونکە تەنانەت خودی ناودکەشی (بروتوس) لەبەرازیلیدا هیچ واتایەکی نەبوو. هەڵبەتە ناوێکی (پرتوگال)ی بوو، کە هەمان (داسیلڤا)یەو (کارنرۆ)یەکی بۆ زیادکراوە. کەشتیوانەکانی خێزانە (پرتوگال)ییەکان باسیان لەوە دەکرد لەسەردەمی گەشتە دەریاییەکاندا، کە بەکەشتی چارۆکەدار گەشت دەکراو پێیدەوترا (کاراڤل) خێزانێك بەناوی (داسیلڤا) بۆ بەرازیل کۆچیان کردوە، بەڵام پاشئەوە هیچ هەواڵێك لەو خێزانەوە نەبیستراوە. (بروتوس) بەرهەمی هاوسەرگیری (پرتوگال)ییەکی کۆن‌و ژنێکی لاوی ئەڵمانی بوو، بەناوی (گرتا)، کە خێزانە ئەڵمانییەکە لەسەرەتای سەدەی بیستدا بۆ (بەرازیل) کۆچیان کردبوو. ژنەکە وایڕادەگەیاند بەهۆی هاوسەرگیرییەکی تێکەڵاو لەنێوان باوەگەورەی لەگەڵ شاژنێك لەخێڵی (پوکاهنتاس)ی بەرازیلی، هەڵگری خوێنی سورپێستە رەسەنەکانی (بەرازیلە). خوێنی سورپێستی لەبەرازیل بەهاو متمانەی خۆی هەبوو. بونی شوێنگەیەك لەپشتی کەسایەتیەکی پلەبەرزی بەرازیلی بەڵگەی پەیوەندی نێوان رزگارکەرێکی سپیپێستە لەگەڵ کەسێکی رەسەنی پلەبەرز، کە بێگومان دەبێت لەوڵاتی خۆی خاوەنی پلەوپایەی دیاربوبێت تا بۆ ئەو پەیوەندییە هەڵبژێرێت. بەڵام (بروتوس) لەرونکردنەوەی ئەوەی بۆچی قژی لول‌و لچ‌و لێوی ئەستورە خۆی دەدزییەوە، چونکە لەبەرازیل کاتێك یەکێك رایدەگەیاند لەخێزانێکی بەرزە، ئەگەر لەخوێنی رەش بوایە، لێی پەسەند نەدەکرا. کاپتن قسەکانی بەمجۆرە کۆتایی پێهێنا:

---

[1]. مەبەست لە کارنەڤاڵی (ریۆ)یە، کە ناوبانگێکی جیهانی هەیەو هەموو ساڵێك لەرێورەسمێکی گەورەدا لەو شارەدا بەرپا دەکرێت.

لەوباوەڕەدام باپیرەی (بروتوس) عاشقی یەکێك لەکۆیلە ڕەشپێستە ئەفریقییەکانی خۆی بووبێت. (بروتوس) هێندە پێداگری دەکات سەبارەت بەنەبونی خوێنی ڕەش لەدەمارەکانیدا، کە بەڵگەو ناسنامەکانیشی ئامادە کردوە!

- (تیۆ) وتی: هەویرێکی سەیرە. بۆچی لەپشتی دانیشتوانی ڕەسەن بێت باشترە؟

- چونکە سورپێستە ئەمریکیەکان کۆیلەنەبون. هەرچەندە لەسەرەتادا کەمێك لەترس و هەراسدابون، بەڵام لەهەمان ئەو سەرەتایەدا مژدەدەرێکی ئاینی بەناوی (لاس کازاس) کاتێك تێگەیشت هاونیشتمانییەکانی خۆی، کەخۆیان بەکاسۆلیکی چاك دەناساند، خەڵکە ڕەسەنەکانی بە(دڕندە) ناویاندەبردن دەکەنە کۆیلەو لەژێر کاری قورس و گراندا ئەو بێگوناهەو دڵسافانەی بەسەسەدانیان لێدەمرێت، (لاس کازاس)، کەسوربوو لەسەرئەوەی کۆتایی بەتاوانکارییەکانی هاونیشتمانییەکانی بێنێت بیرۆکەیەکی دارشت و پێشنیاری بۆپاشای (پرتوگال) کرد جێگای سورپێستە ڕەسەنەکان بەکۆیلەی ئەفەریقی پڕبکاتەوە، چونکە ئەمان بەتواناو بەتەحەمولترن و بۆ کاری قورس شیاوترن. (لاس کازاس) بەخەیاڵی خۆی کارێکی چاکی کردوەو دۆزەخی گۆڕیوە، بەڵام دیارە پێشبینی نەکردبوو لەجیاتی کۆکوژی سورپێستەکان کۆکوژییەکی بەرفراوانتر سنگی ڕەشپێستەکان دەگرێت. ئەو نارەزاییانەی دواتر لەلایەن ئەمەوەکرا هیچ سودێکی نەبوو. بەمپێیە لەسەر بنچینەی بیرۆکەیەکی ساویلکەو گەندەڵ بازرگانی ڕەشپێست لەنێوان ئەمریکاو ئەوروپادا برەوی پەیداکرد.

- (تیۆ) وتی: بەڵام (پرتوگال)یەکان پەیوەندی سێکسیان لەگەڵ کۆیلەکاندا بەستبوو.

- بەو شێوەیەنا. ئیمپریالیزمی (پرتوگال)ی لەسەر بنچینەیەکی سادە ڕاگیرابوو؛ بەوەی هەرتاکێکی پرتوگالی لەگەڵ چونەناو کۆلۆنیەکەوە دەبێت ژنێك هەڵبژێرێت. لەبەرئەوە لە(بەرازیل) دورەگەکانی سپی و سور، ڕەش و سپی پێست پەیدابوو. ئلینەکانیش بەهۆی ژنەکانەوە تێکەڵاوبون. بەرازیلییەکان (خواوەند — ئاژەڵەکانی جەنگەڵ)یان لەسور پێستەکانەوە وەرگرت. (کۆرۆپیرا) خواوەندی تایبەتی بێشەکان بەددانە سەوزەکانییەوە؛ (کایی پۆرا)ی شەنگ بەپایپەکەیەوە بەروتی لەسەر پشتی بەرازێك یان (بۆتۆ) سوری روباری (ئەمازۆن)، کە (دۆلفین)ێکی سەرنجڕاکێشەو سکی ژنان پڕدەکات. ژنە بەرازیلییەکان بونەمیراتگری ئەو خواوەندە ئەفریقاییانەی لەناو ئەمباری کەشتییە تایبەتەکانی گواستنەوەی کۆیلەکاندا زەریاکانیان تەییکرد، واتە ئەو کۆمەڵە خواوەندانەی لەقەڵەمڕەوی پێشوی (داهۆمی)یەوە گەیشتنە بەرازیل. ئەو وڵاتەی ئەمڕۆ بە (بنن) ناودەبرێت. کۆیلە

ئەفریقییەکان لەژێر فشاری موژدەدەرەکاندا بون بەمەسیحیو (غوسڵ)کرانو ئاینی قەدیسەکانی کاسۆلیکیان لەگەڵ ئاینی خواکانی خۆیاندا ئاوێتەکرد. بەجۆرێك، کە ئاینەکانی بەرازیل بونە کارنەڤاڵێکی گەورە، کەسەماو تەپڵ، واتە توانستی ئەفریقی جێگای یەکەمو باڵای گرتەوە.

- (تیۆ) هاواریکرد: واتە هەمان (تام - تام)ەکان. پورە (مارتا)... چەند شتێکی بەرزە!.

- بەڵێ، (تام - تام)ەکان. بەمپێیەو لەسەرخۆ داگیرکردنی خاك لەلایەن کۆیلەکانی ئەفریقاوە دەستیپێکرد. خودانەکان کەللەشەقو سەختگیربون، بەڵام خەڵکی بازرگانو ئابوری، کە دەیانبینی کۆیلەکان بەخواردنی گڵو خۆڵ خۆکوژی دەکەنو ئەوەش بەزیانی ئەوان تەواو دەبێتو زیان لەسەرمایەگوزارییەکانیان دەدرێت بۆ رێگریکردن لەزیانو نابوتبونی کاڵاکان مۆڵەتیان بەکۆیلەکانیان بەخشی لەتەپڵو دەهۆڵەکانیان بدەن. ئیدی (بتوك)ەکان دەستیپێکرد: واتە هەموو تەپڵەکانی ئەفریقا. خواوەندەکان بەنهێنی لەگەڵ تەپڵو زمانە ئەفریقیەکاندا چونەناو مەیدانەکەوە، ئینجا هەر بەنهێنی سروتی ئاینی لەمیحرابە شاراوەکاندا سەریهەڵدا، کە ئەمرۆ هەمویان بەفەرمی ناسراون. لەیەکێك لەرۆژەکانی ساڵی (١٨٧٠) ئەفریقییەکان لەگردەکانی دەوروبەری (ریۆ)وە هاتنەخوارەوەو بەتەپڵەکانیان شاری خواکانیان داگیرکرد، ئەوەش یەکەمین کارنەڤاڵی (ریۆ)بوو.

هەر لەکۆنەوە گروپی ئاینی لە(پرتوگال) زۆر بەشکۆمەندییانە رێپێوانیان سازدەکرد. لەوگروپە گەورانەدا جگە لەئەندامانی کڵێسەو رۆحیانەتی کریستیانی بەبەرگی فەرمییەوە، قەدیسە جۆراوجۆرەکان، ئبلیسەکان، ئیمپراتۆرەکان، پاشاو شاژنەکان، ئاسنگەران، پیرۆزدکان، ڤینۆس، باکۆس، سباستیانی پیرۆز، کە بەنوکی نێزە جەستەیان کون کردبوو، بنزیس قەدیس، سان ژاكو ئەبراهام بەشداربون. پاشان هەمان دەستەی رێپێوان لەگەڵ (پرتوگال)ەکۆچبەرەکاندا بەرەو ئەوبەری زەریا کۆچیانکرد.

- ئەفریقییەکان پاشاو شاژنەکانیان پەسەندکرد، بەڵام (تەوتەمەکان)[١]ی خۆیان لەسەر ئاڵاکانیان نەخشاندو لەپاڵیدا هێمای یەکگرتنی خۆیان چەسپاندو بەسەماو تەپڵ کارنەڤاڵەکەیان خرۆشاند. بەو هۆیەوە قوتابخانەکانی سەمای (سامبا)کرانەوەو کارنەڤاڵی بەرازیلی بووە خاوەنی ناوبانگێکی جیهانی. هێدی هێدی ئەفریقا لەناو دڵی ئەمریکادا

---

[١]. Totem: ئاژەڵ یان گیا یان شتێکی دەگمەنە، کە لەلایەن خێڵێك یان خاندانێك یان گروپێکەوە وەك پارێزەرو پشتیوان وەردەگیرێتو دەیپەرستن، سروتی تایبەتی بۆ دەکرێت، لایەنی سیمبولیو نهێنی لەخۆ دەگرێت. هەموو تاکێکیش دەتوانێت توخمی تایبەتی خۆی هەبێت.

بەجۆرێك ژیانی بەبەرداهاتەوە، کە سەرنجی سپیپێستەکانیشی بەلای خۆیدا کێشکردو زۆریشیان چونە سەر ئاینی ئەفریقییە بەرازیلییەکان. ئەوانەشی سروتی ئەفریقیان پەسەندنەکرد رویان لەسورپێستە رەسەنەکان کردو سمبولەکانیان لەوانەوە وەرگرت.

- پورە (مارتا) وتی: سورپێستە رەسەنەکان (لانك - hamac)، گەنمەشامی، توتن، شێوەی خۆشۆردن لەئاوی روباریان بەبەرازیلییەکان بەخشی.

- کاپتن (داسیلڤا) وتی: ئەفریقییەکان دۆشاوی خورما، شەیپۆڕ، بیبنەر، عەمامەو مرواری شوشەییان بەخشی!. هەڵبەتە ناشبێت کاریگەری ئەفریقییە موسڵمانەکانیش لەیادبکرێت. هەر لەبەرئەوەشە دڵم بە (بەرازیل) دەکرێتەوە. مرۆڤ لەوێدا وا هەست دەکات لەسەر چوار رێی جیهانە.

- پورە (مارتا) پێشنیازی کرد: دەربارەی ئەو دروشمەی لەسەر ئاڵای بەرازیل هەیە قسە بۆ (تیۆ) بکە.

- تۆ راستدەکەیت. لەو وڵاتەدا، کەنارێکی (سور، رەش، سپی)پێستەکان شتێکی هەمیشەییە، دروشمی (بەرازیل) بەجوانییەکی تەواوەوە (سیستەمو پەردەسەندن) بەرجەستە دەکات.

- پورە (مارتا) وتی: (تیۆ) دەزانیت ئەو دروشمە لەکوێوە سەرچاوەی گرتوە؟. لەجۆرێك ئاینەوە، کەفەیلەسوفێکی فەرەنسی بەناوی (ئۆگۆست کانت)[1] لەسەدەی نۆزدەدا نقاری کرد. بڕیاریدا ئاینی (مرۆڤایەتی) بکاتە جێنشینی ئاینە خوداییەکانو ئەو شێوازەشی ناونا فەلسەفەی (پۆزیتڤیزم). بەبڕوای ئەو زانستی پەیوەست بەکۆمەڵگەو زانستەوە مایەی سەلماندنە. پاشان (ئۆگۆست کانت) کتێبێکیشی نوسی دەربارەی ئامۆژگارییەکانی ئاینی (مرۆڤایەتی).

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئامۆژگاری ئاینی بۆچی؟ باشە بۆچی ئاینێکی دروست نەکرد؟

- بەڵێ، هەر ئەوەشی کردا!. بەنوسینی ساڵنامەیەکی جەژنی (موسا، شارلمانی، دکارت، پرۆلیتارو ژنان....) دامەزرێنەرانی کۆماری بەرازیل بونە شاگردی دڵسۆزی (کانت)و فەلسەفە کۆمەڵایەتییەکەی ئەویان لەسەر بنچینەی (رێکخستنو پەردەپێدان) کردە دروشمی خۆیان. هێشتا لەبەرازیل پەرستگای (پوزی تیوسیتەکان) هەیە.

- (تیۆ) وتی: کەواتە ئەوەش بوو بەئاینێکی دیکە...

---

[1] August Cont : فەیلەسوفێکی فەرەنسییە (١٧٩٨ – ١٨٥٧) دانەری پۆزەتیڤیزم یان فەلسەفەی (سەلماندن)ـە.

- کاپتن وتی: بەبێ فەرامۆشکردنی (سوداد Soudad)، کە بریتییە لەهەستێکی کەمێك خەماوی، کەمێك شاد، هیوادارو هیوابڕاو. کە ئەگەر مەزهەبێك نەبێت ئەوا ئاینێکی تایبەتە.

- پورە (مارتا) وتی: (سامبا)ش.

- (تیۆ) وتی: دەڕۆم دەڕوانم، بەڵام بەراست دەکرێت چی ببینرێت؟

- کاپتن وەڵامیدایەوە: ئەمە نهێنییە!... بەڵام بەڵێن دەدەم دەنگی تەپڵەکان دەبیستیت.

## بەڕێز پرۆفیسۆر. کارینرۆد سیلڤا

کەشتی (بلیمۆنت) لەناو دڵی زەریادا بەملاولادا دەکەوت. (ئارتۆر) لەگۆشەیەك خزابوو. پورە (مارتا) بەیارمەتی (تیۆ)، کەچوبوە ژێربالّی بەهێواشی پیاسەی دەکرد، بەڵام پاش ماوەیەك (تیۆ)ش نەیتوانی تەحەمولی بەرزو نزمبونەوەی کەشتییەکە بکات و ڕەنگی پەڕیو بۆ خۆگرتنەوە پەنای بۆ نەردەکان برد. نەخۆشی دەریا سەرودڵی گرت.

سێ ڕۆژ لەکابینەکەیدا مایەوە. هەرچەندە کاپتنەکە ڕایدەسپارد بۆ هەوا گۆڕین بچێتە سەر تەختی کەشتییەکە، بەڵام (تیۆ) هەر لەژوردوە مایەوە. ڕۆژی چوارەم ڕشانەوەی نەمابوو. دواجار (تیۆ) ڕازی بوو بچێتە دەردوە. کەشتی (بلیمۆنت) لەو کەنارە نزیك دەبۆوە، کە (بروتوس)ی ئامۆزای کاپتن چاوەڕوانی دەکرد.

(بروتوس) لەکراسە سەوزەکەیدا سەرنجڕاکێش دەهاتە بەرچاو. چاوەکانی لەکراسە سێپارچەکەی سەوزتربوو، بەڵام قژی کورتو لول بوو. لەسەر ناوچەوانی تاڵی سپی بەدەرکەوتبوو. ماوەیەکی درێژ کاپتنی لەئامێزگرت، پاشان بەوپەڕی ڕێزەوە دەستی پورە (مارتا)ی ماچکرد:

- پورە (مارتا) ڕوو بە(تیۆ) وتی: (بروتوس کارینرۆد سیلڤا)ی هاوڕێمو مامۆستای زانکۆ بەتۆ دەناسێنم. (تیۆ) تکایە سڵاوی لێبکە.

- (تیۆ)، کە دەستی درێژکرد بەرەو (بروتوس) وتی: تەندروستیت باشە؟ خێزانەکەت چۆنن، تەندروستیان باشە؟

- (بروتوس)، کە کەمێك حەپەسابوو، گوتی: زۆرباشن، تۆ چۆنی؟

- (تیۆ) وەڵامیدایەوە: باشم، تەندروستیت باشە؟

- بەروخۆشییەوە وتی: بەڵێ، بێگومان. هاوڕێی لاو زۆر ماندو نەبویت؟

- (تیۆ) وتی: هەرگیز. کاروبارت چۆنە؟ بەراست..

- پورە (مارتا) هاواریکرد: Stop. خۆ ئێرە (داکار) نییە؟ تۆ ئیدی لەسنیگال نیت.

- (تیۆ) بەروگرژییەوە کاردانەوەی پیشانداو گوتی: چی؟ تۆ لەمنت نەخواست بەئەدەب بم؟

- (بروتوس) دوو ئۆتۆمبیلی ئامادە کردبوو بۆ هەڵگرتنی جانتاکان. بەبێزو نەفرەتەوە ئەو قەفەسەی هەڵگرت پشیلەکەی تێدابوو. دەستیکرد بەرونکردنەوەیەکی مێژووی دروستکردنی شاری (ریۆ) لەلایەن (گاسپار دو لێمنۆس)ی کەشتیوان؛ ناخۆشی‌و گرفت‌و نەهامەتییەکانی لەشکرکێشی پرۆتستانە فەرەنسییەکان. سەرکردایەتی دەریاوان (ڤیلی گنیۆن)، پەلامار و هێرش‌و چەپاوڵی (ریۆ) لەلایەن (دوگە - تروین)، گەیشتنی (ئەلبوکرك)[1].

- (تیۆ) پرسی: ئەو پەیکەرە سپییە چییە لەوسەرەوە لەسەر شێوەی فڕۆکە دروستکراوە؟

- پورە (مارتا) هاواریکرد: پەیکەری (مەسیحی فریادڕەسە) لەسەر (کۆرکڤادۆ)!

- (بروتوس) دەمودەست رایگەیاند: ئەو پەیکەرە لەلایەن پەیکەرتاشێکی فەرەنسییەوە کراوە بەناوی (لاندۆڤیسکی)، کە ئەو شاکارە هونەرییەی بەیادی دۆزینەوەی بەرازیل لەلایەن پرتوگالییەکانەوە پێشکەش بەجیهان کردووە، کە دەنوارێت بەسەر کەنداوی (ژانویە - دوژانرۆ)دا، چونکە دۆزینەوەکە لەسەرەتای (ژانویە)دابوو. (دیۆ) بە(ریودوژانیرۆ) ناسراوە.

- (تیۆ) وتی: باشە، کەی نان دەخۆین؟

- پورە (مارتا) رونیکردەوە: (تیۆ) هیچ حەزی بەمێژوو نییە... بیبەخشە.

(بروتوس) بەدەسرێك پێڵاوەکانی سڕییەوەو بێدەنگ بوو. بێئەوەی ئیدی قسەبکات (تیۆ)و پورە (مارتا)ی گەیاندە هوتێلەکەو کاتی چاوپێکەوتنەوەی داناو بزربوو.

بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ بۆ بەرزاییەکانی ناسراو بە(نان شەکری) رۆشتن. (با)یەکی هێندە توندی هەبوو پشیلەکە (ئارتۆر) چنگی کردبوو بە (تیۆ)دا. رەشەباکە دەفرەکەی پورە (مارتا)شی هەڵگێڕایەوە. پاش گەڕانێکی پێچاوپێچی گردۆڵکەکان بۆ بینینی پەیکەری گەورەی مەسیحی فریادڕەس رۆشتن. پەیکەرەکە بەئامێزە کراوەکەیەوە وەك ئەوەبوو جیهان لەباوەش بگرێت. (تیۆ) بەراستی پەیکەرەکەی بەمەزن دەهاتە بەرچاو.

- سەعات شەش‌و نیو (بروتوس) لەشوێنی دیاریکراو ئامادەبوو. داوای (قاوەی سینۆهە)ی کرد. سێ دڵۆپ قاوە لەکوپێکدا. رایگەیاند سبەینێ بەیانی بۆ سەردانی (باهیا) فڕۆکە دەگرن‌و جێگای مەخابنە (تیۆ) ناتوانێت بۆ بەرزاییەکیانی (نان شەکری) بچێت‌و پەیکەری بەناوبانگی

[1] Albuquerque. ئەلفۆنسۆ دوالبوکرك دەریاوانی پرتوگالی (١٤٥٣ - ١٥١٥). ئەلبوکرك لەساڵی (١٥٠٣) چوتە هندستان‌و تەنگەی هورمزی داگیر کردووە.

شین‌و قژێکی کەتان ئاسای هەیە. لەبەرایل پاکیزەی دەریاکان بەرگی سپی‌و کەمەربەندی شینە، بەڵام چاوان‌و موەکانی رەنگی ژنانی سەر زەویان هەبوە، واتا رەش. پاکیزەی دەریاکان لە روداوی (کاندۆمبلە)دا لەگەڵ کەمێك چانسدا لەوانەیە میهرەبان بێت‌و لەبەردەمی باوەڕداراندا دەرکەوێت.

- (تیۆ) بەسەر سورمانەوە وتی: چۆن دەکرێت دەرکەوێت؟

- باس لەجۆرێك پەڕەجوو ناکرێت. لەکاندۆمبلەدا خواوەندەکان لەسەر شێوەی نورانی‌و غەیبی خۆیان دەرناخەن، وەك ئەوەی پاکیزەی (لۆرد)[1] یان (فاتیما)[2]. خواوەندەکان دەچنە جەستەی ئەو باوەڕدارانەوەی بەدرێژایی پەروەردەکردنێك خۆیان بۆ ئەو تەرخان کردوە. خواوەند موریدەکە کۆنترۆڵ دەکات، روخساری دەگۆڕێت، سەماو ئاماژەکانی خۆی بەسەردا دەسەپێنێت‌و لەپڕ بزر دەبێت؛ چاوەڕوانی خانەخوێیەکی دیکە دەبێت. موریدەکە لەوبارەدا پێیدەوترێت (ئەسپ)، چونکە بەدرێژایی سروتەکە خواوەندەکە بەسەر کۆڵییەوە ئەسپ سواری دەکات.

- (تیۆ) بەنیگەرانییەوە گوتی: کەواتە من (یمانجا) لەوشێوەو شەقڵەدا دەبینم؟. لەشێوەی خاتونێك بەکەزی رەشی درێژەوە.

- پرۆفیسۆر (بروتوس) رایگەیاند: لەسەر شێوەی ژنێك یان پیاوێك خواوەندەکان گوێ بەجۆری رەگەزی ئەسپەکانیان نادەن. هەموو شت لەسەر قۆناغی پەروەردەو ئامادەگی وەستاوە، کەشتێکی کەم نییەو پاشان دەبێت مورید خۆی بۆ خواوەند تەرخان کردبێت.

پرۆفیسۆر (کارنرۆ) لێرەدا بێدەنگ بوو.

- پورە (مارتا) بەشداری کردو گوتی: بۆ لەنیوەی ڕێگادا راوەستایت. قۆناغی چونە ناو بازنەی ئامادەبون رونبکەرەوە!

- (بروتوس) بەهێواشی وتی: چونکە ئەم قۆناغە نهێنی‌و سروتی خۆی هەیەو من ناتوانم....

- پورە (مارتا) پێداگریکرد: باسی بکە، کەمێ ئازا بە. (تیۆ)... (بروتوس) ناوێرێت بەتۆ بڵێت خۆی موریدێکی هەڵگری رازە؟

---

[1]. لە (لۆرد – Lourds)، کە شارێکە لەدەڤەری (پیرنە)ی باڵای (فەرەنسا) (مەریەمی پیرۆز) لەلای کچێکی لاو بەناوی (برنادت سوبیرۆ) دەرکەوتوەو ئێستا جێگاکەی پەرستگایەکی بەناوبانگە لە (فەرەنسا) کەساڵانە هەزاران توریست بۆ خۆی کێش دەکات.

[2]. (فاتیما – Fatima) لەپرتوگال وێنەیەکی دیکەی پاکیزەی پیرۆزە کە لەبەردەم سێ شواندا دەرکەوتوەو شوێنەکەی پەرستگایەکی گەورەیە.

- (تیۆ) وتی: تۆ؟ ئەسپی خواوەندێکیت؟

بەڕێز پرۆفیسۆر بەبێ ورتە سەری لەقاند. بۆ رازیکردنی کات پێویست بوو تا پورە (مارتا) دڵنیایی بە(بروتوس) بدات، کە یەکەم ناچار نییە هەموو شت باس بکات، دووەم سوێندی بۆخوارد، کە نە ئەو و نە(تیۆ) هیچ شتێك لەوەی دەیبیستن نایگێڕنەوە بۆ کەس. دواجار بەو مەرجە لەژوری پورە (مارتا) بمێنێتەوەو دەرگاکە دابخات. (بروتوس) خۆی رادەستدا. (ئارتۆر)ی پشیلە خێرا چووە سەر کورسییەکەو لەباوەشی (تیۆ)دا جێگای خۆی خۆشکرد.

## سێ مانگ لەناو پەرستگادا

- بەیارمەتی یەکێك لەهاوەڵەکانم زۆرجار بەشداری (کاندۆمبلە باهیا)م دەکرد. دەزانیت من پرۆفیسۆرم لەمێژووی بەرازیلدا. شەوێك بەبێئەوەی بەخۆم بزانم کەوتمە لەرزە. هۆش و گۆشم لەدەستچوو، بێئاگا لەخۆم کەوتم، چونکە خودایەتی لەمندا دەرکەوتبوو. کەواتە دەبوو ببمە رێهەلگر (تەریقەتی). ئەمەش ئەو شتەبوو هاوەڵەکەم پێیڕاگەیاندم، چونکە قۆناغی تەریقەت سێ مانگ دەخایەنێت، تاماوەیەك خەونی ئاڵۆزو پەرێشانیم دەبینی، هەرچۆنێك بێت بومەرێهەلگر.

- (تیۆ) بەسەر سورمانەوە وتی: سێ مانگ!

- قۆناغی رێهەلگرتن و چونەناو بازنەی رازاوە لەبەرازیل هەندێجار دوانزە ساڵ دەخایەنێت. بۆ گۆڕینی پیاو یان ژنێك کات پێویستە. هاوڕێکەم پیاوێکی بەتەمەن بوو، کە بەباڵاترین قۆناغی (کاندۆمبلە) گەیشتبوو. ئێمە بە(باوکی قەدیسەکان) بانگمان دەکرد. بڕواو متمانەم بەو هەبوو. لەبەرئەوە....

- پورە (مارتا) وتی: غیرەت بدە بەرخۆت.

- هەفتەیەك پێش چونەناو بازنەکەوە پەیوەندیمکرد بەگروپی رێهەلگرانی پێشووەوە، کە هەمویان پۆشاکی سپی و شتی بەجۆریان هەبوو، کەهیچیان دەربارە نالێم. هەموو رۆژێ لەکڵێسا نزاو پاڕانەوەمان ئەنجامدەدا تا دیدی سۆزو پیرۆزی ئاسمان بۆخۆمان کێش بکەین و غوسلی ئاو بەرگمان دەکرد.

- (تیۆ) گوتی: ئەمەش جۆرێکی دیکەی (سنکرتیزم)ە.

- کڵێسا نزاکانی خۆی دەخواست و ئێمەش تەبەڕوك. ئێمە ئیدی لەسەردەمێکدا نین، کەجادوگەرانیان لەئاگردا دەسوتاند.

- پورە (مارتا) وتی: هیوادارم تۆ راستبکەیت.. بەردەوامبە.

- کە شەو دادەهات لەسەر زەوییەکە دەیانخەواندین. لەبەردەم ئامادەبواندا سەرزەنشت دەکراین، بەهۆی هەڵەکانمانەوە بەقامچی لێیان دەداین.

- (تیۆ) پرسی: چ بێئەقلانییەکە؟

- خۆشم نەمدەزانی چ گەمژەییەك دەکەم. هەرچۆنێك بێت منیش وەك ئەوانی دیکە دوچاری لێدانو سوکایەتیکردن دەبوم. بەردیان لەسەر سەرمان دادەناو دەبوو بەکۆمەڵ سەمابکەین. ئەو خاتونەی لەو قۆناغەدا فێرکارمان بوو دەترسا لەوەی لەبەر زۆری زەحمەتکێشان بمرین. دواجار کاتی ئەوەهات بچینە دێرەوە.

- (تیۆ) وتی: مرد قسەیەکی لەسەر نییە، زیاتر مایەی پێکەنینە، بەلام نیشتەجێبون لەدێرێکدا وەك هەمان سروتی لای خۆمانە، وایە؟

- (بروتوس) بەدڵنیاییەوە وتی: قۆناغی رێهەلگرتن وەك جۆرێك لەهاوسەرگیری عیرفانییە لەگەڵ خواوەند، کە دەکرێت بەهاوسەرگیری نێوان خوشکانی ئاینیو کورانی خواکانیان بەراورد بکرێت. (دێر) ئەوشوێنەیە بۆ چاوەنوارپکردنی شتێك تیایدا نیشتەجێ دەبیت. مافم نییە لەوبارەیەوە قسە بکەم. ئەوەی دەتوانم بیڵێم لەباری سروشتی خۆمدا نەبوم.

- پورە (مارتا) وتی: جۆرێك لەبێهۆشی. لەبونی خۆتان دەتانکەنە دەرەوە. رونە! ئایا ئەو بابەتە راستە، رێهەلگر بۆ سەردەمی منالی دەگەڕێتەوەو وەك منالێکی سێ سالان لەژێر چاودێریدا دەبێت؟. لەو قۆناغەدا قسەکردن لەیاد دەچێتەوە؟ پاشان (باوکی قەدیسەکان) بەددانی خۆی زمانی جوجکێك دەردەکێشێتو لەملی دەئالێنێت و پێستەکەی بەخوێنی قوربانییەکە بەسەر سەری ئێوەوەی دەلکێنێت؟

- (بروتوس) وتی: پرسیارێکی حەرامکراوە. تەنها دەتوانم بەئێوە بڵێم لەدێرەکەدا سەرت دەشۆن تاخواوەندی لەسەر جێگیر بکەن. ئەم شۆردنە بەئاو نییە، بەڵکو مادەیەکی تێکەڵە، کە بەدرێژایی ماوەی چاوەنوارپکردن نابێت لێیبکرێتەوە. خاتونی ئەرکداری رێهەلگرتن ناسنامەی خواوەند بۆ هەموو رێهەلگرێك ئاشکرا دەکاتو خۆڕادەستدانو موبارەککردن ئەنجامدەدرێت.

- پورە (مارتا) وتی: ئەوانە ئەرکدارن تائێوە ناچاربکەن ناوی (ئۆریشا)ی خودتان بدرکێنن. خوێندومەتەوە کەموزۆر مادەی بێهۆشکەر بەقوتابییەکانیان دەدەن؛ ئەوانەی لەباری چودنوارپکردندان... باشە، لەمبارەیەوە هیچ مەدرکێنەو بەردەوامبە.

- پاش سێ مانگ بەسەری تاشراویو بەرگی سپییەوە دەچینە ناو کۆمەڵەوەو بەوجۆرەیە دوبارە لەدایکبونەوە بەدەستدێنن. ئینجا خوو بەئاگرەوە پێدەگرن و هێندە بەرگری بەهێزدەکەن تابتوانن نانی شیرین لەناو رۆنی قرچاودا دەرکێشن بەبێئەوەی هەست بەسوتاندن بکەیت. دوبارە ئیدی بۆ دێرەکەمان دەگێڕنەوە تادرێژە بەژیانی ئاسایی خۆمان بدەین.

- پورە (مارتا) پرسی: تۆ دەربارەی خولی چاوەنواڕییەکەت هیچت لەیادە؟

- ئەوەش بەشێکی نهێنییە. من بەگۆڕاوی لەدێرەکە هاتمە دەرەوە. پێشتر کەسێکی شەڕانی، خرۆشاو، خەمئامێز، بێدەنگ، هەمیشە توڕەو گوماناوی بوم...

- پورە (مارتا) وتی: هێشتا هەندێك شت لەتۆدا هەیە!

- (بروتوس) سەلماندی: هەندێجار. پێشتر دەمتوانی زللەیەك لە (تیۆ) راکێشم!، بەڵام ئێستا (ئۆریشا)کەم رێنمایم دەکاتو ئارامیم پێدەبەخشێت. بەپێچەوانەوە منیش جەستەم بەودەسپێرم تاخۆی تێدا نمایش بکاتو بەس.

- (تیۆ) بەچاوی درەوشاوەوە وتی: خواوەندەکەی تۆ کێیە؟

- (بروتوس) بەهێمنی گوتی: (شانگۆ)یە. خوای هەورەبروسکە، پیادەکاری دادپەروەری، توند، پیاوانە. هەندێکجار خۆشگوزەران.

- (تیۆ) وتی: شانگۆ هەر (ژروم)ی پیرۆزە وانییە؟ وەك ناوی باوکی من، سەرنجڕاکێشە.

(ئارتۆر) سودی لەشوێنەکە وەرگرت تا بچێتە باوەشی (بروتوس)ـەوە.

## ئۆشون، یمانجاو شانگۆ

(بروتوس) لەوەزیاتری نەدرکاند. دەستپێکردنی سروتەکە نزیك ببۆوە. لەوێو لە(تیرێرۆ - Terreire) هەرلەسپێدەوە ئامادەسازی خواکانیان دەستپێکردبوو تا بۆ سەر زەویان بهێنن. کاتی ئەوە هاتبوو بەئۆتۆمبێل خۆیان بگەیەننە شوێنی سروتەکە، چونکە خواوەندی ئاین لەدەردوەی تخوبی (باهیا)بوو. (تیۆ) خواردنی بە (ئارتۆر)ی پشیلەکەیداو لەسەر جێگاکەی خەواندی. ڕاڕەوی چونە ژورەوە بۆ (تیرێرۆ)، کە بەمۆم روناك کرابۆرە، شتێکی سەرنجڕاکێشی تێدانەبوو. هۆڵی سروتەکە بەدارخورماو پەردەکانییەوە کەموزۆر بەتەلاری سەماکردن دەچوو، کە لەناوەڕاستی هۆڵەکەدا رمێکی داریان چەقاندبوو. کاتێك دەنگی لێدانی زەنگ دەنگیدایەوە (باوکی قەدیسەکان) بەبەرگی سپیو جۆرەها ملوانکەوە گەیشتو کردنەوەی سروتەکەی راگەیاند. دەنگی سێ تەپڵ لەگەڵ گۆرانی باوەڕداران هاوکات بوو، کە یەکەمین خواوەندیان

بانگهێشت دەکردو ئەویش (ئیشۆ)بوو؛ هەمان (لگبای ئەفریقی). (باوکی قەدیسەکان) بەبەردەم هەموو باوەڕدارەکاندا رابوردو لەیەکە بەیەکەیانی روانی. کاتێك چاوی بە پورە (مارتا) کەوت بەخێرایی روی وەرگێڕا. (تیۆ) دەستی گرتو توند گوشی، بەلأم (بروتوس) ئیدی ئەو کەسەی جاران نەبوو. یەکەمین هاوار دەنگیدایەوە. ژنێك بەداوێنێکی فشەڵەوە بەسوڕانەوە بەرەو ناوەڕاستی هۆڵەکە چوو. (باوکی قەدیسەکان) دەمودەست فەرمانی دەرکرد بۆ ناو میحرابەکەی ببەن. ژنەکە پاش ماوەیەك بەیارمەتی دوو پەرستار، کە چوبونە بنهەنگڵی، هاتە دەرەوە. کلأوێکی پولەکەداری لەسەرکرابوو، کەزنجیری مرواری زەردی پێدا شۆڕببۆوەو هەموو روخساری داپۆشیبوو. (بروتوس) هاواریکرد (ئۆشون)، چونکە ژنەکە (ئۆشون)ی خوای تایبەتی ئلوی شیرین بوو. کەخواوەندەکە سوار ئەسپە خانەخوێیەکەی ببوو لەبەریەککەوتنی بازنەکانییەوە دەنگێکی لەبەردڵان دەهاتو باوەشێنێك وشکی دەکردەوە. ژنێکی دیکەش هاتە ناو هۆڵەکەوە، ئەندامەکانی لەرزەیەکی سوکیان گرتبوو. کاتێك بۆ میحرابەکە رۆشتو گەڕایەوە هێماو جوانکارییەکانی (ئۆریشا)ی تایبەتی تێدا بەرجەستەبوو؛ ئەویش کلأوێکی لەسەرکردبوو، باوەشێنێکیش بەدەستیەوە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: هەتا ئێستا دوو (ئۆشون)!.

- پورە (مارتا) چرپاندی بەگوێیدا: وانییە، لەرەنگی (بالأپۆشە)مرواریيەکەی بنواڕە کریستاڵو زیوە. گوێبگرەو بزانە موریدەکانی بانگی چناوێك دەکەن . فەرموو ئەوەش (یمانجا)کەی تۆیە.

- (تیۆ) هاواریکرد: سلأو، پیرەژن! تندروستیت باشە؟

هەردوو ژنەکە لەژێر چاوی تیژی (باوکی قەدیسەکان)دا، کە بەوردی چاودێری باری بێهۆشیانی دەکرد، دەستیان بەسوڕانەوە کرد.

ئەسپی سێیەم (بروتوس) بوو. (بروتوس)، کە لەرزەیەکی زۆر سەراپای داگرتبوو لەپڕ بزربوو؛ کاتێك گەڕایەوە دوو تەوەری دار بەدەستەوەو ملوانکەیەکی سورو سپیش لەگەردنیدابوو. ئایا بەڕاستی ئەوە هەمان پرۆفیسۆر (کارنرۆدا سیلڤا) بوو؟ چاوەکانی دەدرەوشایەوە، قەدی رێكو زەردەخەنەیەکی فیرعەونیانە لەسەر لێوەکانی نەخشابوو، کە تەورەکانی لەسەر سەری دەسوڕانەوە، دەستی کرد بەسەمایەکی فەرمانداراننە... (بروتوس) بۆ (شانگۆ) گۆڕابوو.

- (تیۆ) بەهێوری وتی: جێگای باوەڕکردن نییە!

- پورە (مارتا) وتی: ئایا بەو ڕەواڵەتەوە سەرنجڕاکێشتر نییە؟. کاتێك ئەفریقا لەئەودا بەرجەستە دەبێت چێژ وەردەگرم.

پورە (مارتا) لەبارێکی ئارامدابوو، چاوەکانی داخستبوو تازۆر نەڕوانێت. مات بوو، بەهێوری خۆی دەجولاند، یەك پێ لەسەرپێکەی دیکە. (تیۆ) دڵنیابوو، بەڵام لەو ساتەی دەستی لەدەستی ڕەهاکرد (باوکی قەدیسەکان) لە پورە (مارتا) نزیك بودودو دەستی لەکەمەری ئاڵاندو پەنجەی دۆشاومژەی هێندە بەتوندی لەسەر ناوچاوانی دانا، وەك ئەوەی بیەوێت ناوچاوانی بسمێت. پورە (مارتا) ناڵەیەکی لێوەهاتو چاوەکانی کردەوە.

- (تیۆ) هاواریکرد: پورە (مارتا) تەندروستیت باشە؟

- بەهێواشی وتی: بابڕوینە دەرەوە. سەرم گێژدەخوات.

لەدەرەوەش لێدانی تەپڵو گۆرانی دەنگی دەهات. پورە (مارتا) لەسەر راخەرێك رۆنیشتو هەناسەیەکی هەڵکێشا.

- ئەو پیاوە ئازاری دایت؟

- وابزانم رێگریکرد تا دوبارە دەستپێبکەمەوە. هەستم دەکرد دەمەوێت بڕۆمو ئەویش هێنامییەوە سەرخۆم. قەرزارباری ئەوم.

- بەڕاست؟ تەنها پەنجەیەك لەسەر ناوچاوان بەسە؟

- پەنجەی ئەو. پەنجەی (باوکی قەدیسەکان)! سوێند دەخۆم زۆر بەتوانایە. دڵنیام ئێستا جێگای پەنجەی لەسەر ناوچاوانم شین هەڵگەڕاوە.

- (تیۆ) بەحەزی زانینەوە پرسی: لەو باوەڕەدایت بوبیت بەئەسپ؟

- نەخێر، نەبوم بەماینیش، تەنها بەدەنگی تەپڵەکان هەستیارمو هیچی دیکە نا.

- (تیۆ) وتی: ئێستا تێگەیشتم بۆچی حەز لە (راك)و (تکنۆ) ناکەیت، واباشە تەنها گوێ لەمۆزیکی (مۆزارت) بگریت، مەترسی نییە. بگەڕێینەوە بۆ هۆڵەکە؟

- هەرگیزاو هەرگیز! هەر لێرە چاوەنواڕی (بروتوس) دەکەین.

تا سپێدە هەردوکیان لەپاڵ یەکدا بەوجۆرە مانەوەو چاویان لەمۆمەکان بڕیبوو، کە یەکەیەکە دەکوژانەوە. کاتێك پرۆفیسۆر (کارنرۆ داسیلڤا) سەماکەی (شانگۆ)ی تەواو کردو گەڕایەوە بۆ لایان میوانەکانی لەئەو زیاتر شەکەتو ماندوبون. (بروتوس) پارچە کاغەزێکی لەگیرفانی (تیۆ)ی خەوتوو رۆکردو بردییە ناو ئۆتۆمبیلەکە.

## پورە (مارتا) مامۆستاکەی دەدۆزێتەوە

(بروتوس) شەوی دواتر هات بەشوێنیاندا. (تیۆ)و پورە (مارتا) هەموو رۆژەکەیان لەناو جێگادا بەسەربردبوو.

- (بروتوس) سەرەڕای مۆربونی لاچاوی خۆشحاڵبوو. بەمیهرەبانییەوە وتی: وابزانم نزیکبوو ببیتە خوای خواکانمان. پورە (مارتا)ی خۆشەویست بەداخەوە درێژەت پێنەدا! دەزانیت کێبوو؟

- پورە (مارتا) هاواریکرد: لەلای من گاڵتەجاڕییە.

- پێداگریکرد: لەگەڵ ئەوەشدا بەتۆ دەڵێم ئەگەر بەردەوام بویتایە تۆ دەبویتە ئەسپی (یان سان)، خواوەندی زریانەکان، کە دەتوانێت رۆحی مردووەکان رامبکات. ئەمە ئەو (ئۆریشا)یەیە، کە بەتەواوی لەگەڵ بەرگی تۆ سازە.

- نامەوێت ببمە ئەسپ.

- بەهەڵەدا دەچیت. لەراستیدا (ئۆریشا)کان جگە لەخەسڵەتە شاراوەکانمان شتێکی دیکە نین. ئەگەر ببیتە ئەسپی (یان سان) ئیدی ئازاری ڤاچت نامێنێتو دڵشادو گەنج دەبیت، بەڵام هاوڕێ ئازیزەکەم.. هێشتا راستی بابەتەکەم بەتۆ رانەگەیاندوە. (یان سان) هاوسەری (شانگۆ)یە.

- پورە (مارتا) بەهێوری وتی: هەزار جار سوپاس! ژنو مێردێکی، کە هیچ شتێکی راستەڤینەیان تێدانییە.

- (بروتوس) بەراگەیاندنێکی بڕوا بەخۆبونەوە وتی: (مارتا)ی ئازیز.. لەدەستی تۆدایە بەرگی راستەڤینە بکەیت بەبەریدا.

- پورە (مارتا) وتی: هیوادارم بەراستت نەبێت.

- لەکاتێکدا دەستی گرتبوو گوتی: بۆچی نا، بەراستیمە. ماوەیەکی دوورودرێژە یەکدی دەناسین!. خواکان قسەیان کردوە، (مارتا)...

- (تیۆ) بەشداریکرد: دەتوانم دەست لەیەختان بکەمەوە، دەتانەوێت ببنە هاوسەر ناتانەوێت منو (ئارتۆر) برسیمانە.

ئەودوانەش برسی بون. (تیۆ) هەوڵیدا (بروتوس) باسی (شانگۆ)ی بۆبکات، بەڵام پرۆفیسۆر هیچی لەیاد نەمابوو. دەیزانی (باوکی ڤەدیسەکان) (ئۆریشا)کەی پورە (مارتا)ی ئاشکراکردبوو. (بروتوس) کاتێك لەباری بێهۆشی دەرچووبوو هەموو شتێکی لەیاد کردبوو. لەو راستییەش

رازیبوو. پورە (مارتا) چووبووە ناو جیهانی خەونو خەیاڵەوەو چاوی لەئەو بڕیبوو، کە بەئارەزوویەکی زۆرەوە خواردنی دەخوارد. لەراستیدا پرۆفیسۆر (بروتوس) خراپ نەبوو.

- لەکاتی دەمسڕیندا (بروتوس) بەناوچاوانی خۆیدا کێشاو گوتی: (تیۆ)، دەستت کردوە بەگیرفانتدا؟ لەیادم چوبو پێتڕابگەیەنم کە..

- (تیۆ)، کەپارچە کاغەزەکەی دەگردەوە، وەڵامیدایەوە: تێگەیشتم. کێ پەیامی بۆ ناردوم، شانگۆ یان بروتوس؟ من حەز ئەکەم (شانگۆ) بێت، سەرنجڕاکێشترە! بابزانم چییە...( **تا سێوی درشت بەدوی ڕێچکەی ئەفریقا بکەوە).**

- پورە (مارتا) وتی: ئاسانە.

- (تیۆ) وتی: سێوی درشت، شتێکم بەیادا دێنێتەوە. کاتێك ویستم بخەوم دێتەوە یادم.

- هەرکەچونە ناوجێگاوە زەنگی تەلەفون لێدرا. (تیۆ) بەباوێشکدانەوە تەلەفونەکەی هەڵگرت: دایە؟ چیڕوویداوە؟ دەزانیت جیاوازی سەعات چەندە؟ وابزانم بەپێچەوانەوە خوێندوتەوە؟ قاچەکانت باشبوو؟ چیبوە؟ بۆچی بەو جۆرە پێدەکەنیت؟ تاقیکردنەوەکان؟ پورە (مارتا) هیچی بەمن رانەگەیاندوە. چۆن، لە (نیوۆرك) تاقیکردنەوەکان بکەم؟ پزیشکەکان وتویانە دەبێت چاوەڕوانی ئەنجام بکەیت؟ من چاکبومەتەوە! ئێ... باشە، هەڵەیەکی گەورەتکرد. دیارە بۆ (نیوۆرك) دەچین.. نا دڵنیابە تورە نابێت. ئێستا بیر لەشتی دیکە دەکاتەوە. نەخێر، نەخێر تندروستیشی زۆر باشە. چی؟ ئۆو، ئەوە نهێنییە... منیش ماچت دەکەم. ئێمەش هەروەها.

- دایکی تەلەفونەکەی داخستەوە. (تیۆ) سەرەڕای پرخەی پشیلەکەی چوە خەوێکی قوڵەوە.

بەڵام (تیۆ) بەهەڵەدا چووبوو. بەیانی ڕۆژی دواتر پورە (مارتا) توڕەبوو. چی! پاش ئەو هەموو پەنهانکارییە لەناوەڕاستی شەودا لەپڕێکدا دایکی (تیۆ) نەزانانە یەکێك لەپەیامەکان تێکدەدات! ئەوەش پەیامێکی ئاسانو سەرنجڕاکێش بوو!

- (بروتوس) وتی: من نەمتوانی بیدۆزمەوە. سێوی درشت؟

- پورە (مارتا) بەتوندی وتی: چۆن؟ بۆ تۆ نازناوی (نیوۆرك) نازانیت؟ بۆ لەکوێوە هاتویت؟م

- من؟ لە(بەرازیل)ەوە، بەڵام هەرگیز بوارم نەبوە گاز لەسێو بگرم. (تیۆ) تۆ دەتوانی بیدۆزیتەوە؟

- (تیۆ) بەدرۆوە وتی: من خۆم زانیم.. دایکم هیچ هەڵەیەکی نەبوو... دڵشادبوم چونکە بینیم دایکم خۆشحاڵەو پێدەکەنێت. پورە (مارتا) لەیادی بکە. کەی دەجولێین؟

- پوره (مارتا) بەتوڕەییەوه وتی: سەرەتا تاقیکردنەوەکانی تۆ ئەنجام دەدەین. دایکت هەمیشه پەلەیەتی. پێشتر زۆر نیگەران بوو، ئێستاش زۆر دەڵێت!. هەرچۆنێك بێت نازانم چی بەسەرهاتوه، بەڵام درێژه بەچاودێریکردن دەدەین. هەروەها ئێستا بەبێ ژوانی پێشوەخت بۆ نەخۆشخانه دەچین.

- (بروتوس) وتی: هەرچۆنێك دڵت دەخوازێت، بەڵام تکا دەکەم توڕه مەبه...

- (تیۆ) بڕۆین! کاتێك پوره ئازیزەکەت پشوو دەدات من و تۆ بۆ نەخۆشخانه دەڕۆین.

- من پشوو بدەم؟ هیچ پێویست ناکات!

- (بروتوس) لەسەر کورسییەکەی ڕۆنیشتو هاواریکرد: لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت پشوو بدەیت تا ئارام ببیتەوه!.

- لەناو ئاسانسۆرەکەدا (تیۆ) به (بروتوس)ی وت: خراپ نەبوو، تا ئێستا کەس بەو جۆره لەگەڵی نەدواوه!

- (بروتوس) وتی: بینیت، چیبکەم؟ ئەوه سروشته ناوەندەکەمه.

## هەڵەیەکی کوشنده

پاش نەخۆشخانه (بروتوس) (تیۆ)ی بۆ کەناری (کۆپاکایانا) بردو بۆ ماوەیەك هەردوکیان لەناو خەڵکێکی زۆردا پیاسەیان کرد. کاتێك بۆ هۆتێل گەڕانەوه پوره (مارتا) لەتاو گریان چاوی سور هەڵگەڕابوو.

- بەناڵەناڵ کردنەوه وتی: دەبوو بۆ تاقیکردنەوەکان بۆ (ریۆ) بگەڕێنەوه، کارێکی باشمان نەکرد. (بروتوس) بۆچی هێشتت دۆخەکه بەوجۆره بێت؟

- (مارتا)ی ئازیز، (تیۆ) تەندروستی زۆر باشتره. دەبینیت چەند شادو بەکەیفه!. چۆن دەبێت نەخۆش بێت؟. لەراستیدا ئەو تاقیکردنەوانه هیچ پێویست نەبون! تۆ تەنها بۆ دڵنیایی خۆتان ئەو کارەدەکەن و تەواو.

- پوره (مارتا) بەساردییەکەوه وتی: دڵنیام دەبوو ئەوه بکەم... (بروتوس) دەبێت باوەڕم پێبکەیت.

- (بروتوس) بەپەله وتی: قسەکەی تۆ پەسەند دەکەم. مەگری، ئێستا دەبینیت چی دەکەم؟.

- تا کاتی دەرچونی ئەنجامی تاقیگه بۆ سەرچاوەی روباری (ئەمازۆن) له (بێلێم - Belem) رۆشتن، کەدرەخته زۆرەکانی گەرما شێدارەکەی هاوسەنگ دەکرد. (بروتوس) میوانەکانی برد

بۆ بازاڕی فرۆشتنی شتومەکی جادوییو چاوبەستنو (تیۆ)ش بۆ مژۆڵ کردنی (ئارتۆر)ی پشیلەکەی سەرەمارێکی مۆمیایی کڕی.

- (بروتوس) پاش ئاڵوگۆڕکردنی چەندجۆر زیندەوەر سەرئەنجام قاچی کیسەڵێکی کڕیو گوتی: رۆحی سورپێستە رەسەنەکان بەسەر ئەم بازاڕەدا زاڵە. خوێنی باوانە ئەفریقییەکانە ئەو بەهرەیەم پێدەبەخشێت.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: باوانی ئەفریقایت؟ کەواتە هەموو شتێك دەزانیت!

- هەڵبەتە، لە(بێلێم) ئاینی (کبوکلوس - Caboclos)کان، کە دوو رەگەی رەشو سورپێستەکانن لەئارادایە. بەخۆشحاڵییەوە میراتگری هەرسێ لقەکەم، لەسپی، رەشو هەروەها سوریش، خۆم بەتەنیا (بەرازیل)ییەکی کامڵم!

- (تیۆ) وتی: پورە (مارتا) دەبینیت نکوڵی لەرەگی ئەفریقی خۆی ناکات، ئامۆزاکەت وتی...

- (بروتوس) قاقا پێکەنیو گوتی: ئامۆزاکەم! ئەو بەتەنها دەیەوێت پورتوگالی بێتو ئەگەر لەوەش بەولاتری پێبڵێن تورە دەبێت. وەرە باخواردنێکی خۆشت پێبناسێنم.

- ئەو خواردنانەی (بروتوس) پێشنیازیکرد نەرمەی مریشکی ئاوی بوو بەئاردی نۆکەوە. بەڵام (بروتوس) بەپورە (مارتا)ی راگەیاند، کە مریشکی ئاوی بەبیبەر مەڵاشو دەسوتێنێتەوەو تۆزی (توکوپی - Tucupi)یش سوتانەوەکە لادەدات. لەبەرئەوە دەبێت هەردوکیان پێکەوە بخورێت. پورە (مارتا) لەگەڵ تامکردنی خواردنەکە کەوتە پژمین. (بروتوس) بەزۆر کوچکێکی لەتۆزەکەی لەزاری رۆکرد.

- پورە (مارتا) بەسەرسوڕمانەوە وتی: سەیرە، هیچ هەست بەتیژییەکە ناکەم، وەك ئەودیە زمانم لەتەختە بێت.

کاریگەری بێهۆشکردنی (توکوپی) هێندە بەهێزبوو، کە پزیشکی ددان دەیتوانی بۆ سڕکردنی دەماری ددان بەکاری بهێنێت. لەراستیشدا لەنێو ئەو دوو تامەدا ئیدی خواردنەکە هیچ تامێکی نەبوو. لەبەرئەوە (تیۆ) بۆ قەرەبوکردنەوە بێتامی خواردنەکەی بەشیرینی پڕکردەوە، بەلام کاتێك پورە (مارتا) دەستی بۆ شیرینییەکە درێژکرد، یەکڕاست (بروتوس) رێگای نەدا، کە دەست بۆ شیرینییەکە ببات!

- پورە (مارتا) بەتوندی وتی: بەچ مافێك دەست دەخەیتە ناو ژیانی منەوە؟ تا ئێستا کەس نەیتوانیوە بەو جۆرە لەگەڵ من رەفتار بنوێنێت!

- (بروتوس)، كە دەفرە شيرينييەكەى لەبەردەميدا لادەبرد، وتى: خاتونى خۆشەويست.. هەموو كارێك سەرەتايەكى هەيە، من زۆر لاوازو تۆش قەڵەوو خەپان.

- پاشان بۆ قەرەبوكردنەوەى دڵتەنگى پورە (مارتا) هێماو ئارمەكانى (ئۆريشا)ى بۆ كڕى، كە بريتيبون لەشمشێرێكى دار، كلكى ئەسپ، گەردنبەندێكى لەعلو بەردى خۆشەويستى خواى زريانەكان. بەدەربڕينێكى خۆشەويستانەوە وتى: خاتونە ئازيزەكەم، كاتێك زۆر تورە بويت دەتوانيت ئەم شمشێرە بەكاربهێنيتو شتێكى سەرنجڕاكێش دەبێت.

رەنگى ئاوەكەى (ئەمازۆن) لێڵ ببوو. پاشەرۆكانى سەر ئاوەكە، دەنگدانەوەى چريكەى باڵندەكان، سيما رەشداگەڕاوەكانى ژنانى دەستفرۆشى بازاڕ، بارهەڵگرەكانى دوتا گونييەيان باركردبوو، ماسييە زەبەلاحەكان بەتەنگى ئەستوريانەوە، دەنگى تيژى گوێرەكەى دەرياو ديمەنى خاكێكى كەوتبوە ئەوپەڕى جيهان هەموو ئەوانە رەنگيان لەروبارەكەدا دەشكايەوە. (ئەمازۆن) خەمئەنگێزبوو، بەلآم چاوەكانى (بروتوس) لەخۆشياندا دەدرەوشايەوە. پورە (مارتا) خۆى رادەستداو ئەوە (بروتوس) بوو باوەڕى پێهێنابوو تاسەردانى شارە نائاساييەكانى (بەرازيل)بكەن. (بروتوس) بۆ گەشتێكى سێ هەفتەيى بردنى. دواجار پورە (مارتا) بەپەشيمانييەوە بڕياريدا بۆ (باهيا) بگەڕێتەوەو ئەنجامى تاقيگەكە وەربگرێت.

كارەسات! بەپێچەوانەى هەموو جۆرە پێشبينييەكەوە ئەنجامى تاقيكردنەوەكان كارەساتباربوو... پورە (مارتا) بەرەو تەلەفونەكە رۆشتو تارێنماكەى لە(نيۆرك) ئاگادار بكات هەرچى زووە پێشەكى خەواندنى (تيۆ) لەنەخۆشخانە سازبكات. ئايا ئەمريكييەكان دەيانتوانى بۆ چارەسەركردنى (تيۆ) پەرەجوو بنوێنن؟ بەلآم بەدبەختەكە لەوێدا بوو رێنيشاندەرەكەى پورە(مارتا) لە(نيۆرك) بەهۆى نەخۆشى (هپاتيت)ـەوە لەنەخۆشخانە كەوتبوو، لەبەر ئەوە پورە (مارتا) دەسەپاچەبوو.

- (بروتوس) لەچاو بزربوو. پورە (مارتا) تا توانى جنێوو نەفرەتى بۆ نارد. سوێندى خوارد تۆڵەى ئەو ڤيرسيچمەييەى لێبكاتەوە، بەلآم كەسى دەسنەكەوت يارمەتى بدات. لەهەمووى خراپتر ئەوەبوو دايكى (تيۆ) ئاگادار بكاتەوە. لەماوەى يەك سەعاتدا هەموو ريسەكەى ببۆوە بەخورىو كارەكەى بەكاموس. پورە (مارتا) دەستێكى كەوتبوە ئەملاو دەستێكى كەوتبوە ئەولا. كاتێك (بروتوس) لەسەر نوكى پێو بەهێواشى گەڕايەوە، پورە (مارتا) هێندە بەكوڵ دەستى بەگريان كرد، كە نزيك بوو لەتاسەوە بچێت.

- (بروتوس) وتى: (مارتا) هەڵەيەك لەئارادايە.

- هەڵەیەکی کوشندە! چۆن باوەڕ بکەم... من گوناهبارم! هەروەها تۆش!.

- (بروتوس)، کەکۆمەڵە کاغەزێکی لەگیرفانی دەرهێنا، وتی: نەخێر، مەبەستم ئەوەیە فایلەکەی لەنەخۆشخانە گۆڕاوە. بەراستیش وایە! ئێمە زۆر دواکەوتین... ئەمانە دوا ئەنجامەکانن.

- پورە (مارتا) لەخۆشیدا خۆی هەڵدایە ئامێزییەوە. چونکە ڕێنیشاندەرەکەشی لە (نیۆرك) هەواڵی نەبوو داوای لە (بروتوس) کرد هاوەڵیان بکات بۆ (سێوی درشت). (بروتوس) بەگەلێك خۆشحاڵییەوە پەسەندیکرد.

- (تیۆ)، کە دەیبینی پورە (مارتا) خەریکی ڕێکخستنی بۆینباخە پەپولەکەی پرۆفیسۆر (کانرو دیسلڤا)یە، ڕوی لەپشیلەکەی کردو گوتی: ئەزانی چی؟ یەکەم، ئێستا باش دەزانم چاکبومەتەوەو دوەمیش ئەو دوانە لەسەر لێواری هاوسەرگیرین!...

بەشی بیست و هەشت

# (نارەزایەتی گەورە)

## بەرایییەکی نائاسایی لە (سێوی درشت)

بۆ یەکەمجاربوو کەس لەفرۆکەخانە چاوەنواڕی نەدەکرن.

- لەکاتێکدا لەناو ریزی دورودرێژی خەڵکدا بەرەو خاڵی کۆنترۆڵی پۆلیس دەڕۆشتن، پورە (مارتا) وتی: لێرە هەمیشە هەروایە! چەند سەعاتێك درێژە دەکێشێت!

- (بروتوس) زۆر بەڕاستی وتی: شمشێری دار!

پورە (مارتا) بەبێئەوەی لەمەبەستەکەی تێبگات چاوی تێبڕی.

- (بروتوس) سەری بۆ دانەواندو گوتی: خاتونی ئازیز.. شمشێرە دارەکەی، کەخواوەندی تایبەتی ئێوەیە، لەکێلان دەرکێشەو! ئەو کاتە توندیو تورەییتان کاریگەرتر دەبێت.

پورە (مارتا) پێکەنی.

(ئارتۆر)، کە خۆی لەناو جانتاکەی (بروتوس)دا حەشاردابوو، بەمیاو میاو سەرنجی پۆلیسەکانی بۆ لای خۆی کێشکرد. سزاکەی برە دراوێکی بەرچاوبوو، (نیۆرك) نیشتەجێبونێکی خۆشی بۆ میوانەکان پێشبینی نەدەکرد. (بروتوس)، کە ببوە ئەرکداری بانگکردنی تەکسی بەلیمۆزینێکی رەش پێشوازییەوە گەڕایەوەو پورە (مارتا) کەوتە دەنگە دەنگ، چونکە باش لەنرخەکانی ئەو شوێنەی دەزانی، ناچار بەدەستکراوەیی وتی: خۆم کرێکە دەدەم.

- پورە (مارتا) بەنارەزاییەوە وتی: خۆ تۆ هیچت پێنییە!

- ئاهێکی کێشاو گوتی: کتێبخانەکەم دەفرۆشم.

- قسەی هیچ مەکە. من هێندەم هەیە بەشی دوو کەس بکات.

- (تیۆ) وتی: کاتێك لەقسەکردن بونەوە بۆ هۆتێل دەڕۆین.

هۆتێل!. پورە (مارتا) بەهۆی شلەژانەکانی رۆژانی رابردوەوە لەیادی دەرکردبوو ژوربگرێت. لەڕاستیدا بڕیاربوو لەجۆرە خانویەکدا بژین، بەلام بەهۆی جۆری نەخۆشییەکەی رێنیشاندەرەکەوە ئەو ئەگەر لەئارادا نەمابوو. لەبەر ئەوە بەناچاری دوو سەعات بەلیموزین بەشەقامەکانی (نیۆرك)دا سوڕانەوە، ئەم هۆتێلو ئەو هۆتێلیان کرد تا دواجار دوو ژوری تایبەتی خوێندکارییان لەتەنیشت (زانکۆی نیۆرك)ەوە چنگ کەوت. پورە (مارتا) فەرمانیدا کە (سێوی درشت) کاریگەری خۆی لەدەستداوە. بەلام شارە گەورەکە بەتەلارە بەرزە شوشەییەکانەوە، کەسەریان لەهەور دەسوو، بەپارکەکانی، مەیدانەکانی فوتبالی ئەمریکی لەناو حەسارێکی تەلبەندو ئەو هەموو خەلکە سەیرو سەمەرەیەوەی شانبەشانی یەکدیو هەموو پێکەوەو هەرکەس بۆ کاری خۆی دەڕۆشتن هەموو ئەوانە لای (تیۆ) سەرنجڕاکێشبون.

- پاش تێرکردنی (ئارتۆر)و خۆگۆڕین نۆرەی تەلەفونکردن بوو بۆ دایكو باوك (تیۆ) بۆ ئەوەی ژمارەی تەلەفونی هۆتێلەکەیان بدەنێ، هەروەها رونکردنەوەیان سەبارەت بەئەنجامی هەلەی تاقیگەکە پێبدەن. پورە (مارتا) لەکاتی تەلەفون کردنی لەگەل (ژروم)ی باوکی (تیۆ) رایگەیاند، کە خۆشبەختانە (بروتوس) لەروداوەکە تێگەیشتوەو هەموو شتێکی سازکردۆتەوە. لەوبەری هێلەکەوە (ژروم) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بروتوس، بروتوس کێیە؟

- پورە (مارتا) هاواریکرد: بروتوس؟ تۆ دەیناسیت. پرۆفیسۆر (کارنرۆدا سیلڤا) دەلێم. بەلێ هەمان مێژونوسەکەی بەرازیلە! دەلێت ناوە بچوککراوەکەی سەیرو سەمەرەیە؟. (ژروم) بەو پرسیارانەت خەریکە سەغلەتم دەکەیت. چونکە خۆم ئارەزوم لێبوو تەواو!

- بەمۆنییەوە تەلەفونەکەی داخستەوە. باوکی (تیۆ) تورەی کردبوو. رایگەیاند باشترە (ئارتۆر) لەلای (نۆیمی) دابنێن تا لەوە زیاتر نەبێتە هۆی سەغلەتی. پاڕانەوەکانی (تیۆ) سودێکی نەبوو. پورە (مارتا) (ئارتۆر)ی لەقەفەسە تایبەتەکەی رۆکردو سوار تەکسییەك بوو. هەروا پاش سەعاتێك گەڕایەوە.

- کاتێك پورە (مارتا) پرسیاری روگرژیو مۆنییەکەی لە (تیۆ) کرد وتی: بۆچی بەوجۆرە لەگەلیدا جولایتەوە؟ ئێستا پشیلەکەم چی بەسەردێت؟

- هیچ، بەئاسانی خۆی هەلدایە سەر جێخەوەکەی (نۆیمی). پشیلە هەر وایە، بێوەفان!

- ئێستا بۆچی بەمجۆرە رەفتار لەگەل مندا دەکەیت؟

- هەروا بەئارەزوو تەواو!

- جارێکی دیکەش (بروتوس) هەوڵیدا باسی شمشێری دارینە بکات، بەڵام پورە (مارتا) بەو قسانە دڵی چاك نەدەبووەوە، تەنها کاتێك بۆ کافتریاکە چوون کەمێك باشتربوو. لەکاتێکدا کێکی بەقاوەوە دەخوارد ئاهێکی کێشاو گوتی: ئاه... لەم جیهانەدا مرۆڤ ئازاد نییە، چونکە دەبێت هەمیشە کارەکانی ئاراستە بکات.

- (تیۆ) بەوریاییەوە وتی: بەراست، دەڵێی جیهانی ئاینەکانمان تەواو کردوە، وانییە؟ جولەکە، کاسۆلیك، موسڵمان، ئاینمیست، هندۆسی، بودایی، کۆنفۆشیۆسی، شینتۆیی، مەگەر هەموو ئەوانەمان نەبینیوە؟

- چیدەڵێیت ؟ دیارە نەمانبینیوە! خۆت وەڵامەکە بدۆزەرەوە. برازای ئازیز... بۆچی ئێمە ئێستا لەولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاین.

- (تیۆ) وتی: هۆکەی نازانم، بڵێی لەپێناو گروپە شێتەکاندا بێت؟

- لەهەموو شوێنێك لەو گروپانە هەیە. بگەڕێ!

- (بروتوس) وتی: من ناڕازیم، تۆ بەتەواوی یارمەتی نادەیت!. (تیۆ)... ئاینێکی سەرەکی و ریشەیی ماوە، کە تۆ هێشتا نەتدۆزیوەتەوە. یەکێکە لەئایینە سەرەتاییەکانی جیهان، کە لێرە، لە ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا زۆرینەی خەڵك بڕوای پێیەتی. ناڕازیم...

- پورە (مارتا) بەگاڵتەپێکردنەوە وتی: ناڕازی... ناڕازی، هەمیشە شتێك هەیە بۆ نارەزایی.

- (تیۆ) لەژێرلێوەوە وتی: زۆرینەن، لێرە؟ ئەوانەی بەهاتوهاوارەوە لەتەلەفزیۆندا ئامۆژگاری دەکەن؟ ئێ... تێگەیشتم. پرۆتستانەکان[1]، ناڕازییەکان!.

- پورە (مارتا) وتی: دواجار! باشبوو (بروتوس) کۆمەکی پێکردیت. رستەی (من ناڕازیم)ـەکەی ئەو بێواتانەبوو، وەك پەیامەکانی سەر کاغەز! (بروتوس) تۆ شایانی دەستخۆشی لێکردنی.

- (تیۆ) تاڕادەیەك جەسورانە وتی: ئێ، هەڵبەتە. دەربارەی پرۆتستانەکان، جگە لەرەشەکوژییەکەی شەوی (سان - بارتلمی)[2] لە پاریس، تەنانەت ناشزانم باوەڕیان بەچی هەیە!.

- (بروتوس) وتی: راستت دەوێت، منیش نازانم، ئازیزەکەم، ئارەزوت هەیە لەوبارەیەوە یارمەتیمان بدەیت؟

[1] Protestant : واتە ناڕازی بوو.

[2]. سەبارەت بەرووداوی خوێناوی رەشەکوژی پرۆتستانەکانی پاریس لەشەوی جەژنی (سن – باتملی) لەسەردەمی دەسەڵاتداریتی کاترین دووەم.

## کاتێك (پاپا) دژ بە(مەسیح) دەبێت

- پورە (مارتا) بەخۆشییەوە لەوەی هەلی بۆ رەخساوە بیروڕای خۆی دژ بە(قەشەکان) دەربڕێت، وتی: مەبەستتان لەوەیە کە پرۆتستانەکان لەسەدەی شانزەدا دژبەچی رویان لەنارەزایەتی دەربڕین کرد؟ زۆرباشە، دژ بەزیادەڕەوی کڵێسای (پۆستیلیك)بوو؛ بەواتایەکی فراوانتر (کڵێسای پۆستیلیك — حواری — کاسۆلیکی رۆحی). لەو سەردەمەدا قەشەکان بەئاشکرا کەیفو سەفاو هەرزەییان دەکرد. ژنیان سیغە دەکرد، کچانی پاکیزەیان دوگیان دەکرد، گیرفانیان بەپارمەتییەکانی باوەڕداران پڕدەکرد: لە پارەی سروتی (غوسل)، ناشتنی تەرمو ماتەمگێڕی، هاوسەرگیری، ناونوسکردن، خێروخێراتو بەتایبەتی بەشی سزای گوناهەکان. کڵێسا بەهۆی ئەو گەندەڵیو گومڕاییانەی داوێنگیری ببوو سیستمێکی پاکژکردنەوە لەگوناهەکانی داهێنابوو.

گوناهەکار دەیتوانی بەنرخێکی زۆر، کە لەلایەن کڵێساوە دیاریدەکرا، مۆڵەتی (بەخشینی)ی خۆی بکڕێت. ئەگەر گوناهەکار گوناهەکەی گەورە بوایە یەك رست (بەخشین)ی دەکڕیو ئیدی خاترجەم دەبوو، کە لەگوناهەکانی بەخشراوە. بازرگانی مۆڵەتی (بەخشین) سودێکی زۆری هەبوو. کریستیانەکان لەترسی ئاگری (دۆزەخ) سەرمایەگوزاریان لەکڕینی (بەخشین)دا دەکرد؛ هەروەك چۆن ئەمرۆ لەبۆرسەی هاوبەشدا سەرمایەگوزاریو سوخۆری دەکەن. لەگەڵ ئەو جیاوازییەی لەو سەردەمەدا لەجیاتی سەرمایە کۆکردنەوە بۆ سەردەمی خانەنشینی دواتەمەن بەو پارەیەی دەیاندا خانەنشینی جاویدانیان بۆ خۆیان دەستەبەردەکرد. سەرمایەگوزارییەکی سودبەخش بوو. نەدارانیش، کە خاوەنی شتێك نەبون بۆ کڕینەوەی گوناهەکانیان لەکاروانەکە دواکەوتبون. ئەمەش تاکە بازرگانیکردنی کڵێسا نەبوو. شتی پیرۆزی کۆنینەی بەباوەڕداران دەفرۆشت، پارچەی ئەو خاچانەی مەسیحی پیادا هەڵواسرابوو، موی (سانتا ئۆرسول)، شانەی قژی (سان سباستیان)، کفتەکەی (سان ژۆزیف)، موی ریشی (سان ژاك)، (فرمێسکەکانی پاکیزەی پیرۆز). ئەگەر ئەم خرتکەو پرتکانە لەشوێنێکدا کۆبکرێتەوە بەبازاڕی کۆنەفرۆشی (بیلیم) دەچوو. بەکورتی کڵێسا زیاتر بەرەو بتپەرستیو بت دروستکردنێکی بێڕادەو سنور هەنگاوی دەنا. بەڵام کێ فەرمانڕەوای ئەم کڵێسایە بوو؟ (پاپای مەزن). کێ دەستی بەسەر سامانە لەبن نەهاتوەکەی کڵێسادا دەڕۆشت؟ کێ دەیوێرا (راهبە)و (سیغە)و کوڕانی هەبێت؟ ئەوەش بەپێچەوانەی دەستورو رێسای پیرۆزی ئیمانی کریستیانی؟. دیارە (پاپا)ی مەزن.

- (تیۆ) هاواریکرد: بەراست؟ هەموو (پاپا)کان؟

- لەراستیدا لەوڕووەوە تەنها یەك (پاپا)بوو؛ ئەویش (ئەلكساندەر بۆرژیا)[1]بوو، بەلاّم خۆ پاپاكانی دیكەش لەهەڵەو گوناهە بێبەری نەبون. كێ مۆڵەتی بە (ئەنگیزیسۆن) دەدا، هەر كەس بچوكترین دەنگی نارازیبون بڵند بكات لەسەر لیژنەدار بسوتێنرێت؟، (پاپا)ی مەزن! وەك كەسێكی كەللە شەق، زاڵم، تاوانكارو نەشیاو لەجێگای (بوتریس پیرۆز)و (پاپا)یەتیو هەر ناوێكی دیكەی هەبێت، بۆ كەسێكی (دژە كریستیانی)[2]گۆڕابوو.

- نەڕەی یاخیبون ماوەیەكبوو دەهاتە بەرگوێ، ئینجا قەشەیەكی كاسۆلیكی بەناوی (مارتن لۆتەر) بابەتی ریفۆرمی كلێسای پێكەشكرد. هەڵبەتە پاككردنەوەی كلێسا لەوهەڵەو گوناهانەی كردبونی شتێكی نوێ نەبوو. قەشەو دانیارانی هۆشیار هەر لەسەدەیەك لەوەوبەرەوە لەهیوای ئەوەدابون. بەمپێیە (لۆتەر) یەكەمین (ریفۆرمخوازی) ئاینی نەبوو، بەلاّم وەك پێشینانی خۆی سەری بەسەر ئامۆژگاریو پێشنیارەكانیدا شۆڕ نەدەكردەوە. (لۆتەر)، كە لەساڵی (١٥٢٠) لەلایەن كلێساوە كافركرا، بەفەرمی ئەو فەرمانەی كلێسای سوتاند. لەوەش خراپتر نامیلكەیەكی بەناونیشانی (بۆچی نوسراوەكانی پاپاو لایەنگرانی لەلایەن دكتۆر مارتن لۆرتەرەوە سوتێنران) بلاّوكردەوە. ئەگەر لەهەلومەرجو دۆخێكی دیكەدا بوایە بێگومان لەسەر لیژنەدارێك ئاگریان تێبەردەدا. بەلاّم لەوكاتەدا ئەوە روینەدا، چونكە پاشاو شازادەكانی (ئەڵمانیا)، كە بەدەست زۆرداریو خراپەكانی كلێساوە تەنگەتاوببون پشتیوانیان لەپێشنیارەكانی (لۆتەر) كردو یارمەتیاندا تالەهەڕەشەوگوڕەشەكان و دەستگیركردنی بەدووربێتو لەژێر ناونیشانو نازناوێكدا حەشاریاندا؛ بەوجۆرەش (لۆتەر) بەزیندویی مایەوە. سەركەوتنێكی گەورە بوو! لەپاش ئەو روداوە چەندین دەوڵەتی دیكەش لەدەوری ئەو شتە ئالاّن. كە بە(ریفۆرمی ئاین) ناودەبراو بزوتنەوەیەكی نارەزایی گەورە دژ بەدەسەلاّتی (پاپا)و كلێسای كاسۆلیك دروستبوو. پاش ماوەیەكی كورت ریفۆرمخوازەكان لەهەموو شوێنێك بەئاشكرا نەفرەتیان لە (پاپیست)ەكان دەكرد، واتە ئەوانەی لایەنگری (پاپا) بون. (مارتن لۆتەر) وەك بیریارانی پێش خۆی، كە تێكۆشابون، لەبیری گێڕانەوەی كریستیانیدابوو بۆ سەرەتاكانی (كریستیانی بەرایی). كریستیانیەك بەبێ (پاپا)، بەبێ دێرو كلێسە، بەبێ بازرگانیكردن بەپیرۆزییەكانەوە، بەبێ زنجیرەی پلەداری كلێسایی، بەبێ كۆمەڵگەی رۆحانییەت، بەبێ دەستدرێژیو پێشێلكردنی یەكسانی برایانی كریستیانی. دەیانگوت لەسەرەتای كریستیانیدا هاوسەرگیری قەشە قەدەغە

[1]. A. Bor Gia: ئەم پاپایە بە (باوكە سیزار فۆلكرۆس بۆرژیا) ناسراوە.

[2]. Anti – Chrstc: نوسەر لەم دەمكەدا سودی لە لێكچوونی واتا وەرگرتوە، كە بەواتای (دوژمنی مەسیح)ـەو بەپێی ریوایەتەكانی دنیا ئاخربوون كەمێك پێش ئەوەی جیهان كۆتایی بێت ئاینێكی دژ بە مەسیح سەرهەڵدەدات

نەبووەو کە لەپاشانیش لەلایەن (پاپا)وە سەپێنراوە لە(ئنجیل)دا نییە. (لۆرتەر) ئەو دەستورەی پێشێلکردو بەبەرگی قەشەییەوە هاوسەرگیری لەگەڵ خوشکێکی ئاینی بەناوی (کاترین) ئەنجامدا، کە ئەویش لەگەڵ دەستەخوشکێکی یاخیبودا لە دێرێك هەڵاتبون. بیرۆکەی (ریفۆرم) سادەبوو، کڵێسا لەوبەرگە دابماڵرێت کەکرابوو بەبەریدا، لەدرۆو فریودان دوربکەونەوە، خراپ بەکارهێنان و دڵی واقیعی لە(دەقە پیرۆزەکان) دوربخەیینەوە، بەهەموو بڕواوە باوەش بەئیماندا بکەین‌و پڕ بەدڵ پاسی بکەین. (لۆتەر) هەر تەنها بەرەخنە گرتن لە کڵێسای (رۆمی)یەوە نەدەوەستا، بەتاسەوە وێڵی دوبارە سازدانەوەی پەیوەندی بوو لەگەڵ خوداوەند.

- (تیۆ) هاواریکرد: عارف بوو!، بێگومان لەحاڵەتی پەرۆشی‌و بێهۆشیدا؟

- هێندە لەعیرفانییەوە دوورنەبوو. روداوێکی سەیر لەچارەی نوسرابوو. (مارتن لۆتەر) لەترسی زریانێکی بەسەریدا هاتبوو پەیمانی دابوو ئەگەر رزگاری ببێت بچێتە دێرێکەوە. بەلێوەشاوەیی‌و ئازایانە هەوڵیدا راهیبێکی باش بێت. خۆی ئازار دەدا: رۆژو گرتن، شەونخونی‌و مانەوە لەبەرسەرماو تەحەمولکردنی، هیچ ئەنجامێکی نەبوو. (مارتن لۆتەر)ی راهیب بەهەموو ورەیەوە نەیدەتوانی بەسەر خوڕەوشتی توندی خۆیدا زاڵ بێت‌و نەبەسەر عیشق‌و ئارەزوی رەمەکیدا، کە بونی دیل کردبوو. بەکورتی حەزی بەژیانێکی پەرێشانی بوو. (شەیتان)ی تاوانبارکرد، کە ترساندویەتی تا رۆحی دیل بکات، بەرامبەر بەبونی خودی خۆی، بەرامبەر بە کڵێساو کریستیانی دوچاری گومان بوو تا رۆژێکیان روناکییەك ئیمانی سادەو بێخەوشی ئاشکراکرد، گەڕانەوە بۆ ئیمان، دور لەکۆت‌و بەندی کڵێسا، چەند ئاسان‌و سادە بوو!

- (تیۆ) وتی: سەیرە، وەك بودا. لەوکاتەدا کە رۆژوی شکاند... بەهەموو شێوازێکی بەردەست جەستە بخەرە ژێر ئەشکەنجەوە تا نوری خودایی بەهەموو جوانییەکەوە بەسەرتا بێت.

- راستە. بەڵام (لۆتەر) بەپێچەوانەی (بودا)وە هەموو ژیانی بە ئازارو بێبەشبون بەسەربرد. سەردەمێك پەرێشان‌و سەردەمانێك تێکشکاو و روخاو. هەندێجار لەکاردا چالاك‌و کۆششی سەرسامهێنەرو هەندێجاریش سست‌و ناچالاك‌و بێجوڵە، لەهەموو کاتێکیشدا دیلی دەردەسەرێکی لەوزە بەدەرە. لەکاتێکدا بەهەموو بونییەوە دەژیاو باش دەیخواردو دەیخواردەوە چەندین مانگیش لەخەلوەتدا دەبوو. خوڕەوشتی ئاوێتە لەگەڵ توندوتیژی‌و پیرۆزیدا هێندە وزەو توانای پێبەخشی تا بتوانێت بانگی ریفۆرمی ئاینی بدات، بەڵام نەك بەوجۆرەی خودی ئەو بکاتە پیرۆزکراوێك.

- پورە (مارتا) قسەکانی بەو ئەنجامە گەیاند، کە ئەو خاوەنی خەسڵەتی مرۆڤ بوو، زۆر مرۆڤایەتی....

- (بروتوس) قسەکەی پێبڕیو گوتی: بەڵام نادادپەروەرانە، دژ بەیەك، زیادەڕۆیی. (لۆتەر) هێرشی دەکردە سەر دوژمنەکانیو ئەوانیش بریتیبون لە: پاپا، شەیتان، تورکەکان و جولەکەکان، بەڵام پشتگیری لەرەشەکوژی جوتیاران بەدەستی شازادەکانی ئەڵمانیا دەکرد. راستە لەبەرامبەر نەیاردا ملی شۆڕنەکرد، بەڵام ئەویش وەك (پاپا) سودی لەئاگرو ئاسن وەرگرت!

- پورە (مارتا) بەسەرسوڕمانەوە گوتی: بەڵام تۆ وتت هیچ دەربارەی (پرۆتستانیزم) نازانیت!

- واتە کە.... دەبێت دانبەشتێکدا بنێم. هاوڕێی ئازیزم، من درۆمکرد تا بزانم بیروڕات چۆنە! باشیشم کرد، چونکە من سەبارەت بەبزاوتو (ریفۆرمی ئاینی) بیرۆکەی لەوەی تۆجیاوازم هەیە...

## کاتێك جیهانی مەسیحی لەهەموو لایەکەو ە درزی تێکەوت

- (بروتوس) لەوبوارەدا چیرۆکێکی تایبەت بەخۆی هەبوو. بەبڕوای ئەم ئەگەر تواناو وزەی (لۆتەر) لەکاتی گونجاو و شوێنی خۆیدا دەرنەکەوتایە هەرگیز لای جیهان ناسراو نەبوو، هەر بەنەناسراوی دەمایەوە، چونکە سەدەی شانزە خاڵی کۆتایی رێگایەکی درێژبوو؛ ماوەیەك بوو جیهانی کریستیانی لەهەموو لایەکەوە درزو دەلاقەی لێدەرکەوتبوو، تاعونی رەش، مەرگو مردنی بەکۆمەڵ، جەنگو برسێتیو گرانی، هەڕەشەکانی ئیمپراتیۆڕی تورکی عوسمانی ئەم جیهانەی وروگێژ کردبوو. خەڵکی گەیشتبونە ئەو بڕوایەی مێژوو هەموو واتاکانی خۆی لەدەستداوەو بەوپێیەش کاتی (دوایین دادوەری ) گەیشتووە. خەتیبو بانگدەرانی ئاینی کەوتنە نەفرەتکردن لەدۆزەخەکان، کەوتنە داوی _'وکردنی جادوگەرو نەفسونیازەکانو هەڕەشەیان لەباوەڕداران دەکرد لەکاتی ئەنجامدانی بچوکترین گوناهەدا دوچاری عەزابی خوداییو کارەساتی ئەم جیهانە دەبن... تاوانی نەفرەتاوی، گروپەکانی خۆکوژی، منداڵانی بەقوربانیکراو کاری ئاسایی رۆژانەی ژیان بوو... باوەڕداران هەراسانو تۆقیو جگە لەمەرگ بیریان لەهیچی دیکە نەدەکردەوە. مەرگێکی راستەوخۆ گوناهەکارانی بەرەو دەروازەی کراوەی (دۆزەخ) راپێچ دەکرد.

- (تیۆ) وتی: وەك جیهانی ئەمرۆی خۆمان!

لەژێر چنگی کلێسای رۆحانییەکان دەرهێناو کردییە دەستە راستی یاخیبونو هەڵگەڕانەوەی دژ بەکلێسای سەردەمی دامەزراندنی (ریفۆرم). هەر لەبەرئەوەیە (بروتوس) بەهایەکی ئەوتۆ بۆ ئەو (ریفۆرمخوازە) دانانێت، بەتایبەتی کە پاش ئەو کەسانی دیکە هەستان بەکاملکردنی ئەوەی ئەو پێکیهێنابوو.

- (تیۆ) وتی: هەمان شێوازی ناسراوی هەمیشەیی. ئاشکرایە لەدروستکردنی ئایندا هیچ کەسێك بەتەنها کار ناکات. زۆرجار کاتێك دروستکەر لەناودەچێت ئەوانی دیکە هەموو شت دەگۆڕن.

- پورە (مارتا) توڕەبوو گوتی: (ئەوانیدیکە) (هەموو شت)ێکیان نەگۆڕی. (لۆتەر) بناغەی راستەقینەی (ریفۆرم)ی دارشتبوو: لەگەڕان بەناو دەروندا، خۆسپاردن بەخواوەندو تیایدا توانەوە، ئەو خوایەی تاكو تەنیاو مەزنەو بەرەکەتی باوەڕ بەوەوە بەندە. ئەوبوو لەکاتی سەرگەردانو وێڵبوونی (لۆتەر)دا، کاتێك لەتاریکیدا جگە لەدودڵیو گومان هیچی دیکەی نەبوو، روناکی خۆی بۆ دەرخستو تێگەیشت کە بەبێ خواوەند ناتوانێت بەمەنزڵی ئیمان بگات. مرۆڤ لەچاکەو خراپەکردندا ئازاد نییە، چونکە هەموو شت نەخواوە سەرچاوە دەگرێت. تائەوکاتە کێ کریستیانەکانی لەتەڵەی شەیتان پاراستووەو چاکەو فریادڕەسیان بووە؟. (پاپا)و کلێسا بوو، بەڵام (لۆتەر) رێگایەکی دیکەی کردووەو بوە رێنیشاندەر، کە باوەڕداران دەتوانن چاو لە کلێسا بپۆشنو خۆیان لەناو باوەڕبون بەخواوەندا، واتە لەناو دنیای ئیماندا، فەرامۆش بکەن. ئەم رێچکەیە رێگایەکی نزیکتری خستە بەردەست خەڵکانی باوەڕدار بۆ گەیشتن بەخواوەند. لەو رێگا نزیکترەدا کلێسا جێگایەکی نەبوو.

- (تیۆ) وتی: سەیرە. بەمپێیە ئەوە خودی (پاپا) بوو بەدەستی خۆی تەناڤی پەیوەندی نێوان ئاسمانو زەوی بڕیبوو؟

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: لە دیدی (لۆتەر)ـەوە بەڵێ. دامەزرێنەری (ریفۆرمی ئاینی) جارێکی دیکە پەیوەندی لەگەڵ خواوەندا دروستکردەوە.

- (بروتوس) وتی: باشە، ئەم بابەتە شتێکی تازەنییە.

- پورە (مارتا) بەپێناخۆشبونەوە وتی: چۆن؟! کارێکی نوێ بوو!. چونکە (لۆتەر) بەتەنها خواوەندی بۆخۆی قۆرخ نەکرد. دەیگوت کلێسای راستەقینە لەناو ناوەرۆكو بونی هەموو کەسێکدایە، لەدڵی هەموو تاکێکی مرۆڤایەتیدایە. دوبارە واتای راستەقینەی بۆ کلێسا گێڕایەوە، کە (ئیکلاسیا - Ecclasia)یەو بەواتای کۆمەڵی باوەڕدارانی دەوری (ئنجیل) دێتە.

- (بروتوس) وتی: ئەو گێڕانەوەیە (لۆتەر) نەبوو، بەڵکو (کالڤن)[1] بوو.

- پورە (مارتا) وتی: تۆ (ژان ئاوس)[2] لەیاد دەکەیت!

- (تیۆ) بەشداری گفتوگۆکەی کرد: عاشقانی ئازیز... لەبیری خۆتانی بەرنەوە. لەجیاتی ناو گۆڕینەوە باشترە بۆ منی رونبکەنەوە پرۆتستانەکان چیدەکەن؟ هەرچۆنێك بێت بێگومان سروتو نزایان هەیەو پەیوەندیان بەو ئاینەوە چۆنە؟

- (بروتوس) وتی: منیش ئەو پرسیارە لەخۆم دەکەم. لەوانەی من دەیانناسم حاڵەتی متمانە بەخواوەند نابینرێتو خەمئەنگێزو خەفەتبارن.

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: زۆر باشە، من بڕوای تۆ دەگۆڕم. چاوەنواڕی سبەینێ بە. دوچاری سەرسوڕمان دەبێت.

## خرۆشاویو کاریگەری ئەفریقایی

رۆژی دواتر یەکشەممە بوو. پورە (مارتا)، (بروتوس)و (تیۆ) بۆ کڵێسای (حەبەشیەکان) لەشەقامی سەدوسییەم رۆشتن، کە مەڵبەندی خواپەرستی خێزانە ئەفریقاییەکان بوو لەرۆژی یەکشەممە. ئاپۆرەکە هێندە قەرەباڵغ بوو، کە دەبوو بۆ چونە ژورەوە لەریزدا سەرەبگرن. لەپاڵ (ئۆرگە)گەورەکەدا سێ ژن راوەستابون، کە بەسەر پۆشاکە رەنگاوڕەنگەکەیاندا مانتۆیەکی شینیان پۆشیبوو.

- (تیۆ)، کە پاژنەی پێی بەشەقامەکەدا دەکوتا، وتی: تا ڕادەیەك هیچ سپی پێستێك لەئاپۆڕەکەدا نییە. ئایا ئەم کڵێسایە تایبەتە بە رەشپێستەکان؟

- پورە (مارتا) وتی: نەخێر، بەڵام برێك بیربکەرەوە. ئەفریقا سەرچاوەو بنکەی کۆیلە رەشپێستەکانە، کە بەملیۆنانیان هێنراونەتە ئەمریکاوە... تێکەڵاوی نێوان سپیپێستو (نیگرۆ - Negro)کان یان رەشپێستەکان بەهەموو شێوەیەك قەدەغەبوو. کۆیلە ئەفریقییە – ئەمریکییەکان تاکاتی جەنگی جیابوونەوە ئازادنەبونو لەژێر فشاری کۆیلایەتیدا درێژەیان بەژیاندەدا...

---

[1]. Calvin: ژان کۆڤن کالڤن (١٥٠٩ – ١٥٤٦) ریفۆرمکاری ئاینی فەرەنسیو دامەزرێنەری قوتابخانەی کالڤیتیسم. هەروەها (کالڤن) بەیەکێکیش لە نوسەرە گەورەکانی زمانی فەرەنسی دادەنرێت. لەفەرەنسا پرۆتستانەکان بە کالڤینیست دەڵێن (Hugvcnot)، کە سەرەتا لایەنێکی هێرشبەرانەی هەبوو.

[2]. Jan Avs: ریفۆرمخوازی ئاینی چیلی (١٣٦٩ – ١٤١٥) بەهۆی بیروڕاکانیانەوە کڵێسا بەکافر لەقەڵەمیداو بەئاگر سوتێنرا. (ژیۆیستەکان) کە لایەنگری بوون بەنیشتمان پەروەرو شەهیدێکی گەورەی دادەنێن.

- (تیۆ) قسەکەی پێبڕی‌و گوتی: ئەو ئازادییەش (ئەبراهام لنکۆڵن) پێیبەخشین.

- لەمکاتـەدا (تێکـەڵاوبون) لەبـەرازیل کـاری خـۆی ئەنجامـدابوو، بـەڵام لێـرەداو لەئـەمریکا، ئەفریقییـەکان کۆیلـەبون‌و چـۆن یەکـدیان دۆزییـەوە؟. لەکوختـە نـابوت‌و لەکێڵگـەکانی خودانەکاندا، ئەفریقییەکان بـەزۆر (غوسڵ)کرابـون. چۆن دەکـرا ئـەو ئەفریقایـە ببینـرێتـەوە لەکێڵگەو مەزارەکانـدا نەبونایـە؟ کۆیلـە ئەفریقییـەکان لەهـەر شـوێنێکبون گۆرانیـان دەچـڕی. کـاتێکیش لـەنیری کۆیلایـەتی ئـازادبون، دۆخێکـی دیکـەیان وەرگـرت. پـێش جـەنگ منـاڵی ڕەشپێستەکان لەگەڵ مناڵی ئەربابەکان پێکەوە لەیەك شوێن دەژیان؟ ... بەڵام دواتر!

- واتە دەتەوێت بڵێیت پاش جەنگ هەلومەرجەکە خراپتر بوو؟

- پـورە (مارتـا) هەناسـەیەکی قـوڵی هەڵکێـشاو گـوتی: بـەهیچ کلۆجێـك بارەکـە باشـترنەبوو. خودانـە تێکـشکاوەکان ڕەشپێـستەکانیان لـەخۆیان دورخـستەوەو بـەرەڵایان کـردن. بـەمجۆرە یەکەمین (گتو)ـەکانی ڕەشپێستان سەریهەڵدا. ئەم (گتو)انـە لەلایەکەوە ئـەفریقای لـە ولایەتـە یەکگرتوەکانی ئەمریکا جوداکردەوەو ڕەهاکرد، لەلایـەکی دیکەشـەوە نیگرۆکـان جوداببونـەوەو دەیانتوانی چۆنیان بوێت بەوجۆرە ژیان بگوزەرێنن...

- (تیـۆ) وتـی: مـن نـاڵێم ڕەشپێـستەکان. پـێم باشـترە بڵـێین (ئەفریقییـە ئەمریکاییـەکان)، چونکە جگە لەزاراوەی ڕەگەزپەرستی هیچی دیکە بەبیرناهێنێتەوە.

- ئەگەر ئارەزوو دەکەیت ئەو زاراوەیە بەکاربێنە. من قـسەیەکم نییـە. ئیـدی لەسـەر هـەمان ریتم‌و بەرنامەی ژیانی پێشوی ناو کێڵگەی پەموو، هەروەها لەگەڕەکە هەژارنشینەکاندا سرودە ئاینییەکانی وەك (Negro Spirtval)، (گوسپل - Gospel)[1]، ئاهـەنگی گۆرانییـەکانی (Bluse)[2] شکۆمەندی‌و پەرۆشی بەدەستهێنا. پاشان چونکە ڕەشـەکان لـەدوو یـان سـێ ئـامێری مۆزیکیـان نـەبوو، مـۆزیکی (جـاز)یـان داهێنـا، کـە یەکـەمین هـەنگاو بـوو بـەرەو داگیرکردنـی جیهـانی خودانەکانی پێشوو.

- زۆرباشە، بەڵام لێرەدا لایەنی ئاینی لەکوێدایە؟

- دەبینیت. سروتی ئاینیش بەو زوانە دەستپێدەکات.

بـاوەڕداران بـەپێی ریـزی ڕاخـەرەکان دانیـشتبون‌و لەبەرامبەریـشیاندا پیـاوێکی بەتەمـەن بەڕوپۆشێکی زەردی ئاڵتونییەوە بـەپێوە ڕاوەسـتابوو. ئـەو پیـاوە کەشیـشێکی پرۆتـستانی بـوو،

---

[1]. هەرچەندە ئەم سروتە ئایینی‌و یەکسانییە، بەڵام لەدواییەدا بۆ هەموو سرودەکان بەکارهێنرا.

[2]. Blues: فۆرمێکی مۆزیکییە بەگۆرانی چوار زمانی ڕەشەکانی ئەمریکا، کە جۆرێکیان شێوەی گونجاوی (جاز)ـە.

لەکاتێکدا دەستەکانی لەسەر (ئنجیل) دانابوو ئامۆژگاری دەستیپێکرد. دەنگی بەئەستەم دەبیسترا. پاشان دەنگی بڵندبوو، گڕی گرت...

- پەنجەی لەئاپۆرەکە کردو بەهاوارکردنەوە وتی: ئبلیس لەنێو ئێوەدایە!

- خەڵکەکە، لەکاتێکدا دەستیان بەیەکدا دەدا یەکدەنگ وتیان: Yeah (بەڵێ).

- روخساری ناناسیت، بەڵام لەناوتاندا دەگەڕێت، بەڵێ، لەوێدایە!

- خەڵکەکە هاواریان کرد: Yeah!

- لەکاتێکدا پەنجەی توانباریکردنی لەبۆشاییدا دەسوڕاند روی لەخەڵکەکە کردو هاواریکرد: ئێوەن؟ یان تۆیت، بەرای من؟

- کۆمەڵەکە وەڵامیدایەوە: نەخێر!

- بەهەڵەداچویت! لەهەموو شوێنێك دەسوڕێتەوە... بینیم دەچووە ناو کڵێساوە. سەراپای سور بوو! بەڵێ، بینیم لەریزی یەکەم دانیشت بەروخسارێکی جەسورانەوە لەمنی راونی.

- کۆمەڵەکە ناڵاندیان: ئەفسوس!

- بەکتێب لێرە دەرمپەڕاند!

- خەڵکەکە هەناسەیەکی سەرفرازیان هەڵمژی: هالالویا!

- هاواریکرد: برایان‌و خوشکان، کێ لەدوای ئەو دەتانپارێزێت؟

- کۆمەڵەکە، کەوەك کورە ئاگر جۆشداربوو، وەڵامیاندایەوە: عیسا!

بەئاماژەیەکی نەبینراوی قەشەکە، خەڵکەکە کەوتنە گۆرانی وتن‌و سەماکردن. شەپۆلی گەورە، ریزی راخەرەکان، یەکدەنگ‌و جوڵە دەستیانپێکرد. هەموو ببونە یەك جەستەو ئەندام. کڵاوی ژنان‌و پرچی گرێدراوی کچان‌و گوڵەکانیان‌و دەستەکانی ناو دەستکێش هەموو شەپۆلیاندەدا. کەس نەدەکوروزایەوە، کەس نەدەکەوتە سەر زەوی، هیچ حاڵەتێکی بێهۆشی‌و دواچێژ لەوناوە نەدەبینرا. دەنگی تەپڵ لەو ناوەدا نەبوو، بەڵام گۆرانییە هاوتاکەو چەپڵەی دەستەکان دەنگیان دەدایەوە. خواوەندە فرە روخسارەکان لەگەڵ ئاهەنگی ناوی (عیسا)دا لەئارێتەبوندابون.

- پورە (مارتا)و (تیۆ) بێدەنگ‌و بێجوڵەبون‌و نەیاندەوێرا ئەو جوڵە هاوسەنگە تێکبدەن. (بروتوس) چوە ناو سەماکەوە.

- قەشە ئاگاداریدا: تۆ (غوسڵ)ت هەڵبژارد!

- کۆمەڵەکە لەبارێکی رۆحانیدا بەهێوری وتیان: Yeah!

- تۆ لەئاوی باوەڕدا مەلەت کردووەو بەپاکژی گەیشتویت! دەزانیت باوەڕت بەچی هەیە؟

- Yeah!

- هاواریکرد: ئنجیل! تەنها هەر ئەو ڕێنیشاندەرمانە! ئێوە لەژێر بەرەکەتی ئەودا درێژە بەژیان دەدەیت!

- ئامین..

- برایان‌و خوشکان، تەنها ئنجیل دژ بەئبلیسە، (خراپەکانی) لەملی منالەکانمان دەنێت، قوتیان دەدات‌و دەیانکوژێت و بۆ جەنگ دەچێت.

- ئەفسوس!

- هێی! ئبلیسی سور تۆ لەخواوەند بێبەش دەکات‌و بەردو هەژاری‌و زیللەت‌و گومڕایت دەبات.

- بەڵێ.

- یەکسانی بۆ هەموان لەناو کڵێساکەماندا! نەدەنگێك، نە زۆرداریيەك. هەریەکەمان کەسێکە لەناو ئەوانیدیکەدا! برایان‌و خوشکان، برایەتی بەناوی کێوە، کێ؟

- خەڵکەکە بە وشەی پچڕ پچڕ وەڵامیاندایەوە: عـ...یسـ....ـا!

دەستەکان هەڵبڕان‌و هاوارەکان تیژبون، ژنەکان لەجۆش‌و خرۆش‌و خۆشیدا سەریان دانەواندو چاویان داخست. پەیکەرەکان کەوتنە لەرزەو لەسەر ریتمی مۆزیکەکە دەستەکان پێکدادران. بێهۆشی دروست ببوو. بێهۆشییەکی سرودو ئاوازەکان، لەوپەڕی دەسەڵات‌و کامڵبوندا، رێکیدەخست‌و خستبویە ژێر کۆنترۆڵەوە. (بروتوس) لەجوڵە وەستا.

- قەشەکە هاواریکرد: یەکدیتان خۆشبوێت، هەرکەس ئەوی دی.

- ئاپۆرەکە هاواریکرد: یەکدیمان خۆشبوێت!

- لەناو خەڵکەکەدا ماچو لەباوەشگرتن بەڕستەی (براکەم، تۆم خۆشدەوێت. خوشکەکەم تۆم خۆشدەوێت) دەستیپێکرد.

- (تیۆ) بەهێوری وتی: ئایا ئەمانە کریستیانین؟

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: بەتەواوی! باپتیستەکان.

- (بروتوس) لەژێر لێوەوە وتی: حەزدەکەم بچمە دەرەوە. هەرچۆنێك بێت ئەفریقا هی من نییە.

## ئازادیو زیادەڕەوییەکانی

هەرسێ کەسەکە لەکافتریایەك لەبەردەم مێزێكو سێ کوپ قاوەو دەفرێك کێکدا ڕۆنیشتن. (بروتوس)، بەبەهانەی ئەوەی سروتی ئاینی کلێساکە جوڵاندبوی، وەك سروشتی خۆی دەستیکرد بەزۆر خۆری.

- (تیۆ) لە پورە (مارتا)ی پرسی: تۆ وتت ئەم ئەفریقییە ئەمریکاییانە (تەعمیدین Baptistes)، ئەوەم بۆ ڕونبکەرەوە.

- پورە (مارتا) وەڵامیدایەوە: دەبێت ئەوە بڵێم ئەو بابەتە دورودرێژە! وانییە بروتوس؟

- (بروتوس) بەدەمی پڕ لەشیرینییەوە وتی: هم!

- هەرچۆنێك بێت تۆ هیچ لەوبارەیەوە نازانیت، پاشان وتی: بزاوتی (ریفۆرمی ئاین)ی (مارتن لۆرتەر) بزاوتێکی پێشکەوتو خوازبوو، هێندە بەسەر بزاوتەکەیدا تێنەپەڕیبوو، کە پەتای پاکژکردنەوەی نەفس زۆر لەناوچەکانی ئەوروپای وەك دەڤەری فلاندەر، ئەڵمانیاو... گرتەوە. وتاربێژانی شۆڕشگێڕ لەهەموو شوێنێکەوە سەریانهەڵدا، کە هانی خەڵکیاندەدا بۆ یەکسانیو ڕاوەستان بەروی دەوڵەمەندەکانو ڕایاندەگەیاند، کە ڕنجو زەحمەتییەکانی خەڵك وەك ئازارو ڕەنجی مەسیحی لەخاچدراو یاسا چەسپیوەکان تێکدەشکێنێت. یەکێك لەو وتاربێژانە بەناوی (تۆماس مونتەزر)، کە لەلایەن خودی (لۆتەر)ەوە دانرابوو لەپێناوی ڕاپەڕاندنی خەڵکی نەدار ڕێگایەکی زیادەڕەوانەترو لەپێشتری بەکارهێنا، کە (مارتن لۆتەر) لەترسی تەشەنەکردنی یاخیبون لەشارەکان ڕایگەیاند، کە شازادەو دەسەڵاتدارانی ئەڵمانیا مافو پشکی خودایانەیان هەیە تایاخیبوانی بەردەستەکانی پێشویان بکوژنو ڕێگری لەئاژاوەچییەتی بکەن.

لەبەرئەوە (تۆماس مونتەزر) دژ بەمامۆستاکەی ڕاپەڕی و سیستمێکی بەناو دیموکراتی پاکژەکان پێمهێنا. ئازادی کردە مەرجی بنەڕەتی وتەی خواوەندانەو بەدەنگدان و پشتگیری (لۆتەر) دامەزرا؛ کە لەکەسە یەکەمەکان بوو، بە (ئاناباتیست) ناونرا، چونکە ئەم گروپە (غوسل - تعیمد)ی منداڵانیان پەسەند نەکردو ڕایاندەگەیاند دەبێت ئەو سروتە ئازادانەو لەتەمەنی عەقڵو ئاگاییدا بێت. بەڵام دامەزرێنەری (دیموکراسی پاکژەکان) لەپاشان بوو بەبەهرەیەك بۆ بزاوتێکی مەسیحی زۆر دەمارگیر. لەشاری زێدی (مۆنتز) نانەوایەكو بەرگدرویەك بانگەشەو ئامۆژگاری جێگیرکردنی جۆرێك دەسەڵاتی (ئنجیل)ی یەکسانی خوازیان دەکرد. کەسێك بەناوی (ژان ماتیج)، کە لەهۆڵەنداوە هاتبوو، داوای لەسێدارەدانی بۆ

کافرەکان کردو کۆمەڵێکی لەسەر بنچینەی هاوبەشی تەواوی تاکەکانو لەهەموو دارونەدارێکدا پێکەوەناو رێکخست. (هۆڵەند)ییەکی دیکە بەناوی (ژان دولیاد) خۆی بە (پاشای دادپەروەری) ناونا. مۆڵەتی سیستمی (پۆلیگامی)یان فرەژنی بەخشیو بانگەشەی خودایی کردو (ئانابابتیسم) لەبەرەو پێشچوندا بوو! کڵێسای مەسیحی بەتەحەمول نەکراو لەقەڵەمدا. ئەسقەفێك لەژێر ناوی (دژە مەسیح - Lantichriste) دژ بەشاری ئاسمانیی (مۆنستر) لەشکرکێشی کردو فریشتەی خەیاڵی سورکراو بەخوێنی موریدەکان روخا. پەیکەری سەرکردەی بزاوتی (ئاناباتیست) لەقەفەس نراو بەسەر تاوەرەکانی (لامبرتی کیرش) لەکڵێسای (گوتیك مونستەر) لەئەڵمانیا هەڵواسراو کرا بەدیمەنی بەرچاوی خەڵکی.

- (تیۆ) هاواریکرد: دواجار هێشتا نازانم (بابتێست)ـەکان کێن؟ ئەوەی تۆ باستکرد جگە لەبەلەسبونی کوشتوبڕ هیچی دیکە نەبوو.

- پورە (مارتا) وتی: بزاوتی (ریفۆرمی ئاین) هەڵگری زاینێکی پڕ ئازارو زەجربوو. زۆر گروپی موریدەکانی (لۆتەر) لەهزرو ئایدیای ئەو تێپەڕیبونو دەیانویست ئازادانە بەپێی رێساو یاسای خۆیان خۆیان دروستبکەن. یەکێك لەو دەستورانەش (غوسڵ)ی ئازادانەبوو. لەگەڵ نغرۆکردنی تەواو لەئاوی روباری (ئوردن) بەهەمان شێوەی (یەحیا)ی تەعمیدکار (عیسا)ی تعمیدکردبوو.

- (تیۆ) وتی: تێگەیشتم. کەواتە ئەمانە (بابتێست)ـەکان بون، واتا غوسڵ)کارەکان.

- نەخێر، لەوسەردەمەدا پێیاندەوتن (ئانابابتێست)، بەڵام ئابڵوقەدانی شێتئاساو وەحشەتناکی شاری هاربۆی (مۆنیستەر) هەر کاریگەری مابوو، کە بۆسڕینەوەی کاتێکی زۆری دەویست؛ بەجۆرێك پاش یەك سەدە لەو مێژووە بەدواوە (بابتیزم)ی راستەقینە لە(ئینگلستان) سەریهەڵدا. (بابتیزم)ی (ئەنگلۆ - ساکسۆن) لەسەر بنەماو بنچینەیەکی بەهێزو توندو تۆڵ رۆنرابوو.. (ئنجیل) مەرجەعی باڵا بوو، (غوسڵ) تەنها تایبەت بوو بەباوەڕداران و کڵێسا لەوباوەڕدارانە پێکدەهات، کە هەموان وەکیەك بونو پەیوەست نەبوو بەدەسەڵاتو حکومەتەوە. هەموو تاکێکی باوەڕدار تەنها بەپەیپڕەوکردنی لەسەفاو سادەیی دڵی خۆی بۆ باوەڕەکەی بەوەفاداری دەمایەوەو بۆ ئەم بەئەمەکییەشی بۆ باوەڕەکەی تێپەڕاندنی قۆناغی دیسپلینی ئاینیو رێساکانی باوەڕی بەپێویست نەدەبینی. هزرو بیرۆکەکانی (بابتیزم) پاشان بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کۆچیکرد، کە خاکی ئازادو پەناگەی ژمارەیەکی زۆری

پرۆتستانە خێرلەخۆنەدیوە ئازاردیدەکان بوو. لەئەمەریکا کڵێسای (بابتێست)ی لەسەر رێچکەی ئازادیو یەکسانی کاری دەکردو ناودارترین نوێنەرانی ئەو کڵێسایە (مارتن لۆتەر کینگ)ـە.

- (تیۆ) هاواریکرد: ئۆو! هەمان ئەو پیاوەی وەك (گاندی) دژی توندوتیژی بووەو کوژرا؟

- هەمان ئەو کەسەیە ... بەڵێ. ئەو (مارتن لۆتەر کینگ)ـە، داکۆکی لەمافی شارستانی ئەفریقی – ئەمریکییەکان دەکردو خەباتگێڕو ئاشتیخوازێکی ورەبەرز بوو. (مارتن لۆتەر کینگ) قەشەیەکی (بابتێست)ی بەئەمەك بوو بۆ سەرچاوەو چاوگی رەسەنی کڵێساکەی.

- (تیۆ) وتی: ئێستا تێدەگەم بۆچی ئەفریقی – ئەمریکییەکان بون بە (بابتێست)، ئەوەش بەتەواوی مافی خۆیان بوو.

- بەلام بۆ زانینی وردی مێژوی کڵێسای (بابتێست) دەبێت چەرخەلەیەکی تەواو بەئینگلستاندا لێبدرێت.

لەسەدەی شانزەدا لەترۆپکی ئاڵوگۆڕی ئەوروپادا (ریفۆرمی ئاینی) چارەنوسێکی سەیری هەبوو. پاشای ئینگلستان عاشق بوو، چونکە (پاپا) نەیدەویست مۆڵەتی تەلاقدانی پێ ببەخشێ (هێنری هەشتەم) فەرمانی بەپەرلەماندا بەفەرمی وەك سەرۆکی بالای کڵێسای (ئەنگلیکان – English- anglcan). بەمجۆرەش ئەو مۆڵەتەی (پاپا) بۆ تەلاقەکە رێگری لێکردو خۆی بەخۆی بەخشی و تەواو!.

سەرەتا ئاینی (ئەنگلکن – ئەنگلیکتیزم کاتۆلیسیزم) بەبێ (پاپا) بوو. لەپاشاندا، واتا دوای چەند ساڵێك، شاژنی ئینگلیز (ئەلیزابیتی یەکەم) پەرەی بەو ئاینەداو بەرەو (پرۆتستاتیزم)ێکی توندڕەو هەنگاوی هەڵناو لەپای ئەوەش جەنگێکی راستەقینە لەنێوان (پاپتیزم) (لایەنگرانی پاپا)ی ئینگلیزو ئەو کەسانەی بە(پۆریتنەکان - پاکژخوازان) دەنایران هەڵگیرسا. (پۆریتنەکان)ی وەك (تۆماس مونتەزر)، کە شەیدای پاکژیو خاوێنی ئاین بون، جگە لە (ئنجیل) هیچ چاوگێکی دیکەیان پەسەند نەکرد. لەکاتێکدا (پاپیستەکان) وەك لەناوەکەیانەوە دەردەکەوێت پەیڕەویان لە (پاپا) دەکرد. ئەوکاتە (چارلزی یەکەم)ی پاشای کاتۆلیك، کە ببوە جێنشینی پاشایانی (ئەنگلیکن) بواری رەخساند بۆ ئەشکەنجەو ئازاردانی (پۆریتنەکان)، بەلام دوچاری نەهامەتی بوو. یاخیبون سەریهەڵدا سوپا پێکهێنراو کەسێك بەناوی (ئۆلیڤەر کرامۆیل)ی سەرۆکی پارتی (پۆریتن) سەرکەوتنی بەدەستهێناو فەرمانیدا سەری (چارلزی یەکەم) لەگۆڕەپانی شاردا لەجەستەی جیابکرێتەوە.

- (تیۆ) وتی: پۆریتن زیاتر بەواتای بونەوەرێکی گۆشەخوازو بێجوڵە دێت، وانییە؟

- پورە (مارتا) وتی: (پۆریتن)ی رەسەن وێڵی دوای وەفاداریو پاکێتییەو سڵ لەوەسوەسەکانی (ئبلیس) دەکاتەوە. لەسەردەمی (کرامۆل)دا بۆ بەگژداچونەوەی گەندەڵیو هەوەسبازی ژنو پیاو پۆشاکی یەخەدرێژیان دەپۆشیو پشتیان لەهەموو چێژێکی ژیان کردبوو، کەیفو بەزمو رەزمو مەحکومو مۆزیك گومان لێکراوبوو.

- (تیۆ) هاواریکرد: هەروەك کەماڵخوازەکان، واتە (ئەنتگریستەکان).

- باشە، ئەوەش رویەکی دیکەی دراوەکە بوو: زۆرجار پرۆتستانەکان لەتاو شەیتان لەهەراسو بیمدا دەژیان. لەدیدی ئەوانەوە جگە لە(ئنجیل) هیچ رێگاچارەیەکی رزگاربون نەبوو. وەی بەحاڵی ئەو کەسەی لەمێگەل جیادەبێتەوەو دڵی بەوەسوەسەی (خراپە) دەبەستێت!. بەخشینی خودایی لەپرۆتستانیزمدا نەبوو: مرۆڤ یان (رزگار)ببوو یان (مەحکوم)!. لەنێو ئەو دوو رێگایەدا رێگایەکی دیکە نەبوو. لەسەدەی حەڤدە کۆمەڵەی پرۆتستانەکان لەناو بیمو هەراسی هەناسە پیسەکانی (ئبلیس)دا لەشاری بچوکی (سالم - Salem) لەئەمریکا نۆزەدە ژنی جادوگەری هەڵبژارد، کە بەبڕوای ئەوان کەموکوڕی هەموو روداوەکانیان لەئەستۆدابوو، ئینجا جوانی، زمان، نیگاو بەکورتی هەموو شتێکی ئەو ژنانە گومانلێکراوبوو. بەواتایەکی وردتر نۆزدە ژنی بێگوناهیان بەداراکرد... کاریگەرو روداوەکانی بەدوای ئەو شێتییەدا هات هەرگیز پاك نەبوەوەو نەسڕایەوە. ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کەوتە ژێر کاریگەری (پرۆتستانیزم)ی وشكو توندوتیژی یەکەمین گروپە کۆچبەرەکانو بەردەوام دەکەوتە بەر هێرشو دەستدرێژی شەپۆلەکانی (پۆریتانیزم)و بەدواداچونو ئازاردانی جادوگەران، کە ئەم هێرشانە لەهەموو رویەکەوە کەموزۆر دەبوە هۆی دواکەوتویی. ئازادی ئەمریکا لەراستیدا چەکێك بوو دژ بەئازادی بەکاردەهێنرا. پاکژخوازیو دڵسۆزی زیانێکی زۆر بەباردەهێنا ، بەو واتایەی، کە (ریفۆرمی ئاینی)، بزرو سڕابۆوە.

- (تیۆ) وتی: هەروەك وتم، خەڵکی ئایدیۆبۆژیستی!

- (بروتوس) راستیکردەوە: رەشبێستەکان! (ئەنگلیکن)ـەکانی ئینگلستان لەرێگای ئەقڵو ئاوەزەوە چاکەو خراپەیان لەیەك جیادەکردەوە، بەڵام لەدیدی (پۆریتنەکان)ـەوە (یەکەمین گوناهە) نەوەی (ئادەم)ی بەگشتی گەندەڵ کردبوو. (ئەنگلیکن)ـەکان دەیانخواست زەمین وەك ئەوەی هەیە چاك بکەن، بەڵام (پۆریتنەکان) لەسەر ئەو بڕوایەبون لەرێگای گۆڕینی کامڵو تەواوی کۆمەڵگاوە (ئۆرشەلیم)ێکی ئاسمانی دروست بکەن. (ئەنگلیکن)ـەکان ژیانێکی ئارامتریان هەبوو، بەڵام (پۆریتنەکان) وزەو هەوڵێکی زیاتریان پیشاندەدا... لەناو بۆشایی ئەو جیاوازی

جوداییەدابوو کلێسای (پاپتێست) لەئنگلستان جێگیربوو. لەو کلێسایەدا هزرە ئازادەکانی لەتاو بەندوباو هەڵاتبون، کە جۆش‌و خرۆشیان لەبەرامبەر هەوڵی ئاقلانەو ئیمانی راستەوخۆی دژ بەخواناسی هەڵبژاردبوو، لەو دوو رووداوەی رابردودا بونە هاوبەش. ئەمانە جیهان چۆنبوو هەربەوجۆرەش چاکیان دەکرد، بەڵام (ئۆرشەلیم) ـەکەی دڵی خۆیان لەهەمان باردا دادەمەزراند.

- (تیۆ) وتی: تۆ حەزت بە(پاپتێست)ـەکانە، ها؟

- پورە (مارتا) وتی: راستت دەوێت، بەڵێ! کاتێك (مارتن لۆتەر کنگ)یان کوشت، من گریام.

- (تیۆ) وتی: ئەمجارە بەجیهانی پرۆتستانەکاندا سوڕاینەوە.

- (بروتوس) هاواریکرد: نەخێر! هێشتا (کالڤن) ماوە!

- پورە (مارتا)، کە زمانی بەلێویدا دەخشاند، وتی: سەیرە، ئێوە هەموو شیرینییەکەتان خوارد؟

## خاچەکان‌و پنتەکان

رۆژی یەکشەممە بەپیاسەی نێو بازاڕو کتێبخانەکان بەسەرچوو. هێندە بەپێ رێیانکرد تاسەرئەنجام بە (ئیتالیای بچوك) گەیشتن، کە پورە (مارتا) لەوێدا شارەزای رێستۆرانێك بوو جۆرەها خواردنی (پاستا)ی ئیتالی هەبوو، بەڵام کە گەیشتین بۆ چێشتخانەیەکی چینی گۆڕابوو. شاری چینییەکان (چیناتاون) شاری ئیتالییەکانی قوتدابوو. لەجیاتی (پاستا)ی ئیتالی گۆشتی شیرینی بەراز، رۆبیانی زەنجەفیلاوی، پارچە گۆشتی مانگاو ناو سکی ئاژەڵان هەبوو، کە (تیۆ) ئارەزووی لێنەدەکردن.

دوو شەممەی رۆژی دواتر رۆژی نەخۆشخانەبوو. پورە (مارتا) وریای ئەوەبوو تا (تیۆ) ئاگاداری گفتوگۆکەی لەگەڵ (ژروم)ی باوکی (تیۆ) نەبێت. نەخێر، پێویست نەبوو (تیۆ) بزانێت تەواو چاکبۆتەوە یان لەوە بەئاگابێت پزیشکەکان تەقەلای زۆریانداوە بۆ دۆزینەوەی ئەو گۆڕانە سەیرە. لەوانەشە نەخۆشییە سەیرەکەیان دۆزیبێتەوە. پورە (مارتا) دەیویست گەشتەکە وەك خۆی پێشبینی کردبوو کۆتایی بێت. ئەمپولێکی زیاتر یان کەمتر کاریگەری لەبنچینەی رووداوەکە نەکات، بەڵام (بروتوس) دەیویست جارێکی دیکەش خوێنی پورە (مارتا) ئەزمایش بکرێت‌و (تیۆ)ش بەوە خۆشحاڵ بوو.

(بروتوس) هێشتا نەیتوانیبوو (کالڤن) بخاتە بەرباسکردن. هەرکاتێك دەیویست پورە (مارتا) بخاتە بەرباسی ئەو کەسایەتییە گرنگە، پورە (مارتا) کەلێنێکی بۆ خۆدزینەوە پەیدادەکرد. جارێك بەبیانوی بینینی کلاوێکی (تبتی) لەوبەر لەسەر شۆستەکە، جارێك خۆی بەماندوو دادەنا. لەکافتریادا هێندە بەسبوو (بروتوس) ناوی (کالڤن) بێنێت تا پورە (مارتا) خۆی لەدەستشۆرەکە توند بکات. وردە وردە ئەم بابەتە دەبوە جێگای تورەیی پرۆفیسۆر.

- نەخێر، هیچ شتێکی یەکلایەنەی دژ بە(کالڤن)م نییە، هێندە هەیە دەمەوێت ماندوێتیم دەرچێت‌و هەناسەیەك بدەم.

ئەم قسەیە لۆژیکانە دەردەکەوت. جگە لەوەی پورە (مارتا) هەر لەگەڵ چونە ناو (سێوی درشت)ەوە تورەیی‌و مۆنییەکەی نەماو پاش بینینی شانۆگەرییەکی مۆزیکی لە(برادوی) شاری (نیۆرك) ئاشت بۆوە. (بروتوس) تامی لەساتە خۆش‌و شادییەکانی بینی تا لەمەیدانی شەترەنجی هاوسەریدا خۆشەویستی پێشبخات، چونکە پورە (مارتا) لەساتە جۆشوخرۆشەکاندا میهرەبان دەبوو؛ لەو ساتەنەدا بەدەگمەن وەڵامی نەرێی دیدەکانی هاوسەرگیری دەدایەوە. بەلام رۆژی دواتر بروایەکی دیکەی هەبوو. هاوسەرگیری؟ محاڵە. بزانم لەکوێ دەژین؟ لە (باهیا)، لۆس ئەنجلس؟، هەروەها پاش ساڵانێك لەژیانی سەربەخۆیی چۆن دەتوانێت هەروا بەئاسانی جیهانێکی نوێ پەسەندبکات؟. (بروتوس)ـە بێنەواکەم، خەونێکی بێهودەیە... هەروەها دەبێت هەمووشت لەسەرەتاوە دەستپێبکرێتەوە.

(تیۆ) لەرۆژژمێرەکەیدا بەرامبەر بەنەرێکانی پورە (مارتا) هێمای خاچ‌و بەرامبەر بەئەرێکانی هێمای پنتی دادەنا. دووشەممە دوو خاچ، بەبێ پنت؛ وەك رۆژێکی خراپ. سێشەممە دووپنت‌و یەك خاچ؛ رۆژێکی پێشکەوتوو. چوارشەممە دوو پنت دوو خاچ؛ ئەنجام سفر بەدەستەوە. بەرێز بۆ مۆزەخانەکان دەچون، ئۆرکسترای مۆزیکی ئەنجامدەدراو رۆژەکان بەبێ دەرئەنجامی خواستراو تێدەپەرین. هێشتا باسی (کالڤن) لەنیوەرێدا بەجێمابوو.

رۆژی پێنج شەممە پاش بەدەستهێنانی سێ پنتی پۆزەتیف‌و یەك خاچی نێگەتیف، (بروتوس) بەدڵێکی پر لەهیواوە پێشنیاری نانخواردنێکی کرد لەرێستورانتی (بەلژیك)ی.

- پورە (مارتا) بەسەرسورمانەوە وتی: رێستورانتی (بەلژیك)ی! (بروتوس) تۆش بیرۆکەی سەیرو سەمەرەت هەیە.

- (بروتوس) وەلامیدایەوە: حەزم لەبیرەی بەلژیکی‌و خودی بەلژیکایە.

- ڕێستورانتەکە بیرەی شیلك، گێلاس و هەرمێی بە موشتەرییەکانی دەبەخشی. پورە (مارتا) هەموویانی ئەزمون کرد، کاری تێکردو جولاندی و شادبوو.

- (بروتوس) بەشیاوی بابەتی (کالڤن)ی هێنایە پێشەوەو گوتی: لەبەلژیکا تەنها بیرەی میوەکان نییە، بەڵکو دەتوانیت لەگەڵ (تیۆ)دا باسی (بێگوێن)ەکان بکەیت.

- پورە (مارتا) بەخۆشحاڵییەوە کەوتە باسکردنی: ئۆو...(بیگین)ەگان. ماوەیەك پێش سەردەمی (ریفۆرمی ئاینی) (لۆتەر)، (بگین)ەکانو (بگار)ەکان جۆرێك کۆمەڵگای (لاییك)یان دروستکرد، کەخۆیان بۆ (رامان و خەڵوەتی)ی تاکایەتیو چاکەکاری تەرخان کردبوو. دروشمی (بنگین)ەکان (کاکنوس)بوو، کە بەسمبولی نوێبونەوەی ژیانو هەستانەوەی مەسیح دادەنرا. ئەو ژنانە بەشێوەی گروپ دەژیانو پێش دەرکەوتنی راستەقینەی (پرۆتستانیزم) پرۆتستانی راستەقینەبون. هەڵبەتە چەند کەسیان بەتاوانی جادوگەری سوتا، بەڵام ڕەوتو ئاینی (بگین) لە (بەلژیکا) مایەوەو وەك تەریقەتێکی سادەو عارفانە لەناو ماڵدا گۆشەگیربوو، کە لەدۆڵی (ڕەن)ەوە سەریهەڵدابوو، چونکە ئەڵمانەکان وەك شوێنێکی پڕ لەخەڵکی خاوەن بەهرە لەدەڤەری (رن)یان دەنواڕی.

- (بروتوس) زیادیکرد: لەهەموو ناوچەکانی گەلە ژێرمەنکاندا ریفۆرمخوازی ئاینی گەورە سەریانهەڵدەدا. خودی (کالڤن)یش لە (ژنۆ) لەدایکببوو.

- پورە (مارتا) بەهێواشی وتی: دووبارەت کردەوە؟ من دەڵێم (کالڤن) لە (ژانۆ) لەدایك نەبوە، بەڵکو لەفەرەنسا لەدایکبوە. یەکەم (کالڤن) خەڵکی دەڤەری (بیکاردی) فەرەنسا بوو، دووەم لە (ژانۆ)ببوە پەناهەندە. دەبێت ئەوەت لەیاد نەچێت. (بروتوس) هەڵبەتە دەبێت باس لە(کالڤن) بکرێت، بەڵام بەڕاستی زۆرم خواردۆتەوە...

- (تیۆ) وتی: تۆ دەزانیت لەکوێ لەدایکبوەو ئێستا دەڵێیت ناتواتنیت بەردەوام بیت، چونکە زۆرت نۆشیوەو باش ئاگات لەخۆت نییە؟ کەواتە دەستی ئێمەت بڕی!.

- پورە (مارتا)، کەدوبارە گێلاسەکەی هەڵدەقوڕاند دانی بەوەدا نا: ئێستا پێتان دەڵێم... دوبارە ئاینی (کالڤن)... باشە، من... هیچی لەبارەوە نازانم...

- (بروتوس)، کە دەستی لەناو دەستی نابوو، گوتی: هاوڕێ ئازیزەکەم... زۆرباشە، ئەگەر مۆڵەت بدەیت خۆم باسی دەکەم؟

- رازیم، بروتوس!

- دەبینیت ناتوانیت بەبێ من بژیت؟

- پورە (مارتا)، کە بەهۆی زۆ خرۆشاوییەکەوە، ئەشك بەچاویا دەهاتە خوار وتی: بەڵێ. چوار پنت لەرۆژێکدا! بۆ (تیۆ) مایەی باوەڕکردن نەبوو.

## دەسەڵاتی رۆح

- (بروتوس) دەستیکرد بەرونکردنەوە: کاتێك (لۆتەر) بەرەو کۆتایی هەنگاوی دەنا (ژان کالڤن)ی لاو بەنوسنی نامەیەك بۆ (فرانسوای یەکەم)ی پاشای فەرەنسا، کە دەستی کردبوو بەئازادکردنی یەکەمین پرۆتستانەکان، چالاکانە لەبزاوتی (ریفۆرمی ئاینی)دا بەشداربوو. ئەوەی (کالڤن)ی ناچار بەیاخیبون دەکرد زوڵمو زۆرداری ستەمگەراکان بوو. ئازارو ئەشکەنجەدانی پرۆتستانەکان ئەو کورە لاوەی ناچار بەلایەنگریکردن لەئایدیالەکەیان کرد، بەلام بەپێچەوانەی (لۆتەر)ەوە (کالڤن) راهیبو قەشە نەبوو، بەڵکو تاکێکی ناوداری زانکۆو بەرۆشنبیرو (هزرساز) دادەنرا. خۆشبەختانە کەسێکی لەوجۆرە چووە پاڵ ئامانجەکانی (لۆتەر) تاببێتە پاڵپشتو بەهێزکردنی جۆشوخرۆشە تاڕادەیەك ئاڵۆزەکانی .

- پورە (مارتا) هاواریکرد: بۆ دەڵێیت ئاڵۆز، بڵێ پڕجۆشوخرۆش‌و پەرۆشی.

- (بروتوس) پێداگریکرد: ئاڵۆز، (کالڤن) بەپێچەوانەی (لۆتەر)ەوە پرنسیبو ئایدیۆلۆژیایەکی هەماهەنگ‌و گونجاوی راگەیاند. باوەڕەکەی لەسەر بنچینەی دەسەڵاتی پڕ تواناو کۆداری خواوەند بەندبوو؛ خوایەکی دەسەڵاتی بەسەر گشت شتێکدا دەشکا، بڕیار لەهەموو شت دەداتو هەستەکان، خرۆشانەکان‌و بەتایبەتی فەرمانی ژیان‌و بەخشینی باوەڕداران هەموی لەچنگی ئەودایە. لەبەرئەوە باوەڕداران راستەوخۆ پاشکۆو گرێدراوی خواوەندن‌و هەربڕیارو هەڵبژاردنێك لەلای ئیرادەی ئەوە: هەرئەوە یەکێك دەکاتە جاویدانی ژیانی هەتاهەتایی‌و هەندێك دەکاتە مەحکومی هەتاهەتایی.

- (تیۆ) وتی: پەلەمەکە بابزانم، کەواتە من هەر لەسەرەتاوە مەحکومم، ناتوانم هیچ کارێك بۆ رزگاربونم ئەنجام بدەم؟

- وەلامیدایەوە: نەخێر، چونکە تۆ نازانیت نزیکە خۆت مەحکوم بکەیت. هێندە بەسە دەربارەی ژیانی جاوییدانی پرسیار لەخۆت بکەیت تارزگار ببیت!. تۆ بەرپرسیاری خۆت نیت، ئەوە خواوەندە تۆ روناك دەکاتەوە، خواوەندە لەسەرەتاوە تۆی هەڵبژاردوەو دیاریکردویت، چارەنوس لەچارەت نوسراوە، خواوەند پێشبینی ئەوەی کردوە.

- (تیۆ) بەئاڵۆزییەوە وتی: ئەمە دادپەروەرانە نییە!

- (کالْڤن)یەکان لەوباوەڕەدابون خواوەند نە(دادپەروەرە)و نە(زۆردار). لەڕاستیدا کێ دەتوانێت حوکم لەسەر تێزو نەخشەکانی بدات؟ هیچ کەسێك!. ئەمەبوو رەسەنایەتی ئەو بیرۆکەیە. ئەوە خوایە لەسەر موبارەکیو بەخشندەیی بڕیاردەدات. هەڵبژێراوەکانی بۆ ئەو پیرۆزکردنە لەڕێگای هەستی توانستی هاوبەندییەوە دەسەلاتو هێز بەدەست دێنن، بەتایبەتی کاتێك روبەڕوی ئازارو ئەشکەنجە دەبنەوە، چونکە ئەو کەسانەی بونەتە هەڵبژێراوی بەهرەی ئەو پیرۆزبوونە لەبەرهەمان هۆ لەژێر چاودێریو پارێزگاری خواوەندا دەبنو لەجەنگەکەیاندا سەرکەوتوو دەبن. (کالْڤنیست – موریدو لایەنگرانی کالْڤن) لەسەردەمێکدا خەباتگێڕی تێکنەشکاوبون، چونکە باوەڕیان بەقوڵایی رۆحیاندا رۆچوبوو... بنەمای هەڵبژاردن لەلایەن خواوەندەوە، کە (کالْڤن) بە (چارەنوسی پێشتر نوسراو) ناوی دەبرد، لەچەرخی نوێدا دەیتوانی بەجۆرێکی سەیر بکەوێتەوە، بەلام لەسەدەی شانزەدا جەنگی هەوادارانی (پاپا - پاپتیستەکان)و پرۆتستانەکان پێویستی بەپرنسیپی ئایدیۆلۆژی بوو تا دڵنیاییو متمانە بە پەیڕەوانی ئاینی نوێ ببەخشێت. (کالْڤن) دروست تێگەیشتبوو، کاتێك مرۆڤ خۆی (بەهەڵبژێراوی خواوەند) دابنێت ناتوانرێت تێکبشکێنرێت.

- پورە (مارتا) بەشداریکرد: بەلام پێشئەوە گەلێکی هەڵبژاردە بەناوی (ئیسرائیل) هەبون!

- (بروتوس) وتی: (کالْڤن) هێندە لەو پرسە بێئاگانەبوو؛ سودیش لەنەهامەتییەکانی گەلی جولەکە وەرگرت. (کالْڤن)و پەیڕەوانی لەوبڕوایەدابون ئازاری دورودرێژی پرۆتستانەکان هاوسەنگە لەگەڵ بەکۆیلەبونی جولەکە لەمیسرو تێکشکاندنو سەرکەوتنەکانیان بەعیبرییەکان دەچوێتو رۆژی (دەرچون لەمیسر)یش رۆژێك دەبێت، کە هەموو کڵێسای جیهان نوێژەن کرایەوە. لەبەرئەوەبوو (ژان کالْڤن) بەبێ کات بەفیڕۆدان بڕیاریدا (کۆمارێکی خودایی) دور لەحکومەت، ولاتو جەنگەکان بونیات بنێت. جولەکەکان لەوکارەیاندا سەرکەوتوو نەببونو پەرستگاکەیان وێرانکرابوو. کڵێسای کاسۆلیکیش لەلای خۆیەوە بەهەڵەو گوناهی گەورە ئالودەبوو. کەواتە سەردەمی جولاندن گەیشتبوو، (کالْڤن) دەیویست دواجار شارێکی، کە بۆ شەوکەتو شکۆمەندی خواوەند تایبەت بوو، واتە (ئۆرشەلیم)ێکی دوبارە ناکام، لەسەردەمی خۆیدا دروست بکات.

(کالڤن) لەو ڕێچکەیەی (لۆتەر) داپڕشتبوو (ئایدەی - Sacrement)[1] گۆڕی، کە لەدیدی ئەوەوە زیاد لەرادە لایەنی بەرچاوی هەبوو. دەیگوت (سکریمانت) تەنها لەڕێگای خود ئاگاییەوە بەسەر نەفسدا دەتوانێت وەك كار بونی هەبێت. (نان) جەستەی مەسیح نییە، بەڵکو سمبول و ڕەواڵەتی (دابەشکردنە). (هەوێن) هێمای فیزیکی و جەستەی هەستانەوە نییە، بەڵکو ئایدیاڵ و ئەندێشەی کەوتن و هەستانەوەی هەوێنە؛ واتە هەستانی جیهان. خواردنی نان بەو واتایە نییە کەباوەڕدار جەستەی ڕاستەقینەی مەسیح دەجوێت، ئەوەی ئەو دەیجوێت جگە لەنان شتێکی دیکە نییە، بەڵام ڕەواڵەت و سمبولێکە، کە بەردەوام خۆراکی (عیسا) بەیاد دێنێتەوەو کاوێژی دەکاتەوە.

- (تیۆ) وتی: ئەو بابەتە بەگەمژەیی تێناگەم! چونکە دەکرێت دادپەروەری لەسەر زەوی و نان دابەشبکرێت.

- بەڵێ، بەڵام بەهۆی دەقە پیرۆزەکانەوە!، چونکە لەدیدی (کالڤن)ـەوە ئەوە تاکە بەرهەمێکە، کە لەلایەن خواوە هاتوە. (ئنجیل) بەهیچ شێوەیەك سەرچاوەی ژیان و هاوبەندی کڵێسانییە، بەڵکو لە (ڕۆحی قدس)ـەوە دێت، کە بەرپرسی پەخشکردنی روناکی بوە بەسەر باوەڕداراندا. ئەگەر باوەڕدار یەکێك بوو لەهەڵبژێراوەکانی بەرادەیەکی باش خاوەنی روناکی دەرونی خۆیەتی، کە خۆبەخۆو ئازادانە ژیانی خۆی لەگەڵ دەستورو بڕیارەکانی دەقە پیرۆزەکان دەگونجێنێت و تەنها ئەو ڕۆحە ڕێنمایی دەکات؛ بەڵام دەبێت کەسەکە وابەستەی لایەنی چاکەو دروستی چارەنوسی نوسرابێت و لەپێشدا نەفرەت و حوکمێکی هەتاهەتایی بۆ نەنوسرابێت!.

- پورە (مارتا) ڕاڤەی کرد: نامەوێت تەڵقینت بدەم، بەڵام ئەم ئاینە ڕاستە، کە جێگای گەڕانەوەو خواستی بەخشین بۆ کەس ناهێڵێتەوە، هەمیشە موەکانی جەستەی ڕەپ کردوە!. نازانم بۆچی هەمیشە خۆم بەلایەنگرانی حوکمدراوەکان دەزانم...

(بروتوس) بێدەنگبوو، چونکە بەبڕوای ئەم خودی (مارتا)ش هەڵبژاردەیەك بوو، ئەوەش لەیەکەم بینینەوە دەرکەوت!. تەنانەت ئەو بێهۆش بون و پەلەکردنەی ئاماژەیەکی خواوەندانە بوو!، چونکە (ژان کالڤن)یش لێبوردەیی و ئارامگرتنی ڕادەسپارد...

---

[1] Sacrement : لەئاینی مەسیحدا سروتێکە (عیسا)ی مەسیح لەپێناوی دۆزینەوەیان پەرەپێدانی بەرەکەتی خودایی لە ڕۆحی باوەڕداراندا دیاریکردبوو. ژمارەشیان حەوت بابەتە، کە بریتین لە (تعمیدکردن، پشتگیری، ئۆرکایستی، بەبیرهێنانەوەی بەقوربانیکردنی مەسیح لەڕێگای نزای دەستەجەمعی، دابەشکردنی نان و شەراب و....) دواهەتون، هاوسەرگیری، سیستمی (ئاینی) و تۆبەکردن.

- پورە (مارتا) بەردەوام بوو: بەهۆی نکوڵیکردنی لەسێ لوتکەو خواوەندبونی مەسیح (میشیل سێرڤت)[٢]ی هاوڕێی خۆی وەك كافر سوتاند!

- کەس کامڵ نییە، بەڵام دەبێت بوترێت لەلای (کالڤن) هەرکەسێك بەهۆی نوسراوی پیرۆزەوە باوەڕی خۆی دەردەبڕی ئیدی بەچاوپۆشی لەجۆرو شێوەی ئەو دەربڕینە تاکێکی هەڵبژێراوی خواوەندبوو. دەیگوت وشەکان ئەژمار ناکرێن، تەنها کردار گرنگەو ئەوەشی لەهەموو شوێنێك نوسیبوو.

- پورە (مارتا) بەجۆرێك بەدگومانییەوە پرسی: (بروتوس)ی ئازیز.. چۆنە بەوجۆرە پرۆتستانیزم دەناسیت؟ لەکاتێکدا خۆتان کوڕی قەدیس و موریدێکی (کاندومبل)ەن؟.

- (بروتوس) بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دوو رونکردنەوەی راگەیاند: رونکردنەوەی یەکەم بەمێژووی بەرازیلەوە پەیوەستبوو، کەخۆی یەکێك لەپسپۆرانی بوارەکەبوو. لەخوارووی (بەرازیل) کلێسای پەیڕەوانی (پانتکوت) یان (پانتکۆتیستەکان) هەبوو، کە پەرەگرتنێکی گەورەو بێنمونەی پەیداکردو سێیەکی دانیشتوانی شاری گەورەی (ساولۆپاولۆ) ببونە پانتکۆتیست. بەتایبەتی خەڵکانی نەخوێندەوارو هەژارانی تخوبی شاری (ساولۆپاولۆ) بەکۆگەلی بەشداری خواپەرستیان دەکرد. چونکە پانکۆتیزم لەراستیدا پڕبەپڕیان دورابوو، وەك پرۆتستانەکان داوای گەڕانەوەی دەکرد بۆ چاخە سەرەتاییەکانی کریستیانیو کلێسا. (پانتکویست) لەجیاتی ئەوەی (غوسڵ کردن) بەپرنسیپو دروشمی خۆی دابنێت وەکو لەناوەکەیانەوە دەردەکەوێت پشتی بەروداوی (پانتکوت) بەستبوو. ئەو ساتە سەروسروشتیەی، کە تیایدا (رۆحی پیرۆز) لای (هاوەڵەکان) دەرکەوتبوو، کردبوە پرنسیپی بنچینەییو سروتی خواپەرستیان و نوێژەنکردنەوەی ئەو پەڕەجوو گەورەیەبوو.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: دەتەوێت بڵێی چی؟

- - دەمەوێت بڵێم (پانتکۆتستەکان) باوەڕیان بە سازدانی پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ خواوەند، پەڕەجوی رۆژانەو (قسەکردن بەزمانە جۆراوجۆرەکان) هەبوو؛ واتە کاتێك کۆمەڵێك لەباوەڕداران دەگەیشتنە پنتی پەیوەندی لەگەڵ خواوەند لەناکاو یەکێکیان لەژێر کاریگەری دەرونیدا بەزمانێکی نەناسراو دەکەوتە گفتوگۆ، بەڵام هەندێکجار زمانەکەی ئاسایی بوو، بەڵام خودی بێژەر ئەو زمانەی نەزانیوە. ئەم قسەکردنە بەپەڕەجوی (رۆحی پیرۆز) ناسراوە!. بەوجۆرە باوەڕ دەبوە هۆی گێڕانەوەی بارودۆخو هەلومەرجی (پانتکۆت)...

[٢]. M. servet: رۆحانی، فەیلەسوف، پزیشکی ئیسپانی. لەساڵی (١٥٥٣) بەهاندانی (کالڤن) بەکافرکراو بەئاگر سوتێنرا.

- (تیۆ) وتی: پورە (مارتا) لەو رووەوە گفتوگۆی لەگەڵ من کردووەو پێیدەڵێن (گلۆسۆلیلا) نەك (گلۆسۆلایی - Glossolalie). هەڵبەتە دایدەهێنن...

- بەڵام لەو کوڕو کچە پیرۆزانە زیاترنا، کە بەهۆی (ئۆریشاکان)ـەوە سەرقاڵی ئەسپسوارین!. بۆچی خەڵك نەتوانن بەزمانێك قسەبکەن کەلەلایان نەناسراوە؟. بۆچی یادەوەری و بیرەوەری مرۆڤ ناتوانێت سەدەکان بپشکنێت؟. لەوانەیە ئەم زمانانەش وەك زمانە ئەفریقییەکانی سەدە کۆنەکان بۆ ماوەیەکی زۆر لەبەرازیلدا هەبوو بێت و بەکارهێنرابێت. پرۆفیسۆر (مارنرۆ - پروتوس) بەردەوام بوو، کە ئەمە دووەمین هۆکاری پەیوەندی ئەوە بەمێژووی ئاینی پرۆتستان و ئاڵوگۆڕە سەیرەکانی ئەو ئاینەوە بوو. درێژەیپێدا، کە لە(بەرازیل)ی وڵاتی ئەودا (کاندومیلە) لەباکورو (پانتکوتیزم) لەباشور بواری دەرەخساند بۆ هەژارو نەخوێندەوارەکان تابەقسەکردن خواستەکانیان دەربڕن. (پانتکۆتیزم) وەك (کاندومیلە) چارەی نەخۆشەکانی دەکرد!، بۆ نمونە خودی ئەو، واتە (بروتوس)، بەبێ گرفت و پرسێك (ئنجیل)و (کاندۆمیلە)و ئەفریقاو دەقی پیرۆزی پێکەوە ئاوێتەکردوە، چونکە ئەسپسواری قەدیسەکان لەپەیکەری ڕێهەڵگراندا خۆی لەخۆیدا دەربڕینی جۆرێك هەستبوو، وەك هەموو دەربڕینەکانی دیکە، مەگەر وانییە؟

- (مارتا) بەزمان شیرینییەوە وتی: ئازیزەکەم... دەتوانی ببیتە وتاربێژێکی باش (بەڕێز قەشە کارنرۆ داسیلڤا، کۆلکە فەرەنسی!).

- (تیۆ) وتی: دەتوانیت بێدەنگ بیت؟! کۆلکە فەرەنسی تێدەگات لەوەی وتاربێژ دەیڵێت!

- (بروتوس)، کە ئێستا سیفەتی وتاربێژیشی درابوە پاڵ بەردەوامبوو گوتی: دەسەڵات و کاریگەری بەهرە لەرێگای بەرەکەتی خوداییەوە هێندە روو لەگەشەو پەرەسەندن بوو، کە لەساڵەکانی دەیەی شەستدا، پاش گۆڕانی ئازادانەی شەقڵی کڵێسای کاسۆلیکی لەلایەن (پاپا ژان)ی بیست و سێیەم ڕێچکەیەکی دەسەڵاتداری لەناو ناواخنی کڵێسادا بەرپاکرد، کە وەك کڵێسای (پانتکوتیست) (گفتوگۆ بەزمانە جۆراوجۆرەکان)ی لەخۆگرتبوو. ئەم بزاوتەش لەپای سەرچاوەی زیندوبونەوەی کریستیانی بوو، چونکە ململانێی (ژان کالڤن)و ئاینی (کالڤینیزم) ڕێگایەکی فراوانتری بۆ دادپەروەری و یەکسانی کردبۆوە. (لۆتەر) گاڵتەی بەو ئاڵوگۆڕە دەهات... هانی شازادەکانی ئەڵمانیای دەدا بۆ هاڕینی یاخیبون و بزاوتی جوتیاران، چونکە (لۆتەر) یەك بیرۆکەی لەمێشکدابوو ئەویش تێکشکاندنی (پاپا)و دەسەڵاتەکەی بوو.

(بروتوس) بەپشتبەستن بەوشە بەردەوامبوو: (کالڤن) لەکاروانی روخساری دەسەلاتی رۆح و ئازادیدا بەرەوپێشدەچوو...

- پورە (مارتا) بە ئحم کردن و رەوشتێکی ناجۆرەوە وتی: بەپێی ئەو کتێبانەی من خوێندومەتەوە (کالڤن)فاکتەری بەرایی و سەرچاوەی سەرمایەداری کاسبکاربوو! چ سەرکەوتنێکی گەورەیە!... هاڕینی هەژاران و نەداران! تۆ ئەمە بەکارێکی چاك دادەنێیت؟

- (تیۆ) وتی: بۆ ساتێك بوەستە. (بروتوس) رێکوراست پێچەوانەی ئەمە دەڵێت: سەرمایەداری لەو وتەزایەدا چیدەکات؟

- (بروتوس) پەسەندی کرد، کە پورە (مارتا) راستەو بەهەڵەدانەچووە؛ چونکە پرۆتستانەکان لەپێناوی پێکهێنانی دەمودەستانەی[٢](شاری سەرزەوی) خۆیاندا زۆر تێکۆشابون و سامانێکی خۆیان گردکردبۆوە. بەکورتی گرفتی ئابوری مۆدێرن، کە بە(سەرمایەداری - کاپیتالیزم) ناودەبرا، بەبێ یارمەتی و کۆمەکی دەوڵەت و دوور لەدەسەلاتی سیاسی، سەرمایەیان پێکهێنابوو. (شاری کافینست) پێویستی بەو خەباتە بازرگانییەبوو تا بتوانێت دادپەروەری کۆمەلایەتی لەکۆمەلگەی خۆیدا پیادە بکات. بەڵێ، من پەسەندی دەکەم، کە سەرمایەداری تا رادەیەك بەهۆی بەهرەو کاریگەری (پرۆتستانەکان)ـەوە کەوتە سەر رێگای خۆی! کارو هەوڵدان، ئەرك و خواستی ئەوانەبوو داوای شکۆمەندی و دەسەلاتی خواوەندیان دەکردو سەرکەوتن لەبواری کاروبازرگانیدا بەبەلگەی ئامادەیی خودی خواوەند دادەنرا. لۆژیکانەیەو هێندەش لۆژیکانەیە، کە لەئیسپانیای سەدەی بیستەم ریفۆرمخوازێکی کاسۆلیکی بەناوی (خوسێ ماریا ئیسکەرڤیا دوبالاگر) لەگەڵ ئەوەی خاوەنی هیچ پرنسیپ و سەرچاوەیەکی پرۆتستانی نەبوو لەویلایەتی (نافار) بەمەبەستی پیرۆزکردنی بەباوەڕدارانی کاسۆلیکی رێکخراوێکی توندوتۆڵی لەرێگای کاروکۆششەوە پێکهێنا، کە بە(ئاپۆس دی)[١] ناسرا، واتە (کاری خواوەند).

- (تیۆ) وتی: وەك (موریدەکانی) سنیگاڵ.

- پورە (مارتا) لەژێر لێوەوە وتی: رۆحانییە نوێژەنخوازەکان لەنێوان کارو خواپەرستیدا زنجیرەیەك پەیوەندیان دروستکرد، بەلام هەمیشە گەشەکردنی کۆمەلایەتی لێنەکەوتۆتەوە!

---

[١] Opus dcl. : ئەم رێکخراوە دەسەلاتدارە دارایی و سیاسییە، کە لەلایەن (پاپا)شەوە بەفەرمی ناسێنرا لەبنەما سەرەکییەکانی کۆمەلگای ئیسپانیایەو لەجەنگی ناوخۆی ئەو ولاتەدا رۆڵی سەرەکی هەبووە لەسەرکەوتنی (فرانکۆ)دا.

- (بروتوس) بەشڵەژاوی وتی: ئەگەر سیستمی سەرمایەداری بوو بەسیستمێکی وەحشیگەری، وێرانکارو پیس گوناهی (کالڤینیستەکان) نەبوو! بەپێچەوانەوە (کالڤینیستەکان) هەوڵیاندەدا چاککاری تێدابکەن.

- پورە (مارتا) وتی: زۆرباشە، سەرکەوتوونەبون. من لایەنگری یەکسانی سامان نیم، خۆتان تێدەگەن.

- (تیۆ) هاواریکرد: تۆ کاپیتالیستی! هەموو رۆژێك چاودێری راگەیەنراوی بۆرسە دەکەیت...

- پورە (مارتا) بەتورەییەوە وتی: هەر ئەوەش بواری بۆ رەخساندوم خەڵك بۆ گەشت ببەم!

- (بروتوس) بەمیهرەبانییەوە وتی: ئازیزەکەم... (چارنوسی قەدەر) لەیادمەکە، منو (تیۆ) باوەڕمان بەوە هەیە، تۆ کەسێکی هەڵبژێراوی...

- پورە (مارتا) لەو گفتوگۆیە نارازیبوو، بۆ خۆلادان رووی لەخواردنەوە کرد.

## (نۆیمی)

- رۆژی دواتر پورە (مارتا) لەهاوڕێ نەخۆشەکەیەوە (نۆیمی) پەیوەندی پێوەکرا. تەندروستی (نۆیمی) باشترببوو. وتبوی (ئارتۆر) پشیلەیەکی دڵڕفێنو هۆگرە... ئارەزوو دەکات بە(تیۆ) ئاشنا ببێت.

(نۆیمی) لەبەردەم ئاپارتمانە کۆنەکەی خۆیدا چاوەنواڕیان بوو. لەهەموو ئەو هاوڕێیانەی پورە (مارتا)، کە (تیۆ) تائێستا بینیبوونی بەتەمەنتر بوو.... بەڵام پێستی زۆر تەنك، قژی لولو نیگایەکی رونی هەبوو، کە دەمودەست لەوێنەیەکی ئاشنادا هاتەبەرچاوی(تیۆ).

- پێش هەموو شت وتی: تەندروستی پشیلەکەت باشە، سوپاست دەکەم بەمنت سپارد... (ئارتۆر) زۆر یارمەتی پێکردم.

- (تیۆ) لەژێر لێوەوە وتی: باشتر، منیش رازیمو ئێستا لەکوێیە؟

- لەوێیە، لەسەرجێگاکەم خەوتوە. خێرا برۆ بۆ لای! دەرگای سێیەم بەدەستەراستدا.

پورە (مارتا) بەچەند ناو و نازناوێ (بروتوس)ی پێناسان، کە (نۆیمی) زیرەکانە پێکەنیو پرۆفیسۆر (کانرو داسیلڤا) بەوپەڕی رێزەوە دەستی راموسی. لەسەر مێزەکە (چا) چاوەڕوانی دەکێشاو (تیۆ)ش، کە ئارتۆری لەئامێزدابوو بۆ ژورەکە گەڕایەوە.

- (نۆیمی) وتی: تیۆ، باشە لەنیۆرك چیت بینی؟

- (تیـۆ) بەخرۆشـاوییەوە وتـی: هەمووشـت! رۆشـتن بـەپێڵاوی (ئەسـکیت - تایـە) لەسـەر شەقامەکان، خەڵکی سەیر

- (نـۆیمی) جـەختی کـردەوە: دەمودەسـت دەربـارەی گەشـتەکەت قـسەم بـۆ بکـەم. بەداخـەوە نەمتوانی لەم گەشتەدا هاوەڵیت بکەم!

- (تیۆ) پرسی: ئایا تۆ پاپتیستیت؟

- وەڵامیدایەوە: بەڵێ، حەز بەباوەڕهێنانە لەدڵەوە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەفریقی نیت.

- چ گرنگییەکی هەیە؟ ئێمە هەموو یەکسانین.

- پورە (مارتا) بەشداری گفتوگۆکەی کردو گوتی: (نـۆیمی) هەمیـشە شانبەشانی (ئـەفریقی - ئەمریکاییەکان) جەنگاوە. خۆی (مارتن لۆتەر کنگ)ی ناسیوە.

- (نۆیمی) بەهێوری وتی: چـەندین سـاڵ پـێش لـەدایکبونت. (تیـۆ).. باباسـی تـۆ بکـەین، ئایـا شارەزای واتای راستەقینەی کڵێساکەمان بویت؟

- (تیـۆ) بـەدەنگی بـەرزەوە وتـی: گـۆرانی دەڵـێن، سـەمادەکەن، هـەموو پێکـەوە .... ئەگـەر (ئبلیس) لەنێواندا نەبوایە زۆر سەرنج راکێش‌و بێکەموکوڕی بوو.

- هێنـــدەش (ئبلـــیس) گرنگـــی نییـــە. ئـــەوەی گرنگـــە جۆشوخرۆشـــی پەیوەندیگرتنـــە بەخواوەندەوە، کە هەموو کارو دەرەنجامێکی کۆمەڵایەتی پێوەبەندە. بۆبەرزکردنەوەی چیاکان باوەڕ پێویستە، چیاکانی ئەمڕۆش زەبەلاح‌و بەرزن. هەموو ئەو جەنگە ئاینییانە...

- (بروتـوس) وتـی: وەك جەنگـەکانی سـەدەی شـانزەی نێـوان کاسـۆلیك‌و پرۆتـستانەکان. لایەنگرانی ریفۆرمی ئاینی هێنـدە تونـدڕەو و زیادەڕۆیـان دەکـرد بەئەنـدازەی ئەوانـەی ئـازارو ئەشکەنجەیان دەدان.

- (نـۆیمی) وەڵامیدایـەوە: دەزانم. تـەنها بیربکـەرەوە، کـە چ ئـازارو ئەشـکەنجەیەکی ژنـانی کاسۆلیکیان دەدا!. لەرێگای مەحرەمانەترین پنتی جەستەیانەوە باروتیان تێڕۆدەکردن‌و ئینجا سـکیان دەتەقاندنـەوە. چ ئەشـکەنجەدانێکی هەراسـئامێزبووا، بـەڵام کاسـۆلیکەکانیش درێغیـان نەدەکرد. (پاپتیستەکان) ورگی یەکێك لەباوانەکانی منیـان هەڵدڕی‌و منداڵەکـەیان دەرهێنـابوو، سەریان بەدیواردا کێشابوو.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە پرسی: یەکێك لە نەنکەکانت؟ لەکوێ؟

- لەفەرەنسا لەدەڤەری (سیڤینیس)[1]. من سەربەخێزانێکی پرۆتستانیم کە لەسەردەمی ناسراو بە(بیابانەکان) لەچیاکاندا خۆیان حەشاردابوو تا درێژە بەئاینە نایاساییەکەیان بدەن.

- خولی سەردەمی (بیابان)؟ وەك جولەکەکانی میسر...

- راستە، بەهەمان شێوە. ئێمە بەو سەردەمەی ئاینو بەجێهێنانی سروتی ئاینیمان لێ قەدەغەکرابوو دەڵێین (سەردەمی بیابان). پاش ساڵی (١٦٨٥)، کە (لویسی شانزە) بڕیاریدا یاساکانی پەیوەست بەپارێزگاریکردنی پرۆتستانەکان هەڵوەشێتەوە گروپەکانی دەستیاندایە رەشەکوژی ئێمە. ئێمەش جەنگاین... پاشان ناچاربوین خۆمان حەشاربدەین. دوای یەك سەدەو لەساڵی (١٧٨٧) مافی خۆمان بەدەستهێنایەوە. بەڵام لەو نێوەندەدا یەکێك لەباوانەکانم بڕیاردەدات بۆ ئەمریکا کۆچ بکاتو بەوجۆرە من لێرە لەدایك بومو ئەمریکیم. ناوی ئەویش لەفەرەنسا وەك ناوی تۆ بوو (تیۆدۆر - خواپێداو).

- (تیۆ) پرسی: سەردانی (سڤینیس) دەکەیت؟

- لەگەڵ بەتەمنیشدا هەموو ساڵێك بۆ (میالە) دەچم. لەو مانگەدا پرۆتستانەکان کۆدەبنەوە تا لەژێر درەختەکانداو لەکەشێکی کراوەدا یادەوەرییەکانی (سەردەمی بیابان) بگەڕێنەوە. ئەوە یەکێك لەجوانترین کۆمەڵەی ئاینیەکانە. نازانم ئەمساڵ بەهۆی ئەم نەخۆشییەوە دەتوانم بچم یان نا.

- پورە (مارتا) دڵنیای کرد: بێگومان دەتوانیتو نەخۆشییەکەشت چارەسەر دەبێت.

- (نۆیمی) وتی: (تیۆ) بەراستی من دیدێکم هەیە. تۆ (زەبور)ی سەدو سیو نۆ دەزانیت؟ دیارە نایزانیت. (زەبورەکان) بانگەشەی شاعیرانەی (داود) پاشان، کە بەدەستی خۆی نوسراون. بۆ تۆو بۆ خۆمی دەخوێنمەوە، گوێڕادێرە.

**(ئەی خواوەند، بۆ کوێ بچم، دور لەهەناسەی تۆ؟ بۆ کوێ هەڵبێم، دور لەروخسارت؟ بۆ ئاسمانەکان هەڵدەکشێم، تۆ لەوێدایت. لەسپێدەدا باڵ لێکدەدەم. لەودیو دەریاکانەوە، دەنیشمەوە لەسەر زەوی، تەنانەت لەوێشدا دەستی تۆ رێنیشاندەرمە، دەستی راستی تۆ، کە پارێزگاری لەمن کردوە...)**

- (تیۆ) وتی: جوانە.

---

[1] Cevennes: ناوچەیەکە لەدەوروبەری (تولوس)و باشوری خۆرئاوای فەرەنسا، کە یەکێك لەچالاکترین سەنتەرەکانی پرۆتستانتیزم بووە.

- (نۆیمی) کە (تەورات)ـەکەی دادەخستەوە، وتی: دەزانیت دەستی خواوەند تۆی بۆ ئەوپەڕی دەریاکان بردو چارەسەری کردی، ئەگەر بیەوێت بۆ منیش هەمان کاردەکات.

- پورە (مارتا) وتی: گومانم لەوە نییە. (نۆیمی) ئازیز... لەوانەیە پێویست بێت...

- وتی: ئا.. بەڵێ... راستە، من ئەرکمەندم پەیامەکەت بدەمە دەست. (مارتا) دەیویست بیخاتە ژێر دەفەرەکەتەوە، بەڵام من حەزم بەو نهێنکارییانە نییە. بیگرە.

- (تیۆ) خوێندییەوە: (من شاری **کۆشکم**، شاری **شێر**، شاری **کیمیاگەران**). لەژێر لێوەوە وتی: ڤینیس؟ شێرێك لەسەر ئاڵاکەی هەیە...

- پورە (مارتا) وتی: بەڵام شاری کۆشك، کام کۆشك؟

- (تیۆ) بەگومانەوە وتی: ڤێرسای؟ نەخێر، ئەوە نییە، بەراستی نازانم بەڵام بەزویی تێدەگەم.

- (بروتوس) وتی: دەبێت بەهۆی کۆشکەکەوە مەتەڵەکە بدۆزیتەوە. ئەو کۆشکە شتێکی نائاساییە!

- (نۆیمی) وتی: شێرەکەش وەك شێرەکانی دیکە نییە. (مارتا) مەتەڵەکە زۆر قورسە. (تیۆ) من یارمەتیت دەدەم.. لەزمانی ئەڵمانیدا بەو شێرە دەڵێن (Lowe).

- (تیۆ) وتی: کەواتە کۆشکێکە لەشەقەدایە. نازانم.. لەراستیدا نازانم کیمیاگەرەکە کێیە؟

- (بروتوس) رونیکردەوە، کە کیمیاگەرەکە لەسەردەمێك پیاوێکی زانا بوو. لەرێگەی توانەوەو ئاوێتەکردنی مادەی جۆراوجۆرو بەگەرمکردن دەیویست بەردی فەلسەفی دروستبکات.

- (تیۆ) پرسی: بەردی چی؟ فەلسەفی؟

- نەك بەواتای فەلسەفە، بەواتای کرۆکی مەزن. ئەم بەردە بۆ خاوەنەکەی دەیتوانی لەرێگەی گۆڕینەوە رەواڵەتی قورقوشمی تاریکی رۆحی گوناهکار بۆ رۆحی ئاڵتونی. ژیانی جەوهەری فەراهەمبکات.

- (تیۆ) وتی: کیمیاگەران هەمان کاری (تایۆیستەکان)ی (چین) دەکەن. کۆمپانیای جادوگەریو هاوبەشیکردن!

- (بروتوس) وتی: هیچ وانییە. کیمیاگەرەکان جادوگەرو ئەفسونباز نەبون. بەڵکو باوانی گەورەی کیمیازانەکانی سەردەمبون، کە لەکاتێکی دیاریکراودا لەجادو سحر تێپەڕیبونو کیمیاگەرییان لەروپۆشە ئەفسانەییەکەی رزگارکرد. هیچ کیمیاگەرێك (کرۆکی مەزن – ئەکسیری مەزن) یان بەردی فەلسەفی دەستنەکەوت، بەڵام لەدرێژەی ئەو هەوڵانەدا چەند کەس

لەوانە هۆشیاریان لەسەر رازەکانی جوانی سروشت بەدەستهێنا. کیمیاگەرەکان (کیمیستەکان) سیستمی کاری کیمیاگەرانیان سادە کردەوەو زانستێکی نوێیان دروستکرد.

- (تیۆ)، کە پشیلەکەی دەلاواندەوە وتی: هەموو ئەو وەسفانە دەربارەی ئەو شارەی گەشتی بۆ دەکەم هیچ شتێکی فێرنەکردم. (ئارتۆر) سەرەنجام ناوی ئەو شارە دەدۆزمەوە، تۆ دەڵێی چی؟

- (نۆیمی) وتی: دەهێڵێت ماوەیەکی دیکەش لەلام بمێنێتەوە؟ (ئارتۆر) شفادەرێکی بەتوانایە...

- (تیۆ) جوانمێرانە پشیلەکەی بە (نۆیمی) بەخشیو (ئارتۆر)یش راستەوخۆ لەئامێزیدا جێگای خۆی کردەوە. (تیۆ) بەمخابنەوە ژنە بەتەمەنەکەی بەدیدە سافو رۆشنەکەیەوە بەجێهێشت.

## (تیۆ) کۆپی دەکات

(تیۆ) بڕیاریدابوو بەهەر بەهایەك بوە مەتەڵەکە بدۆزێتەوە. بەبێ ئەنجام هەموو کتێبەکانی ژێرەوژورکرد. لەهەر گۆشەیەکدا کیمیاگەرو چیرۆکی شێرەکان هەبوایە دەگەڕا. سەرەڕای ئەوەش پورە (مارتا) بەرەواڵەت ئامادەنەبوو کۆمەکی پێبکات؟ (تیۆ) بەدڵگەرمیو تورەییەوە بەبیانوی هەوا هەڵمژین بۆ دەرەوە رۆشتو بەدەوروبەری ماڵەکەدا سوڕایەوە... پاشان دانیشتو موبایلەکەی دەرهێنا.

- (فاتۆ)؟ لەسەر جادەوە تەلەفۆنت بۆ دەکەم. دەمەوێت پشویەك بدەم. بەڵێ، خۆشمدەوێیت....! زۆر زۆر. بەڵێ، وایدەردەخەن چارەسەرکرابم... بەڵام خۆم ماوەیەك پەیم بەوەبردوە!. باشە دەمەوێت قۆناغی دواتری گەشتەکەم پێبڵێیت. نەخێر، ئامازەم ناوێت، هەمووی بڵێ، کۆپییە؟ ... باشە. بۆ هەموو ئەمانە گەمەنین. ئیدی ئەو گەمژەییانە بەسە؟ لەدەست ئەو مەتەڵبازانە سەغڵەتم. پورە (مارتا)؟ ئەگەر دەزانی؟ ئیدی خۆشی گرنگی بەو بابەتە نادات! خۆزگە دەتزانی سەرقاڵی چییە؟....عاشق بوە! سوێند دەخۆم، پرۆفیسۆرێکی بەرازیلییە. شێوەو رەواڵەتی؟ بۆ پیاوێکی بەتەمەن خراپ نییە. دەیەوێت بیخوازێت. تارادەیەك رازییە... ئاه! دەبینیت چیدی ئەوشتانە لەلای گرنگیان نییە، باشە ناوی شاری خاوەن کۆشکەکەم پێدەڵێیت؟ دەنگت هەڵبڕە! پراگ؟

لەژێر لێوەوە وتی: نارەسەن.. تەلەفونەکەی داخست. باشە ئێستا (پراگ) لەکوێیە؟ لەفەرهەنگەکەدا دۆزییەوە پایتەختی (چیك)ـە. نە شوێنەوارێك لەکۆشكو نەلەشێر نەبوو.

تەنها نوسرابوو (چیکۆسلۆڤاکا). هێرشی سۆڤێتی (١٩٦٨)، شۆڕشی مەخمەڵ لەساڵی (١٩٨٩)، پراگ پایتەختی دێرینی (بۆهم)و هیچی دیکە! وەرسبوو. ناچار تەلەفۆنەکەی هەڵگرتو بۆ گەرماوەکە رۆشت.

- (فاتۆ)؟ ئەگەر باسی بابەتی شێرو کۆشكو شتەکانی دیکە نەکەیت شتێکی خراپە!. دەبێت بەلایەنی کەمەوە دیاردەکە لەبەربکەم ...ئاماژە؟ باشە بیڵێ... بوهم، ئەوەم دۆزییەوە، ئەی کۆشکەکە؟ بەسەر شاردا دەڕوانێت. باشە ئەی شێر؟ ناوی (حاخام)ێکە؟ دڵنیایت؟. (رەبی لیۆ- Liw). نوسیم ئەی کیمیاگەران؟ لەکۆشکەکەدا گەڕەکیان هەیە؟ گەڕەکی ئاڵتون؟ ئاخ... چەندم خۆشدەوێیت! بەخێرایی... لەکاتێکدا تەلەفۆنەکەی دادەنایەوە وتی: ئێستا بەقوربانی پشتگوێخستنەکەی پورە (مارتا) دەبم!. سەری شۆڕکردەوەو لەناو دەستیگرت گوایە بۆ ئەوەی مەتەڵەکە بدۆزێتەوە...

- پورە (مارتا) بەمیهرەبانییەوە پێشنیازیکرد: تەلەفۆن بۆ (فاتۆ) بکە.

- (تیۆ)، واخۆی دەرخست گوایە دەیەوێت بەوردی بیربکاتەوە، وتی: نەخێر، دەمەوێت خۆم بەتەنها بیدۆزمەوە. بابزانم شێر لەزمانی ئەڵمانی ... ئێ، ئەگەر (حاخام)ێك بێت چی؟ پیاوێکی ناودارە، (رەبی لویی)! لەکوێیە؟ لەشارێکدا کۆشکێك بەسەریدا روانیوە باشە دیارە شاری (پراگ)ـە.

- پورە (مارتا) لەتاو سەراسیمەبون دەمی داچەقاندبوو. بەفیکە لێدانەوە وتی: ئەم کوڕە لاوە بلیمەتە! هەمیشە هەروامزانیوە.

- (بروتوس) بەگومانەوە پرسی: لەچ سەردەمێکدا ئەم (حاخام)ـە لە(پراگ) ژیاوە؟

- (تیۆ) بەتەتەڵەکرنی زمانەوە وتی: لەچ سەردەمێکدا؟ ئۆو... سەدەکانی ناوەڕاست!

- (بروتوس) راستیکردەوە: سەدەی شانزە. (تیۆ) دەزانیت (گۆلێم - Golem) چییە؟

- (تیۆ) هاواریکرد: ناوی کۆشکەکەیە! بۆچی ئەو پرسیارانە دەکەیت؟

- (بروتوس)، کەخەندە گرتبوی، وتی: چونکە تۆ (قۆپی - کۆپی)یت کردوە!. (گۆلێم) پەیکەرێکی گڵێنەیە لەلایەن ئەو (حاخام)ـەوە، کە تۆ نایناسیت، ئەفرێنراوە. ئێستا دەرکەوت.

- پورە (مارتا) هاواریکرد: (تیۆ) ناشێت تەلەفۆنت بۆ (فاتۆ) کردبێت؟

- وایە، ترسام نەتوانم بیدۆزمەوەو پاشان... ئۆف! لەدەست ئەم مەتەڵانە سەرسام بوم!

- پورە (مارتا) بەسەرزەنشت کردنەوە وتی: چەند گۆڕاویت...

- گەورەبوم. تاڕادەیەکیش خەتای تۆشە، پیرەژن!

- (بروتوس) وتی: بەپیرەژن بانگی مەکە، ئەگینا تورە دەبم. (مارتا) خودی لاوێتییە.

- (تیۆ) پرسی: بەراست. ئەم (خودی لاوێتییە) بۆ ئەوەیە رازیبوە شوت پێبکات؟

- پورە (مارتا) کەمێك نیگەرانبوو، لەهەمان کاتدا دەستی چەپی خۆی پیشاندا، کە ئەنگوستیلەیەکی نقێم سوری گرانبەها لەپەنجەیدا دەدرەوشایەوە.

- (تیۆ) بەسەرسامییەوە وتی: ئەوە چییە خەون دەبینم؟ ئەڵقەی دەستگیرانی؟

- (بروتوس) بەخاکیانەوە وتی: ئەو نقێمە سورە (لەعل)ـە. بەردی (ئاشوت)، بەرێکەوت لەگەڵ خۆم هێنابوم.

## میحرابێکی جیهانی

پێش رۆشتن بۆ ئەوروپا پورە (مارتا) لەبەرنامەکەیدا سەردانێکی دیکەی هەبوو بۆ نیۆرك. سەیرەکە لەوەدابوو، کە بۆ ئەو مەبەستە دەبوو لەسەردانی تەلاری رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا بەقەراخ روبارەکەدا تێپەرینایەو وەك کاری ئاسایی کۆنترۆڵی پۆلیس، نیشانەی تایبەت بەملداهەلۆاسینو بریاری ئاسایشو نۆبەگرتن لەریزی ئەوانەی سەردانی دەکەن.

- (تیۆ) لەخۆی پرسی چۆن دەکرێت کەسێکی ئاینی لەشوێنێکی لەوجۆرەدا بێت؟ لەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا!.

- (بروتوس) بەهێواشی وتی: لەناو ئامێری حەلوفەسڵی جەنگو سکاڵاکان، تکادەکەم نەڵێیت بیناکە پەرستگای ئاشتیو ئارمییە!

پورە (مارتا)ش پاش گفتوگۆکردن لەگەڵ یەکێك لەپاسەوانەکان یەکێك لەدەرگا گەورەکانەوە تێپەرین، کە رێگای چونە ژورەوە بوو. ئەو دەرگایە دەچوە سەرمیحراب یان پەرستگای تایبەتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان.

- میحرابەکە وەك دیارییەکی وڵاتی سوید، کە لەساڵانی دەیەی پەنجاکاندا لەپاڵ تەلارەکەدا دروستکراوەو شوێنی پەرستگای پەیرەوانی هەموو ئاینەکانی جیهانە، بەبێ خاچ، وێنەی پیرۆز، ناونیشان، شوێنی قوربانیکردن، رمی لەدار دروستکراو، پەیکەرو شتی بەرچاوی پیرۆزکراو و درەخت بەتیرۆژە روناکییەك بەردێکی زەبەلاحی بەرز روناك ببۆوە. بەردێکی رەشی زەبەلاحی (هماتیت — ئۆکسیدی ئاسن)، کە لەکانی کانزای ئەو وڵاتە دەرهێنراوە. ریزێکی راخەر تایبەتە بەو باوەڕدارانەی ، کە بۆ دوعاکردنو نغرۆبون لەجیهانی بیرکرنەوەو رامان، دەچنە ئەو شوێنە.

- پورە (مارتا) بەنیگەرانییەوە وتی: گرنگە، وانییە؟
- (بروتوس) بەهێوری وتی: بەلام بەبێ خوێنو گۆشت، ئاین شتێکی پیرۆزە!
- (تیۆ) وتی: ئارەزوم لەمەیە، هەموو ئاینەکان پێکەوە، ئەمەم بەدڵە.

## بەشی بیست‌و نۆ

# (گەڕانەوە بۆ رەچەڵەك)

### بەخۆشی پورە (مارتا)و (بروتوس)ەوە

لەراستیدا هەموو گەشت‌و سەردانەکان وەکویەك نەبون. پێشتر (تیۆ) لەهەر قۆناغێکی گەشتەکەیدا هاورێیەکی نوێی لەدەستدەدا، بەڵام لە (داکار) بەدواوە هەلومەرجەکە گۆڕابوو. بە (عەبدوڵلایە)ی وتبوو: (ماڵئاوا، بەنیازی دیدار لەپاریس). لە (بەرازیل) ماڵئاوایی کردن لەئارادا نەبوو، چونکە پرۆفیسۆر (کانرۆ) لەگەڵ پورە (مارتا)و ئەودا بۆ (نیۆرك) دەچوو. ئێستاش بەبێ ئەو (نیۆرك) بەجێدێڵن، هەرچەندە ئەو دوانە ببونە دەستگیران، تاکە شتێکی نوێ، کەلەئارادابوو، پەیوەندی هەبوو بەپشیلەکەوە (ئارتۆر)، کە لەقەفەسە تایبەتەکەیدا خەریکی میاو میاو بوو. لەفرۆکەخانەی ماڵئاوایی پورە (مارتا)و (بروتوس) کەمێك خەمئەنگێزبوو، بەڵام ئەمجارە لەو روداوەدا بەشدارنەبوو.

- (بروتوس) وتی: زۆرباشە، ئازیزەکەم. دەزانیت دەبێت بۆ زانکۆ بگەڕێمەوە.
- پورە (مارتا) بەئەفسوسەوە وتی: هەڵبەتە جێگای شانازیتە، بەڵام کەی یەکتر دەبینینەوە؟
- بەو زوانە! وا دەزانیت لەتۆ کەمتر پەرۆشم؟ بۆ دروستکردنی ماڵی داهاتومان کەمێك ئارامم لێبگرە.
- بەنیگەرانییەوە پرسی: لەکوێ؟ هیوادارم لەبەرازیل نەبێت؟

- لەبارێکدا رەنگی هەڵبزرکاو گوتی: بۆچی؟ ئارەزو ناکەن لە ولاتەکەی من بژین؟ وامدەزانی...

- قسەکەی پێبڕی: (بروتوس) هێشتا لەوبارەیەوە بڕیارمان نەداوە. من نە (ریۆ)و نە (باهیا) پەسەند ناکەم.

- نە(ریۆ) نە(باهیا) زۆرباشە، ئێستا واباشترە شمشێرە دارینەکەت لەکێلان بخەیتو ماڵئاواییو ماچو موچم لەگەڵدا بکەیتو جارجارەش لەو ئەنگوستیلەیەی پەنجەت بڕوانیت... ئەی ئازیزەکەم.

- وەرە بۆ (پراگ). ژیان بەبێ تۆ سەخت دەبێت.

- (تیۆ) وتی: زۆر سوپاس بۆ میهرەبانیت، کەواتە من لەم ناوەدا هیچ کارەم؟

دوو عاشقو مەعشوقەکە ئامادەنەبون لەیەکدی جیاببنەوە. (تیۆ) ئەو دوانەی رەهاکردو کەوتە گەڕان بەناو بازاڕە بێگومرگەکەدا . چەرخێکی بۆ باوکی کڕی، زانی بۆ یەکەمجارە پورە (مارتا) لەشت کڕینەکەی تورە نابێت.

پورە (مارتا) لەناو فڕۆکەکەشدا هێشتا فرمێسك لەناو چاوانیدا قەتیس مابوو. (تیۆ) ئارامی لێهەڵگیراو سەری بەسەر رۆژنامەیەکدا شۆڕکردەوە. داوای خواردنەوەیەکی کردو فەرموی لە پورە (مارتا) کرد.

- ئەویش بەتوڕەییەوە وتی: بۆ وادەزانیت من (ئەلیزابیت تایلۆرم)؟

- (تیۆ) بەپێکەنینەوە وتی: ئەویان نیت، بەلام دەبێت لەو قاوغە بێیتە دەرەوە. بەوزوانە دەیبینینەوە.

- ئەو قسانە دەکەنو پاشان .. بەراستی لەو بڕوایەدیت منی خۆشدەوێت؟

- بۆ خۆت لەو بارەیەوە گومانت هەیە؟

- لەگەڵ خواردنەوەکەی خستە سەر لێوی وتی: نەخێر، هەر چۆنێك بێت لەم تەمەنەی مندا رون نییە. ئەمجارە بەراستی فرمێسك زایە چاوەکانی...

- (تیۆ) کە دەستی لەناو دەستەکانی خۆی گرتبوو گوتی: هەر کەس بەنۆرەی خۆی. پێشتر تۆ دڵی منت دەدایەوەو ئێستاش من. پیرەژن ئازابە! باشتر نییە بزانم لە (پراگ) چیدەکەین؟. ئەوە (پرۆتستانیزم )مان تێپەڕاند، نازانم چیدیکەمان لەپێشە.

- پرسیارێکی باشە. ئێستا پێتدەڵێم. (رەبی ئالیئەزر)ت لەیادە؟

- لەئۆرشەلیم؟ بێگومان، زۆرباش! نەیدەویست دەستم لێبەربدات!

- راستە. لەیادتە لەفرۆکەخانەکە چیوت؟ بەتۆی راگەیاند کەهێشتا هیچ دەربارەی (جولەکەگەرایی جوداییزم) نازانیت. وەڵامەکەی منت لەیادە کە وتم: (ئەو کارەی کە دەستپێکراوە کەسانی دیکە تەواوی دەکەن). باشە، هەر ئەوەش هۆی گەشتەکەمانە بۆ (پراگ)، چونکە هێشتا دەربارەی کارەکانی جولەکە هیچ نازانیت.

- من دیواری (ندبە، نزاکان، وێردەکان، زمان لێدانەکان، گەڕەکی ئاینی، قوتابخانەیەك.... هەمویم بینی، چ شتێك کەمبوو)؟

- وەڵامیدایەوە: کەنیسەیەك. شباتێك، خۆراك، روناکییەکان، موبارەککردن، دابەکردنی نان، ژیانو رۆژگاری ئاینی جولەکە.... تۆ بچوکترین وێناکردنت بۆ ئەوانە نییە.

- دەزانم بێهودەو بەرێکەوت (پراگ)ت هەڵنەبژاردوە. تۆ دەناسم! کەواتە هێشتا کۆمەڵێك جولەکە لەوێ ماون؟ وامزانی لەسەردەمی جەنگدا هەموان کۆکوژکراون....

- خۆشبەختانە نەخێر، هەمویان نا، بەڵام هەر ئەوەش تاکە هۆی هەڵبژاردنی (پراگ) نییەو دەسیکرد بەرونکردنەوەکانی.

## بۆچی پراگ

- ئەو (گتو)ەی لە(پراگ) هەبوو وەك (گتو)ەکانی دیکە. هەروەها بەچوار کەنیسە، گۆڕستانێکی کۆن، خانوی کۆنینەو گەڕەکێکی تەواو دێرینەبوو، کە لەسەرانسەری جیهاندا بەناوبانگە. لەلایەکی دیکەشەوە هۆکاری مانەوەی ئەم (گتو)یە خۆی لەخۆیدا هۆیەکی نەفرەتاوی بوو. بەم واتایەی کە پاش پێشنیازو جێبەجێکردنی (دوو رێگاچارە)، واتا کۆکوژکردنی هەموو جولەکەکانی ئەوروپا، (هیتلەر)، فەرمانیدابوو (گتو)ی (پراگ) بەدەست لێنەدراوی بهێڵنەوە تا وەك پاشماوەی نەژادێکی قڕکردوو بمێنێتەوە. بەمپێیە (گتو)ی پراگ بەئاوڕدانەوە لەو ئایندەیەو بەفەرمانی (پێشەوا) لەوێرانیو لەناوچون پارێزرا. (نازییەکان) لەناو ئەو (گتو - مۆزەخانە)یەدا شارە هونەرییەکانی جولەکە، شتە گرانبەهاو موفورکی ئاینی، پەردەی میحرابەکانو شتی لەوجۆرەیان گردکردبۆوە. جەنگ کۆتایی پێهاتو (هتلەر) لەپەناگە ژێرزەمینییەکەی لە(بەرلین) خۆکوژی کرد؛ بەڵام (گتو) هەرمایەوە. پاش روخانی ئیمپارتۆری سۆڤێتی لەساڵی (١٩٨٩) کۆمەڵگەی جولەکەکانی (پراگ) جارێکی دیکە بونەوە بەخاوەنی (گتو)یە،کە لەوەودوا ئەم کەنیسە گەورەیەی ببووە مۆزەخانەیەکی جولەکە لەلایەن ئەم

کۆمەڵەوە بەڕێوە دەبرا، کە سەرەڕای ئەو شتانەی کەنیسەکانی دیکە هەیانبوو لەگەڵ گۆڕستانێك، خەڵکی سەرەیان دەگرت بۆ بینینی: دەبێت وەك شانۆگەرییەکیش سەیری بکرێت.

- (تیۆ) وتی: پێشتر (گتو)م بینیوە، لە (میاشریم).

- پورە (مارتا) رونیکردەوە: کە (میاشریم)*هەرچەندە بەتەواوی بەوەفاداری بۆ سوننەتەکانی جولەکە ماوەتەوە، بەڵام شتێك نییە جگە لەدوبارە ئەفرانەوەی سەرکەوتوانەی (گتو)یەك. لەبارێکدا (گتو)کەی (پراگ) خۆڵی مێژووی لەسەر نیشتوە. هەڵبەتە لەم (گتو)یەدا روبەڕوی جولەکەی کەوا شۆڕو کورێژگەی پانتۆڵ کورت نابیتەوە، بەڵام لەجێگای ئەوانە دیوارەگانی هەرهەمانە بەدرێژایی مێژوو وەك خۆی ماوە. بەردەکان دەچرپێنن، گۆڕەکان پەرجونو بەراستی شوێنی زیارەتکارانن.

- (تیۆ) وتی: گۆڕە پەرەجزئاساکان؟ لەجودایزمدا؟

- بەڵێ، موعجیزەئاسا. پاش داگیرکردنی پەرستگای (ئۆرشەلیم) جولەکە کۆچەرییەکان لەهەر شوێنێك بون کەنیسەیان بۆخۆیان دروستکردوە، بەڵام پەرستگاکەی (سلێمان) لەهیچ شوێنێك بوونی نەمابوو جگە لەناو دڵی جولەکەکان. (ئۆرشەلیم)ـەکەیان تەلارێکی گەورەبوو لە (کتێبی پیرۆز). سوننەتی جولەکە بەوجۆرە بوو، کە (موسا) لەسەر کێوی (سینا) لەو خواوەندەی ناکرێت ناوی بهێنرێت، ئەو وشانەی وەرگرتبوو، کە تایبەت بوو بەکەسانی نائاسایی. (دە) فەرمانەکە گەلی جولەکەی راسپارد، بەڵام وتەکانی خواوەند روبەڕوی پاکترین کەس بوو لەناو پاکترین تاکەکاندا. ئەو پاکترین کەسانە پەیامبەرانی ئیسرائیل یان (پێغەمبەران)بون: ئەسفیا، ئەرمیا، حزاقیلو دانیال، کەهەموانیان پیاوانی خوداییو رۆحانی بون، کە نەدەبوو سەرپێچی بیروراکانیان بکرێت.

- (تیۆ) وتی: وەك (یەحیا)ی تەعمیدکارو پەیامبەری ئیسلام....

- وشەی پەیامبەر لەوشەی عەرەبی قورئاندا بە (النبی - Alnabi) هاتوە، کە مەبەست پەیامبەری ئیسلامە. دوای ئەو چوار پەیامبەرە گەورەیەی ئیسرائیل دوانزە دانەی دیکە هاتونو کاتێك کۆچی گەلی جولەکە دەستیپێکرد ئەو سوننەتە هەر درێژەی هەبوو. بەڵام سوننەتی جولەکە دووجۆر بوو: یەکەم، لایەنی پەیامبەرانەی نەبوو بۆ نوسینو خوێندنەوە بوو، کە بەزمانی عیبری پێیدەڵێن (تلمود - Talmud). سونەتی دووەم، کە لەسەردەمی دووەمین پەرستگای (ئۆرشەلیم) سەریهەڵدا. کە تەنها بە سونەت یان (کاباڵ - Kabbal) ناوبرا. بەخێرایی ئەو دوانە لەیەك جوداکرانەوە: (تەلمود)ییەکان بێکۆتا (یاسا)ی نوسراویان راڤەو

لێکدەدایەوە. (کابالّ)یەکان تەنها پەیوەستبون بەلایەنی عارفانەی پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ خواوەند.

- (تیۆ) وتی: منیش ئارەزوم لەو بابەتە هەیە.

- پورە (مارتا) بەردەوامبوو: بابەتەکە ئەوەیە، کە (کابلیست)ـەکان، هەرگیز لەسەرچاوەو چاوگی بەهرەکان بەدورنەبون... پاشی بەدەرنانی جولەکەکانی ئیسپانیا ئەو دەستەیەی بۆ (فەلەستین) گەڕانەوە لەشارۆچکەی (سەفێد) لەسەر چیای (گالیلا) نیشتەجێبون. لەوێداو لەسەدەی شانزەدا لەژێر سروەی بەهرەبەخشی گردۆڵکە سەوزو پڕ لەگوڵەکان عارفانەترین رێچکەی (کابالیزم) بەرابەری (رەبی)یەکی لاو بەناوی (ئیسحاق لۆریە) پەرەپێدرا. (رەبی لۆریە) لەخێزانێکی دورخراوەی (ئەڵمانی) لە (ئۆرشەلیم) لەدایکبوە. لەسەرەتادا چۆتە (میسر). لەکەنارەکانی روباری (نیل) ژیاوەو پاشان بۆ (سەفێد) رۆشتوەو دەستیکردوە بەبلاّوکردنەوەی ئاین‌و تیۆرەکانی. بیروڕای (رەبی لۆریە) ئەوەبوو، کە رۆحی مرۆڤەکان هەموان لە رۆحی (ئادەم)ـەوە سەرچاوەیان گرتووە، بەلاّم هەموو ئەو رۆحانەش لەیەك بەشی هاوبەش‌و تاکەوە لەناو پەیکەری (ئادەم)دا نەبون. ئەو رۆحە ناشیرینانەی لەبەشەکانی خوارەوە دروستبون بەکافرو مولحیدەکان سپێرراوەو رۆحەکانی ئەندامەکانی بەشی سەرەوەو چاکەکان بە جولەکەکان دراوە. لەپێناوی قەرەبووکردنەوەو لەجیاتی هەڵەی سەرەتا بێگومان دەبێت رۆحە (چاکەکان) بەجەستەی خەڵکی دیکە یان رووبار، جانەوەران، درەخت‌و بەردەکانی رۆچن. بەمجۆرە (چاکە) بەسەرانسەری جیهاندا بلاّودەبێتەوە. هەر لەبەرئەوەش بوو (رەبی لۆریە) بەزمانی زیندەوەرەکان دواوە. رۆحەکانی لەنێو لەگۆڕستانەکانەوە بانگدەکرد. لەگۆڕستانەکاندا دەچوە باری بێهۆشی. دۆنادۆنی رۆحی تاکی فێردەکرد، کە لەرۆحی کۆو گشتییەوە سەرچاوەی دەگرت. نازناوی (ئاری) واتا شێر یان بە(رەبی لۆریا) دانابوو. موریدەکانی ناویاننابوو (بێچوەشێر)، ئێستاش گۆڕەکەی لە (سەفید) لە گۆڕستانی کۆن شوێنی ستایش‌و پەرستنە.

- (تیۆ) وتی: یان من بەهەڵەداچوو یان ئەم پرسی زمانی زیندەوەرانە یاسایی‌و رێکخراو نییە. دەزانم کە (رەبی ئالیئەزر)یش نەیدەتوانی رازیبێت.

- پورە (مارتا) وتی: لەوانەشە وانەبێت، بەلاّم (رەبی ئالیئەزر) وەك هاولاّتییەکی ئیسرائیل حەزی بەگەڕانەوەی هەموو جولەکەکان بوو بۆ سەر خاکی بەڵێنپێدراو، کە خودی جولەکەکانیش لەسەر ئەو دیدە کۆك نین. زۆر لە جولەکە پەرەوازەکان (Draspora) پێیان

باشە لەناو شوێن و ژیانی خۆیان‌و لەناو دڵی زێدیاندا بژین، کە پڕە لەیادەوەری‌و بیرەوەری باوان‌و ژیانی رابردوو یان هەر لەوێدا درێژە بەژیان بدەن. زۆر لە جوەکانی (پراگ) لەسەر ئەو بیروباوەڕەن، بەڵام لەسەدەی حەڤدەدا (ڕەبی لوڤی) لە (پراگ) ژیاوە، هەر ئەوەی پێوتراوە (شێر)، کە ئێستاش لەکۆڵانەکانی (گتو)دا ئەفسانەو چیرۆکی سەیرو سەمەرە دەرباری دەماودەم دەکات‌و ڕێنیشاندەرانی تۆریستەکانیش، کە دێتە سەردانی ئەوێ، لەشاخ‌و باڵ بۆ دروستکردنی درێغی ناکەن.

(ڕەبی لوڤی) بەبەرەکەتی ئەو جولەکەیەکی خزمەتکاری لەقوڕەسور دروستکردبوو ناوی (گۆلێم - Golem)بوو. هەرکاتێك (ڕەبی) ئارەزوی بکردایە رۆحی بەبەردا دەکردو ئەوەش ئەو مرۆڤە دەستکردەبوو، کە (بروتوس)ی ئازیزیش لەگەڵ تۆ قسەی لەسەرکرد. (گۆلێم) بە ویستی (ڕەبی) دەیتوانی لەچاو تروکانێکدا کۆشکێك دروستبکات یان بفرێت‌و لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی بچێت یان رۆح بانگهێشت بکات‌و ئارەزووەکان جێبەجێ بکات.

- (تیۆ) وتی: تا رادەیەك وەك شێرەی دیکە (لۆریە)ی شێت، بەم پێیە (ڕەبی لوڤی)ش (کابالّ)بوە.

- زۆر دڵنیایی نییە، چونکە موعجیزەی (ڕەبی) لە (پراگ) بێگومان لایەنی ئەفسانەی هەیە. راستی مێژویی زۆر سادەترو لەهەمان کاتدا بەبەهاترە. (ڕەبی لۆڤی) وەك پیاوێکی دانیار، زانا، سیاسەتمەدارێکی شارەزاو پیاوی دانوستان‌و گفتوگۆ توانیبوی جولەکەکانی دانیشتوی (گتو) لەزیانەکانی دژە جولەکەگەرایی (ئانتی سامیتیزم) لەو دەڤەرەدا بپارێزێ‌و پارێزگاریان لێبکات. خاوەنی دەسەڵاتێکی لەوجۆرەبوو، کە خودی ئیمپراتۆری بۆ لای خۆی کێشکردبوو، بەدزییەوە بانگهێشتی کۆشکەکەی خۆیکردبوو، کەتا ئەوکاتە هیچ کام لە(حاخام)ەکان نەیانتوانیبوو چاویان بەهیچ ئیمپراتۆرێك لەئەوروپا بکەوێت!. (ڕەبی لۆڤی) بۆ کۆشك چوو. یەك شەوی تەواو لەگەڵ ئیمپراتۆردا گفتوگۆی کردبوو.

- (تیۆ) وتی: دەربارەی پەرەجوو گفتوگۆی لەگەڵ کردبوو؟

- ئەوە نازانم. بەڵام دەبێت جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە ئیمپراتۆری (نەمسا)ش وەك ئیمپراتۆرەکانی هاوشانی بوو. ئەو ئیمپراتۆرە ناوی (رۆدۆلفی دووەم هایسبۆرگ)بوو، کە (پراگ)ی وەك پایتەختی خۆی هەڵبژاردبوو. ئیمپراتۆر لەو شارەدا هێندە شارەکەی فراوان کردبوو تا بۆ شارێکی راستەقینەی گۆڕیبوو، کە مۆزەخانەی سەرسوڕهێنەری لەزۆر زینەوەری‌و شککراوی تێدابوو، شاخی کەرکەدەن، زمانی مار، ددانی قرش، هێلکەی حوشترمل، مەرجانی

سەیرو سەمەرە، مێخی پێچاوپێچی کەشتییەکەی نوح، کوپی دژە ژەهر، جۆرەها تریاكو دەرمان، تەنانەت ئەو گڵەی (ئادەم)ی لێدروستکرابوو لەلایەن خواوەند. ئیمپراتۆر ویستبووی باخچەیەکی ئاژەڵانیش لەناو کۆشکەکەدا دروستبکات. خاڵێکی سەیری ئەم ئیمپراتۆرە پەرێشانە لەیەکێك لەڕاڕەوەکانی کۆشکەکەیدا ژمارەیەك کیمیاگەری دانابوو، کە داوای لێکردبون نهێنی دروستکردنی ئاڵتون بدۆزنەوە.

- (تیۆ) هاواریکرد: ئۆو! کۆشك، کیمیاگەران، ڕێڕەوی ئاڵتون! لەو نێوەندەدا تەنها (شێر) دەرنەکەوتوە.

- پورە (مارتا) وتی: تاکە شێری (پراگ)و ڕاستەقینەکەی هەمان ئەو (ڕەبی)یە بەڕێزە بوو، چونکە لەسەردەمی ژیانی (ڕەبی لۆڤی) جولەکەکان لەبارێکی ئارامو خۆشگوزەرانیدا ژیان ئەوەش تاکە موعجیزەی سروشتیو بنەڕەتی کەسێك بوو، کە موریدەکانی، بە(مامۆستای چاك - Mahral) ناویان نابوو، پاش مەرگیشی نازناوی دیکەی بەسەردا برا، کەهێندەی نەخایاند، جولەکەکان لەسەرانسەری جیهانەوە دەهاتنە سەر گۆڕەکەیو سکاڵاو داخوازی خۆیان بەبەردی گۆڕەکەیەوە دەنوساند، وەك ئەو کاغەزانەی لەدرزی دیوارەکانی (نەدەبە)ی ئۆرشەلیم ڕۆدەکرا.

- (تیۆ) وتی: بەمپێیە، ڕوداوی گۆڕە پەرەجوئاساکانیش لایەنێکی سونەتی هەیە. ئایا منیش دەتوانم ئارەزوەکانم لەسەر پارچە کاغەزێك بنوسمو لەکونی بەردەکانی گۆڕەکەی ڕۆبکەم؟

- هەڵبەتە، بەڵام بەتەنها (پراگ) تاکە شوێنی پاشماوەی (گتو)کانی ئەوروپا نییە، بەڵکو سەرەڕای ئەوەی ژمارەیەکی زۆری جولەکەکانی ئەوروپا لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا ناوبران، بەڵام هێشتا لەم شوێنە سروتی ئاینی جولەکەگەرایی وەك سەدەکانی ڕابردوی ئەوروپا جێبەجێ دەکرێت. پاشان بۆ (تیۆ)ی ڕونکردەوە، کە چونکە گەشتەکەی لە ئۆرشەلیمەوە بەرونکردنەوە سەبارەت بەئاینی جولەکە دەستیپێکرد دەیەوێت بەهۆی جولەکەکانی (پراگ)ەوە ئەو باسە کامڵ بکات.

- (تیۆ) بەئەفسوسەوە وتی: واتە دەتەوێت بڵێیت لەپاش (پراگ) گەشتەکە دوایی دێت؟ بۆ پاریس دەگەڕێینەوە؟

- وەڵامیدایەوە: نەخێر، هێشتا قۆناغی کۆتایی ماوە.

- هاواریکرد: واتە مەتەڵێکی دیکەی نوێ؟.

- ئەوەش لەدوو چرکەی داهاتودا دەزانیت، ئەو مەتەڵە وەك خۆر دەدرەوشێتەوە.

## کاسەی ئازادی

ئەو ڕێوانەی پورە (مارتا) بۆ گەشتەکەی (پراگ) هەڵیبژاردبوو ناوی (خانم ریڤا ئۆپن هایمەر)بوو، کە مامۆستای زمانی فەرەنسی لەپەیمانگای کەلتوری بەشی (ستێپانکا)بوو. لەدیدی (تیۆ)وە نە لاوو نەپیر، نەجوانو نەناشیرین دەردەکەوت؛ ڕەش پۆش بوو. بەچاوداخستنەوە ڕێی دەکردو بەشەرمەوە دەدوا، لەهەڵەی زمانەوانی زمانە فەرەنسیەکەی پۆزشی دەهێنایەوە، بەکورتی هێندە چالاکو زرنگ نەبوو. سەرەڕای ئەوەش ناونیشانی هۆتێلەکەی بەهەڵە بەشۆفێری تاکسییەکە وتو پاشان زۆر داوای لێبوردنی کرد.

- پورە (مارتا) وتی: (ریڤا) لەزمانی (یدیش)دا (ریڤکلە)یە. (یدیش) زمانی جولەکەکانی ئەوروپای ناوەڕاستەز ئەم زمانە سێیەکی ئەڵمانیو بەشێکی عیبرییە.

- خاتونەکە بەشەرمەوە وتی: دەبێت بڵێم کە (ریڤا) بەرامبەر بە (ربکا)یە. میسۆ (تیۆ) دەتوانێت بە(ریڤکلە) بانگم بکەیت.

- (تیۆ) پەسەندی کرد: (ریڤکلە) ناوێکی جوانە. وەك جۆگە.

- دواجار گەیشتنە هۆتێلەکە. باڵەخانەیەکی شکۆداربوو. لە دەیەکانی (١٩٢٠)ەوە تازە نوێژەنکرابۆوە. ڕەواڵەتی بەجوانکاری ڕازابۆوە، کە بۆ یەکێك لەباشترین هۆتێلەکانی (پراگ) گۆڕابوو، بەڵام کاتێك پورە (مارتا) چووە ژورەکەوە، چونکە هێندە تەسك بوو بەباشی جێگای دوو کەس نەدەبۆوە، هاواریکرد (ریڤکلە) ئەم قەفەسی کەروێشکە چییە؟ بۆ هۆتێلەکە نوێ نەکراوەتەوە؟

- (ریڤکلە) وتی: داوای لێبوردن دەکەم هێشتا ژورەکان هەروەك سەردەمی سۆڤێتی ماون.

- پورە (مارتا) بەتوڕەبوونەوە وتی: ژیانی سەغڵەتی ناو حکومەتی تۆتالیتاریزم، بونەوەرانی مرۆڤی وەك ئاژەڵ ئەنبار کردووە. هەرچۆنێك بێت دەیگوزەرێنین. لەکوێوە دەستپێبکەین؟

- (ریڤکلە) وتی: بۆ ئەمڕۆ سەردانی کۆشكو کاتدراڵ (کڵێسای مەزن)، مۆزەخانە، کڵێساکانی ستیل (باروك)، گردی (مالاسترانا)م داناوە.

- پورە (مارتا) وتی: دەتەوێت بمانکوژیت؟ هیچ کام لەوانەمان ناوێت، سەرەتا بچین بۆ بەردەم گۆڕەپانەکەی بەرامبەر سەعاتە گەورەکەو پاشان دەربارەی پیاسەکردن بڕیار دەدەین، ڕازیت؟

- (ریڤکلە) بەترسو لەرزەوە وتی: بەڵێ خاتوو ماك لاری.

- بە (مارتا) بانگم بکە! قەفەسەکەی (ئارتۆر) بگرەو تکادەکەم ئارامبە.

- (تیۆ) بەبینینی گۆڕەپانە گەورە کۆنەکەی شار بەهاوارکردنەوە دەستخۆشی کردنی کرد. بانە لێژەکان، تیری ئالتونی کلێساکان، گومەزە شێوە پیازییە سەوزباوەکان و بورجی زەنگەکان هەموو باسیان لەلایەنێکی جادوگەرئامێزانەی شارەکە دەکرد. لەناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا کۆمەڵێك گۆرانیان دەوت. کەسێکی جۆکەرئاسا مناڵانی دەهێنایە پێکەنین و کەمانچەژەنێك ئاوازی (هایدتی) لێدەدا. کەشەکە لێوانلێو بوو لەئاوازی خەمبارو ژاوەژاوی خەڵك. (ریڤکلە) بەزەحمەت توانی مێزێکی خاڵی چنگکەوێت.

- پورە (مارتا) هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: چ ئاپۆرەیەکە! لەمانگی دیسەمبەریشدا...

- (ریڤکلە) وتی: داوای لێبوردن دەکەم، پاش شۆڕش و دواهاتەکانی بەرادەی (ڤینسیا) تۆریست لەم شارەدا هەیە؛ بۆ ئابوری ئێمە باشە.

- پاش داواکردنی شەکرلەمەی گەرم ، چاو شیر بۆ (ئارتۆر) پورە (مارتا) روو بە (تیۆ) وتی: (تیۆ)... ئەو پەیکەرە گەورەیەی ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە دەبینیت؟

- (تیۆ) وەڵامیدایەوە: ئەو تەڵقینەدادەرە رەنگ سەوزەی پۆشاکێکی چینچینی لەخۆی پێچاوە؟ ئەوە کێیە؟

- پیاوێکی زۆر گرنگە. سەدەیەك پێش (لۆتەر) دەیویست ریفۆرم لەکلێسای کاسۆلیکدا بکات، بەڵام بەپێچەوانەی (لۆتەر)ەوە لەشاری (کنستاتس) بەئاگر سوتاندیان. ناوەکەیم لەیادماوە، ناوی (یان هۆس)ە.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بۆچی سوتاندیان؟ بەپێچەوانەی کەسانی دیکەوە بیری دەکردەوە؟

- بەئازادانە بیری دەکردەوە. زۆربەیان بەهەمان شێوە بەپێچەوانەی هەموانەوە بیریان کردۆتەوە.

- پورە (مارتا) بەردەوامبوو: (یان هۆس) خەڵکی (هۆسینك)ە، کە زێدەکەی گوندێك بوو. خێزانەکەی جوتیاری (بوەهم)و رۆحانی باشبون. هێدی هێدی بەلای بیرۆکەی ئایدیاڵی نوێدا لایداوە، چونکە لەوسەردەمەدا هەموو بیریارانی کاسۆلیکی بەنیازی نوێژەنکردنەوەی کلێساکانیان بون؛ (یان هوس)یش لەریزی ئەو کەسانەدابوو. بیرۆکەکانی، کە هیچ لایەنێکی جەسارەتی تێدانەبوو، بڵاو دەکردەوە. هێشتا دەزگای چاپ دانەهێنرابوو، بەڵام (یان هوس) وتاربێژێکی چاکبوو. هێندە لەو هونەرەدا پێشکەوت هەموو کاسۆلیکەکانی دەبزواندو بۆ گوێگرتن لەقسەکانی لەگۆشەو کەنارەکانەوە بۆ شوێنی قەشایەتییەکەی بەناوی (بیت لحم) لە

(پرتگ) دەچون. (کلێسای بیت لحم)، کە لەنوێ دروستکرابوو جێگای سێ هەزار کەس دەبوۆوەو بەزمانی چیکی، کە زمانی عەوامەکەبوو، ئامۆژگارییەکانی دەخوێندەوە، بەلام لەکلێساکانی دیکەدا بۆ خەلکە دەولەمەندەکە بەزمانی ئەلمانی وتار دەخوێندرایەوە. ناوبانگی بلاوبوەوەو لەوکاتەشدا نەیدەزانی ئەو ناوبانگە چ بەلاو نەهامەتییەکی بۆ حەشارداوە. (یان هوس) چیدەوت؟ دەیگوت دەبێت بۆ ریشەو بنەمای کریستیانی بگەڕێینەوەو سروتی (میس) لەسەر شێوەی رەسەنی خۆی جێبەجێ بکرێت. دەیگوت دەبێت کاسۆلیکێکی راستەقینە لەسروتی بەکۆمەلدا (میس) وەك ئەوەی (مەسیح) لەدوا دانیشتنی نانخواردنیدا جولاوەتەوە، بەدوو جۆر بجولێنەوە؛ بەو واتایەی هەموو کریستیانەکان مافی ئەوەیان هەیە بەشداری دابەشکردنی جەستەو خوێن بکەن، چونکە لەو شەوەدا (عیسا) بەوجۆرە فەرمانیداوە. کاسۆلیکی راست دەبێت نان بخواتو شەراب بنۆشێت. هەمان ئەوکارە بکات، کە قەشە لەو سروتەدا بۆخۆی ئەنجامی دەدات.

بەلام زنجیرەی پلەداری کاسۆلیکی لەسەر ئەو بڕوایە نەبوو. بەرپرسانی کلێسا دەیانگوت: ئەم کەشیشە مەبەستی چییە؟ دەیەوێت نەریتی (میس) بگۆڕێت؟! باشە لەوکاتەدا دەسەلاتی (پاپا) چی لێدێت؟ باشە لەبنەڕەتدا ئەم قەشەیە بۆچی بیروڕاکانی خۆی لای خۆی ناپارێزێ؟ لەگۆشەو کەنارێکی پەرستگاکەیدا دەستناداتە پاڕانەوەو نزا؟... بەلام نەخێر، خەلکی (پراگ) (یان هوس) یان دەپەرست!. وردەوردە بەدروستکردنی دەردەسەری هۆکاری سەغلەت کردنیان فەراهەم کرد. پلەدارانی کلێسا بانگهێشتیان کرد تا ئاگاداری بکەنەوە. داواکارییەکانیان یاداشتکرد، بەلام کاریگەری نەبوو. بەپێچەوانەوە بڕواو باوەڕی ئازادانەی خۆی توندوتۆلترکرد. لەماوەی چەند سالێکدا لەکۆمەلگەی (چیك)دا هێندە خۆشەویستبوو، کە داواکرا بۆ دادگاییکردنو لێکۆلینەوەیەکی وردا. دادگاییکراو سەرئەنجام دوو رێگایان لەبەردەم دانا، یان لەبەردەم رای گشتیو بەئاشکرا بیرۆکەو ئەندێشەکانی رەتبکاتەوەو نکولیان لێبکات یان بەمەرگ مەحکوم دەبێت. لەراستیدا بەبیری کەسدا نەدەهات بەئاگر بیسوتێنن، بەلکو ئومێدی هەموان ئەوەبوو بۆ رزگاریکردنی گیانی پەشیمان ببێتەوە، بەلام ئەو بەپێچەوانەوە جولایەوە، لەڕاستیدا هەلبژاردنەکەی سادەبوو. (یان هوس) پێیباشتر بوو لەپێناوی بیروڕاکانیدا خۆی رادەستی مەرگ بدات.

- (تیۆ) بەهێدی وتی: زۆر دژوارو نائاساییە!

- ئەو کارەسەختەی کردو لەئاگردا سوتا، بەڵام دەمودەست خەڵکی (چیك) دژ بەکڵێسای یاخیبونو هەڵگەڕانەوەی فراوان و گەورەو بەهێزبوو. پەیڕەوانو لایەنگرانی نەیاندەویست دەست لەبیروڕاکانی هەڵگرن. ئەو (کاسەیەی) باوەڕداران خوێنی مەسیحیان تێدا هەڵدەقوڕاندبوو بۆ سیمبولو ڕەواڵەتی یاخیبون گۆڕا. (هۆستییەکان) یان لایەنگرانی (یان هوس) سوپاو سەربازیان گردکردەوەو بەناوی (کاسە)کەیانەوە کەوتنە شەڕکردن. بەوجۆرە ئاینی (هۆسیت) لەسەربنچینەی جێبەجێکردنی کۆمۆنیۆنی (میس) لەسەرشێوەی جمکی (نان)و (شەراب) دروستبوو. (هۆسیت)ەکان، کە لەلایەون کڵێسا و کۆمەڵی ڕۆحانییەوە بەدەرنرابون سروتی ئاینەکەی خۆیانِ لەناو دارستان، بیابانو لەکەشی ئازادا بەرپادەکرد. بەم کارە قەدەغەکراوە یەکەم تۆوی (ریفۆرمی ئاینی) تۆوکراو پاشان بەهۆی (مارتن لۆتەر)ەوە بەفەرمی لەجیهانی کریستیانیدا سەوزبوو.

- لەم نێوەندەشدا پاڵەوانێك دەرکەوت؛ نەجیبزادەی تایبەت بەجەنگو شەڕ، ڕاوچییەکی پێشوی پاشا بەناوی (یان زیزکا)، کە فەرماندەیی جەنگی پیرۆزی بەناوی (کاسەی برایانی زیزکا) لەئەستۆگرتو شاری پیرۆزی (هۆستیەکان)ی بەناوی (تابور) پێکهێنا. ئیدی (بوەهم) لەبەرامبەر کڵێسای (ڕۆم)دا بەکافرکرابوو!. بۆ لەناوبردنی یاخیبون (پاپا) فەرمانی جەنگێکی خاچپەرستانەی دەرکرد، کە دوچاری شکست هات. جەنگی دووەمیش ناکام بوو. لەجەنگی خاچپەرستانی سێیەمدا خاچپەرستەکان بێبەزەییانە (هۆستیەکان)یان ڕەشەکوژکرد. لەو سەردەمە خوێناوییە بەدواوە (یان هوس) بوە روخساری ئازادی (چیك). نەك هەر بۆ نانو شەراب، بەڵکو چونکە خاوەنی ئەو جوامێرییەبوو تا لەپێناو بیروڕاکانیدا پێشوازی لەمەرگ بکات. پێنج سەدە دوای ئەو ڕوداوە لەدەوروبەری سەدەی بیستەمدا، لەوکاتەدا کە خاکی (چیکۆسلۆڤاکیا) لەژێر نیلی ئیمپراتۆری سۆڤییەتدا دەیناڵاند، لاوێکی (چیکی) لاسایی (یان هوس)ی کردەوەو بەنزینی بەخۆیداکردو خۆی سوتاند. (یان هوس) لەپێناو بیرباوەڕو ئامانجەکانیدا بەناوی ئەو ئازادییەی لەکۆمەڵانی خەڵکی (چیك) دزرابوو، لەنێو کڵپەی ئاگردا بسوتێتو سوتاش!

- (تیۆ) پرسی: ئایا ئەویش پەیکەری هەیە؟

- (ریڤکله) بێدەنگییەکەی خۆی دڕیو گوتی: جێگای خۆی هەیە. ئەگەر ئارەزوو بکەیت دەتوانیت لەو شوێنەی خۆی تێدا سوتاند تاجە گوڵێنەیەك دابنێیت. ئەوەش نەریتێکە من

زۆرجــار ئــەنجامی دەدەم. یەکــەمجاربوو چــاوەکانی (ریڤکلــە)، کــە لــەزەوی بڕیبــونی، دەدرەوشایەوە.

- پورە (مارتا) وتی: لەوسەردەمەدا دایكو باوکت دوچاری ئازارو نەهامەتییەکی گران هاتن. بە هۆی سیاسەتەوە لەکارەکەیان بێبەشکرانو لەهەژاریو نەداریـدا ژیان. لەوکاتـەدا تـۆ هێـشتا منالبویت.

- کـچە لاوەکـە بەراگەیانـدنێکی بـڕوا بەخۆبونـەوە وتـی: ئـەوەی ئـەوان بـەمنیان راگەیانـد ئەنجامدا. کتێبەکانم خوێندەوەو پەنام بۆ بەردەروازەی خودی جاویـدان بـرد تـا لەکۆیلایـەتی رزگارمان بکات. ئەمڕۆ ئێمە ئازادین.

- (تیۆ) وتی: دەزانیت کاتێك چاوەڕەشەکانت بەدەردەکەون شیرینتری؟

- (ریڤکلە) وەلامیدایەوە: دیارە دەزانم، بەلام من زۆر شەرمنم. زۆرجاریش بێدەنگ دەبم.

## جۆنی قژ زەردو جۆنی قژ خورمایی

- دروست لەوکاتـەدا، کـە(ریڤکلـە) دەدوا دوو لاو بەبۆینباخـەوە بـەرەو چاپیخانەکە هـاتنو لەپشت مێزێکەوە رۆنیشتن و بەوردیو رێکوپێکییەوە هەندێك (بلاوکراوە)یان لەسـەر مێزەکـە داناو چاوەنواڕبون.

- (تیۆ) وتی: دەچم بزانم چی دەفرۆشن. (ریڤکلە) تۆش دێیت؟

دوو کوریژگەکە هیچیان نەدەفرۆشـت. بـەزمانێکی (چـیك)ی شەقوشـڕ دەدوانو ئـەو کەسـەی دلگەرمی بیروباوەڕەکەیان بوایـە بلاوکراوەیـەکیان پێـدەدا. (ریڤکلـە) چـەند پرسـیارێکی کـردو زۆر بەراسـتی وەلامیاندایـەوە؛ ئـەویش بـۆ (تیـۆ)ی وەرگێـڕا: ئەمانـە (مۆرمـۆن)نو ئـەرکیان بانگەشەکردنە بۆ بیروباوەڕەکەیان.

- (تیـۆ) بەسەرسـوڕمانەوە وتـی: پـورە (مارتـا)، مۆرمۆنـەکان! تێگەیـشتی. مۆرمۆنـەکان لەپراگ!.

- پورە (مارتا) بەبێئەوەی لەسەر کورسییەکە بجولێت وتی: ئەی بۆچی نابێـت مۆرمۆنـەکان لە پراگ بن؟ سود لەو هەلە وەرگرە تا باشتر لێیان تێبگەیت، من چاودێری (ئارتۆر) دەکەم.

- (تیـۆ) بەیارمـەتی (ریڤکلـە) لەگـەل دوو لاوەکـەدا کەوتـە گفتوگـۆ. هـەردوکیان ناویـان (جۆن)بوو. (جۆن)ی یەکەم قژی زەردو ئەویدیان قژی خورمایی بـوو. خزمـی یەکـدی نـەبونو هـەردوکیان لەشـاری (سـالت لـەیك سـتی)ی ئـەمریکاوە هـاتبون، کەشـاری پـیرۆزی هـەموو

مۆرمۆنـەکانی جیهانـە. (بریـام یـانگ)ی جێنـشینی (جۆزیـف سمـیس)ی دامەزرێنـەری ئـاینی مۆرمۆنەکان، پاش ئەو داستانی پڕ لـەرەنجو هـەوڵو تەقـەلای ئـەو شـوێنەی شـارەکەی لەسـەر دروستکرا ناونا (شوێنی دروست).

- (تیۆ) پرسی: داستانی چی؟

- پـاش پارچەپارچـەکردنی (جۆزیـف سمـیس) ئەنجومـەنی (کڵێـسای نـوێ) لەشـوێنێکی دور لەئەشـکەنجەدانی خـۆی جێگایـەك دیـاری بکـات. سـاڵو نیـوێکی خایانـد تـا مۆرمۆنـەکان لەهەلومەرجێکی ترسناکدا دوو هەزار کیلۆمەتریان بڕیو سەرئەنجام کاتێك گەیشتنە چیاکانی (بەردین) لەناو بیاباندا دەریاچەیەکیان دۆزییەوە. ئاوی دەریاچەکە سوێر بوو، لەبەرئـەوە ئـەو شارەی لەوێدا دروستیان کرد ناویان لێنا (سالت لـەیك سـتی –شـاری دەریاچـەی سـوێر). ئـەمڕۆ شـاری مۆرمۆنـەکان شـارێکی گەشـەکردو پـڕ رەونەقـەو لـەڕوی ئابوریـیەوە پێـشکەوتوە. دامەزراندنی ماڵی خوا پێویستی بەهۆشیارییەکی زۆربوو بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە.

- (تیۆ)بە (ریڤکله)ی وت: لێیان بپرسە لـە (پـراگ) چیدەکەن؟. (ریڤکلـە) رونکردنـەوەکانی وەرگێڕا.

- وەك هەر خێزانێکی بـاوەڕدار باوانیـان بڕیاریانـداوە بـۆ مـاوەی یـەك سـاڵ کـوڕی گـەورەی خێزانەکە بـۆ ئـەرك جێبـەجێکردن رەوانـە بکـەنو ئـەوەش دەسـتورێکی پیـادەکراوە. هەڵبـەتـە ئەوانە دەتوانن ئەرکەکە پەسەندنەکەن. سەرەتا رازینەبون، بەڵام چونکە خێزانەکـەیان هێنـدە سەغڵەت بون بـەو بڕیـارە ناچـار ملیـان بـۆ ئـەو ئەرکـە داوەو پـاش پەسـەندکردنەکە (کڵێـسای عیسای مەسیحو قەدیسەکانی دوایـن رۆژەکـان) (کڵێـسای مۆرمۆنـەکان) بڕیـاری لەسـەر شـوێنی ئەرکەکـەیان داوە. دیـارە پـاش ئـەوە بـەوردی لاوەکانیـان بـۆ ئـەوکارە ئامـادەکردوە. ئیـدی راپەڕاندنی بەرزی کارەکە لەئەستۆی ئەمانەدایە تـا بـەپێی (کتـێبی مۆرمۆنـەکان)بەشـێوەیەکی شایستە پرۆپاگەندە بۆ پرنسیبەکانی ئیمانەکەیان بکەن. کۆمەکی خەڵکی بکەنو بەشـێوەیەکی ئاسایی کارو ئەرکی وەك (مسیۆنێر - موژدەدەر)ـە ئاینییەکان ئەنجام بدەن.

- (تیۆ)، کە زۆر دوچاری خرۆشاوی ببوو، گوتی: بڵێ لەسروتە ئاینییەکەیاندا چیدەکەن؟

- (جۆنی) موزەرد وتـی: بـۆ ئاشـنابون بـەو سـروتانە دەبێـت خـۆت لەناوماندا ئامادە بیـت. هەرچۆنێك بێت ئێمە لەکڵێسای خۆماندا (خاچ)مان نییە، چونکە (مەسیح) لەناوماندا زیندوە.

- (جـۆنی) ڤـژ خورمـایی وتـی: دەتـوانین رێـساکانی ژیـانی خۆمـان بـۆ ئێـوە رونبکەینـەوەو لەهیچ شتێکدا زیادەڕۆیی ناکەین. ئەمەی دەخۆینـەوە نـەقاوەو نـەمادەی سـرکەر بـەکاردێنینو

نەجگەرە دەکێشین. پیاوی ئاینی (رۆحانییەت)مان نییەو یەکسانی تەواو لەنێوانماندا هەیە. هەموو منالێکی دوانزە سالانە دەتوانێت بەشداری سروتی ئاینی بکات. ژیانمان بەقەناعەتو سادەیی تێدەپەڕێت، هەر وەك خێڵە ئیسرائیلییەکانی سەرتا.

- (جۆنی) موو زەرد بۆ تەواوکردنی وتەکانی وتی: چونکە بەپێی نوسراوەکانی کتێبەکەمان، ئێمە خێڵی بزربوی (ئیسرائیل)ین، کە لەئەمریکای باکور خۆمان دۆزیوەتەوە. پاش چوار سەدە لەهەستانەوە (عیسا)ی مەسیح بۆ سەردانی باوانەکانمان هاتووە لەبەرەکەتی ئەوەوە دەزانین ئەوکارەی خواوەند بەسەر کوڕەکەی خۆیدا هێنا بۆ هەمومانی دەکاتو بەڵێنی هەستانەوە بەهەمومان دراوە.

- (جۆنی) قژزەرد وتی: لەبەرئەوە ئێمە خاوەنی ئەرکێکی پیرۆزین تا رۆحی مردوەکانی سەرانسەری جیهان دوبارە (غوسڵ) بکەینەوەو دەمانەوێت هەموو ئەو رۆحانە بهێنینەوە مالی (مەلەکوتی) خواوەندەوە تا هەستانەوەیان ئاسانو سادە بێت.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: لەسەرەتای کاتەوە؟ شتی لەوجۆرە محالە.

- محاڵ نییە. ئێمە لەشارەکەی خۆماندا (رەگەزناسی جیهان)مان لەسەر کۆمپیوتەر هەیە. هەڵبەتە ئەوکارە چەند دەیەیەکی دەوێت، بەلام بەهۆی کۆمەکی ژمارى بێشوماری مۆرمۆنەکانی کۆمەڵگاکەمانەوە پێشکەوتنی بەرچاومان بەدەستهێناوە. خێزان دوای خێزان رابردوو نوێژەن دەکەینەوەو باوانە بزرەکان دەدۆزینەوە، ئینجا رۆحیان (غوسڵ) دەکەینەوە.

- (جۆنی) قژ خورمایی وتی: بەوجۆرەش جیهان رزگاردەکەین، ئایدیالەکەمان سادەو بێڕتوشە!

- (ریڤکلە) کە چاوی لەو دوو لاوە بڕیبوو گوتی: ئایا راستە کە سیستمی فرە هاوسەریتان هەیە؟

- (جۆنی) قژخورمایی وتی: نەخێر. فرە هاوسەری لەویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا قەدەغەیەو ئێمەش هاولاتی باشو گوێڕایەڵین. بەلام وانەزانی بنەمای ئاینەکەمان پارێزگاریکردنی لەژنانیان بەئەرکێك داناوە. ئەوەش راستە.

- (تیۆ) بەئاوازێکی زبرو توندەوە وتی: باشە، دواجار بەڵێ یان نەخێر. (ریڤکلە) چیدەڵێت؟

- ئینجا (جۆنی) موزەرد وتی: وەلامی کۆتایی ئەو پرسیارە (نەخێرە). کاتێك هەمومان لەباری خودایی (بون)داین ئەم بابەتە چ گرنگییەکی دەبێت. مەسیحەکەی ئێمە مەسیحی

ئازاری پیرۆز) نییە، بەڵکو مەسیحی هەستانەوەو دوبارە گەڕانەوە بۆ ژیانە. ببینە چۆن تیشك دەداویێت!

- (تیۆ) کە لەوێنەکەی مەسیحی دەنواڕی وتی: دەڵێی قارەمانێکی زنجیرەی فیلمێکی ئەمریکییە. زنجیرەی (مەسیح لە مالیبۆ).

- (ریڤکلە) بەگوێچکەیدا چرپاندی: بەئەدەب بە! ئەوە وەرناگێڕم.

- کەواتە بپرسە ژیان بۆ ئەمان دور لەشارو لەو ئەرکەیاندا پڕ لەزەحمەتو گران نییە؟

- (جۆنی) قژ خورمایی رایگەیاند: کە زۆرخۆشحاڵە بەپڕوپاگەندە کردن لەئەوروپای ناوەڕاستو (جۆنی) موو زەردیش هەمان رای هەبوو، بەڵام نەك بەو ورەیەوە. هەندێك جار هەڵدەکەویێت ئەو لاوانەی بۆ موژدەدەری دەچن لەناو بچن یان شەکەتو وره روخاو بۆ ماڵ بگەڕێنەوە. بەڵام (جۆن)ی ژمارە یەكو دوو چانسیان هەبوو، چونکە لاوەکانی دیکە بۆ گوندە هەژارەکانی ئەمریکای لاتین نێرابون، لەکاتێکدا ئەم دوانە لەم وەرزە خۆشەدا بۆ (پراگ).

- (تیۆ) وتی: پرسیارێکم هەیە. بۆچی تەنها کوڕەکان دەتوانن لەتەمەنی دوانزەساڵیدا بەشداری سروتی ئاینی بکەنو کچان باسیان لەو بابەتەدا نییە؟

- هەردوو (جۆن)ـە وەك بەردی بنگۆم متەقیان لێبڕا، چونکە (کلێسای عیسا — مەسیحە پیرۆزەکانی دواڕۆژ) هێندە دەربارەی ژنان نەدەدوا!

## روەك، درەختی خورماکان، قۆچو تاجەکان

رۆژی دواتر چون بۆ سەردانی (گتۆ)ی (پراگ)، (ریڤکلە) دەیویست بەهەرنرخێك بوە دیدارەکەیان لەکەنیسە کۆنەکەوە دەستپێبکەن. (تیۆ) رازی نەبوو سەردانی مۆزەخانە بکات.

- پورە (مارتا) پشتی (ریڤکلە)ی گرتو بە (تیۆ)ی وت: ئەو راستدەکات. لەمۆزەخانەکە شتە پیرۆزکراوەکان دەبینیت، کەهیچیان دەربارە نازانیت.

(تیۆ) لەناو جامخانەکاندا تاجی شکۆداری بینی، کە شێری ئاڵتونی بەسەریانەوە بوو. پەردەی مەخمەڵی رەنگاوڕەنگ، چراکان، مۆمدانەکان، لولەی سەیروسەمەرە، قۆچی ئاژەڵانی نەخشێنراو، کۆمەڵێك گۆچانی درێژی نەرم، کە وێنەی پەنجەیەکی روو لەئاسمانی لەسەر بوو. دەبێت باسی کاسەی شەرابو دەفری بچوکی تایبەتی (هۆستی — نانی فەتیرەی تایبەت)ی کریستیانەکان بکرێت. بەڵام (تیۆ) سەری لەوەسوڕمابوو، کە ئەم کەلوپەلە تایبەتیانەی کریستیانەکان لەکەنیسەیەکی جولەکەدا چیدەکات؟

- (ریڤکلە) رونیکردەوە، کە جێدەستی گۆچانە درێژەکان ئاماژەیە بۆ دەقە پیرۆزە عیبرییەکانو پەنجەی ئامازە وشەو سمبولی پیشاندەدات. لولەکان، کە بە(مومزە - Mezouzah) ناودەبرێت لەدەرەوەی مالّی جولەکەکان دادەنرانو لەکاتی هاتوچۆدا دەستیان لێدەدرا، چونکە لەناو لولەکاندا تەوراتێکی بچوك جێگای بۆ کرابۆوە. پەردەکان بەرامبەر میحرابەکان دادەنران تاتەوراتەکان لەبەرچاودا نەبن. ئەوانە پێنج کتێبی یەکەم (پەیمانی کۆن Bible) بونو تەنها لەسروتو ئاهەنگە گەورەکاندا دەردەهێنران. مۆمدانەکان...

- (تیۆ) وتی: بەڵێ، مۆمدانە حەوت پەلەکان دەزانم.

- بەلاّم هێشتا کەس نازانێت حەوت پەلی مۆمدانەکان لەکوێوە هاتون. (پەیمانی کۆن) باس لەو مۆمدانە ناکات. ئەو شێوەیە بۆ یەکەمجار لەوێنەیەکی بەرجەستەی سەردەمی ئیمپراتۆری (رۆم)دا بینراوە، کە لەکاتی هێرشو پەلاماری سەر (ئۆرشەلیم) دەستی بەسەرداگیراوەو لەوێ پیشاندراوە. ئایا مۆمدانەکە هی پەرستگا وێرانبوەکەبوە؟ بێگومان بردنی ئەو مۆمدانە بۆ ئیمپراتۆر نیشانەی شکستی گەلی جولەکەبوو. سەیرە! لەگەلّ لێڵیو بزری سەرچاوەکەی ئەو مۆمدانە بە (مینۆرا - menorah) ناودەبرێتو لەگەلّ (ئەستێرەی داود)دا بەسمبولی زیندوێتی (جودایزم) دانراوە. بەلاّم چراکانی تایبەت بە (جەژنی روناکی) یان (هنوخە - Hanoukha)یە یادەوەری دوبارە نوێژەنکردنەوەی شوێنی پەرستگاکەیە پاش شەڕی دژ بەرۆمییەکان.

- (تیۆ) پرسی: ئەو شتە چییە دەڵێی ئەناناسەو لە هەموو شوێنێك هەیە؟ بۆ نمونە لەسەر تاجەکانو مەخمەڵەکان...

- (ریڤکلە) رونیکردەوە: ئەوە ئەناناس نییەو لیمۆیەکی گەورەیە. (ریڤکلە) لەنێوان نەخشو نیگارو هەلّکۆڵینەکاندا لقی مۆزیك، لقی دارخورما، لقی درەختی بی پیشانی (تیۆ) داو رایگەیاند، کە روەك، دارخورما، بیو مۆز لەوشتانەبون لەجەژنی ئاینیو (کولّبە)، کە بەعیبری پێیدەڵێن (سوخوت - Soukhot) بەکارهێنراون. هۆی ئەو ناولێنانەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە گەلی جولەکە پاش دەرچونیان لە (میسر) بیابانێکی دوورودرێژیان بڕی تابەخاکی بەلێنپێدراو گەیشتنو ئینجا بەو یادەوە جەژنی (کولبە)یان سازکردوە، کە لەژێر لقوپۆپی گەلاّو درەختەکاندا پشویانداوە یان بەوانە شوێنی حەسانەوەیان سازکردوە.

- (تیۆ) وتی: ئەی قۆچەکان چین؟ یادەوەری قوربانییەکانن؟

- ئەوانە یادەوەری ئاژەڵێکە لەدواین ساتدا بووبەجێنشینی (ئیسحاق)، کە بڕیاربوو لەلایەن (ئەبراهام)ەوە بکرێتە قوربانی. ئەو قۆچە ناسراوە بە (شوفار- Schofar) زوڕنایەکی پیرۆزە

بەدەنگێکی ترسناكو نەڕەئامێزەوە، کە وەك دەنکی (ئەدۆنەئەلودهیم) دەنـگ دەداتـەوە. بـەڵام تـاجی پاشـایانە بـەهۆی ئـاڵتونو زیـوەوە لـەناو ورشـەیەکی شـکۆدارو شـانازیدا تەوراتـەکان دەپارێزێت.

- کەواتـە لـەناو جولەکـەدا جـەژنی جۆراوجـۆر هەیـە، جـەژنی کلبـە، جـەژنی رونـاکی، ئایـا جەژنی دیکەش هەیە؟

- بـەڵێ، جـەژنی شـادی (پـوریم - Pourim)ـە، کـە یـادەوەری روداوی (سـتر)ی قەشـەنگی هاوسەری (سویرۆس)ی پاشایەکی کافرە، کە بەئاشـکراکردنی شوناسـەکەی گەلەکـەی رزگـارکرد. لـەم رۆژەدا جولەکـەکان پۆشـاکی جۆراوجـۆر دەپۆشـنو گـۆرانی دەڵـێن، کارنـەڤالێکی راستەقینەیە!. جەژنێکی دیکە جەژنی ساڵی نوێیە لەکۆتایی وەرزی هاوین کـەپیرۆزبایی سـاڵی نوێ لەیەکدی دەکەن، وەك یەکـەمی جـەنیوەری لەئـەوروپا. هەشـت رۆژی دوای جـەژنی سـاڵی نوێ بەرزڕاگرتنی (بەخشینی مەزن – رۆژی کیپۆر) دێت، کە جەژنێکی دڵتەنگەو ئامانجەکـەی پاککردنـەوەی گوناهـەکانی سـاڵی رابـردوە. لـەم رۆژەدا جولەکـەکان داوای بەخـشینو لێبـوردن لەخواوەند دەکەنو بۆ مردوەکانیان دەپاڕێنەوە.

- پورە (مارتا) وتـی: دەمێنێتـەوە جـەژنێکی دیکـەو ئـەو جەژنـە دەناسـیت. (تیـۆ) تەنانـەت پێش گەیشتن بە (ئۆرشەلیم) باسی ئەو جەژنەت کردبوو.

- (تیۆ) بیریکردەوە: پێش گەیشتن بە ئۆرشەلیم؟ کاتێکی زۆر بەسەرچوە!... پەلەمەکە! ئایا مەبەستت جەژنی (پاك) نییە؟

- پـورە (مارتـا) راسـتیکردەوە: جەژنـەکانی (پـاك)!. بـەعیبری جـەژنی (پـسح - Pessah)ی پێدەڵێن، کەنابێت لەگەڵ جەژنی هەستانەوەی مەسیح تێکەڵ بکرێت، لەیادتە؟

- (تیۆ) وتی: تاڕادەیەك. لەلای جولەکەکان (عیسا) مەسیحی دوبـارە گـەڕاوە بـۆ ژیـان نییـە. ئەو جەژنە لەلای جولەکەکان یادی شەوی دەرچونیانە لە (میسر)، کە لەو نانە خۆشـە دەخـۆن باوکم بۆ مانی دەهێنایەوە. بەڵام کام یەك لەو جەژنانە لەهەمویان گرنگترە؟

- (ریڤکلە) وەڵامیدایەوە: جەژنی (پـسح). لـەلای جولەکـە هـیچ شـتێك لـەکۆتایی سـەردەمی کۆیلایەتیان لەمیسر گرنگتر نییە. دەبێت تـامی نەهامـەتیو زەبـرو زەنـگ بـچێژرێت تاهەسـت بەگرنگی رەهایی بکرێت.

## گۆڕی مهاراڵ

بۆچوونەناو تخوبی گۆڕستانە کۆنەکەی جولەکەکانەوە (ریڤکلە) ساتێکی گونجاوی هەڵبژاردبوو: پاسی گەشتیارەکان خەریکی بەجێهێشتنی شوێنەکەبوو، خۆر روو لەئاوابون بوو. لەژێر سایەی لق و پۆپی بێکۆتایی درەختەکان و لەناو نارێکوپێکییەکی تەواودا هەزاران کێلی گۆڕی راستو هەندێك خوارو گرووپێك کەوتوو زۆریش شکاو دەبینرا.

- (تیۆ) بەسەراسیمەبونەوە وتی: ئەمە گۆڕستانە؟ بەم هەموو نارێکوپێکیو پەرشوبلاوییەوە؟

- (ریڤکلە) وتی: (تیۆ) ئەمە بەرێزترین گۆڕستانی جولەکەکانە. لەسەدەی سیانزە بۆ چواردە پانزەهەزار جوو لەم تخوبەدا نێژراون. لەژێر بەردی هەریەك لەم گۆڕانە بۆ قولایی چەند چینێك مردوو لەسەر یەك کەڵەکە کراون.

- بۆچی شوێنێکی بەرفراوانتریان بۆ گۆڕستان هەڵنەبژارد؟

- پورە (مارتا) بەشداریکردو گوتی: بڕیارەکانی (گتۆ) بەوجۆرە بوو. جولەکەکان چ زیندوو چ مردوو لەبورای (گتۆ)دا ماونەتەوە.

(تیۆ) بەبێدەنگی بەناو گۆڕو باریکەرێگاکاندا دەهاتو دەچوو سەرقاڵی سەیرکردنیان بوو. روناکی خۆر تەنها سەر گۆڕەکانی دەگرتەوەو سەوزایی چیمەنەکانی بەلای زەردا دەیانڕوانی. رێچکەی نێوان گۆڕەکان پڕبوو لەپەل و لقی درەختی وشكو پۆل پۆل قەلاوغو قەلەڕەش سەریان لەو ناوچە فەرامۆشکراوەدەدا. لەگەڵ بونی رەنگی ئاڵتونی پایز گۆڕستانی جولەکەکان هەناسەی ئارامیو ئاشتی نەدەدا. (تیۆ) بەپەژارەوە بەنێو گۆڕەکاندا رادەبوردو بەلاچاوێکەوە ئەو ناوانەی دەخوێندەوە لەسەر بەردەکان هەڵکۆڵرابون.

- (ریڤکلە) بانگیکرد: (تیۆ) راوەستە. ئەوە گۆڕی (مهاراڵ - Moharal)ـە؛ (رابی یەهودا لیڤابێن بێتسال)ی ناسراو بە(شێر).

- (تیۆ)، کە لەدوو کەوانی کۆڕەکەی دەنواڕی وتی: چەند جوانە! زۆریش خاوێنە. ئای! شێر لەچوارگۆشەیەکی سەرەوەی بەردەکەدا هەڵکۆڵراوە...

- (ریڤکلە) وتی: روەك لەپێنتی سەرەوە! لەبەشی خوارەوەی بەردەکە خۆشاوی ترێ، کە بەرەواڵەتی باوەڕەکەیەتی ... ئایا نییەتت خستە دڵی خۆتەوە؟

- (تیۆ) لەکاتێکدا پارچە کاغەزێکی لەگیرفانی دەردەهێنا وتی: دەبێت لەکوێی رۆبکەم؟

- لەژێر شێرەکەو لەپاڵ کاغەزەکانی دیکەدا بەردێك هەڵگرەو لەژێری رۆکە. ئێستا بەردەکە راموسەو بپارێوە. بەوجۆرە (مهاراڵ)وەڵامی خواستەکەت دەداتەوە.

- (تیۆ) بەدەنگی بەرز وتی: وەك دەبینم ئەم (حاخام)ـە بەتەنها خۆی (دیوارێکی نەدەبەیە)؟ ئایا لەبەرئەوەیە (گۆلێم)ی دروستکردوە؟

- بێگومان. لەسەر ئەو گسکە رۆنیشە. هێشتا کەمێکی ماوە بۆ خۆرئاوابون. باسی (گۆلێم)ت بۆ دەکەم.

کاتێك ئەو دوانە دوور کەوتنەوە پورە (مارتا)بەدزییەوە پارچە کاغەزێکی لەژێر بەردێك رۆکرد.

- (ریڤکلە) بەدەنگێکی شیرین و نەرمونیان دەستیکرد بەگێڕانەوەی ئەفسانەکەو گوتی: (مهاراڵ) نەناوی (گۆلێم)ی داهێناوەو نەرازی دروستکردنی. بەپێی نوسراوی (تلمود) (گۆلێم) ناوێکە لەشتە نیوەکان دەنرا، وەك گۆزەیەکی نیوەناچڵ، یان ژنێکی وەجاخ کوێر. (ئادەم) پێشئەوەی هەناسەی خواوەند بەجەستەیدا بگەڕێ خۆی (گۆلێم)بوو. ئینجا زانایەکی ئاینی فێربوو چۆن لاسایی خواوەند بکاتەوە. لەساڵی (١٨٥٠)دا کاتێك (مهاراڵ) تێگەیشت دەبێت بۆ پاراستنی جوەکانی (گتۆ) لەدەست ئازاری خەڵکی (پراگ) رێگاچارەیەك بدۆزێتەوە برپاریدا گیان بەبەر (گۆلێم)دا بکات. سەرەتا خۆی پاکژکردەوەو بەرگێکی سپی پۆش و دوایی بەرێکەوتن لەگەڵ زاواکەی و یەکێك لەموریدەکانی شەو بۆ کەنار روبارەکە رۆشت و برێکی زۆر قوڕی گرتەوە. دەبوو پاشئەوەی پەیکەرەکەی لەقوڕ دروستکرد سەدو شەستو دوو جار بەخوێندنی وشە پیرۆزەکانەوە بەدەوریدا بسوڕێتەوە. هەروەها (مهاراڵ) کاغەزێکی بەهەمان ئەو وشانەوە تۆمارکردبوو لەناو زاری پەیکەرەکەی رۆکرد. لەو کاتەدا پەیکەرە پیرۆزکراوەکە کەوتبوە جوڵە. (مهاراڵ) ناوی لێنا (یۆسلە Yosele). پەیکەرەکە قسەی نەدەکردو تەنها فەرمانی جێبەجێ دەکرد. چونکە (یۆسلە- گۆلێم) زۆر گەورە بوو ترسی لەدڵی بینەردا دروستدەکرد. هەرئەوەش بوو (گتۆ) چاوەڕوانی دەکرد. کاتێك شەو داهات (مهاراڵ) نوسراوە پیرۆزەکەی لەزاری دەردەهێناو ئیدی تا سپێدە جوڵەی نەدەکرد.

- (تیۆ) وتی: ئەوەی لەسەر ئەم کاغەزە نوسرابوو بیڵێرەوە.

- (ریڤکلە) وتی: وشەی عیبری لەسەر تۆمارکرابوو، کە واتاکەی (راستیە)، بەڵام ئەگەر یەکەم پیتی لابدرێت واتای (مەرگ) دەگەیەنێت. ئینجا بەردەوامبوو.

- کاتێك (پرڵ)ی ژنی (مهاراڵ) (گۆلێم)ی لەگەڵ خۆی بۆ بازاڕ دەبرد دۆخەکە روی لەشلەژان دەکرد. (گۆلێم) زۆر بەهێزو مهرەبان بوو! بەلام هیچ تێنەدەگەیشت. رۆژێك داوای لێکرد زەرفە سێوەکەی بۆ هەلگرێت، لەوکاتەدا (پرڵ) خەریکی پێدانی نرخی شتەکان بوو (گۆلێم) ژنەی فرۆشیاری بەزدرفەسێوەکەوە هەلگرتو خستییە سەرشانیو ترس و تۆقاندنی لەبازاڕدا دروستکرد. خزمەتکارییەکەی (گۆلێم) بۆ (پرڵ) ببوە دەردەسەری تا شەوێکیان (مهاراڵ) لەسوێر قسەیی ژنەکەی وڕو کاس ببوو لەیادی چوو پارچە کاغەزەکە لەزاری (گۆلێم) دەربکات. ئیدی (یۆسلە گۆلێم) بەدرێژایی ئەو شەوە لەناو کوچەو کۆلانەکانی (گتۆ)دا هاتوچۆی دەکردو هەرچی هاتە بەردەمی پانی کردەوە. دەبوو هەرچی زوە تێکیبشکێنن، بەلام بەبێئەنجامەدانی هەڵە، چونکە ئەگەر پرۆسەی تێکدانەوەی وەك دروستکرنەکەی نەبێت دوچاری دەردەسەری گەورە دەبن. وەك (بەعل – شم - توو)، کە دەڵێم بەساویلکانە داوای لێکردوە سەردانەوێنێت تا پارچە کاغەزەکە لەزاری دەردێنێت.

- (تیۆ) هاواریکرد: ئای، هەمان ئاشنایی کۆن! بەمنیان نەوتوە کە (بەعل – شم – توو)ش کاری گەمژانە دەکات.

- (گولێم بەعل شم توو) هێندە چەمایەوە تا (رابی) لەژێر قورسایی پەیکەری خۆیدا پان کردەوە. (مهاراڵ) کە بەئاگاتربوو یەك وشەی سەر پارچە کاغەزەکەی رەش کردەوەو ومرەقەکەی هەلگرت و بەپێچەوانەوە بەخوێندنەوەوە سەدو بیستو دووجار سوڕایەوەو کاتەکەی تەواوکرد. ئیدی (گۆلێم) دوبارە بوەوە بەقوڕو گڵی کەنار روبارەکەو لەجێگای یەکەمی خۆی دانیایەوە. یان لەوانەیە (مهاراڵ) لەئەمباری کڵێسەکەدا حەشاری دابێت. چونکە پاش تێکدانەوەی (یوسلە گۆلێم) (مهاراڵ) هەستا بەقەدەغەکردنی چونە ناو ئەمباری کەنیسەکە بۆ هەموو کەس.

- (تیۆ) ئاهێکی کێشاو گوتی: بەداخەوە ئەم روداوە جگە لەئەفسانەیەك شتێکی دیکە نییە. حەزم دەکرد (یۆسلە) ببینم.

- (ریڤکلە)، کە بەپەنجە ئاماژەی بۆ شوێنێك دەکرد بەهەراسەوە وتی: سێبەرێکی گەورە لەپشتی درەختەکەوەیە، لەوێ... (یوسلە گۆلێم)ە... خودی خۆیەتی.

- پورە (مارتا) وتی: (ریڤکلە) ئارامبە. ئێمە لەسەدەی بیستدا دەژین و گۆلێم بونی نییە.

- (ریڤکله)، که کەوتبوه لەرزە، وتی: دەڵێن هەرکاتێك جولەکەکان لەمەترسیدا بن (گۆلێم) دەگەڕێتەوە. دواین جارێکی بینراوە ساڵی (١٩٣٩)بوو، دروست پێش (شۆها - Shoha)[1].

- پورە (مارتا) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: باشە بابڕۆین. بەراست وا شەو دادێتو دنیا تاریکەو تۆچۆن توانیت سێبەرەکەی لەپشت درەختەکانەوە ببینیت؟

- ژنە لاوەکە بەترسو لەرزەوە وتی: خاتون خۆتان بڕوانن، دەجوڵێت!.

- پورە (مارتا)، کەتا رادەیەك بڕوای هێنابوو، گوتی: لەوە دەچێت راست بکەیت.

- (تیۆ) بەپەلە وتی: دەچم بزانم چییە؟

- لەراستیدا لەپشت درەختێکەوە پەیکەرێکی گەورە خۆی شاردبۆوە. پیاوێکی بالآبەرز بەبەرگێکی خاکییەوە... (بروتوس)؟.

- (بروتوس)، کە پەنجەی لەسەر لێوەکانی دانابوو، بەهێواشی وتی: شش! نازانێت من لە(پراگ)م!

- باشە پەلەکە، هیچ ناڵێم خۆت حەشاردە.

(بروتوس) لەسەرخۆ دورکەوتەوەو (تیۆ)ش خاتونەکانی دڵنیاکرد، کە (گۆلێم) لەوێدانەبوو، بەڵکو کابرایەك بوو پاڵتۆکەی لێبەجێماوەو گەڕاوەتەوە بۆی، هەروەها لقێکی گەورەی درەختێکیش کەوتوە.

- پورە (مارتا)و (ریڤکلە) بۆ هێورکردنەوەی خۆیان لەکافیتریایەك روبەروی (تیۆ) دانیشتنو داوای شەکللەمەیان کرد. (تیۆ) لەدوکانێکی کۆنەفرۆش پەیکەرێکی (گۆلێم)و وێنەیەکی (مهاراڵ)ی کڕی. تا وەك دیاری بۆ (رەبی ئالیئەزر)ی بنێرێت لە (ئۆرشەلیم).

## شاژنی شەبات

رۆژێکی هەینیدا (ریڤکلە) بانهێشتی (تیۆ)و پورە (مارتا)ی کرد بۆ سروتی (شەبات)، کە باوك و دایکە پیرەکەی بەسادەیی سازیان دەکرد. ئاپارتمانەکەی خێزانی (ئۆپن هایمەر) زۆر لە(گتۆ)وە نزیکبوو. بەڕێز (ئۆپن هایمەر) مامۆستای پێشوی خانەنشینی زانکۆ، کە زۆر بەتەمەن بوو، لەدەرەوەو لەپاڵ (مزوزایەکی مس) چاوەنواڕبوو. ژنەکەی بەوتنی (شەبات باش) پێشوازی لێکردن. پورە (مارتا) بەوتنەوەی (شەباتت باش) بەڕێز (ئۆپن هایمەر)ی لەئامێز

[1]. مەبەست لە (Shoah) ناماژەیە بۆ جینۆسایدی نازییەکان دژ بەجولەکە لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانی.

گرتو رایموسی. لەراڕەوەکەشدا جارێکی دیکەش (شەبات باشی) دوبارە کردەوە. دەستەکانی خاتوو (روت ئۆپن هایمەر) لەهەویر هەڵکێشابوو، لەگەڵ ئەوەشدا (تیۆ)ی نغرۆی ماچ و پەڵەی هەویرکردو ئینجا بۆ موبەقەکەی برد، کە خەریکی ئیش بوو. (ریڤکلە) سفرەیەکی سپی لەسەر مێزێك پان کردەوەو دوو مۆم، یەك کوپ، دەفرێك، گێلاس و شەرابی لەسەردانا. لەگۆشەیکی ژورەکەدا سۆپایەك دەگرا.

- (ریڤکلە) بەدەنگی بەرز وتی: دایکە، دوادەکەویت، پەلەبکە.

- (روت) لەموبەقەکەوە وتی: دەزانم.. خەریکە دەبرژێن؟ کەسێك بۆ کوژانەوەی ئاگرەکە پەیدابکە!

- (ریڤکلە) وتی: تکادەکەم بکوژێرەوە! دەزانیت ناگرێت ئەو داوایە لەکەس بکرێت.

- بەڕێز (ئۆپن هایمەر) وتی: ئەمڕۆ دایکت لەسەرخۆی نییە... لەگەڵی مەڵێ، هەرچی لەدەستبێت دەیکات.

(تیۆ)، کە لەمەتبەخەکەوە لەزۆری نانخواردنەکەی دەنواڕی، جگە لەمشتومڕی نێوان دایكو کچ هیچ تێنەگەیشت. چونکە لەگەڵ داهاتنی شەودا کەش سارد داگەڕابوو سۆپاکە گەرمایەکی سروشتی لەژورەکەدا پەخش دەکرد. بۆچی دەبێت بکوژێتەوە! ئەی بۆچی دەبێت داوا لەکەسانی دیکە بکرێت بیکوژێننەوە یان داوای کوژانەوەی نەکەن؟

- بەڕێز (ئۆپن هایمەر) نیگایەکی بێدەنگی لە پورە (مارتا) گرتو ئەویش وتی: زۆرباشە (دەیڤد)ی ئازیز، من دەیکوژێنمەوە.

(تیۆ)، کە لەوگفتوگۆیە سەرودەری نەکرد، بۆ موبەقەکە گەڕایەوە تا لەسەر فەرمانی دایە (روت) هێلکە کولاوەکان بەچنگاڵ لەت بکات. (روت) جگەری مریشك بەبیبەرو خوێوە بەخێرایی لەگەڵ پیاز تێکەڵ کردو پاشان دەرگای وەجاخەکەی کردەوەو سەمونە برژاوەکانی دەرهێنا. سینییەکی گەورە ماسی درشتی ساردبۆوە ئامادە بوو. (ئارتۆر)یش نەخشەی دەکێشا هەرچی زووە هێرشی بۆ ببات!.

(روت) بەپشتی دەستی ئارداوییەوە ناوچاوانی سڕیو هەناسەیەکی تەواوبونی هەڵکێشا. بەکچەکەی وت ئاگاداری پشیلەکە بێتو پاشان بۆ هێنانی کێكو خۆگۆڕین رۆشت.

کاتێك (روت) بەپۆشاکە مەخمەڵییەکەیەوە بۆ ژوری نانخواردن گەڕایەوە بەجوڵەیەکی شیاو شقارتەکەی دەرهێناو مۆمەکانی داگیرساندو لەژێر لێوەوە وێردی خوێند؛ ئیدی شەبات دەستپێکردبوو. لەهەمانکاتدا پورە (مارتا) هەستاو سۆپاکەی کوژاندەوە.

- (ریڤکلە) بۆ (تیۆ)ی رونکردەوە: لەکاتی (شەبات)دا جولەکەکان بۆیان نییە دەستکاری ئاگر بکەنو تەنها کەسێك جولەکە نەبێت دەتوانێت یارمەتیان بدات. هەروەها نابێت بۆ کوژانەوەی ئاگریش داوا لەکەس بکەن یارمەتیان بدەن. کاتێك پورە (مارتا) لێرەیە یارمەتیمان دەدات... ئێستا باوکم وێرد دەخوێنێت.

- (دەیڤد) وتی: (روت)، (هالس - Hales)ـەکانت لەکوێ داناوە؟

- (روت)، کە بەپەلە بەرەو مەتبەخەکە رایکرد، وتی: ئاه، لەکورەکەدایە! مارتا وەرە گازەکە بکوژێنەوە، تکادەکەم ....

(هالس) (خڕە نانەکانی شەوی هەینی) باش ئامادەببون، کفەڵو ئاڵتونی. (روت) لەسەبەتەیەکی هاویشت و دەسرپەکی بەسەریاندا کێشا، کە چەند وشەیەکی لەسەر چنرابوو.

- (ریڤکلە) بەویقارەوە وتی: بەعیبری نوسراوە (شەبات پیرۆز). لەهەموو هاتنێکی شاژندا بەبێدەنگی جەژن بەسەردەبەین. (شەباتی پیرۆز) وەك دەستگیرانێکە، کە لەمکاتەدا شکۆمەندیو ئاشتیو گەرما بۆ دڵمان دێنێت. هەر ئێستا باوکم نانەکە موبارەك دەکاتو ئینجا دابەشی دەکات.

- (دەیڤد)ی بەتەمەن ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: بەداخەوە ناتوانم هێندە رێگا بکەم تا کەنیسە، بەڵام هێشتا دەتوانم وێرد بخوێنمو سرودی ستایشی هاوسەری میهرەبان بڵێمەوە، هەرچەندەش ئەمرۆ کەمێك لەکارەکانی دواکەوت.... (روت) وانییە؟. (تیۆ) ئیدی دەبێت پێتبڵێم لەکاتی (کیدۆس - Kidousch) هاتوە، کە گرنگترین ساتی (شەبات)ـە. گوێبگرە...

بەرێز (ئۆپن هایمەر) کاسەی شەرابەکەی پڕکردو لەسەردەستی راگرتو هەموو هەستانە سەرپێ...

**(شەو داهاتو رۆژبووەوە، پاش شەشەمین رۆژ. بەمجۆرە ئاسمانەکانو زەویو هەموو شتەکان دواییان هات. حەوتەمین رۆژ خواوەند کارەکەی خۆی کۆتایی پێهێنابوو، پشویدا. خواوەند حەوتەمین رۆژی پیرۆزکردو بەرۆژی پیرۆز ناوینا، چونکە لەو رۆژەدا لەهەموو ئەفراندنەکانی تەواو ببوو). پاشان قومێك شەرابی فڕکردو جامە شەرابەکەی بەژنەکەیداو پاش ئەوەی هەموان شەرابیان نۆشی پیاوە بەتەمەنەکە دەستی بەکەمێك ئاو شوشت و کەوتە نزاکردنو بۆ بەرەکەتدان بە (هالس) دەستی خستە سەر نانەکەو ئینجا دەستی بەبڕینی کردو بەمیهرەبانییەوە وتی: (روت) نانەکە نەبرژاوەو لایەکی نەرمە.**

- (روت) بەناڵاندنەوە وتی: بیرم لای خۆم نییە. (دەیڤد) پیربوم...

- (دەیڤد) بەپێکەنینەوە وتی: بەڵام لەمرواری ئازیز تری، ئێستا دەتوانین شێو بکەین.

دوای تەواوبونی شێو (دەیڤد ئۆپن هایمەر) دوعای بەرەکەتی خوێند: ( **گوێهەڵخە ئیسرائیل جاوید خوای ئێمەیە، جاوید یەکتایە، تۆ بەهەموو دڵتەوە، بەهەموو رۆحتەوە، بەهەموو تواناتەوە خواوەندت خۆشدەوێت).**

- پورە (مارتا) لەسەرخۆ وتی: بەم نزایە دەڵێن (شیمە – Chema). خۆشاوی پەرستنی جولەکەیە.

- (ئۆپن هایمەر) بەمجۆرە کۆتایی بەنزاکەی هێنا: ... کەواتە وتەکانی من لەناو دڵو هزرتانا جێگیر بکەن، وەك هێمایەك لەسەر باسکتانی دابنێن‌و لەسەر ناوچاوان‌و بەنێوان چاوەکانتاندا هەڵیواسن.... لەسەر تەژی خانوەکەت‌و دەرگاکاندا هەڵیکۆڵە... تەنها لەو کاتەدا درێژی رۆژەکانتان‌و رۆژی وەچەکانتان لەسەر ئەو زەوییە تا ئاسمان بەبەرزییەوە بێت بەردەوام دەبێت، کە جاوید سوێندی خواردوە بەباوانتانی ببەخشێت.

- کاتێك پورە (مارتا)و (تیۆ) گەیشتنە هۆتێلەکە وەك شوێنێکی خەمئەنگێز هاتە بەرچاویان. تەنانەت (ئارتۆر)یش، کە بۆ خەوتن دەچوە ژێر تەختەی خەوەکەوە سکاڵای لەدۆخی خۆی دەکرد!

## نزای کۆن – نوێ

شەممە رۆژی (شەبات) بوو؛ (ریڤکلە) نەهات. (تیۆ)و پورە (مارتا) رۆژەکەیان لەو کۆشکەدا بەسەربرد، کە بەسەر پراگدا دەینواڕی. تۆریستێکی زۆر بۆ سەردانیکردنی (کۆڵانی ئاڵتون)، کە لەکۆندا شوێنی نیشتەجێبونی کیمیاگەرەکان بوو، ریزیان بەستبوو. بەناچاری بۆ باخچەکانی سەروی کۆشکەکە رۆشتن. لەوێوە سەیری میچەکانی (پرگ)، گومەزە پیازییە سەوزباوەکان‌و تەمێکی ئاڵتون ئاسای سەر شارەکەیان دەکرد.

- (تیۆ) وتی: خراپ نییە، بەڵام زۆر لە (گتۆ) ئاڵۆزترە!

- پورە (مارتا) وتی: (تیۆ).. تۆ لێرەدا لەسەرکەویی هونەری (باروك) دەنواڕیت. وردبەرەوە! کڵێسای کاسۆلیك بۆ بەرەنگاربونەوەی (ریفۆرمی ئاینی) پرۆتستانت چەندین شێوازی بەکارهێنا. سەرەتا جەنگ، کۆکوژییەکان، جەنگی خاچپەرستی و پاشان رازاندنەوەی راستەقینانەی رەفتارو نەریتەکانی خۆی. دواجاریش هونەری (باروك)ی، کە ئێستا نمونەکەی لەبەرچاوتدایە. لەو باوەڕەدابون رێگای جوانی‌و جوانکاری چەکێکی باڵای کڵێسای کاۆسلیکەو

باشترین هۆکارە بۆ دژایەتی (ریفۆرمی ئاینی)... کەواتە ئێمە لەم شارە مەزنانەدا لە هونەری رابردوو بێبەشین. مێژوو نوێژەن مەکەردوە!

- کەی (ریڤکلە) دەبینینەوە؟

- سبەینێ شەو. ئەمساڵ (بەخشینی مەزن)ی رۆژی یەك شەممە لەخۆرئاوا دەستپێدەکات. دەبێت جارێك پەرستن لە کەنیسە ببینیت.

رۆژی یەك شەممە پورە (مارتا) زوتر (تیۆ)ی بۆ (گتۆ) برد تا دیمەنی دەرەوەی کەنیسەکەی پیشانبدات، کە بە(کەنیسەی کۆن - تازە)ناودەبرێت. (کۆن) لەبەرئەوەی، کەکۆنترین کەنیسەی شاربوەو (نوێ) چونکە ماوەیەك لەمەوبەر نوێژەنکراوەتەوە. واگریمانە دەکرا ئەم کەنیسەیە جاویدانییە، چونکە فریشتەکان بەردی پەرستگای (ئۆرشەلیم)یان هێناوەو لەوێ داینناوە. راستییەکەی ئەوەبوو کەنیسەکە لەهەموو دۆخەکاندا هەرمابۆوەو لەژێر گەردو خاکدا (یوسلە گۆلێم)، کە (مهاراڵ) لەگۆشەیەکدا شاردبویەوە هەروا دەستی لێنەدرابوو.

لەسەعاتی دیاریکراودا خێزانی (ئۆپن هایمەر) گەیشتنە کەنیسەو لەبەردەرگای کەنیسەکە (کیپا)یەکیان کردە سەر(تیۆ)و عەبایەکی سپی هێڵداری رەشیان هاویشتە سەر شانیو پاشان ژنان لەلایەكو پیاوان لەلایەکی دیکەوە رۆنیشتن. کاتێك لەپشت پەردە سورەکەی بەئاوی ئاڵتون نەخشێنرابوو تەوراتەکانیان دەرهێنا لەرزەیەك بەناو ئامادەبواندا گەڕا. (تیۆ) هیچ لەو ئاوازە تیژە تێنەگەیشت، کە ئەرکی خوێندنەوەی نزاکانی لەسەربوو، هەروەها لەوشەکانی لەژێرلێوەوە دەوتران و ئەوانەش لەزاری (حاخام)ـە کەوە دەهاتنەدەر، بەڵام هەستیدەکرد سێهەزار ساڵ بۆ دواوە گەڕاوەتەوەو لەسپێدەدا سەرهەڵدانی ئاینەکانی جیهان لە (ئۆرشەلیم) یان لەجێگایەکی دیکەدابوو.

- (دەیڤد) لەگەڵ دەوروبەرەکەی خۆی بەهێواشی وتی: ئەمرۆ رۆژی (بەخشینی) جولەکەکانە، لەهەمانکاتیشدا رۆژی هاتنی پێو قەیەمی خێری هەندەرانییەکانیشە؛ کەواتە (تیۆ) هاتنت بۆ ناومان پیرۆزە... کوڕەکەم...

کاتێك (تیۆ) بۆچاککردنی عەباکەی سەری سوڕاند لەپڕ (بروتوس)ی بینی عەبایەکی رەشو سپی لەسەر شانەو (کیپا)یەکی لەسەر کردوەو خەندەیەك لەسەر لێویەتی. پرۆفیسۆر (کارنرۆ) لەناو دڵی کەنیسەی جولەکەکاندا بەئەندازەی کڵێساى حەبەشیان لە (تێریۆ)ی (کاندومبلە)کەی خۆی ئاسایی بوو. (بروتوس) چاوێکی لە(تیۆ) داگرتو لەگەڵ ئاوازی ئەوانی دیکەدا تێکەڵبوو. سەیرەکە لەوەدابوو گۆرانییەکەی بەزمانی عیبری دەوتەوە.

- کاتێك پورە (مارتا) لەچونە دەرەوەدا (بروتوس)ی بینی عەباکە بەبەرپرسی سروتەکە دەدات لەتاو ئەبڵەقبون خەریکبوو لەهۆش خۆی بچێت!. پورە (مارتا) پاش ئەوەی گاڵتەجارییەکەی پشت درەختەکەی لەگۆڕستانە کۆنەکە کردە سەرزەنشتکردن خۆی فرێدایە ئامێزی‌و نغرۆی خۆشیبوو.

- (بروتوس) لەگەڵ ئەوەی لەئامێزیدا دەیگوشی وتی: ئازیزەکەم خۆم خانەنشین کرد. لەمەودوا تاکەکاری من ژیانە لەپاڵ تۆدا.

- هیوادارم نە لە(ریۆ)و نە لە(باهیا) نەبێت.

- (بروتوس) لەژێر لێوەوە وتی: خانویەکی کۆنم لەشاری (باروك ئۆلیندا) بەمیرات بۆماوەتەوە. لەژێر میچی ئەو خانوەدا دەژین، هەروەك شایستەی ئەوەیە... ئازیزەکەم.

- پورە (مارتا) بەجۆرێك لەخانەگومانییەوە وتی: بەڵام من سەربەخۆیی خۆمم دەبێت. دەتوانم بۆ هر شوێنێکم بوێت گەشت بکەم؟

- هەر شوێنێك دڵتان بخوازێت ئازیزەکەم، بەڵام بەتەنها نا.

- بەراستی بۆ هەموو شوێنێك لەگەڵما دەبیت؟

- (تیۆ) پرسی: باشە، کەی شاییەکە دەکەن؟

- پورە (مارتا) وەڵایدایەوە: کاتێ گەیشتینەوە (پاریس). بۆتۆ تەنها یەك پەیام‌و شوێنێکی دیکە ماوە. چاوەڕێی سبەینێ بکە!

(تیۆ) بەبێ ئەرکبەخۆدان زانی پەیامەکە لەکوێدایە. ئەو کاغەزەی لەژێر بەردی سەر گۆڕەکەی (مهاراڵ) رۆکرابوو کۆتایی گەشتەکەی دیاریدەکرد.

- ئێستا برۆ (پی تی)یەکەت لەمیحرابەکەدا بدۆزەرەوە.

- دوای دوو رۆژ هەموان بەهاوەڵی (ریڤکلە) بەمەبەستی سەردانی (دلف) بۆ (یۆنان) رۆشتن.

## بەشی سی

# (گەشت دوایی هات، گەشت دەستیپێکرد)

### (تیانۆ)، دایەگەورە

(تیۆ) بەتەواوی شارەزای فرۆکەخانەکەی (ئەسینا) بوو. ئەمجارە دەیزانی کێ چاوەڕوانیانە. (تیانۆ)ی دایەگەورە یان وەك خۆی دەڵێت (دایە تیانۆ)، کە بەپرچە سپییەکانییەوە توندوتۆڵانە راوەستابوو. خۆی هەڵدایە ئامێزییەوەو ئەویش توند بەخۆیەوە گوشی.

- (تیۆ)، کە سەری لەئامێزیدا نغرۆ کردبوو گوتی: دایە تیانۆ، کۆتایی پێهات و چارەسەر کرام. مەگری...

- بەڕاستی پەرەجوە، چەند نزاو پاڕانەوەم کرد...

- کارێکی چاکتکرد... هەموو پاڕانەوەکانت بەسودبون.

- کاتێ باش لە (تیۆ) وردبۆوە گوتی: چەند بالآت بەرزبوە! بەلایەنی کەمەوە (دە) سانتیمەتر!

- (تیۆ) وتی: گەشت لاوەکان گەورەتر دەکەن. ئاگات لەو قەفەسە شینە بێت! (ئارتۆر)ی پشیلەکەمی تێدایە.

- ئەم هەموو گەشتە دورودرێژەت بەم پشیلەیەوە بڕیوە؟ (مارتا) هیچی پێڕانەگەیاندویت؟

- نەخێر، چونکە لەئەفریقا ئەم پشیلەیەیان بەمن بەخشی، ئینجا جوانیشە، بڕوانە...

- راستە جوتێ چاوی شینی جوانی هەیە، ناوی چییە؟

- ئارتۆر. باشە، دایەگەورە، ئەوانیدیکە چاوەڕوانن. تکادەکەم بەخێرهاتنیان لێبکە. (ریڤکلە) لە (پراگ)ـەوە هاتوەو مامۆستایە. ئەو پیاوە بالآبەرزە هاوسەری ئایندەی پورە (مارتا)یەو ناوی (بروتوس)ـە، بەرازیلییە. سەرت نەسوڕمێت... پیاوێکی سەرنجڕاکێشە!

- (تیانۆ)ی دایەگەورە بەسەرسوڕمانەوە وتی: مارتا شودەکات؟ باشە، بۆ ئەو پێویستە. لەگەڵ کەمێك چانس و بەخت لەوانەیە ئەو شوکردنە کەمێك ئەقڵی بەهۆشدا بێنێتەوە.

دایە (تیانۆ) لەناو خێزاندا بەزمان زبری بەناوبانگ بوو، بەلآم ئەوەی باشبوو رەچاوی ئەدەبی دەکرد. پیرۆزبایی لە (مارتا) کردو دڵخۆش بوو بەوەی (بروتوس) دەستی راموسی، بەلآم (ریڤکلە)ی شەرمن و کەمڕوو هەرخێرا جێگای پەسەندی دایەگەورە. شەو دایەگەورە سێ میوانەکەی بۆ شێوکردن رەوانەی دەرەوە کرد تاخۆی بەتەنها لەگەڵ وەچەکەیدا بمێنێتەوە. لەژوری نانخواردن (تیۆ) بەدەم خواردنەوە لەشتەکانی ژورەکەی دەڕوانی: تابلۆ هەڵواسراوەکان، وێنە کۆنەکانی باپیرەی، سەروکەللەی (دمتر)ی خواوەندی تایبەت، کە لەئەسکەندەرییە کڕابوو، کەمانچە، مێزی نزاو شتەکانی دیکە... ئینجا وتی: هێشتا کەمانچە لێدەدەیت؟

- دایە (تیانۆ) وتی: هەڵبەتە جارجارە وانەش دەڵێمەوە! بۆچی پێدەکەنی؟ دەڵێی باوەڕم پێناکەیت؟

- (تیۆ) هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: ناتوانم باوەڕبکەم کەمانچەژەن بیت، لەلای من دایەگەورەیەکی زۆر شارەزایانە سوپی مریشك بەئاوی لیمۆ دروست دەکەیت، گەمژانەیە وانییە؟

- نەخێر، بەلآم بەراستی تۆ گەورەبویت!. هەرگیز دەربارەی کەمانچە پرسیارت لەمن نەکردوە... لەتەمەنی منالێتدا سەرت هەر لەسەر کتێبەکانت بوو... پیشەکەی من هیچ لەلات سەرنجڕاکێش نەبوو.

- زۆرباشە، ئێستا گۆڕاوم. ئاینەکانی جیهانم تێپەڕاند، کە هیچی لەوە کەمتر نییە لەکتێبەکاندا دەخوێندرێتەوە.

- بۆ دەستپێکردن زۆرباشە. ئەو گەشتە ئاینییە چی فێرکردیت؟

- (تیۆ) بەدەنگی بەرز وتی: ئۆو... چەندە، بۆ ئەمەش گەمەیەکی ناو تەلەفزیۆنە؟ بەسێ پشك یان پێنج؟ بردنەوەی خەلآتی گەشتێك بۆ (جەزائیر) یان مێزێکی شت نوسین و کەلوپەلەکانی ئۆفیسێك؟

- تۆ بواری تەواوت هەیەو دەتوانیت لەوەلامدانەوەدا راڕابیت، بەلام من دەمەویت بزانم .. کوڕەکەم، نەك لەبەرئەوەی لەکاروباری ئاینیدا زانابم، بەلکو کاتێك بلیمەتێك لەخێزاندا دەبێت..

- کاکی بلیمەت سەری خوراندو باوێشکێکیدا: زۆرباشە، بەلام بەقاوەیەکەوە بۆ سافکردنی گەروم!

- دایە گەورە لەگەڵ لادانی دەسماڵێك لەسەر سینییەك وتی: هەموو شتێکم ئامادەکردوە. دەتناسم!

## درەختەکەی تیۆ

- (تیۆ) لەکاتێکدا پەڕاوێچکەکەی دەردەهێنا گوتی: باشە، ئێستاکە دەبێت بکەومە باسکردن. هەر لەسەرەتای گەشتەکەمەوە پلە بەپلە کەبەرەوپێش دەچوین لەپەڕاوێچکەکەمدا شتم تۆماردەکرد؛ ئینجا نەخشەو سکێچەکانی وەك لێرەدا دەیانبینی. ..دەیبینیت دواین سکێچم درەختێکە؟. گوێبگرە رونیدەکەمەوە... ئاین‌و دینەکان وەك درەختێك دەبینم؛ درەختێکی مەزن، کە رەگەکانی بەسەرانسەری گۆی زەویدا رۆچوە، هەموو ئەو رەگانەش بەیەك ئاراستە، واتە بەرەو ئاسمان بەرز دەبنەوەو ئەوەش سروشتییەو چارەنوسی رەگ هەروایە. پاشان قەدی درەخت لەخاکەوە دێتە دەرەوە؛ راست‌و رێك‌و تەواو خاوێن. درەختەکە وەك (بایۆباب)ێکی ئەفریقییە، چونکە دەتوانرێت هەرچی بخوازرێت لەسەری هەڵکۆڵرێت. خۆت ئەمە بخوێنەرەوە: **(خواوەند بۆ چاکەو خێری خەڵکە)**. ئەمە لەسەر قەدی درەختەکە نوسراوە.

- دایە گەورە بەم ئەنجامە گەیشت: کەواتە تۆ هیچ خوایەکی خراپەکارت نەبینی!

- بۆ ساتێك ئارامبگرە!. درەختی هاوبەشی ئاینەکان تەنها بەپێداگری لەسەرئەوە ناوەستێت، کە خواوەند باش‌و مهرەبانە!. لەپاڵ ئەم درەختەداو لەسەرتابلۆیەك راسپاردەکانیم نوسیوە، چونکە قەدی درەختەکە جێگای نەدەبۆوە. خواوەند بۆ چاکەو باشەی خەڵکە، بەلام بەچەند مەرجێك: ستایشی بکەیت، لەبەر قاپییەکەیدا بپاڕێیتەوەو قوربانی بۆ بدەیت، ئەگەر وانەبێت خواوەند تۆقێنەر دەبێت!، دژ بەتۆ زریان، دورخستنەوە، جەنگ، وشکەساڵی‌و هەورە بروسکە دەنێرێت.

- دایەگەورە وتی: واتە مرۆڤ بەرامبەر بەخواوەند ئەرکدارە؟

- ئـەوەش لەسـەر قـەدی درەختـە هاوبەشـەکە نوسـراوە. بابـەتی چـۆنییەتی سـودوەرگرتن لەقەدی درەختەکە لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژە. هەموو ئاینـەکان دەیانـەوێت هـەموو خـەڵکی لـەخۆیان گردبکەنـەوەو بیانپـارێزنو چـاودێرییان بکـەن و لـەپێناو گەیـشتن بـەو ئامانجـەش سەختگیرانە داوای ئەو شتانە دەکەن، کە بەئەندازەی یەك پەنجە کەمتر لێیان پەسـەند ناکـەن. درەختەکە دەبێت بەئاوی پاك ئاودێری بکرێت. ناکرێت میـز بکرێتـە بـنی!. کەواتـە ئاینـەکان بەتوندی گرنگی بـە پـاکیو خـاوێنی دەدەن. خـودی ئـەو کـارەش پاراسـتنی مرۆڤـە لەپیـسبونو لەسـەر درەختـە هاوبەشـەکە جێگـای خـۆی هەیـە. هـەروەها پێـدانی خـۆراکیش بـەو درەختـە پێویستە، کە ئەویش قوربانیکردنە. تا ئێرەش هەموو ئاینەکان بەیەك دەچوێن.

- ئێ، پاشان چی رودەدات؟

- ئـەوەی رودەدات یەکـەمین زێوانـەکانی خواوەنـد دەمـرن. زێوانـەکانی دواتـر دەکەونـە ململانێکردن لەگەڵ یەکدی، کـە بەڕەواڵـەت کـارێکی مرۆڤانەیـە. هـەر زێوانێـك دەربـارەی ئـەو خۆراکـەی پێویـستە بەدرەختەکـە بـدرێت، سـەلیقەو بیربـاوەڕی تایبـەت بـەخۆی هەیـە. لـەلای یەکەم خوێنی ئاژەڵ؛ لەلای دووەم شەرابو وردەنان؛ لەلای سێیەم تەنها ئـاو؛ چـوارەمیان ئـاوی کانزایی؛ پێنجەمیان ئاوی پاکژکراو؛ شەشەم تەنها ئاگر بۆ سوتاندنی گەڵا پەژموردەکان؛ لەلای حەوتەم تەنها هەوا باشترین خۆراکەو بەکورتی ململانێکـە لـەنێوان کەسـانێکدایە هەریەکـەیان بۆ پاراستنی ژینگەکە شێوازی خۆی بەباشتر دەزانێـت؛ ئینجـا هەریـەك لـەو زێوانانـە سـەبارەت بەشـێوازی سـود وەرگـرتن لـەو خۆراکانـە بـۆ پارێزگـاریکردن لەدرەختەکـە رۆژێـك دیـدو بیروباوەڕەکانی بلاودەکاتـەوە. هەلومەرجەکـە ئـاڵۆز دەبێـت، هەریـەك لەئاینـەکان دەسـتدەداتە بـەرگریکردن لـەبیروباوەڕەکانیو جـەنگیش لەپێناویـدا. ئیـدی لـەوەودوا کارەکـە روو لەباشـیو رێکخستن نییە. کاتێك لەسـەرەتای هەربەهارێکدا درەخـت گەشـەدەکات، هەریـەك لەزێوانـەکان لقێك بۆ خۆیان تەرخان دەکەنو هەریەکەشیان خۆراکی تایبەت بەخۆی هەیە.

- دایەگەورە وتی: سەرنجڕاکێشە. باشە بیروڕات دەربارەی لقەکان چۆنە؟

- چی؟!، درەخت درەختەو کاری پەلوپۆ دەرکردنە. دەزانیت چـی بەسـەر درەختەکـەدا دێـت؟ ئەگەر داینەهێنرێت لاواز دەبێتو وشك دەبێتەوە.... باشە! کاتێـك لقێکـی رەسـەنی درەختەکـە ئیدی گـەڵا دەرنـەکات لەوکاتـەدا زێـوانێکی نـوێ دێـت تابیبڕێتـەوە و دوبـارە روو لەگەشـەکردن دەکاتـەوە. کاتێـك جولەکەگـەرایی (جـودایزم) روو لەوشـکبون دەکـات زێـوانێکی نـوێ بـەناوی (عیسا)وە دێتو لقە وشکەڵاتوەکان دەبڕێتو ئیدی لـەجیاتی لقێـك دوو شـێخەڵی نـوێ دروسـت

دەبێت؛ یەکێك کۆنو یەکێك نوێ. کاتێك لقی کریستیانی کەڕوو دایدەپۆشێت (لۆتەر)ی زێوان بەلێدانێك پەلەکە دەشکێنێتو دوبارە نوێژەنی دەکاتەوە. کاتێك لقی (بەرهمانیزم) لەبەهاردا ئیدی ناژێتەوە (بودا)ی زێوان دەگاتو دەستدەکات بەپاکژکردنەوەو ئەم رەوتەش بێکۆتایە......

- تائێرە دەردەکەوێت تۆ ئەو زێوانانەت خۆشدەوێت... بەلآم ئەو زێوانانە لەکوێوە دێن؟

- باش لەوە نازانم. خۆیان دەڵێن نێردراوی خواوەندن. بەڕەوالەت ئەوانە لەگەڵ درەختەکەدا هاوپەیوەندنو ئەو پەیوەندییەش بە (سروش) ناودەبەن. ئەوانە لەکوێستانە بەرزەکان، لەبیابانەکاندا یاخود لەدارستانەکان، لەبەفرو لەکەنارە لماوییەکاندا یاخیبون. هەرچۆنێك بێت دوور لەکەسانی دیکە گۆشەگیربون. ئەوانە زۆر بەجۆشوخرۆشو زۆر زرنگن؛ زۆریش بەیەك دەچوێن!. موسا، عیسا، بودا، ستیس...

- دایەگەورە بەسەرسورمانەوە وتی: ئەمەی دواییان کێیە؟

- ئەمریکییەکە دەڵێت خواوەند کتێبی (مۆرمۆن)ی بۆ رەوانە کردوە. سەیرە، تۆ منت هاویشتە ناو بیرکردنەوەوە... ئەمانە زێوانی راستەقینەن، نەخێر. باشە بۆچی کارەکانیان هێندە ناڕێکوپێك ئەنجامدەدەن و کاتێك لەجیهان دەرچون شەڕ دەستپێدەکات؟!. تۆ لەجیاتی بینینی یەك پەلی نوێ، سێ یان شەش پەل دەبینیت؛ لەگەڵ ژمارەیەك لە زێوانی نوێ!. من ئەو کەسانەم خۆشدەوێت پەلەکان پاکدەکەنەوەو لەوشکیو زیادەکان نوێژەنی دەکەنەوە، بەلآم ئەو کەسانە کاتێك پەلو لقەکانیان بڕی ئیدی وادەزانن کارەکەیان تەواو بوەو ملی رێگا دەگرنو دەڕۆن.

- دایەگەورە وتی: گوناهی مردن لەئەستۆی ئەواندا نییە، بەلآم بەڕاستی ناچار بەوتنی شتی گەمژانەم دەکەیت، دیارە مەسیح نەمردوە....

- (تیۆ) هاواریکرد: بەلآم باش بزانە تاکە کەس نییە کەنەمردوە. پەیامبەری ئیسلام بەئەسپەکەی (بۆراق) لەسەر سەربانی مزگەوتی (ئۆرشەلیم)ـەوە بۆئاسمان رۆشتوە؛ (بودا) چۆتە ناو (نیروانا)وەو هەروەها دەتوانم زۆر ناوی دیکە بڵێم بزربونو نەمردون... (موسا)، بەڵێ، بەڕاستی مردوە، بەلآم ئەوانیدیکە! کەس نایەوێت ئەوە پەسەند بکات کەئەو زێوانانە سروشتینو وەك هەموو کەسێکی دیکەن.

- دایە (تیانۆ) بەتوڕەییەوە وتی: بەلآم مەسیح کوڕی خوایە!

- (تیۆ) خۆی رادەستداو گوتی: تاکە زێوانە وتویەتی لەکوێوە هاتوە. ئەوەش وادەکات باوەڕی پێبکەین. من نازانم، بەلآم تۆ دەیزانیت؛ من پەیوەندیم بەهەموو درەختەکەوە هەیە. زۆر

روداو بەسەردرەختێکدا دێت. عەشقەکان لەژێر سایەیدا گەورە دەبن، گژوگیای سەیری تێدەئالێت و ئەگەر زێوانەکان وریا نەبن خەفەی دەکەن... ئیدی کارەکە بەرەو (کەماڵگەرایی) هەنگاو دەنێت، کەگەلەك کوشندەیە.

- دایە گەورە پەسەندی کرد: زۆرباشە، ئەی ئەو درەختەی تۆ چۆن کۆتایی بەژیانی دێنێت؟

- کۆتایی نایەت. درەختەکەم بەهێزو پتەوە. پەلە گەورەکانی درێژەیان هەیەو کاتێك داهێنرێن دەڕوێنەوە یان پەلی نوێ دەردەکەون. لقەکانی دیکەی دەبڕێن یان سەرئەنجام دەکەونە خوارەوە.... خودی درەختەکە هەمیشە لەباری گەشەکردن و باڵادایە.

- تۆ سەغڵەتم دەکەیت. دەڵێی هەرگیز هیچت دەربارەی (درەختی دانایی) بەهەشت نەبیستوە.

- بەپێچەوانەوە!. ئێستا باسیدەکەم، کە من چۆن مێژوو دەبینم. لەسەرەتادا درەختەکەدا بوو مرۆڤەکان تەنها یەك ئارەزوویان هەبوو: ئەویش ئەوەی هەتا دەتوانن بەرزتر بڕۆن و بەو شوێنە بگەن، کە درەختەکە سەر لەهەور دەسوێ. بۆ ئەم مەبەستەش پەیژەیان دروستکرد، کە بەکارە. رۆژێك بونەوەرێکی نارەسەن پەیژەکە دەشکێنێت تا بزانێت چیڕودەدات. ئیدی هۆکارێك بۆ سەرکەوتن نییە!. لەهەموو ئاینەکاندا ئەو نارەسەنە دەبینیتەوە شکێنەری پەیژەی نێوان ئاسمان و زەوییە. پاشان زێوانەکان کەوتنە کۆشش و تەقەلا تاشێوەو هۆکاری دیکە ئەزمون بکەن و درەختەکە بەئەوپەڕی ترۆپك بگەیەنن و ئەو توانایە بەمرۆڤەکان ببەخشن چەندی دەتوانن بەرزتر ببنەوە؛ خەڵکیش لەکاروانی سەرکەوتن رانەوەستان و...

- دایەگەورە بەناڕازییەوە وتی: ئەی شەیتان لەپێستی ماردا؟ ئەی سێو؟! چی لەو میوە قەدەغەکراوەی دانایی دەکەیت؟

- ئەو مارە شەیتانیە بابەتێکی دروستکراوە!. من ئاشنای لقی هندستانی ئەو درەختەبوم؛ ئەو لقەی کەمارەکانی زۆر شایستەو زۆر خوداییین!. ئیدی من ناتوانم باوەڕ بەوە بکەم ئەگەرێك هەبێت بۆئەوەی خواوەند دەستڕاگەیشتنی مرۆڤی بەزانست و دانایی قەدەغەکردبێت. باشە، لەو بارەدا بڵێ من چیدەکەم لەقوتابخانە، ها؟ جگە لەوەی فێری زانست دەبم؟.

- دایەگەورە بەنیگەرانییەوە وتی: کەواتە بڕوات بەگوناهەو گومڕایی نییە؟

- کامەیان؟ خواردنەوەی کحول، جگەرەکێشان، خواردنی گۆشتی مانگا، بەراز یان بینینی پرچ و کەزیەی ژنان؟. گوناهەکردن پێناسەی جۆراوجۆرو لق و پۆپی زۆری هەیە!. ئەمەیانم

لەسەر قەدی درەختەکە نوسیوە، خواوەند قەدەغەی دەکات (نەهی لێدەکات). چ شتێك؟ ئەو (چ شتێك)ـە بابەتێکە پەیوەستە بەزێوانەکانەوە.

- دایە گەورە ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: خوای من (مارتا) بەئامانجەکەی گەیشت. تۆ لەشێوەو پۆشاکی مرۆڤێکی (بێ خواوەندا) بۆ لامان گەڕاویتەوە؛ مرۆیەکی بێباوەڕ، وەك خۆی!.

- دایە، هەرگیز بەوجۆرە نییە!؛ من هەستم بەقودرەتی خواوەند کردوە. دڵنیابە، تەنها هێندە هەیە ئەو توانایەم لەگشت شوێنێك بینیوەتەوە؛ هەر ئەوەندەو بەس. ئەوە رەگەکانن لەرێگای لق و پەلەکانەوە بۆ ئێمە دەدوێن، بەلام ئەگەر بمانەوێت لەنێو ئەو لق و پەلانەدا دانەیەك هەڵبژێرین من لەو هەڵبژاردنەدا دوچاری دژواری دەبم!

- پەلەمەکە باتێبگەم. کەواتە تۆش دەتەوێت بەدرەختەکەدا هەڵگەڕێیت؟.

- (تیۆ) بەهێواشی وتی: من واهەست دەکەم مرۆڤەکان ئەڵتەرناتیڤێکی دیکەیان نییە، چونکە رەگەکان لەبونیاندا دەڕوێن. دەبێت ئەو رەگانە بالاترو بەرزتر بڕۆن. هەرکاتێك بەپێچەوانەی ئاینەوە دژ بەیەکدی دەچنە شەڕوجەنگەوە خودی ئەو جەنگە بەپێچەوانەی ئاینیشەوە جەنگێکی ئاینییە، کەواتە...

- (تیۆ) تۆ وەلامی منت نەدایەوە.

- بەڵێ، حەزم بەسەرکەوتنە بەسەر درەختەکەدا، بەلام نەك زۆر لەسەرەوە. حەزدەکەم لەسەر یەکێك لەپەلە نشێوەکان دابنیشم و خەوش و کەڕوەکانی لێبکەمەوە. بزانم زێوانەکان چۆن کاردەکەن، پێیبلێم زیاد لەڕادە لقەکە نەبڕێتەوەو باش و چاك هەڕەی بکات و زیان بەدرەختەکە نەگەیەنێت. پێیدەڵێم لقەکانی درەختەکە کون کون و بریندارو هێلانەی باڵندەکان وێران نەکات، هەرچەندە پاشەڕۆشی بەسەردا دەکەن؛ پاشەڕۆ بەشێکە لەژیانی درەخت.

- دایە گەورە وتی: بەراستی لەناو تخوبی ئەو ژینگەیەداو لەو شتانەی رایدەگەیەنیت هیچ شتێکی ئاینی نابینم!.

- (تیۆ) پاش بێدەنگییەکی کورت وتی: دایە (تیانۆ) داوای لێبوردن دەکەم، تۆ لقی خۆت هەڵبژاردوەو من بەدوایدا دەگەڕێم، ئەو دوانەش لەیەك جیاوازن.

- دایە گەورە هاواریکرد: دەست لەیەخەم بەردە. ئەو درەختە هیچ میوەیەك ناگرێت!

- ئاهـ... بۆچی؟!، بەردەدات! سەوزەو میوە... درەختەکەم نائاساییەو بەتەنها هەموو میوەکانی جیهان دەدات!. هەموو ئەو گیانەوەرانە لەژێریدان دەژین: مانگا، بزن، مەڕ، کەڵەشێر، مار، هەڵۆ، کارژۆڵە، قاز، مشك و باڵندە بێشومارەکان و ئەم درەختە ناوی درەختی بەهەشتە.

- دایــە گــەورە بەهەڕەشــەکردنەوە وتــی: کــوڕم.. ئاگــاداری گوناهــەکردن بــە. زۆر مــرۆڤ لەبەهەشت بەدەردەنرێن.

- لەلای خواوەند کارێکی سادەنییە. هەنـدێکجار توندوتیـژە! کاتێـك لـە ئەفرێنراوەکـەی رازی نەبێت هەورەبروسکە بانگ دەکات، دەبێت بڵێم هەرچۆنێك بێت کەمێك زبرە.

- دایەگەورە هاواریکرد: وسبە... تۆ چیتو کێیت تا بەوجۆرە داوەری خواوەند بکەیت؟.

- من؟ من دروست خودی خۆمم. زۆرباشە شتێکی گرنـگ نیم، بـەڵام ئەگـەر تـۆ لـۆژیکی بیت پەسەندی دەکەیت، کە ئەوە ئەو خوایەیە منی بەمجۆرە ئەفراندوە.

- باشە، هەندێکجار خواوەند کاری لەوجۆرەشی کردوە!.

- ئێ، دەبینیت خودی خۆشت خەریکە داوەری دەکەیت!. بۆچی ناهێڵیت، بۆچی ناتەوێت لقی تایبەت بەخۆمم هەبێت؟

- چــونکە... نــاتوانم!. مــن پەرێــشانو نیگــەران دەکــەیت. تێگەیــشتنی مــن بــۆ شــتەکان بەوجۆرەنییە. چاوەڕوان نەبوم... باشە، بەڕاستی (تیۆ) تۆ چارەسەرکراویت؟

- مرۆڤەکان، زێوانە باشەکان، لەهەموو شوێنێك هەن.

- بەترسو بیمەوە پرسی: باشە، کەواتە واتای وایە خواستی خواوەندی لەسەرنەبوە؟

- بەخەوشدارییەوە وتی: هەمان ئـەو درەختەیـە. بـۆ بەخێرهێنانەکـەی تـۆ بەتـەواوی رازیـم ناوی بنێم خواوەند.

- بــەدەنگێکی وەك ناڵەکردنــەوە وتــی: (تیــۆ).. تــۆ زۆر گۆڕاویــت. بــوارم بــدە لەگــەڵ ئــەو گۆڕانکارییانەدا رابێم!. شێو بکەین... ئەو خواردنەی بەتایبەتی بۆ تۆم دروستکردوە...

- (تیۆ) بەخۆشـییەوە وتـی: سـوپی مریـشك بـەلیمۆو هێلکـەوە؟ زۆر بەتامـە! چونکە هێنـدە باسی درەختو میوەمان کرد برسیم بوو.

## کاتێك بارهەڵگرەکان دەگەن

رۆژی دواتــر دایەگــەورە لەســەرمێزی نــانخواردنی بــەیانی روخــسارێکی داهێــزاوی هــەبوو. رایگەیاند، کە بەهۆی درەختەکەی (تیۆ)وە دوێـنی شـەو خـەو نەچـۆتە چاویو چـوار سـەعاتی تــەواوی بەخــەیاڵو بیرکردنــەوەوە بەســەربردوە تــا دواجــار کەمانــچەکەی هــەلگرتودو بــۆ ئارامبونەوە بۆخۆی ئاوازێکی (بارتوك)ی لێداوە.

- (تیۆ) لەبارێكدا (ئارتۆر)ی لەسەر كۆشبوو بەباوێشكدانەوە وتی: گوێم لەهیچ نەبوو. ئایا بەڕاست كەمانچەت لێدا؟

- لەسەرخۆ تاخەوت نەزڕێنم. ئەگەر لەلات ناخۆش نەبێت دەمەوێت دوبارە باسی درەختەكە بكەینەوە. كەمێك زیاتر ڕاڤەی بكە. ئایا هەموو لقەكانی درەختەكە لەلای تۆ یەك بەهایان هەیە؟.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بەها؟ ئایا درەختێك داوەری لەسەر لقەكانی دەكات؟. لق و پەلوپۆ هەیە وشك دەبن و دەمرن و دەكەونە سەر زەوی، لەگەڵ ئەوەشدا چرۆ و لق و پەلی نوێ بەگەڵای جوانی سەوزەوە سەرهەڵدەدەن! ئایا ئەم شێخەڵە بچوكانە لەلقە گەورەكان كەمترن؟

- دایەگەورە لەتوڕەییدا تەقییەوە: ئاه، هەروەك بیرم لێدەكردەوە! تۆ گرنگی بە (گروپ)ەكان دەدەیت؟

- ئێ، كەواتە ئەوە بیرۆكەكەتە! بنواڕە، من دەربارەی گروپەكان و درەختەكەم لەمێشكی خۆمدا زۆر بیرم لێكردۆتەوە. گروپەكان نەفرەتئەنگێزن، بەڵام بەگشتی بەرۆشنبیرانەوە لێیان دەڕوانم. كاتێك بونەوەرێكی پێكەنیناوی بانگەشەی پەیامبەرێتی دەكات بەردەوام داوای دراو لەموریدەكانی دەكات، زیندانیان دەكات و ناچاریان دەكات كاری بۆ بكەن. ئەوە بەرهەمی تاكە گروپێكە! خاترجەمبە من ئەو بابەتە دەزانم.

- بەڕاست، بەڵام (تیۆ) ئایا گروپەكانیش لەسەر درەختەكەی تۆ نین؟ ئەوە گرنگە!.

- ئەوانە ناكەونە سەر درەختەكە، بەڵكو دەكەونە بنی درەختەكە. دەزانیت كەی خەڵفە تازەكان ئامادەنابن لەقەدەكەوە دەرپەڕن؟ بیر لە پەلی شلیك بكەرەوە، ئەگەر باخەوان پێگەیشتوەكان نەچنێتەوە شلیك لەئارادا نابێت!؛ گروپەكانیش بەهەمان شێوەن. نەك هەر بەشێك لەدرەختەكەنین، بەڵكو سەغڵەتیشی دەكەن، دانەی خراپن.

- هێشتا بڕوام نەهێناوە. نمونەیەكت بۆ بێنمەوە. وابزانم پورە (مارتا) باسی ئاینی (كارگۆ - Cargo)ی بۆ كردویت؟

- (تیۆ) وتی: نەخێر، (ئارتۆر) تۆ ئەو ئاینە دەناسیت؟

- دایەگەورە كەوتە بیركردنەوە: سەیرە! لەگەڵ ئەوەشدا خودی ئەو باسی ئەو گروپە سەیرو سەمەرە (زەریاییە)ی بۆ من كردوە.

- (تیۆ) وتی: بۆ ئەو شوێنە نەچوین. بابەتەكە چییە؟

- بەگومانەوە وتی: هەوڵ ئەدەم بێتەوە یادم، لەهەندێك دورگەی ناو زەریای (ئارام)دا، خەڵکی....

- (تیۆ) راستیکردەوە: دانیشتوان، ئێمە هەموو خەڵکین.

- هەرچۆنێك بێت، بینیویانە یەکەمین کەسانی ئەوروپی بەکەشتییەکانیانەوە گەیشتونو ئەم سپیپێستانە لەکەشتییەکە جۆرەها سندوق بەقەبارەی جیاواز دادەگرن، لەماتۆڕی سەیر، خواردنەوەی نامۆ، بەکورتی رۆژێك ئاینی (بارهەڵگران) هاتەئاراوە.

- (تیۆ) وتی: بێگومان دەبێت بەو هۆیەوە بێت، کە ئەو کەشتییە پەڕەجوئاسانە هەمان کەشتییە بارهەڵگرەکانی (کارگۆ - Cargo)بوبن؟

- دایەگەورە وتی: (Cargo) لەئینگلیزیدا بەواتای (بارهەڵگر) دێت. خەڵکی، ببورە دانیشتوانی دورگەکان بونە (بارهەڵگر) پەرست. پێش ئەو دەمە ئاینی باوان و پارێزەری خۆیان هەبوو، کە جارجارە بۆ ناو زیندوەکان دەهاتنو سەریان دەدان. رۆژێکیان کەشتی گەورە گەیشتنە کەناری دورگەکانی زەریاکە، کە پڕبون لەباری خۆراكو سامانو لەسەربنەمای یەکسانخوازی بەسەر دانیشتوانەکەدا دابەشکران...

- (تیۆ) رایگەیاند: یەکسانخوازی زۆر گرنگە. مەرج دەکەم دانیشتوانەکە لەچاوەڕێی (مەسیح)ی خۆیاندابون.

- نازانم. دانیشتوانەکە باوەڕو بڕوایان هێندە بەتینە زۆرجار بۆئەوەی کاتی گەیشتنی بارهەڵگرەکان پێشبخەن هەموو دارو نەداریان وێران دەکەنو لەناوی دەبەن، بەو هێوایەی سۆزو خۆشەویستی دەریاوانە خوائاساکان بجولێنن!. فەرموو ئەوەش گروپێکی وێرانکار!.

- (تیۆ) بەبیرکردنەوەوە وتی: بەبڕوای تۆ ئاینی (بارهەڵگران) لەریزی گروپەکاندایە، بەڵام سوکانی کەشتییەکان بەدەستی کێوەیە؟ سپیپێستەکان.

- ئۆو، نا! ئەوە باوانەکانن دەگەڕێنەوە!.

- (تیۆ) هاواریکرد: کەواتە تۆ بابەتە بنەڕەتییەکەت نەدرکاندبوو. باشە، ئەگەر پرسی باوانەکان لەئارادایە، کەواتە ئەوانە گروپ نین، بەڵکو لقێکن لەزەریاکان، کە دەڕوێتەوە. بۆچی دەبێت رەگو ریشەکانی درەختەکەم لەژێر خاکی دورگەکانی زەریای (ئارام)دا نەبن؟. بیرۆکەو ئایدیای بارهەڵگران بەشتێکی سەرنجڕاکێش دادەنێم، راستە! (بەهەشت) لەرێگای دەریاوە دێت... باوانەکان بارەکان دادەگرن، خۆراك دابەشدەکەنو دیاری دەبەخشنەوە. باوانەکان هەمیشە نائاساین، سەرنجڕاکێشن؛ لەئەفریقاوە ئەوە فێربوم. بژی باوانەکان!.

- دایەگەورە بە لەبەرەشانگرانییەوە وتی: بەهۆی هیواوە هەموو شتێکیان لەناوبرد!.

- دایە (تیانۆ) بەبڕوای تۆ پەرستگای کۆمەڵەخواکانی (یۆنان) وەهەمو هیوایەکی بێهودەیە؟

- (تیۆ).. بڕوانە، تۆ ناتوانیت خوا یۆنانییەکان لەئاستی بەراوردکاری لەگەڵ.....

- (تیۆ) رستەکەی بۆ تەواوکرد: ئەم درِندانە دابنێم؟ هەرئەمەنەبوو دەتویست بیلێیت؟ خەجاڵەت نابیت؟

- دایەگەورە خۆی رادەستداو گوتی: زۆرباشە، بابەتەکە ئەوەیە دەترسم تۆ بەرامبەر بەو گروپە جۆراوجۆرانە دیدێکی ئارامو بەخشندەیت هەبێت.

- درەختەکەم جیاوازی دەکات. دەبینیت بونی زێوانەکان پێویستە... لەو بارەوەرەدام دەربارەی زێوانەکان هێندە نائامادە نەبم. دایە (تیانۆ) نیگەران مەبە.

- (تیۆ) بەراستی چۆنە سەرئەنجام دروست وشەکان دەردەبڕیت؟. بۆ نمونە نالێیت (نیگەرانی بەلاوە بنێ) بەڵکو دەلێیت (نیگەران مەبە....).

- راستیەکەی بەوجۆرەیە، چونکە زۆر لەگەڵ کەسانی گەورەو پێگەیشتودا گفتوگۆم کردوە... کاتێك دوبارە دۆستەکانم دەبینمەوە ئاسان نابێت.

- دایەگەورە بەدەم هەستانەوە لەپشت مێزەکەوە وتی: بێگومان. باشە، کورەکەم کارمان هەیە. بەیانی سەیرانێکی گشتی دەکەین بۆ (دلف)! دەبێت بۆ شت کرین برۆین.

دایە (تیانۆ) وەك کارێکی نائاسایی دە بەرامبەر پێویستیی میوانەکان کەلوپەلی کری. تەنانەت هێندە دڵشادبوو، کە دەیویست سەد بەرامبەریش بکرێت. (تیۆ) هەوڵیدا زیادەرەوی نەکات، بەڵام گوێی مسی تێدابوو. دە بوتڵ عارقی (راکی)، بیست پاکەت شیرینی، پێنج کیلۆ زەیتون، سێ قوتو خۆراکی پشیلە بۆ (ئارتۆر)، سی کیلۆ تەماتە!

- شەو ئیدی دایەگەورە هیچ نارەزاییەکی لە درەختەکەی (تیۆ) دەرنەبڕی، بەڵام لەجیاتی ئەوە دەستیکرد بەرەخنەگرتن لەکاری پزیشکەکان، کە هیچ نازانن، هیچیان نەدیوە، فێرنەبونو تێنەگەیشتونو.....

- (تیۆ) قسەکەی پێبڕیو گوتی: دایەگەورە، واز لەپزیشکەکان بێنە! هەوڵی خۆیاندا. کەس ناتوانێت رونیبکاتەوە چۆن چارەسەرکرام.

- دەڵێن هەر لەسەرەتاوە دەستنیشانکردنەکەیان هەڵەبوە!

- باشە، ئێستا کەزیندومو لەژیاندام، چ جیاوازییەکی هەیە؟

- بەگومانەوە وتی: هەرچۆنێك بێت حەزمکرد بزانم.

- پێت دەڵێم. یەکەمجار کە دەنگی جمکەکەی خۆمم بیست وامزانی سەرشانم قورس دەکات تا ئەوکاتەی دایکم نهێنییەکەی درکاند، ئیدی باری شانم زۆر سوك بوو.

- دایە (تیانۆ) بەهێوری وتی: ئۆوا خوشکە بچکۆلانە مردوەکەت. زۆرجار بە (میلینا)م وتوە: بۆچی نهێنییەکەی بەتۆ نەوتوە. هەرگیز گوێی لەمن رانەگرتو لەتۆ دەترسا. هێندە نیگەرانبوو....

- تابەتەواوی نەخۆش کەوتم!. باشە، نەك نەخۆشییەکی راستەقینە، بەڵکو وەك نەخۆشێك. ئەوەش لقێکی درەختەکە بوو دەبوو هەڵپاچرێت.

- دایەگەورە بەخێرایی وتی: هەمیشە زیاد لەڕادە چاودێری دەکردیت.

- لەلام خراپ نییە... نابێت هەموو شتێك بەخێرایی دابڕێت، بۆ نمونە ناشتاکردن لەسەر جێگای خەو....

- تەمەڵ، هێشتا هەر مناڵیت!

- دایەگەورە پێمبڵێ تۆ ناوی خوشکە جمکەکەی منت دەزانی؟

- بەهێواشی وتی: کەس ناو لەکۆرپەیەك نانێت بەمردوی لەدایك بوبێت. وابزانم دەبوو ناوی (تیۆدۆرا)بێت.

- (تیۆ) لەباری روبەڕوبونەوەدا وتی: بەڵێ، دەبوو بزانم ناوێکی لەوجۆرەی هەیە. (تیۆدۆرا). چیدی لەگەڵم نادوێت، بەراست ئەوە بۆچی ئیدی دایکم تەلەفۆن ناکات؟

- دایەگەورە بەخەندەیەکی واتادارەوە وتی: لەوەباشتر نابێت... کاتێك بینیتەوە دەزانی بۆ لەوساتەوە هێندە بێدەنگە.

- (تیۆ) بەپەرۆشییەوە وتی: کەی دەیبینم؟ بەیانی؟

- بەیانی. کاتێك گەیشتینە (دلف). (تیۆ) دواین قۆناغی گەشتەکەت لەدەستمەدە.

- لەبەرخۆیەوە وتی: لەوێ، تێناگەم! خۆ ئیدی لە (دلف) خواوەندی لێنەماوە.

- دایەگەورە بەناڕەزاییەوە وتی: بێهودە هەوڵمداوە ئارتەدۆکسێکی باشو چاك بم، چونکە گومانم هەیە هێشتا گەلی خواوەندەکان بەسەر یۆنانەوە بن. (تیۆ) تۆ نابێت خواکانی یۆنانیم لێ زەوت بکەیت، تورەدەبم.

- (تیۆ) بەجوڵەجوڵ کردنەوە وتی: دایەگەورەم بتپەرستە!. دوبارە لقی درەختەکە روو لەگەشەکردنە. هەر بژی خواکان!.

## غەیبزانی پی تی

- پوره (مارتا)، (بروتوس)و (ریڤکلە) بەجیا کەوتنە ڕێ. دایەگەوره لەپشت سوکانی ئۆتۆمبیلەکەوه رۆنیشتو هێندە بەخێرایی ئۆتۆمبیلەکەی ئاژوو بەهۆرین لێدانو خۆکردن بەناو لۆرییەکاندا تالەکەمترین کاتدا گەیشتنە (دلف). دەوروبەری پاشنیوەڕۆ خۆر لەوپەڕی درەوشاوەیی خۆیدابوو، باڵندەکان بەهەموو توانایانەوه دەنگیان لێهەڵبڕیبوو، لەو وەرزەدا ژمارەی تۆریستەکان زۆر نەبوو. (تیۆ) پاسەکانی بژارد: یەك، دوو، سێ....کاتێك لەپلەکانی ئەو گەڕەکە کۆنەدا سەردەکەوتن کەسیان نەبینی، وەك ئەوەی سەرنشینانی پاسەکان لەژێر سایەی پەرستگاکەدا بزربوبن.

- (تیۆ) بەبیرکردنەوەوه وتی: کەواتە دەبێت بڕۆم (پی تی) بدۆزمەوه. گرفتەکە لەوێدایە تۆ هەمیشە وتوتە کەس نازانێت لەکوێدا خەریکی کاری غەیبزانییە.

- دایەگەوره وتی: ئێستا، کە ئارەزوو دەکەیت سەرکەویت، بڕۆ بۆ سەرەوه!. (ئەپۆلۆن)ی خوای یۆنانییەکانیش ئلرەزوی لەبەرزاییەکان بوو.

- لەراستیدا ئەویش خوشکێکی جمکی هەبوو، وانییە؟

- بەڵێ، (ئارتمیس)ی خواوەند، کە هاوکات لەگەڵ ئەوداو لەژێر درەختێکی خورمادا لەدایکبوو. (ئەپۆلۆن) خۆرەو (ئارتمیس) مانگە. ئەو دوانە هەرگیز یەکدیان نەبینیوەو روبەڕووی یەکدی نەبونەتەوە، هەرواش باشترە.

- (تیۆ) بەسەر سوڕمانەوه وتی: بۆچی باشترە، خەمئەنگێزە؟

- داەگەوره بەدەنگێکی فەرماندارانەوه وتی: هەریەك لەخواکان جێگای خۆیان هەیەو هەریەکەشیان کاری تایبەتی خۆی. کەس پرسیار لەبیروباوەڕیان ناکات. (ئارتمیس) بەشەو کاردەکاتو (ئەپۆلۆن)یش بەرۆژ. بیهێنە بەرچاوی خۆت، کە ئەو دوانە روبەڕو ببنەوه ئەوسا کارەکان پێچەوانە دەبن. جیهانی ئاوەژوو!

- باشە ئێستا ئەو خاتونە غەیبزانە لەکوێ خۆی حەشارداو؟ ئایا دەبێت دواین پەیامم وەرگرم؟

- دایەگەوره بەبیری هێنایەوه: (تیۆ) لەکاغەزەکەدا چی نوسراوه؟

- نوسراوه دەبێت (پی تی) خۆت بدۆزیتەوه. (پی تی) خودی خۆتو تایبەتی. لەدەوروبەرت بنواڕە.

- (تیۆ) پەلکەکانی چاوی لەیەکداو جگەلەبەردی سوتاوی بەرخۆر هیچی دیکەی نەبینی. (مارمێلکەیەك) بەهێواشی لەسەردەستی پەیکەرێکی مەرمەڕ دەجوڵا. چۆلەکەیەك سەرگەردان

لەئاسماندا دەسوڕایەوە. هەڵۆیەك لەقوڵایی ئاسماندا باڵەكانی كردبۆوە. لەهەموو شوێنێك درەختی زەیتون، سەروو، ڕێگای بەردرێژكراو هەبوو. كۆڵەكەیەكی بەردینی گەورە ئاسۆیی لەسەر زەوییەكە كەوتبوو؛ لەسەر ئەو كۆڵەكەیە پەیكەرێكی سپیپۆش وەستابوو، خەون و خەیاڵە؟ بەڵام پێكانی پەیكەرە خەیاڵییەكە راستەقینە بوو، لەناو جوتێك پێڵاوی سوردا دەجوڵا.... هاواریكرد: جێگای باوەڕكردن نییە، پورە (مارتا) بەراستی (پی تی)یەكی دروستكردوەو لەوێدا ڕۆیناوە!

- پەیكەرە سپیپۆشەكە لەپڕ دەنگێكی لێوەهات و گوتی: یەكەم من ئەوجۆرە (پی تی)یە نیم تۆ بیری لێدەكەیتەوە. من (پی تی) خودی تۆم، ئەی كوڕیژگەی چاونەكراوە!

- (فاتۆ)؟ چۆن شتی وا دەگونجا؟ بۆچی بیری بۆ ئەوە نەچوبوو؟ بەرەو لای رایكرد؟ روپۆشە سپییەكەی لاداو پرچەكانی راموسی، كە مرواری رەنگاوڕەنگی پێوە ئاوێزان بوو. كەوتە ماچكردنی (فاتۆ)و بەهێوری وتی: ئەی مامزە ئازیزەكەم، زوو پەیامە نهێنییەكەم پێبدە.

- (فاتۆ) وتی: (فێری خوێندواری ببە).

- بەناڕازییەوە وتی: ئەزانم چیت بەسەر دێنم، واتە من خوێندەوارنیم؟

- وەلامیدایەوە: نا، چۆن خوێندەواریت!. دوا پەیامت بخوێنەرەوە!. نوسرابوو (پی تی)یەكەی (تۆ)!. ئاشكرایە، وانییە؟ مەگەر لەكاتی گەشتەكەتدا ئاشنای (پی تی)یەكی دیكە بوبی؟

- ئۆو، نا. نەخێر! تۆ، من تۆم خۆشدەوێت و خۆت دەزانیت.

- كە لەسەر ئەستونگەكە دەهاتە خوارەوە وتی: دەبینیت (تیۆ)كەی من، ئێستا چاوەكانت باش بكەرەوە.

- لەناو دارزەیتون و سەرووەكانی وێرانەی پەرستگای (دلف)دا ڕێنیشاندەرەكانی (تیۆ) بەپێكەنینەوە دەهاتن. (تیۆ) واقوڕماو (ساریە) سورەكەی (ئایلا)، گوارەكانی (ئەمەل)ی خاتونی میسری، سەرپۆشە تەنكەكەی (نەسرەت)، نیگای شیرینی (ریڤكلە)، (كیپا)كەی سەری (ئالیئەزرا)، كڵاوە نەخشێنراوەكەی (عەبدوڵلایە)، بەرگە ئەخەوانییەكەی (هەورەتریشقەی پیرۆز)، كۆڵوانە سورەكەی (كاردینال)، ریشی رەشی باوكە (دۆبۆر)ی ناسییەوەو لەپشت ئەوانیشەوە (سودهارتۆ) بەبەرگی چینی دوامۆدێل و ئینجا (ئەلیوشا)، كە دەستی (ئیرینا)ی گرتبوو، لەخۆشیاندا فرمێسك لەچاوەكانی زابوو.

- لەبەرخۆیەوە گوتی: هەموتان هاتون... ئەمە باشترین (بارهەڵگر)ی جیهانە.

- وەڵامیان نەدایەوە، ئابلۆقەی (تیۆ)یاندابوو، بەچاوی پڕ لەشادیو کامەرانییەوە بۆیان دەنواڕی. نەیاندەوێرا دەستی لێبدەن، تەنها بەعەشقو میهرەبانییەوە بۆیان دەڕوانی. (تیۆ) لەلایەك دەستی (ئایلا)و بەدەستەکەی دیکەی دەستی (ئەمەل)ی گرتو هەموانی لەخۆی گردکردەوە. لەسەرخۆ وتی: ئارادەیەك هەموتان.

- (تیۆ) بەسەرسوڕمانەوە وتی: بەڵام یەك کەس کەمە، شێخ سلێمان لەکوێیە؟ دوادەکەوێت؟

- (رەبی ئالیئەزرا) بەسەراسیمەبونەوە وتی: نەیتوانی ئامادەبێت. دەبێت لەو هەواڵە خەمئەنگێزە ئاگادار بێت.

- باوکە (دۆبۆر) هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: (تیۆ)، هاوڕێکەمان مانگێك لەمەوپێش ئێمەی بەجێهێشت. لەدواساتدا هەردوکمان لەپشت سەرییەوە بوین.

- (تیۆ) بەزمانێکی تەتەڵەکردنەوە وتی: مردووە؟ بۆچی ئەوەی کرد؟

- (رەبی) وەڵامیدایەوە: چونکە کاتی هاتبوو. لەئارامییەکی تەواودا بێدەنگ بوو. دەیزانی چارەسەرکراوی تۆی زۆر خۆشدەویست، (تیۆ).....

- (تیۆ)، لەسەر پارچە بەردێك رۆنیشتو گریا. باسکی رێنماکانی بازنەیەکیان بەدەوریدا دروستکردبوو، وەك پەلکی دەستی لاوێنەرەوەیەك...

- (هەورە تریشقەی پیرۆز)وتی: نەدەبوو کەس لەئێمە بەزیندویی بمێنێت و ئەوەش لەئەستێرەکاندا نوسرابوو. ئەو بەتەمەنترین رێنیشاندەری تۆ بوو. تیۆ.... بەڵام رۆحی دەمێنێت، باش ئەوە دەزانیت.

- (تیۆ) بەبوغزو گریانەوە وتی: جیاوازە! کەسێك کەمە.

- دایەگەورە لەو وێنەیەی دەنواڕی، کە بەدەستییەوە بوو، ئینجا وتی: وەك دەبینم (تیۆ)، یەکێکی دیکەش کەمە، ناوی چییە؟ (ئاشی کۆ دیرۆزیەر).

- (تیۆ) کە سەری هەڵبڕی هاواریکرد: (ئاشی کۆ)؟ شوی کردوە، باشە چەند زوو؟

- دایەگەورە (تیانۆ) بەپۆزشەوە وتی: دەربارەی شکۆفەکردنی گێلاسەکان تەلەگرافێکی بۆ ناردویت، بەڵام لەماڵەوە لەیادم کرد.

- (تیۆ) لەژێر لێوەوە وتی: پەلە نییە، ئاشی کۆ نەمردوە! ئەوەش گرنگە.

- باوکە (دۆبۆر) بەردەوام بوو: هاوڕێ پیرۆزو چاکەکارەکەمان جێگای بەهەشتی خواوندە. کەس بەهێندەی ئەو دڵێکی پاکی نەبوو، وانییە. (ئالیئەزرا).

- (حاخام) وەڵامیدایەوە: لەبیرویادەوەریماندا بەزیندویی دەمێنێتەوە. ئەوە رێچکەی ئێمەی جولەکەیە بۆ جاویدانیو ئەبەدییەت. مردوەکان لەدڵماندا زیندوو دەمێننەوە. بەناو دەرۆنت بگەڕێ (تیۆ)! هەریەکەمان دەدۆزیتەوە.

- (تیۆ) کەفرمێسك بەچاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە وتی: لەنێو (حۆرییەکان)دا دەیبینمەوە. لەوانەیە زۆری پێناخۆش بێت! بەو تەمەنەیەوە لەناو ئەو ژنە قەشەنگانەدا چی پێدەکرێت؟

- (رەبی ئالیئەزرا) وتی: (تیۆ) ! گاڵتە بەو جۆرە پرسانە ناکرێت! (سلێمان) موسڵمانێکی ئاسایی بوو... من زۆر باش دەتوانم لەناو حۆرییەکانی بەهەشتدا بەرجەستەی بکەم. کاتێك لاو بوو تۆ نەتناسیبوو!

- (تیۆ) بەپەژارەوە وتی: بەمپێیە بۆ ئاشتکردنەوەی تەنها دوو کەسن؟

- (رەبی) وەڵامیدایەوە: لەگەڵ تۆدا دەبینەوە بەسێ کەس. لەوێ چاوەنوارِت دەکەین. خۆت باش دەزانیت (**ساڵی ئاییندە لەئۆرشەلیم**؟) پێشبینیم بۆ کردیت تۆ ئازاد دەبیت.... دەبێت بێیت.

- (تیۆ) وتی: ئەو بیرۆکەیەم زۆر لاپەسەندە. دەگەڕێمەوە وەك سلێمان هەموو کارێك دەکەم. هەڵبەتە کاتێك خوێندنم تەواو کرد، رازیت؟

- (رەبی) پێداگری کرد: ساڵی داهاتوو کوڕەکەم؛ ئاشتیو ئارامی کارێکی دەمودەستانەیە!

- (تیۆ) وتی: ئەوەم لەیادنەکردوە، بەڵام بوارم بدە!؛ زۆرشت لەژیانمدا رویانداوە. بەراست پورە (مارتا)و (بروتوس) بۆ کوێ چون، ئەی باوكو دایکم؟.

- (فاتۆ) بەراگەیاندنێکی فەرمییانە وتی: حەوسەڵەت هەبێت. لە (دلف) من فەرماندەم. بەرنامەیەکم بۆ دارِشتویت. رێنیشاندەرە ئازیزەکان بۆ بەرزڕاگرتنی گەمەکارەکان بازنەیەك پێکبهێنن! باوکە، یارمەتی بدە...

بەیارمەتی (عەبدوڵلایە) خاتونەکان وەك بازنەیەك لەسەر زەوییەکە رۆنیشتن پیاوەکانیش لەپشتیانەوە بەپێوە وەستان. (فاتۆ) چووە سەر ئەستونگەکەو خۆی رێکخست.

## لەگەڵ خۆتدا میهرەبان بە

رایگەیاند: دەستگیرانەکان (مادام ماك لاری)و (بروتوس کارنرو داسیلڤا)!

- (رەبی ئالیئەزرا) هاواریکرد: (Mageltov) بۆ پێشوازیان چەپڵە لێبدەن!.

پورە (مارتا) بەپۆشاکێکی سادەی رەشو کلۆشەوە لەناو دارەکان هاتە دەرو (بروتوس) چوو بووە ژێر باڵیو چاوەکانی لەخۆشیاندا دەبریقایەوە.

- (تیۆ) رایکردو لەئامێزی گرتو چرپاندی بەگوێیدا: جلەکانت گەلێك جوانە!. بۆ یەکەمجارە بەرگی واجوان دەپۆشیت!

- بەهێوری وەڵامیدایەوە: (بروتوس) هەڵیبژاردوە. بەراستی بەدڵتە؟

- زۆر زۆر. ئێستا خۆشبەختی، پیرەژن؟

- ئۆو بەڵێ، بۆ سەردانمان دێیت بۆ ئۆلیندا؟

- بێگومان مادام داسیلڤا. لەگەڵ (فاتۆ) دێم.

- گەشتەکەت لەیاد ناکەیت؟

- (تیـۆ) بەهێواشـی وتـی: خۆشـترین گەشـت بـوو. ئـەو گەشـتە گیـانی رزگـارکردمو ئێـستاش دەپرسیت ئایا لەیادم نەکردوە؟ پورە (مارتا) میهرەبانو سادەکەم....

- لەکاتێکـدا پارچـە کاغـەزێکی لەدەسـتی رۆکـرد وتـی: پـورە (مارتـا) سـادەکەت بـۆ کۆتـایی گەشتەکەت پێداویستی ئامادە کردوە کاتێك لەگەڵ (فاتۆ) بەتەنها بون پێکەوە بیخوێننەوە.

- (بروتوس) وتی: زۆر ئازیزەکەم، واز لەو چرپەچرپە دەهێنیت؟. پی تی چاوەڕوانە!.

- (فاتۆ)، کە هەروا لەسـەر کۆڵەکەکـە راوەسـتابوو رایگەیانـد: خوشـکەکانی (تیـۆ). یەکـەمیان (ئاتنا)!.

(ئاتی)، کە پرچەکانی کورت کردبـۆوە هاتـە مەیدانەکەوەو پاشـان (ئـەیۆن فۆرنـە)و (جیـف مالار) بەدوایدا!.

(تیۆ) برۆکانی هێنایەوەیەك: (جیف مالار)؟ ئەمە لەکوێوە پەیدابوو؟ لاوێکـی بالآبـەرزی قـژ زەرد، کە دەستی (ئەیرن)ی گرتبـوو...(ئـەیرن) ئـەوی پێناسـاند: (جان فرانـسوا) دۆسـتی منـە! بەلآم دەتوانیت بە(جیف) بانگی بکەیت.

- (پی تی) فەرمانیدا رێگا بکەنەوە ئێستا باوکی (تیۆ)! بەتەنها؟

- (تیۆ) راچڵەکی. لەکاتێکدا خۆی بەملی باوکیدا هەڵواسی پرسی دایکم لەکوێیە؟ ئێرە نییە؟

- باوکی بەپێکەنینەوە وەلآمیدایەوە: دیارە لێرەیە هێندە پەلە مەکە.

- (فاتۆ) شاعیرانە وتی: ئێستاش ئەستێرەی کۆبونەوەکەمان دایکی (تیۆ).

(میلینا)ی بەسیمایەکی کراوە، کەخۆشی و پێکەنینی لێدەباری، لەسەرخۆ بـەورگێکی کـەمێك هەڵماسیو، کە دەستێکی لەسەر دانابوو، هەنگاوی هەڵدەهێنا.

- (تیۆ) بەواقوڕماویو چاوی دەرپەڕیوەوە لەدایکی نواڕی. دوگیـان، دایکـم؟، کـە لەخۆشـیاندا شێت ببوو بەرەو لای رایکردو دایکی بەباوەش بەرزکردەوە.

- باوکی هاواریکرد (تیۆ) وریابە ئازار بەمنداڵەکە دەگات!

- (تیۆ) کە بەهێواشی دایکی دانایەوە وتی: مەترسە من بەهێزبوم، باشە چەندی پێدەوێت؟

- دایکی لەسەرخۆ وتی: کۆتایی ساڵ. (تیۆ) .. لەسەرخۆ، کچە.

- (تیۆ) هاواریکرد: ئەو خوشکە بچوکەی دەمویست! زۆرباشە ناوی دەنێن چی؟

- دایکی وەلآمیدایەوە: (زۆی - Zoe). بەزمانی یۆنانی واتا ژیان، خۆشە؟

- (Zoe fournay) خراپ نییە. بە(زۆ زۆ) بانگی دەکەم.

- دایکی بەهێوری وتی: تۆ زو زویت. ئێستا ئەڵقەکەم بدەرەوە، خێرا.

(تیۆ)، کە دەستی دایکی رادەموسی، ئەڵقەکەی لەپەنجەی دایکی رۆکردەوە.

(پی تی) تورەیی خواکان، راستی وتبوو. (تیۆ) لەکۆتایی گەشتەکەیدا هەموو ئەندامانی خێزانەکەی بینییەوە. بازنەی رێنیشاندەرەکان نزیك ببۆوەو پاش ساتێك هەموو ئەو سەرانەی لەگۆشەو کەنارەکانی جیهانەوە کۆببونەوە لەدەوری (میلینا)و (تیۆ) ئالان.

- دوو تیۆریستی ئەڵمانی، کە بەهانکەهانك بەرەو سەرەوە دەهاتن، کاتێك (فاتۆ)یان لەسەر ئەستونگەکە بینی راوەستانو یەکێکان هاواریکرد: چی رویداوە؟ فیلم دەردەکەیت Was Ist das ein film?

- (فاتۆ)، کە لەشوێنەکەی دەهاتە خوارەوە وتی: بەتەواوی وایە بەرێز فیلمێکی گەورەی سترێۆ رەنگاورەنگ بەکۆتاییەکی خۆش، لەو فیلمەدا من رۆڵی (پی تی) غەیبزان دەگێرم.

- خاتونە ئەڵمانییەکە دوبارە کەوتەوە رۆشتنو وتی: ئاه (پی تی)یەکی رەشپێست! چەند شتێکی تازەیە، زۆر سەرنجراکێشە!

- دایەگەورە ئامادەبوانی کۆکردبۆوە. کاتی سواربونی پاسەکانو رۆشتن بۆ کەناری دەریا گەیشتبوو. بەڵام گروپی رێنیشاندەرەکانی (تیۆ) رێکوپێك نەبون...

(ئەیرن) لەگەڵ (ئەلیۆشا) لەسەر رێگاکە پیاسەیان دەکرد. (سودهارتۆ) خۆی لەگەڵ (ریڤکلە) رێکخستبوو، (ئیرینیا) بەزمانی ئەڵمانی لەگەڵ باوکە (دۆبۆرا) دەدوا. (رەبی ئالیئەزرا) بەرستەیەك بەدوای یەك پیرۆزبایی لە پورە (مارتا) دەکرد. (نەسرەت) لەگەڵ (بروتوس) درێژدادری دەکرد. (کاردینالْ دۆن ئەتافۆ) لەگەڵ (ئایلا)، (عەبدوڵلایە)، (ئاتی)، دایەو (هەورەبروسکەی پیرۆز) خەریکی گفتوگۆ بوون لەگەڵ ئەمەلی خاتونی میسری.

- دایەگەورە وتی: پەلە بکەن، هاوەڵان کەمێك خۆرێکخستن، بەرێز کاردینالْ دەتوانێت ئاگای لەو پشیلەیە بێت؟

- (دۆن ئەتافۆ)، کە پشتەملی پشیلەکەی گرتو لەناو باوەشی داناو وتی: خاتوو شاگرۆس، ئایا دەتوانیت لەدەریادا مەلە بکەیت؟

- (ئایلا) بەپەرێشانییەوە هاواریکرد: بەڵام من پۆشاکی مەلەکردنم نەهێناوە.

- (دۆن ئەتافۆ) باوکانە وتی: دەتوانیت هەر بەو جلوبەرگەوە بچیتە دەریاوە. لەوڵاتی ئێوە ژنان هەروا دەکەن وانییە؟

- ئەلیۆشا وتی: من زۆر دەریام خۆشدەوێت، ئەی تۆ (ئیرینا)؟

- ئەوەندە ئارەزوی پێناکەم.

- نەسرەت وتی: من مەلە ناکەم، لەمانگی سێبتامبەردا ئاو ساردە.

- (سودهارتۆ) وتی: خۆم دەمزانی جلوبەرگی لاستیکم هێناوە!
- چەند کەسێکی بەتەگبیری!.
- لەو باوەڕەدایت ماسی قرشی تێدابێ؟
- لەدەریای سپی؟ بێگومان نەخێر؟
- بەڵام هەندێکجار دەڵێن...
- ئەی پشیلەکە؟ چی لێبکەم؟
- چاودێری دەکەم...
- ئازیزەکەم بیدە بەمن.
- دڵنیایت پشیلە چارەی ئاوی ناوێت؟
- لەوانەیە کە...

وشەکان لەگەڵ قسەکارەکاندا دوور دەکەوتەوە. (تیۆ) بەتەنها لەگەڵ (فاتۆ) مایەوە.

- (تیۆ) ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: ئەفسوس بۆ ئەو هاوەڵە بەتەمەنەی ئۆرشەلیم. یەکەم کەس بوو بۆ چارەسەر کردنم هەوڵیدا...
- (فاتۆ) وتی: بەداخەوەم کە نەمبینی. زۆر پیربوو وانییە؟
- (تیۆ) وتی: زۆر. بۆ ئۆرشەلیم دەچین‌و چەپکە گوڵێك لەسەر گۆڕەکەی دادەنێین.
- (فاتۆ) کەچاوی دەدرەوشایەوە وتی: بۆ (نۆیل)ـە؟ تۆ لەدایکبونی (زویە) لەیاد دەکەیت؟
- رۆژێك بۆ ئەوێ دەچین. چونکە دەزانیت من‌و تۆ هەردوکمان بەجوت، پاشان، بۆ گەشت دەچین!
- (فاتۆ) لەژێر لێوەوە گوتی: کەواتە گەشتەکەت کۆتایی هاتوە. چ گەشتێکی درێژبوو!
- کوا ئەوەندە دورودرێژبوو؟ لە (نۆیل)ـەوە تا سێپتامبەر... نۆ مانگی کورت‌و بەس.
- (فاتۆ) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: ماوەیەکی زۆرە تۆم نەبینیوە. (الله)گەورەیە! تۆ بەزیندویی گەڕایتەوە.
- (تیۆ) وتی: بەڵێ، وایە. بەراست پورە (مارتا) نزایەکی پێداوم تا دووبەدوو بەتەنها بیخوێنینەوە. بگرە، بیخوێنەرەوە.
- (فاتۆ) بەدەنگێکی گڕ دەستیکرد بەخوێندنەوە: **لەنێو ژاوەژاو و پەلەپەلیدا بەهێوری بجوڵێ‌و ئەو ئارامی‌و ئاسایشەت لەیاد بێت، کە دەکرێت لەبێدەنگیدا هەبێت. بۆئەوەی بەتەنیا نەمێنیتەوە تادەتوانیت لەگەڵ هەموو خەڵك بەهاوبەشی‌و رێکەوتن بژی. بەڕونی‌و گونجاوی باسی حەقیقەت بکە: گوێڕادێرە بۆ وتەی کەسانی دی، تەنانەت ئەگەر ساویلکەو نەزانیش بن. ئەوانەش سەربوردەو حکایەتی خۆیان هەیە. لەکەسانی ئاژاوەچی‌و هێرشبەر دوربگرە، بونی**

**ئەوانە ئازارن بۆ رۆحی تۆ. خۆت لەگەڵ کەس بەراورد مەکە. هەراس لەوێدایە بۆ ناو لەخۆباییبون و خۆپەرستی هەڵخلیسکێیت. هەمیشە لەتۆ گەورەترو بچوکتریش هەن....**

- (تیۆ) وتی: راستە، بەتەواوی دروستو راستە. من پاشماوەکەی دەخوێنمەوە: **هەمیشە چێژ لەپلان و بەرهەمەکانتان وەرگرن و بەکاری بێنن. هەمیشە ژیانی خۆتت خۆشبوێت، ئەگەر هیچیشت نەبێت؛ ئەوە تاکە موڵکایەتییەکی راستەقینەی خۆشگوزەرانی و درەوشاوەی ناو کاتە جیاوازەکانە. لەکاروباری ژیاندا بەتەگبیربە، چونکە جیهان لێوانلێوە لەفریودان و فێڵ و تەڵەکەبازی.**

- (فاتۆ) وتی: زۆر حەزم بەو رستەیە نەبوو. تەواوی بکە

**- بەڵام چاوپۆشی لەوشتە مەکە هاوبەندی چاکەکاری و خواپەرستییە: زۆر کەس وێڵی دوای ئایدیای مەزن کەوتون و لەهەموو شوێنێکیش ژیان پڕیەتی لەقارەمانەکانی؛ خودی خۆتان بن. بەتایبەت زیان بەدۆستایەتی مەگەیەنە! نەکەی لەعیشق و خۆشەویستیدا بەرەو دەغەڵکاری بچیت، چونکە خۆشەویستی بەهەموو کێشەو گرفت و سەریەشەکانییەوە بەهەمان ئەندازەش هەمیشەیی و سەوزە...**

- (تیۆ) هاواریکرد: بژی .. هەر سەوزە! تەواوی دەکەم... **ئەگەر بەدیدێکی بەرزەوە چاوپۆشی لەساڵانی لاوێتیت بکەیت، ئامۆژگارییەکانی ئەو ساڵانەت بۆ دەگەڕێتەوە، کە تێپەڕیون. مێشکێکی بەتەگبیری بەهێزت هەبێت تا لەکاتی نەهامەتی کتوپڕدا پارێزگاریت لێبکات، بەڵام بەهۆی خەون و خەیاڵەکانەوە خۆت دوچاری پەژارە مەکە!. ترسی گەورە لەشەکەتی و گۆشەگیرییەوە هەڵدەقوڵێت... گونجاو و ئارامبە لەپەیڕەویکردن لەدیسپلینێکی تەندروستت لەگەڵ خودی خۆتاندا. تۆ وەچەی بونەوەرانیت، لەدرەخت و ئەستێرەکان کەمتر نیت.. مافی خۆتە لێرەدابیت...**

- (تیۆ) هاواریکرد: تێدەگەیت؟ ئێمە مافی خۆمانە لێرەدابین.

- (فاتۆ) تکای کرد تەواوی بکات : **هەرچی روبدات، چ رون و ئاشکرا، چ بەجۆرێکی دیکە، بێگومان جیهان هەرلەسەر ئەو رێچکەیە دەسوڕێت کەدەبێت بسوڕێت. لەگەڵ خواوەندی خۆتدا لەئاشتی و رێکەوتندابە، ئیدی هەرچییەکت دەوێت، هەوڵ و تەقەلاو خەونەکانت هەرچییەك بن با ئاشتی و ئارامی دەرون لەناو وێڵی و پڕجەنجاڵی ژیاندا پارێزراو بێت. جیهان بەهەموو خراپەی سەدەکانی، ناکامییەکانی، سەرقاڵییە وەرسکاریی و خەونە تێکشکاوەکانییەوە هێشتا جوانە!. وریابە.... هەوڵبدە هاوشانی بەختیاری بیت.**

- (تیۆ) بەهێدی وتی: کێ ئەمەی نوسیوە؟

- (فاتۆ) وتی: سەیری ئەوە بکە، کۆتایی کاغەزەکە، دێڕێکی دیکە هەیە . (لەبەرگیراوەی کلێسایەکی کۆنی شاری (بالتیمۆر) لەساڵی (١٦٩٢). نوسەرێکی نەناس).

- (تیۆ) لەبارێکی خەونئامێزانەدا وتی: پورە (مارتا) دەتوانێت نوسەرەکە بێت. دواجار باشترین نزا بۆ هەموو خەڵکی جیهان پورە (مارتا) بەدەستیهێنا.

- (فاتۆ) نزاکەی پورە (مارتا)ی پێچایەوەو لەتەنیشت (تیۆ)وە رۆنیشتو گوتی : وریابە هەوڵبدە خۆشبەخت بیت.... (تیۆ) سبەینێ چیدەکەیت؟

- مـن؟ بـۆ پـاریس دەگەڕێمـەوە. دیارییـەکان دەکەمـەوە، بـەو وانانـەدا دەچـمەوە تیایـدا دواکەوتومو هاوڕێکانم دەبینمەوە. زۆر ئارەزوو دەکەم یاری تۆپی پێ بکەم! باشە، بـۆ کەنارەکـە دەچین.

- (فاتۆ) بۆ خۆشیو تاڕادەیەك فێڵبازانە وتی: بۆ قوربانیکردنی مانگا؟

- نغرۆبون لەشەپۆلەکاندا.

- دەنگی (میلینا) بەرزبۆوە: (تیۆ) ئەزانی سەعات چەندە؟ کاتی فراوین کردنە! (تیۆ) ....

- (فاتۆ)و (تیۆ) بەپێکەنینەوە لەیەکدیان نواڕیو هاروهاجانـەو بـەڕاکردن پلـەکانی پەرسـتگا (دلف)یان بڕی. لەسەر کۆڵەکەکە پۆشاکەکەی (پی تـی) دەشـەکایەوە. ئیمپراتـۆری سیـسرکەکان ئـارامیو بێـدەنگیان بـۆ گەڕایـەوە. خـۆر بەسـوار ئەرەبانەیەکـەوە کـاروانی ئـاوابونی دەبـڕی. مارمێلکەکە لەسەر دەستە مەرمەڕییەکەو پانتایی پەرستگاکەش تەنهامایەوە. دوراودورو لەژێر درەختە زەیتونەکاندا قاقای تریقانەوەی (تیۆ) دەنگیدایەوە.

## کۆتایی